

# ئەزموونی خەبات

ئاوڕێک لەژیان و خەباتی عەبدوڵڵا حەسەن زادە

وتوویژی هەیاس کاردۆ

# ئەزموونی خەبات

ئاورێک لە ژیانو خەباتی عەبدوڵڵا حەسەنزادە

وتوویژی هەیاس کاردۆ

چاپی دووەم ٢٠١٢

## ئەزموونی خەبات


- بابەت: ئاوڕێک لە ژیانو خەباتی عەبدوڵڵا حەسەنزادە
- ئامادەکردنی: هەیاس کاردۆ
- تایپ: هەیاس کاردۆ
- مۆنتاژ: مەسعوود ڕەوانلووست
- بەرگ: ئاگری باڵەکی
- چاپی دووەم: ٢٠١٢
- سوێد چاپخانەی ئەرزان
- ISBN 91-974991-3-7

# پێڕست

# ئەوەی پێم‌خۆشە بیڵێم

**خوێنەرە بەڕێزەکانا!**

ناتوانم خۆشحاڵیی خۆم لەوە بشارمەوە کە ناوم کەوتۆتە سەر بەرگی کتێبێک کە پێوەندیی بە ژیانو خەباتی مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن‌زادەوە هەیە. لێتان ناشارمەوە هەرچەند بۆ بەئاکام‌گەیاندنی ئەم بەرهەمە زەحمەتێکی زۆرم کێشاوە، بەڵام ئەگەر لوتفو نییەتی خێری مامۆستا نەبایە ئەو شانسەم بەنسیب نەدەبوو. لەو بارەیەوە خۆم بە کەسێکی بەختەوەر دەزانمو لەپێستی خۆمدا جێم نابێتەوە.

هێشتا "ابوبکر بنی احمد" بووم کە ناوی مامۆستا "عەبدوڵڵای حەسیاکی"م ـ ئەو کات بەو ناوە دەناسرا ـ وەک تێکۆشەرێکی وشیاری مەیدانی خەبات دەبیست. پاییزی ساڵی ١٣٥٨(دوای سەرکەوتنی شەڕی سێ مانگە) لە مێتینگێکی شاری مەهابادا دوورادوور چاوم پێی کەوت. بۆ یەکەم جار کە ڕاستەوخۆو لە دانیشتنێکی دوو قۆڵی‌دا بە خزمەتی گەیشتم کۆتایی هاوینی ساڵی ١٣٦٣ بوو کە جێگری سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستان بوو. ئەوکات ئەمن ببوومە "هەباس" بەڵام لە "کاروێ" هیچ خەبەر نەبوو. ساڵەکانی دواتر ئەو شانسەم بەنسیب بوو لە تەنیشت مامۆستاو کۆمەڵێک خەباتکاری دیکەدا بکەومە نێو بازنەی ڕاگەیاندنو دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی کوردستان. لەو ساڵانەدا هەوڵم دا هەم لێی فێر بم هەم ئەوەندەی بتوانم باشتری بناسم. ڕەنگە زەرفییەتی ئەوەم تێدا نەبووبێ باشی لێ فێر بم، بەڵام وا بزانم توانیومە بیناسم.

پاییزی ساڵی ١٩٩٤ بە دڵی پڕ، چاوی بە گریان کۆڕی هاوسەنگەرانم بەجێ هێشتو ڕەوانەی هەندەران بووم. لە هەموو بەڵگەیەکی حیزبی کە توانیم دەگەڵ خۆمی بەرم نامەیەکی دۆستانەی مامۆستا بوو کە ئێستاش وەک یادگاری ڕام گرتووە. لەو کاتیشەوە کە بە مەودا لێک دوورین بەخۆشی‌یەوە بیرمان هەروا لێک نیزیکەو پێوەندیمان کەلێنی تێ‌نەکەوتووە.

دوای کۆنگرەی چاردەی حیزبی دێموکراتی کوردستان مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە هەرچەند شانسی یەکەمی هەبوو بۆ هەڵبژێرانی بە ئەندامی ڕێبەرایەتیو تەنانەت سکرتێری گشتیش، کەچی شوجاعانە خۆی کێشایەوەو ڕێگای بۆ نەسلی نوێتر هەموار کرد هەتا ڕیزەکانی پێشەوەی ڕێبەری پڕ بکەنەوە. دیارە وێڕای مامۆستا تێکۆشەرانی دیکەی وەک کاک جەلیل گادانی، کاک فەتاحی کاویانو کاک حوسێن مەدەنیش هەر ئەو ڕێگاییان هەڵبژارد. ئەمن هەر ئەوکات لە وتارێک‌دا لە ژێر سەردێڕی "دیاردەیەک بە

ناوی عەبدوڵڵا حەسەنزادە" ئەزمری خۆم لەبارەی ئەو تێکۆشەرەوە دەربڕی‌و نووسیم " ئەوونەی حەسەنزادەو هاوڕێیانی ئەکرێ وەک نوورێک لە تاریکایی ئەنگوستەچاوەدا سەیر بکرێ‌و لە ڕاستی‌دا دیاردەیەکی تەواو نوێ لە خەباتی سیاسی‌و حیزبایەتی بە مانای کلاسیکی خۆیەتی". ئێستاش هەر پێموایە هەڵوێستی ئاوا ئازایانە دەبێ زیاتر بناسێندرێ‌و ڕێزی لێ بگیرێ.

زۆر دوای تەواو بوونی کۆنگرەی چارەی حیزبی دێموکراتی کوردستان ئەبوو کە دۆستانە داوام لە مامۆستا کرد خەریکی نووسین‌و ئامادەکردنی بیرەوەرییەکانی بێ. زۆریشم پێ داگرت کە ئەو کارە دەتوانێ خزمەتێکی باش بە نەسلەکانی داهاتووی کۆمەڵەکەمان بێ هەتا ڕابردووی نەتەوەکەیان زیاتر بناسن. بە هێندێک بیانووی بۆخۆی قابیلی قەبووڵ‌و بۆ من سادە، قەولی دەستپێکردنی ئەو کارەی نەدا. ئەوەی لەبیرمە لانی‌کەم دوو(٢) جاری دیکەشم هەر ئەو داوایە لێ‌دەکردو ئەعانەت وەبیرم دێنایەوە ئەگەر شتێکی وا نەکا بە کەمتەرخەم دەناسرێ. وا دیار بوو بڕیار هەر ئەوە بوو کە دراوبوو کە ئەخێر نای‌کەم. هەر بۆیە ئەمن تاکتیکم گۆڕی‌و ڕێگایەکی دیکەم تاقی کردەوە. جاری ئاخر پێشنیارم بە مامۆستا کرد داخوا ئیمکانی هەیە ئەمن پرسیاران بکەم ئەویش وەڵامیان بداتەوە؟ پاش ماوەیەک بیرکردنەوە لوتفی کردو فەرمووی: "مادام ئیبیعەت ئاوا پاکەو دڵسۆزی نیشان دەدەی قسەیەکم نیە". سەرەتا باوەڕم نەکردو پێم وابوو خەراپ حاڵی بووم. بۆیە لێم دووپات کردەوە: "مەبەستت ئەوەیە بەو کارە ڕازیی؟". فەرمووی بەڵێ ئەتۆ خەریکی پرسیارسازکردن بە، دوایە لەسەر شێوەی مولاقاتەکە پێک دێین.

هەرچەند لەو کاتەدا هاوکات تووشی دوو کێشەی جەستەیی بووم بەردەوام هاتوچۆی دوکتۆرانم دەکرد، بەڵام ئەوەم بە سەرکەوتنێک زانی‌و ئێشو ئازارم لەبیر چوونەوە. ئیدی کەوتمە چەورکردنی بیری ژەنگ-هەڵگرتووم بۆ ئەوەی وەگەڕی بخەمەوەو ئەوەی ساڵانێکە تێی‌دا زەخیرە کراوە لێی دەرکێشم. ئەوە بوو کە دەستم بە پرسیارسازکردن کرد. کارم کردو کارم کرد. بۆ وەڵاموەرگرتنەوە لەسەر مەسەلە جۆراوجۆرەکان شەووڕۆژ خەریکی پرسیاردروستکردن بووم. ڕاستی‌یەکەی ئەمن ئەمدەویست پرسیارەکان یەک بوعدی‌و کلێشەیی بن. زۆرم حەز دەکرد حەساسترین ڕووداوەکان بێنمە بەرباس‌و گرێ‌پووچکەکان بە هۆی مامۆستا بکەمەوە. بەو ئاسپاوی‌یە کە لەسەر مامۆستا حەسەنزادەم هەبوو دەمزانی وەرگرتنەوەی هەموو وەڵامێک ئاسەمکینە. بۆیە هەوڵم ئەوە بوو پرسیارەکان وا بگونجێنم کە قابیلی باس بن‌و جێگای وەڵامیشیان هەبێ. بەگشتی لەو ماوەیەدا زۆرم خۆ ماندوو کرد هەتا سەرەنجام پاش پێنج، شەش مانگ سەرجەمی پرسیارەکانم داڕشتو بۆم ناردن.

ئەمن پێم‌خۆش بوو مامۆستا حەسەنزادە بە نووسین وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە کە لانی‌کەم دوو قازانجی هەبوو: یەکیان ئەوە کە قەڵەمی مامۆستا قسەی تێدا نیەو ئەوەی ئەو دەی‌نووسێ پێداچوونەوەی ناوێ. یانی دەمزانی وەڵامی بەرپەرچی پرسیارەکان دەداتەوەو لەباری ئەدەبیشەوە جوانکاریی پێویستیان تێدا پێک دێنێ.

قازانجەکەی دیکەی ئەوە بوو ڕێگای بیستو دووهەزار کیلۆمیتری وەبەر من نەدەدا هەتا لە گەرمای چل‌پەنجا دەرەجەی کۆیەدا ڕووبەڕووی دانیشمو پرسیاری لێ‌بکەم. بەڵام ئیشارەتەکان پێچەوانەی ئەوەیان پێ-دەگوتم هەربۆیە دەبوو خۆم بۆ سەفەرێکی دوورودرێژ ساز کەم. هەرواشم کرد. ڕۆژی بیستویەکی مانگی مای(٢١/٥/٢٠١٠) لە قەڵای دێمۆکرات ئامادە بووم. ڕۆژی بیستوپێنجی مانگ دەستمان بە تۆمارکردنی دەنگو ڕەنگی وتووێژەکە کرد. ئەوەی دەی‌خوێننەوە ئاکامی سی‌وشەش(٣٦) سەعات تۆماری دەنگی منو مامۆستایە.

لەبارەی چۆنیەتیی وتووێژەکەو پرسیارو وەڵامەکان پێویستە باسی چەند شت بکەم کە ئەوانەن:

یەکەم: ئەمن وەک هەواڵنێری ڕۆژنامە یان دەزگایەکی خەبەری نەچووم قسە لە مامۆستا دەرکێشمو بازاڕی پێ گەرم بکەم. هەوڵی من ئەوە بوو بە هاوکاریی هەردووکمان هەم ئاوڕێک لە ژیانو خەباتی جەنابیان بدەینەوەو هەم لە ڕوانگەی مامۆستاوە مێژووی کارو تێکۆشانی حیزبی دێمۆکرات هەڵسەنگێنین کە دیارە لەو بوارەدا باسی کەسایەتیو لایەنی دیکەش هاتۆتە گۆڕێ. بۆیە لە داڕشتنی پرسیارەکاندا هەوڵ دراوە دیقەتی زیاتر بکرێو ئەوەندی دەکرێ مەسەلەی لاوەکی نەیەتە گۆڕێ.

دووهەم: ئەمن دەزانم نە مەوقیعییەتی مامۆستا ئەوە هەڵدەگرێ هەموو شتێک باس بکاو نە هەلومەرجی خەباتی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش وای لێ‌هاتوە هەموو شاراوەکانی ئاشکرا بکرێن. هەر بۆیە چاوەڕوانی ئەوە نەبووم بێ‌پەردە پرسیار بخولقێنمو بێ‌سنووریش وەڵام وەرگرمەوە. بەو حاڵەش هەموو هەوڵی خۆم داوە هەم داوای ڕوونکردنەوەی زۆر قۆناغی جێگای پرسیار بکەم هەم سەرنجی مامۆستا بۆ گرینگیی ڕوون-کردنەوەی هێندێک شتی "حەساس" ڕاکێشم. هەڵبەت پێی لێ‌دەنێم نەمتوانیوە وەڵامی هەموو پرسیارێک بەو جۆرەی مەبەستی خۆم بووە وەربگرمەوە. بەڵام دەبێ بزانین ئەوە مامۆستا حەسەنزادەیە وەڵام دەداتەوە نەک کەسێکی ئاسایی. ناوبراو کە لە هەموو ژیانی سیاسیی خۆیدا بۆ تاقەجارێک لەسەر ئاشکراکردنی نهێنی-یەکی تەنانەت چووکی حیزبیش نەهاتۆتە ژێر پرسیار. زۆر ئاسایی‌یە کە نەکرێ وەڵامی هەموو پرسیارێکی لێ‌وەرگیرێتەوە. ئەوەی لە وەڵامی پرسیارەکاندا بۆم ڕوون بۆوە مامۆستا زۆر مەسئوولانە وەڵامی داوەتەوە، قازانجی گشتیو دواڕۆژی زۆر لەبەر چاو بووەو بێ هۆ کەس یان لایەنێکی تاوانبار نەکردوە.

سێهەم: هەروەک باسم کرد مەبەستی ئەسڵی ڕوونکردنەوەی باسەکانی پێوەندیدار بە خەباتی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانو خودی مامۆستا بووە. ئاشکرایە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان بە مێژووی دوورودرێژیەوە تووشی سەرکەوتنو تێشکانی زۆر هاتوە. لە پێوەندییەکانی دەگەڵ لایەنە کوردیو نا کوردی-یەکاندا کێشەی بۆ ساز بووەو تەنانەت شەڕی دوو لایەنەو چەند لایەنەی لێ پەیدا بووە. لەو بوارەدا دیارە پرسیاری زۆر هاتوونە گۆڕێو باسی کەسو لایەنی جۆراوجۆر کراوە. لە باسی ئەو کەسو لایەنانەدا مەبەست

تەنیا ڕوونبوونەوەی باری مێژوویی بووەو مەبەستی دیکە بە هیچ‌جۆر لەبەر چاو نەگیراوە. سروشتی ڕووداوو باسەکان جاری وایە ئەوەی ویستوە کە پرسیارەکان بێ تێ‌بینی بێنە گۆڕێ بۆ ئەوەی وەڵامی سەرپەحتریان بۆ بدرێتەوە. ئەو جۆرە پرسیارانە ئەگەر لە پێوەندیی دەگەڵ کەسو لایەنی دیکەدا ئاوا باس کراون بۆ خودی مامۆستاو حیزبی دێمۆکراتیش هەروا بووە.

چوارەم: لەمێژە ئاواتی ئەوەم خواستوە ئەوانەی خزمەتکاری گەلو وڵاتی خۆیانن هەتا ماون قەدری خزمەتەکانیان بگیرێ‌و لەبەر چاوی خۆیان باسی کارە باشەکانیان بکرێ. ئەوە ئەگەر بۆ خزمەتکاران کارێکی باشە پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە. یانی خۆزگە ئەو دەسەڵاتبەدەستو ڕێبەرو سەرۆکانەی بە ئەنقەست یان نەزانانە دەبنە هۆی زیان‌گەیاندن بە قازانجی گشتی، بێ‌پەردە بەڵام بە مەنتیق لەقاو بدرێن‌و ڕەحمیان پێ نەکرێ. ئەمن دەگەڵ هەموو عەیبو کەموکوڕی‌یەکانی، مامۆستا عەبدوڵڵای حەسەن‌زادە بە تێکۆشەرێکی سادقی ڕێگای ئازادی‌و بە دڵسۆزێکی خەڵکو بە ئینسانێکی شێلگیر دەناسم، هەر بۆیە هیوادارم ئەو هەوڵەی من لانی‌کەم بچێتە خانەی سوپاسگوزاری لە زەحمەتەکانی. ئەوە بۆ من سەرکەوتنێکی گەورەیە.

پێنجەم: دەبێ پڕبەدڵ سوپاسی لاوی بە بەهرەو کارجوان کاک "پێشەوا عەلی‌پوور" بکەم کە لە هەموو ئەو سی‌وشەش سەعاتەدا کە منو مامۆستا خەریکی قسەوباس بووین فیلمی هەڵگرتوەو ماندوو بوونی نەناسیوە.
هیوای بەختەوەریی بۆ دەخوازم.

هەباس کاردۆ – ئوستڕالیا – ٢٧/٢/٢٠١١

# دەروازەیەک بۆ چوونەژوور

**عەباس کارەوان:** مامۆستا گیان پێش ئەوەی بچینە نێو پرسیارەکانو دەست بە گێڕانەوەی مێژووی ژیانو خەباتی جەنابت وەک کەسێکی دیار لە بواری جۆراوجۆردا بکەین، بە پێویستی دەزانم بە گەرمی سوپاست بکەم، سوپاس لەوە کە بەشی زۆری تەمەنو توانای فکریو فیزیکیی خۆت سەرفی خەبات لەرێی ئازادیی کورددا کردوەو لەو پێناوەدا کارنامەیەکی پڕلەسەروەریت هەیە. سوپاسی دیکەشم بۆ ئەوە کە داوای منت بۆ گێڕانەوەی مێژووی ژیانو خەباتت کە بێگومان بەشێکی گرینگ لە مێژووی خەباتی کوردە، قبووڵ کرد. دڵنیام سەرجەم ئەو زانیارییانەی لەو پێوەندییەدا دەخرێنە سەر لاپەڕەکانو وەبەرچاوی خوێنەران دەکەون جێگای سوودی زۆرنو لە ڕاستیدا کلیلی کردنەوەی زۆر دەرگای داخراون. بە ئاواتم تەمەنت درێژ بێو بتوانی ڕۆژی ڕزگاریی کورد ببینی کە خەباتێکی بێ وچانت لە پێناویدا کردوە. ئێستاش لەسەر ئیزنت هەوڵ دەدەم لەرێگای هێنانەبەرباسی پرسیاری جۆراوجۆرەوە لەو بێدەنگییەت بێمە دەرو داوات لێبکەم دەرگای جیهانی پڕلە ڕەمزوڕازی دەیان ساڵ تێکۆشانی خۆتان بەسەر ئۆگرانی زانینو ئاگاداربوون لە مێژوودا بکەنەوە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** زۆرت سوپاس دەکەم بۆ ئەو دەستپێشخەرییەتو دیارە هەروەک پێشتر باست کرد لەمێژە ئەو قسەیە لەبەینی منو جەنابتدا هەیە کە لەرێگای وتووێژێکەوە بێمە بتوانین ئەو شتانەی لەلای من هەنو دەتوانن بخرێنە سەر کاغەز جەنابت زەحمەتەکەی بکێشی لەجیاتی من بیاننووسیەوەو بڵاویان بکەینەوە. پێم خۆشە ئەوەش بڵێم کە لەمێژە خەڵکێکی زۆر دەستیان داوەتە نووسینی بیرەوەرییەکانیان. ڕەنگە لەنێو کورددا زۆر لەمێژ نەبێ، بەڵام لە نێو میللەتانی دیکەدا هەر یەکجار زۆر لەمێژە شتی وا هەیە . ئەمن لە بارەی بیرەوەرییانەوە هێندێک بیروڕام هەن کە پێم خۆشە بەجۆرێک ئاماژەیان پێ بکەم. پێم وایە بیرەوەریی کەسەکان لە هەر بوارێکدا بێ لەڕاستیدا مێژوو نیە، بەڵام یەکێک لە باشترین سەرچاوەکانە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ مێژووی وڵاتێکو میللەتێک بنووسن. دیارە ئەوە شەرتێکی تایبەتیی هەیە کە دەبێ بڵێم بەداخەوە ـ ئەمە دانانە بە گوناحێکدا کە کردوومە ـ لەمندا ئەوە زۆر بەکەمی دەست دەکەوێ. شەرتەکە ئەوەیە کە ئەوانەی دەیانەوێ لە ئایندەدا بیرەوەری بنووسن ، هەر لە ڕۆژەکانی ژیانیاندا ئەو بیرەوەرییانە بنووسن. ئەمن دیسان هەر بۆ دانانان بە گوناحێکدا، ئەوەی دەڵێم کە لە سەرەتاکانی ژیانی لاوەتیمدا بۆ ماوەی یەک دوو ساڵ کردبوومە عادەت کە هەموو بەهاران تەقویمێکم دەکڕی. تەقویمێک کە هەر لاپەڕەی تەنیا ڕۆژێکی تێدا

نووسرابوو. ئەو ڕۆژە هەرچی ڕووداوی پێم وابوو بۆ ڕاگرتن دەبێ دەمنووسین. بەشێکی لە باری ژیانی خۆمدا بوو: "ئەمڕۆ چوومە فلان جێ، ئەمڕۆ فلان کەسم میوان بوو، ئەمڕۆ ئەو کارەم کرد". بەشێکی مەربووت بوو بە دەوروبەری خۆم، بەشێکیشی مەربووت دەبوو بە دنیای دوورتر لەخۆم. وەک ئەوە کە لە کوردستان چی دەگوزەراو لە ئێران چی دەگوزەراو بە پێی ئەوەی ئەوکات پیاو ئەقڵی پێی ڕادەگەیشت- چونکی دایرەی بیرکردنەوەمان زۆر بەرتەسک بوو-، ئەوەی لە دەوروبەرمانو دوورتریش یانی ئەوەی لە دنیایەدا ڕوویان دەدا دەمنووسین. لەپاش دوو ساڵێک لەهیچوخۆڕایی ئەمن وازم لەو کارە هێنا. ڕەنگە ئەگەر بڵێم بەتەواوی لەهیچ وخۆڕایی بوو وا نەبێ. تەماشام کرد هێندێک شتی وایان تێدایە کە بیرەوەریی شەخسیی خۆمن، ڕەنگە شتی واشیان تێدا بووبێ کە هەم بۆ خەڵکی دیکە قیمەتیان نەبێو هەم هێندێکیان بۆ خۆشم پێم خۆش نەبێ خەڵک بیانبینێ. ئیدی وازم لێ هێناو پێم وایە کارێکی خراپم کرد. بەکورتی وا تێدەگەم بیرەوەری ئەو وەختە زۆر قیمەتی هەیە کە کەسەکان – ئەوەی بۆیە دەڵێم بیێتە وەسیەتێک بۆ لاوانی ئەم بەرەیەی ئێستا هەموو هی دواتر – سەعی بکەن لە ڕۆژانی ژیانیاندا بیرەوەرییەکانیانو ڕووداوە گرینگەکانی دەوروبەریانو هی دنیای دوورتریش تۆمار بکەن بۆ ئەوەی کاتێک دەیانەوێ بیرەوەری بنووسن سەرچاوەی زۆر باوەڕپێکراویان لەبەر دەستدا هەبێ.

ئەمن زۆر کەس داوایان لێ کردووم بیرەوەرییەکانم بنووسم بەڵام بە دوو دەلیل نەمنووسیون. یەکێکیان ئەوە بووە کە هەروەکی گوتم لە وەختی خۆیدا ئەو بیرەوەرییانەم نەنووسیونو هەمووم یادداشت نەکردوون هەتا بۆم ببنە سەرچاوەیەکی جێی باوەڕ. پیاو دەترسێ ئەوەی ئێستا لە بیریەتی – ڕاستە ئەوە دەگێڕێتەوە کە لەبیریەتی – ئەوە نەبووبێ کە کاتی خۆی ڕووی داوە، لەبەر ئەوە زۆرم دەخۆمڕا نەدیوە. ئەوی دیکەش ئەوەیە کە دەزانم ئەوەی دەژیانی مندا گوزەراوە بەشێکی هەر بۆخۆشم هیچ بایەخێکی نیە. بەڵام بەشی هەرە زۆری بۆ خەڵکی دیکە هیچ بایەخو قیمەتێکی نیە. ئەگەر بایەخێک لە بیرەوەریی منو لە ژیانی ڕابردووی مندا هەبێ ئەوەیە کە پێوەندیی بە ژیانو خەباتی میللەتەکەمو وڵاتەکەمەوە پەیدا دەکا. ئەوەش کە دەبێ دەی گێڕینەوە ئەگەر هەموو ئەو شتانەی لە ژیانی مندا ڕوویان داوەو بەو جۆرەش کە ئەمن تێیان دەگەم ئەیانگێڕمەوە هەتا حەددێکی زۆر لە نرخو بایەخی کارەکە دێتە خوارێ. ئەگەریش هەموو شتەکان بەو جۆرە کە بوونو بەو جۆرە کە تێیان دەگەم باس بکەم ڕەنگە لە کۆمەڵی کوردەواریدا هێندێک گیروگرفت بخوڵقێنێ. گیروگرفت بۆ خۆم کە زۆر گرینگ نیە، بەڵام بۆ ئەو حیزبە کە پێوەندیم پێیەوە هەیە. لەبەر ئەوە خۆم پاراستوە. با ئەوەش بڵێینو قەبووڵ بکەین –وەک داننێنان بە گوناحێکدا- کە ئەو کارش وەختی دەوێو تواناییی دەوێو خۆماندووکردنی دەوێ کە ڕەنگە کەمێکیش ئەوە هۆی ئەو خۆبواردنە بووبێ.

دوایە کە جەنابت ئەو داوایەت لە من کرد بە پێی ئەو تەجرەبەیەی کە لە قەڵەم و نووســینی جەنابتم هەیەو بەپێی ڕاستگۆیی‌یەک - بەبێ ڕوودەربایستی، وەک فارس دەڵێ - کە تێیدا شک دەبەم پێم وا بوو کە یەکێک لە ئەمینترین کەسەکانی کە دەکرێ ئەو کاریان دەگەڵ بکرێ. لێت ناشارمەوە کە پاش تۆ زۆر کەسی دیکە لە دۆستانی نیزیکم لە دۆستانی جێگای ڕێزم داوایان لێ کردووم کە ئەو کارە دەگەڵ ئەوان دەست پێ بکەین. بەڵام هەموو جارێ داواکەیانم ڕەت کردۆتەوە هەر بەو دەلیلە کە گوتوومە ئەمن ئەو کارەی خۆمم بەخشیوە بە دۆستێکی دیکە. بۆ خۆشت دەزانی کە نیزیک بە ساڵێک دەبێ ئێمە ئەو بەڵێنەمان بە یەکتر داوە بەڵام ڕێ نەکەوتوە دەستی پێ بکەین هەتا ئەمڕۆ کە ئاوەزوو دەکەم هەتا سەر بتوانین درێژەی پێ بدەین و کارەکەش بەکەڵک بێ.

لە بارەی ئەو شتانەوە کە لێرە بەولاوە دێن، ئەمن وەک ئینسانێکی ڕاستگۆ - یا ئەو ناوەی لەسەر دابنێم - قبووڵ دەکەم کە ڕەنگە کارێکی زۆر دژوار بێ پیاو لەبارەی ژیانی خۆیەوە لەبارەی ژیانی حیزبی خۆیەوە، لەبارەی ژیانی نەتەوەی خۆیەوە بنووسێ و قسە بکاو بەتەواوی بێ‌لایەن بێ، یانی ئەگەر لایەنداریش نەبێ شتێکی زۆر سەیر و ناسروشتی‌یە. بەڵام ئەمن لێرەدا هەوڵ دەدەم ئەوەندەی لەتوانامدا هەیەو تاقەتم پێ دەشکێ، بە تەواوی لە هەموو شتەکاندا بە بێ‌لایەنی قسە بکەم و بەناحەق هیچ شتێک بەلای نەتەوەی کورددا نەشکێنم یان خەڵکی دیکە، خەڵکی بەرابەری حیزبەکەم و نەتەوەکەم ئەگەر حەقێکیان هەیە لێیان نەستێنمەوە. لە پاشان زۆر وێ دەچێ لەو پرسیارانەدا کە دەکرێن و ئەمنیش جوابیان دەدەمەوە، وەڵامەکان بەتەواوی نەزانم یان بۆچوونەکانم هەڵە بن. بەڵام بەڵێن بە خۆم و بە جەنابت و بە خوێنەرانی ئایندەی ئەم وتووێژە دەدەم کە ڕاستگۆ بم. هەرچی دەیڵێم ئەگەر شتێکی ناڕاستی تێدا هەبێ لەبەر ئەوەیە کە نەمزانیوە لەبەر ئەوەیە کە خراپم لەبیر ماوە، لەبەر ئەوەیە وەختێکی بیستوومە، ڕەنگە کەسێکی دیکە بۆی گێڕابمەوە نەی‌زانیبێ یان بە پێچەوانەی ڕاستی قسەی بۆ من کردبێ. ئەگینا ئەوەی دەی‌زانم - دەکرێ شتێک هەبێ ڕاستی‌یەکەی بزانم و نەیڵێم - بەڵام بەڵێن دەدەم ئەمن خیلافی ڕاستی‌یەکە نە بە جەنابت وەک ئەو کەسە کە زەحمەتەکە دەکێشی و نە بە خوێنەرانە کە لە داهاتوودا کتێبەکەی دەستی تۆ دەخوێننەوە بە هیچیان ئەمن پێچەوانەی ڕاستی نەڵێم. ئاوەزوو دەکەم وتووێژێکی بەسوودمان هەبێ. بچینە نێو کەلێن و کەلەبەرەکانی ژیان و خەباتی نەتەوەی کورد و ئەوەندەی ئەمن تاقەتم پێی دەشکێ، تێیدا ژیاوم یان لە لاوە لە دۆستانی پێش خۆمم بیستووە بخەینە ڕوو تا بتوانین هەر وەک جەنابت باست کرد هێندێک کەلێن و قوژبنی کەمێک تاریک و کەمێک ناڕوون کە هەن ئیشکیان بخەینە سەر و ڕوونیان کەینەوە بۆ ئەوەی بەکەڵکی بەرەی داهاتووی نەتەوەکەمان بێ.

# لەدایکبوون و پێگەیشتن

**هیلاس کاردۆ:** زۆر سوپاس مامۆستا. دیارە ئەمن بۆ ئەوەی پرسیارەکان دیققەتی زیاتریان تێدا بەخەرج بدرێ و هەر لەخۆڕا پرسیاران نەهێنمە گۆڕێ، هەوڵم داوە دەپێشدا پرسیارەکان بنووسم. دایان بڕێژم هەر بۆیە پێمخۆشە بیانخوێنمەوە بۆ ئەوەی هەر بەو زەرافەتە کە هەوڵم داوە هەیانبێ هەروەهاش لە جەنابتیان بکەم. یەکەم پرسیاریشم لەوێڕا دەست پێ دەکا کە دەڵێ: خاڵی جووڵەو تێکۆشانی مرۆڤ لەو کاتەڕا دەست پێدەکا کە چاوی بە دنیای ڕوون دەکرێتەوە. لەدایکبوونت، سەرەتای ژیانی پڕکارەساتی تۆیە و هەربۆیە پێمخۆشە لەو سەرەتایەڕا دەست پێبکەین. تکایە هەر زانیارییەکی لەو بارەیەوە لە بیرتە بۆمان باس بکە. ئەوە کاتەو شوێنی لەدایک بوون ئەندامانی بنەماڵەو هەلسوکەوتیان باری ژیان و گوزەران سروشت و باری جوغرافیایی ناوچەی شوێنی لەدایک بوونت و زۆر شتی دیکەش دەگرێتەوە. تکایە مامۆستا.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پرسیارێکە پیاو زۆری لێنازانێ (بەپێکەنینەوە). ئەمن نازانم چۆن لەدایک بووم چۆن وەزگی دایکی خۆم کەوتووم!! بەڵام بەو جۆرەی لە گەورەکانم بیستوە یان خۆم تێدا دیوەتەوە ئەمن ساڵی ۱۳۱۷ یان ۱۳۱۸ی هەتاوی [۱۹۳۸-۱۹۳۹ی زایینی] لە یەکێک لەو دوو ساڵانەدا لە دێیەک بەناوی "سیمینۆ" لە ناوچەی گەورکی سەردەشت لە دایک بووم. با لەپێشەوە باسی بنەماڵەکەمان بکەم. بنەماڵەی مە بریتی بووە لە دایک و بابێک و پێنج کوڕ و کچێک. یانی ئەمن چوار براو خوشکێکم هەبوون ـ ئەمن ئاخر کەسی بنەماڵەم ـ بابم ئەوەندەی ئەمن لەبیرمە و زانیومە خزمی دووری لە ئامۆزاو بن ئامۆزاو ئەوانە زۆر هەبوون. بەڵام وەکوو برا تەنیا برایەکی هەبوو. ئەو برایەشی دوو کوڕی لەپاش بەجێ ماون دەگەڵ سێ کچان. پێمخۆشە ئەوانە هەر بڵێم چونکی بەتایبەتی برای هەرە گەورەی بنەماڵەمان بۆ من لە ڕاستیدا لەجێی باب بووە. بابم لە تەمەنێکی زۆر کەمی مندا کۆچی دوایی کردوە. دەخوازم بڵێم هەر وەبیرم نایە، چونکە تەنیا تارماییەکی زۆر لێڵم لەو ڕۆژە لەبیرە کە بابی پێ مرد. ئەمن بۆخۆم نەخۆش بووم کە بابم مرد خەڵک دەگریاو ئەمنیش هەروەک شتێک تارێک دەگەڵیان گریام بەڵام ئەوانی دیکەم لەبیر نیە. ئەو برایەم پێی خوێندم پێی گەیاندم سەرپەرستیی ماڵەکەمانی کرد، سەرپەرستیی برایەکانی دیکەمانی کرد. ئەمن زۆر جار ئەوەم باس کردوە کە برای بە دوو سێ ساڵ لە خۆی چووکتری وەکوو من کە ئاخر منداڵی ماڵێ بووم نازی لەسەر دەکرد، بەڵام ئەو برایەم نازی ئەویشی هەر دەکێشاو باڵی بەسەردا کێشابێ وەکوو بابێک. ئەو برا گەورەیەم ناوی ڕەسووڵ بوو

کە پیاوێکی بەدین و موتەقی بوو، پێیان دەگوت سۆفی ڕەسووڵ. جگە لەوە کەمێک قورئانی خوێندبوو، بۆیە هێندێک کەسیش بە فەقێ ڕەسووڵیان ناو دەبرد.

پاش ئێ براکانی دیکەم بریتی بوون لە: مەحموود، خدر، حەمزە کە ئەمنیش دەبمە ئاخرین کەس. خوشکەکەشمان کە لەدوای سۆفی ڕەسووڵ و کاک مەحموود لەدایک بووە ناوی فاتمە. ژیانی بنەماڵەیمان وەک بنەماڵە دەکرێ بڵێین لەخوار ناوەندییشەوە بوو. ماڵێک بووین کە هەم بابم هەم مامم ژیانیان لەسەر جۆڵایی دەگوزەرا. بووزوو و جاجم و بەرماڵ و شتی ئاوایان دروست دەکرد. لەعەینی حاڵدا وەک هەموو خەڵکی لادێی چەند سەر حەیوانیشیان ڕادەگرت. چەند سەر مەڕ و بزن و مانگا بۆ ژیانی خۆیان. ژیانێکی زۆر ڕێک‌وپێک نەبوو، بەوحاڵە شتێکی تێدابوو کە ژیانێکی موحتەرەمانە بێ و ئیحتیاجی بەوەش نەبێ بچێتە بەردەرگای ماڵان. بەڵام جاری دیکەم گوتوومە ئێستێ لە کتێبێکدا دەبێ، پێم‌خۆشە ئەوەی بڵێم کە لە کوردەواریدا دەڵێن: ڕزقی ئەو ماڵەی بە پێی فلان کەسەوە ڕزییە. وەکی دوایە بۆیان باس دەکردم دواتر بۆخۆشم کەمێکم درک دەکرد، وەختێک بابم مرد ئێمە لەباری ماڵییەوە بەتایبەتی لەباری حەیوانی ماڵی‌یەوە وەزعمان باش بوو. یەک دوو مانگامان هەبوون. وەکی دەڵێن زەکاتە حەیوانێکمان هەبوو بزن و مەڕ. ساڵی دوای مردنی بابم بوو یان ساڵی دواتری بوو ئەو حەیوانەی بوومان قڕی تێ کەوت هەمووی مرد. لەبیرمە هەموویان نەخۆش بوون، ماڵان هەوارەو هەواریان دەکرد. بە یەک ڕۆژ مەڕێک کە لە دێ بەجێ مابوو مرد. یەکێک بە مزە بڕابەکی لەخۆم گەورەتر بوو دەمان بردە کوێستانێ ئەویش لە ڕێیە مرد. یەکێکیش ئەمن لە ماڵێ بووم لە کوێستانێ مرد. وای لێ‌هات ئەو ساڵە ئێمە هیچمان نەما غەیری دوو بزن دەگەڵ کاوڕێک. کاوڕەکیان گۆڕییەوە بە ماڵێکی بە بزنێک بۆ ئەوەی ببنە سێ بزن بتوانین دۆیان لێ بخۆین. بەهەر حاڵ ژیانی ئێمە ژیانێکی خۆش نەبوو بەڵام وا ش نەبوو کە بە نانی شەو موحتاج بین.

هەڵو مەرجی وڵاتەکە هەڵو مەرجێکی ئاوا بوو. دەڵێن ـ دیارە ئەوە لەزۆر جێگا گوتراوە ـ کوردستان ناوچەیەکی دواکەوتوو لەنێو وڵاتێکی دواکەوتوودایە. دەکرێ بڵێم مەنتەقەی ئێمە کە مەنتەقەی سەردەشتە، ناوچەیەکی دواکەوتوو لەنێو کوردستانێکی دواکەوتووی نێو وڵاتێکی دواکەوتوودا بوو. ناوچەیەکی تیژیک سنوور بوو. خوێندەواریی زۆر بە کەمی تێدا هەبوو. ڕێگاوبان نەبوو. ئەو وەختی ئەمن لەدایک بووم دواتریش ڕێگاوبان هەر نەبوون. کارەبا نەبوو. لە هەمووی گرینگتر مەدرەسە نەبوو. ڕەنگە ئەوە باعیسی خۆشبەختیی من بووبێ کە گوندەکەی ئێمە لەنێو ئەو ناوچەیەی تێیدا دەژیاین گوندێک بوو نازانم لە کەیەوە بەڵام نۆگرییان بەوە هەبووە کە مەلا و فەقێیان هەبێ. ئەو گوندەی ئێمە هەر لەو کاتەوە کە ئەمن چاوم کراوەتەوە پێشتریش نازانم لە کەیەوە مەلای لێ بووە و فەقێی لێ بوون. هەر بۆیە بەپێچەوانەی دێهاتی دەوروبەرمان کە ئەو وەختی مەلایان نەبوو یان ئەگەر مەلایان بووبێ فەقێیان نەبووە دێیەکەی ئێمە مەلاشی لێ بوو، فەقێشی

لێبوون. تەنانەت زۆر چاک لەبیرمە ئەمن کە دەمخوێند لە نێو دێ‌دا، دەقاودەق ئەوەم لەبیرە کە بیست و یەک منداڵ بەیەکەوە دەمانخوێند. هێندێکیان وازیان لێ هێنا، بەڵام زۆر لەوانە کە هاوتەمەنی من بوون یان کەمێک لەپێشتر یان لەدواتر بوون، خوێندنیان تەواو کردو بوون بە مەلا. ئەو وەختی بوون‌بەمەلا شتێکی گەورە بوو، چونکە لەڕاستی‌دا تەنیا خوێندەواری لادێ هەر مەلاکان بوون. بۆیە دەکرێ بڵێین لە نێو دێهاتی ناوچەکەدا، ئەو گوندەی ئێمە بە مەرکەزێکی زیندووی خوێندەواری‌و فکری دینی‌و ئەو شتانە دەناسرا. یانی خەڵک ڕووی تێ دەکرد.

با ئەوەش بڵێم ـ نەک لەبەر ئەوەی باسی خۆم کردبێ ـ ئەمن شانازی بەوە دەکەم کە لە بنەماڵەیەکی هەژاری لادێیی‌دا گەورە بووم‌و لەپاشان ڕێگایەکم گرتە بەر کە خەڵکەکە پێی باش بووەو دیارە بۆخۆشم هەر پێم باشە. بەڵام وابوو بابم برای من دەگەڵ ئەوەی دەوڵەمەندی دێ نەبوون، جووتبەندە نەبوون، بەڵکوو هەروەک عەرزم کردی براکانیشم تەنانەت هەتا بیست، سی ساڵ پێش ئێستا ئەوانیش هەر جۆلایی‌یان دەکرد، کەچی یەکێک لە ماقووڵترین پیاوانی ئاوەدانی بوون. پیاوی بەئیعتیبار بوون، هەم پیاوی بەدین بوون‌و هەم با بڵێین وەک پیاوی ڕیش‌سپیی قابیلی ڕێز لە دێدا سەیریان دەکرا. ئەوەش بۆ من جێگای شانازی بووە. تەنانەت چونکی لەبەر ئەوەی ئەمن خوێندوومەو ئەوان نەیانخوێندوە ڕەنگە خەڵک پێیان وا بووبێ کە ئەمن پیاوێکی زۆر زیرەک بووم. بەڵام ئاوەزووم هەبوو زیرەکیی براکانم ،بەتایبەتی ئەو برا گەورەمم هەبایە. چونکە زۆر جار ڕێ کەوتوە لە مەجلیسی مەلایاندا باس‌و موناقەشەیەک کراوە، ئەو پیاوە دەی‌زانی حەق بە کێیە، ئەوەندە زەکاوەتی هەبوو. یان مەلا بە عەرەبی حەدیسی دەخوێندەوە. پێش ئەوەی مەلا عەرەبی‌یەکەی بۆ خەڵکی تەفسیر بکا ئەو بۆ پەنادەستی خۆی دەگێڕایەوە. دەتوانم پێت بڵێم لە ئەحکامی دینی‌دا ئەوەی پێوەندیی بە عیباداتەوە هەیە لە هیچ مەلایەکی دەوروبەری خۆی کەمتری نەدەزانی. ڕەنگە بوو هێندێک حوکمی گەورەتری وەک نیکاح‌و تەڵاق‌و ئەوانە نەزانێ، بەڵام ئەوەی سەربووت بوو بە نوێژو ڕۆژوو و تاعەت‌و حەج‌و زەکات‌و ئەو شتانە بە قەدەر مەلایەکی لێ دەزانی. لەو بارەیەوە پێم‌خۆشە ئەو حەقە ئەدا بکەم کە براکانی من شانسیان بۆ ڕێ نەکەوت دەنا هەموویان ،یان لانی کەم سی‌یان زۆر لەمن زیرەکتر بوون. بۆیە ئەگەر ئەمن فەزڵێکیشم هەبێ گەورەیی‌یەکەی دەگەڕێتەوە بۆ براکانم. بەکورتی دەمەوێ ئەوە بڵێم کە ئەمن تەمەنم گەیشتبووە بیست و پێنج ساڵ کە بۆ یەکەم جار قوتابخانە چووە دێیەکەمانەوە. ئەویش ئەو دەورانە بوو کە "سپاه دانش" داکەوتبوو، سوپای دانیشی لێ‌بوو. بەڵام بەهەر حاڵ لەچاو ئەو مەنتەقەیەو ئەو دەورانەی ئێمەی تێدا دەژیاین دێیەکە زیندووتر بوو، هەر بۆیە لەباری سیاسییشەوە کە حەتمەن باسی دێتە پێش ئەو دێیە نەخشی هەبوو.

**عەباس کاردۆ:** کەی، چۆن و لە کوێ دەرگای خوێندنت بەڕوودا کرایەوە؟ ئەو کەسانەی لە سەرەتاکانی خوێندندا یارمەتی‌یان داوی و دەگەڵ ئەو دنیا پڕ لە نهێنی‌یە ئاشنایان کردووی. تکایە بە وردەکاری‌یەوە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هەر وەکی باسم کرد لە دێ‌یەکەماندا قوتابخانەی دەوڵەتی نەبوو. هەر مەدرەسەی مەلاو فەقێ‌یانی لێ بوو. لەبەر ئەوەش کە بابم برا گەورەکەم ئینسانی بەدین و موسوڵمان بوون پێ‌یان خۆش بوو — بەتایبەت برایەکەم — پێی خۆش بوو ئەمن بخوێنم. نە بۆ ئەوەی ببمە سیاسی، نە بۆ ئەوەی ببمە موعەللیم بەڵکە بۆ ئەوەی ببمە مەلا خزمەتی دین بکەم. بۆیە هەر لە دێ‌یەکەی خۆمان وەبەر خوێندنێی نام، جارێکی دیکەم گێڕاوەتەوە، بەڵام پێم‌خۆشە دیسانەکەش ئەوەی بگێڕمەوە ئەمن خوێندم بووم بە مەلاو ماوەیەک مەلایەتیم کرد و پاشان لەسەر کاری سیاسی قاچاغ بووم، ماوەی یازدە ساڵێک لە کوردستانی گەرمێن و لە خودی بەغدار ئەوانە ژیام، پاشان ساڵی ١٣٥٧، وەختێک ڕاپەڕین لە ئێران دەستی پێ کردبوو بە نهێنی گەڕامەوە وڵات، پاشان کە شا ڕۆیشت و کۆماری ئیسلامی دامەزرا، ئاشکرا بووم. سەردانێکی دێ یەکەی خۆمانم کرد، میوانی ماڵە براکانم بووم. ڕۆژێکیان لەماڵی ئەو براگەورەیەم دانیشتبووین، هەر بەخۆشیی منەوە میوانێکی زۆریشی داوەت کردبوون. لەوێ بە شاهیدیی خەڵکە پێم‌خۆش بوو پێی بڵێم کە ئەمن شەرمەزاری تۆم. ئەتۆ زۆرت زەحمەت دەگەڵ من کێشا کە ڕێگایەک بگرم، کەچی ئەمن ئەو خوێندنەی کردبووم ئەوەی فێری ببووم بۆ ڕێگایەکی دیکە بەکارم هێنا. لەو بارەیەوە بەحوزووری ئەو خەڵکە داوای لێبووردنت لێ دەکەم. وەک ئینسانێکی بەڕاستی تێگەیشتو فەرمووی ڕاست بەپێچەوانە، ئەمن ئێستا شانازیت پێوە دەکەم. چونکە ئەگەر ئەو ڕێگایەت گرتبایە کە ئەمن بۆم دانابووی خزمەتی دێ‌یەکت دەکرد، بەڵام ئێستا خزمەتی میللەتێک دەکەی، خزمەتی وڵاتێک دەکەی.

بەڵێ هەرلەوێ دەبەر خوێندنێی نام دەتوانم بڵێم کێ بوو کۆمەکی کردم. حەقی خۆیەتی بڵێم پێش هەموو کەس و بەقەت هەموو کەس و بگرە پتر لە هەموو کەس هەر ئەو برایەم بوو، تەنانەت دەگەڵ ئەوەی کە یەکجار زۆری خۆش دەویستم، ـ منداڵی چووکەڵەی ماڵێ لە هەموو ماڵێکدا وایە، خۆشەویستە ـ ، منی کە دەبەر خوێندنێ نابوو و دەیویست ببمە ئەو کەسە کە ئەو دەیویست خۆشەویستتریش بووم، ئەگەر چی لەسەر هیچ شتێک بێ‌دڵیی نەکردووم لەسەر ئەوە لێشی دلوم، ئەگەر ویستبام نەخوێنم مەرەکین نەبوو لێم قبووڵ بکا.

خوێندنەکەشم داستانی خۆی هەیە، خوێندنەکە لە سەرەڵەوە بریتی بوو لە سیپارە ـ نازانم بۆ پێشیان دەگوت سیپارە ـ چونکە ئەغلەب وا بوو ئەو شتە کە بە سیپارە ناو دەبرا بریتی بوو لە دوو بەرگی چەرم، هەمپانەیەک یان شتێکی ئاوا. دەگەڵ دوو بەڕە کاغەز کە تەلقەو بێ‌یان لێ نووسرابۆوە جاروبار سوورەیەکی قورئانیشیان لێ نووسرابوو. ئەوە دەخوێندراو پاشان دەست دەکرا بە دەرسی دیکە. واتە بەرنامەیەکی ڕێک و پێکی دەرسی وا نەبوو وەک مەدرەسە کە بڵێی ئەوە پۆلی یەکەمەو ئەوە پۆلی دووهەمەو ئەوە نەوەیە. هێندێک وردە کتێب

هەبوون کە کەمێک باری دینی‌یان هەبوو. ئەوانە دەخوێندران کە بەشی زۆریشیان هەر فارسی بوون. زۆر کەمیان کوردی بوون. مەسەلەن یەکێک لەو شتانەی دەخوێندرانو زامیرن بە کوردی بوو، "ئەحمەدی" بوو. لە نووسینی شێخ مارفی نۆدێی ڕەحمەتی‌یە کە کەلیماتی عەرەبی بەکوردی مانا کردۆتەوە بۆ خوالێخۆشبوو کاکەئەحمەدی شێخی داناوە. جالیب ئەوەیە لە موقەددیمەکەشی دا بەفارسی دەڵێ:

**در این رساله به کوردی زبان    کنم لسان عرب را بیان**

**تا که فرزندم احمد بی تعب    شود دانای لغـــات عرب**

**عەبباس کارەز:** یانی هەر لەسەرەتاکانی خوێندندا ئەوانەتان دەخوێند؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ئەوە یەکێک بوو لەو کتێبانە کە دەمانخوێند. جا ئاوا دەست پێ دەکا کە دەڵێ:

**ڕەش سەرە، عەین چاوە ، بەدەن قالیبە ئیسم ناوە.**

ئەوەش شتێکی دیکە بوو کە دەمان خوێند ، دوایە ئامیلکەیەکی دیکە هەبوو کە پێیان دەگوت "ای شدە"، نەی شودە کە ئاوای دەست پێ دەکرد:

**ای شدە مخلوق ز نور خدا    پس همە عالم ز تو گشتە جدا**

بەوتەرتیبە ئەو کتێبانەمان دەخوێندو پاشان دەچووینە سەر "گلستان"و "بوستان"و ئەوانە. ئەمن قەت مامۆستایەکم نەبوو. یانی دەتوانم بڵێم لە ژیانی خوێندنی سەرەتاییدا بەدەگمەن هەڵکەوتوە کە دوو مانگان یەک نەفەر دەرسم پێ بڵێ. فەقێی لێ بوون ئەمڕۆ یەکێک لێرە بوو، سبەینێ ئەو دەڕۆیی یەکی دیکە دەهاتە جێگای. هێندێک خوێندەوارمان لەدێ‌دا هەبوون بەشی زۆریان ئاغایەکان بوون. تاقە یەک نەفەریشیان تێدا بوو کە ئەو دوایی‌یانە ڕووحی شاد بێ ئەمری خودای کرد، ناوی "میرزا سمایل" بوو. خەڵکی دێی خۆمان بوو. برادەرێکمان هەبوو "عەبدوڵڵای ئیسماعیل زادە"، بابی ئەو عەبدوڵڵایە بوو. نەکسەرن دەچووم دەرسم لەکن دەخوێند. هەتا ئەو دوایی‌یانە ، بیستوپێنج ساڵێک پێش ئێستا کە هەر پێم‌دەگوت مامۆستا. داوای لێ کردم گوتی بەخاتری خودای پێم مەڵێ مامۆستا. گوتم هەر بۆیەت لێ‌قبووڵ دەکەم چونکی مامۆستامی، بە حەقی ئەوەی کە مامۆستامی ئیتاعەتت دەکەم، دەنا ئێستاش هەر مامۆستامی. تەنانەت پێم‌خۆشە ئەوەی بڵێم – بێ ئەوەی بڵێم ئەو مامۆستایە وا بوو – ڕەنگە دەرسم لە کن زۆر مامۆستایان خوێندبێ کە دەرسەکەی خۆمیان وەکوو خۆم نەدەزانی. مەسەلەن گولستانی سەعدی ئەمن ئێستا تێدەیما ناکەم کە دەی‌زانم. بوستان ڕەنگە کەمێک سادەتر بێ، بەڵام بوستانیش هەر وا بوو. یان کتێبی دیکەی لەو بابەتە لەلای کەسی وامان دەخوێند کە پێشتر بۆخۆیان نەیانخوێندبوو.

پاشان کە ئەو مەرحەلەیەمان بەجێ هێشت ئەوجار کەوتینە سەر خوێندنی ئەو شتانە کە پێیان دەڵێن زانستە ئایینی‌یەکان. وەکوو سەرفو نەحوو بەلاغەو بەیان و بەدیع و شتی دیکە.

**هێمایس کاردۆ:** مامۆستا ئەو دەورانە چەند دەکێشێ هەتا دەچیە قۆناغێکی دیکە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو دەورانە، ئەمن دەورانی سەرەتایی‌یەکەی لێ دەردەکەم کە هەروەک عەرزم کردی بە پەرش و بڵاوی کتێبی فارسیم لە کن ئەم‌و ئەو خوێندوە. کتێبی کوردییش تەنیا ئەحمەدی‌یان تێدا بوو دەنا ئەوانی دیکە هیچیان کوردی نەبوون. بەڵام ئەوە کە دەست پێ‌دەکەن بە زانستەکان زانستی دینی یان بڵێین زانستە عەرەبی‌یەکانی کە ئەودەم دەخوێندران وا نەبوو بەرنامەی بۆ دانرابێ کە بڵێی ئەوە پۆلی یەکەو لەپۆلی دە تەواو دەبێ یان پۆلی دوازدە تەواو دەبێ. پێوەندی بەوەوە هەبوو بۆخۆت چەندەت توانایی هەیە. ئەمن بە هەشت ساڵ تەواوم کرد. ڕەنگە هەبووبێ کە بە کەمتر تەواوی کردبێ. ڕەنگە بووبێ هەرچەند ئەمن کەسم نەدیوە. بەڵام دەتوانم بڵێم لەوانەی کە ئەمن بەدەورمەوە بوون ئەمن لە هەموو کەسم زووتر تەواو کرد. هەبووە بە دە ساڵان تەواوی کردوە. بە دوازدە ساڵان. بە پازدە ساڵان بگرە بە بیست ساڵانیش. نێ وا هەبووە بیست ساڵانی ئەو دەرسانە خوێندوون. بۆ خۆم بە هەشت ساڵانم تەواو کرد. دیارە مانای ئەوە نەبووە کە ئەمن لەوانە زیرەکتر بووم، بەڵام بە هەرحاڵ کە خوێندم دوایە پێم وابوو بەسە. تەنانەت یەکێک لە براکانم کە ئەویش بەخۆشی‌یەوە ماوە زۆر قسە خۆشە. جارێکیان لێی پرسیم گوتی ئەرێ چەندەت ماوە تەواو بێ؟ گوتم ناتوانم بڵێم چەند، بەکەیفی خۆمە، دەتوانم بیست ساڵی دیکەش بخوێنم. ئەم کتێبە تا ئەو کتێبە دەتوانم وەری گرم بی‌خوێنم. دەش‌کرێ زوو لێ‌ببمەوە. کردیە گاڵتەو گوتی کوڕە بەشی کەرو دووقڕانەکەت خوێندوە. ئەوە چیە ڕۆژێک لێرەو ڕۆژێک لەوێ. دانیشەو بۆخۆت داسەکنێ. ئیدی پێموایە ساڵێک یان ساڵ و نیوێک دوای ئەوە بوو کە دیارە بۆخۆشم ئیحساسم کرد پێویستە وازی لێ بێنم هەتا کەنگێ. هەر بۆیە ساڵی ئێ-وەرسووڕا وازم لێ‌هێنا.

# خوێندن‌و حیزبایەتی

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا جەنابت یەک لەو خەباتکارو سیاسی‌یانەی کوردی کە لەحوجرەدا دەستت بە خوێندن کردوەو دەگەڵ هەردوو فەرهەنگی دینی‌و نادینی(لائیک) ئاشنای. پێمخۆشە بۆخۆت ڕادەی شوێن‌دانانی دەورانی خوێندنی حوجرە لەسەر داهاتووی ژیانی سیاسیت باس بکەی.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن پێموایە ئەومان دەبێ کەمێک جیددیتر بگرین. لە کوردستان هەتا چل پەنجا ساڵ پێش ئێستا بیری نەتەوەیی ئەگەر لە چوارچێوەی شاران تێ‌دەپەڕی، لە حوجرەوە سەری هەڵ‌دەدا. بێجگە لەوە ئەگەر تەماشا بکەی سەرهەڵدانی بیری نەتەوایەتی زۆر کۆنتر لەوەشە. ئەدی ئەودەم کێ بڵاوی کردۆتەوە؟ ئەحمەدی خانی بڵاوی کردۆتەوە. حاجی قادری کۆیی بڵاوی کردۆتەوە. مەلای گەورەی کۆیە بڵاوی کردۆتەوە.

**عەباس کاردۆ:** ئەدی جزیری؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** جزیری نازانم ڕەنگە ئەو ئەختەی نەبووبێ. ئەوانەن کە بڵاویان کردۆتەوە کە هەموویان ڕێبەری ئایینین. هەموویان مەلان. یانی ڕووناکبیری کورد لە دێهات‌و لەحوجرەی بووە. شەرت نیە هەر لە دێهاتی بووبێ ، لە شاریش بووە بەڵام لەحوجرەی فەقێ‌یان بووەو لە مزگەوت بووە. جا نی من بەشێوەیەکی تایبەتیتر بوو. لە گوندەکەی مە لە زەمانی دێمۆکڕاتی‌دا، دیارە ئەوەی ئەمن وەبیری دێتەوە هەمووی بیستنە، زۆر کەمی دەبینەو زۆر کەمیم لە بیرە. لەبەر ئەوەی ئێمە لە دێ‌یەکی چەپەک بووین‌و لەپاشان عومریشم زۆر کەم بووە. حەوت ساڵ شتێکی ئاوا تەمەنم بووە. بەڵام ئەو گوندەی ئێمە هەر لە زەمانی دێمۆکڕاتی‌دا یەکێک لە بنکەکانی پێشمەرگەو ئەندامانی حیزبی بووە. ئەمن دوایە بۆم دەرکەوت کە دوو برای گەورەم هەر دووکیان ئەو وەختی ئەندامی حیزب بوون. لە پاشان ئاغای دێ‌یەکەمان کە ئاغاکان شەش برا بوون یەکێکیان بە ناوی ئەحمەدئاغا لە ئەفسەرانی دێمۆکڕات بوو. پلەی ئەفسەریی درابوویە. وەک شتێک بۆ دڵخۆشکردن دەیان دانێ. بەڵام بەڕاستی پیاوێکی ڕووناکبیرو خوێندەوار بوو. بە نیسبەت ئەودەمی زۆر زیرەک‌و زانا بوو. لە دێ‌یەکەی مە حیزبایەتی دوای جمهووریش زۆر باو بوو. مەسەلەن لە بیرمە دەگەڵ ئەوەی ئەو ئاغایە زۆر دەوڵەمەند نەبوو بەڵام ڕادیۆی کڕیبوو تەنیا بۆ ئەوەی ڕادیۆی کوردیی باکۆیەی پێ بگرێ کە دیارە ئەو شتانە ئەمن دواتر

تووشیان گەیشتم. ئێوارانە کە نازانم سەعات چەند دەستی پێدەکرد، ئەو ڕادیۆیەی دەکردەوە بە دەنگێکی زۆر بەرز، تەواوی پیر و گەنجی دێ کۆ دەبوونەوە. دیوەخانی ماڵەکەی بەسەر سەر بانی مزگەوتییدا دەڕوانی. هەر بۆیە خەڵکەکە لەسەربانی مزگەوتی کۆ دەبوونەوە هەتا گوێیان لێ بێ کە بە ناوی حیزبی دێمۆکراتەوە قسەی دەکرد. ئێمە دواتر — کە دیارە ئەو دەمی زۆر منداڵ بووم — هەموو سروودەکانی زەمانی جمهووریمان لەبەر کردبوو. تەنانەت پێش ئەوەی دەرسی مەدرەسەی بخوێنین فێریان کردبووین بڵێین :

**نیشتمانم ڕەنگینە، بەهەشتی سەرزەمینە  خاکم وەکوو ئاڵاکەم ڕەنگ سوور و سپی و شینە.**

یان مەسەلەن سروودی لاولن، سروودی لاواتمان دەخوێندەوە:

**ئەجەل وا لە لوولەی تفەنگی مەدا  ڕەها نابێ دوژمن لە چەنگی مەدا**

پاشان "ئەی ڕەقیب" هاتەو "خوایە وەتەن ئاوا کەی" بوو. یان ئەو شێعرە بەناوبانگەی قایق ئێکەس کە دەڵێ:

**ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیر کەوتەوە  بەختی دیلییە ئەسارەت پێ بە تۆ تۆ گۆتەوە**

**من لە زیکرو فیکری تۆ غافڵ نەبووم وا تێنەگەی  هەبوو تێهەڵناو زیلەت تۆی لەبیر بردوەتەوە**

تەنانەت یەکێک لە فەقێیەکانی دێ کە دوایە بوو بە مەلاو بە شاعیرێکی ناسراو، مەلا "کەریمی فیدایی" بۆخۆی شێعری نیشتیمانیی دانابوون:

**وەتەن لەبەر دڵانە پڕ لە بۆنی گوڵانە  دەرمانی دەردەداران دەفعی هەموو غەمانە**

خۆلاسە هەر لەوێڕا بەوە گۆش کراین. ئەمن لەبیرمە لەو دێیەی مە کەس هەبوو کە ئەندامی حیزب نەبێ، بەڵام کەس نەبوو کە موخالیفی حیزب بێ. ئەوش بۆخۆی جێی سەرنج بوو کە هەرچەند ئاغاو ڕەعیەتی‌یەکە بەو سەروپڕتە نەبوو کە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستان هەبوو، بەڵام بەهەرحاڵ ئاغاو ڕەعیەت هەبوون. ئاغایەکان بۆخۆیان لە تێکۆشەرانی حیزبی دێمۆکرات بوون. تەنانەت ئەو ئەحمەدئاغایە کە باسم کرد برا گەورەی ئاغاکان بوو، بۆخۆی وەختێک ئەندامی کۆمیتەیەک بوو بە ناوی "گسب" واتە گەورکەو سوێسنێ و بانە. ئەو کۆمیتەیە سێ ئەندامی هەبوون. ئەوەی گەورکان ئەو بوو. ئەوەی سوێسنێیان یەکێک بوو کە حەتمەن ناوت زۆر بیستوە بەناوی مەلا باقی، ئەوەی بانێ کە ئەویش هەر ئاغا بوو، مەجیدخان بوو لە ئەمەشیرێ دادەنیشت. یانی ئەوانە ئەخشیان لە تێکۆشانی حیزبیدا هەبوو. ئەمن هەر لە دێیەکەی خۆمان لەسەر دەستی ئەو میرزا سمایلەی باسم کرد دەعوەت کرام بۆ ڕیزی حیزبی دێمۆکراتو لەسەر دەستی ئەو یەکێک لە ئاغایەکان — ئادرەسی نادەم چونکی زیندوویە — لەسەر دەستی ئەوانە ناوم لە دەفتەری حیزبدا نووسرا.

داستانی بوون بە حیزبی‌یەکەشم وەک پێخۆش بوون پێمخۆشە بگێڕمەوە. ڕەفیقێکم هەبوو لە تەمەندا، ڕەنگە سێ یان چوار ساڵ لەخۆم گەورەتر بوو. ئێستاش هەرماوە. ئەمن زۆر منداڵ بووم بەڵام لەسەر پێ بووم.

ڕۆژێکیان لەسەر خواجەنشین – پێی دەڵێن خواجەنشین – لەبەر دەرگای مزگەوتێ ڕاوەستابووین. گوتی داخڵ بووی؟ گوتم داخڵی چی؟ گوتی چۆن داخڵ نەبووی؟ گوتم باشە داخڵی چی؟ گوتی داخڵی حیزبی دێمۆکراتمان بیستبوو، بەڵام ناوی حیزب بۆ یەکەم جار بوو وەبەر گوێم دەکەوت. گوتم حیزبی چی؟ گوتی حیزبی خۆمان. گوتم ئاخر حیزبی خۆمان چیە؟ گوتی چۆن حیزبی کوردان. گوتم با پێم خۆشە، بەڵام نابێ بزانم چیە؟ گوتی ئەگەر پێت خۆش بێ دەتبەمە کن یەکێک لەخۆم پتر بزانێ. بردمیە لای ئەو کەسانە کە مەسئولیەتی حیزبی‌یان لە دێ‌یەکەدا هەبوو کە یەکێکیان عەرزم کردی ئەو میرزا سمایلە بوو، یەکێکیشیان لە ئاغایەکان بوو. لەوێ قسەیان بۆ کردم. ئەوە حیزبی دێمۆکراتەو کۆماری کوردەستانی دامەزراندوە لەو قسانە. لەوێ وەکوو ئەندامی حیزب ناویان نووسیمو پێم وایە مانگانەی حیزبیشیان لێ‌وەرگرتم.

**هەیاس کلودۆ:** مامۆستا ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی چەند؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** ئەوەیان سەیرە. ئەمن لە بیۆگرافیی حیزبی‌دا نووسیومە ساڵی سی‌ودوو بوومەتە حیزبی، بەڵام ئەوە زستانی ١٣٣٠ بوو. یانی عومرم لە باشترین حاڵەت دا سێزدە ساڵ بوو کە بوومە ئەندامی حیزب.

**هەیاس کلودۆ:** یانی لە ساڵیشیان نەدەپرسی، واتە تەمەن؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** نەخێر لەجی‌دا ئەو وەختی لەو دەوروبەرەی شتی وا نەبوو. باوەڕم پێ بکە ئەمن پاش کۆنگرەی دووەم بۆ یەکەم جار بەرنامەو پێڕەوی نێو خۆی حیزبم دیوە ساڵی ١٣٤٣ ئەوکاتی ئەمن بۆ یەکەم جار شتێکم دیوە کە پێی بڵێن پێڕەو پرۆگرامی حیزب. ئەو وەختی هیچ حیسابی ئەوانەیان نەدەکردو ئەمنیش منداڵێکی لەسەرێ بووم دەشم‌خوێندو درێژیش بووم بەقەت ئێستا درێژ بووم. کردیانمە ئەندامی حیزب.

**هەیاس کلودۆ:** هەر لە دەورانی خوێندن لە دێو لە خزمەت مامۆستایانی ئایینی دەمێنیەوە. لە حوجرە جگە لە دەرسی دینی‌و باسی ئەخلاقو چاکەو خراپە چی دیکە دەهاتە بەر باس؟ ئایا بە پێی کەسایەتیی مامۆستاو فەقێکان باسەکانیش دەگۆڕان یان وەک شتێکی جێ‌کەوتوو لە هەموو حوجرەیەک وەک یەک وا بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** ئەوەی لە قۆناغی یەکەمدا هەبوو ڕەنگە تەنیا فەرقی لە یەک شتدا کردبێ. مەلایەک مەلای چاکە. فەقێیەک فەقێی چاکە، زیاتر دەزانێ‌و دەرسەکەی چاکتر ڕەوان کردوە. دەنا سیستمێک هەبوو، سیستمێکی بڵێین لەقالبدراو. هەموو وەک یەک بوون. مەسەلەن هەرکەس دەستی پێ‌دەکرد بە یەکێک لەو دووانە دەستی پێ دەکرد: یەکیان پێیان دەگوت تەسریفی زەنجانی، عیلمی سەرف بوو.

ئەوی دیکە پێیان دەگوت عەوامیلی جورجانی، عیلمی نەحو بوو. ئەمیان وپێش دەخست یان ئەویان وپێش دەخست فەرقی نەبوو. لە پاشان دەچووە کتێبێکی دیکەو یەکی دیکەو یەکی دیکە. بەو تەرتیبە دەی‌خوێندو بە دەگمەنیش هەڵ نەدەکەوت دوو کەس، دوو فەقێی یەک دەرسیان هەبێ. تەنانەت ئەگەر کتێبەکەی دەیان‌خوێند یەکیش بایە، هەر کەس بە تەنیا دەرسی خۆی دەخوێند. یەکێک لە پێشەوە بوو، یەکێک لە دوایە. چونکە دەرسی بە کۆمەڵ هەر نەبوو. بۆیە مەلایەک ئەگەر زۆری خۆ ماندوو کردبایە دەی‌توانی چوار فەقێیان ڕابگرێ. دەبوو ڕۆژێ دوو دەرسانیان پێ بڵێ. عادەتەن ڕۆژێ هەر دوو دەرسیش بوو. یەکیان بەیانی‌و یەکیان پاش نیوەڕۆیە. دەرسەکانیش بەپێی زیرەکی‌و نازیرەکیی فەقێکان لەنێو سەعاتەوە دەی‌گرت هەتا سەعاتو نیوو دوو سەعات. جاری وا بوو مەلا بەدەستی فەقێیەکەوە شێت دەبوو. ئەمن دیومە مەلا لەداخی فەقێی بە دیواری هەڵ‌گەڕاوە. کەلیمەیەک هەبوو کە مانای گەورەی دەدا. فەقێ پرسی گەورە بە چ مانا؟ ئەویش گوتی گەورە بەو مانایەو بە دیواری هەڵ‌گەڕاو جنێوێکیشی پێ‌دا. لەپاشان دیارە دوای ساڵەکانی سی‌و هەشتو سی‌و نۆو چل کە مەدرەسەیەکی علوومی دینی لە مەهاباد کرایەوە کە ئێمەش لەوێ بووین، مامۆستایان هێنابوو دەرسی ئەدەبیاتی فارسیی پێ دەگوتین. هێنابوویان ئینگلیسی پێ دەگوتین. تی وا هەبوو لە هێندێک مەدرەسە پیازیاتیان دەگوت. دەنا ئەوی دیکە کتێبەکە هەمووی یەک بوو.

بەڵام لە مەدرەسەکانی کوردستان پیاو حەق بڵێ مزگەوتەکانی کوردستانی ئێران زیندووتر بوون بە نیسبەت بەشەکانی دیکەی کوردستانەوە. لەوێ مەسایلی سیاسی دەکرێ بڵێین هەمیشە هەبوو. ڕەنگ‌بوو لە حوجرەیەک‌دا کە چەند کەسی لێ‌بوون هێندێکیان لە کارە سیاسی‌یەکە ئاگادار نەبووبن ، بەڵام حەتمەن تێیاندا هەبوو. ئەمن زۆر جارم ئەوە گێڕاوەتەوە لە زەمانی فەقێیەتیدا ئەمنو مەلا ئاوارە هەردووکمان حیزبی بووین هەرکەسە لە جێی خۆی. هەرچی ئەسراری ژیانم هەبوو هەموو شتێکم دەگەڵ باس دەکرد. بەڵام دە ساڵیش پێوە خوا کە ئاشکرا بوو هەر دووکمان حیزبیین. ئەوەندە حیزبایەتی‌و نهێنی‌کاری بەقووەت بوو کە ئەوانەمان باس نەدەکرد. مەبەستم ئەوەیە بڵێم بیری نەتەوایەتی لە حوجرەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان قەت نادیار نەبووە هەمیشە هەر هەبووە. ڕەنگە بەشێکیشی لەبەر ئەوە بووبێ کە لەلادێ هەر ئەوان خوێندەوارو ڕووناکبیر بوون. لە لایەکیش لیباسی وان زۆری لێ‌نەدەپرسرا. دیارە دوایە لیباسی وانیش قاچاغ بوو، بەڵام پێشێ وا نەبوو. مەسەلەن سایلی شەریفزادە وەختێکی لە ناوچەی بانێ بوو ناوی مەلا عەزیز بوو. بەڵام لە مەنتەقەی سەردەشت ناوی مەلا ڕەحمان بوو. کاک حەمەدەمینی سیراجی یادی بەخێر کە ئێستا دەڵێن نەخۆشیشە ئەویش لە لای ئێمە بوو ناومان لێ نابوو مەلا حەسەن. هەر بە مەلامان ناو دەبرد. زۆر لە کادرە حیزبی‌یەکانی شاریش کە بە دێهاتی‌دا دەگەڕان مەندیلێکی سپی‌یان لەسەر دەنا وەک فەقێ دەگەڕان چونکی

خەڵک کەمتری لێ دەپرسین و حورمەتیشیان دەگیرا. بەکورتی، بەرنامە دەرسییەکە یەک بوو بەڵام بیرو باوەڕە سیاسی و نەتەوایەتییەکە لەزۆر مزگەوت و حوجرانەدا هەبوو مەلاو فەقێ تێدا بوون. جاری وا بوو مەلا موخالیف بوو فەقێ هەبوون حیزبی و سیاسی بوون. جاری وا هەبوو فەقێ بێگانە بوون بەڵام خودی مەلاکە حیزبی بوو. ئەوانە هەموو هەبوون. لەسەر یەک شتەکە وا بوو کە بەزیرەکی و نازیرەکیی مەلاو فەقێیەکە فەرقی دەکرد بەڵام سیستەم دەرسییەکەی لە هەموو جێیەک وەک یەک بوو.

**هیوای کاردۆ:** مامۆستا بەڕاستی من هەم بە خوێندنەوە هەم بۆخۆشم دیتوومە زۆر فەقێ و تەنانەت مەلای دەرستەواوکردووش شتی وایان گوتووە کردوە کە لە ڕادەی باوەڕمەندبوون بە ڕەوشی خوێندن و پێگەیاندنی نێو مزگەوتی کەم کردۆتەوە. مەبەست ئەوەیە داخوا شێوەی خوێندن لە حوجرەو مزگەوت ئەو دابو شوێنەی کە دەبوایە پێڕەوی لێ بکرێ بە دڵی هەموان بوو یان هەر بە ناچاری درێژەیان دەدا؟ نموونەی خۆت چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم خۆشە ئەوەی کە فەرمووت نموونەیەک لەوە بڵێی کە ئەوە دەگەڵ ئەوی ئەیـ دەخوێندەوە یانی چی، مەبەستم ئەوەیە بڵێم ئەتۆ چیت دیتوە؟

**هیوای کاردۆ:** دەمەوێ ئەوەی بڵێم کە بۆخۆم مەلای وام دەناسی کە لە حوجرە دەرسی دەخوێند بەڵام لە دەروە دەگەڵ دین و باوەڕمەندبوون بێگانە بوو و ئەوەشی بەکردەوە نیشان دەدا.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** با قسەیەکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە قسەی خۆش هەر خۆشە. ئەمن دەمخوێند لە دێیەک. ئەو برا گەورەیەم هات بۆ سەردانم. کە هات لەو وەختەدا چەند مەلاو فەقێی دەوروبەریش میوان بوون کە یەکیان ڕووحی شاد بێ پیاوێکی زۆر باش بوو بەڵام لەوەی موهیمتر پیاوێکی سەیر قسەخۆش بوو. کاکم کە هات بەرماڵێکی بۆ من بە دیاری هێنابوو. ئەو مامۆستا قسەخۆشە بەرحەمەت بێ گوتی وەڵڵا بەرماڵی بۆ فەقێ بە دیاری بەری وەکوو زوڕنایە بۆ خەیاتی بە دیاری بەری وایە. ئاخر فەقێ و بەرماڵ؟ بۆ ئەوەی ڕاستگۆیانە جوابم دابێتەوە دەبێ بڵێم لەسەر یەک فەقێش ئینسان بوو. فەقێش گەنج بوو وەکوو خەڵکی دیکە. ڕاستە ڕیعایەتیان دەکرد. ڕاستە بیرو باوەڕی دینییان تێدا بەقووەتتر بوو، بەڵام هەموو ئیحساساتێک کە دە لاوێکی دیکەدا هەبوو دەویشدا دەیتوانی هەبێ. دیارە ئەو بیروباوەڕە دەهێندێک کەسدا بەهێزو دە هێندێکی دیکەدا لاواز. مەسەلەن ئەمن لە بیرمە ڕەفیقێکم هەبوو، کە بەعێنێکی مامۆستاشم بوو، دەی گوت: خودا حەقی خودایەتیی بەسەر منەوە نیە. لەوەتا خودا خودایە تەمێنێکی نەداوە بە من، منەتی چیم بەسەردا دەکا؟ پاشان تەمەنی لە خوارەوە بوو دیتم دەانی کردوونەوە. گوتم ئەوە چیە؟ گوتی ئەوە لە مننەتی خودای چاکترە. قسەی ئاوای دەکردن. بەڵام لەسەریەک سیستمی خوێندنەکە کە ئەو وەختی شتێکی دیکەی لەبەرابەردا نەبوو، شتێکی دڵخواز بوو بۆ ئەو کەسانەی دەیانەویست بخوێنن. هی واش هەبوو پێی

کەوتبوو. باوەڕم پێ بکە هەبوو بیست ساڵانی خوێند، پاش بیست ساڵان خوێندەواریی پەیدا نەکرد. ئی واش هەبوو زانایەکی لێ دەردەچوو. دیارە لە ئاخرو ئۆخرییەکاندا هێندێک شتی وا هەبوون کە پیاو حەزی لێ نەدەکردن. مەسەلەن ـ با هەر شتی خۆم بگێڕمەوە ـ ئەمن لە هەموو ژیانی خۆمدا یەک جارم کەوای درێژ دەبەر کرد. کە بووم بە مەلاش هەر کەواو پانتۆڵم دەبەر دەکردن. جارێکیش عەبایەکیان بەزۆری بەسەردا بڕیم. لە مەدرەسەی علومی دینیمان دەخوێند دەگەڵ هەموو فوتابییەکانی دیکە کەوایان بۆ بە دروستکردن دلێ دەنا ئەوەشم هەر دەبەر نەکرد.

یان مەسەلەن ئایندەی مەلایەتیم خراپ دەدیت. لەبیرمە مامۆستای بەوەج لە عەینی حاڵدا تێکۆشەری سیاسی، مامۆستا مەلا ئەحمەددیتی کەوکەبیڕاد کە لە خزمەتیم دەخوێندو دیارە هەر وەک دوو ڕەفیقی سەمیمی وا بووین. جارێکیان هات گوتی ئەتۆ بۆ ناخوێنی؟ بۆ سەعی ناکەی؟ جا ئەمن سەعیم نەدەکرد، چونکە بۆ ئەگبەتی کەمێک زیرەک بووم و دەرسەکەم هەر دوای خوێندنی جارێک دەخوێندەوەو ئیدی کتێبم وێنک دەناو کارم بە خوێندنێ نەبوو. گوتم بۆ ناخوێنم ئەوە نیە دەخوێنم؟ گوتی نا ئەوە کەمە. ئەتۆ ئەگەر بخوێنی دەبی بە مەلایەکی چاک. گوتم باشە ئەگەر ببمە مەلای چاکیش دەبم بە تۆ. ئەتۆ بووی بەچی؟ چونکە بەڕاستی وەزعێکی زۆر خراپی گوزەرانی هەبوو. لەبیرمە ئاردی ڕۆژێیان نەبوو کە بیکەنە هەویر. چەند جارم ئاگا لێ بوو کە خێزانی دەچوو لە ماڵێکی دوو سێ‌( یەک سێ، دوو کیلۆیە. عەباس) ئاردی قەرز دەکرد. جا ئایندەکەی ناڕوون بوو. هەر بۆیە ڕەنگە زۆر کەسی وەک من بووبن کە ئولفەتیان پێیەوە نەمابوو، حەزیان لە ئیدامەدانی نەبوو. دەنا وەکوو فێربوونو شتی وا پێم وا نەبوو کەس پێی ناخۆش بووبێ. ئەمن ئێستاش شانازیی پێوە دەکەم چونکی بە چاکوخراپ ـ یەکێک پێی باشە یەکێک پێی خراپە ـ بەڵام ئەوەی فێری بووم لەوێ فێری بووم و لە هیچ زانکۆیەکم نەخوێندەوە. کەوابوو چۆن دەتوانم پێی بڵێم شتێکی خراپە؟ بەتایبەت کە دەگەڵ سەلیقەی من باش دەهاتەوە. ئەو دەورانەش کە ئەمن دەمخوێند، ئەو دەورانە نەبوو کە بەجارێک لە مزد کەوتبێ. مەلار فەقێ حورمەتی زۆریان هەبوو. هەستی من ئەوە بوو کە لەلای خەڵکە ڕێزێکی زۆرم هەیە. ڕەنگە بەشێکی لەبەر ئەوە بووبێ کە دەیانزانی بیرو باوەڕی سیاسییشم هەیە. با ئەوەی نەشارمەوە ئەوەشی تێدا هەبوو. بەڵام هەروەکوو مەلاش پیاوماقووڵی دێ بووم. یانی لە هەموو کەس گەورەتر بووم.

**عەباس کاکۆ:** مامۆستا هەزار باسی شتی زۆر خۆش دەگێڕێتەوە لە دەورانی فەقێیەتی کە بۆخۆی تێیدا بووە. بۆ وێنە فەقێی جەوان لە دێی داری خەڵکیان دزیوە شتی زۆر خۆشی دیکەش. لە لای ئێوە شتی وا هەبوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە زۆر مەشهوورە کە دەڵێن کابرا وشتری لێ ون ببوو. ئەویش زۆر نیگەران بوو. گوتیان بابە بۆ ئەوەندە نیگەرانی؟ سبەینێ دێتەوە ئیدی. وشتر دەعبایەکی هێندە زەعیف نیەو لەپاشانیش حەیواناتی دڕندە لەو مەنتەقەیە زۆر کەمە. کابرا گوتی لەوەی ناترسم بەڵام لەوەی دەترسم فەقێ بە زەفتی ڕەزا(ظن رضا) بچن بیخۆن. چونکە بە تەنیشت بێستانی هەر کەسدا ڕۆیشتبان نەک وەک دزی بەڵام دەیان گوت کاکە ڕەنگە ئەو کابرایە بۆ فەقێیان ڕازی بێ. هەر بۆیە پەلاماریان دەداو دەیان خوارد. یان شتێکی دیکە کە کەیفی خۆتە باوەری دەکەیەوە یان نا، بەڵام ئەو مامۆستا مەلا موحەممەدی شەڵماشی برای کاک مستەفای شەڵماشی لە 'بێشاسپ'یان دەخوێند (گوندێکە لەناوچەی سەردەشت. هەیاس). ئەو مامۆستای من بوو. شەوێ وەختی نوستنێ تازە ئەووەڵی هاوینێ بوو. خەیارو ترۆزیو تەرەکاری پێنەگەیشتبوو. باسیان کرد گوتیان بێستانی ماڵێ مستەفا چۆنەی لە شێوەسەڵێ – بیاونک بوو 'مستەفا چۆنە'یان پێ دەگوت – چاک پێ گەیوە. هەستان چوون بەو شەوێ. ئەوە ماڵ نوستوون. خۆیان ڕووت کردبۆوە بە تونێ کراسەو دەرپێیان چوون بۆ شێوەسەڵێ بۆ خەیاردزینێ. کە دەچن تەماشا دەکەن ئەو ماڵە حەیوانێکیان بە گیابڕ مردوە، خەریکی گرویننیی بەخەبەرن. ئەوە ئەوان خەریکی گاگروینێو ئەمانیش دەچنە نێو بێستانی بۆ خەیارخواردنێ. لەوێ دەڵێن بەخوا حەیف خوێمان پێ نیە.مامۆستا مەلا موحەممەد دەڵێ هیچ نیە، بە دەلاقەی‌دا دەست درێژ دەکاو دەڵێ دا هێندێکمان خوێ بدەنێ خوێ. ئەوانیش بە سەرسوڕمانەوە دەڵێن ئەوە چیە؟ دەڵێ بۆ وا حەبەساون خوێمان دەنێ خوێ. دەڵێن یانی چی ئێوە کێنو چیتان دەوێ؟ دەڵێ کوڕە بۆ حەبەساون؟ هاتووین خەیاران بخۆین خوێمان پێ نیە. ئەویش مستەفا چۆنە دەڵێ وەڵڵاهی وەدەر ئەکەون هەموو پشتێو بە بەردان دەشکێنم سەگباب. مامۆستا دەڵێ وەڵڵاهی قەحبەباب دەنگت لەبەر بێتە دەر هەرچی خەیاری ئەو بێستانەیە پێتدا دەدەم. لەپاشان کە دەردەکەوێ فەقێن، بانگیان دەکەنو چایان بۆ لێ دەنێنو خەیاریان بۆ دادەنێن.

**هەیاس کاردۆ:** وا بزانم تۆ گریت بەشێعرو دنیای ئەدەب هەر لەو ساڵانەڕا سەری هەڵدا. داخوا بۆخۆشت شێعرت هەبوون یان هەر تۆ گریت بە شێعری شاعیران هەبوو؟ لەوانە شێعری کێ زۆر کاری تێ دەکردیو بۆ لای ئەو دنیایەی رادەکێشای؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەکی عەرزم کردی دەکرێ بڵێم جگە لە شێعری فۆلکلۆریو گۆرانیو ئەوانە، یەکەمین شێعرەکانێ کە لەو دێیەی ئێمەدا کەوتنە سەر زارو زمانانو لەبەر کران شێعری نیشتیمانی بوون. بەدوای کۆماری کوردستاندا بوو. لەو بارەیەوە مامۆستاو ڕێبەری ئەسڵی هەر ئەو مامۆستا مەلا کەریمی فیدایی‌یە بوو کە هەم بۆخۆی شاعیر بوو، – دوایە بوو بەشاعیرێکی مەشهوور– هەم ئەو شێعرە نیشتیمانی- یانەی کۆ دەکردنەوەو هەم ئەندامی حیزبو مەسئوولی حیزب بوو لە مەنتەقەدا. بەڵام پێویستە لەسەر دوو

بەشی شێعر قسەبکەم، یەکیان شێعری کوردی‌یە، یەکیان شێعری فارسی‌یە. ئەوەی ڕاست بێ ئێمە زیاتر دەگەڵ شێعری فارسی ئاشنا دەبووین، هەرچەند خۆ لە دێهاتی فەت کتێبێکی وات دەست نەدەکەوت کە بڵێی ئەوە کتێبی شێعری‌یە دەی خوێنمەوە. "بوستان" ت دەخوێند هەمووی شێعر بوو. کتێبێکی دیکەمان دەخوێند بە ناوی "پند نامە عطار" هەمووی شێعر بوو. "گلستان" دەخوێندرا بەشێکی شێعر تێدا بوو. یان کتێبی دیکە کە دەست دەکەوت شێعری فارسیی تێدا بوو. بۆ ئەوەی داخوا ئەمن شێعرم گوتوە یان نا، وا باوە دەڵێن "کورد هەمووی شاعیرە". دەی باشە ئەمنیش هەر کوردم. کەوابوو ئەمنیش دەبێ شاعیر بم. ئەوەی بە شێوەی گشتی پێی دەڵێن شێعر، ئەمن زیاتر لە چوار هەزار شێعرم هەبووە. بە دەیان جار هەڵکەوتوە شێعرێکی درێژم نووسیوە بۆ دەرویەرم خوێندۆتەوە دەکووڕم هاویشتوە. بۆ خۆم ئەم دەویست ببمە شاعیر. چونکە دەمگوت شاعیری چاک نیم با شاعیری خراپیش نەبم. هەرچەند لەباری وەزن و قافیەو ئەوانەوە یەک شێعرم نەگوتوە کە لە شێعری شاعیران بێبێتەوە. ئێستێش هەروام. زەوقی من بۆ شێعر وەک تەرازووی میلی وایە. با کەمێکیش خۆهەڵکێشانی تێدا بێ، بەڵام دەتوانم سابیتی بکەم. لە نێو هەزار شێعردا تاقە یەک حەرف کەم و زیاد بێ زەوقی من قبووڵی ناکا. یەکێک لە شاعیرەکان پێی دەگوتم ئەتۆ وەک کامپیوتێر وای، زیهنت غەڵەت قبووڵ ناکا. مەسەلەن پیاوی وەک "خاڵەمین" ی شاعیرجارێکی داتیشتبووین شێعرێکی خوێندەوە. گوتم بابە ئەو نیوەیان لەنگە. دوایە هەر خوێندیەوە، خوێندیەوە خوێندیەوە هەر لەنگ بوو. گوتم ماڵت خەرا ئەمە ئەتۆ بۆخۆت خراپی دەخوێنیەوە. ئەو شێعرە نابێ لەو وەزنەدا بخوێندرێتەوە. گوتی با بۆت باس بکەم. ئەوە دۆستێکم ناردبووی کە کووپەی بۆ بنێرین بۆ ئەوەی ترشیاتی تێدا بنێتەوە. ئەمنیش بۆم ناردو شێعرێکیشم دەگەڵ نووسی . نووسیم:

ئەوا بۆم ناردی کووپەو نەی‌شکێنی          ئەگەر بیشکێنی لێرە دەمشکێنن

گوتم مامۆستا شێعرەکە ڕاستە بەڵام ئەتۆ خراپی دەخوێنیەوە، ئەتۆ وات نەنووسیوە. گوتووتە:

ئەوا بۆم ناردی کووپەو نەی‌شکێنی          ئەگەر بیشکێنی لێرە دەمشکێنن

گوتم وەزنەکەی ئەوەیە (بەداخەوە لە نووسیندا جیاوازی‌یەکە باش دەرناکەوێ) . گوتی یەکوو ماڵێ بابت خراپێ. ئەمن چووزانم ئەتۆ بە تەرازووی میلی هەڵی‌دەکێشی. قەپانی من نیو سیەی ناخوێنێتەوە. یانی لەباری وەزن و قافیەوە شێعری مەوزوونم زۆر گوتوون بەڵام پێم وا بوو لەباری ماناوە شتی تازەم پێ نیە. شتی جوانم پێ نیە، بۆیە نەمدەهێشت بڵاو بنەوە، دیارە هەمن لەملاو لەولا چاپیش بوون. دۆستێکم هەیە ڕەنگە وەختێکی ڕاستیم لێ بڵێ. ئەوە خۆشە بۆت بگێڕمەوە. ڕەحمەتی "گیوی موکریانی" م بۆ یەکەم جار کە دیت هەم ئەو ناوی منی بیستبوو هەم ئەمن ناوی ئەوم بیستبوو. داوەتی کردم بۆ ماڵێ. لەوێ دیوانێکی دەستخەتی خۆی بۆ هێنام کە شێعری شاعیرانی تێدا کۆ کردبوونەوە. هەرلەو ماوەیەدا کە چاومان لێ دەکرد دوو غەزەلی

منی تێدابوون بە دوو ناوی جیاواز، بەڵام پێیەتە گوت ئەوانە هی منن. دەنووسی جاروبار لێیان دەدزیم. هەر پارەکە دۆستێکم بۆی باس کردم گوتی فلانە کەس شێعرێکی تۆی چاپ کردوە دەفلان کتێبی دا. گوتم پێم‌خۆشە بی‌بینم. دوایە هەر بۆخۆی بۆی هێنام تەماشام کرد شێعرەکەی منی بەناقیسی چاپ کردوە کە بە فارسییش بوو. ئەوی کە چاپیشی کردوە غەڵەتی تێدابوون. گوتم پێی بڵێ ئەوانی دیکەی پێ نائێم بەڵام ئەمانە ئەو غەڵەتانەیان تێدایە یا ئیسلاحیان بکا. شێعرەکە بیستو چەند بەیتێک بوو، ئەو پێنج شەشێکی لەبیر مابوون چاپیان بکا. ئەمن شێعرەکانم ڕانەگرتوون خۆم لێ بەساحێب نەکردوون. هەرچەند نی وا هەبوون پێشیان جوان بوون.

لەبارەی ئەوەوە کە شێعری کێم پێ باش بووە. ئەمن وەکی لە هەوەڵەوە عەرزم کردی دەگەڵ شێعری فارسی ئاشنا بووم. بێ زیادەڕۆیمان دەکرێ پێت بڵێم وەختێک هەموو دیوانی "حافز"م لەبەر بوو. شێعرەکانی "گلستان"م هەموو لەبەر بوون نی "بوستان"ی کە هەمووی پەند و مەسەل بوون، هەمووم لەبەر نەبوون. بەڵام هەرجارەی شێعرێک خوێندرابایەوە، ئەمن بەدوویدا پێنج شەشێکم دەخوێندنەوە. زۆر بەئاسانی دەکرێ بڵێم من چەند سەت هەزار شێعر(بەیت)م لەبەر بووە. ئەوەندەم زەوقی شێعری هەبوو. جا لەوانەدا دیارە ئینسان شێعری جۆراوجۆر دەخوێنێتەوە. دواتر کە دەگەڵ شێعری شاعیرە کوردەکان ئاشنا بووم نی زۆربەیانم خوێندۆتەوە. بەڵام گۆش‌کرانم بەو شێعرە نیشتیمانی‌یانەو شێعرەکانی مامۆستا مەلا کەریمی فیدایی بوو.

**هەباس کاردۆ:** مامۆستا لە شێعری خۆت هیچت لەبیرن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** زۆرم لەبیرن.

**هەباس کاردۆ:** ئێستا هیچت بۆ دەخوێندرێتەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەم وتووێژەدا هیچت بۆ ناخوێنمەوە بەڵام دوایە بۆت دەخوێنمەوە،چونکی نامەوێ چاپ بن. تاکە یەک بەیت دەخوێنمەوە کە پێم وابوو شێعرە لەڕووی ئیحساسێکی واقیعی‌یەوە هات. قەسیدە یان غەزەلێکم نووسیبوو. ئاوا دەست پێ دەکا:

**ئەوە ئەی شۆڕە سەروی کوردەواری        عەزیزم غونچە سووری ئەوبەهاری**

پاشان دەڕوا، دەڕوا کە دیارە ئەوە پێویست نەبوو هەتا لە نیوبەیتێکی دا نووسیبووم:

**دڵم دایم بەهاوارو گرینە**

کە ئەوەم نووسی پەشیمان بوومەوە لە دڵی خۆمدا گوتم خۆ وەختێکی ئەوم لە کنە هیچ غەمم نین. هەر بۆیە ئاوام تەواو کرد:

دڵم دایم بەهاراو گریەنە      مەگەر کانی لەپێش چاوم دیاری

ئەوەم پێ ئیحساسێکی واقیعیو شاعیرانە بوو. دەنا ئەو شێعرەی کە گوتم تازە چاپ کراوە قەسیدەیەکی درێژە دوایە دەتوانم هەمووت بۆ بخوێنمەوە. ئەمن زۆر لە شێعرەکانی خۆمم لەبیرن.

**هێمن کاروێز:** تۆ منداڵ بووی کە خەونی شیرینی کوردان وەدی هات و یەکەم کۆماری کورد لە مێژوودا دامەزرا. زۆریشی نەبرد کە کۆمار ڕووخێندراو سەرکۆمار لە سێدارە دراو ڕۆژڕەشیی کورد دەستی پێ کردەوە. لەسەرجەمی ئەو هەستانو ئەزموونەوە چیت لە بیرە دەتەوێ چی بڵێی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە ئەوە جێی داخ بێ کە پیاو باسی شتێک دەکا کە دەعومری وی‌دا ڕووی داوە بەڵام زۆر کەمی لێ‌دەزانێ. هەمووی ئێمە لەبەر ئەوەی ئەندامی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانینو کوردینو مەسەلەی کۆمار پێوەندیی بەخۆمانەوە هەیە ئێستا شتی لەسەر دەزانین. بەڵام مەبەستی جەنابت ئەوەیە کە ئەمن ڕاستەوخۆ ئاگام لێ بێ. وەکی پێشتر باسم کرد ئەمن ساڵی ١٣١٧یان ١٣١٨ لەدایک بووم ـ ١٩٣٨یان ٣٩ی زایینی ــ بەو حیسابە ئەوکاتەی کۆمار دامەزراوە ئەمن یەعنی حەوت هەتا هەشت ساڵ تەمەنم بووە، لەوەش زیاتر لە مەنتەقەیەکی دوورکەوتووی دێهاتی بووم. ئەو وەختی نە ڕادیۆ هەبوو، نە ڕێگاو جادە هەبوو. ئەو شتانەی ئێستێ هەن هیچیان نەبوون. لەبەر ئەوە زۆر کەمم شتی ڕاستەوخۆ لەبیرە. ئەوەی وەک شتی ڕاستەوخۆ دیتبێتم تەنیا یەک دیمەنم لەبیرە کە لە دێ‌یەکەی ئێمە ڕووی دا. پێشمەرگە هاتبوون کە ئەو وەختی خەڵک هەر دەیان‌گوت دێمۆکرات هاتوون. نەشیاندەگوت پێشمەرگە هاتوون کە مەعلووم بوو بەرپرسەکیان ڕەحمەتی "حەمەدی مەولوودی" یە. گوتیان حەمەدی مەولوودی هاتوە. هێندێک سوارە بوون، هێندێک پیادە بوون بەسەر خەڵکیاندا دابەش کردبوون. شتێکی بۆ من جالیب بوو. ئەوانە کە هاتبوون بەسەر ماڵاندا دابەش ببوون، بەهیچ جۆر بۆ خەڵکەکەی سەربار نەبوون. ئەو وەختی ئەمن عەقڵم پێی نەدەشکا، بەڵام ئێستێ کە عەقڵم پێی دەشکێ پێم شتێکی زۆر جالیبە کە ئەمە نیشانەی ئەوە بوو کە هەم وەزعی کۆمار باش بووە هەم سیستێکی گەلی هەبوو. هاتن ئێستا لەبەر چاومە کە ئاردیان هێنا بۆ ماڵی مە، برینجیان هێنا، ڕۆنیان هێنا بۆ ئەوەی ئاردەکیان بۆ بکرێ بەنانو برینج و ڕۆنەکەشیان بۆ لێ بنرێ بۆ ئەو کەسانەی لە ماڵی مە بوون بیخۆن. لەپاشان کە وەختی خواردنەکەی هات دەرکەوت شتەکە واش نیە. هاتن نانەکیان برد، خواردنەکەشیان هەر برد، هەتا لە جێیەکی دیکە کە نازانم کوێ بوو بەسەر یەکەوە بیخۆن. ئەوەم لەبیرە دەنا شتەکانی دیکە هەمووی ئەوانە بوون کە دوایە فێریان بووم و دوایە بیستوومن، ڕاستەوخۆ شتێکم لەبیر نیە.

بۆ ڕووخانەکەشی دیسان هەر ئەوەندەم لەبیرە کە گوتیان دێمۆکرات تێک چوو. لەبیرمە وەکوو دیمەنێک کە بۆ خەڵکەکەی زۆر تاڵ بوو، ڕەنگە عەقڵی منداڵیی من هێندەی بەلاوە مونیم نەبووبێ. بەڵام ئەوەی پێ-

یان دەگوتن "دەوڵەتخوا"، لایەنگرانی دەوڵەت هاتن بۆ گوندەکەی مە. هاتن ناونووسیی خەڵکیان کردو چەکی خەڵکیان کۆ کردەوە. ئەمن لە شتی ڕاستەوخۆ هەر ئەوەندەم لەبیرە ئەوی دیکە هەمووی شتی بیستراوە کە دواتر زانیومن. دیارە دواتر، ئەو کات کە فامم کردبێوە بۆ من زۆر ناخۆش بوو کە لە ژیانمدا حادیسەیەکی ئاوا گرینگم دیوە بەڵام تێیدا بەشدار نەبووم. یان بۆ ئەوەندە دەوامی نەکردوە یان ئەوە کە ئێستا چەند ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە بۆ شتێکی ئاوام نەدیوە. بەخۆشییەوە دواتر وەک ئیدامەکاری هەم لە وڵاتی خۆمان ڕووی داو هەم لە کوردستانی عێراق ئەوەی پێی دەڵێن شۆڕشی ئەیلوول و دواتریش ڕاپەڕینی گەلانی ئێران هاتە پێشەوە ئەو ڕووداوانە کە هەموومان لێی ئاگادارین.

**عەباس کارەزا:** مامۆستا لەو دێیەی ئێوە کەس پێشمەرگە هەبوو ئەو وەختی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەکی پێشتر عەرزم کردی یەکێک لە ئاغایەکانی دێی دەرەجەی سەرهەنگیی هەبوو، خەڵکێکیش هەبوون کە وەک پێشمەرگە عەمەلیان دەکرد. یەکێک لەوانە کە ئێستاش بە خۆشییەوە لە ژیان-دا ماوە پوورزایەکی خۆم بوو. کوڕێکی زۆر ئازاو چوستوچالاک بوو. هەر لە ژیانیدا لە هەموو شتێکدا ئینسانێکی چوستوچالاک بوو. بەڵێ پێشمەرگە هەبوون. بەڵام خەڵکێکیان بۆ ماوە ماوە بۆ هێندێک شوێن دەبردن و دوایە مەرەخەسیان دەکردنەوە.

**عەباس کارەزا:** دوای تەواو کردنی دەرسی دینی ڕووت لە چی کردو ژیانت چۆن تێپەڕ کرد؟ ئایا هەر بە دەرسی دینی وەستای یان لە بواری خوێندنی دیکەشدا خۆت ماندوو کرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لە ڕاستی دا ئەگەر شتێک بووبێ لە خوێندندا هەر ئەو دەورانە بوو کە دەرسم خوێندەوە. ئەوەش شتێکی یەکجار کەمی تێدا هەبوو کە لە ساڵەکانی سیوهەشتو ئەواتەدا، ئەمن لە مەهاباد ئێم دەخوێند ئەوەی کە پێیان دەگوت مەدرەسەی علوومی دینی. لەوێ بۆ ماوەیەکی زۆر درێژیش نەبوو دەرسی ئەدەبیاتی فارسییان پێ دەگوتین، دەرسی ئینگلیسییشیان پێ دەگوتین. کە ئەمن لە هەردووکیاندا زۆر کەم بەشدار بووم. پاشان شتێکی جالیب هەبوو، بۆ ئەوەی هەر دانەنیشین و هەر نەخوێنین وەرزیشیشیان بۆ دانابووین. بەیانییان ئەفسەرێکی ئەرتەشی دەهات کە دیارە ئەو وەختی تەقریبەن حکوومەتێکی نیزامی هەبوو. ڕەزمئارای مەشهوور لەوێ فەرماندەی لەشکر بوو. ئەفسەرێک دەهات لەوێ بەرنامەی وەرزشی بۆ دادەنایین.

**عەباس کارەزا:** مامۆستا دەچمە سەر پرسیارێکی دیکە. دەورانی خوێندن و مەڵانی جەنابت، هەم لە ئێران و هەم لە کوردستان ئێمە شاهیدی ڕیزە گۆڕان و جموجۆڵێکی بەرینی خەڵکیین. پرسیار ئەوەیە مەحەلی ئێوە کە

دەرسی دینیتان دەخوێند چۆن سەیری ئەو ئاڵوگۆڕانەتان دەکردو چەندە خۆتان پێوە ماندوو دەکرد؟ نەخشی مامۆستاکان لەو نێوەدا چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هەر لەجوابی پێشتردا دەبوو ئەوەی بڵێم کە ئەمن هەر وەک لە بەشەکانی پێشتردا باسم کرد لە دەورانی فەقێیەتی‌دا دەگەڵ حیزبایەتی ئاشنا بووم‌و لەپاشانیش کە خوێندنم تەواو کرد وەکوو سەرئەنجامی هەموو ئەو کەسانەی خوێندنی ئایینی‌یان تەواو دەکرد بووم بە مەلای دێ. مەلا لە دێ چەند وەزیفەیەکی لەسەر شانە ـ دیارە هەموو مەلایەک نا ـ بەڵام ئەمن لە لایەک ئیمامی جومعەو جەماعەت بووم‌ لە لایەک وەک ئەرکی دینی ئەوەی پێی دەڵێن "وەعز" واتە خوێندنەوەی ئەحکامی دینیم لەسەر شان بوو و لە هەمووشیان موهیمتر ئەمن دەرسم دەگوت. لە خاریجی مەسایلی دینی، ئەوجار دەگەڵ مەسایلی سیاسی بەربڵاوتر تێکەڵاو بووم‌. هەر لەو ماوەیەدا دەگەڵ تێکۆشەرانی دێموکرات لە نزیکەوە پێوەندیم هەبوو. ئێستا ئیدی بەشێوەیەکی زیندووترو چالاکتر کارم دەکرد. هەوڵی من زیاتر ئەوە بوو ئەوەندەی دەتوانم شوێنی ژیان‌و پێگەی کۆمەڵایەتیم یارمەتیم دەدا لە باری سیاسی‌یەوە زیاتر خۆم پێ‌بگەیەنم. دەتوانم بڵێم هەتا حەدودێکیش جێگای خۆم کردبۆوە، بەجۆرێک کە وەختێک ناچار بووم وڵات بەجێ بێڵم، بۆخۆم لە دڵەوە جگە لەوەی پێم ناخۆش بوو وڵات‌و ژیان‌و تەنانەت بنەماڵەکەشم بەجێ دێڵم‌ لەو بارەیەوە زیاترم پێ ناخۆش بوو چونکی پێم وابوو بوونم لەوێ دەتوانێ بەسوودتر بێ بۆ میللەتەکەم‌و بۆ حیزبەکەم. دەکرێ بڵێم لە چواردەوری ئەو دێیەی ئەمن لێی دەژیام خەڵک ئەوەندەیان متمانە بەمن هەبوو کە لە زۆر کاری کۆمەڵایەتی‌و تەنانەت ژیانی تایبەتیی خۆشیاندا پرسیان پێ دەکردم‌و نەخشم هەبوو. بۆیە ئەمن ئێستاش هەر وام‌ کاتێک دەبینم کەسانێک بە هۆی کاری حیزبی قاچاغ دەبن‌و ناچار دەبن وڵات بەجێ بێڵن ئەمن بە خەسارێکی گەورەی دەزانم. چونکە ئەوانەی لە کاروباری حیزبی‌و تەشکیلاتی‌و ڕێکخراوەیی‌دا کارامە بوون‌و ئەزموونێکیان وەسەریەک ناوە دەتوانن لە ڕاکێشانی خەڵکی دیکە بۆ لای کاری سیاسی‌و خەباتگێڕانەدا ڕۆڵێکی گرنگ یاری بکەن‌و هەمیشە پێگەیەکی جێی متمانە بۆ ئێستای تێکۆشان‌و کاروباری حیزبی لە داهاتوودا بن. پڕکردنەوەی جێی ئەو جۆرە کەسانە بۆ حیزب کارێکی ئاسان نیە.

**عەباس کاکەڕۆ:** دەورانی مێرمنداڵی‌و لاوەتی دەگەڵ ئەوەدا کە دەورانی هێرشی خەیاڵ‌و ئاواتەکانە، لە هەمان‌کاتدا ماوەی جووڵەی فیزیکی‌و نەشەی فکری‌یە. ئەو دەورانە بۆ تۆ چۆن تێ‌پەڕی؟ زیاتر خۆت بە چییەوە خەریک دەکردو تامەزرۆیی خۆت بەچی دەشکاند؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەگەر پیاو ئێستا تەماشای دەوروبەری خۆی دەکا و لەپاشان بیر لە ڕابردووی خۆی دەکاتەوە عەجایب بەزمی بەخۆی‌دا دێ. جەنابت پرسیارت لە دەورانی مێرمنداڵی‌و لاوەتی کرد. ئەمن دەورانی

منداڵییشی لێ زیاد دەکەم، لە دەورانی منداڵییشدا شتێک نەبوو منداڵی شوێنی ژیانی من خۆی پێوە خەریک بکا. ئەمن لەبیرمە هەموو سەرگەرمیی منداڵێکی وەکوو من بریتی بوو لە چەند یارییی منداڵانە کە بە کۆمەڵ دەکران. وەکوو "قەرەقەرە"، وەکوو "کەرە سووری مەڵەوێنێ" و ئەو جۆرە شتانە. لەپاشان هێندێکیشیان هەبوون کە بەتەنیاش دەکران. مەسەلەن مەزرەچێکی فڕێ دەداو هەڵی دەسووڕاند. یان شێلاقەمان دەکرد. یان ئەگەر کرابا بە دوو کەس ئەگەر نەکرابا بەتەنێ شتێک هەبوو پێمان دەگوت "هەڵووکێن" ئەومان دەکرد. یان تیرو کەوانمان ساز دەکرد کە زۆر جار لە سەری تووشی کێشە دەبووین. ڕەنگە زۆر بێ کەڵک بێ بەڵام باسیشی بکەین خراپ نیە، بۆخۆم تیروکەوانم ساز کردبوو. هێندەشم کار پێ کردبوو زۆر عەجایب ئەنگێوە بووم. بە هەرچیمەوە دەدا دەم ئەنگاوت. جارێکیان لەو بەری ئاوەدانی مریشکەو کەڵەبابی لێ بوون نیشانەم لە یەکێکیان گرت، تیر دەبەدەی مەڵچەقێ و چووین هێنایانەوە زانییشیان کاری منە. چونکە دیتبوویانم کەڵەبابیان هێنایە ماڵێ و کردیانە هەڵاوهەنگامە. دوایە مەسەڵەتیان کرد گوتیان بابە کەڵەبابێکتان دەدەینێ با ئەو کەڵەبابە بۆ ئێمە بێ. لەسەر ئەوی [illegible]کیشە[illegible]تان لە دەستی دایکم خوارد، چونکی ژنان زۆریان پەرۆشی شتی ناوابەو ئێمەش [illegible] بە [illegible] کەڵەبا[illegible] مە[illegible] کەڵەبابیان دا بەوانو ئەوی دیکەیان سەر بڕی کە بۆ ئێمە قازانج بوو چونکە گۆشت کەڵەبابەکەمان خوارد، هە[illegible] هەر شتی ئاوا بوون، پاشان کە چووینە دەورانی لاوەتی تۆزێک فەرقی هەبوو. مەسەلەن [illegible]یشمان دەکرد. ئەویش [illegible]ێنی داری کە تۆپی عادی بوونەو هەر لە بەیندەو و لە پەڕۆ شتی وا ساز دەکران. ئیتر ئەو شتان[illegible]یە هاتن یان هەر ئەو وەختی لە شاران هەبوون هیچیان لای ئێمە نەبوون.

هەر ئەو ڕۆژانە میوانمان هەبوون کە بۆیان باس کردم کە لە [illegible]ک[illegible] هەر دێیەکەی دراوسێمانو دێ یەکەی ئەولاتریش لە خودی دێیەکە تیمی فووتباڵ هەیە. باوەڕ بکە باڵا بە باڵا پێی گەورە بووم کە پێشکەوتنێکی ئاوا لە کۆمەڵی مەدا پێکهاتوە کە لە دێیەکی پەنجا شێست ماڵیدا لاوەکان تیمی فووتباڵیان پێکهێناوە، تیمی واڵیباڵیان پێکهێناوە. یان چالاکیی دیکەیان هەیە.

ئەو وەخت ڕادیۆ نەبوو، تەلەفیزیۆن نەبوو. بەڵێێن ئەو دەزگایانەی منداڵ کایەیان پێ دەکاو خۆیان پێ دەخافڵێنێ هیچیان نەبوون. لە هەمووی موهیمتر کە ڕەنگە لە جێی دیکەش باسم کردبێ یان باسی بکەمەوە ئەمن کە دەمخوێند دەو دەورانەدا زۆرجار تەنانەت کتێبە دەرسییەکەی خۆشم نەبوو، ئەویشم بە ئەمانەت لە کەسێکی دیکە وەدەگرت. دەنا ئەگەر لە باشترین حاڵەتدا هەمبایە هەر ئەو تاقە کتێبەی دەمخوێند هەر ئەوم دەکڕی بەهەر قیمەتێک بایە. لەوە زیاترهیچ کتێبێکی دیکە نەبوو لە خاریجی دەرسەکە پیاو بی‌خوێنێتەوەو خۆی پێ بێگەیەنێ. ئەمن زۆر جارم ئەوە گوتوە ئەمەندم گەیبووە دەوری بیست ساڵ کە بۆ یەکەمجار ڕۆمانێکم خوێندەوە. هەر لەبیرمەو ئێستاش پێم‌خۆشە وەدەستم کەوتەوە. ناوی "تەحصیل کردەها" بوو بە قەڵەمی

"مشفق همدانی". ئەویش بە فارسی بوو نەک بە کوردی. دیارە شتێکی دیکە هەبوو کە زۆریش تێی‌دا بیووینە وەستا. ئەویش ئەو داستانە کۆنانە بوون وەک مەلیک بەهمەن و ئەمیر ئەرسەلانی نامدار و ئەسکەندەرنامە و شتی دیکە. جا زۆریش بۆ خۆم خۆم پێوە ڕاحەتاو ئاوا بۆ خەڵکیم دەخوێندەوە و خەڵکیش زۆریان پێ خۆش بوو. ئەسڵەن فارسی‌یەکەم نەدەخوێندەوە هەتا مانای لێ بدەمەوە. بەڵکوو هەر یەکسەر کوردی‌یەکەم دەخوێندەوە، وەک ئەوەی هەر بە کوردی نووسرابێ. زۆر جار دەڵێم ڕەنگە شتێک باش بێ و هێندێک باری خراپی هەبێ، یان خراپ بێ و هێندێک باری باشی هەبێ. ئەمن بەش بەحاڵی خۆم – خەڵکیش قبووڵیەتی بۆیە دەیڵێم – لەباری هۆش و زەکای فکری‌یەوە باش بووم. بۆیە دەرسەکەم زۆر زوو لەبەر دەکرد و ئیدی ئەوجار بێکار بووم. بۆیە ژیان زۆر بەزەحمەت دەگوزەرا. چونکی هیچ ئەعمالییەتێکی موفید نەبوو کە بڵێی هەم ئینسانی پێ دەگەیەنێ و هەم کەڵکێکیش بە کۆمەڵ دەگەیەنێ. مەحرومییەتەکە لەو پەڕی خۆی‌دا بوو.

**عەباس کاروان:** مامۆستا دەگەڵ جۆرانێن و ئەو جۆرە یاری‌یانە چۆن بووی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** جۆرانێن لە تەمەنێکی کەمێک هەرزەتردا هەبوو. هەم جۆرانێن هەبوو هەم پشکێلان هەبوو، چونکی جۆرانێن بەدوو کەسانیش دەکرا، بە چوارانیش دەکرا و بە زیاتریش دەکرا. دیارە ئەگەر زیاتر بایە ناخۆش دەبوو. بەڵام پشکێلان خەڵکی زۆری دەویست، لانی کەم دەبوو هەر لایەی حەوت، هەشت کەس بێ. دیارە بە منداڵی شتێکی دیکەمان دەکرد کە پێیان دەگوت "کڵاو مەستێنە" یان "کاڵە مەستێنە"، چونکە ئەوە بە کڵاوان دەکرا. عەرزم کردی هەموو شتێکی هەر سەرەتایی بوو. ئەمن ئێستێ بەداخم کە ئەوانە بفەوتێن وەک یاری نەریتی و خۆوڵاتی. ئەوانە نابێ بفەوتێن، پێویستە بمێنن بەڵام دیارە ئەوانە لەچاو ئەو شتانەی لە دنیای تازەدا هەن و تەنانەت بە نیسبەت ئەو شتانەش کە ئەو وەختی لە شاری هەبوون زۆر سەرەتایین.

**عەباس کاروان:** شتێکی سروشتی‌یە بێ‌دەرەتانی ماڵی و نەبوونی ئیمکاناتی پێوەندیدار بەخێوکردن و پەروەردەی فکری و لەشی پێش هەڵدانی ئیستیعدادەکان دەگرن. بەو حاڵەش لە مێژوودا کەم نین ئەو زانا و بیرمەندە پایەبەرزانەی لەو پەڕی بێ‌دەرەتانی‌دا ژیاون بەڵام بە باشترین شێوە خۆیان گەیاندۆتە لووتکە. تۆ ئەو پێوەندی‌یە چۆن هەڵدەسەنگێنی و داخوا نموونەی خۆت دەکرێ چۆن لێک بدرێتەوە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن بۆخۆم بە تەجرەبە بۆم دەرکەوتووە ژیان فێری کردووم کە ئەو قابلییەت و توانایانەی لە ئینساندا هەن بەپێی هەلومەرجی ژیانی ئەو ئینسانانە بەجۆرێک خۆیان هەر دەردەخەن. بەڵام لە عەینی کاتدا زۆر شت هەن کە پێش پەرەگرتن و گەشەکردنی ئەو توانایانە دەگرن. زۆرجار ئەمن گوتوومە –

هەر لەسەر خۆم دەڵێم چونکی بۆخۆت پرسیارت لەوە کرد ـ ئەگەر ئەمنیش لە گوندی قاسملووی یان لە ماڵەکەی دوکتۆر قاسملووی لەدایک بووبام‌و لە شارەکەی وی خوێندبام‌و پاشان چووبامە پایتەختێو ئینجا لە ئورووپا درێژەم بە خوێندن دابایە، دەمتوانی ئەمنیش ببمە دوکتۆر قاسملوویەک. چونکە هەموو جارێ دەڵێم بوون بە دوکتۆر قاسملوو نە مەحاڵە، نە گوناحە. بەڵکە ئەرکێو شتێکی مومکینیشە. بەڵام کە ئیمکانەکەی ئەوەی هەڵناگرێ ئەوبەری دەبمە مەلایەکی زیرەک. ئیدی نابمە موهەندیسێک، نابمە پزیشکێک، نابمە پسپۆڕێک لە بواری علوومی تازەدا. شتی ئاوا بۆ من دەرحاتی نیە. لەنێو ئێمەدا شتی زۆر سەیرم دیوە کە قابلییەتەکە، توانا کە خۆی نیشان داوە. مەسەلەن ئەمن هەر ئێستێ کتێبێکم هەیە عەرەبی‌یە بەڵام کوردێک نووسیویەتی خەڵکی شارەزوورێیە. حدوودی دووسەد ساڵێک پێش ئێستا ژیاوە نیشان دەدا ئەگەر ئەو کابرایە لە وڵاتێکی پێشکەوتوو بایە دەی‌توانی شتێکی سەیروسەمەرەی لێ دروست بێ، قابلییەتی هەیە، توانای هەیە بەڵام هیچ مەجالێکی نیە. ئەو کتێبە ناوی "کنزاللسن"ـە یانی خەزێنەی زمانان. ئینشەڵڵا وەختێکی بکرێ هەر پیشانیشت دەدەم. کتێبەکە حدوودی شەست سانتی‌میتر درێژە یانی لاپەڕەکانی. مەتنەکە کە دەی‌خوێنیەوە عەرەبی‌یەکی زۆر جوان ئەدەبی‌و مەتنێکی زۆرزۆر بەڕاستی عالیی هەیە. فیقهە، شەرعە. بەڵام ئەو کابرایە کردوویەتە یازدە ستوون. یازدە ستوونی چووکەڵەی تێدا کردۆتەوە لە نێوەڕاستیدا. ئەگەر ئەو کتێبەی ئاسۆیی دەخوێنییەوە ئەوە فیقهە. ئەگەر ستوونی دەیان‌خوێنییەوە واتە لە سەرەوە بۆ خوارێ لە ئەووەڵەوە هەتا ئاخیر هەر کامەیان باسی مەوزووعێکی دیکە دەکا. هەمووشی لە باشترین عیبارەتدا. لە ئەدەبیترین عیباراتدا باسی دەکا. مانایان دەگۆڕێ. ئاسۆیی دەی‌خوێنیەوە باسی شتێکە، ئەستوونی دەی‌خوێنیەوە شتێکی دیکەت بۆ باس دەکا. مەسەلەن ئەوەیان باسی عیلمی نەحو دەکا. ئەوی دیکە باسی سەرف دەکاو هەر ئاوا. لە هەمووشی سەیرتر لە ستوونەکانی ئاخریدا زمانەکە دەگۆڕێ. چەند شێعری کوردی‌و فارسی‌و تورکی‌و ڕووسی‌و فەڕانسەیی هێناوە. ئاسۆیی دەی‌خوێنیەوە عەرەبی‌یە. ئەستوونی دەی‌خوێنیەوە کوردی‌یە یان فەڕانسەیی یان تورکی یان فارسی یان ڕووسی‌یە. تەنیا شتێکی کە پیاو لەوێدا مەجبوورە بی‌گۆڕێ ئەوەیە کە هێندێک حەرف لە زمانی عەرەبی‌دا نین. وەک "پ" کە تێی‌دا نیە بەڵام لە فارسی‌دا هەیە. لەعەرەبی‌دا بە "ب" نووسراوە ئەتۆ مەجبووری بە "پ"ی بخوێنیەوە. یان "چ" کە لە عەرەبیدا نیە بە "ج" نووسراوە دەبێ بە "چ" بی‌خوێنیەوە. "ژ" هەیە دەبێ بە "ژ"ی بخوێنیەوە. دەنا تەواو تەواو شێعرەکە وەک خۆیەتی. مانای خۆی دەدا بە هەرکام لەو زمانانە کە باسیان کرا. لەو لاشەوە کە دیارە عەرەبی‌یە. یانی ئەوە توانایەکی عەجایبە، هەڵکەوتەیی‌یەکی سەیری تێدا هەیە. ئاخر لە شارەزوورێکی کە چوار دەوری تەنراوە چی پێی بکەیەنێ. بەڵام ئەوە ئەگەر لە ئەمریکا بایە، لە ئورووپا بایە ئەدەبوو بە ئەنیشتێنێک؟ ئەدەبوو بەئەدیسۆنێک؟ جا لە نێو ئێمەدا ئاوا بوو.

لەسەر خۆشم هەروەک عەرزم کردی پێم وایە ئەگەر لە جێیەکی دیکە بامایە حەتمەن جۆرێکی دیکە دەبووم. ئەوە ناخۆشە کە پیاو بە زمانی خۆی بیڵێ، بەڵام خەڵک هەیە کە شاهیدیم بۆ بدا، ئەمن قابلییەتی سەیرم تێدا هەبوو. ئێستێش کەمێکم پێ ماوە بەڵام زۆری کەم کردوە. یەکێک دەهات مەسەلەن پێنج شێعری دەخوێندنەوە کە پێم جوان بوون. گوتم ئەو شێعرانە نەبیستبوون. قەڵەمێکم تاو دەدایەوە هەر پێنجم دەنووسینەوە. دەسبەجێ ئەو شێعرانە دەهاتنە بەرم. یان شێعری وا هەبووە زیاتر لە پێنج سەت شێعر(بەیت). "بەرەو موکوریان"ی هەژار پێنج سەتو شێستو هەشت شێعرە بە جارێک نووسینەوەو چوار جار خوێندنەوە تەماشام کرد هەمووم لەبەرە. ئەو توانایانەم تێدا هەبوون.

تەنانەت قسەیەکی خۆشە با بی گێڕمەوە. ئەمن دەگەڵ ڕەحمەتی مەلا ئاوارە زۆر ڕەفیق بووم. هەموو شتێکمان پێکەوە بوو. قەت لێک توڕە نەدەبووین. شەوێکی لێم توڕە بوو. عەجایبیش توڕە بوو. ئەویش چی بوو؟ چرایەکی ئەمریکاییمان هەبوو. لە دەوری چرایەکە کۆ دەبووینەوە خەریکی موتالای دەرسی سبەینێ بووین. کتێبێکمان هەبوو هەردووکمان ئەومان دەخوێند. ڕەفیقێکی دیکەشمان هەر ئەوی دەخوێند. کتێبی "سیوطی"* کە لە نەحودایە، شێعرو شەرحی لێ کراوە. دەستم وەبن چەنەگەم دابوو موتالەعەم دەکردو لەبەر خۆشمەوە نازەنازە گۆرانیم دەگوت. بە نیو سەعاتی پێنج لاپەڕەو نیوی ئەو دەرسەی سبەینێم موتالەعە کرد. وێتکم تاو هەستام. مەلا ئاوارە بۆ یەکەم جارو ئاخر جاری ژیانی لێم توڕە بوو، گوتی ئەرێ ئەتۆ بۆخۆت ناخوێنی بۆ نایەڵی خەڵک بخوێنێ؟ ئەوە موتالەعەیە ئەتۆ دەی کەی؟ بۆ خەریک نابی؟ وەڵاهی هیچ ئیستیفادەیەکت لێ نەکردوە. گوتم لێم نەکردوە؟ گوتی نا. گوتم دا ئەو کتێبەم بۆ بگرە. کتێبەمم وەدەست دا. مەتنەکەی هەژدە شێعر بوو، هەر هەژدەم بۆ خوێندەوە. بەو گۆرانی گوتنەشەوە بە نیو سەعاتی هەژدە شێعری کتێبەکەم هاتبووە بەر. کە ئەوەی دی مەلا ئاوارە بەسەری خۆیدا داو گوتی نای قوڕم بەسەری. ئیدی دەستمان کرد بەپێکەنینو ناخۆشییەکەشمان تەواو بوو. مەبەستم ئەوەیە کە ئەگەر شوێنی ژیان ئاوا نەبێ ڕەنگە قابلییەتەکان جۆرێک بن کە شتی دیکەیان لێ پەیدا بێ. بەڵام لەو دێیەی ئەمنی لێ گەورە بووم هەر دەتترانی ئاوا بی. لە هەموو شوێنێک هەر وایە. ڕەنگ بوو ئەگەر ئەنیشتێنیش لە دێیەکەی مە ژیابایە، مەلایەتیی خوێندبایەو ئەو پەڕی مەلایەکی وەکوو منی لێ دەرچووبایە.

**حەمیلی کاردۆ:** مامۆستا لەو شێعرو شتانەی کە ئەوکات لەبەرت بوون ئێستا هیچت لەبیر ماون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وا هەیە جاروبار شتی سەیروسەمەرە ڕوو دەدا. هەر ئەو بەینانە، چەند ساڵێک لەوە پێش بوو لەخۆڕا باسی قسەیەکمان دەکرد باسی شێعرێکم کرد. کە ئاوا تەماشام کرد شەش‌حەوت شێعر بوون.

زۆرم پێ سەیر بوو کە خوێندمەوە تەماشام کرد هەمووییم لەبەرە. فارسییش بوون. لەبیریشم نەماوە نی کێن نازانم نی سەعدییە نی کێیە. مەسەلەن:

دیدم بە بصرە دخترکی اعجمی نسب   روشن نمودە شهـــر بە نور جمال خویش
می‌خواند درس ز قرآن پیش شیخ شهر   وز شیخ دل ربودە بـە غنج و دلال خویش
می داد شیخ درس "ضلال مبین" بە او   وآهنگ ضاد رفتە بە اوج کمـــال خویش
دختر نداشت طاقت گفتار حرف ضاد   با آن دهان کوچک غنچەمثـــال خویش
می‌داد شیخ را بە "دلال مبین" جواب   وآن شیخ می نمود مکـرر مقـــال خویش
گفتم بە شیخ راه ضلال اینقدر مپوی   کاین شوخ منصرف نشود از خیال خویش
بهتر همان بود کە بمانید هر دوان   او در دلال خویش و تو اندر ضلال خویش

هێندەم پێ سەیر بوو، بەڕاستی پاش چل ساڵ کە باسی ئەو شیعرە کرا تەماشام کرد هەمووییم لەبەرە. هەر وەکی ئێستاش هەر لەبەرمن. بەڵام وەختێک هەبوو هەر وەک پێشتر باسم کرد بە هاسانی دەمتوانی بڵێم سەدانهەزار شیعرم(بەیت) لەبەر بوون. دیارە پیلار کە لە عالەمی ئەدەبیاتو شیعرو شاعیری دوور کەوتمەوە بەقینەن ئەوشتانەی لێ دەستێندرێتەوە.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا یەکەم دڵەڕاوکێیەکانت بۆ کاری سیاسیو خەباتی کوردایەتی چۆنی دەست پێ-کردو لە چی‌ڕا سەری هەڵدا. تکایە بە وردەکاریەوە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کاک عەباس ئەمن پێمخۆشە لەو شتانەدا واقیعبین بم. پێم وابێ لە پرسیارێکی دیکەی ڕۆژێکی دیکەدا باسمان کرد کە ئەمن چۆن بووم بە ئەندامی حیزب. وەک ئەوە کە لە کەسێکی دەپرسن ئەوە چۆن بوو دەست بە گۆرانی کرد؟ داستانێک باس دەکا کە ئەمڕۆ دای‌دەنێ. بەڵێ ئەمڕۆ دای-دەنێ. پێم وایە هیچ گۆرانی‌بێژێک نازانێ بۆ بۆتە گۆرانی‌بێژ. گۆرانی هەیەو ئەویش پێی‌خۆشەو فێری دەبێو دەیڵێ. ئەو داستانانە دوایە ساز دەکرێن. جا ئەمن چونکە پێم خۆش نیە ئەو داستانەی ساز کەم وەکوو عەرزم کردی دەڵێم ئەو کەسەی منی دەعوەت کرد بۆ حیزب نەی‌دەزانی حیزب چیە. هەر دەی‌گوت داخڵ بووی؟ داخڵی چی؟ چۆن داخڵ نەبووی؟ گوتم نی چی؟ گوتی نی حیزب. گوتم حیزب چیە؟ گوتی حیزبی خۆن. لە ئاخریدا گوتی وەرە بتبەمە کن کەسێکی بزانێ حیزب چیە. ئەویش دوایە هێندێک شتی پێ گوتم. مەسەلەن دڵخۆشیی ئەیان دەدایەوە ئەگەر تەتۆ ناوت بنووسی، ببی بە ئەندامی حیزب ناوت دەچێتە

تارانی. تەنانەت ناوت دەچێتە مۆسکۆیەش، یان مەسکەوێش. چونکە ئێرانی دیان گوت مەسکەو. چەند ساڵ دواتر بۆم دەرکەوت کە ئەوە ئەو دەورانەیە کە ئەوەی پێی دەڵێن یەکیەتی تەشکیلاتی بەینی حیزبی دێمۆکراتو حیزبی تودەی ئێران لەئارادا بووە. ئەوە پێوەندیی بەو وەختەوە هەبووە. بۆیە دیان گوت ناوتان دەچێتە مۆسکۆیە. ئیدی زوڵمو زۆری خەڵکم دیتو هەستم بە مەحرومییەتی میللەتی کوردو زوڵمو زۆری عەجەمو ئەوانە کرد، داستانێکە کە پیاو دوایە فێری دەبێ. دەنا ئەو وەختی بەڕاستی ئەو شتانە نەبوون. دیارە مەسەلەن هەر ئەو وەختی لەبیرمە کە دوایە دەرکم دەکرد بابی چەتە. منداڵیان دەترساند. منداڵ دەلانکێ‌دا ژێر ئەدەبۆوە دیان گوت عەجەم هاتن. بەڵام ئەوە ئەو منداڵە نیە کە ئەو وەختی دەرک دەکا. منداڵەکە کە گەورە بوو دەرکی دەکا داخوا مەسەلەکە چیە. مولاحەزە دەفەرمووی؟ دەمەوێ بڵێم واقیعیانە ئەو وەختی کە بووم بە ئەندامی حیزبی شتێکی زۆر لێڵو تاریکم لە زوڵمو زۆر دەزانی. بەڵام دەمزانی کە ئەوە شتێکی تازەیەو گەورەبوونێکە پیاو ئەوەی بکا. لەوەی زیاتر نەبووە. بۆیە ئەو شتانەی دوایە فێریان بووم پێم خۆش نیە بەسەر ئەو دەمیانەدا بیبڕم عیبارەتێکی ئەدەبیو سیاسیی لێ ساز کەم کە بڵێی ئاوا بوومو ئەوانە منیان هان دا.

**عەباس کاروان:** ئەوە سەداقەتی زۆر ئێلیەو دەستت خۆش بێ. ئایا ئەو دەورانەی کە تۆ پێت نایە نێو مەیدانی کاری سیاسیو دەگەڵ حیزبی دێمۆکراتی کوردستان پێوەندیت بەرقەرار کرد هیچ حیزبو لایەنێکی سیاسیی دیکە لە مەیداندا هەبوون کە تۆ بتوانی لە نێویاندا هەڵبژێری؟ ئەگەر نەبوو هۆی ئەک‌حیزبی بوونی ئەو دەورانە بۆ چی دەگێڕیەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بە بێ‌شک ئەو دەورانە لە کوردستان وەک حیزبی سیاسیی کوردی جگە لە حیزبی دێمۆکرات هیچ حیزبێکی دیکە لەئارادا نەبوو. بەتایبەت حیزبی دێمۆکراتی کوردستانیش هەروەک پێشتر باسم کرد ئەو وەختی حیزبێکی بەتەواوی موستەقیللی کوردی نەبوو. چونکی ئەوەی پێی گوترارە وەحدەتی تەشکیلاتی دەگەڵ حیزبی تودەی ئێران لەئارادا بوو. ئەمن لەبیرمە، ئەو وەختی دەرکم نەدەکرد کادری حیزبی دەهات قسەی بۆ دەکردین. بە فارسی قسەی بۆ دەکردین. باسی مەسایلێکیشی بۆ دەکردین وەک سۆسیالیسمو ئیمپریالیسمو زوڵمو زۆری ئیمپریالیسمو ئەوانە کە غیرەتمان نەبوو ـ هەر با باسی خۆم بکەم ـ غیرەتم نەبوو بڵێم بابە لێت حاڵی نابم. دەنا بەڕاستی لێی حاڵی نەدەبووم. لەعەینی حاڵ‌دا پێم شانازیش بوو کە ئەو کابرایە لە تارانێ‌ڕا هاتوە کاری حیزبی دەگەڵ ئێمە دەکا. ئەوە کە بۆچی حیزبی دیکە نەبوو پێم وایە بێجگە لەوەی کۆمەڵی کوردستان ئازاد نەبوو هەر وەک ئێستێش ئازاد نیە، پێگەیشتنی فکریش لە نێو کۆمەڵی کوردەواری‌دا ئەوەندە زۆر نەبوو کە جۆراوجۆریی فکریو سیاسیی تێدا پەیدا ببێ هەتا ئەو فکرە جیاوازانە بکێشرێتە سەر دامەزرانی حیزبی جۆراوجۆریش. وەختی دیکەش ئەمن گوتوومە، ئەمن ماوەیەکی

زۆرە ئەندامی حیزبم، لە بەشێکی زۆری‌دا غەیری حیزبی دیمۆکرات هیچ حیزبێکی دیکە لە مەیدانی سیاسەتی کوردەواری‌دا نەبووە. ئەوە لە بەشەکەی دووهەمی‌دایە کە حیزبی سیاسیی جۆراوجۆر سەر هەڵدەدەن. ئەمن ئەو بەشەی دووهەمی بە دەورانێکی گەشاوەتر دەبینمەوە بۆ حیزبی دیمۆکراتی کوردستانیش پێم وایە بە شانازیی دەژمێردرێ. چونکی پێش ئەو دەورەیە ئەو کەسانەی ویستبایان سیاسەت بکەن بیانویستبا یان نەیان‌ویستبایە دەبوو هەر حیزبی دیمۆکرات هەڵبژێرن چونکە ڕێگایەکی دیکە نەبوو. بەڵام لە بەشی دووهەمی‌دا کابرا لەسەر ڕێگای خۆی چەند ڕێگەڕاوی دیکەی دەبینی با بەناوی حیزبیش نەبن. ئێستا ئەگەر کەسێک لە نێو ئەوانەدا حیزبی دیمۆکرات هەڵدەبژێری، ئەوە نیشان دەدا کە حیزبی دیمۆکراتی کوردستان زیاتر توانیویەتی ئامانجەکانی خەڵکی لەبەرنامەی خۆی‌دا بگونجێنێ. ئێستا کارم بەوە نییە داخوا بۆرژوایی‌یە، کرێکاری‌یە، کۆمۆنیستی‌یە، پێشکەوتوویە یان پاشکەوتوویە. یانی لە ویست و داخوازو بیروباوەڕی خەڵکی کوردستان نیزیکترە، بۆیە خەڵک لە دەوری ئالاکەی و لەدەوری دروشمەکانی کۆ دەبنەوە.

**عەباس کاردۆ:** هەرچەند بەشێوەیەک باسی ئەو مەسەلەیەت کرد بەڵام پێم‌خۆشە بزانم جگە لەو کەسەی بۆ یەکەم‌جار بوو بە ئالقەی پێوەندیی تۆ دەگەڵ حیزب ئەگەر کەسانێکی دیکە لە دەوروبەر نەخشیان هەبوو، یان پێیەکەوە دە تەشکیلات یان هەستەی نهێنی‌دا بوون ئەگەر کەسانێکت لەبیرە ڕەنگە جێی خۆی بێ باسیان بکەی.

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** لەوانە کە کاری حیزبیم دەگەڵ کردوون، لەو کەسانەی کە بۆم باس کردی ئەوانە هەبوون بەڵام دەکرێ بڵێم ئەوەی لە نیزیکەوە لەهەمووان پتری تەئسیر لەسەر من هەبووە، کەسێک بوو کە لە ئاخری ساڵەکانی ژیانی‌دا لە حیزبی دیمۆکراتدا نەما. ئەویش مامۆستا مەلا "خدری عەبباسی" ناسراو بە مەلا خدری سارتکی، یان "مەولانی" بوو چونکە بە ناوی جۆراوجۆر دەناسرا. ئەو دەکرێ بڵێم لە دەوروبەری منیش‌دا وشیارترین و ئاگاترین ڕەفیقی من بوو. کە دیارە ئەمن قوتابیی وی بووم، لە خزمەت وی دەرسم دەخوێند. ئەو پتر تەئسیری هەبوو. پاشان ئەو کات کە حیزبایەتیمان لەنێوخۆی وڵاتدا کردوە، خەڵکێکی زۆر هەبوون کە جاری وا بووە ئەمن لەسەروویان وان بووم. مەسەلەن ئەگەر لەبیرت بێ مەرحوومی "کاکەسەن"ی دەشتی هەبوو. پیاوێکی زۆر ڕاستگۆ بوو، پاشان ئەوانەی کە لە دوورەوە زانیومانە حیزبین و ئیحساسمان کردوە پێم‌خۆشە یادی هێندێکیان بکەمەوە. لەوانە کاک "سەید حەسەنی هاشمی"، کە دیارە دە یەک حەوزەی حیزبی‌دا نەبووین بەڵام زۆر زوو دەگەڵ یەک ئاشنا بووین. زۆر لە یەکتر نیزیک بووین، زۆر پێیەکەوە دۆست بووین. دواتریش کە هاتووینەتە نێو ژیانی سیاسی و حیزبی، ئەوانەن کە دیارە بەشێکی زۆریان دەناسین و

بەشێکی زۆریان بەداخەوە لەنێومانda نەماون، شەهید بوون. بەشێکیشیان بەخۆشییەوە هەر ماون و درێژە بە خەبات دەدەن.

# پێکهێنانی ژیانی هاوبەش

**عەباس گاردی:** مامۆستا دێینە سەر ژیانی تایبەتیی خۆت، ئەگەر پێت خۆش نەبێ جوابم بدەیەوە ئازادی. با ئاوا دەست پێ بکەم. کەی و چۆن ژیانی هاوبەشت هەڵبژارد؟ بە گشتی پێم‌خۆشە کەمێک باسی دڵداری‌یەکانت بکەی پێش هەڵبژاردنی شەریکی ژیان. دەزانم مەحفەلی فەقێیان بەزمی زۆر خۆشی تێدایە. ئایا لەو شتە خۆشانەدا بەشدار دەبووی؟

**عەبدوڵلا حەسەن‌زادە:** ئەگەر لە دوایەوڕا دەست پێ بکەم، ئەوە کە مەحفەلی فەقێیان وەکوو مەحفەل یان کۆڕی فەقێیان شتی خۆشی تێدایە تەبیعەتەن تێی‌دا بەشدار بووم. گاڵتەیە، گۆرانی گوتنە، هەڵپەڕکێیە ئەو جۆرە شتانە. لەڕاستی‌دا حوجرەی فەقێیان مەکۆی کۆبوونەوەی لاوانی هەموو دێیەک و هەموو گەڕەکێکی شاریش بوو. چونکی هیچ جێگایەکی دیکە نەبوو. شەوانی سێ شەممەو جومعە کە ئەو دوو ڕۆژە لە حەوتوودا تەعتیل بوون، حوجرەی فەقێیان جێی تێدا نەدەبۆوە. جاری وا بوو لەبەر میوانی و لەبەر دەرکێش خەڵک هەر ڕادەوەستان. چونکی ئەو بەزمانەیان دەگێڕاو دەنگ‌خۆشیان تێدابوون. یان تەنانەت گۆرانی‌بێژی خەڵکی دیکەش دەهاتن لەوێ دەیان‌گوت و خەڵک لە دەوریان کۆ دەبوونەوە. مەعلوومە ئەمن تێی‌دا بەشدار دەبووم و دوور لە ئێستاو بەیادی ئەو وەختی بۆخۆشم دەنگم خۆش بوو و گۆرانیم دەگوت. وا دیار بوو خەڵک دەنگی منیان پێ‌خۆش بوو. بەتایبەت لە هەڵبژاردنی شێعرو کەلیماتدا کەمێک وەستایانە دەجووڵامەوە. لەبیرمە ئەو مامۆستا مەلا نەجمەددینەی لە جێیەکی دیکەدا باسم کرد هەوەڵ‌جار کە چووبوومە پێران لەوێ بخوێنم، شەوێ میوان بووم و ئێستا باسی ئەوەم نەکردبوو کە دەمەوێ لێرە بخوێنم، ئەوەی پێی دەڵێن گەڕەلاوژە ئەوە بوو. کە نۆرەی من هات و دەستم پێ کرد گوتی فەقێ ڕاوەستە پرسیارێکم هەیە. تازە یەک دوو بەیتم گوتبوون. ئەمنیش ڕاوەستام گوتم فەرموو. گوتی یەکێکت ئاوا لە بەرابەر خۆت دانناوە قسەی دەگەڵ دەکەی؟ گوتم ئەوە یەکەم کەسە تێم دەگا.

باسی دڵداریتە کرد. جارێکی دیکە پرسیارێکی ئاوایان لە من کرد کە دڵداریت کردوە یان نا؟ گوتم ئەگەر بڵێم دڵداریم نەکردوە دەبێ بڵێم دڵم نیە. مەعلوومە کەسێک دڵی هەبێ دڵداریش دەکا. دڵداری ڕەنگە ماوەیەکی زۆری کێشابێ و حەتتا ڕەنگە جاروبار لە موددەی مەعقوولیش بترازێ. بەڵام ئێستێ هاتوو ڕابردوە ئەمن لەو بەشەدا دەتوانم بەهەمموو باوەڕەوە ئیدیعا بکەم کە دڵدارییەکی زۆر خاوێنم هەبووە. یانی بەقێنەن

ئەوی ئینسانی وادار دەکا بە دڵداری پێش هەموو شتێک هەوەسە. مەسەلەن کەسێک ژنێ دێنێ بۆیەی نایەوێ خانەوادە تەشکیل بدا. بۆیە ژنێ نایەوێ منداڵی لێ‌ببێ‌کەوتەوە بیان‌کاتە پێشمەرگە یان بیان‌کاتە ئۆممەتی موحەممەدی. ئەوانە هەمموو شوعارن. هەوەس ئینسانی هان دەدا بۆ ئەوەی ژیانی هاوبەش پێک بێنێ. چ پیاو چ ژن. بەڵام لە عەینی کاتدا دڵداریی من قەت هەوەسبازی نەبووە. تەنانەت جاروبار ببوو بەشتێکی زۆر سەیرو خەیاڵپەروەرانەش. لەبیرمە ماوەیەکی زۆر دەگەڵ کچێکی بەینمان هەبوو زۆرمان یەکتر خۆش دەویست. بەتایبەتی دەیانگوت کچەکە بۆ تۆ شێت بووە، هەر دووربەدوور دەتبینێ دەلەرزێ. بەڵام چەند جارمان یەکتر دی. جارێکی یان دوو جار هەروا بۆ پێ‌خۆشبوون دەستم هاویشتە سەرملی. جارێکی تەسبیحێکی دەملی‌دا بوو گوتم ناتدەیەی؟ گوتی با. گوتم لێم گەڕێ بۆخۆم دەی‌کەمەوە. بۆخۆم کردمەوە. دەنا حەتتا ماچم نەکرد. پاش ماوەیەکی ئەو کچە دۆستێکی دیکەی بۆخۆی گرت.

**هەباس کاروخ:** یانی ئەو لەتۆ کشایەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ئەو لە من کشایەوە. دیارە لێی دوور کەوتمەوە. ئەمن لەو دێیەی کە لێی بووم لەوێ ئەمام بۆ ماوەی هەشت، نۆ، دە مانگان کەسێکی دیکەی وەکوو دۆست هەڵبژاردە. جارێکی کۆ ببووینەوە جەمعێکی زۆر بووین. هەروا قسەمان دەکرد. خەڵکێکی زۆری لێ بوو ئەوە نەیوو بڵێی تەنیا ئێرانی کوڕو کچێکە. گوتی تەتۆ قەت نەتوێرلوە تەماشای من بکەی. گوتم بۆ لە تۆ ترساوم؟ گوتی نا. گوتم نا ئەمن لەتۆ نەترساوم بەڵام ئەوی ئەمن لێی دەترسام ئەتۆ لێی نەدەترسای. یانی بۆخۆم داخابوو ئەو کچە هاوسەری دواڕۆژی منە. لە عەینی حاڵیش‌دا بۆ من بێگانەیە. کەوابوو ئەگەر ئێستا ئەمن هەوەسبازیی دەگەڵ بکەم، وەکوو ئەوە وایە خەیانەتم بەخۆم کردبێ. بەو ئەندازەیە عیشقی ئەفسانەییم هەبوو.

پرسیارت کرد کەنگێ ژیانی هاوبەشت پێک‌هێناوە. ئەمن ژیانی هاوبەشم ساڵی ١٣٤٢ پێک هێناوە. ڕاستی‌یەکەشی ئەوەیە کە ئیعتیڕافم کرد دڵداریم کردوە بەڵام ژیانی هاوبەشم بە دڵداری پێک نەهێناوە. پێم وایێ دوو مانگیش پێوە خراوە کە خێزانم خواستوەو مارەم کردوە، بگرە زیاتر لە دوو مانگیشی پێ‌چووە ئێستێ قسەیەکم دەگەڵ نەکردوە، هەر نەشم دیوە. دیارە دووراودوورم دیوە بەڵام لە نێزیکەوە نەمدیبوو. ئەوەندە هەبوو دایکەو باوکێکی بەڕێزی هەبوون. بەتایبەتی ئەمنیش دەبوو ژنێ بێنم هەر بۆیە داوامان کردو داپانو مارەمان کرد. پاش چەند جار دڵداری ڕاست بە مەبەستی ئەوەی ئەگەر بکرێ بۆ یەکتر بین، سەرئەنجامەکەی ئەوە بوو کە ئەوی بۆخۆم هەڵمنەبژاردەبوو بوو بە شەریکی ژیانم ئێستێ نێزیکەی پەنجا ساڵە پێکەوە دەژین. پاشان ئەو ژیانە شتی سەیری تێدابوو، با ئەوەش وەک مەراقێک بڵێم. جارێکی ئەمن و ڕەفیقێکم چووینە دێیەک کە خزمێکی منی لێ بوو. لەوێ کچێکمان دیت. کچەکە کچێکی جوانو ڕێکوپێک بوو. ئەو کوڕەی ڕەفیقم

دڵی چۆیە، گوتی دەکرێ وا بکەی ئەو خزمەت پێی بڵێی بۆ من؟ گوتم بۆ ناکرێ؟ بە خزمەکەمم گوت کە پێمخۆشە پێی بڵێی بۆ ئەو ڕەفیقەم. پاش دوو سێ ڕۆژان یان پێم وایە پاشی ڕۆژێکی هاتەوە گوتم چیت کرد؟ گوتی نازانم بڵێم چی. گوتم چۆن؟ گوتی ئەمن پێم گوتوە بەڵام ئەو مشتەریی تۆیە. گوتم بڕۆ پێی بڵێ ئەوە وەزعیەتی وایەو واچوو، هەر بەڕاستیش پیاوێکی بەڕێز بوو. دیارە ئێستێ نەماوە، ئەویش بوو بە مەلا دوایە جوانەمەرگ بوو. چۆوە هاتەوە گوتی گوتوویەتی ئەمن هەر ئەوم دەوێ. ئیدی ئەمن دەگەڵ ڕەفیقەکەم باسم کرد، گوتم نازانم چۆنت بۆ باس بکەم بەڵام ئەو کچە وای گوتوە خاترجەمیش بە خەیانەت پێی نەکراوە. گوتی جا "پارەو لە زاری بکەوێ بۆ کۆشی چاکە". باشە با بۆ تۆ بێ. لە دوایە ئەو ئێوانەمان هەبوو بەیێ ئەوی دیسان شتێکی هەوەسبازانەی تێدا بێ. دواتر هەر لەماڵی خۆیاندا پێوەندییەکەمان لە ڕێگای نامۆزایەکی خۆیەوە بوو کە ئەویش هەر کچ بوو، بابی پێی زانیبوو، زانیبووی کە ئێوانی دەگەڵ من هەیە، هەر ئەوەندە فەقەتە گرتبووی ئێرتێری لێدابوو. لەپاشانیش تەڵاقی لێخواردبوو گوتبووی دنیاش خەراپ بێ ناتدەم بەوی، هەر لەبەر ئەوی خۆشی ویستووە هیچی دیکە. ئەوە لە کوردەواریدا هەبوو، مەبەستم ئەو میحنەتەیە کە کوڕو کچی کوردەواری تووشی دەبن.

بەهەر حاڵ ئەمن ساڵی ١٣٤٢ ژنم هێناوە. لەو ژیانە هاوبەشە نۆ منداڵ کەوتوونەوە کە سێیان مردوون، شەشیان ماون. دوویان کچن کە یەکیان گەورەترین منداڵمە گەلاوێژی ناوە، ئێستێ ساحێبی ماڵەو مێردی خۆیەتی و سێ کوڕی هەن. مێردەکەی ناوی موحەممەدی کەسرایییە خەڵکی مەنتەقەی سەردەشتە. کوڕەکانی بەتەرتیب ناویان "ئەدیب"ە کە ساڵی ١٣٧٠ لەدایک بووە. پاشان "مەتین"ە کە ئیستا ڕەنگە چاردە یان پازدە ساڵی تەواو کردبێ. پێم وایە ساڵی ١٣٧٥ لە دایک بووە. ئەوی دیکەیان ناوی "وەزین"ە. کچی دووهەمم کە دەبێتە سێهەم منداڵی زیندووم ناوی ئەسرینە کە ئەویش مێردی کردووە کچێکەو کوڕێکی هەن. کچەکەی دەوری نۆ یان دە ساڵە. کوڕەکەشی پێنج ساڵ عومریەتی. مێردەکەی مستەفای مەعرووفی خەڵکی مەنتەقەی پیرانشارە. کوڕەکانم موحەممەدە. ئەویش دەگەڵ کچێکی فەرانسەیی ئیزدیواجی کردوەو ئێستێ لە فەڕانسە دەژی. دوو کوڕی هەن. یەکیان وا بزانم شازدە ساڵ عومری دەبێ. ئەوی دیکەیان چاردە ساڵ عومری دەبێ. بە ناوەکانی "ئاوات"و "هیوا". کوڕی لەوی چووکترم "ئاوارە"یە کە لە باری ئەقڵییەوە ناقیسەو ژنی نەهێناوەو لە ڕاستیدا ژیانی عادیی نیە. ئەو لە سوێد دەژی، یانی بەسەر کۆمەڵی سوێدییان-دا بڕیوە. ئەو ساڵی ١٣٥٠ لە دایک بووە. کوڕی لەوی چووکترم "ئاکۆ"یە. ئەویش ساڵی ١٩٧٤ لە دایک بووە بە تاریخی مەسیحی کە دەبێتە ١٣٥٣ی ئێرانی. ئەو ژنی هێناوە. لە حەددادەکانی سەردەشتێ، کچی کاک لەتیفە بە ناوی نیروان. ئەویش کوڕێکی هەیە کە ئێستا وا بزانم نۆ ساڵە. کچێکیشی هەیە چوار ساڵە. ئاخرین منداڵم "ئاسۆ"یە. ئەویش ساڵی ١٣٥٥ لەدایک بووە ئێستا لە فەرانسە دەژی، خوێندنی لە حقووقی

ئێوەنەتەوەیی‌دا تەواو کردوەو دوکتۆرای وەرگرتوە. چەند ساڵە ژنی هێناوە بەداوی ئێشتمان بەڵام تائێستا منداڵیان نەبووە، ڕەنگە هەر بۆخۆیان حەزیان نەکردبێ جارێ خۆیان تووشی گیروگرفتی ژیانی منداڵداری بکەن. ئەوە وەزعییەتی بنەماڵەیمە.

**عەباس کاردۆ:** دەستت خۆش بێ ماموستا. لە چوارچێوەی پرسیارەکەی پێشوودا، ئەوەی کە پرسیار دەدا ئینسان خۆشەویست هەڵبژێرێ‌و دڵداری بکا، بەشێکی زۆری هەوەسە یانی دەورانی جەوانی‌یە. پێی خۆشە بەڕاستی لەززەت لەو دەورانە ببا. ئێستا کە جەنابت بەجۆرێکی دیکەت کردوە پێت وایە جەنابت لە خەڵکی دیکە جیا بووی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا جیا نەبووم. دیارە ئەمن ئینسانێکی ناکامل و فریشتە نەبووم. مەبەستم ئەوەیە بڵێم لە دڵداری‌دا ئەو هەوەسبازی‌یەم نەبووە. بەڵام ئەگەر تەماشای ئەوش دەکەم دەبینم ئەو خەیاڵپەروەری‌یە هێندێک شانسی لەدەست من داوە پێم ناخۆشە. هەر ئەو کچەی کە باسم کرد یەکەم عیشقم نەبوو بەڵکە پاش چەند کەسی دیکە بوو. بەڵام ئارەزووی قەلبیی من ئەوە بوو کە ئەو کچە ببێتە هاوسەری من. ئێستا خۆ لە دەستم چووە بەڵام بەوحاڵە لەوەی کە ئەو وەختی دڵداریم کردوە دارێنێکی خارێتم هەبووە هیچ پەشیمان نیم کە ئەو فورسەتەم لە دەست چووە. چونکە ئەو قسەیەم زۆر پێ جوانە کە دەڵێ: **"یک لحظه هوسرانی یک عمر پشیمانی"**. هیچ چێژێکی درێژخایەنی تێدا نیە. ڕەنگە لەو لەحزەیەدا لەززەتی هەبێ، بەڵام دوایە هیچ نیەتیجەیەکی تێدا نیە. ئەمن پێم وایە یەکێک لەو زوڵمانەی لە کۆمەڵی کوردەواری‌دا لە ژنان دەکرێن، ئەوەیە کە عەیبی ژنان دەبینرێ بەڵام عەیبی پیاوان نابینرێ. مەسەلەن ژنێک کە سەروکاری دەگەڵ چەند پیاوان هەیە بە ژنێکی سووک ناو دەبرێ. بە باوەڕی من ئەو پیاوەش کە سەروکاری دەگەڵ زۆر ژنان هەیە وەک ژنەکەو پتر لە ژنەکەش سووکە. ئەوانە دیارە خۆیان بە ئازا ناو دەبەن بەڵام داخوا لە کۆمەڵ‌دا ئەوانە سووک نین؟ پێموایە ئەوە غەدرێکە کە دەکرێ هەر وەک لە زۆر باری دیکەشەوە دەکرێ. دیارە بەخۆشی‌یەوە ئێستا وەزعەکە گۆڕاوە دەنا لە کوردەواری‌دا کابرا کچەکەی ڕەدوو کەوتبایە دەیویست بیکوژێ. کەچی ئەگەر کوڕەکەی ژنی هەڵگرتبایە، سەروماڵی هەراج دەکرد هەتا مەسەلەی بۆ دەکرد. ئەوەش لەو زوڵمانەیە کە لە ژنان کراون.

# ئاوارەبوون

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا وا دیارە ئەو جار تۆزی بەجێهێشتنی وڵات دێ. دەمەوێ لێت بپرسم بۆ ژیانی ئاساییت جێ هێشتو ڕووت لە باشووری کوردستان کرد؟ ئایا مەجالی مانەوەت نەمابوو یان لەسەر داوای حیزب ئەو کارەت کرد؟ چۆنیەتیی ڕۆیشتنتو بەسەرهاتەکانی ئەو ماوەیە چۆن بوو؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەو وەختیدا کە ئەمن مەجبوور بووم وڵات بەجێ بێڵم، بە شێوەی تەشکیلاتی کاری حیزبیم نەدەکرد. بەڵام باوەڕپێکراوێکی زۆر نیزیکی هەموو ئەو کەسانە بووم کە لە بزووتنەوەی ساڵەکانی ٤٧-٤٦ یان ٦٨-٦٧ی زایینیدا بەشدار بوون. لە هەمووشیان زیاتر مەلا ئاواری شەهید. هەروەها کاک سولەیمانی موعینیو ڕووحی شاد بێ شەهید سمایلی شەریفزادە بوو. کاک حەمەدەمینی سیراجی بوو. مەرحوومی قادر شەریف بوو. خولاسە هەموویان جێگای باوەڕی من بوونو جێگای باوەڕی وان بووم. هەروەختێکی هاتبایەن بۆ خاوانەوە یا یان بۆ مەشوەرەتو بیروڕاگۆڕینەوە بایە حەتمەن ئەمن دەمدیتنو دەیاندیتم. دەناخۆیدا لەبەر چاوی ئەو کەسانەی پیاوی ڕێژیمی پاشایەتی بوونو کاریان بۆ دەکرد، ئەمن وام لێهات کە پێیان وا بێ حاکمی مەنتەقە ئەمنم. تەنانەت ڕاپۆرتێکیان لەمن دابوو کە ئەوانەی وەکوو پێشمەرگە دە وڵاتیدان، هەوتووی جارێک موراجەعەی فلان کەسی دەکەنو دەستوورولعەمەل لەو وەردەگرن. وا بوو هاتن منیان گرت. ئەوە ساڵی ١٣٤٦ بوو. درووست دەجەرەیانی ڕاپەڕینی ٤٧-٤٦دا بوو. گرتیانم بە شێوەیەکی زۆر ناعەنتیقیش. ڕەمەزان بوو، چلەی زستانێ بوو. ژاندارمەکان بۆخۆیان سوار بوون. دەیانەویست هەر بەپێیان وەپێش خۆیانم دەن. مەلا بووم، بەلیباسی مەلایەتییەوە. سەرمایەکیش بوو بە ڕۆژیش سەرما لە دە دەرەجەی ژێر سیفر نەدەهاتە خوارێ. بەڵام ئەمن داوام لەجیرانێکمان کرد کە ولاغێکم دەنێ بۆ ئەوەی ئاوا بە سووکایەتی وەپێشیان نەکەوم. دەگەڵیان سوار بووم بردیانم بۆ سەردەشت. لەوێ بردیانمە ماڵێکی. نەیانبردمە هیچ شوێنێکی وەک ئیدارە. بەڵام دوایە بۆم دەرکەوت ماڵەکە چییە. مەنزڵی نەفەرێکی دەرباری بوو. هاتبوو بۆ سەرکوتی ئەو جووڵانەوەیە. ئەو کەسە سێ دەفتەری کاری هەبوون. یەکیان لە پیرانشار بوو. یەکیان لە سەردەشت بوو. یەکیان لە ورمێ بوو. هەر سێکیان دەفتەری عەمەلیاتی بوون. ئەو وەختی بۆم دەرکەوتو ئێستاش پێم وایە بەهەڵە نەچووم چونکە خیلافی ئەوەم بۆ دەرنەکەوتوە کە فەرماندەیی عالیی هەموو ئەو عەمەلیاتانەی هەبوو کە لە دژی بزووتنەوەی چەکدارانەی ٤٧-٤٦ بەڕێوە دەچوون.

**عەباس کاردۆ:** ناوی ئازانی مامۆستا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ناوی سەروان "محمد باقر بنی عامری" بوو. دواتر بۆم مەعلووم بوو کە لە باری دینییشەوە یەهوودی‌یە هەرچەند ناوەکەی ناوێکی ئیسلامی بوو، بەڵام گوتیان جوولەکەیە. لەوێ بە شێوەیەکی سەیر بۆم هات. زۆر دۆستانە. ئەمن هەمیشە گوتوومە عەجەم کە دیارە مەبەست مەشووریی دەوڵەتین عەجەم هەتا چاکتر بێ خراپترە. ئەگەر خراپە وەک هەیە خۆت نیشان دەدا، ئەگەر چاکە دەیەوێ فریوت دا. لێم هاتە پێشەوە گوتی ئەمن ئەتۆم بۆیە نەهێناوە ناڕەحەتت بکەم. هەر ئاردوومە پێی مەشوورەت بکەین. گوتم جا ئەوە بۆ مەشوورەتە ئاوایان هێناوم، ئەگەر بۆ شتی دیکە با چۆن دەبوو؟ گوتی نا ئەوانە خراپیان ڕەفتار کردوە دەبێ سزا بدرێن لەو قسانە. گوتم بەهەر حاڵ. بەکورتی داوای هاوکاریی لەمن کرد. هاوکاری‌یەکی چۆنیش، کە داستانەکەی زۆر دوورودرێژە. هاوکاریی وا نا کە ئەمن جاسووسیی بۆ بکەم. زۆر زیرەکانە بۆم هات. گوتی ئەمن دەمەوێ مەلا ئاواریی ببینم. بۆ من لەدەستی سولەیمانی موعینی هیچ کارێکی نیە. هەمیشە بەخۆی‌و دە پازدە بیست کەسەوە دەگەڕێ. لە هەموو جێ‌یەکی کەشفە. هەر وەختێکی بمەوێ دەوری دەدەم دەشی گرم یان دەشی کوژم. بەڵام پێم‌خۆشە مەلا ئاواریی ببینم، مەلا ئاوارم بۆ نابینرێتەوە، مەلا ئاوارە شەوێ لە هەر جێ‌یەک بێ بەیانی دەزانم. بەڵام نازانم شەوی ناینە دەچێتە کوێ. چونکی بەتەنێ دەگەڕێ. سەر لە کاری مەلا ئاواریی دەرنایەم، پێم‌خۆشە مەلا ئاواریی ببینم. ئەتۆ ئەمن بگەیێنە مەلا ئاواریی. کارەکەت هەر ئەوەندەیە. دێم بەبێ چەک، بەبێ ڕەفیق، کوێم بۆ دادەنێی دێمە وێ. لەوێڕا دەچمە کوێ بمبە. لەوێڕا دەچمە کوێی دیکە بچە. دوو جێ، سێ جێ، لە جێ‌یەک دەگەڵ مەلا ئاواریی دادەنێ. دەمەوێ قسەی دەگەڵ بکەم وا بکەین ئەو ئاڵۆزی‌یە لە بەین بچێ. بزانین داخوازی‌یان چیە. ئەمنیش لەپێشدا لێی پرسیبووم دەی‌ناسی گوتم ڕەفیقمە. گوتی چەند جارت دیوە؟ گوتم نازانم. گوتی چۆن نازانی؟ گوتم هێندەم دیوە نازانم چەند جارە، چونکە ئیدی حاشا نەدەکرا. تێ ئەوانی دیکە حاشا دەکرا. مەسەلەن گوتی سولەیمانی موعینیت چەند جار دیوە؟ گوتم پێم وایە دوو جارم دیوە، دەحاڵێک‌دا کاک سولەیمانیشم بە دەیان جار دیبوو، ئی وێ دەکرا بەڵام ئی ئاواریی حاشاکردنی نەدەکرا. ئەمنیش گوتم باشە نازانم کەنگێم بۆ دەبینرێتەوە بەڵام هەوڵ دەدەم وەی‌بینم. گوتی ئاخر چۆن وا دەبێ؟ گوتم ئاخر بابە گیان کابرا خۆ ئازاد نیە، شوێنی ئیداریی نیە، پاشان ئازاد نیە بچێتە هەر جێ‌یەک خەڵک بزانێ. کەوابێ دیتنەوەی وەختێک دەخایەنێ. مەجبوورە بش- گەڕێ. خۆ ئەو ناتوانێ هەر لە جێ‌یەک دابنیشێ. ئەتۆ ناڵێی لە هەر جێ‌یەک دەبێ سبەینێ دەزانم؟ گوتی ئەو ڕەمەزانەی نەهاتۆتە دێ‌یەکەی ئێرە؟ گوتم نازانم. گوتی دوو شەوان لەوێ بووە چۆن دەڵێی نەم- دیوە؟ گوتم ئەمن ناڵێم نەهاتوە، دەڵێم نەمزانیوە. گوتی چۆن؟ گوتم خۆ ئەو نایە بۆ دیتنی من. ئەو بۆ کاری خۆی دێ. ڕاستیشی نەدەکرد. دوو شەو نەبوو، سێ شەو بوو. هەر سێ شەوانیش هەتا بەیانی پێکەوە بووین.

بەڵام ئەو قسەیەی ئەو دەی گوت ڕاست بوو. مەلا ئاوارە میتۆدێکی زۆر جالیبی هەبوو. شەوێ دەهات میوانی ماڵێک دەبوو. هەتا بەیانی لەوێ دەبوو. بەرێ بەیانی دەڕۆیی‌و هەموو کەس دەی‌زانی مەلا ئاوارە ڕۆیشتوە. پاش نیو سەعات بەرێ‌یەکی دیکەدا دەچۆوە ماڵێکی دیکە. بارگرانایێشی نەبوو. عومدەتەن بەتەنێ بوو. لە سەدا نەوەدی حاڵەتەکان بە تاقی تەنیا بوو. دەنا کەسێکی دەگەڵ بوو. چوویایە هەر ماڵێکی دەحاوایەوە. سێ شەو لەوێ بوو، بەڵام ئەو (کابرای ئەفسەر) هەر ئەوەی زانیبوو کە ئەوشەو ڕۆیی. ئەوەی نەدەزانی کە دێتەوە. گوتم دەبێ وەختم پێ بەدەی. وەختیشم بۆیە دەویست هەتا خۆم ئامادە بکەم بۆ خۆدەربازکردن. ڕەفیقێکمان هەبوو زۆر هاتوچۆی مەلا ئاوارەی دەکرد. تەقەر بوو لەبەینماندا. ڕوورەی شادبی موحەممەدی ڕەسووە مەرەی ئەگەر ئاوت بیستبێ، کە یەکێکە لە شەهیدەکان. ئەو هەمیشە دەی‌زانی لەکوێیە. ئەو ڕۆژەی چوومەوە بۆ سبەینێ‌ڕا دیتم پێم‌گوت بە مەلا ئاوارەی بڵێ حاڵەو قەزیەیەکی ئاوا پێش هاتوە. هەم دەمەوێ بی‌بینم‌و هەم دەمەوێ بڕۆم. بەڵام پێش ئەوەی بڕۆم دەمەوێ بی‌بینم. چوو دیتی. لەو وەختیش‌دا حاجی دەڕۆیشتن بۆ حەجێ. ئەمن بەناوی ئەوەی کە دەچمە حەجێ دەگەڵ پیارێکی دەوڵەمەندی دێ‌یەکەی خۆمان کردمە شۆخی کە بۆ منیش نابەی؟ ئەمن مەلام ڕێنوێنیت دەکەم پووڵ لەسەر تۆ، ئەوی دیکە لەسەر منو ئەواتە. بەهەر حاڵ وام نیشان دا کە ئەمن دەمەوێ بچمە حەجێ. دەوەختی ڕۆیشتنی‌دا حاجی‌یەکی دیکەی دەگەڵ دەڕۆیی کە ئەویان ڕەفیقی حیزبیم بوو. پێم گوت ئەمن دەگەڵتان دێم بەناوی بەڕێکردن. ئەو وەختی بەعێراقی‌دا دەچوون بۆحەجی. لەپشتەوەی ساڵان بڵێ بگەڕێوە، بەڵام ئەگەر نەگەڕامەوە گوتم هەتا فلان جێتان دەگەڵ دێم کێشەی مەکە چونکی ئەمنیش دەگەڵ تۆ دێم. خۆشم ساز کردبوو، لیباسو ئەوانەم تێکەوە پێچابوون. بەفریش لە عەرزێ بوو، بەفرێکی زۆر. سەرمایەکی سەخت بوو.

ئیدی ئەو ڕۆژەی ڕۆیشتین، چووینە ئاغەڵان (گوندێکی ناوچەی سەردەشتە لە نیزیک سنوور- هەیاس).

دەگەڵ مەلا ئاوارەش پێشتر قەرارمان دانابوو کە شەوێ لە ئاغەڵان یەکتر ببینین. لەوێ کە یەکترمان دیت، دیارە ئەو ماڵە کە منی لێ‌بووم ئەو لەوێ نەبوو. بەڵام ئاگامان لێک بوو. لە ماڵێکی دیکە بوو، هەستام چوومە کنی. لەوێ زۆرمان قسە کرد. پێم گوت داستانی تۆ ئەوەیە. ئاوا بەدواتەوەن وا دیارە زۆر چاک ئاگایان لەحاڵی تۆ هەیە. کەوابێ ئەتۆ دەبێ وا بکەی قەت دوو شەوان لەجێ‌یەک نەمێنیەوە. دیارە باشە ئەوەش بڵێم گوتی بۆ دەگەڵمان ناکەوی؟ گوتم ئەتۆ بۆخۆت باوەڕت بەو حەرەکەتە هەیە؟ ئەمەشم بۆیە لێ-پرسی چونکە نیزیکەی ساڵێک پێشتر نامەیەکی بۆ نووسیبووم لەوێدا گوتبووی ڕەنگە ئاگادار بی کە ماوەیەکە مقۆمقۆیەک داکەوتوە کە گۆیا دەست دەکەن بە خەباتی چەکدارانە. خەباتی چەکدارانە بە بێ پشتی جەبهە، بەبێ تەجرەبەو بەبێ پشتیوان چۆن دەکرێ. تکات لێ‌دەکەم بەهەموو توانایەکەوە موخالەفەت دەگەڵ ئەو فکرە بکەو خەڵکی ڕوون بکەوە. جا دەمەوێ بڵێم مەلا ئاوارە لەڕاستی‌دا لەو ڕێگایەوە تەڵەی بۆ

داتراو گیرا. ئەوان (ئێرانییەکان) کە ئەومیان زانیبوو بە هۆی هێندێک پیاوی خۆیانەوە داستانێکیان خولْقاندبوو. دیارە داستانەکە هەبوو، ئیختیلافی دوو بنەماڵان لەسەر مڵک. بەڵام هانیان دابوون کە مەلا ئاوارەی بانگ بکەن بۆ حەللی مەسەلەکە. ڕێکیش نەکەون هەتا درەنگ دەبێ، ئیمڵن برۆا هەتا بەیانی. خەبەریش بە کاربەدەستان بدەن کە لەوێ دەوریان بدەن. ئیدی ئەوان لەوێ دەبن هەتا بەیانی ئەو دوو ماڵە ڕێک ناکەون. بەیانی کە دەیەوێ بڕوا، هەر ئەو خاوەنماڵەی دەستی دە پیلانەکەدا هەبوو دەڵێ بۆ کوێ دەڕۆی؟ نابینی هێلیکۆپتێر وەک ڕەوە کۆتران بە ئاسمانیدا دەگەڕێن؟ ئیدی مەلا ئاوارە بەو تەریقەیە گیرا. وایان کردوە ئەو شەوەی ئەوڕاو ئەو ڕۆژەش بزانن لە کوێیە. ئیدی هاتبوون دەوریان دابوو کە ئەوە داستانێکی دیکەیە.

مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەمن بەدڵخوازی خۆم هەڵنەهاتم. هەر بۆیە هەڵاتنەکەم بۆ خەسارێکی گەورە بوو. بەڵام ئەمن بۆم سابیت ببوو کە ئەگەر بمێنمەوە دەگیرێم بە گیراتێکی زۆر خراپیش. وەک ئەوە کە درێژخایەنتر باشان دەگەڵ ئەشکەنجەو ئازاریش بێ. یان ئەگەر نەش‌گیرێم یان دەبێ هاوکاریان بکەم یان ڕیسوام دەکەن. بۆیە هیچ چارم نەبوو دەبوو هەڵێم. دەنا وەکی هێمن دەڵێ:

**کوا بەخۆشیی خۆم بەجێم دێڵم وڵاتی خۆشەویستم    من لە ترسی زوڵمو باتووبو دارو شەق هەڵاتم ئەمنیش** قەت بەخۆشیی خۆم نەبوو.

**هەیاس کاروێز:** مامۆستا پێت وایە ئەگەر ئەو داستانە ساز نەکرابایەو ئەتۆ مابایەوە چارەنووست بەرەو مەسیرێکی دیکە دەڕۆیشت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەگەر ئەو داستانە نەهاتبایەتە پێشەو ئەمن مابامەوە، چارەنووسی من دەبوو بە یەکێک لەو دوو شتانە: یان دیسان لە مەرحەلەیەکی دیکەدا، چەند مانگ دواتر دەبوو هەڵێم یان دەکەوتمە داوو بە یەقین نەدەپارێزرام. چونکی خەڵکێکی زۆر گیران بەتایبەتی لە مەنتەقەی سەردەشت. بەڵام هونەری مەلا ئاوارە لەوەدا بوو کە لە باری تەشکیلاتییەوە کەس وا وردا نەبوو. ئەوانەی گیران زۆریان حیزبی بوون. لەسەر هیچیان سابیت نەبوو کەحیزبین. ئەوەندە تەشکیلاتێکی ڕێکوپێکی هەبوو. ئەوەندە باشی خەڵکەکە پەروەردە کردبوو، یانی کاربەدەستان هیچیان وەک بەڵگە بەدەستەوە نەبوو. کابرا حیزبی بوو، مەسئوولی حیزبی بوو. بەڵام کە گرتیان هیچی لەسەر سابیت نەبوو. نە مەدرەکێکی هەیە، نە ناوێکی هەیە، نە نازناوێکی تەشکیلاتیی هەیە. هەموویان وەک ڕەشبگیر گیرابوون. دەنا خەڵکی حیزبیی زۆر گیران. جا لە حاڵەتێکی ئاوادا ئەمنیش چارەنووسم هەر ئەوە دەبوو. یان دەبوو وەکوو زۆر خەڵکی دیکە دەرباز بم. ئەگەر لەبیرت بێ بە شکانی بزووتنەوەکە لە هەموو مەنتەقەکان خەڵکێکی زۆر هەڵاتن. مەسەلەن "هێمن"ی ڕەحمەتی ئەو ساڵەی

مەلات، ئەمن ٤٦ی مەلاتم ئەو ٤٧ی مەلات. زۆر کەسی دیکەش مەلاتی بەشێکیان چوونەوە بەشێکیان مانەوە. ڕەحمەتی مامۆستا مەلا خدری سارتکێش ئەوی سالی مەلات. ئەگەر حەل‌ئەعاتبامایە یەقینەن دەگیرام، چونکە مومکین نەبوو. عەرزم کردی وایان ناسانئبووم کە هەروا بزانە فەرماندەی کوللی قوام لەو مەنتەقەیەدا، لە حالێکدا هیچ شتێکی وا نەبوو.

**هێلس کاردۆ:** مامۆستا فەرمووت هەر تێکۆشانی تەشکیلاتیت نەبوو لەو وەختیدا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا، لەبەر ئەوەی وەزعیەتم زۆر خراپ بوو. ئەمن ئەگەر دەستەی تەشکیلاتی بایەم هەر زۆر زوو دەکەوتمە داوەوە. هەربۆیە تەنیا وەک تەرەف مەشوەرەتێک حیسابم لەسەر دەکرا. بەڵام هەروەک عەرزم کردی وەزعێکی وام بۆ خولقابوو کە تەواوی خەلکەکە، نەک هەر لەدێی خۆمان بەلکوو لە دەوروبەریش باوەڕیان پێم هەبوو. ئەگەر شتێکم گوتبایە حەتمەن جێبەجێ دەکرا. لەو بارەیەوە مەوقعیەتێکی زۆر تایبەتیم هەبوو.

**هێلس کاردۆ:** مامۆستا لەو تەجروبەیەی مەلا ئاوارەی، لەو شێوە ڕێکخستنەی هیچ کەلک وەرنەگیرا دوایە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەڕاستیدا کاری تەشکیلاتی لەپاش مەلا ئاوارە پاش دەورانی خەباتی تەواو نهێنی قەت جێی خۆی نەگرتەوە. یانی ئەمن زۆریشم ئیسرار دەکرد، ئەمن کاری تەشکیلاتیم نەدەکرد ئەو وەختی بەلکە لە مەجالەکانی دیکەدا کارم دەکرد، بەڵام دەمگوت با فریوی ئەوەی نەخۆین ئێستا مەنتەقەی ئازادمان بەدەستەوەیە. حیزب دەبێ تەشکیلاتی نهێنیی هەبێ. بەڵام ئەوکاتێ کە ئیمکانێکی زۆرمان بۆ کاری تەشکیلاتی هەبوو، تەشکیلاتی نهێنیمان نەبوو. دواتریش وای لێهاتبوو کە ناچار بووین سنوورەکان بەجێ بێلین هەرکات پێشمەرگە دەچۆوە بۆ ماوەیەکی نیسبەتەن درێژ کاری تەشکیلاتی دەواقیعدا دەگەل کاری پێشمەرگانە دەستی پێدەکرد. ئەمن دەمگوت کە پێشمەرگە دێتەوە، حیزبیش دێتەوە پشتی جەبهەی، چونکە کاری تەشکیلاتییش دەگەل کاری پێشمەرگایەتی تەواو دەبوو. ئاوا ناڵێ، حیزب دەبێ بێتێ. دوایە کە بەداخەوە ئیمکانی خەباتی چەکدارانە نەما، ئەو قازانجەی هەبوو کە تێ گەیشتین دەبێ تەشکیلاتی حیزبیمان هەبێ، کە ئەو تەشکیلاتە حیزبییە هەمیشە هەبێ. ئەمن دەتوانم بڵێم ئەگەرچی ئێستا تێکۆشانی تەشکیلاتیی ئێمە وەک زەمانی مەلا ئاوارەی بەتایبەت لە موحیتی فەعالییەتی مەلا ئاوارەیدا بەربلاو نیە، وەکوو تەشکیلات، ـ چونکە لایەنگر جوێیە دەگەل تەشکیلات ـ بەڵام تەشکیلاتی ئێستامان ڕاست وەک ئەو

[illegible] لی کاروبوه کە بچمە ناو سیاسی‌یەوە بەڵام ئەو ڕێبەرە سیاسی-یانە. چونکە ئەمن قەتم ئیدیعای ڕێبەری نەکردوە هەر وەک ئێستاش ئیدیعای ناکەم. بەڵام وەکی باست کرد موشکیلاتی ماددی‌و مەعنەوی ڕەنگە هەر لە کۆنەوە دەگەڵم لە دایک بووبێ. دەگەڵیشم دەچێتە قەبری. ئەوانە هەر هەبوون. بەڵام کە هاتم بۆ دەرەوە وەزعیەتێکی سەیرم بۆ پێک هات. دیارە بەسەڵتو سپادەی هاتم. هاتم لە دێیەکی دانیشتم بە ناوی "ماردەوێ". ساحێبی دێیەکەی ئەو وەختی پیاوێک بوو بە ناوی "کوێخا قادری حەسەنی". پیاوێکی نیشتمانپەروەر بوو. دوو قادر هەبوون هەردووکیان ئامۆزا بوون. یەکیان پێیان دەگوت قادری حەمەدی، ئەوی‌دیکەیان قادری حەسەنی. هەروەک ئیستیلاحی مەنگوڕان. جا ئەوە کوێخا قادری حەسەنی بوو. بەداخەوە لە حادیسەیەکی زۆر خراپ لە حزمایەتی‌دا لێیان دا کوشتیان. نە ماڵم هەبوو، نە مزگەوتم هەبوو، نە حوجرەم هەبوو، هیچم نەبوو. دێیەکە هیچی نەبوو، هەر لە دیوەخانی کوێخای دەمامەوە. دوایە پاش پێنج شەش مانگان ماڵم بۆ هات. ئەوجار هەم خانوویان بۆ دروست کردم هەم فەقێم ڕاگرت‌و حوجرەی فەقێیان بوو بە ئەنکەیەک. لەواقیع‌دا ئەنکەیەکی حیزبی بوو.

**هەیاس کاردۆ:** بۆ ئەو دێیەت هەڵبژارد بۆ نیشتەجێ بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کە هاتم بۆ ئەو دیوەی، ڕەفیقێکمان هەبوو خەڵکی مەنتەقەی سەردەشتێ بوو. مەلا کریمیان پێ‌دەگوت لە ناوچەی "سوێ" بوو. میوانی وی بووم. لەپاشان هەر ئەو بە پیاوێکی دیکەی زۆر بەڕێزی ناساندم بەناوی "حاجی مەلا عەوڵا" کە بەئەسڵ خەڵکی "دۆڵە تووێ" بوو، بەڵام چونکە دۆڵەتوو مامەشەو دەگەڵ مامەشان خزمایەتی‌و تێکەڵاویی هەبوو لە سوێ مەلا بوو. ئەو وەختە لەوێ ئێمە دەفتەراتمان نەبوو. ئەنکەی حیزبیمان نەبوو، هیچمان نەبوو. لە ئەسەر جووڵانەوەی ٤٧-١٩٤٦دا فەقەت ئەفرادمان مابوو. تەنانەت ئەفرادەکە وەکوو فەردیش پێوەندیی تەشکیلاتی‌یان پێکەوە نەمابوو. لە دوای کۆنفڕانسی دوو ئەوەمان دەست پێ کردەوە کە سازمانیان دەینەوە دەنا هیچمان نەمابوو. ئەدی دەبوو چ بکەم؟ هەر دەبوو ئەو کەسبەی بکەم کە دەمتوانی. یانی مەلایەتی بکەم. لەدێیەک ببمە مەلاو لە عەینی کاتیش‌دا دەبوو خۆ بشارمەوە. ئیگەرانیی ئەوەش هەبوو کە بکەومە خەتەرەوە. ئەو خەتەرە هەبوو ئێلی شاراوە نیە. بۆیە ئەو حاجی

مەلا عەولایە ـ نازانم ئەو وەختی ببوو بەحاجی یان نا ـ ڕێنوێنیی کردم ، گوتی دێیەک هەیە بەناوی مارەدوێ تالیبی مەلان، گوتی ئەگەر ڕازی بی دەچینە وێ. گوتم زۆر چاکە. دەگەڵ وی چووین بۆ وێ. دیارە لەوێ دەشیان ناسی. لەوێ دامەزرام بە مەلایەتی. بەڵام مەلایەتی چ بوو بەراتیان بۆ من بڕیبۆوە. ماڵێک دینارێک. ماڵێک دوو دیناروو ئەوە. پێم وابێ لەسەر یەک ببوو بە سی‌و نۆ دینار. هێندێک گەنمیشیان دانابوو بەدەنێ کە ئەویش ببوو بە سی‌وحەوت پووت. تەواوی داهاتی من ئەوە بوو. کە دیارە ئەوە هەر هیچ نەبوو. هەر بۆیە دامانا کە ئەمن کاسبی بکەم. خەڵکی وێ تووتنیان دەکرد، ڕازی بووم وەکوو وان تووتنی بکەم. هیچ عەرزێکیش نەبوو بەدەنێ. تەنیا جێگایەک هەبوو پێیان دەگوت 'بەردێنان' ناوی خۆی بە خۆیەوە بوو، هەمووی بەرد بوو. بەڵام بە هەرحاڵ زەوی بوو. ئاوی هەبوو. لە باری ئاوەوە زۆر دەوڵەمەند بوو. گوتیان ئەوێ هەڵدەوژێرینەو شتێکی لێ ساز دەکەین. مەڕیشی لێ ڕادەگرین بۆ ئەوەی کوود بدرێ، ئەوە بۆ تۆ. قەبووڵم کرد. منداڵێکی زۆریش لە دێی‌دا دەمیان‌خوێند. قوتابیم بوون. دیارە فەقێم نەبوون. هەر دەرسی قورئان‌و کتێبی کوردی‌و ئەلفوبێ‌و ئەوانەم پێ دەگوتن.

چووین ئەو جێیەمان هەڵوەژاردو مەڕیان لێ ڕاگرتەوە بۆ ئەوەی کوود بدرێ. نیەی کردم بە تووتن. دیارە زەحمەتی زۆر بوو بەرهەمیشی زۆر نەبوو، کەم بوو، بەڵام بە هەرحاڵ باش بوو. چونکی تووتنەکە چل‌و پێنج دیناری لێ پەیدا بوو. دەواقیعدا چل‌وپێنج دینارەکە لە سی‌و نۆ دینارەکەش‌و لەو چەند تەنەکە گەنمەش زیاتر بوو. چونکە تەنەکەی گەنم بەکەمتر لە ڕوبعە دینارێک بوو. جا لەبیرمە، لەبەر ئەوەی پرسیت داخوا ئیحتیاجیی ماددی پەشیمانی نەکردیەوە؟ جارێکی هەر ئەو ساڵەی ـ دوایە نیەی فەقێم ڕاگرتن ـ هەرچەوەزی نێوکۆڵی تووتنیمان کردبوو. ئەمنیش چووم فەقێکانیشم دەگەڵم هاتن. مەلاخدری دۆڵەگەرمی یەکێکیان بوو، مەلا ڕەحمانی کاژمی یەکێکی دیکەیان بوو. ئەوانە فەقێم بوون. یەکی دیکەش کە نازانم ئێستا ماوە یان نا چونکە لە ئێراقێ‌یە ناوی مەلا موحەممەد بوو. ئەوانەشمان هەموو چووبووین. کە داوای ئەوەم کردبوو خەڵک کۆمەگم بکەن چونکە هەرەوەزم کردبوو، منداڵیان ناردبوون. منداڵی هەشت ساڵە، دە ساڵە بۆ نێوکۆڵ کردنێ. پێم وایە دە دوازدە منداڵیان ناردبوون لەوانە هەر دوو سی‌یەکیان کوڕ بوون دەنا ئەوانی دیکە هەموو کچۆڵە بوون. ئەوە ئەمن دانیشتوومو نێوکۆڵێ دەکەم. لە حەسانەوەیەک‌دا ڕەحمەتی مەلاخدری دۆڵەگەرمی گوتی لەگۆڕی بابی شای بەم لە تۆ دەترسێ هاتووی لەسەر پشتە دیزاوێ دەگەڵ کچۆڵەی هەشت ساڵە دادەنیشی‌و نێوکۆڵێ دەکەی؟ گوتم ئیشتیبای تۆ ڕاست دەوێ‌دایە. چونکە ئەوجار دەبێ لێم بترسێ. ئەگەر دەکۆشکێکی سێ قاتەدا بام‌و داهاتم هەبایەو سەرم بۆ دانەنواندبایە هیچ هونەر نەبوو. بەڵام ئێستێ دەبێ لێم بترسێ کە بەچەنگ‌و نینۆکان نانی پەیدا دەکەم‌و سەریش دانانوێنم. هەر بۆیە دەبێ بڵێم ئەوە قەت هیچ تەزلزولێکی لە ڕوحی مندا پێک نەهێنا. لەپاشان کە دەڵێی داخوا حیزب کۆمەگی کردی؟ حیزب لە

وەزعێکدا نەبوو کۆمەگمان بکا. لەبیرمە ئەو وەختیش حیزب چی بوو، ساڵی ئەوێ ئەندامی حیزب تەنەت کاک ئەمیری قازی بوو کە وەک ئەندامی حیزب دەناسرا. دەگەڵ مەرحوومی مەلا سەید ڕەشیدی حوسێنی کە ئەویش هەر ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو. بەڵام ئەو وا ئەناسرابوو، وا ئەندام نەبوو.

جارێکی کۆمەگێکی پێ کردم. کۆمەگەکە ئەوە بوو هیچ وەسیلەی هاتوچۆمان نەبوو. چووبوو بە وەسیلەیەک بۆ من و کاک حەسەنی ڕستگار تەزکەرەی دەرهێنابوو.

**عەباس کاردۆ:** کێ ئەو کارەی کرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کاک ئەمیری قازی. تەزکەرەش دەبوو لەسەر ناوی خەڵکی دیکە بێ، کەسێک مردوو کرێخاسجیلان بەپارە لەسەر ناوەکەی تەزکەرەیان دەردێنا. بۆ هەر یەک لەمە دە دیناری خەرج کردبوو. یانی پارەی دابوو. ئەوە لەسەر دڵم عەراق بوو، زۆریش لەسەر دڵم عەراق بوو. هەوڵمدا وەری نەگرتەوە. هەرپێم وا بوو نیوخۆیەتی. هەتا کۆنفرانسی دوو، لە کۆنفرانسی دوو منیان دانابوو بۆ پێداچوونەوەی ماڵی. ئەویش ماڵی چی؟ ڕەنگ بوو بە هەمووی ئەو ماڵە دەی کردە هەزار دینار یان دوو هەزار دینار. کە تەماشام کرد ئەو بیست دینارە لەوێ نووسراوە، بەخۆشی لەوێ بوو لێم پرسی گوتم پێم وا بوو نی خۆتە. گوتی ناوەڵڵا نی خۆم نەبوو، بەڵام پێم دروست نەبوو بڵێم نی حیزبە. جگە لەوە هیچ کۆمەگێکی مادەیی حیزبم پێ نەگەیشت چونکی حیزب هەر نەشی بوو هەتا کۆمەگم بکا. تەنانەت ئەوە تاریخێکە کە دواتر ئێمە وەزعیەتێکی دیکەمان پەیدا کرد و کوردستانمان بەجێ هێشت و چووینە بەغدا. لەوێ بۆ ماوەیەکی کەم لەسەر حیزب دەژیام. مانگێ سی دینارم لە حیزب وەردەگرت. بەڵام دواتر ئەمن کارم لە ڕۆژنامەیەک وەرگرت، لە ڕۆژنامەی "هاوکاری". لەوێ وەکوو ڕۆژنامەنووس کارم دەکرد. دیسانەکە زۆربەی هەرە زۆری ژیانی مادەیی من ــ کە پاش دوکتۆر قاسملوو تەنیا کەسیش بووم ـ هەر لەسەر خۆم بوو. لە ئاخریدا کە مەعیشەت زۆر گران بوو لەبیرمە دەقاوەدەق کە هەوڵی بە پەنجا دینار دامەزرام دوایە زیادی کرد بوو بە سەت دینار، بەڵام ئەویش بەشی نەدەکرد. هەر بۆیە حیزب مانگێ پازدە دیناری کۆمەکەمەزینە دەدا بەمن. لەحاڵێکدا برادەرانی دیکە سەت دینار و سەت و بیست و سەت و پەنجا دیناریان وەردەگرت. لەو بارەیەوە ئیدی لەسەر حیزب نەدەژیام لەسەر کاری خۆم دەژیام.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ماوەی چەند بە تەنیا ژیای کە هاتیە ئەو دیوی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کە هاتم زۆر کەم پێوە خرا. بە باشی لەبیرم نیە داخوا کەوتبووینە زستانێ یان نەکەوتبووین، چونکی زستانەکە زوو هات، یانی زۆر زوو بەفر باری. با بڵێین لە بەقرانبارێدا هاتم پێش

جۆزەردانی سەری ماڵێم دایەوە. یانی لە بانەمەڕیدا سەری ماڵێم دایەوەو یەک شەویش لە ماڵێ بووم. چونکی ماڵەکەمان لە سنووری نیزیک بوو. ئەویش بەوحیسابە تەنیا نەفەرێکم دەگەڵ خۆ بردو بە بێ چەک چوومەوە ماڵێ، چونکی ئەمن بەحیساب چووبوومە حەجێ و پێم وا بوو خەڵک هەروا دەزانێ. ئەوکات حاجی هێشتا نەهاتبوونەوە. بەڵام کە چوومەوە زانیم قەزیەکە شتێکی دیکەیە. لەبەر ئەوەی هاتوچۆ نەبوو ئەمن ئەم- زانیبوو. ئەوجار زانیم ئەو ئەفسەرە یانی هەر ئەو بەنیعامری یە بۆخۆی چۆتە ماڵەکەی من. ماڵەکەی منیش کێیە؟ دایکمە، خێزانمە، ئەو گەلاوێژیەو کچێکی دیکەشم هەبوو کە پێش ئەوەی ماڵێ پێنم مرد. یانی بە تەولی کوردەواری چوار زەعیفەی تێدابوون. چووبووە خودی ماڵەکەم. ئێستا دەزانن کە ئەمن قاچاغ بووم و هەڵاتووم. ئیدی ئەو شەوەی لەوێ بووین بۆ بەیانی هەتا ئێواری مابینەوە. ئێواری کە نانو چامان خوارد دووبارە وەڕێ کەوتین گەڕاینەوە. جا ئەو پیاوە زۆر کارکوشتە بوو گوتی ئەوە نەتکی تۆیە بە منی دەکەی دەنا ئەمن چۆن بەبێ چەک دێمە نێو عەجەمان؟ وا بوو دەجۆزەردانیدا هاتینەوە چونکە پێم گوتبوون خۆیان ساز کەن. ئیدی هاتینەوە ماڵ و منداڵەکەم برد. ماڵ و منداڵەکەشم چی، فەقەت دەستە نوێنێکمان لە ئێسترێکی هەڵبەستو خێزانم لەسەری سوار بوو. موحەممەد منداڵێکی دوو مانگە بوو. ئەومان دایە دەستی و بەنیاز بووین گەلاوێژێ لەکن دایکێم بەجێ بێڵین چونکە دایکم دەمایەوە. کەچی سەیر بوو، وەخەبەریشمان نەهێنابوو، کاکە هات دەلینگی پانتۆڵەکەی گرتو گوتی بابە ئەمنیش دێم. ئەو وەختی دووساڵ یان دووساڵ و نیو دەبوو. هەستی بەوە کردبوو کە دەڕۆین گوتی بابە ئەمنیش دێم دەی خوایە چی بکەین؟ هەرچی کردمان وەڵاغێکی دیکە دەست نەکەوت. ناچار پیاوێکم بۆ بە کرێ گرت لە کۆڵێی بکا. لە کۆڵێی کرد هەتا گوندی "شێنێ". لە واقیعدا فاسیلەی بەینی قاچاغ بوونو هێنانی ژنو منداڵەکانم ڕەنگە چوار مانگ و نیو، یان پێنج مانگ بووبێ. زۆر نەبوو.

**هێلی کاردۆ:** ئەوەندەی لە نێوخۆ بووی و پێوەندیت بە حیزبەوە هەبوو هیچت لەسەر ئەندامانی ڕێبەری و ئەوە کە کارەکان چۆن بەڕێوە دەچن دەبیست؟ لەو ماوەیەدا بەگشتی حیزب چ قۆناغێکی تێپەڕ دەکرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو ماوەیەی ئەمن لە ژووری بووم هەم بە نیسبەتی خۆمەوە دوو قۆناغی ئەساسیی هەیە هەم بە نیسبەت ڕێبەریی حیزبەوە دوو قۆناغی سەرەکی هەن. ئەوەی خۆم بەشێکی ئەوەیە کە وەزعی سیاسیم زۆر لەخواری بوو. چونکی پێگەیاندنی حیزبی شتێکی وای تێدا نەبوو. ئەوە کە خەڵک لە دەورەی کادردا فێر بکرێن و هەموو ڕۆژێ ڕۆژنامە بخوێننەوەو بڵێین ئەدەبیاتی حیزبی لەبەر دەستدا بێ و شاریی سیاسی بچێتە سەرێ، یان بەتایبەتی کۆبوونەی گەورە یان چووکەڵەی حیزبی بۆ بگیرێ، لە گۆڕێدا نەبوو. شێوەی حیزبایەتیی ئەو وەختی شێوەیەکی زۆر بەرتەسک بوو. لە بەشەکەی دوایەدا کەم‌وزۆر ـ ئەمن ئێستاش

ئیدیعا ناکەم وریایی سیاسیم لەسەرێیە ـ بەڵام کەم‌وزۆر پیاو پێ گەیشتوو دەرکی مەسایل دەکا. ئەوەی پێوەندیی بە ڕێبەرایەتیی حیزبیشەوە هەیە، ماوەیەک ڕێبەرایەتیی حیزب لەڕاستی‌دا نەناسراو بوو. کەس نەی‌دەزانی کێیە. یانی لە بەدەنەی حیزبدا.

**هەیاس کاروان:** ئەوە چ ماوەیەکە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو ماوەیە کە خەباتەکە نهێنی‌یە، لێدراوی حیزبە، لە بەعێتی بیستوپێنجەوە کە کۆماری کوردستان دەڕووخێ تا دەگاتە ساڵەکانی پاش سی‌و سێ، سی‌و چوار ئەوانە کە بەرەبەرە شتێک وەکوو ڕێبەرایەتیی حیزب دەردەکەوێ. بەتایبەتی دواتر، دوای کۆنگرەی دوو کە ئەوجار ئەوەی پێی دەڵێن ڕێبەرایەتیی حیزب و لەبەرچاوە دێتە کوردستانی عێراق و خۆی دەنوێنێ، جا لە بەشی یەکەمدا نە ئاگام لە ڕێبەرایەتی بووە، نە ئاگام لە سیاسەتەکانی بووە و نە هیچم هەبووە. بەڵام دواتر کە شۆڕشی١٩٥٨ی عێراق ڕووی دا و بزووتنەوەی کورد لەو وڵاتە بووژایەوە ڕێبەران و کادرەکانی حیزبیش بە تایبەتی دوای پەلاماری پۆلیس لە ساڵی ١٣٣٨دا ئاوارەی کوردستانی عێراق بوون، خەڵک لە ژوورێ‌دا نەک هەر ئەندامانی حیزب، تەنانەت ئەوانەی ئەندامی حیزبیش نەبوون هەر وەکوو ئێستا کەم یان زۆر لە ئەخباری نێو کادری بەڕێوەبەری ئاگادار بوون. ئیدارە هەر وەکوو ئێستاش گلەیی و گازندەیان لێ‌یان هەبوو. چون ئەو وەختی وەک ئێستا و دەکرێ بڵێم خراپتر لە ئێستاش دووبەرەکی و ململانەیان لە بەینی‌دا هەبوو. تەنانەت تەقسیم ببوون بەسەر دوو بەش لە پارتی دێموکراتی کوردستاندا بەتایبەتی دوای ساڵەکانی ١٩٦٤ کە ڕێبەرایەتیی پارتی تەقسیم بوو بە ڕێبەرایەتیی بارزانی و مەکتەبی سیاسی کە بە ئیستیلاحی ئەو وەختی پێ‌یان دەگوتن مەلایی و جەلالی. ئەو وەختی بە کردەوە ڕێبەرایەتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانیش، یان ئەوانەی نەقشی ڕێبەری‌یان هەبوو — چونکە هەموویان ئەندامی ڕێبەری نەبوون — ئەوانەش نەوعێک تەقسیمیان لەنێودا پەیدا ببوو. هێندێکیان لەملا بوون هێندێکیان لەولا بوون. تەنانەت لە نێوخۆی وڵاتیش‌دا ببوو بەشەڕ و هەراو پێک‌هەڵپڕژان. حەتا جارێکی ئەمن دوو ڕەفیقی زۆر عەزیزم لێ میوان بوون دەستیان کرد بەو باسانە. لە هەوەڵەوە پێم وا بوو دیانەوێ بزانن ئەمن چیم ئاگا لێیە. لەپاشان تەماشام کرد مەسەلە زۆر جیددی‌یە. پێم گوتن بابە ئەوە مەسەلەی مە نیە. یانی مەسەلەی بەینی دوو بەشی بزووتنەوەی کورد لە باشووری کوردستان یان بڵێین جەلالی و مەلایی‌یەکانە. گوتیان ئەوە نیە لەوێش ئی ئێمە هەر ئاوان. گوتم ئاخر ئەویش هەر خراپە. ئەوەم زۆر چاک لەبیرە.

بەڵام ئەوەی ئەمن دەتوانم وەک خاڵێکی گرینگ لە کاری ڕێبەریی حیزبی دێموکراتی کوردستاندا وەبیری بێنمەوە ـ کە باسی حیزبی دێموکراتی کوردستانیش دەکەم لەبەر ئەوەیە کە ناوی هەر ئەوە بوو. لە کۆنگرەی چوارەوە ئەو ناوە بۆتە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ـ بەدوای کۆنگرەی دووەدا بوو. ئەمن لە

کۆنگرەی دوودا بەشدار نەبووم. کۆنگرەی دوو لە پایزیدا گیرا. ئەمن لەئاخرو ئۆخری ڕەشەمەدا بەیاننامەی کۆتایی کۆنگرەم دەست کەوت. کە تەماشام کرد تێبینیم لەسەر بەیاننامەی کۆتایی کۆنگرە زۆر بوو. ڕەنگە ڕوشدی سیاسیی من ئەو وەختی وا نەبوویێ کە لەسەر هەمموو شتێک مولاحەزاتم هەبێ، هەرچەند ئێستا کە تەماشا دەکەم تێبینیی دیکەشم هەیە. بەڵام تێبینیی زۆر گرینگم ئەوە بوو کە زۆر بێ بەزەیی‌یانە هەڵی کوتابووە سەر ڕێبەرایەتیی کۆماری کوردستان. ڕێبەران و دامەزرێنەرانی کۆماری کوردستانی بەجارێک مەحکووم کردبوو. خولاسە هیچی پێوە نەهێشتبوون. ئەوە وای کرد کە ئەمن هەوڵ بدەم بێم لە نیزیکەوە قسان بکەم. ئەمن لە ئێران بووم. هاتم بۆ ئەو دیوەی کە بنکەی ڕێبەرایەتیی مە لە"سوتێ" بوو. بەڵام لە"شێتنێ"وە دەستی پێ‌دەکرد کە لەوێش هەر بنکەی حیزبیمان هەبوو. لەواقیعدا زیندانی ئەو مەنتەقەی ــ کە ئەوەش بۆخۆی داستانێکە ـ واتە زیندانی بزووتنەوەی کورد لەو بەشەی، لە شێتنێ بوو کە ئیدارەکەی درابوو بە ئێمە، واتە بە حیزبی دێموکڕات. ئەوە بۆیە دەڵێم ئەوەش مەسەلەیەکە کە نوختەی تاکۆکیی ئێوان خوالێخۆشبووان عەبدوڵلای ئیسحاقی‌و سەدیقی ئەنجیری بوو. سەدیقی ئەنجیری پیاوێکی زۆر ناسک بوو. پیاوێکی زۆر خوێندەوارو سیاسی‌و تێگەیشتوو بوو. بەڵام لەعەینی حاڵدا پیاوێکی زۆر ساویلکە، سۆفی مەسلەک‌و عارف مەسلەک بوو. بەڵام لێرەدا شتەکە لەوەی تێپەڕیبوو. دەیگوت بابە ئەو کارە بۆ کاری ئێمەیە؟ ئێمە کە دەمانەوێ کۆمەک بە بزووتنەوەی کورد بکەین، بۆ زیاد لە هەمموو شتێکی ببوینە "دۆخیم". ئاخر ئەو کەسەی لە زیندانی‌یە ڕقی لەو کەسە هەر هەڵدەستێ کە زیندانەوانە. ئێمە لێرە بۆ بووینە زیندانەوان ؟ باشە با پێشمەرگە بنێرینە جەبهە. با کارێکی موفیدی دیکە بکەین. بەڵام کاک عەبدوڵلای ئیسحاقی کە بڕیاربەدەستی ئەسڵی هەر ئەو بوو، زیندانی وەرگرتبوو.

بەهەر حاڵ ئەمن دەگەڵ ڕەفیقێکی دیکە هاتم. با هەر ناویشی بەرم کاک حەسەنی شیوەسەڵی. هاتین شەوێ لە شێتنێ بووین و بەیانی هاتین بۆ سوتێ. هێندێکیانم لە نیزیکەوە هەر نەشدەناسین لە ڕێبەرانی حیزبیە دووریەدوور یەکترمان دەناسی بەڵام ئاوا هەمووم نەدەناسین. ئەمن کە هاتم زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردم، زۆر بەموحیببەتەوە وەریان گرتم. لەپاشان داوام کرد دەگەڵیان دانیشم. بەبێ ئەوەی ئەمن بڵێم ـ ئەوەی وەکوو وەفا دەڵێم ـ ئەحمیەتێکی زۆریان دانا. لەبیرمە، بەداخەوە هەموویان شەهید بوون کاک سولەیمانی موعینی، کاک مەلا ڕەحیمی مەریجەلانی ( کاک مەلا ڕەحیمی ڕێزدی)، مەلا کەریمی سارەی کۆسانی، کاک ئەحمەد پاشایی کە پێیان دەگوت "بابیر شکاک"، ئەگەر ئیشتیبا نەکەم کاک سەید تاهیری ئیمامی کە ئەویش ئەندامی کومیتەی چاوەدێریی بەرز بوو. ئاوا پێنج شەش کەس دەگەڵم دانیشتن.

**عەباس کاردۆ:** کاک ئەحمەد تۆفیق لەوێ نەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر کاک ئەحمەد لەوێ نەبوو. دواتر هاتەوە. چونکە ئەمن دوو، سێ شەوان لەوێ بووم. دواتر هاتەوە یەکترمان دیت. بەڵام لە کۆبوونەوەکەدا بەشدار نەبوو. زۆر بەقوەتی لەسەر ئەوە ئیعتیرازم گرت کە ئیفتیخاری کورد لە هەموو جێیەک کۆماری کوردستانە. ئێستێ ئەوە چ زەروورەتێکە کە ئەو پەلامارە دەبرێتە سەر ڕێبەرانی کۆماری کوردستان و بەجارێک مەحکووم دەکرێن؟ تەناتەت سووکایەتیشیان پێ کرد. پێم وایە مامۆستا مەلا ڕەحیم بوو، گوتی قسەکانت زۆر جوانن بەڵام پێمان خۆشە بزانین ئەو ئەزموونە ئەزموونی خۆتە یان کەسێکی دیکە قسەی کردوە ئەتۆ پێت دروست بووە. لە وەڵامدا گوتم ئیشکالی کاری ئێوە هەر لێرەدایە. پێتان وایە هەر بۆخۆتان هەموو شتێک دەزانن و کەسی دیکە هیچ نازانێ. ئەوە تێ زیرەکیی من نیە. ئەو بەیاننامەیە بۆ هەر کوردێکی نەخوێندەواریش بخوێنیەوە، عەینی ئەو قسانەی لەسەری دەبێ کە ئەمن دەیانکەم. ئەوە شتێک نیە یەکێک لە یەکێکی فێر بێ. لەپاشان ڕەحمەتی کاک سولەیمانی موعینی گوتی باشە ئەتۆ بەیانی (بەیاننامە) دەی خاکەلێوەت دیتوە؟ ئەمنیش گوتم بەیانی دەی خاکەلێوەی چی؟ خۆ ئێستا نەبۆتە بەهار. بیست و چوار و بیست و پێنجی ڕەشەمە بوو. گوتی نا، بەڵام نووسراوە. گوتم نەخێر نەمدیوە. گوتی ئامادەیە دەتدەمێ بیخوێنەوە. باسەکانمان زۆر دوور و درێژ بوون. گەیشتینە لای نیوەڕۆیە و چووین بۆ نان خواردنێ، لەسەر نانخواردنێ هەر بۆخۆی چوو بەیانێکی بۆ هێنام. نوسخەیەکی چاپ کراو کە ئامادەیان کردبوو بڵاوی بکەنەوە. ئەوە بۆخۆی کارێکی چاکە کە ئەگەر بەیان بۆ موناسەبەتێکە کە مەعلوومە، ئەتۆ زووتر ئامادەی دەکەی... کە ڕێی دام هەر لەسەر نانخواردنێ خوێندمەوە. زۆر بەپەلە بووم بیخوێنمەوە. چونکی ئەوەیان کورت بوو، بەڵام بەیانی کۆنگرەی زۆر درێژ بوو. لەوێدا تەجلیل لە شەهیدای دەی خاکەلێوە کرابوو، لە پێشەوا قازی و ئەوانی دیکە.

پاش نوێژێ دووبارە سەعات چواری دانیشتینەوە. کاک سولەیمان گوتی خوێندتەوە؟ گوتم ئا. گوتی پێت چۆن بوو؟ گوتم بۆخۆی باشە. بەڵام بەهیچ جۆر نایێتە کەفارەتی گوناحی ئەوی دیکە کە لە کۆنگرەدا کردووتانە. وەک شتێک پێی جالیب بوو. لەپاشان وای کرد کە ئێمە دوو جاری دیکەش بەڵام نەک کۆبوونەوەی ئاوا گەورە بەڵکوو تەنیا ئەمن و ئەو پێکەوە دانیشتین و باس و موناقەشەمان هەبێ. شتی ڕاستەوخۆ کە لەپەیوەندیی دەگەڵ کار و ڕەفتار و سیاسەتی ئەواندا ڕەخنەم گرتبێ، تەنیا ئەوەم لەبیرە. بەڵام ئیدی لە دوایە دا کە ئەوبەندەم بووم ئەمنیش بۆخۆم بوومە بەشێک لەو جەریانانە.

# ئاشنایی دەگەڵ دوکتۆر قاسملوو

**عەباس کاروان:** بۆ یەکەم جار کەی و لە کوێ دوکتۆر قاسملووت دیت؟ ئەوکات ناوبراو چ کارە بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کاتێک لە ئاکامی وتووێژ و سەرەنجام ڕێک کەوتنی نێوان سەرکردایەتیی بزووتنەوەی کورد و دەوڵەتی عێراقدا بەیاننامەی ١١ی مارسی ١٩٧٠ دەرچوو، دوکتۆر قاسملوو ئەو وەختی لە دەرێ بوو، لە دەرێش کە بوو لەڕاستیدا پێوەندیی دەگەڵ هێندێک لە دۆستانی حیزبی هەبوو بەتایبەتی ئەوانەی لە دەرێ بوون. ئێستا ٤٧- ٦٤یش تێپەڕیوە، ئەویش سەرکوت کراوە، دەنا پێوەندیی دەگەڵ وان پتەو بوو. دوکتۆر قاسملوو هاتبۆوە بۆ سەردانی مەرحوومی بارزانی، بۆ پیرۆزبایی پێ گوتن و لەعەینی کاتدا ئەویشی دەمەزەردا بوو کە بزانێ چەندە ئیمکانی هەیە ئەو ڕەفیقەکانی بگەڕێنەوە بۆ عێراق، لە کوردستان یان لەعێراقدا تێکۆشانی حیزبی دەست پێ بکەنەوە. لەوکاتەدا کە ئەو لە ناوچەی باڵەکایەتی بوو، کاک ئەمیری قازیش کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو — ئەوە ئیدی دەکەوتە دوای کۆنفرانسی دوو کە ئەمنیش ببوومە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی — لەو ناوچەیە بوو کە بنکەی سەرۆکایەتیی بارزانییش هەر لەوێ بوو. ئەوان کە پێشتر یەکتریان ناسیبوو، دووبارە یەکتریان گرتبۆوە و قسەیان کردبوو. کاک ئەمیر هەر بۆخۆی باسی ئەوەی کردبوو کە ئەگەر ئیمکان بێ هەموو ئەو لکە پژانەی حیزبی دێموکراتی کوردستان وەسەر یەک کەونەوە. دوکتۆریش ئامادەیی نیشان دابوو. بەڵام هەر لەوێ گوتبووی ئەمن بەتەنێ نیم. ئێمەش هەموومان دەمێژبوو ناوی دوکتۆر قاسملوومان بیستبوو وەکوو سیاسییەکی بەتوانا و پیاوێکی زانا و خوێندەوار و مامۆستای دانیشگا و ئەوانە. هەر بۆیە زۆرمان پێ خۆش بوو کە دوکتۆر قاسملوو بێتەوە و پێکەوە کار بکەین. لەوێ دوکتۆر قاسملوو دەڵێ ئەمن پێم خۆشە، بەڵام بەتەنێ نیم. هێندێک ڕەفیقی دیکەشم دەگەڵن. یەک لەوانە کاک حەمەدەمینی سیراجی بوو. یەکیان کاک کەریمی حیسامی بوو. یەکیان کاک عەبدوڵڵا شلێر (یووسفی ڕیزوانی) بوو. هەم کاک حەمەدەمین و هەم کاک یووسف لە بەغدا بوون. بەڵام کاک حەمەدەمین بە سەڵتی دەژیا و ئەوی دیکە ماڵی هەبوو و کاسبیی دەکرد. دوکانی وێنەگریی هەبوو. بۆ ئەوەش دەبوو ئێمە موجەوەزێک وەربگرین. چونکە دوکتۆر قاسملوو بە بڕیاری کۆنگرە لە حیزب دەرکرابوو. کۆنگرەی دوو لە حیزبی دەرکردبوو. ئێستاش ئێمە دەمانەویست سەفحەیەکی دیکە هەڵدەینەوە. کۆمیتەی ناوەندیشمان بریتی بوو لەچەند کەسێک: پێش کۆنفرانسی دوو تەنیا سێ کەس لە ئەندامانی

کۆمیتەی ناوەندی مابوون. عەبدوڵڵای ئیسحاقی، ئەمیری قازی و مەلا سەید ڕەشیدی حوسێنی. کە کۆنفڕانسمان گرت هەر لە کۆنفڕانسدا نامەی ئیستیعفای کاک عەبدوڵڵای ئیسحاقییان هێنایە گۆڕێ. بۆخۆی لە کۆمیتەی ناوەندی ئیستیعفای دابوو، کە ئەوە داستانێکی دیکەیە. عیدەیەک ویستیان لێی قبووڵ نەکەن بەڵام گوتمان پاشە بۆ لێی قبووڵ نەکەین. بەهەر حاڵ دوای کۆنفڕانس کاک عەبدوڵڵا ڕۆیشت بۆ بەغدا. مایەوە پێنج کەس: کاک ئەمیری قازی، کاک سەید ڕەشیدی حوسێنی کاک حەسەنی ڕەستگار، ڕەحمەتی هێمن و ئەمن کە سێ کەسی دواییمان لە کۆنفڕانس هەڵبژێرابووین. ئێستا بەپێی پێڕەوی نێوخۆ، کۆنفڕانس لە هەلومەرجی تایبەتیدا سەڵاحیەتی کۆنگرەی هەیە، بەڵام ئەو وەختی شتی واشمان نەبوو. بەوحاڵەش هێنامان شتێکی وامان کرد. بۆیە ناومان لێنا "تەرمیمی کۆمیتەی ناوەندی" یان پینەکردنەوەی کۆمیتەی ناوەندی. پیاوێکی نیمچەخوێندەوارمان هەبوو کە قسەخۆش بوو، دەی گوت ئێوە بەرهەڵێنن. بەرهەڵێن ئەوەیە ئەگەر دیوارێک خەریکە بڕووخێ دیوارێکی دیکەی بەپشتەوە دروست دەکەن بۆ ئەوەی پشتی بگرێ. هەر بۆیە پێی دەڵێن بەرهەڵێن. ئێمەش یانی ئەو کەسانەی لە کۆنفڕانسی دوو هەڵبژێرابووین بەرهەڵێن بووین. لەبەر ئەوە ئیزنمان بەخۆمان نەدەدا کە بڕیار لەسەر شتی وا گرنگ بدەین. بۆیە هاتین کۆبوونەوەیەکمان ساز کرد. لەبیرمە لەبەر ئەوەی ئێمە شتێکی وامان لە کاری حیزبی نەدەزانی، سەروەستامان کاک ئەمیر بوو. ئەو ناوی لێنا "پلێنۆم" کە دوایە بۆم دەرکەوت پلێنۆم بەوە نالێن. ئەوە دەیتوانی ناوی بنێ کۆبوونەوەی بەرینی ئەندامانی حیزب. بەهەر حاڵ ئەوانەمان دەعوەت کردو ناومان لێنا پلێنۆم.

لەوێ شتەکە دەگەڵ موخالەفەتێکی زۆر توند ڕووبەڕوو بوو. دیارە پێشێ لەسەر خودی دوکتۆر قاسملووش. دوایە لەسەر دوکتۆر قاسملووی پاش تەوزیحی مە هەموو ڕازی بوون کە ئەو بێتە نێو ڕێبەری. تەنانەت ناواش بوو. ئێمە نامەیەکمان بۆ نووسیبوو کە کۆمیتەی ناوەندی حازرە هەتا کۆنگرە لە هەموو کۆبوونەوەکانی خۆیدا بەشدارت بکاو مەشورەتت پێ بکاو تەنانەت پێڕەوی لە نەزەراتیشت بکا. بەڵام بەتایبەت لەسەر کاک حەمەدەمینی سیراجی موخالەفەتێکی یەکجار زۆر توند هەبوو. زیاتریش بۆیە ئەوی دەگرتەوە چونکە کەریمی حیسامی و عەبدوڵڵا شلێر خەڵکەکە ئەوان دەناسین. بەڵام بەشێک لەوانەی لەو پلێنۆمەدا بەشدار بوون دیارە بەشێکی زۆرتریشیان موخالیفی بزووتنەوەی ساڵەکانی ٤٧-٤٦ بوون. کاک حەمەدەمینیشیان بە هەڵگێڕینەری ئەو کارە دەزانی. پێیان وا بوو ئەو ئاورە ئەو هەڵی ئایساندوە. لەبیرمە برادەرێک کە خوا عافووی بکا ئەویش مردوە ڕەئییەکی نووسیبوو ــ ئێمە ڕەئییەکانمان دەخوێندنەوە ــ هەرچی کردمان چوار پێنج کەس بووین بۆمان نەخوێندرایەوە. بە هەرکەسمان نیشان دا بۆی نەخوێندرایەوە. لەپاشان گوتمان ئەوێ ئەو ڕەئییە هی کێیە؟ ناتوانین بیخوێنینەوە. دەستی هەڵێناو گوتی ئەمن نووسیومە. گوتمان چیت نووسیوە؟ گوتی نووسیومە "حەمەدەمین وەک نەبووە با هەر نەبێ". بەهەر حاڵ ئەوە قبووڵ کراو ئەوجار بڕیار درا ئێمە

بچینە بەغدا یەکتر ببینین. چونکە دوکتور قاسملوو جارێک چووبۆوە دیسان گەڕابۆوە بەغدا. وا بوو کاک حەسەنی ڕەستگارو کاک ئەمیرو ئەمن ـ مام هێمن بۆی نەکرا ـ ئەو سێیەمان چووینە بەغدا. ئەمن بۆ یەکەمجار لە بەغدا دەگەڵ دوکتور قاسملووی ئاشنا بووم کە ئەو ماوەیە زۆری کێشا، لانی کەم چوار پێنج ڕۆژی خایاند. باسمان بوو، کێشەمان بوو لەسەر ئەوەی چۆن بێ. ئێمە نامەکەمان بۆ بردبوو و داوامان دەکرد کە دەبێ کۆمیتەی ناوەندیدا کار بکا بەو جۆرەی بۆمان نووسیبوو. ئەو گوتی نایەم، ئەمن ئەو کۆمیتە ناوەندی‌یەدا نایەم ئەو کۆمیتە ناوەندی‌یە لە کۆنگرەیەک هەڵبژێردراوە کە منی بە جاسووس ناسیوە دەری کردووم. ئێمە گوتمان باشە ئەوە دواتیدا وەرگرتنەوەی ڕەنی‌یەکەیە. گوتی تا ئەمن نایەمە نێو شتێکی تازا. دەبێ ڕێبەری‌یەکی تازە هەڵبژێرین و دەست بەکار بکەین هەتا دەگەینە کۆنگرەیەک، کۆنفرانسێک، شتێک. جا ناوی لێ‌دەنێن چی ئەمن هەر قسەشی لێ‌ناکەم. بڵێن کۆمیتەی بەڕێوەبەری، بڵێن کۆمیتەی ناوەندی، هەرناوێک ئێوە لەسەری دادەنێن ئەمن موخالەفەتم نیە. ئێمە زۆر موتەعەسسیب بووین لەسەر مانەوەی ناوی کۆنگرە ئەوانە. سەرەنجام ـ ئەمن لەنێو سەدە تێکۆشانیش دا هێناومە ـ کاک حەسەنی ڕەستگار کەلێنی دە وەحدەتەکەی مە خست. هات گوتی کاکە ئەمن شەڕی قاسملووم پێ ناکرێ. ئەگەر دەگەڵی رێک دەکەون رێک کەون. ئەگەر رێک ناکەون هیچ. کە وای لێ‌هات ئێمە مەجبوور بووین قبووڵی بکەین. هەر بۆیە هاتین لە کۆبوونەوەیەکی شەش ئەفەری‌دا کۆمیتە مەرکەزی‌یەکی هەشت ئەفەریمان هەڵبژارد کە ئەمن زۆر جار ئەوەم نووسیوە. شەش کەسەکەش ئێمە ئەو سێ کەسە بووین و ئەوانیش دوکتور قاسملوو بوو دەگەڵ کاک حەمەدەمین و کاک یوسفی ڕیزوانی. کاک کەریمی حیسامی کە لەوێ نەبوو ئەویشمان هەڵبژارد. مام هێمنیش کە هەبوو.

**هیوا کاردۆ:** یانی ئەوە بوو بە کۆنفرانس، بوو بەچی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەبووە هیچیان. تەنیا کۆبوونەوەیەک بوو ئەو بڕیارەی دا. ئەمن زۆرجار ئەوەم گوتوە ئەگەر تەماشای ئوسوول بکەین ئەوە هیچ ئەسڵێکی تێدا نیە. بەڵام بەڕاستی ئەوەی حیزبی دێموکرات هەیەتی و هەیبوو، نەتیجەی ئەو کارە خیلافە بوو. جا ئەگەر حیزبێکی بێ‌سەروبەرە بێ، بێ‌ڕێبەری بێ، هەرچی بێ، ئەوە بوو. ئەو کۆمیتە مەرکەزی‌یە توانی کار بکا، توانی ڕۆژنامە دەربکا، توانی ئیعتیبار پەیدا کاتەوە توانی لەنێو کۆڕوکۆمەڵە کوردستانی و ئێرانی و خاریجی‌یەکاندا بناسرێ. دوایە چووە کۆنفرانس و کۆنگرەو بەرنامەو ئەساسنامەی دانا. دواتر کە هەلومەرج گۆڕا گەڕایەوە ئێران بوو بەو شتە کە هەموومان دیتمان. بوو بە حیزبێکی میلیۆنی. ئەوە هەمووی ناکامی ئەو کارە "خیلاف"ە بوو.

**عەباس کاروان:** مامۆستا ئێوە کە کۆنفرانسی دووتان گرت، کۆنفرانسی یەکتان هەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کۆنفرانسی یەک ئەوە بوو کە ساڵی ١٣٣٤ بە بەشداریی دوکتور قاسملوو و جەمعێک لە تێکۆشەرانی حیزب لە "سەیدئاوا"ی مەهاباد گیرا.

**عەباس کاروان:** پاشان ئێوە دیسان لە کۆنفرانسی سێ هەڵبژاردنتان کردەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا ئەوە کۆنفرانسی دوو بوو. دوایە کە ئێمە دەگەڵ دوکتور قاسملوو و ئەوانە ئەو کۆمیتە ناوەندییەمان پێک هێنا، چووینە کۆنفرانسی سێ. لە کۆنفرانسی سێ ئەو ئەساسنامەیە کە نووسرابوو، تێیدا هەبوو کە لەهەلومەرجی تایبەتیدا کۆنفرانس دەتوانێ جێی کۆنگرە بگرێتەوە. ئەمەمان هەبوو. بەڵام ئەوەش خۆ کۆنگرە پەسەندی نەکردبوو. دیسانەکە هەر سەرتەشلەمە بوو. دەبوو بمێنێتەوە بۆ کۆنگرە، بەڵام تەحەمول کارەکان ڕاوەستن. بەڕاستییش هەر دەبێ وا بێ. خۆ لە شەرایتێکدا کە تەماشا دەکەی ئەساسنامە مانیعی پێشکەوتنە، نابێ قازانجی حیزب و بزووتنەوەو میللەت بە قوربانی ئەساسنامە بکرێ. دەنا ئەساسنامە پیرۆزە، دەبێ پەیڕەویی لێ بکرێ. قەت نابێ بە بێ زەروورەت عدوولی لێ بکرێ. بەڵام ئەگەر بەتەنێکی ئەساسنامە بوو بە مانیعی پێشکەوتن، مەنتیق حوکم دەکا کە ئەتۆ وازی لێ بێنی هەتا دەگەیە جێیەکی دیکە. ئیدی وا بوو لە کۆنفرانسی سێدا کۆمیتەی ناوەندیمان هەڵبژاردو بەرنامەو ئەساسنامەمان پەسند کردو ڕاپۆرت پەسند کراو دواتر ئامادەیی کرا بۆ کۆنگرە کە پاش دوو ساڵان کۆنگرەی سێهەممان گرت کە هەموو شتەکان لەوێدا پەسند کران.

# هەڵوێستی حیزبی دێموکرات بەرامبەر بە ئەحمەد تۆفیق

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ئەمن دێمە سەر باسێکی دیکە کە لەو بارەیەوە گلەیی زۆر لە حیزبی دێموکراتو ڕەنگە شەخسی جەنابیشتو ڕێبەرایەتی هەیە کە بێدەنگی‌یەکی موتڵەقتان کرد(تە پێشە لە ماوەی دەیان ساڵی ڕابردوودا. ئەویش مەسەلەی شەهید (عبداللە اسحاقی) ئەحمەد تۆفیقە. ئەمن هەوڵ دەدەم چەندێک پرسیار لەو بارەیەوە بێنمە گۆڕێ کە هیوادارم بۆ مێژوو وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەیەوە. پێم وایە ئێستا کاتی وەڵامی ئەو پرسیارانەش هاتوە. پێمخۆشە یەکەم پرسیارم ئەوە بێ کە: لەسەر پێوەندیی دوکتور قاسملوو دەگەڵ ئەحمەد تۆفیق شتی جۆراوجۆر گوتراوە بیستراوە. تۆ لەو بارەیەوە چی دەزانی؟ هەر لەچی‌دا ئەو دووانە بۆ کەوتنە بەرەی دژ بەیەک؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەی ڕاست بێ ئەمن لە نیزیکەوە ئەو دوو کەسەم هیچ وەخت دەمرقابیل یەک‌دا نەدیوە. ئەمن ساڵی ١٣٤٤ بۆ یەکەم جار چاوم بە کاک ئەحمەد تۆفیق کەوتوە. وەکوو باسیشم کرد ساڵی ١٣٤٩ بۆ یەکەم جار دوکتور قاسملووم دیوە. بۆیە ئەوەی بی‌زانم هیچی پێوەندیی بەوەوە نیە کە ئەمن شاهیدی ئیختیلافو ناکۆکی‌یەکانی وان بووم. ئەمن ئەوەی لێی بزانم، سەرفی نەزەر لەوەی کە لە کاتی ناکۆکی‌دا ڕەنگە قسەی ناحەق بۆ یەکتر هەڵبەستن. ڕەنگە عەیبوعار لە یەکتر بدۆزنەوە. بەڵام ئەوەی ئەمن لەو دوو کەسەی دەزانمو هەر دووکیشیانم ناسیوەو تاڕادەیەکی زۆر لەکارو تێکۆشانیان ئاگادار بووم، بەتایبەتی نی دوکتور قاسملوو، چونکە ئێمە نیزیکەی بیست ساڵ پێکەوە ژیاوین. شتەکە ئەوە بوو کە لە باری بیروبۆچوونی سیاسی‌و فکری‌یەوە تەفاوتێکی زۆر لە بەینی ئەو دووانەدا هەبوو. لە لایەک دوکتور قاسملوو پایەی خوێندەواری واتە مەدرەکی تەحسیلیی لەسەرێ بوو. لە دانیشگای موعتەبەر درسی خوێندبوو، ئەو وەختی هێشتا دوکتۆرای وەرنەگرتبوو بەڵام لیسانسو فەوقی لیسانسی هەبوو. لەپاشان پیاوێکی زۆر خوێندەوار بوو. زۆر زیرەک بوو لەباری سیاسی‌یەوە. کاک ئەحمەد تۆفیق – چونکی دەمانەوێ بەڕاستگۆیی قسان بکەین – لەباری خوێندەواری‌یەوە پێم وایە دیپلۆمی هەبوو، بەڵام لە باری خوێندەواریی سیاسی‌یەوە لە پلەیەکی زۆر بەرزترتر لە دوکتور قاسملوودا بوو.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ئەو دانیشجوو نەبوو کە هاتە دەرەوە؟

**عەباس کاردۆ:** ئەوە ئەو وەختەیە کە دوور خراوەتەوە؟ مەبەستم ئەحمەد تۆفیقە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر. ئەو دووانە ده ساڵیان فەرقە. ئەویان ١٩٥٩ بووە کە دارای دەرکردنی دوکتور قاسملووی کراوە. ئەوی دیکەیان ١٩٦٩ بووە کە ئەحمەد تۆفیق دوور خراوەتەوە. یانی ئەک دوورخرانەوەکەی ٦٩ بووبێ، بەڵکوو ئەوەی لە دوورکەوتنەوەی‌را چۆتە بەغدایە.

**عەباس کاردۆ:** لە مێژووی حیزبی دیمۆکراتدا شتێک بە ناوی کێشەی ئەحمەد تۆفیق هەیە. وا بزانم ئێستا کاتی ئەوە هاتوە لە زمانی جەنابتەوە ئەو گرێ‌پووچکەیە بکرێتەوە و بیرێتەوە. هەر بۆیە لەم پێوەندی بەدا چەند پرسیار دێنمە گۆڕێ: یەکەم ـ ئەحمەد تۆفیق چۆن دەسەڵاتی حیزبی خستە ژێر نفووزی خۆی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەحمەد تۆفیق بۆخۆی لە بنەڕەتڕا کادرێکی زۆر چالاکی حیزبی بوو. زۆریش فیداکار بوو. دەمەوێ ئەوەندەی لێی دەزانم زۆر بە ڕاستگۆیی باسی بکەم. لە چەند خەسڵەتدا پیاوێکی کەم‌وێنە بوو. چەندی بڵێی چوستو چالاک بوو، چەندی بڵێی فیداکار بوو. مەسەلەن کەم دێهاتی مەنتەقەی مەرکەزی کوردستان ماوە کە ئەو... لە کادێنانو لە ئەویلانیش‌دا ئەگەر پێویست بێ نەخەوێ. زۆر خەلکی بوو. ئەمن لە ڕەفیقی... کە گەورەیەتی ئەوەندەم متمانە پێی‌هەیە کە حازرم دەگەڵ خوشکم لەسەر دۆشەگێکی بخەوێنم. لە ...یک‌دا ئەمن دەزانم کە ئەویش وەک هەموو ئینسانان ئینسان بوو، فریشتە نەبوو، یانی پێوەندیی جینسیی هەر هەبوو، ... منداڵی نەبوو، قەتی ژن نەهێنا. پیاوێکی زۆر ئازا بوو. یانی ئەگەر کەوتبایەتە شەڕ بۆ دەستو...ەنگ زۆر ئازا بوو. لە هەڵوێستیش‌دا هەر ئازا بوو. شتێکی دیکە کە بەلامەوە زۆر موهیم بوو، ئەوەیە ...ێن ئوتووریتە. دەگەڵ ئەوەدا کە ڕەفیقایەتیی دەگەڵ ڕەفیقەکانی باش بوو، بەڵام عەزیزی ئەسین شتێک دەگێڕێتەوە دەڵێ: فەرماندەکەمان پێی‌دەگوتین فەرماندە دەبێ هەمیشە ئێوچاوانی سێبەر بکا. ئەویش لە موقابیل پێشمەرگەی ژێردەستانی‌دا ئاوا بوو. ئەوەندە بەئوتووریتە بوو کە ئەگەر ئەحمەد تۆفیق دەردەکەوت، هەموو کەس خۆی خڕ دەکردەوە. ئەوە خەسڵەتێکی باشە. نەک زەبروزەنگ‌و فیرعەونیەت، ئەوەیان خراپە بەڵام ئەوە کە ئەوانەی خوارتر حورمەتی بۆ دانێن‌و سامێکی هەبێ‌و بێ‌نەزمی قبووڵ نەکا خەسڵەتێکی باشە. ئەمن دەمزانی فەرماندەی حیزبی دیمۆکراتدا ئەو خەسڵەتەم نەدیوە کە گلەییم هەبووە کە بۆچی دەبێ وا بێ، کەوابێ کادرێکی بەرجەستە بوو، کادرێکی تێکۆشەر بوو، دە ڕێبەرایەتیی حیزبدا بوو.

بەڵام کە هاتنە عێراقو ئەو ئیختیلافاتە زیاتر لەوێ پەیدا بوو، نای‌شارمەوە کە ئەحمەد تۆفیق زیاتر بە پشتیوانیی خوالێخۆشبوو بارزانی بەسەر وەزعەکەدا زاڵ بوو. ئەو وەختی ئەوانە هەموو ئاوارەو دەربەدەر بوون‌و لە‌ ژێر دەسەڵاتی ڕێبەریی بزووتنەوەی کورد لە عێراقدا دەژیان. لە لایەکیشەوە بارزانی وەکوو ڕێبەرێکی

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەندەی ئەمن بزانم کاک سولەیمان دانیشجوو بوو. کاک ئەمیر دانیشجوو بوو. ئەوانە دانیشجوو بوون، بەڵام کاک ئەحمەد دانیشجوو نەبوو کە کەوتە کاری سیاسییەوە. ڕەنگە ئەمن هەڵە بم، بەڵام ئەوەی ئەمن بزانم دیپلۆمی وەرگرتوە و وەرنەگرتوە. بەهەر حاڵ ئەمن باسی سەوادە سیاسییەکەی دەکەم. دەگەڵ دوکتور قاسملوو ئەمریکی یەکجار زۆریان هەبوو. ئەوە بەشێکی. بەشی دووهەمی لەباری فکری سیاسییەوە ئەوەی پێی دەڵێن خەتی فکریی سیاسی، دوکتور قاسملوو ئەگەر دروست بێ ئەو ناوەی لێ بنێین لە بەشی چەپی حیزبی دێمۆکراتدا بوو. باوەڕی بە سۆسیالیزم تەنانەت بە کۆمونیزم و ماتریالیزم ئەوانە هەبوو. کاک ئەحمەد تۆفیق بە تەواوی زیدی ئەوانە بوو. ئەو ناسیۆنالیست بوو کە دیارە ناسیۆنالیست شتێکی خراپ نیە، جنێو نیە. بەڵام ئەوەی پێی دەڵێن ناسیۆنالیستی بەرچاو تەنگ، ئەو ناسیۆنالیستێکی بەرچاو تەنگ بوو. بەتایبەتی دژایەتییەکی توندی دەگەڵ بیروباوەڕی سۆسیالیستی هەبوو. ئەو وەختیش بەتایبەتی نەک هەر لە ئێرانیشدا، بەڵکوو لە جێی دیکەش لەو وەختەدا کە کاری عەمەلی بەدەستەوە نیە وەک ئەوە کە حیزبێک خەریکی خەباتی چەکدارانە نیە، یان خەریکی خەباتێکی تووندی نیە، لە دەوڵەتدا نیە هەتا سەرگەرمی ئیدارەی دەوڵەت بێ، واتە تەنیا کاری فکری و ئیدئۆلۆژیکی و ئەوانە دەکا، ئەو مەسائیلە یەکجار زۆر زەقن. سەرباری هەمووی ئەوانەش ئەوەی لە تاریخدا بە "موهاجیرەتی لەعنەتی" ناو نراوە، واتە دووروڵاتی، ئەویش تەئسیری لەسەر گەورەبوونەوەی ئەو جۆرە دووبەرەکییە فکری و ئیدئۆلۆژیکییانە زۆرە. ڕەنگە ئەوە بناغەی ئەو شتانە بێ. بەڵام جوزئیاتی ئەوەی چی لە بەینیاندا گوزەراوە، هەروەک پێشتر عەرزم کردی ئەمن قەت شاهیدی نەبووم.

**هیوا کاردۆ:** یانی بە هەموو ئەوانەوە پێتوایە ئەوانە دەبەرابەر یەکدا نەبوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نانا، بوون. دەوەیدا کە بوون شکم نیە. بەڵام چ دەبەینیاندا گوزەراوە هەتا ئەو کاتەی کاک ئەحمەد بۆتە باعیسی ئەوەی کاک دوکتور لە عێراق دەربکرێ ئەمن هیچم ئاگا لێ نیە.

**هیوا کاردۆ:** ئاگات لەوەی هەیە چۆن بۆتە هۆی دەرکردنی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ئیدی هەر بەهۆی ئەو ئیختیلافاتەی هەیانبووە ئەحمەد تۆفیق دەچێتە لای خوالێخۆشبوو بارزانی. دەڵێ ڕەحمانی قاسملوو فلان و فلانە. وەک جاسووس ناوی دەبا. دەڵێ عونسورێکی نامەتلووبە. مەلا مستەفاش ئەو وەختی قسەی دەڕۆیشت. هەر بۆیە قسە دەگەڵ وەزیری نێوخۆی عێراق دەکا. دوایە بانگی دەکەن ٤٨ سەعاتی وەخت دەدەنێ کە عێراق بەجێ بێڵێ. ئەو وەختی هەر دووکیان لە بەغدا بوون.

کاریزماتیک بۆ هەموو کورد جێگای ڕێز بوو، بۆیە هەر موشکیلێکی هەیانبایە دەبوو موڕاجەعە بەو بکەن. مەسەلەن گۆیا جارێک لە ڕانیە هەموو ئەوانەی موخالیفی ئەحمەد تۆفیق بوون، چوونە لای بارزانی گوتوویانە ئێمە شکایەتمان هەیە. ئەحمەد تۆفیق ئینسانێکی دیکتاتۆرە کەس ناخوێنێتەوە لەو شتانە. بارزانی لە یەک قسەدا گوتوویەتی: ئەمن ئەحمەد تۆفیق بە هەمووی ئێوە ناگۆڕمەوە. ئەوی دەیەوێ دەگەڵ من بێ، دەبێ دەگەڵ ئەحمەد بێ. ئەوە تەئسیری زۆر بوو. دیارە ئەوە دواترە، ١٩٦٣ یە کە قاسملوو چوار ساڵ پێنج ساڵە لە عێراق ڕۆیشتوە. ئەوە ئەوی ناگرێتەوە. هەڵبەت لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێم کە لەو پێوەندییەدا قەت کار نەگەیشتە ئەوەی مەلا مستەفا بەینی ئەحمەد تۆفیق و ڕەحمانی قاسملوو یەکێکیان هەڵبژێرێ. بەڵام حورمەتێک کە مەلا مستەفا بۆ دوکتۆر قاسملووی دادەنا، قەت ئەوەی بۆ ئەحمەد تۆفیق دانەدەنا. دەتوانم بڵێم بە یەقین ئەحمەد تۆفیقی پتر خۆش ویستوە، بەڵام ئەحمەد تۆفیقی وەک پێشمەرگەیەکی خۆی خۆش ویستوە. دوکتۆر قاسملووی وەک ڕێبەرێکی سیاسی لە حیزبێکی دیکەدا ناسیوە یا خۆشیشی نەویستبێ. مەسەلەن ئەمن تەنیا کەسی کە دیومە نامە بۆ مەلا مستەفا دەنووسێ هێندێک عینوانی بۆ نانووسێ. تەنیا دەنووسێ: برای بەڕێز جەنابی مەلا مستەفاو هیچی دیکە، دوکتۆر قاسملوو بوو. ئەویش هەر دەی‌نووسی: برای بەڕێز ـ پێم وایە ـ کاک ڕەحمان. یانی ئیحتڕامێکی دوو لایەنەیان دەبەینێدا هەبوو. بەڵام ئەگەر دەگەڵ ئەوانی دیکە لە بەرابەر یەکی‌دا ڕادەگرتن، بارزانی نەی‌دەشاردەوە کە بەتەنێ ئەوی بەسەر هەمووانێدا تەرجیح دەدا. ئەوەش وای کردبوو کە ئەحمەد تۆفیق ئیدی خۆی بە منەتباری کەس نەزانێ.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا ڕوانگەو بۆچوونە کۆنگرێتەکانی ناوبراو چی بوون کە بیبوونە جێی مشتومڕ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە پێشتر عەرزم کردی زیاتر ئەو شتە فکرییانە بوون. پاشان لە هەموو سەغیرەو کەبیرەیەکدا بەڕاستی بۆخۆی بڕیاردەری یەتەنیا بوو. پیاوێک بوو کە زۆر کەم ئەهلی مەشوەرەت بوو. حەتتا ئەگەر کۆمیتەی ناوەندیشیان کۆ بوویێتەوەو بڕیارێکی دابێ، هەر وەختێکی بۆخۆی پێی خۆش بووبێ عەکسی ئەوە ڕەفتاری کردوە. هیچ خۆی بە مەجبوور نەزانیوە پرس بەوانی دیکە بکا. لەو بارەیەوە ئینسانێکی زۆر تەکرەو بوو. پێم‌خۆشە ئەوەی بڵێم ئەمن لە هیچ بڕیارێکی حیزبی‌دا نەمدیوە کە ئەحمەد تۆفیق وەکوو سکرتێری حیزب هەڵبژێردراوە. ئەحمەد تۆفیق ئەندامی یەکەمی حیزب بوو، بەڵام عینوانی سکرتێری لەسەر نەبوو. ئەوەی کە ئەمن دەزانم، لەوێ دەفتەری سیاسی‌یان نەبوو. شتێکیان هەبوو بەناوی هەیئەتی سکرتاریا. مۆرێکی ڕەسمییشی هەبوو بە ناوی هەیئەتی سکرتاریای حیزبی دێمۆکراتی کوردستان. ئەو مۆرە بە دەستی کاک ئەحمەدەوە بوو، چونکە ئەندامی یەکەم بوو. دیارە ئەرکەکەی هەر ئەرکی سکرتێر بوو، وەتەنێ ئەوی ڕەت کەمەوە، بەڵام ناوی سکرتێری لەسەر نەبوو. پێشەوا قازی موحەممەدیش ئەندامی یەکەمی

حیزب بووە بەڵام سکرتێر نەبووە. قازی موحەممەد پێشەوای حیزب بوو نەک سکرتێری حیزب، لە حیزبی دێموکراتدا ناوی سکرتێر لە دوکتۆر قاسملوویەوە دەست پێدەکا. حیزبی دێموکرات پێشتر سکرتێری نەبووە.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا وەک بزانی کاک ئەحمەد تۆفیق بۆخۆی خۆی بەسەر حیزبدا سەپاند. یان بارزانی زەقی کردەوە بەسەر حیزبیدا سەپاند؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** تا وەک عەرزم کردی ئەحمەد تۆفیق بەو چوستو چالاکی‌یەی، بەو فیداکاری‌یەی بۆ بارزانی هەیبوو خۆی لە لای بارزانی خۆشەویست کرد. بۆ نموونە یەکەم خەبەرنیگاری خاریجی کە هاتۆتە کوردستان ئەحمەد تۆفیق بە قاچاغی لە بەیرووتەوا هێناویەتە کوردستان. ئەوەی کە کتێبێکیشی نووسیوە: سەفەر بۆنێو پیاوە ئازاکان. تەنانەت دەڵێ دوو سێ جار باسی ئەحمەد تۆفیق دەکاو لەجێیەکدا دەڵێ ئەوەی منی ڕێنوێنی دەکرد، ئەحمەد تۆفیق، پیاوێکە کە ترس ناناسێ. لە زۆر جێگا تاریفی دەکا کە دەگەڵی بووە. مەسەلەن دەڵێ: دەچووینە هەر جێیەک، هەرکە دادەنیشتین ژنو منداڵو هەرکەسێ لێبایە دەستی دەکرد بە تاریفی بارزانی. یانی ئیخلاسی خۆی بۆ مەلا مستەفا سابیت کردبوو. دیارە ئەوە حەقی موسەللەمی خۆیەتیو کارێکی باشە. مەلا مستەفا ڕێبەرێکی گەورەی بزووتنەوەی کورد بوو. لەوەدا هیچ گومانێک نیە. ئێستا یەکێک موافیقیەتی، یەکێک موخالیفیەتی هەروەک بۆ هەموو ڕێبەرانی دیکەش وایە. هیچ لەوە کەم ناکاتەوە کە مەلا مستەفا ڕێبەرێکی گەورەی کورد بووە. بەڵام ئەو لەو تیژیکیو خۆشەویستی‌یەی کەلکی وەرگرت بۆ سەپاندنی ئوتۆریتەی خۆی بەسەر هەمووانیدا. لەپاشان بۆ لەبیربردنەوەی مەنافیعی حیزبی دێموکراتی کوردستانیش. مەسەلەن یەک لەو کارانەی کە بەڕاستی زۆر سەیر بوون هەر لەو کۆنگرەی دووەدا مەلا مستەفای بە ڕەئیسی حیزب هەڵبژاردوە. خەڵکەکەش بە قسەیان کردوە. کابرا ئەندامی حیزب نیە ئەتۆ دەیکەی بە ڕەئیس ناوی دەنێی چی؟. جا بەو ئەندازەیە ئوتۆریتەی هەبوو کە دەیانگوت کابرا خەوی لێ کەوتبوو ـ خودا عافووی بکا مردوە ناوی نابەم ـ ، هەڵی دەستێنن بۆ ڕەئی گیری. دەڵێ کاک ئەحمەد چۆن دەڵێ ئەمنیش دەگەڵ ویم. ڕەئیی من هەر ڕەئیی ئەوە.

**عەباس کاردۆ:** ئایا ئەحمەد تۆفیق لە پەرتەوازەکردنی ئەندامانی حیزبداو بەتایبەت ئەو کەسانەی دواتر کۆمیتەی شۆڕشگێڕیان پێک هێنا هیچ دەورێکی هەبوو؟ تکایە مەسەلەکەی شی کەوە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەقینەن تەئسیری زۆر بووە. ئەوە ئەگەر پێویست بێ دەکرێ لە هێندێک لەو کەسانە پرسیار بکرێ. چونکی ئەوانەی دواتر بوونە کۆمیتەی شۆڕشگێڕ ئێستا بەداخەوە کەمکەسیان ماون. وا بزانم یەک دوو کەسێکیان ماون. یەک لەوانە کاک حەمەدەمینی سیراجی کە بەداخەوە وەکی باس دەکەن لە حاڵەتی کۆما دایە( جێی داخە هەر لەجەرەیانی وتووێژی من دەگەڵ مامۆستا دا بوو کە کاک حەمەدەمینی

سیراجی لە وڵاتی سوێد کۆچی دوایی کرد. هەیاس). کاک سەعید کوێستانییش یەکێک لەوانە کە ماوە. ئەوانی دیکە هەموویان شەهید بوون. بەڵام لە موخالیفانی ئەحمەد تۆفیقی ماون، چونکە موخالیفانی ئەحمەد تۆفیقی هەر ئەوانە نەبوون کە کۆمیتەی ئینقیلابییان پێک هێنا. کەسانێکیش هەبوون کە موخالیفی ئەحمەد تۆفیق بوون بەڵام دەگەڵ کۆمیتەی شۆڕشگێڕیش نەبوون. لەوانە خوالێخۆشبوو هاشمی ئەقەلموتتوللاب(قادر شەریف) کە شەهید بووە، کاک حەسەنی ڕەستگار، کاک ڕەسووڵی پیشەساز، کاک حوسێنی مەدەنی ئەوانە لە حاڵی حەیاتدان کە هەموویان موخالیفی ئەحمەد تۆفیق بوون. مەسەلەن کە کۆنگرەی دوو دەگیرێ ـ ئاخر وەختێک حیزب پەرش و بڵاوە دەبێ بۆ ئەو مەسەلانە حەل بکا ـ ئەوانە هیچیان حیساب ناکەن، بانگیان کەن کۆنفرانسیان بۆ بگرن، نوێنەریان لێ هەڵبژێرن، دەعوەتیان بکەن کە حەقی خۆیان بوو. چونکە ئەوانە لەڕیزی پێشەوە بوون دەبوو بانگ بکرێن بۆ کۆنگرە. بانگیان ناکەن هیچ، وەختێکیش بۆخۆیان دەچن دەڵێن بابە ئێمە خائین نیین؟ با بێینە کۆنگرە موحاکەمان بکەن. ئەوان بە تفەنگەکان لەبەریان دادەمەزرێن و دەڵێن هەرچی بێتە پێشێ دەی کوژین. بە تفەنگ پێشیان پێ دەگرن نایەڵن بەشداری کۆنگرە بن. بەڵێ کاک ئەحمەد لەوەدا ئەخشی ئەساسی هەبوو.

**هەیاس کاردۆ:** ڕێبەرایەتیی حیزبی دێموکرات ڕەخنەی زۆر لێ گیراوە کە بەرانبەر ئەحمەد تۆفیق کەم لوتفیی زۆری کردوە و ناوی وی لە لاپەڕەکانی خەباتی خۆی سڕیوەتەوە. هەر لەجێدا بۆچی هەتا ئێستاش حیزبی دێموکرات ئامادە نیە ناوی ئەو کەسایەتییە لە ڕیزی ڕێبەرانی خۆیدا بگونجێنێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە ئەوە هەر حیزبی دێموکرات نیە، حیزبی دیکەش هەر وان. ئەگەر یەکێک دەیەوێ تاریخ بنووسێ دەتوانێ باسی ئەو جۆرە شتانە بکا. ئێستا ئێمە تاریخیش نانووسین بیرەوەری دەگێڕینەوە، بەڵام ئەوەی کە بێتە پێشێ باسی دەکەین. تاریخی حیزبی دێموکرات مروروری ئەو شتانەش دەکا. بەڵام حیزبی دێموکرات یادی ئەو ڕێبەرانەی دە موناسەباتدا دەکاتەوە. مەسەلەن یادی قازی موحەممەد دەکاتەوە کە پێشەوای حیزبە و سەرکۆماری کوردستان بووە و ئیعدام کراوە. یادی دوکتور قاسملوی دەکاتەوە کە سکرتێری حیزب بووە و تیرۆر کراوە. دوکتور شەرەفکەندی هەر وەتر. ئەحمەد تۆفیق وەختێکی شەهید بووە ئەسڵەن ئەندامی حیزبی دێموکرات نەبووە. ئەحمەد تۆفیق وا بزانم ساڵی ١٣٥١ لە حیزبی دێموکراتی کوردستان دەرکراوە. دەباشە باسی چی بکا؟ کەسێک کە لەحیزب دەرکراوە دەکرێ ساڵرۆژی ژیانی بگرین و بڵێین ئەوە بیست ساڵەی شەهید بووینەتی یان چل ساڵەی شەهید بووینەتی؟ شتی وا هیچ حیزبێک نایکا. مەسەلەن دەحیزبی دێموکراتدا هێندێک شتی دیکە هەبووە کە دە حیزبەکانی دیکەدا نەبووە. ئی وا هەیە سکرتێری پارتی دێموکراتی کوردستان بووە کە ئەگەر بۆت باس بکەم هەر باوەڕ ناکەی، یەکەم جارە دەی-

بیستی. مەسەلەن پارتی دێموکرات هەر ئەوانەی ناسراویشن قەت یادێک لە هەمزە عەبدوڵڵا دەکاتەوە؟ قەت یادێک لە برایم ئەحمەد دەکاتەوە؟ یادیان ناکاتەوە چونکی کە مردوون ڕێبەر نەبوون. ڕێبەری ئەو حیزبە نەبوون ئیدی یادیان ناکاتەوە. لە عەینی حاڵدا حیزبی دێموکرات هیچ‌وەختێک بێحورمەتیی بە عەبدوڵڵای ئیسحاقی نەکردوە، کەنگێ کردوویەتی؟ ئەگەر تاریخ دەنووسی باسی ئەوە دەکەی کە لە فلان وەختی‌ڕا هەتا فلان وەختی‌ئەحمەد تۆفیق ئەفەری یەکەمی حیزبی دێموکراتی کوردستان بووە. ئێمەش گوتوومانە لە ڕاپۆرتی کۆنگرەی سی‌دا ـ دیارە ئەخشی مەنفیی ئەومان دەرخستوە ـ دە ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی سی‌دا هاتوە کە لە ۳۹ هەتا ٤۹ وەک دەورانێکی لادان لە ڕێبازی حیزبی دێموکراتی کوردستان باس کراوە. بەڵام ئیدی ئێنتیزارێکی بەجێ نیە کەسێک کە لە حیزب دەرکراوە ئێستا بگوترێ دەبێ یادی بکرێتەوەو تەجلیلی لێ بکرێ.

**عەباس کاردۆ:** زۆر باشە مامۆستا. ئەی تۆ بۆخۆت لەو سەروبەندەدا کە باڵی ئەحمەد تۆفیق دەسەڵاتی حیزبی بەدەست بوو لە کوێ بووی‌و هەڵوێستت چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو وەختی کە ئەحمەد تۆفیق دەسەڵاتی حیزبی دێموکراتی دەدەستدا بوو، ئەمن لە داخلی وڵات بووم. بەڵام دیارە هەر لە سەرەتاوە ئەمن هاوکاری‌و هاوفکریم دەگەڵ ئەوانە بوو کە دواتر بوون بە کۆمیتەی ئینقیلابیی حیزبی دێموکراتی کوردستان. ئەمن دەگەڵ ئەوانە هاوکاریم هەبوو. دیارە خوالێخۆشبوو سولەیمانی موعینی وەختێک لە موریدانو موخلیسانی ئەحمەد تۆفیق بوو کە دیارە وەیشی هەڵنەکردو ئەویش هەر کەوتە خەتی موقابیلی. دەگەڵ وی‌و پێش هەموواتیان مەلا ئاوارە کە هەر لە کۆنەوە ڕەفیق بووین، هاوکاریم دەکرد. هەروەها هاشمی ئەتەللوتوللاب، کاک سمایلی شەریفزادە، کاک حەمەدەمین. کاک حەمەدەمین بە مانگ و دوو مانگو سێ مانگ هەر لەماڵەکەی من دەمایەوە. مەخفی بوو بەڵام زیاتر هەر لەماڵی من دەژیا.

**عەباس کاردۆ:** دەگەڵ لایەنەکەی دیکە دۆستایەتی‌ڕ هاوکاریت نەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەپاش کۆنگرەی دوو تەنیا پێوەندیی کە هەبوو ئەو داستانە بوو کە گێڕامەوە. دیارە دەگەڵ کەسانیان پێوەندیی نیزیکم هەبوو، بەڵام وەکوو تەشکیلات ئەخێر هیچ پێوەندی‌یەکم نەبوو. دەنا دەگەڵ مەرحوومی مەلا کەریمی سارده کۆسانی(ڕاوچی) پێوەندیی زۆر دۆستانەمان هەبوو. هەروەها دەگەڵ سەید تاهیری ئیمامی کە ئەویش هەر مردوە پێوەندیی دۆستانەمان هەبوو هەرچەند زۆر نیزیک نەبوو. دەگەڵ هێندێکی دیکەش کە پێشێ دەگەڵ وان بووین دوایە دەگەڵ کومیتەی ئینقیلابی کەوتن کە هەر زۆر گەرم

بوو. لەوانە مەلا مەحموودی زەنگەنە کە بەداخەوە زۆر کەممان یەکتر دیت بەڵام باوەڕ بکە بەحەددی پەرستن خۆشم دەویست. ئاخر مەلا مەحموودی زەنگەنە هەوڵی دەگەڵ ئێوان بوو ، دوایە دەواتیشدا ئەگەیشتە ئەوەش کە کۆمیتەی ئینقیلابی پێک بێ ئەو شەهید بوو. بەڵام دەگەڵ جەرەیانەکەی هەبوو.

**هیاس کاردۆ:** مامۆستا ئەو چۆن شەهید بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەداخەوە مەلا مەحموودی زەنگەنە بەخەسار شەهید بوو. ڕەفیقێکمان هەبوو ئەندامی کۆمیتەی چاوەدێری بەرز بوو ئێستا لە نۆروێژ دەژی. ناوی ڕەشیدی فەلاحی‌یە بەڵام لە سلێمانی بە ڕەشەی قاچاغچی دەناسرا. مەلا مەحموود لە مەنتەقە دەبێ خەبەر دەدەن کە ڕەشەی قاچاغچی بە باری قاچاغەوە لەلایەن ژاندارمەوە گیراوە. مەلا مەحموودیش خوێنی وەکوڵ دێ‌و دەڵێ دەبێ بچین ڕزگاریان بکەین. دەچێتە سەر ڕێگایان‌و شەڕ ساز دەبێ‌و لەوێ شەهید دەبێ. لەپاشان دەردەکەوێ ئەو ڕەشەی قاچاغچی‌یە ئەو کابرایەکی دیکەیە. زۆر بەخەسار شەهید بوو. پیاوێکی یەکجار شەریف‌و دڵسۆز بوو.

**هیاس کاردۆ:** مامۆستا هۆی چی بوو بارزانی ئەحمەد تۆفیقی دوور خستەوە؟ لایەنگرانی ناوبراو لە نێو حیزبدا دوایە چی‌یان لێ هات؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە هۆیەکەی هەر ئەوە بوو کە ئەحمەد تۆفیق لە نێو حیزبی دێموکراتی کوردستاندا عونسورێکی لە هەموان زەقتر بەرچاوتر بوو. بزووتنەوەی کوردیش هەم پێوەندیی بە ڕژیمی شاوە هەبوو، هەمیش ئیحتیاجیی پێی هەبوو. بۆیە وەکوو وەستاندنی خەباتی حیزبی دێموکراتی کوردستان ناردبووی لە بارزان دای‌نابوو. دیارە هەموو ئیمکاناتێکی هەبوو لەحاڵێکدا ئەوانی دیکە ئیمکاناتیان زۆر کەم بوو. بەڵام ئەو هەموو ئیمکاناتی ژیانی خۆی‌و هەشت تا دە پێشمەرگەی بۆ دابین کرابوو. لایەنگرانی ئەحمەد تۆفیقیش خۆ هەموویان هەر دەگەڵی نەبوون. پێم وایە ئەوانەی پێشمەرگەی کوردی ئێرانی بوون دەگەڵ خۆی بوون، چوار یان پێنج کەس زیاتر نەبوون. پێشمەرگەی دیکەیان بۆ داتابوون بۆ موحافەزەتی شوێنەکەو مەنتەقەکە. دەنا بۆخۆیان زۆر کەم بوون. بەهەر حاڵ هەموو ئیمکاناتێکیان دەئیختیاردا بوو و خزمەتیان دەکرا. تەنانەت وەختێکی بیستم ئەحمەد تۆفیق ویستوویەتی ژن بێنێ، مەلا مستەفا فەرموویەتی چیی پێویستە بۆی بکەن. یانی لەو بارەیەوە دەهیچ مەزیقەیەکدا نەبوو. ئەوەی هێندێک کەس پێیان وایە زیندانی بوو، یان تەبعید بوو، نەخێر. تەبعید بوو بەڵام تەبعیدێکی مەسڵەحەتی. لەعەینی کاتدا خۆ خەباتی بەشەکەی دیکەش هەر ڕاوەستا بوو. پێم وایە باسمان کرد کە ئەو بەشەی دیکەش کە لە ئەحمەد تۆفیقی دوور بوون، فەقەت ئەفراد مابوون. ئیتسانەکان مابوون. دەنا وەکوو تەشکیلاتێک کە پێکەوە گرێ درابن، ئەسڵەن شتێک بە ناوی تەشکیلات نەبوو. سەرباری ئەوەی کە هیچ تێکۆشانێکیش لە داخڵدا نەبوو. لە دوای کۆنفرانسی دوو ئێمە دەستمان کرد

بە سازمانەکانی ئەو ئەندامانە کە لە کوردستانی عیراق دەژیان، لە دوای رێککەوتنی یازدەی ئادار چوونە خزمەتی بارزانیو داوامان کرد کە دەرفەتی ئازادیی عەمەلمان بۆ پێک بێنی بۆ ئەوەی بتوانین کاری خۆمان بکەین.

**عەباس کاردۆ:** هۆی بێسەروشوێنبوونی ئەحمەد تۆفیق چی بوو؟ ئایا هیچ شتێکی وا هەیە باس نەکرابێو لە لای جەنابت هەبێ؟ ئەو رووداوە ئێستاش شتی ناروونی تێدایە. تەنانەت باسی ئەوە هەیە کە حیزبی دێمۆکراتو شەخسی دوکتۆر قاسملوو تاوانبار دەکرێن کە ڕەنگە دەستیان لە بەکوشتدانی کاک ئەحمەددا هەبێ. پێمخۆشە ئەوە زیاتر ڕوون بکرێتەوە.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەوە یەکێکە لە گەورەترین ناحەقییەکانی مێژوو کە لە کەسێک دەکرێ. ئەمن پێش ئەوەی ئەو مەوزووعە بگێڕمەوە، پێمخۆشە نموونەیەکی دیکە بگێڕمەوە. کە خوالێخۆشبوو سەید ڕەسووڵی دێهقان(سەید ڕەسووی بابی گەورە) شەهید بوو، ئەمن بۆخۆم دەگەڵ بووم دەگەڵ دوکتۆر قاسملووی دەچووینە سەفەر. لە کەرکووک لامان دا. مەسئوولێنی دەوڵەتی عێراق میواندارییان بۆ دوکتۆر قاسملوو ساز کردبوو. پیاوێکی لێبوو پێیان دەگوت "ئەبوو میژەر".ئەفسەرێک بوو، پیاوێکی زۆریش زیرەک بوو. هەروا دانیشتبووین باسی سەید ڕەسووی کرا. ئەبوو میژەر گوتی خەڵک دەڵێن یان ئەبوو میژەر کوشتوویەتی یان دوکتۆر قاسملوو. دوکتۆر قاسملوو گوتی کەس نالێ قاسملوو کوشتوویەتی. هەموو کەس دەزانێ قاسملوو پیاوکوژ نیە. عەینی بەو کەلیمەیە. ئەبوو میژەر پێ کەنی، دەواقیعدا بەنیشانەی تەئیید کە بە دەستووری من کوژراوە.

پاشان ئەوانەی ئەوەی دەڵێن شتی سەیرسەیر دەڵێن. ئەحمەد تۆفیق لە ئەندامەتیی حیزبی دێمۆکرات دەرکرابوو، یانی حیزب دەری کردبوو ـ ئەمن لە جێی دیکەش باسم کردووە دیسان ئەگەر پرسیار بکرێ باسی دەکەمەوە کە بۆ دەرکراوە ـ. بەڵام بە مەحزی ئەوەی زانیمان کە عەبدوڵلای ئیسحاقی گیراوە، لە دەفتەری سیاسی بڕیارمان دا چی لە توانامانەدا هەیە دەبێ بیکەین بۆ ڕزگاریی ئەو پیاوە. لە پێش هەمووشمانەوە دوکتۆر قاسملوو نەزەری وا بوو . هەوڵمان دەگەڵ عێراق دا کە بەرپرسی پێوەندییشمان کاک حەمەدەمینی سیراجی بوو. کاک حەمەدەمین خزمایەتیی دەگەڵی هەبوو، پێم وایە خاڵۆزاو پوورزا بوون. عێراقییەکان بەپانەوە ئەوەیان گوت کە ئەحمەد تۆفیق کاری بۆ مە(بۆ عێراق. هەیاس) کردووە. بەڵام دوایە بۆمان دەرکەوتوە "مزدوج" کار دەکا. باوەڕ بکە کەلیمەی مزدوجیشم بۆ یەکەمجار دەبیست. بەو مانایە کە جاسووسی مەلا مستەفاش بووە لەسەر ئێمە. لەسەر ئەوەی گرتوومانە. ئێمە وازمان لە هەوڵەکانمان نەهێنا. ئەمجار بەوە پێکەنگیان کردین، گوتیان ئەحمەد تۆفیقمان "تەسفیر" کردوە. تەسفیریشم هەر بۆ یەکەمجار دەبیست. بەوەی دەڵێن کە یەکێکی لە وڵاتی خۆیان دەرکەنو نەشی نێرنەوە وڵاتی خۆی کە تەحویلدانەوەیە. پێی دەڵێن تەسفیر یانی

سەفەرمان پێ کردوە، گوتیان تەسفیرمان کردوە بۆ سووریە. لەپاشان کە ماوەیەک پێوە خراو ئەحمەد تۆفیق لە هیچ جێگایەک سەرو سۆراغی نەبوو، ئێمە بەو قەناعەتە گەیشتین کە دەبێ کوژرابێ. چونکی دەمانزانی سووریە ناوێهەوێ، بۆ چیەتی. کەوابێ وەدەر دەکەوێ، کە وەدەریش کەوت کابرایەکی زیرەک بوو لە جێ‌یەک سەری هەر وەدەر دەنا. گوتمان کوژراوە و نەماوە کە واشیان گوتوە مەبەستیان کوژران بووە. دواتر، زۆر دواتر دەرکەوت کە ئاوا بە نیزیکییش نەکوژراوە.

ئەمن شاهیدێکی زیندووم هەبوو بەداخەوە هەرچی هەوڵم دەگەڵیدا حازر نەبوو بە نووسین یان بەدەنگ ئەو ئیتلاعاتەی هەیەتی لێی وەربگرم.

**هەیاس کاردۆ:** کابرا عەرەب بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر، کورد بوو، کوردی ئێران ئەندامی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانیش بوو، ئەندامی پارتی دێمۆکراتی کوردستانیش بوو. لەو کوردانەی "زووحەیاتەین"ن. لە ئێران ئەندامی حیزبی دێمۆکرات و لە عێراق ئەندامی پارتین. دیارە ئەوە ئەندامەتیی حیزبی هەر پاراستبوو، بەڵام چونکە ببوو بە عێراقیش ببوە ئەندامی پارتی. ئەوە لەسەر پارتی گیرابوو. بۆ منی باس کرد، وا بزانم پێرار بوو لە هەولێر عەمری خودای کرد. گوتی: ئەمن لە زیندانی ئینفیرادی بووم. لە ژووری ئینفیرادیی تەنیشتی منەوە دەنگی ناڵەو ناڕەحەتی دەهات. جارجار کە دەینالاند قسەی دەکرد گوێم لێ‌بوو کە بە کوردی قسەی دەکرد وەک ئەی هاوارو شتی ئاوا. دەی گوت درزێکی زۆر کەم لە دیوارەکەدا هەبوو ، سەرم بەدیوارەکەوە ناو گوتم ئەرێ کاکە ئەتۆ کێی‌و چکارەی؟ جوابی دایەوە گوتی کارت بەکاری من چیە کاکە؟ گوتی دوو، سێ ڕۆژم ئەوە لێ دووپاتە کردەوە هەتا ئاخرەکەی گوتم کاکە ئەمن ناوم فلانە، ئەندامی پارتی دێمۆکراتی کوردستانم، لێرە وەکوو تۆ زیندانیم ، پێم‌خۆشە باوەڕم پێ بکەی. گوتی ئەوجار کە وام پێ گوت، باوەڕی کردو گوتی ئەمن عەبدوڵڵای ئیسحاقیم. لێرە گیراوم ئەشکەنجەم لەسەرە. گوتی هەموو ڕۆژێ دەیانبرد. زۆری پێوە ئەخرا، شەوێکیان کە بردیان‌و هێنایانەوە لێم پرسی چۆنی، گوتی ئیدی ئازە ناچمەوە. تازە ئەمن ناژیم. گوتی هەتا بەری بەیانی ناڵەو نووزەی هات، بەری بەیانی بێدەنگ بوو. گێڕایەوە گوتی دوو ڕۆژی پێوە خرا هەر بێدەنگ بوو هەتا لە جیاتی دەنگ بۆن هات. هاوینیش بوو، گوتی لە ژوورەکەی خۆی‌دا مردبوو بۆگەنی کردبوو، جا ئەوجار لایان برد. لە ژێر ئەشکەنجەدا کوشتیان.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا ئەو ئەفەرە کێیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو ئەفسەرە ناوی "ئەکرەم بەگ" بوو. لە هەولێر عەمری خوای کرد. بابی ئەو کوڕە باشە بوو کە لە تەلەڤیزیۆنی کوردسات کار دەکا، ڕاسان موختار. دیارە سێ کوڕی هەن هەموویان هەر باشن. ئەمەیان ناوی موختارە شۆڕەشیان ئەحمەدییە، لەو بەگانەی بانێن. بەداخەوە ئەوەی بۆ ئێمە سەبت نەکرد هەرچەند بیستوومە بۆخۆی هێندێک شتی لەپاش خۆی بەجێ هێشتوە. هیوادارم وەدەست کەوێ و چاپ بکرێ.

وەکی عەرزم کردی، دوکتور قاسملوو دەگەڵ مردنی هیچ کەس نەبوو. دەگەڵ کوشتنی هیچ کەس نەبوو. بەتایبەتی دەگەڵ موخالیفینی خۆی. ئەمن دە "نێو سەدە تێکۆشان"دا هێناومە . لە کۆنفرانسی سێی هەموو کۆنفرانس دەیەویست ئەحمەد تۆفیقی دەرکا. دوکتور قاسملوو ڕاست بۆوە گوتی چۆن دەری دەکەن؟ ئێمە ئێستێ تازە دەمانەوێ ئوسوولی حیزبی پیادە بکەین، ئێوە هەر لێرە پێشێلی دەکەن؟ ئەو کابرایە ئەندامی حیزبە، دەبێ بانگ بکرێ، مەسایلی دەگەڵ باس بکرێ. ئەگەر خوای کردو ئەو حازر بوو کاری حیزبی بکا ئەوە چ باشتر. ئەگەر نەی‌کرد ئەوکات کۆمیتەی ناوەندی دەتوانێ دەری بکا. جا ئەوجار کۆنفرانس لە ڕەئیی خۆی وەرگەڕایەوە هاتە سەر ئەوەی ئیختیار بدا بە کۆمیتەی ناوەندی. دەنا کۆنفرانس حازر بوو هەرلەوێ ئەحمەد تۆفیقی دەربکا.

**هیاس کاریز:** مامۆستا هەر لەو چوارچێوەیەدا پێم‌خۆشە ئەو پرسیارەش بکەم کە: پێشتر فەرمووت ئەحمەد تۆفیق ئیستیعفای دا. بەڵام دواتر لە ڕاگەیاندراوی خۆتاندا دەڵێن دەرمان کرد. ئێستاش فەرمووت دەرکرا.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئیستیعفای لە ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندی کردبوو. ئێمە کاک مەلا سەعید ڕەشیدمان نارد بە نامەیەکی کۆنفرانسەوە بە نامەیەکی کۆمیتەی ناوەندییەوە. داوامان لێ‌کرد کە ئیستیعفایەکەی وەربگرێتەوە. ئەگەر پێویست بوو کۆبوونەوە بکەین ئێمە دێین بۆ ئەوێ ئەگەر ئەتۆ ناتوانی بێی و منەت لەسەرە. لەپاشان وابوو خەبەرمان زانی کە ئەو ڕۆیشتوە. کاک مەلا سەعید ڕەشیدیشی دەگەڵ خۆی هەڵ‌گرتبوو ڕۆیشتبوو. ڕۆیشتبوو بۆ نێو دەوڵەتی عێراق. ئەوجار جارێکی دیکە نامەمان بۆ نارد. نەفەرێکمان نارد بۆ لای. ئێستا بەیانی یازدەی ئادار دەرنەچووبوو. ئەوجار دوو شتمان داوا لێ‌کرد. یەکیان ئەوە کە ئیستیعفاکەی وەربگرێتەوە. دوو نامەمان نووسیبوون. یەکیان بۆ هەردووکیان. یەکیان تەنیا بۆ کاک ئەحمەد بە جودا. ئەوی دیکە ئەوە بوو کە ئێستا کە چوونە وێ کارێکی وا نەکەن کە بۆخۆیان و بۆ حیزبی دێموکرات ببێتە نابڕووچوون. کاری قەبیح نەکەن. دیارە کە چوون هەر لەوێ دەرکەوت کاک مەلا سەعید ڕەشید کە دەی‌پەرست لێی جودا بۆتەوە. هەر دەستبەجێ لێی جودا بۆتەوە. لەبەر شتێکیش کە خراپ نیە لێرە باسی بکەم. کاک مەلا سەعید ڕەشید بۆخۆی بۆی باس کردین کە لەسەر چی لێی جودا بۆتەوە. گوتی کە

ڕۆیشتین هەرکە لە چیای "پێرس" دەهاتینە خوارێ "پیسپیس" بۆی گێڕامەوە کە سەدیقی ئەنجیری ئەو کوشتوویەتی. جا مەلا سەید ڕەشید لە موریدانی ئەحمەد تۆفیقو لە موخالیفانی سەدیقی ئەنجیری بوو. بەڵام پیاوێکی بەکجار سادەو خاوێن بوو. ئەوە نەبوو کەسێکی بکوژێ لەسەر ئەوەی ئیختیلافی فکریی دەگەڵی هەیە. ئیدی هەر دەڵێی بەخۆی‌دا گرتبوو هەتا گەیبوونە بەغداو لەوێ لێی جودا ببۆوە.

جا لەوێ‌دا دیسان کاغەزێکی نووسیبۆوە کە وەری‌ناگرمەوە(ئیستیعفاکەی وەرناگرتەوە. هەبیاس). چەندێشی حەملە کردبوو کە زیاتر ڕووی دەکاک ئەمیری قازی بوو. چونکە ڕاستە ببوونە هاوتۆزگان بەڵام قەتی کار دەگەڵ ئێمە نەکردبوو. بە تایبەتی دەگەڵ منو هێمنی ڕەحمەتی قەت هیچ بەرخوردێکی لە ژیانی‌دا نەبوو. دەگەڵ کاک حەسەنی ڕەستگار بووبوویان چونکی موخالەفەتیان دەگەڵ یەک هەبوو. بەڵام دەگەڵ ئێمە ئەوەی نەبوو. هەر بۆیە دوای کۆنفرانسی سێ کە بڕیار درا دەگەڵی دانیشین، دوو کەس دیاری کران: کاک حەمەدەمینی سیراجی، چونکی خزمی بوو، ئەمن، چونکی قەتمان ئیختیلافو بەربەرەکانی پێکەوە نەبوو. بەڵێ جا وەک ئەندامی حیزب هەر مابۆوە. لەپاشان دەستی کرد بە بەیاندەرکردن بە دژی حیزبو هەڵاتن بەملاو ئەولاداو شتی سەیروسەمەرە. ئێمەش دەگەڵی دانیشتین، پێم وابێ دە "ئیمە سەدە تێکۆشان"دا هێناومە تەنیا داوای ئەوە بوو کە ئەمن هێندێک کەس دەناسم پیاوی خراپن، جاسووسن بەڵام بە قسەی من نایەنە ئێرە بەقسەی ئێوە دێن. دەبێ بیانهێننە ئێرە، ئەمن جێگام هەیە ڕایان بگرم، تەعزیبیان دەکەم کە ئیعتیراف بکەن. ئەگەر نەیان‌کرد دەیان کوژم. جا ئەو وەختی دێم کارتان دەگەڵ دەکەم. دەمانپرسی ئەوانە کێن؟ دەی‌گوت پێتان ناڵێم. دەی جێگاکەیان کوێیە؟ وەڵڵا پێتان ناڵێم. یانی بەڕاستی سادیسمی هەبوو بۆ پیاوکوشتن. دیارە ئەوەی لێ قبووڵ نەکرا. کە ئەو بەزمەشی هەر ئیدامە دا یەک بەیاننامەدەرکردنو دەستەسازکردنو ئەوە، شتێکی زۆر کورتی لەسەر دەرکرا بەو مەزموونە: عەبدوڵڵای ئیسحاقی (ئەحمەد تۆفیق) بەهۆی بێ دیسیپلینیو کردەوەی دژی‌حیزبی لە حیزبی دێموکراتی کوردستان دەرکرا. هەتا ئەو وەختی ئەندامی حیزبی بوو.

**هەباس کارەزۆ:** ئەو بڕیارەی پێ ڕاگەیەندرا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەکوو بڵێی بۆی بنێرین نا. بۆی نەنێردرا بەڵام دە ڕۆژنامەدا بڵاو بۆوە. تەنانەت لەسەر ئەوە بەزمێکیان بۆ من نایەوە مێشیان بەگرتن‌دا. ڕۆژێکی دەچوومە سەرکار، لە ڕۆژنامەیەک کارم دەکرد. ئەویش هەر لە ترومبێل دابەزیم پۆلیس هات گرتمی. گرتمیو بردمی بۆ لای ئەفسەرەکەی. ئەفسەرەکە گوتی هەوییەت کوا؟ ئەمنیش هەوییەم پێ نەبوو، بەڵام وەرەقەی "عدم تعرض"م پێ بوو کە لە ئەمنی عام دەرچووبوو. ئەوم پێ‌بوو نیشانم دا. گوتی ها ئەدی کێ بوو گوتی جاسووسە؟ پۆلیسەکە گوتی هۆرەتانێ ئەوە

گوتوویەتی. بانگی کرد ئەگەر هات یەکێک لەو کوڕانە بوو کە دەگەڵ ئەحمەد تۆفیق بوون. ئەمنیش گوتم داوەشێی یاخوا ئێوە هاتوون لێرە جاسووسی بکەن؟ ئەمن دەکەیە جاسووسو بەگرتنم دەدەی؟ گوتی وەڵڵا دایکتان دە... هەمووتان بەگوتن دەدەم. ئەحمەد تۆفیقی لە حیزب دەردەکەن؟ ئەمنیش بەڕاستی قەتم ئەوە نەکردوە، بەڵام مستم هەڵێنا لە دەمی بدەم، بەحەیاتیشم بۆ شەڕکردن دەستپێشخەر نەبووم. پێش ئەوەی دەستم بگاتە وی، پۆلیسەکە دەستی گرتم. ئەفسەرەکە گوتی بۆ بێئەزمی دەکەی؟ گوتم ئێوە تێناگەن ئەوە جنێوان دەدا. ئیدی ئەویشیان دەگەڵ من گرت. دەستیان بەستینو بردیانین بۆ مەرکەزی پۆلیسو لەوێڕا بۆ وێو لەوێڕا بۆ وێ. ئاخرەکەی بردیانینە کن مودیری ئەمنی عام، ئەو ڕۆژێ ئەمزانی، دواتر بۆم دەرکەوت ئەو کابرایە مودیرئەمنە. ئەو تازە گزارێی مەشهوور. لەوێ کە وەژوور کەوتین پرسی ئەوانە چین؟ گوتیان ئەو دووەمان گرتوون، ئەم بەوی دەڵێ جاسووس، ئەویش بەم دەڵێ جاسووس. ئەمنیش وەدەنگ هاتم گوتم تا ئەمن بەوی نالێم جاسووس. کابرا لەپشت مێزەکەیەوە زۆر بە سەرسوڕمانەوە گوتی چۆن؟ ئەمنیش گوتم ئەمنو ئەوە هەردووکمان کوردی ئێرانینو ئیختیلافی سیاسیمان هەیە. ئەمن دەلیلێکم نیە لەسەر ئەوەی ئەو پیاوە جاسووس بێ، خۆشم بە پیاوێکی عاقڵ دەزانم قسەی بێمانا ناکەم. بەڵام ئەو بێ سەلیقەیە لەخۆڕا بە من دەڵێ جاسووس. کابرا ڕاستە ئەمن بوو، پیاو کوژ بوو، بەڵام کابرایەکی زیرەک بوو، گوتی ئەوەی بەرنە دەرێ. ئەوی پێی بردنە دەرێو گوتی ئەتۆ وەرە دانیشە. دانیشتم بانگی کرد قاوەیەکیان بۆ هێناو جگەرەیەکی تەعارووف کردم، گوتی ئەتۆ کێی؟ گوتم ئەوەم. وەرەقەکەشیان کە لێوەرگرتبووم ئەویشی لەبەر دەست بوو. گوتی ئەوەت چۆن وەرگرتوە؟ گوتم نازانم. ئەمن ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانم جا لەو ڕێگایەشەوە وەرمگرتبوو. "مرادی ڕەزمئارە" هەبوو دۆستایەتیمان دەگەڵی هەبوو. ئەویش پێوەندیی دەگەڵ ئەوان باش بوو، چوار وەرەقەی عەدەمی تەعەرروزی بۆ وەرگرتبووین. بۆ منو کاک حەمەدەمینو هەر دوو خوالێخۆشبووان دوکتور قاسملوو و کاک کەریمی حیسامی. گوتم ئاوا وەرگیراوە. دیار بوو وەبیری هاتەوە یان هەر شتێک بوو قبووڵی کرد. دوایە گوتی تازە هێناویانی، مەجبوورین ڕاتگرین. سێ شەوانیان ڕاگرتم.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا هیچ ماوە لەسەر ئەحمەد تۆفیقی کە بتەوێ بیڵێی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن هیچم نیە مەگەر ئەتۆ پرسیارت هەبێ. تەنیا ئەوەندە دەڵێم کە بۆخۆم ئەحمەد تۆفیقی بە شەهید دەزانم، چونکی زۆر مەزڵوومانە کوژرا. بەڵام لەعەینی حاڵدا حیزبی دیمۆکرات بە خەتابار نازانم کە هەموو ڕۆژێ یادی ناکاتەوە. چونکی وەختێکی شەهید بووە، لە ڕێبەرانی حیزبی دیمۆکرات نەبووە، ئەندامی حیزبیش نەبووە، ئەوە هیچ تاوان نیە.

# پێوەندیی حیزبی دیموکرات دەگەڵ عێراق

**هەیاس کاروخ:** مامۆستا لەم پرسیارەدا دێمە سەر چۆنیەتیی دامەزرانی پێوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستان دەگەڵ دەوڵەتی عێراق کە وا دیارە هەورازو نشێوی زۆری لێ پەیدا بووە. لەبەر ئەوەی پێم وایە جەنابتە کەسێکی کە دەتوانی وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەیەوە بۆیە دەیانهێنمە گۆڕێ. لە هەرکوێ پێت وا بوو پێویست بە وەڵامدانەوە نیە، دەتوانی وەڵام نەدەیەوە. پرسیارەکان بەمجۆرن:

* یەکەم هەنگاوەکان بۆ دامەزرانی پێوەندی چۆنو کەی دەستی پێ کردو بە هۆی چ کەسێکەوە بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە لە جێیەکی دیکەدا هێناومە، جا نازانم چەندە بە تەفسیل یان بە کورتیم باس کردوە. پاش بەیانی یازدەی ئاداری ۱۹۷۰ ئێمە چووینە لای مەرحوومی بارزانی. عەرزمان کرد کە هەتا ئێستا لەبەر پاراستنی قازانجی ئەم شۆڕشە دەستمان لە هەموو شتێک هەڵ گرتوە. ئەو حیزبەمان مراندوە. بەڵام ئێستێ کە ئێوە بەخۆشی‌یەوە بە تەوافوق گەیشتوون و دەوڵەت ئیعتیرافی بە حقووقی کورد کردوە، چاوەڕوانیمان هەیە کە ڕێگا بدەن ئێمە ئیدی لەمە بەدوا تێکۆشانی حیزبیمان دەست پێ بکەینەوە. گوتی وەڵڵا لێرە باش نیە، بەڵام ئێوە بچنە لای دەوڵەتی عێراق، لەوێوە کار بکەن. هەموومان وا تێ گەیشتین کە لێمان بە گومانە (دیارە دوایە دەرکەوت کە هەموومان ئەو هەستەمان هەبووە). پێمان وا بوو ئەو وا دەزانێ ئێمە پێوەندیمان بە دەوڵەتی عێراقەوە هەیە. گوتمان باشە ئێمە چی‌و دەوڵەتی عێراق چی؟ گوتی نا بابە خۆ نالێم پێوەندیتان هەیە. دەڵێم پێوەندی بگرن. ئێستا دەوران گۆڕاوە. ئەوە ڕێککەوتن هەیە، بەیانی یازدەی ئادار هەیە، حوکمی زاتی هەیە. هەروەها گوتی ئەوە "حیزبەینی حەلیفەینی" هەن بەڵام ئەوەی بۆ ڕێککەوتین بوو. کە دیارە مەبەستی لە هاوپەیمانیی دوو حیزبی بەعسو پارتی بوو کە وای دەنواند هیچ باوەڕی پێی نیە. ئەوە وەزیری کورد هەیە ئەمن بە "سامی" دەڵێم ڕێگەی بدا. یانی ئەووەڵ گەرای پێوەندیی دەگەڵ دەوڵەتی عێراق لەو جەلەسەیەدا گوورا. واتە بە پێشنیاری مەرحوومی بارزانی‌و بە ڕێگای مەرحوومی سامی عەبدوڕڕەحمان‌دا کە وەزیری "شئون شمال" بوو، ـ پارتی دای‌نابوو ـ یەکەم پێوەندی دەگەڵ دەوڵەتی عێراق گیراو دوایە بۆخۆمان کاروکاتمان درێژە پێدا. ئەمن قەتی تێدا نەبووم قەت. چەند ساڵان لەوێ بووین دەگەڵ ئەوەی ئەمن زاهیرەن عەرەبیم باشتر دەزانی، بەڵام قەت قبووڵم نەکرد بەرپرسی پێوەندی‌یەکان بم.

دواتر لەڕێگای پیاوێکەوە ئەو پێوەندی‌یە گیرا کە پاش ماوەیەک دەوڵەتی عێراق بۆخۆی ئیعدامی کرد، "عەبدالخالق سامرایی". پیاوێکی زۆر خوێندەوارو شەریفەو پێشکەوتنخواز بوو، کە هەر بۆیەش بیانوویەکیان بۆ ساز کردو هەر بۆخۆیان کوشتیان. دوکتۆر دەگەڵ وی هەر لە پراگەوە دۆستایەتی‌و ئاشنایەتیی هەبوو. هەربۆیەش لە ڕێگای ئەوەوە ئەو پێوەندی‌یە ساز بوو. زۆر چاکم لەبیرە کە دوکتۆر قاسملوو هێندێک شتی هێنانە سەر کاغەز وەکوو مەبنایەک بۆ هاوکاری. نووسیبووی ئێمەو حیزبی بەعس هەردووکمان حیزبی پێشکەوتنخوازین. هەردووکمان دۆستی وڵاتانی سۆسیالیستیین. هەردووکمان موخالیفی ئیمپریالیزمین. ئێمە داوای خودموختاری بۆ کوردستانی ئێران دەکەین، کە ئێوەش وەک حیزبی بەعس خودموختاریتان بۆ کوردستانی عێراق بەرەسمی ناسیوە. خولاسە چەند خاڵی هاوبەشی کە لە سیاسەتی هەردوو لامانێدا هەبوون یادداشت کردبوون. لە ئاخری‌دا نووسیبووی ئێمە هەم دۆستی ئێوەین، هەم دۆستی پارتی دیمۆکراتی کوردستانین. بۆ ئێمە زۆر جێگای خۆشحاڵی‌یە کە هەردوو دۆستەکەشمان پێکەوە دۆستن. بەڵام ئەگەر ڕۆژێک خودا نەخواستە ئەو دۆستایەتی‌یە تێک بچێ، ئێمە نە دۆستایەتیی ئێوە بۆ پارتی وەلا دەنێین، نە دۆستایەتیی پارتی بۆ ئێوە وەلا دەنێین. ئەوە زۆر عەجایب دووربینانە بوو. ئەمن ئەوانەم کردن بە عەرەبی. ئەوانەمان دانێ وەکوو مەبنای هاوکاری‌و پێوەندی لەبەینماندا. دیارە هاوکاری‌یەکە چی بوو. ڕێگایان دا لەعێراق بین. شتێکی زۆر کەمیان یارمەتیی ماددی دەکردین. یەکجار زۆر کەم بوو کە بەشی ئەوەی دەکرد کرێ خانووەکەی لێ بدەین، ئەو مەقەڕو تەشکیلاتەی هەمانە پێی ئیدارە بکەین. ئیدی وەکوو قەرەمووت ڕەنگە لەنێو خۆماندا شتی وا ئەبوو، بەڵام لە پێوەندیی دەگەڵ بزووتنەوەی کورددا هەوراز و لێژی زۆری لێ پەیدا بوو.

بۆ نموونە ئێمە پاش ماوەیەک ڕادیۆیەکمان وەڕێ خست بەناوی "ڕادیۆی دەنگی ئازادیخوازانی ئێران". بە سێ زمان قسەی دەکرد. فارسی‌یەکەی جبهەی میللی ئیدارەی دەکرد. ڕێکخەراوی جبهەی میللی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. تورکی‌یەکەی حیزبێکی ئازەربایجانی هەبوو بەناوی ڕاهی ئازادی. نازانم بە تورکی دەبوو بەچی ــ ئەو ئیدارەی دەکرد. کوردی‌یەکەشی ئێمە ئیدارەمان دەکرد. بەڵام وتارەکان کە دەنووسران هەموو لەسەریان تەوافوقمان دەکرد چونکە ڕادیۆکە لە بەغدایە بوو. وەختێک ــ ئەوە دیسان لە شتە ناخۆشەکانە کە پیاو وەبیریان دێنێتەوە ــ دوو ئەندامی حیزبمان بە ناوەکانی: مەرحوومی سەتاری مامەدی کە ئەو دوایی‌یانە لە سوێد کۆچی دوایی کردو شەهید حەسەنی ئەردەهاڵی کە لەلایەن ڕێژیمی شاوە ئیعدام کرا، ئەوانە هاتن بۆ بەغدا بۆ پێوەندی دەگەڵ حیزب. کە گەڕانەوە لە "حاجی ئۆمەران" گیران و تەسلیمی ئێران کرانەوە. پارتی گرتنی‌و تەسلیمی کردنەوە. بەعس هات گوتی ئێوە دەبێ لە ڕادیۆدا هێرش بکەنە سەر مەلا مستەفا. گوتمان نای کەین. گوتیان ئاخر ئەوە ڕەفیقەکانی ئێوەی تەحویل داوەتەوە. گوتمان دەزانین بەڵام ئێمە مەقالە لەسەر

شتێک دەنووسین کە بۆخۆمان پێمان وابێ دەبێ لەسەری بنووسین. هێرش بۆسەر بارزانی بە قازانجی خۆمانو کورد نازانین بۆیە نای‌نووسین. گوتیان ئەگەر نەی‌کەن لە ڕادیۆیە کە دەوتانە‌دەکەین. ئێمە گوتمان ڕادیۆ کە هی خۆتانە دەتوانن دەرمان بکەن، بەڵام ناتوانن مەقالەمان پێ بنووسن. ئێمە هێرش ناکەینە سەر بارزانی. لە ڕادیۆکە دەریان‌کردین. مانگێ ٥٠٠ دینارش-کۆمەکیان دەکردین، ئەویشیان لێ بڕین. ئێمەش خۆ دەرەتانی هاتوچۆی وڵاتمان نەبوو. یارمەتیمان پێ نەدەگەیشت هەر ئەوەندە بوو. وای لێ‌هات هەتا چوار مانگ یان شەش مانگ نازانم چەند بوو، ئێمە بە قەرزوقۆڵە دەژیاین. بەڵام دەریان نەکردینو ماڵەکەشیان پێ چۆڵ نەکردین. بەبێی چوار مانگ یان شەش مانگی پێوە خرا. ڕۆژێک تەلەفۆنیان کرد گوتیان دێین بۆ سەردانتان. هاتن. ئەزقەزا کە هاتن ئەمنیش لەوێ بووم. دیارە ئەمن ماڵم هەبوو بەڵام ئەمنیش لەوێ بووم. هاتن گوتیان ئێمە هاتووین سەلام لە ئێوە بکەین. ئێوە سایەتان کرد بیروباوەڕتان هەیە. ئێمە پێمان خۆشە ئاشت بینەوە. دوکتۆر گوتی خۆ ئێمە هەر ئاشتین ئێوە تێکتان داوە. ئەوە بوو پێوەندی‌یەکەیان بەرقەرار کردەوەو ئەو پووڵەی ئەو ماوەی نەیاندابوو هەر نەیاندا، بەڵام بۆیان کردینە هەزار دینار. هەر یەکسەر هەزار دیناریان لەوێ دایێو پاشان هەموو مانگی دەیاندا. ئەو وەختی هەزار دینار بۆ ئیحتیاجاتی مە کیفایەتی دەکرد.

جارێکی دیکە لەسەر یەکیەتی نیشتیمانی. ئەو وەختی ناوی یەکیەتی زۆر نەکەوتبووە سەر زارو زمانان بەڵام بە هەرحاڵ دامەزرابوو. لە جەرەیانی ئەوەڵدانەوەی کاک ئەحمەد نستانی‌و کاک کەریم نستانی‌دا. دیارە ئێمە بۆخۆمان دەگەڵ یەکیەتی لەسەر ئەوەی ئیختیلافمان لێ پەیدا بوو. بەڵام ئەوان هاتن گوتیان دەبێ لە زیەدی یەکیەتیی نیشتیمانی شت بنووسن. گوتمان نانووسین. هەرچی هەوڵیان دا گوتمان نانووسین. جەمعێکیان لێ بانگ کردین کە منیان دەگەڵ نەبووم، دەستمان لێ‌شوتن گوتمان تازە نایانهێننەوە. لەپاشان ئەوانیش حادیسەیەکیان بۆ هاتبووە پێش کە بەقینیان کردبوو بۆ لەبەین‌بردنیانە. سواری ئاسانسۆر دەبن، بەرق دەکوژێتەوە. دەوێندا حاسیە دەبن. دوو سەعات، سێ سەعات دە ئاسانسۆڕی‌دا دەبن. ئیدی دەڵێن ئەوە بەرنامەیە بۆ وەی بمانکوژن. دوایە دەرکەوت کە شتەکە وا نەبووەو هەر بەڕاستی بەرق بڕاوە. بەڵام لەوێ پێیان گوتبوون ئێوە زۆر لە "جەلال"ی بۆمە خەتەرناکترن. جەلال هەر نەبێ لە شاخی‌یە، بەڵام ئێوە لەنێو دڵماندان. ئێوە لەنێو جەرگەی خۆماندا خیانەتمان پێ دەکەن. گوتبوویان بابە ئێمە دۆستی ئێوەین بەڵام ئێمە دوژمنایەتی بۆخۆمان ساز ناکەینو ئەوانەش دوژمنی ئێمە نین. باسی ئەو شتەیان کردبوو کە کارێکی خراپە، بەڵام لەسەر ئەوە نابێ پێوەندیی دوو حیزبان تێک بچێ.

یان وەختێک لە ساڵی ١٣٥٧دا دەمانویست بگەڕێینەوە بۆ ئێران پێیان ڕاگەیاندین کە لە سنوورەکانی ئێمەوە ناتوانن بچنەوە. ئێمە دەگەڵ ئێران ڕێک کەوتنمان هەیەو نامانەوێ بەلای ئێمەدا بڕۆنەوە. ئێوە دەچنە هەر جێیەک، ئێمە بلێتی تەیارەتان بۆ دەکڕینو لە هەرجێگایەکی کە لێتیکتان بۆ دەکڕینەوە خۆ دەزانی.

هاتینەوە. بەڵام ئێمە ئیجازە نادەین لە سنووری ئێمەوە بڕۆنەوە. گوتمان باشە. دوکتۆر قاسملوومان کردە بارمتە. چونکی گوتمان ئەگەر ئەو دیار نەبێ مەعلوومە، بەڵام ئەگەر ئێمە دیار نەبین دەڵێن داخوا چوونە کوێ. شەش کەس بووین کە دەبوایە بچینەوە. هەر بە دوو شەوان دوومان هاتین. ئاخر دوو کەس ئەو (دوکتۆر قاسملوو) و مەرحوومی سەید ڕەسووڵی بابی گەورە بوون کە هاتنەوە نێوخۆی وڵات. ئیدی ئێمان تەقاندو هیچیش نەبوو. دیارە دەفتەرمان چۆڵ نەکرد بەڵام دوایە وەک شتێک هیچیان نەگوت. یانی شتی ئاوا هەبوو کە فشاریان بۆ دێنایین بەڵام ئەگەر بڵێم دوژمنایەتیمان لەبەینێدا پەیدا بوو ئەوە نەبوو. هیچ وەختێک نە بووینە دوژمن، نە بووینە ئاغاو نۆکەر.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا بۆ ئەحمەد نستانی‌و کەریم نستانی یەکیەتی تەحویلی دانەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ کەسانێک تەحویلیان دانەوە کە سەر بە بزووتنەوەی سۆسیالیستی بوون. بزووتنەوەی سۆسیالیستییش بەشێک بوو لە یەکیەتی.

**عەباس کاردۆ:** یانی ئەوە بڕیاری سەرکردایەتی‌یان بوو یان وەک شتێکی چەند کەسێک کردیان؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوانەی تەحویلیان دابوونەوە وەک گوتم سەر بە یەکیەتی بوون. شتێکیشیان نووسیبوو کە ئێمە لە ڕاگەیاندنی خۆماندا لەسەرمان نووسی. تەنانەت نووسیبوویان کە ئەو کەسانەی ئەو کارەیان کردوە موحاکەمە کراون و سزا دراون کە دیارە لە دەرەوە ئەوەیان بڵاو کردبۆوە. ئێمەش لە ئەدەبیاتی خۆماندا لەسەرمان نووسی کە ئەوانە کە دەڵێن بە سزای خۆیان گەیشتوون ئێستا لە بنکەی سەرکردایەتی لە سنووری ئێران ئێران و عێراق خزمەت دەکەن. جا لە بنکەی "تۆکان"ی بوون.

* ئەو کات کە ئەو پێوەندی‌یە دامەزرا حوکمی عێراق بە دەست کێ بوو؟ چاوەڕوانیی ئەوان لەحیزب چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** حوکمەکە دیارە بە دەست حیزبی بەعس بوو. حیزبی بەعس ئەی‌دەگوت حاکمی عێراقم. دەیگوت قائیدی عێراقم یانی پێشەواو سەرکردەی عێراقە. بەڵام ئەو وەختە "احمد حسن البکر" سەرکۆمار بوو. ئەوان سێ پۆستیان هەبوون: سەرکۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش، سەرۆکی قیادەی ناوچەیی حیزبی بەعس. ئەو سێ‌یە هەر سێکیان بە دەست ئەحمەد حەسەن بەکرەوە بوون و سەددام حوسێن جێگری بوو. بەڵام لەباری تیئۆری‌و هەروەها ئەعمالییەتی بەدەنی‌و ئەوانەوە سەددام حوسێن چالاکتر بوو. بەکردەوە هەموو کەس دەی‌زانی دەسەڵاتی واقیعی بە دەست سەددام حوسێنەوەیە. تەنانەت ساڵی ١٩٨٠ کە ئەحمەد حەسەن بەکریان لابرد، سەددام نوتقێکی دا کە ئەو بۆخۆی ئیسراری کردوە دەنا ئێمە پێمان

خۆش بوو هەر لەسەر شانان هەڵی گرین بۆ ئەوەی سێبەری هەر لەسەر سەرمان بێ. بەڵام هەرچی هەوڵمان دەگەڵی دا قبوولی نەکرد. لەحاڵێک‌دا خەڵک پێیان وابوو بۆخۆی لای بردوە.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ئێوە پێش بازدەی ئاداریش لە بەغدا بوون بەڵام پێوەندیتان نەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئێمە پێش بازدەی ئادار کێمان لە بەغدا بوو. کاک حەمەدەمینی سیراجی لەوێ بوو کە ئەو پێوەندیی هەبوو. ئەو نازانم بە چ شێوەیەک‌و لە چ ڕێگایەکەوە ئەو پێوەندی‌یەی هەبوو. یووسفی ڕیزوانی کە لەوێ بوو وەکوو عێراقی‌یەک لەوێ بوو. چونکە هەموو شتێکی عێراقیی هەبوو. هەم دوکانی هەبوو، هەم ژن‌و ماڵی هەبوو. بەڵام کەسی دیکە هەبوون لەوێ. مەسەلەن مەرحوومی زەبیحی لەوێ بوو. خەڵکێکیشی دەگەڵ بوو. بەڵام نەک وەکوو حیزبی دێمۆکرات، حیزبی دێمۆکراتیش وەختی خۆی لە ساڵەکانی ٣٨ و ٣٩ کە خەڵکی ئێمە قاچاغ بوون‌و هاتنە کوردستانی عێراق، پێوەندی‌یان دەگەڵ دەوڵەتی عێراق هەبوو. وەکوو مەجموعەی حیزبی. بەڵام ئیدی بەو شێوە جیددی‌یە کە وەکوو حیزبێک تەعامولیان دەگەڵ بکەن ئەوە نەبووە. هەر وەکوو جەمعێک پەنابەرو لێقەوماو چاویان لێ‌دەکردن. دیارە ئێمە هیچ وەختێکی لە عێراق بەشێوەی ڕەسمی داوای پەنابەریمان نەکرد. هەر وەکوو حیزب لێرە بووین. ئەفرادی ئێمە وەکوو فەرد هیچ پێوەندی‌یەکیان بە دەوڵەتەوە نەبوو.

* ئەو کەسانەی لە درێژایی چەندین ساڵ پێوەندیی حیزب دەگەڵ دەوڵەتە جۆراوجۆرەکانی عێراقدا نەخشیان بووەو لەڕاستی‌دا کارساز بوون کێن؟ مەبەست لایەنی حیزبە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەکوو کارساز ئێمە هیچمان لە هیچ شتێکدا کارساز نەبووین. خەڵک ڕەنگە باوەڕ نەکەن بەڵام حیزبی دێمۆکرات تەنانەت دوکتۆر قاسملوویشی بەتەنیا بڕیاردەرو کارساز نەبووە. شتەکانمان حیزبی بوون‌و جەمعی بوون. بەڵام هەتا ئەو ماوەیەی لە بەغدا بووین مەسئوولی پێوەندیمان هەر کاک حەمەدەمینی سیراجی بووە، دواتر کە ئەو پرووتەوە هەڵگیرسا، نوێنەرەکانمان گۆڕان. بەینێکی مەسەلەن کاک سەلیمی بابازادە بوو، کاک ئەبووبەکری ڕاد بوو، کاک ڕەحمانی کازمی بوو، ماوەیەک شەهید عەبدوڵڵا قادری‌ئازەر بوو. ماوەیەک کاک سەید سەلامی عەزیزی بوو. ماوەیەک کاک غەفووری هەمزەیی بوو. ماوەیەک کاک حەمە نەزیفی قادری بوو. ماوەیەک کاک موحەممەدی حەسەن‌پوور بوو. ئەوانە وەک مەسئوولی پێوەندی لەوێ بوون. دەنا کارسازو بڕیاردەرێک دەکاردا نەبوو.

**عەباس کاردۆ:** نا، مەبەستم ئەوەیە کەسانێک لە لایەن عێراقەوە چاک وەرگیرابن، گوێیان بۆ ڕاگیرابێ‌و شتی ئاوا.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** عێراقییەکان وەکوو دیپلۆمات ڕەفتاریان کردوە. حیزبی دیمۆکرات قەتی وا نەکردوە دەوڵەتی عێراق حوکمی بەسەردا بکا. بناغەیەکی دامەزراندبوو کە قەت دەوڵەتی عێراق چاوی لەوە نەبوو حیزب نۆکەریی بکا. لە حەیاتیشیاندا قەت بەمەیان نەگوت ئەو نوێنەرەتان باشە ئەوەتان خراپە. هێندێک نیشانە لەدەستدا هەن، یان هێندێک بۆچوون هەن کە کاک غەفووری هەمزەیی ئەوان کوشتوویانە. چونکی کاک غەفوور پیاوێکی زۆر بێ‌ئیحتیات بوو، زۆر پێوەندیی دۆستایەتییشی دەگەڵ ڕێبەرانی بزووتنەوەی کورد هەبوو. زۆر جار بە تەلەفۆن مەسایلێکی باس دەکرد، ئەمن کە قسەم دەگەڵ دەکرد هەموو جارێ تەلەفۆنەکەم لەسەر دادەخست. یانی قسەی وای دەکرد کە نەدەبوو بە تەلەفۆن بیکا. مەعلوومیش بوو ئەو تەلەفۆنە کۆنترۆڵ دەکرێ. جا ئەو ڕەئییە هەبوو کە کاک غەفوور نەک ئێران بەڵکە ئەوان کوشتوویانە، هەرچەند ئێمە ئێرانمان تاوانبار کرد. بەڵام قەت ئەوان‌گوت غەفووری لابەرن. قەت ئیجازەمان بەخۆیان ئەدا بڵێن ئەفەری ئێوە باش نیە کەسێکی دیکە بنێرن.

* لە عێراقییەکان کێ زیاتر خۆی بە دۆستی ئێوە دەزانیو کێ زۆر نارەحەتی دەکردن؟ مەبەستم دژی بەرژەوەندیی ئێوە بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ناتوانم شتێکی ئاوا بڵێم چونکی دەگەڵ هەموو ئەو سیاسەتانەی کە هەیانبووە بە زیدی کورد، ئەوانە وەکوو دەوڵەت عەمەلیان دەکرد. ئەفراد ڕەنگە تەئسیریان هەبێ. یەکێک ئەگەر پێی خۆشبێ هاوکاری بکا، ئەگەر سیاسەتی دەوڵەتەکەش وا بێ ڕەنگە زیاتر هاوکاری بکا. یەکێک ئەگەر پێی خۆش بوو کارشکێنی بکا ئەگەر سیاسەتی دەوڵەتیش وا بێ ڕەنگە زیاتری بکا. بەڵام سیاسەتی کولڵیی دەوڵەتێک ئەوەندە پێوەندیی بە شەخسەکەوە نیە. یانی پێوەندیی شەخسی ئەوەندە کاریگەر نیە. بۆیە دەتوانم بڵێم هیچ وەخت کەسێک نەبوو، کە پیاو بڵێ ئەوە کارشکێنیی مە دەکا. یەکیان ڕەنگە هاوکاریی دەگەڵ خۆشتر بووبێ، یەکێکیان ڕەنگە ناخۆشتر بووبێ. بەڵام هەمووی مەربووتە بەوەی کە سیاسەتی گشتی‌یان چیە. ئەمن بۆخۆم لەمسم کردوە، لەو مەرحەلەیەدا دەبینی ئەوانە هاوکارییەکانیان خۆشترە، ئەمە یان ئەوە فەرقێ ناکا. لەو مەرحەلەیەدا کە ناخۆشە، ئەمە یان ئەوە فەرقێ ناکا. عەرزم کردی ئی وا هەیە ڕەفیقایەتیی دەگەڵ خۆشترە بەڵام وەک دەوڵەتێک سیاسەتە گشتییەکەیان موهیمە. ناتوانی ئیسبەتی بدەی بە ئەفرات.

**عەباس کارووز:** یانی کەسی وا پەیدا نەبووە کە بڵێن پێی خۆش بووبێ حیزبی دیمۆکرات باشتر کارەکانی بۆ ڕاپەڕێنلرێن؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ڕەنگە یەکێک بووبێ ڕەفیقایەتیی خۆشتر بووبێ. بەڵام ئەوە نیەی لە چوارچێوەی ئیمکاناتەکەدا توانیوەیەتی بیکا. یانی هاوکارییەکەی دەگەڵ خۆشتر بووبێ، هەبوو، تەنانەت لە مەرحەلەیەکدا ئەوانە وایان لێ هاتبوو وەزعیان زۆر خراپ بوو. چاکەی مە دەگەڵ وان دەی‌توانی تەئسیری لەسەر کارڕاپەڕاندنەکە هەبێ. یانی ئەو وەختەی عێراق کەوتە گەمارۆی ئابووری‌یەوە مەنموورێکی وان ئیحتیاجی بەوە هەبوو کە حیزبی دێمۆکرات، یان ئۆرگانێکی دەوڵەتی یەکەی چاکەیەکی دەگەڵ بکا. دیاری‌یەکی بلاتێ، چونکە وەزعیان زۆر خراپ بوو. ڕەنگە ئەوە تەئسیری دانابێ. پێم‌خۆش نیە ناوی هیچ کەس بەرم چونکی ئەوە گرنگ نیە. ئەوە تەنیا بۆ ئەوەی کارەکە زووتر یان درەنگتر ڕاپەڕێ، دەنا ئەو شتەی بڕیار دراوە ئەوا هەمیشە مەرکەز بڕیاری لەسەر داوە.

* بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ئێران و عێراق نێوانناخۆشی و کێشەیان هەبووە و تەنانەت بۆ ماوەی هەشت ساڵ لە دەورانی کۆماری ئیسلامی‌دا شەڕی یەکتریان کردوە. لە زۆربەی ئەو ماوەیەدا حیزبی دێمۆکرات پێوەندیی ڕاستەوخۆی دەگەڵ عێراق هەبووە. پرسیار ئەوەیە حیزبی دێمۆکرات چۆن لەنگەری پێوەندی‌یەکانی وا ڕادەگرت کە نەبێتە پاشکۆی عێراق؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** وەک لە پێشدا عەرزم کردی هەر لە سەرەتاوە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان وەک جەرەیانێکی سەربەخۆی بڕیارەدەستخۆ دەگەڵ عێراق تەڕەف بوو. بۆیە لەو بارەیەشەوە هەر لە ئەووەڵەوە ئوسووڵێکمان دانا. ئەوەمان بە عێراقی‌یەکانیش گوت. دیارە بەحەق دەبێ بڵێین کە مێعماری ئەو سیاسەتانە بە پلەی یەکەم دوکتور قاسملوو بوو. بەڵام پێمان گوتن ئێمە عەمەلەن دەستەنگەرێک داین. دوژمنی هاوبەشمان هەیە. بەڵام شەڕی ئێمە و شەڕی ئێوە هەم لە تەبیعەتداو هەم لە ئامانجەکانی‌دا دوو شەڕی بەتەواوی لێک جیاوازن. شەڕی ئێوە شەڕی دوو دەوڵەتانە، بۆ گرتنی خاکە، بە قەولی فارسی بۆ کیشوەرگوشایی‌یە. شەڕێکی جەبهەیی‌یە بە ئەرتەشی مونەززەم و تانک و تۆپ و هەلیکۆپتەر و تەیارە و مووشەکەوە. شەڕی ئێمە شەڕی میللەتێکی بێ‌دەسەڵاتو ژێردەست بۆ وەدەستهێنانی مافەکانی خۆیەتی. ئەوە لەباری ئامانجەوە. لەباری تەبیعەتیشەوە شەڕی ئێمە شەڕێکی پارتیزانی‌یە. کەوابێ ئێمە لەو بارەیەوە بە تەواوی لێک جوداین.

**هیلی کارەۆ:** یانی ئەوانەتان بەوان دەگوت؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** بەڵێ بەڵێ زۆر بە سەراحەت. تەنانەت جارێکی نوێنەری قەلادزێ ئێمەیان بانگ کردبوو پێیان گوتبوو ئێمە دەمانەوێ عیددەیەک بە ئیستیلاحی خۆیان لە فورسانەکان بنێرین حەملە بکەنە سەر ئێران لە مەنتەقەی ئالانی، پێمان خۆشە هاوکاریمان بکەن. دوکتور قاسملوو لەسەفەر بوو. ئەمن جێگری سکرتێر بووم. هاتە کن من. ئەمنیش گوتم بچۆ پێیان بڵێ قەلادزێ حەقی نیە تەماس دەگەڵ دەفتەری

سیاسی بگرێ. دەبێ بەغدا تەماس دەگەڵ من بگرێ، ئێوە بە چ حەقێک پێوەندیی بە ڕێبەرایەتیی حیزبەوە دەکەن؟ مەرحوومی ڕەحیمی بەغدادی بوو. کە چووبۆوە پێی گوتبوون پێیان وا بوو ئیدی دەستبەجێ جێ-بەجێی دەکەم. بە بەغدایەیان گوتبوو. نوێنەرمان لە بەغدایەڕا هاتەوە عەینی مەسەلەی گوت. گوتم پێیان بڵێن پێشمەرگەی حیزبی دێمۆکرات هەرکە شەو داهات هەر چەکدارێک ببینێ ئەگەر دەنگی داو ناوی نەهێنیی نەگوت لێی دەدا. ئێمە ئەو هاوکارییە دەگەڵ ئەوان ناکەین. ئەگەر دێن بە ئەرتەشەوە هێرش دەکەن، دەگەڵ ئەوەی پێمان ناخۆشە، چونکە دەسەڵاتمان نیە پێشمان پێ ناگیرێ. بەڵام قەت ئیجازە نادەین ئەوان بێن بە کنمەدا تێپەڕن و ئەو کارە بکەن. ئەگەر دەگەڵیان ناکەین، لێشیان دەدەین. ئێمە جوابمان کردن. ئەوپاشان ئەویان دەگەڵ سازمانێکی دیکە(موجاهیدین) کرد. موجاهیدین دەگەڵی کردن و عەمەلیاتێکی زۆر ناموەفەقیان کرد. خەڵکیان لێ کوژراو بە ناسەرکەوتوویی گەڕانەوە. یانی حەتتا بۆ یەک مەوریدیش ئیجازەمان نەدا ئێمەو ئەوان پێکەوە شەڕ دژی ئێران بکەین. بەڵام ئێمە لە جبهەیەکەوە شەڕمان دەکرد، ئەوان لە جبهەیەکی دیکەوە.

**عەبباس کاردۆ:** بەڵام بیستوومە کەسانێکیان وەک ئەفسەر و شتی وا دەگەڵ هێزی ئێمە هاتوونەتە ناوچەو ئیتلاعاتی نیزامی و شتی وایان کۆ کردۆتەوە. ئەوە ڕاستە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن بەش بەحاڵی خۆم قەتم حاڵەتی وا نەدیوە.

* دەزانم جەنابت یەک لەو کەم کەسانەی نێوحیزب بووی کە ئاگات لە کەلێن و قوژبنەکانی ئەو پێوەندی-یانە هەیە. پرسیار ئەوەیە ئایا نموونەی وات پێ شک دێ دەوڵەتی عێراق ڕاستەوخۆ داوای ئەوەتان لێ بکا دژی کوردەکانی باشوور ڕاوەستن و ئێوە ڕەتتان کردبێتەوە؟ ئەگەر هەبووە چۆنتان پاساو بۆ هێناوەتەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن دوو نموونەم پێشتر بۆ باس کردی. با دوو حادیسەی سەیرت بۆ بگێڕمەوە. هەر بۆخۆم کە سکرتێر نەبووم بەڵام ئەندامی دەفتەری سیاسی بووم. بۆ مەبەستێک چووبووینە سلێمانی لە مەرکەزی موخابەرات دانیشتبووین بەڵام قائید فەیلەقیش لەوێ بوو. باسی وەزعییەتی "بۆڵێ" و هاتوچۆی پێشمەرگەی باشوور بەوێدا هاتە گۆڕێ. ئەمن لەوێ بە سەراحەت گوتم ئێمە دۆستی ئەوانین. ئێمە خێری ئەوانمان دەوێ. هاتینە دەرێ و قەرار بوو دوایە بچینە چوارقوڕنەی. کاک غەفووری هەمزەیی ئەو وەختی مەسئوولی پێوەندیی سلێمانی بوو. کە هاتینە دەرێ گوتی ئەرێ ئەتۆ دەزانی دەڵێی چی؟ گوتم بەڵێ بەڵێ خۆ بۆخۆت دەزانی ئەمن مەشرووب ناخۆمەوە مەست بم. زۆر چاک دەزانم دەڵێم چی. ئەوان دەبێ بزانن کە ئێمە دوژمنی کوردی عێراق نین. ئەوانە برای ئێمەن، ئێمە خێری وانمان دەوێ. لەپاشان مەوعیدێک دانرا،

چووینەوە لەوێ بە هێلی کۆپتەر چووین بۆ چوار قوڕنەی کە مەرکەزی فیرقەی لێبوو. لەوێ دەستمان کرد بەقسان. قائید فیرقەکە داوای کرد ئێمە نەیەڵین پێشمەرگەی کوردی عێراق بەنێو ئێمەدا بێن. ئەمنیش گوتم جا بۆ ئێمە نەیەڵین؟ ئەو هەمووە ڕەبیئەی فورسانە و عەسکەرەکان هەیە با ئەوان نەیەڵن، بۆ ئێمە؟ گوتی باشە مەیەڵن بەنێو خۆتاندا بێن. ئەمن گوتم بەنێو ئێمەشدا بێن ئەوە خاکی وانە، ئەوان حەقیانە بە ئێمە بڵێن ئێرە مەبن. ئێمە چۆن بەوان بڵێین ئێرەدا مەیەن؟. ئەوە خاکی وانە ئێمە چۆنیان پێ بڵێین؟ گوتی یانی ئەگەر بەنێو ئێوەشدا بێن پێیان ناڵێن؟ گوتم نا پێیان ناڵێین. کابرا لە دین دەرچوو. ژەنەراڵێک بوو. ئەو ئەبوو مێژەری باسم کرد لە تەعرەب موخابراتەوە دەگەڵمان بوو. گوتی لەسەرخۆ لەسەرخۆ "سیدي القائد". گوتی کورد ئەوە دەڵێ بەنێویشماندا بێن پێیان ناڵێین ئێرەدا مەیەن. گوتی سیدي القائد لەمێژە قیادەی عێراق ئەو سیاسەتەی حیزبی دێمۆکرات دەزانێ. بە زانینی ئەو سیاسەتەوە قیادەی عێراق دۆستایەتیی حیزبی دێمۆکرات دەکا. بناغەی کارەکانمان ئاوا دامەزراندبوو.

جارێکی، دیارە ئەمن ئیدی هەر ئەو جارەم لێ بیستوون کە باسی خراپەی یەکێتی و مام جەلالیان کردبێ. بە موخەرریبیان ناو برد. گوتم ئێوە کەیفی خۆتانە چۆنیان باس دەکەن بەڵام ئێمە پێمان خۆش نیە گوێمان ئەو قسانە بێ. ئەوان دۆستی مەن. گوتی چۆن ئەوان دۆستی ئێوەن؟ گوتم مەعلوومە، ئەوانە برای ئێمەن. گوتم با شتێکی دیکەشت پێ بڵێم. ئەتۆ چۆن بە کەسێک دەڵێی موخەرریب کە دوێنێ "سیادەت الرئیس"ی تۆ ماچی دەکرد. ئاخر موزاکەرەیان هەبوو تازە تێک چووبوو. گوتم سبەینێش لەوانەیە یەکتر ماچ کەنەوە. ئەتۆ لەلای خۆت چی پێ دەڵێی بیڵێ، بەڵام ئەگەر لەلای ئێمە وا دەڵێی دەواقیعدا بە ئێمەی دەڵێی. چونکی ئێمە لە ئێران چ دەکەین، ئەوانیش لە عێراق هەر ئەوەی دەکەن. ئیدی جارێکی دیکەم لێ نەبیستەوە بە بێ‌حورمەتی ناویان بەرن. دیارە نەیاندەگوت مام جەلال. بەڵام دەیانگوت جەلال. دەیانگوت ئیتیحاد، دەیانگوت مەسعوود یان پارتی. قەت ئیتر لە لای ئێمە بە بێ‌حورمەتی باسی ئەوانیان نەکرد. چونکی هەر لەبنەڕەتەوە پێمان گوتبوون نە مشتەریی ئەو قسانەین، نە بە زمانی ئێوە قسان دەکەین. پێمان خۆشە بە زمانی خۆمان قسە بکەین.

* لە جەرەیانی ڕێککەوتنەکەی ١٩٧٠ی کوردەکان و دەوڵەتی عێراقدا کە ئێوە لە بەغدا بوون دەوری خۆتان چۆن دەگێڕا و دوو لایەن چ حیسابێکیان بۆ دەکردن؟ ئەدی لە کاتی شەڕەهەڵایسانەوەدا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەختی ئیمزاکردنەکەی ئێمە لە بەغدا نەبووین. پێشتر باسم کرد دوای بەیانی یازدەی ئادار بە ماوەیەکی زۆر دوکتور قاسملوو هاتەوە چۆوە ئێمە چووین لەڕاستیدا چەند مانگێکی پێوە خرا هەتا ئێمە چووینە بەغدا. دیارە بەڕاستی دەورانێکی تەلایی بوو. ئێرانی هەمووان خۆش بوو. هەرچەند دڵیان

لێک ئەمین نەبوو، بەڵام لە هەموو جێیەک ڕابیتەیەکی دۆستانە حاکم بوو. وەکوو دوو حیزبی هاوپەیمان قسەیان دەکرد. تەنانەت دەوەختی شەڕیشدا ئەمن دیتم حیزبی بەعس نامەیەکی نووسیبوو کە دوایە بڵاویان کردەوە، بۆ پارتی دێمۆکراتیان نووسیبوو. نووسیبوویان ئێمە دەزانین ئێوە لەسەر هەموو مەسائیلی عێراق بەچاک‌و بە خراپ تەئسیرتان هەیە. ئیعتیراڤیان بە نەقشی پارتی کردبوو.

ئەوەندەی مەربووت بە ئێمە بوو، هەر لە هەوەڵەوە بناغەکەمان وا دامەزراندبوو. پێوەندیمان دەگەڵ پارتی کە مەعلوومە پێوەندییەکی زۆر کۆن‌و تاریخی بوو. دەگەڵ وانیش(دەوڵەت) کە پێوەندییەکە تازە بوو، ئەو پێوەندییەمان لەسەر بناخەیەکی باش دامەزراندبوو. دواتریش پێوەندیی دۆستانەمان دەگەڵ هەردووک لایان هەبوو. هەروەها دەگەڵ حیزبی شیوعیی عێراق کە دەتوانین بڵێین تەنیا حیزبی غەیری ئەو دووانە بوو کە زۆر مەترەح بوو. دەگەڵ وانیش هەر پێوەندیی دۆستانەمان هەبوو. یانی هیچ موشکیلێک لەو نێوەدا نەدەهاتە پێش. غەیری ئەو دوو، سێ مەوریدەی کە باس کران. ئەویش قەت نەدەکێشرایە ئەوەی پێوەندیمان دەگەڵ عێراق وای لێبێ کە مەسەلەی وەدەرمان نێن. جارێکی دیکە شتێک هاتە پێشێ لە شەڕی ئۆکتۆبری ١٩٧٣دا. ئێمە ئەو وەختی ڕادیۆیەکمان هەبوو هەر بەناوی "دەنگی کوردستانی ئێران".

**هەباس کاردۆ:** ئەوە هەر ئەو ڕادیۆیە بوو کە باست کرد؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** نەخێر. ئەویان دەنگی ئازادیخوازانی ئێران بوو. ئەمەیان دەنگی کوردستانی ئێران بوو. ئەو ماوەیەکی بەسەرداچوو و لەبەین چوو. ساڵی ٧٣ ئێمە ڕادیۆیەکمان وەڕێ خست هەر بەناوی دەنگی کوردستانی ئێران. ئەوەیان هەر بۆخۆمان بووین. کەسی دیکەمان شەریک نەبوو. بەڵام کە شەڕی ئۆکتۆبر لە بەینی ئیسرائیل‌و وڵاتانی عەرەبیدا دەستی پێ کرد ، عێراق بڕیاریدا کە بە کۆمەگی سووریەوە بچێ. لەبەر ئەوە بڕیاریدا پێوەندییەکانی دەگەڵ ئێران چاک بکاتەوە تا لەپشتەوە لەخۆی ئەمین بێ. هاتن داوایان لە ئێمە کرد کە نابێ لە ڕادیۆی دەنگی کوردستانی ئێراندا قسە بە ئێران بڵێین. ئێمە لەپێشدا گوتمان باشە بۆ لەسەر خۆتانی سابیت دەکەن کە ئەو ڕادیۆیە ئێوە وەڕێتان خستوە؟ خۆ ئێمە ناڵێین لە بەغدایە بڵاو دەبێتەوە. گوتیان بابە هەموو کەس دەزانێ لێرە بڵاو دەبێتەوەو ئێوە ئەو ئیمکاناتەتان نیە وەڕێی خەن. بۆیە دەبێ قسە بە ئێران نەڵێن‌و شتی دیکە بڵێن. ئێمەش گوتمان جا ڕادیۆمان بۆیە دەوێ کە قسە لە دژی دەوڵەتی ئێران بکەین دەنا بۆچیمانە؟ گوتیان ئەگەر شتی وا بڵاو کەنەوە ڕادیۆیەکە دادەخەین. گوتمان دای‌خەن. ئیدی وا بوو دایان‌خست بەڵام ئێمە نەچووینە ژێربار. یانی ئەومان قبووڵ نەکرد کە ڕادیۆیەکمان هەبێ ڕۆژهەتا ئێواری قسە بکا بەڵام باسی شای نەکا. هەر شتی وا دەهاتە پێش دەنا موشکیلمان نەبوو.

لەپاشان کە ئێوانی ئەو دووانە بەرەبەرە دەهات تێک چێتەوە حیزبی دێمۆکرات وەزعو تەحشیکی یەکجار زۆر باشی هەبوو. ئەووەڵەن یەکێک بوو لەو تەرەفانە کە لە دانانی بەرنامەی ئۆتۆنۆمیدا هەموو لا پرسیان پێ دەکرد. پارتیش و دەوڵەتیش و حیزبی شیوعیش، چونکی سێ تەرح ئامادە کران. لە عەینی کاتدا لە ئاخر دیدارەکاندا ـ کە دەڵێین حیزبی دێمۆکرات، دیارە کە دوکتور قاسملوو نوێنەرایەتی یەکەمی دەکرد و ئێمە لەلاوە بووین ـ بەڵام لە ئاخرین دیداری نێوان بزووتنەوەی کورد و دەوڵەتی عێراقدا کە مەرحوومی ئیدریس بارزانی سەرۆکی هەیئەتی کورد بوو، دوکتور قاسملوو هەتا ئەو کاتەی سواری هێلیکۆپتێری کرد هەتا بەڕێی کاتەوە بۆ کەرکووک هەر دەگەڵی بوو. چونکە زۆر نیگەران بوو کە لەوێ بیگرن یان بی گێڕنەوە. دیارە هیچ شتێکی وا دەرنەکەوت کە ئەو نیازەیان هەبێ بەڵام ئەوحەقی بوو نیگەران بێ. تەنانەت دواتریش کە ئەو وتووێژانە سەریان نەگرت، هەیئەتێک پێک هات لەبارەی کەرکووکەوە کە ڕێگاحەڵێک پێشنیار بکا. ئەو هەیئەتە سێ کەسی تێدابوون: یەکێکیان پیاوێک بوو بەناوی "غانم عبدالجلیل" کە بەعسی بوو. نازانم ماوە یان نەماوە. یەکیان خوالێخۆشبوو "خوسرەو تۆفیق" بوو کە پێشتر ئەندامی حیزبی شیوعیی عێراق بوو، دوایە ئەندامی پارتی بوو. هەتا مردیش نازانم وەک تەشکیلات کاری دەکرد یان نا، بەڵام هەر ئەندامی پارتی بوو. بەڕاستی دڵسۆزێک و تێکۆشەرێکی زۆر گەورە بوو. پیاوێکی زاناش بوو. یەکێشیان دوکتور قاسملوو بوو. ئەو سێیانە بوون. دوو ڕێگا چارەیان پێشنیار کرد بۆ کەرکووک، زۆر جالیب بوو. ئەمن ڕێگا حەللەکانم زۆر بەتەفسیل لەبیر نین باسیان بکەم، یەکێکیانم ڕەنگە کەمێکزۆر لەبیر بێ کە ئەوە بوو مەجلیسێکی هاوبەش پێک بێ ئەوەندەی کورد بێ و ئەوەندەی لە دەوڵەتی مەرکەزی بێ و بەسەر یەکەوە ئیدارەی کەرکووک بکەن. کە درا بە سەددام حوسێن، چونکە ئەو هەمەکارە بوو گوتبووی جا ئەوە هەر ئەو قسانەن کە بارزانی دەیانکا.

دواتر کە وەزعەکە تێک چوو و بوو بە ناخۆشی و ئیحتیمالی شەڕەکە بە تەواوی بەقووەت بۆوە، ئێمەش لە نێوخۆمانیدا ـ کە ئەوە باسێکی دیکەیە ـ هاتینە سەر ئەو باوەڕە کە دوو کەس لە ڕێبەرایەتیی ئێمە و کادرێکی دیکەمان بچینە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە. ئەوانەش یەکیان ئەمن بووم وەک ئەندامی دەفتەری سیاسی. یەکیان کاک مەلا ڕەسووڵی پێشنەماز بوو وەک ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و ڕەحمەتی کاک سەید ڕەسووڵی بابی گەورەش کە وەک کادرێکی پێشکەوتووی حیزب بوو بەڵام لەو کاتدا ئەندامی ڕێبەری نەبوو. قەرار بوو بچین مەقەڕێک بکەینەوە بۆ ئەوەی بە جۆرێک لە جۆرەکان بەو ئەندامانەمان ڕابگەین کە لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا بوون. لە یەکەم دیداردا کە بوومان لە "قەسرێ" چووینە دیداری مەرحوومی کاک ئیدریس بارزانی، دەگەڵ باسی مەسایلی دیکە کە شتمان زۆر بوو و نامەمان پێ بوون بۆ مەکتەبی سیاسی و بۆ خودی مەلا مستەفای بارزانی کە تەحویلمان دان. لەوێ لێم پرسی گوتم کاک ئیدریس ئەو پرۆژەیەی ئەو هەیئەتە پێشنیاری کردبوو بۆ موشکیلەی کەرکووک پێت چۆن بوو؟

گوتی جا هەر ئەوەیە کە سەددام دەڵێ. گوتم کاک ئیدریس ئێستێ ئیتر دڵنیام حەڵێکی باش بوو. ڕێگا حەڵێکی وەسەت بوو. گوتی بۆ؟ گوتم چونکی سەددام دەڵێ عەینی ئەوەیە بارزانی دەیڵێ. ئەتۆش دەڵێی عەینی ئەوەیە کە سەددام دەیڵێ. مانای ئەوەیە لە بەینی هەردووکیان دایە. بەڵام تازە هەردوولا ڕەتیان کردبۆوە.

دیارە هەم دەوڵەتی عێراق بڕیاری دابوو ئەو شەڕە بکرێتەوە هەم دەوڵەتی ئێران بڕیاری دابوو. ئەمن جارێکیان دەگەڵ بەرپرسێکی پارتی باسم کرد. گوتی ئێران قەولی هەموو شتێکی پێ داین. جا جارێکی مەسئوولێکیان گوتی: بەچ سیلاحێکمان لێ دەن، بەو سیلاحە لێیان دەدەینەوە. گوتی گوتوویانە تانکتان دەدەینێ. تەیارەتان دەدەینێ، هەموو شتێکتان دەدەینێ. گوتم باشە ئەوان مەسڵەحەتیان لە هەڵایساندنەوەی شەڕەکەدا هەبوو، خۆ ئێوە مەسڵەحەتتان نەبوو. بەهەرحاڵ هەر دووکیان خۆیان ئامادە کردبوو. عێراق دەیویست ئەو دەسکەوتانە بستێنێتەوە کە دەست کورد کەوتبوون بێ مەتمانەیی زۆر ببوو. ئێرانیش پێی خۆش بوو ئەو دەسکەوتە لەدەست بچێ بۆیە ئەو کۆمەگەی کرد کە شەڕ بێتەوە. لەپاشان دەوڵەتی ئێران هەرچی نامەردی بوو کردی. شەڕ لە بادینان بایە مورەیماتی بۆ دەناردنە پێنجوێن. لە خانەقین بایە، مورەیماتی بۆ دەناردنە حاجی ئۆمەران. هەر بۆ ئەوەی دەرەنگیان بەدەست بگا. کارشکێنیی موتڵەق بوو.

* مامۆستا باسی ئەوە دەکرا کە جەنابت بوویە هۆی قبووڵ کردنی هێندێک داوای نابەجێی دەوڵەتی عێراق لە حیزبی دیموکرات لە سەرەتاکانی دوای هاتنەسەرکاری کۆماری ئیسلامی لە ئێران دا؟ هەڵبەت سەرچاوەی من بۆ ئەوە بیرەوەری‌یەکانی مامە غەنیی بلووریانە. جەنابت لەو بارەیەوە چی دەڵێی؟ تکایە بەوردی باسی ئەو مەسەلەیە بکە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** داستانێک هەیە دەڵێ: خەسەن و خوسێن هەر سێ دوختەرانی موعاویە. خەسەن و خوسێن نین، حەسەن و حوسێنن. سێ نین، دوون. دوختەران نین، پسەرانن. موعاویەش ئیەو موعاویەیە. کوڕی ئەویش نین کوڕی عەلین. ئەوش وایە. هەر لەبنی ڕا هەمووی درۆ و دەلەسە و شتی ساز کراو بوو. ئەمن پێم وایە کاک غەنیش سازی نەکردبوو، چونکە بەڕاستی پیاوێکی ئەوەندە فێڵباز نیە. بۆیان ساز کردبوو. مەسەلەن دەڵێ فلانکەس لەحاجی‌ئۆمەرانڕا بە هێلی کۆپتێر چۆتە کەرکووک. ئەمن لە ژیانمدا بە ڕێگای حاجی ئۆمەراندا سەفەری عێراقم نەکردوە، ئەو وەختی لە کوردستانی دیوی خۆمان بووین ئەمن چەند جار سەفەری عێراقم کردوە، بەڵام هیچ جارێکیان بە حاجی‌ئۆمەراندا نەبووە. زیاتر بەلای قەڵادزێدا بووە، یان ئەگەر هاتبووینە ئەو دیوی لە سلێمانیەڕا بووە. لەپاشان قەتم سەفەری کەرکووک بە هێلی کۆپتێر نەکردوە. جارێکی کە مەلا حەسەنی شێوەسەڵی تووشی ئەو حادیسەیە بوو لەبەر ئەوەی دەبوو زوو بگاتە مەرکەزێکی باشتر، لە

ڕانیەڕا سواری هێلی کۆپتێر بووین لەبەر وەی چووینە کەرکووکێ. لە کەرکووکێشڕا دیسان سوار بووینەوە چووینە بەغدایە. بەڵام بڵێین کە لە مەنزڵێڕا دەڕۆم قەت قەت بە هێلی کۆپتێری نەچووم. پاشان ئەمن کە سەفەر بکەم بە هەرچی بێ فەرقی چیە؟ خۆ ئەگەر عەیبێک هەبێ عەیبی کارەکە دەوەدا نیە بە چی چووی.

ئینجا لەبارەی ئەو شتەوە، لە هەموو ژیانمدا ئەمن هیچ شتێکم دەگەڵ هیچ دەوڵەتی دنیایە ئیمزا نەکردوە نەک هەر ئەوە. پاشان ئەوە ئەسڵ و ئەساسی نەبووە. دوو دەلیل بۆ وەی دێنمەوە. یەکیان ئەوە کە ــ جارێکی دیکەش جوابم داوەتەوە ــ گوتم باشە ئەوە هەتا دوکتور قاسملوو سکرتێر بوو ڕەنگە بوو بەوی بڵێن باشە بۆ جێبەجێیان ناکەی؟ دوکتور سەعید سکرتێر بوو دەبێ بەوی بڵێن. بەینێکی کاک مستەفای هیجری سکرتێر بوو بەوی بڵێن. باشە ئاخر ماوەیەکی زۆر لە دەورانی بەعسییاندا ئەمن بۆخۆم سکرتێر بووم. بۆ جارێکی نەیانگوت ئەوێ فلانکەس تەنۆ ئەو شتەت دەگەڵ ئێمە ئیمزا کرد بۆچی جێبەجێت نەکرد؟ لەوەش موهیمتر. دەوڵەتی عێراق ڕووخا. هەرچی سەنەدو بەڵگە هەبوو هەمووی کەوتە دەست خەڵکی. ئەوە بۆ وەدەست نەکەوت؟ لە بنیڕا ئەسڵ و ئەساسی نەبوو. هیچ ڕێککەوتنێک لەبەینی ئێمەو دەوڵەتی عێراقدا نەبووە. تەنانەت بۆ ئەو هاوکارییانەی لە نێوانماندا هەبوون قەت شتی ئیمزاکراومان نەبووە. ئەو شتەش کە باسم کرد گوتم بوو بە مەبنای پێوەندییەکانمان دەگەڵ دەوڵەتی عێراق یان حیزبی بەعسی حاکم، ئەوەش هەر ئیمزا نەکراوە.

**هیاس کاردۆ:** یانی ئەو پێشنیارەشیان پێ نەکردن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر، هەر شتێکی ئاوا نەبوو. وەختێک کە دەوڵەتی ئێران لە پاییزی ١٣٥٨دا پێشنیاری موزاکەرەی کرد، دەوڵەتی عێراق ناردی بۆ لای ئێمە. گوتیان ئێران درۆتان دەگەڵ دەکا. ئێوە مەیکەن، چێتان دەوێ دەتاندەینێ. گوتمان نازانین درۆ دەکا یان ڕاست، بەڵام ئێمە شەرمانە بۆ وەدەستهێنانی مافەکانمان، ئێستا دەوڵەتی ئێران دەڵێ موزاکەرە دەکەم ئێمەش موزاکەرەی خۆمان دەکەین. حەتتا گوتیان ئێوە ئیعلامی خودموختاری بکەن، ئێمە بەڕەسمی ئیعتیرافی پێ دەکەین. گوتمان خودموختاریی کوردستانی ئێران دەبێ دەوڵەتی ئێران ئیعتیرافی پێ بکا نەک ئێوە. بەکەڵکی چی دێ ئەگەر ئێوە ئیعتیرافی پێ بکەن؟ تەنانەت هەر لەو پێوەندییەدا ساڵی ١٩٨٢ بوو سەرەتاکەی کە دەیکردە زستانی ١٣٦٠ی هەتاوی، ئەمن لە بەیرووت بووم چووبوومە سەفارەتی شووڕەوی. دەگەڵ سەفیری شووڕەوی دانیشتم زۆرمان قسە کرد. گوتی ڕەئیتان لەسەر ئیستیقلالی کوردستان چیە؟ گوتم ئێوە ڕەئیتان چیە؟ گوتی ئەمن مەعزوورم. گوتم ئەمنیش مەعزوورم. ئەگەر تەنۆ کە یەکێک لە دوو ئەبەرقودرەتی دنیایەی هیچ نالێی، ئەمن وەک حیزبێکی بێ-

دەسەڵات بۆچی بیڵێم؟ گوتم ئێمە داوای مافی کورد لە چوارچێوەی ئێراندا دەکەین. بەڵێ ئەگەر جامیعەی بەینەلمیلەلی لەپشتمان ڕاوەستێ و بەرەسمیمان بناسێ، ڕەنگە داوای کوردستانی سەربەخۆش گوناح نەبێ. بەڵام ئێمە بە چەند هەزار کلاشینکۆف نە کوردستانی گەورەمان پێ ڕزگار دەکرێ و نە کوردستانی چووکەڵە. کەوابێ خودموختاریی خۆمانمان دەوێ.

* ئەو بەڵگانەی دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە عێراق دەست کەوتن دەریانخست ئەوە بوون کە حیزبی دێمۆکرات لە پێوەندییەکانی خۆی دەگەڵ ئەوحکوومەتەدا بە جۆرێک جووڵاوەتەوە کە تووشی لێپرسینەوەی مێژوو نەبە. لەو بارەیەوە جەنابت چ هەستێکت هەیە؟ ئەزموونی خۆتان چۆن پێناسە دەکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە ئەوە بۆ هەموو دێمۆکراتێک جێگای شانازی و سەربەرزییە کە نە بەنووسراو هیچی وامان نووسیوە و نە بەکردەوە هیچ شتێکمان کردوە کە بە زیانی کورد تەواو بێ. تەنانەت کارێکمان نەکردوە بە زیانی هیچ عێراقییەک تەواو بێ. چونکی خۆ موخالیفانی دەوڵەتی عێراق تەنیا کوردەکان نەبوون. عەرەبەکانیش بەشی زۆریان لە حیزبی جۆراوجۆردا و شەخسیاتی موستەقیل موخالیفی دەوڵەت بوون. ئێمە بە کردەوە بە زمانو بە نووسین هیچ کارێکمان نەکردوە کە بە زیانی هیچ عێراقییەک تەواو بێ. ئەگەر وەک ئەزموونیش تەماشای بکەم، پێم وایە ئەو ئەزموونەی ئێمە نیشانی دەدا، یان دەکرێ ئەو دەرسەی لێ وەربگیرێ کە حیزبێکی سیاسیی کورد ئەگەر حەقی موسەللەمی خۆیەتی و تەنانەت پێویستیشە پێوەندیی دەگەڵ دراوسێیەکانی هەبێ، بەڵام ئەگەر بۆخۆی بناغەی کاری خۆی باش داڕێژێ، دەتوانێ سەربەخۆیی و سەربەرزیی خۆی بپارێزێ بێ ئەوەی پێوەندییەکانی دەگەڵ ئەو دراوسێیانە بکەونە مەترسی-یەوە. چونکی پێشتریش ئاشکرا بوو، لەوەشدا ئاشکرا بوو، دواتریش هەر ئاشکرا دەبێ، ئەگەر دەوڵەتی عێراق پێوەندیی دەگەڵ ئێمە دەگرێ لەبەر چاوی کاڵی ئێمە نیە. لەبەر ئەوەیە قازانجی دەویدا هەیە. ئیختیلافو ناکۆکیی دەگەڵ ئێران هەیە. ئەو دوژمنی ئێرانەو ئێمەش ناکۆکیمان دەگەڵ دەوڵەتی ئێران هەیەو ئەگەر وەڵامی داخوازەکانمان نەداتەوە ئێمەش دوژمنی دەوڵەتی ئێرانین. وەکی دەڵێن: دوژمنی دوژمنم دۆستمە. کەوابێ ئەو لەبەر مەنافیعی خۆیەتی و ئەگەر ئەمن تۆزکەرێکیشی نەکەم ئەو مەنافیعەکەی هەر هەیە پێوەندیم دەگەڵ بگرێ. جا کەوایە بۆ وای لێبکەم کە ئەمن بچمە بن دەستی وی. قازانجی وی بە قیمەتی زەرەری میللەتی کورد لە بەشێکی دیکەی کوردستاندا بپارێزم. پێم وایە ئەزموونە گەورەکە ئەوەیە کە حیزبێکی سیاسی دەتوانێ پێوەندییەکانیشی بگرێ، لەو ئەزادانەش کەڵک وەرگرێ و لەعەینی حاڵدا سەربەخۆیی سیاسی و سەربەخۆیی بڕیاردانی خۆشی بپارێزێ. ئەمن نموونەیەکی دیکە دێنمەوە کە بەڕاستی زۆرم پێ-خۆش بوو، پێم مایەی سەربەرزی بوو. "جاناتان ڕاندڵ" ڕۆژنامەنووسی ئەمریکایی دەڵێ: قاسملوو تەنیا

ڕێبەری کورد بوو کە دەیتوانی دەگەڵ هەموو دەوڵەتەکان، هەموو تەرەفەکان قسەی خۆی بکاو سەربەخۆیی خۆشی بپارێزێ. ئەوە ئەزموونێکی گەورەیە کە دەتوانێ بۆ ئایندەی خۆمانو خەڵکی دیکەش دەرسی لێ وەربگیرێ.

**هێلی کارهۆ:** مامۆستا دیارە ئەوە لە ڕاستیدا زیرەکیو دڕایەتو لەخۆبوردوویی زۆری دەوێ. وا نیە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** مەعلوومە دەوێ لە زۆر شت بگوزەرێی. یانی زۆر کاری وا بووە کە ئێمە کردوومانە لە باری مەنافیعی ماددییەوە، یان قازانجی کاتییەوە زۆرمان زەرەر تێدا کردوە. مەسەلەن لەسێرتانە تەیارەیەک لە نێو خاکی کوردستانی ئێراندا بە دەستی عێراقییەکان بەربۆوە. تەیارەی ئێرانی بوو لە ناوچەی مەنگوڕایەتی بەربۆوە. شتەکە وابوو کە تەیارەی عێراقی هاتبوون بۆ بۆمبارانو تەیارەی ئێرانیش هاتبوونو لەحەوا بوو بە شەڕ، مووشەکو تەیارەیەکی ئێرانی بەربۆوەو خەلەبانەکەی کەوتە دەستی ئێمە. ئەو وەختی دەوڵەتی عێراق دە میلیۆن دیناری دایێ کە ئەو خەلەبانەی بدەینەوە، بە تەیارەی وانیش بەربۆوە. گوتمان ئەگەر لە خاکی خۆتاندا بایە حەقی خۆتان بوو. بەڵام لە خاکی ئێمەدا بەربۆتەوە نایدەین. دەگەڵ ئەوەی لە حاڵی شەڕدا بووین، خەلەبانەکەمان دایەوە بە ئێران. زۆر بە سەختی بریندار ببوو، دەرمانمان کرد هەتا هاتەوە سەر حاڵی خۆی لەپاشان دامانەوە بەئێران. دە(١٠)میلیۆن دینار ـ کە ئەو وەختی دەی کردە سی(٣٠) میلیۆن دۆلار ـ مان لە قیس خۆماندا، بەڵام ئەوە سەربەرزییەکی گەورەیە کە سەربەخۆیی خۆت، عیززەتی خۆتو حیزبەکەتو بزووتنەوەکەت دەپارێزی. حاڵاتی دیکەی ئاواشمان هەبوون کە ڕەنگە ئێستا لەبیرم نەبن.

* ئەنفالو بۆمبارانی شیمیایی هەڵەبجە لەلایەن حکوومەتی بەعسەوە ڕەنگە ئێوەی لەبەر دەم تاقی کردنەوەیەکی مێژووییدا ڕاگرتبێ. دەکرێ لەو بارەیەوە بدوێی؟ هەر لەجێدا هەڵوێستی حیزبی دێموکڕات ئەوکات چۆن بوو؟ هیچ بەڵگەیەک لە دەستدا ماوە کە هەڵوێستی ئێوە دەربخا؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** لە بارەی ئەو شتانەوە کە لە عێراق کراون ئێمە دەبێ قبووڵ بکەین نەمانتوانیوە قارەمانبازی بکەین. حیزبی دێموکڕات نەیتوانیوە ئەو کارە بکا. مەسەلەن دەوڵەتی عێراق بۆمبارانی بانەی کرد. بۆمبارانی زیندانی دۆڵەتووی کرد، لە سابلاغیدا. لە سەردەشتیدا. لە هەموو ئەو مەوریدانەدا ئێمە بەیاننییەمان دەرکردوەو ئەو حەرەکەتەمان بە توندترین شێوە مەحکووم کردوە. گوتوومانە دەوڵەتی عێراقییە. ئەمن هەر ئێستا حادیسەیەکم وەبیر هاتەوە. کە لە زیندانی دۆڵەتوویان دابوو، بەیاننامەیەکی زۆر توندمان دەرکرد، ئەو وەختەش ئەمن لە دەفتەری سیاسی نەبووم یانی حوزوورم نەبوو. دوای ماوەیەک ئەمنو دوکتۆر قاسملوو پێکەوە سەفەری دەرەوەمان کرد. لە کەرکووک نانی نیوەڕۆیان بۆ دوکتۆر قاسملوو ساز کردبوو. کە

چوونە ژووری ئیداری موخابەرات، ئەمن مەسئوولیتی وتم هیچیان نەدەناسین بەڵام دوکتۆر قاسملوو دەیناسین. ئەمن ئەوکات بەرپرسی تەبلیغات بووم، کە وەزیر کەوتین دوکتۆر قاسملوو فەرمووی ئەوەش وەزیری ئیعلامی مەیە. مەسئوولەکەیان گوتی یانی بەیانی دۆڵەتوو ئەوە نووسیویەتی؟ ئەوە ئێستا دانەنیشتووین. گوتم عەمەلیاتی دۆڵەتوو ئەتۆ کردووتە؟ دەقاودەق ئەو کەلیماتەمان لە بەینێدا ڕەدو بەدەڵ بوون. لەپاشان کە دانیشتین مەوزووعەکە هەڵایسا. دوکتۆر قاسملوو گوتی بەیانی دۆڵەتوو ئەمن نووسیومە. نازانم ئەو نووسیبووی یان نا، بەڵام وای گوت، مەعلوومە ئەمن نەمنووسیبوو چونکە لەماڵ نەبووم. بەڵام ئەو گوتی ئەمن نووسیومە. چۆن ئەتۆ حەق بە خۆت دەدەی زیندانی من بۆمباران بکەی، زیندانیی من بکوژی، تەنانەت پێشمەرگەم بکوژی، حەقیش بە من نادەی مەحکوومی بکەم؟ حیزبی دێموکرات پێوەندیی وا ناناسێ.

بەڵام لە بارەی ئەو عەمەلیاتانە کە لە عێراق دەکران ئەوانە کە دەوڵەتی عێراق بە دژی کوردەکانی وێ دەی کردن، ئێمە نەمانەدەتوانی بە ئاشکرا مەحکوومی بکەین و قارەمانبازی بکەین. ئەوە حەقیقەتێکە. بەڵام لە عەینی حاڵدا لە بارەی شیمیابارانی هەڵەبجەوە موساحەبەی دوکتۆر قاسملووی هەیە لە "کل‌العرب"دا چاپ کرابوو کە دەڵێ لەو بۆمبارانەدا هەم ئێران چەکی شیمیایی بەکار هێناوە هەم عێراق بەکاری هێناوە. با لە بەراتێژدا ئەوەی بڵێم وەختێکی خەبەریان داینێ کە دوکتۆر قاسملوو شەهید بووە. ئێمە لە ماڵێ بووین دوکتۆر سەعید لە دوای ناردین چوونە دەفتەری سیاسی. گوتی دوکتۆر قاسملوو لە ئوتریش تیرۆر کراوە. ئەمن گوتم کاری دەوڵەتی عێراقە، چونکی تازە ئەو موساحەبەیەی کردبوو. دوکتۆر سەعید گوتی نا ئەتۆ ئاگات لێ نیە حاڵەتێکی ئاوا بووە وتووێژێکی ئاوا هەبووە، جا ئەو کات گوتم کاری ئێرانییە.

ئەمن دۆستێکم هەبوو لە ڕانیە تووشی بووم. گوتی جا ئەوە کارە دوکتۆر قاسملوو و حیزبی دێموکرات کردوویانە؟ گوتم چی بووە؟ گوتی دەڵێ عێراق لە هەڵەبجە چەکی شیمیایی بەکار نەهێناوە. ئەمنیش مەجەللەکەم دیبوو. لە زمان دوکتۆر قاسملوویەوە تیترێکی زلامی دابوویە کە دوکتۆر قاسملوو دەڵێ عێراق لە هەڵەبجە چەکی شیمیایی بەکار نەهێناوە. بەڵام لە خوارەوە کە قسەکانی بڵاو کردووتەوە عەینی قسەکانی دوکتۆر قاسملووی هاتوون، کە دەڵێ هەم ئێران بەکاری هێناوە، هەم عێراق بەکاری هێناوە. تەنانەت ئیشارە بەوەش دەکا – ئەو وەختی وا بزانم ئەتۆ لە "گەوەرەدێ" بووی کە بۆمبارانەکە کرا لە ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٦٥دا، کە مووشەک‌بارانی کردو گازی شیمیایی تێدا بوو – باسی ئەوەش دەکا. گوتم کاکە مەجەللەکەی بگرە بی‌خوێنەوە بزانە هەر لەوێدا شتی وای تێدایە؟ بەڵام ئەوە خەبەرنێگارە دەیەوێ ڕۆژنامەکەی بفرۆشێ، ئێستا چووە لیتری وای داوەتی بڵێم چی.

وەک عەرزم کردی ئێمە بەیانییەمان دەرنەکردوە مەحکوومی بکەین. چونکی پێوەندیمان دەگەڵ دەوڵەتی عێراق هەبووە ئیحتیاجمان پێی هەبووە. بەڵام جارێک لەجاران نەچووین بڵێین دەوڵەتی عێراق دۆستی کوردە

هیچ، حەتتا ئەمان گوت دۆستی مەشە. زۆر جار برادەرانی کوردی عێراق دەیانگوت ئێران دۆستی کوردە. دەمانگوت بابە بڵێن دۆستی مەیە، مەڵێن دۆستی کوردە. بۆ مەگەر ئێمە کورد نین؟ ئەدی بۆ دەمانکوژێ؟ جا ئێمە کەنگێ گوتمان لەو دنیایەدا ـ خۆ ئەدەبیاتمان هەمووی ماوە ـ کەنگێ گوتمان دەوڵەتی عێراق دۆستی مەیە؟ پێوەندیمان هەبووە، پێوەندیی دۆستانەشمان هەبووە. خۆ ناکرێ پێوەندیت هەبێ، کۆمەگی لێ بخوازی‌و بە ڕێگای ویدا هاتوچۆ بکەی‌و ئەخۆشت لەوێ دەرمان کەی، هەموو ڕۆژێش جنێوی پێ بدەی. بەڵام لەو وەختانەدا کە پێویست بووە بە فاشیستمان ناو بردوە. لەبارەی دۆڵەتووەوە، لە بارەی یانەوە لانی کەم چونکە نازانم بۆ سەردەشت. بەڵام لەو دووانەدا لەبیرمە کە بە فاشیستمان ناو بردوە.

**عەباس کاردۆ:** یانی ئەو بارەیەوە دیفاع لە سیاسەتی خۆتان دەکەی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** بەڵێ، قبووڵ دەکەم کە حیزبی دێمۆکرات نەی‌توانیوە هەموو شتێک بڵێ. ئێستا ئەوە قسوورێکە یان بڵێن ناتەواوی‌یەک مەیە. بەڵام قەت شتێکی وای نەگوتوە خیلافی حەقیقەت بێ. قەتیشی دەوڵەتی عێراق لەسەر ئەو کارانە تەشویق نەکردوە بە دۆستی ناو نەبردوە.

* وەکی بیستوومە دوای کارەساتی هەڵەبجە ڕێبەریی حیزبو شەخسی دوکتۆر قاسملوو لە داهاتووی پێوەندی‌یەکانی حیزبو دەوڵەتی عێراق تووشی دوودڵی بوون. ئایا ئەوە ڕاستە؟ ئەگەر وایە بۆ؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** نا تووشی دوودڵی نەبوون بەڵام حیزبی دێمۆکراتیشو دوکتۆر قاسملووش هەمیشە بەو چاوەیان چاو لێ کردوە کە دوو لایەن مەنافیعی موشتەرەکیان مەیە. ئیدی نابێ وای چاو لێ‌بکەین کە عێراق عاشقی چاوو بۆی کوردو حیزبی دێمۆکراتەو دۆستێکی ستراتیژیکە. شتەکە لەبەر زەروورەت بووە. با قسەیەکی خۆش بگێڕمەوە. ئەو ساڵەی ڕێککەوتنی ئەلجەزایر ڕووی دا، ئەو نیگەرانی‌یە هەبوو کە ئێمە تەحویل بدرێینەوە چونکی ئەو دوو دەوڵەتە ڕێک کەوتبوون. مامۆستا هێمن داستانێکی ساز کردبوو. بەو جۆرە کە دەوڵەتی عێراق هەموو ئێمەی گرتوە، ڕیزی کردووین بۆ بن داری ئیعدام. جا هەرکەسەی قسەیەک دەکا یان هەرکەسەی حەرەکەتێک دەکا. بۆ دوکتۆر قاسملوو ئەوەی دانابوو کە دەڵێ: ئەمن دەمگوت ئەوانە فاشیستن. چونکە بەو دیمەوە تەماشای دەکردن. هەموویانم لەبیر نیە بەڵام مەسەلەن بۆ کاک حەسەنی ڕەستگار ئەوەی ساز کردبوو کە لەو وەختەدا کە دەی‌بەن بۆ بن داری ئیعدام تەماشا دەکا یەکێک لەسەربازەکان سیغاری بەدەستەوەیە. غاری دەداتێ‌و لە دەستی دەرفێنێ‌و پێش ئەوەی بی‌کوژن دوو مژی توندی لێ‌دەدا. لەو وەختی‌دا کاک حەسەن سیغاری دەکێشا. بۆ منی دانابوو کە لەو کاتی‌دا دەگریم. ئەویش هێمن پێم دەڵێ عەیب ناکەی ئەتۆ بۆ دڵۆپە خوێنێک دەگری؟ ئەمنیش دەڵێم بابە بۆخۆم ناگریم بۆ ئەو

کەسک و سوورانە دەگریم بۆخۆی ساز کردبوو کە لێی دەپرسن ئاخرین ئارەزووت چیە بیڵێ. ئەویش برادەرێکمان هەبوو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو، ئەوی لەپشتەوە ڕاوەستاوە. گورج پیلی دەگرێ و دەیهێنێتە پێش خۆی و دەڵێ دەپێشدا ئەوی ئیعدام کەن با مەرگی ئەوی ببینم جا دوایە ئەمن ئیعدام کەن.

مەبەستم ئەوەیە کە دوکتور قاسملوو بەو چاوە سەیری دەکردن. مەسەلەن دەوڵەتی عێراق چەندین جاری هەوڵ دا کە دوکتور قاسملوو لەسەر تەلەڤیزیۆن دەگەڵ سەددام حوسێن دیداریان هەبێ. دیداریشیان زۆر بوون. ڕەنگە دەجار زیاتریان دیدار بووبێ. بەڵام ئەوی قبووڵ نەکرد. دەی گوت ئەمن دەگەڵ سەددام حوسێن لەسەر تەلەڤیزیۆن دانیشم چ جوابی کوردی عێراق بدەمەوە کە ئەنفال دەکرێ و شیمیاباران دەکرێ. ئەدی ناڕێ ئیحساساتی ئەو میللەتەی ببینی؟ نابێ حورمەتی ئەوی بگرێ؟ هەربۆیە قەتی قبووڵ نەکرد. کە دیارە دووبارە دەڵێم لەباری مەنافیعی کاتی‌یەوە زەرەری بۆ حیزبی دێموکرات زۆر بوو. بەڵام ئەو ستراتیژی‌یە درێژخایەنەی هەمیشە لەبەر چاو دەگرت.

**هیواس کاردۆ:** مامۆستا ئەوە ڕاستە گۆیا تەنیا مەسعوودی ڕەجەوی و دوکتور قاسملوو دەیانتوانی سەددام حوسێنی ببینن؟ مەبەستم ڕێبەرانی حیزبە ئێرانی‌یەکانە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نازانم. ئەمن ئەوەم خوێندۆتەوە کە وایان گوتوە. بەڵام نازانم کەسی دیکەی دیوە یان نا. دەزانم دوکتور قاسملوو زۆر جاری سەددام حوسێن دیوە. مەسعوودی ڕەجەوی‌یش هەم بە نهێنی دیتوویەتی و هەم لەسەر تەلەڤیزیۆن پێیەکەوە دەرکەوتوون. بەڵام ئەوە کە هیچ کەسی دیکەی نەدیبێ پێم وایە وا نیە. دەلیلم نیە کێ دیبێ، بەڵام پێم وا نیە وا بێ. چونکە زۆر کەسی لە موخالیفینی ئێرانی بە حوزووری دیوە.

**هیواس کاردۆ:** باشە ئەوی دەتوانین وەک خاڵی لاواز لەسەر ئەوانە حیساب بکەین یان شتێکی سروشتی-یە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە ئەوە کە هەر ئەوانەی دیوە ڕەنگە بۆیە بووبێ کە ئەو دوو سازمانە عومدەتر لەوانی دیکە بوون. بەتایبەتی لە نێو کوردەکاندا دوکتور قاسملوو بەرجەستەتر بوو. حیزبی دێموکراتیش بەرجەستەتر بووە. ئەمن جارێکی لەو دیدارانەدا کە دوکتور قاسملوو دەگەڵ سەددامی هەبوون حزووورم هەبوو. کابرا لەڕێی خۆی ڕۆیشتوە. بەڵام باوەڕت بێ بە ئەدەبەتەو ئیحتیرامێکەوە دەگەڵ دوکتور قاسملوو بەرخوردی کردوە وەکوو دەگەڵ ڕێبەرێکی زۆر لەخۆی گەورەتر، یان بڵێین سەرۆکی دەوڵەتێکی زۆر گەورە بووبێ، ئاوای ڕەفتار دەگەڵ دەکرد. بە سەراحەت پێی دەگوت ئەمن زۆرم ئیحتیاج بە نەزەری جەنابت هەیە. پێمخۆشە تەحلیلی خۆت لەسەر ئەوزاع بۆ من باس بکەی. تەنانەت ئەگەر وەختی دیکەش شتێکت بەنەزەر گەیشت بۆم

بنێرێ. بەهەر زمانێک بۆم دەنێرێ بۆم بنێرە تەرجەمەی دەکەین. زۆر بە ئیحتیرامەوە دەگەڵی دەدوا. وەکوو ڕێبەرێک ببینێ وا بوو.

* دوای ڕاگرتنی شەڕی ئێران و عێراق، لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە چ داوایەک لە حیزب کرا و حیزب چ وەڵامێکی دایەوە؟ ئایا ڕێبەریی حیزب هیچ ڕێگایەکی دۆزیبۆوە کە ئەگەر هات و ساتوسەودای لەسەر کرا تووشی کێشە نەبێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دوای ڕاگرتنی شەڕی ئێران و عێراق ئەمن دەربەدەری دا نەبووم، زۆریشم ئاگا لەو شتانە نیە کە گوزەراون. بەڵام ئەمن پێم وایە دەوڵەتی عێراق داوایەکی غەیری ئەوەی نەبوو کە ناتوانێ ئیجازە بدا لێرەوە هێرش بکرێتە سەرخاکی ئێران. لەو کاتەدا حیزبی دێموکراتی کوردستان هەڵوێستێکی تاریخیی گرت. دیارە بەخۆشییەوە ئەو شتە نەهاتە پێشێ. بەڵام ئەو نیگەرانی و ئیحتیماڵە هەبوو کە ئەو دوو دەوڵەتە ڕێک کەون و پێکەوەش لە هەردوو بەشی بزووتنەوەی کورد لە هەردوو پارچەی کوردستان بدەن. بڕیارێک لە کۆمیتەی مەرکەزی دەرچوو کە هەر ناویشی لێنرا "ئیحتیمالاتی ڕۆژی ڕەش" کە ئەوە بڵاو نەبۆوە. ئەویش ئەوە بوو کە ئەگەر شتێکی وا هاتەپێش، ئێمە دەبێ شۆڕشگێڕانە بجووڵێینەوە. تابێ ئەوەی دەتاریخدا ناوی لێنراوە "ئاشبەتاڵ" دووبارە بێتەوە. دەبێ ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتە لە خۆمان دوور خەینەوە و زۆربەیەک لە تێکۆشەرانی حیزبی بە ژمارەیەکی دیاری کراو، بەخۆمان و چەکەکانمانەوە بە یەکجاری بگەڕێینەوە وڵات. لەوێ بمێنینەوە هەتا یان سەر دەکەوین یا سەر دادەنێین. ئەوە یەکێکە لە لاپەڕە درەوشاوەکانی مێژووی حیزبی دێموکرات کە بەخۆشییەوە ئەو ڕۆژە ڕەشە نەهاتە پێش. چونکی ئەو دووانە هیچ وەختێکی ئەوەندە پێکەوە سەمیمی نەبوون.

بەڵام خۆ دەوەختی دیکەشدا دەوڵەتی عێراق ئەو فشارانەی بۆ دێناین. وەک عەرزم کردی ئیجازەی نەدەدا بەدەستی بەتاڵ بەخاکی وی‌دا بگەڕێینەوە وڵات. لەورتێدا ئیجازەی نەدەدا بەچەکەوە بگەڕێینەوە. چونکە دەگەڵ ئێرانێ ڕێک کەوتبوو ئیحتیاجی هەیە. دیارە جارەکەی دوایە کە ڕێک کەوتن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش هاتە نێوەوە. بەو حاڵەش ئێمە هەر چووینەوە و خەباتی خۆمان هەر درێژە دا. هەتا ساڵی ١٩٩٦ ئێمە پێشمەرگەمان بۆ عەمەلیات دەچۆوە نێوخۆی وڵات.

* حکوومەتی بەعس دەگەڵ ئەوە کە پێوەندیی خۆی دەگەڵ ڕێبەریی حیزب تێک نەدەدا و تەنانەت ڕێزیشی لێدەگرت، کەچی زۆر جار کادر و پێشمەرگەی حیزبی ئازار دەدا و تەنانەت بەبێ هۆ دەی گرتن. هۆی ئەوە چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نازانم ئەمن ئەو مەوریدانەم هێندە لەبەر چاو نین. (مەوریدی وا یەکجار زۆر بوون. هەیاس). بەڵێ جا ڕەنگە عوصمەتمن ئەوانە بووبن کە نەیانناسیون یان بێ موجەوویز هاتوچۆیان کردوە. وەکوو جارەکەی کاک غەفووری هەمزەیی و کاک ئەحمەدی ئەخشی نازانم داستانەکەت زانیوە یان نا. دەگەڵ ئەوەی کە ناخۆش بوو، داستانەکەی خۆشیشە کە زۆریان لێ دابوو هەر لەو کۆیەی کە ئێستا ئێمە لێی دانیشتووین. شتی وا هەڵکەوتوە. تەنانەت جارێکی ڕێ کەوت برادەرێکی ئەیان ئیعدام کرد. ئەوە دیارە زۆر کۆنە. دوای ساڵی ١٩٧٥ بوو کە ئێمە لە بەغدا بووین. دوای تێکچوونی بزووتنەوەی کورد لە باشوور بوو. برادەرێکی ئێمە کە لەو کۆیەی دادەنیشت بە ناوی "موحەممەد پیرۆتی" بە تۆمەتی ئەوەی کە گۆیا معامەلەی چەک دەکا — بەڕاستی ئەشی دەکرد — گرتیان و ئیعدامیان کرد. یادداشتێکی زۆر توندمان نووسی بەڵام بڵاومان نەکردەوە. زۆرمان ئیعتیراز پێ کرد کەچی هەر جوابیشیان نەدایەوە. شتی وا دێتە گۆڕێ. ئەوە هیچ لە بەینی حیزبێک و دەوڵەتێکدا، لەبەینی دەوڵەتانیشدا وایە. دەبینی لە سنوورێک پێک هەڵپڕژانێک دەبی یەکیان بەناحەق یەک یان چەند کەس لەوی دیکە دەکوژێ. بەڵام لەسەر ئەوە پێوەندی یەکان تێک ناچن. ئێمەش خۆ لە وەزعێکدا نەبووین ئەو تەنیا وڵاتە لە خۆمان ببەستین.

• حکوومەتی بەعسی عێراق بە هەموو کارو کردەوە خراپەکانی دەرحەق بە خەڵکی ئەو وڵاتەو بەتایبەت کوردەکان وەک پشتیوانێک بۆ خەباتی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە حیساب دەهات. ڕووخانی ئەو ڕژیمە چ زیانێکی بە حیزب و بزووتنەوەی ئەم بەشەی کوردستان گەیاند؟ ئایا حیزب بۆی بەداخ بوو؟ بۆ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە ئەو تەعبیرە دروست نیە کە بڵێین دەوڵەتی عێراق پشتیوانێکی بزووتنەوەی کوردی ئێران بوە. چونکی ناتوانێ پشتیوان بێ. بەڵام مەعلوومە هاوکاریی کردوە. پێوەندییان پێکەوە هەبووە. قازانجی هاوبەشیان هەبووە. دوژمنی هاوبەشیان هەبووە. ئەوانە هەموو ڕاستن. ئێمە لە ئاکامی ڕووخانی دەوڵەتی عێراقدا ڕەنگە هێندێک زیانی ماددیمان پێ گەیبێ. هێندێک زیانی ترانسپۆرتی و هاتوچۆمان بۆ ماوەیەکی زۆر پێ گەیشتبێ. بەڵام لەسەریەک مادام ئیرادەی خەڵکی عێراق دەگەڵ ئەوە بوو، ئێمەش دەگەڵ ئیرادەی خەڵکی بووین. ئێمەش ئەو حکوومەتەمان بە دەوڵەتێکی غەددار دەزانی. بە زاڵممان دەناسی. چاکییەکەشی ئەوە بوو کە هەر وەک پێشتر باسم کرد جۆرێکمان ڕەفتار نەکردوە کە بە ڕووخانی دەوڵەتی سەددام حوسێن ئیلی هەستی و وجوودمان بکەوێتە خەتەرەوە. بەخاتری ئەوەی ئەو دەوڵەتەی تازە دێ تۆڵەی سەددامیش لە ئێمە دەکاتەوە. چونکی هیچ زەمینەکمان بۆ ئۆپۆزیسیۆنی سەددام نەبووە. بۆیە هیچ وەختێک نیگەران نەبووین ئەگەر سەددام حوسێن بڕووخێ ئێمە بکەوینە مەترسییەوە. بەڵێ لە باری ئیمکاناتی ماددی و ئیمکاناتی هاتوچۆو موعالەجەی نەخۆش و شتی وا وە تووشی زیان هاتین. بەڵام دواقیعدا کاری ئێمە

بە ڕووخانی دەوڵەتی سەددام حوسێن ڕاستەوخۆ تەنانەت لەنگیش نەبووە. ڕەنگە عامیلی دیکە بووبێ کە کاری ئێمە کەمایەسی پەیدا بکا. بەڵام ئەگەر بڵێین لەبەر نەمانی دەوڵەتی سەددام کاری ئێمە لەنگ بووە شتێکی وام پێ شک نایە.

* باشە مامۆستا وەک ئاخر پرسیار لەو چوارچێوەیەدا هەرچەند بەجۆرێک باست لێ کردوە. حیزبی دێموکراتی کوردستان هەم پێوەندیی دەگەڵ دەوڵەتی عێراق خۆش بوو هەم دەگەڵ خەڵکی باشووری کوردستان. ڕاگرتنی ئەو باڵانسە بڕێک چەتوونە. جەنابت هۆی ئەوە دەچی‌دا دەبینی؟ دیارە نموونەی خۆشت لەبەر چاوە کە خاوەنی دەیان و سەدان دۆستی نیزیکی لەو بەشەی کوردستان.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە ئەمەش یەکێک لە لاپەڕە درەوشاوەکانی مێژووی حیزبی دێموکراتی کوردستانە. ئەندامان و ڕێبەرانی ئەم حیزبە دەتوانن بە سەربەرزییەوە یادی بکەنەوە. ئەتۆ هەر باسی لایەنێکت کرد، ئەمن باسی دوو لایەن دەکەم. هەر لە یەک کاتدا ئێمە پێوەندیی دۆستانەو برایانەمان دەگەڵ کوردەکانی عێراق هەبوو، دەگەڵ دەوڵەتی عێراقیش پێوەندیمان هەبوو کە ئەویش هەر پێوەندیی دۆستانەیە خۆ دوژمنانە نیە. ئەو دووانەش پێکەوە دەشەڕدا بوون، بەڵام سەداقەت و دروستکاریی ئێمە دە پێوەندییەکانمان دا – بناغە قایمەکەش کە هەر لەبنیڕا دانرابوو – وای کردبوو کە ئەگەریش تۆمەتمان لێبدرێ چونکە دەوڵەتی عێراق تۆمەتی لێ دەداین، بەڵام شتێکیان بە دەستەوە نەبوو کە بڵێن ها ئەوەتان کرد. دیارە دەوڵەت هەمیشە تۆمەتی لێدەداین کە کار بۆ کوردەکان دەکەین. خۆ ناکرێ ئەتۆ لە میللەتێک بی بەڵام هاوکاریی نەکەی. لەپاشان کوردەکان پێم وایە هەر ئەو وەختی باوەڕیان پێ‌دەکردین کە ئێمە لە پێوەندیمان دەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا کارێک ناکەین کە زیان بە کورد بگەیێنێ. جاروبار ئەوانیش تۆمەتیان بۆ هەڵدەبەستین و تەنانەت بە ناحەق بە بەعسییشیان ناو دەبردین. ئەوە وەکوو گلەیی‌یەک بێ لەسەریان، بەڵام ئەوانیش هیچ دەلیلێکیان بەدەستەوە نەبووە باسی بکەن. لەبەر ئەوە ئەگەر بە پێچەوانەی مەیلی خۆشیان بووبێ مەجبوور بوون قەبووڵ بکەن کە ئێمە حیزبێکین لەو نێوەدا سەربەرزانە ڕەفتار دەکەین.

بەڵام لایەنێکی دیکەی ئەوە بوو کە بۆ ماوەیەکی زۆر ئێمە کەوتبووینە نێوان دوو بەرداشی دیکەوە. شەڕی جێگای داخی نێوان دوو حیزبی سەرەکیی کوردستانی عێراق. ئێمە دۆستی هەردوو لایان بووین. لە مەنتەقەی ژێر دەسەڵاتی هەردوو لادا حوزوورمان هەبوو. هاتوچۆی هەردوو لامان دەکرد. ئەو دووانەش لە شەڕێکی زۆرخراپ و زۆر خوێناوی و زۆر بێ‌بەزەیی‌یانەدا بوون. ئەوە هونەرێکی تێدا بوو کە ئەوەندە بە سەداقەتەوە ڕەفتارمان کرد کە هیچیان نەیانتوانی ئێمە موتەهەم بکەن کە لایەنێک بۆ لایەنێکی دیکە وەلا دەنێین. ئەگەریش لەنێو خۆیاندا بە خەیاڵیاندا هاتبێ وا بڵێن. ئەوەندی بۆمان کرابا هەوڵی ئەوەمان دەدا ئەو دووانە

پێکەوە دۆست بین و شەڕەکەمان تەواو بکەن. بەڵام بە سەراحەت پێمان دەگوتن ئێمە لەو شەڕەدا تەرەف نین. هەتا جارێک تاوانی ئەوەیان خستبووە پاڵ کە چەکی موهیمماتمان داوە بە یەکێتی نیشتمانی. ئەمن چووبوومە سەردانی کاک مەسعوود بارزانی، لەوێ باسەکە هەڵایسا. ڕووحی شادبێ "ئەدرێس هەریری" باسی کرد. هەرچەند خوا هەڵناگرێ ئاوای باس کرد. گوتی گوتوویانە حیزبی دێموکرات تەقەمەنیی بۆ یەکێتی ناردوە ئەمن گوتوومە درۆیە. گوتم کاک ئەدرێس با ئەو قسانە بەس بن. ئێمە ئەوە لێرە دانیشتووین. کاک مەسعوود دانیشتوە، ئەگەر کاک مەسعوود داوای پێنج فیشەکاتم لێبکا بۆ ئەو شەڕەی دەڵێم نا. مام جەلالیش لە سەفەری بوو گوتم ئەگەر ئەویش لەوێرا نامە بنووسێ داوای پێنج فیشەک بکا دەڵێم نایێ. چونکی ئێمە لەو شەڕە بێزارین ، ناماندەوێ ئیدامەی هەبێ. کۆمەگ بە درێژەی ئەو شەڕە ناکەین. دیارە خوا هەڵناگرێ گوتی خۆ لەگەڵ من ئەوی گوتوە دەنا جوابم دەدایەوە. یانی مەبەست ئەوەیە سەداقەت لە پێوەندی‌یەکانداو زەرافەت لە هەڵسوکەوتدا توانیوویەتی لەنێو ئەو ئاوردا ئێمە بپارێزێ بێ ئەوەی بە ئاوری هیچ لایەکیان بسووتێین.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا دەوڵەتی عێراق تەشویقی نەدەکردن بە قازانجی لایەنێک بجووڵێنەوە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دەوڵەتی عێراق ئەوەی پێخۆش بوو، بەڵام زۆری ئیجازە بەخۆی نەدەدا باسی بکا. چونکە بناغەکەمان وا داڕشتبوو. چونکە دەیزانی هێندە کەللەڕەقین شتی وا قبووڵ ناکەین. یانی دەوڵـــەتی عیراق زوو تێ گەیشت کە حیزبی دێموکرات ئەوە نیە ئەو داوایەی لێبکا. مەسەلەن لەگەڵ من پێشنیاریان کردوە ـ دەقیق ئادرەس نادەم ـ کە فڵانە موخالیفی دەوڵەتی عێراق ـ لە ئەفسەرانی ئەرتەش ـ وا بکەن تیرۆر بکرێ. هەر لە خۆمیان داوا کردوە. گوتم نە کاری ئێمەیە، نە بە ئێمە دەکرێ و قەت حیسابی شتی ئاوا لەسەر ئێمە مەکەن. تێیگەیاندن کە ناتوانن بۆ تیرۆری موخالیفانی خۆیان لەسەر ئێمە حیساب بکەن. گوتم ئێمە دوژمنانی خۆمان تیرۆر ناکەین تا دوژمنانی ئێوە تیرۆر بکەین.

## کومیتەی ئینقیلابیی ح.د.ک

**هەباس کارەزو:** دەگەڕێینەوە سەر ڕووداوە مێژووییەکانی حیزبەو داوات لێدەکەم لە باری چۆنیەتی دروست بوونی "کۆمیتەی شۆڕشگێڕ" و سەرەتاکانی هەڵگیرسانی شەڕی چەکداریی ساڵەکانی ٤٧-٤٦ بۆمان بدوێی. دیارە دەزانم لەو بارەیەوە شتی جۆراوجۆر باس کراوە کەمتاکورتێک ئەو ڕووداوە لە مێژوودا تۆمار بووە. بەڵام ڕەنگە ئێستاش زۆر شت هەبن کە باس نەکرابن، بۆ وێنە داخوا ئەو کۆمیتەیە لەسەر ڕەزایەتی زۆربەی ئەندامانی باڵی موخالیفی ئەحمەد تۆفیق دروست بوو یان بڕیاری چەند کەسێکی لەگیانبوەڕەز بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە کە بزووتنەوەکە چۆن دروست بوو باسێکە، ئەوە کە کۆمیتەی شۆڕشگێڕ چۆن دروست بوو باسێکی دیکەیە. چونکی ئەو دووانە هاوکات نین. با دەیشێدا ئەو ڕاستییە بڵێم کە ئەمن ڕاستە دەگەڵیان دەپێوەندیدا بووم بەڵام بەشێک لەوان نەبووم، ڕەنگە ئەوەی ئەمن دەیزانم بۆ قەزاوەت کردن لەسەر ئەو داستانە کافی نەبێ. بەڵام ئەوەی کە ئەمن لەبیرمە هەر لە سەرەتاوە کە بزووتنەوەی کورد لە باشووور هەڵگیرسا، ئەوەی کە لە مێژوودا بە "شۆڕشی ئەیلوول" ناسراوە، کوردەکانی ئێرانیش ئەو سەودایەیان لەسەریدا هەبوو کە لەوێش کارێکی ئاوا بکەن. تەنانەت لە نێو ڕێبەران یان بڵێین کادرە بەرجەستەکانی حیزبدا کە لە زیندان بوون ئەو باسە هاتبووە گۆڕێ. بەڵام هەمووی ئەوانەی پێیان دەڵێین "عەقڵانی قەوم" لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە ناکرێ لە دوو بەشی کوردستاندا هاوکات بزووتنەوەی چەکدارانە هەبێ. چونکە ئەو وەختی دوو دەوڵەتەکەش یەک دەگرن. هەر بۆیە ئێستا کە لە باشوور شتێکی ئاوا هەیە حەق نییە لە ڕۆژهەڵات وەڕێ بخرێ. لە حدوودی شەش مانگ هەتا ساڵێک پێش بزووتنەوەی ساڵەکانی چلوشەش-چلوحەوتەوە لە نێو هێندێک لە کادرو پێشمەرگەکانی حیزبدا بەتایبەتی ئەوانەی لە باشووور دەژیان ئەو بۆچوونە دەستی پێ کردبوو کە لەنێو خۆی وڵاتیش شۆڕشی چەکداری هەڵگیرسێ. دیارە کە دەهاتنەوە نێو خۆی وڵاتیش قسەیان لەسەر دەکرد و کاریان لەسەر دەکرد کە دێینەوە شۆڕش دەکەین شتی وا. ئەمن زۆر بەداخم کە سەنەدێکی زۆر باشم لەو بارەیەوە لەدەست چوو. ئەویش نامەیەکی شەهید مەلا ئاوارە بوو. شەهید مەلا ئاوارە لە زیمنی ئەو نامانەدا کە دەینووسین، بۆ منی نووسیبوو کە حەتمەن دەزانی ئەوە ماوەیەکە مۆزمۆزی خەباتی چەکدارانە داکەوتوە. شۆڕشی چەکدارانە بەبێ چەک، شۆڕشی چەکدارانە بەبێ تەشکیلات، شۆڕشی چەکدارانە بەبێ ئامادەیی، شۆڕشی چەکدارانە بەبێ پشتی جەبهە، فکرێکی خەتەرناکە و داوات لێ

دەکەم ئەوەندی دەنگت دەڕوا بەرپرسەکانی دەگەڵ ئەو فکرە بکەی. بەهەرحاڵ ئەو فکرە لە نێو بەشێک لە بەدەنەی حیزبو تەنانەت عەناسیرێک لە ئەندامانی ڕێبەرییشدا هەبوو. دیارە بەشی زۆری ئەوانەی ئەو فکرەیان هەبوو لە ڕێبەری دوور بوونو موخالیفی خەتی ڕێبەریی کۆنگرەی دوو بوون یان هەر وەک باست کرد موخالیفی خەتی عەبدوڵلای ئیسحاقی بوون. لەپاشان شتێکی ئاوا ڕووی دا کە خەبەر بە خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی دەگا کە "قایق" کاک سولەیمانی موعینی چووە دەگەڵ ئامیر لیوا یان قائید فیرقە ـ بەهەر حاڵ ئەرمانندەیەکی گەورەی سوپای عێراق ـ لە ڕانیە پێوەندیی گرتوو داوای چەکوچۆڵی لێ کردووە بۆ وەڕێخستنی بزووتنەوەی چەکدارانە. کە ئەوە دەبیسێ مەلا مستەفا داوا دەکا کە کاک سولەیمان بچێتە لای. ڕاستییەکەی هەرچەند دوای ئەوەش ئەمن چەند جارم سولەیمانی موعینی دیتەوە بەڵام قەتم ئەو پرسیارە لێ‌نەکرد کە داخوا ئەو قسەیە ڕاست بوو یان نا.

بەهەر حاڵ لەبەر ئەوەی کاک سولەیمان یان هەر نەچووە بۆ لای ئەرماندەو یان ئەگەر چووە کارێکی نەکردوە بە دژایەتیی بزووتنەوەی کوردستانی عێراق بێ، دەچێ بۆ لای بارزانی. دەچێ کە بڕوا بۆلای سەرکردایەتیی بارزانی کە بزانێ چی‌یان دەوێ، لە ڕێگایە میوانی هێندێک لە دۆستانی دەبێ. چونکە ئەو وەختی سەفەر زیاتر هەر بەپێ‌یان بوو. ئەو دۆستانە کە دیارە لە هاوڕێ‌یانی حیزبی شیوعی دەبن، پێی دەڵێن بابە بۆیان تێ‌چاندووی. ئەگەر بچیە کن مەلا مستەفای، دەت‌گرێ هیچ، مەترسیی ئەوەش هەیە بت‌دانەوە بە ئێران. بۆیە ئامۆژگاریت دەکەین کە نەچی. ئیدی کاک سولەیمان کە ئەوەی دەبیسێ ناچێتە وێ‌و بە ڕێگایەشدا نا، بە خەتی سنووریی نێوان هەردوو بەشی کوردستاندا دەگەڕێتەوە بۆلای سونێ کە مەقەڕیان لەوێ بوو. لە عەینی حاڵدا خەبەر دەدا کە حاڵو قەزیەیەکی ئاوا هەیە ئەمن دەڕۆم بۆ ئەو دیوی‌و ئێوەش وریای خۆتان بن. ئەو بەشەی ئێستا باسی دەکەم ڕاستەوخۆ بۆ منیان گێڕایەوە. هێندێک لە برادەرانی وەک کاک حەمەدەمینی سیراجی‌و ئەوانە بۆ منیان گێڕایەوە. هەر لەو سەروبەندەدا ڕۆژێکیان تەماشا دەکەن کۆمەڵێکی زۆر پێشمەرگەی پارتی دێن بۆ سونێ‌و لەوێڕا وەڕێ دەکەون بۆ "گەڵوەرز" کە مەقەڕەکەی ئێمە لەوێ بوو. ئەوانیش کە لەسەر هەست دەبن فکری ئەوەی دەکەن کە ڕەنگە بۆ گرتنی وان بێن. هەربۆیە هەموویان تفەنگەکانیان هەڵدەگرن‌و دەڕۆن بۆ شاخی پشتەوەی مەقەڕ. یەک دوو پێشمەرگە لەوێ بەجێ دێڵن دەڵێن ئەگەر ئەمانەن ئەوە چاومان لە وڵاتی‌یەو دەگەڕێینەوە. ئەگەر هاتن‌و کاریان بەمە نەبوو خەبەرمان بدەنێ ئەوە دێینەوە. ئەگەر بۆ گرتنی ئێمەش هاتبوون‌و ویستیان مەقەڕەکەی تێکەوە پێچن، ئەو وەختی ئیدی ئێمە نایەینەوە.

دیارە پێشمەرگەکان کە دێن لەوێ بنکەکەی بە هەموو شتێکەوە تێکەوە دەپێچن. هەر بۆ تەکمیلی شتەکە بڵێم لە ئاخریدا پاش چەندین ساڵ لە تەواوی بەڵگەو مەدارێکێک کە لەو مەقەڕە بوویێ کەم‌زۆر، لە

هەموو شتێک تەنیا سێ شت درانەوە بە ئێمە. یەکیان تەلیسێک کتێب بوو کە لەسەر بزووتنەوەی بارزان نووسرابوو. لەبیرم نییە بە عەرەبی بوو، یان بە کوردی. هەمووی هەر یەک کتێب بوو. دوو "تایپ"یشیان دایەوە کە هێنابووم لەبیرمان لە عێراقەوە، فڕێ دابوون یەک دوو ئەلیفبێیان، گرنگ بوون، دەزگایەکی "پۆلیکۆپی" یان یەقلولی تێر "ڕۆنیۆ"ش کە ئەویش هەر کاری نەکرد. ئیدی ئێمە هیچی دیکەمان وەگیر نەکەوتەوە. ئەو چەند پێشمەرگەیەی لەوێ مابوونەوە کە چاپەڕو شتی ئاوا بوون گرتبوویانن بەڵام دوایە بەریان دابوون. ئەوانی دیکە کە وەشاخی کەوتبوون هاتنەوە ئێران. ئیدی نازانم چۆنیان یەکتر گرتبۆوە. ئەوە لەڕاستیدا یەکەم شەوی دوای وێک کەوتنەومان بوو. هاتنە ئەو دێیەی ئەمنی لێ بووم واتە "هەڵوێ". هەموویان وەسەر یەک کەوتبوونەوە. شەوێ سەعات دووی سێ و ئەوانە بوو کە نامەیەکیان بۆ من نووسیبوو، گوتبوویان نان و پێخۆرمان بۆ بنێرە سەعات ئەوەندەش وەرە بۆ لامان ئێمە لە فڵان شوێنین. ئەمنیش هەستام یەک دوو کەسم لە خەڵکی دێیەکەی کە هەموو خەڵکی زۆر باش بوون هەستاندن. خەڵکەکە هەموویان هەر جێگای ئیتمینان بوون. ئێستا حیزبی بوون یان نەبوون گرینگ نییە. وەتێو دێم خستن و نان و پێخۆر و تەنانەت چایەکی زۆریان بۆ پەیدا کردن. چونکی نازانم زیاتر بوون یان نا، ئەوەندە دەزانم لە پەنجا نەفەر کەمتر نەبوون. بەڵام نان و پێخۆری کامیلیان بۆ ناردن و بەیانییش ئەمن هەستام بێ ئەوەی خۆم گورگە بکەم چووم بۆ لایان. لەوێ کەوتینە قسە کردن کە زیاتر موخاتەبەکە کاک سولەیمانی موعینی بوو.

ئەمن لێم پرسی گوتم مەسەلە چییە کە ئاوا هاتوونەوە؟ چونکی هەر وەخت دەهاتنەوە یان کاک سولەیمان بوو بەتەنێ، یان مەلا ئاوارە بوو یان یەک دوو یەک بوون. یانی ئاوا بە جەمع قەت نەبوون. باسی کرد گوتی ئێمە لە کوردستانی عێراق جێگامان پێ لێژ بووە. بۆیە هاتووینەوە. ئەمنیش کە ئەو سابیقە زیهنییەم نە ئەزمواتی مەلا ئاوارەی هەبوو. گوتم وەختی کارێکی وا نییە. مەلا ئاوارەشیان دەگەڵ بوو. گوتم بگەڕێنەوە بچنەوە لای مەلا مستەفا مەسەلەکە لەوێ حەل بکەن. گوتی ناوێرم، متمانەی پێ ناکەم. لە باشترین حاڵەت-دا دەمان کوژێ، دەنا تەحویلی ئێرانمان دەداتەوە. ئەوە ڕەئیی وی بوو. گوتم بچنە نێو دەوڵەتی عێراق. گوتی خەڵک پێمان دەڵێن جاش. گوتم باشە بچن بۆ لای جەلالییەکان. زۆر بە سەراحەت گوتی بەخائینیان دەزانم. زۆر موخالیفیان بوو. گوتم باشە هەر دەمێننەوە؟ چ دەکەن ئەگەر وابێ؟ گوتی هاتووینەوە وڵاتی خۆمان و لە نێو میللەتی خۆمان دەبین تا دەکوژرێین. ئەمن بە سەراحەت پێم گوتن ئێستا کە هەر دەمێننەوە دەبێ کاری نیزامی بکەن. گوتم ئەگەر عەمەلیاتی چەکداری بکەن خەڵکێکـــــان وێ هەڵدەوەسکێ. نێ وا هەیە چەکی هەیە وەگەڵ دەکەوێ. نێ وا هەیە چەک پەیدا دەکا. بەڵام ئەگەر ئەوە نەبێ شەوێ بێنە وەتێوی دەکەون نانی لێ وەردەگرن، پێخۆری لێ وەردەگرن و زەحمەتی دەدەن. بەیانی ژاندارمە دێ، وەرگیان دەشێلێ هیچ. لێیان دەدا، دەیانگرێ و خەڵکەکەتان لێ بێزار دەکا. خەڵکەکە ئەحەممولی ئەوەی ناکەن. بەو مەعنەت

پێ گوتی ئێمە بڕیارێکی وامان نیە. ئەگەر بڕیاری واش بدەین، ئێستێ بۆ دەستپێکردنی خەباتی چەکدارانە وەختێکی باش نیە ، ئەوە ئاخری بەهارێ بوو. جۆزەردان بوو نازانم چەندی جۆزەردانێ بوو. گوتی چونکی ڕۆژ درێژنو شەو کورتن. کە تووشی شەڕێ دەبی ڕۆژت لێ ئاوا نابێ‌و دوژمن دەتوانێ هێزی دنیایەت لەسەر کۆ کاتەوە. بەڵام پاییزێ ڕۆژ کورتن. ئەگەر دەرگیریش بووی چەند سەعاتێک شەڕ دەکەی‌و دوایە خۆت دەرباز دەکەی، شەوێکی دوورو درێژە خۆت دەگەیەنیە جێگایەک. جا لەبیرمە ماوەیەکی زۆر پێوە خوا کەوتینە پاییزێ جارێ هیچ نەبوو. کاغەزێکی دیکەم بۆ کاک سولەیمانی نووسی، نووسیم هیچ باس نیە. ئێستاش هەر ڕۆژ درێژن؟ دیارە نامەیەکی بۆ نووسیبووم کە هێندێک شتی تێدا گونجاندبوون نیشانەی گۆڕانی ڕەئیی وی لەسەر بارزانی بوون. پێشتر عەجایب شیفتەی شەخسیەتی بارزانی بوو. بەڵام ئەوجار کە ئەوە ڕووی دابوو، بە کەلیماتێکی بێ حورمەتەوە باسی بارزانیی دەکرد. ئەمنیش موخالەفەتم دەکرد. جا لە نامەکەی‌دا ئیشارەم پێ کردبوو کە ئەتۆ زۆر جاران ئاوات دەگوت‌و ئێستا ئاوا دەڵێی. چونکی هەر لە نامەکەی‌دا کە بۆمنی نووسیبوو هێندێک شتی وای باس کردبوون‌و مەلا مستەفای بە ناوێک ناو بردبوو کە جوان نەبوو.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا ئەو ماوە دوورودرێژەی کە دەفەرمووی هەتا پاییزێ هەر لە مەنتەقەدا بوونو حەملەشیان بۆ نەکرا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ هەر لە مەنتەقەدا بوون. دەواقیعدا بەشی هەرە زۆری حەملە نیزامی‌یەکە کەوتە ساڵی ٤٧. ئەو ساڵەی زۆر کەم شەڕ کرا. لە ساڵی ٤٦دا تەنیا حاڵەت ئەوەندەی لەبیرم بێ کە ڕووی دا، شەهید بوونی مەلا مەحموودی زەنگنە بوو. کە ئەویش هەر وەک گوتم عەمەلیاتی نیزامی بەو شێوەیە نەبوو. شەڕی "سپی‌سەنگ"یش ئەو ساڵەی بوو. دەنا باقی عەمەلیاتەکان هەمووی لەساڵی ٤٧دا بوون. ژاندارم بە دوایانەوە بوون بەڵام دەرگیر نەبوون. عەرزم کردی پێشتر ئەو کابرا ئەفسەرە گوتی هەر وەخت بمانەوێ پەلاماری سولەیمانی موعینی بدەین دەتوانین. جا ئەوان زۆریان بێ ئیحتیاتی دەکرد. مەسەلەن دەچوون بە نوێژی نیوەڕۆیە لە سەربانی ڕادەوەستان. تەنانەت لە دێیەکی شایی ببوو، چووبوونە دەشایی‌یەوە. یانی شتی ئاوایان دەکرد.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا بەو حیسابە بۆخۆشت کە ٤٦ی قاچاغ بووی وا نیە؟ کەوابوو بۆ شەڕەکەی کە دەیێتە ٤٧ تۆ لەوێ نەبووی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەخێر لەوێ نەبووم. ئەمن بەینی پاییزو زستانێ ڕۆیشتم. ئەوە لەسەر چۆنیەتیی هەڵگیرسانی شەڕی چەکداری بوو. بەڵام کۆمیتەی ئینقیلابی – دیارە هەر بە ناوی کۆمیتەی ئینقیلابیی

حیزبی دێمۆکرات دروست بوو. ئێمە دوایە کردمانە کۆمیتەی شۆڕشگێڕ ـ ئەوە لە ساڵی ١٣٤٦ دا لەنێو خۆی کوردستانی ئێران بوو. ئەوانە کۆنفرانسیان گرتو کۆمیتەی ئینقیلابیشیان دەرێنا هەڵبژارد. حەتتا وەختی خۆی کە ئێمە کۆنفرانسی سێو کۆنگرەی سێمان گرت بەتایبەتی لە کۆنگرەی سێ‌دا، ئێمە ئیختیلافێکی زۆرمان هەبوو لە نێو ئەو بەشانەی حیزبدا کە وەسەر یەک کەوتبوونەوە. دواقیەدا سێ دەستە بووین:

کاک دوکتۆر قاسملوو و کاک کەریمی حیسامی کە لە دەرەوە بوون لایەک بوون. هەرچەند لە باری فکرییەوە نێزیکی لە بەینی وانو بەشی دووهەمدا هەبوو کە کاک حەمەدەمینی سیراجیو یوسفی ڕیزوانی بوون. بەڵام کاک حەمەدەمینیش دەگەڵ بەشێک لەو کەسانە کە پێشتر لە بزووتنەوەکەدا دەگەڵی بوونو بەشێکی دیکەش کە لەوێ‌دا بەشدار نەبوون بەڵام لە کوردستانی عێراق بوونە بەشێک بوون. بەشەکەی دیکەش ئێمە بووین کە لەو ماوەیەدا دە کۆمیتەی مەرکەزی‌دا بووینو دەگەڵ کۆمیتەی ئینقیلابییش‌دا نەبووین. هێندێک لە ئێمە لە کۆنفرانسی دوودا بووین بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. ئەو سێ کەسەمان بووین وەکی پێشتر باسم کرد. ئەوانە کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەی کوردستانی عێراقدا بووین هەموو وەسەریەک کەوتبوونەوەو لە کۆنفرانس‌دا بەشدار بووین. ئەفەرەکانی ئەو سێ دەستەیە بەرچاوترینیان [illegible] بەشدارانی خەباتی چەکدارانەی ساڵەکانی ٤٦ و ٤٧ گرتوویانە، یان ئەو کۆنفرانسە کە کۆمیتەی ناوەندی پێکی هێناوە. سەرەنجام قبووڵ کرا کە ئەوەی وەک کۆنفرانسی دووی حیزب دەناسرێ ئەوەیە کە ئێمە گرتوومانە. بۆیە لە ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی سێهەم‌دا ناوێک لە کۆنفرانسی دوو کە ئەوان گرتوویان نەهاتوە. دیارە هەرخودی بزووتنەوەکەش کێشەیەکی یەکجار زۆری لەسەر بوو. لەنێو خۆماندا دەعوایەکی زۆرمان لەسەر دوو شتی ئەساسی هەبوو. نێ کۆنفرانسیش هەر کێشەی لەسەر بوو، بەڵام دوو شتە ئەساسی‌یەکە ئەمانە بوون:

ژمارەیەک ئەو حەرەکەتەی ٤٧-٤٦یان بە سەرپێچیو یاخی‌بوونو تەنانەت بە خەیانەتیش ناو دەبرد.

**هێلاس کاردۆ:** سەردەستەی ئەوانە کێ بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** زیاتر کاک ئەمیرو ئەوانە بوون. ئەوانە کە لە کۆمیتەی ناوەندیی پێشوودا بوون، عیدەیەک تەجلیلیان لەو خەباتە دەکرد. کاک دوکتۆر قاسملوو، کاک کەریمو کاک حەمەدەمینیش لەو بەشەدا بوون. ئەوانە کە هەر لە هەوەڵەوە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەگەڵی بوون. دیارە ژمارەیەکیش لە خاریجی کۆنگرەی یان بڵێین لە خاریجی کۆمیتەی ناوەندی کە دەگەڵ جەرەیانەکە بوون. بەشێکی دیکەشمان هەبوون کە ئەمن بۆخۆم لەوانە بووم کە دەگەڵ بزووتنەوەکە نەبووم بەڵام ئێستا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بووم. ئەوانە دەکرێ بڵێی لە نێوەڕاستدا بووین. وەک کاک حەسەنی ڕەستگارو هێمنی ڕەحمەتیو ئەمن. بەڵام لەسەر یەک ئەو دوو بەشەی دیکە لە موقابیل یەکدا ڕاوەستابوون.

دووەم شت، مەسەلەی کۆنگرەی دووهەم بوو. تەنانەت ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی کە بۆ کۆنگرەی سێهەم نووسرابوو، ناو نرابوو ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی دووهەمی حیزبی دێموکراتی کوردستان. لە دەفتەری سیاسی ئەمن هەبووم کە موخالیفی ئەوە بووم. چونکی دەفتەری سیاسی بریتی بوو لە: دوکتۆر، کاک کەریمی حیسامی، کاک حەمەدەمینی سیراجی، مامۆستا هێمنو من. ئەو سێیانەی پێشوو یەک دەنگ بوون. مامۆستا هێمنیش لە باری شێعرییەوە هەرچەندی بڵێی شاعیری چاک بوو، بەڵام لە باری سیاسییەوە وا نەبوو. بە تایبەتی وەختێکی دوکتۆر قاسملوو شتێکی گوتبا نەک بڵێم گوێ لەمستی دوکتۆری بێ بەڵام چونکە مەرکەزییەتو ئیستیدلالی بەقووەتی هەبوو ئەویش دەگەڵی کەوتبوو. ئەمن لەو نێوەدا بەتەنیا بووم. یانی لە دەفتەردا ئەمن لەو بارەوە بەتەنیا بووم. هەر بۆیە گوتم ئەوە دەبەمە کۆمیتەی ناوەندی. بردمە کۆمیتەی ناوەندی، دیسانیش لەوێ ئێمە کەوتینە ئەقەلییەتەوە. پێم وایە ئەمن بووم، کاک ئەمیری قازیو کاک حەسەنی ڕەستگار. ئەوانە پێیان وا بوو ئەوە ئێستێ دەی گرین کۆنگرەی سێهەمە. کۆنگرەی دووهەم گیراوە. وەختێک کەوتینە کەمایەتییەوە گوتمان ئێمە ئەو مەسەلەیە لە کۆنگرەشدا باس دەکەین. چونکی کۆنگرەی دوو بە هەموو عەیبو نەقسەکانیەوە کۆنگرە بووە. لە تاریخی حیزبدا بووە. ڕێبەریی مەوجوودی حیزب گرتوویەتی. دەتوانین نەقدی بکەین، بەڵام ناتوانین نەفیی بکەین. مێژووی حیزب هەموو مێژووی حیزبە. دیارە دوکتۆر قاسملوو زۆری ئیسڕار هەبوو بەتایبەتی. دەی گوت ئەو کۆنگرەیە منی دەرکردووە بە خائینی لەقەڵەم داوم. ئەمن چۆن ئیعتیرافی پێ بکەم؟

بەهەر سوورەت گەیاندمانە کۆنگرە. تەنانەت لە کۆنگرەدا کە خوێندرایەوە گوترا ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی دووهەمی حیزبی دێموکراتی کوردستان. ئەوە گوترا بوو بەهەرا. ئەمنیش لە هەیئەتی ڕەئیسە بووم. دەستم هەڵێنا گوتم ڕاوەستن دوایە قسەی لێ دەکەین. ڕاوەستن گوێ لە ڕاپۆرتەکە بگرن جا دوایە ئەو باسەی دەکەین. سەرئەنجام دوای باسێکی دوورو درێژ لەسەر ئەوە پێک هاتین کە بزووتنەوەی ٤٧-

٤٦ لاپەڕەیەکی پڕ شانازییە لە مێژووی حیزبی دێمۆکراتدا و دەبێ تەجلیلی لێ بکرێ. دەگەڵ ئەوەی کەم و کووڕیی زۆری هەبوو، دەگەڵ ئەوەی سەرمایەی زۆری حیزبی تێدا لەبەین چووە، بەڵام لاپەڕەیەکی پڕ شانازییە. بەڵام لە عەینی حاڵدا لەسەر ئەوەش ڕێک کەوتین، یانی بە زۆرینەی دەنگی کۆنگرە کە کۆنگرەی دوو، کۆنگرەی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانە، ئەوەش ئەقڵەکانی کە دە ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندیدا هاتبوون.

ئەمن زۆر جارم گوتوە ئێستاش دەیڵێمەوە دوکتور قاسملووم دەوێدا زۆر گەورە هاتە بەرچاو. چونکە ئەو هەموو ئیسراری کردبوو، لەپاشان هەروەک بۆخۆی دەیگوت کۆنگرەی دوو ئەوی بەخاتین ناسیبوو. بەڵام وەختێکی ئەکسەرییەتی کۆنگرە بڕیاری دا کۆنگرەی دوو کۆنگرەیەکی مەشرووعە لە تاریخی حیزبدا، نەک هەر قبووڵی کرد، بەڵکە قبووڵی کرد کە مەسئوولییەتی حیزبیش وەربگرێ. هەروەک دیتمان بەرپرسایەتیی یەکەمیشی وەرگرت کە بۆ ماوەی هەژدە ساڵ درێژەی کێشا. ئەوە گەورەیی ڕووحی دوکتور قاسملووی نیشان دەدا. ڕەنگە ئەگەر ئەمن یان یەکی دیکە ئاوا لە نەزەری خۆماندا دوچاری شکست بایین، گوتبامان باشە کەیفی خۆتانە لە حیزب ناڕۆم بەڵام نابمە ئەندامی ڕێبەری.

**عەباس کاردۆ:** یانی بەو حیسابە نەخشی تۆ وەک کەسێک کە کۆنگرەی دووی لە مێژووی حیزبدا هێناوەتە گۆڕێ و تەسبیتی کردوە دەبێ مەترەح بێ.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەک عەرزم کردی ئەوە نیی هەموانە بەڵام داستانەکە بەو جۆرە بوو، چونکە وەختێکی لە دەفتەری سیاسی باس کرا ئێمە پێنج کەس بووین تەنیا ئەمن بووم کە موخالیفی ئەوە بووم کۆنگرەی دوو حەزف بکرێ. دیارە خۆ ئەمن لە کۆنگرەی دوودا بەشدار نەبووم و وەک پێشتریش بۆم باس کردی ئەمن لە دیوی ئێرانێڕا هاتمە دیوی عێراقێ هەر بۆ ئەوەی ئیعتیراز بە بەیانی کۆتایی کۆنگرەی دووهەم بکەم. ئیعتیرازم لەسەری هەبوو، بەڵام پێم وابوو ئەوە کۆنگرەیە و ئەگەر ئەقدی لەسەرە ئەقدی دەکەین بەڵام نابێ حەزف بکرێ. دوایە کە چووینە کۆمیتەی ناوەندی دیسان هەر ئەمن بووم کە هەڵمانپساند دەگەڵ دوو سێ کەسێکی دیکە. لەوێش کە کەوتینە کەمایەتی، ئەوجار هەڵمان گرت بۆ کۆنگرە، بەڵام لە کۆنگرەدا ئەو ڕەئیە ئەکسەرییەتی هێنایەوە. یانی ئەمن ئەگەر زمانەزێیم بووبێ کەیفی خۆیەتی، بەڵام شتی تایبەتم ئەوەیە کە لە دەفتەری سیاسیدا تەنیا کەس بووم، لە کۆمیتەی ناوەندیش کۆڵمان نەدا، هەتا بە ئیستیدلالی من و ئەوانی دیکە لە کۆنگرەدا پەسند کرا. ئێستا ئەگەر نەخشی زیاترم بووبێ ڕەنگە کەسانی دیکە بتوانن قەزاوەت بکەن. ئەمن ئەو ئیددیعایە ناکەم.

**عەباس کاردۆ:** هەرچەند بڕێکیشت باس کرد بەڵام پێمخۆشە ئەو پرسیارەش بکەم کە بۆ خۆت لەو ماوەیەدا لە کوێ بووی، بە چییەوە خەریک بووی و لەسەر ئەو تێکۆشەرانە چۆنت بیر دەکردەوە؟ پێمخۆشە بزانم دەلیلی موخالەفەتی بەشێک لە ئەندامانی حیزب دەگەڵ ئەو بزووتنەوەیە چی بوو؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەوەندەی مەربووت بێ بە بەشی ئەوەڵی و هەرلەجێدا پێش بزووتنەوەی ٤٧-٤٦ یش کە لەجێی دیکەشدا باسمان کرد، ئەمن خەتی ئەوانەم زیاتر قبووڵ دەکرد کە موخالیفی کۆمیتەی ناوەندیی کۆنگرەی دوو بوون. ڕەنگ بوو بە دەلیلی ئەوە بێ کە مەلا ئاوارەی ڕەحمەتی زۆرم لێ نیزیک بوو. زۆرمان پێکەوە کار کردبوو و زۆرمان تەبادولی ئەزەر دەکرد. زۆریشمان یەکتر دەدیت کە ڕەنگە ئەوە تەئسیری لەسەرم دانابێ. گوناح نیە پیاو ئەوەی قبووڵ بکا. بەڵام بەهەرحاڵ دەگەڵ ئەوانی دیکەش کە دانیشتم لەوانیش هەر نیزیک بووم و هاوکاری‌یەکانم زیاتر دەگەڵ ئەوان بوون. یانی هەتا قاچاغ بووم هەر دەگەڵیان بووم.

وەکوو شوێنی دانیشتن هەتا پاییزی ١٣٤٦ یان سەرەتای زستانەکەی لەنێو خۆی وڵات بووم. لە دێیەک بووم بەناوی "هەڵوێ". پێشتر لە دێیەکی دیکە بووم "شیوەسەڵ". بەڵام هەر ئەو ساڵە بەهارەکەی چوومە هەڵوێ و پاییزەکەی دەرچووم. دواتر هاتمە ئێرە لە باشووری کوردستان لە دێیەک دادەنیشتم بەناوی "مارەدوێ". دوای کۆنفرانسی دوو کە بوومە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی ئەوجار ئەوێشم بەجێ هێشت و وا بوو هاتمە خوارێ. هاتمە "قەڵادزێ"، چوومە "هیرانی نازەنینان"، چوومە "شەقڵاوێ"، چوومە "هەولێر" و سەرەنجام قیسمەتوونسیب کەوتە بەغدایە. ئەو وەختی خۆمان ئامادە دەکرد بۆ کۆنفرانسی سێ (١٣٥٠ گیرا). ئەمن لە بەغدا دادەنیشتم. وەختی کۆنگرەی سێهەمیش ئەمن هەر لە بەغدا بووم.

پاشان دەلیلی موخالەفەتی ئەوانە دەگەڵ بزووتنەوەی ٤٧-٤٦ ئەوەڵەن پێیان وا بوو سەرپێچی لە بڕیاری ڕێبەریی حیزبی دێموکراتی کوردستانە. چونکی لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی کاک سولەیمانی موعینی‌یان تێدا بوو. لە ئەندامانی کۆمیتەی چاودێریی بەرز کاک عەبدوڵڵای موعینی‌یان تێدابوو. لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لە کوللی جەریانەکەشدا دوو کەسی دیکە هەبوون: مەرحوومی مەلا ڕەحیمی وردی و کاک ئەحۆ (باپیر شکاک). بەڵام ئەو دووانە هیچیان ئەبوونە ئەندامی کۆمیتەی ئینقیلابی، چونکە هەردووکیان پێش ئەو حادیسەیە شەهید بوون. لەوێدا لەبیرم نەبوو باسی بکەم بەڵام ئەحۆ ساڵی ٤٦ شەهید بوو. مەلا ڕەحیمی وردیش هەر پێشتر شەهید ببوو. پێم وایە ئەحۆش لەو کۆنفرانسەدا بەشدار نەبوو کە بۆ کۆمیتەی ئینقیلابی گیرا. مەلا ڕەحیم بەداخەوە لە ناوچەی هەورامان شەهید بوو. یانی ئەویش یەکێک لە فەرماندەکانی ئەوکاتی پارتی بە ناوی "عەبدولوەهاب ئەترووشی" کوشتی. لەو شتە ناخۆشانە بوو کە بەداخەوە دوایە زۆر دووپات بوونەوە.

**عەباس کاردۆ:** یانی ئەو یەکەم کەس بوو کە لەو ڕێگایەوە گیانی لەدەست دا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕاستی‌یەکەی بە دەقیقی نازانم، بەڵام پێم وایە لە یەکەم دەستەکانی پێشمەرگە بوون کە ئاوا کوژران. چونکە ئەو هەر خۆی نەبوو، سێ کەسی دیکەشی دەگەڵ بوون کە کوشتیانن.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا پێم‌خۆشە بزانم هۆ، یان هۆ گرینگەکانی ئەوە کە ئەو تێکۆشەرانە زوو دەداو دەکەوتن و تووشی زیان دەبوون چی بوو؟ ئایا ڕژیم بەهێز بوو؟ خەڵکیان دەگەڵ نەبوو. یان ئەزموونیان کەم بوو؟ هۆی دیکە هەبوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هەڵسەنگاندنێکی ئاوا دەبێ بەجۆرێکی دیکە بکرێ. بەڵام ڕاستی‌یەکەی ئەوە بوو کە ڕژیم زۆر موقتەدیر بوو. هەتا پێش ئەودەمی ڕژیمی شا ئیددیعای دەکرد ئێران جەزیرەی ئارامی ئێو ئوقیانووسی پڕ گێژاوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە. یانی شا ئاوا بەسەر ئەوزاعدا موسەڵلەت بوو. ئاخر زۆرجار ئێمە دەگەڵ ئیدایی‌یەکانیش کە بۆخۆم قسەم دەگەڵ کردوون، ئەو باسەمان بۆ دەهاتە پێش. ئەوان زۆریان ڕووداوی "سیاکەڵ" گەورە دەکردەوە. گۆیا ئەوە بوو کە ئێرانی شڵەژاند. دەمگوت باشە یانی چی ئەوە ١٣٤٩ دەستی پێ کردوە. بزووتنەوەی کوردستان ٤٧-٤٦ بووە، بەردرێژتریش بووە. دەیانگوت نا ئەمە [سیاکەڵ] حەرەکەتی سەراسەری بوو. دەمگوت ئێوە پێم ناڵێن بۆ پاسگایەک سەرتاسەری‌یە. بەڵام دوو ئوستان ناوچەیی‌یە؟ چونکە ئەو بزووتنەوەیە بەشێکی زۆر لە ئوستانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوای گرتەوە کە کوردستانە و چەند شارێکی ئوستانی کوردستانیشی گرتەوە. لەپاشان ئەوانە پشتی جەبهەیەکیان نەبوو. قودرەتێکی ئاوایان نەبوو کە ناوچەیەکی پێ ڕزگار بکەن. ئێرانیش هەم پووڵی خەرج دەکرد، هەم وڵاتەکەی نیزامی کردبوو. هەم ئەوەی پێیان دەگوتن "چریک" — لە حاڵێکدا ئەوانە زیدی چریک بوون — ئەوەی دروست کردبوو. بۆیە دەی‌توانی دەداویان بخا. خۆ لەڕاستیشدا ئەگەر تەماشا بکەین دەداوخستن بەمانای ئەوە کە غافڵگیریان بکا و تێرۆڕیان بکا، دەتوانین تەنیا مەلا ئاوارەی حیساب بکەین. ئەوی دیکە تووشی شەڕ دەبوون و بەرەنگاری‌یان دەکرد و شەهید دەبوون. هەموویان هەر وا بوون. شەڕی سی‌سەنگی بگرە، شەڕی هۆملی بگرە، شەڕی قالوێ بگرە، شەڕی چیای ئستانێ بگرە، شەڕی سەرشیوێ بگرە، ئەوە هەمووی هەر بەرەنگاری بوون و لە دوژمنیشیان کوشتوە. دیارە حەتمەن پیاوانی ڕژیم کاریان کردوە بۆ دۆزینەوەیان. خەبەریان لێ‌داون بەڵام ئاوا نەبووە غافڵگیر بوبن. غەیری حاڵەتی مەلا ئاوارەی کە دەداویان خست. تەنانەت ئێمە ئیستیلاحێکمان هەبوو دەێو خۆماندا کە دەمانگوت لەپازدە تمەنی‌یەکانە. یان لە بیستوپێنج تمەنی‌یەکان؟ ئاخر هێندێک جاسووسیان هەبوون مانگێ پازدە تمەنیان وەردەگرت. هێندێکیان هەبوون کە مانگێ بیستوپێنج تمەنیان وەردەگرت. ئەو ئیتسانە خۆفرۆش و خەبەرچینانەی پەیدایان کردبوون ئی وایان تێدا بوو بۆ پازدە تمەن ئەو

کاری بۆ دەکردن. دیارە نەبوونی ئیمکاناتیش هەر هۆیەک بوو. ئەوانە بێسیمیان نەبوو، تەلەفۆنیان نەبوو، وەسیلەی دیکەیان نەبوو. دوژمنیش دنیای لێ تەنیبوون کە ئەوانە هەمووی شۆڕشگێڕ بوون.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا لە سەرجەمی ئەو شەڕانەدا بەشداریی پێشمەرگەکانی پارتی بەرچاو دەکەوت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە یەکێکە لە لاپەڕە جێی داخەکانی مێژووی کورد کە جگە لەوەی لێرە تەنگییان پێ هەڵچنین، لە مەقتەعێکیشدا پێشمەرگەی پارتی چوونە داخڵی کوردستانی ئێرانو لەوێ دەگەڵ هێزەکانی شا هاوکارییان کرد بۆ لێدانی ئەو پێشمەرگانە. بەخۆشییەوە ـ ئەوەیان جێگای خۆشحاڵی یە ـ وا هەڵنەکەوت لەوێ بەرەنگاری یەکتر بن. یانی ئەو ڕووبەڕووبوونەوە چەکدارانەیە لە نێوان پێشمەرگەکانی پارتیو تێکۆشەرانی ٤٧- ٤٦ دا ڕووی نەدا. بەڵام ئیدی دەگەڵ ژاندارمەی دەگەڕانو ناقیبیان دەکردن. تەنانەت لە دێیەکی، لە "بوویانێ"ی مەنتەقەی سەردەشتێ ژنێک گوتبووی: هەی عەمرم تەمێنی ئەوە پاداشی ئەوەمان دەدەنەوە کە "پوولی بەرزک"ەکانی خۆشمان هەموو لێ کردەوە بۆ ئەوەی بی‌نێرین بۆ شۆڕشی کورد؟ یانی شتی خراپی زۆر تێدا بوو. هەروەک پێم وایە جاری دیکەش گوتراوە کە "سام وسوو دزەیی" کە سەرلکی پارتی بوو لە هێزی کاوە، فەرماندەی ئەو پێشمەرگانە بوو کە چووبوون بۆ وێ، کە گەڕابوەوە کوردستانی عێراق گوتی دەرێشم کەن جارێکی دیکە ناچمەوە. چونکی ئەمن هەستم کردوە خەڵکی کوردستانی ئێران بە جاشمان دەزانن. دیارە بە خۆشییەوە ئەوە ئیدی دووپات نەبۆوە. بەڵام جێگای ناخۆشی ئەوە بوو کە بەداخەوە بزووتنەوەکە سەرکوت کرا. ئیتامەی پەیدا نەکردو مەجبوور بوون هاتنەوە باشووری کوردستانو خۆیان تەحویل دایەوە. هێندێکیان خۆیان دەرباز کرد. دەتوانم بڵێم لە ڕێبەرەکانیان تەنیا کاک حەمەدەمینی سیراجی بوو کە دەرباز بوو. ئەو بە سەفەر هاتبۆوە بەڵام نەگەڕابوە بەداخەوە. ئەوانی دیکەی بەجێ هێشتو نەگەڕایەوە.

ئەوی دیکە، ڕێبەرەکان تەقریبەن هەموویان شەهید بوون. یانی دەرەجە یەکەکان. کاک سولەیمانو کاک عەولاو مەلا ئاوارەو کاک سمایلی شەریفزادەو کاک ئەحۆ کە پێشتر باسم کرد. دیارە یەک نەفەریشیان خۆی تەحویل دایەوە، کە کاک سالاری حەیدەری بوو. پاش خۆتەحویلدانەوەی ئەمن دیتم ، ساڵی ٤٦ خۆی تەحویل دایەوە. ئەمن چوومە سابڵاغ لەوێ دیتم. داستانەکەی بۆ گێڕامەوە. لەو شەڕەدا بەشدار ببوو کە لەساکان ڕوویدابو باپیر شکاکو ڕەفیقەکانی تێیدا شەهید بوون. ئەو کە بنەماڵەکەی تەماسیشیان هەر دەگەڵی هەبوو داوای لێ دەکەن بێتەوە. بەڵام کە لەوێ خۆی نەجات دەدا دەچێتە ورمێ. لە ورمێڕا دێتەوە مەهاباد. (بۆخۆی بۆی گێڕامەوە) دەچێتەوە ماڵێ بۆ ئەوەی خۆی نەجات بدا. ئەوە دەقیق قسەی خۆیەتی کە گوتی: داچابوو کەس پێ نەزانێ بەڵام لەنەکاو خاڵم پەیدا بوو. ـ خاڵی موحەممەدی مەجدیی ناو بووـ

هات گوتی هەموو شتێکم جێبەجێ کردووە سبەینێ دەچینە ساواک مورعەرریفیت دەکەم. گوتی ئەمنیش گوتم ئەمن بۆیە نەهاتووم خۆم تەحویل دەمەوە. لێم قەوماوە هاتووم دەرباز بم هەتا دوایە دەچمەوە لای ڕەفیقەکانم. گوتی نا ئیدی تەواو. بۆیە مەجبوور بووم قبووڵم کردو دانیشتمەوە. تەنانەت کاغەزێکی بەمندا نارد بۆ کاک حەمەدحسێن کاک سمایلی شەریفزادە. جا ئەو بە "مەلا برایم" ناو دەبرا. کە کاغەزەکەی دامێ، لەسەر داوای خۆی خوێندمەوە. لە ئاخری یەکەی‌دا نووسیبووی براتان مەلا برایمی بەڕێزیو مانەوەیبوو. دیارە هەدەفی ئەوە نەبوو خۆی تەحویل داتەوە. هەرچەند دوایە ڕێگای درا بچێتە دانیشگاو درێژە بە خوێندن بدا. سالار بۆخۆی لەباڵ خۆی‌دا ئینسانێکی سادق بوو. بەڵام خاڵی، موحەممەدی مەجدی زۆری دەست دەڕۆیی. ئەمن پێم وایە ئەوە کە ئیمکاناتی خوێندنی بۆ پێک‌هات بە دەلیلی ئەوە بوو خاڵی خۆی هاویشتە سەر. چونکە لە لایەکەوە ئەوی لە هاوڕێیانی دابڕی‌و لە لایەکیشەوە دەوایە ئیعتیباری ڕێ پارێزرابا. هەر بۆیە ڕێگایان دا بخوێنێ. جا مەبەستم ئەوە بوو بڵێم ئەوانە هەموو لەبەین چوون. کادرەکانی پلەی دووهەم‌و سێهەم‌و پێشمەرگەکان مانەوە کە ئەوانیش کاتێک زانییان هیچیان نەماوە هاتن خۆیان تەحویلی کاربەدەستانی بزووتنەوەی کورد لە باشوور دایەوە. کە خۆشیان تەحویل دایەوە ماوەیەک لە مەنتەقەی "پێستانەی" نیزیک هەولێر ڕایان گرتن. دیارە لانی کەم دوو پێستانەمان هەن. یەکیان ئەوەیە لە بەینی کۆیەو قەڵادزێ‌و سلێمانی دایە. ئەوەی دیکەیان لە مەنتەقەی هەولێری‌یە. لە دیگەڵەی‌ڕا ڕێگایەک دەڕوا بۆ قوشتەپەی. پێستانە لەوێ‌یە. ئەوانیان لەو پێستانەیە دانا. لەپاشان گۆیا بۆیان دەرکەوتبوو کە شۆڕش واتە پارتی بەنیازە بیانگرێ‌و تەحویلیان بداتەوە. یان بەهەر حاڵ ئەگەر ئەوەش نەبووبێ کە پێم وایە ئەوە نەبوو، چونکی وەزعەکە تەواو ببوو. ئێران مەجبوور نەبوو ئەو فشارەیان بۆ بێنێ. نە بزووتنەوەکە مابوو، نە ئەوانەش ڕێبەرانی دەرەجە یەکی جەرەیانەکە بوون. بەڵام ئەوان ترسیان ڕێ‌نیشتبوو، ڕۆیشتن خۆیان تەحویلی دەوڵەتی عیراقداو داوایان کردبوو بیانێرنە کن جەلالی‌یەکان بە ئیستیلاحی ئەو دەم. ئیدی بردیانە بەکرە جۆیەو لەوێ بنکەیان بۆ کردنەوەو حاوانتیانەوە.

**هەباس کاروەز:** ئێوە ئیدی ئاگاتان لێیان نەبوو؟ پێوەندیتان نەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هیچ پێوەندی‌یەکمان دەگەڵیان نەبوو. تەنیا پێوەندیی کە پێم وایە باسم کرد وەختێک بوو کە ـ ئەو وەختی قەڵادزێ دەدەست پێشمەرگەدا بوو ـ هێرشێک کرا بۆ قەڵادزێ‌و گیرایەوە، کە گیرایەوە ئەوانیش هاتن. چونکە ئەو وەختی جەماعەتی جەلالی‌یەکان یان مەکتەبی سیاسی دەگەڵ دەوڵەت بوون. ئیدی ئەوانیش هاتن بۆ قەڵادزێ‌و ئەوانەی مەشیان دەگەڵ هاتن. لەوێدا بڕیار درا ئەمن بچم پێوەندی‌یان پێوە بکەم. چووم دەگەڵیان دانیشتم. شەوێکی دەگەڵیان دانیشتم‌و پێم گوتن تکایە ئێوە کارتان بەو کارانە نەبێ. ئێوە

نەهاتوون شەڕی پارتی بکەن. دانیشن خەریکی خۆپێگەیاندنی خۆتان بن. شەهید کاوە مارەغانی باسی کرد گوتی بۆ حەقیقەت و ئینساف دەبێ بڵێم شەخسی مام جەلالی چەندین جاری بە ئێمە گوتوە کە ئێمە ئیحتیاجیمان بە چەند پێشمەرگەی ئێوە نیە. ئێوە دانیشن بخوێنن، خۆتان پێ بگەیەنن بۆ داینده. گوتی بەڵام پێشمەرگەمان دەگەڵ بووە گوتوویە بۆ ئێمە پیاو نیین؟ ئاخر سێ کەسمان لە شەڕی نێوان مەلایی و جەلالی-یەکاندا لەدەست چوون. "حەسەن ئەلیاس"و کوڕێک هەبوو ناوی خۆی "عەلی گۆماوی" بوو خەڵکی شیوەسەڵێ بوو بەڵام ناوی خۆی نابوو قەرەنی. پێشمەرگەیەکی زۆر ئازای ٤٧- ٤٦ی بوو. ئەوی دیکە کوڕێک بوو بە ناوی هەمزە خەڵکی گوندی قەڵەڕەشێ لە ناوچەی سەردەشت . سێ کەسمان ناوا تێدا چوون.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا چیهری ئەوانەی لەوێ بوون کێ بوو؟ یانی ئەوی ناسرابێ.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەو وەختێ کە ئەمن چووم دیتمن کاوە مارەغانی بەرجەستەترینیان بوو. بەڵام ئینسانی دیکەش هەبوون. مەسەلەن مەلا کەمال کە خەڵکی سەقز بوو، میرزا لەتیفی نەقشبەندی کە شەهید بوو. (مەبەست لەتیفی نەقشبەندیە کە لە دەیەی ٩٠ی زایینی‌دا لە هەولێر بە دەستی بەکرێگیراوانی کۆماری ئیسلامی تیرۆر کرا. عەباس). ئەحمەد ئەستانی و کەریم ئەستانی و ئەوانەیان دەگەڵ بوون. کەسانی دیکەش هەبوون کە وەبیرم نایەنەوە.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا حەتمەن بۆخۆشت خوێندووتەتەوە کە مامۆستا هەژار لە "چێشتی مجێور" دا هەڵسووڕاواتی ئەو خەباتە بە چەند ناو دەبار بەتایبەت زۆر خراپەی کاک سولەیمانی موعینی دەڵێ. بۆیە داوا دەکەم بۆچوونی خۆت لەسەر ڕوانگەکانی مامۆستا هەژار لەو بارەیەوە دەربڕی.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن یەکجار زۆر تامەزرۆ بووم بۆ ئەوەی بیرەوەری‌یەکانی مامۆستا هەژاری ببینم. چونکی پێم وا بوو شتی زۆر نهێنیی لەبارەی مەسەلەی کوردەوە پێ‌یە کە بەکەڵک دێن. بەتایبەتی بۆ حیزبی دێمۆکراتی کوردستان. بەڵام کە ئەو مرد و شتەکانی دیارە بە خانیی کوڕی ئەسپاردبوو، ئەمن لە پاریس بووم. کاک خانییش هەر لەوێ بوو. داوای لێ کردم کە پێی‌دا بچمەوە. تایپ کرابوو هێشتا چاپ نەکرابوو. لە ڕاستی‌دا پێش ئەوەی چاپ بکرێ ئەمن نوسخەکەیم دیوە. کە خوێندمەوە دوو شتم گۆڕین. یەکێک لەوانە غەڵەتی ئیملایی و تایپی بوون. یەکیشیان ئەوە بوو زۆر جێگا هەبوون کە خانی دەگەڵ ئەو جۆرە خەتە ئاشنا نەبوو نەی‌توانیبوو بیان‌خوێنێتەوە. یانی بەهەڵە لێ‌یان حاڵی ببوو. ئەوانیشم چاک کردن. دیارە بۆم نووسیبوو دوایە بۆخۆی چاکی کردن. زۆر بەکەمیش هێندێک تاریخ بوون کە زۆر ڕوون بوو هەڵەن بۆیە یادداشتم کردن و خانی بۆخۆی گۆڕینی. بەڵام دوایە بەخانیم گوت بابە ئەوە زۆر شتی تێدایە کە وا نیە.

بەخۆشییەوە خانیی ئەوە ماوە. دیارە لە تەمەندا زۆر لەمن چووکترە، بەڵام ڕەفیقیشین. گوتی چ بکەم؟ خۆ ئەوە کتێبی من نییە، کتێبی بابمە. ئەمن کتێبی بۆ نانووسم هەرچی گوتراوە دەبێ چاپی کەم دەنا ڕاست دەکەی.

بەداخەوە بیرەوەریی هەژاری شتی بەکەڵکی بەدەستەوە نەدا. کتێبێکی زۆر گەورەی پڕ لە تەعبیراتی ئەدەبی و نوکتەی خۆشیو ئەوەی بەدەستەوە داوە. لەو بارەیەوە گەنجینەیەکە. بەڵام وەکی دیکە تەقریبەن کەسی لێ ڕازی نییە. ئەوە نییە کوڕە گەورەکەی شتێکی لەسەر نووسیوە، شتێکی زۆر خراپ. هەر یەکجار خراپ، زۆری بێ حورمەتی پێ کردوە. ئەمن دەگەڵ ئەوە نیم. بەڵام لەبیرمە خوالێخۆشبوو کاک فەرەنسۆ هەریری کە نێوانی دەگەڵ هەژاری یەکجار خۆش بوو، یەکجار یەکجار، زۆر لێک نیزیک بوون بەخۆمی گوت، گوتی بەداخەوە مردوە، دەنا ئەگەر زیندوو بایە، بەقەد خۆییم لەسەر دەنووسی. لەحاڵێکدا خۆ ئەوەندی کراوە لەبارەی پارتی و بنەماڵەی بارزانییەوە زۆر بە ئیخلاسەوە دواوە.

ئەوەی مەربووتە بە کاک سولەیمانی موعینی، غەدرێکی عەجایب تاریخی لێ کردوە. سولەیمانی موعینی وەکوو هەموو ئینسانێک عەیبی هەبوو. عەیبی وای هەبوو کە ڕەنگە هەژار قەت پێی نەزانیبێ. بەڵام دوو شتانی پێ نیسبەت دەدا کە بە دەرزی و دەزووشڕ بە جەسبی دووقلووش بە سولەیمانی موعینییەوە نەدەچەسپان. یەکێکیان ئەوە کە بەترسەنۆک و خوێڕی و ئەوەی ناو دەبا. کاک سولەیمان پیاوێکی بەدەستو تفەنگ بوو، پیاوێکی ئازا بوو. ئەوی دیکە کە لەویان خراپترە، موتەهەمی دەکا بە پووڵ کۆکردنەوە دزی و فزی و ڕێگری و ئەوانە. سولەیمانی موعینی وەختێکی بۆخۆی گیرا، ئەگەر سەید ڕەسووڵی بابی گەورە فریای ژن و منداڵەکەی نەکەوتبایە منداڵەکانی لەبرسان دەمردن. دە دینارییان نەبوو کە ژنەکەی و دوو منداڵی خەرجی بکەن. سەید ڕەسووڵ باڵی بەسەردا کێشاون لەماڵی خۆی حاواندنییەوە دوای ئەوە ئەو شتەی بەسەر هات کە ئەویش بەداخەوە یەکێکە لە سەفحە تاڵەکان. سولەیمان ئەوە نەبوو. ئەمن بۆخۆم دەبیرم دێ جارێکی کە هاتبووم بۆ سەردانی برادەرانی خۆمان، ئەمن لەوێ بووم، دیتم دەگەڕان و هەوڵیان دەدا شتێک کۆ کەنەوە، وەکوو مەحرەمیش چونکی زۆر سەمیمی بووین. دیتم گەڕان و لە یەکتریان پرسی ئەتۆ چیت پێیە و ئەتۆ چەندت پێیە، ئاخری بە هەموویان سەت فلسیان پێ بوو کە ناردیان دایان بەچا. کیلۆیەک چا بە شەش سەت فلس بوو. ئەوان سەت فلسیان پەیدا کرد دایان بەچا. یانی ١٥٠ گرەمیان چا پێ کڕی بۆ ئەو سەفەرەی کە ئەمنیشی لێ میوان بووم. ئەوە هیچ کە خواردنەکەش شتێکی زۆر عادی بوو. هەر ئەو شەوەی لەوێ بووم بۆ سبەینێ بەیانی کاک سولەیمان لە نێو خۆی وڵاتەوە هاتەوە. بۆ منیان باس کرد کە پێیان گوتوە ئێمە وەزعی مادییمان یەکجار زۆر خراپە، ئەتۆ هیچ پووڵت نەهێناوەتەوە؟ گوتبووی خۆ ئەمن نەچووبوومەتەوە پووڵ کۆ کەمەوە یارمەتی وەرگرم. ئەمن چووم بۆ کاری حیزبی. دوایە لەوێ هەستابوو چووبوو بۆلای مەلا

مستەفاو پەنجا هەزار تمەنی تەحویلی ئەو دابوو، وەکوو کۆمەگ بە شۆڕش. خۆ ئەوە کارێکی خراپ نیە. مەبەستم ئەوەیە بڵێم عەیبی دیکەی پێوە دەچەسپا، چونکە هەر ئەوە بۆخۆی عەیبێکی گەورە بوو. ئەتۆ حیزبەکەی خۆت تانی نیە، هیچی نیە دەچی ئەو کارەی دەکەی. بۆ منیان باس کرد گوتیان بەڕاستی مەلا ئاوارە ئەمی ئێمە لێرە لەبرسان دەمرین کە دیارە لەو وەختیدا هەر لەوێش نەبوو. ئەوە مەلا ئاوارەیە کە ئێمە دەژیەنێ لە مەنتەقەی سەردەشتیڕا ئاردو ڕۆنو برینجو قەندو هەموو شتێکمان بۆ دێ. ئەوە هەمووی ئەو بۆمان دەنێرێ دەنا ئێمە لێرە لەبرسان وشک دەبین. بەو حاڵە دە هەزار تمەنی بۆ حیزبەکەی خۆی بەجێ نەهێشت، هەمووی تەحویلی ئەوان دا. تەحویلدانی ئەوان خراپ نیە، بەڵام ئیحتیاجیی حیزبەکەی خۆی خراپە. دەحاڵێکدا مام هەژار بەجۆرێکی دیکە باسی دەکا. دوژمنی کوردو خائینو چەتەو ڕێگرو شتی وای پێ دەڵێ.

**عەباس کەلوەژ:** لە ماوەی سەرهەڵدانو تێشکانی بزووتنەوەی چەکدارانەی ٤٧-٤٦دا پشتیوانی ماڵیو چەکوچۆڵی ئەو خەباتکارانە کێ بوو؟ ئایا ڕاستە کاک سولەیمان پێوەندیی بە عێراقەوە گرتبوو و داوای چەکی کردبوو؟ ئەگەر کردبووی داخوا هیچی بۆ کرا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر کاک سولەیمان کە هات ئەو سەفەرەی کرد، لەڕاستیدا ئەوسەفەرەی کە کردبووی بەشێکی زۆری ئەوەی بۆی هاتبوو نەیکردبوو. دەگەڵ دەوڵەتی عێراق هیچی بۆ نەکرابوو، هەر هیچ. ئەو وەختی ئەو ئەزادەدە هەبوو. مەکتەبی سیاسیی پارتی دیمۆکراتی کوردستان کە بەجەلالی ناو دەبران ئەوان دەگەڵ ئەو بزووتنەوەیە دۆستایەتییان هەبوو. ئەو وەختی کە پارتی موخالەفەتی دەکردن، ئەو بەشە دۆستایەتییان دەکرد. کاک سولەیمان حازر نەبوو ئەوان ببینێ چونکی ئەوانی بەخائین دەزانی هەر وەکی لە هەوڵەوە باسم کرد. هەموو تێبینیکاری وی ئەوە بوو کە دەگەڵ حیزبی توودە تەماس بگرێ، دەگەڵ ڕادمەنیشو ئەوانە. دیارە ڕادمەنیشی هەر دیبوو. ئەو وەختی دەبیرکوللی حیزبی توودە بوو، لە بەغدا دیتبووی. بەو خەیاڵە کە گۆیا ڕادمەنیش کۆمەگی پێ دەکاو کۆمەگی وڵاتانی سۆسیالیستیو ئەوانەی بۆ دێ. ئەوانیش هیچ، هەر هیچیان نەکرد. ئەمن لەبیرمە مەلا ئاوارەی ڕەحمەتی کەسێکی ناردبوو — کەسەکەش لەبیرمە کێیە بەڵام پێویست ناکا ناوی بێنم — بۆلای مام جەلال. مام جەلال نامەیەکی بۆ نووسیبوو بە ناوی "پیرۆت". نامەکەی دا بەمن خوێندمەوە. ئەودەم بۆ یەکەمجار خەتی مام جەلالم دەدی. هێندێک شتی بۆ نووسیبوو. یەکێک لەوانە بۆی نووسیبوو ئەو ڕۆژانە داوێکیان بۆ مام جەلال ناوەتەوە. تەقەیان لێ کرد، بەڵام مام جەلال بەسەلامەتی دەرچوو. واش بوو. لەپاشان نووسیبووی ئەوە دووهەزار فیشەکم بۆ ناردی دەگەڵ سەت دینار. سەت دینارەکە ئی مام جەلالە.

بەڵام کاک سولەیمان کە چووبوو، مەبەستی ئەوە بوو کە دەگەڵ هەموو ئەو ئیمکاناتانە هەوڵی خۆی بدا بزانێ چیی بۆ دەکرێ. کەچی نە ئەوانی دی، نە دەگەڵ دەوڵەتی عێراق تەماسی گرت. فەقەت هەوڵی دابوو بەڵکە دەگەڵ توودەیی‌یەکان کارێک بکا، توودەیی‌یەکانیش کە هیچ کارێکیان بۆ نەکرد.

**عەباسی کاردۆ:** یانی لەڕاستی‌دا هیچ پشتیوانیەکیان نەبوو. ئەدی ئەوچەک و تەقەمەنی و شتانەیان چۆن دابین دەکرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** تا ئەیان بوو. ئەو چەک و تەقەمەنی‌یە کە پێیان بوو لە واقیعدا هەر ئەوە بوو کە پێشتر پێیان بوو. هێندێک دەسکەوتیشیان هەبوو لەو عەمەلیاتانە کە کردبوویان. چەند (ئێم ١) یان لە شەڕەکانی سیی سەنگ و سەرشیو ئەوانە گرتبوون. چەند قەیزیەکی دیکەشیان هەبوون. بەڵام ئەو خەباتە شتی سەیرو سەمەرەی تێدا هەبوو کە پێم وایێ لە جێگایەکی دیکەدا باسم کردوە. یەکێک لەو پێشمەرگانە کە وەختی خۆی دەگەڵ سمایلی شەریفزادە شەهید بوون "میرزا موحەممەدی شاتمانی" بوو. میرزا موحەممەدی شاتمانی کوڕی بیوەژنێک بوو بە ناوی نەسنی‌یە مەنگوڕ. تفەنگەکەی ئی خۆی بوو. کە ئەو شەهید بوو پووڵێکیان بۆ دایکی بردبوو گوتبوویان ئەوە پووڵی تفەنگەکەیە. نەسنی‌یە مەنگوڕ گوتبووی ڕۆڵە گیان ئەمن ئەو تفەنگەم بە پووڵی تەشی‌ڕێسی‌یە بۆ موحەممەدی کڕیوە. ئێوە ڕێگاکەی ئیدامە بدەن دیسان بە تەشی‌ڕێسی پێنجی دیکەشتان بۆ دەکڕم. پووڵەکەی لێ‌وەرنەگرتبوون. یانی پشتیوانیی توودەیی هەبوو، بەڵام پشتیوانیی توودەیی ئەوەڵەن لە مەنتەقەیەکی زۆر مەحرووم‌دا بوو. عومدەتەن پایەگای ئەو بزووتنەوەیە ناوچە سنووری‌یەکانی سەردەشت و بانەو ئەوانە بوون کە زۆر مەحرووم بوون. ئەو خەڵکە مەوجوودی‌یەکی زۆر کەمیان هەبوو. بزووتنەوەش هەموو توانای خۆی لەو شوێنانە کۆ کردبۆوە. چونکی ئێران جەزیرە ئارامەکە بوو کە لە هیچ جێیەکی هەناسەی بای نەدەهات و دڵۆپێک باران نەدەباری. دەنا نەخێر بەداخەوە هیچ پشتیوانی‌یەکی دەرەوەیان نەبوو.

**عەباسی کاردۆ:** مامۆستا هیچ خەبەرت هەیە ژمارەی بەشدارانی ئەو بزووتنەوەیە چەندە بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەکوو چەکدار قەت نەگەیشتە سەت کەس. نەخێر چەکدار و پێشمەرگە نەدەگەیشتە سەت کەس. خەڵکیان دەگەڵ بوو بۆ خەبەرهێنان بردن و ئەوانە بەڵام ئەوەی ڕەسمەن پێشمەرگە بوو هەر ئەوە بوو، نەگەیشتە سەت کەس.

**عەباس کاروێز:** بۆ مێژوو پێمخۆشە بزانم هەڵوێستی خەڵکی باشوور ـ جگە لە پارتی ـ سەبارەت بەو خەباتەو تێکۆشەرانی چۆن بوو؟ نموونەی وا هەیە کە خەڵک وەک سەرکردایەتیی شۆڕش بیری نەکردبێتەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو وەختی کە ئەمن لە کوردستانی عێراق بووم، لە هەلومەرجێکدا نەبووم کە تەماسم دەگەڵ خەڵکی زۆر بێ. ئەمن بۆ ماوەیەکی چەند مانگی هەر نەمهێنرا لە دێیەکەی خۆمان وەدەر کەوم، چونکی نیگەران بووم کە چارەنووسێکی خراپم بۆ بێتە پێش. پێم وایە سێ مانگی پێوە خرا کە بۆ یەکەمجار خەڵکێکمان دەچوونە شارۆچکەی "سەنگەسەر". گوتیان تابەی؟ گوتم بەڕێزمڵا دێم ئەوە چەند مانگە لێرە ماومەوە. دێمو هێندێک پێویستیی خۆشم دابین دەکەم. دەنا ئەو تەماسەم دەگەڵ خەڵکی نەبوو چونکە نەمدەوێرا خۆم وەدەر خەم. بۆ حەقیقەتو تاریخ دەبێ ئەوەی بڵێم پاشی دوو مانگ یان سێ مانگان سەید ڕەسووی بابی گەورەی ڕەحمەتی کە تەماسێکی زۆرو دۆستایەتی‌یەکی نیزیکی دەگەڵ خوالێخۆشبوو حەسۆ میرخان هەبوو کە فەرماندەری هێزی کاوە بوو، چووبوو قسەی دەگەڵ کردبوو. گوتبووی ئەوە کەسێکی ئاوایە. هێندێک شاخەوانی پێوە نابووم کە ئەوە نەدییەو نازانم چییە. ئێستا قاچاغ بوومو تکایە حیمایەتی لێ بکە. ئەویش گوتبووی پێمخۆشە بێ بیبینم. سەید ڕەسووڵ هاتو بەیەکەوە چووینە لای کاک حەسۆ، خوا هەڵناگرێ زۆری قەدر گرتم. تەعارووفی کرد کە هەر پێویستی‌یەکت هەبوو دەنگ بکە، کە قەتم داوای کۆمەگی ماددی لێ نەکرد. تەنانەت جارێکی دیکە ئێران ناردبووی کە ئەگەر نەیهێنەوە، یان زیندووەکەی، یان مردووەکەی لە مەلا مستەفا وەدەگرینەوە. پاش ئەوەی ڕاسپاردەکانم ناردەوە. چوومە کن کاک حەسۆی گوتم ئێران پەیامێکی وای بۆ ناردووم. ئەگەر شتی وا مومکینە، با بۆخۆم بچمەوە. هەر نەبێ دەیبەخشن چونکە بۆخۆم چوومەوە. بەڵام ئەگەر وا نەبێ ئەو وەختی دەمگرنو دەمکوژن. گوتی برۆ لە ماڵێ خۆت دانیشە. حەتا مەلا مستەفا نەڵێ هیچ کەس ناتوانێ بەبەر دەرکی تۆدا بێ. ئەگەر مەلا مستەفاش گوتی، ئەمن پێت ناڵێم بێ‌ئەمریی مەلا مستەفای دەکەم، بەڵام قەولی شەرەف بێ چەند سەعات پێش ئەوەی بنێرم بتگرن ئەفەری خۆم دەنێرمە لات پێت بڵێن هەڵێ. ئەو عەهدەشی بردە سەرێ بۆ حەقیقەتو تاریخ. ئوسوولەن لە مستەفای زۆر فەرماندەریی ویدا — هەرچەند خشوونەتی هەبوو، دەگەڵ هی ئێمەش خشوونەتی هەبوو — بەڵام قەت هیچ کەس تەحویل نەدرابوو.

جا مەبەستەکەم ئەوەیە ئەمن ئەو وەختی تەماسێکی وام دەگەڵ خەڵکی نەبوو. تەنانەت جارێکی دەگەڵ کابرایەک لێم بوو بە شەڕیش. کە سولەیمانی موعینی گیرا، کەسێک کە پێشمەرگەیەکی واش نەبوو بەڵام لەبەر مەنفەعەتی خۆی ببوو بە پێشمەرگە، هاتە ئەو ماڵەی کە ئەمنی لێ بووم. هەر دابەزیو دانیشتو گوتی قائیدی سەرۆکی کوردستانی ئێرانیش گیرا. گوتیان چی بووە؟ گوتی "قایق" گیرا. ئاخر بۆ من زۆر ناخۆش بوو. گوتم ئەتۆ گرتت؟ گوتی نا. گوتم ئەدی ئەو خۆبادانو خۆرلانانەت بۆ چی‌یە؟ گوتی وا دیارە

پێت ناخۆشە؟ گوتم مەعلومە پێم ناخۆشە. پێت وایە قسەیەکی زۆر گەورە کراوە؟ یانی لە واقیعدا مەسئەلەیەکی نائینسانی بوو، بەڵام بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆم لەدەست دا. دەنا دەبوو لەو وەزعەدا قسەی وا نەکەم. شتەکە ئەوەندە تاڵ بوو، ئەوەندەش ناجوامێرانە ئەو قسەیەی کرد کە خۆم پێ ڕانەگیرا. دوایەش کە زانی ئەمن پێم ناخۆش بووە، عوزری هێنایەوە چونکە شعووری ئەوەی نەبوو، بەڵام ئیدی لەسەری ئەوڕۆیشتو شتەکە کپ بوو.

ئەمما دواتر کە ئەمن وەتێو خەڵکی کەوتم و خەڵکم ناسی، عەکسی ئەوەم لە خەڵکی دی. خەڵک زۆر عاتیفەیان هەبوو. یانی هاودەردی‌یان دەردەبڕی. پێ‌یان ناخۆش بوو ئەو هەڵوێستەی بەرامبەرمان گیرابوو. یانی نەک هەر بڵێی موخالیفانی پارتی، تەنانەت لە نێو پارتیشدا هەبوون دەریانئەبڕی کە ئەوەیان پێ‌ناخۆش بووە.

**هیلس کاردۆ:** دوای سەرکوتی ئەو خەباتەو شەهیدبوون و بەدیل‌گیرانی تێکۆشەرانی، وەزعی گشتیی حیزب چیی لێ هاتەوە؟ ئایا خۆتان بە تاوانبار دەزانی، خەتای لایەنی دیکەتان دەگرت یان پێتان وا بوو هەر نەدەبوو ئەو تاقی کاری‌یە کرابا؟ وەزعی ڕوحیتان چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەڕاستی‌دا ئەگەر بڵێم دانیشتین و تەحقیقاتێکی ئاوامان کرد، ئەتمان کارێکی ئاوا نەکرد. بەڵام لەو بارەیەشەوە یەکدەست نەبووین. هەمانبوون هەر لە نێو بەدەنەی حیزبداو هەروەها لە ڕێبەری‌یەکەشدا لێرە لە کوردستانی عێراق ئەوانیان مەحکووم دەکرد. هەمانبوون کە دڵمان دەگەڵیان بوو، بۆیان بەداغ بووین. بەڵام پاش ماوەیەک ئەو وەزعە بڕێک گۆڕا. ئەمن لە "نیو سەدە تێکۆشان" دا هێناومە جا نازانم چەند بەتەفسیل باسم کردوە. وەختێکی دوای کۆنفرانسی دوو نێمە نامەمان بۆ ئەحمەد تۆفیق نووسی‌و کاک مەلا سەید ڕەشیدمان نارد کە ئیستیعفای پێ وەربگرێتەوە. کەچی لە جیاتی ئەوەی بی‌هێنێتەوە بۆخۆشی دەگەڵی ڕۆیی، لە قەلادزێ کۆ بووینەوە. هەرچی بەجۆرێک بوو هەموو خڕ بووینەوە. حدوودی چل کەسێک دەبووین زۆر نەبووین. خڕ بووینەوە دوو ڕۆژان قسەمان کرد کە چ بکەین چ نەکەین. عاقیبەت هاتینە سەر ئەوەی کە خۆ ناتوانین لە مەلا مستەفا یاغی بین. ناتوانین بگەڕێینەوە شۆڕشی چەکداری بکەین. کەوابێ مەجبوورین بچین بەخۆی بڵێین چ بکەین:

**پیش کە برآورم ز دستت فریاد — هم پیش تو از دست تو می‌خواهم داد**

جا لەسەر ئەوە ساغ بووینەوە. لەوێ بڕیار درا ئەمن و کاک ئەمیری قازی بچین بۆ لای بارزانی. ئەوە سالی ١٣٤٨ بوو. کە چووین خواحافیزیمان کرد، دەوری چل کەسێک دەبوون. هەرچی خوداحافیزیی لێ‌کردین دەستی دەمستۆی کردین، ماچی کردین و گریا. یانی لە واقیعدا پێ‌یان وابوو بۆ قەبریمان بەڕێ

دەکەن. ئەرقەزا ئەو دەنگۆیەش لە ئێران بڵاو ببۆوە کە ئەوانە گیراون و تەحویل دراونەوە. بەڵام کە ئێمە چووین، چووینە مەکتەبی سیاسی. مەکتەبی سیاسی بەپێویستی نەزانی بچینە لای مەلا مستەفا. یانی دیداری مەلا مستەفایان بۆ وەرنەگرتین. بەڵام هەم مەکتەبی سیاسیمان دیت، هەم کاک ئیدریسمان دیت کە دیارە ئەویش هەر ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو. دوێنێدا هێناومە کە کاک "عەلی عەبدوڵڵا" کە ئەو وەختی سکرتێری پارتی نەبوو گوتی ئەوەی دەگەڵ ئێوە کراوە "وصمة عار"ە بە نێوچاوانی پارتییەوە. قەتم ئەو کەلیمەیە نەبیستبوو. گوتی ئەوە پەڵەی شەرمە بە نێوچاوانی پارتییەوە و دڵنیا بن جارێکی دیکە دووپات نابێتەوە. ئەو مەسەلەیەم بە مەلا مستەفاش گوتووە ئەویش زۆری پێ ناخۆشە ئەو کارە کراوە. بەڵام گوتوویە با ئەوان لە ماڵی خۆیان دانیشن کەس کاری بەکاریان نیە. کە چووینە لای کاک ئیدریس بارزانی ئەویش عەینی ئەو قسەیەی کرد. گوتی زۆرمان پێ ناخۆشە. تەنانەت ئەو گوتی ئەمن نێ مەلا سەید ڕەشیدم پێ سەیرە. ئێستێ ئەحمەد تۆفیق شتی ئاوا بکا دیسان دەبێ، بەڵام مەلا سەید ڕەشید چۆن شتی ئاوای کردوە؟ یانی وای نیشان دا کە ئەو کابرایەکی ئاڵۆز باڵۆزە. بەڵام ئێوە نیگەران مەبن بچن لە ماڵی خۆتان دانیشن. ئیدی گەڕاینەوە. ژیانەکە ژیانێکی ناخۆش بوو. مەقەڕێکمان هەبوو، دواقیەدا مەقەڕ ئەبوو مەنزڵی کاک ئەمیری قازی بوو کە سەڵت بوو. ئەگەر کۆبوونەوەیەکمان هەبا لەوێ کۆ دەبووینەوە. ئەویش تاقە یەک ژوور بوو کە لە ماڵێکی دێهاتی وەری گرتبوو. لە دێیەک بوو بەناوی "سەرگەی تێڵێ" لە مەنتەقەی ئاکۆیان و لە نیزیک "پشت ئاشان" و ئەوێ. ئەو لەوێ بوو، ئەمن لە ماڵی خۆم بووم. کاک حەسەنی ڕەستگار لەماڵی خۆی بوو. یانی وەزعێکی وا بوو، گوزەرانەکەمان خراپ بوو بەڵام چاک بوو دوای کۆنفرانسی دوو کە ئەو تۆزە مەجالەشمان بۆ کرایەوە، ئەوەمان کرد کە بە دەوری خەڵکەکەدا بێین. خەڵکەکەی خڕ کەینەوە ئەوعێک سازمانئەھی یان بۆ بکەین. ئیدی بووژانەوەیەکی ـ هەرچەند کەمیشی ـ ئێدا حاسڵ بوو.

یانی بڵێی ئایەندەیەکی ڕوونمان لەپێش چاوی خۆمان دەدیت ئەوە نەبوو. دەحاڵی گەشانەوەدا بووبین ئەوەش نەبوو. پێوەندیمان دەگەڵ نێوخۆی وڵات پتەو کردبێ ئەوەش نەبوو. بەڵام ئەو نیگەرانییەی بۆ ماوەی ساڵێک بەسەر هەموو کەسدا زاڵ بوو کە ڕەنگە بگیرێین یان تەحویل بدرێینەوە، بەو ئیتمینانەی لە زمان مەلا مستەفاو کاک ئیدریسو ئەندامانی مەکتەبی سیاسییەوە بیستمان ڕەوییەوە. ئیدی ئەوجار هاتوچۆمان دەکردو وەدەر دەکەوتین. وەزعەکە فەرقی کردبوو. دوای ئەوە کەس تەحویل نەدرایەوە.

# ئەدەبو سیاسەت

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا دەچینە سەر بەشێکی دیکە کە زیاتر پێوەندیی بە خۆتەوە هەیە. ئەوەی باس دەکرێ تۆ لە نێو حیزبی دێمۆکراتدا بە شارەزاترین کوردی‌زانو بەدیققەتترین نووسەر ناسراوی. پرسیار ئەوەیە ئەزموونی کاری سیاسیو حیزبایەتی فێری ئەوەیان کردی، یان خۆت ئەوانەت بە دیاری بۆ حیزب برد؟ ئایا ئەو شارەزایی‌یە تۆی لە پلیکانی سەرکەوتن بردە سەر؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** دیارە هێندێک تەعبیر کە بەکارت هێنان ئی خۆتن. پێم وایە تە بە ئەزموونترینو بەدیققەتترین نووسەرو ئەپلیکانی سەرکەوتنیشم بڕیون. بەڵام لەسەر ئەوەی کە ئەو دووانە چۆنیان کار تێک کردوە، پێم وایە ناتوانین یەکیان بکەینە ئەسڵو ئەوی‌دیکەیان بکەینە فەرع. نموونەیەک دێنمەوە، دەڵێم ئەو کەسانەی قەڵەون ناتوانن خۆ کز کەن. چونکی بۆیە قەڵەون کە خواردنی چاک دەخۆن. لەبەر ئەوەش خواردنی چاک دەخۆن قەڵەون. ئەوەش وایە. ئەمن لەمێژدا کەمێک عەلاقەم بە شێعرو ئەدەبیات هەبوو. بەتایبەت بە شێعرەوە کە سەدان هەزار بەیتە شێعرم لەبەر بوون، ژمارەیەکی یەکجار زۆر شێعرم لەبەر بوو. هەرچی وەدەستم کەوتبایە بێ ئەوەی خۆمی زۆر بۆ ماندوو بکەم زۆر بەهاسانی دەهاتە بەرم. بەڵام بۆ یەکەم-جار ئەمن ساڵی ١٣٤٨ بەیانێکم نووسیوە. بەیانێکی سیاسیم نووسی ، زۆریشم پێ سەیر بوو کە پێیان باش بوو. بۆ دووهەمین جار ساڵی ١٣٤٩ (١٩٧٠)بە بۆنەی ٢٥ی گەلاوێژ ساڵرۆژی دامەزرانی حیزبەوە بە هاوکاریی دەگەڵ مەرحوومی هێمنی بەیانێکی دوورودرێژم نووسی. دیارە هێندێک ڕێنوێنیی وی تێدابوو بەڵام نووسینەکەو داڕشتنەکە ئی من بوو. لە دوایە وەختێکی بوومە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، دەکرێ بڵێم لوتفی هاوڕێیان بوو کە پێیان وا بوو ئەمن دەبێ ببمە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. زۆر بە نابەدڵی قبووڵم کرد. دوایە کە قبووڵم کرد گوتم تەنیا خەسڵەتێک دەخۆمی‌دا دەبینم ئەوەیە کە پیاوێکی ڕازدارم. ئەسراری حیزبم پێ دەپارێزرێ دەنا ئەمن شایستەی ئەو کارە نیم. بەڕاستییش هەموو وەختێک ئەمن دەڕیانمدا کە پێم وایە ئەتۆش دەگەڵم بووی هەوڵم داوە نەبمەوە ئەندامی ڕێبەری. ئەوە زۆر دەلیلی هەبوون بەڵام یەکێک لە گرنگترین دەلیلەکانی ئەوە بووە کە ئەوەی پێم وایە بۆ ئەندامەتیی ڕێبەریی حیزبێکی وەک حیزبی دێموکراتی کوردستان پێویستە لەخۆمدا شک نەبردوە.

بەهەرحاڵ. ئەوە کە ئاوادیەکی کەمیش بێ توانای نووسین و دەرکی سیاسیم تێدا بووە بۆتە باعیسی ئەوەی هەر بیمەوە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. لەپاشان کە بوومە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، لە نێو ڕەفیقانی حیزبی‌دا شت فێر بووم. نووسینیان لێ فێر بووم. نووسیومەو بەرەبەرە نووسینەکە بەقەوەت بووە. هەمووی ئەوانە هەبوون. لەبیرمە لە بەغدا بووین. زۆر هەوڵم دەدا بپرسم و شت فێر بم، ئەو کاک حەسەنی ڕستگارە کە ئێستا لێرە ماوە، ڕووی دە دوکتۆرو هێمن و کەریمی حیسامی کرد، گوتی ڕاوەستن هەتا ساڵێکی دیکە وەڵڵا ئەومەتان پێ نایەڵێ. یانی شەوقێکی زۆرم هەبوو بۆ ئەوەی فێر بیم. چونکی ئەمن لە دەورانی خوێندن و مەلایەتیدا هیچ کوێم نەدیبوو. مەسەلەن ئەمن پاش یازدە ساڵ دەربەدەری گەڕاومەوە ئێران. جا ئەوجار دوای ساڵێک تارانم دیوە، دەنا تارانم نەدیبوو. سنەم نەدیبوو. دواقیعدا تەنیا شاری ئەمن لە وڵاتی خۆمان دیبووم سەردەشت بوو ئەگەر دروست بێ بە هەموویان بڵێین شار، بانە بوو، سەقز بوو، بۆکان بوو، پیرانشار بوو، مەهاباد و ورمێ. دەنا شنۆش شاری شنۆیەشم دوای ئینقیلابێ دیتوە. ڕۆژنامەم نەخوێندبۆوە. یانی عەجایب بەجێ مابووم. دەرفەتم بۆ نەخوڵقابوو لە مەدرەسەو دانیشگا بخوێنم. بەڵام لەوێ‌دا کە ئەو فورسەتەم بۆ خوڵقا، هەم بۆخۆم هەوڵم دەدا، هەم مەجاڵێکیش بوو، ئیدی پیاو دەی‌توانی کەلکی لێ‌وەربگرێ.

**عەباس کارەوێ:** یانی حیزبایەتی‌یەکە بە قازانجت بوو.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دەتوانم بڵێم بەڵێ. قابلییەتێکم تێدا بینراوە بۆیە بوومە حیزبی‌و کۆمیتەی ناوەندی. بەڵام لەوێ‌دایە ئەگەر شتێک فێر بووبم فێری بووم. دیارە وەکوو کوردی، خەڵک پێمن دەڵێ کوردی‌زان. ئەگەر ڕاست بێ‌و کوردی‌زان بم ئەوە هونەرێکی تێدا نیە. لە مەنتەقەیەکی دێهاتی پەروەردە بووم کە زمانی ئەسیل لەو مەنتەقانەدایە کە دێهاتین. بێ‌سەوادو نەخوێندەوارن. زمانەکانی دیکە فێر نەبوون چونکە تێکەڵاوی‌یان دەگەڵ زمانەکانی دیکە نیە. ئەوە شتێکی باش بووە بۆ پاراستنی زمانی ئەو میللەتەی لەوێ دەژین. لەڕاستی‌دا هونەرەکە نی ئەومیە.

**عەباس کارەوێ:** بەڵام خۆ هەموو خەڵکی ئەوێ کوردی‌زان نین.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا دیارە خۆ هەموو کەس نابێتە نووسەر. بەڵام ئەگەر کوردی‌یەکەم جوان بووبێ نی ئەومیە کە کوردی‌یەکی ڕەسەن و خاوێنە. چونکی ئەو خەڵکەی ئەمن دەنێویاندا ژیاوم زمانی دیکەیان نەزانیوە. لەبیرمە، پیاوێکی خەڵکی دێ‌یەکەی ئێمە کە کەمێکیش خزم بووین، وشەی "موتڵەقا"ی بیستبوو. وا بزانم لە فەقێ‌یانی بیستبوو. پێی وا بوو ئەگەر ئەو کەلیمەیە بەکار بێنێ پێی ماقووڵ دەبێ. نەشی‌دەزانی بیڵێ هەر دەی‌گوت "موتڵەما". نەشی دەزانی لەکوێ‌دا بەکار دەبرێ. هەرکە قسەی دەکرد دەی‌گوت موتڵەما یاخوا

بەخێو بێ. موتڵەقا ماڵ و منداڵت چۆن. موتڵەقا ئەوێ پرسیت نیە. یانی دەگەڵ هەموو شتێکی ئەوی بەکار دێنایەوە.

**عەباس کاردۆ:** جەنابت هەم وەک نووسەری مەسەلە سیاسییەکان ناسراوی و هەم بە شارەزایەکی بواری ئەدەبیە. خۆت لە کام ئەزموون ڕازیتری و کێهەیان بە سەرکەوتووتر دادەنێی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بێ تەعارووف ئەمن لە هەردووک بەشیاندا خۆم بە کەمدەسەڵات دەزانم. بەڵام لەسەر یەک ئەمن لە شتە سیاسییەکاندا ڕەنگە پترم لە دەست هاتبێ. چونکی کاردکەشم ئەوە بووە. ئەمن نەهاتبووم کاری ئەدەبی بکەم. پاشان ئەمن زۆر جار دەڵێم ئەمن ئەدیب نیم، ئەدەبدۆستم. چونکی ئەدیب بەو کەسە دەڵێن کە هەموو مەکتەبە ئەدەبییەکانی خوێندبێ یان خوێندبێتە، ئەوەڵەن بەدەستی گەیشتبێ شێعری شاعیران و ڕۆمانی ڕۆماننووسەکان و ئەدەبیاتی میللەتانی دەوروبەر و ئەوانەی خوێندبێتەوە. یان مەسەلەن قەواعیدی زمان وەک ڕێزمان و ڕێنووس و ئەوانەی خوێندبێتەوە. کاری لەسەر کردبێ یان بەدەرس خوێندبێ. ئەمن هیچ یەک لەوانەم نیە. ئەوەی ئەمن کردوومە شتەکە لەپیرێژن و پیرەپیاوان فێر بووم و لەپاشانیش زەوقێک و ئیستیعدادێکی نووسینم هەبووە بەکارم هێناوە. دەنا شارەزای هیچ یەک لەو مەکتەبە ئەدەبییانە نیم. بەڵام لەباری سیاسییەوە ماوەی چەند ساڵ دەبەر دەستی مامۆستایەکی شارەزای وەک دوکتور قاسملوودا کارم کردووە شتی لێ فێر بووم. ئەگەر تەماشای نووسینەکانیشم بکەی، نووسینە سیاسییەکانم پێم وایە بێ‌شک لە ٩٥ لەسەدی نووسینەکانم زیاتر پێک دێنن. چونکە ئەمن ڕەنگە ئەگەر حیسابی بکەم سێ چوار هەزار وتارم نووسیبێ. پێم وا نیە مەقالاتی ئەدەبی و کۆمەڵایەتیم لە دوو سێ لە سەت زیاتر ئەبن. ئەوانی دیکە هەموویان سیاسین. جا ئەوە چ بۆ ڕۆژنامە بووبێ، چ بۆ ڕادیۆ یان تەلەڤیزیۆن یان گۆڤار و هەرچی بووبێ. پێم وایە زیاتر لەوێدا چالاک بووم.

**عەباس کاردۆ:** بەشێک لەوانەی کاریان دەگەڵ کردووی گلەیی ئەوەیان هەیە کە زۆر سەختگیری و ڕێگا نادەی کەسانی دیکە لە بواری نووسیندا بناسرێن. واتە نووسراوەکانیان بە هێند ناگری. جەنابت لەو بارەوە چۆن بیر دەکەیەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پیاو لەو بارەوە بۆ خۆی نازانێ چۆن بووە. ڕەنگە لە مێتۆدی کارکردندا ئەو شتانەم لێ دەرکەوتبێ. بەڵام لە نیەت و مەبەستدا بەهیچ جۆر ئەوەی تەئیید ناکەم، ئەوە حەتمەن خیلافە. ئەمن خودا خودام بووە یەکێکی دیکە پێ بگا. تەنانەت لەبیرمە کەسێک، کە ڕەنگە ئەتۆش لەبیرت بێ کێ بوو، گوتبووی کاک سەعید ـ دوکتور شەرەفکەندی ـ مەقالەکانی بۆ دەنووسێ. ئەگەر بە دڵی ئەبان بۆ

خۆی چاکی دەکردن و بۆی دەنووسینەوە بەڵام فلانکەس فێری کردین بۆخۆمان بنووسین. جا ماوەیەک کاک سەعید بەرپرسی ئینتیشارات بوو لە "بۆلی"، دوایە ئەمن بووم. ئەمن هەمیشە هەوڵی ئەوەم داوە. بەڵام ئەگەر شتێکم دیوە - ئێستاش هەروایە - پێم ناخۆشە نەی‌ڵێم. جا ڕەنگە لەوێدا گوتنەکەم بەشێوەیەکی خراپ بێ یان خراپ وەربگیرێ، ئەوەی قبووڵ دەکەم. زۆرم پێ‌ناخۆشە ئەوەی دەڵێم بەڵام دەتوانم بڵێم لە سەتا ٩٩ی ئەو ئیرادانەی لە نووسینی ڕەفیقانم گرتوە حەق بوون. پێشم گوتوون وەرن با بێ‌بەینە کن خەڵکی دیکە بزانین وایە یان نا. زۆر جار کێشەم دەگەڵ کەسێک هەبووە، دوایە پێشانی کەسی دیکەمان داوە تەماشام کردوە قسەکەی من قبووڵ بووە. ئەمن پێم‌خۆشە بە شانازی‌یەوە لەپاشان بە شانازیی دوکتور قاسملوویەوە ئەوەی بڵێم کە هەر لە ساڵەکانی هەوڵی بەم لاوە دوکتور قاسملوو هەر مەقاڵەیێکی دەی‌نووسی، دەی‌دایە دەست من و دەی‌گوت چی لێ‌دەکەی بیکە. یانی ڕازی بوو هەر دەسکاری‌یەکی بکەم. مەسەلەن جلدی یەکەمی چل ساڵ خەباتی کە نووسی، ئەمن لە دەرێ بووم. نوسخەیەکی ئیمزاکراوی بە دیاری بۆ ناردبووم. لەوێ خوێندمەوە. کە هاتمەوە چوومە خزمەتی گوتم پێم‌خۆشە ڕۆژێک دابنێی دووبەدوو دانیشین لەسەر چل‌ساڵ-خەبات قسە بکەین، چونکی ئەمن هێندێک تێ‌بینیم لەسەری هەن. گوتی دانیشتنی ناوێ. ئەتۆ لەسەر نوسخەکەی خۆت چ مولاحەزەیەکت هەیە بی‌نووسە، دەسکاریی بکە. ئەوە قەرارە چاپی بکەینەوە، دەی‌دەین لەسەر ئەوەی تۆ تایپی بکەن و ئەمن دوایە نوسخەی دیکەت بۆ ئیمزا دەکەم، دەگەڵم دانەنیشت. ئیجازەی دا لەسەر کتێبێک کە بۆخۆی نووسیویەتی چیم هەیە دەسکاری بکەم و لە دوایە چاپ بکرێ. ئێستێ ئەوانەی ئەو وەختی دەگەڵی ژیاون تەنیا کەسێکی کە نوسخەی ئیمزاکراوی دەستی دوکتوری لە چاپی دووهەمی کتێبەکە هەیە ئەمنم. ئەوانی دیکە هەمووی چاپی یەکەمیان هەیە. یانی خۆ ئێمە فازیلتر و سیاسیتر و نووسەرتر لە دوکتور قاسملوومان نەبووە. بەڵام ئەو قبووڵی بوو، شتەکەی دەدایە دەست من و دەی‌گوت چی لێ دەکەی لێی بکە. چونکی دوو شتی هەبوو. یەکیان باوەڕی پێم هەبوو کە ئەزموونەکانم دەبێ باش بن. ئەوی دیکەش ئەوە بوو کە عوقدەی خۆکەم‌بینینی نەبوو کە بڵێ ئەگەر ئەو بێ‌گۆڕێ دەڵێن ئەوە فێری دەکا. بۆخۆی عالم بوو، نووسەر بوو، ئەو نوقتەزەعفەی دەخۆی‌دا شک نەدەبرد. ئەمن زۆر جار گوتوومە نووسینی دەستی دوکتور قاسملووم هەزار جار ئاسانتر دەسکاری کردوە تا نووسینی ئەو کەسانەی دەبەر دەستیدا پێ‌گەیشتوون یان ئەو کەسانەی ڕەفیقم بوون بەڵام ئیدیعایان زیاتر بووە. برادەرمان هەبووە لەسەر کەلیمەیەک جۆتە ئەستێران. لە حاڵێک‌دا کەلیمەکەی وی هەڵە بووە و ئەوەی ئێمە گوتوومانە درووست بووە.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ڕەنگە بەشێکی لەبەر ئەوە بووبێ کە ئەتۆ شێوە عیلمی‌یەکەیت ئەتوانیوە باس بکەی یان وەک دەرس بتوانی فێری ئەو کەسانەی بکەی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن وەک دەرس ناتوانم بیڵێمەوە. ئەمن بۆخۆم هیچ شتێک بە دەرس فێر نەبووم هەتا بە دەرس بیڵێمەوە. ئەوەی دەیەوێ لەمن فێر بێ دەبێ وەکوو من فێر بێ. ئەوەی کە "گۆران" لە بارەی "دەرویش عەبدوڵڵا"وە دەڵێ: **نە مەڕۆی مەکتەبێکت خوێند، نە ئوستادێ پەلی گرتی.** ئەمنیش هیچیان نەبووم. کێ فێری خوێندنەوەی کردووم؟ کێ فێری نووسینی کردووم؟ کێ گوتوویە ئاوا مەقالە بنووسە. هەمووی بە زۆری زۆرداری خۆم فێر کردوە. جا ئەوەی بیەوێ لەمن فێر بێ دەبێ سابیقەکانم ببیسێ و لەپاشان ئاوا بۆخۆی بە ئیبتیکار فێر بێ. دەنا ئەمن بە میتۆدی عیلمی فێر نەبووم. ئەمن یەک ڕۆژ لەسەر تەختە ڕەشەی حەرفێکم نەنووسیوە. لەسەر مێزو نیمکەتان دانەنیشتووم. موعەللیمێک دەرسی پێ نەگوتووم. لە دێ-یەکی دوورەکەوتووی کوردستان لەکن مەلار فەقێیان فێر بووم. ئەویش پێم وایە جارێکی دیکەش گوتم زۆر وەختم وەبیر دێن مامۆستایەکە بەقەت خۆمی لە دەرسەکەم نەدەزانی. بەڵام عومری لەمن زیاتر بوو دەبوو بچم لەکن وی بخوێنم.

**عەبباس کاردۆ:** لە نووسراوەو وەرگێڕانە ئەدەبییەکانت، ئەوەی زۆر ناسراوەو خوێنەری زۆر بووە ــ ئەوەندەی من بزانم ــ وەرگێڕانی ڕۆمانی حەمەدۆکە. خۆشت داستانێکت نووسیوە کە ناوەکەیم لە بیر نیە. حەمەدۆکت زۆر چاک وەرگێڕاوەو زەریفکاریی زۆرت تێدا بەخەرج داوە. پێت وا نیە ئەگەر درێژەت بە وەرگێڕان دابایە خزمەتی گەورەت بە زمانی کوردی دەکرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەسەر یەک ئەمن لەجێیەکدا نووسیویشمە لەو باوەڕەدام کە وەرگێڕان بەتایبەتی وەرگێڕانی ڕۆمان ڕێگایەکی زۆر باشە بۆ پەرەپێدانی زمانی کوردی. چونکی نووسەری ڕۆمان بە کاناڵی جۆربەجۆری ژیاندا دەڕواتە خوارێ. لە بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیان دەدوێ. ئەوانەش هەموو کەلیماتیان هەیە. بۆیە گەنجینەیەک لە کەلیمات دەکەوێتە سەر کاغەز. شتی سیاسی وا نیە. لە "زەمانی مودەڕیسی" دەگێڕنەوە کە گۆیا گوتوویەتی دەتوانم ببمە سەرنووسەری دە ڕۆژنامەی کۆمۆنیستی. چونکی هەمووی دوو سەد کەلیمەیە، هەر پاشوپێشی دەکەن و تێکی دەکەنەوە دەیکەنە ئەوە. ئەوە حەقیقەتێکی تێدایە. مەسائیلی سیاسی بوارێکی زۆر بەرتەسکی هەیە بۆ کەلیمات. هەر بەڕاستی دەتوانم بڵێم هەموو وتارە سیاسییەکان دە هەزار کەلیمەیان تێدا نیە. لەحاڵێکدا ڕۆمانێکی درێژی وەک حەمەدۆک ڕەنگە بەسەد هەزار کەلیمە تەواو نەبێ.

جا ئەمن کە خەڵکەکە لە کاری تەرجەمەکەم ڕازی بوون پێم وایە ئەگەر مەجال هەبایە یانی هەم مەجالی تەرجەمە لە لایەن منەوە هەبایەو هەم مەجالی چاپ و بڵاو کردنەوەش هەبایە، ڕەنگ بێ خەڵک زەوقێکی لێ دیبایە. یانی خزمەتێک بایە، ئەمنیش پێم وایە.

**عەبباس کاریزۆ:** یەکەم نووسراوەکانت چۆن بوون؟ کێ چاوی لێدەکردن و هەڵەکانی پێدەگوتی؟ سەرەتا بە نووسینی ئەدەبی دەستت پێکرد یان سیاسی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** لە دەورانی پێش سیاسەتدا هەر وەک باسم کرد شێعرم کە یەکجار زۆر دەنووسین و دەم دەڕوتاندن. بەڵام جاروبار هێندێک وتاریشم دەنووسین کە ڕەنگە بڵێم ئەویان پتر شتی ئەدەبی بوون. بەڵام وەک شتی جیددی کە گوتم یەکەم دوو بەیانییەم لە ساڵەکانی ٤٨ و ٤٩ دا نووسین. ئەوانە بەیانییەی سیاسی بوون. دوایە کاری بەرچاوی من لەنێو خەڵکیدا، زیاتر تەرجەمە بوون. ئەووەڵ تەرجەمەم کتێبێک یان جزوویەک بوو بەناوی "واقعیت خلقهای ایران و افسانه م.ماکان" لە نووسینی ڕووناکبیرانی کوردی ئێران کە بە یەقین بە قەڵەمی دوکتۆر قاسملووی نووسرابوو. ئەوە سیاسی بوو. هەر بە دوای ویدا، دووهەمین کارم کە کردم کارێکی گرینگیش بوو کتێبی دوکتۆر قاسملووی بە ناوی "کوردستان و کورد" بوو کە دیارە لێکدانەوەیەکی سیاسی و ئابووری بوو، هەرلەو کاتەدا وەک سەرەتایەک، ئەسڵێکی تاریخی و جوغرافیاییشی بۆ نووسیبوو. ئیدی دوای ئەوە کە کەوتمە کاری نووسین، نووسینەکان لە ڕۆژنامەی "کوردستان"دا بوون. لە بڵاو کراوەی "تێکۆشەر"دا بوون. ئەو وەختێ کە ڕادیۆمان هەبوو لە ئەووەڵەوە هەتا ئاخر کەموزۆر بۆم دەنووسی. دیارە ئەوانە بەشی هەرە زۆریان هەر سیاسین. ئیدی ئەوجار وەک تەرجەمە کە شتی ئەدەبیان زۆرتر تێدا بوو، ڕۆمان یان کورتە چیرۆکەکانی "عەزیزی نەسین" و ڕۆمانەکانی "یەشار کەماڵ"و هەر وەها لە "جەک لەندەن" ئەمن شتم تەرجەمە کردوە. ئەوانە دیارە پتر وەک شتی ئەدەبی حیسابن هەتا سیاسی. هەرچەند بەڕاستی بەشێکیان بەجۆرێک لە جۆران ئێوەرۆکی سیاسیشیان هەیە. ئێستێ تێ ئەکری لە نووسینەکانی یەشار کەماڵ، هەر لە حەمەدۆکدا، زۆر موحتەوای سیاسی و کۆمەڵایەتی هەیە بەڵام بەشێوەی ڕۆمانێکی شیرین دایڕشتوە هەتا چاکتر بە گەرووی خەڵکیدا بچێتە خوار. شوێنەواری دیکەش هەن کە بە شێوەی ڕۆمان نووسراون بەڵام نێوەرۆکی سیاسی خۆیان هەیە.

**عەبباس کاریزۆ:** ئەدی هیچت بۆ گۆڤار و ڕۆژنامەکانی غەیری حیزبی نەنووسیوە؟ مەبەستم ئەوەیە لە باشووری کوردستان یان جێگاکانی دیکە.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** لە عێراق بۆ ماوەیەکی پێنج شەش ساڵی لە ڕۆژنامەی "هاوکاری" کارم دەکرد. وەکوو قەرارداد دامەزرابووم نەک وەکوو کارمەندی ڕەسمی، چونکی کوردی عێراق نەبووم. لەوێش هەر لاپەڕەی سیاسەتم هەڵگرتبوو کە لاپەڕەی دوو بوو. هەرچی لەوێدا نووسراوە هەمووی هەر سیاسی بووە. بەڵام جگە لەوە بۆ گۆڤار و ڕۆژنامەکانی دیکەش کە دەردەچوون وەک "بەیان" و "ڕۆشنبیر" و "ڕەنگین" و ئەوانە دەمنووسی. ئەوانە زیاتر ئەدەبی بوون، تەرجەمە بوون، جاری وا بوو نووسین بوون کە زیاتر دەچوونە

خانەی ئەدەمی‌یەوە، بە تایبەت هی گۆڤارەکان. جاری وابوو چیرۆکێکم هەڵدەگرت و تەرجەمەم دەکردو بڵاوم دەکردەوە. بەهەر سوورەت ناکرێ بڵێی ئەمن چیرۆکم نووسیوە، چونکە ناچێتە خانەی چیرۆک‌نووسی‌یەوە.

یەکەم‌جار کە ئەمن شتێکی لەو بابەتەم نووسی واتە ئەدەبی ـ سیاسی، ڕووداوێکی واقیعی بوو کە لەمێژ بوو دیتبووم. پاش چەند ساڵان لە ڕۆژنامەی کوردستاندا بڵاوم کردەوە. ناوەکەشی ئەوە بوو: "دەشمان کوژن و جێژنیشمان پێ دەگرن". ڕووداوێکی ژیانی خۆم بوو. ڕۆژی ٢١ی سەرماوەزی١٣٣٨ بوو لە مەهاباد کە عادەتەن لە ئێران ئەو ڕۆژەیان دەکردە جێژن بەناوی ڕۆژی نەجاتی ئازەربایجان. باسی ڕووخانی حکوومەتی نیشتمانیی ئازەربایجانیان دەکرد، کەچی کۆماری کوردستانیان هەر باس نەدەکرد. ئەمن چووبوومە خەیاباتی پزانم وەزع چییە. دیارە خەڵکیان کۆ کردبۆوە بەڵام ئەمن هەر بۆخۆم چووبوومە خەیابانێ. ڕۆژێکی زۆر سارد بوو. لەسەرمان چووم خۆم بە مزگەوتی حاجی سەید بایزی‌دا کرد. مزگەوتی حاجی سەید بایزی، مامۆستا مەلا شێخ عیززەدینی لێ‌بوو، بۆیە زۆرم هاتوچۆ دەکرد. تەماشام کرد پیاوێکی پیری کورتی کە زۆر جارم دەدیت لەوێ دانیشتوە. ئەو کابرایە پەیتا پەیتا ئەو قسەیەی دووپات دەکردەوە کە "بەڵێ، بەڵێ دەشمان‌کوژن و جێژنیشمان پێ‌دەگرن". ئیدی ئەو وەختی ماوەیەک بە دیاریەوە ڕاوەستام و نەمهێشت ئەڵقەی خەیاڵەکەی بپسێ. زانیم دەڵێ چی. لێی گەڕام پاش چەند ساڵان کە ڕۆژنامەی کوردستانمان دەردەکرد، پێم وایە ساڵی ١٣٥٠ی هەتاوی بوو. ئەوەم بە موناسەبەتی ٢٦ی سەرماوەزەوە نووسی. کە دام بە دەستەی نووسەران دوکتور قاسملوو گوتی باشە ئەتۆ بۆ هەوڵ نادەی چیرۆک بنووسی؟ ئەمەت بەشێوەی چیرۆکێک دەرهێناوە. گوتم وەڵڵا وا هاتوە دەنا خۆم بە چیرۆک‌نووس نازانم.

ئەوەش کە ئیشارەت پێ‌کرد، شتێک بوو کە پێم وایە ساڵی ١٣٦٣ یان ٦٤ بوو نووسیم بە ناوی "شەرتی پیاوان". ئەوە جارێکیش کرا بە نمایشنامە. ئەوەش کە وەک جزوەیەک چاپ کرا لە ڕاستی‌دا گێڕانەوەی دوو، سێ ڕووداوی جۆراوجۆر بوو لە ژیانی حیزبایەتی‌دا. بەڵام مۆنتاژ کرابوو. عادەتەن نووسینی ئەدەبی ئەگەر مۆنتاژ کرا هێندێک شاخ‌وباڵی لێ زیاد دەکرێ جا با پیاو چیرۆک‌نووسیش نەبێ. دەنا ئەوە هێندە واقیعی بوو کە هێندێک کەسی شارەزا دەیانزانی ئەمن باسی چی دەکەم. هێندێک لە قارەمانەکانی ئەوشتەی وەک چیرۆک دەرهاتبوو دەناسرانەوە. چون ئەوانە شتێک بوون کە بەچاوی خۆم دیبوومن. مەسەلەن داستانێک دەگێڕمەوە کە جەمعێک پێشمەرگە چووین لەکن کابرایەک میوان بووین کە پەزیرایی لێ کردین. ئەوە هەر بۆخۆم دەگەڵ بووم. پیاوەکە پێم وایە ئێستاش هەر ماوە و لە مەنتەقەی گەورکانە. دەنا لەوێ زیاتر هەوڵی چیرۆک‌نووسینم نەداوە. چونکە چیرۆک‌نووسین ڕەنگە هەر وەک شێعرەکە بێ. چیرۆک‌نووسێکی باش نەدەبووم، پێشم خۆش نەبوو چیرۆک‌نووسێکی خراپ بم. هەرچەند ئەو شەرتی پیاوانە خەڵکەکە پێی خۆش بوو. هەم شیرین بوو، هەم لە ڕووحییاتی خەڵکی نێزیک بوو. نازانم لەوێ بووی یان نا

کە کردیانە شانۆ. پێم وایە لە ٢٦ی سەرماوەزیشدا بوو کە کردیان. بەڵام کەسەوە یەک لەسەر چواری خەڵکەکەی دەگەڵی دەگریان. هەرچەند ئەوانە پیشەیان شانۆگەری نەبوو بەڵام ئەوەندە هەستو سۆزی تێدابوو کە زۆری خەڵکەکەی یان هەر بەتەواوی دەگریان یان فرمێسکیان دەهاتەوە خوارێ.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا وا بزانم لە زمانەوانییش دا دەستت دەروا. گۆیا لە کۆڕی زانیاریی کورد لە بەغدا لە حەفتاکاندا کارت کردوە. پاشکۆیەکیشت لەسەر فەرهەنگی هەمبانە بۆرینەی مامۆستا هەژار نووسیوە. دەکرێ سەرجەم ئەزموونەکانی خۆت لەو بوارەدا شی کەیەوە؟ بۆخۆت دەزانی زمانەوانی بەشێکی تایبەتە لەخوێندنی بەرز، کەچی تۆ بەبێ زانستگا فێری بووی. ئەوە لە چی ڕا هاتوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە وا باشە موبالەغەی تێدا نەکەین. ئەمن لەپێشەوە گوتم خۆم بە ئەدیب نازانم چونکە ئینسانی ئەدیب دەبێ دەرسی زمان بخوێنێ. مەکتەبە ئەدەبی یەکان بخوێنێتەوە و بیانناسێ. ئەمنیش هیچ یەک لەوانەم نیە. ئەوەش کە بروەمە زمانزان پێم وایە ناچێتە خانەی زمانەوانی یەوە، بەڵکوو شتێکی دیکەیە. با بڵێین ئۆگری بە زمانە. مەسەلەن ئەوەی کۆڕی زانیاری، ئەمن قەت وەک کارکردن کارم دەکۆڕی زانیاری دا نەکردوە. نەشبووم بە ئەندامی. ئەمن ئێستێ ئەندامی ئاکادیمیای کوردستانم. ئەو ئاکادیمیای کوردستانە کە لەجێی کۆڕی زانیاری یە. ئەوەی لە بەغدایە بوو ناوی کۆڕی زانیاری بوو. بەڵام ئەوەی ئێستا ناوی ئاکادیمیای کوردستانە. منیشیان کردۆتە ئەندامو وەریان گرتووم. دیارە وا نیە بڵێی دایم کارو یارمەتی وەردەگرم. شتی ئاوا نیە بەڵام وەکوو ئەندام حسابم. ئەو وەختی ئەندام نەبووم.

**عەباس کاردۆ:** باشە ئەوە نیشانەی ئەوە نیە لەو بوارەدا شارەزای؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەبەر ئەوەیە کەمێک کوردی دەزانمو هێندێک ئەزمراتیشم داوە کە وەریان گرتوە. لەوێ کە هاتوچۆی کۆڕی زانیاریم دەکرد هەم لەبەر ئولفەتەکەم بوو، هەمیش زیاتر هێندێک کاری دیکە بوو. ڕووحی شاد بێ دوکتۆر "عەبدوڕڕەحمانی حاجی مارف" کە بۆخۆی زمانناسێکی گەورە بوو، یانی دوکتۆرای دە زماندا هەبوو. دیارە نەک زمانزان چونکە کوردی‌زانی چاک نەبوو، بەڵام وەک قانوونی زمان پێم وا نیە کەسی کورد ئەوەندە قەوانینی زمانی زانیبێ. چەند کتێبێکی نووسیوە. هەموو جارێ کە کتێبەکانی دەنووسین، پاش تەواوبوونی حەتمەن داوای لەمن دەکرد بیبەکەوە پێی‌دا بچینەوە. لەپاشان ئەو قاعیدەی ئەو دەی‌هێنان ئەگەر کەلیماتەکە دروست نەبایە، یان جوان نەبایە یان هەر موڵاحەزەیەکم لەسەری هەبایە دەکرێ بڵێم بێ سێ‌و دوو قبووڵی دەکردن. وەکوو پیاوێکی بەئەخلاقیش، دەگەڵ ئەوەی پێم وایە

کارەکەم چووکەڵە بوو بەڵام لە هەموو کتێبەکاندا نووسیویەتی ئەو کتێبە بە کۆمەگی فلان کەسی پێدا چووەتەوەو بۆ کراوەو تەسحیح کراوە.

یان مەسەلەن ئەوەی باست کرد، ئەوەی حەژاری. هەژار کە هەنبانە بۆرینەی نووسیبوو دوای چاپی جلدی یەکەمی کە پێم وایێ نامەکەشت هەر دیوە ئەودەمی پێکەوە بووین، نوسخەیەکی بۆ ئیمزا کردبووەو بۆی ناردبوومو بۆشی نووسیبووم کە ئەوە یەکەم کارە بەو بەرباڵاوی‌یە دەستی پێ کراوە وەک بناغەی فەرهەنگی کوردی. بۆیە لە خەڵکی دیکەشم داوا کردووە لەتۆش داوا دەکەم کە بی‌خوێنیەوەو ئەگەر شتێکت وەبەرچاو هات کە دەوێدا نەبوو لێی زیاد کەی‌ و بۆم بنێری. ئەوە بوو جلدی یەکەمم خوێندەوە هەر چەند زۆر بەپەلە بوو چونکی بەڕاستی فەرهەنگ بۆ خوێندنەوە نایێ. فەرهەنگ بۆیە دەبێ ئەگەر کەلیمەیەکت لێ حاسیە بوو موراجەعەی پێ‌بکەی‌و دەری بێنی. بەڵام لەبەر خاتری وی خوێندمەوەو بۆشم ناردن. دیارە کاغەزێکی بۆ ناردم کە ئێستاش ماومە ، وا دیار بوو زۆری پێ‌خۆش ببوو. هەم سوپاسی کردبوو، هەم داوای کردبوو کە دووهەمەکەشی بۆ چاو لێ‌بکەم کە بەداخەوە پێش ئەوەی چاپ بێ یان بۆم بنێرێ، بۆخۆی کۆچی دوایی کرد. یانی ئەوانە تاچەند خانەی زمانەوانی‌یەوە، بەڵام لە زمانناسی‌دا لەبەر ئەوەی بۆخۆم شارەزای زمانەکە هەم هێندێک شتی زەریفی زمان دەزانم. کە زۆرجار لە کۆڕە ئەدەبی‌یەکاندا بەشدار بووم ئەوانە کە باس کراون خەڵک وەریان گرتوون.

یان مەسەلەن بۆ خۆم وەک شانازی‌یەکم داناوە کە لە سەرەتای قسەکانیشمدا باسم کرد. ئەو کۆنفرانسەی ڕۆژانی ٢٢تا٢٤ی دیسامبری ٢٠٠٩ لەسەر زمانی یەکگرتوو لە ئاکادیمیای کوردستان گیرا ، وا بزانم غەیری من کەسیان تێدا نەبوو پلەی دوکتورای نەبێ. هەموویان دوکتور بوون. منیشیان کە داوەت کردبوو، ئەمن لە سەرەتای قسەکانمدا گوتم ئەوە شانازی‌یەکی گەورەیە کە لەنێو ئەو جەمعە دام بەڵام هەستیش بە کەمی ناکەم. بەڵکوو هەست بە شانازی دەکەم کە دەگەڵ ئەوەی ئەو پلەیەشم نیە ئێوە بە لایقی ئەوەتان زانیوم کە لەو کۆڕەدا بێم قسەی خۆم بکەم. تەنانەت وایان تەرتیب دابوو کە ئەووەڵین کەسیش کە قسە دەکا ئەمن بم. وا بوو ئەمن هێندێک یادداشتم هەبوون ئەمزانیبوو وا زوو دەست پێ‌دەکا، یادداشتەکانم هەر لەنێو ئۆتۆمۆبیلەکەدا بەجێ هێشتبوون. گوتم ئەمن یادداشتەکانم لێ بەجێ ماون ئەوە ناردوومە بیانهێنن. ئەگەر کەسێکی دیکە قسە بکا باشترە ئەفەری دوای من گوتی ئەمن ئامادەمو ئەو یەکەم قسەی کرد. بەهەر حاڵ ئەمن نە عالمی زمانمو نە زمانەوانم. ئەوەش کە باسی دەکرێ، ئەمن هەمیشە دەڵێم کۆڕی زانیاری یان ئەکادیمیای کوردستان حەق وایە بۆ خزمەتی زمانی کوردی پێک بێ لە زمانناسو زمانزانان. چونکە زمانناس ئەوانەن لە باری عیلمی‌یەوە زمان دەناسنو دەتوانن بچنە نێو وردەکاری‌یەکانی، زمانزانیش بەو تەعبیرەی ئەمن بەکاری دێنم ئەوانەن کە لە دێهاتی گەورە بوونو ڕەنگە هەر خوێندەواریش نەبن بەڵام وشەی

زمانی کوردی باش دەزانن. ئەمن خۆم لەوانە حیساب دەکەم. تەنانەت ئەوە باشە بگوترێ ئەمن زۆر جار لە کاری نووسین و تەرجەمەدا ئەگەر بۆ کەلیمەیەک تێ‌ماوم، بانگی خێزانم کردوە بەجۆرێک لەجۆران دوانەوومە بۆ ئەوەی وەشەی پێنم داخوا کەلیمەیەکی لەو بابەتەی بەزمانەدا دێ یان نا؟ کە جاری وا بووە بە زمانی‌دا هاتووە جاری واش بووە نا. پێم وایە ئەوەی دەبێ لە ئەخوێنەواران وەرگرین.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا هەرچەند پێکت باس کرد داخوا لە کاری ڕۆژنامەگەری‌دا جگە لە ڕۆژنامەی "کوردستان"و ڕادیۆی دەنگی کوردستان کە ساڵانێکی زۆر کارت تێدا کردووە و سەرپەرستیان بووی، لە کوێی دیکە کارت کردوە و بۆ چ بڵاوکراوەیەکی دیکەت نووسیوە؟ دەکرێ باسی بکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ پێم وایە باسم کردن. لە ڕادیۆ و ڕۆژنامەی خۆمان هەر وەک فەرمووت کارم کردوە. هەروەها بڵاوکراوەی نێوخۆیی حیزب "تێکۆشەر" کە بە زۆری کارم تێدا کردوە. بەڵام جگە لەوانە ڕۆژنامەی "هاوکاری" بوو کە ماوەیەکی زۆر یانی ٥،٦ ساڵ کارم تێدا کرد. بۆ زۆر بڵاوکراوەی دیکەش بابەتم نووسیوە. حەتتا ئەو بڵاوکراوانەی دیکەی حیزبی وەک "ئیشک" و "ئاوات" و "ژنان". هەرچەند ڕەنگە ئیعتیراف بکەم کە کەمم لەوانەدا نووسیوە بەڵام بەهەر حاڵ لەوانیشدا نووسیومە. بێجگە لەوە ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی هەبوون و ئێستا هەن لە بەشێکیاندا ئەمن بە جۆرێک لە جۆران بەشدار بووم لە نووسیندا. نێ ئەم دواییانە زیاتری وتووێژە. یانی دەکرێ بڵێم لە ماوەی یەک، دوو ساڵی ڕابردوودا چل، پەنجا وتووێژم لە ڕۆژنامە و گۆڤار و سایتەکاندا بڵاو بوونەتەوە. نووسینیش کەم‌وزۆر هەبوون لە هەموو ڕۆژنامەکانی کە زۆر پڕتیراژن. هەرچەند نووسینی من بەشی هەرە زۆری، زیاتر لە سەدی ٩٥ی یان بەبێ ناوە یان بە ناوی خوازراوە. ئەو وتووێژانە مەعموولەن بۆیەیان دەکەن کە بەناوی خۆم بن. ئەوانە ناوی منیان لەسەر بووە دەنا ئەوی دیکە ناوی منیان لەسەر نەبووە. تەنانەت وا بووە کە ناوی حەقیقیی کەسی دیکەی لەسەر بووە. ئەمن نووسیومە بەڵام بە ناوی کەسی دیکە چاپ کراوە. جارێکی بۆ یەک ڕۆژنامە - ناوی نابەم - دوو جارم شت نووسی. جارێکیان ناوی ڕەفیقێکی دیکەم لەسەر نووسی چاپیان کرد. بەڵام جارەکەی دیکە هەر بۆ ئەو ڕۆژنامەیە تەقریبەن هەر لەو مەجالەشدا، بە ناوی خۆم نووسیم بڵاویان نەکردەوە. وەختێک گلەییم لێ کردن گوتم ئێوە هەڵوێستتان بەرانبەر بە من ئاوا بووە. فڵانە مەتڵەبتان چاپ کرد کە هی من بوو. ئەو ڕووحیشی خەبەردار نەبوو بەڵام بە ناوی ئەوەوە ناردم چاپتان کرد. بەڵام ئەوی دیکە کە بە ناوی خۆم بوو بڵاوتان نەکردەوە.

**هێیاس کارێز:** شارەزاییت بە سەر زمانەکانی دیکە دا چۆنە؟ دەزانم فارسیت زۆر باشە، ئەدی زمانی دیکە دەزانی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** فارسیم باشە بەو شەرتە بە زمانەوە نەبە. چونکی لەهجەم بەحەددی ئەعلا خراپە. بۆ کوردیش بۆخۆت دەزانی قسەکردنم هەر خراپە، بەڵام بۆ فارسی لەهجەیەکی زیاد لە حەددم هەیە. پێشتریش وا نەبووم، بە جحێلی کە پیاو بەکاری دێنا باشتر بوو. بەڵام دوایە کە هێندی لێ‌دوور کەوتوومەوە ساڵێ جارێک داخوا چەند کەلیمەیەکم بەسەر زاری‌دا بێ یان نا. ئەویش نە حوزووری زیهنی هەیە کە کەلیماتەکە بە ڕەوانی بێژم نە لەهجەکە تەواوە. بەڵام لەسەر یەک دەتوانم بڵێم فارسی دەزانم چونکی کە دەنووسم خراپ نیم. لەو لاشەوە بۆ خوێندنەوە حاڵی بوون پێم وایە لە هەموو ژیانمدا هەڵنەکەوتوە لە جوملەیەک حاڵی نەبم. مومکینە کەلیمەم نەزانیبێ‌و کەڵکم لە فەرهەنگ وەر گرتبێ، بەڵام جوملە نا. جگە لەوە زمانی عەرەبی دەزانم. لە باری قەواعیدی عەرەبی‌یەوە دەکرێ بڵێم باش دەزانم. یانی کەم وا هەبووە عەرەبێک قسە بکا و ئەمن هەست نەکەم فلان جوملە یان عیبارەتی بە هەڵە خوێندۆتەوە. ئاوای دەزانم. لە خوێندنەوەدا هیچ موشکیلم نیە. لە حاڵی‌بووندا مەگەر مەسایلی عیلمی‌و ئەوە بێ دەنا موشکیلم نیە. لە نووسینیش تەقریبەن هەر باشم. بەڵام لە قسە کردندا ئەویش هەر لەبەر ئەوەی تەمرینم لە سەری نیە. زۆر موسەللەت نیم. هەرچەند ئەو وەختەی پێویست بووە بە تایبەت لە بواری مەسایلی سیاسی‌دا ئەدای مەتڵەبم کردوە. یانی تەرەفەکان نەک هەر حاڵی بوون تەنانەت لێشم ڕازی بوون. هەر وەکی جارێکی گێڕامەوە ساڵی ١٩٨٢چووبوومە بەیرووت، کاک "سەلاح بەدرەددین" کوردی سووریە کە وەختێکی سکرتێری حیزبێک بوو بەناوی پارتی دێمۆکراتی چەپی کوردی سووریا، هەم شارەزا بوو، هەم بۆ دیداری هێزە سیاسی‌یەکان دەگەڵم دەهات، زۆر دۆست بوو. کە دەیانپرسی بە چ زمانێک قسە بکەین، هەموو جارێ دەی‌گوت "بە عەرەبی‌یەکی شیرین قسە دەکا".

لەوانە بەولاوە زمانێک نیە بڵێم دەی‌زانم. ڕەنگە سەت کەلیمە، دووسەت کەلیمە فەرانسەیی بزانم. یان ئینگلیسی بزانم. کاک "فەتاحی کاویان" کە زۆرجار داوام لێ کردوە ئەگەر مەتڵەبێک هەبە دەگەڵ کەسێک تەرجەمەم بۆ بکا. چونکی ئیستیلاحەکان سیاسین پیاو دەیان زانێ. ئەگەر شتێکی دەقیق تەرجەمە نەکردبێ بە ئینگلیسی، عەرزم کردوە کاکە ئەمن وام نەگوت ئەتۆ وات لێ کرد. جارێ وا بوو سوێندی دەخوارد دەی‌گوت ئەتۆ بەخۆڕایی منیش خۆشت عەزیەت دەدەی. دەنا ئەتۆ ئینگلیسی دەزانی. لە حاڵێک‌دا تەوەڵڵا ڕەنگە هەمووی دوو، سێ جوملە ئینگلیسی بزانم. لە فەرانسەیی‌دا ئاوا کەم نین. لەویان بۆ سەفەر و شتی ئاوا ڕەفعی ئیحتیاج دەکەم. بەڵام ئەگەر بکەومە مەسایلی عومدەوە ئیحتیاجیی موتڵەقم بە موتەرجیم هەیە.

یادی بەخێر کریس کۆچێرا جارێکی پێی گوتم ئەتۆ لە کوردستان فەڕانسەیی دەزانی، بەڵام لە فەڕانسە نایزانی. دەلیلەکەشی ئەوە بوو کە دەهاتە ئێرە ئەمن کەس نەبوو تەرجەمەم بۆ بکا. هەر بۆیە بۆخۆم قسەم دەگەڵ دەکردو ئەویش کۆمەگی دەکردم. بەڵام لەوێ کەسێک هەبوو تەرجەمەم بۆ بکا. بۆیە بۆخۆم ڕاستەوخۆ قسەم نەدەکرد. یان هەر پارەکە ئەو "کارۆڵ پرووتەوویێر" کە ئەو کتێبەی لەسەر دوکتور قاسملووی نووسیوە، هاتبوو بۆ ئێرە. ئەو بۆخۆی وێنزوئێلاییە و زمانەکەی ئیسپانیۆلییە. بەڵام هەم فەڕانسەیی باش دەزانێ هەم ئینگلیسی. ئەوەندەی پێکەوە دەبووین بە فەڕانسەیی قسەمان دەکرد، ئەوی ئەم دەزانی ئەو بۆی ڕاست دەکردمەوە. بەڵام بەهەر حاڵ ناتوانم بڵێم دەیزانم.

**عەباس کاردۆ:** دەڵێن ماموستا لە ژیانی سیاسی و خسووسیی خۆیدا شانسی زۆری هەبووە. تۆ دەڵێی چی؟ باوەڕت بە شانس هەیە؟ ئەگەر هەتە پێت وایە کەسێکی بەشانس بووی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو شتەی پێی دەڵێن شانس باوەڕت پێی هەبێ یان نەبێ، ئەوە هەیە. ئەمن پێم وا نیە شانسی بەو جۆرەم هەبێ کە باعیسی ناسرانم بووبێ. لە ژیانی خسووسیدا کە چ عەرز کەم، پێم وا نیە شانسێکم بەنسیب بووبێ. دیارە لە باری سیاسییەوە ئەوەی بە شانس دەزانم کە دەگەڵ ئەوەی پەروەردەی دێیەکی چکۆلە بووم، بەڵام لە دنیای سیاسەتو جامیعەو تەدەمیدا جێگایەکم بۆ خۆم کردۆتەوە ئەوە بۆخۆی شانسە. بەڵام لە نێو کوردەواریدا شانس زۆرجار بەوەی دەڵێن کە بۆی ڕێ دەکەوێ. ئەوەی دەڵێن: بۆ هاری، هەر دەباری. ئەوە زەربولمەسەلێکی کوردییە. ئەمن بەو مانایە خۆم بە ساحێبشانس نازانم. یان ڕەنگە ئەوە کەمێک بە قازانجی خۆم بێ ئەو قسەیە، یان بێ ئەدەبی نەبێ تاریف لەخۆم بێ، پێم وا نیە ئەوەی پێم دراوە لەبەر شانس بووە. مەسەلەن ئەمن بوومە ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی. پێم گوتی، بە ئیمانیشەوە گوتم. هەر وەختێکی ئەمویستوە - کە زۆر وەختیش هەر نەمویستوە - ببمە ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی، دەلیلی ئەساسی ئەوە بووە کە پێم وا بووە ئەمن زانایی و لێوەشاوەیی و توانای پێویست بۆ ئەو کارەم تێدا نیە. بەڵام پێم وا نیە ئەوەی بە شانس حیساب بکەم. چونکی لەو کۆمەڵەدا کە تێیدا بووم ڕەنگە چەند کەس لە سەرەوەی من بووبن بەڵام چەند کەسیش لە خوارەوەی من هەبوون. ئەو وەختە دەتوانی بڵێی ئەوە شانسی هێنا بوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کە خەڵکەکەی دیکە هەمووی لەو بەتواناتر بن. یانی هەر وەکوو کوڕو کەچەڵەی ئاشەوانی بازی ئیقباڵی لەسەر نیشتبێ. ئەمن بەو ئەندازەیە خۆم بە بێتوانا نازانم کە بڵێم ئەوە شانس بووە. جا نازانم ئەوانەی پێیان وایە ئەمن خۆشبەشانسم، خۆشبەشانسییەکەم لە چیدا دەبینن؟

**عەباس کاروخ:** دیارە ئەمن بۆخۆم زۆرم باوەڕ بە شانس نیە. ئەوە ھەوڵی ئینسانە کە بە جێگایەکی دەگەیەنێ. بەڵام باسەکە ئەوەیە دەبینی ڕەوتی ڕووداوەکان وا دەکا کە ئەتۆ دەگەڵی بچیە پێشێ و مەجالێکت بۆ بکرێتەوە کە تێی‌دا سەرکەوی. جاری وایە تواناو لێزانیشت ھەیە بەڵام مەجالێک نیە خۆتی تێدا تاقی بکەیەوە.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە لەو حاڵەتەدا کە کابرا توانای پێویستی بۆ کارێک ھەیەو دەستی دەکەوێ، ئەوە شانس نیە. ئەوە تەبیعی‌یە. ئەگەر وەدەستی ناکەوێ ئەوە پێی دەڵێن بەدشانسی. مەسەلەن کابرا دەچێ بلیتی بەختئەزموون دەکرێ. کە بۆی دەرچوو دەکرێ بڵێی شانسە. چونکی لە نێو خەڵکەکەی دیکەدا شتێکی زیادی نیە. ئەویش ھەر بلیتەکەی بەو قیمەتە کڕیوە کە خەڵکی دیکە کڕیویانە. دەنا کابرا چووە لە دانیشگا دوکتورای وەرگرتوە، ئەوە بۆ شانسە. ئەوە ھیچ شانس نیە. یان کابرا گەنجینێک دەبینێتەوە یان خێری وەڕێگایە دێ ئەوانە شانسن. ئەمن پێم وایە دەکرێ دە شتێک‌دا بڵێم شانسم ھەیە. وەکوو حەقێکیش بێ ئەدای دەکەم. دەگەڵ ئەوە کە گیروگرفت ھەر ھەیە، بەڵام ئەمن لە بنەماڵەدا خۆم بە ساحێب‌شانس دەزانم. کوڕم ھەن و کچم ھەن. زاوام ھەن و بووکم ھەن. لە ھەموواتیان ڕازیم. چونکی بەخۆشی‌یەوە ھەموویان لەنێو خەڵکی جێگەو پێگەیان ھەیە. کۆمەڵایەتین و خەڵک خۆشی دەوێن. دەگەڵ منیش وەک بابو خەزوور، ھەر چوار لایان باشن و بە مەحەببەتن. لێرە ھەم حەقی وان دەدەم ھەم ئەوەش قبووڵ دەکەم کە ئەوە شانسێکە کە ھەمە. ئەوە ھیچ ئیرادەی خۆمی تێدا نیە. بە تایبەتی ئی بووک و زاوایان ئیرادەی منی تێدا نیە. ڕەنگە کەم-وزۆر تەربیەتی منداڵەکان نەخشی منی تێدا بێ. مەحەببەتم پێ کردوون، مەحەببەتیان پێ کردووم. بەڵام بۆ ئەوانی دیکە ڕەنگە بچێتە خانەی شانسەوە.

**عەباس کاروخ:** تۆ کتێبی "دان چەرموو"ی "جەک لەندەن"ت لە فارسی‌را وەرگێراوەتە سەر زمانی کوردی. ئەو کتێبە ئەزموونێکی ناخۆشی بۆ تۆ ھەبوو. دەکرێ لەو بارەیەوە بدوێی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەزموونە ناخۆشەکە یەکێک لەوانەیە دەبێ بخرێتە خانەی بەدشانسی‌یەوە. ئەمن کە لە دەفتەری سیاسی بووم، کاک حەسەنی شیوەسەڵی کە یەکێک لەوەی ڕەفیقی حیزبایەتی و فەقێیایەتی و ئەوانەم بوو، ژێرپاشم بوو. ئەو کە لە مەنتەقەی سەردەشت بوو و دەگەڵ خەڵکی تەماسی ھەبوو، داوام لێ کرد بنێرێ ئەو کتێبەم بۆ بێنێ. ئەو کتێبەی ھەر بۆ ئەناردم لەپاشان لە ڕێگایەکی دیکەوە کتێبەکەم دەست کەوت، نەک ھەر دەستم کەوتبوو تەنانەت زۆریشم لێ تەرجەمە کردبوو. دوایە کە ئەوە بێ‌خەبەر لە یەکترین ئەو کتێبەیان کە وا دیار بوو ئەوانەی ڕای ئەسپاردەبوون پیاوی دوژمن بوون، بە دوژمنیان گوتبێ کە ئەو کتێبە بۆ فڵان کەسی دەبەن. ئەو کتێبەیان بۆ بۆمبڕێژ کردبوو، یانی نێوەڕاستەکەی ھەمووی بۆمب بوو.

ئەوەیان بۆ کاک حەسەنی شێوەسەڵی ناردبوو کە بەداخەوە دەستی‌دا تەقیەوە کە بوو بە هۆی لەدەستدانی هەردووک دەستی‌و هەردووک چاوی. ئەوە بیرەوەری‌یەکی زۆر تاڵە. بەڵام هەر ئەو وەختی کە ئەوە بوو ئەمن کتێبەکەم ڕەنگە زیاتر لە نیوەی تەرجەمە کردبوو. سەیرەکەشی دەوەدا بوو ئەو کتێبە دوو تەرجەمەی هەبوون، یەکیان هی موحەممەدی قازی بوو. ئەمن کە دەمزانی تەرجەمەی موحەممەدی قازی باشە دەوای ئەوەم کردبوو. کەچی ئەوەی بۆ کاک حەسەنی شێوەسەڵی هاتبوو، لە بنی‌ڕا ئەوەش نەبوو. پێشم وایە ئەوەیان بۆیە هەڵبژاردبوو چونکی ئەوەی موحەممەدی قازی بەرگەکەی بەرگێکی عادی بوو. بەرگەکەی نەرم بوو، بۆ بۆمب گوزاری نەدەبوو. ئەوی دیکە ئەگەر بە سەهوو نەچوویم، ڕەنگە زۆر دڵنیا نیم. تەرجەمەی کەسێک بوو بەناوی 'داریوش شاهین" کە جلدەکەی مقەبا بوو. ڕەق بوو. بۆیە بە عەمد ئەوەیان هەڵبژاردبوو کە بۆ مەلا حەسەنی بنێرن. دەنا لەجێدا ئەگەر ئەو کتێبەم بۆش هاتبایە هەر نەمدەویست. چونکە بۆخۆم یان پێم گوتبوو یان بۆم نووسیبوو چاکم لەبیر نیە، کە سپید دندان لە نووسینی جەک لەندەن تەرجەمەی موحەممەدی قازی. چونکی لە ماوەی ژیانی موحەممەدی قازی‌دا هەر شتێکی ئەوو کەسێکی دیکە تەرجەمەیان کردبێ، نەک هەر ئەمن پێم وا بێ هەموو ئێرانی‌یەک تەرجەمەکەی موحەممەدی قازیی پێ باشتر بووە. موتەرجیمێکی زۆر بەتوانا بوو. داستانەکە ئەوە بوو. حادیسەیەکی زۆر تاڵ بوو.

ئەمن بەفکریشدا هات کە کتێبەکە بڵاو نەکەمەوە. لەپاشان گوتم ئەوە کەمێک عەوامانەیە. جەک لەندەن چ خەتایەکی هەیە؟ مەتڵەبێکی جوان چ خەتایەکی هەیە کە بڵێی چونکە شتێکی وا بووە چاپی ناکەم. تۆزێک منداڵانەو عاتیفی‌یە. بۆیە کتێبەکەم تەواو کردو دوایەش بڵاوم کردەوە. چونکی پێم وایە یەکێک لە کارە جوانەکانی دنیای نووسینە. خەلاقییەتێکی یەکجار زۆری تێدایە. فکرێکی یەکجار بەرزی تێدایە. ئەمنییەتێکی یەکجار زۆری ئەخشی پەروەردەی نیشان داوە. پێم وایە بۆخۆشت کتێبەکەت خوێندۆتەوە.

**عەباس کاروخ:** کەی‌و چۆن دەستت بە وەرگێڕانی کتێبی 'کوردستان‌و کورد'ی دوکتۆر قاسملووی کرد؟ ئایا ئەوە یەکەم ئەزموونی وەرگێڕانت بوو یان پێشتر کاری دیکەت کردبوو؟ پێشوازیی خوێنەران لە کتێبەکەو بە تایبەت لە وەرگێڕانەکەی چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کتێبەکە ئاخری ساڵی ١٣٥١ دەست بە وەرگێڕانی کرا. بۆ کۆنگرەی ٣ کە لە سەرەتای پاییزی ١٣٥٢دا دەستی پێ کرد، لە چاپ هاتە دەرێ‌و وەکوو دیاری درا بە ئەندامانی کۆنگرە. ئەوە یەکەم کاری من نەبوو. پێم وایە جارێکی دیکەشم باس کرد، پێشتر کارێکی چووکەڵەی دیکەم کردبوو. ئەو "واقعیت خلقهای ایران و افسانه م. ماکان"م تەرجەمە کردبوو کە جزوەیەکی چووکە بوو بە فارسی نووسرابوو. بەڵام وەکوو کتێب وەکوو کارێکی قورس یەکەم کارم بوو. دیارە ئەمن ناوی کتێبەکەم بیستبوو. زۆر بەتاسە بووم کە بە زمانێک بێ کە ئەمن تێی بگەم بە فارسی یان عەرەبی. حەتتا پێش ئەوەی دوکتۆر قاسملووی

ببینم ناوی کتێبەکەیم بیستبوو. کە یەکترمان بینی، پاش ماوەیەک نوسخەیەکی لە عەرەبی‌یەکە وی‌داموخوێندمەوە.

تەرجەمەی کتێبەکە بەڕاستی دژوار بوو، ڕاستە عەرەبیم دەزانی. بەڵام چاپێکی زۆر خراپی هەبوو. زۆر تێک‌چووبوو. غەڵەتی زۆر تێدا بوون. جاری وا بوو بەشێک لە مەتنەکەی ببوو بە حاشیە. جاری وا بوو حاشیە چووبووە نێو مەتن. لەو بارەیەوە زۆرجار تووشی ئیشکال دەبووم. لەوانەیە بڵێم ئەگەر دوکتۆر قاسملوو بۆخۆی لەوێ نەبایە، ئەو موشکیلاتە قابیلی حەل نەبوون یان هەرنەبێ گران حەل دەبوون. بەڵام کە شتێکی وام بۆ دەهاتە پێش و نەمدەتوانی بەئاسانی حەللی بکەم، موراجەعەم پێ‌دەکردو ئەویش ئەو وەختی عەرەبیی زۆر کەم دەزانی. بەڵام کە دەی‌خوێندەوە لە مەتڵەبەکە حاڵی دەبوو. ئەوەندەی عەرەبی هەر دەزانی. بۆیە پێی دەگوتم ئەوە هەڵەیەو دروستەکەی ئاوایە. بە هەرحاڵ دەگەڵ ئەوەی کاری دیکەشم هەبوو، کاری حیزبی‌و کاری ڕۆژنامەنووسییشم هەبوو، بەڵام هێندەم تولفەت پێی هەبوو کە تەرجەمەم کرد. دەسخەتەکەی من بە کاغەزیA4 ببوو بە ٣٠٠ لاپەڕە. لە حەفتەی یەکەمی‌دا ١٠٠ لاپەڕەیم تەرجەمە کرد. هەرچەند کارێکی گران بوو لە عەرەبییەوە. دوایە هەر بێ‌ئەوەی پاکنووسی بکەینەوە، ئەوەمان دا بەچاپ. کتێبەکە دوکتۆر قاسملوو فەسڵێکی لێ حەزف کرد. فەسڵێک کە لە عەرەبی‌یەکەی تێیدا نەبوو. چونکی کتێبەکە بەینی ١٩٥٧ و ٦٢ی نووسراوە. ئەو فەسڵەی هەر تێدا نەبوو. بەڵام دوایە بۆ چاپی عەرەبی‌یەکەی فەسڵێکی بۆ نووسیبوو بە ناوی: بزووتنەوەی کوردو دەوڵەتی عێراق. لەوێ‌دا زۆری باسی بزووتنەوەی کورد کردبوو، دیارە هەملەشی کردبوو سەر عێراق‌و ئەو دەوڵەتەی مەحکووم کردبوو. هەرچەند ئەمن تەرجەمەم کرد، بەڵام لە چاپی کوردی‌یەکەدا ئەو فەسڵەی دەرێنا، هەم بە دەلیلی ئەوەی لە سەرەتاوە تێی‌دا نەبووە، هەم لەبەر ئەوەی کە داوای کردبوو گوتبووی کتێبێکی ئامادەم هەیە بۆ چاپ، گوتبوویان ئێمە بۆت چاپ دەکەین. کاقەزیان بۆ چاپخانەیەک نووسیبوو کە ئەو کتێبەی چاپ کەن بەبێ ئەوەی بدرێ بە ڕەقابە. ئەوە لەحاڵێکدا بوو کە هەموو شتێک دەدرا بە ڕەقابە. هەربۆیە دوکتۆر قاسملوو گوتی مادام ئەوان بەبێ ڕەقابە کتێبی من چاپ دەکەن دەبێ ئەمن ڕەقابە لەسەر خۆم دانێم. حەق نیە بە ئیمکاناتی وان بە ئیجازەی وان لە وڵاتی وان بە پارەی وان کتێبەکە چاپ کەم بەدژی ئەوانیش بێ. بۆیە ئەو بەشەی حەزف کرد.

کتێبەکە زوو کەوتە بازاڕەوە. دیارە کتێبەکە کتێبێکی عیلمی بوو. کتێبێک بوو کە لە هەموو جێیەک‌و بە هەموو زمانەکانی خەڵک پێشوازی‌یان لێ‌دەکرد. چەند جومڵەیەکمان لە نووسەران‌و سیاسەتمەداران هێنابوو کە تاریفی کتێبەکە دەکەن. بۆیە حەتمەن دەبوو ئیستیقباڵی لێ بکرێ. پێم وایە خەڵک لە کوردی‌یەکەشی ڕازی بوون‌و لەڕاستی‌دا خەڵک لەوێ‌دا دەگەڵ زمانی کوردیی نووسینی من ئاشنا بوون. بۆیە دواتر کە

شتێکم تەرجەمە دەکرد. هەر ئەوە کە خەڵکەکە دەیانزانی ئێ منە پێشوازییان لێ‌دەکرد. یانی کارێکی باش بوو.

**عەباس کاردۆ:** ئەو بەشەی دەفەرمووی لاچوو، دوایە دانەنرایەوە لە چاپەکانی دیکەدا؟
**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** نەخێر دانەنرایەوە. تا ئێستا دانەنراوەتەوە.

**عەباس کاردۆ:** ئەشماوە وەک سەرچاوەیەک یان شتێک کە خەڵک ئەگەر ویستی چاوی لێ‌بکا؟
**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** لە نوسخە عەرەبی‌یەکەی‌دا هەیە.

**عەباس کاردۆ:** بەڵام تۆ کردووتە کوردی کە ئێستان نەخستوە.
**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** یەکێک لە کارە خراپەکانی من ئەوەیە کە هیچ شتێکم نەماوە. ڕەنگە هیچ موبالەغە نەبێ کە ئەمن ٤٠٠٠ مەقالەم نووسیوە. کەچی دەستخەتی یەکێکیانم نیە. چاپکراوی پێنجیانم نیە. ئەوە کە دە ڕۆژنامەی کوردستاندا هەن یان ڕۆژنامەی دیکە، خۆ ئەمن ئەوانیشم هەموو ڕانەگرتوون. هەر شتێکم چاپ کردوە هەر دوای چاپ، دەستخەتەکانم فڕێ داون. بۆیە هەموو جارێ باسی دەکەم بۆ ئەوەی خەڵکی دیکە وەک من نەکەن و دەرس وەربگرن. چونکە کارێکی خراپە.

# پێوەندیی ح.د.کو پارتی دێموکراتی کوردستان

**عەبباس کاوەزۆ:** مامۆستا دەگەڕێینەوە نێو ڕووداوەکانی حیزبەو دەمەوێ بەیەکەوە بچینە نێو باسێکی یەکجار هەستیارو ناسک. دەبێشدا پێویستە ئەوەی بڵێم مەبەست لە هێنانەبەرباسی ئەو بابەتە تەنیا باری مێژوویی مەسەلەکەیە. دەزانم ئەگەر وەک سیاسەت چاو لە مەسەلەکە بکەین ڕەنگە نە کاتی ئەوە بێ‌و نە پێویست بێ بە وردی بچینە نێوی. بەڵام مێژوو حوکم دەکا ڕووداوەکان چۆن بوون ئاوا باس بکرێن بۆ ئەوەی نەسلی دوای ئێمە ئەزموونیان لێوەرگرێ. من وەک کوردێک زۆر حەز دەکەم بزانم ڕووداوەکانی دەورووبەرم چۆن ڕابردوون. تکایە یارمەتیی نەسلی نوێ بدە لە ڕابردووی گەلەکەی باشتر حالی بێ.

* یەکەم، تۆ لەسەر پێوەندیی مەلا مستەفای بارزانی دەگەڵ قازی موحەممەد چی دەزانی؟ هێندێ لایەن باسی قەدرگرتنی بارزانی لەلایەن قازی موحەممەدەوە دەکەن‌و کەسانێکیش باسی ئەوە دەکەن قازی زۆر بە بوونی بارزانی لە مەهاباد خۆشحاڵ نەبووە. زانیاریی تۆ لەو بارەیەوە چۆنە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە مەسەلەیەکی یەکجار ئاڵۆزە. ئەوەی لە حەقیقەتێکی تاریخی پیاو دەیزانێ ئەوەیە کە مەلا مستەفاو بارزانی‌یەکان وەختێک لە ئاکامی هێرشی دەوڵەتی عێراقو حەملەی هەوایی ئینگلیسدا تەنگیان پێ‌هەڵچنراوە هاتوون وەکوو پەنا، پەنایان بۆ کوردستانی ئێران هێناوە لەو وەختەدا دیارە کۆماری کوردستان هێشتا دانەمەزراوە، پێشوازی‌یەکی کە پێشەوا قازی موحەممەدو دامودەزگا حکوومەتی-یەکەی کە جاری دەکرێ بڵێین حکوومەتی میللیی کوردستان یان حکوومەتی قازی موحەممەد لە مەلا مستەفایان کردوە، بۆتە شتێکی گەورەو لە تاریخدا تۆمار کراوە. تەنانەت ئەمن لە شارەزایانی ئەو وەختەم بیستوە کە بە پێشەوایان گوتوە ژن‌و منداڵی بارزانی‌یەکان لەباری لیباسەوە پێڵاوەوە وەزعیان زۆر خراپە . پێشەوا وای کردوە دوو ڕۆژ سێ ڕۆژان ڕاوەستن هەتا بە کۆمەگی خەڵکی مەهاباد لیباس‌و کەوشیو ئەوانەیان بۆ بچێ. گوتوویەتی نایێ وەختێک وارید دەبن خەڵکی ئێرە بە ڕووتوڕەجاڵی‌و لێقەوماوی‌یان ببینن.

ئەوە لایەکی مەسەلەکە. لایەکی دیکەی ئەوەیە کە مەلا مستەفاو بەتایبەتی ئەو کەسە شارەزایانەی دەگەڵی بوون وەکوو ئەفسەرەکانو مامۆستاکان ئەوەی لە توانایاندا بووە لەخزمەت دامودەزگای جمهووری‌یان هاویشتوو خزمەتی خۆیان کردوە. لەو لاشەوە کۆماری کوردستان یان جمهووریی کوردستان - چونکی

ناوەکەی جمهوریی کوردستان بوو ــ. فەرقی پێ نەکردوون. مەسەلەن مەلا مستەفای کردۆتە فەرماندەو بە پێی ڕیوایەتێک وەختێک فەرماندەی کوللی قواش بووە. ئەمن بە تەواوی ئەوەم بۆ سابیت نەبووە کە فەرماندەی هەموو هێزەکان بووبێ. پاشان ٤ کەس دەرەجەی ژەنەڕاڵییان وەرگرت کە یەکیان مەلا مستەفا بوو. حەمە حوسێن خان، حەمە ڕەشید خانی بانێ، عومەرخانی شکاک و مەلا مستەفا. یانی لەوەشدا فەرقی پێ نەکراوە.

لەوەدا شک نییە کە مەلا مستەفا پیاوێکی زۆر مەحکەم بوو. زۆر باوەڕبەخۆ بوو. بەڵام لەعەینی حاڵیشدا پیاوێک بوو کە کەسی لە سەرووی خۆیەوە نەدەدی. لە ژیانیدا کەسی لە سەرووی خۆیەوە نەدیوە. وەکوو دەزانین قازی سەرکۆمار بووە. ئەو لە باشترین حاڵەتدا ژەنەڕاڵێکی باشی حکوومەت بووە. ڕەنگە نەوعێک حەسوودیی هەبووبێ. مەسەلەن ئەمن بۆخۆم ڕەنگە تەحلیلێکی عیلمی نەبێ بەڵام پێم وایە ساڵی ١٩٧٥ مەلا مستەفا بۆیە دەستی لە موقاوەمەت هەڵگرت چونکی بۆخۆی پیر ببوو. ئەمن نەمدەزانی، ئەتۆ نەتدەزانی، بەڵام بۆخۆی دەیزانی کە نەخۆشیشە، سەرەتانی هەبوو. باوەڕیشی بەوە نەبوو کەس بتوانێ کارێک بکا. یانی ئەوە ئەمن ڕاستەوخۆ لە زمانی خۆییم نەبیستوە، بەڵام مەشهوورە گوتوویەتی کورد پیاویان نییە. ڕستەیەک کە لەویان گێڕاوەتەوە ئەوەیە کە: "خودێ مرۆ د کوردادا نینە". یانی کەسی بە لایقی ئەوە نەزانیوە کە کارەکەی پێ بسپێرێ.

لە ڕۆژانی پاش تەواوبوونی کۆماری کوردستان و گیرانی قازی موحەممەدو ڕۆیشتنی بارزانییەکان ئەوە دوو سێ داستان زۆر دەگێڕنەوە. کە گۆیا بارزانی چۆتە لای پێشەواو گوتوویەتی وەرە با بڕۆین. ئەوەیان تەقریبەن ئەسڵی قەزیەکە بۆمن سابیتە. قازی دەگەڵی نەچووە. بۆیەش نەچووە ئەمن پێم وایە چونکی قازی وەکوو مەلا مستەفای نەبوو کە خاوەنی ٢٠٠٠ تفەنگچی بێ. دیارە هێندێک لە خەڵکەکەی ناردنەوە. بەڵام هەر ئەوەی دەگەڵی ڕۆیشتن ئەرقامی جۆراوجۆر هەیە، پێم وایە لانی کەم ٥١٤ کەسی دەگەڵ ئارا بووە کە لە چۆمی ئاراسی پەڕیونەوە. هەمووشی هێزی لاو و کارکردوو کارکوشتەو فیداکارو موتیع. بەڵام قازی موحەممەد کەسی دەگەڵ نەبوو. قازی موحەممەد ئەگەر دەگەڵ مەلا مستەفا چووبایە، - شتەکانی دیکە با وەلا نێین- ئیدی ئەوکات سەرکۆمارێک نەدەبوو، کابرایەک دەبوو بێدەسەڵات کە هیچی بەدەستەوە نییە، هیچ وەزیفێکیشی نییە. لەحاڵێکدا نەڕۆیشتنی قازی موحەممەد قسەی دیکەی لەسەر هەیە. ئەوە دەلیلی دیکەی هەیە. قازی بۆخۆی گوتوویەتی ئەمن مەسئوولییەتی هەرچی گوزەراوە وەعۆدە دەگرم. تەعبیرێکی لێ دەگێڕنەوە کە ئینشەڵڵا وای نەگوتوە. ئەوە کە گوتوویەتی: خۆم بە قوربانی منداڵە سابڵاغییان دەکەم. هیوادارم گوتبێتی خۆم بەقوربانی میللەتەکەم دەکەم. پێم خۆش نییە وای گوتبێ. بەڵام تەعبیرەکەی وا دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی خۆم بە قوربانی منداڵە سابڵاغییان دەکەم با کەس نەکوژرێ. بەهەر سوورەت

عیبارەتەکە هەرچی بێ قازی موحەممەد گومانی لەوەدا نەبووە کە دەوڵەتی ئێران لەوی خۆش نابێ. ئەو دەیزانی دەکوژرێ بەڵام گوتوویەتی هەموو مەسئولییەت وەئەستۆ دەگرم با خەلک نەکوژرێن ئەمن بکوژرێم. هەرواش بوو. لە ئازەربایجان بەپێی ئامارێکی ئاڕەسمی نیزیک بە پازدە هەزار کەس کوژران. خەلک لێیان دانو کوشتیان. دەوڵەت تەشویقی کردو ئەو. بەڵام قازی لە زەمانی حکوومەتەکەیدا وای ڕەفتار کردبوو کە خەلکەکە پەلاماری سەرانی جمهوریان نەدا. لەپاشانیش دەوڵەتی شاهەنشاهی کە تێیدا کوشتی دەگەڵ دوو هاوڕێیەکەی، سەدری قازیو سەیفی قازی، چوار ئەفسەرەکە کوژران شەهیدانی بۆکانو شەهیدانی سەقز. یانی هەمووی پێم وا بێ حدوودی ٢٠ نەفەرێک ئیعدام کران. دیارە ئەوە زۆرە، ٢٠ کەس ئەویش لە بژاردەکان کەم نیە. بەڵام لە بەراورد دەگەڵ ئەوڕۆژدا کە ١٥٠٠٠ کەسەو بەنایەتی کە خەلک پەلاماری ڕێبەرانیان دا، فەرقێکی یەکجار زۆری هەیە. جا ڕەنگە ئەوە بێ.

پاشانیش لە ڕیوایاتدا هەموو شتێکم دیوە گوێ لێ بووە، کە ناخۆشی ویستوە. کە پێی خراپ بووە. بەڵام شتی ڕەسمی ئەوەیە کە هەم قازی ئیحتیرامی وی گرتوە، هەم ئەو ئیحتیرامی قازیی گرتوە. زۆر جاریش دەبینین ئیحتیرامی دوولایەنە هەیە بەڵام خۆشەویستی لە بەینێدا نیە. لە عالەمی سیاسەتیشدا ئینسانەکان مەجبوور نین ئاشقی یەکتر بن. بەلکە مەجبوورن هاوکاریی یەکتری بکەن. دوو دەوڵەت لەبەر ئەوەی جیرانن‌و پێوەندیی دوولایەنەیان هەیە، حوستی هەمجەواری نیشان دەدەن. ئەوانە حوکم نیە عاشقی یەکتری بن یان دۆستی یەکتری بن. دەکولدا ئەمن پێم وایە پێوەندیی بارزانی‌و پێشەوا قازی، پێوەندییەکی تێکەڵ بە ئیحتیرام بووە. یانی خەلک ئەوەی لێ نەدیوە کە ئەوانە ڕقیان لە یەکترو یەکتری دەشکێنن. ئەگەر دەباتێندا شتێک گوزەراوە، یان دە دڵیاندا جۆرێکیان فکر کردۆتەوە، ئەوە نایێتە قاعیدە.

**عەباس کارەوز:** دیارە لەم دوایییانەدا کتێبێک بڵاو بۆتەوە بەناوی "پس از شصت سال" بە زمانی فارسی لە سەر ژیانی مام جەلالی کەسێک بەناوی "عرفان قانعی فرد" بڵاوی کردۆتەوە. لەوێدا هێندێک بەڵگەی جۆراوجۆر دێنێتەوە کە دەبێ شووڕەوی لە بارزانی بە شک بووبێ کە گۆیا ئینگلیس ناردوویەتی. ئەوەشی بە گوێی قازی موحەممەدی هەڵێناوە کە ئەو پیاوی ئینگلیسەکانە. هەر بۆیە هەتا ماوەیەک شکیان لێی بووە.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەوەی دەڵێن. بەڵام حەتتا ئەگەر ئەوەی قبووڵ کەین شووڕەوی بە شک بووە سەرانی شووڕەوی زۆر لە هەڵەدا بوون. ئاخر مەلا مستەفا لە دەستی بۆمبارانی ئینگلیسان هەڵاتو عێراقی بەجێ هێشتە ئەوە چیی بەسەر چییەوەیە. هەموو ئەو شتانە گوتراون. زۆرم لەو شتانە خوێندووەتەوە کە لەو پێوەندی-یەدا گوتراونو نووسراون. ئەمن گوتم ئەوەی بۆخۆم تێی گەیشتووم ئەو ئیحتیماڵە هەیە کە مەلا مستەفا کەسی لە سەرووی خۆی نەدەدی. جا ڕەنگە لە دڵەوە بەوەی ڕازی نەبووبێ کە قازی موحەممەد سەرکۆمارو

ئەویش ئەفسەرێکی کۆمارەکەی ویە. بەڵام شتی سابیت لەسەر ئەوە نیە کە ئەو دووانە ئەو ڕەقابەتە ئاشکرایەیان لەنێواندا بووبێ، یان مەلا مستەفا لەملاو لەولا بەدگۆیی وی کردبێ. دەنا دەتوانێ خۆشی نەویستبێ، دەتوانێ پێی لایق نەبووبێ. ئەوانە دەتوانن هەبن، بەڵام شتە ڕەسمی‌یەکە هەر ئەوەیە کە ئیحتیرامی دوو لایەنەیان دەبەینەدا هەبووە.

* ئایا ڕاستە قازی موحەممەد ئاڵای کوردستانی تەحویلی بارزانی داوە؟ تۆ هیچت لەو بارەوە بیستوە؟ ئەو ئاڵایەی ئێستا هەڵدەدرێ هەمان ئاڵایە کە قازی هەڵی دەدا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو داستانە، داستانی تەحویلدانی ئاڵای کوردستان زۆر تازەیە. یانی ساڵی پاش جمهوری، دوو ساڵ پاش جمهوری، دە ساڵ پاش جمهوری نەبووە. ڕەنگە سی ساڵو چل ساڵ پاش جمهوری ئەو شتە پەیدا بووبێ. مەلا مستەفا لایقی هەڵگرتنی ئاڵای کوردستان بوو، بەبێ ئەوەی قازی موحەممەد بیداتێ. لەپاشان ئاڵاتەسلیم‌کردن خۆ ئەوە نیە پەڕۆیەکی بداتێ. وا نیە؟ ئێمە زۆر جار دەنووسین ئاڵای دەستی قازی موحەممەد نەکەوتە سەر عەرزی. کەوتە دەستی قاسملوو و شەرەفکەندی‌و ئەم ئەو. ئاڵاتەسلیم‌کردن ئاڵای خەباتە. خۆ بەداخەوە ئاڵای حکوومەت نەبووە. ئاڵای خەبات کێ دای بە قازی موحەممەد هەتا مەلا مستەفاش موحتاج بێ ئەو بی‌داتێ. ئەمن پێم وایە ئەوە شتێکی سەمبولیکە وەک دروست‌کردن دروست کراوە. هیچ پێویست ناکا دروستیش بکرێ. دەلیلەکەشی زۆر ڕوونە. ئەمن ئەو ئاڵایەم کە ئەو دوایی‌یانە دیتیانەوە گۆیا پێشەوا قازی داویەتی بە مەلا مستەفا، لە نیزیکەوە لە دەستی کاک مەسعوود وەرگرتووە تەماشام کردوە. ئەو ئاڵایە ئەوەیە کە ئێستێ هەیە. دیارە چنراوە و ئەو ٢١ پەڕەی کە لە ئاڵای ئێستا داهەن تێی‌دا نین، بەڵام ڕۆژی تێدایە. لەحاڵێکدا لە زەمانی جمهووری‌دا. ئاڵا ڕۆژی تێدا نەبووە. سێ ڕەنگەکە هەر ئەو سێ ڕەنگە بوون بەڵام ئارمی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان عەمەلەن بۆتە بەشێک لە ئاڵای کوردستان وەک گوڵە گەنمەکەو قەڵەمەکەو پێشکی خۆرهەتاوەکە. مەعلوومە کە وابێ وا نیە. هیچ پێویستیش نەبوو ئەوەی بڵێین، مەلا مستەفا لایق بوو ئاڵای خەباتی میللەتی کورد هەڵبگرێ. چونکی ئەگەر قازی موحەممەد ساڵێکی ئەو ئاڵایە پێ‌بوو، مەلا مستەفا پەنجا، پەنجاوپێنج ساڵی پێ‌بوو. دەی کەوابوو ئەوەی ناوێ. پێی ناوێ ئەوەی بۆ ساز کەی. ئەمما ساز کراوە.

* دوای چوونە دەری بارزانی لە کوردستان‌و پەرتەوازبوونی ئەندامانی حیزب بۆ باشوور، پێوەندیی حیزب‌و پارتی کە تازە دامەزرابوو چیی لێ هات؟ ئایا دۆست بوون یان هیچ پێوەندی‌یەکیان دەبەینەدا نەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن لەو بەشەی‌دا بە شێوەی زیندوو بەشدار نەبووم، چونکی ئەتۆ گوتت کە بارزانی لە کوردستان چۆتە دەرێ، یانی چۆتە شووڕەوی‌و عیددەیەکیش لەوانەی مە هاتوونە ئەو دیوەی. ئەمن پێم وایە لەو قۆناغەدا پارتی لێرە ئەو دەسەڵاتەی نەبووە، چونکی پارتی کە دامەزرا پێت وایە چەند دواتر بوو کە جمهوری ڕووخا، هەمووی سێ مانگ، چوار مانگی پێ‌چوو. پارتی لە ٢٥ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٢٥ یان ١٩٤٦دا دامەزراوە. لە ٢٦ی سەرماوەزدا جمهوری ڕووخاوە. یانی چوار مانگ‌و ڕۆژێک. لە زستانی‌دا ئەوانەی ئێمە دەربەدەر بوون، هەر بۆیە ئەوکات لە عێراق پارتی ئەو حیزبە بەربڵاوە نەبووە کە ئێستا هەیە یان دوایە بوو.

بەڵام دەکرێ تەماشای ڕۆژەکانی دواتر بکەین. مەسەلەن لێرە ئەوەی لە تاریخدا بە شۆڕشی ئەیلوول ناسراوە بە سەرۆکایەتیی بارزانی، پێوەندی‌یەکە بەرقەرار بوو لە کوردستانی عێراق. ئەندامان‌و تێکۆشەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانیش کە دەربەدەر بوون‌و هاتوونە ئێرە ئیدی پارتی سەرەڕای هەموو ناڕەسایی‌یەک، پەنایەک بووە بۆ ئەوان. ئەوە ئەو وەختی بووە کە مەلا مستەفا دوای ساڵی١٩٥٨ گەڕاوەتەوە ئیدی پارتی وەزنییە لە عێراق، دەستی دەڕوا. مەلا مستەفاو پارتی دەتوانن لە سەر مونەقەدەراتی هەموو وڵاتەکە تەئسیریان هەبێ.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا مەبەستم لە دوای کۆمارەوە هەتا ٥٨ هیچ شتێک دیار نییە لەو نێوەی‌دا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر شتێکی ئاوا دیار نییە. هەبووە هاتوچۆ هەبووە لە بەینیاندا. مەسەلەن جارێکیان هەیئەتێکی حیزبی هاتۆتە ئەو دیوەی‌و دەگەڵ ڕەحمەتی برایم ئەحمەد قسەی کردوە. ڕەئیسی هەیئەتەکە کاک غەنیی بلووریان بووە. گۆیا کاک غەنی کەلیمەی بوغرەمجی زۆر بەکار هێناوە، بۆیە ناویان لێ‌ناوە بوغرەمج. پێوەندی‌یەکی وا توندوتۆڵ‌و گوڕ و گۆڵ نەبووە، بەو حاڵەش ئەوەندەی ئەمن بیستوومە پێوەندی‌یەکی ناسالم نەبووە.

**عەباس کاردۆ:** ئەدی ئەو مەسەلەی شاپەسەندی‌و ئەوانە کە دێن‌و لێرە چاپخانە دادەمێن‌و کاک غەنی دێ‌و ئەوانە چین؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** باشە شاپەسەندی زیاتر بۆ پارتی کاری کردوە تا بۆ حیزبی دێموکراتی کوردستان، چونکی پسپۆڕی‌یەکی هەبوو، لێرە بۆ ڕۆژنامەی ئەوان کاری کردوە. یانی وەختێکی باش هەبووە بۆ ماوەیەکی زۆر. ئەمن ئەوەم بەشێکی لەبیرە وەک کەسێکی کە ئەندامێکی سادەی حیزبی بووم لە وڵاتدا، کە هەموو کەس چاوی لێرە بوو. مەلا مستەفا زیاتر لە پێشەوا جێگای باس بوو. پێشەوا ببوو بە بەشێک لە

تاریخ شەهید بوو، بەڵام مەلا مستەفا ئوستووری میللەتی کورد بوو. ئومێدی هەموو کورد بوو. مەسەلەن ئێمە لەنێو وڵات بووین و برادەرانی حیزبیش لە کوردستانی عێراق بوون. کە دەگەڕانەوە وڵات ئەووەڵی قسە کەخەڵک لێی دەپرسین بۆ ئەوەی باوەڕیان پێ بکەن ئەوە بوو: مەلا مستەفاتان قبووڵە یان نا. مەلا مستەفا ئێوەی قبووڵە یان نا. ئەگەر مەلا مستەفا قبووڵی بایەن خەڵکیش وەری دەگرتن، دەنا نا. لەسەر برادەرێکی گێڕاومەتەوە ئێستا ناوی نابەم. ئەو برادەرە بۆ ئەوەی خۆی ماقووڵ بکا دەمانچەی چاردەخۆری پێ بوو. قەت دەمانچەی چاردەخۆر نەدیبوو. گوتم ئەو دەمانچەیە چیە؟ گوتی چاردەخۆرە. گوتم پێمخۆشە بیبینم. دایمێ و تەماشام کرد و لێکی دەرهێناو تێکی هاویشتەوە. پاشان گوتم وەڵڵا تاریفەکەی هەڵدەگرێ، دەمانچەی چاکە. گوتی بەشەرەفە، بەشەرەف ئەگەر لەبەر ئەوەی ئەبا مەلا مستەفا لە قەدی خۆی کردۆتەوەو داومیە، هەڵم نەدەگرتەوە. لەحاڵێکدا هەر لەبنی‌ڕا ئەسڵ و ئەساسی نەبووە، پێم وایە مەلا مستەفای هەر نەشدیبوو. یانی دەورانە کە ئاوا بوو.

* یەکەم نیشانەکانی نێوان ناخۆشیی حیزب و پارتی کەی و چۆن دەستی پێ کرد؟ نەخشی دوو لایەن لەو بارەیەوە چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە جاروبار ڕەقابەت هەبووبێ. بەڵام نێوان ناخۆشی کە لە بەینی حیزبی دیمۆکرات و پارتی‌دا پەیدا بووبێ، یانی موقابەلە بووبێ، لە ڕاستی‌دا دەگەڕێتەوە دوای ساڵەکانی شۆڕشی ئێران. ساڵانی ٤٧-٤٦ موقابەلەو بەرەنگاری‌یەک نەبووە. ئەوەی پارتی دیمۆکرات دەگەڵ حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی کرد، کارێکی خراپ بوو بەڵام خۆ یەک‌لایەنە بوو. مەسەلەن ئێمە تەنیا لە کۆنفرانسی دووهەمدا کە گرتمان دوو نامەمان نووسین. یەکیان بە ناوی مەحکەمی سیاسی، یەکیان بە ناوی بارزانی کە ئێستێ لە ئارشیوی حیزبدا ماون. لەوێدا ئیعتیرازمان کرد بەو ڕەفتارەی دەگەڵمان کراوە. دەنا خۆ ئێمە بە نامەیەک یان بە یادداشتێکیش ئیعتیرازمان نەکردبوو. خۆ ڕۆژنامەیەک دەرنەچووە هەتا هێرش بکاتە سەر پارتی کە بۆ وا دەکەی. ئەوانە بە تەواوی یەک‌لایەنە بوون. بەڵام ئیدی لەپاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران و هاتنەسەرکاری کۆماری ئیسلامی، ئەو ڕووداوانە ڕوویاندا. ڕەنگە لەوێ ئەووەڵ حادیسە ئەوە بووبێ کە لە شنۆیە ڕووی‌دا. ئەو وەختی پارتی لە شنۆیە بوو، تەقەیان لە تەزاهوراتی خەڵکی کرد، چەند کەسێک کوژران و بریندار بوون. ئیدی لەوێڕا ناخۆشی‌یەکان پەیدا بوون.

* یەکەم جار ڕێبەرانی حیزب (مەبەست بەشێک لەوانە) بۆخۆیان بڕیاریان دا ڕێبەرایەتیی بارزانی قبووڵ بکەن یان ناچار بەو کارەی کران؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەهیچ جۆر پێم وا نیە ناچاری ئێنا بووبێ. عەرزم کردی لە ئەووەڵەوە وەک سێمبولی موبارزە چاوی لێ دەکرا. قازی موحەممەد نەمابوو. مەلا مستەفا بوو کە وەکوو سێمبولی کوردایەتی دەربەدەر بوو. چووبووە یەکیەتی سۆڤیەتو پاشان وەک قارەمانێک گەڕابووەوە هەر بۆیە خەڵکەکە ئومێدی پێی هەبوو، بەڵام ئەوە شتە سێمبولیکەکەیە. ئەوی دیکە خۆ مەلا مستەفا ڕووحیشی خەبەردار نەبووە کە ئەحمەد تۆفیق لە کۆنگرەی دووهەمدا وەک سەرۆکی حیزب هەڵیبژاردوە، لە پاشانیش بارزانی گاڵتەی پێ کردوە. هەر ئەو نەبوو. هەژاریشی بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژاردبوو. هەژار گوتی بابە ئەمن کوردی ئێران نیم نەک هەر ئەندامی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان نیم. لە کارەکانی کۆنگرەی دوودا عەجایبات زۆرن. مەسەلەن کاک عەزیزی یووسفیو کاک غەنی بلووریانیان بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژاردبوو، هەموو کەسیش دەیزانی. باشە ئەوە فایدەی چی؟ کەسێک لە زینداندایە ئەتۆ هەڵی دەبژێری؟ هەر بۆ ئەوەی زیندانەکەی لێ قورس کەی؟ ئەویش وا بکەی کە خەڵک بزانێ. نازانم هێنیان کردبوو یان نا، پێم وایە ئەویان نەکردبوو، بەڵام هەژاریان کردبوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. ئەندامی حیزب نیە، لە کۆنگرە نیەو دەڵێ ئەمن کوردی ئێرانیش نیم. پێم وایە جەنابی سارم خانی سادقوەزیریشیان هەر هەڵبژاردبوو.

باقی هەمووی لە ڕووی دڵخوازی خۆیانەوە بوو. بێ ئەدەبی نەبێ لە ڕووی کەسێک کە بەداخەوە شەهید بووە، نیشانەی خۆشیرنکردنو خۆڕێشخستنێکی بێ زەرووەتی ئەحمەد تۆفیق بوو.

● شەڕی بارزانی لە دژی خەباتکارانی ساڵەکانی ٤٧-٤٦ شتێک نیە تازە هاتبێتە بەر باس. ئەمن ناهەوێ بچمەوە نێو وردەکاریەکانیو تەنیا پێمخۆشە بزانم کاریگەریی ڕووحیی ئەو ڕووداوە لەسەر باقی تێکۆشەرانی دێمۆکرات چۆن بوو؟ هەر کات دەتان بیست هاوسەنگەرێکتان شەهید بووە یان تەحویل دراوەتە چیتان دەکرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دەزانی چۆنە، با ئەمن نموونەی شتێکی زۆر عادی بێنمەوە. کابرایەک لە دێی مە بوو. زۆری شایی بەخۆی بوو، هەمیشە تفەنگو دەمانچەی هەبوون. کاری قاچاغچێتیشی دەکرد. جارێکی تووشی ژاندەرمان بوو لە نێزیک دێ. دەستی کردەوە بەڵام لە هیچوخۆڕایی تفەنگەکەی ڕاوەستا بوو. لە نەتیجەدا بۆ خۆی بریندار بوو، بە تفەنگو بەبارو هەموو شتێکەوە گیرا. برایەکی هەبوو، پیاوێکی یەکجار زۆر ئازا کە دوایە بوو بە پێشمەرگە. لە پێشمەرگایەتیدا بوو بە سەرلکو شەهید بوو. ئەمن ئەو وەختیدا لە ماڵێ نەبووم، هەر لەدێیدا نەبووم، ئەو برایەی کە هەر وەک گوتم زۆر ئازا بوو دەست بە گریانێکی عەجایب دەکا. مەلای ئاوەدانی دەڵێ کوڕە عەیب کە، ئەتۆ پیاوی بۆ دەگری؟ ئەویش دەڵێ خۆ بۆ عەولای ناگریم. - براکەی ناوی عەولا بوو - بۆ بێدەسەڵاتیی خۆم دەگریم، دوژمنەکەم هێند گەورەیە هیچی دەگەڵ ناکرێ. دەنا ئەگەر کەسێکی دیکە بایە نانم نەدەخوارد هەتا دەمکوشتەوە.

ئەوەش وابوو. خەڵک دەگیرێ، خەڵک تەحویل دەدرێتەوە. مەسەلەن ئەمن بۆخۆم لە کوردستانی عێراق دانیشتبووم. شاهیدم کە پێشمەرگەی پارتی ئەوە لە خاکەکەی مندا دێ بەدێ‌و شاخ بەشاخ‌و دۆڵ بەدۆڵ بە دوای پێشمەرگەی حیزبی دێموکراتدا دەگەڕێ بەبێ سووچ‌وتاوان کە بەخۆشی‌یەوە نەبوو بەشەڕ هەر وەک پێشتر نیشانم پێ‌کرد. بەڵام بێ‌دەسەڵاتی. حادیسەکە چەند تاڵە، ئەو بێ‌دەسەڵاتی‌یە کە تەنانەت توانای ئیعتیرازێکیشت نیە زۆر تاڵترە. مەعلومە شتێکی زۆر ناخۆش بوو. بەڵام هیچ نەدەکرا. ئێستاش هەتا دنیا بە دنیایە هەر تاڵەو پێموایە بۆ ڕێبەرانی پارتییش هەر تاڵە. کاک مەسعوود بارزانی پێموایە دوای کۆنگرەی هەشتیان بوو کە شتێکی نووسی، ئەوەی بە مەرارەتەوە یاد کردەوە، ئەوەی دەگەڵ کوردی ئێران کراوە.

* ئایا ئەو باڵەی حیزب کە لە دەسەڵاتی بارزانی نزیک بوو بەو ڕووداوانە هیچ ئاڵوگۆڕ دە ڕوانگەکانی‌دا پێک نەهات؟ بە گشتی چیتان کرد بۆ ئەوەی فەوڵیی ئەو کارەساتە نیشان بدرێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە ئەو قۆڵە کە بوو و وەختێک ئەمنیشی تێدا بووم، یەکدەست نەبوو. بەشێکیان ئەوانە بوون کە هەر لە جەرەیانی قەزیەکەدا بوون کە خودی عەبدوڵڵای ئیسحاقیی تێدا بوو. ئەو دیارە هەم زۆر خۆشەویستی مەلا مستەفای بوو و هەم زۆریش موخلیسی بوو. بەڵام ئەوەی دیکە شتێکمان لە دەست نەدەهات. تەنانەت ئیعتیرازێکی سادەشمان لە دەست نەدەهات. ئەگینا بەو شتانە پێموایە کەسمان نەبوو خۆشحاڵ بێ، هیچمان بۆ نەدەکرا. تەنیا لە کۆنفرانسی دووەدا بوو کە هێندێک نامەمان بۆ ئەملاو ئەولا نووسین کە دوانیان بۆ مەکتەبی سیاسیی پارتی‌و شەخسی بارزانی بوون. لەوێشا بە لەحنێکی کەمێک سەریح ئیرادمان لەو کارە گیرابوو.

* دوای کۆنفرانسی سێهەم کە دوکتور قاسملوو گەڕابۆوە لە کۆنگرەی سێ‌دا ڕێبەریی حیزبی وەدەستوە گرت، پێوەندیی حیزبو پارتی بە کوێ گەیشت؟ باشتر بوو یان خراپتر؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوروەڵەن دوکتور قاسملوو پێش کۆنفرانسی سێ گەڕابۆوە. ئەو دوو ڕووداوە واتە کۆنفرانسی سێ‌و کۆنگرەی سێ هەر دووکیان بە سەرپەرستیی دوکتور قاسملووی ڕێکخران. دوکتور قاسملوو ساڵی ١٣٤٩ی، یان ١٩٧٠ گەڕایەوە. ساڵی ٧١ کۆنفرانسی سێ گیرا. ٧٣ کۆنگرەی سێ گیرا. ئەوانە هەر دووکیان بە هاوبەشی‌و سەرپەرستیی دوکتور قاسملوو گیران. بەڵام لەبارەی پرسیارەکەتەوە دەبێ بڵێم پێوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستان‌و پارتی دێموکراتی کوردستان نایێ بڵێم چاکتر بوو. دەبێ بڵێم پێوەندی وەکوو پێوەندیی دوو حیزب دامەزرا. نازانم پێشتر چۆن بووە ئەو وەختەی ئەمن نەهاتبووم بەڵام لەو ماوەیەدا کە دەکەوێتە پێش ئەو ساڵانەی دوکتور قاسملوو هاتەوەو تێکۆشانی دەست پێ کردەوە، پێوەندی‌یەکە

پێوەندیی دوو حیزبی خاوەن‌حەقی بەرامبەر نەبوو. دەواقیعدا حیزبی دێمۆکراتی کوردستان پاشکۆیەک بوو لە پارتی دێمۆکراتی کوردستان. بەڵام ئەوجار بوو بە پێوەندیی دوو حیزب کە حەقی بەرابەریان هەیە. خۆ لە پێوەندیی بەرابەریشدا قەت ئەوە ڕەعایەت ناکرێ کە ئەمیان گەورەترە و بەقووەتترە، یان ئەویان چووکترە و لاوازترە، شتی ئاوا نیە. پێوەندیی بەرامبەر مەسەلەن لە بەینی ئەمریکاو عەرەبستانی سەعوودی‌دا، نەخێر گواتمالا، نەخێر جیبووتی. پێوەندیی بەرامبەر ئەوەیە ئیحتیرامی موتەقابیل لەبەینی هەر دووکیاندا هەبێ. یەکیان تابیعی ئەوی دیکە نەبێ. ئەوکات پێوەندی‌یەکە لە باشترین حاڵەتی خۆی‌دا بوو. وەکوو دوو حیزب ڕەفتارمان دەکرد. ڕێبەرانی حیزبی دێمۆکرات وەکوو ڕێبەرانی حیزبێکی سەربەخۆ بۆ موناسەبات داوەت دەکران. لە میوانداریی‌شدا هەر وایان حیساب لەسەر دەکرا. وەکوو پێموایە لە جێگایەکی دیکە گوتم شەخسی دوکتور قاسملوو جگە لە ئیحتیرام کە شتێکی دیکەیە، پێوەندی‌یەکی تەواو بەرامبەری دەگەڵ خوالێخۆشبوو بارزانی هەبوو. نامەی بۆ دەنووسی برای بەڕێز مەلا مستەفا بارزانی. قەت بۆی نەدەنووسی سەرۆک بارزانی هەرچەند وەک سەرۆکی پارتی ئیحتیرامی بۆی هەبوو. ئەویش هەر دەی‌نووسی برای بەڕێز کاک عەبدوڕڕەحمان قاسملوو. کەوابێ پێوەندی‌یەکەمان زۆر ئوسوولی بوو، زۆری گەشە کردبوو. دەتوانم بڵێم نەوعێکی تایبەتی بوو لە پێوەندیی نێوان ئەو دوو حیزبە.

• لە جەنگەی لێکترازێک‌بوونەوەی پارتی‌و دەوڵەتی عێراق دوای ساڵی ١٩٧٠، هەڵوێستی ئێوە چۆن بوو، چیتان کرد بۆ ئەوەی ئەو ئەزموونە سەرکەوتوو بێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە لە بەشێکی دیکەدا باسمان کرد، پێوەندیی ئەو دەورانە پێش ئەو مەرحەلەیە ئاسایی بوو. ناکامی وتووێژەکان بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد لە عێراق بوو بە بەیانی یازدەی ئادار، یان باشترە بڵێین پێک‌گەیشتنی یازدەی ئاداری لێ کەوتەوە. چونکە ڕاستە بەیانییەکە دەوڵەتی عێراق دەری کرد، بەڵام ئەوە ئاکامی ڕێککەوتنێک بوو لە نێوان ڕێبەریی بزووتنەوەی کوردو دەوڵەتی عێراقدا. عێراقی‌یەکان پێیان ناخۆش بوو بڵێن ڕێککەوتننامە، هەر دەیان‌گوت بەیانی یازدەی ئازار. چونکی بەیانەکە یەک تەرەفە بوو، بەیانێک نەبوو ئەو دووانە ئیمزایان کردبێ. بەڵام خۆ بەخێرا بابی دەری نەکردوە. ئەوە ئاکامی چەند سەعات و چەند ڕۆژو چەند حەفتە دانیشتن‌و هاتوچۆ بوو کە دەگەڵ ئەو هەموو لووت‌بەرزی‌یەی هەبوو، هەر هێلی کۆپتێر بوو، سەددام حوسێنی دەبرد لە چۆمانێ دای‌دەبەزاند بۆ ئەوەی دەگەڵ کوردان موزاکەرە بکا.

جا ئاسایی‌بوونەوەی پێوەندیی ئەو دەورانە پێش ئەوە بوو کە دوکتور قاسملوو گەڕایەوەو تێکۆشەرانی حیزب کە پەرش‌وبڵاو بوون هەر وەک باسم کرد یەکیان گرتەوە. کۆمیتەی مەرکەزی پێک هاتو دوایە کۆنفرانس‌و کۆنگرە گیران‌و کۆمیتەی ناوەندیی تازە هەڵبژێراو بەرنامەو ئەساسنامەی تازە نووسراو نەواتە. وەکوو گوتم

هەوڵی ئێمە ئەوە بوو ئەو پێوەندی‌یە چەندی بکرێ بەردەوام بێ. چونکی بەقازانجی کوردمان دەزانی. وەک بناغەش دەگەڵ حیزبی بەعس دامانناببوو کە ئێمە پێمان خۆشە ئێوە دۆستن. بەڵام ئەگەر ڕۆژێک خودا نەخواستە ئێوە دۆست نەبن، ئێمە دۆستایەتیی هیچ کامتان بۆ ئەوی دیکە وەلا نانێین. دیارە خۆ ئەگەر ڕۆژێک مەجبوور باین کە هەڵبژێرین، حەتمەن هەر کوردەکەمان هەڵدەبژارد. بەڵام وەکوو کارێکی بەجێ‌و ئوسووڵی هەر ئەوە بوو. تەنانەت ئەوە ڕووشی دا. ساڵی ١٩٧٤ کە بەرەبەرە ناکۆکی‌یەکانی بەینی بزووتنەوەی کوردو دەوڵەتی عێراق تەشەنەیان کردو لەسەر ئوسووڵی خودموختاری نەگەیشتنە یەکتر، بەرەو تەشەنوج چوو. وای لێ‌هات کە پارتی هێزەکانی لە شارەکان کێشانەوەو مەقەڕەکانی بردنە دەرێ‌و خەڵک ڕووی لە دەرێ کرد. هەرچی بوو لە هەموو لایەکەوە، لە کوردو لە عەرەبە ئەوەی بوو لێکڕا کەوتنە یەکێک لە لایەنەکان. یان جنێویان بە پارتی دا، یان جنێویان بە حیزبی بەعس‌و دەوڵەتی عێراق دا. بەڵام ئێمە بەیانێکمان دەرکرد، گوتمان ئەو وەزعە وەزعێکی خراپە. بە زیانی عێراقی‌یە، بەزەرەری کوردە. بەزەرەری هەموو هێزە نیشتمانی‌یەکانی عێراقە. داوا دەکەین هەموو هێزە نیشتمانی‌یەکانو دەپێش هەمووانیشدا پارتی‌و حیزبی بەعس پێکەوە دانیشن بۆ چارەسەری ئەو مەسەلەیە. کە هەموو هێزەکانی دیکە شتی پێچەوانەی ئەوەیان بڵاو کردبۆوە، ئەو بەیانەی ئێمە شتێکی سەیری لێ شین بوو، یانی دوو شتی جالبی لێ شین بوون. باوەڕ بکە پارتی‌و سەرکردایەتیی بزووتنەوەش پێی خۆشحاڵ نەبوون کە ئێمە ئاوا سەربەخۆیانە بەیان دەردەکەین. بەڵام بەعسی‌یەکان عەجایبی پێ تووڕە بوون. ڕۆژنامەیەکی حیزبێکی کوردیی سەربەوان هەبوو لە لوبنان، لەو ڕۆژنامەیەدا شرتەوشۆیان شوتین. زاهیرەن بە ناوی حیزبی بەعسیش نەبوو، بە ناوی هێزێکی کوردی بوو.

بەڵام لەموقابیلدا شتێکی خۆشیشی لێ شین بوو. هێندێک برادەرمان لە سلێمانی بوون، یانی برادەری حیزبی‌و ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزییش. خەڵکی کوردستانیش دەگەڵ ئەوەی لە بەسرێ‌ڕا کوردەکان دەهاتنە دەرێ‌و دەچوونە شاخی، هەموو کەس خوداخودای بوو ئەو شەڕە نەبێتەوە. هەموو گوێیان بە ڕادیۆوە بوو بەڵکوو خەبەرێکی خۆش هەبێ. یەکێک لەو برادەرانە گێڕایەوە گوتی شەوێ خەڵکێکی زۆرم میوان بوون خەڵکی سلێمانی. ئێستێ شەڕ نەبۆوە. گوتی ئەمنیش بەیاننامەکەم پێ گەیشتبوو. گوتم ئەمن بەیانیەی حیزبی دێمۆکراتتان بۆ دەخوێنمەوە بزانن سیاسەتی حیزب چۆنە. گوتی کە بەیانیەکەم خوێندەوە کە باسی ئاشتی‌و تەبایی‌و دانیشتنی دەکرد، خەڵکەکە زۆریان پێ خۆش بوو. کە تەواو بووم لێکڕا چەپڵەیان لێ‌داو گوتیان بژی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان چەند کەسیشیان کە زۆر شارەزای سیاسەت نەبوون گوتیان بژی شاهەنشای ئێران. قسەی خۆمان بێ ئەزایەک خولقا بوو کە هەموو ماڵە کوردێک بە تایبەتی لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا، عەکسی شاو شابانووی لێ‌بوو. چونکە ئەووەڵەن عەکسەکان جوان بوون. پاشان

هاتبوون فێڵێکیان کردبوو. جگە لە عەکسی تیو چوارچێوەی، وێنەی شاو شابانوویان لە کەشەفێکی دابوو کە کەشەفەکەش هەر جوان بوو. خەڵک دەی‌کرد و هەڵی داوەشی‌و لە دیواری دەدا.

* دوای کارەساتەکەی ١٩٧٥ کە بە "ئەسکۆ" و تەنانەت "ئاشبەتاڵ" ناوی دەبەن ئێوە چیتان کردو هەڵوێستتان چۆن بوو؟ بیستوومە جەنابت کەسێک بووی کە پەیامێکی گرینگت بۆ بارزانی بردوە بەڵام فریای نەکەوتووی؟ دەکرێ لەو بارەیەوە بدوێی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە ئەوە درێژکردنەوەیەکی بوێ. ئەو پەیامانە لە ڕێگای حیزبەوە چوون. دەنا خۆ من کەسێک نەبووم. دوو، سێ جار پەیام هەبوون. لانی کەم دوو جاریان باس دەکەم. یەکێکیان ئەوە بوو کە ماوەیەک، ماوەیەکی زۆریش پێش دەرچوونی بەیاننامەی ڕێککەوتنی ئەلجەزایر، دەوڵەتی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەوی لە ڕێگای دەفتەری نوێنەرایەتیی حیزب لە بەغداوە پەیامێکیان دا کە بدرێ بە سەرۆکایەتیی شۆڕشی کورد لە عێراق. سەفارەتی شووڕەوی دەگەڵ نوێنەرایەتیی حیزب قسەیان کردبوو. گوتبوویان ئێمە دەزانین لە بەینی عێراقو ئێراندا هەوڵو تەقەلایەک هەیە بۆ ڕێک کەوتن. مەعلوومیشە ئەو ڕێککەوتنە لەسەر حیسابی کوردە. ئەوە مانگێک، مانگو نیوێک پێش تەوافوقەکە بوو. بۆیە ئێمە پێشنیار دەکەین کە کارێکی وا بکەن یەکتر ببینین بۆ ئەوەی ئێمە هەوڵێک بدەین نەگاتە ئەو جێگایە. لە بەغدایەوە پەیامەکە درا بە من بە نووسراو. پەیامەکە دەبوو بە نهێنی بێ. ئەمنیش چووم بۆ مەنتەقەی سەرکردایەتیی شۆڕشو مەسەلەکەم دەگەڵ مەرحوومی ئیدریس بارزانی مەترەح کرد. تەنیا خۆم بووم چونکە شتەکە دەبوو زۆر نهێنی بێ. کاک ئیدریس شتەکەی وەرگرت زۆر بە وردی یادداشتی کردو گوتی عەرزی بارزانی دەکەمو جوابەکەت دەدەمەوە. بردی بۆلای بارزانی‌و نازانم ڕۆژێک بوو یان دوو ڕۆژ دوایە، مووهیم نیە، جوابەکەی دامەوە. جوابەکەی ڕاست ئەوە بوو کە: ئێمە پەنا بۆ ماڵی دوژمن نابەین. ئێمە دەزانین ئەو کوردستانە بە چەکی ڕووسی وێران بووە. قەت ناچینە ماڵی دوژمن. هەرچی دەبێ با ببێ، ئێمە موقاوەمەت دەکەین. با لەسەر قەبرەکانمان بنووسرێ ئەوانە هەتا ئاخرنەفەس لە پێناوی میللەتی خۆیاندا خەباتیان کرد. ئەمن جوابەکەم وەکوو هەیە ناردەوە بۆ ڕەفیقانی خۆمانو ئەوانیش دیارە بە سەفارەتی شووڕەوی‌یان گوتبوو کە دواقیەوا ئەو پێشنیارە ڕەت کراوەتەوە. چونکە ئەوان داوای ئەوەیان کردبوو لە یەکێک لە سەفارەتەکان یەکتر ببینن.

دواتر یەکی دیکەش هات کە ئەوەیان کەمێک ناڕاستەوخۆ بوو. ئەوەیان بەو جۆرە بوو، دوو دەوڵەتی عەرەبی کە هەر دووکیان ئیختیلافیان دەگەڵ عێراق هەبوو. ئەمن ڕاستەوخۆ وەرم نەگرت، بەڵام ناڕاستەوخۆ وەرم‌گرتو گەیاندیشم. دوو دەوڵەتی لیبی‌و سووریە بوون. ئەوانە ڕاسپاردەیەکی ناوایان هەبوو کە ئەگەر موقاوەمەتەکە درێژە پێبدەن هەرچی لە ڕێگای ئێرانەوە بە بزووتنەوەی کورد گەیشتوە ئێمە پێیان دەگەیەنین. بەڵام با

موقاوەمەتەکە درێژە بدەن. ئەوە لە ڕۆژەکانی تێکچوونی‌دا بوو. ئەو پەیامە ئەمن بە ڕێگایەک‌دا گەیاندم. کەسانی ڕاستەوخۆم نەدیتن. ئیدی نازانم ئەو پەیامە چی لێ‌هات.

جارێکی دیکە ئەمن لە تەرەف حیزبەوە هەڵگری پەیامێک بووم. وەزعییەتی ئێمە ئاوا بوو: دوکتور قاسملوو لە دەرێ بوو. هێندێک لە برادەرانمان کە پتر بوون لە بەغدا بوون. ئەوە ساڵی حەفتاو چوار بوو. ئەمن و کاک مەلا ڕەسووڵی پێشنەماز کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بووین لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە بووین لە قەندیل. دوو، سێ برادەری کۆمیتەی ناوەندییشمان کاک کەریم حەداد بوو، کاک هاشمی کەریمی بوو، برادەرێک بوو کە ئێستا لە نێوخۆی وڵاتە، ئەو سێ کەسەش لە سلێمانی بوون. پێش ئەوەی ڕێککەوتنی ئەلجەزایر دەرچێ، ئێمە قەرارمان دانابوو لە سلێمانی کۆبوونەوەیەک بکەین. ئەوە ئیدی ببوو بە ساڵی ٧٥ و مانگی مارس. وا بوو کە وەرێ کەوتین، ڕۆژی پێنجی مارس بوو. نا، دەقیقەن ڕۆژی شەشی مارس وەرێ کەوتین. بەڵام دامانابوو کە شەوێ بچین میوانی هێزی کاوە بین. هێزی کاوە کە خوالێخۆشبوو حەسۆ میرخانی بارزانی فەرماندەی بوو لە دێیەک بوو بەناوی "کووزینێ". قەرار بوو سەردانێکی وی بکەین و لەوێڕا بە پێیان وەرێ کەوین بۆ سلێمانی. ئێمە ئێوارەی شەشی مارس لەوێ بووین. بەڕێککەوت کاک حەسۆ بۆخۆی لەماڵ نەبوو، برایەکی لەخۆی گەورەتری هەبوو، غەزالی میرخان، ئەو لەوێ بوو. هەر ئەو ڕۆژە سێ هەواڵنێری ئیتالیاییشی لێ بوون.

ئێمە لەلای هێزی کاوە بووین کە خەبەرگوزارییەکان ڕێککەوتننامەی ئەلجەزایریان خوێندەوە. لەبیرمە یەکێک لەو خەبەرنیگارانە فارسییەکی باشی دەزانی. پرسیاری لە خوالێخۆشبوو غەزالی میرخان کرد هەر بە فارسی. گوتی پێتان وایە ئەو ڕێککەوتننامەیە شوێنەواری لەسەر ئێوە چی دەبێ؟ ئەویش کە فارسییشی باش نەدەزانی گوتی "برای مرز" واتە لەسەر سنوورە. هەر ئەوەندە زۆر کورت، چونکی فارسییەکەی هەر ئەوە بوو. کابرا تەوزیحی دا گوتی باشە ئاخر مەرزەکە بەشی زۆری کوردستانە. وەختێکی لەسەر مەرز ڕێک دەکەون تەئسیری لەسەر ئێوە چ دەبێ؟ دووبارە وەڵامەکەی هەر ئەوە بوو گوتی "برای مرز". ئەمنیش ئیجازەم وەرگرت قسە بکەم. گوتم ئەو ڕێککەوتننامەیە مەعلوومە بەشی زیاتری ڕووی لە کوردە. دەوڵەتی عێراق بۆیە دەگەڵ ئێران ڕێک دەکەوێ کە ئەو پشتیوانییە لە کورد بستێنێتەوە. بەڵام ئەمن پێم وایە بزووتنەوەی کورد دەتوانێ بۆ خۆی لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ - بە هەموو باوەڕیشمەوە وام گوت-. ڕەنگە ئەو دامودەزگایەی ئێستای پێ بەڕێوە نەچێ، بەڵام وەکوو حەرەکەتێکی ئەسڵی پارتیزانی درێژە بەخەبات دەداو خۆی ڕادەگرێ. گوتی باشە چۆن خۆی تەئمین دەکا. گوتم جارێ ئەوەی ئەمن بزانم بەشی ماوەیەکی زۆری لە هەموو شتێک هەر ئێستا هەیە، لە سیلاح و موهیمماتو خواردەمەنی و هەموو ئەو شتانە. لە پاشانیش بزووتنەوەی کورد لەمێژە را فێر بووە خۆی لە دوژمنەکەی تەدارەک بکا. چەکی هەر لەوی دەستێنێ. موهیمماتی هەر لەوی دەستێنێ.

زۆرجار خواردەمەنی و پووڵیش هەر لەوێ دەستێنی. کابرا قسەکانی پێ باش بوون. بۆیە جێگای گۆڕی و هاتە کن مە دانیشت. لە دوایە کاک غەزالی ڕۆیشتەوە بۆ دیوی خۆی بۆ حەسانەوە. ئەویش ساڵۆنێکی گەورەی میوانداری بوو. ئێمە دانیشتین هەتا درەنگانێکی شەو، بەرقیش کوژایەوە ئێمە هەر دانیشتبووین. پێیان خۆش بوو کەسێک هەیە قسەیان دەگەڵ دەکا چونکی ئێمە فارسییەکەمان باشتر بوو.

بەهەر حاڵ ئێمە چووین کۆبوونەوەکەمان گرت. بە ڕێیان بۆ شەوی دواتر گەیشتینە "سەفرەتی" کە پێم وا بێ دیتبووتە. ئەگەر لە گەناوێ ڕەت دەبی پێش ئەوەی بگەیە گوندی "گەلاڵە" لەسەر چۆمی هەڵکەوتوە. ئێمە شەوەکەی لەوێ میوان بووین. لەوێ ئیدی ڕادیۆیەکان باسیان کرد کە موقاوەمەتی کوردەکانی عێراق تەواو بووە. زۆریش ناخۆش بوو. ڕادیۆیەکی کوردیی مەحەللی هەبوو کە لە "ماوەت" بڵاو دەبۆوە. لە حاڵێکدا ڕادیۆکانی دەرەوە باسی دەستهەڵگرتنی خەباتیان دەکرد، ئەو هەروا خەبەری کۆنی بڵاو دەکردەوە. ئیدی بۆ بەیانی کە ئێمە بەرەو سلێمانی ڕۆیشتین، بەرەبەرە ئاساری تێکچوونەکە دەرکەوت. ڕەفیقێکم هەبوو، لە ڕێگا تووشی هاتم، هەر کە چاوی پێم کەوت دەستی کرد بە گریان. دۆستێکی خۆم بوو بەڵام پێشمەرگەی پارتی بوو. ئەمنیش گوتم بۆ دەگری؟ گوتی چ نەما. گوتم بۆ چ نەما، کورد ماوە، بارزانی ماوە و پارتی ماوە. گویا گوتی بارزانی خودا دەزانێ لە کوێیە. دوایە بۆم دەرکەوت کە خەبەر بڵاو بۆتەوە کە مەلا مستەفا لە تاران گیراوە و بێسەروشوێن کراوە. کەس ناتوانێ بیبینێ، کە دیارە شتی وا هەر نەبوو، پێم وا بێ ئەو دەنگۆیەش بە خۆڕایی بڵاو نەبۆوە. ئەوە بۆیە ئاوا بڵاو ببۆوە بۆ ئەوەی ڕووحیاتی خەڵکی زیاتر بێتە خوارێ. یانی پێم وایە بەرنامەیەکی تێدا بوو.

بەهەر حاڵ ئێمە دەبوو بەشەو داخڵی سلێمانی بین. شەوێ چووینە سلێمانی و برادەرانی بەغدایەش هاتن. کە بۆ سبەی چووینە نێو شاری دیتمان ئەوە لەسەر ئوتوبووسەکان هەر شوعاری دژی مەلا مستەفایە نووسراوە کە شتی زۆر تاڵ و جێگای ناهومێدییان تێدا بوو. مەسەلەن نووسیبوویان ئەو تاقمە خائینە یان دەبێ بۆ هەمیشە لە ئێران بمێننەوە یان خۆی تەسلیمی عێراق بکاتەوە. خولاسە قسەی زۆر بێتامیان تێدا بوو کە ئیحساساتی خەڵکی زۆر بریندار دەکرد. ئێمە کۆ بووینەوە. ئەو دەستووری کارە کە بوومان لەڕاستیدا زیاتر کەوتە ژێر تەئسیری ئەو ڕووداوە تاڵە. بۆیە دەکرێ بڵێم گرینگترین بڕیاری کە دامان ئەوە بوو کە ئێمە بە ناوی حیزبی دێموکرات نامەیەک بنووسین کە نووسیشمان. پەیامێک بدەین بە مەلا مستەفا و بە پارتی کە بڵێین ئەو زەربەیە ئێران لە بزووتنەوەی کوردی داوە، ئێستێ کە وایە ئێمە پێشنیار دەکەین ئەو موقاوەمەتەی بخەینە ئێران. ئەگەر ڕێبەرایەتیی پارتی، بارزانی ئەوەی قەبووڵ بکا کە بیخاتە ئێرانێ، ئێمەش دەست بەجێ بەیانێک دەر دەکەین و داوا لە خەڵکی کوردستان دەکەین کە لەژێر ڕێبەرایەتیی بارزانیدا بەسیج بن بۆ موقاوەمەت لە دژی شا. ئەوەمان بە نامەش نووسی، بە پەیامیش کە بە من بوو. ئێمە بەپەلە گەڕاینەوە بۆ

ئەوەی ئەو پەیامە بە مەلا مستەفا بگەیەنین. کە هاتینەوە، لە سونێ دیسان تووشی ئەو غەزالی میرخانە بووینەوە کە دەڕۆیی. کاک حەسۆمان نەدیت. شوێنێک هەیە پێی دەڵێن "بێتەلان" لەوێ تووشی بووین. ئەمن نامەکەم دایەو پەیامەکەم پێ گەیاند کە بە زووترین کات بی گەیەنێ. لەعەینی حاڵدا بۆ سبەینێ دیسان وەڕێ کەوتم کە دیارە کاک مەلا ڕەسووڵی پیشنمازیش هەر دەگەڵ بوو، چووین بۆ مەنتەقەی چۆمانو حاجی ئۆمەرانو ئەوناوە. نامەکەم بۆیە دا بە غەزالی میرخان کە مەبادا ئێمە فریا نەکەوین. بەکردەوەش هەروا دەرچوو. کە چووین لەوێ هیچی لێ نەمابوو. دنیا بۆنی خوێنێی لێ‌دەهات. دارو بەرد نائومێدیو مەحرومییەت بوو. مەسەلەن تفەنگی بڕنۆی دارشووشەیان دەدا بە دینارێک کەس نەبوو بیکڕێ. خەڵک خۆیان لێ بار بوو. فەزایەکی زۆر ناخۆش حاکم بوو. تەنانەت شتێکی زۆر ناخۆشیان گێڕایەوە. لەدێیەک بەناوی "کۆمتان" پێشمەرگەیەک کلاشینکۆفێکی جوانی پێ دەبێ. یەکێک پێی دەڵێ کلاشینکۆفەکەت نافرۆشی؟ ئەویش زۆری پێ ناخۆش دەبێ، دەڵێ ئەگەر میللەتی کورد وای لێ‌هات تەماع دە تفەنگی پێشمەرگەکەی بکا ژیان بەکاری چی دێ، دەڵێ دوور کەوە. نارنجۆکێک دەردێنێ. زامنەکەی ڕادەکێشێ. لەسەری ڕادەکشێو خۆی دەتەقێنێتەوە. یانی حادیسەی زۆر سەیرو سەمەرە ڕوویان دا. بەهەرحاڵ ئێمە چووینەوە بەڵام هیچمان پێ نەکرا. تەنانەت نیگەرانی ئەمنییەتی خۆشمان بووین. هەرچەند سیلاحمان پێ بوو، بەڵام بەپەلە هاتینەوە بۆ ئەوەی نەکوژرێین. جا مەبەستم ئەوەیە ئەو دوو پەیامەم ڕاستەوخۆ گەیاندوون. ئەو پەیامەی دیکەش ناڕاستەوخۆ گەیاندم جا نازانم گەیی یان نەگەیی. دیارە ئەویان کە درا بە غەزالی حەتمەن گەیاندوویەتی چونکە نامە بۆ مەلا مستەفا بنووسرابایە، کەس نەی‌دەتوانی نەی گەیەنێ، بەتایبەت کە ئەو خۆی بارزانی بوو. بەڵام ئیدی هیچ ڕەنگدانەوو کاردانەوەیەکی نەبوو، چونکە تازە هیچیان بۆ نەدەکرا. هیچیشیان بە ئێمە نەگوتەوە.

* دوای کووژانەوەی شۆڕشی کورد لە باشوور، ئێوە هەر لەعێراق مانەوە. وەزعتان چۆن بوو؟ هەڵوێستی دەوڵەت بەگشتی سەبارەت بە کورد چ گۆڕانێکی تێدا پێک هات؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەزعی مە وەزعێکی زۆر خراپ بوو. ئێمە نیگەرانیی لەوە خراپتریشمان هەبوو. تەنانەت ئەمن نامەیەکم نووسی کە هیچ دەرفەتی ئەوەمان نەبوو، هیچ خەبەریشمان نەبوو کە چۆن پێک بگەین، یانی یەکتر ببینینەوە. نامەیەکم نووسیو بەهۆی برادەرانی شیووعییەوە ناردم بۆ بەغدا. نووسیم وەزعی مە ئاوایە. مارەیەکیشیان دانابوو لە شەشی ئادارەوە هەتا سیو یەکی ئادار کە گۆیا لەو ڕێکەوتەدا دێنو وڵاتی چۆڵ دەکەن. هەموو کەس نیگەرانی ئەوە بوو کە بێن ماڵان بگەڕێنو چەکوچۆڵە بگرنو خەڵکی دەستبەسەر بکەنو ئەوانە. تەنانەت ئێمە کە یازدە پێشمەرگەیەک بووینو چەکمان هەبوو،

چەکەکانمان لە شوێنێکی دیاریکراو ژێرخاک کرد. شاردمانەوە بۆ ئەوەی وەدەست نەکەون و بۆخۆمان بێ‌چەک ماینەوە. دەنامەکەدا نووسیم کە وەزعی مە ئاوایە. ئاگاشمان لە ئێوە نیە کە چیتان بەسەر هاتوە. بەڵام ئەگەر ماوەو دەرفەتان هەیە فکرێک بەحاڵی ئەو خەڵکەی بکەنەوە. نیگەرانی ئەوە بووین کە بێن و تێکیانەوە پێچن و بیانبەن. نووسیم تەنانەت ئەگەر پێویست بێ تابیعییەتیش وەربگرن، قبووڵی بکەن. یانی ببنە عێراقی.

جا ئەوە قسە دێ‌ڕ قسە دەبڕێ. لە کۆنگرەی چوار دا، خوالێخۆشبوو کاک کەریمی حیسامی هات لەبەر چاوی کۆنگرە گوتی فلان کەس بۆی نووسیوم تەبەعییەت لە دەوڵەتی عێراق بکەن. پەڕیمە پشتی میکرۆفۆنەکە. گوتم کاک کەریم هێندە نازیرەک نیە کە نەزانێ تابیعییەت و تەبەعییەت فەرقیان هەیە. بەڵام دەیەوێ تەعریفی بکا بۆ ئەوەی لەتمەیەک لەمن بدا. ئەمن گوتوومە تابیعییەت وەربگرن. یانی ئەگەر ئەوەشتان پێ پێشنیار بکەن کە ببنە عێراقی، بیکەن با ئەو خەڵکە تەحویل نەدرێنەوە یان زیندانی نەکرێن. بەڵام ئێستا دەی‌کەیە تەبەعییەت یانی پێڕەوی و گوێ‌لەمستی. ئەمن شتی وام نەگوتوە. ئیدی کاک کەریم هیچی پێ نەما. چونکی لەسەر تۆڕەش ڕاوەستام. ئاخر کۆنگرە لە ساڵۆنی سینەما ئومێدی مەهاباد بوو کە ٣٢٠ کەسی تێدا بوو. ئەمنیش هەر ئەو وەختیش دەنگم هەر کەم بوو. ئەگەر لەجێی خۆڕا هاوارم کردبایە نەدەبوو. بۆیە پەڕیمە سەر میکرۆفۆنەکەو پێم گوت.

بەهەرحاڵ ئێمە چاوەڕوانیی شتی زۆر ناخۆشمان دەکرد. بەڵام ناکامی ئەوەی ئەوە بوو کە دەوڵەتی عێراق گوتی ئێوە دەبێ هەموو چالاکیی خۆتان ڕابگرن تەنانەت دەرکردنی ڕۆژنامەش. گوتمان بابە ئاخر دەرکردنی ڕۆژنامە بۆچی ڕابگرین؟ گوتیان نابێ. ئەوجار پێشنیاری ئەوەمان پێ کردن کە ئێمە ڕۆژنامەکە بە تایپ دەنووسین، لە چاپخانەیەک لە چاپی دەدەین و خەلاس دەبێ. خۆ ڕۆژنامەکە ئاوا نووسراوە. ئێستا ئەتۆ بڵێی حروفی چاپی ئێرە دەناسرێتەوە بەهەر حاڵ. بەڵام خۆ ئەوە نائاسرێتەوە، تایپە. گوتیان نابێ. بۆ ماوەیەکی زۆر حەتتا ئەوەشیان لێ قبووڵ نەکردین. جارێکی دیکەش نووسیومە. ژمارەیەکمان هەبوو، لە بەغدایە چاپ نەکرا. ناردمانە بەیرووت چاپ نەکرا. ناردمانە ئەڵمان چاپ نەکرا. سەرئەنجام لە پایتەختی چوارەم لە پاریس چاپ کرا. یەک ژمارەی ڕۆژنامە چوار پێتەختی دنیای کرد هەتا چاپ کرا. دواتر پاش ماوەیەکی زۆر کەمێک ئاسان بۆوە.

تەنانەت ڕۆژێک ئەمن چووەمە مەقەڕی حیزب، چونکە ئەمن ماڵی خۆم هەبوو. لەپڕ چەند مەئموورێک هاتن گوتیان نابێ بچنە دەرێ. مەئمووریان بە دەورەوە دانان و لە ژوورەکەی خۆماندا حەپسیان کردین. گوتمان مەسەلە چیە؟ گوتیان نازانین. بە ئێمە گوتراوە نابێ بچنە دەرێ. هەر ئێوەش نین، هەموو ئێرانییەکان. ئەو وەختی ئەحزابی کوردیی دیکە نەبوون. بەڵام سازمانی ئێرانیی دیکەی لێ بوون وەک جەبهەی میللی. گوتیان دەستوور دراوە دەبێ هەموو ئێرانییەکان لە ماڵێ بن. تەقریبەن بۆ ئێمە شک نەمابوو کە داستان

تەواوە. خەرمان دەکەنەوەو دەمان نێرنەوە بۆ ئێران. دیارە ئەوە قاسپلەیەک هەیە بەیتی ئەوەی کە نامەکەم نووسی‌و پاشان بە ڕێگایەکی دیکەدا بەزەحمەتێکی زۆر هاتمە ئەم شاری کۆیە. ئێرە قایمقامێکی لێ‌بوو کە ئەم‌ئەیبوو، بەڵام چووم داوای مولاقاتم کرد. ئەویش گوتبووی باشە مولاقاتی چی؟ با بیڵێ‌و نەیە. گوتم بابە دەمەوێ بۆخۆم بی‌بینم. قسەیەکم هەیە بۆخۆی نەبێ نابێ، ڕێگام بدەن با خۆی ببینم. ئەویش ماڵی ئاوەدان بێ ئیجازەی دا بچم خۆی ببینم. خەڵکی لێ بوو، گوتی قسە بکە بزانم چیتە دەوێ. گوتم ئەمن دەمەوێ تەنیا خۆت ببینم. کورد بوو خەڵکی لای دەهۆکێ بوو نازانم دەقیق ئی کوێ بوو بەڵام دەزانم هی لای وێ بوو. دوایە گوتم ئەمن ئەو کەسەم وەزعییەتی ئێمەش ئاوایە. ئیستا دەمەوێ وەرەقەیەکم بدەیەی پێی بگەمە بەغدایە. هیچی دیکەم لێت ناوێ. داوای لێ‌بووردنیش دەکەم لە ئێستێ بەر بەرەوەمەوە دەستم شکابوو، دەستم هەڵبەسترابوو. وەزعێکی زۆر شپرزەم هەبوو. کردیە پیاوەتی، وەرەقەیەکی "عدم تعرض"ی بۆ کردم پێی چوومە بەغدایە.

لەسەر یەک دوو شەوو ڕۆژان ئێمە لەوێ زیندانی بووین. تەنانەت ئیجازەیان نەدا ئەو برادەرەمان کە مەسئوولی خەرید بوو بچێ ئەمانان بکڕێ تەماتاوێکی لێ‌بنێ. دوو جەم نەفەریان دەنارد بۆخۆشیان‌و بۆ ئێمەش لە دەرێ نانیان دێنا. پاش دوو شەوو ڕۆژان مرحاسەرە هەڵ‌گیراو ئازاد بووین. دوایە دەرکەوت ئەو بەزم‌وڕەزمە بۆ چیە. ئەوە ئەنوەر سادات هاتوە لەترسی ئەوە بووە کە ئێمە ئەنوەر ساداتی تیرۆر بکەین. ئەی گوتم ماڵتان بەقوڕ گیرێ بۆ سیاسەتو بیرکردنەوەتانو بۆ هەموو شتێکتان. بەگشتی غەیری ئەو مەحدوودیەتە دەرکەوت خەتەرێکی دیکە تەهدیدمان ناکا، وەکوو بڵێین زیندانی کردن یان تەحویل‌دانەوە یان دەرکردن لە عێراق. بەڵام ئیدی هەموو جۆرە تێکۆشانێکیان لێ قەدەغە کردین هەر وەکی بەشێکیم باس کرد. تەنانەت چوار ساڵ دواتر کە ئێمە دەمانەویست بگەڕێینەوە ئێران نەیان‌دەهێشت. دەیان‌گوت ئیجازە نادەین لە سنووری مەوە بچنەوە ئێران. بەڵام بلیتتان بۆ دەکڕین حەز دەکەن دە وڵاتان بکەن دوایە بچنەوە. بەپاکستاندا دەچنەوە، بە ئەفغانستاندا دەچنەوە، بە کوێ‌دا دەچنەوە کەیفی خۆتانە بەڵام نابێ بە وڵاتی مەدا بچنەوە. دیارە بە قسەشمان نەکردن. شەش کەس بووین ئەوانەی دەچووینەوە، بە سێ شەو خۆمان گەیاندەوە.

* دوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران کە سەرکردایەتیی پارتی لە ئێران بوو، لە بڕیارنامەیەکدا کە وا بزانم بە "مادده هەشت" ناوبانگی هەیە داوا لە ئێران کرابوو دەریان بکا. دەکرێ لەسەر ئەو مەسەلەیە بدوێی؟ کێ بوون ئەو بڕیارەیان دا، بۆ دایانو ئاکامەکەی چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەپێشدا دەبێ ئەوەی بڵێم کە ئەمن لە جوزئیاتی ئەوشتەی ئاگادار نەبووم، چونکی لە جەلەسەکەدا بەشدار نەبووم. ئەو دەمی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیش نەبووم. لەپاشان ئەندامی دەفتەری

سیاسی‌ڕ ئەوەش هەر بەشدار نەبوون. لە ئێمە تەنیا دوکتۆر قاسملوو بەشدار بوو. مامە غەنیش لەو جەلەسەیەدا بەشدار بوو، بەڵام ئەو جارێ نەی‌دەگوت حیزبم. وەک حیزبی بەشدار نەبوو، وەک کەسێکی خۆی، وەک کەسێکی ڕیش‌سپی-یەک یان بڵێین کۆنەزیندانی‌یەکی سیاسی بەشدار بوو. دیارە حیزبی بوو. ئەمن کە پێشتر بە نهێنی لە مەهاباد دەژیام حەفتەی جارێک لە ماڵەکەی وان کۆبوونەوەم دەگەڵ دەکرد. بەڵام جەمعێک بوون زۆربەیان هیچ کەس بە ناوی حیزب بەشدار نەبوو. تەنانەت داوای ئەوە کرابوو کە دوکتۆر قاسملووش نابێ لەوێدا بەشدار بێ، چونکی دوکتۆر قاسملوو سکرتێری حیزبی دێموکراتە. دیارە دوکتۆر قاسملوو گوتبووی ڕاست بەو دەلیلە بەشدار دەبم. ئەمن سکرتێری حیزبی دێموکراتم، حیزبیش وەزنێکە حیزبەو کۆمەڵانی خەڵکی لەپشتە. هەر بۆیە پێویستە بەشدار بم.

**عەباس کاردۆ:** ئەوە چ کۆبوونەوەیەک بووە بۆ ساز کراوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە کۆبوونەوەیەک بوو کە هەیئەتی دەوڵەت لە تارانڕا هاتبوو. لە ماڵی حاجی ڕەحیمی خەرڕازی کۆبوونەوەکە کرا کە ئەو وەختی نەببوو بە حاجی. لە هوتێلەوە کوردەکان پێکەوە دانیشتبوون. لەپاشان دەگەڵ هەیئەتی دەوڵەت دانیشتبوون. ساڵی ٥٧ بوو. یانی هەر ٢٠ ڕۆژێک دوای ڕووخانی ڕێژیمی شای بوو. شا ٢٢ی ڕێبەندان ڕووخا. ئەو کۆبوونەوەیە هەر پازدەبیست ڕۆژ دواتر بوو. لەوێ هێندێک لە داخوازەکان گەڵاڵە کرابوون کە ببوونە حەوت مادە. مادەی هەشتەمیشیان ئەوە بوو. کە ئەوە پەسند کرابوو، دوکتۆر قاسملوو هەم بۆخۆی باسی کرد، هەم دوایە بە ئاشکراش باسی کرد کە ئەو موخالیفی بووە. بەڵام شتەکە بە جەمع پەسند کراوە. مادەکە وەک بەشێک لە تەرحەکە بە دەوڵەت پێشنیار کراوە. جا بۆیە دەڵێم لەوێش موخالەفەتی کردوە کە دوایە دوکتۆر لە کۆبوونەوەیەکدا لە مەهاباد قسەی کردو گوتی سەرفی نەزەر لەوەی ئەزموومان لەسەر قیادەی موەققەت چیە، ئەو مادەیە لەوێدا هەر جێی نیە. وەسڵەیەکی ناجۆرە. حەوت مادەی باشە کە باسی حقووقی کوردو پێوەندیی دەگەڵ دەوڵەت دەکا. یەکێکیان پێوەندیی بە پەنابەرانی دەرەوەی ئێرانەوە هەیە. لەپاشان ئێمە بۆ داوای دەرکردنی ئەوانە بکەین. ئەوەش بوو کە خۆپیشاندانێکیان کردو قاووقیژێکی زۆریان وەڕێ خست. لەوێدا دروشمیان دەدا: دێموکراتو قیادە ڕەنجی کوردیان بەبا دا. بەڵام ئێستاشی دەگەڵ بێ بەشێکی زۆری خەڵک یان لە ڕووی نائاگایی، یان لە ڕووی ئەوە کە ڕقیان لە حیزبە، گوناهی ئەو مادە هەشتەی دەخەنە ئەستۆی دوکتۆر قاسملوو. لەحاڵێکدا هەر وەکی عەرزم کردی دوکتۆر قاسملوو هەر لەوێشدا گوتوویەتی ئەوە جێی نیە. ئێمە باسی شتێک دەکەین و ئەوە شتێکی دیکەیە. لەپاشان لە میتینگێکیشدا لە چوارچرا گوتی. هەر لەسەر ئەوەش بوو کە ئەو هێزە سیاسی‌یانەی دیکە ئەو دروشمانەیان دەدا : دێموکراتو قیادە ڕەنجی کوردیان بە بادا.

**عەباسی کاریزی:** مامۆستا کێ ئەو پێشنیارەی مەترەح کردووە لەو کۆبوونەوەیەدا. کاک "سەلاحی موهتەدی" دەڵێ "فوادی مستەفا سوڵتانی" ئەو شتەی هێنارەتە گۆڕێ.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کاک سەلاحی موهتەدی هێندێک شتی گوتوە. کاک سەلاح بۆخۆی دەوێندا بووە، ئەمن لەوێ نەبووم، بۆیە ناتوانم قەزاوەت بکەم. ئەو شتانەش هیچی وا بە جوزئیاتەوە نەنووسراون و ئێستاش ئێمە ئارشیوێکی وا کامیلمان لە دەستدا نیە. کاک سەلاح و کاک فوئاد هەر دووکیان لەوێ بوون. مامۆستا شێخ عیززەددین لەوێ بووە. خەڵکێکی زۆری لێ بووە، پێم وابێ دەوری ٤٠ کەسێکی لێ بوو. بەڵام ئیدی مەسەلەی کاک فوئاد کە کۆمەڵە بوو، وەک شەخسییەتێکی سیاسیی مەریوان بەشدار بوو. کاک سەلاح وەک شەخسییەتێکی سیاسی لە بۆکان. دوکتور قاسملوویش هەر وا بوو، هەرچەند ئەو دەناسرا کە سکرتێری حیزبە. پیاو حەق بڵێ ئەو دەمی مامۆستا دەستی زۆر دەرۆیی دیفاعی لە دوکتور کردبوو. دەنا بەشێکی زۆریان ویستبوویان دەری کەن. بەڵام مامۆستا گوتبووی دەلیلێک نیە. دوکتور قاسملوو سیاسییەکی لێزانەو شەخسییەتێکی گەورەیە. حیزبی دێموکراتیش خۆ گوناهی نەکردوە. دیارە ئێران هیچ کارێکی بۆ ئەو ماددەیە نەکرد، هەروەک هیچی بۆ ماددەکانی دیکەش نەکرد. بەڵام قیادە پێی ناخۆش بوو، تەنانەت دوایە کە ئەو ڕووداوە ناخۆشانە هاتنە پێش قیادەی موەققەتی پارتی دێموکراتی کوردستان ئەوەشیان وەک یەکێک لە دەلیلەکانی ئەو ناکۆکـــی و ناخۆشییانە دێنایەوە.

* زۆر لە سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران تێنەپەڕیبوو کە دیسان نێوانناخۆشیی حیزبیو پارتی سەری هەڵ-دایەوە. تکایە هۆیەکانی و ئاکامەکانی باس بکە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە زۆر ئاسان نەبێ پیاو بچێتە نێو جوزئیاتی ئەو شتەوە. با ئەوەی بە سەراحەت بڵێم، بەڵام دەمەوێ ئەوەی وەک دیفاع لە حیزبەکەی خۆم بڵێم. ئەمن لە هەوڵەوە قەولم دا تەعەسسوب نیشان نەدەم، بەڵام دەزانم حیزبی دێموکرات هیچ وەختێک ئارەزووی ئەوەی نەبووە دەگەڵ هیچ هێزێکی سیاسیی کورد ناکۆکی و ناخۆشیی هەبێ، بەتایبەتی کە پارتی دێموکراتی کوردستان هێزێکی گەورەی کورد بووەو هەیە. پێوەندییشمان هەر دۆستانە بووە. زۆر وەخت مەسەلەن لە عێراق ئێمە لەسایەی ئەواندا دانیشتووین. ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو دوو حیزبە یەک حیزب بوون. یەک ساڵ پارتی لە واقیعدا بەشێک لە حیزبی دێموکراتی کوردستان بووە. ئەمن پێم وایە ئەوانیش بە هەڵبژاردنی موتڵەق ئەو وەزعەیان هەڵنەبژارد. بەڵام جمهوریی ئیسلامی کە دەیویست زەربە لە بزووتنەوەی کوردی ئێران بدا و بەگشتی زەربە لە بزووتنەوەی کورد لە هەموو جێیەکی کوردستان بدا، لە دوو ڕێگاوە زۆری کار کرد: یەکێکیان لەو ڕێگایەوە کە فیتنە لە بەینی ئێمە و ئەواندا بکا. وەکوو ئەوەی ماددە هەشت گەورە بکاتەوە کە ئەوانە داوا دەکەن ئێوە دەریکرێن.

ڕێگاکەی دیکە ئەوە بوو کە فشارێکی زۆریان بۆ هێنان. پارتی خەڵکێکی زۆری لەوێ بوو. جمهووریی ئیسلامی هەموو جۆرە یارمەتییەکی لێ بڕین بۆ ئەوەی لە بەرانبەر ئێمەدا هەڵوێست بگرن. دیارە یەک دوو ڕووداوی ناخۆشیش ڕوویان دابوو. مەسەلەن جارێکی لە نێوان شنۆو نەغەدەی پێشمەرگەی مە لە ماشێنێکی وانیان دا کە پێیان وا بوو ئی هێزەکانی ئێرانییە. یان لە شنۆیە ئەوان تەقیان لە تەزاهوڕاتی خەڵکی کردو ژمارەیەکیان لێ کوشتن. خۆلاسە بەرەبەرە تەشەنوج پەیدا بوو کە دوایە شەڕێکی گەورەی لێ دروست بوو. ڕەنگە ئەتۆش هەر بەئەوێ باسی بکەی، جەرەیانی دەرهێنانی جەنازەی بارزانی هاتە گۆڕێو ئیدی ئەوە بوو بە بەهانە. یانی لەواقیعدا دوای ئەو حادیسەیە پارتی ئیعلانی شەڕی کرد.

* "قیادە موقت" چی بوو، بۆ پێک هاتو کاری بە کوێ گەیشت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەش ئەمن زۆر لە جوزئیاتەکەی ئاگادار نیم. بەڵام پاشی ئەو شکستە یان ئەو نوشوستییەی لە ناکامی ڕێککەوتنی ئەلجەزایردا بەسەر کورد هات، پارتی دێمۆکراتی کوردستان چەند جار تووشی لێک‌دابڕان بوو. ئەگەر لەبیرمان بێ پاش بەیانی یازدەی ئادار، پارتی کە پێشتر لەت ببوو بە جەلالیو مەلایی، یەکی گرتەوە. ئێستا ئەو یەکگرتنەوەیە چۆن بوو ئەوە باسێکی دیکەیە. بەڵام بە هەرحاڵ ئەوانیش هاتنەوە نێو پارتی. لە هەوەڵەوە ناویان گۆڕی بە پارتی شۆڕشگێڕی کوردستانو لەپاشان هاتنەوە نێو پارتی. دیارە بەشێکیان ناڕازی بوون. ئەوان بۆخۆیان بوون بە دوو دەستە. دەستەیەک هەر بوون بە پارتی دێمۆکراتی کوردستانو دەگەڵ دەوڵەتی عێراق هاوکارییان دەکرد. دەستەیەکیش هەر بە ناوی حیزبی شۆڕشگێڕی کوردستان مانەوەو دەگەڵ دەوڵەتی عێراق بوون. ئەوان حیزبێکی ڕەسمی بوون. یانی حیزبی ڕۆژی تەنگانە بوون. هەر وەخت ئیختیلاف لە بەینی دەوڵەتو بزووتنەوەی کورددا ساز دەبوو، ئەوانە بەرجەستە دەکرانو وەک پارتی دێمۆکراتی کوردستانو پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان ناویان دەبردن. ئەگەر نێوانیشیان دەگەڵ پارتی خۆش دەبوو، ئەوانە بایەگانی دەکران، ناویان دە کوولەکەی ئەوپیشدا نەدەما.

بەڵام کە ئەو نوشوستییەی بەسەردا هات، ئەوجار ئیدی پارتی ئەو یەکپارچەییەی نەماو لێک هەڵوەشا. چەند شتی لێ پەیدا بوون: بەشێکیان شتێکیان دروست کرد بە ناوی بزووتنەوەی سۆسیالیستیی کوردستان. بزووتنەوە، دوایە لەوانەو لە کەسانی دیکە بوو بە حیزبی سۆسیالیستی کوردستان. ئەوە دوایە پەیدا بوو. ئەو بەشانەش کە سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتی بوون، وەک مام جەلالو ئەوانی دیکە پاش ماوەیەک یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستانیان پێک هێنا. دوکتۆر مەحموودو ئەوانە لە هەوەڵەوە بێلایەنییان ئیختیار کرد. دوکتۆر مەحموود بۆخۆی نامیلکەیەکی بڵاو کردەوە. ئەو مەوازیعەکەی لە هەموان ڕوونترو سەریحتر بوو. دیارە دوکتۆر مەحموود بە جۆرێک دوایە چووە گەڵ بزووتنەوەی سۆسیالیستی. ژمارەیەکی

دیکە لە ڕێبەرانی پارتی، بە تایبەتی کوڕانی مەرحوومی بارزانی واتە کاک ئیدریس و کاک مەسعوود و کاک سامییش کە ئەو وەختی هەر دەگەڵ ئەوان بوو، شتێکیان ئیعلام کرد بە ناوی "قیادەی مووەققەتی پارتی دیموکراتی کوردستان". مەسەلەکە ئەوە بوو کە پارتی لێک هەڵوەشاوە. وا دەموودەست ئیمکانی گرتنی کۆنگرەشی نیە بۆ ئەوەی شەرعییەتێکی هەبێ. بۆیە قیادەیەکی مووەققەتیان دانا. دوایە کۆنگرەی نۆیەمیان گرت جا ئەوجار ناوی قیادە مووەققەت هەڵگیرا. دیارە هەتا ماوەیەکی زۆریش لە دوورەوە هەر پێیان دەگوتن قیادە مووەققەت. بەڵام ئیدی ئەوان ناوی قیادەیان لەسەر نەمابوو.

* مامۆستا دەڵێن‌گوت هۆیەکی ئەسڵیی جیابوونەوەی زێندوو یاد "سامی عبدالرحمان" لە پارتی کە "پارتی گەلی کوردستان"ی دامەزراند، ناڕەزایەتی لە سەرهەڵدانی شەڕی پارتی دژی حیزبی دێموکرات بووە. ئەوە ڕاست بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەڵەن هیچ شتێکی وام لەبیر نیە کە ئیعلان کرابێ لەسەر ئەوەی بووە. بەڵام پێم وایە بووە، چونکی لەسەر ئەوەی ناکۆکی هەبوو. لە جێگایەکی دیکەش باسم کرد کە خودی کاک مەسعوودیش پاش کۆنگرەی نۆ شتێکی دەرکرد کە ئەو کارانەی بەخراپ زانی. بەڵام ئەمن فکر دەکەم ئەگەر ئەوەش بووبێ، دەلیلی ئەسڵی بۆ ئەو جیابوونەوەیە نەبووە. چونکی دەزانین دواتر کاک سامی حیزبەکەی هەڵوەشاندەوە چۆوە نێو پارتی و بۆ ماوەیەک بوو بە سکرتێری پارتییش. بەڵام بەهەر حاڵ ئەمن هیچ دەلیلێکم نەدیت کە لەسەر ئەوە بووبێ.

**هێمن کاردۆ:** بەڵام ئەمن نووسراوەم لێ دیتن ئەو وەختی کە جیا ببوونەوە بە دژی ئەو شەڕەی دەیان نووسی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ئەوە ڕاستە، ئەوە دوای جیابوونەوەکە بوو. بەڵام ئەوە کە بەیاننامە دەربکەن و بڵێن لەسەر ئەوە جیا دەبنەوە، وا بزانم شتی وا نەبووە. مەسەلەن لە تاریخدا شتێکی دیکە هەبووە، دوور لەوان. لەنێو چریکەکاندا دەستەیەک هەبوون بەناوی "پێڕەوی بەرنامەی هوییەت" کە کوردەکانی تێدا بوون. شەهید سەعید یەزدانپەنای تێدا بوو. وەختێکی پاش ڕاپەڕینەکەی باشووری کوردستان، دەوڵەتی عێراق هات و موجاهیدینی بەجۆرێک کە کەموزۆری یەکەی ناڕازیتین لە زیندی بزووتنەوەی کورد کۆمەگی ئەرتەشیان کرد. ئەوانە داوایان لە سازمانەکەی خۆیان کرد کە بە ئیعتیراز لەو ڕەفتاری موجاهیدین ئەو چریکی هوییەتە لە شووڕای میللی موقاوەمەت بێتە دەرێ. ڕێبەرایەتیی چریکی هوییەت ئەو کاری قبووڵ نەکرد. ئەو وەختی ئەوان بەیاننێکیان دەرکرد کە ئەوجار ئێمە بە ئیعتیراز لە چریکی هوییەت دێینە دەرێ. هەر لە بەیانی ئیعلانی

مەوجودیەتەکەیاندا ئەوەیان سەبت کرد کە لەسەر ئەوە جیا بوونەوە. ئەمن جاری دیکەشم گوتوە کە ئەوانە لە هەڵوێستێکی زۆر نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌دا دروست بوون. بەڕاستی ئەوە ئەخزێکە بۆ ئەوەی ناوی ئەوا یەکیەتی شۆڕشگێڕان کە دواتر ناوی خۆی گۆڕی بۆ پارتی ئازادی. بەڵام لە بەیانی دروستبوونی پارتی گەلی کوردستاندا، ئەمن شتێکی وام نەدیوە. دوایە کە دەیان نووسی زیاتر جەنبەی تەبلیغاتیی هەبوو.

* حیزب چەندە لە هەڵگیرسانو درێژەکێشانی ئەو شەڕەدا خۆی بە خەتابار دەزانێ؟ ئایا کەسانی جۆراوجۆری نێو ڕیزەکانی حیزب نەخشی خراپیان لەوێدا گێڕاوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ناتوانم هیچ کەس لەنێو حیزبی دێمۆکڕاتدا نەک هەر ناو بەرم بەڵکوو وەبیرم بێتەوە کە لایەنگری ئەوە بووبێ ئەو شەڕە ساز بکرێ. هیچ کارێکی هەڵەشم پێ‌شک نایە. ڕەنگە زۆر بە دڵی وان نەجووڵابنەوە. یان کەسان هەبووبێن لە شەڕدا زۆر بە حەماسەتەوە شەڕی کردبێ. بەڵام بەتایبەتی ئەوانەی دەتوانن ئەو کارە بکەن دەبێ لە ڕەدەی سەرەوە بن. ڕەنگە پێشمەرگەیەک هەڵەش بکا. فەرماندەیەکی پێشمەرگەی لە مەنتەقە هەڵەیەک بکا. بەڵام ئەگەر ڕێبەرایەتیی دوو حیزبەکە یان دوو لایەنەکە حوسنی نییەتیان هەبێ، ئەوە خەفە دەکرێ‌و تەواو دەبێ. لە ڕێبەرایەتیی حیزبی دێمۆکڕاتدا کەسم نەدیوە بیەوێ ئەو شەڕە هەڵایسێ. یان دنەی بدا، یان کاری بۆ بکا. بەڵام دوایە کە شەڕەکە پەیدا بووە، تەبیعەتەن کاریان کردوە. مەسەلەن ڕێبەرایەتیی حیزب تەرحی کێشاوە چۆن سەرکەوێ. یان تەداروکی کردوە. ئەوە زۆر تەبیعی-یە. بەڵام بۆ دەستپێشخەری، لە حیزبی دێمۆکڕاتدا کەسی وام پێ شک نایە.

* ئێوە وەک ڕێبەرایەتیی حیزب چ هەوڵێکتان بۆ کۆتایی شەڕو نێوانناخۆشی دا؟ وەڵامی پارتی چی بوو؟ لایەنەکانی دیکە چۆنیان بیر دەکردەوە چی‌یان کرد بۆ چارەی ئەو گرفتە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لە واقیعدا چونکی شەڕی بەرپرسی، دوای دەرهاتنەوەی جەنازەی بارزانی دەستی پێ کرد. هەوڵەکانی مە دوو جێیەدا بوون. هێندێکی دیکە لە حیزبە کوردی‌یەکان یان نیوە کوردی‌یەکان — چونکی حیزبی شیوعی هی کوردستان نەبوو، هی عێراق بوو — بەڵام ڕێبەرایەتی‌یە کوردی‌یەکەی‌و حیزبی سۆسیالیستی کوردستان هاتنە نێو، موافەقەت کرا کە هەیئەتێک پێک بێنین بۆ تەحقیق لە بارەی دزرانی جەنازەی بارزانی‌یەوە. قەرارەکە ئەوە بوو کە ئێمەش تێدا بین، پارتییش تێدا بێ، لە تەرەف حیزبەوە ئەمن دیاری کرابووم. حیزبی شیوعی‌و سۆسیالیستیش نوێنەریان هەبوو. ئێمە هەیئەتە هاوبەشەکە هەستاین چووینە شنۆیە. چەند ڕۆژێک لەوێ ماینەوەو خەریکی تاقیقات بووین. هەرچی دوو هەیئەتەکەی دیکە واتە شیوعی‌و سۆسیالیست هەوڵیان دلو نەتەمریان نارد، پارتی نوێنەری خۆی نەنارد. بەهیچ جۆر نەهاتنە نێو

هێنەکە. تەنانەت لەوەش زیاتر ئەو کەسەی بەرپرسی پاراستنی گڵکۆی بارزانی بوو، ئەو موتەهەم بوو. دەبوو بێ تاقیقی لێ بکرێو لێی بپرسرێ. هەرچی کردمان پارتی بۆ پێنج دەقیقەش نەیدەدایێ. داستانەکە بە هەموو دەلیلێک وەکوو داستانێکی جەعلی دەچوو. یانی ئەووڵ کەس کە زاهیرەن زانیویەتی تەرمەکە دەرهاتوە ئەو کابرایە بوو. ناوی ڕەحیم میران بوو. ڕۆژی پێشتر هاتوە بە یارێکی گوتوە سبەینێ وەرە ئەو گیاوگژەی دەوروبەری گڵکۆی بارزانیمان بۆ بدروو. - بەهار بوو- چونکە قەرارە دوو سبەی ماڵی بارزانی بێنە سەر گڵکۆکەی. بەری بەیانی بۆخۆی دەچێ بانگی کابرای دەکا دەڵێ مەیە چونکی جەنازەی بارزانییان دزیوە، دەریان هێناوە. بۆخۆشی دەچێتەوە بۆ "ڕاژان".

**عەباس کاریز:** ئەو زانیارییانەتان چۆن دەست کەوت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بە هۆی ئەو کابرایەی، نەک بۆخۆی، بەهۆی برایەکی دیکەی، لەویان پرسی. لەپاشان دیارە ئەویان بە حیزبی دێمۆکراتو شەخسی خوالێخۆشبوو سەید ڕەسووڵی بابی گەورە نیسبەت دا. لەوەی گەڕێن کە حیزبی دێمۆکرات شتی ئاوای دەفەلسەفەدا نەبووە، حیزبی دێمۆکرات گڵکۆی چەمەرانیش یان فەرمانتەیەکی سوپای پاسدارانیش دەوبایەنێو بێحورمەتی بە قەبری هیچ مردوویەک ناکا. ئەوە فەلسەفەی حیزبی دێمۆکرات نیە. پاشان ئەو ڕۆژەی ئەو حادیسەیە ڕووی دا، دوو ڕۆژ پێشتریشو دوو ڕۆژ دوای ئەو ڕۆژەش ئێمە کۆبوونەوەی کۆمیتەی مەرکەزیمان هەبوو لە "دۆڵی دێمۆکراتی". سەید ڕەسووڵی بابی گەورەش وەک ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی بۆخۆی بەشدار بوو. جگە لەوە، ئەمن زۆر جاری دیکەم ئەوە گوتوە. سەید ڕەسووڵ وەکوو ئەندامی حیزب، ئەندامێکی زۆر بەدیسیپلین بوو. هەرچی حیزب پێی گوتبایە مادام لەتوانای‌دا بایە، دەی‌کرد. بەڵام بە ئیمانەوە دەڵێم ئەگەر حیزبی دێمۆکرات بە سەید ڕەسووڵی گوتبا بەردێک بە کێلی مەلا مستەفادا بدە، پێی‌دا نەدەدا. ئەوەندەی مەلا مستەفا خۆش دەویستو ئەوەندەی ڕێز بۆی هەبوو. کەوابوو پێم وایە داستانەکە داتاشراو بوو بۆ تەحریکی ئیحساساتی بارزانییەکانو باقی ئەندامانی پارتی بۆ ئەوەی لەو شەڕەدا قیناکارانە بجووڵێنەوە. ئەمن کە چوومە ڕێ، هەر بۆخۆم چوومە "دزەی مەرگەوەڕ. هەر لەو سەفەرەی‌دا چووم کۆبوونەوەم بەخەڵکی کرد. ئەو داستانەم مەحکووم کردو تەنانەت کە خەبەرەکەیان بۆ کاک ئیدریسو ئەوان بردبۆوە لای کەم لەو بەشەی قسەکانم ڕازی بیوون، بەهەر حاڵ بەڵام بۆ هیچ هاوکارییەک حازر نەبوون. دەگەڵ ئەوەی موافەقەتیان کردبوو بێن دە هەیئەتی تاقیقدا بەشدار بن.

پاشان ئەگەر حیزب ویستبای ئەو تەرمە دەربێنێو ڕای گوێزێ کێ پێشی پێ دەگرت؟ ئاخر ئێمە کە چووین جەنازەکە دەرهاتبوو و ڕاگوێزرابوو بۆ مەرگەوەڕ، نازانم بۆ ڕاژانێ بۆ کوێ. بەڵام جەنازەکە کە

دەرهاتبوو، لە خوارەوە شیوێکی لێ‌بوو و لەو بەریش پنچکە درەویەکی لێ‌بوو. جنازەکە برا بوو لەوێ دانرابوو. دوایە هاتبوونو بردبوویانەوە. بەڕاستی ئەگەر حیزب ئەو کارەی کردبایە بۆ لەوێی دادەنا؟ کێ هەبوو پێشی بگرێ کە ڕای نەگوێزێ؟ بۆ هەر شوێنێکی ویستبای دەی‌برد. ئەوە بەهیچ جۆر ئەسڵو ئەساسی نەبوو. نەحیزب وەکوو حیزبو نە تێکۆشەرانی وەک شەخس، هیچ کەس دەستی تێ‌دا نەبوو. جا ئەوە بوو بە بەهانەی ڕەسمی بۆ هەڵگیرسانی شەڕ. کە شەڕەکەش بەداخەوە ماوەیەکی زۆری کێشاو خەڵکێکی زۆری لە هەر دوو لاوە تێدا شەهید بوون. بەتایبەتی ناوچەیەکی زۆر بەرین بە شەڕی کورد دەگەڵ کورد، کەوتەوە دەستی جمهووری ئیسلامی. ئەمن ناڵێم کۆماری ئیسلامی پێی نەدەکرا، بەڵام بە نرخێکی زۆر زیاترو ماوەیەکی بەردرێژتر ڕەنگ بوو بتوانێ ئەو کارە بکا. لەحاڵێکدا پێشمەرگەی پارتی هەم پارتیزان بوونو هەم تێروتەسەلو پۆشتەو پەرداخ بوون. یانی لە هیچیان کەم نەبوو. خۆ وەکوو مە نەبوون. بە ماشێن دەچوونو بە ماشێن موهیمماتیان بۆ دەچوو. پێشمەرگەی کارکوشتەشیان هەبوو. دیارە شەڕی شاخی بوو، بەڵام ئەوان بۆ هەموو شتێکی لە ئێمە زیاتر بوون. لەناکاودا توانیان هێزەکانیان لەسەر ئێمە خڕ کەنەوەو دەرمانبەرێنن. ئێمە لە سەرتاسەری کوردستان دەرگیری شەڕ بووین. خۆ بۆمان نەدەکرا ئەوێ هەمانە بێ‌هێنە وێ. بەڵام پارتی هەمووی هەر لەوێ بوون. هەرچی پێویست بایە دەیان نارد. هیچ شەڕێکی دیکەیان بە ملەوە نەبوو.

* باسی ئەوە دەکرا پارتی، تۆو دوکتۆر قاسملووی خۆش ناوێ. ئەوە ڕاست بوو؟ ئەگەر نا،بۆ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە لەپێوەندیی سیاسی‌دا ئەو مەسەلانە مەتڕەح نین. ڕابیتەی دیپلۆماسیو سیاسی دەگەڵ دڵداری فەرقی هەیە. دەڵێی دوو کەس یەکتریان خۆش دەوێ، حەز لێک دەکەن. ئەوە شتێکە. بەڵام لە پێوەندیی سیاسی‌دا وا نیە. مەسەلە ئەوەیە پێوەندی‌یەکە چۆنە. خودی پارتی، یان خودی بارزانی ڕەحمەتیی دوکتۆر قاسملووی خۆش ویستوا یان نا، بەلامەوە گرینگ نیە. بەڵام هەروەکی باسم کرد، پێوەندی‌یەکی زۆر موحتەرەمانەی دەگەڵی هەبوو. دەگەڵ شەخسی منیش ئەو وەختی بەرپرسایەتیی سەرەوەم هەبووە لە حیزبدا، پێوەندی‌یەکی پڕ ئیحتیرام هەبووە. بەڵام داخوا پارتی منی خۆش ویستوە یان خۆش نەویستوە، بە نەزەری من ئەوە زۆر موهیم نیە. موهیم ئەو پێوەندی‌یەیە کە دەبەینمانەدا هەبووە. پاشان ئەگەر ئەوە ڕاست بێ، ئەوە دەبێ لەوانی بپرسی، نابێ لە منی بپرسی. ئەمن دەڵێم نە ئەمنو نە بەتەئریقی ئەولا دوکتۆر قاسملوو، هیچ شتێکمان نەکردوە بۆ دوژمنایەتی دەگەڵ پارتی. هیچ شتێک. بەڵام هیچمان نەمان‌ویستوە ببینە پیاوی کەس. ئەمن عەمیقەن ئازادەمنیشم. ڕێزم بۆ هەمووان هەیە، بەڵام هەتا ماوم ناتەوێ ببمە پیاوی کەس.

لە کۆنگرەی ١٣دا ئەمن شتێکم گێڕایەوە. تەرەفی موقابیلی مە ئەوەڵەن هەوڵێکی زۆری دا کۆنگرە لە کۆیە نەگیرێ. چونکە پێی وابوو ئەگەر لە کۆیە بگیرێ ئەمن هێزەکانی یەکێتی داوەت دەکەم بۆ تێکوەپێچانی وان. لەحاڵێکدا هێزەکانی یەکێتی بۆ پاراستنی ئێمە زۆریان مایە لە خۆیان دانا. بێجگە لە کارو زەحمەتەکەی، هەرئەوە کە یەکێتیی نیشتمانی ڕێگا دەدا کۆنگرەی حیزب لە خاکی وی دەلو بە ئیمکاناتی وی بیبەسترێ ئەوە بۆخۆی مایەدانانێکی زۆرە. جا لەوێندا باس کرا. ئەمن قسەیەکم لە دوکتور قاسملووی گێڕایەوە. دوکتور قاسملوو دەی گوت سکرتێری حیزبی دێموکرات، نە لە مۆسکۆیە هەڵ-دەبژێردرێ، نە لە واشینگتۆن. ئەمنیش جارێکی دیکە دەڵێم سکرتێری حیزبی دێموکرات نە لە "قەڵا چوالان" هەڵدەبژێردرێ، نە لە "سەری ڕەش". دەبێ دەو کۆنگرەیەدا هەڵبژێردرێ. ئەمن باوەڕم بەو سەربەخۆیی یە هەیە. وەک چۆن دوکتور قاسملوو باسی پێوەندی یەکانی دەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستیی دەکرد کە نە دوژمنایەتی و نە نۆکەرایەتی، بەڵکوو دۆستایەتی. ئەمنیش ئاوا فکر دەکەمەوە. دەگەڵ پارتی، دەگەڵ یەکێتی، دەگەڵ شیوعی یان سۆسیالیست، دەگەڵ کۆمۆنیست یان ئیسلامی، ئەمن باوەڕم بە دۆستایەتی هەیە. دیارە ئەگەر مەنافیعی هاوبەشمان هەبێ. ئەگەر ئەمانەبن ئیدی دۆستایەتی ناکەین دوژمنایەتیش ناکەین. بەڵام دۆستایەتی ئەوەیە کە سەرفی نەزەر لەوەی کێ گەورەیەو کێ گەورە نیە، هیچیان نۆکەری هیچیان نین. بەڵام دۆستن. کە دۆستن جارێک نەزەریان وەک یەک دەبێ و جارێک وەک یەک نابێ.

ئەگینا ئەمن ئێستاش دەڵێمەوە هەموو کاتێک گوتوومە. ئەو قسەیەم بە پارتی یەکان گوتووە تەنانەت وەختێکی بە کاک مەسعوودیشم گوتوە. گوتوومە ئەمن حازرم دەگەڵ هەموو ئەو کەسانە کە ئەو قسەیە دەکەن دانیشم با پێم بڵێن لە کوێ، لە چ نوقتێکی ڕەسمی دا، لە چ وتارێکدا ئەمن شتێکم گوتوە بە دژی ئەوان. چونکە گوتبوویان گۆیا ئەمن زەددی پارتیم. جارێکی موساحەبەیەکم کردبوو دەگەڵ تەلەڤیزیۆنی یەکێتی. ئەو وەختی پارتی و یەکێتی پێکەوە شەڕیان دەگەڵ (پ.ک.ک) هەبوو. تەلەڤیزیۆنی یەکێتیی نیشتمانی لەو بارەیەوە وتووێژێکی دەگەڵ من کرد. لە نێوخۆماندا دەیانگوت ئەوە بۆ موساحەبەی دەگەڵ وان کردوە، ئەوە سەر بە یەکێتی یە. گوتم بابە نیو سەعاتم دەگەڵ وان قسە کردوە، با تەلەڤیزیۆنی پارتی بێ دوو سەعاتی قسە دەگەڵ دەکەم. بەڵام پارتی زۆری تەجلیل لە قسەکانی من کرد. چونکی دەگەڵ ئەوەی لە تەلەڤیزیۆنی یەکێتی بوو، چەند جار بەحەق و بەمەورید ناوی پارتیم هێناو دیفاعم لە هەڵوێستی وان کرد بەرامبەر بە پ.ک.ک. چونکە پێم وابوو خەتای وانە. هەر گوتیشم بۆ ئەوەی بزانین ئەو شەڕە خەتای کێ یە، شوێنی شەڕەکەی دەلیلێکی باشە. ئەو شەڕە لە خاکی کوردستانی عێڕاقدایە. پارتی و یەکێتی نەچوون لە هەکاری لە (پ.ک.ک) ی بدەن. ئەوان هاتوونەتە ئێرە. جا کاک سامی عەبدوڕڕەحمان گوتبووی ئەوە یەکەمجارە لە مەقەڕڕەکانی پارتی دیمۆکراتدا چاکەی عەبدوڵڵای حەسەن

زادە دەڵێن. بەسەر سووڕەت بۆ خۆیان گوتوویانە یان یەکێک شتێکی دروست کردوە ئانی دەوەیدا بووە کەیفی خۆیەتی با نانی لێبخوا. بەڵام ئەمن نە پێشترو نە ئێستاش هیچ شتێکم دەگەڵ پارتی دێمۆکڕاتی کوردستان نەبووە نیە. دەگەڵ بنەماڵەی بارزانییش نەبووە نیە. نەک بڵێی ئیرادیان لێ نەگرم. ئیرادم هەبووە هەمەو لە ئایندەشدا دەمبێ. هەم لە سەر پارتی، هەم لەسەر بنەماڵەی بارزانی، هەم لەسەر حیزبێکی دیکەو تەنانەت لەسەر حیزبەکەی خۆشم، ئەوە بە مانای دوژمنایەتی نیە کە ئەمن تەزەوم وەک وان نیە یان ڕەخنەم لێیان هەیە. بەڵام وەک دوژمنایەتی هیچ شتێکم دەگەڵ هیچیان نیە.

* کاتی خۆی لە جەنگەی شەڕی دوو لایەندا، حیزبی دێمۆکڕات جوزوەیەکی بە ناوی "خەیانەتەکانی قیادەی مووەققەت بە نەتەوەی کورد" بڵاو کردەوە. کەسانێک نووسینی ئەوجوزوەیە بەجەنابت نیسبەت دەدەن. چیت لەسەر ئەوە هەیە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەو جوزوەیە نووسراوە. کەسانێکیش ئەو کەریمی حیسامی نووسیویەتی کە ئەوە عەبدوڵلای حەسەنزادە نووسیویەتی. ئەمن لێرەدا باسی ئەوە ناکەم کە ئەمن نووسیومە یان نا، بەڵام لە حیزبی سیاسیدا وتارێک کە دەنووسرێ و ئاوڕێکی لەسەر نیە، ئەوە تی ئەو حیزبەیە. دەی مەعلوومە هەر وتارێک یان هەر مەتڵەبێک دەنووسرێ خۆ هەموو حیزب ناوی نووسێ. حیزبێک دە هەزار ئەندامی هەیە، چل هەزار ئەندامی هەیە، خۆ چل هەزار کەس پێکەوە ناوی نووسن. هەموو مەتڵەبێک کە دەنووسرێ، یەک ئەفەر دەی-نووسێ. بەڵام وەختێک حیزبەکە لە ئۆرگانی خۆیدا بڵاوی دەکاتەوە، ئەوە بۆچوونی هەموو حیزبەکەیە نەک بۆچوونی ئەو شەخسە. ئەو وتارە ڕەنگە ئەمن نووسیبێتم یان یەکی دیکە نووسیبێتی. بەڵام وتاری حیزبی دێمۆکڕاتی کوردستانە لەو وەختەدا حیزبی دێمۆکڕات بەشەرێکی تێدا نەبووە موخالیفی بێ. ئەمن ئەو وەختیدا لە ڕادیۆ نەبووم لە ڕۆژنامەش نەبووم. ئەمن ناڵێم ئەمن نەمنووسیوە. ئەوە سەرەتا لە ڕادیۆ بڵاو بۆوە. پاشان وەک جوزوە بڵاو بۆوە. دەتا لە هەوڵەوە لە ڕادیۆ بەش بەش بڵاو دەکرایەوە. نازانم بە چەند بەش بڵاو بۆوە چونکە زۆری بەسەردا تێپەڕیوە. وا بزانم ساڵی ٦١ بوو.

* مامۆستا دۆستانی نیزیکی تۆ لەنێو پارتیدا کێ بوون یان هەن؟ خۆت مەلا مستەفات دیبوو دەتوانی چی لەسەر بڵێی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** دۆستانم هەبوون و هەشمن، تەنانەت زۆر لەو دۆستانە کە لە نێو یەکیەتی نیشتمانییشدا هەمن ئەو وەختە دەگەڵیان بوومە دۆست کە تەنیا پارتی دێمۆکڕاتمان هەبوو، یەکیەتیمان نەبوو. دوایە کە لەت بوون یەکیەتی لێ دروست بووە سۆسیالیست دروست بووە ئەوانە. بەڵام زۆر لەوانەی

دۆستایەتیم دەگەڵیان هەبووە هەر ئی ئەو وەختی بوون. بەشێکیش هەبوون دیارە دوایە دەنێو یەکیەتی‌دا دەگەڵیان ئاشنا بووم بوونە دۆست. ئەوە بەجێی خۆی. ئیستاش هەروایە، ئەمن وەکوو خۆم، خۆم بە دۆستی حیزبەکانی کوردستان دەزانم ئەواندی تێکۆشەرن، هەر هەموویان. ئەو پێوەندی‌یەش کە هەیە ڕەنگە دوورو نیزیکیی هەبێ. بەڵام لەنێو هەموو حیزبەکاندا دۆستم هەن. لە نێو پارتییش‌دا دەکرێ بڵێم لە حیزبەکانی دیکە کەمتر نین. پاشان لەنێو پارتی‌دا ئەمن زۆر جار دەڵێم دۆستایەتی دەگەڵ دڵداری فەرقی هەیە، بەڵام ئەمن هەم خۆم بە دۆستی کاک مەسعوود بارزانی دەزانم لە ڕەسمی‌دا، هەم خۆم بە دۆستی کاک نێچیروان بارزانی دەزانم. هەم خۆم بە دۆستی کاک دڵشاد بارزانی دەزانم کە تێکەڵاویم دەگەڵیان هەبووە. کوڕەکانی دیکەم کەمتر دیون. مەسەلەن کاک سیدادی برای کاک مەسعوودم هەر تەنیا وەک ڕەسمیاتێک دیوە کە بەوی‌دا چوومەتە لای کاک مەسعوود بارزانی. بەڵام دەگەڵ ئەو سێ‌یانە زۆرجار دیدارمان هەبووەو دانیشتووین. ئەمن ئیستا بە دۆستیان دەزانم. لە ڕێبەرایەتی پارتی‌دا هەروەها دۆستی باشم هەن. لەنێو خەڵکی پارتییش‌دا دۆستی باشم هەن. دەگەڵ کاک فەرەنسۆ حەریری ئەو وەختەی ئێمەو پارتی شەڕمان دەگەڵ یەک دەکرد، ئێمە پەیاممان موبادەلە دەکرد. یانی لەنێوان حیزبەو پارتی‌دا شەڕ هەبوو، ئێمە ڕاسپاردەمان دەنێودا هەبوو. چونکی فەرەنسۆ لە ساڵی ١٩٧٤ەوە دۆستم بوو. وەختێکیش کە شەهید بوو ئەمن دەنامەی سەرەخۆشی‌یەکەمدا نووسیم کە فەرەنسۆ لە ئێمە مرد. حەتتا بۆ کاک مەسعوودم نووسی کە ئەو دۆستێکی شەخسیی من بوو.

* یەکەم هەنگاوەکان بۆ لێک‌نیزیک بوونەوە دەگەڵ پارتی کەی‌و چۆن دەستیان پێ کرد؟ ئێوە یەکەم هەنگاوتان هەڵێنایەوە یان ئەوان؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** یەکەم هەنگاوەکان دیارە هەر دوو لامان لە شەڕەکە بێزار بووین. لە پاشانیش زەروورەتی شەڕ نەما. ئەوەندێک موتارەکە دەستی پێ کرد. چونکی لە توختەی تەماس‌دا نەماین تا شەڕ بکەین. جەبهەیەک نەما بۆ شەڕ. ئێمە بیووینە پارتیزان. دەگەڵ ئەوانەش هێندێک حەرەکەت ڕوویان‌دا کە کۆمەگیان کرد بە شتەکە. ڕەنگە ئەخشەو کێشراویش نەبووبن بەڵام زۆر کۆمەگیان کرد. مەسەلەن پێشمەرگەی ئێمە لێیان قەوما لە مەنتەقەی "ئاڵوەتان"و "کونەمشکی"و ئەوانە. لە بەفری‌دا لێیان قەوما. یان دەبوو سەرما بیانبا، یان دەبوو بگیرێن. چووبوون پەنایان بۆ مەقەڕڕەکانی پارتی دێمۆکرات بردبوو. وەریان گرتبوون‌و جێگایان دابوون. شەوێ‌و سبەینێ هەتا ئێوارێ هەر لەلایان بیوون. جا ئێواری وەپێشیان کەوتبوون بۆ بەڵەدی ڕێیان پێ نیشان دابوون هەتا لە ناوچەی خەتەر نەجاتیان دابوون. ئێمە لەنێو ئەرتەشی عێراقدا بووین. ٦٥ پێشمەرگەی پارتی لێیان قەوما، هاتنە نێو ئێمە. نیزیک مانگێکی ئێمە ئەو پێشمەرگانەمان پەنا دا. ئەوە لەحاڵێک‌دا بوو کە ئاشتبوونەوەیەک، موزاکەرەیەک لەبەینماندا نەبوو. لەپاشان کە ئەو وەزعە گۆڕاو ڕاپەڕین نیزیک بۆوە، کاک فەرەنسۆ بە ڕادیۆ پەیامێکی دا بەمن‌و کاک سەعیدی ڕەحمەتی. بە ڕادیۆی

پارتی پەیامێکی دایێ کە ئێمە بەم زووانە دێینە لاتان. ئەمن و کاک سەعید لێی حاڵی بووین. خەڵکی دیکە نەی‌زانیوە پەیامیش هاتوە. هیچ ڕەمزێکیش دەگۆڕێ‌دا نەبوو. پەیامەکە ئاوا بوو: پەیام بۆ باوکی سارا و کوڕی جۆلا. باوکی سارا کاک سەعید بوو، کوڕی جۆلاش ئەمن بووم. دەڵێ بەم زووانە دێینە لاتان. پەیامەکە لە ڕادیۆی پارتی خوێندرابوەوە. دیارە جگە لە ئێمە کەس لێی حاڵی نەبوو. ئێمە ئەو وەختی ڕادیۆکانمان دەگرت و گوێمان لێ بوو. ئیدی ئێمە زۆر بەباشی لێی حاڵی بووین.

بەڵام دواتر کە ڕاپەڕین ئەوجی گرت و هاتنەوە، وەکوو سوڵحێکی عەشایری، سوڵحێکی عەشایری کرا. لەڕاستی‌دا ئەمن ئەو وەختیش ڕازی نەبووم و ئێستاش ڕازی نیم. ئەووەڵێ کاک فەرمەنسۆ هات سەری داین. دواتر پاش ماوەیەکی کەم کاک نێچیرڤان هات سەری داین. ماوەیەکی دیکەی پێوە خرا، ڕەنگە مانگێک، مانگ و نیوێک دواتر کاک مەسعوود هات سەری داین. هەر هات سەری داین. وەک هاتنەماڵ و تەنانەت شتێکی واش نەگوترا. بڵێین داوای لێبووردنێک، شتێک. بەهەر حاڵ وەکوو ئاشتبوونەوەیەک هەر ئاوا گوزەرا. ئەمن پێم وایە ئەوە باش نەبوو. دیارە ئەو وەختی کاک سەعید سکرتێری حیزب بوو. هاتنەوە تەنانەت وەک سوڵحێکی عەشایریش نەبوو. ئەو وەختیم پێ‌خراپ بوو. ئێستێشم پێ‌خراپە. پێم وایە دەبوو شتێکی لەسەر بگوترێ. مەسایلەکە باس بکرێ. مەسەلەن پەیامی داوە دێم بۆسەرداتان هیچی دیکە. بۆخۆم دە مەجلیسەکەی‌دا هەبووم. دەگەڵ فەرمەنسۆی جاری دیکە باس کرا. بەڵام لەو دوو مەجلیسەدا هیچ نەهاتە گۆڕێ. فەقەت سەردانێک بوو و هیچی دیکە. ئەوە بۆخۆی باش بوو، بەڵام دەبوو ڕابردوو مروور بکرێتەوە. تەنانەت جارێکی دەگەڵ کاک فەرمەنسۆی کە گوتم زۆر ڕەفیق بووین، ئیختیلافێکمان بۆ پێک‌هات. گوتم وەزعێکی وا خولقا بوو لە باشووری کوردستان کە لە هەموو ماڵان عەکسی شا و شاهانووی هەبوو. گوتی لە کوردستانی ئێرانیش لە هەموو ماڵان عەکسی سەددامی هەبوو. گوتم وەڵڵا لە ماڵێکیش نەتدیوە. سوێندی ئەوەی ناخۆم لە ڕۆژنامەیەک‌دا عەکسی وی بووبێ. کابرا ڕۆژنامەی دەکڕێ دەبینێ عەکسی سەددامیشی تێدایە. هەروەک لە ماڵەکەی منیش ڕۆژنامەی لێیە عەکسی خومەینی تێدایە. ئەوە نابێتە ئەوە وێنەی خومەینی لە ماڵێ من هەیە. بەڵام پێم وا نیە لە هەموو کوردستانی ئێران عەکسێکی سەددامی لێ بووبێ. دیارە ئیدی زیاتری لەسەر نەڕۆیی.

* بۆ هەتا دوکتور قاسملوو مابوو هەنگاوێکی وا هەڵنەگیرا؟ هەڵوێستی پارتی بەرامبەر بە تیرۆری دوکتور قاسملوو چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەهەر حاڵ لە دەورانی ژیانی دوکتور قاسملوودا ناخۆشی لە بەینی ئەو دوو حیزبەدا هەبوو. دوکتور قاسملوو ئەمن گوتم ڕەنگە هیچی وای نەکردبێ بۆ دوژمنایەتیی پارتی، بەڵام دوکتور

قاسملوو ئەگەر بڵێین لە هەموو کەس زیاتر ڕەچێیەکی سەرانی پارتی بووە هەرچەند لە بەشێکی کوردستاندا خەباتیان نەبووە زیادم نەگوتووە نالێم بنەماڵەی بارزانی چونکی گوتم هەر خودی مەلا مستەفا دوکتۆر قاسملووی وەک ڕێبەری حیزبێک دەناسی. دەی باشە ئەگەر باسی سەرانی کورد بکرابایە، ئەو وەختی دەیان‌گوت: قاسملوو، تاڵەبانی، مەسعوود بارزانی یان مەسەلەن یەکی دیکە. بەڵام یەقینەن لە زۆرجێگا ئەگەر باس کرابێ ناوی قاسملووی لە پێش مام جەلالیشەوە کاک مەسعوودیشەوە بووە. ڕەنگە یەکی دیکە ئەویان وەپێش بخا، بەڵام ئەو سێ ناوە هەر دەهاتن. ناوەکانی ئەوانە موازی بوون و ڕەنگە ئەوە بۆ هەموو کەس خۆش نەبێ. بەڵام بەهەر حاڵ وا بووە. دیارە تا دوکتۆر قاسملوو مابوو هەلومەرجێکی واش نەخولقا. ئەگینا ئەگەر ڕاپەڕینی باشووری کوردستان لە سەردەمی ژیانی دوکتۆردا ڕووی دابایە زۆر وێ دەچوو هەر ئەودەم ڕێبەرانی پارتی سەردانی حیزبی دێموکرات بکەن.

ئەو وەختەی کە دوکتۆر قاسملوو شەهید بوو، بە نووسراو هەڵوێستێکم نەدی. بەڵام ئەمن بۆخۆم لەسەر جەنازەی دوکتۆر قاسملووی بووم. کاک مەسعوود بارزانی نوێنەری خۆی ناردبوو. نازانم ئەوکات دوکتۆر بوو یان نەبوو، بەڵام ئێستا دوکتۆرە. دوکتۆر پیرۆت ئەحمەد نوێنەری وان بوو لە ئۆتریش. لە دوایە بوو بە نوێنەری پارتی لە تاران. لەلایەن کاک مەسعوود بارزانییەوە ئەو هاتبوو لە مەراسمی بەخاک‌سپاردنەکەی‌دا بەشدار بوو. لەبیرم نییە ئەو وەختی دەستە گوڵی دانابێ، بەڵام لەبیرمە ئێمە جارێکی دیکە چووینە سەردانی گڵکۆی دوکتۆر قاسملوو. کە چووین گوڵێکی لێ‌بوو لەسەر گڵکۆکەی بەبێ ئەوەی بەرپرسییش گوترابێ، بەڵام نووسرابوو مەسعوود بارزانی. وا دیار بوو کاک مەسعوود دەستەگوڵێکی ناردبوو بەبێ ئەوەی خەبەرمان بداتێ، بەبێ ئەوەی بەرپرسی ئیعلام بکرێ. دەقی مەتنەکەم لەبیر نییە، بەڵام دیار بوو ئەوە لەلایەن ئەوەوە بوو. تەنانەت ئەگەر کەسێکی دیکەش ناردبێتی نیشانیان داوە کە هی ئەوە. بەڵام ئیدی هیچ نامەیەکی سەرەخۆشی و شتی ئاوامان بۆ نەگەیی، بەیاننامەش ئەمن هیچم نەدی. پێشم وایە هیچیان نەنارد. چونکە ئەگەر هاتبایە حەتمەن بڵاو دەکرایەوە.

* ئایا ڕاستە پارتی ڕێزی لە دوکتۆر سەعید دەگرت؟ بۆ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە دوکتۆر سەعیدیان خۆشتر ویستبێ، بەڵام ڕێزێک کە بۆ دوکتۆر قاسملوویان داناوە قەتیان بۆ دوکتۆر سەعیدی دانەناوە. ڕەنگە ئەوە کە برای مامۆستا هەژاری بووە تەئسیری بووبێ. بەڵام ئەو وەختەی ڕێز دادەنرێ، ئەو ڕێزەی لە دوکتۆر قاسملوویان گرتوە قەت لە دوکتۆر سەعیدیان نەگرتوە.

* دوای ڕاپەڕینی خەڵکی باشووری کوردستان لە ساڵی ١٩٩١ داو هاتنەوەی لایەنە سیاسییەکانی کوردی ئەو بەشە بۆ نێو خەڵک، دیسان حیزبی دێمۆکرات تووشی گیروگرفتی ئەمنییەتیو سیاسی هاتە. هەر چەند بەخۆشییەوە ئەمجارەیان شەڕی ڕاستەوخۆ نەکراو پێوەندییەکان تێک نەدران، بەڵام ناڕاستەوخۆ حیزب هێرشی کرایە سەریو خەڵکی لێ شەهید کرا. لەو جەرەیانەدا تۆ پێت وایە پارتی هیچ دەخالەتێکی هەبووبێ؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** دەپێشدا ئەمن پێم باش نیە پرسیارەکە ئاوا یەک‌لایەنە بێ. حەق وایە ئەو پرسیارە وا بێ کە پارتیو یەکیەتی وەک دوو حیزبی عومدە یان دەسەڵاتدار چ نەخشێکیان هەبووە، هەرچەند خۆ دەزانین ئەو وەختی بەرەی کوردستانی بەسەر ڕادەگەیشت بەڵام هێزبوونی دەسەڵات هەر بەو دوو حیزبە بوو.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ببوورە. ئەمن دواییە لە بەشی خۆیدا تایبەتی دێمە سەر یەکیەتی. ئێستا تەنیا باسی پارتی دەکرێ.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** بە هەرحاڵ ئەمن پێم وایە لەو بارەیەوە باسی هەر دووکیان پێکەوە بکرێ باشترە. ئەمن پێم وایە ئەگەر وەکوو حەقیقەتێکی تاریخی قسان بکەین دەکرێ بڵێین بەڵێ بوویانە، یان نەخێر نەیان بووە. یانی چی؟ ئەو تیرۆرانەی کراون بە دەستی هەر کەس کرابن، بۆ جمهووریی ئیسلامیو بە قازانجی جمهووریی ئیسلامی بووە. چونکی خۆ ئێمە دوژمنی پارتی یان یەکیەتی یان هێزێکی سیاسیی دیکە نەبووین. تەنانەت دوژمنی ئەفرادێکی تایبەتی کوردی عێراقیش نیین. کەوابێ هەرکەس کردبێتی بە قازانجی جمهووریی ئیسلامی بووە، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بە دەستووری ئێران بووە. بەڵام لە عەینی کاتدا ئەگەر بە ئینسافەوە بڵێین، لە زۆربەی هەرەزۆری ئەو تیرۆرانەدا کە لە ئێمە کراون ئەو دوو حیزبە دەسەڵاتدارە نە دەستووریان داوە نە لەپێشدا ئاگادار بوون. کەسانێک کە بۆ ماڵی دنیایە ئەو کارانە دەکەن چ کوردی ئێران بووبن چ کوردی عێراق بووبن چ بە ئیحتیماڵێکی زۆر کەم پیاوانی جمهووریی ئیسلامی لە غەیری کورد بووبن، ئەوانە ئەو کارانەیان کردوە بۆ ئەوەی پووڵێک لە ئێران وەر بگرن. قسوور ئەگەر بێتەوە سەر یەکیەتیو پارتی بە باوەڕی من، لەو بارەیەوە دێتە سەریان کە دەگەڵ ئەوەی حاکم بوون لەو وڵاتە، زیاد لەحەد ڕێگایان بۆ ڕەمبازێنی پیاوانی جمهووریی ئیسلامی ئاوەڵا کردبوو. تەنانەت زۆریان بە وەرەقەی پارتی یان یەکیەتی هاتوچۆیان دەکرد. تەنانەت مەسەلەن قاتڵەکانی دوکتور قاسملووی وەکوو هەموو شتێکی کە ئەوکات دەیان گوت ٥٠-٥٠ بەش کراوە، ئەوانیش ئاوا بەش کرابوون، پاش تیرۆری دوکتور قاسملووی محمد جعفر صحرارودی هاتوچۆی یەکیەتیی دەکرد، حاجی مستەفەوی هاتوچۆی پارتیی دەکرد. تەنانەت جارێکیان حاجی مستەفەوی بەبەر لوولەی تفەنگی پێشمەرگەکانی ئێمەدا ڕابرد. دەیان توانی لێیدەن بی کوژن. بەڵام

نەکرا چونکی ئەوە دەبووە تەقەکردن لەپێشمەرگەی پارتی. وەکی دیکەش کە دەهاتن لە چۆلگەیەکی را هەڵ نەکەوت کە بکەونە بەر لوولەی چەکی ئێمە.

لە هێندێک مەورێدیشدا هەبووە کە کارەکە بە دەستی ئەفرادی وان کراوە، بەڵام لێپرسینەوەی لێ نەکراوە. مەسەلەن پێشمەرگەیەکی ئازەربایجانیمان هەبوو پێم وایە دەتناسی، "ئەحمەدئاغا" لە سلێمانی تیرۆر کرا. لە واقیعدا زۆریش وا دیار بوو بە دەستووری جمهووریی ئیسلامی تیرۆر نەکراوە. بەڵام ماشێنێکی باشی پێ بوو کە لەندکرۆزێرێکی نوێ بوو. بۆ ئەوەی ماشێنەکەی بەرن لێیاندا کوشتیان. لەپاشان دەرکەوت سێ کەس بوون هەر سێکیان ئی یەکیەتیی نیشتمانی بوون. یەکیەتی کە زانی، بەزامیر گرتنی. دوایە هاتنە لای ئێمە هەروا بۆ سەردان. لەوێ ئەو باسە کرا. یانی شتێکی ئاوا لەلایەن ئێمەوە مەترەح کرا کە بابە کوشتنی ئەوانە، ئەحمەدئاغای بۆ ئێمە ناگەڕێنێتەوە. داوای ئەوەتان لێ ناکەین کە ئیعدامیان بکەن. چونکە ئەو وەختی هەر بۆخۆیان حوکمیان دەدا. بەڵام پێشنیار دەکەین حوکمی ئیعدامیان بدەن. ئیعلانیشی بکەن کە ئەوانە بە تۆڵەی قەتلی پێشمەرگەی حیزبی دێمۆکرات، حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرچووە. ئەو وەختی ئێمە وەک حیزب پێشنیار دەکەین کە لەبەر خاتری پێوەندیی دۆستانەی نێوان حیزبی دێمۆکراتو یەکیەتیی نیشتمانی، حوکمی ئەوانە کەم بکەنەوە بۆ حەپسی ئەبەد. کەچی پاش ماوەیەک لەبەر گوێمان لێبوو لە ڕادیۆ کە ئەوانە مەحکووم بە ئیعدام کران بەڵام حیزبی دێمۆکراتی کوردستان بەخشینی. یانی لەجیاتی ئەوەی ئیعلانی بکەن کە حوکمی ئیعدامیان دراوە حیزبی دێمۆکرات ئەو داوایەی کردووە ئەوە هەر یەکسەر شتەکەیان ئاوا لێ کرد. حەپسەکەیان بوو بە ئەبەدو ماوەیەکی پێوە خرا کە ئەوانە ئازاد بوون. جارێکی نامەیەکمان بۆ هات. نامەکە پێم وایە ڕووی لەمن بوو ئەگەر لەبیرم بێ. ئەمن سکرتێری حیزب بووم. ناوی ئەو دۆستەمان کە دۆستێکی یەکجار بەڕێزی حیزبی دێمۆکراتە،با مەحفووز بێ. نووسیبووی ئەوە ئەو برادەرانە هەر زیندانینو ئەوانەو عەفوویان بکەن بۆ ئەوەی ئازاد بن. بۆ ئەوەی خزمەت بکەنو تەرفیعی دەرەجە بکەنو لەو شتانە. ئەمن جوابێکم نووسیەوە زۆر دۆستانە بەڵام زۆر سەریح، نووسیم ئێمە دەزانین ئەوانە لەمێژە ئازادن. دەزانین لە کوێ کار دەکەن. ژمارەی ئوتۆمبیلەکانیشیان دەزانین. ئەگەر پێویستە با هەمووانتان پێ بڵێین. بەڵام ئیدی واش نا، قاتڵەکانی ڕەفیقی مە ئازاد بکەن ئیستا داوا بکەن ئێمە شتێکیشیان بە دەستی بدەینێ. داوا بکەین سزایان لەسەر هەڵگیرێو تەرفیعی دەرەجە بکرێنو لەو شتانە. ئیدی بێدەنگیی لێ کراو ئەوانە سزا نەدران.

حادیسەی زۆر جێی داخی دیکە کە هەر لەلای یەکیەتیی نیشتمانی ڕوویدا.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا تکایە جارێ باسی لای پارتی بکە. دوایە دەچینە لای یەکیەتی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** تا پێم خۆشنییە ئەوەی بیوژم، ئەوەی دەبێ باس بکەم. حادیسەیەکی زۆر تاڵی دیکە ئەوە بوو کە لە دەروازەی کۆیە قەوما. ئەوەی لە دەروازەی شاری کۆیە قەوما، ئیدی ئەوانە تیرۆریست نەبوون، ئەوانە چەند بەکرێگیراوێک نەبوون. ئەوانە پێشمەرگەی یەکیەتیی نیشتمانی بوون کە لە دەروازەی شاری کۆیەو ئەوەی پێی دەڵێن سەیتەرە. لە سەیتەرەی ٤ کەس لە ماشێنێکی‌دان کە هیچیان تفەنگیان پێ نیە. دوویان تفەنگیان پێ بوو بەڵام تفەنگەکانیان لە سندووقی ماشێنەکەدا بوون. ڕاوەستاون بانگیان دەکەن. دوایە ماشێنەکەیان نیشان دام بۆخۆم نەمدیتە شۆفێری ماشێنەکە کە مەرحوومی سەید مەنسووری ئاسری بوو دەرگاکەی دەکاتەوە. لاقی چەپی دێنێتە دەرێ‌و لاقی ڕاستی هەر دەوێ‌دایە کە لێ‌یان دەدەن هەر چواریان دەکوژن. ئەوە مەعلووم بوو ئی یەکیەتیی نیشتمانین. ئێستا یەکیەتیی نیشتمانی دەکرێ بڵێی دەستووری نەداوە، بەڵام ئەوان کوشتوویانن. کە ئاوا بە سەراحەت دەکوژرێ، بەڵام دوایە یەکیەتی لێی ناپرسێتەوە موحاکەمەی ناکا. ئیدی ئەوە مەسئوولیەتەکەی ئی یەکیەتیی نیشتمانی‌یە. تەنانەت هاتن پێشنیاریان کرد با هەیئەتێکی لێکۆڵینەوە دابنێین. ئێمە نەچووین. قبووڵمان نەکرد. پێمان گوتن. گوتمان هەیئەتی موشتەرەکی مە چیە؟ ئێمە لەکێ بپرسین؟ خەڵکەکە هەموو هی ئێوەن. ئێمە چوار کەسمان بوون هەر چوارتان کوشتوون. هەیئەتی موشتەرەک دەتوانێ چی بکا؟ هەر لەو کەسانە دەپرسن کە کوشتوویانن. لە دوایە دادگایەکیان بۆ تەشکیل دان. کە لەوێ ئەوانە دیفاع دەکەن کە بەڵێ ئێمە لەژێر ئاڵای سەوزی یەکیەتیی نیشتمانی‌دا دیفاعمان لە سەروەریی خەڵکەو نازانم نەتەوە ئەوە کردووە. پاش ماوەیەک کە بەزاهیر زیندانی بوون بەردران.

لەپاشان لە مەنتەقەی پارتی‌دا. لەوێش خەڵکێکی زۆرمان لێ کوژرا. بەڵام لە زۆربەی هەرە زۆریاندا گلەیی لەپارتی هەر ئەوەیە کە ئەمنییەتەکەی نەپاراستوە. ئەرەحانیان بەوان داوە بە ئازادی بێن‌و بچن بە وەتەنەوە هیچ بەربەستێکیان نەبێ. جا ئەمن شتێکم لەبیر چوو لەبارەی ئەوەی یەکیەتیی نیشتمانی‌دا. ئەو چوار کەسەمان کە شەهید بوون لەسلێمانی ڕا دەهاتنەوە بۆ کۆیە کە لە دەرکانێ کەوتنە بەر حەملەی تیرۆریستەکانی جمهووریی ئیسلامی. لەوێ بەدەست هاتن. شەهید مەنسووری فەتاحی هەرلەوێ شەهید بوو. دوو پێشمەرگەشمان بریندار بوون. بەڵام دەگەڵ ئەوەی کە شەهیدیشیان دابوو، بریندارشیان هەبوو، وەدەست هاتبوونو ڕاویان نابوونو ماشێنێکیان پێ بەجێ هێشتبوون. کە ماشێنەکەیان هێنایە ئێرە تەماشا دەکەین ئەوە وەرەقەیان پێ‌یە، وەرەقەی یەکیەتیی نیشتمانی‌و بەئازادی هاتوچۆ دەکەن. هەموویشی ئیتلاعاتی ئێرانین کە دیارە ئەفەرەکان نەگیران. هەڵاتبوون چووبوونە دەرکانێ گوتبوویان ئێمە ئێرەدا ڕۆیشتووین ئاقڵ ئاقڵ هیچمان نەکردووە. کەچی ئەو تیرۆریستانەی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان هاتوونە سەر ڕێمان‌و لێیان داوین‌و ماشێنیان لێ ئەستاندووین. چوزانم درۆزن‌و بێ‌ئابڕوون، ڕەنگە شتی دیکەشیان گوتبێ.

بەهەر حاڵ بگەڕێنەوە لای پارتی. هی پارتی زۆربەی گلەیی‌یەکە هەروەک گوتم تەنیا ئەو بەشەیەتی.

**عەباس کاردۆ:** یانی ڕاستەوخۆ هیچ هێرشێک نەکراوە لە لایەن ئەوانەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** زۆربەی هەر ئەوەیە. مەسئولیەتی پارتی هەر ئەوەیە کە ئەمنیەتیان نەپاراستووە ڕێگای ئەوانیان ئازاد کردوە. بەڵام لەوێشدا دوو مەورید هەن. دوو مەوریدی زۆر وارید. برادەرانی ئێمە لە "باسرمە"ی بوون لە لای هەریرو باتاسان. شەوێکی نازانم بۆ ماوەی چەندی، بەڵام ١٥٠ پێشمەرگەی پارتی ئەو مەقەڕانەیان بە ئار پی جی و چەکی جۆراوجۆر گوللەباران کرد. تەنیا فیلمهەڵگرەکە ئێرانی بوو. بەخۆشی‌یەوە کەسمان لێ شەهید نەبوو، هەشت، نۆ بریندارمان هەبوون. بەتەسادوف ئەوڕاقیان لێ بەجێ ما. کەسێکیان لێ ئەسیر کرا. هەموومان بردن لەپێش کاک مەسعوود بارزانیمان دانان. قابیلی حاشالێکردن نەبوو. بەڵام لەسەر ئەوە هیچ کەسیان سزا نەدا. دیارە هەڕەشەیان کردبوو کە ئەگەر ئەوەمان نەدەنەوە چ دەکەین و لێتان دەدەین و ئەوە. لەو بارەیەوە ئەوەیان بەخۆشی گوزەرا. بەڕەسمی نامەیان نووسیبوو کە ئەو برادەری ئێمە کە گرتووتانە ئەگەر ئازادی نەکەن لێتان دەدەین و تەفروتوناتان دەکەین.

لە حادیسەیەکی دیکەدا لە جێژنیکان بەکرێگیراوانی ڕێژیم هاتن لە مەیدانی فووتباڵی لە خەڵکیان دا، ٥ کەسیان لێ شەهید کردن و ٥، ٦ کەسیان بریندار کردن. وەدوایان کەوتین کە بیانگرین، پێشمەرگەی پارتی نەیانهێشت تاقیبیان بکەین. لەپاشان لە ڕێبەری پارتی‌یەوە تێلگرافێک بۆ ئێمە هات کە ئەوانە گیراون نەتیجەکەی هەرچی بێ ئێمە سزایان دەدەین. سەروبەندی نەورۆزی بوو. ئەمن لەپەیامی نەورۆزیدا ئیشارەم بەو هەڵوێستە کردو سپاسم لە بەڕێز کاک مەسعوود بارزانی کرد کە کارێکی ئاوای کردوە بۆ ئەوەی وەک شتێک سەبتی بکەم لەتاریخدا. بەڵام نە کەس موجازات کراو نە لە گوڵ کاڵتریان پێ گوتن و تەنانەت ئەو قسەیەش کە بۆخۆی نووسیبوی ئەوانە گیراون سزایان دەدەین، ئەو قسەیەش وەرگیرایەوە. گوتیان نازانین بەکوێدا ڕۆیشتوون و دەرباز بوون. داخوا چ تونێلێکیان لێ‌داوە لە جێژنیکانەوە بۆ تەمەرچیان. ئەوە ناکرێ بڵێی تەسادوف بوو. ئەوە هیچی تەسادوف نەبوو. ئەوەی دیکە کە گوتم ئی باسرمەی هەر پێشمەرگەی پارتی بوون. ئەفەریان لێ بەجێ ما. ئەوڕاقی هاوکاری دەگەڵ ئێرانی‌یان لێ گیرا. پاشان نامەیان نووسیبوو بە هەڕەشە کە ئەگەر بەرەڵایان نەکەن لێتان دەدەین و تەفروتوناتان دەکەین. ئەوە هەمووی مەدرەک بوون. ئیدی لەوانەدا ناکرێ بڵێی خەتای ڕاستەوخۆی ئەوانی تێدا نەبووە. بەڵام لە بەشی زۆری ئەوانی دیکەدا، خەتایەکە هەر ئەوەیە کە کوردستانیان کردبووە جەولانگای پیاوانی جمهووری ئیسلامی هەتا بەکەیفی خۆیان ڕەمبازێنی تێدا بکەن و خەڵکی تێدا بکوژن.

* بە گشتی پێوەندییەکانی حیزب و پارتی بە درێژایی مێژووی خەباتیان تووشی هەوراز و لێژی زۆر هاتوە. بەڵام وا دیارە عەقڵی سەلیم سەرەنجام بەسەر هەردووک لادا زاڵ بووە و تێ گەیشتوون دۆستایەتییان هەم لازمە و هەم بەقازانج. ئاستی پێوەندییەکانی دوو لایەن لەحاڵی حازردا چۆنە و داهاتوویان چۆن دەبینی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم خۆشە بێ ئەوەی تەعەسسوب بەخەرج بدەم لە ئەووەڵەوە ئەوەی بڵێم کە هەر لە سەرەتاوە حیزبی دێموکرات قەت سیاسەتی ئەوە نەبووە شەڕی دەگەڵ پارتی یان هیچ حیزبێکی دیکە لێ پەیدا بێ، هەرچەند ناتوانم بڵێم هیچ کەسێکی حیزبی دێموکرات قەت زیادەڕۆیی نەکردوە. قەت حیزبی دێموکرات دەستپێشخەر نەبووە و قەتیش زیادەڕۆیی نەکردوە. بەڵام وەکوو فەرمووت هەستی مەسئوولیەت و عەقڵی سەلیم، لەپاشان زیاتر زاڵ بوو. ئەوشتانەی ئێستا باسیان کردن دوایە بەجۆرێک لەجۆرەکان لاپەڕەکەیان هەڵدرایەوە و ئەو شەڕی براکوژییە تەواو بوو.

ئەوەی کە ئێستا هەیە، هەرچەند ئەمن ئەوە بۆ پێنج ساڵ دەچێ لە ڕێبەریی حیزبدا نەماوم، بەتایبەت لە دوای کۆنگرەی چاردەوە کە ئەوە سێ ساڵی بەسەردا ڕادەبرێ، ئەمن هیچ پێوەندییەکی دوورو نێزیکم دەگەڵ تەسمیمگیریی حیزب و پێوەندییەکانی نیە. بەڵام چونکە لێرە و لەڕێبەریی حیزب نێزیکم کەم و زۆر ئاگاداری شتەکان هەم. ئێستا بەخۆشییەوە پێوەندیی نێوان حیزبی دێموکراتی کوردستان و پارتی دێموکراتی کوردستان زۆر باشە، زۆر لە گەشەدایە. تەفاهوم و حوسنی نیەت بەرقەرارە. ناکرێ پیاو هیچ شتێک بە موتڵەقی پێشبینی بکا. دەکرێ خودا نەخواستە ڕۆژێکی ئەو پێوەندییانە دیسان تێکبچن، بە دەلیلێکی حەق یان ناحەق، بەڵام ئەمن وا فکر دەکەمەوە لە ئایندەشدا ئەو پێوەندییانە هەر باش دەبن. چونکی پێم وایە هەموو لایەنەکان تێ گەیشتوون ئەگەر لە مەیدانی شەڕی براکوژیدا سەرکەوتنێک بەدەست بێنن، لە مەیدانی سیاسەت و قەزاوەتی بیروڕای خەڵکی کوردستان و ئازادیخوازاندا، هیچ لایەنێک سەرکەوتن لە شەڕی براکوژیدا بەدەست نایەنن. شەڕی براکوژی بۆ هەموان، تەنیا پەشیمانی و تەنیا زەرەروزیان بۆ خۆیان و میللەتی بەدواوەیە. ئەوە پێم وایە هەر بۆ ئێمە و پارتی نیە. بۆ پارتی و یەکێتیشە کە بەداخەوە تووشی شەڕێکی دوورودرێژ و پڕزیان هاتن. ئەوانیش وان. ئێستێ ئەوەی ئەمن ئومێدم پێی هەیە کە ئەو ئاشتی و تەباییە پارێزرێ، ئەوە نیە کە ئەوان نەزەریان لەسەر یەکتری بەتەواوی گۆڕاوە. ئەگەر گۆڕانێکی بەسەردا هاتبێ، گۆڕانەکە زۆر کەمە. بەڵام بەخۆشییەوە هەر دوو لا تێ گەیشتوون کە یەکتریان پێ لەبەین ناچێ و پاشان ئەو شەڕی براکوژییە غەیری زەرەرگەیاندن بەخەڵکی کورد و خۆشیان هیچ فایدەیەکی دیکەی نیە. پێم وایە لەبەر ئەوە دەبێ ئومێدەوار بین کە هیچ لایەنێک جارێکی دیکە بۆ حەللی مەسایلی خۆیان پەنا بۆ شەڕی براکوژی نەبەن.

* ئاخرین پرسیار لەسەر پارتی دێموکراتی کوردستان. دیارە هەر لایەنێکی سیاسی خاڵی بەهێزو لاوازی هەن. جەنابت سەرجەم تێکۆشانی پارتی دێموکرات چۆن هەڵ دەسەنگێنی؟ تای تەرازوو بەکام لادا دەکەوێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەگەر یەکێک لە ڕووی عینادەوە باسی ئەوە بکا - کە بەداخەوە گوترایشە - کە تەواوی عومری پارتی خیانەت بووە، ئەگەر ئەوەش بڵێ، لەواقیعدا قسەی بێ مانا دەکا. دەنا مەعلوومە ئەگەر بارە موسبەتو مەنفی‌یەکانی کارو کردەوەی پارتی دێموکراتی کوردستان هەڵسەنگێنین بارە موسبەتەکانی زۆر زۆر زیاترن. حیزبێک کە ئەوە بۆ ٦٤ ساڵ دەچێ دەخەباتی ئازادیخوازانەی نەتەوەی کورددایە. مایەیەکی زۆر ئاڵای خەباتی ئازادیخوازیی لە باشووری کوردستان هەر بەدەست پارتی‌یەوە بووە. ئێستاش نەک هەر یەکێک لە دوو هێزی هەرە گەورەو عومدەی باشووری کوردستانە کە دە دەسەڵاتدا بەشدارن لە ئاخر هەڵبژاردندا دەرکەوتوە کە هێزی عومدەتریشە لە بەینی ئەو دووانەدا. چونکی کە بەجودا وارید بوون لە نەتیجەی ئینتیخاباتەکەدا دەرکەوتوە کە هێزی عومدەیە. هەرچەند با بڵێین هێندێکیشی ناتەبیعی بوو چونکە ئەو ئیتیهامانەی لێ‌دراون. بەڵام بەهەر حاڵ ئاکامی هەڵبژاردن دەری‌خستوە کە هێزی عومدەیە. کەوابێ کارنامەی پارتی دەگەڵ هەموو هەڵەو کەموکوڕی‌یەکانی، کارنامەیەکە کە دەچێتە خانەی خزمەت بە ئامانجەکانی کوردو قازانجی کورد. هەر تەرازوێکی دیکەی غەیری ئەوە، هەم دوژمنانەیە هەم بێ‌مەنتیقە. خەڵک دانیشتوە هیچ ناکا، مەعلوومە غەڵەتی ناکا. قسەیەکی جوان هەیە دەڵێ: ئیملای نەنووسراو غەڵەتی نیە، وایە، کەسێک کە هیچ کاری نەکردبێ هیچ غەڵەتان ناکا. بەڵام ئەوان کە کاریان کردوە، هەڵەیان بووەو هەڵەی زۆر خراپیشیان بوو، هەڵەی کوشندەشیان بووە. کەمتوزۆر ئیشارەمان پێ کردن. هەر ئەوەی بە نیسبەت حیزبی دێموکراتی کوردستان کردیان لە ساڵەکانی ٤٧-٤٦داو لە وەختی دیکەشدا و بەتایبەتی دوای ڕووخانی ڕێژیمی پاشایەتی، هەڵەی گەورە بوون. هەروەها بەشی خۆیان لە شەڕی براکوژی-دا. چووزانم لە تەعامولی دیکەدا، تەوانەیان هەیە. بەڵام لە هەڵسەنگاندندا، ئەو کارنامەیە لە کوللییەتی خۆیدا کارنامەیەکی ئیشتباتی و نەتەوەیی‌یە.

## ئیسان لەسەر ئاڵوگۆڕەکانی نێو حیزبی دێموکڕات

**عەباس کاردۆ:** دەگەڕێنەوە نێو خۆی حیزب و تێکۆشانی خۆت. هەر وەک لە مێژووی حیزبدا تۆمار کراوە ڕەوتی مۆدێڕنکردن و بەبەرنامەکردنی حیزب دوای کۆنگرەی ٣ واتە ١٣٥٢ی هەتاوی دەستی پێ کرد. ئەوانەی ئەخشی چالاکیان لەو گۆڕانەدا هەبوو کێ بوون؟ بەرنامەی حیزب چۆن نووسراو بۆ ئەوە کەڵک لە چی وەرگیرا؟ ئایا بەرنامەی حیزبە کۆمۆنیستی‌یەکان چەندە کاریگەری‌یان لەسەر داڕێژرانی بەرنامەی حیزب هەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەوتەکە ناوی لێ‌نەنرابوو ڕەوتی مۆدێڕنیزەکردنی حیزب. ئەو کەلیمانە زۆر تازەن. ئەوە بەم شێوەیە دانەنرا بوو. دیارە مۆدێڕنیزم زۆر کۆنە بەڵام ئەوە کە لەنێو کورددا بازەڵێتی پێ‌دەکەن ئەوە شەش، حەوت ساڵێکە مۆدێڕنیزم و پۆست مۆدێڕنیزم ئەوانە دەستیان پێ کردوە. ئەو وەختی ئەوە نەبوو. بەڵکوو هەوڵێک بوو بۆ گێڕانەوەی ڕێگایەک کە حیزب پێشتر لەسەری دامەزرابوو، ڕەنگە ئێستا بۆچوونێکی دیکەی لەسەر هەبێ، بەڵام حیزبی دێموکڕات وەختێک دامەزراوە بێجگە لە ئامانجە نیشتمانی و نەتەوەیی‌یەکانی، لە پێوەندیی دەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی و بەرەی دێموکڕاسیخوازی بە ماناکەی گەلی‌دا دروست بوو. یانی جۆرێک ئەحزابی چەپی دێموکڕات بوو. لە ماوەی ساڵەکانی ١٣٣٩ هەتا ١٣٤٩دا کە تەقریبەن دەتوانین بە دەورەی حاکمییەتی خەتی خوالێخۆشبوو عەبدوڵڵای ئیسحاقی حیساب بکەین دەکرێ بڵێین لادانێک، لەو ڕێبازە هەبوو. ئەو هەوڵە لە باری سیاسی‌یەوە هەوڵێک بوو بۆ گەڕانەوە بۆسەر ئەو خەتە فکری‌یە کە حیزبی دێموکڕات لەسەری دامەزراوە. لە دوایەش لە نێوخۆی حیزب و کاری تەشکیلاتی‌دا، بۆ جێگیرکردنی ئوسوولی حیزبی پەیڕەوی لێ‌دەکرا. ئەمن جاری دیکەشم گوتوە ئێستاش دەی‌ڵێم. باوەڕ بکە هیچمان لە ئوسوولی حیزبی نەدەزانی. چونکی قەت لە مەکتەبێکی حیزبی‌دا نەمانخوێندبوو. بۆم باس کردی کە ساڵی ١٣٤٣ بۆ یەکەم‌جار شتێکم دیوە بە ناوی پێڕەو و پرۆگرامی حیزب کە دوایە تێ گەیشتم زۆریش خراپ نووسرابوو. ماوەیەکی زۆر مەرجەعی تەقلیدی ئێمە - دەگەڵ هەموو ڕێزم بۆی کە دۆستێ و خۆشم دەوێ - کاک ئەمیری قازی بوو. ئەو چیی گوتبایە بۆ من قانوون بوو. بۆ شەخسی خۆم، چونکی هیچی دیکەم نەدەزانی. ئەویش لەنێو حیزبدا بوو و ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی بوو.

بەڵام دوای ئەو مەرحەلەیە کە دیارە ساڵی ١٣٤٩ دەستی پێ کرد، وردە وردە تێ گەیشتم کە تا لە دەرکی ئوسوولی حیزبی‌دا، لەپیادەکردنی ئوسوولی حیزبی‌دا ئیشکالاتمان زۆر بووە. ئەوە کە کێ هەبوو، پێم‌خۆشە کەمێک واقیعبینانە بی‌بینین. نە ئینکاری نەقشی یەکێک بکەین، نە هەموو شانازی‌یەکان تەنیا بدەین بە یەکێک. حەقیقەتەکەی ئەوەیە. ئەوەی لەو گەڕانەوەیەدا، ئەوەی لە عەرەبی‌و فارسی‌دا پێی دەڵێن "حصه اسد" واتە بەشی شێری پێ‌دەبڕا، دوکتۆر قاسملوو بوو. بۆ زۆربەی شتەکان، هەم ئەزموونی حیزبایەتیی هەبوو لە حیزبی خۆی‌و لە حیزبی دووهەمی خۆی کە حیزبی توودە بوو، لەسەر حیزبەکانی دیکەش موتالەعاتی زۆر بوو. لە دنیای موتەمەددین‌دا ژیابوو. هەم لەهەمین حاڵ‌دا ئینسانێکی فازیل‌و بەهەمەتی‌و بەئیستیدلال و ئەوانە بوو. بەڵام ئیدی دوکتۆر قاسملوو بەتەنێ نەبوو. دوکتۆر قاسملوو کەسانێکی بە دەورەوە بوون کە هەرکەسە بە تۆڕای خۆی‌و بە پێی پێگەی کۆمەڵایەتیی خۆی‌و توانای خۆی بەشدار بوون. دەتوانین بڵێین ئەوانە کە ئەو وەختی ئەندامی کۆمیتە ناوەندی‌یەکی دەستکرد بوون، هەموویان تەئسیریان هەبووە. یەکێک زۆرتر، یەکێک کەمتر. ئەوانە بریتین لە مەرحوومی — بەداخەوە زۆربەیان نەماون — کاک کەریمی حیسامی، کاک حەمەدەمینی سیراجی کە دوو، سێ ڕۆژ پێش کۆچی دوایی کرد. پێم وایە ئەمڕۆ ٣١ی مانگی مەیە. ئەو ڕۆژی ٢٩ی مەی ٢٠١٠ کۆچی دوایی کرد. هێمن بوو. یوسفی ڕیزوانی بوو، لەوانەش کە ئازانم بۆ بەدشانسی کوردە یان بۆ خۆشانسیی کوردە کە ماون (بە پێکەنینەوە)، کاک حەسەنی ڕەستگارو عەبدوڵڵای حەسەنزادە بوون. بەتایبەتی لەنێو ئەوانەش‌دا ڕەنگە سێ، چوار کەسێکمان فەعالتر بووبین. کەریمی حیسامی، حەمەدەمینی سیراجی، هێمن‌و عەبدوڵڵای حەسەنزادە فەعالتر بوون چونکی ئەندامی دەفتەری سیاسی بوون. ئەوانە ڕەنگە پتر فەعال بووبن لە دانانی بەرنامەو ئەساسنامەو دەرکردنی ڕۆژنامەدا، یان بڵێین بۆ چەسپاندنی ئەو ئوسوولە لەسەر کاغەزو بەتیئۆری.

ئەوە کە داخوا بۆ ئەوە لەچی کەڵک وەرگیرا. گەڵاڵەی بەرنامەو ئەساسنامە دوکتۆر قاسملوو ئامادەی کرد. دوکتۆر قاسملوو پێجگە لەوەی زمانەکانی لای خۆمانی دەزانین، زمانەکانی دەرەوشی دەناسین. پێوەندی‌یەکی بەرینیشی دەگەڵ ئەحزابی کۆمۆنیست و دێمۆکرات لە دنیای دەرەوەدا هەبوو. ئەو وەختی دەگەڵ سۆسیالیستەکان ڕەنگە پێوەندی‌یەکی وای نەبووبێ. چونکی ساڵەکانی پێش ئەو وەختی لە چێکۆسلۆڤاکی دەژیا. عەمەلەن ئەندامی حیزبی توودە بوو. لە هەموو شتەکانی حیزبی توودەدا بەشدار بوو، خۆ ئەوە عەیب نیە. جاروبار هێندێک کەس حاشای لێ‌دەکەن. ئەمنیش ماوەی چەند ساڵان ئەندامی حیزبی توودە بووم بەڵام ئەمن ئەیدەزانی. چونکی لە ساڵی ١٣٢٧،٢٨وە یەکیەتیی تەشکیلاتی دروست ببوو هەتا ساڵی ١٣٣٤ کە لە کۆنفرانسی یەکەم‌دا بڕیاریان داوە ئەو پێوەندی‌یە بپچڕێ. ئەمن ئەو کات ئاگام لێ نەبووە دوایەم زانیوە. لەبەر ئەوە دەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی‌و ئەحزابی کۆمۆنیستی پتر سەروکاری هەبوو. ئەمن دەزانم بەرنامەو

ئەساسنامەی زۆر لە حیزبە کۆمۆنیستییەکانی موتالەعە کردبوو. بەرنامەو ئەساسنامەی پارتی دیمۆکراتی کوردستانی موتالەعە کردبوو. ئی ئەحزابی ئێرانی بە تایبەتی حیزبی تودەی موتالەعە کردبوو. لە ئاکامی هەمووی ئەوانەدا گەڵاڵەی بەرنامەو ئەساسنامەی حیزبی دێموکراتی داڕشتبوو. دیارە دوکتور قاسملوو پیاوێکی زیرەکەو لەعەینی حاڵدا واقیعبین بوو. هەربۆیە ئەوەی لەبەر چاو بوو کە بۆ کوردی دەنووسێ. زۆر شتی وای هێنابوو کە دەگەڵ کۆمەڵی کوردەواری بێتەوە. بەڵام هێندێک شتیش کە ئەو وەختی باوی بوو، بەتایبەت جەوهەرەکە، ئەوەی پێیان دەگوت "جهانبینی علمی" دە ئەساسنامەی حیزبدا گونجانبوو. ئێستێش هێندێک خەڵک هەر پێیان چاکە. ئەو وەختی هەبوون باوەڕیشیان پێی نەبوو بەڵام تەزاهوریان پێوە دەکرد.

بەهەر حاڵ ئێستاشی دەگەڵ بێ، حیزبی دێموکراتی کوردستان لە ڕیزی حیزبە چەپەکانی کوردستان و ئێراندایە. حیزبێکی دەستەڕاستی نیە. یانی چەپی دێموکراتە. بەڵام ئیدی بەرەبەرە ئەو ئەساسنامەیە هاتوو گۆڕانی بەسەردا هاتوە. ئێستا ئەو تەفسیرەی ئەو کاتی زۆر کەمڕەنگ بۆتەوە. هێندێک شتی تەنیا ناوەکەی ئەماوە دەنا خۆی ماوە. چونکی ئەمن بەش بەحاڵی خۆم ئێستاش نازانم چیی لێ بکەین. با قسەیەکی خۆش بگێڕمەوە. ڕەفیقێکمان هەبوو، ئەو وەختی ئێمە زۆر توند بووین لە پێوەندی دەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی و ئەحزابی کۆمۆنیستی و ئەوانەدا و باوەڕمان بە سۆسیالیزم هەبوو. ئەو زۆر توند دژی سۆسیالیزم بوو. ناوی عەبدوڵڵای مەلا عوسمانی بوو. ڕووحی شاد بێ شەهید بووە. کە شەهید بوو بەرپرسی کاری حیزبیی نەدەکرد. لە هەمووان بڕابوو. فەللاحیش بوو، لەسەر خەرمانێ تۆپێک هاتو ڕێی کەوتو شەهیدی کرد. جا زۆر دژی سۆسیالیسم بوو. جارێکی گوتم ئەرێ ئەتۆ پێت خراپە زەوی بدرێ بە جووتیاران ؟ گوتی ئەوڵڵا. گوتم پێت خراپە کرێکار دەستڕەنجی خۆی بۆخۆی بخوا؟ گوتی نا. گوتم ئەدی خوێندن بۆ هەمووان بەخۆڕایی بێ خراپە؟ گوتی ئەوڵڵا. پرسیم دەرمان بۆ هەمووان بەخۆڕایی بێ خراپە؟ گوتی ئەخێر ئاوا پرسیارم لێ کردن. گوتم دەباشە سۆسیالیزم ئەوەی دەڵێ. زۆر بەتووڕەیی گوتی ئاخر هەر ئێوەکەی پیسە. ئێمەش هەسەلەن سانتڕالیزمی دێموکراتیکمان لابرد چونکی هەر ناوەکەیمان پێ "پیس" بوو. دەنا ئێستاش ئەو ئەسڵانەی دە سانتڕالیزمی دێموکراتیکدا هاتبوون هەر لەجێی خۆیانن وەک: ئۆرگانەکان لە خوارەوە بۆ سەرێ هەڵدەبژێرێن، لە حیزبدا بۆ هەمووان یەک دیسیپلین هەیە، ئەکەڕیەتی مەحکوومە. ئەندام پەیڕەوی ئۆرگانەو کەمایەتی پەیڕەوی زۆرایەتییەو هی دیکە. چونکی ئەمن بەشبەحاڵی خۆم نازانم چییان لەجێگا دابنێین. پێم وایە ئەوانە ڕاستن بەڵام وا دیارە ئێوەکەی پیسەدیا ئێوەکەی نیێ.

بەڵام بەهەرحاڵ جیهانبینیی عیلمی لە ئەساسنامەدا هەر نەماوە. یان ئەو دروشمە کە "بمرێ ئیمپریالیزم بەسەرۆکایەتیی ئیمپریالیزمی ئەمریکا". ئەوە شوعاری ئەسڵیمان بوو کە ئەوە گۆڕاوە. هەرچەند ئێستاش ئیمپریالیزم هەر هەیەو هەر خراپیشە. ئیمپریالیزم نەبۆتە فریشتە. بەڵام ئیمپریالیزم خۆ حەتمی نیە هەر لە

ئەمریکا بێ. دەتوانێ لە جێگایەکی دیکە بێ. لە وەختی هێرشی ئەمریکا بۆسەر عێراقدا، لە مەجلیسێک دانیشتبووین لە هەولێر. برادەرێک کە پێم وایە ئێستاش بە بیروباوەڕ هەر کۆمۆنیستە، بەڵام پێشتر ئەندامی حیزبی شیوعی عێراق بوو، دیفاعی لەوە کردبوو کە ئەمریکا هێرش بکاتە سەر عێراق. ئەویش دەڵێن ئەتۆ، ئەتۆی کۆمۆنیست؟ دەڵێ، بەڵێ بەڵێ ئەمن. ئەمن زیددی ئەمریکا نیم، زیددی ئیمپریالیزمم. ئێستێ سەددام بۆتە ئیمپریالیست دەچێ کوەیتێ داگیر دەکا. کەوابێ ئێستا کە ئەمریکا دژ سەددامی لە کوەیتێ وەدەر دەنێ، خەباتی زیددی ئیمپریالیستی دەکا.

باشە ئەوەش بگوترێ کە نووسینی گەڵاڵەی بەرنامەو پێڕەوی نێوخۆی حیزب زۆر پێش کۆنگرەی سێیەم بوو. ئەو گەڵاڵەیە بۆ یەکەمجار ساڵی ١٣٥٠ لە کۆنفرانسی سێیەمدا پەسند کرا.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا دەکرێ ئیشارەیەک بە پێکهاتەی ئەندامانی رێبەریی دوای کۆنگرەی ٣ بکەی؟ ئایا ئەو پێکهاتەیە وەڵامدەری بەڕێوەبردنی بەرنامەی پەسند کراو بوو؟ بەگشتی تۆ چەند لەو پێکهاتەیە ڕازی بووی و خۆت چ بەرپرسایەتی‌یەکت تێی‌دا هەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی کۆنگرەی سێ هەر دەتوانین بە ناویش ناویان بەرین هەرچەندە ئاوا لە ئەکاو ئاسان نیە. بەڵام ئەو کەسانە بوون: دوکتور قاسملوو، حەمەدەمینی سیراجی، کەریمی حیسامی، هێمنی شاعیر، ئەمیری قازی، هاشم کەریمی، دوکتور سوڵتانی وەتمیشی، دوکتور حەسەنی شەتەوی، موحەممەدی موتەدی، عەبدوڵڵای حەسەنزادە، مەلا ڕەسووڵی پێشنەماز، کەریم حەداد، مەلا سمایلی حاجی، حەمەڕەسووڵی حەسەنپوور کە لە نێوخۆی وڵات بوو، مەلا سەلامی شەفیعی کە ئێستا ئیمامجومعەی سەردەشتی‌یە. ئەوانە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوون. ئەو وەختی ئەمن ئەو توانایەم نەبوو کە بڵێم داخوا ئەمە دەگەڵ ئەوەی مونابیسە یان نا. وەکی هەر لەسەرەتای ئەم وتووێژانەدا گوتم ئەوە هێندێ قسەن کە دوایە فێریان دەبین بەڵام دەیان گێڕینەوە بۆ ئەو وەختی. ئەمن ناسەرێ وا بکەم. هیچ دروست نیە بڵێم هەر لە منداڵی‌ڕا ئیشتاپەروەر بووم هەستم بەوەی کرد و بەوەی کرد. نەخێر وا نەبوو. پیاو دەگەڵ دەکەوێ. یان هەر لەمنداڵی‌ڕا هەستی ئەدەبیم هەبوو، هەستی هونەریم هەبوو. دەمزانی هونەری کوردی دوا کەوتوە دەبێ پێش بخرێ. ئەوانە هەموو قسەن. بەڵام ئەگەر بە تێگەیشتنی ئێستامەوە چاوی پێدا بخشێنمەوە، ڕەنگە بتوانم قەزاوەتی لەسەر بکەم. ئێستا ئەو قەزاوەتە دروستە یان غەڵەتە، یەکێک موافیقە یەکێک موخالیفە، ئەوە شتێکی دیکەیە. بەڵام دەتوانم قسەی لەسەر بکەم.

تەرکیبی ئەو وەختی، تەرکیبێکی زۆر ناڕێک بوو. ئەو کۆمیتە ناوەندی‌یە کە هەڵبژێرابوو تەرکیبێکی ناڕێکی هەبوو. بێ ئەوەی بمەوێ - بە دەردی کورد دەڵێن- کەوشی بەهەشتو جەهەنەمی‌یان لێک جودا

کەمەوە. بەرنامەو ئەساسنامەیەکمان دانابوو کە بەشێک لەوانەی تێیدا بوون هەر باوەڕیان پێی نەبوو. مەسەلەن تێیاندابوو کوللی خەتەکەی دۆستایەتی دەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی بوو. دەگەڵ ئەوەی ئێمە ئەو شوعارەمان نەدەدا کە - بەسەرۆکایەتیی ئیتیحادی شووڕەوی-، بەڵام ئەو بلۆکەمان قبووڵ بوو. کەچی تێیاندا هەبوون شووڕەوی‌یان بە ئیمپریالیست دەناسی. جیهانبینیی عیلمی لە ئەساسنامەدا گونجابوو، هەر لە کۆمیتەی ناوەندی‌دا چەند کەسمان تێدا بوون - یەکێکیان خۆم-، ئینسانی موسوڵمان بووین. دیارە ئەوە بەو مانایە نییە ئیستا نیم، ئەمن هەر دەڵێم زۆریش بەشانازی‌یەوە دەڵێم کە هەر موسڵمانم. کەوابوو تاڕێکی هەبوو. ئەوە زیاتر تەئسیری ئەفکاری دوکتۆر قاسملوو‌ی‌و باڵادەستیی وی لە تیئۆری‌و لە ئیستیدلالی ئەودا بوو کە ئەو بەرنامەو پێڕەوە دانراو قبووڵ کرا. لەو بارەیەوە وەڵامدەر نەبوو. لەپاشانیش ئێمە وەک کەوێ برابرای بووین. چەند کەسمان لە دەرێ بووین. چەند کەسمان لەعێراق بووین، بەتایبەت دوای دەستپێکردنەوەی شەڕ هێندەی دیکەش پەرشوبڵاو بووین‌و پێوەندیمان لێک بڕابوو. نەخێر دەتوانین بڵێین وەڵامدەر نەبوو.

**عەباس کاردۆ:** ساڵانی مانەوەی ڕێبەریی حیزب لە بەغدا هاوکات بوون دەگەڵ هێندێک ئاڵوگۆڕی وەک بەهێزو دەوڵەمەندتربوونی ڕێژیمی شا، کۆنترۆڵی زیاتری ساواک بەسەر کاری ڕۆژانەی خەڵکدا، پەرەگرتنی هێندێک پرۆژەی سەنعەتی‌و کشتوکاڵی لە کوردستان‌و سەرگەرم‌کردنی خەڵک بە تێکۆشانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و زۆر شتی دیکەش. کاری حیزب لەو ماوەیەدا چی بوو؟ ئایا تێکۆشانی ئێوە هیچ ڕەنگدانەوەو کاردانەوەیەکی لە نێو کۆمەڵگای کوردستاندا هەبوو؟ دەکرێ باسیان بکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە ئەگەر شتەکان دەخانەی خۆیاندا باس بکەین وەک چۆن هەن، جوابەکەی دەبێتە ئەوە: ئەو تەئسیردانان‌و شوێندانانە کە ئێمە وەک حیزبی دێموکرات لەسەر ڕووداوەکانمان هەبوو، بارتەقای ئەحشێک نەبوو کە حیزبی دێموکراتی کوردستان وەکوو حیزبێک کە ئەوکات تەنیا حیزبی پێشڕەوی خەباتی گەلی کورد بوو دەبوو هەیبێ. زۆر کەمتر بوو. بەڵام بە هەرحاڵ لە دوای دەرچوونی بەیانی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ لە عێراق‌و بەتایبەتی دوای کۆنفرانسی ٣، ئێمە لە هەموو بوارەکاندا دەستمان بە بووژاندنەوەی کاری حیزبی کرد. ماوەیەکی زۆر بوو هیچ شتێکی وا نەبوو لە باری تەبلیغاتی‌یەوە. ڕۆژنامەمان دەرکرد، ئۆرگانی نێوخۆیی حیزبیمان دەرکرد. وەکوو باسم کرد پێشتر، لە دوو قۆناغی جیاوازدا ڕادیۆمان هەبوو. لە باری تەشکیلاتی‌یەوە دەستمان کرد بەپێوەندی گرتن دەگەڵ وڵات. تەنانەت لە وەختێکدا سەرکەوتنی باشیشمان هەبوو. مەسەلەن ئێمە ئیستا خەڵکمان لە دانیشگاکان زۆرە. بەڵام باوەڕ بکە ڕێکخراوی حیزبیی ئێمە لە دانیشگای تاران ئێستاش هیچ وەختێک وەک ئەوکاتی لێ نەماوەتەوە. یانی لەنێو

دانیشگای تارانی ڕێکخراوی بەهێزی حیزبمان هەبوو. بەداخەوە لە نەتیجەی حادیسەیەکدا بەرپرسەکەی کە کاک هاشمی کریمی بوو، ناچار بوو ڕابکاو تەقریبەن بەجۆرێک هەڵوەشایەوە.

لەباری دیکەوە کە ئێمە پێشتر ببووینە حیزبێکی نوستووی نادیاری نەناسراو، لەباری دیپلۆماسییەوە پێوەندییەکی بەرینمان بە دنیای دەرەوە گرت. لە حیزبە کوردیو ئێرانییەکانەوە بگرە هەتا ئەحزابی کە ئەو وەختی زیاتر کۆمۆنیستو دێمۆکراتەکان بوون لە دنیادا. لەعەینی حاڵدا پێمخۆشە ئیشارە بە لێکدانەوەیەکیش بکەم کە لە سێبەری ئەو پێشکەوتنانەی ئێرانەدا کردبوومان. پێم وایە ئەمن هەمن کە هیوادارم هەردووکیانم مابن. بەرنامەی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان کە لە کۆنفڕانسی سێدا پەسند کرابوو، هەروەها بەرنامەی حیزب کە لە کۆنگرەی سێدا پەسند کراوە. لە موقەددیمەی بەرنامەی حیزب بۆ کۆنفڕانسی سێدا کە باسی تەحلیلی ئەوزاع دەکا نووسیبوومان کە: دەوڵەتی شای دەربەست لە ئیختیاری ئیمپریالیزمی ئەمریکادایە. لەماوەی ئەو دووساڵەدا (بەینی کۆنفڕانسی سێو کۆنگرەی سێ. هەیاس) هێندێک ڕووداو ڕوویان دا. کێشە کەوتە بەینی ئەمریکاو حکومەتی شا. تەنانەت دوایە دەرکەوت کە ئەمریکا کەوتە فکری ئەوە کە شای بشگۆڕێ. شا چوو پەیمانێکی دەگەڵ شووڕەوی ئیمزا کرد، پەیمانێکی ئەساسییش. کارخانەی ئاسن-توانەوەی لە شووڕەوی کڕی، کە عادەتەن ئاسنتوانەوە بە سەنعەتی "دایک" حیساب دەکرێ. ئەمریکا ئەوەی پێ خۆش نەبوو. لە وتووێژێکی ڕۆژنامەنووسیدا لە شایان پرسی کە ئێوە هاوپەیمانی ئەمریکان بەڵام داخوا ئەمریکا بەوە ڕازییە ئێوە کارخانەی ئاسنتوانەوەتان لە شووڕەوی کڕیوە؟ شا گوتی ئەمریکا ڕازییە یان نا کەیفی خۆیەتی. ئێمە مەنافیعی خۆمان لەبەر چاوە. ئەمریکا ناتوانێ هەتاهەتایە بابە گەورەی میللەتان بێ. ئەمن لەبیرمە کە گەلاڵەی بەرنامەو ئەساسنامەمان دەنووسی، بۆخۆم بە دوکتور قاسملووم گوت ئەوەی دەبێ بگۆڕین ئەوە غەڵەتە. کەسێک کە دەربەست دەئیختیاری ئەمریکادا بێ، چۆن هەنگاوێکی ئاوا هەڵ-دەگرێ. ئیدی پێم وایە دوکتور قاسملووش هەر ئەو نیازەی هەبوو چونکە گوتی ڕاستە وایە. ئەوجار وامان لێ کرد کە بڵێین لەسەر یەک پێڕەوی لە سیاسەتی ئیمپریالیزمی ئەمریکا دەکا. مەبەستم ئەوەیە کە ئەو واقعییەتانە ڕەنگیان دابۆوە.

یان مەسەلەن لە بەرنامەی پێشوودا دیفاعێکی زۆر لە ئیسلاحاتی ئەرزی کرابوو. ئەوەمان گۆڕی، چونکە گوتمان ئەوە شا ئیسلاحاتی ئەرزیی کردوو کاری چاکیشی کردوە. ئەو ئاڵوگۆڕانەمان دەدیت هەرچەند لە نیزیکەوە هەستمان پێنەدەکرد. ئەوانەش تەئسیریان لەسەر سیاسەتدانانو فۆرمووڵەکردنی ئامانجەکانی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان دانا.

**عەباس کاروخ:** لەو ماوەیەدا ژمارەیەک لە تێکۆشەرانی حیزبی وەک زیندوو یاد عەزیزی یووسفی، مامە غەنی بلووریان کاک جەلیل گادانی و کەسانی دیکەش لە زینداندا بوون. ئایا رێبەرایەتی حیزب هیچ کارێکی را بەرچاوی بۆ ئازادکردنی ئەوانە کرد؟ ئەگەر کردی چیی کرد و بە کوێ گەیشت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەک دەزانین ئەو هاورێیانە زۆر پێش ئەو دەورەیە گیرابوون. ئەوان سالآنــی سی-وحەوت و سی‌وهەشت گیران و ئەوەی باسی دەکەین ساڵی ١٣٤٩ دەست پی‌دەکا. دەزانین کە پێنج کەس لەو گیراوانە بە ئیعدام مەحکووم کران. بەڵام دوای ئێزیک بە ساڵێک حوکمەکەیان گۆڕاو بوو بە حەبسی ئەبەد. ئەوەش زیاتر بەرهەمی لێکدانەوەی موستەشارانی ئێزیکی شای بوو. بزووتنەوەی کورد لە کوردستانی عێراق هەڵگیرسابوو. شا دەیویست دەستی تێی‌دا هەبێ. عیسا پەژمان ئیدیعا دەکا کە گۆیا هەر ئەوان هەڵیان ئابیمانەوە. ئەمن بەش بەحاڵی خۆم دەگەڵ ئەو ئەزەرە نیم. چونکە ئەوە میللەتەکە کردوویە. جا ڕەنگە ئەوان لەو ئەزادەدە کەڵکیان وەرگرتبێ. چوون بەشایان گوت ئەوە مەعقوول نیە ئەتۆ خۆت بە دۆستی کوردان نیشان بدەی و هەر لەو کاتەدا لە وڵاتی خۆت کوردان ئیعدام بکەی. بۆیە حوکمەکە تەخفیفی پەیدا کرد. بەڵام شتی زۆر مەـلموس کە دواتر و بەداخەوە ئانیستاش وەک ڕاستەوخۆ بۆ ئاخرجاریشە، ئوێنەرانی ئەمنیستی ئەنتێرناشناڵ یان بڵێین سازمانی جیهانیی دیفاع لە زیندانیانی سیاسی، لەسەر هەوڵ و تەقەلای حیزبی دێمۆکرات چوونە زیندان و لەوێ چاویان بە کاک عەزیز و کاک غەنی و ئەوانە کەوت. ئەو وەختی پێموایە کاک جەلیل و ئەوان تەقریبەن هەموویان ئازاد ببوون. تەنیا ئەو دووانە دەزیندانێدا مابوون. ئەوە ئیدی ساڵەکانی ٥٥ و ٥٦ی ئەو ئەوانە بوو.

**عەباس کاروخ:** مامۆستا ئەوە ئیدی دو ماوانەدا کێشەی ئەحمەد تۆفیق تەواو بوو و حیزب کەوتۆتە سەر ئاسایی کردنەوەی ژیان و خەباتی خۆی. بەڵام دیسان وا دەرکەوت گەرای ناڵێکی و دووبەرەکی لە نێو حیزبدا سەری هەڵدا. دەکرێ لەو بارەیەوە زانیاریمان بدەیێ؟ ئایا بوونی زیندوویاد کەریمی حیسامی کێشەساز بوو؟ تکایە بەوردی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دووبەرەکی، وەک لەبەرامبەریەکتر ڕاوەستان لە نێو حیزبی دێمۆکرات دا دەکرێ بڵێین لەو قۆناغەدا بەشێوەی بەرچاو هەر نەبوو. ئەوە کە بڵێی لە موقابیل یەکتردا ڕاوەستابین. بەڵام ئەو ناهاوسەنگی‌یە کە باسمان کرد لە نێو کۆمیتەی مەرکەزی‌دا هەبوو. وا نەبوو بڵێی لەباری فکری و ئیدئۆلۆژی و ئەوانەوە هەبوویی و بەدەیتەوە. ئەوەی کە هەبوو و بڵێین لە بەرابەر حیزبی دێمۆکراتدا بوو، شتێک بوو کە بەپشتیوانی، یان هاندان یان بە ئیبتیکاری عەبدوڵڵای ئیسحاقی دروست کرابوو. ئەوە کە ڕەنگە زۆر کەس ئەوەی نەزانێ. یەکەمجار لە حیزبی دێمۆکراتدا بوو کە ئیادەی مووەقەت دروست بوو. شتێکیان

دروست کرد بەناوی "ڕێبەرایەتی کاتیی حیزبی دێموکراتی کوردستان". بەڵام دواقیعدا قەت نەبوو بە هیچ. ئەوە لە دەرەوەی حیزب بوو. چەندێک کەس بوون، خەڵکی ئەوەندە بەرچاویان تێدا نەبوو. کادری هەڵکەوتەیان تێدا نەبوو. ئەحمەد تۆفیق بۆخۆی هەبوو، بەڵام ئەو لێیان دوور بوو. ئەو مەرستەقیمەن خۆی دوورەدەخست. ئەوانی دیکە کاریان ئەوە بوو دەگەڕان بە کوردستانی عێراقداو هەر جێیەک دەچوون بێموقەددیمە جنێویان بە حیزب دەدا. جنێویان بە دوکتور قاسملووی دەداو بە بەعسی ناویان دەبردین و لەو شتانە. بەڵام ئیختیلافە فکرییەکە ڕەنگە بووبێ.

ئەوەش مەربووتە بە کاک کەریمی حیسامی، دیارە ئەو کۆچی دوایی کردووە خودا عافووی بکا. ئەوساڵ ئێمە بیرەوەرییەکی زۆر خەستوخۆڵمان بۆ گرت. بەڵام کەریمی حیسامی یەکجار قەرزداری دوکتور قاسملوو بوو. بانی کەریمی حیسامی هەرچی لە سیاسەتدا پەیدای کردبوو لە دەرەوەی وڵات بە کۆمەگی دوکتور قاسملوو پەیدای کردبوو، دەنا کەریمی حیسامی کابرایەکی کەمسەواد بوو کە دە خەباتدا هەبوو، نەقشی هەبوو خوا هەڵناگرێ. بەڵام کە چووە دەرێ هیچی پێ نەبوو. دوکتور قاسملوو زۆری کۆمەگ کرد وەربگیرێ. کۆمەگی کرد بخوێنێ. بۆخۆی جاروبار ئیدیعای دەکرد دیپلۆمی هەیەو جاروبار ئیدیعای دەکرد دوکتورای هەیە. هیچیشیانی نەبوو، بەڵام مەدرەکی کلاسی حیزبی هەبوو لە چیکۆسلۆڤاکی کە مەعمولەن پێوانە دەڵێن دیپلۆم. بەڵام لە عەینی حاڵدا کەریمی حیسامی دوژمنایەتییەکی عەجیب سەختو بێڕەحمانەی دەگەڵ دوکتور قاسملوو دەکرد. تەحلیلەکەشی دەتوانم ئەوەی بڵێم لەباری فکری سیاسییەوە دوکتور قاسملوو لەوی چەپتر بوو، نەک وەک ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست چونکە ئەندامی هیچ حیزبێکی کۆمۆنیست نەبوو، بەڵام لەوی کۆمۆنیستتر بوو، فەرقیان ئەوە بوو کە کاک کەریم ببوو بە کلکە بۆ وڵاتانی سۆسیالیستی. ببوو بە کلکیەکی موتڵەق. دوکتور قاسملووش هەر لە کۆنەوە، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە، موئادیی ئەوە بوو کە سۆسیالیزم بێعەیبو نەقس نیەو دەبێ دەستکاریی تێدا بکرێ. ئەوە کە پێی گوترا سۆسیالیزمی دێموکراتیک، ئەوە گەڕایەکەی لەمێژ بوو لە مێشکەو بیروباوەڕیدا خولقا بوو، پاشانیش باوەڕی بە سەربەخۆیی حیزبی دێموکرات بەرامبەر بە هەموو حیزبو هێزو دەسەڵاتێکی دنیا هەبوو. هەم لە باری بڕیاردانو هەم لەباری سیاسییەوە باوەڕی بەوە هەبوو. کەریمی حیسامی باوەڕی وا بوو کە ئێمە دەبێ ئەوە بکەین کە شووڕەوی دەڵێ.

مەسەلەن ئەمن لەبیرمە ئەوونەی زۆر باش هەرچەند ڕەنگە ئەتۆ پرسیارت هەبێ، بەڵام وەکوو ئەوونە لێرەدا جێ دەگرێ. ساڵی ١٩٧٤ کە وتووێژەکانی بەینی دەوڵەتی عێراقو بزووتنەوەی کورد لە ئارادا بووو وا دەردەکەوت کە پێک ناگەنو تووشی شەڕ دەبنەوە، ماوەیەکی زۆر ئێمە دەکۆبوونەوەی دایمدا بووین، ئەگەر کۆمیتەی ناوەندی نەبایە، دەفتەری سیاسی کۆ دەبۆوە کە ئێمە دەبێ چی بکەین. دیارە باسێکی زۆر کراو

سەرەنجام بە ناکامێک گەیشتین. با ئەگەر بە خۆهەڵکێشانیش دابنرێ بڵێم کە پێشنهادەکە ئەمن کردم زۆریش بەترسەوە، ئەوەی دوایە پەسند کرا. پرسیارەکان ئەوانە بوون: هەموومان بێینە نێو دەوڵەتی عێراق؟ هەموومان بچینەوە ئێران؟ هەموومان بچینە مەنتەقەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە؟ یان هەموومان بڕۆینە دەرێ؟ جا فکر دەکرایەوە دەچینەوە ئێرانێ چ دەکەین. لە نێو دەوڵەتی عێراقێ بین چیمان لێ‌دێ. بچینەوە نێو پێشمەرگە چیمان بەسەر دێ. پاشان ئەگەر بڕۆین ئەو هەموو خەڵکەی چۆن بەرینە دەرێ. ئەمنیش زۆر بەئیحتیاتەوە پێشنیارێکم کرد. گوتم ئەمن پێشنیارێکم هەیە نازانم ڕەنگە بڵێن لەبەر ئاسانی‌یە، یان لەبەر گرانی‌یە قبووڵی نەکەن. گوتیان چییە. گوتم پێم وایە هیچ کام لەوانە نەبێ، تەقسیم بین. بەشێکمان لێرە بین. بەشێکمان بچینە نێو پێشمەرگەی. بەشێکمان لە ئێرانێ بن. بەشێکیشمان لە دەرەوە بێ. ئەو وەختی مەحفووز دەبین. ئەگەر ئەفرادێکمان لە دەرەوە هەبە هەرچەند ئێران فشار بۆ بزووتنەوەی کورد بێنێ خۆ ناتوانێ تەسلیمیان بکەنەوە وەکوو ساڵەکانی ٤٧- ٤٦. چونکە دەزانن ئەو حیزبە ئیمتیدادی هەیە لێرە لە ئورووپایە لێی لە هەڵڵا دەدەن. دەوڵەتی عێراق ناتوانێ بمانگرێ‌و چیی پێ‌خۆشە پێمان بکا، چونکە ئێمە لەنێو بزووتنەوەی کورددایین. یانی لە دەرێ هەبین‌و لە ئێرانێ هەبین‌و لە هەموو جێیەک هەبین. خولاسە کە ئەوەیمدا، دوکتۆر قاسملوو گوتی هیچ ڕێگایەکی دیکەمان نیە، هەر ئەوەیە. ئەوە قبووڵ کرا. جا مەبەست کەریمی حیسامی بوو. ئەو دەیگوت ئەمن ڕەقیم نیە. ئێمە دەبێ ڕاوەستین بزانین شەڕ دەبێتەوە یان نا‌و ئەگەر شەڕ بۆوە دەبێ بزانین کێ تەرەفداری کێیە. ئەو وەختی دەگەڵ لایەک دەکەوین. ئەمتیش زۆر بە سەراحەت گوتم یانی ئێمە ڕاوەستین بزانین داخوا ئەوکات شووڕەوی دیفاع لە مەلا مستەفای دەکا یان لە ئەحمەد حەسەن بەکر. گوتی ڕاست ڕاست وایە. یانی ئەوەندە باوەڕی بە گوێ‌لەمستی هەبوو. دیارە پیاوێکی چالاک‌و خۆڕێکخەریش بوو دەنێو خەڵکی‌دا جێگای خۆی دەکردەوە. بۆ ئەوەی شتی خۆی بسەپێنێ زۆری هەوڵ دەدا کە لە شەئنی دوکتۆر قاسملووی کەم کاتەوە. پێوەندیی وی دەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی گەیشتە ئەو جێگایە کە جارێکی لێرە دوکتۆر قاسملوو دەگەڵ سەفارەتی شووڕەوی قسەی کردبوو. گوتبووی پێمان خۆشە پێوەندی‌یەکی پتەوترمان هەبێ. سەفیر گوتبووی پێوەندیمان بۆ نیە، ئەوە نیە پێوەندیمان دەگەڵ ڕەفیق کەریم هەیە. دوکتۆر قاسملوو گوتبووی تا مەبەستم ئەوەیە نوێنەری ئێمە دەگەڵتان دە پێوەندی‌دا بێ. ئەویش گوتبووی ئەوە نیە ئەو نوێنەرتانە. عاقیبەت دوکتۆر گوتبووی جەنابی سەفیر ئەگەر ئێوە کەریمی حیسامی وەک نوێنەری خۆتان لەلای ئێمە دادەنێن، ئێمە پێمان باش نیە، بەڵام ئیعتیراز ناکەین. چونکی ئێوە نوێنەری خۆتان دادەنێن. بەڵام ئیدی ئەو نوێنەری ئێمە لەلای ئێوە نیە. ئێمە نوێنەری خۆمان بۆخۆمان دیاری دەکەین. ئەوە ئیدی بە ئاشکرا وا بوو.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا کاک کەریم هەموو ئەو شتانە ڕەت دەکاتەوە لە بیرەوەرییەکانی‌دا. پاشان هۆی چی بوو پێش هاتنەوەتان بۆ ئێران کاک کەریم لە کۆمیتەی مەرکەزی وا دیار بوو دوور خرابۆوە یان سەرکۆنە کرابوو یان دەرکرابوو. ئەوە چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئاخر ئەوەش بۆخۆی هەر داستانێکی دیکەیە. بۆخۆت دەزانی کەریمی حیسامی لە نووسینەکانی‌دا بەشی شێری داوە بەمن بە جنێو قسەی سووک. بەڵام کەریمی حیسامی یەکجار دەگەڵ من ئێوانی خۆش بوو. هەر لەسەر ئەوە دەگەڵ من تێک‌چوو لە هەوڵەوە دوایەش لە نووسینەکانی‌دا. کاک کەریم دەچوو بۆ سەفەر. کاک حەمەدەمینی سیراجی بەرپرسی پێوەندیی ئێمە بوو هەم دەگەڵ عێراقو هەم دەگەڵ شووڕەویش. ماوەیەک بوو کاک کەریم هەر دەی‌گوت ڕەوە با بگەڕێین چونکە ماشێنی هەبوو. دەگەڕاینەوە دەعوەتی دەکردەوە ئەوانە. لەپاشان ڕۆژێکی گوتی با سەرێکی دۆستەکەمان بدەین. وا بزانم سکرتێری یەکەمی سەفارەتی شووڕەوی بوو. گوتی با سەرێکی بدەین. هەر لەڕێیە گوتی پێی گوتووم ئەتۆ دەچیە سەفەرێ ئەدی ئێمە پێوەندییمان دەگەڵ کێ هەبێ. ئەمنیش گوتوومە ڕەفیق عەبدوڵڵاتان پێ دەناسێنم کە ئاگادارەو فڵانەو فڵانە. چووین. کە چووین جارێ بە شێوەیەکی سەیر دەی‌ویست ئەمن جەلب بکاو ڕام‌کێشێ. بەعەلاوەت ئەمن پاکەتە سیغارم پێ نەبوو. دەستم بۆ گیرفانم برد کە پاکەتە سیگاری دەرێنم، تەماشام کرد پێم نیە. ئیدی ترند دەستم کێشایەوە دوایە. ئەو کە ئاگای لە حەرەکەتی من بوو تێ‌گەیشت. گوتی سیگارت پێ نیە؟ گوتم هیچ نیە. هەر هەستاو گلۆرێکی سیگار هێنا، لەپێشی دانام. گوتم نامەوێ. گوتی چۆن ناتەوێ. هەڵی پچڕیەو پاکەتێکی دەرێنا. ئەمنیش بۆ ئەوەی بێ‌تەربیەتی نەبێ، سیگارێکم دەرێنا کێشام ئیدی دەستم لەوی دیکە نەدا و کە ڕۆیشتیشین پاکەتەکەشم بەجێ هێشت. ئەوە کاک کەریم مەعموولەن لەو دیارییانەی زۆر وەردەگرتن. لەوێ باس‌کرا کە دیارە کاک حەمەدەمین بەرپرسی پێوەندی‌یەکانە بەڵام ئەوە پێوەندیی خۆمە. پێوەندیی ویش چ بوو، لە سەرووی حیزبەوە بوو. دەنا هەرچی حیزب هەدی‌بایە دەبوایە کاک حەمەدەمین بۆی بردبایەو هەرچی ئەوانیش هەیان‌بایە هەر دەبوو لە ڕێگای ئەوەوە باسی بکەن. بەڵام ئەو پێوەندی‌یەکی تایبەتیی خۆی هەبوو دەی‌ویست ئەمن لە جێگای خۆی دابنێ.

ئیدی بۆ سبەینێ‌ڕا کاک کەریم سەفەری دەکرد. واشی دانابوو کە ئەمن جارێکی دیکە بچمەوە کن ئەو کابرایەو ڕێکەوشوێن دانێین کە دیارە ئەمن قەت جارێکی دیکە نەچوومەوە. ئەومان کە بەڕێ کرد، داستانەکەم بۆ کاک حەمەدەمینی باس کرد. گوتم کاک کەریم شتێکی ئاوای کردوە، مەعلوومە کاریان پێ‌کردوە ئیدی. حەتتا لەو جوابێک‌دا کە بە منی داوەتەوە - ئەمن ئێستاش پێم وایە ئەو پیاوە ناوی ئەلیکساندر بوو -، بەڵام دەڵێ ناوەکەشی گۆڕیوە. یانی غەیرە موستەقیم قبووڵ دەکا کە داستانەکە وایە. بەڵام ڕەنگە ئەمن ناوەکەم لەبیر نەمابێ، کە بۆخۆم ئێستاش لەسەدا ٩٩ پێم وایە ئەو پیاوە هەر ناوی ئەلیکساندر بوو.

**هەیاس کاریز:** ئیدی بە دووی ئەوەدا کاک کەریم سزا درا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر. ئەو ڕۆیشتە دەرێو هەر ئەو ساڵە بوو یان کەوتە ساڵی دوایە، چوو بۆ بەیرووت. لە بەیرووت دەستی کردبوو بە موساحەبەو قسە کردن بەناوی جێگری سکرتێر. ئێمە نە شتێکمان هەبوو بەناوی جێگری سکرتێر، نە کرابوو بەجێگری سکرتێر. ساڵی ١٩٧٤ کە بڕیارماندا ئاوا بکەین، ئەوەی پێشتر باسم کرد، ئێمە دوو بڵاوکراوەمان دەردەکردن. کوردستانو تێکۆشەر. بڵاو کراوەی تێکۆشەر لە دەرێ (مەبەست ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەیە. هەیاس) ئێمە، یان ئەگەر بێ ئەدەبی نەبێ ئەمن دەرم دەکرد، چونکی دواقیەدا خەڵکی دیکەم بە دەورەوە نەبوو. تەنانەت ژمارەیەکم دەرکرد، هەمموو نووسینەکانی، تایپ کردنەکەی، ڕۆنیۆیەکەی، هەمووی هی خۆم بوو. هەمووم بە دەستی خۆم کرد کەپێشتر قەتیشم نەکردبوو. بۆ بەغدایەش کە کاک کەریمو کاک حەمەدەمینو مامۆستا هێمن دەمانەوە دەگەڵ دوکتور سوڵتانی وەتەمیشی، لەوێ ڕۆژنامە دەربکەن. دوکتور قاسملوو گوتی با مەسئولی سیاسی‌یەکەی کاک کەریم بێ. مەسئولی ئەدەبی‌یەکەشی مامۆستا هێمن بێ. ئەویش هێمن گوتی بۆ هەتا ئێستاش هەر ئەمن مەسئولی ئەدەبی نەبووم؟ دوکتور قاسملوو گوتی بەڵێ مەسئولی ئەدەبی بووی بەڵام هەتا ئێستا فلان-کەست دەگەڵ بوو. جا بە ڕاستی مەسئولی ئەدەبی ئەو بوو، بەڵام هەمموو کارە ئەدەبی‌یەکەی ئەمن دەم‌کرد. بۆ ئەو ماوەیە، تەنیا بۆ ئەو ماوەیەی دانرا کاک کەریمی حیسامی مەسئولی یەکەم بێ. دەنا قەت نەبۆتە جێگر. جا لەوێ، لە بەیرووت، بە ناوی جێگر موساحەبەی کردبوو، شتی سەیرو سەمەرەشی گرتبوو. لەبەر ئەوە لە ڕێبەرایەتی دوور خرایەوە و هەر ئەوەش بوو کە لە کۆنگرەی چوارەمدا عەلاڕەقمی ئەو هەڵاو هەنگامەیەی وەرێی خست دەنگی نەهێنایەوە. ئێستا ئەو ڕۆژانە شتێکم لەسەر کاک حەمەدەمینی سیراجی خوێندەوە کە دەڵێ لە کۆنگرەی چواردا بوو بە ئەندامی دەفتەری سیاسی. ئەویش هەر هەڵەیەکی نەبێژرا. دیارە ئەو کەسەی نووسیویەتی هیچ ئاگای لێ‌نیە.

**هەیاس کاریز:** مامۆستا ئەتۆ بۆخۆت لە کۆنگرەی سێ‌دا بووی بە کۆمیتەی مەرکەزی. بەڵام چۆن پێش کۆنگرەی چوار تێدا نەبووی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هەم کۆمیتەی ناوەندی بووم هەم دەفتەری سیاسی، بەڵام دوایە ئیستیعفام کرد. لە هەردووک پۆست ئیستیعفام دا.

**هەیاس کاریز:** دەلیلی چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە موشکیلەی خۆمو ئەحاوانەوە ئەوانە بووبێ.

**عەباس کاردۆ:** دەی هەر ئەوەی دەڵێم ناکۆکی هەبووە تۆ دەڵێی نەبووە. ئەدی ئەوە چییە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر ناکۆکیی فکری نەبووە. وەک گرووپ ئیختیلافی بیروباوەڕی نەبووە. ئەمن هیچ گرووپێکم نەبووە. ئەمن دەگەڵ هیچ کەس ڕووبەڕوویشم نەکردوە بڵێم ئەمن خەتێک بووم ئەو خەتێکی دیکە. خۆ نەبوونی ئیختیلافی حیزبی بەوەی ناڵێن هیچ شتێک نیی. کەنگێ دوو کەس وەک یەکن؟

**عەباس کاردۆ:** باشە ئەگەر ئیختیلافەکە وای لێ هات ئەتۆ لە کۆمیتەی مەرکەزی بڕۆی، چۆن چووکەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لە کۆمیتەی مەرکەزی ڕۆیشتووم بەڵام بە زەڕڕەیەکیش ئەمن لە کارو تێکۆشانم کەم نەبۆتەوە. لە هاوکاری، لە تەبلیغ بۆ حیزب، لە هیچ شتێک. بە جۆرێک کە کاتێک هاتینەوە بۆ وڵات دیارە بەو شێوەیە هاتینەوە. پێت وایە کێ و کێ هاتنەوە بۆ وڵات؟ شەش کەس حازر بوون بێتەوە. سێ کەسیان کۆمیتەی ناوەندی بوون: دوکتور قاسملوو، کاک ئەمیری قازی و کاک هاشمی کەریمی. سێ کەسیش لە دەرەوەی کۆمیتەی ناوەندی: کاک سەید ڕەسووڵی بابی گەورە، مەلا حەسەنی شێوەسەڵی و ئەمن. کاک سەید ڕەسووڵ بێ قەید و شەرت قبووڵی کرد بگەڕێتەوە تەنانەت جارێکی دیکەش پێش ئەو وەختی گەڕایەوە. ئەمن گوتم حازرم بگەڕێمەوە بەڵام بە بێ شەرت ناگەڕێمەوە. ئەمن ناچمەوە نێو وڵات هەموو ڕۆژێ گیانم لەسەر بەری دەستم بێ، ئەو برادەرانەش کە لێرەن ئامادە نین بێنەوە بڕیارمان بۆ بدەن. ئەگەر هەموو کۆمیتە ناوەندی دێتەوە، ئەمن وەکوو پێشمەرگەیەکی سادە دێمەوە. ئەگەر نا، دەبێ سەلاحییەتی کۆمیتەی مەرکەزی بدرێ بەو ئۆرگانەی کە دەچێتەوە. کە ئەمن ئەوەم گوت کاک سەید ڕەسووڵ و کاک حەسەنی شێوەسەڵێیش دەگەڵی کەوتن. ئیسراڕمان کرد کۆمیتەی ناوەندی کۆ بۆوە. حازر نەبوون بێنەوە، بەڵام حازر بوون لە سەلاحییەتی خۆیان کەم بکەنەوە بیدەن بە "زاگرۆس". ئۆرگانێکمان دروست کرد بە ناوی زاگرۆس. ئیدی زاگرۆس بەکردەوە بوو بە بەڕێوەبەری حیزب. بوو بە هەموو شتێک. هەموو بڕیارێکی بەدەست بوو. بڕیارەکە شتێکی دیکەشی تێدا بوو. گوترابوو هەر ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی بێتەوە، دەبێتە ئەندامی زاگرۆس. مەسەلەن کاک حەمەدەمینی تێدا نەبوو. پاش مانگێک بڕیاری دا بێتەوە ئەویش بوو بە ئەندام تێی دا. ئەوەشی تێدا بوو ئەگەر هەموو کۆمیتەی ناوەندی گەڕایەوە کۆمیتەی ناوەندی کاری خۆی دەست پێ دەکاتەوە و زاگرۆس هەڵدەوەشێ.

جا مەبەستی من لەو قسانە ئەوە بوو دواتر کە ئێمە ئاشکرا بووین، زاگرۆس هەڵوەشایەوە. ئەمن ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی نەبووم، بەڵام زۆر جاران دەبوو سوێندو قورئانی بخۆم کە بابە وەڵڵا ئەندامی کۆمیتەی

ناوەندی نیم. لە هەموو شتێک‌دا ئەمن هەبووم وەک ئەندامی دەفتەری سیاسی عەمەلم دەکرد. تەنانەت جارێکیان برادەرێک هەبوو پێیان دەگوت محمد عەجەم(ناوی خۆی بێهزادی کەریمی بوو) لە چریکان بوو. گوتی: "ماموستا این دیگە چیە، معلومە شما عضو دفتر سیاسی هستید". گوتم بابە وەڵلا نیم. ناخر ئێمە هەیئەتی نوێنەرایەتیی گەلی کوردمان هەبوو. هەر حیزبەش هەیئەتی خۆی هەبوو. لە هەیئەتی ئێمەدا رەئیسی هەیئەتەکە دوکتور قاسملوو بوو. ئەگەر دوکتۆر قاسملوو نەبایە ئەمن بووم. ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیش نەبووم. پێش ئەوەی بچینە کۆنگرەی چوارەم. تەنیا کەسێکی کۆمەگی دوکتور قاسملووی کرد بۆ ئەوەی راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بنووسێ ئەمن بووم. یەک ئەفەر لە دەفتەری سیاسی خەتێکی بۆ نەنووسی، بەڵام بۆ چەند فەسڵێک دواوای لێ کردم گوتی وەرە بیان نووسە.

**عەباس کاربۆز:** باشە بە هەمووی ئەوانەوە بۆ ئیستیعفات دا؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** بەهەر حاڵ عەرزم کردی لازم ناکا پیاو واریدی هەموو جوزئیاتێک بێ. هێندێک ئیختیلافاتی جوزئی لەنێو خۆماندا بوو بەهۆی ئەوەی ئەمن بکشێمەوە. ئەوە بایەخی نیە وەک بەشێک لە مێژووی حیزب سەیری بکرێ. خۆ ئەمن نەبوومە جەرەیانێک. موهیم ئەوەیە تاقە یەک ئەقەدەم وەخۆم نەگرتوە. خەتی تایبەتیی سیاسیم ئیعلان نەکردوە. ئەچووم تەبلیغاتم نەکردوە. لە هەموو شتێک‌دا بەشدار بووم بەڵام پێم را بووە ئەوە قورساییەک لەسەر شانم دەکا و قبووڵم نەکردوە.

**عەباس کاربۆز:** هەرچەند ئەوکات جەنابت ئەزموونێکی زۆرت لە کاری سیاسی و رێکخستن‌دا نەبوو، بەڵام ئەوەی کە بیستراوە لەو دەورانیش‌دا یەکێک لە کەسانی شوێن‌دانەر و جێگای باسی حیزب بووی. بەتایبەت کە لە کێشە نێوخۆییەکان دا ناوت دێتە گۆڕێ. دەکرێ خۆت بۆ ئەو دەورانە پێناسە بکەی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** نازانم مەبەستت کام دەورانە.

**عەباس کاربۆز:** بەگشتی لەو رۆژەوە لە کۆنفرانسی دووهەم‌را مەترەح بووی هەتا هاتنەوە نێوخۆ.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە هەتا هاتمەوە نێوخۆ و دوای ئەوەش هەتا دەمیزیی دێموکراتدا بووم لەو کەسانە بووم کە مەترەح بوون. ئەوەم قبووڵە. وەختێک موخالیفانی خەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان سێ کوچکەیەکیان دانابوو. دوکتور قاسملوو، دوکتۆر شەرەفکەندی و عەبدوڵلا حەسەنزادە. تەنانەت دوژمن، جمهوریی ئیسلامی جارێک نامەیەکی بۆ برادەرێک نووسیبوو، دیسان ناوی من و دوکتۆر قاسملووی هێنابوو. هێرشەکەی تەنیا بۆ سەر ئەو دووانەمان بوو، حەتتا ناوی دوکتۆر سەعیدیشی نەهێنابوو. شتی وا زۆر بووە.

ئەمن قەت نەمویستوە بۆخۆم خەتێکی تایبەتیم هەبێ. ئەمما ئەو وەختی دەگەڵ خەتی گشتیی حیزب بووم، دەزۆر شتاندا بە توندی ڕاوەستاوم. زۆر جار گلەییم هاتۆتەوە سەرێ کە توندم لەو بارەیەوە. دیارە توندیش بووم. مەسەلەن با بۆ تاریخ سەبت بێ ئەگەر گوناحە، ئەگەر خێرە. کە گرووهی ٧ نەفەری دروست بوو، نازانم ناوی بەیانیە بوو چ بوو هی دەفتەری سیاسی کە دەعوەتی کۆمیتەی ناوەندیان کرد. لەوێدا شتێکمان نووسیبوو، گوتبوومان هیواداریـن کۆمیتەی ناوەندی ئەوانە بە خائین بناسێ. ئەوە ئەمن نووسیومەو بردوومەتە دەفتەری سیاسی پەسندی کردوە. چونکی پێم وابوو کارێکی زۆر قەباحەتە لەو وەختەدا کە حیزب دەگەڵ شەڕێکی درێژخایەن و بێڕەحمانەو نابەرابەر بەرەوڕوویە، ئەوانە بێن ئێستا بە تەحریکی حیزبی توودەیە کە بوو حاشای لێ نەدەکرا، بەڵام حەتتا ئەگەر ئەوەش نەبێ کارێکی ئاوا بکەن. پێم وا بوو نابێ لێیان قبووڵ بکرێ، دەبێ بە جورمیان لەسەر حیساب بکرێ. هەمیشە لەبارەی ئەو شتانەوە کە پەسندکراوی حیزب بوون ئەمن بەقووەت دیفاعم کردوە.

بە قەستی باسی ئەوەی دەکەم کە سەبت بێ. ئەو ڕۆژانە هەڵایەک ساز بوو لەسەر لۆگۆی کوردکانالی. دەگەڵ برادەرێکی باسم کرد گوتم ئەمنیش پێم باش نیە لۆگۆی کوردکانالی. با بڵێین شتێکی بێ‌ماناشە. بەڵام ئەو هەمموو خەڵکە هەڵڵای لێ پەیدا بووە بۆ جوابیان نادەمەوە. وەکوو تەعنەیەک، یان وەکوو بەرپەرچدانەوەیەک گوتی ئەتۆ وەختێکی موخالیفی ئاڵای کوردستان بووی. کەچی دەڵێی دەبێ ئێستا ئاڵای کوردستان دابنرێ. گوتم نەزەری من نەگۆڕاوە، نەزەری من هەروەک جارانە. جاران حیزب ئاڵای کوردستانی دانەدەنا. کەس حەقی نەبوو خۆی لە حیزب بە کوردتر بزانێ‌و دای‌بنێ. بەڵام لە کۆنگرەی سێزدەوە بڕیارمان داوە ئاڵای کوردستان هەڵدەگرین. کەوابوو ئێستا دیفاعی لێ دەکەم. ئەوەی من هەر دیفاعە لە بڕیاری حیزب.

مەسەلەن ئەو هەڵڵا سەیروسەمەرەیەی سازیان کرد لەسەر عەکسی دوکتور قاسملوو و ئەوان. لەهیچ‌و خۆڕایی بێ ئەوەی بڕیارێکی بۆ بدرێ، هاتن عەکسی ئەو سێ ڕێبەرە شەهیدەیان دانا کە لە هەمموو دیوێکی بێ. ئەمن پێم وا بوو کە ئەوە نابێ. یانی کە دەڵێم پێم وا بوو، دەمگوت ئەگەر ئینشەڵڵا ڕۆژێک ئێمە لە وڵاتی خۆمان بینەو مەرکەزی حیزبمان هەبێ، دەبێ هەمموو ئەندامانی شەهیدی کۆمیتەی ناوەندی عەکسی گەورەی با بڵێین یەک میتر دە یەک میترو نیوی‌یاندا لێ بکێشرێتەوەو لە کۆڕیدۆرەکانی دەفتەری مەرکەزیی حیزبدا هەڵاوەسرێن. بەڵام ئەوەی دی‌کەیە سیمبوول دەبێ وێنەی یەک شەهید بێ. تەنیا یەک عەکس. لەپاشان ئەوە چووە کۆمیتەی مەرکەزی. لەوێ بڕیاریاندا. جا زۆریان ئیستیفادە لێ کرد، دوایە تەبلیغاتیان پێوە کرد کە ئەوە دوژمنی قاسملوویەو ئەوە عەکسی قاسملوو لە هەر جێیەکی بێ دەی‌شکێنێ‌و دەی‌دڕێنێ‌و لەو قسە بێ‌نرخانە. بەڵام لە کۆمیتەی مەرکەزی بڕیاریاندا دەبێ هەبێ. هەر لە کۆبوونەوەی

هاتمەوە بە کوڕەکانی سکرتاریام گوت بێنن وتەی ئەو شەهیدانە هەڵاوەسن. ئەوکات سکرتێر بووم. مادام بوو بە بڕیاری کۆمیتەی مەرکەزی بۆ من واجیبولئیتاعە بوو. لەو باوەڕەوە ئەگەر یەکێک ناخۆشی ویستبێم یەکێک گلەیی لێم بووبێ، یان هەرچی بێ، ئەوەیە کە ئەمن پابەندی ئەو شتە بووم کە حیزب بڕیاری لەسەر داوە. جاری وا بووە موخالیفی بڕیارێک بووم. یان ناگام لە بڕیارێک نەبووە. بەڵام مادام بڕیاری لەسەر بووە، بۆ من پیرۆز بووە. پێم وا بووە دەبێ جێبەجێ بکرێ مەگەر زەروورەتێکی دیکە ئیجاب بکا.

نموونە دێنمەوە. ئێمە لە کۆنگرەی ٤ دا شوعاری ڕووخانی جمهووریی ئیسلامیمان نەدابوو. بەڵام لە بەینی کۆنگرەی ٤ و ٥ دا شەڕیان بەسەردا سەپاندین و دنیا هەمووی بوو بە ئاور، یانی کوردستانەکە. ڕەحمەتی دوکتۆر سەعید بەرپرسی ڕادیۆو چاپەمەنی بوو، ڕۆژێک داوای مەقالەی لێ کردم کە بۆی بنووسم. لە زیمنی نووسینی مەقالەکەدا دوو کارم کردن. هەم هێرشم کردە سەر خودی خومەینی. هێرشێکی موناسیب بوو. هەم شوعاری ڕووخانم تێهاویشت. کە دامە دەستی، گوتم ئەمن وتارەکەم وا نووسیوە، ڕەئیی خۆمە، بەڵام ئیختیار بە تۆیە. چیی لێ حەزف دەکەی و چیی لێ دەگۆڕی بیکە. کە وام گوت، وا دیار بوو کوتیچکاو بوو. هەر زوو خوێندییەوە گوتی کوڕە بە قوربانت دەبم ئەمن لە ترسی تۆ ناوێرم دەنا لەمێژ بوو دەمەویست ئەوە بکەم. ئیدی لەو وەختیڕا تەقریبەن ٥،٦ مانگی مابوو بۆ کۆنگرە، ئەو دروشمە کەوتە سەر زاروزمانان کە زەمینەی بۆ ئامادە بکرێ. دیارە هەرواش بوو ئەو شوعارە لە کۆنگرەی ٥ دا قەبووڵ کراو بوو بە شوعاری حیزب. قەستی من ئەوەیە کە بڵێم لە وەختێکدا تەشخیس دەدەی بڕیارێک ڕەنگە جێبەجێ کردنەکەی بە قازانج نەبێ، حیزب بۆخۆی بڕیار دەدا دەیگۆڕێ. بەڵام ئەندامی حیزب حەقی نییە بڕیاری حیزب ڕەت کاتەوە ئەگەر بۆخۆشی موخالیفی بێ دەبێ پێڕەوی لێ بکا.

**عەباس کاریزێ:** مامۆستا پرسیارێکی دیکەت لێ دەکەم. ئەویش هەر لە قسەو بۆچوونەکانی کاک کەریمی حیسامی هەڵدێنجم. ئەو پێی وایە جەنابت زیاتر خۆت بە دوکتۆر قاسملووی وابەستە کردوە. یانی لە ڕێگای ئەوەوە خۆت گەورە کردۆتەوە. ئەوە چەندە ڕاستە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو دۆزمنایەتییە دەگەڵ دوکتۆر قاسملووی هەبوو. دەنا ئەمن دەگەڵ دوکتۆر قاسملووی پێوەندییەکم هەبوو. ئەوانەی موخالیفی دوکتۆر قاسملووی بوونە بە نۆکەری دوکتۆر قاسملوویان دەناسیم. بەڵام ئەوانەی مریدی دوکتۆر قاسملووی بوون بە موریدی دەماغی ئەویان دەناسیم. هیچ کەس لە دەفتەری سیاسیدا بە بێ شەڕ کردن - نەی وابووە شەڕی دەگەڵ کردوە - بەڵام هیچ کەس لە دەفتەری سیاسیدا بەقەد من لە موقابیل دوکتۆر قاسملوویدا ڕانەوەستاوە. مەسەلەن جارێکی لەبیرمە لە کۆمیتەی ناوەندیدا بەتاقی تەنێ لە بەرامبەریدا بووم. بەداخەوە تەسلیمیش بووم. جەریانەکەشت بۆ باس دەکەم. دوکتۆر

قاسملو سەفەری دەرێی کردبوو، ئەوە بۆ ساڵی ١٣٦٥ یان ٦٦ دەگەڕێتەوە زۆر دەقیق نیە. کە هاتەوە گوزاریشی سەفەرەکەی دا بە کۆمیتەی ناوەندی‌و لەپاشان بڕیارنامە ئامادە کرا. بۆ بڕیارنامەکە نووسیبووی: سکرتێر ڕاپۆرتی سەفەری خۆی دا بەکۆمیتەی ناوەندی‌و کۆمیتەی ناوەندی تەواوی کارەکانی سکرتێری کە لەو سەفەرەدا کردوونی تەئیید کرد. کە خوێندمەوە گوتم ئەوە نابێ وا بێ. دەبێ بڵێی ڕاپۆرتەکەی پەسند کرد. حەتتا کردمە گاڵتە، ئاخر دوکتور ئەهلی دڵ بوو، گوتم ئەمن چووزانم چیی دیکەت کردوە. کۆمیتەی ناوەندی ئەو قسانەی تۆ تەئیید دەکا، ئەوەی لەو ڕاپۆرتەی‌دا هاتوون. نووسراویش هەر ئەوەیە، غەیری ئەوە غەڵەتە. دوکتور قاسملو گوتی هەردەبێ وا بێ. دەگەڵ ئەوەی پێم وایە هەموو کۆمیتەی ناوەندی قبووڵیان بوو کە ئەزموەکەی من دروستە، لەبەر خاتری دوکتوری قبووڵیان کردو هەر ئەوە پەسند کرا.

یان مەسەلەن جارێکی لە سەفەری هاتبۆوە، نازانم هەر ئەو سەفەرەی بوو یان یەکێکی دیکە. ئەوە پاش ئەوەی بوو کە کورتەباس پەسند کرابوو. لە کورتەباس دا دەڵێ سۆسیالیسمی دێموکراتیک شتێکی غەیری سۆسیالدێموکراسی‌یەو لەو قسانە. لە سەفەرێ هاتبۆوە، جزوەیەکی "میشێل ڕۆکار"ی هێنابوو. میشێل ڕۆکار ئەو وەختی سکرتێری پارتی سۆسیالیستی فەڕانسە بوو، ئەوەی کردە فارسی‌و بڵاوی کردەوە. لە کۆبوونەوەیەکی گشتی‌دا دیفاعی لێ‌کرد، تەبلیغی بۆ کرد. کە خەلک قسەی کرد، ئەمنیش هەستام گوتم: ئێمە دەڵێین لە کورتە باس‌دا دەمانگوت سۆسیالیسمی دێموکراتیک دەگەڵ سۆسیالدێموکراسی فەرقی هەیەو ئەوە شتێکی دیکەیە. ئێستاش دوکتور جزوەی میشێل ڕۆکاری بۆ هێناوین‌و بۆی کردووینە حەدیسی "ئەبوو هورەیرە". عەینی ئەو کەلیمەیەم بەکار هێنا. ئێستا پرسیار ئەوەیە ئێمە بووینە سۆسیالدێموکرات، یان حیزبی سۆسیالیستی فەڕانسە لە سۆسیالدێموکراسی هاتۆتە دەرێ. پرسیارەکان دەکرانو دوکتور قاسملو جوابی دەدانەوە. وەڵامی هەمووانی دایەوە جوابی ئەوەی منی نەدایەوە. ئەمنیش زانیم قەڵس بووەو هیچم نەگوت. چووینەوە سکرتاریا. لەوێ بانگی کردم. گوتی ئەتۆ نابێ بزانی لە کوێ پرسیاران بکەی؟ گوتم بۆ نازانم؟ گوتی نەدەکرا لێرە لێم بپرسی؟ دەواقیعدا گوتی بۆ خەڵکم لێ فێرەقسە دەکەی. دیققەت دەکەی؟ یانی وا نەبووە ئەمن خۆ بە دوکتور قاسملووی هەڵواسم. ئەوە ماوەو بەدەنگ ماوە. لە کۆنگرەی ٨ دا برادەرێک کە ئەمماوە ڕووحی شاد بێ، کاک نەبی قادری، گوتی هەموو کەس دوکتور قاسملووی قبووڵە، بەڵام هێندێک کەسی بێ‌وەزن خۆیان بەوی‌یەوە هەڵ‌داوەسن. ئەمن هەستام گوتم ڕەنگە یەکێک لەوانەی ئەو قسەیە بیانگرتەوە ئەمن بم. ئەوە دوکتور قاسملوو لێرە دانیشتوە، لە حەیاتیدا لەبەری نەپاڕاومەوە بەم‌کاتە کۆمیتەی مەرکەزی. لە هەموو کۆنگرەکاندا! ئەو هاتوە خواهیشی لە من کردوە، نەم‌گوت پاڕاوەتەوە. ئەو داوای لە من کردوە کە بەرپرسایەتیی کۆمیتەی ناوەندی وەربگرم. چونکی ئەوە حیزبی دێموکراتی کوردستانە، حیزبی عەبدوڕڕەحمانی قاسملوو نیە. نەشم گوت دوکتور قاسملوو. یەکەم کەس دوکتور قاسملوو

چەپڵەی بۆ لێدام بۆ ئەوەی هەموو خەڵکەکە چەپڵەم بۆ لێ بدەن. لە بەرابەر دوکتۆر قاسملووی‌دا ئاوا بووم. ئێستاش شانازی بەوەوە دەکەم کە شاگردی بووم. پێم وایە ئەوەی لە سیاسەتدا فێری بووم نالێم هەمووی لەو فێر بووم، چونکە ئەمن لەژیاندا لە کەسی خوارتر لەخۆشم شت فێر بووم. لە منداڵێکیش، لە نەخوێندەوارێکیش شت فێر بووم. بەڵام ئەوەی لە سیاسەت فێری بووم ئەگەر بیکەینە دوو بەش، نیوەی لەو فێر بووم، جا نیوەکەی دیکەی لە هەموو خەڵکی دنیایە. ئەمن شانازیی پێوە دەکەم، بەڵام قەت نۆکەری دوکتۆر قاسملووی نەبووم. قەتیش دوژمنی نەبووم.

**عەباس کاروخ:** باشە مامۆستا وەک ئاخرین پرسیار لەبارەی ڕەوانشاد کەریمی حیسامی. سەرجەم کارو تێکۆشانی ئەو بەرێزە چۆن هەڵدەسەنگێنی، دەگەڵ ئەوەدا کە ڕەنگە لە قۆناغێک‌دا یان لە چەند قۆناغدا ئیختیلافیشتان بووبێ.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەش هەر وایە. کەریمی حیسامی ئەخشی باشی لە حیزبی دیموکراتدا گێڕاوە. لە خەباتی ڕزگاریخوازانەی میللەتی کورددا زۆری ماندوویی چاشتوە. ئەو ئەخشە دەبێ بەرێزەوە سەیری بکرێ. بەڵام لەعەینی حاڵیشدا، ئەو عەیبەی عەیبێکی گەورە بوو کە لە باری فکرییەوە سەربەخۆ نەبوو. زیاتر گوێ‌لەمستی وڵاتانی سۆسیالیستی بوو. لەوەش ڕەنگە تێ‌پەڕیبێ. حەتتا کاری بۆ دەکردن، ئەو کارەی کە شایستەی ڕێبەرێکی سیاسی نیە بۆ هیچ دەسەڵاتێکی دنیایەی بکا. لەو بارەیەوە خراپ بوو، چونکی گەیاندبە جێگایەک کە ئیدی بەداخەوە دەحیزبی دیموکراتی کوردستاندا جێگایەکی بۆ نەمابوو. داستانی کۆنفرانسی کۆمیتەی شارستانی مەهابادێت بیستوە؟ کە دادەنیشن و قسان دەکەن "ساڵە قەساب"ی ڕەحمەتی خەوی لێ کەوتوە. قسە تەواو دەبن و هەڵی دەستێنن کە ڕەئیت چیە. دەڵێ ئەمن موخالیفی ڕەئیی کاک کەریمیم. کاک کەریم دەڵێ کاکە ئەتۆ نوستبووی خۆ گوێت لە قسەکانی من نەبووە. دەڵێ وەڵڵا حاشا لەوەی ناکەم خەوم لێ کەوتبوو، بەڵام خۆ قورئانت نەخوێندەوە. ئەگەر قورئانیشت خوێندبێ هەر موخالیفتم. بانی دەگەڵ ئەوەی پیاوێکی هەڵسووڕ بوو. لەباری سیاسی و بەتایبەتی نووسینەوە خۆی پێ گەیاندبوو، بەڵام وای کردبوو کە لەو دواییانەدا تەنیا ئەوانە پشتیان دەگرت کە موخالیفی دوکتۆر قاسملووی بوون.

**عەباس کاروخ:** مامۆستا بەو حاڵەش ئێوە ڕێزتان لێ گرتوو بیرەوەریتان لێ بڵاو کردەوە. باشە بۆ ئەو کارەی بۆ ئەحمەد تۆفیقی ناکەن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو پرسیارە نابێ لە من بکرێ چونکە ئەمن بڕیاری حیزبم بەدەست نیە. بەڵام ئەحمەد تۆفیق و کەریمی حیسامی فەرقێکی زۆریان هەیە. ئەوەڵەن کەریمی حیسامی ئەخشێکی زیاتری لە حیزبی

دێمۆکراتدا گێڕاوە. عومرێکی زیاتر دە حیزبی دێمۆکراتی کوردستاندا بووە. پاشان لە هەمووی سەیرتر کەریمی حیسامی لەحیزب دەرنەکراوە. بەڵام ئەحمەد تۆفیق لە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان دەرکراوە. خۆ کە باسی ئەحمەد تۆفیقیمان کرد، ڕەنگە بە تەفسیل نەبووبێ بەڵام شتە باش و موسبەتەکانی ئەحمەد تۆفیقم باس کردن. بەڵام ئەو کاتێ شەهید بووە ئەندامی ڕێبەریی حیزب نەبووە هیچ، ئەندامی حیزبیش نەبووە. کاک کەریم دەرنەکرا، بۆخۆی ڕۆیشتە دەرێ و نەهاتەوە. قەت بڕیاری دەرکردن بۆ کەریمی حیسامی دەرنەچوو. بەڵام بۆخۆی وەک ئەندام ڕەفتاری نەدەکرد نیدی.

**عەباس کاردۆ:** هەر لەو دەورانەدا کەسانی دیکەش ناویان هەیە کە دواتر لە دەور خاریج بوونە یان ڕێگای دیکەیان گرتە بەر. لەوانە دوکتۆر سوڵتانی وەتەمیشی، موحەممەدی موحتەدی، دوکتۆر حەسەنی شەتەوی، سەلام شەفیعی، سمایلی حاجی و... ئەوانە چییان لێهات و بۆ حیزبیان بەجێ هێشت؟ کەسانی دیکەش هەن باسیان بکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوانە هەموویان ناچنە یەک خانەوە. هەر یەکەی بە دەلیلێک ڕۆیشتوە. ڕەنگە ئەوەی زیاتر لە هەمووی ئەوانە موخالەفەتی فکریی بووبێ، کاک موحەممەدی موحتەدی بووبێ. ئەو دەگەڵ خەتە فکرییە سیاسییەکەی حیزب زۆر موخالیف بوو. بە دەرەجەی دووهەم کاک حەسەنی شەتەوی بوو، کاک موحەممەدی موحتەدی زۆر موخالیفی شووڕەوی بوو. لەو وەختیشدا حیزبی دێمۆکرات لەو جیبهەتەدا حەرەکەتی دەکرد. دیارە ئەمنیش بۆخۆم وەکی وی توند نەبووم، دەنا ئەمنیش وام فکر دەکردەوە. مەسەلەن جارێکی کێشەمان هەبوو لە دەفتەری سیاسیدا کە بۆ ئێمە ئەوەندە ئیسرار دەکەین شووڕەوی، شووڕەوی. لە کۆبوونەوەی دەفتەر نەبوو پێم وابێ، لە کۆمیتەی ناوەندی بوو. گوتم ئەگەر هەر ئیسرارتان هەیە. تاقە یەک ڕێگا بۆ مۆسکۆیە هەیە. ئەویش بە دالانی سەفارەتی ئەمریکادا تێدەپەڕێ. ئێمە ئیسرارمان هەیە بێهەوێنین هەر دێهەوێنین، نەیهەوێنین هەر دێهەوێنین. بۆ؟ شووڕەوی چییە؟ ئەم ئەبەر قودرەتێکە، ئەویش ئەبەر قودرەتێکە. تەعامولیش دەگەڵ ئەمریکا خۆشترە هەتا شووڕەوی. ئاخر مەسەلەن ئەو شووڕەوییە کە ئێمە ئەوەمان بۆ دەکرد، ئێستاش ئێستاش ڕێگای نەدا دوکتور قاسملوو سەفەری بۆ بکا. حازر نەبوون بچن بیانبینن. بۆ؟ چونکی نۆکەریان نەبوو.

جا لە کۆنگرەی ٤ دا کاک دوکتۆر شەتەوی قسەی دەکرد. هێندێک ئیرادی گرت لەسەر سیاسەتی شووڕەوی لە ئەفغانستان. ئەویش گوتیان وەختەکەت تەواو بووە. کاک کەریمی حیسامی هەڵیدایە، گوتی لێی گەڕێن نوێنەری ئیمپریالیزمی ئەمریکا با قسەی خۆی بکا. یانی چونکی دژی شووڕەوی ئەو کارەی خراپە دژی نوێنەری ئیمپریالیزمی ئەمریکایە. هێندێکیان ئەوە بوون. دوکتۆر سوڵتانی وەتەمیشی پیاوێکی

باش بوو. پیاوێکی یەکجار سالم بوو. بەڵام ئیدی دوایە کە هەلومەرج گۆڕا ڕۆیشتەوە دەرێ و دەستی بەژیانی خۆی کردەوە. هەرچەند ژیانی خۆشی باش نەبوو، خێزانەکەی لێی جیا ببۆوە. جیا بوونەوەیەکیش کە ئیدی هەر بۆخۆی ڕۆیشتبوو، نەک بڵێی بەرەسمی جیا ببۆوە. منداڵەکانی دەگەڵی نەبوون. بەبێنێکی چووە لیبی. لەوێوە کاغەزێکی بۆ من نووسی کە ئەمن لەپاریس بووم. گوتی پێم‌خۆشە بێمەوە. ئەمنیش کاغەزەکەم بۆ دەفتەری سیاسی نارد. نووسیبووشم ئەمن پێم وا نیە کە دوکتۆر وەقەمیشی دەوەزعێکدا بێ کە بتوانێ بێتەوە. بەڵام ئێستا کە ئەو داوای کردووە، پێشنیار دەکەم لێی قبووڵ بکەن. حەتتا ئەوەشم نووسیبوو با منەتی بەخۆڕاییمان بەسەردا نەکا. کە بڵێ ئەمن حازر بووم بێم لە شاخەکانی کوردستان خزمەت بکەم بەڵام حیزب نەی‌هێشت. ئاخر جەوڕاح بوو. گوتیان موافیقین و هەربۆیە بۆم نووسی کە دەفتەری سیاسی زۆر ئیستقباڵی دەکاو سویاست دەکا. ئەتۆ کەنگێ ڕێکی دەخەی با ئەمن بلیتت بۆ بکڕم وەرە ئێرە لێرەوە بچۆ بەغدایەو لەوێشڕا بچۆوە بۆ کوردستان. کە ئەوەم بۆ نووسی ئێستاو ئێستاش جوابی نەدایەوە. چونکی بەڕاستی پیر ببوو، بێ تاقەت ببوو. ڕووحیەی ئەو جۆرە کارانەشی نەبوو. دوایە چووە یۆگۆسلاوی و لەوێ کۆچی دوایی کرد.

عەرز بێ ئەوانی دیکە، سمایلی حاجی هەتا چوونەوە وڵات ئێمە بوو. لەوێ پاش ماوەیەک بەهەر دەلیلێک بێ وەدوای ژیانی خۆی کەوت ئیدی درێژەی نەدا. ئەو ماوەیەک کەوتە ژێر تەئسیری گرووهی ماەمە غەنی، بەڵام ئیدی لەوان بەتەواوی دابڕا. خەتی فکری‌یەکی وای نەبوو. مەلا سەلام لە هەوڵەوە هاتیشەوە، بەڵام بەداخەوە دوایە لەڕادەبەدەر بەرەو خۆپارێزی کشا. هەتا وای لێ‌هات کە ئێستا خەڵکی پێی وایە لە باوەشی جمهووری ئیسلامی‌دایە. عەمەلەنیش ئەمن ناڵێم جاسووسی‌یان بۆ دەکا، بەڵام دەخزمەتیان دایە. کەسانێکی دیکەم دەنەزەردا نیە باسیان بکەم. ئەمن باوەڕم وایە هەرکەس بۆ ماوەیەکیش کەم یان زۆر خزمەتی حیزبی دێمۆکڕاتی کردوە، ئەخێر خزمەتی میللەتی کوردی کردوە لە حیزبێکی دیکەدا، یان ئەخێر لە هیچ حیزبانێدا نا، وەکوو سەربەخۆ کردوویەتی، مادامێکی ڕێی خەیانەتی نەگرتبێتە بەرێ، هەر جێی تەقدیرو هەر دەبێ بە باشی بۆی حیساب بکرێ. ئەگەر غەڵەتێکی هەیە باسی بکرێ. بەڵام خزمەتەکەی نابێ لەبیر بکرێ.

**هیوا کاروان:** مامۆستا دەکرێ باسی کارو تێکۆشانی خۆت جگە لە ڕاپەڕاندنی کاری حیزبی لەو دەورانە دا بکەی؟ لە بەغدا زیاتر بە چیەوە خەریک بووی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** غەیری ماوەیەکی کەم کە هەموومان ژیانمان لە لایەن حیزبەوە دابین دەکرا، ئەمن لە ڕۆژنامەیەکی کوردی بە ناوی "هاوکاری" دامەزرابووم وەکوو پەیمانی. وەکوو وتارنووس لەوێ کارم دەکرد.

ماوەی شەش ساڵێک لەوێدا کارم کرد. لە هەوەڵەوە بەردەوام لەوێ نەبووم وەک بڵێی کاری ئیداری. پێم وایە دەلیلی ئەوە بوو کە بەرپرسی و بەڕێوەبەرەکە موراعاتی دەکردم، ڕۆژنامەکە بۆ خۆی شەخسییەتی خۆی نەبوو، بەڵام لەژێر سەرپەرستیی دەزگایەک‌دا بەناوی "دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی کوردی"دا بەڕێوە دەچوو. ئەوە وەکوو بەڕێوەبەرایەتی‌یەک بوو. جا بەرپرسەکەی زیاتر ڕیعایەتی دەکردم و نەدەچوومە ئیدارە. بۆ ماوەی لانی کەم دوو، سێ ساڵێکی وتارەکانم لە ماڵێ دەنووسین و بۆم دەبردن. دواتر دیار بوو هێندێک توندیان گرت و هەر بۆیە دەبوو بچم لە بەیانی سەعات هەشت و نیوەوە هەتا سەعات دوو و نیوی پاش نیوەڕۆیە لەوێ بم. یانی شەش سەعات دەبوو لەوێ بم. جا بۆیە ئەمن کە کاری حیزبیشم دەکرد زۆربەی وەختەکان دوای تەواو بوونی کار ئەوێ، لە جیاتی چوونەوە بۆ ماڵێ، دەچوومەوە بنکەی حیزب بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان. یانی ژیانم بەشی هەرە زۆری لەوێ تەنمین دەبوو. یارمەتی‌یان دەدامێ.

**عەباس کاروخ:** وا بزانم لەو ماوەیەدا کە لە بەغدا بوون یەکێک لە پلینۆمەکانی کۆمیتەی ناوەندیتان لە ئورووپا گرتوە. ئەوە بۆ وای لێ هاتوە؟ دەکرێ باسێک لەو بارەیەوە بکەی؟ بەشداران، شوێن، ڕێککەوتو مەبەستی کۆبوونەوەو ئەوەی لەسەری دەزانی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەی ئەمن بزانم دوو جار کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی چۆتە دەرەوەی عێراق. لە یەکێکیاندا ئەمن ئەندام بووم چووبووم و هەر لەوێشدا ئیستیعفام کرد. ئەوە ساڵی ١٩٧٥ بوو. دوای ڕێککەوتنی ئەلجەزایر لە بەینی ئێران و عێراقدا بوو. عێراقی‌یەکان ڕازی نەبوون ئێمە لەوێ پلینۆم بگرین. گوتیان دەچنە کوێ ئێمە کۆمەکتان دەکەین، خەرجی فڕۆکەو ئەوانەشتان بۆ دابین دەکەین. بەحەقیقەت کردیشیان. تەنانەت بۆ ئەوانەش کە ئیمکانی ویزەو سەفەرو شتی وایان نەبوو، دەوەشدا هەر کۆمەکیان کرد. چووینە بولغارستان. لە شارێکی قەراغ دەریا بە ناوی "ڤارنا"، کۆبوونەوەکانمان کردو دوایە گەڕاینەوە. بەڵام وا بزانم ساڵی ١٩٧٦ بوو، جارێکی دیکە کۆمیتەی ناوەندی ویستی کۆ بێتەوە. هەر بە عەینی ئێبیخی دەوڵەتی عێراق ئیجازەی نەدا. چوون لە شارێکی نیزیک پاریس لە فەرانسە کۆبوونەوەیان گرت کە ئەمن دەویاندا بەشدار نەبووم. ئەوەیان زۆر دەقیق نیم. بە ئیحتیمالی زۆر هەر ٧٦ بوو بەڵام ئەگەر ئەوە نەبێ ٧٧ بوو. لە شارۆچکەیەکی نیزیک پاریس گرتیان کە برایەکی کریس کۆچێرای مەشهوور، بە ناوی "ژاک مۆنیک" ماڵەکەی خۆی دەئیختیار نابوون کە ماڵێکی ویلایی بوو. ئاخر کریس کۆچێراش ناوی "پۆل مۆنیک"ە بەڵام ئەو ناوەی هەر بۆ سەفەری ئێران و کوردستان بەکار دێنا.

**عەباس کاروخ:** مامۆستا مەجبوور بوون دەوڵەتی عێراق ئاگادار بکەن کە پلینۆم دەگرن؟ یانی ئەوان بۆ دەبوایە زانیبایان؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەدی مەجبوور بووین چونکی بەشێک لە خەڵکەکەمان لە دەرەوەڕا دەهاتنەوە. ئەوانە دەبوو ڤیزایان بۆ وەربگرین‌و پاشان ئەو دەزگا عەریزو تەویلە کە عێراق هەیبوو، بۆ جاسووسی، حەتمەن پێ‌یان دەزانی. دروستیش ئەبوو ئێمە کارەکە بکەین‌و ئەوان بۆخۆیان لە ڕێگای خۆیانەوە دەرکی بکەن. چونکی پێ‌یان دەزانی‌و ئەوجار وایان دەزانی کە شتیان لێ دەشارینەوە. دیارە خۆ ئێمە بەوان ناڵێین لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی‌دا چ دەگوزەرێ‌و چ ناگوزەرێ. بەڵام کە بڵێی ئەسڵی کۆبوونەوەکەش ناڵێم ئەوە زۆر بێ‌ئیعتیمادی دروست دەکا.

ئێستا شتێکم وەبیر هاتەوە کە بۆتی باس بکەم هەر لەوپێوەندی‌یەدا. ئێمە کۆنگرەی سێ‌مان لە بەغدایە گرت. داوامان لێ‌کردن ماڵێکیان داینێ ماڵێکی گەورە. دیارە ئێمە زۆر نەبووین. ٤٠، ٥٠ کەسێک دەبووین. یانی بە هەمووی ئەوانەشەوە کە خزمەتیان دەکرد نەدەگەیشتە ٦٠ نەفەر. بەڵام بە هەرحاڵ ماڵێکیان داینێ کە جێگای هەموو ئەو خەڵکەی دەبۆوە بۆ نوستنیش‌و بۆ دانیشتنیش. هەر ڕۆژی ئەووەڵێ تەفتیشمان کرد کە بزانین چۆنە. تەماشا دەکەین لە هەمووی دەزگای گوێ‌گرتنیان داناوە. ئێمەش تەنیا جەلەسەی کردنەوەی کۆنگرەمان لە یەکێک لە ژوورەکاندا کە گەورە بوو پێک هێنا. لەوێ لە وتاری کردنەوەی کۆنگرەدا کە درابوو بە هێمنی ڕەحمەتی، ئەوەش گوترا کە سوپاسیان دەکەین بۆ ئەوەی ئیمکاناتی بەستنی کۆنگرەیان بۆ پێک هێناوین. هەر بەو دەزگایەی کە نێو ماڵەکەمان پێ کەشف کرد، زانیمان حەوشەکە ئەو دەزگایەی بۆ دانەنراوە. حەوشەکە یەکجار گەورە بوو. ئیدی چووینە دەرێ‌و هەموو کۆنگرەکەمان لەوێ گرت. هیچ دەنگێکیان بۆ نەچوو. لەپاشان ئیعتیرافیشیان کرد، دوایە کە زانیان ئێمە زانیومانە. گوتیان ئێمە لەو ماڵەدا دەزگای ئیستیراقی سەمعمان داناوە. بەڵام ئەوە بۆ ئێوە نەبووە‌و هەر ماڵەکە تێی‌دا بووە. کاک حەمەدەمینی ڕەحمەتی کە مەسئوولی پێوەندی بوو گوتبووی ئێمە هەر ڕۆژی هەوەڵێ بۆخۆمان کەشفمان کردوە، بۆیە هیچ شتێک بۆ ئێوە نەهاتوە. بەڵام پێمان ناخۆش بووە شتێکی واتان کردوە خۆ ئێمە نەهاتبووین لە دژی ئێوە بەرنامە داڕێژین. ئێمە مەسایلی خۆمان‌و مەسایلی مەربووت بە دوژمنی ئێوە باس دەکەین کە ئێران بێ.

**عەبباس کاردۆ:** ئەو ماوەیە کە ئێوە لە بەغدا بوون، دۆستایەتیتان دەگەڵ زۆر کوردی ڕووناکبیر‌و نووسەری ئەو بەشەی کوردستان پەیدا کرد کە ئەو دۆستایەتی‌یە دەگەڵ بەشێکیان دواتریش بەردەوام بوو. پێم‌خۆشە لەو بارەوە بدوێی. ناوی کەسایەتی یەکان‌و تایبەتمەندی‌یەکانیان ئەگەر بکرێ.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هەر ئەوانەی بۆخۆم دەخزمەتیان‌دا بووم ڕەنگە وەختی زۆری بوێ‌و هەمووشم وەبیر نەیەنەوە. بەڵام با دەپێشدا بڵێم ئەو کەسایەتی‌یانەی ئێمە لە بەغدا دۆستایەتیمان دەگەڵیان هەبوو، بەشێکیان دەگەڕانەوە بۆ دۆستایەتیی کۆن وەک ساڵانی ٥٨ و ٥٩ کە دوکتور قاسملوو لەوێ بووە‌و وەکوو مامۆستای

زانکۆش عەمەلی کردوە. یان لە دوێ دەگەڵیان ئاشنا بووم و دوایە گەڕاونەوە. بەشێکیان ئەوانە بوون کە پێشتر لە نێو بزووتنەوەی کورد دەگەڵیان ئاشنا بووبین و دیارە بەشێکیشیان هەر لەوێ لەو ماوەیەدا دەگەڵیان ئاشنا بووین. جا لەوانە کە پیاو ناو بەرێ، هەر ئەوانەی ئێستا لەبیرمن مەسەلەن: خوالێخۆشبوو مەسعوود موحەممەد، هەر دیسان خوالێخۆشبوو دوکتۆر عەبدوڕڕەحمانی حاجی مارف، خوالێخۆشبوو دوکتۆر ئیحسان فوئاد، مەرحوومی ئیحسان شێرزاد، مامۆستا شوکور مستەفا کە ئەویش هەر بەڕەحمەت چووە. ئەوە بەوێ قسەیەکی خۆشم وەبیر هاتەوە با بۆت بگێڕمەوە. دەڵێن ئەو وەختی زەبیحی لە مەکتەبی سیاسیی پارتی دێمۆکراتی کوردستان بووە. یەکێک لە مەهابادێڕا هاتوە. زەبیحی لێی پرسیوە فلانکەس چۆنە، گوتوویە ئەتۆ خۆش. دەی دیسان لە یەکی دیکەی پرسیوە، گوتوویە ئەتۆ خۆش. خولاسە هەر پرسیویەتی و ئەو وەلامی داوەتەوە ئەتۆ خۆش. ئەویش ڕەحمەتی برایم ئەحمەد پێی دەڵێ بابە ئەتۆ وەک ئەسحابی کەهف وای، ئەوانی دەورانی تۆ هەموویان مردوون. جا ئێ منیش وای لێ هاتوە. بەڵام بەخۆشی‌یەوە زۆریشیان ماون لەوانە. مەسەلەن شەخسییەتی زۆر تاریخی و کۆنە بەسابیقە کاک فوئاد عارف کە ئێستا عومری لە نەوەدو چەند ساڵەی‌دایە، بەڵام هەر ماوە دەڵێن سەلامەتییشی باشە. هەروەها مێژوو نووسی گەورە فازیل دوکتۆر کەماڵ مەزهەر، دوکتۆر کەماڵ فوئاد، دوکتۆر عیززەددین مستەفا، کاک کەماڵ محیەددین، مامۆستا جەماڵ بابان کە ئەویش هەرچەند تەمەنی زۆرە ماوە لە سلێمانی دەژی. پێم وایە زستانی ڕابردوو بوو لە موناسەبەتێک‌دا چاوم پێی کەوت. باوەڕ بکە دەگەڵ چل ساڵ پێش زۆر کەمی فەرق کردبوو. یانی زۆرن ناتوانم هەموویان وەبیر بێنمەوە. چاک بوو وەبیرم هاتەوە. دوو برای زۆر بەڕێزو بەوەج. کاک خوسرەو تۆفیق کە ئەو دوایی‌یانە بە مەرگی تەبیعی مرد. دارا تۆفیق کە بەداخەوە لێ‌یاندا کوشتیان. دەوڵەتی عێراق بێ‌سەروشوێنی کرد. سەیدا ساڵح یووسفی بوو، عومەر دەبابە، چووزانم دکتۆر خالید، عەلی عەسکەری، حەمەی مەلا کەریم. ئەوانە هەموو لە بەغدا بوون. زۆرن ئەوانە کە دیارە تێکەڵاویمان دەگەڵیان زۆر بوو. حەتتا وەختێکیش کە بە مورەقیبی لە بەغدا ئەبووین. بنکەمان هەبوو بەڵام لەوێ نەبووین و گەڕابووینەوە کوردستان. دیسان سەرمان دەدان. ئەوانمان دەعوەت دەکردو دەهاتنە لامان. یان کە دەچووینە بەغدا ئەوان لە شوێنێک دەعوەتیان دەکردین و کۆ دەبووینەوە. پێوەندی‌یەکە، پێوەندی‌یەکی زۆر گەرم و سەمیمانە بوو.

دووبارە دەڵێم هەر وەکوو حەق. بەشێکی زۆرتری ئەو پێوەندی‌یانە لە ڕێگای دوکتۆر قاسملووەوە بوون. بەڵام بێ‌شک هەموویان ئێ وی نەبوون. ڕەنگە بە دوای ویدا کاک کەریمی حیسامی بێ. ڕەنگە ئەمن بم. چونکی ئەمن هێندێک پێوەندیم هەبوون کە کەریمی حیسامی نەی‌بوون. هێندێک ئەو هەی‌بوون ئەمن نەم‌بوون. یانی ئەو پێوەندی‌یانە زۆر وسیع بوون. مەسەلەن ماڵی ئەمین ڕەواندزی دوکتۆر قاسملوو دەگەڵیان ئاشنا بوو. ماڵی دزەیی‌یەکان، شەخسییەتی مەشهووریان کاک موحسین دزەیی، پێوەندیمان دەگەڵی هەبوو ئەو وەختی

وەک سەفیری عێراق لە چیکۆسلۆڤاکی بوو ، بەلام ماڵێکی لە بەغدایە هەبوو. خولاسە زۆر بوون. لە سەت زیاتر بوون .

**عەباس کاروخ:** مامۆستا ئەوانە هەر وەک دۆستایەتیی دوو لایەنە وا بوون یان دۆستی حیزبیش بوون.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** زۆربەی هەرە زۆری ئەوانە دەگەڵ حیزبیش هەر دۆست بوون. دەتوانم بڵێم هەر هەموویان وا بوون. ئەلحەق هەموویان ئیحتیرامێکی زۆریان بۆ حیزب هەبوو. دیارە خۆ حیزب لە شەخسییەتەکاندا خۆی دەبینێتەوە. لەپاشانیش سیاسەتەکانیەتی. سیاسەتەکانی حیزب ئەوە بوون کە خەڵک لێیان ڕازی بوون. دەگەڵ ئەوەی ئێمە پێوەندیمان بە دەوڵەتی عێراقەوە هەبوو، بەزاهیری حاڵ ئیحتیاجیمان بە دەوڵەتی عێراق هەبوو، کەسێک بەدبین بایەو تەنانەت جاروبار ئەگەر دەیانویست تانەمان لێبدەن، پێشیان دەگوتین کە پیاوی بەعسن یان بەعسین. بەلام پێم وایە هەموو ئەو کەسایەتییانەو بەدەیان و سەدان و بگرە هەزاران کوردی کوردستانی عێراقیش بەو ئازادیو سەراحەتەی لەلای ئێمە باسی دەوڵەتی عێراقیان کردوە دەگەڵ کوردێکی دیکەی باشووری کوردستان بەو سەراحەتە باسیان نەکردوە. چونکە دڵنیا بوون لەوەی ئەگەر ئەزمریشمان وەک وان نەبێ، ئیدی ئەوەی بە دەوڵەتی عێراقی نالێین. لەوەدا بەتەواوی دڵنیا بوون. سیاسەتی ئێمەش سیاسەتی دۆستایەتیو تەبایی بوو. مەسەلەن خەریک بوو لەبیرم بچێ کە دەمێ باسی بکەم. بەشێکی زۆری ڕێبەرانی حیزبی شیوعی، کاک عەزیز موحەممەد، کەریم ئەحمەد، جەلال دەباغ، موکەڕەم تالەبانی، حەمەکەریم فەتحوڵلا ئیدی هەر هەموویان دۆستی زۆر باشمان بوون.

**عەباس کاروخ:** مامۆستا دەکرێ بەناو باسی ئەو کەسانە بکەی کە چ وەک سەرکردایەتی یان ئەفرادی دیکەی حیزبی لە بەغدا کاریان دەکرد؟ بە گشتی ئەو خەڵکە چۆنیان خۆ دەژیاندو بە چییەوە خەریک بوون؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** لە ئەندامانی ڕێبەری ئێمە چەند کەسێک زیاتر لەوێ نەبووین. ماوەیەکی کەمتر، دیارە ئەندامی ڕێبەری مەبەست دەفتەری سیاسییە. وەختێک دوکتۆرو کاک کەریمی حیسامیو مامۆستا هێمنو کاک حەمەدەمینی سیراجیو ئەمن بووین. وەختێکی دوکتۆر وەحەمیشی بوو. ئەوانە لەوێ بووین. ماوەیەکی کاک سەید ڕەسووڵی بابی گەورە بوو. پاشان لە کوڕەکانی دیکە شەهید جەلال میراوەیی لەوێ بوو. کادرێکی زۆر بەتواناو شایستە بوو. کاک مەلا حەسەنی شیوەسەڵی بوو. کاک مەلا ڕەحمانی کازمی بوو کە ئەوانە هەر لە مەقەڕی بوونو کاری ئینتیشاراتیو ئەوانەیان دەکرد. بە تایبەتی کاک ڕەحمانی کازمی زۆر بەتوانا بوو لە مەجالی تایپو ڕۆنیۆو ئەوانەدا کە ئەوکات زۆرمان بەکار دێنان. کاک جەلال هەم ئەوەی دەکرد کە وەک وی ئەدەبوو، هەم نووسینو تەرجەمەی دەکرد کە لەودا دەسەڵاتی لە کاک مەلا

ڕەحمانیش پتر بوو. ڕەفیقێکی عەزیزمان هەبوو بە ناوی خالیدی عەلیپوور کە بەخۆی و منداڵەکانیەوە لەوێ بوون. لەواقیعدا کارەکانی ماڵیی دەکردن ئەوەی کەپێی دەڵێن کوویل. ئەو دەگەڵ ئێمە گەڕایەوە بۆ مەهاباد. دواتر هەر لە مەهاباد مایەوە نەهاتەوە دەرێ، بەڵام پێوەندیی هەبوو کە بەداخەوە پێوەندییەکەی ئاشکرا بوو، گیراو ئیعدام کرا. ئەوەی لەبیرم بێ ئەو چەند کەسە بوون. وەبیرم هاتەوە مام عەلی عەجەمی ڕەحمەتییش بوو. ئەویش لەوێ بوو. ئیدی ژیانێکمان بە ویەوە بوو.

مام عەلی عەجەم هەژار قسەیەکی خۆشی لەسەری هەبوو. دەی گوت مام عەلی لەدایک نەبووە. لە عەرزێ هاتۆتە دەرێ و یەکەمجاریش کە هاتۆتە دەرێ سمێڵی ڕاتلەکاندوون. دەلیلەکەشی ئەوە بوو کە نەی‌دەزانی کەی لە دایک بووە. تەقریبەن کەسیش نەی‌دەزانی خەڵکی کوێیە. بۆخۆی دەی گوت خەڵکی تەورێزم، بەڵام زۆری سەرەوەریی خۆی دەگێڕاوە. قەت جارێک لەجاران باسی منداڵیی خۆی نەدەکرد. باسی هەرچیی کردبایە هەر گەورە بوو. هەم تفەنگی پێ بوو. هەم سوارچاک بوو و ئەوانە. دیارە خەڵک پێیان وا بوو درۆیان دەکا، ئەمن دەمگوت درۆیان ناکا. مام عەلی هەموو شتەکانی کە دەیانڵێ لە عالەمی خۆیدا دروستی کردوون. جا دەیان گێڕێتەوە. ئەوەی دەی گێڕێتەوە ڕاستە، چونکی ئەوەی بۆخۆی دروست کردووە. مەسەلەن بەینێکی ڕیشێکی وەک ڕیشی بزنی لەسەر چەنەگەی هێشتبۆوە. دەمان گوت مام عەلی ئەوە بۆ ناتاشی. دەی گوت وەڵڵا ئەوە لینین ماچی کردۆتەوە، دڵم نایە بیتاشم. قەتیشی لینین نەدیبوو. بەڵام لەو شتانەی زۆر بوون. ئەویش ئەندامی حیزب بوو. ئەمن لەبیرمە لە مەنتەقەی ئێمە بوو، ماوەیەک لە کوردستانی ئێران. لەوێ کەنکەنەچی بوو. بیری هەڵدەقەندن. ئەو وەختی ئەندامی حیزب بوو. بەڵام چ ئەندامێک. ئەوکاتی لە بەغدا بووین هەرکەس قسەی کردبا پێی‌دەگوت "سەگباب" دیارە بە لەهجەی تورکی کە زۆر خۆشی دەگوت، ئەمن ٥٥ ساڵە ئەندامی حیزبم. ئەتۆ ئەمن فێر دەکەیەوە؟ ئەو وەختیش حیزب تەمەنی ٣٠ ساڵ بوو. ئەو کاری بەو کارانە نەبوو.

عالەمێکی خۆشی هەبوو. مەسەلەن باسی دەورانی ڕەشید عالی گەیلانیی دەکرد. دەی گوت لێرە بووم. هەموو گاڵتەمان پێ‌دەکرد. هەتا جارێکی میوانێکمان هەبوو بەناوی "غەسان" کە بۆخۆی بە نەسڵ خەڵکی کوێتیە. بەڵام بابی ڕۆیشتوە بۆ لوبنان. ئەو لەوێ لە دایک بووەو دوایە بۆتە ئەندامی حیزبی شیوعی و ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبی شیوعی لوبنان بوو. ئەوە میوانمان بوو. دوکتور باسی مام عەلیی بۆ کرد. گوتی ئەوە کابرایەکی ئازەربایجانی‌یە، بەڵام لە کۆنەوە ئەندامی حیزبەو بۆخۆشی داستانی خۆی هەیەو لەوانە. ئەو ڕەفیقە گوتی وەڵڵا پێم‌خۆشە قسەی دەگەڵ بکەم، هێندێک شت لەخۆی دەپرسم. دوکتور گوتی زۆر باشە بانگی دەکەین و با مامۆستاش تەرجەمەتان بۆ بکا، چونکی ئەمن زاهیرەن عەرەبی‌یەکەم لەوانی دیکە باشتر بوو. بانگی مام عەلیی کرد، گوتی مام عەلی، ڕەفیق غەسسان پێی‌خۆشە قسەت دەگەڵ بکا.

ئەوە فلانە کەسیش تەرجەمەت بۆ دەکا. گوتی نا بۆخۆم گسە(قسە) دەکەمەوە. ئەوە قەتمان گوێ لێ نەبوو بەعەرەبی قسە بکا. هات دەگەڵی دانیشتو دەستی کرد بە عەرەبی قسەکردن. هەرچی ئەو پیاوە گوتی لێی حاڵی بوو. هەرچیشی گوت جوابی دەدایەوە. شەپشەپێتی بە عەرەبی دەکرد. بەڵام جۆرێکی قسە دەکرد کە بە تەواوی لێی حاڵی دەبووین. جا ئەویش لەوێ بوو. دوایە هاتەوە ئێران. ساڵی ١٣٦١ لە کۆمیتەی شارستانی سەردەشت لە مەنتەقەی بێوخەڵەفی مرد. هەتا ئەو وەختی هاتو کەسیش نەیدەزانی عومری چەندە. شتی زۆر خۆشی هەبوو. مەسەلەن یاریی فوتباڵ بوو. دەیگوت فوتباڵم زۆر چاک دەکرد. لە بوخارست ئەم-دۆڕاندوە. لە مۆسکۆ نەمدۆڕاندوە. لەپاریس نەمدۆڕاندوە. ڕاستیشی دەکرد چونکە لە هیچیانی نەکردبوو.

# ڕاپەڕینی خەڵکی ئێران بە دژی ڕێژیمی پاشایەتی

**عەباس کاردۆ:** دەگەینە بەرەبەری ئاڵۆزییەکانی ئێرانی پێش ڕاپەڕین. پرسیار ئەوەیە حیزب هەتا چ ڕادەیەک لەو ئاڵۆزییانە ئاگادار بوو. چۆنی خۆ بۆ ساز کردو بەرنامەی بۆ بەشداری کردن چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو ئاڵۆزییانە ئەوە نەبوون پیاو هەر لە ئێرانێ بێ تا ئاگای لێیان هەبێ. یان هەر ئێرانی بێ و ئاگای لێیان بێ. یان هەر کوردی ئێران بێ و ئاگای لێیان بێ. دیارە ئەو وەختی ئەو ئاڵۆزییانە دەستیان پێ کرد، دنیا وای لێ نەهاتبوو وەک ئێستا کە دەڵێن بووییتە گوندێکی چکۆلە. بەڵام ڕادیۆ هەبوو، ڕۆژنامە هەبوو، تەلەفۆن هەبوو. هەموو ئەوانە هەبوون. وەکوو دەجێیەکی دیکەدا باسم کرد ئێمەش لەباری پێوەندیی تەشکیلاتییەوە بووژانەوەیەکی نیسبەتەن باشمان هەبوو. لە بەشێکی زۆری شارەکانی کوردستان ئەگەر نە تەشکیلاتێکی پاتوبەرین، هەر هیچ نەبێ ئەڵقەی تەشکیلاتی و پێوەندیی ڕێکخستنمان هەبوو. لە تاران لە ناوەندی دانیشگا ئێمە مەوقعییەتێکی باشمان هەبوو. بۆیە وەک هەموو کەس و بەتایبەت وەک کوردیش کە حیزبەکەی ئێمە پێوەندیی بەو بەشەی کوردستانەوە هەیە، پتر تاقیمان دەکرد و ئاگامان لێی هەبوو.

ئێمە لەو پێوەندییەدا هێندێک ئیمکاناتی باشمان هەبوو. ڕەنگە باشترینیان ئەوە بووبێ: هەر پێش ئەو ساڵانە هەردوو شەهید دوکتور قاسملوو و دوکتور شەرەفکەندی پێکەوە ئاشنا ببوون. دوکتور شەرەفکەندی کە خوێندنی لە فەڕانسە تەواو کرد، لەڕاستیدا وەکوو ئەندامی حیزب و وەکوو نوێنەر یان بڵێین وەکیلێکی دوکتور قاسملوو گەڕایەوە تاران. دیارە لەوێ کاری تەشکیلاتیی بەرینی نەدەکرد، بەڵام شەخسییەتی خۆی هەبوو، شەخسییەتێکی دانیشگایی بوو. ئاخر ئەو وەختی ئەو دوکتورای شیمیی تەجزیەی وەرگرت، پێم وابێ لە هەموو ئێرانێ دوو کەسی دیکەی ئاوا هەبوون. یانی زۆر کەم کەس ئەو مەدرەکەیان هەبوو. جایەگای خۆی هەبوو، پێوەندییەکی بەرینی دەگەڵ شەخسییەتە عیلمی و ئەدەبییەکان هەبوو. ئەوە بۆخۆی مەوقعییەتێک بوو. مەوقعییەتی دیکەشمان ئەوە بوو کە پێوەندیی تەشکیلاتیمان هەبوو. تەلەفوونیش هەبوو. لە بەغداڕا بۆ تاران و بۆ هەموو جێگایەک. بۆیە لەو بارەیەوە هیچ دە تەنگانەدا نەبووین. ئەو وەختی مەسئوولی تەشکیلاتمان خوالێخۆشبوو کەریمی حیسامی بوو. دەگەڵ ئەڵقە تەشکیلاتییەکان تەماسی هەبوو. بەڵام بێجگە لەوش ئێمە هەمووومان بە نۆرەی خۆمان دەگەڵ کەسانێک کە دەمانناسین تەماسمان دەگرت و ئەخبارمان وەردەگرت.

ئەمن لە نێو ئەو سەدە تێکۆشانەدا پێم وابێ هێناوەمە. تازە ئەو جموجوولانە هەڵایسابوون، ئاخر ڕاپەڕینەکان لەڕاستی‌دا لە ڕێبەندانی ٥٦ وە دەستیان پێ کرد، چونکی وا بزانم لە ١٩ی بەفرانباری١٣٥٦ بوو کە لە قومێ حادیسەیەک ڕووی‌دا. لە ٢٩ی ڕێبەندانی لە تەورێز حەرەکەتێکی گەورە بۆ چلەمین ڕۆژی وەڕێ خراو ئیدی دەستی پێ کرد. دوکتۆر قاسملوو ئەو وەختی لە دەرێ بوو. کەوتینە بەهارێ، تاریخ ڕۆژەکەیم لەبیر نیە بەڵام دوکتۆر قاسملوو هاتەوە. ئەوە ئیدی کەوتینە بەهاری ٥٧. کە هاتەوە کۆبوونەوەی کۆمیتەی مەرکەزیی بانگهێشتن کرد. لەوێ گوتی، لە دەفتەری سیاسی‌و کۆمیتەی ناوەندییش‌دا، گوتی ئەوجارە شتێکی دیکەیە. تازە شا دەڕوا. ئێمە دەبێ ئامادە بین بۆ بەرەوڕووبوونەوە دەگەڵ ئەو وەزعییەتە. جاری دیکەشم باس کردوە. هەرچەند پێمان وابێ ئەوە بێ‌ئەدەبی‌یە، بەڵام تەعبیرێکی کوردی‌یە، ڕەسەنە. لە دەرەوە، تەک لە کۆبوونەوەکەیدا، ئەو کاک حەسەنی ڕەستگارە گوتی شا تازە ڕۆیی، گوتم بۆ؟ گوتی ئەو کابرایە وەک قەلێ بە بن باڵی خۆی‌دا دەڕوانێ. تازە شا دانامەزرێتەوە، دەڕوا. یانی خوێندنەوەکەی ئاوا بوو. ئیدی لەو وەختەوە دەستمان کرد بە کار. هەتا کەوتینە پاییزەکەی‌و هەروەک باسم کرد دەوڵەتی عێراق موخالیف بوو کە لەوێڕا بچینەوە. ئێمە شەش کەس بووین کە دەچووینەوە. ئەو شەش کەسە بە فاسیلەی چەند ڕۆژێک خۆمان دە ئێرانێ کردەوە. هەرجارێ دوو کەس دەڕۆیشتین کە دوکتۆر قاسملوو دەستەی ئاخری بوو لەبەر شوێنەونکەی بۆ دەوڵەتی عێراق، عادەتەن نەبوونی وی دیار بوو بەڵام بۆ ئێمە هیچ نەبوو.

کە گەڕاشینەوە دیارە حیزبێکی پانوبەرین نەبووین بەڵام بەسەر شارەکاندا دابەش بووین. شەش کەس بووین شەش جێگامان بۆ دیاری کرا. دوکتۆر چوو بۆ تاران. کاک حەسەنی شیوەسەڵیمان بۆ مەنتەقەی ورمێ دانا، کاک سەید ڕەسووڵی دیهقانمان بۆ ناوچەی نەغەدەو پیرانشار دانا. ئەمن بۆ ساباڵاغێ دانرام. کاک ئەمیری قازی بۆ کرماشان. کاک هاشمی کەریمی بۆ سنە. دوایە کاک حەمەدەمینی سیراجییش هاتەوە پاش ماوەیەک، ئەویش بۆ سەقز دانرا. لە دەرەوەی کۆمیتەی ناوەندی‌و لەخاریجی زاگرۆسیش، کاک سەلیمی باباتژادە بوو کە لە سوێدێڕا هاتبۆوە زۆر خۆبەخشانە، چونکی کەس ئینتیزاری لەو نەبوو. ئەویش بۆ بۆکان دانرا. ئەو چەند کەسە بووین دەستمان پێ کرد. هێندێک قەیدوبەندیشمان بۆخۆمان دانا. دانرابوو کە ئێمە کاری نهێنی دەکەین. لە ماوەی یەک‌ساڵدا حەقمان هەیە یەک لە هەزاری خەڵکی هەر شارێکی دەگەڵ حیزب ئاشنا بکەین. ئەوە بۆ باری ئەمنیەتی بوو. یانی یەک کەس لە هەزار کەس. مەسەلەن ئەمن کە لە مەهاباد بووم، پێیان وا بوو جەمعییەتی مەهاباد ٥٠٠٠٠ کەسە. ئەمن حەقم هەبوو پاش ساڵێک ٥٠ کەسی دەگەڵ حیزب ئاشنا بکەم. ئەوە بوو کە بۆخۆم ئینیتیکارێکم بەخەرج دا. تەماشام کرد ئەو بڕیارەی ئێمە لە بەغدا داومانە وەڵامدەر نیە. بۆیە هەستام بیرم لە پێکهێنانی ڕێکخراوی لاوانو ژنان کردەوە. دوو ڕێکخراوی جنبیم دامەزراندن بە ناوی ڕێکخراوی لاوانی مەهابادو ڕێکخراوی ژنانی مەهاباد. هەر لە هەوەڵێشەوە بۆیەم وا

دانا کە لە هەر شارێ بە ناوی شاری خۆیان بێ‌و دوایە لە فورسەتی موناسیبدا بیکەینە کوردستانی. ئیدی ئەوە بوو مەسەلەن ئەمن لەبیرمە ڕۆژی دووی ڕێبەندان بۆ یەکەمجار هەم بەناوی حیزبەوەو هەم بۆ موناسەبەتێکی حیزبی، دەعوەتمان کرد بۆ کۆبوونەوە، ئەوە دووی ڕێبەندانی ١٣٥٧ بوو. تەزاهوراتو کۆبوونەوە بەناوی حیزبەوە کرا. هێزی کاریی ئێمە لەوێدا تەشکیلاتی حیزبی نەبوو، بەڵام لاوان‌و ژنان بوون. ڕەنگە تا ئەو وەختی گەورەترین خۆپێشاندان بووبێ. خەڵکێکی ئەوەندە زۆر هاتبوون، دیارە خەڵکەکە لە دروشمەکانیشڕا ئیحساسێکی تایبەتی‌یان وەرگرتبوو. شوعارەکان زیاتر مەحتەوای سیاسی‌یان هەبوو.

ئەمن بۆخۆم قەت نەمچووە خۆپێشاندانەکان. بەڵام لەو خۆپێشاندانەدا بۆخۆشم چووم، هێندێک خۆم گۆڕی‌و چووم، ئەووەڵەن ئەمن کە قەت لە مەهاباد بە کۆتوشالوارەوە نەبینرابووم، ئەو ڕۆژە کۆتوشالوارم دەبەر کرد، دوایە عەینەکێکی ڕەشم دەچاوم کردبوو. چونکی زستانیش بوو وەکی ئەوەی سەرمام بووبێ دەسرۆکەیەکی چووکەشم بە بەر دەممەوە گرتبوو. بەڵام ئەوە شتێکی خۆش بوو کە پێم باشە بیگێڕمەوە. ماشێنێکمان هەبوو بڵیندگۆی لەسەر دانرابوو شوعاریان لەسەر دەدا. ئەمن یەک، دووجار خۆم دەگەیاندە ماشێنەکەو دەمگوت ئەو شوعارێ بدەن. هاتین بۆ مزگەوتی سوور کە دەبوو لەوێ کۆ ببینەوە. لەلای چۆمی‌ڕا بۆی هاتینەوە، لەو شوێنەی‌ڕا کە پیلامانی پێ‌یان دەگوت قوولکەی کەران، ئەمن نەچوومە ژووری مزگەوتێ چونکی نی‌خۆمان نەیانهێشت، ڕۆژی پێش قسەمان لێ کردبوو. بەڵام لە نێزیک مزگەوتێ، لەبەر دەرگایە، یەکێک هات گوتی خۆپێشاندانەکەت پێ چۆن بوو؟ ئەمنیش گوتم خراپ نەبوو. کابراشم نەدەناسی، ئیدی ڕۆیشتو نەمدیتەوە. شا ڕۆیشتو کۆماری ئیسلامی هاتو حیزب ئاشکرا بوو. جارێکیان کاک حەمەدەمینی سیراجی گوتی لە ماڵی ڕەسووڵی برام دەعوەتن، کاک حەمەدەمین جارێ ماڵی لەوێ نەبوو، بەڵام براکانی لەوێ بوون. کە چووین ئەمن کەمێزۆر قیافەی ئەو کەسەم ناسیەوە، یانی کاک ڕەسووڵ. دوایە گوتی ڕۆژەکەت لەبیرە؟ گوتم کام ڕۆژ؟ گوتی ڕۆژی تەزاهوراتەکەی. گوتم کام تەزاهورات؟ ئەویش گوتی کە هاتمە کنت پرسیم خۆپێشاندانەکەت بەدڵە. گوتم بەڵێ لەبیرمە بەڵام ئەتۆ بۆ هاتیە لای من؟ گوتی دیتمی یەک، دووجار خۆت گەیاندە بڵیندگۆیەکەی. گوتم بێ‌و ئەمێ ئەوە شتێکە. هەتا ئەوێ ڕۆژێ لە نێزیکەوە کاک ڕەسووڵم نەدیبوو.

**عەباس گلزەو:** مامۆستا پێش ئەوەی، هەرچەند تازە خۆت گەیاندەوە ئێران بەڵام پێت خۆشە لەو ماوەیە کە لە عێراقێ بووی شتێک باس بکەی؟ یانی شتێکی مێژوویی ماوە کە لەبیرمان چووبێ لێی بدوێین.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کوڕە ئەوە ئەتۆی لەکۆڵ نایەوە هەتا باسی چی بکەم. دیارە شتی مێژوویی زۆرن کە ڕەنگە ئاوا یەکەدابەدوو وەبیر نەیەتەوە. بەتایبەتی وەکی پێشتریش باسمان کرد تێکەڵاوی دەگەڵ ئەو

ئەدیبو نووسەرو شەخسیەتە سیاسی‌یانەی کوردی ئەوێ شتی زۆر موهیممی تێدابوو. قەتم لەبیر ناچێ کە مەرحوومی مەلا قادری ویردی گەڕابوەوە ولاتو شەهید بوو، سالی ۱۳۵۱. ئەو هاودەردی‌یە کە خەلکەکە دەگلی کردبن بەجێی خۆی، بەلام پاش ماوەیەکی بەو ڕەسمەی کە دەنێو کوردی ئێرانی‌دا نەبوو بەلام هەم لەنێو عەرەبی عێراقو هەم لەنێو کوردەکان دا هەبوو دەمانەویست شتێک بکەین، بۆیە بەبۆنەی چلەی شەهیدبوونی مەراسیمێکمان ساز کرد. لە مەرکەزی ڕۆشنبیری کوردی لە بەغدا بوو، باوەڕ بکە زۆربەی هەرە زۆری شەخسیەتە ئەدەبی‌یە بەرچاوەکانی کورد دەوێدا بەشدار بوون. کەلیماتی ئەوەندە پڕەھەستو پڕ لە هاوپێوەندی دەوێدا بەزماندا هاتن کە پیاو قەت لەبیریان ناکا. ئەو شیعرە مەشهوورەی هێمنیش کە لەو پێوەندی‌یەدا نووسیبووی، بۆ یەکەمجار هەرلەوێ خوێندرابەوە. دەیێشدا هەبوو "کاروانی خەبات"، بەلام زۆر موناسیبی حالی ئەو ڕووداوە بوو. هەرچەند بۆخۆی گوتی ئەو شیعرە پێشتر نووسراوە بۆ مەلا قادری ویردی نەگوتراوە. کە دەلێ:

**زەردە پەڕی، سووڕ بوو ئاسۆ — خەریک بوو سێرە هەلگیرێ**
**لەباتی قاسپە قاسپی کەو — دەهات قرمژنی شێست تیرێ**

جا لەئاخریەکەی‌دا دەلێ:

**لەناو خوێندا دەخێتەوە — لاوی پەڕیکەو بەسەبات**
**بەلام هەروا دەچێتە پێش — پڕوچان کاروانی خەبات**

ئەوە تەئسیرێکی زۆر عەجایبی لەسەر خەلکەکە دانا. جا پێوەندیی ئاوامان زۆر بوون کە هەرکامیان لەجێی خۆیان جێگای ڕێزنو دەمێننەوە. ئەوانە دەحافیزەی ئینسانی‌دا دەمێننەوە بەلام ئێستا کە بەتەوێ بیانلێی ڕەنگە بەئاسانی نەگوترێن.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا کە هاتنەوە تۆ منداڵەکانت لە بەغدایە بەجێ مان. خۆ دوایە بۆخۆت نەگەڕایەوە.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** کە هاتینەوە بە نهێنی هاتینەوە، منداڵمان بەجێ هێشتن. هەتا دوای سەرکەوتنی ڕاپەڕینو زۆریش دواتر ئەوان هەر لەوێ بوون. کەوتینە بەهاری، ئەمەو خوالێخۆشبوو سەید ڕەسوولی بابی گەورە مەئموورییەتمان درایە کە بگەڕێینەوە عێراقو ئەو مالانە بگێڕینەوە. هەموو مالەکان نەک هەر ئی خۆمان. دیارە گەڕاینەوەو سەیرەکەی ئەوە بوو دەگەڕاینەوەدا لە سەیدنەحەمدان (گوندێکە لە ناوچەی قەلادزێ) گیراین. شەوی واریدی سەیدنەحەمدان بووین کە بەڕۆژ واریدی قەلادزێ بین. چونکی بەشەو واریدبوونی

قەڵادزێ نەدەکرا. لەوێ گیراین، دیارە هاتبوون بۆ تەفتیشی ئەحوالی قاچاغ. هەرچی ماڵی قاچاغی لەوێ هەبوو هەموویان دەگەڵ خۆیان برد. بەڵام خەڵکەکەیان هەموو کۆ کردەوە کە ئێمەشیان ڕەگەڵ خستن. دوایە کە دەیانەویست لێمان بپرسن، هەموویان بەسەف کردبووین، ئێمە چوار کەس بووین، ئەفسەرێک بوو هات لە منی پرسی. گوتم ئەمن پێمخۆشە بەجیا قسەت دەگەڵ بکەم چونکە خەڵکێکی زۆری لێ‌بوو. گوتی باشە ئەتۆ بچۆ هۆدێ ڕاوەستە. گوتم ئەو سێ کەسەش ڕەفیقی منن، ئیدی ئێمە چووینە وێ. دوایە بانگی کردین و لێی پرسیین. گوتم بابە ئێمە قاچاغچی نین. ئێمە حاڵ و قەزییەیەکی وامان هەیە. ئیدی ئێمەشیان دەگەڵ خەڵکەکەی بردە قەڵادزێ، بەڵام دەگەڵ ئەوانیان نەخستین. لە جیاتی ئەوەی سواری زیلی ئەرتەشیمان بکەن، ئێمەیان سواری ماشێنێکی دیکە کرد. لەوێ شەو ڕۆژێکی هەر وەکوو زیندانی‌یەکی موحتەرەم ڕایانگرتین هەتا دەگەڵ مەرکەزی سەرتریان تەماس گرن و دوایە ئیجازەیان داین بڕۆین. ئیدی بۆ سبەینێ‌ڕا چووینە بەغدایە. هەر بۆخۆشیان بردیانین، هەتا کەرکووکێش بە هێلیکۆپتێر بردیانین کە دیسان ئێمە هەر نیگەران بووین کە وەک گیراو دەمانبەن. بەڵام کە چووینە کەرکووکێ، مەلا ڕەحمانی کاژی ئەو وەختی لە بەغدایە بوو، ئەو بەدواماندا هات کە دیسان بۆ خۆیان هەر دەگەڵمان هاتن. یانی تەقریبەن هەر وەک گیراوێک وا بووین کە کەوتینەوە شەوێک دواتر. لەوێ ئازادیان کردین و ماڵەکانمان بەرەبەرە بەڕێ کردەوە.

ماڵەکان لە قەڵادزێمان هەبوون، لە سلێمانییمان هەبوون، لەبەغدایەمان هەبوون، لە ڕۆمادیە هەبوون، لەحیللەی هەبوون، پێم وایە یەک دوو ماڵ لە هەولێرێ بوون. بە هەموویەوە دەوری ٧٠ ماڵێک دەبوون. ئیدی هەموومان کۆ کردنەوە کە دیارە هەم ئیجازەیان‌دار هەم تەنانەت کۆمەگیشیان کرد. کۆمەگەکەش لە واقیعدا هەم کۆمەگ بوو هەم چاوەدێری بوو. هەردووکی بوو. بە ماشێنی ئەرتەشی عێراقی هەتا حاجی‌ئۆمەرانیان بردین. جا ماڵەکانمان وەجێ‌وەجێ بەڕێ کردن هەتا ئاخرکاروان. پێم وایە پێنج، شەش کاروان بوون. کاروانی ئاخری ئێمە بۆخۆشمان تێیدا بووین. کە بەزەحمەتێکی زۆر کۆمان کردنەوە، شەوێ هاتینە هەولێرێ. لە هەولێرێ ئوردووگایان بۆ لێدابووین بەچادر. شەوێکی ئەو خەڵکە لە هەولێرێ مانەوە. لە دەوروەی شاری بوو، پێم وایە لە نێزیک موعەسکەراتی خۆیان بوو، چاکم لەبیر نییە. شەوێ لەوێ ماینەوە بۆ بەیانی بردیانین بۆ حاجی-ئۆمەران. ئەوەشم لەبیرە کە موقەڕەڕاتی ئەرتەشی و دەوڵەتی جالیبە. هەرچی کردمان و هەوڵماندا کە بابە با ئەو بارانە بچنە هۆزێ، یانی ئەودیوی سنوور، بۆ ئەوەی ماشێن کە لە دیوی ئێرانی‌ڕا دەهاتن ئاسانتر هەڵیان-بگرن. گوتیان مومکین نییە، ئەوە خاکی ئێرانی‌یەو نابێ. مەرزیش خۆ هیچی لێ‌نەبوو. ناچار هەمووی ئەو ماڵانەمان کە زۆریش بوون بە دەست ڕاگوێزتن هەتا ئەودیوی. ئەوەیان بە تەجاوزەمەرز دەزانی و دوایەش کە دیتمان.

ئەوەم پێ جالیب بوو. شتێکی دیکەشم پێ جالیب بوو کە ئەوەیان ئینسانی‌یە. ئەمن برایەکم هاتبوو بۆ پێشوازیمان. ئەوە سالّی ١٣٥٨ە. ناسۆی کوڕیشم منداڵی سالّی ١٣٥٥ە. سێ ساڵ پێش لەدایک ببوو، بەڵام لە مانگـ‌دا نەبووە بە سێ ساڵیش. مینی‌بووسمان بۆ هاتبوو بۆ سواربوونی. یانی ماشێنی باری بۆ بارەکانو مینی‌بووسیش بۆ نەفەرەکان. ئەمنو منداڵەکانمو کاکم دە مینی‌بووسێکی‌دا سوار ببووین. ناسۆ چوو خۆی دەباوەشی مامی هاویشت. دەنێو ئەو هەموو خەڵکەی‌دا. یانی ئەو شتە ئینسانی‌و عاتفی‌یەشم هەر لەبیرە کە پێم جالیب بوو. غەریزەیە. یانی ئەو هەستە دەمنداڵێک‌دا هەبوو کە ئەو کەسە فەرقی هەیە دەگەڵ ئەوانی دیکە.

**هێلی کارێز:** دوای ساڵانێکی زۆر دووری لە وڵاتو ناوچەی جێگای ژیتی پێشووت، هەرکە پێت نایە نێو خاکی بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان چ هەستێکت پەیدا کردو چۆن خۆشحاڵیی خۆت دەربڕی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** خۆ ناتەوێ ئەمنیش وەک "ئیسامی ڕاحیل" بڵێم هیچ؟! دیارە ئەوە یەکەمجار نەبوو کە خۆم تێدا دەدیتەوە. چونکی ئەوروڵەن هەر ئەو جارەی ئێمە لە پاییزێ‌دا چووبووینەوە - پێم وابێ ئەووڵی مـانگی خەزەڵوەرێ گەڕاینەوە - ئێستێ ئەوە مـانگێکی بـەهار چووە کە ماڵەکانمان هێناونەوە. پێجگە لەوجارەش کە بە یەکجاری هاتینەوە، ئەمن دوو جاری دیکەش گەڕابوومەوە وڵات. مەبەست لە دەورانی شای-دا بۆ کاری حیزبی چووبوومەوە. یەکەمجاری کە دیارە ئیدی وەک پێشوو نەبوو کە بڵێی نەمزانیو ئەزموونم نەبێ. چونکی ئیدی بەرپرسایەتیی حیزبیم هەبوو پیاوێک بووم دەرکم دەکردو دەمزانی چی دەکەم. جا ئەوجارەی زۆرم پێ‌خۆش بوو. ئەوەندە خۆش بوو کە هەرچەند هیچ فایدەی نەبوو، بەڵام خۆم ڕەمەزەکەی دەخشاند بۆ ئەوەی بە هەموو وجوودمەوە لەمسی بکەم، نەک بڵێی یەکجارو هەر ئەووڵ لەحزە، تەنانەت هەتا ئاخرین لەحزەکانیش هەتا درێژ دەبوودم خۆم ڕێ‌دەخشاند بۆ ئەوەی چاکی لەمس‌کەم. بەتایبەتی شتێکی دیکەشم لەبیرە. ئاخر هەستی نیشتمانپەروەری لە شوێنی لەدایک‌بوونتەوە دەست پێ‌دەکا. ئەوێ خۆشەویستترە لە دێیەکەی پەنای. ناوچەکەت پێ لە ناوچەیەکی دیکە خۆشەویستترە. ئەمن لەبیرمە لە دێیەکەی مەدا شەڕە گەڕەک دەکرا. گەڕەکی سەرەوەو خوارەوە شەڕە گەڕەکیان دەکرد. هەر شەڕی بە عەمەدی، شەڕە قۆچەقانی‌یان دەکرد. جا ئەمن بە حەتێک‌دا نەچووبوومەوە کە بکەوێتە ناوچەکەی خۆمان. دەمڕوانیە دوور، ئەگەر چیاکانیشم نەدیبایە، لانی کەم شەبەحی چیاکانی لای خۆمانم دیبایە. ئەوە شتێکی خۆش بوو. وەک لە فۆلکلۆردا دەڵێ:

لەولای خۆمان کێوێک دیارە     بەقەد ئەو کێوەی غەم لەدڵم بارە

بەڵام ئەو گەڕانەوەیەی ئاخریمان نەک گەڕانەوەی بەماڵەوە، شتێکی تێدا بوو. ئەوەی بە ماڵیشەوە گەڕاینەوە شتێکی دیکەی تێدا بوو. کە هاتینەوە دەپاییزێدا ئێمە بە فکرێکەوە هاتبووینەوە. دەمان‌گوت داخوا دەبێ چۆن بێ‌و چەند وەحشەتناک بێ. کەچی هاتین لە جێیەکی بەناوی "ئاڵیەمەران" بەفرمان بەسەردا باری. دیارە ڕێگامان لێ وێن بوو و لاقم سەرما بردی‌و ئەوانە. بەڵام دوو شەوان لەوێ ماینەوە لەبەر بەفرێ. لەوێڕا تەماسمان دەگەڵ مەهابادێ گرت کە بە دواماندا بێن. شەوێ هاتینە "چەکوزێ"و نانی شەوێمان لەوێ خوارد. دوایە سواری ماشێنی بووین بەجادەو جادەیدا بڕۆ بۆ پیرانشارێ‌و بڕۆ بۆ نەغەدەی. ئیدی پیاو باوەڕی نەدەکرد. مەسەلەن پاسگای "دوو ئاوان" هەبوو کە خەڵک زۆری لەبەر بەئازار بوون. حەتتا لە دەورانی بزووتنەوە چەکدارانەکەی خۆشماندا. بەڵام کە بە بەر دەرگایدا ڕابردین چۆڵ‌وهۆڵ کەس لەبەر دەرکێ نەبوو. حەتتا نیگابانیشیان نەبوو. بەتێو نەغەدەیدا ڕۆیشتین هەروا هیچ شتێک نەبوو. کە گەیشتینە سابلاغێ دیتم لە نەتیجەی ئەو تەزاهوراتانەدا کە کرابوون هەموو تابلۆو شووشەکان بەردیان پێدا دراوە شکاون. پیاو لەخۆشی‌یان باوەڕی نەدەکرد کە ئەوە چی بێ. یان مەسەلەن ئەو ڕۆژی تەزاهوراتەی کە باسم کرد. کە هاتمە دەرێ خەڵک هاواریان دەکرد: "بگو مرگ برشاه". فکرم دەکردەوە ئەوە ڕاستە ئەمن دەی‌بیستم یان نا.

بەڵام ئەو ڕۆژی بەماڵەوەڕۆیشتنەوەی نەک هەر ئیحساس، بەڵکوو بە زمانیدا هات. گوتم ئۆخەی ئەو داستانە دوورودرێژە تەواو بوو. ١١ساڵ بوو ئەمن لە عێراق بووم. ئەوجارە بەماڵەوە دەگەڕامەوە. بەڵام بەداخەوە ئەو دەورانەی ئەمن عیشق‌و عەلاقەم پێی هەبوو زۆری نەخایاند. هەمووی ٥ ساڵی خایاند کە جارێکی دیکە بەماڵ‌و منداڵەوە قاچاغ بووینەوە. پێم وابێ ساڵی ٦٣ بوو کە دیسان ماڵ‌ومنداڵەکەم هاتنەوە ئەو دیوی سنوورەکان. بەمانەوێ‌و نەمانەوێ ئەوە ناوی سنوورە.

**عەباس کاریز:** مامۆستا پێم‌خۆشە بزانم یەکەم کاری کە دوای گەڕانەوەت دەستت پێ کرد چی بوو؟ کێت دیتو چۆنت پێشوازی لێ کرا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** یەکەم شەو میوانی ماڵێک بووین لە مەهاباد کە بەداخەوە چاکم وەبیر نایەتەوە. بەڵام دەزانم لەو کاکەمەمی‌یانە بوو. نازانم چییی کاک ئەحمەدی کاکەمەمی بوو. بۆ بەیانی ئەمن خزمێکم هەبوو، تەماسم دەگەڵ ئەو خزمەم گرت چووینە وێ. کە چووین، شەوێ لەوێ بووین‌و بۆ بەیانی تەزاهورات بوو کە کەسێک شەهید ببوو بە ناوی سەید عومەر. سەید عومەریان دەناشت. ئەمنیش کوڕێکی خزمەکەمانم نارد گوتم سەید حەسەنی هاشمی دەناسی، گوتی دەی‌ناسم. گوتم بچۆ پێی بڵێ وەرە ماڵێ مە میوانێکی لێیە دەتناسێ. ئەگەر گوتیشی کێیە پێی بڵێ. گوتم بەوی‌و بە کاک عومەری قازی بڵێ. ئێمەش دوو کەس بووین. ئەمن‌و کاک ئەمیری قازی بووین. ئیدی کە مەراسیمی تەشییع‌جەنازەکە تەواو بوو، ئەوان

هاتن. ئەوە دووهەمین ڕۆژی گەیشتنەوەمان بوو. با قسەی خۆشیش ون نەبێ. کە وەژوور کەوتن کاک سەید حەسەن کە هەموو سەرو سمێڵی سپی ببوون، جا چاویشی گەورەو زەق بوون. هەر واقێکی بردەوەو گوتی ئەوە بۆ ئەبزووتوون؟ مەبەستی ئەوە بوو بۆ سەرتان سپی نەبوو. ئەمنیش زۆر بێ ئەدەبی‌یە بەڵام قسەکە خۆشە. گوتم دەبرۆ ماڵت نەشێوێ دڵێی دەست دە کەپەکێ ناوە. جا سمێڵی سپی‌سپی ببوون، بەو قسە خۆشانە دەستمان پێ کردو ئەوە یەکەم دیدارەکانمان بوون. دوایە ئیدی بەپێی ئەو مەحدوودییەتەی هەبوو، ئەمن دەبوو خەڵکی ببینم.

هەر لە ڕۆژەکانی هەوڵێ‌دا بوو، هێندێک کەس کە باوەڕم پێ‌یان هەبوو و دەمزانی جێی متمانەن چووم سەرم دان. مەسەلەن چووم سەری مامۆستا مەلا شێخ عێززەددینەدا. تەلەفۆنێکم لێ کردو گوتم دەمەوێ دیلغیت لێ بکەم. لەبەر کۆنترۆڵ کردنێ ناوی خۆم نەگوتو گوتم کەسێکم قوتابیی خۆت بووم. گوتی کێی؟ گوتم ناوم موحەممەدی پاکتلە. گوتی ئەوە ناوی خۆتە؟ گوتم ناوی خۆم نیە، دوایە دەمناسی. ئەویش ڕەزایەتی نەداو گوتی نازانم کێی. گوتم ناوەکەم مەڵێ بەڵام جارێکی کتێبێکم بە دیاری بۆ ناردبووی، جا پێش ئەوەی قاچاغ بم، مامۆستا مەلا شێخ عێززەددین کە دەی‌زانی حیزبیم، دوو سێ جار ئەو قسەیەی بەمن دەگوت کە ئەمن شایەم بەتۆ نیە بیی بە مەلا، مەلا زۆرن. بۆیەم شایی پێتە بۆ میللەتەکەت شتێکت لە دەست بێ. زۆری خۆشدەویستم. کتێبەکەم کە بۆ ناردبوو، کوردستانو کوردم بۆ ناردبوو، نووسیبووم پێشکەش بەو مامۆستایەی هیوای پێبوو شتێکم بۆ میللەتەکەم لەدەست بێ. ئارەزوو دەکەم ئەوم وەک "شتێک" لێ‌وەربگرێ. جا ئەوجار زانی‌و گوتی وەرە. چوومە سەردانی وی. لەپاشان لە ڕێگای کاک سەید حەسەنی هاشمی‌یەوە مەوعیدم لە مامۆستا مەلا کەریمی شاریکەندی وەرگرت چوومە لای ئەویش. ئاخر مامۆستا شاریکەندی زاوای کاک سەید حەسەنی بوو. یانی مێردی خوشکی وی بوو. ئاوا هێندێک کەس کە جێگای متمانە بوون، دەچوومە ماڵی‌یان. دیارە ئەمن هەر دووسێ شەوان لەو ماڵەی مامەوە. ماڵە خزمێکی دیکەمان هەبوو، پێ‌یانزانی داوایان لێ کردم بۆ ماوەیەک چوومە ئەوێش. دوایە چوومە ماڵی کاک "فەتاح غەوسە"ی کە لە ڕێگای حیزبەوە ئەو ماڵیان بۆ دانام. دەبوو بە خەزووری هونەرمەند کاک عەزیزی شاروخ. ماڵەکەی لە مەحموودکانی بوو، لەوێ بووم هەتا شۆڕش سەرکەوتو خۆمان دەرخست.

ئەو ماڵە زۆریان خۆشدەویستم. زۆریان شایی بەوە بوو کە لەوێم. لەبیرمە خێزانەکەی قسەیەکی کرد قەتم لەبیر ناچێ. هەم موحیببەت دەگەڵ خۆمی تێدا بوو، هەم دڵسۆزی. گوتی ڕۆیشتنی شای خۆش بوو. بەڵام ئەوەی ناخۆش بوو کە کاک موحەممەد ڕۆیشتو ئیدی ئازە ئێمە ناناسیتەوە. گوتم بڵێی ئەوەندە بێ‌سەفەت بم ئێوەم لەبیر بچێتەوە؟ بڵێی ئەو هەموو چاکەو زەحمەتو موحیببەتەی ئێوەم لەبیر بچێ؟ ئیدی بەهەر حاڵ ماڵەکەم لەوێ لابرد چوومە مەقەڕی حیزبی. بنکەیەکمان لە تەربیەت بەدەنیی سابڵاغێ کردەوە، ئەمن لەوێ

دۆزیام. بەڵام لاتی کەم هەتا لە شاری بووین هەفتەی جارێک وەکوو وەفا دەچووین سەرم دەدان. بەڕاستی چاکمیان یەکجار زۆر بوو، موحیببەتیان زۆر پێ کردم. قەتم لەبیر ناچێ.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا دەگەڵ ئەوەی کاک ئەمیری قازی خەڵکی مەهابادێ بوو و خەڵکی زۆر دەناسی، هەم وەک تایفە هەم وەک دۆست و ڕەفیق، چۆن بوو ئەتۆیان لەوێ دانا و ئەویان بردە کرماشانێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە تەقریبەن هەدەف بوو، مەقسوود بوو، چونکی ئەگەر کاک ئەمیری قازی لە مەهابادێ بایە زۆر زوو خەڵک دەیزانی ئەوە دەنێو شاری‌دایە. بەڵام ئەمن کەسانێکی تایبەتی دەیانناسیم. هەموو کەس نەی‌دەناسیم. لە عەینی حاڵیشدا ئەمن لە مەهابادێ شارەزا بووم. کەسانێکم دەناسی و جگە لەوەش برادەرانی دیکە کۆمەگیان دەکردم بۆ ناسینی ئەوانەی پێویست بوو تەماسیان دەگەڵ بگرین. یان مەسەلەن کاک حەسەنی شێوەسەڵیمان بۆ ڕەمزی دانابوو. دەلیلی ئەوە بوو کە لە وڵاتی خۆی زیاتر دەناسراو لە عەینی حاڵدا چونکی زیندانی ببوو، تورکیی دەزانی. پاشان ئەو شەخسییەتانەی لە ناوچەکەدا هەبوون کۆمەگیان دەکرد. مەسەلەن ئەمن مام غەنیی بلووریانم ئەدەناسی کە ئەو وەختی ئەرەف حیسابی ئەرەف مەشورەتی من بوو. هەفتەی جارێک دەبوو ئەوانە کۆ بینەوە باسی مەسایلمان کردبایە. ئەمن ئەمدەناسی دوکتۆر پێی ناسانم.

**عەباس کاردۆ:** هەتا دوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران تەنیا حیزبی هەڵسووڕی مەیدانی خەبات لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان حیزبی دێمۆکڕاتی کوردستان بوو. ئەو حیزبە تاقانەیە کە بەتایبەت ئەزموونی کۆماری کوردستان و بزووتنەوەی ساڵەکانی ٤٧-٤٦ی هەبوو، لەو قۆناغە نوێیەدا چ بەربەستگەلێکی لەپێش بوون و چۆنی خۆ دەگەڵ وەزعی نوێ گونجاند؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە ئەگەر بەربەستی واقیعی باس بکەین ئەوە بوو کە ئێمە ماوەیەکی زۆر بوو لە وڵاتەکە دوور بووین. ئەوە کە لە دوورەوە وڵات بناسی دەگەڵ ئەوەی لە نێزیکەوە تێی‌دا بژی فەرقێکی زۆری هەیە. لە هەلومەرجێک‌دا ئێمە هاتینەوە وڵات کە ڕاپەڕینێکی گەورە بەرپا ببوو، هەلومەرجێکی بە هەموو ئیعتیبارێک و بە هەموو مانایەک تازە پێک هاتبوو. هەڵچنکووتنێکی کۆمەڵانی خەڵک. بەڵام حیزبی دێمۆکرات خاوەنی تەشکیلات و ڕێکخراوەیەک نیە کە بتوانێ وەڵامدەری ئەو وەزعە بێ. یانی دوو کۆسپ: یەکیان ئەوەیە کە کەمە. ئەوی دیکە ئەوەیە کە ئەوەی هەشە ناشارەزایە. ئەوە دروست نیە کە تا سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران حیزبی دێمۆکرات تاقە حیزبی سیاسی بووبێ، چونکە ژمارەیەک ڕێکخراوی سیاسی پێش ئەو ڕووداوە تێکۆشانی سیاسیی خۆیان دەست پێ کردبوو.

**عەباس کاردۆ:** یەکەم هەنگاوەکانتان بۆ خۆچەکدارکردن کەی بوو؟ چۆنتان دەست پێ کرد، بۆ ئەو بڕیارەتان داو بڕیاردەرانی کێ بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەکوو کاری حیزبی عادەتەن ئەو کارانە هەمووی لە کۆمیتەی ناوەندیو دەفتەری سیاسی‌یەوە دەست پێدەکەن. ئێمە کە لە عێراقەوە گەڕاینەوە ئێران چەند دانە چەکێکمان هەبوون. زۆر کەم بوون. پێموایە ٣ دەمانچەمان هەبوون، دەگەڵ ٥ کلاشینکۆفان.

**عەباس کاردۆ:** یانی لە عێراقڕا دەگەڵ خۆتان هێنابوونەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەک بڵێی دەگەڵ خۆمان هێنابنەوە، چونکە ئێمە بە دەستی بەتاڵ گەڕاینەوە. بەڵام پێشتر هەبوون ناردرابوونەوە وڵات، یەکێکیان لەکن دۆستێکی تەنزیمی حیزب بوو، با ناوی نەهێنم بەڵام ڕۆیی‌و ئێستاش هەر دەڕوا. ئەوە نەدرایەوە بەحیزب. ئەوانی دیکە مانەوە کە یەکجار زۆر کەم بوون. لەپاشان وەختێکی ئێمە دەمانەویست پادگانی مەهابادی بگرین، ئەو چوار تفەنگەمان کە هەبوون ئەوانیشمان هەموو لەبەر دەستدا نەبوون. هەر دوویان لەوێ بوون. حیسابی ئەوەشمان کردبوو کە پادگان ڕەنگە موقاوەمەت بکا. مەرحوومی سەرگورد عەبباسی نەخشەیەکی جالبی کێشابوو، ڕەنگە بوو بیشی گری. مەسەلەن بەشێک لە نەخشەکەی ئەوە بوو کە لە کوێڕا هێرش بکرێ‌و لە کوێڕا وارید بینەوە ئەوە. بەڵام بەشێکی نەخشەکەی ئەوە بوو کە بۆڵدۆزێرێکی گەورە دێنین، پاش ئەوەی پادگان بۆ ماوەیەک لە هەموو لایەکەوە گولـلە باران دەکرێ، ئەو بۆڵدۆزێرە وەحەرەکەت دەکەوێ. چونکی هەواش کەمێک تاریکە، دەنگیشی وەک دەنگی تانک دەچێ. کەچکەکەشی هەڵدەداتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر تەقەی لێ کرا، شۆفێرەکەی وەبەر نەکەوێ. بەوجۆرە دەڕوا هەتا دەگاتە بەر شووڕەی پادگان کە یان دیوارە یان سیمی خاردارە. ئەوکات تێکی دەشکێنێ‌و دەڕواتە ژوورێ. یانی لە لایەکەوە دەچێتە ژوور کە دەرگای ئەسڵی نیە چونکە ئەوێ نیگابانی هەیە. کە درزی دە دیوارەکە خست، خەڵکەکە وەژوور دەکەون ئیدی تازە ئەوانەی ئێوێ هیچیان بۆ ناکرێ چونکە ڕووحیەی سەربازەکان دەڕووخێ. ئەوە لە باری نیزامی‌یەوە بەجێ بوو.

جا چونکە ئێمە ئیحتیاجیمان بە ئەسلەحە هەبوو و ئەسلەحەش نەبوو، بڕیار درا بچینە ناوچەکان. هەرکەس لە هەر ناوچەیەک خەڵکی دەناسێ، بچێ داوایان لێ بکا بەچەکەوە وەگەڵ کەون. یەک چووە لای سەقز، یەک چووە بۆکان یەکی دیکە چووە بانێ. پیرانشارو نەغەدە هەروا. مەنتەقەی سەردەشتێ کرا بە دووبەش، بەشێکیان بەشی گەورکان ئەمن چووم. بەشی ئەو بەری کاک حەسەنی شێرمەڵی چوو. بەهەر حاڵ لەسەریەک پێم وایە ٢٠٠ تەفەنگێکمان هێنا. خەڵکەکە لەسەریەک بەچەکی خۆیانەوە هاتبوون. بەهیوای

ئەوە بووین بەپێی نەخشە وەختێک دەستووری دەدرێ تەقە بکەین، مەسەلەن ئەوانەی دەگەڵ من بوون و دەبوایە تەداروکاتیشیان دابین بکەم لای گومبەزانیان پێ نەسپاردبووین لەنێو قەبرەکان بووین .

بەڵام دوایە نەخشەیەکی تەقریبەن هەڵوەشاوەی وی، کە پیاو حەق بڵێ بە ئەفسەران و دەرەجەدارانی نێو پادگانی بوو تەرح کرا. ئەفسەرەکان ئەگەر لە باری دەرەجەوە بڵێین لەسەرەوە بۆ خوارێ ئەوانە بوون: سەرهەنگ ئیرەجی قادری بوو یان قەرەنی قادری. ئاخر ناوی خۆی قەرەنی‌یە، لە ئەرتەشدا ناوی خۆی کردبووە ئیرەج. شەهید سەروان ئەحمەدی جاویدفەر ناسراو بە هەژار بوو، کاک کەریمی پوورقوباد بوو، کاک حامیدی گەوهەری بوو کەپێم وابێ ئوستووار بوو، پیاو حەق بڵێ دەگەڵ ئەوەی ئەو دەرەجەدار بوو، بەڵام نەخشی لە کارەکانی نێو پادگاندا لەوانی دیکە پتر بوو. چونکی ئەو ڕاستەوخۆ دەگەڵ سەربازەکان سەروکاری هەبوو. خەڵکەکەی تەحریک کرد کە بۆخۆیان لەپادگانێ ڕاپەڕن و پادگانەکە بەدەستەوە بدەن. ڕووحییەی ئەرتەشیش دیارە دابەزیبوو، بەخۆشی‌یەوە ئیحتیاج بەوە نەبوو تەقە بکرێ. بەڵام ئیحتیمالەن لە ئاکامی ئەو قسانەدا بوو کە کاک حامید کردبوونی، کە ئەو سەربازانەی لەوێ بوون ئەغڵەبیان مەزهەبی بوون. ئەویش تەحریکی کردبوون کە ئەفسەرانی ئێرە دەیانەوێ کودیتا لە دژی ئیمام خومەینی بکەن. بۆ ئەوە وادڵیان بکا پادگان بەدەستەوە بدەن. لەناکاودا سەربازێک تەقەی کردبوو کە سەرتیپ پزشکپوور بریندار بوو. دەنا نە کەس بریندار بوو، نەکەس کوژرا. دیارە تەیارەکان هاتن دیواری سەرتیپ‌یان شکاندو ئێمە ئیحتیمالی ئەوەمان دەدا کە بۆمباران بکەن، بەڵام بۆمبارانیان نەکردو ڕۆیشتن. ئیدی ئێمەش کە بەحیساب دەسنگەردا بووین، لەپڕ هاتن گوتیان بابە لەجێی خۆتان هەستن پادگان تەسلیم بوو.

پادگان سیلاحی شتی تێدابوو بەڵام ئێمە وامان دانابوو تالان نەکرێ. دەمانویست بیهێنینەوە حیزب کەڵک لە چەکەکانی وەربگرێ‌و بیانداتە بەو کەسانە کەپێویستە سیلاحیان پێ بێ. کەچی سەعاتی سێی شەوێ بوو، ئێمە هێندێک کەسمان هەبوون لەوێ تەلەفۆنیان بۆ من کرد کە لە دەفتەری حیزب بووم. گوتیان خەڵک وەرگەڕاونە پادگانێ‌و تالانیان کردوە. هەرچی سیلاحی سووک بوو بردبوویان. مەسەلەن ئارپی‌جی لەوێ بوو کەس کاری پێی نەبوو، نەیاندەزانی چیە. ئەمنیش گوتم مادام وایە ئەوانەی خۆشمان سەرو تفەنگانیان بدەنێ. پێم وایە ٥٠، ٦٠ تفەنگێک لەو ڕێگایەوە وەدەست کەوت. دەنا ئەسڵەحەی پادگانێ سەرتاسەر خەڵک، ئەفراد بردیان. خۆ نەدەکرا خەڵکەکەی بکوژین، خەڵک ڕێ گەڕاو چی‌یان پێ خۆش بوو بردیان. دواتر زانیمان تێگەیشتبوون کە زاخەکانیان شکاندن ٥٠٠ تفەنگێکیان تێدا بوو. خەڵک بەوانەیان نەزانیبوو. ئەمجار تانکی تێدا مابوو، خەڵک تانکیان نەدەویست. یان تۆپیان نەدەویست. خۆمپارەو ئارپی‌جی‌و ئەو شتە قورسانە مابوون کە خەڵک نەیاندەویستن. خەڵکەکە زیاتر تینووی چەکی سووک بوون. ئیدی پێم وایە ٥٠٠ تفەنگێک وەدەست حیزب کەوت کە هاوڕێیەکی حیزبی مەسئوولییەتی پێدرابوو دەی‌بردنە دەرێ. دوایە ئەویان تۆمەتبار کرد

کە پادگانی هەموو دزی. ئەوە لەحاڵێکدا بوو کە ئەو دۆستە بەستە فیشەکێکیشی بە قازانجی خۆی مەڵ- نەگرت. بەڵام ڕای دەگوێزتن بۆحیزب. (ناوی نابەم چونکە ئێستا وازی هێناوەو لە نێوخۆی وڵاتە). ئەوجار پاسگاکانیش هەر چەک کران کە خەڵکێکی زۆر خۆیان پڕچەک کردو لەنێو ئەوانەدا دیارە خەڵکی حیزبیش وەبەریان کەوت. بەشی زۆری ئەو خەڵکەش دوایە بوونە هێزی بەرگری و بەجۆرێک ڕەگەڵ کەوتن. دواتر لە پادگانی سەردەشتیش هێندێک چەک وەدەست کەوت. لە پادگانی ئەوسوود هەروەها هێندێ چەک دەست کەوت.

بەکورتی پێشبینیی ئەوە کە سەرئەنجام ناچار دەبین بەچەک بەرگری لەخۆمان بکەین قەت لە مێشکی کورد نەشۆراوەتەوە. چونکی هەمیشە ئیحتیمالی هێرش بۆ سەر کورد لە حاڵێکدا داوای مافی خۆی بکا، زۆرە. کەوایە مەجبوور بووین بە شێوەی چەکدارانە دیفاع لە خۆمان بکەین. بۆیە لەوانە لە هەموویان کەڵک وەرگیراو دواتریش کە ئیدی ڕێگای جۆراوجۆر بۆ وەدەستهێنانی چەک و موهیمات دەدۆزرایەوە. ئەوەش هەم بۆ ئێمەو هەم بۆ بەشەکانی دیکەی کوردستانیش بۆتە ئەزموونێک کە تەقریبەن یەکێک لە سەرچاوەکانی تەئمینی چەک و تەقەمەنیی تێکۆشەری کورد، هەر چەکدارانی دوژمن بوون. خۆ ئەو وەختی مندالْ نەبووی و پێم وایە لەبیرتە چەندە لە پایەگار ستوونەکان تەقریبەن لە زۆربەی هەرە زۆری عەمەلیاتەکاندا چەک وەدەست دەکەوت. زۆرجار وا دەبوو ئەوەندە موهیمات وەدەست دەکەوت کە ئیمکانی ڕاگوێزتنی نەبوو. چونکە یان ماشێن دەست نەدەکەوت، یان ڕێگای ماشێنی نەبووە کە پێی ڕاگوێزن. زۆرجار هەبووە کە پێشمەرگەکان دەیان و سەدان هەزار فیشەکیان تەقاندووەتەوە چونکی بۆیان ڕانەگوێزراون.

**هیوا کاردۆ:** مامۆستا لەبیرتە پادگانی مەهابادیان کەی گیرا؟ زۆر دوای سەرکەوتنی شۆڕش بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە ٢٩ی ڕێبەندان بوو. یانی ٧ ڕۆژ دوای سەرکەوتن. ئاخر ئەو ڕۆژەی ٢٢ی بەهمەن کە ئەرتەش ئیعلانی بێ‌تەرەفیی کردو ئیدی مەعلووم بوو دەوڵەت دەڕووخێ، خەڵکی مەهاباد شارەبانی و ژاندارمێری و ئەوەیان هەموو چەک کرد. لە دێهات و لەشارەکانی دیکەش ئەوەیان کرد. لەو کاتەدا دوکتور قاسملوو لە تارانەوە هاتبۆوە مەهاباد. بەیانییەکەی لە ماڵی دۆستێک کە بەداخەوە لەبەر باری ئەمنییەتی ناتوانم ناوی بێنم، ئەمن لە لای دوکتور قاسملوو بووم. ئەو گوتی تازە ڕژێم ڕووخا، ڕۆیی. گوتم بۆ؟ گوتی چونکە ئەرتەش ئیعلانی بێ‌تەرەفیی کرد، کێ ئەوجار پشتیوانی لەو ڕژێمە دەکا. ئیدی کەوتە تێوەڕۆیەو ڕژێم ڕووخا. ئەوڕۆژە خەڵک شارەبانی و ژاندارمێری و ئەوانەیان هەموو چەک کرد. لەدێهات و شارەکانی دیکەش ئەوەیان کرد. شەوێ ئەمن چوومە ماڵی کاک غەنی بلووریان. لەوێ بووم کە لە دەرگایان دا. ئەویش فەقەت دوو ژووری هەبوون. ئێمە لە ژووری میوانان دانیشتبووین بەڵام بۆ ئەوەی ئەوانەی هاتن ئەم-

بینن. چوومە دیوەکەی دیکە بۆلای خێزانی. چونکی خێزانی‌و یەکێک لە کچەکانی کە مێردی نەکردبوو لەوێ بوون. ئەگەر هاتن جەمعێکی زۆر بوون، ٥،٦ کەس بوون. چوون لەو دیوی دانیشتن‌و ماوەیەکی پێ‌چوو، کاک غەنی هاتەوە دیوی ئێوەڵێ‌و گوتی ئەوانە [کە سەر بە ڕێکخراوە سیاسی‌یەکانی دیکە بوون] هاتوون دەڵێن حەملە بۆ پادگانی دەکەین. گوتی ئەتۆ نەزەرت چیە؟ ئەمنیش گوتم پێیان بڵێ ئەوکارە نەکەن. چونکی پادگان شارەبانی نیە، پاسگا نیە، ژاندارمێری نیە. پادگان ئەگەر چەند هەزاریش نا، بەڵام لانی کەم چەند سەت کەسی تێدایە. سەربازو دەرجەدارو ئەفسەری لێ‌یە. پاشان هەموو جۆرە سیلاحێکی لێ‌یە. ئەوە قابیلی گرتن نیە. لێ‌گەڕێن باخەڵک بەکوشت نەچێ. ئەویش ئەوە بوو کەچوو و هاتەوە گوتی قەناعەتیان کردو ڕۆیشتن. کەچی بەخیلافی ئەوەی بەڕواڵەت ئەو قەناعەتیان کردبوو، وا دیار بوو گوتبوویان ئەگەر حیزبی دێمۆکرات هەماهەنگی ناکا با خەبەرەکە بڵاو نەبێتەوەو نەخشەکە ئاشکرا نەبێ. وا بوو بەیانی‌یەکەی حەملەیان کردە سەر پادگان کە بەداخەوە حەملەیەکی زۆر ناموەفەقی بوو. لەبیرمە وەک باسیان کرد، ٢٩ شەهید و ٣٦ بریندار هاتبوونەوە. ئەوە ڕۆژی ٢٣ی ڕێبەندان بوو. ڕۆژێک دوای ڕووخانی شا. پادگان ئەگیراو ئیدی ئەوجار وەخۆ هاتەوەو دەستی کرد بە ئاژاوەو هەتا سەرسەرێ بەرزایی‌یەکانی پشتەوەی هەموو سەنگەربەندی کردو قایمی کرد. بەو حاڵەش ئێمە پێمان وا بوو پادگان نابێ وەکوو ڕەقیبێک بەسەر خەڵکەوە بێ. یانی چاوەدێرێک بێ بەسەر ئەوخەڵکەوە. دەبێ کارێک بکەین پادگان بگیرێ. لە ڕێگای جۆراوجۆرەوە هەوڵدرا کە پادگان بگیرێ، یەکێک لە ڕێگاکانیش ئەوە بوو کە بەحەملەی چەکدارانە بگیرێ کە بەخۆشی‌یەوە وەکی دیکە تەواو بوو.

شەوی پێش ئەوەی پادگان بگیرێ دوکتور قاسملوو گوتی با پرسێک بە مامۆستا شێخ عیززەددین بکەین. چونکە ئەو سەرۆکی شووڕای شار بوو، مەوقعیەتێکی هەبوو لە شاردا. ئەمن چووم بۆ لای. چووم گوتم ئەگەر بمانەوێ پادگانی بگرین ئەتۆ نەزەرت چیە؟ بەڕاستی زۆر تێک ڕابوو. گوتی جا چۆن شتی وا دەبێ. پادگان چۆن دەگیرێ؟ ئەمنیش گوتم مامۆستا پادگان دەگیرێ، ئەوە حیزبی دێمۆکراتە. ئەوە وەکی جاری دیکە نیە. جا ئەزقەزا شەوی دوای ئەو حەملە ناکامەی پێشوو لە ماڵی سەید حەسەنی هاشمی کۆ ببوونەوە کە مامۆستاش لەوێ بوو، ئەمنیش لەوێ بووم. ئەمن جارێ بەڕەسمی زۆر ئاشکرا نەبیوم بەڵام زۆر کەس دەی‌ناسیم. باسی ئەو شتەی کراو دانیان لە حیزب دا. گوتم بابە گلەیی چی لە حیزب دەکەن. حیزبی دێمۆکرات تێدا نەبووە. بۆیەش تێدا نەبووە چونکی دەی‌زانی شتی وا ناکرێ. جا لەوێ بە مامۆستام گوت موحیم ئەوەیە ئەتۆ نەزەرت چیە ئەگەر ئێمە بی گرین. گوتی وەڵڵا ئەگەر بتوانن زۆرم پێ‌خۆشە. ئەویش نۆکەی دا. بەڵام ئیدی ئەپرس بە هێزەکانی دیکە کراو نە ئەگەڵ بوون. تەنیا حیزبی دێمۆکرات بوو. ئەوە

داستانی خۆچەکدارکردنو گرتنی پادگانی بوو کە بۆم باس کردی. کە دیارە قۆناغی جۆراوجۆری بەسەردا هات.

**هەیاس کاردۆ:** دیارە ئەوە نەخشی خۆت باس کرد کە لە گرتنی پادگاندا بەشدار بووی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن نەخشێکی ئاوام نەبووە عەرزم کردی. نەخشی من هەر ئەوەندە بوو، نەخشێکی وام نەبوو. ئەمن قەت فەرماندەی نیزامی نەبووم. قەت لە سەنگەردا گوللەیەکم بە دوژمنەوە نەناوە. قەتیش گوللەیەک ڕاست بۆ من نەهاتوە. دەنا بۆمباران کراوم، تۆپباران کراوم، ئەوجێیەی لێی بووم مووشەکباران کراوەو مووشەکم لەپەنای وەعەرزێ کەوتوە.

**هەیاس کاردۆ:** قەی ناکا فەرماندە نەبووی بەڵام حیزب پێی ئەسپاردووی لەو بەرنامەیەدا بەشدار بی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕاستە ئەمن بۆ گرتنی پادگانی ٥٢ تفەنگم هێنابوو. مەنتەقەی مە خەڵکەکەی زۆریان ئامادەیی تێدا هەبوو. بۆیە توانیم ٥٢ کەسان بەچەکەوە ساز کەمو بیانهێنم. ئەوانە ڕەنگە ئەزموونی شەڕیان نەبووبێ، بەڵام ئینسانی ئازا بوونو تەنانەت بەمانی خۆشیان هاتبوون.

**هەیاس کاردۆ:** هەروەک دەزانین دوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران حیزبی دێمۆکراتی کوردستان لە بوونی تەشکیلاتێکی بەرتەسک‌و زۆر نهێنی‌ڕا بەسەر دەریای خوازیارانی پەیوەستبوون بەوحیزبەدا کەوت. ئەوە ئەگەر لەلایەک مایەی خۆشحاڵی بوو، لەهەمان کاتدا بوو بە هۆی بێ‌سەروبەرەیی‌یەکی سەیر. پرسیار ئەوەیە بۆ وای لێ‌هاتو داخوا نەتاندەتوانی بە شێوەیەکی دروست ئەندامگیری بکەن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لێرەدا کە ئەو پرسیارەت هێنایە گۆڕێ شتێکم لەتەکاو وەبیر هاتەوە. قسەی دۆستێکمان کە باش وایە حەقەکەی نەفەوتێ. نالێم ئەوەی کردمان هەر ڕاست لەژێر تەئسیری قسەی ویدا بوو، ڕەنگە بوو فکری خۆشمانی تێدا بێ. بەڵام کە ئاوا دەستی پێ کرد، خەڵک ڕژانە مەیدان. بەدەیانو سەدانو هەزاران کەس، خۆ پیاو ڕێی نەبوو بچێتە ژووری مەقەڕەکانی حیزب لەبەر خەڵکی زۆر کە داوایان دەکرد ببنە ئەندام. یان داوایان دەکرد چەکیان بدرێتێ چونکە پێیان وا بوو حیزب بۆخۆی عەمباری ئەسلەحەیە. یادی بەخێر "مەلا ئەحمەدی بانی‌خێلانی" یان "ئەبوو سەرباز" کە ئێستا لە سوئێدێیە، یەکێک لە ئەندامانی بەڕێوەبەری حیزبی شیوعی عێراق بوو. مەلا ئەحمەدی بانی‌خێلانی هەر مەلایەتیی خوێندوو پێشتر مەلا بووە. دەگەڵ مەلا موحەممەدی جوانڕۆیی لێت تێک نەچێ. مەلا موحەممەدی جوانڕۆیی نە مەلایەو نە موحەممەدە. "برایمی سۆفی"یە. مەلا ئەحمەد دوو مانگ، سێ مانگ پێشتر هات بۆ مەهاباد دەگەڵ ڕەفیقێکی دیکە کە

ئێستا ناوەکەیم لەبیر نیە. ئێمە پێشتر دەگەڵ مەلا ئەحمەدو ڕێبەرانی دیکەی حیزبی شیووعی دۆستایەتیمان هەبوو. ئەو داوای کرد جێگاو ڕێگایەکی بۆ پەیدا بکەم. ئەوان لەوێ بن بۆ هاتوچۆو بۆ کاروباری حیزبیی و ئەوانە. ماڵە دڵسۆزێکی مەهابادی کە ئاکرێ ئەو ناوانە ئاشکرا بکرێن موواقەقەتیان کرد هەر لەماڵی وان بن. هەرچی مەرلیشیان دا کە خەرجی خۆیان بکێشن، قەبووڵ نەکراو خۆڵاسە لەوێ بوون. ئەو هات گوتی قسەیەکت پێ‌دەڵێم بەقسەم بکە. گوتم فەرموو. گوتی ئەمڕۆ ڕۆژی "مەد"ی حیزبی دێموکراتە. "جزر و مد"ی دەریا هەیە، "مد" یانی بڵاو بوونەو "جزر" یانی ڕێک هاتن. گوتی پێڕەوەکەتان وەلا نێن. خەڵک تینووی سیاسەتە. ئێوە وەریان نەگرن، دەچنە نێو سازمانەکانی دیکە. ئێوە دەبێ ئێستێ جوابی ئیحساساتی خەڵکی بدەنەوە. خەڵکەکەی وەرگرن جا دوایە سەعی بکەن تەسفیەیان بکەن. ئەمن ئەو قسەیەم دەگەڵ پرادەرانی بەرپرس باس کرد. پێش هەموان دەگەڵ دوکتور قاسملووم باس کرد. گوتم ئەو قسەیە قسەیەکی حیسابیی‌یە. خەڵک هەموو دەیانەوێ بینە حیزبی. جا ئەگەر حیزب وەری نەگرێ دەچنە جێگای دیکە.

لەڕاستیدا ئەوە قەبووڵ کرا. بۆیە وەک حیزبی دێموکرات خەڵکێکی زۆرمان وەرگرت. ئیدی ئەو دەورانی تاقی کردنەوەو ئەوە هیچی نەبوو. هەرچی دەهات یەکسەر وەردەگیرا. بۆیە هەموو جۆرە کەسێکی تێ‌کەوت. بەتایبەتی هێندێک کەس هەن کە زیرەکترن، دەتوانن خۆ دەگەڵ هەموو شەرایتێکی ڕێک بخەن. مەسەلەن ئەمن ساڵی ٥٩ی چوومە ناوچەکانی جنووب وەک مەریوانو هەورامانو سنەو ئەوێ. وەکوو مەئمووریەت چووبووم لە جێیەکی ئەندامێکی لەمێژینەی حیزب کە پیاوێکی تێگەیشتوو بوو هێندێک مەشوەرەتم دەگەڵ کرد، گوتی وەزعی حیزب لێرە زۆر خراپە. حیزبی دێموکرات لێرە زۆر گەللایی بارگیریی کردوە. لە هەموو جێگایەک کوێخاسجیلی زەمانی شای بۆتە مەسئوولی حیزبی. خەڵک وەدوای ئەوانە ناکەون. ڕاستیشی دەکرد. یەک، دوو حاڵەتیان پێ گوتم کە ڕەفیقانی وێ قەبووڵیان کرد کە ئەوە کوێخاسجیلی زەمانی شای بووە، بەڵام زیرەک بووەو لەو وەختەدا کە حیزب ئاوا ئەندامگیریی کردوە خۆی ڕەپێش خستوە. لە پاشانیش بۆیە وا بەئاسانی تەسفیە نەکرا، چونکی ئێمە چەمەنێکی کەم بووین، کەمەکەش ناشارەزا بوو. دەبوو ڕێبەری‑یەکی وامان هەبێ هەم بەرپەرین بێ، هەم خەڵکی ژیریی دەگەڵ‌دا بێ. لەبەر ئەوە ئیسرار هەبوو کە چەندی بکرێ زووتر کۆنگرە بگیرێ. ئەوە بوو کە دواییەدا ساڵێکی پێوە نەخرا کۆنگرە گیرا. تەنانەت بۆ ئەوەی بەرنۆمەرییەکە هەر ئەوانە نەبن کە بە تانە پێیان دەگوتین دەرچووانی دانیشگای قەلادزێ خەڵکی دیکەش بتوانن بێنە نێو کۆمیتەی ناوەندی، ئەسڵێکی ئەساسنامەیمان گۆڕی. ئەسڵەکە دەی‌گوت کەسێک دەتوانێ خۆی بۆ ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندی کاندیدا بکا کە لانی کەم دوو ساڵ ئەندامی حیزب بووبێ. ئەوەمان هەڵ‌گرت بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە بتوانن وارید بن. کۆنگرە خەڵکێکی زۆری تێدابوو. چونکی ئەودەمی پێم وایێ دامانبابوو بە ١٠٠ کەس نوێنەرێکیان لە کۆنگرەدا هەبێ. بەوحاڵەش ٣٦٠ کەس بەشداری کۆنگرە بوون.

خەڵکێکی زۆرمان هەبوو. لە کۆنگرەی، لەسەر یەکێکی هەڵاڵا ساز بوو کە ئەو کەسە ساواکی بووە. لەپاشان دەرکەوت ڕاستە. ڕەنگە تی دیکەش بووبن، بەڵام لەسەر یەکێکی بوو بە هەرا. یانی دەرفەتی ئەوە نەبوو بەو شتانە ڕابگەین. چونکە لێکدانێکدا موشکیلات دروست دەبوو. مەسەلەن هەر پاش ماوەیەکی کەم شەڕی نەغەدەی بەسەردا هات. ٢٢ی ڕێبەندانی ٥٧ شا ڕووخا، ٣١ی خاکەلێوەی ٥٨ شەڕی نەغەدەی دروست بوو کە ماوەیەکی زۆر هەموو ئینرژیی حیزبی بەخۆیەوە خەریک کرد. دیارە پێشتریش شەڕی نەورۆزی سنەی بەسەردا هات. ئەوە بوو کە حیزب فریای ئەوە نەکەوت کە ئەو تەسفییە بکرێ کە کۆنگرە گیرا.

ئاخر دوکتۆر قاسملوو زۆرجار شتی خۆشی دەگێڕاوە. لەسەر ئەوەی داخوا ئەو کارە چۆن دەبێ و چۆن نابێ، یان بۆ وا کراوە شتێکی دەگێڕایەوە. دەڵێ کابرایەک چووبووە دزیی بێستانێ. ساحێببێستان بەسەردا هات. کابراش بۆ ئەوەی وا نیشان بدا کە بۆ دزییە نەچووە، دانیشت. ساحیب بێستان گوتی ئەوە چ دەکەی لێرە؟ کابرا گوتی گووی دەکەم. ئەگەر ناوا تەماشای کرد گووسەگێکی لێ بوو. گوتی ئەوە گووی سەگە کوا ئی تۆیە؟ کابرا گوتی بۆ ئەتۆ دیڵێ وەک بنیادەمان گووی بکەم؟ جا ئی مەش وای لێ هاتبوو. وەک بنیادەمان نەمانەتوانی کارەکانمان بکەین. ئەوە بوو کە کۆنگرە گیراو هەر بەپێی لایردنی ئەو ئەسڵەش چەند کەسی تازەمان بوونە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی کە تازە ببوونە ئەندام. یەکێک لەوانە مەسەلەن کاک مستەفای هیجری یە. کاک مستەفا دەڵێ ئەندام نەبووم لە کۆنگرەدا، دوکتۆر قاسملوو کردمی بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. کە ئەوە ئەومینێکی گەورەیە بە دوکتۆر قاسملوو. بەڵام جارێکی باسم کرد گوتم ئەوانەی بەپێی ئەو بڕیارەی حیزب بوونە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، یەکێکیان خێری نەدایەوە کاک مستەفا نەبێ.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا هەروەک بۆخۆشت پێشتر باسی دەرچوونی دانیشگای قەڵادزێت کرد، بەڕاستی ئەوە زۆر دەگوترا ئەمن لەبیرمە. ئایا ئەوە ڕاست بوو کە ڕێبەرایەتیی نیشتەجێ لە عێراق توانای خۆگونجاندن دەگەڵ وەزعی مەوجوودی نەبوو؟ گلەیی لە حیزب ئەوە بوو کە هیچ بەرنامەیەکی ڕوونی بۆ خۆڕێکخستن نەبوو و تەنیا لەسەر ڕووداوی ڕۆژ پلانی دادەڕشت. دوای تێپەڕینی دەیان ساڵ بەسەر ئەو قۆناغەدا تۆ چ وەڵامێکت بۆ ئەوە هەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن دەبێشدا ئیشارەم بەوە کرد کە ئێمە جەماعەتێکی کەم بووین و کەمەکەش لە وەزعی وڵات ناشارەزا بوون. هەمووشمان، پێم وابێ تازەترینیان لە ئەندامانی کۆمیتە ناوەندیی ئەو وەختی، ئەمن و ڕەحمەتی هێمن بووین کە ئەمن یازدە ساڵ و هێمنیش دە ساڵ و نیو دەبوو لە دەرەوە بووین. ئەوی دیکە پتر بوون. پازدە ساڵ و تەنانەت بیست ساڵیشیان تێدا بوو. کەوابوو ئەوە حەقیقەتێکی تێدا هەیە. بەرنامەو شتیش

کەموکوڕیی تێدا هەبوو. مەجالی ئەوە نەبوو خەڵکی پەروەدە بکەین. دەرفەتی ئەوە نەبوو ڕێکخستنێکی باش بکەین. هەمووی ئەوانە ڕاستن.

بەڵام ئەو ئیدیعایە تا ڕادەیەکی یەکجار زۆریش ناواقیعی بوو، چونکی ئەوانەی دە ڕۆژە سەختەکاندا دەگەڵ حیزبەکە مانەوەو حیزبەکەیان بەڕێوە برد، یانی وەکوو لۆکۆمۆتیوی قەتارەکە عەمەلیان کرد، هەر ئەوانە بوون کە لە دەرەوەڕا هاتبوونەوە. نەک بڵێم تەواوی خەڵکەکە چونکە قارەمانی زۆر گەورەمان هەبوون، کادری زۆر باشمان هەبوون، بەڵام لە ڕێبەری‌دا خۆ هەر ئەوانە بوون کە ئیدارەیان کرد. ئیدی کوا ئەو قسەیە ڕاست بوو؟ ئەمن زۆرجارم قسەیەک کردوە، پێم‌خۆشە لێرە هەر سەبتی بکەم، لە زۆربەی کۆنگرەکاندا عادەتمان بوو کە ئەوانەی خۆیان کاندیدا دەکرد، دەچوون خۆیان بناسێنن. لە کۆنگرەی ٤ دا، ئەوانەی لە دەرەوە بەرووین هەرکامەمان کە دەچوو باسی خۆی دەکرد چیی کردوەو کەنگێ بۆتە ئەندامی حیزبەو چ شانازی‌یەکی هەیە، ئەویشی باس دەکرد کە ئەوەندە ساڵە لە عێراق بووە. ئەمن کە نۆرەم هات چووم خۆم بناسێنم دوو، سێ جوملەم گوت: گوتم لەباری کۆمەڵایەتی‌یەوە کوڕە جوتیارم. لەباری خوێندەواری‌یەوە کۆلکە مەلام. دیارە کۆلکە مەلا نەبووم هەم مەلای تەواو بووم هەم مەلای چاکیش بووم. ۱۱ ساڵیش لە عێراق بووم. بەڵام ئەگەر بۆم بشۆرێتەوە بە ۱۱ ساڵ عومر، دەی‌شۆمەوە. هیچ شانازیی پێوە ناکەم. ئێستاش قەت پێم خۆش نیە کە لە عێراق بووم هەم. بەڵام ئەگەر جارێکی دیکە بچینەوە کە پێویستە دەچینەوە، نەک بڵێم یەکێ خەڵکی‌دا دێم بەڵام ئەو قسەیە لە هیچ کەس قبووڵ ناکەم کە پێمان بڵێن دەرچووانی دانیشگای قەڵادزێ. چونکی سابیت بوو، بوون لە دانیشگای قەڵادزێ وەک بە تەعنە ناویان دەبرد، شانازی‌یەکی گەورەیە، ئەو خەڵکەی دەخارێنن، حازرن کوێرەوەری‌یەکان تەحەممول بکەنو لە خۆیانی بگرن، ئەوانی دیکە لە خۆیانی ناگرن. ئێستا کۆمیتەی ناوەندیی ئێمە بە هەموویەوە دەوری ٤٠ کەس دەبێ. ئەمن دەزانم ئێستا لە نێوخۆی وڵات، لە نێوخۆی کوردستانو لە بەشەکانی دیکەی ئێران دە ٤٠ کەسی وامان هەن کە لەباری سیاسی‌و خوێندەواری‌و ئەوەوە لە سەرووی ئەو چل کەسەوەن. بەڵام ئەدی کوانێ؟ ئامادە نین بێن ئەو مەحرومییەتە، ئەو دژواری‌یە، ئەو مەترسی‌یانە لە خۆیان بگرن. کەوابوو بوون لێرە نەک عار نیە، بەڵکوو شانازی‌یەکی گەورەیە، چونکی ئەوەی ئێمە چاشتوومانە بۆخۆمان ئامانەوێ بیڵێین بەڵام بەکردەوە دەرکەوتوە هەموو کەس ئامادە نیە تەحەممولی بکا.

**عەباس کاردۆ:** پرسیارێکی دیکە مامۆستا. گۆیا دوکتور قاسملوو گوتوویە جەنابت مەلای سێزدە عیلمی‌شتی را هەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەزقەزا جارێکی مەلایەکیش پێی گوتم. بەهاری ساڵی ١٣٦٠ بوو لە "خەراوێ" بنکەیەکمان هەبوو، لەوێ کلاسێکی سیاسیمان دانابوو. ئەمن لەوێ بووم. هەم بەرپرسی دەورەکە بووم هەم زۆری دەرسەکانیشم دەگوتنەوە. بۆ هێندێک دەرسان خەڵکی دیکە دەهاتن. یادی بەخێر ئەمن و کاک قادری عەبدی تەقریبەن بە موقیمی لەوێ بووین. هەم بەرپرسایەتی‌یەکەمان لە ئەستۆ بوو هەم دەرسمان دەگوتەوە. ڕۆژێک نیوارێ، ڕووحی شاد بێ کاک سەید ڕەسووڵی بابی گەورە پەیدا بوو. زۆرمان پێ‌خۆش بوو. هەرێمان وا بوو بۆ دیتنی هاتوە. پاش نان‌وچاخواردنێ گوتی ئەوە لە دوای تۆ هاتووم. هەموو مەلاو فەقێی پیرانشارێم داوەت کردوون بۆ کۆبوونەوەی، ئەتۆش دەبێ بێی قسەیان بۆ بکەی. گوتم وەڵڵا نایەم. گوتی وەڵڵا دێی. چۆن نایەی، ئەمن بە هیوای تۆم داوەت کردوون. دەنا دەگەڵ ئەو هەموو مەلایەی چ بڵێم. بەهەر حاڵ ئیستیدلالەکەی قانیعی کردم و دڵیشم نەدەهات دڵی بشکێنم. هەستام دەگەڵی چووم. بۆ سبەینێ‌ڕا چووینە "میشەدێ"ی کە مەلای بۆ ئەوێ بانگ کردبوون. ئەگەر وا بە بیرم بێ شیتی وڵات هەر سێی دەچوو لەبەر میزەبەسەران. لە مزگەوتێ کۆ بووینەوەو دەست کرا بەقسان و هێندێک گلەیی و گازندەیان هەبوون. لەپاشان کە قسەکانم هەموو گوێ لێ‌بوون، هەستام جوابم دانەوە. کە جوابم دانەوە هەر لە هەوەڵەوە گوتم ئەمن لە حوزووری ئێوەدا حەقم نیە باسی قورئان و حەدیسی نەوانە بکەم. بەڵام بە هەرحاڵ هەم مەجلیسەکە هی ئەوەیە و هەم ئەمنیش وەختێکی لە ڕیزی ئێوەدا بووم. کەوابوو ئیجازەم بدەن ئەگەر جارو بار ئایەتێک، حەدیسێکم وەبیر هاتەوە بیڵێم. لەوێ کە قسەم کرد وا دیار بوو خەڵکەکە ئیستیدلالەکانیان قەبووڵ کردبوو. لەخوارەوە مەلایەک قسەیەکی ناحەزی کردبوو، گوتبووی ئێمە چۆن بەوەی دەوێرین ئەوە مەلا شەیتانە مەلا شەیتان. هەرچەند قسەکانیشم هەمووی بەئایەت و حەدیس دەکردن نەک بڵێی شتێکی دیکە بڵێم. بەڵام دوایە کە چووینە دەرێ، زۆربەی زۆری مەلایەکان هاتن دەوریان داو موحیببەتێ ئەوانیان نواند. جا یەکیان گوتی کاکە ئێمە بە تۆ ناوێرین. ئەتۆ ئەوەی هەم دەزانی و بێ خۆشت زیادی. هەروەک گوتم ئەمن کۆلکەمەلا نەبووم. لە مەلایەتی‌دا شارەزا بووم.

**هەیاس کاریزی:** دوکتور قاسملوو لەو قۆناغەدا وەک کەسایەتی‌یەکی خۆشەویست و خاوەن‌نفووز خۆی دەرخست. ئایا هەلومەرج ناوبراوی ئاوا گەورە کردوە یان تواناکانی خۆی وایان لێ کرد؟ چۆنە لەو هەموو کوردە تەنیا کەسێکی ئاوا هەڵکەوت بەو دەرەجەیە بگا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە دوکتور قاسملوو زەمینەی خۆێنگەیاندنی دەگەڵ لەدایک بووە. کوڕە ئاغایەکی موتەدەیر بووە. توانیویەتی لە یەکەم ڕۆژەکانەوە بچێتە مەدرەسە. لە ناوەندی ئوستان واتە ورمێ، لەوێ خوێندوە. پاشان چۆتە تاران و دوایە چۆتە دەرەوە. لە زانکۆکان دەرسی خوێندوە. دەگەڵ کۆڕوکۆمەڵی

ئێرانی‌و کوردو ئورووپایی هەستاو دانیشتنی هەبووە شتیان لێ فێر بووە. لەو بارەیەوە دوکتۆر قاسملوو یەکجار جامیع بوو. ئەمن زۆرجار باسی ئەوەی دەکەم کە جەززابییەتی دوکتۆر قاسملووی لەخۆڕا نەبوو. ئەوەندە دایرەی زانیاری‌یەکانی بەربڵاو بوو کە دەی‌توانی دەگەڵ هەموو کەس وا قسە بکا کە کابرای ڕاکێشێ، مەسەلەن شۆخیی زۆر دەکردن. تازە خوشکە خەدیجە مەعزووور لە ڕێوڕەسمێکدا شتێکی گێڕایەوە کە گۆیا پێی گوتوە پیاوێک دلۆوات دەکا. پیاوێکی جوانچاک نیە، چاوێکیشی خێلە. یانی بۆخۆیەتی. دیارە جوان-چاک نەبوو، بەڵام ئاوا بوو. ئەگەر دەگەڵ کابرایەکی مێژوونووس دانیشتبایە دەی‌زانی باسی چیی دەگەڵ بکا. دەگەڵ شاعیرێک دانیشتبایە، لە شێعری دەزانی. دەگەڵ موزیسیەنێک دانیشتبایە، لە مووزیکی دەزانی. دەگەڵ ئورووپایی‌یەک دانیشتبایە، لە تاریخو فەرهەنگی ئورووپایە ئاگادار بوو. کەوابوو زەمینەی خۆیێگیانەو خۆپەرچەک کردن بەزانستو مەعریفەتی بۆ خولقابوو. بەڵام زەمینەی ئاسران وەکوو ڕێبەرێکی سیاسیی بۆ نەخولقابوو. لە دەرێیە، بێگانەیە. دوکتۆر قاسملووی شاخەکانی کوردستان ڕەنگە کەمتریشی زانیبێ لە دوکتۆر قاسملووی دانیشگاکانی ئورووپا، چونکی لەوێ ئیمکانی وەرگرتنی پتر بوو. بەڵام لەوێ کێ بیناسێ. دوکتۆر قاسملوو لە کوردستان ڕەنگە کەسی دیکەی وای بە دەورەوە نەبووبێ. بەڵام لە فەڕانسە بەسەدانو هەزاران دوکتۆر هەبوون کە لە شارەزاییشدا خەڵکی وەک وی‌و لەسەرتریش هەبوون.

بەڵام کە زەمینەکە ڕەخساو هاتەوە نێو خەڵکی، توانی خۆی دەرخا. ئەوەڵەن لە باری سیاسی‌و زانستی سیاسی‌یەوە بەداخەوە دەبێ بڵێم - نەک لەبەر ئەوەی ڕەفیق بووە یان شەهیدە - هیچ خۆشحاڵیش نیم لەوەی کە وایە، بەڵام هەتا ئێستاش نەک هەر لە حیزبی دێموکراتدا بەڵکوو لە حیزبەکانی دیکەشدا قاسملوویەکی دیکە هەڵنەکەوتوە. پاشانیش ئەو ئامادە بوو هەموو شتێکی وەلا بنێ‌و بێ خزمەتی میللەتەکەی بکا. ئەو کەسە کە دەی‌توانی لە کۆشکێکدا ژیانی خۆی بەسەر بەرێ، هاتبوو بەتایبەت ساڵی نەورۆزی لە "ئاشی پشتشکاوێ" لە نێوان دوو شاخاندا چوار چڵەداری ڕایەڵ کردبوونو گڵی وەسەر کردبوون کە ئەوە ماڵی قاسملوویە.

دوکتۆر قاسملوو هێندێک کەموکووڕیشی هەبوون. مەسەلەن لە باری کۆمەڵایەتی‌یەوە، بۆ دروان دەگەڵ خەڵکی ڕەشوڕووتی عادی‌و دێهاتی زۆر بێ‌چەک بوو. ئەمن چەندجارم پێ‌دەگوت. دەمگوت مام جەلالی تاڵەبانی دەبێ زۆر شت لە تۆ فێر بێ. بەڵام مەوزووعێک هەیە کە ئەتۆ دەبێ لەوی فێر بی. چاوی لێ بکە ئەو چۆن دەتوانێ دەگەڵ هەموو خەڵکی بلوێ. دەستبەجێ مەجلیسی خەڵکی گەرم دەکا. بەڵام خەڵک دەهات مەسەلەن بۆ پیرۆزبایی جێژنی قوربان یان ڕەمەزان دەی‌گوت بەخێر بێن‌و پیرۆزبێ‌و ئیدی ئەوڵ قسەی نەبوو دەگەڵیان بکا. لەحاڵێکدا ئیدی لە باری زانستی سیاسی‌و ئامادەیی بۆ فیداکاری، دوکتۆر قاسملوو لەهیچی کەم نەبوو.

جارێکی لە سنە بووین، نەک لە نێو شاری. هەر ئەو ساڵی ٥٩ی کە بۆ مەئموورییەت چووبوومە جنووبی کوردستان. شەوێکی لە کۆمیتەی شارستان دانیشتبووین کە خەڵکێکی زۆریشی لێ بوو. یادی بەخێر دوکتۆر خەلیقی قسەی کرد، دەوری هەڵگرتو گوتی ئەمن پێم خۆش نیە قسان بکەم، دەنا ئەمن چیمو دوکتۆر قاسملوو چییە. ئەو دوکتۆرە ئەمنیش دوکتۆرم، ئەو مامۆستای زانستگەیە، ئەمنیش مامۆستای زانستگەم. زۆرم پێناخۆش بوو بەڵام هیچ وەڕووم نەهێنا. دوای کۆبوونەوەکە بانگم کردو پێم گوت ئەوجارێ ئەو قسەیە کردوە جارێکی دیکە مەیکەوە، چونکی زۆری زەرەر لێدەکەی. دوکتۆر قاسملوو بۆیە دوکتۆر قاسملوو نیە چونکە دوکتۆرای هەیەو چونکە ئوستادی دانیشگایە. دوکتۆر قاسملوو ئێ عومرێک ڕەنجو کارو شەڕو شەونخوونییە، بەوانە بۆتە ئەو پیاوە. ئەتۆش دەتوانی ببی، بەڵام بەوەی نەبوویەی. بەکار دەتوانی ببی. بەداخەوە لەو ساڵەیەوە، ٥٩ هەتا ٨٩، سی ساڵ گوزەراوە بەڵام دوکتۆر خەلیقی هەر نەبۆتە دوکتۆر قاسملوو. بریا بیابە چ قسەیێ دەکا. پێم وایە دەجاریشم ئەو قسەیە کردوە، لە کۆبوونەوەی ڕەسمیدا گوتوومە کە بوون بە دوکتۆر قاسملوو نە مەحاڵە نە ئاوانە. موومکینیشەو ئەرکیشە. لاوەکان دەبێ بخوێنن، تێبکۆشن با هەر دوکتۆر قاسملوویەکمان نەبێ، زۆرمان هەبن، ئەوە پێم وایێ کارێکی باشە.

**هەیاس کاروێ:** مامە غەنی دوای ٢٥ ساڵ زیندانی تازە ئازاد کرابوو. تۆ پێتوایە ئەگەر ئاوڕاو ئەو ڕێگایەی نەگرتبا بەر کە گرتی، وەک کەسێکی خۆشەویستترو جێکەوتووتر لە دوکتۆر قاسملوو جێی نەدەگرت؟ قەزاوەتی نیهایی تۆ لەسەر ئاوڕاوو کارنامەی خەباتەکەی چییە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەسەر مامە غەنی پێم وایە ئەت چۆنی دەبینی دەبێ وای بڵێی. درۆ نەکەی و تەعارووفیش نەکەی. مامە غەنی قەت لە ئەنی‌دا نەبوو ببێتە دوکتۆر قاسملوو. زۆرم پێناخۆشە ئەوەی وەبیر دێنمەوە، بەڵام مامە غەنی کە لە زیندان هاتەوە، بەدەیان هەزار کەس بەپیلیەوە چوون، لێکڕا شوعاریان دەدا: مامە غەنی هاتەوە، یاخودا بەخێرتەوە. بەڵام زۆری مابوو شا بڕووخێ، ئەمن بە نهێنی لە مەهاباد دەژیام، بۆخۆم گوێم لێبوو کە لە کووچەو کۆڵانانەدا منداڵ هاواریان دەکرد: مامە غەنی هاتەوە، یاخودا بگیرێتەوە. هەر زۆر زوو خۆی نیشان دا. چونکی مامە غەنی ئەو مایەیەی تێدا نەبوو. یەکێک لە خەسڵەتە گەورەکانی دوکتۆر قاسملوو پاش ئاگایی سیاسیی و زانستی، ئەوە بوو کە لەباری فکریی و سیاسییەوە ئینسانێکی سەربەخۆ بوو. لەحاڵێکدا مامە غەنی نە ئەو ئیستیقلالە فکرییەی هەبوو، نە ئەو ئیستیقلالە ڕێکخراوەیی و سیاسییەشی هەبوو. هەر چاوی لەوە بوو داخوا توودەییەکان دەڵێن چی. یان مەسەلەن دوو کەس لە تێکۆشەرانی قەدیم کە ناوەکەشیان پێکەوە دێ و پێکەوە حوکم دران، عەزیزی یووسفی و غەنیی بلووریان. کە چوونە زیندان مامە غەنی باسەوادتر بوو لە عەزیزی یووسفی. بەڵام عەزیزی یووسفی لە زیندان فێری زمانی

ئینگلیسی بوو. تەنانەت چەند کتێبی چووکەڵەشی لە ئینگلیسی‌ڕا کردنە فارسی. فارسیی چاکتر دەزانی لە کوردی بۆ نووسین. لەپاشان بوو بە ڕێنوێنێکی سیاسی. دیارە ئەویش فکری بەلای توودەیی‌یەکاندا هەبوو. - دەنێو حیزبەدا ئەوە داستانێکی دیکەیە. چونکە ململانێ‌یەکی زۆر هەبوو لە بەینی ئەمانەو ئەوانەدا کە زیاتر میللی گەرا بوون هەتا چەپی کۆمۆنیستی- بەڵام خۆی پێ‌ گەیاند. کەچی مامە غەنی چۆن چووبوو، لەڕاستی‌دا هەر ئاواش هاتبۆوە. یانی ئەو چەند ساڵــەی کە لە زینداندا بوو، خـۆی پێ‌نەگەیاندبوو. زیندانی ئەو وەختیش بۆخۆی مەدرەسەیەک بوو. ئەوکاتێ کە ئەوان لە زیندان بوون زۆر لە سەرانی حیزبی توودەش هەر لە زیندان بوون. بۆیە لە هەموو ڕشتەیەکـدا مامۆستا هەبوو کە لە کنی بخوێنێ. کەچی هیچ- یەک لەوانەی نەکردبوو.

لەپاش گەڕانەوەی هاوڕێیانی کۆمیتەی ناوەندی لەعێراقەوە بۆ کوردستانی ئێران کۆبوونەوەیەک گیرا بۆ کۆمیتەی ناوەندی و ٣ کەسیش کە دە کۆمیتەی ناوەندی‌دا نەبوون بەڵام لە کومیتەی زاگرۆس‌دا بوون بەشدار بوون. مامە غەنییش کرابوو بە موشاویری کۆمیتەی مەرکەزی. وا بزانم هەر ئەودەمێ بوو کە کۆمیتەی زاگرۆسیش پێشنیاری کرد کە مامە غەنی کە گیراوە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بووە، ئێستێ لەو هەلومەرجەدا هەردەمێ وای تەعامول دەگەڵ بکرێ. بۆیە وەکوو دەفتەری سیاسی ڕەفتارمان دەگەڵ دەکرد. ڕەسمییەتەکە فەرقی هەیە. ئەوکات کاک جەلیلیش کرا بە موشاویر، کاک عەزیزی مامڵێش هەرکرا. مامە غەنییش بەڕەسمی بوو بە موشاویر بەڵام وەک ئەندامی دەفتەری سیاسی ڕەفتاری دەگەڵ دەکرا. لە کۆبوونەوەکەدا کە دیارە بەمەشیان گوت دەتانکەینە موشاویر بەڵام قبووڵمان نەکرد، کاک حەمەدەمینی سیراجی گوتی ئەمن پێشنیار دەکەم مامە غەنی ببێتە سکرتێر. چونکی دۆستی شووڕەوی‌یو وڵاتانی سۆسیالیستی‌یەو ٢٥ ساڵ زیندانی چێشتوە. ئەوپەڵ کەس کە قسەی کرد ئەمن بووم، گوتم ڕاست بەو دەلیلەی کە ٢٥ ساڵ دە زینداندا بووە، مامە غەنی بۆ سکرتێر نابێ. ئەمن نەمدەگوت مامە غەنی. هەر دەمگوت کاک غەنی. جا لەسەر ئەوەی نووسیویشیەتی کە پێم نەگوتوە مامە غەنی، هەر وایزانە مامە غەنی نیفتیخارە. لەحاڵێک‌دا ئەمن کە پێم دەگوت کاک غەنی بێ حورمەتی نەبوو. ئێستاش بەزۆر کەس دەڵێم کاک کە ڕەنگە خەڵک پێیان بڵێن مام. هەروەک ئەو ڕۆژەی پێکەوە تووشی کاک کەریم حسەینی بووین ئەتۆ پێت گوت چۆنی مام کەریم، ئەمن گوتم کاک کەریم بۆ تۆ ئەوە دەبێ، بەڵام ئەمن ڕەنگە عومرم وەک ئی بێ یان داخوا ساڵێک لەوی کەمتر یا زیاتر بێ دروست نیە پێی بڵێم مام. ئەمنیش هەر بەو حیسابەی پێم دەگوت کاک غەنی. گوتم کەسێک ٢٥ ساڵ دە زینداندا بووبێ ئاگای لە دنیایە نیە.

هەر بۆ ئەوەی نیشانی بدەم چۆنە، کاک جەلیلی گادانی یادی بەخێر دەی گێڕایەوە دەی‌گوت کە کاک غەنی ئازاد بوو و لە تارانێ‌ڕا هاتبۆوە-پێنجوایە گوتی- لە "تاکستان"ێ لاماندا نانی بخۆین، گوتی ٦٠، ٧٠

کەس نەبووین، کە نانمان خوارد یەک دوو خوێندکار ویستیان پووڵەکەی بدەن ئێمەش نەمانهێشت. مامە غەنی گوتی بۆ لێیان ناگەڕێن بیدەن جەوانن‌و شاییان بەخۆیە با بیدەن. ئەمنیش گوتم بۆ پێت وایە دەبێتە چەند مامە غەنی؟ گوتی با بیێتە ٢٠٠ تمەن چیە. پێی وا بوو چلاوکەباب هەر بە پازدە قرانەکەی جارانە، لەحاڵێکدا پووڵی نانی ٦٠، ٧٠ کەسی کردوویەتە ٥، ٦ هەزار تمەن. با بەهیچ جۆر مامە غەنی ئەو کەسە نەبوو کە لە باری سیاسییەوە بتوانێ ئەوی بکا.

**هیاس کاریۆ:** جیا لە سیاسەت‌و دیپلۆماسی، باوەڕی ئەو کاتی خۆت لەسەر ڕێژیمی تازە بەدەسەلات گەیشتووی ئێران چی بوو؟ لەو بارەیەوە ڕێبەرایەتیی حیزب چۆنی فکر دەکردەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە پێش ئەوەی ڕێژیم بەدەسەڵات بگا حادیسەیەک ڕووی دا کە دیدگای مێنیش‌و لەمن زیاتر دوکتور قاسملوو و ڕێبەرانی حیزبیشی نیشان دەدا. ڕەنگە ئەتۆ ئەوەت لەبیر نەبێ چونکە بەئیستیلاح ئەوندەمام بوی، ئاغای شاپووری بەختیار کە هاتە سەرکار، دەواقیعدا ئاخر سەرۆک وەزیری شا بوو، کە دیارە شا بە نابەدڵی دای‌نا چونکە زۆری ناخۆش دەویست. بەختیار لە ئەووەڵین ئوتقی خۆیدا هێندێک قسەی کردن کە هێرشیان بۆسەر ئێمەش یانی بۆسەر کورد تێدا بوو. گوتی ئەمن سوێند دەخۆم بە هەموو توانای خۆم دەگەڵ جیاوازیخوازان‌و ئەوانە کە باسی "گەلانی ئێران" دەکەن شەڕ بکەم. کە پێش هەمووان دەگەڵ کوردی بوو، هەڵبەت دوایە لە ڕێگای هێندێک شەخسیاتی جەبهەی میللی‌و کوردەکانەوە قسەی دەگەڵ کرا. قەولی دابوو کە جارێکی دیکە شتی وا نەڵێ. بەڵام کە ئەو بوو بە سەرۆک‌وەزیر، لایەنگرانی خومەینی‌و ئاخوندەکان دەستیان پێ کرد: بەختیار بەختیار، نوکەری بێ ئیختیار. هەر ڕۆژی دوای ئەو ئوتقەی بوو، لە ژوورەکەی خۆم دانیشتبووم. هاوڕێیانی حیزبی هاتن ڕادەیەکی زۆر ئیعلامییەیان هێنا، کە تەماشا دەکەم کاک حەمەدەمینی سیراجی لە سەقز بە بۆنەی هاتنەسەرکاری بەختیارەوە دەری کردوو عەینی دروشمیشی تێدایە. گوتم هیچتان بڵاو کردۆتەوە؟ گوتیان بەڵێ لە دیوارمان داون. گوتم هەر ئێستا دەچن هەموویان لێ دەکەنەوە. ئەوەش با لێرە بێ. تەلەفۆنم بۆ کاک حەمەدەمین کردو گوتم ئەتۆ چۆن شتی ئاوات نووسیوە؟ دەبێ ئەوەی خڕ کەیەوە. بەختیار دەڵێ وەرن حیزبیان تەشکیل بدەن. وەرن با ئازادیی حیزبی هەبێ. ئێمە ئیحتیاجیمان بە حکوومەتێکی ئاوا هەیە. ئەوە بۆ ئەمڕۆی ئێران قازانجە. خوا هەڵناگرێ بە نابەدڵیش بووبێ قبووڵی کرد. دیارە ئەمن ئەندامی دەفتەری سیاسی نەبووم بەڵام وەکوو شتێک مەهاباد کرابوو بە مەرکەزی ئینتیشاراتیی هەمووومان. کەوتینە شوێن دوکتور قاسملوو تەلەفونی کردو عەینی ئەوسیەی پێ کردین کە لە ماڵی غەنیی بلووریان بووین. گوتی نابێ هیچ خراپەیەکی لە زیندی بەختیاری بکەن، چونکە خەبات دژی وی هاسانە بەڵام خەبات لە زیندی خومەینی زەحمەتە. بەختیار کە موبادیی

ئازادی و دیموکراسی‌یە، بۆ ئێمە هەلێکی باشە. ئێمە ئیحتیاجمان بە دەرفەتێک هەیە بیینەوە بەحیزبە دەبێ خۆمان سازمان بدەین، هەر ئەوەی کە ئەتۆ لە پرسیارەکانی پێشوودا هێنات گۆڕێ. یانی بەشێکی ڕێکخراوەکانی حیزبی دامەزرێنین و بەتوندیان بکەین.

هەر لە هەوەڵەوە دیدگای ئێمە ئاوا بوو، دواتریش ئێمە لە باری ڕژیمی خومەینی‌یەوە لە توهوهومدا نەبووین، وەکوو حیزبی دیموکرات، بەڵام پێمان وا بوو دەبێ مودارا بکرێ. هەتا ئەو جێگایەی مومکینە نابێ کار بکێشرێتە جێگایەکی وا کە خەڵک تووشی شەڕ و ماڵوێرانی بن. هەر ئەوەی کە ئێستا ئەوە ٣١ ساڵە فوڕەکەی دەشێلین. کەوابێ ئەم ڕژیمە قەت ڕژیمی دڵخوازی مە نەبووە. وەختێکی دوکتور قاسملوو لەبیمیکی پێ‌دەگوت بۆ ئەوە بوو کە نەی‌دەویست میللەتی کورد شەڕی تووش بێ و مەزرای بسووتێ و شاری بسووتێ و ماڵی وێران بێ. دەنا ئەگەر ئەمن مەلا بووم مەزهەبی و موسوڵمان، خۆ دوکتور قاسملوو نە مەلا بوو، نە مەزهەبی بوو.

**عەباس کاوەیی:** مامۆستا دێینە سەر کارێکی بەرنامەبۆدارێژراوی حیزب. هەر لەو سەروبەندە حیزب دەستی بەسەر بانکی میللیی ئێران لە مەهابادا گرت و پارەیەکی زۆری لێ دەرکێشا. تکایە بفەرموو کەی ئەو کارە کرا، ئەو پارەیە چەند بوو، چی لێ هات و داخوا بۆ حیزب بوو بە پاڵپشت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە بەساڵ سەروبەند بێ دەنا وەک زەمان بەینیان زۆرە. ڕژیمی شای ٥٧ی ڕووخا، بانکی مەهابادی ٥٩ی لێ‌درا. داستانەکە چ بوو؟. ئێمە بزووتنەوەیەکی عەزیممان بەملەوە بوو. ئیمکاناتی ماڵی کەم بوو. ئێمە دەفکری ماڵدا بووین و ڕەفیقێکی خۆشمان کارمەندی بانک بوو. یانی تەنزامی حیزب بوو. خەبەری‌دا کە بەرەبەری حقووقدانی‌یەو پووڵێکی زۆر ڕژاوەتە بانک. ئەمنیش کار دەکەم با حیزب بێ و پووڵەکەی بەرێ. دیارە ئەمن ئەو وەختی لە سەفەری جنووب بووم. بۆ ئەوەش وەختەکەی بزانین کەی بووە ڕەنگە ڕۆژەکەیم وەبیر نەیێتەوە بەڵام مانگەکەی هاسانە. ئەمن کە دەڕۆیشتم بۆ جنووب ڕۆژی ٢٥ی گەلاوێژ لە بۆکانێ جێژنم کرد و ڕۆیشتم. ڕۆژی ٣١ی خەرمانان بوو کە خەبەری شەهادەتی سەرگورد عەباسی هات. وا بزانم ئەمە دوای ئەو وەختیش بوو. کەوابێ کەوتبووە پاییزێ.

بەهەر حاڵ بەرنامەی بۆ ڕێک‌خرابوو. کاک سەید ڕەسوولی بابی گەورەی لێ کرابووە مەسئوول. چووبوون خەڵکەکەیان خڕ کردبۆوە کە نەچنە دەرێ و بانکیان شکاندبوو. پووڵەکەیان هێنابووە دەرێ و دەماشینی‌یان هاویشتبوو. پووڵەکە وا بڵاو بۆوە کە ٨٠ میلیۆن تمەنە. وا دیار بوو ئەوەندەشی لێ بووە. بەڵام پووڵ هەتا درشتتر بێ، هەڵگرتنی هاسانترە. ئەو وەختی پووڵی ئێرانی گەورەکەی ١٠٠٠ تمەنی بوو. دوایە ٥٠٠ تمەنی و ٢٠٠تمەنی و ١٠٠ تمەنی و ٥٠تمەنی و پێنج وابێ هەتا ٥ تمەنیشی هەبوو. بۆیە پووڵە وردەکەیان نەهێنابوو.

بەھەر حاڵ ئەوەی ھێنایان ڕەنگە بە ھەزارو دە ھەزاریش فەرقی ھەبێ، بەڵام ٦٩ میلیۆن تمەن بوو. پاتی ئەوەندە نەبوو کە باس دەکرا. مەعلوومە خێری دایەوە. ٥٠ میلیۆنی لێ سەرمایە گوزاری کرا کە ٣ میلیۆن دۆلاری کرد. ئەوە بوو بە بناغەی سەرمایەگوزاری‌یەکی باش کە دوایە زیاتری چووە سەری. بەڵێ کەڵکی زۆری لێ وەرگیرا.

**عەباس کاریزی:** ئەو پوولە پوولی خەڵک بوو ماموستا. ئێوە دوایە پەشیمان نەبوونەوە لەوەی ھێناتانە دەرێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە قسەی ڕێژیم بوو کە وای دەگوت. نەخێر ئەوە پوولی خەڵک نەبوو. تەنانەت با وای دانێین بانکەکە بانکێکی شەخسییش بووە. ئەو بانکە موتەعەھیدە پوولی خەڵکی بداتەوە. پاشان لە ھەموو جێگایەک بانک بیمەی ھەیەو بیمە دەی‌داتەوە. نەخێر ئەوەیان بۆ عەوام‌فریبی بڵاو کردەوە کە پوولی خەڵکی بووە. ھەر بەڕاستی پوولی کەس نەفەوتا، پوولی ھەمووان درایەوە. چونکە بەپێی قانوون دەبێ بانک بی‌داتەوە. خۆ خەڵک ناچێ پوولی خۆی لەبانکی دانێ‌و سبەینێ بانک بڵێ سووتا، یان دزرا ئەتۆ ھیچ. بانک بۆیە بەھرەی لێ‌وەردەگرێ کە بۆی پارێزێ‌و پێوەی زیاد بکا. ئەوە قسەی لابەلا بوو.

**عەباس کاریزی:** کۆنگرەی ٤ی حیزبی دیموکرات مەیدانێکی تازەی نیشاندانی تواناو سیاسەتەکانی حیزب‌و ڕێبەرایەتی‌یەکەی بوو. خوێندنەوەی ئێستات لەسەر ئەو کۆنگرەیە چییە؟ ئایا بەردی بناغەی دەرودەستەیی لەوێ دانرا؟ ئێوە پێش کۆنگرە لە شتێک بەناوی حەقی مامە غەنی ئاگادار بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە ئاسان نەبێ بڵێی بەردی بناغەی دەرودەستەیی لەوێ دانرا، چونکی دەرودەستەیی پێش ئەو وەختیش ھەبوو. بۆم گێڕاوەیەوە یەکەم جار حیزبی دیموکرات بوو کە سەرکردایەتی کاتیی دانا نەک پارتی دیموکرات. دەی زۆر پێش ئەو وەختیش بوو کە کۆمیتەی ساخ کەرەوە دامەزرا. پێش ئەو وەختی بوو کە کۆمیتەی ئینقیلابی دامەزرا. تەنانەت ساڵەکانی ٣٨ و ٣٩ و ٤٠ و ئەوانە لە زیندانێ ململانێ‌یەکی زۆر سەیر بوو لە بەینی چەپ‌و ڕاستی ئێو حیزبی دیموکراتی کوردستاندا. ئەوە تەنیا نەخۆشیی حیزبی دیموکراتیش نییە. لە ھەموو حیزبی دنیایەدا ھەیە. بەڵام لە وڵاتانی پێشکەوتوودا ئەو ناکۆکی‌یانە بەشێوەیەکی ساڵمتر دەچنە پێشێ یان چارەسەر دەکرێن. لەوڵاتانی دواکەوتوودا شتی ناخۆشی زۆر لێ دەکەوێتەوە. شتە ناخۆشەکەش نەک ھەر تەنیا ئی حیزبی دیموکرات نییە، بەڵکوو ئی حیزبە کوردی‌یەکانیش نیەو ئی حیزبە ئێرانی‌یەکانیش نیەو تەنانەت ئی حیزبە ناوچەیی‌یەکانیش نییە. مەسەلەن نازانم لە کۆنگرەی چەندی حیزبی سۆسیالیستی فەڕانسەدا بوو کە دوکتۆر فاسلور لەوێ بوو. دەی‌گوت ھێندەی نەمابوو ئەو حیزبە ببێتە سێ بەش، بەڵام دوایە دەستەیەک گرتیان با ھەیئەتێک دانێین ئەو ھەیئەتە لیستێکی ھاوبەش

بێژن کە لە هەموو گرووپەکانی تێدابێ و پێشنیاری بکەن بۆ کۆمیتەی ناوەندی. گوتی چوون ئەو لیستەیان هێنا، پێشنیاریان کرد و چەپڵەیەکیان بۆ لێدا و خەلاس بوو. یان کاک مستەفای شەڵماشی بۆی باس کردم کە لە هولەندێ ٣ حیزبی دێموکراتی هولەند هەن، لێکیش جوێ بوونەوە، دەیگوت هەرسێکیان نوێنەریان لە پارلمان هەیە و جاری وایە هاوکاریش دەکەن. یانی شتی ئاوا دەبێ.

ئەمن پێم وایە کۆنگرەی ٤ بە هەموو مانای کەلیمە سەرنەسلێکی تازە بوو. کۆنگرەی یەکەمی حیزبی دێموکراتی کوردستان ڕەنگە بێ ئەو وەختی هەر ناویان لێ نەنابێ کۆنگرە، نازانم، بەڵام ئەگەر ئەو ناوەشی لەسەر بووبێ، بە مانای ئەمڕۆ هەر کۆنگرە نەبووە. ئەم سەرۆک عەشیرە و ئەو ئاغاو ئەو شێخ و ئەو خاوەن-نفووزە کە وەختێ شانازییان پێوە ئەکەم ڕێزم بۆیان هەیە بەڵام خۆ حیزبی نەبوون. هەروا دانیشتوون و جەمعێک گوتوویانە حیزب دروست دەکەین. پێم وایە هەموویان ئەندامی ژێ کافیش نەبوون. بەشی زۆریان ئەندامی ژێ کاف بوون، بەڵام بەشێکیان ئەندامی ژێ کافیش نەبوون. لە پاشان دەڕوا لە ٢٤ەوە هەتا ٤٣، یانی ١٩ ساڵ دەڕوا هیچی تێدا نیە. کە کۆنگرەی ٢ دەگیرێ دیارە لە کۆنگرەی ٣دا بە ناقیسی نەقد کراوە دەنا عەیبو نەقسی زۆر زیاتری پێوە وا دیارە. ئەوجار دەچینە کۆنگرەی ٣ کە ٦ ساڵ تێ دەپەڕێ جا کۆنگرەیەکی دیکە دەگیرێ. ٥٢ بۆ ٥٨ کە تۆزێک ماوەکەی کەمتر بۆتەوە جا کۆنگرەی ٤ دەگیرێ. بەڵام کۆنگرەی ٣ چ بووە. دەقیقەن ٤٩ کەس بوون، لە وڵاتی عەرەبایەتی، ئەو کەسانە هێنابوون لە وڵاتەوە وەک نوێنەر، بەڵام لەواقیعدا نوێنەر نەبوون. هەر بانگمان کردبوون کاکە تۆ وەرە. ئەوە فەرقی هەیە دەگەڵ ئەوەی نوێنەر هەڵبژێری.

ئەوە یەکەمجار بوو حیزب کۆنگرەیەکی دەگرت بەپێی ئوسووڵ مەبەست کۆنگرەی چوارە. ئەو کۆنگرەیە کۆمیتە ناوەندییەکی لەپشتە، بەرنامە و ئەساسنامەی ئامادە کردوە، ڕاپۆرتی ئامادە کردوە. کەسی هەیە بۆ بڕیار و بۆ پەیام و بۆ هەموو شتێک. لەپاشان ئەگەر کۆمیتە ناوەندییەکەی دەیتە ١٥، ٢٠ کەس، ٣٠٠ کەس وەک نوێنەر هەڵبژێردراون. لە هەمووی گرنگتر لەنێو جەرگەی کوردستان و لەنێو شار دەگیرێ، لەنێو خەڵکی. هێندێک شتی بۆ تاریخ پیاو دەبێ یادیان بکاتەوە. ئەوانەی یەکەمجار ئەوەیان دەدیت شایەد دەرکیان نەدەکرد، یان ئەوەندە بچووکن کە ئەهەمییەتەکەی دەرک ناکەن. بەڵام بۆ من کە دەورانی جۆراوجۆرم دیبوون قەت لەبیر ناچنەوە.

٣٠٠ کەس بۆ ماوەی حەفتەیەک میوانی کۆنگرە بوون. تەواوی ئەو ٣٠٠ کەسە میوانی مەهابادییان بوون. ئەگەر پێنج ٣٠٠ کەسی دیکەش بانو پێنج حەفتەی دیکەش مابانەوە، هەر بەحورمەتەوە هەر بە خۆشەویستییەوە خزمەتیان دەکرا. لەپاشان کۆنگرەکە لە سینەما نوێدی کاک عومەری قازی گیرا کە دوایە سووتێنرا. هەرکە بۆ پشوودان دەهاتینە دەرێ هەموو کووچە و کۆڵانەکان و تەنانەت خیابانی "شاپوور"یش

لە خەڵک جەی دەهات. هەموو دەیانپرسی چ کراو کاری کۆنگرەی بەکوێ گەیشت. بە هەموو قووڵایی و پانایی و درێژایی هەستت دەکرد کە ئەوە چارەنووسی کوردە لەوێدا بڕیاری لەسەر دەدرێ. خەڵکەکە بەو جۆرە بەو چاوە تەماشا دەکرد. کەوابێ هەر بۆخۆی ڕووداوێکی گەورەی تاریخی حیزبی دێمۆکرات بوو. لەپاشان ئەو بڕیارانەش کە دانی، بڕیاری جوان بوون. دوایە ئەو برادەرانە کە جودا بوونەوەو ناوی خۆیان نا "پەیڕەوانی کۆنگرەی چوارەم" هەر لائیلاهەکیان دەدێ، ئیللەڵڵاکیان نەدەدێ. بەڵێ ئەو کۆنگرەیە بەحەق بڕیاری دابوو دەگەڵ ڕێبەرایەتیی شۆڕشی ئیسلامی بۆحەللی مەسەلەی کورد هاوکاری بکا. بەڵام لە هەمان‌حاڵدا گوترابوو ئەگەر کوردستان پەلامار بدرێ، دەسکەوتەکانی خەباتی کورد پەلامار بدرێن، حیزبی دێمۆکراتو گەلی کورد بە هەموو تواناوە دیفاع لە خۆیان دەکەن. کەوابوو کێ بوو کە ئەو عەهدەی شکاند؟ ئێمە یان جمهووریی ئیسلامی؟ ئەوە جمهووریی ئیسلامی بوو کە کوردو دەسکەوتەکانی کوردی پەلامار دا.

ئەگەر لەبیرتان بێ، لە هەڵبژاردنی سەرکۆماری‌دا لە هەوەڵەوە قەول وا بوو ئێمە بەشدار بین، بەڵام دوایە بەشدار نەبووین. کاک مەسعوودی ڕەجەوی ڕای گەیاندبوو کە ئەگەر بە سەرکۆمار هەڵبژێردرێ، گەڵاڵەی ٢٦ ماددەیی هەیئەتی نوێنەرایەتیی گەلی کورد دەکاتە بناغەیەک بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد لە ئێراندا. بۆیە حیزب ئیعلانی کرد کە بەشداریش دەبین و دەنگیش بە مەسعوودی ڕەجەوی دەدەین. لەپاشان یەکێک لە دەلیلەکانی بەشدارنەبوونمان ئەوە بوو کە بەقەولی فارسی لە گەردوونەیان بردە دەرێ. ئەوجار تەحریممان کرد. بەڵام بەو حاڵە پاش هەڵبژاردن حیزب یادداشتی بۆ بەنی‌سەدری سەرکۆمار ناردو گوتی ئێمە دەنگمان بە تۆ نەداوە، بەڵام ئێمە بەشێکین لە خەڵکی ئێران. ئیحتیرامسان بۆ زۆرایەتیی خەڵکی ئێران هەیە. ئەتۆ ئێستا سەرۆک کۆماری، ئێمە ئەوەی دەزانین، پێمان‌خۆشە پێێ مەسایلی کوردستانت دەگەڵ مەترەح بکەین. دەگەڵ سەر کۆمارێکی کە دەنگی موخالیفیشمان پێ نەداوە چونکی تێی‌دا بەشدار نەبووین دەستبەجێ دادەنیشین بۆ هێنانە گۆڕێ مەسەلەی کوردو ڕاگۆڕینەوە لەو بارەیەوە. یانی هیچ شتێک نەما کە حیزبی دێمۆکرات نەیکا. کەوابێ ئەمن پێم وایە بۆخۆی ڕووداوێکی گەورەی تاریخی‌یەو بڕیارەکانیشی زۆر واقیعبینانە بوون. ڕەنگە دوایە هێندێک شت ئەو جۆرەی کە بۆی ڕادەستێ نەیەتە دێ، بڕیاری هەموو کۆنگرەیەک دەتوانێ دوایە ناکام بێ. دەتوانێ بەغەڵەت دەرچێ. ڕەنگە ئەگەر کۆنگرەی چوارەم شتی وای تێدا بووبێ، کۆنگرەی چاردەهەمیش تێی‌دا بێ. مەسەلەن بڕیارێکمان داوەو جێبەجێ نەبووە. ئەوە لە ئەهەمییەتی کۆنگرەی چوارەم کەم ناکاتەوە.

**هەباس کاروێز:** مامۆستا ئەتۆ بۆخۆت چۆن چوویە کۆنگرە، بە هەڵبژاردن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن بە هەڵبژاردن نەچووم بە بڕیاری کۆمیتەی ناوەندی چووم. چونکی ئەو وەختی بەتایبەتی کە کۆنگرە گیرا ئەمن لە کاری تەشکیلاتییش هاتبوومە دەرێ. ئەمن لەبەشی ئینتشاراتو ئەوێ کارم دەکرد. هەڵبژاردنێک بۆ ئەو بەشەی نەکرا.

**هەیاس کاردۆ:** یانی هەر ئەتۆ ئاوا چووی یان خەڵکی دیکەش بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** چونکی بۆخۆم لە کۆمیتەی ناوەندی نەبووم لەبیرم نیە. بەڵام پێم وایە بێجگە لە من کەسی دیکەش هەبوون. ئێ وامان هەبوو لە کۆنگرەدا بەشدار بوو کە ئەندامی حیزبیش نەبوو. مەسەلەن مەلا موحەممەدی جوانڕۆیی ئەندامی حیزب نەبوو بانگ کرابوو بۆ کۆنگرە. هەتا ئاخری بە هەموو حەقێکەوە بەشدار بوو غەیری خۆکاندیدکردن کە نەیدەتوانی خۆی کاندید بکا. یادی بەخێر جەنابی سارمەددینی سادقوەزیری بە هەموو مافێکەوە بەشدار بوو بەبێ ئەوێ ئەندامی حیزب بێ. دیارە ئەویش خۆی کاندید نەکرد، بەڵام وەکوو هەموو ئەندامانی کۆنگرەو بەزیادیشەوە حورمەتی گیرا.

**هەیاس کاردۆ:** کاک دوکتور شەرەفکەندی چۆن بەشدار بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو مرشاوێری کۆمیتەی ناوەندی بوو.

**هەیاس کاردۆ:** پێوەندیی شەخسیی خۆت دەگەڵ مامۆستا مەلا شێخ عیززەددین کە ئەو کات زۆر بەنفووز بوو چۆن بوو؟ داخوا ئاوڕاوت بە مەترسی لەسەر رێی حیزب حیساب دەکرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێوەندیی من دەگەڵ مامۆستا مەلا شێخ عیززەددین زۆر کۆنە. یانی دەکرێ بڵێم پێوەندیی ڕوحیی من دەگەڵ مامۆستای دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئەوەی ئەمن وەک ئینسانێکی کامڵ حیسابم لەسەر بکرێ. چونکی ئەمن زۆر منداڵ بووم کە ئەو دەگەڵ بنەماڵەی مە تێکەڵاو بووە. لە دێ-یەکەی مە خوێندوویەتی و لەوێڕا دەگەڵ بنەماڵەی مە تێکەڵاو بووە. دوایە منی ناسیوە بەتایبەتی برای هەرە گەورەمان زۆری دەخزمەتدا بووە. پاشانیش ساڵی ١٣٣٣ بوو کە بۆ یەکەمجار مامۆستام دیت. ئەو وەختی لە "قاراوا"ی بۆکانێ بوو، چووم لەوێ بخوێنم. لەوێ مامۆستا ئەوەندە لوتفی دەگەڵم هەبوو کە هەر وەک کوڕی ماڵێ حیسابی بۆ دەکردم. لەمێژ نەبوو ژنی هێنابوو، ئەگەر لەبیرم بێ هیچ منداڵیان نەبوو. خۆی و خێزانی و برایەکو خوشکێکی هەبوون. جگە لە مامۆستا شێخ جەلال برایەکی دیکەیان هەیە بە ناوی سەید عەزیز. ئەو دەمی مامۆستا شێخ جەلال بیبوو بە مەلا یان دەی‌خوێند نازانم چونکە زۆر درەنگ ئەوم لە نیزیکەوە ناسی، دواتر لە مەهابادێ. سێ‌ساڵ تەواو نا بەڵام لە ماوەی سێ‌ساڵدا فەقێی بووم. لەوێش سەمیمییەتەکە هەر زۆر

بوو، بەجۆرێک کە دایمە هاتوچۆی ماڵێیم دەکرد. بەڕێزیان ماموٚستای دڵخوازی منیش بوون. یەکێک بوو لەو ماموٚستایانەی حەزم لێ‌یان دەکرد. لەباری بیروباوەڕەوە، ئینسانێکی نیشتمانپەروەر بوو. پێشتر زەمانی کۆماری کوردستان ئەندامی حیزب بوو. بەڵام ئەوکات ئەندامی حیزب نەمابوو، بەو حاڵە دەگەڵ جەریاناتی حیزبی‌و سیاسی دەهاتەوە مەحرەمی ڕاز بوو، پیاو هەموو شتێکی دەگەڵ باس دەکرد. ئەویش هەموو شتێکی دەگەڵ من باس دەکرد. لەباری خوێندەکەمەوە پیاوێکی عالم بوو. دەرسەکەی باش دەزانی کە ئەوە موهیممە. لەباری مەزهەبیشەوە مەلایەکی مورتەجیعی نەبوو. مەلایەکی ڕووناکبیرو ڕووناکبینو کراوە بوو. یانی لەو ماموٚستایانە بوو کە ئەمن زۆرم حەز پێ‌یان دەکرد.

بۆیە لە ماوەی ئێک‌دووریشماندا، تا ئەو وەختی کە ئەمنیش هەر لە ئێران بووم هەتا چووبامە مەهاباد هەمیشە هەر لە حوجرەکەی وی بووم مەگەر کارێکی دیکەم هەبایە. سەردانی ماڵەکەشیم هەر دەکردو چاوویار دەشمامەوە. خولاسە زۆر سەمیمی بووین.

لەو دەورەی ئەخیریشدا کە بە نهێنی چوومەوە مەهاباد، پێم وایە هەر وەک باسم کرد حەوتووی لی ئیێ- نەیەرپیبوو زیارەتم کرد. لەو ماوەیەدا ئێمە پێمان خۆش بوو زیاتر هاوکاریی دەگەڵ ماموٚستا مەلا شێخ عیززەدین بکەین. بەڵام هێندێک سازمانی دیکە، بەتایبەت ئەوانەی دوایە بوون بە کۆمەڵەو وپێش کەوتبوون، ئەوانە زۆر دەوریان دابوو. زۆریان تەئسیر لەسەر کردبوو. هەم کۆمەڵیان پێ کردبوو کە وەک ڕێبەرێک خۆی بنوێنێ، هەم تەئسیریان لەسەر وی کردبوو کە بەجۆرێک لەجۆرەکان دژایەتیی حیزبی دیموکرات بکا. ئەوەی وەکوو حەقایقی تاریخی باس دەکەم. ئەمن لە ئەووەڵ دیدارێدا کە دەگەڵیم کرد، زیمنی تواندنی ئیرادەتو ئەوانە، ئەوەم عەرز کرد کە ئەمن وەک مەسئوولی حیزبی لێرەم چەمعێکین هاتووینەوە بۆ کاری حیزبی. لێرە بەولاوە بەرچەرە ئێمە وەک حیزب دەردەکەوین. داوات لێ دەکەم وەک کەسێکی کە لەمێژە دۆستی حیزبی دیموکراتی‌و لە جێی بابی منیش بووی ئەتۆ تاوا ڕەفتارمان دەگەڵ بکە. ئەگەر عەیبمان هەبوو، عەیبەکانمان پێ بڵێ. بە خۆمانی بڵێ. بەڵام ئەگەر چاکەمان هەبوو بە خەڵکی بڵێ. گوتی عەیبەکانیشتانو حوسنەکانیشتان بە خەڵکی نەڵێم بە ئاشکرا. لەبیرم ناچێ ئەگەر عومری هەردووکمان باقی بێ‌و ئەو بیرەوەرییانە چاپ بن ڕەنگە بیانبینێ، بۆ یەکەمجار وبەرچاوی کەوێ دەنا قەت وەڕووم نەهێنا.

جارێکی چووم بۆ سەردانی، کە چووم خەڵکی دیکەی لەکن بوون. ڕێنوێنی‌یان کردم لە ژوورێکی دیکە دانیشتم هەتا میوانانەکانی دەڕۆن کە نەدەبوو ئەمن ببینن. دیوەکە وا بوو کە تەنیا حایێکی پەنجەرەی هەبوو، یانی دەرگاکە شووشەیی بوو کە دەکرایەوە نازانم چەند دانیشتم حەتمەن کەمتر لەنیو سەعات نەبوو. لەو نیو سەعاتەدا ئەمن ئەوە دانیشتووم ماموٚستا غەیبەتی حیزبی دیموکرات دەکا. بەداخەوە نموونەی دیکەشم هەیە کە ماموٚستا ئەوەی کردوە. بەڵام بەو حاڵە ئێمە حورمەتمان دەگرت. نەک هەر ئەمن بەڵکە مەرحوومی

دوکتۆر قاسملوش. هەتا وای لێهات جارێکی موساحەبەیەکی کرد. ئێستا ئیدی ئەوە حیزب ئاشکرا ببووە پادگان گیراوو مەهاباد دە دەستی خەڵک‌دایە. بەتایبەتی بەکردەوە دە دەستی حیزبی دێموکراتدا بوو. ئیدی هیچ ئەمن حیزب دە مەهابادێ‌دا دەستی باڵای هەبوو. جا مامۆستا موساحەبەیەکی کرد دەگەڵ "کتاب جمعه". دەوێ‌دا هیچی بۆحیزبی دێموکرات نەهێشتبۆوە. زۆر خراپی باس کردبوو. کە خوێندمانەوە دوکتۆر قاسملو گوتی دەچم قسەی دەگەڵ دەکەم. گوتم تا دوکتۆر ئەتۆ نازانی قسەی دەگەڵ بکەی. گوتی یانی چی؟ گوتم ئەتۆ دەچی بە دیپلۆماسی قسەی دەگەڵ دەکەی. مامۆستاش دیپلۆماسی نازانێ. ئەوە ئیدی غەیبەتێک نیە لێرە بیکاو لەوێ بیکا. ئەوە شتێکە لە سەرتاسەری ئێراندا بڵاو بۆتەوە. دەبێ مامۆستا ئەوەی وەرگرێتەوە. خولاسە قانیعم کرد کە ئەمن بچم چونکە گوتم مامۆستا وەری گرەوە. حیزبی دێموکرات ئی ئەوەی نیە گاڵتەی دەگەڵ بکرێ. وەری دەگریەوە یان جوابت دەینەوە. ئەگەر جوابیشت دەینەوە دەزانین چۆنت جواب دەدەینەوە. هەڕەشەیەکی زۆر جیددیم لێ کرد. هەرچەند بۆ من ناخۆشیش بوو. گوتی وەڵڵا پەشیمانم لەوەی گوتوومە. شتی وا تیکرار نابێتەوە. گوتم ئەوە کراوە. گوتی سەعی دەکەم بەرەبەرە لە جێگای دیکە بە باشی باس بکەمەو ئەوە بشۆمەوە. گوتم تا ئەوە کراوە دەبێ ئەوەی وەرگریەوە. پاش فشارێکی زۆر کە زۆر تێک‌چوو، گوتم تەنیا ڕێگا ئەوەیە: یان بۆخۆت شتێک بنووسی‌و ئەمن چاوی لێ بکەم ئەگەر پێی ڕازی بووم چاپی دەکەین، یان ئەمن شتێک دەنووسمو بۆت دێنم ئەگەر ئەتۆ ڕازی بوویو تەوافوقمان لەسەری کرد بڵاوی دەکەینەوە. فەرمووی ئەتۆ بنووسە. وا دیار بوو ئەوەی بۆ هاسانتر بوو. ئەمن هەستام چووم شتێکم نووسی لە زمان ویەوە کە بەختی خۆی بێ‌نووسێتەوە چاپی بکەین. بۆیەش بەختی خۆی بۆ ئەوەی سەنەدییەتی هەبێ. کە بۆم بردەوە مەلا سەعیدی لەکن بوو. مەلا سەعیدی کامەمی ڕووحی شاد بێ. خوێندیەوەو گوتی فلان کەس ئەوەی بڵاو کەمەوە هیچم بۆ نامێنێتەوە. گوتم ئاخر ئەتۆش هیچت بۆ ئێمە نەهێشتۆتەوە. گوتی وەڵڵا ناتوانم. گوتم ئەمن مەجبوورت ناکەم. هاتووم عەرزت دەکەم ڕێک کەوین. ئەتۆ وەری بگریەوە بەقازانجتە. وەری‌ناگریەوە بەزەرەرتە. هەستام بەجێم هێشت چوومەوە ماڵێ. پێم وابێ پێنجشەممە بوو. ئەوە هەمەوی دوو ڕۆژی خایاند. ئێوارێ مەلا سەعید تەلەفۆنی کرد. گوتی لەماڵێ دەبی؟ گوتم بەڵێ. گوتی دێمە ماڵێ. مەلا سەعید هاتو پاش تاوێک دانیشتن گوتی کاکە ئەتۆ بۆ وا لەو پیاوەی دەکەی؟ گوتم چیم لێ کردوە؟ گوتی وەڵڵا بەلای کەمەوە ئەو ماوەیە ٣ کیلۆت گۆشت پێ داناوە. ئاخر لەلای خۆی مامۆستات بووەو حەقی بەسەرتەوە هەیە. گوتم مامۆستامەو بلیشمە بەڵام لە مەرقابیل حیزبدا بۆ ئەو شتانە بەداخەوە ناتوانم بێ‌لایەن بم. فەرمووی باشە سەنگوسووکی‌یەکی دەگەڵ بکە. گوتم باشە ئەویش دەبێ بێتە پێشێ. سەرت نەیەشێنم سەرەنجام وای لێ‌هات چووینو ئەو مەتنەی کە ئەمن نووسیبووم دەستکاریمان کردو

تۆزێک مرلایمان کرد کە دیارە ئەوەی هەر تێدا بوو کە ئەو قسانە خراپ بوون. ئەوەی بەخەتی خۆی نووسیبوو ئێمە دە ڕۆژنامەی کوردستاندا بلاومان کردەوە.

بەهەر حاڵ ئەمن بەو سەراحەتە عەرزی مامۆستام دەکرد. دەمگوت مامۆستا ئەو خەلکەی ناوا لە تۆ هالاون تۆیان ئیحاتە کردوە، باوەڕیان پێت نیە. ئەمن وەک تۆ مەلام وەک تۆ موسوڵمانم حیزبەکمشمان حیزبێکی کۆمۆنیستی نیە. کەوابێ ئێمە ئەتۆ بە شەخسییەتێکی نیشتمانپەروەری ئایینی دەناسین. بەڵام ئەوانە بە کۆنەپەرستت دەزانن. مەعلوومە ئەوانە کەسێکی ئیماندار بە کۆنەپەرست دەزانن، تەنیا دەیانەوێ کەلکت لێوەرگرن. ئەتۆ دەگەڵ حیزبی دێمۆکرات هاوکاری بکەی باشترە. تەقریبەن قبووڵی دەکرد. بەڵام کە وەردەگەڕایەوە دەوریان دەداو تێک دەچۆوە. چونکی پێم دەگوت ئێمە درۆت دەگەڵ ناکەین. ئێمە تۆ بە شەخسییەتێکی سیاسی، مەزهەبی دەناسین بەڵام بە ڕێبەری کوردستانت نازانین. ئەوانیش هاواریان دەکرد: شێخ عیززەددین ڕەهبەرە، بۆ کوردستان سەرووەرە. ئەو قسانەیان بۆ دەکردو ئەویش دیارە پێی خۆش بوو. تەنانەت لەبیرمە لە شەڕی سنەی‌دا کە هەیئەتێکمان چوو بۆ سنە، لە مەهابادێ وەڕێ کەوتین شەوێ چووینە سەقز میوانی ئیمام جومعەی سەقز بووین. ڕەحمەتی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای موحەممەدی کە ئەو دەمی نەببوو بەحاجی. کاک ئەحمەدی موفتیزادەش دەعوەت کرابوو بێ. ئەگەر وابە بووین چونکە دیار بوو سازمان درابوو، لاوەکان کۆ ببوونەوەو دەیانگوت شێخ عیززەددین ڕەهبەرە، بۆ کوردستان سەرووەرە. شەوێ دانیشتین و دەگەڵ موفتیزادەی هێندێک تەوافوقاتیان کرد. بەیانی کە ڕۆیشتین بە قودرەتی قادری شوعارەکە گۆڕابوو. ئەوجار ببوو بە: شێخ عیززەددین ڕەهبەرە، موفتیزادە سەرووەرە. یانی شتەکە هەمووی دەسکردو سازکراو بوو. ئێمەش نەماندەتوانی درۆی دەگەڵ بکەین، چونکە بە مەسئوولییەتەوە قسەمان دەکرد. بەڵام سازمانەکانی دیکە کە بەتایبەتی هەموو چەپی مارکسیستی بوون — مەبەست ئەوە نیە ئەوەی بەخراپ بزانم — بەڵام بەهەر حاڵ لە کۆمەڵی کوردەواری‌دا پەزیرشیان نەبوو، هەموو ئەوانە دەچوون دەیانگوت ئێمە ترشەری مامۆستا شێخ عیززەددینین. کە دیارە ئەویش وەکوو ڕێبەرێکی خۆشەویستی ئایینی دەناسراو قبووڵ دەکرا. بەڵام ئێمە دەچووین دەمانگوت حیزبی دێمۆکراتین. پێویست نەبوو ئێمە ئەوەی بکەین. ئەوان نە لەباری سازمانی‌یەوە ئەو مەقبوولییەتیان هەبوو، نە وەکوو شەخسییەت کەسێکی ناسراوی وەک دوکتۆر قاسملوویان هەبوو. بۆیە لە دەوری مامۆستای بوونو ئەویان وەپێش خۆیان دابوو. بە قەولی برادەرێکی کە لە کوردستانی عێراق بوو — ناوی نابەم — لە ژێر عەبایەکەی مامۆستادا خۆیان شاردبۆوە.

**هەلیاس کارەلا:** مامۆستا ئەگەر ئێوە زووتر لەوان مامۆستاتان گرتبایەوەو قسەتان دەگەڵ کردبایە، پێت وا نیە دەتانتوانی تەئسیری لێ بکەن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن عەرزم کردی خەڵکی دیکە وەپێش ئێمە کەوتبوون. چونکی ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە ئێمە لە زۆربەی شارەکانی کوردستان حەلەقاتی تەشکیلاتیمان هەبوو، بەڵام تەشکیلاتمان نەبوو، بەتایبەتی هەلومەرجەکەشمان نەدەناسی. نەمانەدەزانی چ گۆڕانێک پێک هاتوە. لەحاڵێکدا کوردستانی ئێران وایان لێ هاتبوو خەڵک بە ئاشکرایی فەعالییەتیان دەکرد. بۆیە ئەوانە وەپێش مە کەوتبوون، یانی پێشتر مامۆستایان گرتبوو.

**عەباس کاروان:** بەگشتی دەوری مامۆستا شێخ عیززەدین لەو سەردەمدا چۆن هەڵدەسەنگێنی؟ پێت وا نیە نەی‌توانی ڕیسالەتی خۆی بەباشی بەڕێوە بەرێ؟ ئێستا چۆنی قەزاوەت لەسەر دەکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن دە ئیخلاسی مامۆستا مەلا شێخ عیززەدین‌دا هیچ شکم نیە. هیچ وەختێک شکم دە ئیخلاسی وی‌دا نەکردوە. بەڵام وەکوو گوتم ئاوا ئیحاتە کرابوو. بەتایبەتی ئەو عینوانەیان بۆ بەکار دێنا و ئەویش پێی خۆش بوو، مامۆستا مەلا شێخ عیززەدین لەو وەختی‌دا خراپی عەمەل کرد. ئەگەر مامۆستا مەسئوولانەتر و سیاسی‌یانەتر ڕەفتاری کردبایە شتێکی زۆر نەدەگۆڕا، چونکی جمهووریی ئیسلامی بڕیاری خۆی دابوو. ئەوە مەعلوومە. بەڵام وەزعی کوردستان دەی‌توانی چاکتر بێ، بەتایبەت فەزای نێو هێزە سیاسی‌یەکانی کوردستان دەی‌توانی چاک بکرێ. ئەمن پێم‌وایە مامۆستا مەلا شێخ عیززەدین لە چەند ساڵی ئەو دوایی‌یەدا باشتری ڕەفتار کردوە. ئەگەر لە سەرەتاوە یانی لە ساڵی ٥٧ وە هەتا ساڵەکانی ٦٤ و ٦٥ کە هێزە سیاسی‌یەکان لە نێوخۆی وڵاتدا بوون ئاوای عەمەل کردبایە خزمەتی پتری لە دەست دەهات. یانی لەسەریەک ئەگەر ئەمن قەزاوەت بکەم، ئەوەی پێی دەڵێن عەمەلکرد، عەمەلکردی مامۆستا شێخ عیززەدین لەو ٦، ٧ ساڵەی‌دا کە باسم کرد زیاتر نمرەی مەنفیی دەردێنێ هەتا موسبەت. دەگەڵ ئەوەش هیچ وەختێکی نە پێشتر و نە ئێستا شکم لە دڵسۆزیی وی‌دا نەبووە. بەڵام ئەویش وەک هەموو کەس دەی‌توانی هەڵەو قسووری هەبێ.

**عەباس کاروان:** ئێستا پێوەندیت دەگەڵی هەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هیچ وەختێک نیە بچمە دەرەوە یەکێک لە ئەووەڵین کەسانێک نەبێ کە تەلەفوونیان بۆ دەکەم. پێم‌وایە یەکجاریش هەڵکەوتوە کە تەنیا بۆ ٣ ڕۆژان چوومە ستۆکهۆڵم سەرم نەداوە، دەنا هەموو جارەکان کە چوومەتە سوێد سەرم داوە. چەند جاریش هەر لێرەڕا تەلەفوونم بۆ کردوە و ئەحواڵم پرسیوە. ئەمن ئێستاش خۆم بەموخلیس و قوتابیی و بە کوڕی مامۆستا دەزانم. لەباری تێکۆشانەوە یەکێک خۆشی دەوێ، یەکێک ناخۆشی دەوێ بەجێی خۆی. بەڵام ئەمن خۆشم دەوێ.

**عەباس کاریز:** سەرەتاکانی دوای شۆڕش، هاوکات حیزب تووشی چەند کێشەی جۆراوجۆر بوو: لە لایەک دەوڵەتو ملمڵندانی بۆ داخوازەکانی کورد. لەلایەک حیزبی توودەو دەستتێوەردانەکانی لە کاری ناوخۆیی حیزبی دێمۆکرات دا. لەلایەک کۆمەڵەو دروشمە توندەکانی. لە لایەک موفتیزادەو مەترسیی بەهێزبوونی. هەروەها سوپای ڕزگاریو زۆر شتی دیکەش. ئایا پێتان وا بوو دەتوانن لەو هەموو مەترسییە دەرباز بن؟ ئەگەر لەو بارەیەوە باسێکمان بۆ بکەی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە لە ڕوانگەی حیزبی دێمۆکراتەوە یەک موشکیلی ئەساسی هەبوو. ئەویش موشکیلی ئەو ڕژێمە بوو کە وەک باسم کرد هەر پێش هاتنەسەرکاریشی حیزب پێی وا بوو خەبات دەگەڵ کردنو سازان دەگەڵی زەحمەتە. حیزب لەو کاتەدا دەبوو ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دابا کە خەڵکی کوردستان تووشی شەڕو کێشە نەبن. ئەوی دیکە ئێمە بە موشکیلمان نەدەزانی کە سازمانی جۆراوجۆر هەن. ئەوەتا ئەمن ئەو حیزبەی دەناسم هەمیشە باوەڕی بەوە هەبووە کە کوردستان دەپارانی هیچ حیزبێکدا نیە. هەموو حیزبێکی سیاسی حەقی خۆیەتی بیروباوەڕی خۆی فۆرمووڵە بکاو ئامانجی خۆی دیاری بکاو تێکۆشانی سیاسیی خۆی بکا. تەنیا شت کە دەبێ هەموومان پەیڕەویی لێ بکەینو بیپارێزین مەسڵەحەتی نیشتمانییەو ئەوەش وەک مرشتەرەکانی هەموومان دەبێ سەیر بکرێ. دەنا با حیزبێک جیاواز بێ، یان ئەخێر موخالیفی حیزبی دێمۆکرات بێ، ئەوە موشکیل نیە.

دیارە لەسەر هێندێک لەو گرووپانە کە هەبوون بە بێ ئەوەی ناو بەرم ڕەنگە بیروباوەڕی جۆراوجۆر هەبێو جاروبار دەشتەدی بیروباوەڕێکی مەنفی کە لەسەریان هەبوو، دروست بووە، مەسەلەن گرووپ هەبوون کە وەختی شەڕی ئێرانو عێراق گوێیان دەفرۆشتن. دەچوون خەڵکیان دەکوشت، یان با بڵێین پاسدارییان دەکوشت، هەر دووک گوێیان لێ دەکردنەوەو دەیاندان بە دەوڵەتی عێراق بە نیشانەی ئەوەی ئەوەندە پاسدارییان کوشتوەو نیدی نازانم چییان وەرەگرت. دەگوترا خەڵکی بێتاوانیشیان دەکوشت بۆ ئەوەی ژمارەی گوێیەکان زیاتر بێ. ئەوانە ئاچنە ڕیزی هێزە نیشتمانییەکانەوە. دەنا ئەوانی دیکە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان بە موشکیلی نەزانیون.

ئەوەی کە مەربووت بوو بە هێندێک دەخالەتی حیزبی توودە بەڵێ موشکیلساز بوو. بەڵام وا تێ دەگەم بانی لەبیرم نیە حیزبی دێمۆکرات پێی تەنگاو بووبێ. چونکە ڕەنگە کەس تەنانەت لایەنگرانی حیزبی توودەش گومانیان دەوەدا نەبووبێ کە زۆربەی خەڵکی کوردستان لە نێوان حیزبی دێمۆکرات لەلایەکەو هەموو لایەنەکانی دیکەدا حیزبی دێمۆکراتیان دەویست. ئەوەش هەروا بە گۆترە نیە. باشترین میعیار بۆ دیاری کردنی ڕادەی خۆشەویستیی حیزبێک، هەڵبژاردنە. حیزبی دێمۆکراتی کوردستان لە هەڵبژاردنی دەورەی یەکەمی مەجلیسدا لە هەموو ئەو جێگایانە کە کاندیدێک هەڵبژێرا بۆ کوردستان کاندیدەکانی سەر کەوتن. لەو

جێگایانەش کە کەوتنە دەوری دووهەم، کاندیدەکانی حیزب کەوتنە دەوری دووهەم. کەوابوو هەر چەند حیزبی دێمۆکرات بە دەخالەتەکانی حیزبی توودە ناڕەحەت بوو بەڵام بە مەترسی‌یەکی وای نەدەزانی. بەتایبەتی حیزبی توودە لە کوردستان هەر زۆر کەمنفووز بوو. مەسەلەن ئەگەر تەماشای کاندیدەکان بکەین. لە بۆکان کاندیدی حیزبی توودە مەرحوومی حەسەنی قزڵجی بوو، کاندیدی ئێمەش مەرحوومی کاک ئەبووبەکری هیدایەتی بوو. دەگەڵ هەموو شانازیم بە کاک ئەبووبەکری هیدایەتی‌یەوە، پێم وا نیە کەس گومانی دەوەدا هەبێ کە ئەگەر ئەو دووانە کاندیدی خۆیان بانایە کاک حەسەنی قزڵجی بە ڕادەیەکی یەکجار زۆر وەپێشی دەکەوت و هەڵدەبژێرا. کەچی ئەو پیاوە گەورەیە چونکی کاندیدی حیزبی توودە بوو، پێم وابێ شتێک پتر لە سەت دەنگی هێنابێوە. لە مەهاباد عەلیی گەلاوێژ بوو، ئی مەش کاک غەنیی بلووریان بوو. دووبارە دەگەڵ ڕێزم بۆ هەموویان پێموایە هیچ ئینسانێک تەنانەت ئەگەر دوژمنی بابەگوشتەی عەلیی گەلاوێژیش بێ فکر ناکاتەوە کە کاک غەنیی بلووریان لەسەرووتر بوو لە کاک عەلی. بەڵام چونکی ئەو کاندیدای حیزبی توودە بوو و کاک غەنی کاندیدای حیزبی دێمۆکرات بوو، کاک غەنی بە ڕێژەی ٨٢%ی دەنگەکانی خەڵکی مەهاباد بۆ مەجلیس هەڵبژێرا. لەبیرم نیە بەڵام پێم وابێ کاک عەلی دەوری ٤٠٠ دەنگێکی هێنابوو. ئەویش دڵنیام بەشی هەرە زۆری ئەو دەنگانەش کە هێنابوونی ئی شەخسییەتی خۆی بوون نەک ئی حیزبی توودە.

کەوابێ ئەوانە موشکیل نەبوون، بەڵام بەهەر حاڵ خەبات یانی بەربەرەکانی دەگەڵ هەموو گیروگرفتێک. وەکوو دەڵێن ڕێگای خەبات بە گوڵ و ڕەیحانە دانەچێنراوە. دڕکو داڵی هەیە. کەندو کۆسپی لەپێشە، ئەوانە زۆر ئاساییین.

# کۆمەڵە

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا لێرەوە دەچمە سەر باسێکی تایبەتی‌و پڕکێشە کە هیوادارم وەڵامی پرسیارەکانم وەرگرمەوە. ساز بوون‌و درێژەی خەباتی "کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان" بۆ حیزبی دێموکرات کێشەساز بوو. هەر بۆیە داوا دەکەم با بەشێکی تایبەتیی بۆ بکەینەوە:

* وەک بزانی کۆمەڵە کەی دروست بوو؟ حیزبی دێموکرات چۆن لە بوونی ڕێکخراوێکی ئاوا ئاگادار بوو؟

**عەبدوڵلا حەسەن‌زادە:** ئەمن پێم‌وایە وەڵامی ئەو قسەیە زۆر ئاسان نیە. لە وەختێک‌دا کە خەباتی خەڵکی ئێران‌و کوردستان لە دژی ڕێژیمی پەهلەوی بەرقەرار بوو، ڕێکخراوێک بە ناوی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان لە مەیدانی تێکۆشاندا نەبوو. چەند سازمان هەبوون کە زۆربەشیان ناوی فارسی‌یان لەسەر بوو. مەسەلەن "جمعیت راه رهایی زحمتکشان". لە مەریوان شتێک هەبوو بەناوی جوتیاران. لە سنە ئێستا حوزووری زیهنم نیە ناوێکی دیکە هەبوو. بەڵام لە بەهاری ٥٨دا، وابزانم مانگی بانەمەڕ بوو، مەوجوودییەتی "کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران" ئیعلان کرا. دەنا پێشتر ئەو ناوە هەر وجوودی نەبوو. ئیدی کە ئەوە دروست بوو، ئەو ناوانەی دیکە سڕانەوە. یانی لە واقیعدا ئەگەر بڵێین ناوەکانی دیکە سەرپۆشێک بوون، ئەو سەرپۆشـــە هەڵ‌گیراو هەموویان لە "کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان"دا خۆیان دیتەوە. بەڵام لە عەینی کاتدا کۆمەڵە بۆخۆی دەڵێ کە ئێمە لە ساڵی ١٣٤٨دا، نەک ٥٨دا یانی ١٠ ساڵ پێشتر دامەزراوین. ئەمن تەکزیبی ناکەم. بەڵام حەقم هەیە بڵێم ئەمن کە دە سیاسەتیشدا بووم‌و ئەوە نەبووم بڵێی دەگوێی گادا نوستیم، ئەو ناوەم هەتا ساڵی ٥٨ وەبەر گوێ نەکەوتوە، وەبەر چاوم نەهاتوە، ئەم‌خوێندۆتەوەو لەکەسم نەبیستوە.

لەبیرمە پێش ٥٨ەی کۆمەڵەیەک دروست بوو بە ناوی کۆمەڵەی ڕزگاری. دیارە ئەمن بە تەسادوف بەسەری‌دا کەوتم چونکی گوترابوو کە دەبێ ئەمن نەزانم. ئەو کۆمەڵەیە کاک سەلاحی موهتەدی‌و شەهید موحەممەدی ئێلخانیزادە برای ئەو کاک عومەری ئێلخانیزادەیەو نازانم کێی دیکەش دایانمەزراندبوو. ئەوەی ئەمن لێم دیتن شتێکی یەک‌لاپەڕەیی یان یەک‌لاپەڕو نیوی بوو کە هێندێک ئامانجی تێدا بوون. دیارە

ئامانجەکان ئامانجی گەورە بوون وەک کوردستانی گەورەو پێکهێنانی کوردستانی ئازادو لەو شتانە. بەداخەوە شتەکەم نەماوە. لە دوایە پاش ماوەیەکی ئەویش یەکهەنگ بۆوە. سێ ساڵ، چوار ساڵ پێش ئێستا بوو. جارێکیان ئێمە چووبووینە سەردانی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان، وامان کرد کاک سەلاحیش لەوێ بێ. دیدارەکە زیاتر دۆستانە بوو پێمان خۆش بوو ئەویش لەوێ بێ کە یەکتری ببینین، لەوێ باسەکە هاتە پێش. کاک سەلاح گوتی دوژمنایەتیمان کرا، نیاننەهێشت ئەو کۆمەڵەی ڕزگاری‌یە پێک بێنین. گوتم ئەو دوژمنایەتی‌یە خەیاڵی‌یەی بۆ مەتاشی. کێ ناوی ئێوەی بیست؟ کام ڕۆژنامەتان کام ڕادیۆتان کام بەیانتان کام تەشکیلاتتان؟

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ئەو کۆمەڵەی ڕزگاری‌یەیان لە باشووری کوردستان دامەزراندبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ئەودەم کاک سەلاح و کاک موحەممەد لێرە بوون، گرووپیان هەبوو. حەتتا ئەمن بۆخۆم ماوەیەک هاوکاری حیزبیم دەگەڵیان هەبوو لە داخڵدا. هەر موستەقیم دەگەڵ وان هاوکاری حیزبیم هەبوو. کاک سەلاح ناوی مستەفا بوو. کاک موحەممەدیش ناوی کاوە بوو. ئەوجیە هەژار دە بەرەوموکریاندا یادیان دەکاتەوە:

کاوە بۆ کوێنکی شکاو بێ‌چەرمە  خوێنی لاوان کە لەبیر کا شەرمە
مچە گردەڵ کە بەرەو بار بۆوە  گشتە پان پێچی دەرلو خلو بۆوە

ئەوە دوای ئەوێ بوو کە چوونەوە.

مەبەستی لە مچە گردەڵ کاک سەلاحە. ئاخر کاک سەلاح پیاوێکی کورتە باڵاو چووکەڵەیە. قسەی خۆش هەر خۆشە. با لێرەدا قسەیەکی خۆشیش بگێڕمەوە کە کاک سەلاح لە بابی گێڕایەوە. ئەو وەختی کە کاک سەلاح لە عێراق بووە، ئەوێکیان لەنێوە شەوێدا دایکی وەخەبەر دێ‌و دەست دەکا بە گریانێ. حاجی ڕەحمانئاغا، بابی کاک سەلاح -ڕووحی شاد بێ- وەخەبەر دێ دەڵێ ئەوە بۆ دەگری چ باسە؟ ئەویش دەڵێ وەڵڵا خەونم بە سەلاحەوە دیوە. بابیشی دەڵێ خەون هیچ نیە، بخەوە. دەڵێ نا وەڵڵا حەتمەن شتێکی بەسەر هاتوە. دەڵێ کچێ خەون هیچ نیە گرینگی مەدەیە. خولاسە دەست هەڵناگرێ هەتا لێی دەپرسێ خەونەکەت چی بوو؟ ئەویش دەڵێ دەخەونێدا سەلاح نوستبوو، لێفەیەکی بەخۆیدا دابوو. ئەگەر بەسەریدا دەدا لاقی وەدیار دەکەوتن. ئەگەر بەلاقیدا دەدا، سەری وەدیار دەکەوت. حاجی ڕەحمانئاغا دەڵێ دەیزانە خەونەکەت هیچ نیە. ئاخر چ لێفەیەک هەیە بە کوڕی تۆ ڕانەگا؟ هەرچی لێفەی دنیایە هەیە لەسەرو لاقی سەلاحی زیادە.

هەروەک گوتم ئەمن شتێکم لەو بارەیەوە لە کۆمەڵەی نەدیوە هەتا ساڵی ٥٨ کە ئیعلانی مەوجوودییەتی کرد، بەدوای وی‌دا بوو کە ئەو وردە سازمانانەی دیکەیان کۆ کردەوە سازمانێکی واحید هاتە مەیدانی خەبات.

**عەباس کاردۆ:** کاک برایمی عەلیزادەش باسی ئەوەی دەکا کە پێشتر شتیان هەبووە بەڵام بە ناوی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان نەبووە. دوایە هاتوون ئەو ناوەیان لێ ناوە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** جا ئیدی ئەوان بۆخۆیان دەی گێڕنەوە بۆ ساڵی ٤٨ بەڵام مەگەر مەجمەعێکی چووکەڵەی خۆیان بووبێ. دەنا ئەوەی پێی دەڵێن خەڵکی کوردستان یان سازمانە سیاسی‌یەکان کەس لێی خەبەردار نیە.

* ڕوانگە سەرەتایی‌یەکانی کۆمەڵە چی بوون؟ کۆمەڵە چۆن خۆی بە خەڵکی کوردستان ناساند؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن بە دوو دەلیل زۆر ڕۆ ناچمە نێو ڕوانگە سەرەتایی‌یەکانی. یەکیان ئەوەیە ئێمە دەگەڵ موشکیلاتێکی زۆری سیاسی، تەشکیلاتی، تەبلیغاتی و لە هەمووان خراپتر نیزامی بەرەوڕوو بووین و بەکاری خۆمان ڕاگەیشتووین. دووهەمیش ئەمن حیزبی سیاسیی خۆمم هەبووە و زۆریش عەلاقەم بەو مەسەلانە کە بۆ ئەوان مەتڕەح بوون وەک مەسایلی کۆمۆنیستی نەبووە. ناتوانم بڵێم ئەمن مەبنا فەلسەفی و فکری‌یەکانی ئەوان بە درێژی دەناسم ناسەوق ئیدیعای بێ‌جێش بکەم. بەڵام بە هەرحاڵ ئەوان خۆیان بە ڕێکخراوێکی مارکسیستی و کۆمۆنیستی دەزانی. هەر چەند ناوی سازمانەکەیان کۆمۆنیست نەبوو، بەڵام کە قسەیان دەکرد یان دەیاننووسی هەمیشە خۆیان وەک کۆمۆنیستەکانی کوردستان دەناساند. یانی بناغە فکری‌یەکانیان ئەوە بوون. بە هەرحاڵ ئەوەش دەزانین کە دواتر جامعەی کوردستانیشیان تەقسیم کرد بە تەبەقەی کرێکار و تەبەقەی سەرمایەدار. ئەوان نوێنەری تەبەقەی کارگەر بوون و حیزبی دێموکراتیش نوێنەری بورژوازی بوو. بەڵام ئەگەر بڵێم مەبنا فکری‌یەکانی ئەوانم خوێندۆتەوە، بەداخەوە هەتا ئێستاشی دەگەڵ بێ نەم‌خوێندۆتەوە.

* هەر وەک دەزانین کۆمەڵە لایەنێکی سەرەکی لە بەشدارانی "هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد" بۆ وتووێژ دەگەڵ کۆماری ئیسلامی بوو. هەڵوێست و نەخشی کۆمەڵە لەو پێکهاتەیەدا چۆن بوو.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بە هەرحاڵ کۆمەڵە لایەنێک بوو کە لە باری وەزنەوە دەبێ بە لایەنی دووهەم حیسابی بکەین. ئەگەر دیققەتتان کردبێ هەیئەتی نوێنەرایەتی گەلی کورد لەچوار لایەن پێک‌هاتبوو: مامۆستا مەلا

شێخ عیززەددین وەکوو شەخسییەتە حیزبی دێمۆکڕات، کۆمەڵەو لقی کوردستانی چریکە فیدایییەکانیش وەک حیزبێو ڕێکخراو. مامۆستا کە ئەو نەخشەی درابوویە، فەقەت شتێکی سیمبولیک بوو. وەکوو شەخسییەتێک و زیاتریش لەبەر ئەوە کە دەگەڵ حکوومەتێکی دینی تەرەف بووین. زەمانی دین پێویست بوو بیزانێ کە ئەویش ڕێبەرێکی ئایینی بوو. زۆر جاریش کە کێشەمان دەبوو مامۆستا باسی سۆسیالیزمی دەکرد، دوکتور قاسملوو بە شۆخی پێی دەگوت مامۆستا باسی سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم بۆ من هەڵگرە. ئەمن دەرسی ئابووریی سیاسیم خوێندوە. مامۆستا بووم لە دانیشگا دەرسەکەیم گوتۆتەوە. ئەتۆ دەگەڵ ئەوانە بە زمانێکی دیکە قسان بکە. جا بەڕەحمەت بێ مەلا سەعید پیاوێکی قسەخۆش بوو. دەی گوت مامۆستا دوکتور مەبەستی ئەوەیە پێت بڵێ ئەتۆ باسی قیامەتێ بکە دنیایەکە بۆ من بەجێ بێڵە. لەپاشان نۆرە دەگەیشتە حیزبی دێمۆکڕات کە لەباری وەزن و توانا و هەموو شتێکەوە حیزبی یەکەم بوو. بۆیەش وتەبێژی ئەو هەیئەتە بوو. لەڕاستیدا لەسەر ئەوە تەوافوق کرابوو کە وەختێک دەگەڵ هەیئەتی دەوڵەت دادەنیشین مامۆستا قسە تەشریفاتییەکان دەکا. وەک بەخێرهاتن و بەیەکترناساندن و ئەوە. لەپاشان نوێنەری حیزبی دێمۆکڕات هەر کەسە، ئەو قسەکان دەکا. ئەوانی دیکەش ئەگەر قسەیەکیان هەبێ، دەبێ بینووسن بۆ نوێنەری حیزب کە ئەو مەتڵەبە هەیە. جا ئەویش یان دەڵێ بۆخۆت مەترەحی بکە، یان لەجیاتی وی باسی دەکا، یان ئەگەر پێی مەسڵەحەت نەبوو دەتوانێ بڵێ با لێی گەڕێین.

کۆمەڵە لەباری تەرتیبەوە سێهەم بوو بەڵام لەباری توانا و مەوقعییەتەوە وەزنی دووهەم بوو. بەداخەوە دەبێ بڵێین ئەو هەیئەتی نوێنەرایەتییە لەڕاستیدا قەت نەکەوتە سەر کارەکەی خۆی. دەجێگای دیکەدا زۆر باس کراوە، خۆ دەوڵەت ئەوەندە جیددی نەبوو کە وتووێژێکی ڕاستەوخۆ دەگەڵ ئەو هەیئەتە بکا هەتا بزانین چۆنە. زۆر جار ئەوە گوتراوە کە ئێمە تەنیا یەک‌جار دەگەڵ هەیئەتی دەوڵەت کۆ بووینەوە. ئەویش لەسەر هەڵەیەکی تەکنیکی کە مامۆستا مەلا شێخ عیززەددین کردی، بیانوو کەوتە دەستی ئەوانە کە بە ناوی هەیئەتی دەوڵەت هاتبوون بەتایبەتی هاشمی سەباغیان کە بڵێ ئێمە دانانیشین. ئەوان حەساسییەتیان بە ناوی کۆمەڵە و چریک نیشان دەدا، کە دیارە بەشێکی زۆری بۆ تێکدان بوو. دەیانگوت ئێمە دەگەڵ ئەوانە دانانیشین. ئەوانە زیدی ئیسلامین و ئەو شتانەو ئێمە دەگەڵیان دانانیشین. ئێمەش تەوافوقمان کرد کە بابە خۆ ئەوانە دەزانن هەیئەتی نوێنەرایەتیی گەلی کورد لەو چوار گرووپە پێک هاتوە. بەڵام دەیانەوێ ئاوەکە نەبێ. با ئێمە ئەوە ڕەعایەت بکەین. کە دادەنیشین حادەتەن لە هەموو دانیشتنێکی ئاوادا ئەندامانی هەیئەتەکان دەناسێندرێن- ئێمەش لەجیاتی ئەوەی بڵێین ئەوە چریکە دەڵێین فلان کەسە. یان لەجیاتی ناوبردنی حیزبی دێمۆکڕات ناوی کەسەکە دەبەین. هەیئەتی نوێنەرایەتیی گەلی کورد مەسەلەن ئەو ٥ کەسەیە، یان ئەو ١٠ کەسەیە. کە دانیشتین لە حەوتەوە هەیئەتی دەوڵەت کە ٣ کەس بوون، هاشمی سەباغیان موعەڕیفیی کردن کە بۆخۆی و

داریووشی فرووهەرو عێزەتوڵلای سەحابی بوون. نۆرەی مامۆستای هات کە ڕەئیس بوو دەبوو ئەوشتانە ئەو بیانکا. هەوڵی خۆی نالساند وەک شێخ عیزەددینی حوسێنی. دوایە گوتی ئەوە دوکتۆر قاسملوو و عەبدوڵلا حەسەنزادەو کەریمی حیسامی لە لایەن حیزبی دێموکراتەوە، ئەوجار فلانو فلانو فلان لەلایەن کۆمەڵەو هەروەها ئی چریکەکان. ئەوەندە کافی بوو کە هاشمی سەباغیان بڵێ ئێمە دەگەڵ ئەوانە دانانیشینو ئیدی کۆبوونەوە تێک‌چوو کە ئەوە ئێستاش جارێکی دیکە کۆ دەبێتەوە.

بەڵام لە شتێکی دیکەدا هەم کۆمەڵەیی‌یەکان — ئەوان زیاتر — هەم ئەوانی دیکە هێندێک کاریان دەکردن کە سیاسی نەبوون. مەسەلەن ئەو هەیئەتە هاتبوو بۆ مەهاباد. لە حاڵێک‌دا هەیئەت لە مەهاباد بوو ئەوان بەیاننامەیان دەرکردبوو کە ئێمە بۆ نیشاگەری موزاکەرە دەکەین. دیارە ئەوە یەکەمجارو ئاخرجاریشیان نەبوو. جارێک مەرحوومی دوکتۆر قاسملووی پێشی گوتن کە بابە موزاکەرە سەرفی ئەمزو لەوەی دروستە یان هەڵەیە، پێی دەگەی یان نا، بۆ گەیشتن بە نەتیجەیە. نیشاگەری موزاکەرەی بۆ چیە؟ باشە وەختێک ئەتۆ موزاکەرە دەکەی نابێ کارێکی وا بکەی پێش ئەوەی مەتالیبت تەرح بکەی، وەزعەکە ئاڵۆز بکەی‌و جەلەسە تێک بچێ. بەهەرحاڵ لە کۆبوونەوەیەک‌دا کە ئەمن حوزوورم نەبوو، بەڵگەیان لەپێش دوکتۆر قاسملووی دانابوو. گوتبوویان ئەوەتانێ ئەوانە موزاکەرەی دەکەن بۆ نیشاگەری. کەوابێ ئەوان نایانەوێ ڕێک کەوین. دەیانەوێ تێکی دەن. ئەوە قسەی هەیئەتی دەوڵەت بوو. ئەمن پێم وایە ئەگەر ئەوان ئینساف بدەن، نە ئەوان ئەوتەهەوومیان لەسەر جمهوریی ئیسلامی هەبوو نە ئەمن هەمە. ئەمن قەت بوختانی وا بە جمهوریی ئیسلامی ناکەم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان نیازپاک بووە. حەتتەن ئەوان پتر لە منیش پێیان وایە. بەڵام ئیدی ئەوە سیاسەت نیە. لە سیاسەتدا هەموو ئەو شتانەی دەدڵتدان بۆ گوتن نابێ. یان دەگەڵ تەرەف دانانیشم یان ئەگەر دانیشتم ئیدی بۆیە دانانیشم کە پێی بڵێم ئەتۆ کۆنەپەرستی‌و ئەتۆ فلانو فیساری. ئەوە بە باوەڕی من کارێکی باش نەبوو.

• سەرەتای چالاکی‌یەکانی کۆمەڵە لە کوردستان بە هێرشی تەبلیغاتی بۆ سەر حیزبی دێموکرات دەستی پێ کرد. هۆ، یان هۆیەکانی ئەو هێرشە تەبلیغاتی‌یە چی بوو؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن نازانم ئەو تاریخەی پێشی کە کۆمەڵە باسی دەکا چی بووە. لەو ماوەیەش‌دا کە فەعالییەتی هەبوو، چ ئەو وەختە کە گرووپی پەرشو بڵاو بوون چ دوایە کە بوون بە یەک سازمان، لە ڕاستی‌دا ئەمن بەرنامەکەیانم نەدیوە بەڵام لە نووسراوەکانیان دەردەکەوت کە ئەوان بۆ تێک‌شکاندنی "دەسەڵاتو نۆتۆریتەی بۆرژوازیی کورد" پێک هاتوون. بۆرژوازیی کوردیش هەر حیزبی دێموکرات بوو. بۆ خۆیان وایان دانابوو کە ئەوان نوێنەری کرێکارانو حیزبیش نوێنەری بۆرژوازی‌یە. ئێستا خۆ کاریشیان بەوە

نەبوو ئەو ئیدیعایە چەند وایەو چەندە وا نییە. جارێکی لە سیسێرێ — دێیەک لە ناوچەی ڕەبەتێ کە بۆخۆم لەوێ لە دایک بووم — ئەمنو کاک حەسەنی ڕەنگگار چووبووین قسەمان بۆ خەڵکی کرد. مەقەڕی هەرە گەورەی کۆمەڵەش لە ناوچەی ڕەبەت لەو دێیەی هەڵکەوتبوو، پایەگای سەرەکی‌یان لەوێ بوو. ئەوانیش هاتبوون، لەوێ کردیانە کێشەو پرسیاری سەیروسەمەرەیان دەکرد بۆ ئەوەی بە فکری خۆیان ئێمە لەبەر چاوی خەڵکی بشکێنن. لە زیمنی قسەکاندا ئەمن گوتم بابە ئێوە بە ئێمە دەڵێن حیزبی وەزیرو وەکیلان یان حیزبی بۆرژوازی. خۆ ئەمن زۆربەتان ناناسم جا بەڕاستیش ئەمەوناسین. ئێمە وا دانیشتووین کە کەوتبووینە لای مێحرابێ. هەرچی کۆمەڵە بوون لەلای چەپ دانیشتبوونو حیزبی‌یەکانیش وەکوو پێشمەرگەو ئەندامانی ڕەسمی کەوتبوونە لای ڕاستە. خەڵکەکەی دیکەش وەکوو سەفی نوێژی لە ئێوەڕاستێ ڕووبەڕووی مێحرابێ دانیشتبوون. گوتم ئەوانە کۆمەڵەن ئەوانە دێموکڕاتنو ئەوانەش خەڵکن. گوتم وەرن لێیان بپرسین بزانین کوڕی کێن. با بزانین ئێمە کوڕی زەحمەتکێشانی شارو دێین یان ئێوە. پاشان پرسیارێکی دیکەشم لێ-کردن. گوتم خۆ ئێرە پایەگای بەقووەتتانە. ئەوەش خەڵکی ئێرە. ئەرێ خەڵکینە دێموکڕاتتان دەوێ یان کۆمەڵە؟ خەڵک ئێکڕا گوتیان دێموکڕات. ڕەنگە دەنگێک دوو دەنگ بۆ وان بووبێ، بەڵام ئیدی خەڵکیان دەگەڵ نەبوو.

ئێمە چووبووین شەوێ لەوێ بینو بەیانی بڕۆین. هەرچی کردمان نەیانهێشت بڕۆین. ئەو ڕۆژەش مایەوەو شەوی دووهەمیش لەوێ بووینو سەرمان لە هێندێک کەس‌دا کە دەمانناسین. دەچووینە هەر ماڵێک بە دەیان کەس لە خەڵکەکە بەدوامانەوە بوونو لە دەورمان بوون. جا مەبەستم ئەوەیە ئیدیعاکەیان هەر ئەوە بوو. بۆیە دایان-نابوو دەبێ سەقوەتی بۆرژوازی بشکێنن. شتی خراپیان دەکرد. مەسەلەن ئەمن بەچاوی خۆم نامەی کۆمەڵەم دیوە بە مۆرەوە لە ناوچەی باتێ کە گرتوویەتی ئەو دوو ماڵە دەیانەوێ ژنبەژنەی بکەن. ئیجازەیان بدەن با بیکەن. لەحاڵێک‌دا ئەوە ڕەسمێکی زۆر خراپی کوردەواری‌یە. دەکرێ بڵێم لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان هەبووە کە بەرەبەرە هەرهاتووە کەم بۆتەوە. بەپێشدا لەشارانو پاشان لە دێهاتیش کەمتر بۆتەوە. بەڵام کارێکی خراپە. ئێمە بەربەرەکانێمان دەگەڵ دەکرد. ئەوان بۆ ئەوەی سەقوەتی بۆرژوازی بشکێنن مۆرجەوویزیان سادر دەکرد. دەچی پێشی پێ‌دەگری دەبێ شەڕی دەگەڵ بکەی، پێشی پێ‌ناگری قانوونشکێنی دەکا. یان مەسەلەن جەنگەڵبڕین لە هەموو دنیایەدا کارێکی خراپە. ئێستا جمهووری ئیسلامی بە هەموو کۆنەپەرستی خۆیەوە وای کردوە جەنگەڵەکان ژیاونەوە کە بەداخەوە ئێمە لەوڵات نیین بیان بینین. کۆمەڵە دەی‌گوت بڕۆن بی‌بڕن خۆ ملکی حیزبی دێموکڕات نیە ملکی خۆتانە. کوڕە بابە ملکی خۆتانە مانای نیە، ئەوە نابێ ببڕدرێ. ئەوە ملکی فەرد نیە، ملکی گشتی‌یەو بۆ هەموو کەسە. بەڵام چونکی حیزبی دێموکڕات دەی-

گوت نابێ جەنگەڵی بیبڕن ئەو دەچوو هانی دەدان بی‌بڕن. یانی وەک ئەوەی بۆ موخالەفەت دەگەڵ حیزبی دێموکڕاتی کوردستان دروست بووبن. بەداخەوە ئەوە شتێکی خراپ بوو کە ناکامی زیانباریشی لێ کەوتەوە.

* هەڵوێستە سەرەتاییەکانی حیزب بەرامبەر بە کۆمەڵەو تەبلیغاتەکانی چی بوون؟ دەکرێ نموونە باس بکەی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** وەکوو موشەخەس کە بڵێم فڵان ڕۆژە ئەوەمان گوتو ئەوەمان کرد بەداخەوە- هەر لە هەولێرەوە سەرزەنشی خۆم کرد- هیچم ڕانەگرتوە. ئاوام لەبیر نیە. بەڵام لەبیرمە کە حیزب باوەڕی بەوەی هەبوو کە ئەوانیش سازمانێکن و حەقی خۆیانە تێکۆشانی سیاسی‌یان هەبێ. بەڵام دوکتور قاسملوو زۆر جار لە دانیشتن دەگەڵ ڕاپەر دەگەڵ خەڵکی دیکەشدا دەی‌گوت بابە نموونە دێنینەوە بەدەور دوکانی میوە فرۆشی. هەموو دوکانداردکان حەقی خۆیانە هاوار بکەن وەرە پرتەقاڵی ناودار، وەرە بۆ سێوە لاسووری یان هەرچی پێ‌یان خۆشە. حەقی خۆیەتی تەبلیغ بۆ شتەکانی خۆی بکا. بەڵام حەقی نیە بەخەڵکی بڵێ شت لەو دوکانەی مەکڕن چونکی پرتەقاڵەکانی ڕزیون یان سەرما بردوونی، سێوەکانی تاڵن و شتی وا. بۆ ئەوەی ئەو فەزایە نەشێوێ با ئێمە تەبلیغاتەکەمان لە جیاتی هێرش بۆ سەر یەکتر، بە قازانجی خۆمان بێ. هەرکەسە تەبلیغ بۆ بیروباوەڕی خۆی بکا. دیارە ئەوان نە حوزووری قبووڵیان دەکردو نە عەمەلی، زیاتری تەکیەی وان لەسەر ئەوە بوو کە دەبێ بچن لە زیدی حیزبی دێموکڕات قسە بکەن. دەچوونە مزگەوتان قسەیان دەکرد، قسەکانیان بەشێکی زۆری لە دژی حیزبی دێموکرات بوو.

تەنانەت هێندێک شتی دیکەیان تیئۆریزەش کرد. ئەمن هیوادارم مابێتم جزوویەکم دیوە کە بڵاویان کردبۆوە کە تێی‌دا دەڵێن ئەوە کە جمهوریی ئیسلامی بەسەر مەنتەقەیەک‌دا حاکم بێ یان حیزبی دێموکڕات، لە ئەساسدا فەرقێکی نیە. یان مەسەلەن دەڵێن ئەگەر ئێمە بۆ تێکشکاندنی سەرەڕۆیی حیزبی دێموکڕات ناوچەیەکیشمان بکەوێتە دەستی جمهوریی ئیسلامی موهیم نیە. چونکە ئەوەی لە نیهایەتدا دەبێ دیفاع لەو خاکەی بکا حیزبی دێموکڕات نیە، بەڵکوو کۆمەڵەیە. کەوابێ ئێمە دوایە لە فورسەتی موناسیبدا مشووری هێزەکانی جمهوریی ئیسلامی دەخۆین. کەوابوو ئێوە دەبێ کارتان ئەوە بێ کە دەسەڵاتو جەبەڕووتی حیزبی دێموکڕات تێک بشکێنن. حەتتا لە جێیەکی دیکەدا شتێک هەبوو کە زۆر لەوەش خراپتر بوو. دەڵێ ئەگەر پێشمەرگەی ئێمە تاقە یەک فیشەکی پێ بێتن، لایەکی جمهوریی ئیسلامی بێ و لایەکەی دیکەی حیزبی دێموکڕات، دەبێ ئەو فیشەکەی بە حیزبی دێموکڕاتەوە بنێ. یانی بەو ڕادەیە لە هەڵوێستی توند.

بەڵام حیزبی دێموکڕات بە هیچ‌جۆر کۆمەڵەی بەو چاوە تەماشا نەدەکرد. بە هیچ‌جۆر لایەنگری ئەوە نەبوو فەزای سیاسیی کوردستان ئەوەندە ئاڵۆز بێ کە لە نێوان ئەو هێزانەدا ببێتە شەڕ. ئەمن ناڵێم ئەوان دەیانەویست ئەو شەڕە بکەن. بەڵام ئەوان زەمینەی شەڕەکەیان ئامادە دەکرد. باشە ئەتۆ دەچی لە دێیەک تەبلیغات

دەکەی، بۆ هێرش دەبیە سەر حیزبێکی دیکە، جا هەر حیزبێک بێ؟ دەبێ تەبلیغی خۆت بکە. بەڵێ ئەوان زەمینەکەیان بۆ ساز کرد.

**هێلیس کاردۆ:** بەو دواییانە کتێبێکی کاک برایمی عەلیزادە چاپ بووە کە من خوێندوومەتەوە. کاک برایم لەو کتێبەیدا دەڵێ لە کۆنگرەی دوودا واتە ساڵێک دوای سەرکەوتنی شۆڕش بڕیارنامەیەکمان تەسویب کرد کە حیزبی دێموکرات بە حیزبێکی بۆرژوایی دەناسین و بەحەقی خۆمانی دەزانین خەباتی بەدژ بکەین. بەڵام ئەو بڕیارنامەیەمان بڵاو نەکردەوە تەنیا لە چوارچێوەی ئەندامانی خۆماندا مایەوە بۆ ئەوەی فەزاکە نەشێوێ. بەڵام لەڕاستیدا وا دەردەکەوێ لەو وەختەوە کاریان بۆ کردبێ.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** عەرزم کردی ئەمن بڕیارنامەکەم نەدیوە. بەڵام خۆ ئەوەیان نەشاردەوە کە ئەوە بۆرژوازیی کوردە. تەنانەت دوایە سێ چوکڵەیەکیان دروست کرد. جمهووریی ئیسلامی نمایەندەی بۆرژوازیی ئێرانییە. حیزبی دێموکرات نمایەندەی بۆرژوازیی کوردە. کۆمەڵەش نوێنەری پرۆلیتاریای کوردە. ئێستا پرۆلیتاریا بەو مانا عیلمییە کە دەڵێن بە کرێکاری سەنعەتی دەگوترێ نەک پێشمەرگەشان داخوا لە کوردستان هەبوو یان نا ئەوە شتێکی دیکەیە. چونکە ئەوانەی سەریان لەو باسانە دەردەچوو شکیان هەبوو کە ئەو کرێکارە سەنعەتییە لە کوردستان هەبێ. بەڵام ئەوان دایاننابوو دەبێ ببێ. نەشبێ دروستی دەکەن. دەبێ بۆرژوازیی کوردیش هەبێ و پرۆلیتاریای کوردیش هەبێ. دیارە هەرکام لەوانەش نوێنەری خۆیان بۆ دانرابوو کە حیزبی دێموکرات نێ بۆرژوازییەو کۆمەڵەش نێ پرۆلیتاریایە.

* یەکەم تێکهەڵچوونی چەکداری لە نێوان پێشمەرگەکانی حیزب و کۆمەڵەدا کەی و لەکوێ ڕووی دا؟ تکایە هۆیەکانی باس بکە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیسان بەداخەوە زۆر بە تەفسیلم لەبیر نییە. بەڵام ئەوەی ئەمن لەبیرم بێ یەکەم لێکدانی چەکدارانە کە لە بەینی کۆمەڵەو دێموکراتـــدا ڕووی دا لە ناوچەی سەردەشتـــێ لە کۆتایی-یەکانی هاوین یان سەرەتاکانی پاییزی ١٣٥٨دا بوو. ئەوێ دوو دەستە پێشمەرگەی ئەمو ئەوان تووشی یەکتر دەبن، یەکتر دەنگ دەدەن. ئەوانەی ئێمە دەڵێن دێموکراتین. کەچی ئەوان لەبەر ئەوەی باوەڕ ناکەن یان هەرچی دی، لێیان دەدەن. لەوان بە خۆشییەوە کەس نەکوژرا. بەڵام ئێمە کادرێکمان بە ناوی "فەتێ عەلی ڕەسووڵی نالی" خەڵکی "ئێوچوان"ێ شەهید بوو. ئەوە یەکەم دەرگیریی چەکدارانەی نێوانمان بوو کە شەڕەکە بۆ ماوەیەک درێژەی کێشا. دیارە هەڤاڵانی ئێمە هەرلەوێ زانیبوویان کە ئەوان کۆمەڵەن و ئەوانیش زانیبوویان ئەوانەی دیکە دێموکراتن بەڵام تازە لێیان دابوون.

* هەروەک دیتمان دواتریش هەرجارێ لە ناوچەیەک تێکهەڵچوونی چەکداری ڕووی دەدا بەڵام زوو پێشی پێدەگیرا. هۆی چی بوو نەتوانرا مەحکەمکارییەکی وا بکرێ کە دوولایەن بە هیچجۆر بیر لە شەڕی چەکداری بەدژی یەک نەکەنەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** مەسەلە ئەوەیە هەرکات دادەنیشتین هەردووک لا دەمانگوت ئەو شەڕە خراپە. بەڵام ئێمە دەمانگوت دەبێ زەمینەی شەڕهەڵایسانەکەش لەبەین بەرین. دەنا ئەتۆ پێترینی لەوێ ڕۆکەو شەمچەش لێدە بۆ ئاور ناگرێ؟ دەبێ وا بکەین ئەو زەمینەسازییە نەمێنێ. ئەوان دەستبەردار نەبوون لەوەی کە شتی ئاوا بکەن یانی زەمینەکەی ساز کەن. جگە لەوە شتێکی دیکەش دەکۆمەڵەدا خراپ بوو. ئەگەر لە جێ-یەک تێکهەڵچوونێک دە بەینی پێشمەرگەی ئێمەو ئەواندا دەبوو ، نەک هەر لەوێ کۆسەگیان نەدەکرد خاتیمەی پێ، بەڵکوو لەو جێگایانەش کە بێخەبەر بوون دەستیان بەگرتنی خەڵکی ئێمە دەکرد. بارمتەیان دەگرت، دەگەڵ هەموو ئیدیعاکانیان، ئەمن ئەوکاتیشو ئێستاش هەر پێموایە ئەوان لە بەرابەر حیزبی دێمۆکراتدا خۆیان بە زەعیف دەدیت. چونکە بە هەرحاڵ حیزب لەباری پێشمەرگەوە لە هەر بارێکەوە کە بیگری بەهێزتر بوو. بۆیە ئەویان دەکرد هەتا بەو جۆرە بێدەسەڵاتیی خۆیان جوبران بکەنەوە. لەحاڵێکدا حیزبی دێمۆکرات ئەو کارەی نەدەکرد. ئەمن لەبیرمە جارێکی شەڕ لە مەنتەقەی بۆکانو مەهابادێ دروست ببوو. ئێمە لە "ڕۆژئاوای دۆڵەتوو" لە ناوچەی سەردەشتێ بووین. پێشمەرگەی ئێمە دوو کەسیان لێ گرتبوونو هێنابوونیان. گوتم ئەوانە چین؟ گوتیان کۆمەڵەن گرتوومانن. شەوێ لەلای خۆمان ڕامانگرتنو گوتم خزمەتیشیان بکەن. بەیانی گوتم بیانبەنەوە هەتا ئەو جێگایەی بۆخۆیان دەڵێن بەسەر ئیدی ئەمنییەتمان هەیە. بەڵام ئەوان درێغیان پێ نەدەکرد. نەک هەر پێشمەرگە، لایەنگرانی حیزبیشیان بە بارمتە دەگرتن. جگە لەوە بێڕەحمیی سەیروسەمەرەشیان دەگەڵ ئەوانە دەنواند کە لە شەڕدا دەیانگرتن یان وەدەستیان دەکەوتن. ئەوە هەمووی زەمینەی لێکدڕدۆنگبوونی زیاتر ساز دەکردو بوونی متمانە بە یەکتری لاوازتر دەکرد.

* کۆمەڵە بۆ کەوتە داوی "سەهەند"ییەکانو داخوا دامەزرانی "حیزبی کۆمۆنیستی ئێران" چ زیانێکی بۆ بزووتنەوەی کوردستانو حیزبی دێمۆکرات هەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نە ئەمنو نە حیزبی دێمۆکرات پێشتر ئاگادار نەبووین. ئەوە حەقی خۆیان بوو بڕیارێکی ئاوا بدەن، چاک یان خراپ بەخۆیان مەربووتەو پێویست نیە ئێمە قسەی لەسەر بکەین. بەڵام ئێستا ئیدی بۆ بەشێکی ئەساسی لە کۆمەڵەی، ڕەنگە بۆ بەشی زیاتری کۆمەڵەی دەرکەوتوە کە ئەوە کارێکی باش نەبووە. خەڵکی کوردستانیش پێشوازییان لەوە نەکرد. تەنانەت جارێکی لە "گەلاڵێ" کە تازە ببوون بەیەک موناقەشەیەکمان دەگەڵیان هەبوو، دەیانگوت ئێمە مەوقعییەتی تایبەتیمان لەنێو حیزبی کۆمۆنیستدا

هەیە. ئێمە کۆنگرەی خۆمان دەگرین. کۆمیتە ناوەندیی خۆمان هەیە. ئەگەر پێویست بێ دەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی موزاکەرە بکەین، حەقی موزاکەرەمان هەیە. گوتم دەزانن بۆ ئەوحەقەتان هەیە؟ گوتیان بۆ؟ گوتم دەلیلەکەی ئەوەیە کە حیزبی کۆمۆنیست کۆمەڵەی لێدەرکەی یانی ١٠، ١٥ کەس. با ئەوان بە هەموو ئێرانی بەقەت ئێوەی ئێوەیان هەبێ، بزانم ئەو ئیجازەیەتان پێ دەدەن؟ کەوابێ ئەوە باش نەبوو. بۆ ئێمەش هیچ موهیم نەبوو. حەقی خۆیان بوو. هیچ دەخالەتێکیشمان تێدا نەکرد.

**عەبباس کاردۆ:** یانی هیچ حەساسییەتتان نیشان نەدا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا. هەرچەند ڕەنگە ئەوە کۆمەڵگی کردبێ کە ڕووحی کوردستانی گەری دژی ڕێزەکانی کۆمەڵەدا لاواز بێ ، یان موخالەفەت دەگەڵ حیزبی دێمۆکرات زیاد بکا. بەڵام ئەوە سەربەخۆیان بوو. ئەوە کارێک نەبوو حیزبی دێمۆکرات بیەوێ قسەی تێدا بکا. قسەشی تێدا نەکردوە.

**عەبباس کاردۆ:** یانی ئێوە نە بە تەئیید نە بە مەحکووم‌کردن هیچ ئیعلامییەتتان بڵاو نەکردوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هیچ هیچ. دیارە لە وەختی شەڕەکاندا خەڵکی تەعنەی لێدەدان. ئەمن لەبیرم نیە، بەڕاستی لەبیرم نیە، ڕەنگە نووسەرێکی ئێمەش شتێکی وای نووسیبێ کە حیزبی کۆمۆنیستی بەناوی ئەو جێگایە کردبێ کە کۆنگرەکەیانی لێ گیرا. مووچەیەک بوو لە ناوچەی ئالانی سەردەشت بەناوی "مێشکەیە". خەڵک بە تەعنە پێیان دەگوتن حیزبی کۆمۆنیستی مێشکەیە. بەو مانایە کە ئەوە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران نیە. بەڵام ئەوە بەهەر حاڵ دەوەختی شەڕدا باس دەکرێ. لە وەختێک‌دا کە مەنتیقی سەلیم حوکم دەکا حیزبێکی سیاسی چ حەقی هەیە شتی وا بڵێ. یانی بڵێ ئەو حیزبە بۆ ئاوا دەکا، بۆ ئەوەی هەڵدەبژێرێ و بۆ ئەوەی هەڵنابژێرێ. ئەوە حەقی حیزبی دێمۆکرات نەبوو.

* لایەنە سیاسییەکانی کوردستان چ هەڵوێستێکیان بەرامبەر بە دامەزرانی حیزبی کۆمۆنیست هەبوو؟ خەڵک چۆنیان پێشوازی لێ کرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەی دەبێ لە خۆیان بپرسی. بەڵام ئەوەی ئەمن دیتم دوای دروستبوونی حیزبی کۆمۆنیست لە کوردستان ئەگەر لایەنگریان کەمتر نەبووبێتەوە، زیاتر نەبووە. یانی تەشکیلی حیزبی کۆمۆنیست هاندەرێک نەبوو بۆ خەڵکی. دەبوو دێیشدا ئەوەی بڵێم کە کۆمەڵە بەتایبەت لە سەرەتاکانیدا زیاتر حیزبێکی ڕووناکبیری بوو. لە قوتابیان و خوێندەواران و لاوان پێک هاتبوو. ڕەنگە هێندێک جەواتیان جەزب کردبێ بەڵام ئەگەر باسی کۆمەڵانی خەڵک بکەین پێموایە حەتمەن بە تەشکیلی حیزبی کۆمۆنیست پتریان

لە دەور کۆ نەبوونەوە ئەگەر لێی نەدەکابنەوە. چونکی خەلک زیاتر مەسایلی کوردستانیان بۆ مەترەح بوو هەتا مەسایلی کۆمۆنیستی و مارکسیستی و ئەوانە.

* مامۆستا وەکی باس دەکرا کۆمەلە لە ناوچەکانی خوارووی رۆژهەلاتی کوردستان، یانی لە سەقز بەرەوخوار نفووزی زیاتری هەبوو؟ بەتایبەت ئەوەی باس دەکرا لە نێو خوێندەواران و رووناکبیراندا باشتر وەردەگیرا. جەنابت ئەوەت قبووڵە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** سازمانی ئەقەلییەت لە هەموو جێگایەک هەر وایە فەعالترە. ئەوان ئەقەلییەت بوون، لەعەینی کاتدا وەکی گوتم سازمانێکی رووناکبیری بوون، سازمانێکی جەوانان بوون، یانی زیاتر جەوانیان دەگەڵ بوون. خەلکی دیکەشیان دیارە دەگەڵ بوو بەڵام ئەوانە زیاتر دایک و بابو کەس و کاری پێشمەرگەکانیان بوون. لەبەر ئەوە وەکوو فەعالییەت، فەعالییەتیان زیاتر بوو. ئەگەر دەکەوتە قاوەقیژی خەیابانی، چونکی ئەوان هەڵسووڕتر بوون وا دەهاتە بەرچاو. بەڵام کە کەوتینە ئەو وەختەی خەلک دەبێ لە ئارامیشدا رەئی بدەن وا دەرنەکەوت. لە هەڵبژاردندا لە شاری سنە، کاندیداکانی ئێمە زۆر لەپێشتر بوون لە کاندیدای ئەوان. دیارە رژیم تێکیدا بەڵام ئەو دەنگانەی بژێردران ئی ئێمە زۆر لەپێشتر بوون. مەسەلەن لە سەقز نوێنەری ئێمە هەڵبژێرا، لەحاڵێکدا نوێنەری ئەوان کە ئەو وەخت زۆریش مەحبووب بوو، هەڵنەبژێرا. نوێنەری وان دوکتۆر شاکری بوو کە کەسێکی خۆشەویست بوو و خزمەتی زۆر بەخەلک کردبوو. نوێنەری ئێمە کاک فاروقی کەیخوسرەوی بوو کە پیاوێکی خوێندەوار و فازیلە. بەڵام باسی ئەوەی دەکەم لەپێش چاوی خەلکی چۆن بوو. لەباری تەبەقاتییەوە کاک فاروق کوڕە ئاغا بوو، لەباری بیروباوەڕیشەوە بە کۆمۆنیست و تودەیی دەناسرا کە خەلک کۆمۆنیستیشی خۆش نەدەویست. بەوحاڵەش نوێنەری ئێمە هەڵبژێرا نوێنەری ئەوان هەڵنەبژێرا. ئەمە نیشانەی ئەوەیە شتەکە وا نەبووە. تەنیا لە مەریوان کە هەڵبژاردن لەوێش تێکچووە، کاندیدی وان بە چەند سەت دەنگێک لەپێش کاندیدی ئەوە بوو. ئەویش بەو جۆرەی ئەو وەختی باسیان کرد ئێستا چاکم لەبیر نیە، خەلکی ناوچەیەکی بەربەرینی دێهاتی کە کۆمیتەی مە پێی وا بوو لایەنگرانی ئێمە لەوێ پتر بوون دەنگەکانیان نەخوێندرانەوە چونکە تێکچوو. تەنیا لەوێ ئاوا بوو. ئێستا ئەمن موناقەشەی ئەوە ناکەم کە رەنگ بوو دوایەش هەر دەنگی وان زیاتر بایە. بەڵام تەنیا لە یەک شاری کاندیدی کۆمەڵەی لەپێش کاندیدی حیزبی دێمۆکراتەوە بووە. دەنا لە هیچ جێگایەکی دیکە نەبووە.

**هێمایی کاردۆ:** باشە ئەوە زووتر بوو مامۆستا. هەڵبژاردن ساڵی ٥٨ی بوو. ئەوان باسی دواتر دەکەن. ئەو دەمی بەتایبەتی شەڕەکان دەستیان پێ کردو بوو بەسەراسەری. وا باس دەکرا کە ئەوان لەو ناوچانە دەستی باڵایان هەبووە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو وەختیش کە شەڕەکە دەستی پێ کرد دیارە شەڕەکە بە هەموو حاڵەتان هەر خراپە. ئێمە هەر خراپە، ئەوان هەر خراپە. بەڵام ئەو وەختیش ئەگەر وای دابنێین مەسەلەن لە سنەی هەروا بە تەخمین دای بنێین ئەوان ١٥٠ پێشمەرگەیان بووە، ئێمە ٥٠٠ پێشمەرگەمان بووە. نازانم ئەوە دەجێی دا خۆی دەنوێنێ. میعیاری ئەساسی چییە بۆ ئەوەی؟ ئاخر ئێمە دەبێ هێندێک میعیار دابنێین. یەکێک لە موشکیلەکان ئەوە بوو کە ئەوان هیچ میعیارێکیان قبووڵ نەبوو. دەمان گوت وەرن تەماشای پێشمەرگەکان بکەین، دەیانگوت خۆ بە ژمارەی پێشمەرگە نییە، بە کەیفییەتە. دەمان گوت تەماشای ئینتیخابات بکەن. دەیانگوت ئینتیخابات کۆن بووە. حەتتا چەند ساڵ لەوە پێش دیسان ئەو باسەمان هەبوو. باسی ئەوەیان کرد کە ئینتیخابات ڕۆیشتوە بۆ باس ناێی. گوتم خۆ ئەمن ناڵێم ئەگەر هەڵبژاردن بکرێ هەمووەمان وەک ئەودەمی واین. بەڵام ئەتۆ بەچی ئیدیعا دەکەی کە ئەگەر گۆڕاوە بە قازانجی تۆ گۆڕاوە. ئەمن ئیدیعا ناکەم کە هەر بەقازانجی ئێمەیە. یان مەسەلەن دەیانگوت خەڵکی ئێستا زۆربەی خوێندەوارن. دەمگوت دەی باشە بۆ پێت وایە خەڵکی ئێمە هەر نەخوێندەوارن. ئێمە وەختێکی لەسەدا حەفتای (٧٠%) پێشمەرگەکانمان نەخوێندەوار بوون. ئێستا لەسەدا سێی (٣%) پێشمەرگەکانمان نەخوێندەوار نین. دەیانگوت زۆربەی خەڵکی ئێستا لەپاش ئینقیلاب لەدایک بوون. دەمگوت باشە وەرن چاو لە پێشمەرگەی ئێمە بکەن. خۆ هەمووی منداڵە. خۆ وا نییە ئەوەی هاتوە هەر بۆ تۆ هاتوە.

جا ئەو وەختی هێندێک شتی وایان دەگوت. تەنانەت جارێکی کە بۆخۆشم حازر بووم هێندێک شتی ناخۆشمان لەبەینیدا گوزەرا. گوتم وەرن بزانن کامەمان شەهیدمان پترە. برادەری کۆمەڵە گوتی پێشمەرگەی ئێوە شەڕی نازانن بۆیە شەهید دەبن. ئەمنیش درۆ ناکەم تەعنەیەکم لێدا. گوتم ڕاست دەکەی. چونکە پێشمەرگە ئەگەر شەڕی بزانێ ناچێتە جێگایەک گوللەی دوژمنی بگاتێ. نێ ئێمە دەچنە جێی ئاوا بۆیە زۆریان لێ شەهید دەبن. کە ئیعتیراف دەکەم ئەوە خەراپ بوو گوتم. بەڵام مەجبوور بووم بیڵێم. ئاخر ئەگەر بە شەڕکەر حیسابی بکەین بەڕاستی هەموو پێشمەرگەکانی وان. حیزبی دێموکرات پێشمەرگەی ئازای هەبوو. پێشمەرگەی وانیش ئازا بوون ئەمن ناڵێم ئازا نەبوون. بەڵام ژمارەی پێشمەرگەی ئێمە زۆر زیاتر بوو. تەنانەت جارێکی کە دیارە سەرەتاکان بوو کە دەعوایەکی لەفزی لە نێوان شەهید دوکتور قاسملوو و کاک عەبدوڵڵای موهتەدی دا ڕووی دابوو. ئەمن حوزووریم نەبوو. شەڕ لە بەینی میراوێ هەتا سەردەشتێ لەئارادا بوو. شەڕێکی قورسی لەسەر بوو. یانی بەینی ئێمەو دوژمن. ئەویش کاک دوکتور بە کاک عەوڵای دەڵێ ئەوێ کاک عەوڵا

ئێوە ٢٠٠ پێشمەرگەتان لە مەریوان هەیە بۆ پێیان ناڵێن شەڕ بکەن؟ دەڵێ ٢٠٠ پێشمەرگەی چی دوکتۆر خۆ ئێمە لە هەموو کوردستان ٢٠٠ پێشمەرگەمان نیە. دوکتۆر دەڵێ چی؟ ئیدی تازە قسەیەک بووە کراوە. دیارە ئەوە سەرەتاکان بوو، بەڵام دوایە ژمارەی پێشمەرگەیان زیادی کرد.

* پاش دامەزرانی حیزبی کۆمۆنیست پێوەندییەکانی دوو لایەن کەوتنە قۆناغێکی مەترسیدارو هەروەک دیتمان سەرئەنجام شەڕی سەرتاسەری حیزبو کۆمەڵەی لێ کەوتەوە. دەکرێ ئەوەشەمان وردتر بۆ شی کەیەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وا نیە لەبەر دروستبوونی حیزبی کۆمۆنیست بووبێ کە پێوەندیی ئێمە وای لێهات. چونکی بەتایبەتی سکرتێری حیزبی کۆمۆنیست کاک عەبدوڵڵای موهتەدی بوو. وەنەبێ بڵێی ئەوە کۆمۆنیستەکان هاتبوو زاڵ بوون. هەر لێرە شتێکم وەبیر هاتەوە با بۆت باس بکەم. جارێکی نازانم یان لەلای مەریوانێ بوو یان لای بۆکانێ کە لە بەینی پێشمەرگەکانی ئێمەو ئەواندا شەڕ ساز ببوو. قەرارمان دانا لە ماڵی مامۆستا مەلا شێخ عیززەدینی دانیشینو قسەی لێ بکەین بۆ ئەوەی ئەو ئاورە ڕاگرین. لای ئێمە کاک دوکتۆر قاسملوو و ئەمنو یەک دوو کەسی دیکەش بووین کە ئێستا ناوەکانیانم لەبیر نین. کە چووین کاک عەبدوڵڵا نەهاتبوو. هەیئەتەکەی وان تەوزیحی دا کە کاک عەولا سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستە، خۆ ناکرێ دەگەڵ سکرتێری حیزبێکی مەحەللی دانیشێ. یانی مەبەستم ئەوەیە خۆ عەناسیرێکی دیکە نەهاتبوونە ئێوەوە کە بڕیارەکە بگۆڕن.

بەڵام ئاڵۆزییەکە هەبوو. لێرەدا دەبێ بڵێم حیزبی دێمۆکڕاتیش ئیقدامێکی کرد. خودی ئیقدامەکە لەجێی خۆیدا خراپ نەبوو، بەڵام بەڕاستی خراپی ئیستیفادە لێ کرا. ئەویش ئەوە بوو هەتا ئەوکات لە زۆربەی ئەو حاڵەتانە کە ڕوویان دەدا خەتاکە نی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە بوو. حیزب بڕیارێکی دەرکرد کە ئەگەر جارێکی دیکە لە مەنتەقەیەکدا کە کۆمەڵە بەقووەتە شەڕ هەڵایسێنی، ئێمە لە هەموو جێگاکان لێیان دەدەین. ئەوە بوو بە شتێکی خراپ. بە باوەڕی من پێشمەرگەی ئێمە وەک بیانوو، بەهانەیەکیان دەست کەوتبوو کە کەمێک بێڕەحمی نیشان بدەن. مەسەلەن ڕووداوی هەورامان ڕووداوێکی وا بوو.

**هیوا کاردۆ:** مامۆستا داوای لێبووردن دەکەم. ڕووداوی هەورامان پێش شەڕی سەرتاسەری نەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر نەخێر. دوای ئەو ئیعلانەی بوو. ئێمە دوو شەڕمان هەبوون لە هەورامان. یەکیان ئێمە لەوانمان دا کە لە واقیعدا لەوێ شەڕ نەبوو. نی ئێمە لێیان داو بێڕەحمانەش لێیان دان زۆریان لێ کوژران. لە دوایە ئەوان حەملەیەکیان کردەوە کە تاکتیکەکەیان زۆر شتی خراپی تێدابوو. یانی هەر زۆر

خراپ. ئەوە لەلای خۆی چووینەتە نێویان و ڕێک کەوتووین و یەکیەتیی نیشتمانی هاتۆتە نێویان و ڕەمزی تەماسی شەواتەمان داناوە. جا بە کەڵک وەرگرتن لە هەمووی ئەوانەو بە دۆستایەتی حەملەیان کردو لێیان داین. لە هەمووشی خراپتر ئەوە بوو زۆریشیان شانازی پێوە دەکرد. ژمارەی شەهیدەکانی ئێمە لەو شەڕەدا ١٨ کەس بوو. ئەوان نیستاو ئێستاش لە ٣٩ کەس ئەهاتوونە خوارێ. پێیان وا بوو شانازییە زۆریان کوشتین، کە پێم وایێ نە بۆ ئێمەو نە بۆ ئەوان و نە بۆ هیچ هێزێکی کوردی ئیفتیخار نیە پتری لەوی دیکە کوشتبێ. ئەوە پێم وایە کارێکی خراپ بوو ئەوان کردیان. ئەو حەملەیەش کە پێشمەرگەکانی ئێمە لە هەورامان کردیانە سەر ئەوان هەر لە چوارچێوەی ئەو شەڕە سەرتاسەرییەدا بوو کە حیزب ئیعلانی کردبوو و لەڕاستیدا دەفتەری سیاسی نە لە دوورو نە لە نیزیک بە هیچ جۆر ئاگای لێ نەبوو.

ئەمن لەو بارەیەوە ئەو وەختیش زۆر شتم دەگوت. ئەو وەختی لە نێو حیزبدا دەمگوتن بەڵام ئێستا پێم خۆشە وەک ڕوونکردنەوەی مێژوویی باسیان بکەم. مەسەلەن لەو شتانە کە ئەمن پێم خراپ بوون کە دەکەوتینە موزاکەراتی ئاشتی و ئەوە شتی سەیرمان دەگوتن، بۆ نموونە شەرتێکمان دانابوو کە کۆمەڵە دەبێ حیزبی دێمۆکرات بە شۆڕشگێڕ بناسێ. وەختی خۆی زۆرم کێشە لەسەر کرد کە بابە ئەوە یانی چی؟ ئەوەڵەن عەیب نیە حیزبی دێمۆکرات شۆڕشگێڕبوونو مەشروعییەتی خۆی لە کۆمەڵە وەرگرێ؟ دەبێ ئەو پێت بڵێ شۆڕشگێڕ هەتا خۆت بە شۆڕشگێڕ بزانی؟ لەپاشان چۆن دەکرێ ئەتۆ بە کابرای بڵێی دەبێ بە شۆڕشگێڕم بناسی. ئەتۆ دەبێ داوای لێ بکەی کە پێویستە پێوەندی‌یەکانمان لەسەر ئەو ئەساسە دامەزرێنین. شووڕەوی قەت داوای لە ئەمریکا کرد بە سۆسیالیستو شۆڕشگێڕی بناسێ؟ یان ئەمریکا داوای لە شووڕەوی کرد بە دێمۆکراتو ئینساندۆستی بناسێ؟ ئەتۆ پێوەندی لەسەر ئەساسێک کە بۆ هەردووک لا موناسیب بێ، دادەمەزرێنی. ئەمن پێم وایە حیزب لە هێندێ شتدا خراپ جوولایەوە. یانی ئەوە مەنتیقێک بوو کە کەس لە ئێمەی قەبووڵ نەدەکرد. دەنا لە مەجمووعی شتەکاندا بەبێ تەعەسسوب وا بیر دەکەمەوە کە حیزبی دێمۆکرات لەبنیڕا موخالیفی شەڕ بوو. هەرچی لە توانایدا بوو هەوڵی دەدا لە هەر شوێنێک تێکهەڵچوون دەبێ هەر لەو شوێنەی ئاورەکە بکوژێتەوەو بۆ جێگای دیکە تەشەنە نەکا. بەڵام ئەو بڕیارەی درا کە ئەگەر لە جێگایەک لێماندەن دەی کەینە سەرتاسەری، دواقیەدا بوو بە باعیسی ئەوەی لە لایەن بڕادەرانی ئەوەوە لە هەورامان وا تەفسیر بکرێ کە ئەو هێرشەی بکەن. ئەوە شتێکی باش نەبوو. لەپاشانیش ئەو لێکدانەوەیە کە شەرتی ئاشت بوونەوەو باشبوونی ڕەوابیتەکە ئەوەیە کە بە شۆڕشگێڕم بناسی، ئەمن ئێستاش هەر بەڕاستی زۆرم پێ خراپە. یانی بۆ حیزبی دێمۆکرات زۆر عەیب بوو.

**عەباس کاروخ:** باشە جگە لەوانە پێتوایە هەڵەی دیکەشتان هەبووە لەو پێوەندییەدا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ناتوانم هەموو شتێکم لەبیر بێ، بەڵام بێشک هەڵەمان بووە. مەسەلەن ڕەنگە پێشمەرگەی ئێمە هەڵەی کردبێ. بەتایبەت لە شتێکدا پێشمەرگەی ئەمە کە زۆرتریان ئازاو قارەمان بوون بەڵام بۆ بەحسو جەدەل زۆرجار پێشمەرگەکانی ئەوان خوێندەوارتر بوون، زیاتر وەختێکی تووشی جەدەل دەبوون هی ئێمە پەنایان بۆ زۆرو هەڕەشە دەبرد. تەنانەت مەشهوور بوو کە کوێخا سمایلێکمان هەبوو کە دوایە خۆی تەسلیم کردەوەو دەوڵەتی ئێران کوشتی، ئەوە دەگەڵ تەشکیلاتێکی کۆمەڵە دادەنیشێ دەڵێ وەرە بەحس بکەین. دەڵێ بەحسی چی بکەین؟ دوایە کابرای کۆمەڵەی دەڵێ بەحسێ دەگەڵ دەکەم بەشەرتێک تووڕە نەبی. ئەویش دەڵێ نا تووڕە نابم. دوای ماوەیەک کە باسەکە دەکەن کوێخا سمایل کە کۆلکەسەوادێکی زۆر کەمی هەبوو بەڵام پێشمەرگەکەی کۆمەڵە خوێندەوارتر بووە، باشاری ناکا. ئەو جار تووڕە دەبێ و دەڵێ وەڵڵاهی سەگباب زیاتری لەسەر بڕۆی هەر دووک چاوت دەردێنم. شتی ئاوا حەتمەن هەبووە. بەڵام ئەوە سیاسەتی مەرکەزیی ئێمە نەبوو. بەهیچ جۆر هەڵوێستی حیزب نەبوو. ڕەنگە بوو تەخەللوف هەبێ، بەڵام ئەوان سیاسەتە مەرکەزییەکەیان ڕاست ئەوە بوو. هەر ئەوەی لە کتێبەکەی کاک ئیبراهیمی عەلیزادەدایە کە لە کۆنگرەدا بڕیار دەدا ئەوە بۆرژوازییەو دەبێ موبارەزەی دەگەڵ بکرێ بەلگەیە. جا ئیدی لە ئیعلامییەو تەبلیغاتی ڕۆژانەیاندا بەردەوام دووپات دەبۆوە. هەر ئەوەی بۆم باس کردی بەپانەوە دەڵێ فەرق ناکا مەنتەقەیەک دە دەستی حیزبی دێموکراتدا بێ یان دە دەستی جمهووریی ئیسلامیدا. یانی لە باشترین حاڵەتدا ئەو دووانە وەک یەک حیساب دەکا. خراپترین حاڵەتەکەشی کە هەر دوێنێ دایەو بۆخۆم خوێندوومەتەوە دەڵێ موهیم نیە ئێمە ناوچەیەک لەدەست بدەین کە شەڕی حیزبی دێموکرات دەکەین. ئەگەر بکەوێتە دەستی دوژمنیش قەیدێ ناکا. یان ئەوەی دیکە کە دەڵێ ئەگەر فیشەکێکت پێ ماو لایەکت دێموکراتو لایەکەی دیکەت ڕژێم بوو، دەبێ بە دێموکراتیەوە بنێی. ئەوە دیارە لە سەرەوەڕا دیکتە دەکرێ. لەوەدا فەرقمان یەکجار زۆر بوو. لەحاڵێکدا ئێمە هەموو وەختێک، ئەگەر هەزار ئەوەندەی دیکەشمان ئیختیلاف دەگەڵ کۆمەڵە بووبێ، ئەومان هەزار جار تەرجیح داوە بەسەر جمهووریی ئیسلامیدا. قەت شتی وا لەحیزبی دێموکراتدا نەبووە کە بڵێین ئەو باشترە لە کۆمەڵەی.

**عەباس کاروخ:** هەم کۆمەڵە و هەم لایەنی دیکەش حیزبی دێموکراتیان بە پاوانخوازی تاوانبار دەکردو پێیان وابوو حیزب دەیەوێ حاکمی کوردستان بێ و ڕێگای تێکۆشانی ئەوان بگرێ. هەربۆیە دەیانگوت ئەو حیزبە شەڕی پەوان فرۆشترە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** حیزبی دێموکراتی کوردستان قەت پێی وا نەبووە کە دەبێ بە تەنیا حاکمی کوردستان بێ. هەمیشە پێی وا بووە کە حاکمی کوردستان، خەڵکی کوردستانن لە ڕێگای نوێنەرانیانەوە. ئەویش تەنیا لە هەڵبژاردنی ئازاددا دەکرێ کە خەڵک بتوانن نوێنەرانی خۆیان هەڵبژێرن. بەڵام دیارە هەموو حیزبێک بۆ ئەوە هەوڵ دەدا دەنگی زۆربەی خەڵک وەدەست بێنێ و حاکمییەت بکەوێتە دەستی خۆی. ئوسوولەن ئەگەر حیزبی سیاسی هەوڵ ئەدا دەسەڵاتی سیاسی وەدەست بکەوێ، ڕەنگە ڕێگای وێ کردبێ. جا دەسەڵاتی سیاسی لە سەتحی گشتیی وڵاتدا بێ یان لە ڕادەی ناوچەییەکدا فەرق ناکا. ئەوە هیچ گوناح نیە. بەڵام شتی وا نەبووە کە حیزبی دێموکرات کوردستان بە مڵکی خۆی بزانێ. هەمیشە کوردستانی بە مڵکی میللەت زانیوە.

مەسەلەن ئەگەر لەبیرت بێ ساڵێکی هەڵڵایەکی سەیر ساز بوو لەسەر شتێک. ئەویان کردە نیشانەی ئەوە کە حیزبی دێموکرات کوردستان لەپاوانی خۆی‌دا دەبینێ. خەبەر گەیشتبوو -ڕاستیش بوو- کە جمهووریی ئیسلامی بەسەدان و هەزاران دەست لیباسی لە ڕەنگی لیباسی پێشمەرگەی بەدروون داوە هەتا پیاوەکانی خۆی بە لیباسی پێشمەرگەوە بەملاولادا بگێڕێ بۆ ئەوەی خەڵکیان پێ بناسێ. حیزبی دێموکرات شتێکی دەرکرد بۆ ئەوەی دوژمن نەتوانێ لەوە ئیستیفادە بکا. ئەویش ئەوە بوو ئەگەر پێشمەرگەی گرووپەکان تووشی یەک بوون کارتی شناسایی پێشانی یەک بدەن. دەستووریشی بە هێزەکانی خۆی‌دا ئەگەر تووشی پێشمەرگەی لایەنەکانی دیکە بوون دەبێشدا بۆخۆیان کارتیان پێشان بدەن جا دوایە داوا لەوان بکەن. کردیانە هەڵڵایەک کە ئێمە حاکمییەتی بۆرژوازیمان قبووڵ نیە ئەوە دەیانەوێ خۆیان بکەنە حاکمی کوردستان. شتەکەش خۆ وا نەبوو. ئاخر نیشاندانی کارت بۆ حاکمییەتی کوردستانە؟ ئەوە نیە ئێمەش نیشانمان دەدا. شتێکی زۆر سروشتی بوو. لە ئایندەشدا ئەگەر شتێکی ئاوا بێ، هێزە سیاسی‌یەکان ئەگەر نەیانتوانی لە چوارچێوەیەکی هاوبەشدا یەک بگرن، دەبێ لەو ڕێگایانەوە هاوکاریی یەکتر بکەن. دوو گرووپ تووشی یەک دەبن ڕەنگە لە دۆڵێکی، لە شاخێکی ببێنەوە، ئاخر دەبێ لێکتر ئەمین بن. چونکە بەداخەوە دوژمن توانیویەتی لە نێو خەڵکی کوردستانیشدا بەشی خۆی دابین بکا. کەوابوو لەوانەیە ئەو گرووپەی دیکە ئەفرادی دوژمن بن.

**عەباس کاردۆ:** باشە مامۆستا پێت وا نیە ئیشکالەکە ئەوەدا بوو کە ئێوە هەر بۆخۆتان ئەو بڕیارەتان دەدا. بۆ بە هاوئاهەنگی دەگەڵ وان بڕیارێکی واتان نەدەدا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە فەزاکە ئەوە نەبووبێ. ئەمن بەش بەحاڵی خۆم لە گەڵاڵەکردنی ئەوەدا هەر لە دەفتەری سیاسی نەبووم. ئوسوولەن لە کوردستان نەبووم کە ئەوە دەرچوو. ئەمن ئەو ساڵەی لە فەڕانسە بووم. بەڵام ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە فەزاکە دۆستانە نەبووە کە هاوکاریی تێدا بکرێ. ئێستا ئەگەر هێزێکی

سیاسی حەتتا زۆر چووکەڵەش شتێکی ئاوا بڵێ بۆ دەبێ بەو چاوەی تەماشا بکرێ. ئەتۆ دەبێ ئەو شتەی موتالا بکەی کە هاتۆتە گۆڕێ. ئەگەر حیزبی دێمۆکرات گوتوویەتی هەموو کەس دەبێ کارتی شناسایی نیشان بدا غەیری پێشمەرگەی خۆمان، لەپێش هەمووانەدا ئەمن مەحکوومی دەکەم. بەڵام ئەگەر هەر لایەنێکی دیکە شتێکی ئاوا بێنێتە گۆڕێ پێموایە حیزبی دێمۆکرات دەبێ پێشوازیی لێبکا. مەسەلە ئەوە نیە کێ قسەکەی کردوە، مەسەلە ئەوەیە قسەکە چیە.

* هەرچەند وەبیر هێنانەوەی ئەو ڕووداوانە زۆر جەرگبڕە، بەڵام ئێمە باسی مێژوو دەکەین. داخوا هیچ ئامارێک لە ڕادەی شەهیدانی دوو لایەن لە ماوەی تێکهەڵچوونە چەکدارییەکاندا هەیە؟ دەکرێ قوڕلیی ئەو خەسارەتانە بە ژمارە دەربخەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن ناتوانم دەری‌خەم بەڵام کارەساتەکە زۆر سەنگین و زیانبارە. ڕەنگە ئەگەر بمانەوێ بێ کەین بکرێ چونکە ناوەکانیان لەلای هەر دووک لا هەن بەڵام بەو دەسودەستە ناکرێ. زۆرجار وا هەیە تەرەفێک لە نیشانداني خەسارەتدا موبالەغە لە خەسارەتی تەرەفی دیکەدا دەکا. مەسەلەن هەروەک گوتم ئێمە لە هەورامان ١٨ کەسمان شەهید بوون کۆمەڵە لە ٣٩ کەسی هەر ئەمەتە خوارێ. یان لە شەڕی جمهووری ئیسلامی‌دا حەتتا ئەگەر بە عەمدیش نەبووبێ ئاماری غەڵەت گوتراوە. مەسەلەن جەبهەیەکی پانو بەرین کوژراوی دوژمنی لێ کەوتوە. هەرکەس لە سەنگەری خۆیەوە چەند کەسێک دەژمێرێ. یەک پێنجان دەژمێرێ‌و ئەوی دیکە چواران دەژمێرێ، بەڵام دەبینی یەک دووبەیەک لەوانە هەر دووکیان ژماردوویانن. یانی موبالەغە دەکرا. بەڵام بە هەرحاڵ هەموو هێزێک خەساری خۆی دەزانێ. دەزانێ کێی شەهید بووە‌و کێی بریندار بووە. ئەگەر هەردووک لامان هەوڵ بدەین پێم وایە کارێکی زەحمەت نیە. بەڵام دەزانم لەهیچ لایەکیان کەمتر لەسەد کەس نیە. هەرلایەک بەتەنێ ڕەنگە زیاتر لە ١٠٠ کەسی لێ شەهید بووبێ. یانی بێجگە لە بریندارو خەسارەتی دیکە. لە هەمووی زیاتر ئەو خەسارەتە ڕەوانی‌و ڕووحی‌یەیە کە وێمان کەوتوە. ئەمن دەڵێم لە ئێمەشدا لەوانیش نەفرەت لەوەی شانازیی پێوە بکا. لە هەموو هێزێکی سیاسیی کورد، ئەمن دەڵێم نەفرەت لەوەی شانازی بە شەڕی براکوژی‌یەوە بکا.

* مامۆستا یەک پرسیار نازانم چۆنم وەڵام دەدەیەوە. ئەسڵەن مانای شەڕی براکوژی چیە؟ پاشان با بڵێین حیزبێک با لە کوردستانیش بێ، یان بە زمانی کوردی قسە بکا. بەڵام وەختێک بیروباوەڕەکەی چینایەتی‌یەو بە دژی ئامانج تەمەدانو بیروباوەڕی تۆ دەجووڵێتەوە، ئایا وەختێک شەڕ لە بەینی ئەو دووانەدا ڕوو دەدا ئەو شەڕە دەچێتە خانەی شەڕی براکوژی‌یەوە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** بەڵێ زۆرجار دەکەوێتە خانەی شەڕی براکوژییەوە. مەسەلەن دوو هێزی سیاسی لەو وڵاتەدا هەر دووکیان ئیدئۆلۆژیکین. یەکیان ئیسلامی‌یە، ئەوی دیکەیان کۆمۆنیستی‌یە. ئیدی ئەوانە تەواو دژی یەکن. یەکیان باوەڕی بە خودا هەیە، یەکیان باوەڕی پێی نیە. بەڵام ئەو وڵاتە ژێردەستی وڵاتێکی دیکەیە، لە حاڵی خەباتی ڕزگاریی نەتەوەیی‌دایە. ئەگەر ئەوانە لەسەر ئەوجۆرە فکرەی یەکتری بکوژن، شەڕی براکوژی‌یەو زۆر مەحکوومە. با موبارەزەی ئیدئۆلۆژی دەگەڵ یەک بکەن. بەڵام ئەگەر یەکێکیان هاودەستی دەگەڵ ڕێژیم دەکاو دەبێتە پیاوی ڕێژیم، ئیدی ئەوکات نابێتە شەڕی براکوژی. ئەمن دەزانم ئەوانەی دەگەڵ دەوڵەتی جمهووریی ئیسلامی یان دەوڵەتێکی دیکەی حاکم بەسەر کوردستاندا کەوتوون، زۆریان بە بیروباوەڕەوە نین. بۆ تەماحی دنیایە یان بۆ خۆگونجاندن دەچن چەکیان بۆ هەڵدەگرن. بەڵام بە هەرحاڵ دەسەفی دوژمن‌دان. کە کابرا لەسەفی دوژمن‌دایە، دەکوژرێ، شەڕی براکوژی نیە. بەڵام لەسەر ئەوەی بیروباوەڕی وەک من نیە بۆ دەبێ بی‌کوژم؟ با ئەو ئیختیلافە ئیدئۆلۆژیکی‌یە لە ڕێگای تەحلیلی سیاسی یان تەبلیغاتیی دیکەوە حەل بێ. کەوابوو شەڕی براکوژی شەڕی ئەوانەیە کە لە بیروباوەڕی سیاسی‌دا لێک جیاوازن بەڵام لە هێڵە گشتی‌یە نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌یەکاندا یەکن. ئەمن ناتوانم بڵێم پێموایە هیچ مونسیفێکیش ناتوانێ بڵێ کۆمەڵە مورتەدوویی جمهووریی ئیسلامی بووە. ئەویش ئەگەر لەخۆی نەگۆڕێ قەت ناتوانێ بڵێ حیزبی دێمۆکرات پیاوی جمهووریی ئیسلامی بووە. هیچمان ناتوانین ئەوەی بڵێین. بەڵام بیروباوەڕمان لێک جیا بووە، با ئەو جیاوازی‌یەی بەرینە لای خەڵکی. خەڵک کامەیانی هەڵبژارد با هەڵ‌بژێرێ.

وەختێک خەڵک چەکدارە ئەمن دەگەڵ ئەوەی نەبووم ئێوە قەتیش نابم کە ئێمە لە هەموو کۆبوونەوەو مەحفەلێک‌دا داگرێینە سەر سازمانێکی دیکەو تەبلیغی لەدژ بکەین. ئەمن بەشی بەحاڵی خۆم ئەوەی بە نیشانەی ئەوە دەزانم کە ئەو سازمانە قسەی بۆ گوتن نیە. بۆیە دەبێتە گیاکەڵە لە سەر پنجی گیایەکی دیکە دەڕوێ. دەنا بۆ وا دەکەی. قسەی خۆت هەیە بیکە با ئەو خەڵکە هەڵبژێرێ. بەڵام ئیدی دەستبۆچەک‌بردن لەسەر ئەوە لە هەموو حاڵەتێک‌دا بە مەحکووم دەزانم.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا شەڕی براکوژی لەسەر ئەساسی ئەوەیە کە دوو تەرەف یەک زمانن یا یەک نەتەوەن؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** نا ئەوە نیە. مەسەلە ئەوەیە ئێستا وای دانێ ئێمە کوردستانێکی ئازادمان هەیە. ئەگەر دوو هێز لەوێ‌دا ئیختیلافیان پێکەوە هەیەو شەڕ دەکەن ئەوە شەڕی براکوژی‌یە. بەڵام وڵاتێک هێرشی کردوە

دەیەوێ خاکەکەمان داگیر بکا، ئەتەوایەتی نیە نیشتمانیی‌یە. جەمعێک لە کوردە هاوزمانەکانمان دەچن دەگەڵ ڕێ دەکەون دەبنە جاسووس. کوشتنی ئەوانە قەت نایێتە شەڕی براکوژی.

**عەباس کاردۆ:** نا مەبەستم ئەوە نیە. دوو هێزی نیشتمانی یەکیان فارسە یەکیان کوردە. مەسەلەن حیزبی دیمۆکڕاتو موجاهیدین شەڕیان لێ پەیدا بێ. ئەوە شەڕی براکوژی‌یە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێموایە ئەوەش هەردەچێتە خانەی شەڕی براکوژی‌یەوە، بەڵام بەمانایەکی دیکە. ئێمە لە ئێراندا قەت شتی وامان نەدیوە کە هێزە کوردی‌یەکان دەگەڵ هێزە غەیرە کوردی‌یەکان شەڕیان هەبێ. یەک حادیسە هەبوو کە ئەویش جێگای داخ بوو. ئەوەی لە بۆکان لە بەینی پێشمەرگەکانی ئێمەو سازمانی پەیکاردا ڕووی دا کە ٣ کەس کوژران. ئەوە شتێکی جێگای داخ بوو کە نەدەبا بووبا. پاشان موجاهیدین بۆ دەکوژین. ئەوە نیە پێکەوە لە دژی دوژمنێکی هاوبەش خەبات دەکەین.

دیارە ئەگەر ئاوا تەماشا بکەی وەک نەتەوە بڕینی ئەوەی کە کوردو کورد پێکەوە بەشەڕ دێن، بەڕاتترە لەوەی کە مەسەلەن کوردو ئازەربایجانی پێکەوە بەشەڕ دێن. دەنا ئەو شەڕەی لە نەغەدەش کرا ئەویش هەر براکوژی بوو. هەرچەند لە ڕاستی‌دا هەر مەرحەلەی ئەووەڵی وا بوو. دەنا لە مەرحەلەی دووهەمی‌دا ئیدی بوو بەشەڕی کوردو کۆماری ئیسلامی، دیارە قۆناغی یەکەمیش دەستی دوژمنی هەر تێدا بوو. بەڵام لە هەرحاڵ‌دا شەڕی کوردو ئازەرییش هەر شەڕی برا کوژی‌یە.

* لەکاتێکدا هیچ لایەنێک ئەخۆی بە تاوانبار زانی‌و نە بە دانیشتن دەگەڵ لایەنی بەرامبەر گەیشتە ڕێککەوتنێک، هەردووک لا قبووڵی کۆتایی شەڕیان کرد. ئەوە چۆن بوو؟ وەڵامتان بۆ مێژوو چیە؟ چۆن وەڵامی خەڵکی کوردستان دەدەنەوە؟ خەڵک چۆن دەبێ بزانن کێ بەرپرسی ئەو هەموو زیانەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە ئەو شەڕانە هەر لە بنی‌ڕا ڕەنگە لە تەسەووری هەردووک لاماندا دەگەڵ تەفاوتی ڕەفتارەکە هەر خراپ بووبن. لەپاشان ئەو شەڕانە کە کۆتایی‌یان هات، دەلایلی عەمەلیی هەبوو. لە ئەووەڵەوە ڕێبەرایەتی‌یەکانمان لە وڵات چوونە دەرێ. پاشان وای لێ‌هات کە حوزووری پێشمەرگەش لەوێ‌دا کەم بوو. ئیحتمالی حاکمییەت لە منتەقەدا نەما کە ئەوانە هەمووی عامیل بوون. یەکێک لە عامیلەکان ئەوەیە وەختێک ئێمە هاتووینە پشتی سنوورەکانو لە خاکێک‌دا دەژین کە خاکی ئێمە نیە هەر چەند بە مانا گشتی‌یەکەی دەڵێن کوردستانە، یانی ئێمە لێرە میوانین. هەر لە باتینی خۆشماندا قبووڵمان کرد کە نابێ لەسەر خاکی خەڵکی دیکە لێکتر بکوژین‌و موشکیلات بۆ ئەوانیش دروست بکەین. لە هەمان

حاڵدا هێزە سیاسی‌یەکانی باشووری کوردستانیش پێیانوایە لێیان قبووڵ نەدەکردین. پاشان وای لێهات کە ئیدی مانایەک بۆ ئیدامەی ئەو شەڕە نەما. هەمووشمان نازارو برینەکەمان دەرک کرد و تێی گەیشتین.

بەڵام ئەوە کە چ بکەین، چۆن خەڵک بزانن کێ تاوانبارە، ئەمن پێم وایە ڕێگا ئەساسی‌یەکەی ئەوەیە کە ئەوەی خۆی بە بێ‌گوناحیش دەزانێ ئیعتیراف بە گوناح بکا. یانی بێ گوناحەکەش، چونکی ئەویش گوناحی هەیە ڕەنگە کەمتر بێ. ئەمن زۆرم پێ خۆشبوو بۆ نموونە دوێنێ (١/٦/٢٠١٠)ی زایینی لە کۆنگرەی یەکیەتی نیشتمانیی کوردستاندا کاک مەسعوود بارزانی جارێکی دیکە گوتی ئەمن داوای لێبووردن لە قوربانی‌یانی شەڕی براکوژی دەکەم. دەبێ وا بکەین جارێکی دیکە ئەوە تێکرار نەبێتەوە. ئەوە شتێکی زۆر باشە. دەنا ئەوی دیکە بە باوەڕی من کارێکی بێهوودەیەو زەرەری پترە لە قازانجی.

جارێکی لە سویدێ زۆر لەمێژە وا بزانم ساڵی ٩٨ یا ٩٩ بوو دەگەڵ کاک ئیبراهیمی عەلیزادە سێمینارێکی هاوبەشمان هەبوو. ئەمن سکرتێری حیزبی دێمۆکرات بووم ئەویش سکرتێری کۆمەڵە بوو. هەردووکمان قسەمان کرد کە دیارە کەسمان قسە کرد ڕەنگە هەر یەکەی ١٠ هەتا ٢٠ دەقیقەمان قسە کرد. بەڵام سێمینارەکەمان بۆیە دانابوو خەڵک پرسیار بکەن کە بۆ خەڵکەکەی زۆریش جالیب بوو. پرسیارێک کرا کە ئەگەر ئێوە ڕێک کەون ئامادەن بۆ خەڵکی تەوزیح بدەن لە شەڕی ئێوەدا چەند کەس کوژراوە چۆن کوژراوە خەتایەکە ئی کێ بووە. ئەمن گوتم نا. چ قازانجێک دەوێدا هەیە جارێکی دیکە تەرمەکان هەڵ‌پڕێنن کالبودشکافی‌یان بکەین هەتا بزانین چۆن کوژراون. بەوە جارێکی دیکە مەعرەکەکە دەست پێ دەکاتەوە. برینەکان جارێکی دیکە دەکولێنەوە. ئەوکارە بۆ بکەین. نەخێر یا قبووڵ بکەین ئەگەر لایەک کەمتریشی گوناح کردوە، دەگەڵ ئەوەی ئیختیلاف هەیە کام لا، بەڵام با قبووڵ بکەین هەردووک لامان تاوانبارین. هەر بەڕاستییش هەردوو لامان تاوانبارین. ئێستا ئەگەر تاوانەکە سەتی ٦٠ی بۆ ئەولاو سەتی ٤٠ی بۆ ئێمە بێ یان بەپێچەوانە، ئەوە لە گوناح بێ‌بەریمان ناکا. بەڵام هەڵدانەوەی لاپەڕەکان زۆرجار کێشەی دیکەی لێ ســاز دەبێتــەوە. چونکە هیچ لایەک وا بەهاسانی قبووڵ ناکا کە لەسەر خەتا بووە.

**عەباس کاردۆ:** بۆ هەتا ئێستا هیچ لایەکتان نە داوای لێبووردنتان کردوە نە قبووڵی ئەوەتان کردوە کە هەردوو لا خەتابارن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەڵڵا نازانم ئەمن کە ئێستا قسان دەکەم وەکوو خۆم قسە دەکەم وەک حیزبی دێمۆکراتی کوردستان قسە ناکەم. بەڵام هەر وەختێکی بە ناوی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانەوە قسەم کردوە لە غەیری ئەوجۆرە بۆچوونە بۆچوونێکی دیکەم نەبووە.

**عەباس کاروخ:** ئا، مەبەستم ئەوەیە بەیاننامەیەکی هاوبەش دەربکەن‌و هەردوو لا داوای لێبووردن لە خەلکی کوردستان بکەن؟

**عەبدوللا حەسەنزادە:** دیارە وا باشترە. لە ئایندەشدا باشە ئەو کارە هەر بکرێ ئەگەر زوو نەکراوە درەنگیش بێ هەر باشە بکرێ. بۆچوونی حیزبی دێمۆکرات غەیری ئەوە نەبووە. ڕەنگە بەو زمانە نەبووبێ کە ئێستێ ئەمن قسەی پێدەکەم، بەڵام ئەمن کە بۆخۆم قسەم کردبێ ئەو وەختیش هەروا بووە. ماوەیەکی زۆر، ئێستا ئەوە بوو بە تاریخ لەپاشانیش زانرابوو کە لە نێو ڕێبەرایەتیی حیزبدا ئەمن ئیختیلافێکم هەبوو لەسەر ئەوەی. ئەمن لە شەڕی بەینی ئەو دوو هێزەدا کۆمەڵە ئەو وەختیش‌و ئێستاش بەخەتابارتر دەزانم. چونکی پێم وایە ئاوری شەڕەکە ئەوان خۆشیان دەکردو زەمینەیان پێک دێنا. بەڵام لە زنجیرەیەکانی حیزب ناڕازی بووم. لە ئیعلانی شەڕی سەرتاسەری ناڕازی بووم. لەوە کە لەهێندێک ڕەفتارمان نەدەپرسیەوە ناڕازی بووم. ئەوە نەک لەبەر کۆمەڵەی بەڵکوو لەبەر خودی حیزب بوو. تەنانەت ئەمن لە کۆنگرەی حەوتدا بڕیارم دا مەسئوولییەت وەرنەگرم. دوکتور قاسملوو لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی مەرکەزی‌دا ڕاست بەو دەلیلە ئەمنی قانیع کرد کە دەبێ خۆم کاندید کەمەوە. گوتی خەلک دەزانن فلان‌کەس لەسەر ئەو شەڕەی دەگەڵ کۆمیتەی مەرکەزیی ئێمە ئیختیلافی نەزەری هەیە. ئەمن بۆخۆم قەتم نەبیستبووە دەرێ بەڵام خەبەرەکە بەداخەوە چووبووە دەرێ. گوتی ئەگەر ئێستێ فلان‌کەس نەیێتەوە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، دوو بەرداشتی لێدەکرێ. یان ئەوەیە کە حیزب بە ئیعتیراز بەو هەڵوێستو بۆچوونەی تەسفیەی کردوە. یان بۆخۆی بە ئیعتیراز بەوە کشاوەتەوە کە هەر دووکیشیان هەر خراپن. ئەویش نابێ شتێک بکا کە بە زیانی حیزبەکەی تەواو بێ.

ئەمن ئەوەم قبووڵ کرد لە کۆمیتەی مەرکەزی‌دا دوایە لە کۆنگرە خۆم کاندید کردو هەڵبژێرامەوە. بۆیە کۆمیتەی ناوەندی‌و دەفتەری سیاسی‌و تەنانەت بۆجێگری سکرتێریش هەر قبووڵم کرد. جێگریی سکرتێرشم وەلا نەنا هەر لەبەر ئەو مولاحەزەیە. لە دوایە پاش ساڵێکی پێموایە ئەمن لە جێگریی سکرتێری کشامەوە. یانی مەبەستم ئەوەیە کە ئەمن پێش ئەوەش نەزەرم وا بووە کە ئێمە لەو نێوەدا بێ‌خەتا نەبووین. نەک هەر وەک ڕەفتاری پێشمەرگەو هەڵوێستی فەرماندە، بەڵکوو وەک ڕێبەریش هەڵەمان هەبووە. بەڵام کێشەکانمان ئەو وەختی دەنێو حیزبدا بوون. بەداخەوە هێندێک شت بڵاو دەبنەوە ئیدی ئەوە بەدەست تۆ نیە. حەتتا ئەو وەختی ئیختیلافمان هەبوو لە نێو حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێراندا کە چۆن مەسەلەی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ حەل بکەین یان حەل نەکەین. ئەمن هەموو قسەکانم تەنیا دەنێو دەفتەری سیاسی‌و کۆمیتەی ناوەندی‌دا دەکردن. تەنانەت حەقم نەبوو لە نێو ئەندامانی حیزبی لە دەوروبەری بنکەی دەفتەری سیاسیش باسی بکەم. بەڵام بەوحاڵە ئەوە بڵاو ببۆوە. جارێکی دوو سێ کەس هاتبوون بۆ ئێوڕێوانی. قسەکانیان کردو ئەمنیش ئەوەی نەزەری حیزب بوو بۆم باس کردن‌و گوتم ناوایە. یەکێکیان کە ئەندامی

حیزبیش بوو گوتی نەزەری خۆت چیە؟ گوتم چی؟ نەزەری من چیە؟ نەزەری من دەگەڵ تۆ فەقەت نەزەری حیزبی دێمۆکراتی کوردستانە. ئەگەر نەزەرێکی دیکەم هەبێ دەگەڵ دەفتەری سیاسیو کۆمیتەی ناوەندی باسی دەکەم، بۆخۆم باوەڕم وا بووەو هەرواش جووڵاومەتەوە. بەڵام بەداخەوە بتەوێ و نەتەوێ هەموو کەس ئەوەندە قایم نیە شتەکان نەباتە دەرێ.

* لەنێو ڕێبەرایەتیی حیزبی دێمۆکراتی کوردستاندا کێ زیاتر لایەنگری کۆتایی هاتنی شەڕ بوو؟ ئەدی کەسانی لایەنگری درێژەدانی کێ بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەو بارەیەوە نامەوێ ناوی هیچ لایەکیان بەرم. دەکرێ بڵێم ڕەنگە تەفاوتمان لەسەر بۆچوونەکان هەبووبێ، دەنا هیچ کەسم پێ شک نایە لەنێو حیزبی دێمۆکراتدا باوەڕی بەوە بووبێ کە ئەو شەڕە باشەو دەبێ درێژەی هەبێ. بەڵام لە بۆچووندا وەختی شەڕەکان هێندێک شتی زیادەڕۆیی هەبوو. ئەودەمی موخالەفەتم کردووە ئێستاش دەڵێم هەمووومان خەتابارین. بەواتەوە کە موعتەدیل بووینو بەوانەرە کە توندڕەو بووین، ئێمەشو کۆمەڵەش.

**هەیاس کاردۆ:** هەر ئەتۆ بووی موخالیف بووی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نانا هەر ئەمن نەبووم. کەسی دیکەش هەبوو. بەڵام نامەوێ ناوی کەس بەرم. لەجیاتی خۆم قسان دەکەم، لەجیاتی کەس قسان ناکەم.

* لەبیرمە لە جەنگەی شەڕدا چەند لایەنێکی سیاسیو ماموٚستا شێخ عێززەددین حوسێنی هەوڵی نێوبژیوانی کردنیان دەدا. ئەوانە کێ بوونو چییان بەچی کرد؟ بۆ هەوڵەکانیان سەری نەگرت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** جوزوەیەکمان هەبوو پێم وایە ماوەمە. ئەگەر ئەتۆ نەتبێ پێمخۆشە بیبینی. جوزوەکە ئەو داستانەی تێدایە. بە باوەڕی من عامیلی دیکە هەبوون کە سەر نەکەوێ، بەڵام یەکێک لە گرینگترین عامیلەکانی سەرنەگرتنی ئەوە بوو کە ئەوانەی هاتبوون بۆ نێوبژیوانی بە ماموٚستاشەوە بەڕاستی بێتەرەف نەبوون. دیتنەوەیان گران نیە دەتوانم ناوەکانیان بدۆزمەوە. دیارە گوتیشم. دەرێشدا ئەو داوایەی حیزبی دێمۆکرات هاتە گۆڕێ کە دەبێ کۆمەڵە بە شۆڕشگێڕی بزانێ. ئەو وەختیم پێ شەرتێکی نادێمۆکراتیکو نامەنتیقی بوو، ئێستاشم هەر پێ نادێمۆکراتیکو نامەنتیقییە. بەڵام تا حەددێکی زۆر ئەوان بێلایەن نەبوون. کەسێکیش کە بیەوێ هەوڵی ئاوا بدا دەبێ بێلایەن بێ. ئەمن پێم وا نیە بێلایەنیش ئەوەیە کە هەر نابێ هیچ بڵێ. بەڵام لانیکەم پێویستە بەناحەق بەگژ لایەکدا نەچێ. پێم وایە ئەگەر ئەو جوزوەیەی مرووری کەیەوە تێدەگەی دەڵێم چی.

**عەباس کاردۆ:** ئێستا ناوەکانیانت لەبیر نییە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ناوەکانم چاک لەبیر نین. بەڵام پێموایە ئەمانە بوون: ماموستا شێخ عیززەددینی حوسێنی، سازمان کارگران انقلابی ایران "راه کارگر"، چریکە فیدایی‌یەکانی گەلی ئێران "اقلیت"، چریکە فیدایی‌یەکانی گەلی ئێران(ارتش رهائیبخش)، ڕێکخراوی چریکە فیدایی‌یەکانی گەلی ئێران‌و کۆمەڵەی یەکسانیی کوردستان.

**عەباس کاردۆ:** باشە بۆ ئەوانە هەموو دیفاعیان لە کۆمەڵە دەکرد؟ لەبەر چەپ‌بوونیان بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** جارێکیان برادەرێکی چریک هەبوو پێیان دەگوت "محمد عجم"،(ناوی خۆی بهزاد کریمی بوو) لە مەهاباد دەگەڵ ئێمە دانیشتبوو، زۆر بە سەراحەت گوتی ماموستا مەعلومە ئەگەر قەرار بێ لە بەینی ئێوەو کۆمەڵەدا یەکتان هەڵبژێرین، ئێمە کۆمەڵەی هەڵدەبژێرین. چونکی بەهەرحاڵ ئەوان چەپ‌و کۆمۆنیستن. جا بۆیە ئەوانە زۆربەیان لە سازمانە چەپەکان بوون. ماموستاش هەروەکی پێشتر باسمان کرد، هێندێکیان دەورە دابوو ئیدی نەیاندەهێشت قەت مێشکی ئازاد بێ. ئەویش ئیدی هەر هەڵوێستی ئەوانی دەگرت.

**عەباس کاردۆ:** کاک برایمی عەلیزادە پێی‌وایە یەکێتیی نیشتمانییش لە جەرەیانی ئەوسوودا ئێوەی بەخەتابار زانیوە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ئەوە حەقیقەتێکی تێدا هەیە کە لە جەرەیانی ئەوسوودا نوێنەری یەکێتی پێم‌وایە ناوی ماموستا برایم بوو، ئەویش ڕەئی‌یەکی وای هەبوو. ئاخر ئەمنیش لەوێ ڕەگەڵ کەوتم. گوتم پێموایە لەوێدا خەتایەکی مەی تێدا هەبوو. یانی لەوێ زیادەڕەوی کرابوو.

* ماموستا دەگەڕێمەوە سەرەتای دامەزرانی کۆمەڵەو دوو پرسیارت لێ دەکەم. تکایە ئەگەر زانیاریت لەسەریان هەیە وەڵامم بدەوە. پرسیارەکان ئەوانەن:

یەکەم ئەوکات باسی ئەوە دەکرا کە شەخسی مام جەلال‌و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەستیان لە دروست‌کردنی کۆمەڵە دا هەبووە. داخوا ئەوە ڕاست بوو؟ ئەگەر ڕاست بوو بۆ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** جا بۆ هەر لە سەرەتاوە باست نەدەکردن؟ ئەمن پێموایە حیزبێک بە دەستی خەڵکی دیکە دروست ناکرێ. بەڵام کۆمەگ دەتوانێ بکرێ. پێم وایە داستانەکە لەوێ‌ڕا دێ. ئێستا سەرفی ئەزەر لەوەی ئەو کۆمەڵەیە وەک کۆمەڵە کەنگێ دروست بووە. بەڵام لە وەختێک‌دا کە یەکێتی نیشتمانیی کوردستان دەستی بە بووژانەوە کردەوە دوای ساڵی ٧٥ و ئەوانە، بەشێک لەو کەسانەی دواتر کۆمەڵەی

ئێرانی‌یان دروست کرد هەر لەلای مامجەلالو یەکیەتیی نیشتمانی بوون. ژمارەیەکیان لەوێش نەبوون بەڵام کۆمەڵێکی کاریگەریان بەو وەختی یەکیەتیی نیشتمانی کرد. چونکە یەکیەتی لەباری تەداروکاتیو مالی-یەوە ئیحتیاجی بە کۆمەگ هەبوو. ئەوان لەو بارەیەوە کۆمەگیان کرد. مەسەلەن کاک سەلاحی موهتەدی ناوبەرم. کاک سەلاح ئێستاش کە زۆر لە یەکیەتیو شەخسی مام جەلالی نیزیکە، یەکێک بووە لەو کەسانە. ئەوە وەفایەکە بۆ ئەو کۆمەگانەی ئەو وەختی پێ‌یان کردوون. لەبەر ئەوە ڕابیتەیەکی دۆستانەیان دەگەڵ یەک هەبووە. دواتریش کە کۆمەڵە دروست بوو و لەوێش کۆمەڵەی ڕەنجدەران هەبوو، هەردووکیان مارکسیست بوون. پێوەندی‌یەکی دۆستانەیان پێکەوە هەبووە. ڕەنگە ئەوان پەیەکەوە گەرمتر بووبن لە ئێمەو ئەوان. بەڵام قەت پێمخۆش نیە ئەو تۆمەتە لە کەس بدەم وەک حیزبی سیاسیی نیشتمانپەروەر کە بڵێم یەکی دیکە دروستی کردوە. ئەگەر بۆخۆی زەمینەی هەبێ ڕەنگە یەکێک کۆمەگی بکا. بەڵام بۆخۆی زەمینەکەی تێدا نەبێ بە کەس دروست ناکرێ. ئەدی ئەگەر وایە کێ بردنی بۆ لای یەکیەتی؟ چونکە ئەوان هێندێکیان لەسەر سیاسەت قاچاغ بیوونو لەلای یەکیەتیی نیشتمانی دەژیان.

**هەیاس کاردۆ:** ئەو وەختی باسەکە وا بوو کە یەکیەتیی نیشتمانی بۆ بەرەنگاری دەگەڵ حیزبی دیمۆکرات ئەوەی کردوە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** یەکیەتیی نیشتمانی ماوەیەک ئیختیلافی دەگەڵ حیزب هەبوو بەڵام ئەو ماوەیە بەڕاستی کورت بوو. ماوەیەکی دوورودرێژ نەبوو. ئەوە دوو، سێ ساڵێکی خایاند.

**هەیاس کاردۆ:** ئاخر هەر ئەو ماوەیەش بوو کە کۆمەڵە دروست بوو.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** تا ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ دوای ساڵی ١٩٧٥. لەحاڵێکدا کۆمەڵە بۆخۆی دەڵێ ئەمن ساڵی ٤٨ (٦٩ی زایینی) دامەزراوم.

**هەیاس کاردۆ:** نەخشی کاک سەلاح موهتەدی لە دامەزرانو درێژەی کاری کۆمەڵەدا چی بوو؟ دەڵێن ناوبراو هەتا ماوەیەکی زۆر ڕۆڵی پشتپەردەی دەگێڕا.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کاک سەلاحی موهتەدی لەوەتی ئەمن دەی‌ناسم – دیارە لەمێژە دەی‌ناسم - بەڵام لەو قۆناغەی ئەخیری‌دا قەت قبووڵی نەکردوە کە ئەندامی کۆمەڵە یان ڕێبەرایەتیی کۆمەڵەیە. بەڵام قەتیش نەی‌شاردۆتەوە کە دۆستیانەو لێ‌یان نیزیکە. بەتایبەتی ئێستا ٣ کۆمەڵەی لێک جیاوازمان هەن. یەکیان برای کاک سەلاح سکرتێرەتی. یەکیان ئامۆزای سکرتێرەتی. لەپاشان یەکێک لە پایەکانی

دروستبوونی بووە. خۆ ئەندامەتیی کۆمەڵەی عەیب نیە، کابرا لە خۆی دوور خاتەوە. ئەو قەتی قبووڵ نەکردوە کە ئەندامی کۆمەڵەیە. بەڵام دۆستیان بووە، هاوبیرو هاوەمەشورەتیان بووە. ڕەنگە ئێستاش دەگەڵ یەکێکیان یان دووانیان یان هەر سێکیان. نازانم بەڵام ئەگەر لێیان تێزیک بێ عەیب نیە. خۆ کاک سەلاح مەجبوور نیە ئەگەر ئەندام بێ بڵێ نیم. بۆ ئەندام بوون گوناحە؟

**عەباس کاروان:** مامۆستا باسی ئەنداموون نیە. سەرەتاکان وا باس بوو کە کاک عەبدوڵلا تەجروبەیەکی وای نەبوو. کاک سەلاحیش بە هێندێک هۆ ڕەنگە نەیویستبێ ڕاستەوخۆ بەرپرسایەتیی کۆمەڵەی وەئەستۆ بگرێ بەڵام هەوڵی پەرەگرتنی دابێ. باسەکە ئەوەیە.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** جا چ بوو، ئەوە بۆ خراپە؟ با ڕێشوێنیی کردبێ. کۆمەگی کردبێ. ئەمن لە نێزیکەوە ئاگام لێ نیە بەڵام ئەوەی بە جایز دەزانم.

* بەگشتی ڕەوتی تێکۆشانی کۆمەڵەی هەتا دەربازبوون لە گێژاوی حیزبی کۆمۆنیست چۆن هەڵدەسەنگێنی؟ ئەدی دواتر؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** قەزاوەتێکی ئاوا بۆ یەکێک دەبێ موحەققیق بێ‌و وەدوای ڕووداوەکان کەوتبێ، نەک وەکوو من لە دوورەوە بێ‌و لەندەکاو یەکێک پرسیاری لێ بکا. ئەوە حەقی من نیە. یان دەبێ یەکێکی خۆیان-بێ کە دەکوڵێ جەرەیانەکەیدا هەیە. بەشریەحاڵی خۆم لەسەریەک پێموایە پێکهاتنی حیزبی کۆمۆنیستو تێکەڵبوونی ئەو دووانە کارێکی زۆر سروشتی نەبوو، ئەگەر وەک دوو سازمانی دۆست مابانەوە ڕەنگ بوو قازانجی بۆ کۆمەڵەو بۆ کوردستان بەتایبەتی پتر بێ. بەڵام دوایە دەرکەوت کە بۆخۆیان موشکیلاتی خۆیانیان هەیە. ئەوە بەزەحمەت لەکۆڵیان بۆوە. کۆمەڵە لەو بارەیەوە بە باوەڕی من زەرەری کرد. چونکی هەر ئەووەڵێن لەتبوونی کە تێیاندا ڕووی‌دا کە مەنسووری حیکمەت جودا بۆوە، مەنسووری حیکمەت بەشێک لە سەرمایەی کۆمەڵەی کە سازمانێکی کوردستانی بوو دەگەڵ خۆی برد. مەبەستم سەرمایەی ماددی نیە، چونکی گوتیان لەباری سەرمایەی ماددی‌یەوە گۆیا حیکمەت گوتوویەتی ناوی کۆمەڵەش بۆ ئێوەو سەرمایەی کۆمەڵەش بۆ ئێوە، ئەمن سازمانێکی دیکە پێک دێنم. تەنیا یەک داوای لەوان کردبوو، ئەویش ئەوە کە ئەو کەسانەی دەیانەوێ ڕەگەڵ وی بکەونو لە کوردستانێ کۆمەگیان بکرێ کە بیانێرنە دەرێ. ئەوە بۆخۆی دیارە کۆمەگی کردوە کە بەشێکی دیکە لە سەرمایەکان لە کۆمەڵەی ببڕێنو دەگەڵ وی کەون. چونکی ئەوە لەحاڵێک‌دا بوو کە لە کوردستان وەزع خۆش نەبوو. لەنێو وڵات نەمابوون. لە باشووری کوردستان وەزعی ئەمنییەتی باش نەبوو. چوون بۆ وڵاتانی دەرەوە خوێندنو موعالەجەو هەموو ئەو شتانە

یەکێک بوو لە بەرنامەکان یان ئارەزووەکانی ئەو خەلکە. ئێستا کە سازمانیش کۆمەڵگیان بکار پوولێکیان بداتێ چ لەوەی چاکتر. ئەوە خەلکی زۆر هان دا دەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری کەون کە حیکمەت پێکی هێنا. جا لەو رێگایەوە بەشێک لە سەرمایە ئینسانییەکانیان رۆیشت.

دواتریش لەنێو خۆیاندا دیارە لەسەر مەسایلی فکری لێیان بوو بە ئیختیلاف لە نێو حیزبی کۆمۆنیستی ئێراندا نەک حیزبی کۆمۆنیستی کارگەری. جورئیاتەکەی بۆخۆیان دەزانن ئەمن نازانم. بەڵام وەکی دەرکەوت زیاتر لەسەر ئەوەی بووە کە بەشێکیان پێیان وا بووە دەبێ واز لە حیزبی کۆمۆنیست بێنن و بینەوە کۆمەڵە خۆڵاتییەکەی جاران. بەشێکیشیان باوەڕیان وا بووە کە ڕاگرتنی ناوی حیزبی کۆمۆنیست و تەشکیلاتەکەی هەم بۆ ئێران و هەم بۆ کوردستان موفیدە. لەسەر ئەوەی پێم وابێ ساڵی ٢٠٠٠ بوو کە کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران جیا بۆوە. ئەوە قۆناغی دووهەمە کە لەنێو کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانیشدا دیسان ناکۆکی پەیدا دەبێ و دووبارە لەت-بوونێکی دیکە دروست دەبێ کە وا بزانم دەبێتە ٣ ساڵ پێش. ئەوەی کە کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی لێ دروست بوو واتە لایەنی کاک عومەری ئیلخانیزادە، وا بزانم ٣ ساڵی بەسەردا تێنەپەڕیوە.

* کۆمەڵەی ئێستا چەند بەشن. جیاوازیی ڕوانگەکانیان چییە؟ کامیان زیاتر خۆی بە کێشەی کوردەوە خەریک دەکا؟ قسەی کۆتاییت لەسەر کۆمەڵە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو تەفسیلاتە کە ئەتۆ باسی دەکەی لەلای من نیە. کۆمەڵە دوو، سێ جەرەیانی سازنەبووی هەن کە وەک جەرەیان عەمەل ناکەن. یەکیان دەگەڵ پارتی سۆسیال دێمۆکرات یەکی گرت. ڕەوتێکی دیکە هەیە وەک کاک مینەی حیسامی و کاک ساعیدی وەتەندوست و ئەوانە کە لە باری فکرییەوە لە حیزبی کۆمۆنیست بڕاون بەڵام هەتا ئێستا ئیعلامی مەوجوودییەتیان نەکردوە. کۆمەڵەی مەوجوود کە وەک بڵێی کۆمیتەی ناوەندی و کۆنگرەو بنکەو بارەگایان هەبێ و وەک کۆمەڵە ناسرابن، سێ دانەن. چونکی حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش ڕێکخراوی کوردستانەکەی بە کۆمەڵە ناو دەبا. ئەمن بەش بەحاڵی خۆم ڕەنگە زۆریشم ئاگا لێ نەبێ، بەڵام ئەمن شتێک بە ناوی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران هەر نابینم. چونکی ئێستا لەهەر کەس بپرسی بڵێی "زرگوێز" کێی لێیە، دەڵێ کۆمەڵە. یانی ئێستا ئەو جێگایەی کاک برایمی عەلیزادە سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی لێیە کەس ناڵێ حیزبی کۆمۆنیستی لێیە، هەموو هەر دەڵێن کۆمەڵە.

**عەباس کاروخ:** یانی کاک برایم هەم سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستەو هەم سکرتێری کۆمەڵەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێموایە لە تەشکیلاتەکەیاندا شتی بەو سووڕەتەیان نەماوە. بەڵام سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستە. پاشان "کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران" هەیە بە سکرتێریی کاک عەبدوڵڵای موهتەدی. "کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان" هەیە کە سکرتێرەکەی کاک عومەری ئێلخانیزادەیە. ئەوەیان نە شۆڕشگێڕی دەگەڵە نە ئێران. ئەو دووانە دووبارە دەڵێم بێ ئەوەی کەوشی بەهەشتو جەهەننەمی‌یان لێک جودا کەمەوە، بەڵام شتی ئیعلانکراویان ئەوەیە کە وەختی خۆی پێکەوە لە حیزبی کۆمۆنیست جیا بوونەوە ئەوان هەڵگری شوعاری کوردستانیبوون بوون. یانی ئەوە کە ئامانجی کوردستانی-بوون پەرە پێبدەنو بەرەو کوردایەتی بگەڕێنەوە. جەرەیانی حیزبی کۆمۆنیستی کاک برایمیش ئەگەر لەو بارە-یەوە لێی بپرسی خۆی ئەوان بە کەمتر نازانێ بەڵام شوعارەکەیان فەرقی هەیە.

لەپاشانیش ئەوە کە کامیان بەقووەتەو کامیان پتر عەمەل دەکا، بەڕاستی زۆر ئاسان نیە. مەسەلەن ئێستێ ئەو سێ جەرەیانە لە هەر کامێکیان بپرسی دەڵێ لەنێو خۆی وڵاتی خۆماندا ئەمن لە هەمووانم پتر خەڵک دەگەڵە. یان هەر حیزبی دێمۆکرات کە لەت بووەو دوو حیزبی لێ درووست بوون، لە هەرکامیان بپرسی هەر وا دەڵێ. کێ دەتوانێ سابیتی بکا؟ کێ وەدرۆی دەخاتەوە؟ ئەوە کارێکی ئاسان نیە. ڕەنگە ڕۆژێکی دیکە ئیشەڵڵا هەلومەرجێک پێک بێ کە خەڵک بتوانن لەسەر سندووقی هەڵبژاردن بە حیزبەکان بڵێن کامەتان بایی چەندن. بۆ ئێستێ کارێکی ئاسان نیە.

## بەڵگەنامەکان

### بەڵگەی (١)

... اینکه حزب دمکرات بر کردستان مسلط گردد یا رژیم جمهوری اسلامی، در ماهیت امر فرقی نمیکند. هردو نیرو عامل سرکوب توده‌ها و مدافع نظام سرمایه‌داری و حافظ استثمار اکثریت توده‌های مردم بوسیلهٔ سرمایه هستند. و تشابه تاکتیکهای حزب و رژیم جمهوری اسلامی علیه ما از ماهیت مشترک آنان ناشی میشود: همانطور که رژیم جمهوری اسلامی از درگیری بین ما و حزب دمکرات استفاده میکند، حزب دمکرات نیز از درگیری بین ما و رژیم جمهوری اسلامی بهره میگیرد. بدون درک درست این مسأله ما در اتخاذ تاکتیک صحیح در مبارزهٔ انقلابی کردستان دچار اشتباه خواهیم شد.

از گفته‌های خود تاکنون چه نتیجه‌ای میگیریم؟ از گفته‌های ما تاکنون این نتیجه حاصل میگردد: چنانچه حزب دمکرات متوجه گردد که ما به دگم "جنگ علیه رژیم جمهوری اسلامی و صلح با حزب دمکرات" چسبیده‌ایم، لحظه‌ای در یورش جنایتکارانه برضد ما درنگ نخواهد کرد.

نیرو میدهند در حالیکه بخشی از نیروی ما صرف جنگیدن علیه رژیم و حفظ مناطق در برابر تعرضات رژیم میگردد . توانائی ما در مقابل حمله حزب دمکرات کمتر از اندازه‌ٔ واقعی خود بوده و در برابر حزب شکست پذیر خواهیم بود . آیا برای امر انقلاب فرقی میکند که ما از حزب ضربه خورده باشیم یا از رژیم جمهوری اسلامی ؟ خیر ، فرقی نمیکند ، در هر حال نتیجه‌ٔ آن ضربه به انقلاب و دور شدن ما از نیل به اهداف انقلابیمان میباشد .

هنگامی که ما با خطر تعرض مداوم و وسیع حزب دمکرات روبرو باشیم ولی از دادن جواب قاطع و انقلابی ای که حزب دمکرات را دست کم تا مدتها سرجایش بنشاند ، تحت این عنوان که رژیم جمهوری اسلامی از این درگیری استفاده میکند ، خود داری ورزیم جز اینکه به تضعیف نیروی خود میدان داده باشیم و جز اینکه راه مبارزه‌ٔ خویش را سخت تر کرده باشیم نتیجه‌ٔ دیگری برای ما در بر ندارد .

هنگامی که ما در یک منطقه با حزب دمکرات درگیر شویم و او با تمام نیرو به ما حمله کند ولی ما برای دفاع از منطقه‌ٔ دیگر در برابر رژیم جمهوری اسلامی نیروی خود را در مقابلها نگاهداریم به عبارت دیگر در آن واحد در دو جبهه بجنگیم جز اینکه در هر دو جبهه نیروهایمان فرسوده شود نتیجه‌ای برایمان نخواهد داشت .

ما باید اینرا متوجه باشیم که بالاخره این ما هستیم که در شرایط سخت نیز علیه رژیم جمهوری اسلامی به مبارزه‌ٔ خود ادامه خواهیم داد نه حزب دمکرات . سرانجام این ما هستیم که پیگیرانه مبارزات توده‌ها را برای نابودی نیروهای سرکوبگر رژیم در کردستان و اعمال حاکمیت انقلابی آنان رهبری خواهیم کرد نه حزب دمکرات . پس اگر ما حتی منطقه‌ای را در برابر رژیم جمهوری اسلامی از دست بدهیم ولی در مقابل بتوانیم جواب دندان شکنی به جنایات حزب دمکرات بدهیم در آن صورت با حفظ نیروهای خود خواهیم توانست که در آینده به سروقت نیروهای رژیم در همان منطقه نیز برویم .

ما تاکنون بنابر ضرورت کوشش کرده ایم که از درگیری با حزب اجتناب کرده و ضربات اصلی خود را بر رژیم فرود آوریم . از این پس نیز این

سیاست را ادامه میدهیم، تنها با یک تفاوت؛ با این تفاوت که نباید از سیاست فوق، دگم درست کرد، با این تفاوت که در موقع لزوم – یعنی هنگامی که ادامهٔ این سیاست به گستاخی حزب دمکرات در برابر کومله و توده‌های هوادار آن منجر گشته و به تضعیف ما در برابر این حزب (و بنابراین در برابر رژیم جمهوری اسلامی نیز) می انجامد – باید با تمام نیرو ضربات هرچه کوبنده‌تری بر حزب دمکرات وارد آوریم. و در این حال از از دست رفتن یک یا حتی چند بخش یا ناحیه در برابر رژیم جمهوری اسلامی نیز ابائی نداشته باشیم. زیرا همانطور که گفتیم مماشات در برابر حزب دمکرات به معنای از دست دادن یک منطقه برای ما و واگذار کردن آن به حزب دمکرات است که در نتیجه چنین وضعیتی به مبارزه ما در برابر رژیم جمهوری اسلامی نیز زیانهای بزرگی خواهد رسید. اما چنانچه با اتخاذ تاکتیک انقلابی قاطع به قلدربها و زورگوئیها و جنایات حزب نسبت به کومله و توده‌های زحمتکش تحت رهبری آن میدان ندهیم و آنرا سرجایش بنشانیم قدرت ما – نسبت به حالت مماشات جوئی – افزایش خواهد یافت و توانائی ادامهٔ سیاستی را که تاکنون در پیش گرفته‌ایم همچنان حفظ خواهیم کرد.

"لزوم اقدام قاطع و بموقع علیه ماجراجوئیهای حزب دمکرات"، نامیلکەی نێوخۆیی کۆمەڵە ۱۳٦۰/٦/۳۰

## پاشکۆی (۲)

### نامه‌ مورخ ۲۶ تیرماه ۱۳۶۶ "کمیسیون منتخب و جریان سیاسی"

دوستان گرامی دفتر سیاسی حزب دمکرات کردستان ایران

با درودهای فراوان

با توجه به این که جوابیه کومله از تاریخ ۳۰ خرداد تاکنون در اختیار شما قرار داده شده است و طی دیدار کمیسیون دو روز پیش با نمایندگان دفتر سیاسی پذیرفته شده است که نظر قطعی شما ابراز گردد، و هم چنین با توجه به تاکید شما بر ارائه "پاسخ دو هفته‌ای" و تیرماه با نماینده کمیسیون منتخب و تاکیدات مجدد ما طی نامه مورخه ۹ تیرماه، خواستار تسریع در ارائه پاسخ قطعی شما به جوابیه کومله تا تاریخ ۲ مردادماه ۱۳۶۶ هستیم.

نظر به اهمیت مسأله، بدیهی است که پس از انقضای تاریخ فوق، عدم دریافت پاسخ، از جانب ما به معنای امتناع شما از پاسخگوئی به جوابیه کومله و عدم تمایل حزب دمکرات به قطع درگیریها و برقراری صلح تلقی می‌گردد.

در انتظار پاسخ شما

و

با درودهای مجدد

کمیسیون منتخب و جریان سیاسی

چریکهای فدائی خلق ایران

سازمان چریکهای فدائی خلق ایران

سازمان کارگران انقلابی ایران (راه کارگر)

۲۶/تیر ۱۳۶۶

لطفاً پاسخ را به دفتر سازمان چریکهای فدائی خلق ایران ارسال نمائید.

## بەڵگەی (٣)

## نامهٔ مورخ ۳۰ تیرماه دفتر سیاسی حزب دمکرات به "راه کارگر"

تاریخ ١٣٦٦/٤/٣٠
شماره ١٥٠٤

دوستان گرامی ، سازمان کارگران انقلابی ایران ( راه کارگر )
پس از سلام

نامهٔ مورخ ٢٦ تیرماه ١٣٦٦ شما را که از سوی "کمیسیون منتخب ٦ جریان سیاسی" نوشته شده بود دریافت کردیم.

مفاد نامهٔ شما ما را شدیداً متحیر و متعجب ساخت . چراکه این تصور را در ذهن ما تقویت نمود که هر چند شما ظاهراً نقش میانجیگری را بعهده گرفته‌اید ، در واقع از دیدگاههای "کومله" دفاع می‌کنید و چنین به نظر می‌رسد که مقصود شما بیشتر "افشاگری" است تا پایان بخشیدن به درگیریهای مسلحانه بین حزب دمکرات و کومله .

متأسفانه از همان آغاز کار موضع شما در این رابطه بی‌طرفانه نبوده است . در حالیکه قبل از تهیهٔ قطعنامهٔ مشترک بخرداد ماه ، بارها با نمایندگان کومله به مذاکره پرداخته بودید ، گفتگو با حزب دمکرات را هنگامی شروع کردید که دیگر قطعنامهٔ مذکور آماده شده بود .

این حقیقت نیز نباید نهفته بماند که در "قطعنامهٔ مشترک" تنها و

-١٦-

حزب ما بیش از هر جریان سیاسی دیگری به پایان دادن به درگیریهای مسلحانه در داخل جنبش کردستان ایران علاقمند است .
حال چون تاریخ ۲۸ تیرماه که به عنوان روز ملاقات با دفتر سیاسی حزب دمکرات از طرف شما پیشنهاد شده بود به علت گرفتاریهای متعدد در مورد موافقت ما قرار نگرفته و دیدار چند روزی به تأخیر افتاده است ، نامهٔ "اولتیماتوم گونه" مورخ ۲۶ تیرماه را برای ما می فرستید .
محتوای این نامه از سه جهت برای ما قابل قبول نیست نخست آنکه چند جریان سیاسی که ادعای احساس مسئولیت دارند وچنین وانمود می سازند که به پایان دادن به درگیریها علاقمند می باشند چگونه به خاطر چند روز تأخیر کاسهٔ صبرشان لبریز می شود و برای حزب ما اولتیماتوم می فرستند . دوم آنکه هنوز کومله جواب روشن و صریحی به هیچیک از پیشنهادهای حزب و از جمله آنچه شما "پیشنهاد الحاقی" می نامید نداده است . و هنوز معلوم نیست آیا کومله معیارهای پیشنهادی حزب دمکرات را پذیرفته است یا نه؟ وشما بدون آنکه حزب دمکرات را از مضمون پاسخ کومله مطلع سازید اقدام به نوشتن نامهٔ شدیداللحنی به حزب دمکرات کرده اید . سوم آنکه شما که گویا برای وصل کردن آمده اید نه برای فصل کردن چگونه است که چند روز تأخیر در ملاقات را "عدم تمایل حزب دمکرات به قطع درگیریها وبرقراری صلح تلقی" می کنید و در مقابل حزب دمکرات جبهه می گیرید ؟ آیا این امر نشانهٔ آشکاری از نقض اصل بی طرفی و بی انصافی نیست ؟
در پایان نامه می خواهیم یک واقعیت دیگر را نیز به دوستان گوشزد کنیم. حزب دمکرات درطی هشت سال جنگ خونین با رژیم ضد خلقی جمهوری اسلامی در برابر مردم هشیار کردستان و

همهٔ خلقهای ایران ثابت نموده است که نه از هیچ التیماتومی واهمه دارد و نه بخاطر هیچ تهدیدی سیاست اصولی خود را تغییر می دهد. حزب دمکرات مانند همیشه آماده است به سخنان و توصیه‌های دوستان و جریانهای سیاسی دارای حسن نیت گوش فرا دهد لیکن هر نوع تهدید و التیماتوم را شدیداً رد می کند. بجاست جریانهای سیاسی و کسانی که علاقه دارند با حزب دمکرات روابط دوستانه داشته باشند این حقیقت را هرگز از یاد نبرند.

امیدواریم که شما با حسن نیت و برخورد مسئولانه به اقدامات صلح جویانهٔ خود پیگیرانه ادامه دهید.

دفتر سیاسی
حزب دمکرات کردستان ایران

"٦" جریان سیاسی و درگیریهای کومله و حزب دمکرات" از منشورات کمیته مرکزی حزب دمکرات کردستان ایران، مردادماه ١٣٦٦، لاپەرەکانی ١٥ تا ١٨

# حیزبی دیموکراتو کۆماری ئیسلامیی ئێران

**عەباس کاردۆ:** وا بزانم دوای تێکچوونی هەیئەتی نوێنەرایەتیی گەلی کورد، جەنابت چەندجار لەلایەن حیزبەوە سەفەرت بۆ تاران کرد. دەکرێ ئەزموونەکانی خۆت لەو بارەیەوە باس بکەی؟ خومەینیت چۆن دیتو چۆنی لێ حالّی بووی.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** لەپێشدا با باسی بەشی دووهەمی بکەم. ئەمن خومەینیم هەر جارێک دیت. جارەکەش پێموایە زۆر پێش ئەو وەختی بوو کە هەیئەتی نوێنەرایەتیی گەلی کورد پێکهات. چونکە هەیئەتی نوێنەرایەتیی گەلی کورد لەجەنگەی شەڕی سێ مانگەدا پێکهات. بەڵام ئەوجارەی خومەینیمان دیت سەرەتای هاوینی ٥٨ بوو. هەیئەتێک لە مەهابادەوە چوو. دواتریشدا خەسڵەتێکیان بەسەردا بڕی کە زۆر خەسڵەتی سیاسی و حیزبیی پێوە نەبێ. وەکوو نوێنەرانی خەڵکی مەهاباد لە ئەسنافی جۆربەجۆر پێکهاتبوون. مەسەلەن ٢ ڕووحانیی تێدابوون، مامۆستا مەلا ڕەحیمی عەبباسیی ڕەحمەتی و مەلا عەولای ماوەرانی. ڕەحمەتی جەنابی حەسەنی باباتاهیریی تێدابوو کە فەرماندار بوو، نوێنەری دەوڵەت بوو. ئەمن کە هەبووم لەباتیندا نوێنەری حیزبی دیموکرات بووم، بەڵام بە ناوی نوێنەری جووتیاران دەگەڵ بووم. خوالێخۆشبوو کاک برایمی شێرزادەمان دەگەڵ بوو بە ناوی نوێنەری موعەللیمان. ڕەحمەتی موحەممەدی عەتتاری بوو بە ناوی نوێنەری بازاڕییان. ڕەحمەتی ڕەحیمی قازی بوو کە لەبیرم نیە بەناوی چ سینفێک دەگەڵ بوو. ئاوا هەموو بە ناوی ئەسناف چووین.

لەڕاستیدا زۆریش ویستەکانمان دەگەڵ خودی خومەینی تەرح نەکرد. بەڵام کە چووینە تاران لەوێ مەقاماتێکی زۆرمان دیتن. دەگەڵ مەقاماتەکە مەسایلمان باس دەکرد. مەسەلەن ئێمە بۆ یەکەمجار وەزیری خارجە، سادقی قوتبزادەمان دیت، مەرحوومی فرووهەرمان دیت. چووینە دەفتەری تالەقانی کە بۆخۆی لەوێ نەبوو، دەگەڵ دەفتەرەکەی دانیشتین. ئەپاشان دیداری فرووهەری ٢،٣ جار بوو. یانی ٢ جار لە دەفتەرەکەی و جارێک لە ماڵەکەی. ئەویان دیارە داوەتی کردین بۆ شامی بەڵام دوایە دانیشتین زۆر سەمیمانەو دۆستانە قسەمان کرد. دوایەش کە چووینە قوم دیدارمان دەگەڵ خومەینی هەبوو.

پێم وایە جاری دیکەشم باس کردوە. خومەینیم وەکوو پیاوێکی زیرەک دیت. دەگەڵ ئەوەی میتۆدەکانی بۆ هەموو کەس ڕوون بوون کە وەکوو شێخێک یان مەلایەک ڕەفتاری دەکرد، بەڵام لەباری سیاسییەوە ئەمن

ئەو پیاوەم بەزیرەک دیت. نموونەکەشی دەوەدا دەبینم کە دیار بوو هیچی بۆ کورد پێ نیەو نایەوێ هیچ بۆ کورد بکا. بەڵام قسەیەکی وای بەدەمدا نەهات کە ئەوەی بە زەقی لێ دەرکەوێ.

**هەیاس کاردۆ:** یانی ئێوە چووبوون داوای چ بۆ کورد بکەن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە دەگەڵ هەیئەتی دەوڵەت زۆرشتمان باس کرد. مەتالیبی جۆراوجۆر هەبوون کە باسمان کردن. بەڵام دەگەڵ خومەینی هەر هێندێک شتی گشتیمان باس کرد. یەکێک لەو شتە گشتی‌یانە ئەوە بوو کە دەمانەوێ ئەو زوڵم و ناحەقی‌یەی لە دەورانی ڕێژیمی پاشایەتی‌دا لە کورد کراوە لەسەر ئەو میللەتە نەمێنێ. ئێمە کە دانیشتین بۆخۆی دەستی بە قسان کرد. هەوەڵێ بەخێرهاتنی کردین. دوایە باسی ئەوەی کرد کە بەڵێ لە ئیسلامدا حەقی هەمووان دەدرێ و هەموو شتێک چاک دەبێ. قێڵ لەکەس ناکرێ، زوڵم زۆر لە کەس ناکرێ. بەڵام نابێ پەلەتان هەبێ، چونکە ئەوە شۆڕشەو دەبێ هەموو شتێک لەسەرڕا ساز کرێتەوەو لەو شتانە. ئەمن بۆخۆم بەحیساب زیرەکیم کرد کە بەشکەم قسەیەکی لەزاری دەرکێشم و بیدەم بە ڕۆژنامەکان و وەک شتێک لەسەری تۆمار بکەم، بۆیە گوتم ئێمە هەموو ئەوانە دەزانین و پەلەشمان نیە. بەڵام میللەتی کورد لە درێژایی دەیان و سەدان ساڵدا زوڵمی لێ کراوە، بۆیە ئێستێ دەیەوێ دڵنیا بێ کە لە حکوومەتی تازەدا زوڵمی لێ‌ناکرێ، ڕەفعی مەزڵەمەی لێ‌دەکرێ و مافەکانی دابین دەکرێن. بۆ ئەوەش باوەڕ بە قسەکانی جەنابت دەکەن و پێیان خۆشە ئەو شتەی لە زمانی جەنابتەوە ببیسن. جا زیرەکی‌یەکەی لێرەدا بوو. نە گوتی بەڵێ حەقەکانتان دەدرێن، نە گوتی نادرێن. گوتی هەرکەس دێ دەڵێ زوڵم لەمن کراوە. کورد دێ وا دەڵێ، بەلووچ دێ وا دەڵێ. ئەوجار گۆڕی و لەوەشی تێ‌پەڕاند. گوتی ئیسفەهانی وا دەڵێ، شیرازی وا دەڵێ. هەر ئێمە لەو قومەی حەقمان نەبوو بە ئازادی مەڕاسیمی دینی بەجێ بێنین. ئیدی شتەکەی عەجایب با داو دووری خستەوە. پاشانیش ماوەیەکی کەم دانیشتین. ئەوە لەلای خۆی ١٠ ڕۆژ پێشتر وەختمان وەرگرتوە، کەچی لەبەر زیارەتچی وەژوور کەوتن و دەستیان کرد بە دەستماچ کردن و پووڵ‌دانانێ. ئەوە ئێمە لەوێ دانیشتووین، وەک بارێزە پووڵیان بۆ دێنا و ئەویش وەری دەگرت و وەبن دۆشەگێکی دەنا کە لە سەری دانیشتبوو. لە هەمووی سەیرتر ئەفەرێک کە هات ئەوەی دای بەخومەینی ڕاست بەقەت سەرینێکی منداڵی دەبوو کە دیار بوو هەموو پووڵ بوو تێی‌دا بوو. نە حیسابێک هەبوو نە کیتابێک هەبوو. هەر ئاوا دایان دەناو دەڕۆیشتن. هەموو ئەو پووڵانەشی ڕاست لە بن دۆشەگەکەی دەناو سەرینەکەشی لەلای خۆی دانا.

دیارە کە چووینە لای ئایەتوڵڵا شەریعەتمەداری، ئەویش ئەو بارێزەی پووڵی هەر هەبوو، بەڵام نی وی کەمتر بوو. ئی وی جالیب بوو کە مۆرێکی خۆی بە بەنێکی درێژ دەملی کردبوو. پیاوێک دەهات، چۆکی دادەدا، کاغەزێکی پێ‌بوو دەگەڵ ستامپێکی. مۆرەکەی لە ستامپەکە دەدا، کاغەزەکەی مۆر دەکردو

کاغەزەکەی دەگەڵ خۆی دەبرد. دیار بوو ئەوە ڕەسیدی پووڵەکەیە. ئاغای شەریعەتمەدارییش کە گیرفانەکانی زۆر گەورە بوون پووڵەکەی دەوێ دەناخنی. حدوودی نیوسەعاتێ کە لە کن ئاغای خومەینی بووین موبالەغە نیە ئەگەر بڵێم نیزیکی یەک میلیۆنیان پووڵ دایە. چونکی ئەوەی ئێمە دیتمان هەمووی ١٠٠٠ تمەنی و ٥٠٠ تمەنی بوون. سەعاتێکیش لەلای شەریعەتمەداری بووین کە ئەویش ڕەنگە نیو میلیۆنی وەرگرتبێ. ئەو وجووهی شەرعییەو نازانم خومس و زەکات و ئەوانە کە هەرکەسە دەیدا بە مەرجەعی تەقلیدی خۆی.

**عەبباس کاردۆ:** ئیدی ئاغای خومەینی داواکەی ئێوەی لەسەر چۆوە بەو پووڵانە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا ئوسوولەن هەر نەیدەویست. ئیدی وای لێهات پڕ بوو لە خەڵک. ئێمەش گوتمان با هەستین فایدەی نیە، هەر نەیدەویست هیچمان پێبڵێ. جارێکی پێشتریش هەیئەتێک چووبوون. ئەو هەیئەتە دوکتۆر قاسملووی تێدا بوو، مامە غەنی تێدا بوو، کاک جەلیلی گادانیی تێدا بوو و ژمارەیەک لە پیاوماقووڵانی شارەکانی دیکەی تێدا بوون. لەوێ کە داخوازەکانیان هێنابوونە گۆڕێ خومەینی گوتبووی ئەوە نیە تاڵەقانی لەبارەی مافی کوردانەوە قسەی کردوە؟ دوکتۆر گوتبووی باشە ئێمە بڵێین کە جەنابت قسەکانی ئایەتوڵڵا تاڵەقانیت قبووڵن؟ چونکە تاڵەقانی هێندێک شتی لە پێوەندیی دەگەڵ مەسەلەی کورددا گوتبوون کە باش بوون. ئەویش جوابی دابۆوە گوتبووی خۆ ئەمن نازانم تاڵەقانی چیی گوتوە. یانی نەی-دەویست هیچ شتێک بڵێ. خومەینیم ئاوا دیتە

لەپاشان سەفەرەکانی دیکەی ئێمە. ئەمن سێ سەفەری دیکە چوومە قوم. لەپاش هەڵبژاردنی سەرکۆماری کە ئێمەش کۆنگرەی چوارەمان گرت، ئەمن جارێکی وەکوو هەیئەتی حیزبی دێموکرات چووم. پێم وایە دەستەیەکی ٦ نەفەری بووین. مامە غەنی بوو، ئەمن بووم، کاک نەویدی موعینی بوو، کاک ئەحمەدی قازی بوو کە لە تارانێ دەگەڵمان کەوت، دەگەڵ خوشکە فەوزیەی قازی. پێم وایە ٦ کەس بووین ئەوەی دیکەم وەبیر نایەتەوە. لەوێ چووینە لای خەڵکی جۆراوجۆر بەڵام خومەینیمان نەدیت. ئاغای بەنیسەدرمان دیت.

**عەبباس کاردۆ:** باشە ئەدی بۆ چوونە قومێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** چاک بوو ئەو تەسحیحەت کرد. ئێمە ئەو سەفەرەی نەچووینە قوم. هەر چووینە تاران. لەوێ دەگەڵ ئاغای بەنیسەدر دانیشتین بە دەرەجەی یەکەم. پێشتر دەگەڵ ئاغای فرووهەر

دانیشتبووین. دیارە بۆلای بەنی‌سەدریش ئاغای فرووهەرمان هەر دەگەڵ بوو. پێم وایە داستانەکەی وەختی خۆی لە بەیانییەیەک‌دا چاپ کرا.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا دوای هاتنەسەرکاری بەنی‌سەدر فرووهەرو ئەوانە هەرمان؟ چونکە ئەوان جەزوی کابینەی بازرگانی بوون.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هێشتا کابینە تەشکیل نەبیبوو. ئەوانە هەر مابوون. فرووهەر هەرمابوو. ئاغای بەنی-سەدریش لە کۆشکی سەرۆک‌وەزیری دادەنیشت. ئاغای فرووهەر وەزیری کارو ئوموور ئیجتماعی بوو. کە دەگەڵی دانیشتین لەهەوەڵەوە کاک غەنی قسەی کرد. جۆرێکیشی قسەکرد کە بەنی‌سەدر عەجایب بەگژماندا هات. زۆر خراپ. قسەی ناخۆش و توندی کردن. گوتی هەر دەتانەوێ پوولتان بدەمێ. بۆخۆتان دەوڵەت برو ئێمەش پوولتان دەبێ. خواردەمەنی و شتی دیکەتان بدەمێ و لەو قسانە. ئیدی زۆر سەیر بەگژماندا هات. لەوێ‌دا ئەمن بەخەیاڵمدا هات کە ڕەنگە لەسەر ئەو قسانەی کە دەمەوێ بیان‌کەم بم‌گرێ‌ن‌ەوەو بم‌گرن. بەڵام ئەدی ئەگەر لەسەر ئەوەی ئەمن حازر نەبم فیداکاری بکەم تێکۆشان یانی‌چی. غیرەت یانی‌چی ؟ هەربۆیە کە ئاغـای بەنی‌سەدر لە تووڕەیی‌یەکەی تەواو بوو نۆرەی قسەم وەرگرت. گوتی فەرموو. هەر بەو جوملەیەم دەست پێ‌کرد کە گوتم زۆر بەداخم بۆ کەسێک کە لە مەقامی سەرکۆماری‌دا دانیشتوە ئەو قسانەی لێ دەبیستم. دەگەڵ تەواوی بۆچوونەکانت موخالیفم.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا کێ سەرۆکی ئەو هەیئەتە بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کاک غەنی بوو. گوتم ئەگەر نەوتی ئێران نی بەشێکیە، ئەتۆش بەشت پێوەی نیە چونکە ئەوە لە ئوستانی خوزستانە. ئاخر باسی نەوتی کردو گوتی دەبێ لە نەوتی ئێران بتانژێنین. گوتم ئەگەر نەوتی خوزستانی نی ئێرانی‌یە، نەوتی مەشە، نەوتی کوردستانیشە. جەنابت خێرمان پێ‌ناکەی. بەو قسانەت لەڕاستی‌دا ئەتۆ میللەتی کورد لە ئێران جودا دەکەیەوە. ئەوە کورد نیە کە دەیەوێ جیا بێتەوەو تەنیا پوولت لێ‌وەربگرێ. ئەوە ئەتۆی کە بە ئێرانیمان حیساب ناکەی‌و منەتمان بەسەردا دەکەی. جا دوای ئەوانە پێدا هاتمە خوارێ‌و باسی داخوازەکانی کوردم بۆ کرد. گوتم میللەتی کورد ئەوەی دەوێ.

کە لێ‌بوومەوە بەنی‌سەدر گوتی ئەگەر خودموختاری ئەوە بێ کە ئەتۆ باسی دەکەی، ئەمن قبووڵمە. تەرحێکتان بۆ ئەوە هەیە؟ ئەگەر تەرحێکتان هەیە بمدەنێ ئەمن هەر ئەمڕۆ دەیدەم بە شووڕای ئینقیلاب بۆ پەسند کردن. ئەمنیش گوتم تەرحێکی ئامادەکراومان نیە بەڵام مەتالییەکە دەزیهنماندا هەیە. ژوورێکمان بدەنێ دەچین دادەنیشین دەی‌کەینە تەرحێک. ئەوە بوو ژوورێکیان لە کۆشکی سەرۆک‌وەزیری بۆ چۆڵ کردین

چووین دانیشتین. بۆ ئەدەمی‌یە لە خزمەت ئەوانی دیکەدا خۆ زۆریان ماون. بەخۆشی‌یەوە تەقریبەن هەموو ماون. لەوێ چونکی ئەمن حوزووری زیهنیم پتر بوو ئەمن داپڕشتو کاک ئەحمەد کە فارسی‌یەکەی باشترو خەتەکەشی جوان بوو فارسی‌یەکەی چاک کرد. تەرحەکە لە٦ ماددەدا هاتە گۆڕێ دەگەڵ ٨ ماددەی ئیلحاقی. ٦ ماددەکە جەوهەری داخوازەکانی گەلی کوردی تێدا بوو، ئەو ٨ ماددەیەش لەواقیعدا ئاکامی شەڕی ٣ مانگە بوون. دەبێ عەفووی عموومی دەربکرێ. دەبێ زیندانی‌یانی سیاسی ئازاد بکرێن. ئەوانەی خەسارەتیان وێ کەوتوە بۆیان قەرەبوو بکرێتەوە. ئەوانەی لەسەر کار دەرکراون بچنەوە جێگای خۆیان. موستەمەرڕی بدرێ بە بنەماڵەی شەهیدان. قەراری مەحکوومییەتو مەمنووعییەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان لەغو بکرێ و ئاوا ٨ خاڵ بوون. ئەوانەمان دانی‌و ڕۆیشتین.

پێم وابێ جاری دیکەم گێڕاوەتەوە، ئێوارەکەی بوو، ئەمن لەماڵی مەرحوومی دوکتۆر سەعیدی بووم. ئاغای فرووهەر تەلەفونی کرد. گوتی ئەمشۆ سەعات ٨ تەماشای تەلەڤیزیۆنی بکەن سەرۆک کۆمار لەسەر مەتالیبەکەتان قسە دەکا. دڵم زۆر خۆش بوو. لەوێڕا تەلەفونم بۆ دوکتۆری کرد لە مەهاباد کە زۆریشم بەزەحمەت دیتەوە. ئەو وەختی جێگای سابیتی نەبوو، لەم ماڵی بۆ ئەو ماڵی هەتا دیتمەوە. گوتم شتێکی ئاوا هەیە. هەم تەماشای تەلەڤیزیۆنی بکەن بزانن چیە. هەمیش ئەگەر شتێکی باشی تێدابوو، ئێوە پێشدەستی بکەن زوو بەیانێک دەرکەنو خەڵکی دەعوەت کەن کە پشتیوانیی لێ بکەن. چونکە دوای ئەوەی مەینەتی نوێنەرایەتیی گەلی کورد تێک‌چوو و ئێمە دەچووین ئەوانی دیکە موخالیف بوون. گوتم با ئێمە پێشدەستی بکەین ئەوەک ئەوان زوو بێنە خەیاباتی‌و بیکەنە هاتوهاوار کە ئەوانە چوون کوردیان فرۆشت. دوکتۆر قاسملوویش کە بۆخۆت دەزانی پیاوێکی زۆر قسەخۆش‌و بەزلەگۆ بوو، گوتی باشە خەڵکی دەعوەت دەکەین بێن بۆ پیشوازێتان. گوتم مەیکە بە گاڵتە، ئەمن بۆ شتی ئاوا دەڵێم. گوتی باشە.

وابوو شەوێ هەتا سەعات ١٢ کە تەلەڤیزیۆن تەواو دەبوو دانیشتین‌و تەماشامان کرد، هیچ نەبوو. ئیدی تازە بەو درەنگەی تەلەفونم نەکرد. بەیانی زوو دەستم کرد بە تەلەفون‌کردن بۆ ئاغای فرووهەر هەتا دیتمەوو گوتم ئەوە چ بەزمێکە؟ ئەتۆ گاڵتەت بەمە کردوە. گوتی وا نابێ وەرن بۆ دەفتەری کارەکەم. هەستاین چووینە دەفتەرەکەی. گوتی ئاغای بەنی‌سەدر یەک زەڕڕە خەتای نیە. تەواو دەگەڵ داخوازەکان موافیق بوو. بەڵام شوورای ئینقیلاب گوتوویانە ئەوە هەر مەتڕەحیش نیە، هەر جێی باس نیە. بەنی‌سەدریش کە هیچ دەسەڵاتێک نەبوو. شوورای ئینقیلاب هەموو بڕاردەکانی خومەینی بوونو بەنی‌سەدریش لەڕاستی‌دا ئەو پۆستەی لە خومەینی وەرگرتبوو. چونکە شەخسییەتێکی وا ناسراو نەبوو خەڵک دەنگی بدەنێ. بەڵام حیمایەتی خومەینیی لەپشت بوو. بەهەر حاڵ ئەوە جارێکیان بوو.

تایبەتی، لەسەر چا خوارەئەوەی نووسیمو سەعات ٨ هەلم‌گرتو بردم بۆ لای دوکتۆر قاسملووی. گوتم موساحەبەی مامە غەنیت دیوە؟ گوتی نا. گوتم حالّو قەزیەیەکی ئاوا بووە. ئەمنیش ئەوەم نووسیوە. جا هیوادارم ئەمن ئەوەی بلۆزەمەوە ئەتۆ دەقەکەی چاپ بکەیەوە، کە بە تەفسیل باسی سەفەرەکەم کردوە کە چ گوزەراوەو چ نەگوزەراوەو دیفاعیشم لە ئیقدامەکەمان کردبوو. ناخۆشە پیاو لەسەر شتی خۆی قسە بکا، بەلام دەتوانم بلێم وەکوو بەردێکی دەگۆمێ هاوێی، ئیدی مەتەقیان لێ برا. ئەوجار خەلکەکە ڕووحێکی هاتەوە بەری دەنا ڕەنگ بوو ئەگەر ئەوە نەبایە بەو هێرشانەی کرابوونە سەرمانو بەو دیفاعەی مامە غەنی کردبووی، زۆر کەس نائومێد بووایەن یان لە حیزب نارەحەت بووایەن.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا ئەو وەختی کە ئێوە چوونە ئەو سەفەرەی دەولەت باسی خودگەردانیی هێنابووە گۆڕێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** خودگەردانی خۆ هەیە هەر لە کتێبەکەی کاک کەریمی حیسامیش‌دا هەیە. لەڕاستی‌دا خودگەردانی تەرحی دەولەت نەبوو. تەرحەکە تەرحێک بوو کە حیزبی توودە ئامادەی کردبوو. پێش دەرچوونی پەیامی ٢٦ی ئابانی ئایەتوڵڵا خومەینی، دیدارێک هەبوو لە مەهاباد کە کاک غەنیی بلووریانو کاک کەریمی حیسامی‌و کاک عەزیزی ماملێ تێدا بوون. لە دەولەتیش وا بزانم ئاغای فرووهەر بوو دەگەل کێی دیکە نازانم. لە برادەرانی حیزبی توودەش موحەممەد عەلی عەمرویی‌و عەلی گەلاوێژی تێدا بوون. ئەگەر چاکم لەبیر بێ، لەدوایە کاک عەزیزی ماملێ‌و کاک کەریمی حیسامی هاتنەوە. دیارە کاک کەریم نەهاتەوە هەر لە ناوچەی مەهابادێ بوو، بەلام کاک غەنی خۆی وەدوا دابوو. برادەرانی حیزبی توودە شتێکیان دابوویە کە کاتێک وتووێژ دەکرێ داخوازەکانی میللەتی کورد ئاوا تەرح بکەن. شتێکی زۆر جالیب بوو. کە هێنایەوە باسی کرد، ئاوای دەست پێ دەکرد: بنام حزب دمکرات کردستان بە شما هیات نمایندگی جمهوری اسلامی خوش‌آمد می‌گوییم. هەر ئاوا جا دوایە دەستی پێ دەکرد کە ئەوە داواکانی میللەتی کوردە. ئەو تەرحی خودگەردانی‌یە، وا نووسرابوو کە گۆیا ئەوە ئێمە وەک کورد داوای دەکەین. ئەومیان تەواو دارشتبوو و نووسیبوویان. لە ئاخرەکەیدا کە تەواو دەبێ، سوپاس دەکا کە هەیئەتی دەولەت گوێی بۆ قسەکان ڕاگرتووە هیوادارین بەتەوافوق بگەینو لەو قسانە. هەتا تەواو بوو ئەمن نیوەڕووح بووم. دەئاخرەکەی‌دا گوتم کاک غەنی میللەتی کوردت بۆ ئاوا سووک کرد. یانی کورد بۆخۆی نازانێ بلێ بەخێر بێن؟ دەبێ حیزبی توودە بەخێرهاتنەکەشی بۆ بنووسێ؟ جا ئەوەی دابوو بە دەولەت. دەولەتیش بەکەیفێ بوو، بەوەوە نووسابوو. دەنا تەرحی خودگەردانی لەجێ‌دا لەلایەن حیزبی توودەوە ئامادە کرابوو.

سەفەری دیکەی قوم هەیئەتێکی ٣ نەفەری بووین. ئێمە پێشتر داوامان کرد کە بچین و مەتالیبەکە دەگەڵ ئاغای خومەینی باس بکەین. هەیئەتەکە کە هەر ئی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان بوو ٣ کەس بووین کە بەخۆشی‌یەوە هەموو ماوین. کاک ئەحمەدی قازی بوو، کاک موهەندیس ئاریایی بوو، ئەمن بووم.

**هەیاس کاردۆ:** کاک ئەحمەدی قازی ئەندامی حیزب بوو؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** بەڵێ بەڵێ. خۆ کاک ئەحمەد پێش کۆنگرەی ٤ موشاویری کۆمیتەی ناوەندییش بوو، بەڵام دوایە مەسئوولییەتی وەرنەگرت. ئێمە هەستاین چووینە تاران. لەوێ مەلایەکی لێ بوو کە ناوی چووکەییم لەبیر نەماوە بەڵام "دوکتۆر سەدر"یان پێ دەگوت. پیاوێکی زۆر زیرەک بوو. ئاخر هەم کاربەدەستانی جمهوریی ئیسلامی و هەم بەتایبەتی ئاخوندەکان پیاو ناتوانێ دڵنیا بێ کە بەڕاستی حوسنی نییەتیان هەیە یان دەیانەوێ جەلبت بکەن. بەڕواڵەت زۆریش ئەهلی تەفاهوم بوو. لە ماڵەکەی خۆی لە تاران وەری گرتین. ئێمە دیارە شەوێ لە هوتێل بووین. بەڵام بەیانی بۆخۆی دەگەڵمان هات بۆ قوم کە هەر بەیەکەوە دە یەک ماشێندا سوار ببووین. تەنانەت لەڕێیە هەر بۆ گاڵتە پێم گوت کاکە پێم وایە خودموختاریمان نادەنێ بەڵام لانی کەم سیغەیەکمان بدەنێ. چووینە قوم شەوێ هەموومان لە هوتێل بووین. نازانم بەڕاستی بەجیددی لەمن حاڵی ببوو یان دەیویست بمپزۆوێ، گوتی لێرە ئیمکانی شتی وا هەیە. گوتم بابە پێم‌خۆش بوو قسەیەکی خۆش بکەم دەنا سیغەی چی و شتی چی! یانی پیاوێکی ئاوا بوو کە قسەی دەگەڵ خۆش بوو.

لەوێڕا ئێمەی بردە لای ئایەتوڵلا مەکاریمی شیرازی کە ئەو وەختی ئایەتـــوڵلا نەبوو، مەقامـــی "حجت-الاسلام"ی هەبوو. هەم مودەڕڕیسی حەوزەی عیلمییەی قوم بوو، هەم ئیمامی مزگەوتێکیش بوو بەناوی "علی ابن ابی طالب". چووین قسەکانمان دەگەڵ وی باس‌کردو داوای چاوپێکەوتنی ئاغای خومەینیمان کرد. پیاوێکی بەدیققەت بوو، پیاوێکی خوێندەوارو فازیل بوو. قسەکانی هەموو یادداشت کردن. وەری‌گرتن کە وا بکا بیاندا بەخومەینی و مولاقاتمان بۆ وەربگرێ. ئێمە چووینەوە هۆتێلی و بۆ سبەینێڕا چووینەوە لای. گوتی وەڵڵا ئیمام لێرە نیە، لەتارانێیە. بەڵام دەستووری داوە ئەحمەدئاغا بتانبینێ، یانی ئەحمەدی کوڕی خومەینی. ئەو وەختی پێمان وا بوو ئەوشتە ڕاست نیە. هەر نایەوێ بمان بینێ و عینوانێکی وای دروست کردوە. بەڵام کە گەڕاینەوە تاران دەرکەوت وایە. یانی لەبەر نەخۆشی چووبووە تاران و هەر ئەو چوونەش بوو ئیدی نەگەڕایەوە قوم، لەبەر ئەوەی لەژێر موراقەبەتی پزیشکی‌دا بێ، ئیدی وا بزانم نەگەڕایەوە قوم. هەر ئەوڕۆژەی بوو کە لە ماڵی مەکاریمی شیرازی حاجی ئەحمەدئاغامان دیتو مەسەلەکانمان هێنانە گۆڕێ. کە شتەکانمان مەترەح کرد. ئەمبەرئەوبەر دانیشتبووین، مەکاریمی شیرازی گوتی حاجی‌ئاغا نەزەرت چیە؟ گوتی وەڵڵا ئەگەر خودموختاریی مەوریدی نەزەری برادرانی کورد ئەوە بێ، زۆر مەعقوول و مەنتیقی‌یەو پێم وایە ئیمامیش

حەتمەن موافەقەتی لەسەر دەکا. ئەگەر لەبیرم بێ کاک موهەندیس ئاریایی بوو لەپەنام دانیشتبوو. گوتی گوتی- ئەوەی بەئەسپایی گوت. گوتم نا ئەوە ئێی ناگا، خومەینی قبوولی ناکا. جا هەر بەڕاستیش وا دەرچوو. ئەو زۆر بەحوسنی نییەتەوە موسیبەت وەری گرتەوە لەپاشان گوتی داوا دەکەم ئەوەمان بۆ بکەن بە تەرحێک، تەرحێکی کەمێک وردتر بمانێدەنێ. ئێمە دوو شەوان لەقوم بووین و دوایە گەڕاینەوە تاران. شەوێکیش لەتاران بووین و گەڕاینەوە کوردستان. ئەگەر بەسەهوو نەچوویم هەر ئەو ڕۆژەی بوو کە گەڕاینەوە، یان ئەو بەرەکەی بۆ بەیانی بوو، چووینە خزمەت دوکتۆر قاسملوو. ئەو وەختی شوێنی کارکردنی دوکتۆری لە مەزراکەی موهەندیس ئاریایی بوو لە گوێنکەپە. لەوێ گوزاریشەکەمان پێدا کە شتێکی ئاوایە. دوکتۆر قاسملوو گوتی جا باشە ئەتۆ لەوێ بووی و لە جەریانی کارەکەدا هەی، بیکە بەتەرحو ئامادەی بکە. دیارە شتەکە هاسان بوو چونکە ئاگام لە هەمووی هەبوو.

**هیوای کاروان:** باشە بۆ هەر ئەو تەرحەی پێشووتان نەدەدا، ئەو ٦ ماددەکە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** چونکە ئەو شتی وردتری دەویست ئەمن هەمووی ئەوانەم ماون بەڵام بەداخەوە لە جێگایەکن کە دەستم پێیان ڕاناگا. شتەکەم ئامادە کردو ئەوجار هەستام چووم. پیاو لەوەختی خۆیدا یان ئەزایەکە جۆرێکی دیکە بووە یان هەست پێناکا، چونکە دوایە کە بیرم لێ دەکردەوە یان تازا بووم یان بێ سەلیقە بووم. چونکە بە تاقی تەنیا ملی ڕێگام گرتو چووم. ئاخر ئێمە جارێکی ٨ کەس بووین جارێکی ٦ کەس بووین جارێکی ٣ کەس بووین و جارێکیش بەتەنیا چووم. بە تاقی تەنیا، بەبێ موحافیزو بەنێو ئەو هەموو هێزەی دەوڵەتدا چوومەوە تاران و دووبارە ئەو ئاغای دوکتۆر سەدرم دیتەوە. دەگەڵ وی چووین و تەسلیممان کرد. قەول وا بوو جوابمان بدەنەوە. پێم وایە جوابەکە ئەوە بوو کە دەستووری حەملەو لەشکرکێشی‌یەکی دیکەیانداو شەڕێکی دیکەمان بەسەردا سەپایەوە.

**هیوای کاروان:** ئیدی ئەو ئێوەیدا ئێوە کەستان لە دەوڵەت نەدەدیت. هەر ئەحمەدئاغاو سەدر بوون.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر لەواقیعدا لە دوو سەفەریاندا ئێمە هیچ کەسمان نەدیت. یانی جاری سێهەم ئەمن تەنیا مەکاریمی شیرازیم دیت. تەنانەت ئەحمەدی خومەینیشم نەدیەوە. بەڵام شتەکانم تەسلیمی وی کردن و ئەویش قەولیدا بیانگەیەنێ و دوایە جوابمان بدەنەوە. ئیستاش ئەوە هەر چاوەڕێین جوابمان بدەنەوە. ئیدی ئەوە ئاخرین دیدارمان بوو.

**هیوای کاروان:** مامۆستا لەو هاتوچۆ و شتانەدا دوکتۆر شەرەفکەندی کە لە تاران بوو هیچ نەخشی نەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە ئەخشی تەرەف مەشوەرەتو ئەوانەی هەبوو. میوانداریی لێ دەکردین و زۆر کۆبوونەوەمان لەماڵی وی دەکردن. بەڵام دروست نەبوو دوکتۆر شەرەفکەندی بەشدار بێ. چونکە حیسابی ئەوەمان کردبوو کە ئەو لەتاران دەبێ و کاری وێ دەکا. لەواقیعدا کە شەڕ دەست پێ کرایەوە ناچار بوو بێتە دەرێ دەنا قەرار نەبوو بێ.

**هەیاس کاردۆ:** تۆ هەتا کۆنگرەی ٤ ئەندامی رێبەرایەتی نەبووی. دەکرێ بفەرمووی لەدوای هاتنەوەتان بۆ نێوخۆ هەتا کۆنگرە کە دیسان بوویەوە بە ئەندامی رێبەرایەتی چیت دەکردو بەرپرسایەتیت چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کە هاتینەوە لەواقیعدا ئەمن ئەندامی ئۆرگانێک بووم کە جێنشینی کۆمیتەی مەرکەزی بوو(زاگرۆس). هەتا ڕووخانی ڕێژیمی شایەتی و هاتنەوەی هەموو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ئەمن لەو ئۆرگانەدا کارم دەکرد. لەدوای ئەو ماوەیە هەتا کۆنگرە، ئەندامی ڕێبەری نەبووم بەڵام تەقریبەن لە هەموو شتەکان ئاگادار بووم. مەسەلەن ئەمن جوزوی هەیئەتی حیزب بووم بۆ نێو دەستەی نوێنەرایەتیی گەلی کورد. ئەگەر دوکتۆر قاسملوو حوزووری هەبایە ئەو ڕەئیسی هەیئەتی حیزب بوو، دەنا چەند جار کە کۆ دەبووینەوە ئەمن دەمڕاستی هەیئەتی حیزب لەوێدا بووم. لەپاشان لە ڕۆژنامەی کوردستان کارم دەکرد. لەوێ وەکوو مەسئوولی ئینتیشاڕات کارم دەکرد. ئەوە ئەو وەختی بوو کە لە ماڵەکەی ئەحمەدی خوداپەرستدا بووین لەپەنا خانەی جەوانانی مەهاباد. دوایە لە شەڕی سێ مانگەشدا هەر وەک مەسئوولی ئینتیشارات وەدەر کەوتین بۆ شاخی. بەڵام لە هەموو شتەکاندا بەتایبەت دوکتۆر قاسملوو قەت فەرقی بەوە نەدەکرد داخوا ئەندامی دەفتەری سیاسیم یان نا. چونکی بۆ هەمو شتێک تەرەف مەشوەرەت بووم. وەکی عەرزم کردی خۆ دەگەڵ هەیئەتی نوێنەرایەتیی دەوڵەتیش هێشتا کۆنگرە نەگیرابوو. یانی کە یەکەمجار هاتین و دەگەڵیان دانیشتین، ئەمن یەکێک لە ئەندامانی هەیئەت بووم. ئەو وەختیش ئەندامی ڕێبەری نەبووم.

**هەیاس کاردۆ:** دوای دەستبەکاربوونەوەی تێکۆشانی ئاشکرای حیزب و سازماندانەوەی هێزی پێشمەرگە، سەرەڕای هاتنی ئەفسەرانی نیزامی بۆ نێوحیزب و هەروەها بوونی ئەفرادی کۆنەکار، ئێوە لە ژمارەیەک کوردی باشووریش کەڵکتان وەردەگرت. ئەوانە کێ بوون و چەندە توانیان لەو بوارەدا خزمەت بکەن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڕاستی زۆر بەسەراحەت دەڵێم ئەمن لەخودی ئەو داخوازانە، لەهیچیاندا ڕاستەوخۆ بەشدار نەبووم. یانی کە داخوازی ئەوە کراوە و هاوکاری دەستی پێ کردوە. بەڵام ئەگەر لێکی دەدەمەوە لە جوابی پرسیارەکەی تۆدا، دەلیلەکەی شتێکی دیکە بوو. یانی لەسەر ئەوەی داخوا تفەنگ چۆن باوێژین و خۆمپارە چۆن باوێژین، هەروەها بۆ فێرکردنی بەکارهێنانی هیچ چەکێک ئێمە ئیحتیاجیمان نەبوو. ئێمە

ئەفسەری تۆپخانەی وەک سەرگورد عەبباسیمان هەبوو. لەپاشان ئەفسەری کارامەو بەڕاستی شارەزای وەک سەرهەنگ سمکۆ عەلییارمان هەبوو کە دیارە هەڵلای دنیایەی لەسەر ساز بوو. ئینسانی پاک و قارەمانو بەتەزمو دیسیپلینی وەکوو سەرگورد عەلییارو سەروان جاویدفەر (هەژار)و چەندین ئەفسەری لێوەشاوەمان هەبوون.

**هێمن کاردۆ:** سەرهەنگ چیا هاتبوو ئەوکاتی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** سەرهەنگ چیا داستانی هەیە. ئاها وەبیرم هاتەوە ئەوە سەرهەنگ چیا بوو کە لەگەڵمان بوو لە هەیئەتە ٨ ئەفەرییەکەدا. بۆیەشمان بردبوو کە ئەگەر دەوڵەت قەبووڵ بکا ئێمە داوامان ئەوە بوو هێزە ئینتیزامییەکان بەرێن بە کوردەکانو سەرهەنگ چیا کە ئەفسەری ژاندارمێری بوو، ببێتە مەسئوول. جالیبیش ئەوە بوو لەتاران دانیشتبووین کە باس دەکرا لە کۆبوونەوەیەکی خۆماندا، سەرهەنگ چیا مەتنی نەدەناسی. گوتی ئەمن پێمخۆشە خزمەت بکەم بەڵام ئەمن دەگەڵ حیزبی دێموکراتی "تا دندان مسلح" چ بکەم. ئەمنیش بۆ ئەوەی قسەی خراپ نەکاو دوایە بەخۆدا نەشکێتەوە، گوتم ئەمن لێرە نوێنەری حیزبی دێموکراتی کوردستانم، پێمخۆشە ئێستا پێت بڵێم ئەگەر ئەتۆ دەخزمەت خەڵکدا بی، ئەو پێشمەرگانەی حیزبی دێموکرات هەموویان ژێر فەرمانی تۆن وەکوو ئەفرادێکی بە ئینزیبات. حەقت هەیە خەتاکار موجازات بکەی، دەری بکەی، وەکوو هەر فەرماندەیەکی کە دەگەڵ ئەفرادی ژێر فەرماندەریی خۆی ڕەفتار دەکا. بەڵام ئەگەر لەڕێی خەڵک لادەی، ئەوی‌وەڵلا وات لەمەرقابیلدا ڕادەوەستن تەپڵی سەرت وەعەرزی کەوێ. دیارە هەر بەوەش کەمێک ناڕەحەت بوو کە قسەیەکی ئاوای لەبارەی حیزبەوە کردوە.

بەڵێ جا یەکیان ئەو بوو. سەروان ئەفشین، سەروان ئیقباڵی کەریم نژاد، کاک کەریمی پوور قوباد، هەروەها ژمارەیەک دەرەجەدار بوون. یانی زۆرمان هەبوون ئەگەر لەوەی بپرسی. ئەمن پێم وایە دەلیلی ئەوە کە داوای کۆمەک لە هێندێک حیزبی باشووری کوردستان کرا ئەوە بوو کە ئەوان تەجرەبەی شەڕی پارتیزانییان هەبوو. یانی شەڕی پێشمەرگایەتی. بۆ ئەوجۆرە ئاموزشە ئیحتیاجی هەبوو کە لەوان کۆمەگ وەربگرین. دەنا بۆ ئاموزشی سیلاح حیزبی دێموکرات ئیحتیاجی نەبوو.

**هێمن کاردۆ:** باشە، خۆ ئەودەمی شەڕی پارتیزانی دەگۆڕێدا نەبوو.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** دەگۆڕێدا نەبوو بەڵام دەبوو ئامادە بی، ئەگەر ئەتۆ هەر دانیشی هەتا هێرشت بۆ دەکرێ، ئەودەمی چ دەکەی، هەر وایە خۆ شەڕ نەبوو، غەیری شەڕی سنەو شەڕی نەغەدە کە ئێمە دوو، سێ‌جارمان مەرکەزی ئاموزشی پێکهێنا. جارێکیان هەر لە دەوروبەری مەهاباد بوو، یانی لەنێو شاریڕا

دیار بوو پێشمەرگەکان ئامووزشیان دەدی. دوایە چووە "خڕجۆ"یە. ئەوانەمان دادەنان. پێویست بوو ئامادەیی-یەک هەبێ. خۆ نەدەکرا دانیشین هیچ تەئزیمێکمان نەبێ هەتا شەڕەکەمان بەملدا دێ.

**هەیاس کاردۆ:** کێ بوون ئەوانەی هاتبوون؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** هێندێک کەس بوون کە ڕەنگە ناوەکانیانم لەبیر نەمابن. بەڵام دەکرێ بڵێین عومدە ئەفەری وان ئەوەی لەو لای‌ڕا هاتبوون یانی ئەوەی بۆخۆی ڕاستەوخۆ واریدی کارزارەکەش بوو، هەر کاک مەلا موحەممەدی جوانڕۆیی بوو. دیارە کەسی دیکەش هەبوون کە ڕەنگە پێیان خۆش نەبێ ناویان بێ لەبەر پێوەندی‌یەکانی ئێستایان. دەنا کەسانی دیکەش هەبوون.

**هەیاس کاردۆ:** ئەدی بانیخێلانی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە :** بانیخێلانی دەنێو ئەوانەدا نەبوو. ئەوەی گوتم ئەو حادیسەیە، ئەوە هەر نەسیحەتێک بوو، قسەیەکی دڵسۆزانە بوو. دەنا ئەو لەبەر ئێمە لە مەهاباد نەبوو، لەبەر خۆیان بوو. ئێمە کۆمەگمان کردبوو مەنزڵێکیان هەبێ بۆ هاتوچۆو کاروباری خۆیان. چونکە هاتوچۆی تارانی‌یان دەکرد یان بەتاراندا سەفەری دەرێ‌یان دەکردو پێوەندی‌یان دەگەڵ حیزبی توودە هەبوو. ئەوە وەک مەرکەزێک وا بوو بۆ ئەوان. یانی ئەوان بۆخۆیان لەوێ بوون. ئەو هیچ نەخشێکی لەو بارەیەوە نەبوو. ئەو ئەندامی دەفتەری سیاسی بوو. بەڵام کاک مەلا موحەممەد پێم وایە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییش نەبوو.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا ئەو هاوکاری‌یە هیچ بەقازانج تەواو بوو، یانی ئەو کۆمەگە جێگایەکی گرت؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** یەکجار زۆری تەئسیر هەبوو. بەداخەوە چەند کەسیان هەر شەهیدیش بوون. مەلا موحەممەدی جوانڕۆیی بۆخۆی دوو پێشمەرگەی ئازای دەگەڵ بوون کە شەهید بوون. ئی دیکەشی دەگەڵ بوون بەڵام دوویان شەهید بوون. بۆخۆی ئاموزیشی باشی دا. خوا هەڵناگرێ لەشەڕی سنەدا فەرماندەری-یەکی لایقی کرد. هیچیشی نەما داینێ. ئیدی شانسی ئێمەو شانسی خۆی ڕووحەکەی داتەنا، دەنا خۆ لەمردن گەڕایەوە. تەقریبەن چوار، پێنج ساڵانیش هەر سەقەتو نەقوستان بوو. نازانم ئەتۆ ئەودەمی دیتت یان نا. لاقێکی سەقەت بوو، پاش سێ ساڵان پێم وایە وای لێ‌هات هەم بتوانێ بی‌تووشتێنێتەوە، هەم بتوانێ پێی بڕوا.

**هەیاس کاردۆ:** ئەمن لە ڕێ‌وڕەسمی ناشتنی تەرمی سەرگورد عەبباسی‌دا دیتم کە قسەی کرد. ڕەخنەی توندیشی لە حیزب گرت کە بێ ئیحتیاتیی زۆرەو بەرنامەی نیە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە ماشەڵڵا حیزب ئەوەی هەبووە. بەڵام کەسیش لەبەر سەرگورد عەبباسی نەی‌دەوێرا. سەرگورد عەبباسی چەندی دڵت بخوازێ ئازاو بەوەرە بوو. بەڵام چەندی بشڵێی ئەوەندە دڵساف بوو. ئەوەی تێرۆری کرد جێ‌باوەڕی خۆی‌بوو. دای‌نابوو لەنێو کۆماری ئیسلامی کاری بۆ بکا. حەتتا بۆخۆی ئیجازەی دابوو بەچەکەوە بچێتە کنی. دەنا قەتم ئازایەتی‌یەکەی لەبیر ناچێ. مەسەلەن بە پێشمەرگەی دەگوت: جا تانک چییە، تانک. پاڵێکی پێوە نێ، دە دەڕپەڕێ هاوێ. هەر بەڕاستی ئەوە ڕووحیاتی بوو. لەهیچ نەدەترسا، نەدەخەجڵا، نەدەشەمزا. بەڵام لە عەینی حاڵدا ئاوا دڵساف بوو. بۆخۆی پیاوی چاک بوو، پێی وا بوو هەموو کەسیش پیاوی چاکە.

**عەبباس کاردۆ:** مامۆستا لە "نیو سەدە تێکۆشان"دا باسی جیابوونەوەی تاقمی حەوت کەسیتان کردووە وا بزانم پێویست نییە جارێکی دیکە وەردی دەینەوە. پێت وایە شتێکی تایبەتی ماوە کە بۆ باس بێ؟ بۆ نموونە هەڵوێستو ڕۆڵی خۆت لە تێکڕای ئەو ڕووداوەدا چۆن باس دەکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە پیاو لە زەمەنی کاردا حەتمەن هەڵەش بکا. یان کارێکیش بکا کە دوایە لێی پەشیمان بێتەوە. ئەمن لە ژیانمدا، هەرچەند ئێستا ڕەنگە شتێکم وەبیر نەیە، چەند جارم وا لێ‌هاتووە کە قسەیەکم کردووە لەزارم دەرچووە پاش تاوێکی لێی پەشیمان بوومەوە. چەند جار قسەیەکم کردووە کە پاش ساڵێک‌و دوو ساڵ، یان زیاتریش زانیومە قسەیەکی خراپ بووە لێی پەشیمان بووم. قسەی وام هەیە کە دەتوانم بڵێم نیزیک ٣٠ ساڵ یان زیاتر لە ڕوبەمە قەرنێکی بەسەردا تێ‌پەڕیوە، بەڵام ئێستاش لەدڵم دەرناچێ. ئەوەندەی لێی پەشیمانم. شتی ئاوا دەبێ. ئەوەیان هەر پێم‌خۆشە بڵێم ئەو کەسەی کە لەبیرێتی کە قسەکەم دەگەڵ کردووە پێم‌گوتووە، ئەگەر پاش مردنی منیش ئەو شتانەی خوێندنەوە با بزانێ کە پەشیمانم. برادەرێک بوو، بۆ کارێک هاتبووە دەفتەری سیاسی. قسەم دەگەڵ کرد، بەڕاستی دەعریی کردم. ئێستاش دەزانم کە ناحەقی بوو کە هێندەی ئەمن قەڵس کرد. بەڵام هێندەی قەڵس کردم کە هەستا بڕوا گوتی خوا حافیز،خەراپم جواب دایەوە. هەتا دەمرم لێی پەشیمانم، عوزری بۆ دێنمەوە. بەقەبری شەهیدەکانیش لەبیرم نیە کێ بوو، یانی ناوی کەسەکەم لەبیر نیە، بەڵام حادیسەکە ئەوەندە ناخۆش بوو لەسەر دڵم بۆتە گرێ.

جا مەبەستم ئەوەیە، جوزئیاتی ئەو کارانەم لەبیر نین بەڵام لە هەڵوێستەکانی خۆم پەشیمان نیم. لە هەڵوێستە گشتی‌یەکە کە گرتوومە پەژیوان نیم، چونکی ئەوانە ئەووەڵەن بە تەحریکاتی حیزبێکی دیکە، حیزبی توودە ئەو کاریان کرد. ئەویش نە بۆ قازانجی میللەتی ئێران‌و نە بۆ قازانجی حەتتا ئەو دۆستە گەورەیە کە هەیان‌بوو، یەکیەتی شووڕەوی، بەڵکە بەخاتری تاکتیکێکی غەڵەت کە سەری خۆیانی خوارد، ئەوانەی هان دەدا لە نێو حیزبی دێمۆکراتی کوردستاندا تۆوی ناهومێدی‌و تۆوی تەسلیم‌و سەردانەواندن بچێنن. تاقمی حەوت

کەسی ئاگا بوون یان نائاگا بوون، - کە دوایە دەرکەوت بەشی زۆریان بۆخۆشیان پەشیمان بوون-. کارێکی زۆر خراپیان کرد. دیارە دوایە هێندێکیان هەر لێی جودا بوونەوە. مەسەلەن مەرحوومی ڕەحیمی قازی لێیان جودا بۆوە. فەوزیە خانم لێیان جودا بۆوە. پاشان کاک ئەویدی مرعینیو ئەوانە وازیان هێنا ئەسڵەن نەیان‌کرد. کاک سەنناری مامەدی لێیان جودا بۆوە. کاک ئەحمەدی عەزیزی دواتر دیارە هەر هاتەوە نێو حیزب. هەروەها کاک ڕەحمانی کەریمی لێیان جودا بۆوە. دیارە جودابوونەوەی ئەوان بۆ شتی دیکە بوو. بەهەر حاڵ ئەوەیان دەکرد. لەپاشان دواتر کاری زۆر قەبیحیشیان کرد. مەسەلەن تەک هەر گوزاریشیان دەدا، گوزاریشی بەدرۆشیان دەدا. لەنێو شاری مەهاباد شتێکیان بڵاو کردبۆوە کە ئەمن بۆخۆم دیتم. بڵاویان کردبۆوە کە گرووهی قاسملوو لە گوندی بەیرەم ئاموزشگای سەربازی‌یان داناوەو سەرگوردە فلانو سەروان فلان، دوو ناری عەرەبی، بەعسی هاتوون لەوێ ئامووزشیان پێ دەبینن. ئەوێش چیی لێ بوو؟ تەنیا نەخۆشخانەی لێ بوو. کە نەخۆشخانە پڕ بوو لە نەخۆشو برینداری پێشمەرگە. لەسەر ئەو ڕاپۆرتە هێلی کۆپتێر چوو لێیدا، بریندارەکانی بریندار کردەوە، ساغەکانیشی بریندار کردو خەڵکیشی کوشت. یانی شتی ئاوا هەرزان قیمەتیان دەکرد.

**هەیاس کاردۆ:** ئەدی ئەوە ڕاست بوو کە گۆیا موهەندیس خەیاتییشیان بەموهەندیس "جیمی" ناو بردبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا ئەویان بە موهەندیس جیمی ناو نەبردبوو، نەخێر. ئەوە ڕاپۆرتێکیان نووسیبوو کە گۆیا موهەندیسێکی ئەمریکایی، موهەندیسی موخابەراتیان، هێناوە لە گوندی خدراوێ ئاموزش بە گرووهی قاسملوو دەدا. موهەندیس خەیاتیو موهەندیس جیمی. جا چونکە موهەندیس جیمی‌یەک دەگۆڕێ‌دا نەبوو و کاک موحەممەدی وەیسی دەگەڵ موهەندیس خەیاتی کاری دەکرد، کوڕەکانی خۆمان بە گاڵتە ئەویان ناو نابوو موهەندیس جیمی.

لەپاشان لە کۆبوونەوەیەک‌دا کە لە گوندی "برایمە"ی تیزیک "دێبۆکرێ" گیراو لەواقیعدا بناغەی ئەو جودابوونەوەو ئیعلانی مەوزیعەیان بوو، کاک غەنیی بلووریان شتێکی خوێندەوە کە پێی وابوو تەرحە. زۆر دووروودرێژ بوو، تۆمەتی تێدابوو. کە تەواو بوو گوتم کاک غەنی دەتوانم بیبینم؟ گوتی نەخێر ناتوانی بی-بینی، دەزانم ئەتۆ پێت وایە ئەمن تەپڵی بەتاڵ (طبل میان‌تهی)ام، هیچم پێ‌نیە. گوتم کاک غەنی ئەمن شتی وام نەگوتوە، بەڵام بۆ من جالیبە، چەند جارم داوا لێ کردی بەیانییەیەک بۆ حیزبی دێمۆکرات بنووسی، قەتت نەنووسی. کەچی ئێستا بۆ دژایەتیی حیزبی دێمۆکرات بوویە میرزا مەهدی‌خان، شتێکی ئاوات نووسیوە. لەپاشان بۆخۆی ئیعتیراف دەکا کە "عموبی" بۆی نووسیوم.

**عەباس کاردۆ:** عەلی گەلاوێژ، نەک عەمووبی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ڕەنگە عەلیی گەلاوێژ بێ، بەهەر حاڵ یەکێک لەو دووانە. بۆخۆی دڵێ بۆی نووسیوم بۆیە هەڵوێستەکەم بەرامبەریان توند بوو. ئەگەریش لە جوزئیاتدا شتی خراپم بەزاری‌دا هاتبێ‌و رەبیرم بێننەوە، ئازایانە دەڵێم ئەوەم غەڵەت بووە. لەو پێوەندی‌یەدا هەر بۆخۆم شتێکم لەبیرە کە پێم‌خۆش نیە تۆماری بکەم. قسەیەک بوو لەحاڵەتێک‌دا بەسەر زارمدا هات کە دەستبەجێ لێی پەشیمان بوومەوە. ئێستاش هێندەم بۆ تاڵە تەنەم لەبیر ناچێ، ئەوەندەی لێ پەشیمانم. بەڵام لەخودی خەتەکە کە لە موقابیلیاندا ڕاوەستام باوەڕم وا بوو کە ئەوانە دەیبن بە خائین بناسرێن لەوەی هیچ پەشیمان نیم. تەنانەت هەڵڵایەکی زۆر ساز کرا لەسەر مامۆستا هێمنی ڕەحمەتی. هەر لە کوردستانی عێراقیش، لەنێو ئەدیباندا هێرشمان زۆر لەسەر بوو. لەسەر شەخسی من پتر هەبوو کە هاتوچۆم دەکردو دەمدیتن. ئەمن دەمگوت لە تەواوی ئەو مەوزووعانەدا کە هاتوونە پێشێ ئاوڕێک لە هێمن نەدراوە. بەڵام کار بەکەسەکان هەڵناسەنگێندرێ، کەسەکان بەکارەکەیان هەڵ-دەسەنگێندرێن. ئاکرێ ئەو کارەی کراوە بۆ هەمووان غەڵەت بێ، بۆ وی دروست بێ. هەمووان گوناحیان کردبێ، ئەو خێری کردبێ. دەمگوت بابە خۆ ئێوە گلەییتان لەوە نیە کە مەسەلەن گوتوومانە خائینن. گلەییتان لەوە نیە کە غەنیی بلووریانی ٢٥ ساڵ زیندانی‌دیتوو پێی گوتراوە خائین. ئەوی دیکە پێی گوتراوەو ئەوی دیکەش پێی گوتراوە. باسەکە هەر لەسەر هێمنە. ئاخر هەمووان یەک کاریان کردوە. چۆن دەکرێ یەک کار کە ٧ کەس کردوویانە بۆ شەش کەسیان گوناح بێ، بۆ یەکیان حەسەنات بێ. شتی ئاوا مەعقوول نیە.

دەنا مەسەلەن مامۆستا هێمنی شاعیر، ئەووڵەن لەمن زۆر نێزیک بووە، وەختێ خۆی هەتا ئیختیلافاتی سیاسی دەبەین‌دا نەبوو، زۆر ڕەفیق بووین. لەپاشانیش سەرفی‌نەزەر لە خۆشەویستی‌و ناخۆشەویستی، یان ناسین‌و نەناسینی، شاعیرێکی زۆر گەورەی کورد بووە. هەمیشە وام دیوە هەمیشەش هەر وای دەبینم.

**عەباس کاردۆ:** لە ڕێبەرانی ئەو دەستە ٧ کەسی‌یە: کاک ئەحمەدی عەزیزی دواتر هاتەوە نێو حیزب. دوکتۆر ڕەحیمی سەیفی قازی‌و مامۆستا هێمن کۆچی دوایی‌یان کرد. ئەدی ئەوانی دیکە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوانی دیکە، فەوزیە خانم لە ماڵی خۆی دانیشت. هەرخانمێکی موحتەرەمەو لەجێگای خۆیەتی. کاک غەنی دوای هەوڵ‌و تەقەلایەک کردیانە ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزبی توودەو هەروا بە درۆ قەولی زۆریان پێ‌دا کە هیچیشیان بۆ نەکرد. ئەویش ئەوە دانیشتوە لە دەرێیە. کاک فارووقی کەیخوسرەوی لە نێوخۆی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە. کاک ئەویدی موعینی لە دەرێیە، بەڵام ئەمنیش بۆم سوئالە کە بۆچی لە هیچ جێگایەک خەبەری نیە. ئەو هەر ناوی نیە. کاک ڕەحمانی کەریمی کوژرا. دیارە ڕەحمانی کەریمی‌و سەنناری مامەدی دەگەڵ دەستە ٧ کەسی‌یەکە نەبوون. ئەوان دوایە جیا بوونەوە بەڵام

رەگەڵ وان کەوتن کە دوایە لەوانیش دابڕان. کاک سەتتاری مامەدییش چووە دەرێ و ئەو دوایی‌یانە کۆچی دوایی کرد.

**هیاس کاردۆ:** پێم‌خۆشە ئەو پرسیارەت ئاوا لێ بکەم هەرچەند بڕێکیشت باس کرد. دەگوترا هەڵوێستی حیزب بەتایبەت بەرامبەر مامۆستا هێمن نامونسیفانە بووە. ئەوکات چۆنت لەبارەی ئاوبراودا فکر دەکردەوە ئێستا چۆنی لێ دەڕوانی؟ دەگەڵ ئەوە کە خەڵک زۆریان خۆش دەویست و لە ناوچەی ئازادکراویش بوو. بەڵام حیزب گرتی و لەو بارەیەوە بڕێک گلەیی لە حیزب کرا.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەو بارەیەوە گلەیی لەحیزب کرا لەوێش و لێرەش. بەڵام ئەووەڵەن جارێک لەجاران ناوی مامۆستا هێمنی نەهات، لە هیچ کوێ. شتەکە جەمعێک کردبوویان. گرووهی ٧ کەسی، ٦ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی تێدا بوون دەگەڵ مامۆستا هێمن کە ئەندامی ئیفتیخاریی کۆمیتەی ناوەندی بوو. بەڵام هەر وەکوو باست کرد، لە "شیلاناوێ" دەژیا و حورمەتیشی دەگیرا و هاتوچۆشی دەکرا و هیچ کەسیش هیچی پێ نەدەگوت. تەنانەت جارێکی ئاردەمانە کنی، گوتمان شتێک بنووسێ کە ئەو کارە خراپ بووە. جا بۆخۆشی گوتبووی. گوتبووی فلانە کەس هێندەی ویسکی دامێ بۆخۆشم نەمزانی چیم ئیمزا کردوە. قەولیشی دابوو کە شتێکی وا بنووسێ، بەڵام هەر ئەوڕۆژە چووبوونە لای و قسەیان بۆکردبوو و دیاری‌یان بۆ بردبوو، پەشیمان ببۆوە. هیچی خراپەی دەگەڵ نەکرا نە بەعەمەل و نە بەقسە. بەڵام دوایە مامۆستا هێمن گیرا.

ئەو بەیانە دوو، سێ شت نووسران لە زیدی من کە سێ ساڵم دەزیندانێ کردوە. نازانم دەورانی گیرانی مامۆستا هێمنی گەیشتە مانگ‌ونیوێک یان نا. ئەمن لە مەنتەقەی سنە بووم کە مامۆستا هێمن گیراوە. نە لەدوورو نە لەنیزیک خەبەرم لەباسەکەشی هەر نەبووە. کە هاتیشمەوە هیچ ئیعتیراز‌ێکم بەگرتنی نەکرد. ئەوەی بۆیە دەڵێم تا دەگەڵ خۆم و دەگەڵ خودای خۆم و دەگەڵ میللەتی خۆم سادق بم. هیچ ئیعتیرازێکم نەکردوە. بەڵام ئێستا کە تەماشا دەکەم بەڕاستی کارێکی هەڵە بوو. چونکی هێمن بۆ گرتن نەدەبوو. هێمن چیی دەکرد؟ ئاخر مریشکێکت دابا بە هێمنی پێی سەر نەدەبڕا، ئەوەندە بێ‌ئازار بوو. جاسووسییشی نە پێ دەکراو نە دەی‌کرد. بۆیە ئێستا پێم وایە گیرانەکەی کارێکی بێ‌جێ بووە. ئەو وەختی ئیعتیرازم نەکردوە بۆ ئەوەی بڵێم وەڵڵا نارازی بووم. پێم وایە لەم وتووێژانەدا لەچەند جێگایەک گوتوومە ئەمن ئەزەرم خیلافی ئەزەری کۆمیتەی مەرکەزی بووە. نامەوێ خیلافی واقیع بڵێم، کە هاتمەوە هیچ ئیعتیرازێکم نەکرد. بەڵام هەم دواتر و هەم ئێستاش کە فکرم لێ کردۆتەوە، پێم کارێکی هەڵە بووە. وەختی خۆشی کە ئەو نەی‌نووسی و هەروا مایەوە، ئەمن زۆرجار موخالەفەتم دەکرد کە مەسەلەن شێعرێکی وی لە موناسەبەتێکدا بخوێننەوە. دەمگوت حیزبی سیاسی دەبێ تەوازونی عەقڵیی هەبێ. ناکرێ بە یەکێک بڵێی خائین، شێعرەکەشی وەک سەنەد

بخوێنینەوە. دوایە هەر لە دەورانی منەدا بوو کە شتێکمان دەرکردو ئەوەی پێی دەڵێن ئیعادەی حەیسییەت، ئیعادەی حەیسییەتمان لێ کرد. جا پیاوێکی خوێندەوارو فازیل کاک "جعفر شیخ الاسلامی" شتێکی لەسەر ئەوە بڵاو کردەوە. نووسیبووی ئیعادەی حەیسییەت یانی حەیسییەتی نەمابوو؟ قەتم جواب نەدایەوە بەڵام با ئێستا بێتە جواب. زۆر جێگای داخ بوو کە ئینسانێکی ڕووناکبیر، خوێندەوارو شاعیر ئاوا لە مانای ئیستیلاحاتی سیاسی بگا. لەواقیعدا ئەوەی پێی دەڵێن ئیعادەی حەیسییەت، ئیعتیراف بەوەی کە ئەو کەسە موستەحەقی ئەو سزایە نەبووە کە بۆی دانراوە نەک ئەوە کە حەیسییەتی چووەو ئابڕووی چووەو ئەمن ئابڕووی دەدەمێ. بەهیچ جۆر مانای ئاوا نادا. هەمیشە ئیعادەی حەیسییەت لەوانە دەکرێتەوە کە ئەو سزایەی لەوەختی خۆیدا بەسەریاندا سەپاوە، لەجێی خۆیدا نەبووە. ئیعادەی حەیسییەتەکە لە دەورانی منداو بەئیبتیکاری منو بەپێشنیاری من کراوە.

**هیاس کاردۆ:** ئەوە ساڵی چەند بوو مامۆستا؟
**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەتۆ دەبیرم بێتەوە ئەگەر لەبیرتە. بە ئیحتیماڵی زۆر ساڵی ١٩٩٥ بوو.

**هیاس کاردۆ:** مەسەلەی ڕەحمەتی سەنتاری مامەدیو جەهانگیری ئیسماعیلزادە بڕێک پرسیارخولقێن بوو. ئایا ئەوانیش هەمان ڕێگای تاقمی ٧ کەسییان گرت یان شتێکی دیکە بوو؟ ئەدی ڕەحمانی کەریمی بۆ کوژراو کێ کوشتی؟ حیزب هەتا چ ڕادە لەو مەسەلەیەدا دەستی هەبوو؟
**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوان جەریانێکی دیکە بوون. هەموو شتێکیان فەرقی هەبوو. یانی ئەو کەسانەی دەگەڵ شتێکی موخالەفەت دەکەن دەبینی لە هێندێک شتدا وێک دەکەونەوە. دەنا ئێستا کاک سەتار کۆچی دوایی کردوە ڕووحی شادبێ، دەگەڵ کاک موهەندیس جەهانگیری ئیسماعیلزادە بەڕاستی قەت نەدەبوو وەک یەکیان دابنێی. موهەندیس ئیسماعیلزادە پیاوێکی زۆر سەلیم، دەعەینی حاڵدا خوێندەوارو بەفەرهەنگ بوو. دەحاڵێکدا کاک سەتار پیاوێکی دوربەگ‌سیفەتو ملهوڕ بوو. ئەوە ئەزەری من نیە چونکە ئەمن زۆریشم لە نیزیکەوە نەدەناسی، بەڵام زۆر کەس پێیان وابوو کە کاک موهەندیس لە سەتاری دەترسێ بۆیە ڕاگەڵی کەوتوە. پاشان ئەو دووانە توودەیی‌و تووده‌زەده نەبوون. کاک ڕەحمانی کەریمی تووده‌زەده بوو. کاک ڕەحمانی کەریمی دەگەڵ ئەوەدا کە فەرماندەی پێشمەرگە بوو، پایەگای "سەرگردە"ی پیرانشاری بەپانەوە تەسلیمی هێزەکانی کۆماری ئیسلامی کردو جا ئەوجار دەگەڵ دەوڵەت کەوت. پاشان کاک ڕەحمانی کەریمی کاری زۆر خراپی کرد. نازانم ئەوە شانس بوو، زانایی بوو، نازانی بوو یان هەموو شتێک بوو دەستیان وەدەستی یەک دا کە دوکتور شەرەفکەندی‌و کاک مستەفای شەڵماشی لە پیلانەکەی ئاگادار بوون دەنا

ئەوانیشیان گرتبوو. لەلای خۆی داوایان کردبوو نوێنەرانی دەفتەری سیاسی بۆ وتووێژ لەبارەی چارەسەری مەسەلەی کوردەوە بچنە ئەو ناوچەیە. دوکتور قاسملوو پێی باش بوو ئەو دووانە بچن. لە شنۆیە تەماشا دەکەن بابە ئەوە خەڵکی دنیایەیان کۆ کردۆتەوەو خەریکی ئەوتینەیەکی گەورەن کە دەیانەوێ بۆخۆیان جەمعێکن پاڵ وەحکوومەت بدەن جەمعێکی دیکەش دەگەڵ خۆیان بەرن. دیارە کاک مستەفا داستانی ئەوەی جارێکی باس کردوە، بەڵام لەبیرمە کە هاتنەوە بەحەق کاک دوکتور سەعید گوتی شانازی بە ئیبتیکارو بەتواناو بەزیرەکی و ئازایەتیی کاک مستەفای شەڵماشی‌یەوە دەکەم. گوتی هەم ڕووحی خۆی و هەم ڕووحی من، هەم ئابڕووی حیزب و هەم تەشکیلاتی حیزبی دێمۆکرات لەو مەنتەقەیە، زیرەکیی کاک مستەفای شەڵماشی نەجاتی داوە. ئەوە شاهیدی‌یەک بوو کە کاک سەعید لە دەفتەری سیاسی بۆ کاک مستەفای دا.

مەبەستم ئەوەیە ئەوانە یەک نەبوون. بەڵام دوایە کە هەموویان موخالیف بوون، وەسەر یەک کەوتن و ئەنانەت دەگەڵ گرووپی ٧ نەفەریش هەر لێکیان دایەوە. چونکی هەموویان موئادیی ئەو قسانە بوون کە گۆیا کۆماری ئیسلامی خودموختاری دەداو لەو شتانە. مەسەلەن مامەغەنی لە جێگایەک‌دا نووسیبووی، نازانم لەکوێ‌دا بوو، کە جمهوریی ئیسلامی پیاوی وەک ئایەتوڵڵا مەکاریمی شیرازیی تێدایە. ئەو پیاوە فازیلەو ئەو پیاوە بەحوسنی نییەتە. ئەوە لەحاڵێک‌دا بوو کە هەر نەی‌دیبوو. هەرچی بیستبووی لەزمان منەوە بیستبووی، چونکە ئەمن دیتبووم و قسەم دەگەڵ کردبوو، باسێکی دوورو درێژمان هەبوو. دیارە پیاوێکی فازیل بوو بەڵام ئەمنیش دەمزانی بەزمانی وی بدوێم، چونکی ئەمنیش کۆنەمەلا بووم. جا کە دادەنیشتین پاش باسە سیاسی‌یەکە، بەچەند سەعات باسی شتی دیکەمان دەکرد. ئەو مەسەلەن شتی وای گوتبوو.

ئەوە کەداخوا حیزب دەستی دەو کارەدا هەبووە یان نا، تا ئەو جێگایەی ئەمن ئاگام لێ‌یە، بەقەت سەری موویەک حیزبی دێمۆکرات ئاگای لەو قەتڵە نەبوو. یانی دەفتەری سیاسیی حیزبیش وەک خەڵکی دیکە زانی و خەبەری پێ گەیشت کە ڕەحمانی کەریمی بەدەستی سەنتار مامەدی کوژراوە. ئیختیلافاتی خۆیان بوو، یان دەیویست ڕێگای خۆی پاک بکاتەوە لەلای بزووتنەوەی کورد لەبەر ئەوەی پێی وا بوو ئەو کارەی کردوویەتی شتێکی نادروستە. نازانم. جا سەنتاری مامەدی ڕەوابیتی دەگەڵ عێراقی‌یەکانیش ساز کردبوو، سیلاحی بۆ هاتبوو. ئەوانە هەموویان ڕوویاندا.

**هەیاس کاردۆ:** موهەندیس جەهانگیر چیی لێ‌هاتەوە مامۆستا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** موهەندیس دوایە ڕۆیشت بۆ دەرێ و ئێستا ئەوە لە هوڵەندە. بەداخەوە لەباری سیاسی‌یەوە فەعال نییەو دەگەڵ هیچ گرووهێکی سیاسی هاوکاری ناکا. بەڵام ئێمە هەمیشە حورمەتمان گرتووە

ئەمن دوو، سێ جار کە چوومەتە هۆڵەند، هەتا فورسەتم بووبێ سەرم داوە. یان لە ماڵی خۆی، یان لە جێگای دیکە دیتوومە.

**هیواس کاردۆ:** ئێستا پێتوایە ئەگەر ئەو جیابوونەوەیە ڕووی نەدابا و حیزب بەو تەرکیبەوە مابایەوە قازانجی هەبوو یان زەرەر؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە دەبێ جوابەکە ئاوا بدەمەوە کە ئەگەر ئەوەش نەبایە، جمهووریی ئیسلامی هەر ئەوەی دەکرد کە کردی. بەڵام لەوەیدا گومان نیە ئەگەر ئەوە نەبایە، ئەگەر قازانجی گەورەشمان نەکردبا خۆ زەرەرەکانمان دەگەڕانەوە. خۆ ئەو دووبەرەکی‌یە دروست نەدەبوو. خۆ ئەو خەڵکە پاسیڤ نەدەبوون. خۆ ئەو خەڵکە دانەدەنیشتن. حەتتا هێندێک کەس لەو نێوەدا کوژران ئەو گیانانەمان بۆ زەخیرە دەبوون. زۆر قازانجی دیکەشی هەبوون. بەڵام ئیدی ئەوە نا کە بڵێی چارەنووسی میللەتی کورد بەجۆرێکی دیکە دەبوو. جاروبار دەوەیدا موبالەغە دەکرێ. تەنانەت زۆر وەختێ وا بووە کە خەڵک گوتوویانە ئەگەر حیزبی دێموکراتی کوردستان ملی ڕاکێشابا، جمهووریی ئیسلامی حەقی دەدا. دیارە بەو کەلیماتەیان نەگوتوە، بەڵام گرتبوویان حیزبی دێموکراتو هێزە سیاسی‌یەکانی دیکە شەڕیان بەجمهووریی ئیسلامی فرۆشتوە. کە ئەوە تۆمەتێکی یەکجار زۆر ناڕەوایەو گوناحێکی گەورەیە کە دەکرێ. ئەوە کە گۆیا میللەتی کورد لە ئێران هەموو مافە ئازادی‌یەکانی دەست دەکەوتو کوردی وڵاتانی دیکەش بە جمهووریی ئیسلامی خەنی دەبوون، ئەوە هەمووی موبالەغەیە. جمهووریی ئیسلامی ئەوەی دەماهییەتی‌دا بووە کردوویەتی. ئەگەر مەوقیعییەتی زەعیف بووە جۆرێکی عەمەل کردوە، دیارە زیرەکانە. ئەگەر بەقووەتیش بووە لێی‌داوە. خومەینی‌یەک کە پەیامی ٢٦ی ئابانی دا، هەر ئەو خومەینی‌یە بوو کە بەجۆرێک لەجۆران ئەگەر نەشڵێم فتوای جیهادی لە دژی میللەتی کورد دا، بەڵام ئیعلانی شەڕ بەدژی کوردی کرد. بۆیە ناڵێم فتوا بۆ ئەوەی دەقیق بێ. چونکە ئێمە زۆرمان گوتوە. قەت فتوایەکی وای نەدا کە بڵێ بڕۆن کوردان بکوژن، کورد خوێنیان حەڵاڵە. ئەوەی لەباری تەبلیغاتی‌یەوە دەیڵێین شتێکی دیکەیە. ئەو قسەکانی لە دژی حیزبی دێموکرات کردن، حیزبی دێموکراتو بزووتنەوەش وایان تەفسیر کرد کە ئەوە هێرشە بۆسەر هەموو کورد، چونکە ئەو دووانە لێک جیا ناکرێنەوە. دەنا ئەو فتوایەی نەدا. بەڵام ئیعلانی شەڕ، خۆ ئەو کردی. خومەینی‌یەک کە لە موقابیل عێراقدا جامی ژەهری نۆشی، هەر ئەو خومەینی‌یە بوو کە لەپاش فەتحی خوڕەمشار کە عێراقو هەموو وڵاتانی عەرەبی موافیق بوون شەڕ ڕابگرن و ٥٠ میلیارد دۆلاریش غەرامەت بدەن بە ئێران نەی‌کرد. یانی مەسەلە هەلومەرجەکەیە، لەوەیدا شت دەگۆڕێ. دەنا ئیتەکەو سیاسەتەکە عەینی شت بووە. ئەوەش نەبایە، حیزبی دێموکراتیش تەسلیم بایە فەرقەکە هەر ئەوە بوو کە وەک بەرخ سەر دەبڕاین. بەڵام کە

لەبەرامبەر هێزەکانی جمهوریی ئیسلامیدا موقاوەمەتمان کرد ، ئەوانەمان کە شەهید بوون قارەمانانەو سەربەرزانە مردن. ئەوانەش کە ماون - شانسیان هێناوە کە شەهید نەبوون یان هەرچی - بەسەر بەرزی ژیاون.

**هەیاس کاردۆ:** دوای یەکلابوونەوەی مەسەلەی مامەغەنیو لایەنگرانی، حیزب زیاتر بەرەو دیفاعی چەکدارانە ڕۆیشتو هەروەک دیتمان دواتر شەڕێکی قورسو بەردرێژ لە کوردستان دەستی پێ کرد. ئایا تەنیا هۆی ئەوە هەڵویستی توندی ڕێژیم بوو یان هۆی نێوخۆییو دەرەکییشی هەبوون؟ تکایە بە وردەکارییەوە.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وا نیە دوای ئەو جەڕیانە ئەو تاکتیکە دروست بوو. ئەو تاکتیکە بوو کە مامەغەنیو ئەوانی دیکەی وا لێ کرد. ئەگەر بێئەدەبی نەبێ لە خزمەت بەتایبەت مامەغەنیدا، ئەمن پێم - وایە ئاوبراو هەر بۆیە ئەو هەڵوێستەی گرت کە توانای ئەو موقاوەمەتەی نەبوو. چونکی ساڵەکەی پێشتر کەمێک خۆی تاقی کردبۆوە. ئیدی ئەو توانایەی دەخۆیدا شک نەدەبرد بۆیە ئەوەی کرد. مەسەلە ئەوە بوو. ئاخر دوکتۆر قاسملوو دوای جودابوونەوەی ئەوان میتینگێکی لە مەهاباد ساز کرد. ئەوەش بۆخۆی داستانێکی خۆشی هەبوو کە ئەوەیان ناگێڕمەوە. بەڵام لە زیمنی میتینگەکەدا دوکتۆر قاسملوو ڕووی لە خەڵکەکە کردو گوتی فەلسەفەیافیی ناوێ. مەسەلەکە زۆر سادەیە. ئەویش ئەوەیە: چەک دائێنین یان دائەنێین؟ نازانم چەند دەهەزار کەس دەبوون خەڵکەکە، ٨٠ هەزار بوون، چەند بوون، لێکڕا یەکدەنگ هاواریان کرد دایناێنین. مەسەلەکە هەر ئەوە بوو. کەوابوو با بڵێین ئەو خەتە دیفاعییە پێشتر گیرابوو. ئەوان لەسەر ئەوە ئەو هەڵوێستەیان گرت. چونکە لەلایەک حیزبی توودە ئەو تەحریکاتەی دەکرد. لەلایەکی دیکەش مامەغەنی کە مەسئوولی یەکەمیان بوو، ڕەمزەکەیان بوو، بۆخۆی ئەوتوانایەی دەخۆیدا شک نەدەبرد. کە بێ جارێکی دیکە واریدی ئەو مەیدانە بێ. کەوابێ شەڕەکە دوایە پەیدا نەبوو، نیازەکە دەپێشدا هەبوو.

پاشان ئەگەر ئێستا تەماشای ئەو هەلومەرجە بکەین کە ئەودەم تێیدا بووین، دەبینین کە زۆر کەس بەداخەوە خراپ حاڵی ببوون. بەڵام حیزبی دێمۆکراتو لەسەرووی هەموواتیشەوە ڕێبەری ئەمر دوکتۆر قاسملوو جوان حاڵی ببوونو دەیانزانی چی دەکەن. جارێکیان لە کۆبوونەوەیەکدا گوتی پێماندەڵێن موزاکەرەجوو (وتووێژخواز). پێیان وایە موزاکەرەجوویی جنێوە. بەڵێ ئێمە موزاکەرەجووین. خۆ ئێمە پێمان وا نیە بە(٣٠٠٠) سێهەزار کلاشینکۆف - کە دیارە زیاترمان هەبوو - دەتوانین جمهوریی ئیسلامی بڕووخێنین. ئێمە بۆیە ئەو موقاوەمەتە دەکەین کە جمهوریی ئیسلامی بڵێ ئەرێ بابە چیتان دەوێ. ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە کە لە ڕێگای موزاکەرەو دانیشتنەوە نەبێ مەسەلەکە حەل ناکرێ.

**هێمیس کاردۆ:** مامۆستا عێراق هیچ فشارێکی بۆ نەهێنان کە شەڕ بکەن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** عێراق تاقە یەک‌جار داوای لەمە کرد شەڕ بکەین. ئێمە عێراقی‌یەکانمان وا ڕانەهێنا بوو پێمان بڵێن وا بکەن‌و وا مەکەن. عێراقی‌یەکان لانی کەم دەیانزانی "کەللەڕەقتر" لەوەین کە بەقسەیان بکەین. ئەگەر پێیان وانەبووبێ ئازاترین، یان ئازادەتـرین، لانی کەم دەبـوو پێیـان وابێ بێ‌ئەقڵتـرین. چونکی چـاک دەیانزانی بەقسەیان ناکەین‌و هەربۆیە ئیجازەیان بەخۆیان نەدەدا داوای ئاوامان لێ‌بکەن. بەڵام وەختێکی بەیامی ٢٦ی ئابانی خومەینی بڵاو بۆوە، عێراقی‌یەکان ناردیان گوتیان هەرچی دەیانەوێ دەیانده‌ینێ، ئەگەر تانکیان دەوێ تانکیشیان دەدەینێ. بەڵام خومەینی درۆیە دەکا، باوەڕی بەحەقی کورد نیە، با شەڕەکەی ئیدامە بدەن. حیزبی دێموکرات گوتی ئێمە داخوازێکمان لە دەوڵەتی مەرکەزی هەیە. ئێستا دەوڵەت دەڵێ با موزاکەرەی لەسەر بکەین، ئێمەش موزاکەرە دەکەین. دەنا لەبیرم نیە قەت ئەوان بەئێمەیان گوتبێ شەڕ بکەن یان شەڕ مەکەن. حەتتا وای لێ‌هاتبوو کە زۆرجار دادەنیشتین، دەیانگوت ئەوە قەراری خۆتانەو بۆخۆتان چاکتر دەزانن. تەنانەت لەبیرمە دەجیهەتی عەکسی ئەوەدا دەگەڵ شەخسی خۆم کێشە پەیدا بوو.

ساڵی ١٣٦٣ کە دەبوو بە ١٩٨٤، لە بەغدا کۆنفرانسێکی ئێنتەرنەسیۆناڵ‌یان پێکهێنا لەسەر سوڵح لە نێوان ئێران‌و عێراقدا. یان سوڵح لەخەلیج شتێکی ئاوایان ناو لێ‌نا. خەڵکێکی زۆریان بانگ کردبوو کە داوا بکەن ئەو شەڕە تەواو بێ. چونکە عێراق شەڕێکی کردبوو، وەک داستانی کابرای کە ورچ بەچۆمی‌دا دەچوو پێی وابوو پێستە بەتێرە. خۆی تێ‌هاویشت کە بی‌گرێتەوە کەچی ورچ ئامێزی پێدا گرت‌و دەگەڵ خۆی برد. خەڵک هاواریان دەکرد دەیانگوت دەستی لێ‌بەردە با نەجاتیت بێ. دەی گوت ئەمن دەستم لێ‌بەرداوە ئەو دەستم لێ‌بەرنادا! عێراقیش ڕاست وای لێ‌هاتبوو، دەیەویست شەڕەکە تەواو بێ. نیوەڕۆیەکی بەرپرسانی عێراقی دەعوەتێکیان بۆ هەیئەتەکەی ئێمە ساز کرد. لەسەر نانخواردنێ باسی ئەوەیان کرد کە گۆیا پێشنیاری سوڵح بە ئێوە کراوە، داخوا ئەوە ڕاستە یان نا؟ لە ئێمەیان پرسی. ئەگەر شتێکی ئاوا بێ یانی ئێوە موزاکەرە دەگەڵ جمهوریی ئیسلامی دەکەن؟ گوتم پێشنیارێکی ئاوا نیە، بەڵام هەرکات شتێکی ئاوا هەبێ، ئێمە دەی کەین. گوتیان چۆن چۆن دەی کەن، ئەو ڕژێمە چۆن جێی باوەڕە؟ یەکیان زۆری ئیسرار دەکرد. هەتا ڕووم تێ‌کردو گوتم ئەدی ئەتۆ بۆ شەڕت‌و غەربت دەعوەت کردوە دەڵێی سوڵحم دەگەڵ بکە؟ ئەتۆ وەک وی دەوڵەتی، ئەرتەشێکی بەقووەتت هەیە، پووڵی دنیایەت هەیە، هەموو وڵاتانی عەرەبیت لەپشتن. ئێمە بەخۆمانو چەند هەزار کلاشینکۆفەوە بۆ دەگەڵ جمهوریی ئیسلامی سوڵح نەکەین؟ ئیدی کابرا قسەی پێ‌نەما.

نووسیبووشی کە فلان‌کەس لە عەرەبی‌یەوە کردوویەتە کوردی. بۆ ئەوەی سایتیش بێ کە ڕاست دەکا بەخەتی من پیادەی کردبوو.

جارێکی دیکەش ڕێک‌کەوتنێک کرا کە ساڵی ١٣٥٨، یان ٧٩ی زایینی بوو. لە مەنتەقەی "شێنێ" کۆبوونەوەیەک کرا لە بەینی زۆر هێزی سیاسیی کوردستانی. ئەگەر بەهەڵە نەچووبم هێزێکی کوردستانی تورکیەشیان تێدا بوو. لەسەر شتێک ڕێک‌کەوتن کە وەزعییەتی جوغرافیایی کوردستان وا هەڵکەوتوە کە بزووتنەوەی کورد لەهەر بەشێکی‌دا، لە هەموو لایەکەوە ئابلووقە دراوە. بۆ ئەوەی ئەو بزووتنەوەیە هەناسەی لێ‌نەبڕێ، بۆ ئەوەی بتوانێ ڕێگا بۆ دەرەوە پەیدا بکا، حەقی موسەللەمیەتی کە دەگەڵ دەوڵەتانی حاکم بەسەر کوردستاندا پێوەندی بەرقەرار بکاو لەو ناتەبایی‌یانە کە هەن کەلک وەربگرێ. بەڵام هێندێک شەرتی تێدا باس کرابوون. لەوانە ئەوە بوو کە ئەو پێوەندی‌یە وا تەنزیم بکرێ کە بە هیچ‌جۆر سەر نەکێشێتە بەستراوەیی. یانی جۆرێک بێ کە ئەو هێزە کوردستانی‌یە هەرچی دەکاو هەر بڕیارێکی دەیدا بۆخۆی بیدا. شتێکی دیکەی کە زۆر موهیم بوو تێی‌دا بوو ئەوە بوو کە پێوەندیی هێزێکی سیاسیی کورد دەگەڵ دەوڵەتێکی حاکم بەسەر کوردستاندا، بەهیچ جۆر بە زیانی کوردی ئەو بەشەی کوردستان تەواو نەبێ. ئەوە تەوافوقی لەسەر کرا. بەڵام نازانم -هیچ نەبێ ئەمن لەبیرم نیە- ئیمزا کرا یان نا. لەوەدا شکم نیە کە ئەوە فۆرموولە کرا، بە نووسین فۆرموولە کرا، بەڵام ئایا تەرەفەکان ئیمزایان کرد یان نا، لەبیرم نیە. وەکی دیکە هیچ تەوافوقێکی ئیمزاکراوم پێ شک نایە.

**هەیاس کاردۆ:** ئەوە حیزبی دێمۆکراتو یەکیەتی و کۆمەڵەش بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ کۆمەڵەش بوو. فیدایی‌یان بوون. حیزبی شیوعی بوو. حیزبێکی کوردستانی تورکیە بوو کە ئەو وەختی هەبوو، واتە پارتی سۆسیالیستی کوردستان.

**هەیاس کاردۆ:** جا فیدایی‌یان بۆ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** چریکیش لەوێ بوون. ئەوان شاخەی کوردستانیان هەبوو، ئەوان لەوێ بوون. چریکی فیدایی ئەو وەختی لە هەموو شتێک‌دا بەشدار بوو. تەنانەت بوو بە یەکێک لە کۆڵەکەکانی دەستەی نوێنەرایەتیی گەلی کوردیش. کۆمەڵەش هەروا، ماوەیەکی زۆر شاخەیەک بوو لە حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و دە هەموو‌شتێکیش‌دا بەشدار دەبوو. ئێستاش بەشێکی کۆمەڵەی هەروایەو دێ بەشدار دەبێ.

* شەڕی پارتی لە دژی حیزبی دێموکرات هەتا چ ڕادەیەک بوو بەهۆی لێک نزیک‌بوونەوەی حیزب‌و یەکیەتی؟ ئەوە کەی بوو؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** بەداخەوە ئێمە ئەو شەڕەمان تووش بوو کە دیارە شتێکی زۆر خراپ بوو، کە پیاو ناوی لێ دەداتەوە خەفەتی لێ دەخوا. لەو لاشەوە ئەوانیش بۆخۆیان لە حاڵەتێکی خراپ‌دا بوون. بەڵام پێم‌خۆشە دوو شت بڵێم:

یەکیان ئەوەیە کە پێوەندی‌یەکان دەگەڵ یەکیەتی پێش ئەوەی ئەو شەڕە پەیدا بێ چاک بووبوونەوەو دۆستانە بوون، ئەوە لایەکیان. لای دیکە ئەوەیە کە هیچ وەختێکی حیزبی دێموکراتو یەکیەتیی نیشتمانی لە هیچ بوارێک‌دا پێکەوە دژی پارتی دێموکراتی کوردستان کاریان نەکرد. ڕاستە بەداخەوە وەختێک هەم لە نێوان ئێمەو پارتی‌و هەم لە نێوان یەکیەتی‌و پارتی‌دا ناکۆکی‌و نێوان‌ناخۆشی‌و تەنانەت شەڕی چەکدارانەش لەئارادا هەبوو. بەڵام قەت ڕێ‌نەکەوت ئێمەو یەکیەتی پێکەوە لەدژی پارتی شەڕ بکەین.

* کاک نەوشیروان مستەفا یەک لە سەرکردەکانی ئەوکاتی یەکیەتی لە جلدی یەکەمی بیرەوەری‌یەکانی‌دا بەناوی "لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ" حیزبی دێموکرات تاوانبار دەکا کە پێشی چالاکی‌یەکانی ئەوانی گرتوە. دەکرێ ڕای جەنابت لەو بارەیەوە بزانم؟ بەگشتی بوونی ئەوان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان چ موشکیلەیەکی هەبوو؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن نالێم موشکیلی هەبوو. نازانم مەبەستی کاک نەوشیروان چ بووە. لەبیرتە چی نووسیوە؟ وەک نموونە پێم‌خۆشە باسی بکەی.

**عەباس کاردۆ:** دەقیق وشەکانم لەبیر نین بەڵام دەڵێ ڕێیان وابوو ئەو بەشەی کە لەژێر دەسەڵاتی وان‌دایە ئێمە نابێ هاتوچۆی بکەین‌و لەو شتانە.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** یەک، دوو جار شتی کەمێک نامولایم ڕووی دا. مەسەلەن ئەوەی بۆخۆم موستەقیم دەگەڵی تەرەف بووم لەبیرمە. بەرپرسی کۆمیتەی شارستانی سەردەشت موهەندیس ئاریا بوو کە بەخۆشی‌یەوە ئێستاش ماوە. ئەمن بە هەڵکەوت ڕێم کەوتە ئەو کۆمیتەیە. سەتو پەنجا پێشمەرگەی یەکیەتیی چەک کردبوون. دیارە پیاو حەق بڵێ ئەوان ئەوە نەبوون چەک بکرێن. یانی ئەوە نەبوو بڵێی بەشەڕ چەکیان کردبن. بەڵام وەکوو ئیحتیرام بە قانوونێ بەرێ کە ئەو بەشەی کوردستان ئێمە پێی ڕادەگەین، چەکەکانیان دابوونێ. ئەمن کە ئەوەم دیت زۆرم پێ ناخۆش بوو، گوتم چۆن ئێمە پێشمەرگەی کوردستانی چەک دەکەین. گوتی

ئاخر ئەوە هەروا بیرەدا دێن و ئەوە ئەندامی دەفتەری سیاسی یە. گوتم چی؟ ئەمن دەزانم ئەندامی دەفتەری سیاسی چییە یان ئەتۆ؟ ئیدی هەر لەوێ پێم ئازاد کردن و بەڕێمان کردنەوە.

ئەوە شتێک. بەڵام شتێکی دیکە کە ئەگەر خوا نەخواستە مەبەستی کاک ئەنوشیروان ئەوە بێ کەملوتفیی کردوە. ئێمە جارێکی بەڕەسمی شتێکمان بۆ ئەوان نووسی. ئەوان دەگەڵ پارتی سۆسیالیست یان بزووتنەوەی سۆسیالیست ئیختیلافیان هەبوو، ئێمە بەڕەسمی نامەیەکمان بۆ نووسین و بە هەردووک لامان ڕاگەیاند. گوتمان زۆرمان پێناخۆشە ئێوە ئیختیلافتان دەبەینێدا هەیە. دەقی نامەکەم لەبیر نییە بەڵام مەفهوومەکەی ئاوا بوو. گوتبوومان ئارەزوومان ئەوەیە ئەوە تەواو بێ. هەر ئیختیلافێکی هەیە بەشێوەی ئاشتیخوازانە حەللی بکەن نەک لە ڕێگای چەکەوە. ئەمما ئەگەر هەر ئەوەی دەکەن، ئێمە بەجیدەی داواتان لێ دەکەین خاکی ئێمە نەکەنە مەیدانی پێکهەڵپڕژانی چەکدارانە. ئێمە ئەوەی تەحەممول ناکەین. جا ئەوەم لەبیرە نامەیەکی ئاوامان نووسی. ئیدی ئەمە بەمانای ئەوە نیە ئیجازەمان نەدابن لەوێ هاتوچۆیان هەبێ.

**هەباس کارەۆ:** شتێکی دیکەش کە باسی دەکا گۆیا وەختێک ئێوە لە عێراقڕا دەڕۆنەوە ئەوان لە سنوورەکان دەبن. جگە لە مامۆستا هێمن هیچ کام لە ئێوە ڕووتان تێ نەکردوون. هەروا بە پەنایاندا ڕۆیشتوون و وەک شتێکی بێ ئەهەمییەت چاوتان لێ کردوون. بەڵام مامۆستا هێمن چۆتە لایان.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەش پێم وایە هەڵسەنگاندنی دەقیقی وەزعەکەیە. ئەمن پێشتر بۆم باس کردی، ئێمە ئەو ڕۆژەی لە بەغدایە وەڕێ کەوتین بەدزی و بەنهێنی، دەبوو ئەو ڕۆژە لە مەنتەقە بترازێین. مەسەلەن ئەمن بۆخۆم بەشەو هاتووم کە بەفر لە گۆڕێدایە و سەرمایەکە مەپرسە. زۆر بە سەختی و ماڵوێرانی لە پشتی "ئاڵیەڕەشی" ئاورم کردۆتەوە و لێی نوستووم. بۆ سبەینێڕا کە ڕۆیشتووم بۆ دیوی ئێرانێ دیسانەکە بە پێیان، بەفرو کڕێوە ڕێی لێ ون کردین. ئێمە سەعات یەکی شەوێ گەیشتووینە "ئاڵیەمەران". لەحاڵێکدا ئەو ڕێگایەی ئێمە لە بەیانیڕا حەتا یەکی شەوێ بڕیمان، ئەگەر بەڕێگای تەبیعیدا ڕۆیشتباین، بە دوو سەعاتان تەقەمان لێ دێنا. تەنانەت ئەمن ئەوەدەم زۆر بە سەرپاڕەنەوە گوتم تەماشا ئەو نەگبەتی یە. ئێمە دەچینەوە وڵاتی خۆمان، بە تەیارە ناچینەوە قەیدێ ناکا. بە ماشێن ناچینەوە قەیدێ ناکا. بە سواری وڵاغی ناچینەوە قەیدێ ناکا. قەت وەرە ئەتوانی بەڕێی بنیادەمانیشدا بڕۆی، بچی وەشاخی هەڵگەڕێی. هەرچەند دوو کەسی زۆر کارکوشتەی ئازای خەڵکی وڵاتمان دەگەڵ بوون، ئەمن و کاک ئەمیری قازیش بووین. ڕێمان لێ ون بوو، نیزیک بە دە سەعاتان ئێمە نازانین بەرەو کوێ دەچین. ئەمن دوایە زانیم، دیارە لە جێگایەکی بەربوومەوە. کە تەماشام کرد شڵپە لە پێڵاوەکەم دێ. تەماشا دەکەم هەمووی خوێنە. لەبەر ئەوەی سارد بوو هەستم پێ نەکردبوو، سڕ بوو. لەپاشان کە جڵەی دەکرد، لاقم هەر سەرما بردی. ئێمە بەو جۆرە چووینەوە.

جا ئەوە شتێکی خۆشیشم وەبیر هاتەوە. سەرئەنجام ئێمە گەیشتینە جێگایەک جۆگەت بوو. جۆگەت ئەوەیە کە بنیادەم حەیوانی پێدا دەچێ‌و بەفرەکە دەشکێنێ. دیارە بەفری لێ‌دەباری، بەفرە نوێ‌یەکە پڕی کردبۆوە بەڵام شوێنەکەی دیار بوو. بەفرەکە بەقەت ئەژنۆی بڵند بوو، بەقەت بستێکیشی بەفری تازە بەسەردا باریبوو. بەعەددێک هیلاک‌و ماندوو ببووین کاک ئەمیری قازی زۆر بە ئیستیدلالێکی مەنتیقی گوتی کاکە ئێمە هەر دەمرین. مادام وایە ئەو هەڵبەزدابەزەمان لەچیە. دانیشن هەتا لەجێی خۆمان دەمرین. لێرە دانیشن ئەو هەموو خۆکوتانەی بۆ چیە. کە دیارە جوابمان نەدایەوەو ڕاکێشمان کرد. ئەو برادەرانەی شارەزا بوون گوتیان هێندەمان نەماوە. ئەو ڕێچکە سەری ئاڵیمەرانەو ئیدی دوای ماوەیەک چووینە ئاڵیمەرانو لەوێ ئەوان ماڵێکیان لە خەو هەستاندو چووینە ژوورێ. جا چونکی بەئەزموونیش بوون هەرچەند کوورەیان هەڵ‌کردو ماڵەکەیان گەرم داهێنا، بەڵام گوتیان حەقتان نیە ڕوو دەکوورەی کەن. دەبێ پشتی تێ‌کەن‌و لێفەیان بەلاقاندا دابێن هەتا وردە وردە سەهۆڵ کردیەوەو کەوش‌و پێڵاو لەپێمان هاتنە دەرێ. ئێمە ئاوا گەڕاینەوە. بەڵام مامۆستا هێمن کە گەڕاوەتەوە، وەختێک بووە کە شا ڕووخاوەو جمهووریی ئیسلامی هاتۆتە سەرکارو کوردستان هەمووی ئازادە. بە سەدان‌و هەزاران کەس بە پیریانەوە چوونە هەڵپەڕینیان بۆ ساز کردوون. ئەوان وەختێکی ئاوا هاتوونەتەوە. جا ڕەنگە مامۆستا هێمن لای وابێ‌و سڵاوێکی لێ کردبێ. ئێمە لە شەڕایەتێکدا نەچووینەوە کە ئەو کارە بکەین. خوداخودامان بوو هەر هیچ کەس نەمانبینێ.

* چۆن بوو ساڵی ١٣٦١ی هەتاوی یەکیەتی نیشتمانیی کوردستان هێزەکانی خۆی ناردە یارمەتیی ئێوە؟ ئەو کارە بۆ کرا؟ تکایە وردەکاری‌یەکانی باس بکە.

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** وا بزانم ئەمن لە کتێبی "نیو سەدە تێکۆشان"بەشێدا باسم کردوە. مەسەلەکە لەوێڕا هات کە ئێمە لە جادەی نێوان پیرانشارو سەردەشت شەڕێکی قورسمان لەسەر بوو . دەفتەری سیاسییش کە مەرکەزی حیزب بوو لەبەری گەورکان بوو لە "شیوەجۆ"یە. ئەوە ڕێگایەکی زۆر موهیم بوو بۆ ئێمە کە زۆربەی پێداویستی‌یەکانمان لە دیوی عێراقەوە دابین دەبوون. هێرشەکەش هەر بۆ ئەوە بوو کە دەوڵەتی ئێران دەیویست ئەو ڕێگا ئەداروکاتی‌یەمان لێ‌ببڕێ. بۆیە ئێمە هەوڵمان ئەوە بوو کە لانی کەم بتوانین ئەو زستانەی ڕێگاکە بپارێزین. یانی ئەو گەروویەمان لێ نەبەسترێ‌و بۆ ڕاگوێزتنی بریندارانی شەڕ، یان هێنانی پێداویستی-یەکان لە هەموو بارێکەوە، لە تەنگانە نەکەوین. لەعەینی کاتدا هەر وەک پێم وایە لە بەشێکی دیکەدا باسم کرد، وەزعەکە جۆرێک بوو کە ئێمە لە هەموو مەنتەقەکان شەڕمان لەسەر بوو. داوای کۆمەکمان لەهەر هێزێکی پێشمەرگەی خۆمان دەکرد، یان هەر لەجێ‌دا نەمانئەتوانی کەس بنێرین یان ئەگەر ناردباشیان خەڵکێکی کەمیان لەدەست دەهات. تەنانەت جاروبار ئەو کەسانەیان دەنارد کە لە شوێنی خۆیان ڕۆڵی

کاریگەریان نەبوو، چونکی ئەوانەی ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو وەک فەرماندەو پێشمەرگەی ئازاو کارامە، بۆخۆیان لازمیان بوون.

لەبەر ئەوە دەفتەری سیاسیی حیزب باسی ئەوەی کرد کە ئەگەر بکرێ یارمەتی‌یەکی ئاوا لە یەکیەتی نیشتمانی بخوازین. پێشتریش لە چەند دیدارانْدا لە تەرەف سەرانی یەکیەتی‌و بەتایبەتی خودی مامجەلالەوە شتی وا گوترا بوو کە کوردستان بۆمە هەر کوردستانەو ئامادەین ئەگەر پێویست بێ لە هەربەشێکی کوردستان فیداکاری بکەین. دیارە شوعارەکەشیان هەر کوردستانی بوو. بۆیە هاتینە سەر ئەو باوەڕە کە داوایەکی ئاوا بکەین. وابوو بڕیار درا ئەمن بچم. ئەمن هەستام بەتاقی تەنیا - یەک، دوو پێشمەرگەم دەگەڵ بوون‌و بەس-لە دەفتەری سیاسی‌ڕا چووم بۆ لای مەکتەبی سیاسیی یەکیەتیی نیشتمانی کە ئەو وەختی هاوین بوو، نەکەوتبووینە پاییزێ. مەرکەزی دەفتەری سیاسیی یەکیەتی لە خاکی کوردستانی ئێران، لە"تووژاڵ"ێ بوو. تووژاڵ‌و شێتنێ خاکیان لێک دەگەڕێتەوە. تووژاڵ ئێرانەو شێتنێ عێراقە. کە گەیشتمە وێ، ئێوارە بوو. ئەوەی وەک بەرپرس لەوێ حوزووری هەبوو تەنیا مامجەلال بوو. ئەوانی دیکە ئەندامانی دەفتەری سیاسی‌یان هێندێکیان هەر زۆر دوور بوون، هێندێکیشیان کەمێک دوور بوون کە دەیانتوانی بگەنە وێ.

پاش دانیشتن‌و حەسانەوەیەکی کەم، ئەمن داخوازەکەم عەرز کرد. بەڕاستییش هەر وەک لە جێگای دیکەش گوتوومە، گوتم بۆ داوایەک هاتووم کە ئەگەر ئێستا یەکیەتیی نیشتمانی لە حیزبی دێمۆکراتی بکا، حیزب نای کا. بەڵام ئێستا بزانم ئێوە چی دەڵێن. مەبەستیشم ئەوە بوو یانی ئەگەر ڕەتیان کردەوە پێیان وا نەبێ ئەوە تەئسیر لەسەر پێوەندی‌یەکانمان دادەنێ. چونکی بەحەرحاڵ ڕەنگە مولاحەزاتی سیاسی‌و دیپلۆماسی لەئارادا بێ. کە باسەکەم کردەوە، مامجەلال گوتی ئێمە هیچ پێوەندی‌یەکی وامان دەگەڵ کۆماری ئیسلامی نیە. عەینی ئەو کەلیمەیەشی بەکار هێنا، گوتی ئەمن دەبێ ئەوەی بەرمە مەکتەبی سیاسی. بەڵام لەئێستاڕا پێت دەڵێم کە یەکیەتیی نیشتمانی سەروەری‌یەکی‌وا لەدەست خۆی نادا. ئێمە ئەوەی بە شانازی لەقەڵەم دەدەین. ئەوە بوو دەستی کرد بە تێلگرافنووسین. ئەوردەمی تەلەفون نەبوو، هەر سیستمی بێ‌سیمی هەبوو کە ئەوان سیستمی باشیان هەبوو. تێلگرافی بۆ ئەو ئەندامانەی مەکتەبی سیاسی کرد کە ئەوەندە نیزیک بوون بتوانن بێنەوە. هەموویانم لەبیر نیە، بەڵام دڵنیام کاک ئەوشیروان یەکێکیان بوو. هاتن، وا بزانم ٤ یان ٥ کەسیان کۆ بوونەوە. ئانی شەوێ خوراو دەبوو کۆبوونەوەکە بکرێ، چونکی ئەمنیش بەیانی دەبوو بگەڕێمەوە. گوتم ببوورن ئەمن ماندووم، — جا هەر بەڕاستییش ماندوو بووم، چونکە بەشێکی زۆری بەپێیان ڕۆیشتبووم — ئەگەر جێگایەک هەبێ پێم‌خۆشە ئیسڕاحەتی لێ‌بکەم. دیارە مەبەستم ئەوە بوو ئەوان قسەی خۆیان بۆخۆیان بکەن‌و ئەمنیان لەلا نەبم. مامجەلال گوتی ئەخێر ماندوو تی، دەزانم دەڵێی چی. ئەوە کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسی-یەو ئەتۆش ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی. ئەو دوو حیزبەش وەک یەکن‌و هیچ

فەرقیان نیە. بۆیە دەبێ ئەتۆش بەشدار بی. دووبارە گوتم ماندووم ئێوەش قسەی خۆتان بکەن. گوتی تا دەبێ دانیشی.

ئیدی دانیشتم دیارە هیچ دەخالەتم نەکرد غەیری ئەوەی جارێکی دیکە تەوزیحمدا داخوازییەکە چیە. پێم وایێ وەختێکی زۆر کەمی گرت کە بڕیاریاندا بێن بەکۆمەگمانەوە. هەر ئەو شەوەی تێلگرافیان نووسی بۆ هێزەکانیان کە بەشێکی زۆریان لە قوولایی خاکی باشووری کوردستاندا بوون. دەتوانم بڵێم زەمینی ئەوەی کە کارەکە کارێکی گەورە بوو لە تاریخدا. یانی ئەوە کە هێزێکی بەشێکی کوردستان بە بڕیارێکی مەرکەزیو بە حەجمێکی شاوە لە بەشێکی دیکەی کوردستاندا بەکۆمەگی حیزبێکی سیاسییەوە بچێ، ئەوە بۆخۆی شانازییەکی گەورە بوو. بەڵام ئەوەش نیشانەیەکی دیکە بوو لە چوستوچالاکیو ڕیکوپێکی ئێو یەکیەتیی نیشتمانی کە ئەوەی هەرە دووریشیان لەو هەلومەرجە ناخۆشەدا، دەکرێ بڵێم بە کەمتر لە حەوتوویەک، یان پێنج ڕۆژان گەیشتن. بەکورتی لەماوەی حەوتوویەکدا ئەگەر بەهەڵە نەچووبم شتێک کەمتر یان زیاتر، بەڵام دەوری ١٧٠٠ پێشمەرگەی یەکیەتیی نیشتمانی گەیشتنە سەر سنوورەکانو هاتنە تێکەڵاوی هێزەکانمان بوون.

شتێکی جێی سەرنجی دیکەش پێمخۆشە لێرەدا بگێڕمەوە. کە ڕەنگە قەتم نەگێڕابێتەوە. لەو وەختەیدا بوو کە بەرەبەرە پێوەندییەک لە بەینی یەکیەتیی نیشتمانیو دەوڵەتی عێراقدا گیرابوو. ماوەیەکی کەم دواتر، نەک عەینی ئەو ڕۆژانە، دیدارێک لەنێوان: دوو نەفەری یەکیەتیو دوو نەفەری دەوڵەتی عێراقدا پێک هات. ئەوانەی یەکیەتی مامجەلالو کاک نەوشیروان بوون. ئی دەوڵەتی عێراق پیاوێک بوو لە بەغداوە هاتبوو ناوی "خەلیل شاکیر" بوو. دیار بوو لە سەرانی موخابەراتە. ئەوەی دیکەشیان کەسێک بوو بەناوی "موقەددەم ئیحسان" کە نازانم ناوی بابی چ بوو. ئەویان لە کەرکووک دادەنیشت، مەسئوولییەتی لەوێ هەبوو. لەلایەن ئێمەشەوە دوکتۆر قاسملوو و ئەمن بووین. پەزیراییو پارێزگاری ئێمە ئەوان دەکردن. لەو وەختیشدا، بنکەی ئینتیشاراتو تەبلیغاتی حیزب لە "دووناوی دۆڵەتوێ" بوو کە لەو شوێنە نیزیکە. دیدارەکە لە "گۆرەشێر"ی بوو کە ئەویش هەر خاکی ڕۆژهەڵاتە. ئەمن بەرپرسی بەرپرسی ڕادیۆو ئینتیشارات بووم بەڵام بەکردەوە ببوومە بەرپرسی ڕاپەڕاندنی کاری ئیداریو کاتیی ئەو جەبهەیەو بەرپرسایەتییەکەی خۆم لەڕادیۆ دابوو بەکاک فەتاحی کاویان.

لەوێڕا کاغەزێکیان بۆ نووسیبووم پێم وایێ هەر کاک فەتاح بۆخۆی نووسیبووی. نووسیبووی خەبەرمان هەیە دوژمن بەخەیاڵە ئەمشەو هێرش بکاتە سەر "جاسووسان". جاسووسان ئەو کێوەیە کە بەسەر دۆڵەتوو و ئەوناوەدا دەڕوانێو جێگاکەشی زۆر حەساسە. یانی ئەوێ بگیرێ ماناى ئەوەیە لەخوارێ کەس ناتوانێ بژی. باشە ئەویش بگوترێ کە ئەو ساڵەش زستان زۆر زوو هات. تەنیا هەشت ڕۆژ لەپاییزێ چووبوون کە لە

هەموو کوردستان باراناوێکی زۆر باری و لە شنۆیەش بستێک بەفر باریبوو. جا نووسیبووی ئەمشەو بەنیازن هێرش بکەن و ئێمەش کەسی وامان بەدەستەوە نیە. بەڵام هێزێکی یەکیەتیی نیشتمانی هاتۆتە دۆڵەتوێ، ئەگەر وا بکەی مامجەلال کاغەزێک بۆ فەرماندەکەیان بنووسی بەڵکوو چەند کەسێک وەسەر خەن بۆ سەری جاسووسان، هەرچەند زۆریش ماندوون. ئەمنیش کاغەزەکەم بە دوکتۆری نیشانداو مامجەلال گوتی ئەوە چیە؟ گوتم قەزیەیەکی ئاوایە. گوتی بۆ بۆخۆت بۆیان نانووسی؟ ئەمنیش گوتم نە دەزانم کێن و نە حەقم هەیە بۆیان بنووسم. جا ئەو خاڵە گرینگە کە گوتی هێزەکانی ئێمە دەستووریان پێدراوە کە گەیشتنە خاکی کوردستانی ئێران، لەژێر فەرمانی حیزبی دێمۆکراتی کوردستاندا دەبن. فەرماندەکەشیان ناوی "سامان گەرمیانی"یە. سامان گەرمیانی ماوەیەک لە دەرێ بوو ئێستا هاتۆتەوە لێرەیە. ئەمنیش بەخەتی خۆم کاغەزێکم بۆ نووسی کە قەتیشی نەدیوە دەستخەتی ئیمزاشم ناناسی. سلاو و بەخێرهاتنم پێ گوتو داوام لێ‌کرد گوتم دەزانم ماندوون، چونکی لەخوارێڕا هاتبوون، بەڵام حاڵ و قەزیەیەکی وایە. سەرێش نە خێرەتی لێ‌یە، نە سەنگەری ئامادەی لێیەو نە هیچ. کە کاغەزەکەی پێ گەیشتبوو لە دەوری بڵێین هەشتی شەوێدا، تەواوی ئەو هێزەی پێ ئەوەی یەک نەفەری بەجێ بێڵێ و بۆخۆشی وەسەر کەوتبوون بۆ سەرێ.

یانی شێوەیەکی زۆر شوجاعانەی پێوە بوو، زۆر داینێکی نیشتمانی بوو. وەکی گوتم یەکەمجار بوو بە حەجمێکی ئاواو بە بڕیاری سیاسیی حیزبێک ئەوە بکرێ. دەنا پێشتر زۆرجار پێشمەرگەی ئێمە لە باشووری کوردستان فیداکارییان کردوە، شەهید بوون. پێشمەرگەی کوردی باشوور لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوون. یان ئی تورکیەی لە هەردووکیان بوون. شتی وا هەبووە. بەڵام بە بڕیارێکی سیاسیی ئاواو بەو حەجمە ، یەکەم جار بوو کە دەکرا.

* بەشداریی "هێزی پشتیوان" لە شەڕەکانی پاییزی ١٣٦١ی هەتاوی لە جادەی پیرانشار- سەدەشتدا چەندە بۆ حیزب یارمەتیدەر بوو؟ بەگشتی ئەو حەڕەکەتە چۆن لێک درایەوەو ئاکامەکانی چی بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** جارێ با ئەوەی بڵێم کە چۆن بوو ناوی هێزی پشتیوانی بەسەردا بڕا هەرچەند لە جێی دیکەشم باس کردوە. پێمخۆشە ئەوەی باس بکەم. ئەمن هەروەک باسم کرد مەسئوولی ڕادیۆ بووم. ئەو ڕۆژانەش هەموو ڕۆژێ عەمەلیات بوو، شەهید بوو، گاڵتەبەمردن‌کردن بوو، هەڵمەت بوو، هەڵاتن بوو، ڕێکەوتن بوو. ئیدی ڕادیۆ بەرنامەی حەماسیی هەبوو. بەڵام لەبەر مولاحەزاتی سیاسی ناوی وانمان باس نەدەکرد. کۆبوونەوەیەکی سێ قۆڵیمان هەبوو بۆ مەشوەرەت. مامجەلال بوو، کاک دوکتۆر قاسملوو بوو و ئەمن بووم. مەبەست لەسێ قۆڵی ئەوەیە هەر ئەو سێ کەسە بووین نەک سێ تەرەف. کۆبوونەوەکەش هەر لەبنکەی ڕادیۆ کرا. لەوێ گوتم ئەمن دوچاری عەزابم. ئەو پێشمەرگانە هاتوون ئەو شانازییەیان هەیە، کەچی

تارێکیان لێنابرێ، باسیان ناکرێ. مامجەلال گوتی کاکە ئێمە بۆ تەبلیغات نەهاتووین، نامانەوێ. ئەمنیش گوتم باشە ئەوە دەردی تۆیە، دەردی من جودایە. ئەمن پێیەوە دەعەزابدام. کەوابێ ئەمن پێشنیار دەکەم با بەتارێک باسیان بکەین هەم ئەرکی خۆمان بەجێ هێناوەو هەمیش مەعلووم نەبێ. ئێمە هێزی پێشمەرگەمان هەبوو. هێزی بەرگریی میللیمان هەبوو کە ئەوانە نێ خۆمان بوون، نێ ڕۆژهەڵاتی کوردستان. گوتم ئەوانە بەهێزی پشتیوان ناو دەبەین. هەر دووکیان گوتیان پێشنیاری چاکەو موافیقین.

ئەوە بوو کە بەو ناوەمان خوێندنەوە، بەرەبەرە خەڵک تێ گەیشت. جالیب ئەوە بوو موجاهیدین کە لەوێ بوونو پێکەوە هاوپەیمان بووین، خەبەرەکانی ئێمەیان وەردەگرتو بڵاویان دەکردەوە بە تایبەت خەبەری عەمەلیاتە گەورەکان. چەندجار کە باسی "نیرۆی پشتیبان"یان دەکرد نەیاندەزانی چ باسە. لەپاشان ڕۆژێک تەفسیرێکیان نووسیبوو کە ئێمە بۆخۆشمان بەهەڵە چووین کە خەبەری نیرۆی پشتیبانمان بڵاو کردۆتەوە. دوایە بۆمان دەرکەوت کە هێزی پشتیوان لەکوێ ناو دەهێنرێو چ سەودایەکی نازانم مەزنیخوازانەو تەوسیعەتەڵەبانە کراوە. یانی بەڕێزانی گوتبوویان ئەوە نیشانەی جودایی‌خوازی‌یە. ئەوەیان بۆیە کردبوو کە لە سەحنەی سیاسیی ئێراندا خۆیان لەو تاوانە گەورەیە!! کە پێیان وابوو کراوە بێبەری بکەن. ئەمنیش هەستام بە وتارێک جوابم دانەوە. خولاسەکەی ئەوە بوو کە گوتم: زۆر سەیرە ئەوان بۆخۆیان چوون لە لوبنان شەڕیان کردوە. ئەگەر ئێستا خەڵکی وڵاتێکی دوور بێن کۆمەگمان بکەن ئەوە باشە. بەڵام کوردێکی بەشێکی دیکەی کوردستان کە ئازادیخوازە، هاتوە زیندی ئەو ڕژیمەی کە ئەوان دەیانەوێ بیڕووخێنن موبارزە دەکا، خۆی بەکوشت دەداو قوربانی دەدا، ئەوان ئاوای پێ قەبووڵ بێ، ئەوە مانای نیە. ئیدی دوایە لەسەری نەڕۆیشتنەوەو پێمەگەیان لەو جۆرە تەبلیغاتە کرد.

پاشان لەسەر ئاکامەکانی ئەو بەدەنگەوەهاتنە، ئەوڕۆمن لاپەڕەیەکی زێڕینە لە مێژووی گەلی کورددا. لەپاشان هەم پێوەندیی نێوان ئەو دوو هێزە سەرەکی‌یەی کوردستانی وەک حیزبی دێموکراتی کوردستانو یەکیەتیی نیشتمانی بە هێز کرد، هەم پێوەندیی نێوان ئەو دوو بەشەی کوردستانی بە هێز کرد. ئێستاش پێم وایە ئاساری ئەوە لەنێو ڕووحو ڕەوانی خەڵکیدا هەر ماوەتەوە. مەسەلەن ئەوە ئێمە چەندین ساڵە بەداخەوە سنوورەکانمان بەجێ هێشتوەو مەجبوور بووین لە باشووری کوردستان بژیین، هەست بەوە ناکەین کە ئێمە بە غەریبە بزانن. جگە لەوەش توانیمان بۆ ماوەیەکی زیاتر لەبەرامبەر هێرشەکانی دوژمندا موقاوەمەت بکەین. پێشمەرگەکان دەرسێکی زۆر تاڵیان بە دوژمن دا. دیارە هەم هی ئێمە ئەوانمان بە قووەت دەکردو هەم ئەوان ئێمەیان بە قووەت دەکرد. ئەو یەکگرتنە وەک دەڵێن وەک ڕیازیات نیە ٢+٢ ببێتە ٤. لەوێدا جاری وایە ٢+٢ دەبێتە ١٠٠، یانی قووەتێکی زۆر زیادی بە پێشمەرگەکانو شەڕکەرانی خەباتی ئازادیخوازانە دابوو.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا ئەو هێزە چەند لەلای ئێوە مایەوە. ئایا شەهیدی دا، ئەگەر هەی‌بوو چەند شەهید؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە مانەوەکە لە شەش مانگی کەمتر نەخایاند. ڕەنگە دەقاودەق نەزانم، بەڵام هەتا ئاخرین نەفەرەکانیان گەڕانەوە تەقریبەن ئەوەندەی گرت. بەداخەوە شەهیدیشیان هەبوون، برینداریشیان هەبوون. شەهیدەکانیان ئەوەی لە مەیداندا شەهید بوون، ئەگەر لەبیرم بێ ١٤ کەس بوون. بریندارەکانیشیان بەینی ٣٠ تا ٥٠ کەس بوون. لەو بارەیەوە دوو بیرەوەریم لەبیرن زۆرم پێ‌خۆشە بەناوی ساحێبانیانەوە تۆماریان بکەم.

یەکێکیان، یەک لە فەرماندەکان بە ناوی "ملازم جوامێر" بوو. ئەو بریندار بوو، برینێکی سەختـــی هەڵ- گرتبوو، فەلەج ببوو. کە هێنایانەوە، هەرچەند پیاو ئارەزووی دەکرد بەڵام هیچ ئومێدێک نەبوو ئەو پیاوە چاک ببێتەوە. ئەمنیش ماچم کردو بەخێرهاتنم کرد، گوتم ئەوە ئازادی‌یەو نرخی گرانە. دەنا حەیفە لاوێکی وەک تۆ تووشی حاڵەتی ئاوا بێ. جا تەمەنی هەر ٢٥ هەتا ٣٠ ساڵ دەبوو. گوتی ئەوە هیچ نیە، هەزاری وەک من بەقوربانی کوردستان بێ. تەنیا یەک مەراقم لەدڵدایە. لە کوردستانی عێراق کردم، هەر چەندی پێم کرا کردم، هاتم لە کوردستانی ئێرانیش بۆ کورد جەنگام، بەڵام بەداخەوە بۆم ناکرێ لە کوردستانی تورکیە بیکەم. ئەوەم مەراقە دەنا ئەوی دیکە هیچ نیە. ئەوە دوایە بەرێ کرایە دەرەوە بە فەلەجی مایەوەو بەداخەوە عاقیبەت شەهید بوو.

ئەوی دیکە حادیسەیەک بوو کە لە یەک شەڕدا ٤ نەفەری هێزی پشتیوان شەهید بوون. جەنازەکانیان هێنانەوە ئەو شوێنەی ئێمەی لێ‌بووین. لەوێ‌ڕا ناردمانەوە بۆ مەنتەقەی شێنێ‌و لەوێ نێژران. فەرماندەیەکیان هەبوو بەناوی "شێخ فەیسەڵ". بەداخەوە ئێستێ نازانم شێخ فەیسەڵ چی‌یان پێ دەگوت. دوای ناشتنیان چەند ڕۆژێک پێوە خوا دایکی شێخ فەیسەڵ هات. کە هات ئەمنیش لەوێ بووم، چونکە زۆرمان هاتوچۆ دەکرد. لەدوورەوە خەبەریان دا کە ئەوە دایکی شێخ فەیسەڵ هاتوە. ئێمە هەستاین بەپیریەوە چووین، مامجەلال بۆخۆشی هەستا. وەک شێرەژنان لە دوورەوە گوتی: مامجەلال نیگەران مەبە ناگریم. ئەو شانازی‌یەی بە نسیب کوڕی من بووە بۆیە نابێ بۆی بگریم، دەبێ سەرمی پێ بەرز بێ. لەپاشان لەوەش زیاتر دەرکەوت. هەوڵی دابوو جەنازەی کوڕەکەی بگێڕێتەوەو لە سلێمانی بی‌نێژێ. چەند جار موڕاجەعەی کردبوو هەتا موافەقەتیان بۆ کردبوو جەنازەکەی بەرێتەوە. وەختێک وەرەقەی ئیجازەکەی وەردەگرێ، دەڵێ دا بۆم وەخوێنن. بۆی دەخوێننەوە، نووسراوە کە ئەو خانمە ئیجازەی هەیە جەنازەی کوڕەکەی خۆی "مخرب" واتە خەراپکار فلان- کەس بێنێتەوە. ئەویش کاغەزەکە وەردەگرێتەوە، بە دەمی کابرای‌دا دەداو دەڵێ نامەوێ، کوڕی من موخەڕریب نیە، کوڕی من شەهیدی ڕێگای ئازادیی کوردستانە. بەو ڕووحییەوە دەگەڵ مەسئوولینی عێراقی تەڕەف ببوو، بەو ڕووحییەشەوە هات دەگەڵ مامجەلال بە تایبەتی‌و دەگەڵ ئێمە بەرەوڕوو بوو.

* بەدوای بەشداریی "هێزی پشتیوان" لە شەڕەکانی جادەی پیرانشار- سەردەشتدا، لێک نیزیک بوونەوەیەکی زۆر لەنێوان یەکیەتی‌و حیزبدا هاتە ئاراوە. دەکرێ بفەرمووی ڕادەی هاوکاریی‌یەکانی ئەو دوو لایەنە هەتا چ ڕادەیەک بەرین بوو‌و هاوکاری‌یەکان زیاتر لە چ بوارگەلێک‌دا خۆیان دەنواند؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە نابێ بڵێم بە دوای ئەوەدا بوو. چونکی ئەو کارە گەورەیە بەرهەمی لێک‌نیزیکی بوو. لەڕاستی‌دا تەنیا ئەو مەرحەلە کەمەی کە پێشتر ئیشارەم پێ کرد، ساردی‌یەک لەبەینی ئەو دوو هێزەدا هەبوو، دەنا پێوەندی‌یەکانمان هەر باش‌و دۆستانە بوون. بەڵام دیارە ئەوە هەنگاوێکی دیکە بوو، گوڕوتینێکی دیکەی بەو نیزیکی‌و دۆستایەتی‌یە دا. ئەو پێوەندی‌یانە گەیشتبوونە ڕادەی زۆر بەرین‌و بەربڵاو. ناکرێ بچینە نێو جوزئیات، بەڵام دەکرێ بڵێین باشترین پێوەندیی نێوان دوو هێزی سیاسی بوو. چ لەنێوان هێزە سیاسی‌یەکانی یەک بەشی کوردستان چ لەنێوان هێزە سیاسی‌یەکانی بەشە جۆراوجۆرەکانی کوردستاندا. بە بێ‌شک هەروەک لەباری دیکەشەوە گوتمان، یەکیەتی نیشتمانی‌و حیزبی دیمۆکراتی کوردستان دوو حیزبی سیاسیی جیاوازن. دوو هێزی سیاسیی دۆستن. هێزی سیاسیی دۆستیش مانای ئەوە نیە وەک یەکن. جارێک ئیختیلافمان بووە. جارێک بیروباوەڕمان وەک یەک بووە. ئەمن دیتوومە مام‌جەلال‌و دوکتور قاسملوو لێک ڕاست بوونەوە لەسەر مەسەلەیەک هەر ئەوەندە ماوە ئاویان نەداوەتە سەنتلی‌یەکان. بەڵام ئەوە ئەو پێنج دەقیقەیە کە کێشەکە دەکەن. لە بەینی ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزبی دیمۆکراتیشدا بەدەیان جار شتی ئاوا ڕووی داوە. بەڵام لەپاشان هەموو شتێک تەواو بووە.

مەسەلەن ئەمن لەبیرمە پاش تێکچوونی ئەو موفاوەزاتەی بەینی یەکیەتی نیشتمانی‌و دەوڵەتی عێراق کە دوای تێکچوونی عەمەلیاتی گەورە گەورە دەکران. جارێکی مام‌جەلال کاغەزێکی بۆ دوکتور قاسملوو ناردبوو، نووسیبووی پێمان خۆشە دیدارێکی بەرتەسکمان هەبێ. لە ئێوە ئەتۆو عەبدوڵڵای حەسەن زادە، لە ئێمەش تەنیا ئەمن‌و کاکە نەوە دەبین. جا وەخت دابنێن، یان ئێمە دێین یان ئێوە وەرن. ئەویش دوکتور گوتی مام‌جەلال چەند جار هاتوە ئێمە نەچووین با ئێمە بچین باشترە. دامانێنا ئێمە بچین‌و چووین. کە چووینە وێ، پاش نان‌و چاخواردن‌و ئەوانە، شوێنێکی تایبەتی‌یان دانا هەر ئەو چوار کەسە لێی دانیشین. مام‌جەلال ڕووی دە دوکتوری کردو گوتی دەوڵەتی عێراق ناردوویەتی کە پێمان خۆشە وتوویژ بکەینەوە. - ئەوە وا بزانم بەسالێک دوای تێکچوونی ئەوی دیکە بوو- تەنکیدیشیان کردۆتەوە کە ئێمە عێراقین بۆخۆمان دادەنیشین یا کەسمان دەتێودا نەبێ. یانی دەواقیعدا گوتوویانە با ئەوجار حیزبی دێمۆکرات دەتێواندا نەبێ. بەڵام ئەوە قسەی وانە. ئەمن بەبێ مەشوەرەت دەگەڵ ئێوە هیچ شتێک ناکەم. ئەو "ئێوە"بەشی بۆیە بەکار هێنا کە وەک ڕێز هەر ڕووی لە دوکتور قاسملوو نەبێ‌و هەموو حیزب بگرێتەوە. ئەوە نیشانەیەک بوو لەوەی کە پێوەندی‌یەکە قووڵ‌و پتەوو بەردەوام‌و بەرینە.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا هێزەکانی یەکیەتی بۆلای کۆمەڵەش هاتن. بۆ ئەوان لەسەر چ ئەساسێک بوو، ئایا هەمان داوا کرا یان شتێکی دیکە بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دۆستایەتی‌یەکە دەگەڵ ئەوانیش هەبوو، بەڵام داواکە لە ئێمەوە بوو. لەپاشان وا دانرا کە ئەوانیش دۆستن‌و بەشداری ئەو بزووتنەوەیەن. دوایە لە مەنتەقەکاندا بۆ ڕێنوێنی‌و تەداروکی هێزەکانی یەکیەتی کۆمەڵەش هاوکار بوو. بەهەر سووڕەت ئەو هێزانە پێویستی‌یان بەخەڵکی شارەزا هەبوو. لێرەدا نوکتەیەکم وەبیر هاتەوە کە ڕەنگە برایانی کۆمەڵە پێیان خۆش نەبێ شتی وا وەبیر بێنەوە، بەڵام با بگوترێ. دیدارێکمان لە "مەزرا"یە هەبوو، - مەزرا پێم وایە دێوتە دێیەکە لە مەنتەقەی "دارمێ"ی سەردەشت-. دیدارەکە لە بەینی یەکیەتیی نیشتمانی‌و حیزبی دێمۆکراتو کۆمەڵەدا بوو. ئەوە هەر لەو سەروبەندەی‌دا بوو کە ئەو هێزە هاتبوونو دەبێ تەداروک بکرێن. کۆبوونەوەکە بۆ ئەوە بوو کە داخوا چۆنیان تەداروک بکەینو کێ پێ-یان ڕابگا. لەلایەن یەکیەتی‌یەوە مامجەلال بوو نازانم کێی دیکەشی دەگەڵ بوو. لەلایەن ئێمەوە دوکتۆرو ئەمن بووین. لەلایەن کۆمەڵەشەوە کاک عەبدوڵڵا بوو، بەڵام بەڕاستی لەبیرم نیە کێی دیکەشی دەگەڵ بوو. کە باسی تەداروک کرا، کاک عەبدوڵڵا گوتی ئێمە ١٥٠ کەس تەداروک دەکەین. یانی لە ١٧٠٠ کەس. ئەویش دوکتۆر گوتی بۆ ١٥٠ کەس، یانی کەمتر لە یەک لەدەی ئەو هێزەی هاتوە؟ گوتی ئێمە هەر ئەوەندەمان پێ ئیدارە دەکرێ. دوکتۆر گوتی جالیبە. ئەو وەختەی باسی گومرک دەکرێ داوای سەتی پەنجا دەکەن. بەڵام ئەو وەختەی باسی تەداروک دەکرێ ئێوە لەسەتا دە کەمتر وەئەستۆ دەگرن. بەڵام بەهەر حاڵ قبووڵمان کرد. ئەوان هەر ئەو ١٥٠ کەسەیان وەئەستۆ گرت. ئەوی دیکە تەداروکی لەسەر حیزبی دێمۆکڕات بوو.

* وا بزانم ساڵی ١٩٨٣بوو کە دەوڵەتی ئێراقو یەکیەتیی نیشتمانی کەوتنە وتوویژ. وەکی باس دەکرێ حیزبی دێمۆکراتو بەتایبەت شەخسی دوکتۆر قاسملوو ڕۆڵی گرینگیان لەو نێوەدا گێڕا. دەکرێ لەو بوارەدا بدوێی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ئەوە ڕاستە. بەڕێکەوت ئەمن دیسان دەخزمەت دوکتۆر قاسملووی‌دا بووم کە سەفەرمان دەکرد بۆ بەغداو لەوێرا بۆ دەرێ. وەڕێ کەوتین، زستانیش بوو. پێم وایە ساڵی زایینی نوێ نەبێ‌وە، بەداخەوە یەکێک لە عەیبەکانی کاری من ئەوەیە نە ئەو تاریخانەم نووسیوەو نە لەبیرمن. هاتین بۆ شەوێ لە "مێرگی زەڵێ" میوانی مامجەلال بووین. بۆ بەیانی‌یەکەی وەڕێ کەوتین بۆ قەڵادزێ‌و لەوێڕا ڕۆیشتین بۆ بەغدا. کە چووینە بەغدایە، شەوێک بوو یان دوو شەو بوو لەوێ بووین دیدارێکیان دانا دەگەڵ

سەرۆکی موخابەرات. سەرۆکی موخابەرات ئەو بارزان تکریتی‌یە بوو کە ئەم دواییەیانە ئیعدام کرا. بارزان تکریتی دایکبرای سەددام حوسێن بوو. باسی مەسائیلی خۆمان، پێوەندی‌یەکانمانو شەڕی ئەو شەڕی ئێرانو عێراقو ئەوانە کرا کە پێویست بوو. پاشان زۆر بەپارێزەوە بارزان تکریتی گوتی: دوکتۆر ئەگەر ئێمە پەیامێکمان هەبێ شەفەوی یان کەتبی، ئێوە لەو سنوورانە هیچ ڕێگایەکتان هەیە بی‌گەیەننە کاکەجەلالی؟ زۆریش بە حورمەتەوە بە کاکە جەلالی ناو برد. باشە لە پەراوێزدا ئەوە بگوترێ کە گۆیا وەختی خۆی مام‌جەلالو بارزان تکریتی تێکەڵاوی‌یان هەبووە. دوکتۆر گوتی یانی چی، ئێمە کە هاتووین شەوێ میوانی مام‌جەلال بووین. ئێمە هەموو ڕۆژێ یەکتر دەبینین، ئەوان دێنو ئێمە دەچین. خۆ ئەویش ئەوەی دەزانی. بەڵام دەیەویست وا بڵێ کە مەسەلەن ئێمە دەی‌شارینەوە. یانی لەواقیعدا دوکتۆر پێی گوت ئێمە ئەو پێوەندی‌یانەمان بەدزی نین، ئەوە بە ئاشکرایە. جا پێتان خۆشە یان نا کەیفی خۆتانە. دیارە دوکتۆر بە دیپلۆماسی پێی دەگوتن. بەڵام ئەمن هەر بە سەراحەت پێم گوتوون. گوتوومە ئەوە شتێکی زۆر سروشتی‌یە. ئەتۆ دەگەڵ هەموو عەرەبیان پێوەندیت هەیە. ئەمن بۆ دەگەڵ هەموو کوردان نەبێ.

بە هەرحاڵ گوتی ئێمە پێمان‌خۆشە ڕێگایەکی دیکە بکەینەوەو موزاکەراتێک دەست پێ‌بکەین بۆ حەللی ئەو مەسەلەیە. ئیدی ئەو پەیامە ئێمە گەیاندمانو لەپاشان چەند جار هاتوچۆو نامەو پەیام هەبوون. چونکە هەموو جارێش دوکتۆر پێی نەدەکرا، بەشێکی زۆری هاتوچۆیەکان بەمن دەسپێران. سەرەنجام وای لێ‌هات یەکەم دیدار ئەوە بوو کە باسم کرد لە گۆزە شێری پێک‌هات. کەوابێ ئەم وتووێژانە لە زستانی ١٩٨٢را دەستیان پێ‌کرد، نەک ساڵی ١٩٨٣. دووهەم دیدار هاوینی١٩٨٣ لە ئالانی سەردەشت بوو. پێم وایە سێیەم دیداریش ئەوە بوو کە هەیئەتێک، موشەخەسەن کاک عەزیدوون عەبدولقادر چووە بەغدا. بەرلەوە ئەوە چووە پێشێ هەتا وای لێ‌هات خودی مام‌جەلالیش چوو. مام‌جەلال کە لەوێ مابوو، دوکتۆریشی دەگەڵ چووبوو. ڕۆژێکیان ئەمن هەمووی نیو سەعات دەبوو کە قسەم دەگەڵ کردبوون. کاک ئەنوشیروان داوای کردبوو بە بێسیم قسەم دەگەڵ بکا. زۆر بە نیگەرانی‌یەوە گوتی ئەو برادەرانەی ئێمە چی‌یان لێ‌هات؟ گوتم ئەو برادەرانەی ئێوە لەو جێگایەن کە چوونی، گوتی ماون؟ گوتم بابە ئەمن نیو سەعات پێش ئێستا قسەم دەگەڵ کردوون. گوتی ئەمن دەمێ بۆخۆم قسەیان دەگەڵ بکەم. گوتم زۆر باشە بۆخۆت قسەیان دەگەڵ بکە. ئیدی وا بوو فرێکانسەکانمان وەرگرتو وامان کرد بۆخۆی قسە دەگەڵ مام‌جەلال بکا. یانی نیگەرانی ئەوە بوون کە مەبادا شتێکیان بۆ بێتە پێش.

دواتر وای لێ‌هات کە بوو بە شتێکی ئاشکراو لە بەهاری ٨٤دا بوو کە مام‌جەلال میتینگێکی گەورەی لە "سووروداش" پێک‌هێنا. لەواقیعدا وەکوو شتێک پرسی بە خەلکەکە کرد داخوا ئەو کارە بکەن یان نا. ئەوە ڕۆیشتە پێشێ کە دیارە ئیشکالاتی یەکجار زۆری لەپێش بوو. ئیشکالاتەکە بەشێکی ئەوە بوو کە دەوڵەتی

عێراق ڕەنگە بۆخۆی حوسنی نییەتی تەواو نەبێ کە تەبیعی بوو. لەوە خراپتر ئێرانو سووریەو تورکیە هەوڵی تێکدانیان دەدا کە دوایەش هەر وای لێ‌هات. دەکرێ بڵێین لەحەجمی خۆشی‌دا لەوانەش خراپتر ئەوە بوو کە دوو هێزی عومدەی کورد یانی پارتی‌و یەکیەتی نەک لەسەر ئەوە ئیتتیفاقی نەزەریان نەبوو، بەڵکوو لەنێو خۆیاندا ناخۆشییشیان هەبوو.. ئەوانە هەموو ئیشکال بوون. بەڵام لەعەینی کاتدا ئەو دەورە لە موزاکەرات پێم وایە شتێکی باشی لێ‌شین بۆوە. جارێ ماوەیەکی زۆر حەسانەوەیەک هەبوو، بووژانەوەیەک هەبوو. لەجێ‌دا ئەمن زۆر جارم ئەوە گوتوە کە فەرقی بزووتنەوەی کورد لەباشوورو ڕۆژهەڵات، ڕاست لەو جێ‌یەدایە. ئەوەتا بزووتنەوەی کورد لە باشوور هەیە پێم وا نیە قەت سێ ساڵان لەسەر یەک دەشەڕدا بووبێ. هەمیشە کرانەوەیەک، ئاگربەستێک، موفاوەزاتێک، داڕژانی خێروبێر لە تەرەف حکوومەتی مەرکەزی‌یەوە بۆسەر کوردستان هەبووە. چونکی دەیەوێ بەخەیاڵ خەڵکەکەی بەوە جەزب بکا. مەسەلەن تووتنی دوو ساڵان دەمایەوە چونکە دەوڵەت نەی‌دەکڕی. پاشان کە لێی دەکڕین تووتنی دەرەجە سێشی بەدەرەجە یەک لێ‌دەکڕین. بۆیە خەڵک دەبووژانەوەو پارە پەیدا دەبوو. لەحاڵێک‌دا ئەوە بۆ ٣١ ساڵ دەچێ ئێمە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەگەڵ کۆماری ئیسلامی بەرەنگارین، تاقە یەک سەعات شتێک بەناوی حوسنی نییەتمان نەدیوە. حەتتا ئەوەی باسمان کرد گوتیان موزاکەرە دەکەین، بە نیوسەعاتی ئەویش تێک‌چوو. جا لەو بارەیەوە یەکیەتیی نیشتمانی پێم وایە توانی پشوویەک بداو خۆی ڕێک بخاتەوەو خەڵکەکەش پشوویەکیان وەبەر هاتەوە.

وەختی خۆشی ئەمن دوو شتم لەبیرن کە پێ‌یان خۆشحاڵ بووم. یەکیان لەو دیدارەدا کە گوتم لە گۆڕەشێری بوو، نوێنەرانی دەوڵەت دەستیان کرد بەقسە کە ئێوە لەهیچ‌و خۆڕایی وەشاخی کەوتنو لەخۆڕا شەڕتان ساز کرد. دەوڵەت حەقی کوردانی دەداو لەوشتانە. مامجەلال گوتی کاکە ئەتۆ نازانی، ئەتۆ ئاگات لەهیچ نیە. برۆ لە ڕەئیسەکەت بپرسە. داخوا چەندەمان نامە نووسیوە، چەندەمان قسە کردوە کە بابە ئێمە نامانەوێ عێراق تووشی وێرانی بێتەوە. ئیدی هیچیان پێ‌نەما. چونکی مەنتیقی مامجەلال بەقووەتتر بوو، نەک هەرئەوە کە قسەی چاکتری دەزانی، بەڵکوو بناغەی ئیستیدلالەکەی بەهێز بوو. ئەوی دیکە دوای تێکچوونی موفاوەزاتەکە مامجەلال جوزوەیەکی نووسی بەناوی: گوفتوگۆی ئەمجارەی شۆڕش دەگەڵ میری، شتێکی ئاوا. بەڕاستی ئەوەندە موستەنەدو قایم بوو کە هەرکەس دیبای لەوانەی لەبەینی کوردو عەرەبدا هەن، تەئییدی دەکرد کە بزووتنەوەی کورد مەوزیعێکی باشی هەبووە.

* شکستی وتووێژەکانی یەکیەتی‌و بەعس، دووبارە ئەو ڕێکخراوەی لە ئێران نیزیک کردەوە. ڕادەی ئەو نیزیک‌بوونەوەیە لەو قۆناغەدا چەند بوو؟ ئەوە بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەسەر شکستەکەی پێمخۆشە ئەوە باس بکەم کە لە بەشێکی ئەو موزاکەراتەدا، یەکیەتی و دەوڵەتی عێراق زۆر لێک نیزیک ببوونەوە. تەقریبەن لەسەر زۆربەی شتەکان بەیەک گەیشتبوون. ئەوە بۆ ئەو مەرحەلەیە دەڵێم نەک لەسەر مافی کوردو حەقی دیاریکردنی چارەنووس. لەوەدا تەنیا هێندێک شتی کەمیان مابوو. مەسەلەن لەسەر ئەو چەکدارانەی دەگەڵ دەوڵەت بوون هێندێک ئیختیلافیان مابوو. با ئەوەش بڵێم لەئاخر دیدارییاندا کە پێم وایە دەکەوتە بەینی بەهارو هاوینی ٨٤، مامجەلال لە بەغدا بوو. ماوەیەکی زۆر مایەوەو هەموو کەس نیگەران بوو کە عێراق گرتبێتی. لەپاشان ڕۆژێکی خەبەرمان زانی کە مامجەلال هاتۆتەوە. بەنامەیەکی دوکتور قاسملوویەوە ئەمن نێردرام بۆ لای مامجەلال. هەم مەسایلی خۆمان هەبوو، هەم بۆ ئەوەش کە بزانین بۆ بەچی. وەختێک ئەو پرسیارم لێ کرد کە خەڵک ئاوا نیگەران بوون، گوتی ئاوەڵڵا ئەوان لەکۆڵ من ببوونەوەو دەیانەویست پێمەوە دوایە حەللی کەین. بەڵام ئەمن لە کۆڵیان نەدەبوومەوە، دەمگوت نەخێر دەبێ جارێک بۆ هەمیشە حەللی دەکەین جا دەچمەوە. لە ئاخرەکەیدا دەرکەوت کە فشاری تورکیە بۆتە باعیسی ئەوە کە ئەوان لە ئیمزای ئەو قەراردادە کە هەبیانبووە پەشیمان بنەوە. یانی قەراردادیان نووسیوە هەر ماوەتەوە ئیمزای کەن.

جا دواتر کە ئێک چۆوە، ئێمە بەیاننێکمان نووسی. لەبەیانەکەدا پێ‌ناخۆشبوونی خۆمان لەشکستی ئەو موزاکەراتە دەربڕی. گوتبوومان کە هەرچەند دەوڵەتی عێراقو بزووتنەوەی کورد ڕێک کەوتبوون، بەڵام لەژێر فشارەکانی تورکیەدا ئێکیان داوەتەوە. ئەو وەختی کە ئەو بەیانە نووسرا، دوکتور قاسملوو بە سەفەرێکی کورت چووبووە دەرێ. وەختێک هاتەوە خەبەری دابوو کە پێمخۆشە وەختێک ئەمن دەگەمە بەغدا، ئەویش بگاتە وێ، یانی ئەمن. ئەمنیش چووم. ئەو وتارە لە ڕۆژنامەی کوردستاندا چاپ ببوو و دەوڵەتی عێراقیش دیبووی. وتارەکە مەرحوومی دوکتور سەعید نووسیبووی، بەڵام لەبەر ئەوەی مەسەلەکە گرنگ بوو بە منیشی نیشان دابوو. یەک، دوو ڕۆژ بوو لەوێ بووین کە دیدارێکمان دەگەڵ مەسئوولێنی عێراقی هەبوو. ئەگەر چووین ڕۆژنامەکە لەسەر مێزی کۆبوونەوەکە بوو. لەئەووەڵ مەرحەلەدا شتەکەیان لەپێش دوکتوری داناو گوتیان برایانی حیزب ئاوامان ڕەفتار دەگەڵ دەکەن. دوکتور پرسی چییە، چونکە بەڕاستییش ئاگای لێ نەبوو. گوتیان شتێکی ئاوایە. دوکتور گوتی ئەتۆ نووسیوتە؟ گوتم نا ئەمن نەمنووسیوە، بەڵام دیومەو ڕەزایەتم لەسەری هەبووە، مەسئوولییەتەکەی قبووڵ دەکەم. جا تەوزیحم دا، گوتم ئەوە بە دوژمنایەتی ئێوە نییە بە دۆستایەتییە. ئێمە داخی ئەوەمان دەربڕیوە کە دۆستێکی ئێمە، دەوڵەتێکی خاریجی تەئسیری لەسەر بڕیاری وی داناوە. ئەوەمان پێ ناخۆش بووە. ویستوویانە دەگەڵ میللەتی خۆیان ڕێک کەون بەڵام لەژێر فشاری تورکیەدا کشاونەوە. کابرا گوتی فشاری تورکیە یەکێک لە سەببەکان بووە، یانی قبووڵی کرد. ئەرقەزا

وتارەکەش تەقریبەن بەو جۆرەی بۆ چووبوو. گوتم جا وتارەکەش هەر ئاوا دەڵێ. وتارەکەش دەڵێ یەکێک لە هۆیەکان فشاری دەوڵەتی تورکیە بووە.

بەدوای ئەوانەدا بوو، ئێستا زەمانەکە کەنگێ بوو نازانم، کە مامجەلال سەفەرێکی ئێرانی کرد. دیارە پێش ئەوەی هێزی پشتیوان بێتە یارمەتیی ئێمە، پێوەندیی یەکیەتی و ئێرانێ هەر پچڕابوو، ئیدی لەو ماوەیەشدا هەر نەبوو. بۆیەش ئەودەمی مامجەلال گوتی ئێمە هیچ ئیحتیاجێ‌یەکمان بەئێران نیە. کەوابێ ئەو کارە دەکەین. بەڵام ئیدی ماوەیەک بەسەر هاوکاریی نیزامی دەگەڵ ئێمەدا تێ‌پەڕیبوو کە ئەو شتە ڕووی دا. پاشان ئەو ماوەیەش کە دەگەڵ عێراق وتوویژیان هەبوو و ئێران پەوەش قەڵس بوو، ئێستا ئەوەش تەواو ببوو. بۆیە مامجەلال سەفەرێکی کرد و پێوەندی‌یەکانیان گرێ دایەوە. ئەگەر لە چەندوچۆنەکەشی دەپرسی، بەڕاستی قەت پێویست نەبووە ئێمە ئەوانە بزانین.

* کاک نەوشیروان لە ڕێک‌کەوتنێک دەدوێ کە ساڵی ١٩٨٦ لە نێوان مام جەلال و بەرپرسی قەرارگای ڕەمەزاندا لەنێوان ئیمزا کراوە. بەپێی ئەو ڕێککەوتنە یەکیەتی قبووڵی کردوە بەبێ ڕەزامەندیی ئێران نە چالاکیی نیزامی بکا و نە دەگەڵ دەوڵەتی عێراق واریدی وتوویژ بێ. جەنابت ئەوە چۆن لێک دەدەیەوە؟ هەرلەجێدا دروستە بزووتنەوەی کورد هەتا ئەو ڕادەیە خۆی بەرعۆدە بکا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە بڕیارەکە بڕیاری خۆیانە. ئەگەر لەمن بپرسی، مێتۆدی کاری مە ئەوە بووە کە ڕەنگە زۆرمان زەرەری کاتی و مادی لێ دیبێ، زۆر زۆریش نەک کەم. بەڵام ئیدی مێتۆدی کاری ئێمە ئەوە بووە کە لە پێوەندی‌یەکانماندا نابێ سەربەخۆیی بڕیاردان لەدەست بدەین. ئەمن ئەوەم نەدیوە. هەتا پیاو نەشی بینێ ناتوانێ تەنانەت ئیزهاری نەزەریشی لەسەر بکا. ڕەنگە ئەگەر بی‌بینم بە باوەڕی من خراپ بێ، بەڵام هەر دەتوانم نەزەری لەسەر بدەم. ئەوەندەی بەحیزبی دیمۆکرات مەربووتە، تەنانەت ئەو موواففەقەتنامەیەی باسم کرد دەبەینی حیزبە کوردی‌یەکاندا، هێندێک شتی تێدا بوو کە یەکیان ئەوە بوو نابێ زیان بەکوردی بەشەکانی دیکە بگەیەنن. یەکی دیکەشیان ئەوە بوو کە نابێ بگاتە حەددی وابەستەیی. وابەستەیی بەو مانایە کە یان بڕیارەکانت تابیعی بڕیاری تەرەف بن، یان وات لێ‌بێ بەبێ وی نەتوانی بژی. یانی دەوێشدا ئەو شتانەمان گونجاندبوو. لەسەر یەک ئەگەر ئەوە بەوجۆرە ڕاست بێ، ئەمن پێم کارێکی باش نیە. بۆیەش بۆخۆمان شتی ئاوا ناکەین. بەڵام لەعەینی حاڵدا و موهیمتر لەوەش ئەوەیە کە داخوا بەڕاستی یەکیەتیی نیشتمانی بەکردەوە وای کردوە؟ یانی ئەو وەختە شەڕی دەگەڵ عێراق کردوە کە ئێران بڵێ؟ ئەو وەختەی سوڵح کردوە کە ئێران بڵێ؟ پێم وایە هیچ یەک لەوانە وا نیە. ساڵی ٩٢ کە دیسان موفاوەزات کرایەوە، ئێران پێی خۆش بوو عێراق بێ کوردستانی بە گەسکی ڕاماڵێ هەر کوردێکی تێدا نەیەڵێ. بەڵام دیسان دیتمان

یەکیەتی و شەخسی مامجەلالی چوونە بەغدایەو موزاکەرەیان کرد. دیارە ئەگەر شتێکی ئاوا بووبێ ئەمن پێم باش نیە ئەوە بۆ تەرەف هەر قبووڵ کەی کە بڵێن بە بێ ئەمری تۆ دەست دەناوێ ڕۆناکەم کە نازانم هەیە یان نیە. یان ئەگەر هەیە بەو شێوەیە هەیە! بەڵام لەسەر یەک، سوهیمتر لە هەمووی ئەوەیە داخوا ئەوە بەڕاستی جێبەجێ کراوە؟ ئەمن پێم وایە ئەگەر شتی وا بوو بێتیش جێبەجێ نەکراوە.

* بە دوای ساڵی ٨٦دا دیسان شەڕی زۆر قورس لە باشوور دەستی پێ کردەوە کە ئەوجار هێزەکانی ئێران بەئاشکرا خۆیان دەرەخست. لەو تۆناغەدا هیچ گیروگرفتێک بۆ سەرکردایەتیی ئێوە دەهاتە پێش کە لەو بەشەی کوردستان جێگیر بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** گیروگرفتەکە چەند گیروگرفتێکن. بنکەی ڕێبەرایەتیی ئێمە لە هێندێک حەڵقەدا کەوتبووە نێو ئاگری شەڕەکە. ڕەنگە بتوانم ئەوەی وەک گلەیی لە هەڵوێستی هێزەکانی یەکیەتیی نیشتمانی دابنێم. ئێمە لەسەرداوای وان- ئاخر جارێکی گلەیی‌یان کردبوو کە گلەیی‌یەکەمان قبووڵ کردن- موافەقەتمان کردبوو کە لە شەڕەکانمان دەگەڵ جمهوریی ئیسلامی‌دا دالانێک بۆ هاتوچۆی وان بێڵینەوە. بەڵام ئەو جێگایەی ئێمەی لێ بووین، لەسەر سەری ئێمە سەنگەرەکانی وانی لێ بوون. تەنانەت جارێکیان هێندێک ئازاری دیکەمان پێ گەیشت. مادام لە مەیدانی شەڕەکەدا بووین دەوڵەتی عێراق تۆپبارانی دەکرد کە وەبەر ئێمەش دەکەوت. مووشەکبارانی دەکرد بەشی ئەمنی تێدا بوو. لەو بارەیەوە ئازارمان پێ دەگەیشت. بەڵام جاری واش بووە کە عەکسی ئەوە ڕووی داوە. کە دیسان ئەوجی دۆستایەتیی ئێمەی گەیاندوە. دەوڵەتی ئێران هێرشێکی کرد بۆ ئەو ناوچەیەی ئێمەی لێ‌بووین. بە دەیان سەربازی عێراقی لە بەرامبەر هێرشەکەدا هەڵاتن بێ‌ئەوەی وەدواشیان کەون. هاتن پەنایان بۆ ئێمە هێنا. لەوکاتەدا ئەمن لەماڵێش نەبووم، ئێمە پەنامان دان. دەگەڵ یەکیەتیی نیشتمانی قسە کرابوو کە موافیق بوون هەموو بەسەلامەتی بڕۆن و تەنیا چەکەکانیان لێ وەربگیرێ.

دیارە کاک نەوشیروان قسەیەکی خۆشی کردبوو. گوتبووی بنکەی حیزبی دێموکرات بۆتە ماڵی ئەبوو سوفیانی! داستانی ئەبوو سوفیانی ئەوەیە وەختێکی پێغەمبەری ئیسلام پاش کۆچ کردن لە مەککەوە بۆ مەدینە، جارێکی دیکە هێرش دەکاتە سەر مەککەو فەتحی دەکا، هێزی دژبەر دەشکێ. ئەبوو سوفیان کە پیاو ماقووڵ بووە، پێغەمبەر دەڵێ هەرکەس پەنا بەرێتە بەر ماڵی ئەبوو سوفیان دەمەمان دایە. گوتبووی بنکەی حیزبی دێموکراتیش بۆتە ماڵی ئەبوو سوفیان. نێ ئێمەش گوتبوومان بەڵێ ماڵی ئەبوو سوفیانەو زیاتریش. چونکی پێوەندیی ئێمە دەگەڵ یەکیەتی، پێوەندی‌یەکی دۆستانەیەو کابرا بۆیە هاتوە پەنای بۆ ئێمە هێناوە. بەداخەوە کە حادیسەی ئاوا لە بەینی هێزە سیاسی‌یەکانی کورددا هەبووە. بەڵام لەو شەڕە بێ‌مانایەی

لەبەینی پارتی و یەکیەتی‌دا ڕوویدا، چەند جار هەڵکەوت کە کەسانێک لە پارتی دێمۆکراتی کوردستان دەهاتنە نێو بنکەکانی ئێمە لە مەنتەقەکانی ژێر نفووزی یەکیەتی، یان کەسانی یەکیەتی دەهاتن لە ناوچەی ژێر نفووزی پارتی. هەر دوولا ئیحتیرامی ماڵەکەی ئێمەیان دەگرت. تەنانەت ساڵی ١٩٩١ کە سوپای عێراق سلێمانیی گرتەوە، دەوری ١٠٠تا١٢٠ کەس لە لایەنگرانی پارتی و یەکیەتی هاتنە مەقەڕی مە لە سلێمانی، دەوڵەتی عێراقیش حورمەتی مەقەڕەکەی ئێمەی پاراست، یانی سەربازانی سوپا نەهاتن بڵێن حەتمەن دەی-پشکنین، هەرچەند زانیبووشیان خەڵکی زۆری لێیە.

* هاوکاریی یەکیەتی دەگەڵ ئێران بۆ گرتنی هەڵەبجە هەتا چ ڕادەیەک بوو؟ ئایا ئەو هاوکاری‌یە بۆ مەبەستێکی ئاوا دروست بوو؟ ئەو کات ئێوە لە مەوزووعەکە ئاگادار بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەک بڵێم ئەو کات، دەتوانم بڵێم ئێستاش لە جوزئیاتی ئەو هاوکاری‌یانە ئاگادار نەبووین. بەڵام وا فکر دەکەمەوە ئەگەر یەکیەتیی نیشتمانی بەجۆرێک لەجۆران هاوکاری و هاوجەبهەییشی دەگەڵ ئێران کردبێ، قەت دەفکری ئەوەدا نەبووە کە وەزعەکە ئاوای لێ‌بێ. تەنانەت شتی جالیبیش هەبوون کە نازانم ڕاست بوو یان نا. بەڵام ئەو وەختی باسیان کرد کە ئەووەڵێن ئەوە هێزەکانی یەکیەتیی نیشتمانی بوون کە هەڵەبجەیان گرتوە نەک ئێران. جا دوایە ئێرانی‌یەکان هاتوونەتە نێوێ. ئەوجار بیستم کە لە دەروازەی شاری، ئێرانی‌یەکان سەیتەرەیان داناوە کە ئیجازە نەدەن هیچ کەس بچێتە نێوێ. فەرماندەیەکی یەکیەتی بەخۆی و چەند پێشمەرگەیەکەوە دەچێ کە واریدی شار بێ، بەڵام ڕێگای دەگرن. دەڵێ بابە ئەوە شاری ئێمەیە و بەدەست ئێمەوەیە. ئێرانی‌یەکان دەڵێن نا مەمنووعە. ئیدی پێشمەرگەکان زۆر مەرداتە لێ‌یان دەدەن و هەرچی لێی دەبێ دەی‌کوژن و ئەوجار دەڕۆن. شتی ئاوا هەبووە، بەڵام جوزئیاتەکەی بەڕاستی نازانم.

* گۆیا هەر لەجەنگەی ئەو بۆمبارانە شیمیایی‌یەدا هێزەکانی یەکیەتیی نیشتمانی سەدان پێشمەرگەی حیزبیان لە دەوروبەری هەڵەبجە ڕزگار کردوە کە کەوتبوونە گەمارۆی هێزەکانی ئێران. دەکرێ ئەو داستانەمان بۆ ڕوون کەیەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو داستانە خەڵکمان هەیە زۆر بە تەفسیلتر بی‌زانێ، بەڵام ئەوە ڕووداوێکی واقیعی بوو. لەو وەختەدا کە ئەو هێرشە کرا، پێشمەرگەکانی ئێمە لە دەوروبەری ئەوسوود و ئەو ناوچە سنووری‌یانە شەڕێکی زۆر قارەمانانەیان کرد. زەبرێکی زۆر گەورەیان لە دوژمن دا. لەپاشان کە وای لێ‌هات هەموو مەنتەقەکە گیرایەوە، ئیدی پێشمەرگەکان لە هەموو لایەکەوە کەوتنە موحاسەرەوە. ئەگەر لەبیرم بێ کوللی هێزەکانی ئێمە کە لەوێ بوون، - دیارە ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان پێشمەرگە نەبوون - دەوری ٨٠٠ کەس

بوون، ژنو منداڵەکە هەمووی نەمان، بەڵام لە نێو ئەوانەدا هەبوون کە پێشمەرگە نەبوون. ڕەنگە ٥٠ کەسێکیان خەڵکی غەیرە پێشمەرگە تێدا بوون. ئەوانە لە وەزعێک‌دا بوون کە نە دێ هەبوو، نە شار هەبوو، نە نان هەبوو، نە ئاو هەبوو. بەڵام بەهار بوو گژو گیا زۆر بوو دەیانتوانی ئەوەی بخۆن. تەنانەت لەجێ‌یەکی فەرماندەکانی ئێمە دەگەڵ ئەرماندەکانی یەکیەتی دانیشتوون کە فەرماندەی ئێرانێشیان لەنێودا بوون، بە بێ ئەوەی لێ‌یان ئاشکرا بکرێ هەروا بزانە ئەوانەش پێشمەرگەی یەکیەتین. بە هەرحاڵ هێزەکانی یەکیەتی کارێکیان کرد کە هێزەکانی ئێمە لەو موحاسەرەیە نەجاتیان بێ.

لێرەدا پێم‌خۆشە ئەوەش بڵێم کە بەشێکی زۆر لە هونەری ئەو کارە دەگەڕێتەوە بۆ پارتی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتیی کاک حەمەی حاجی مەحموود. جا ئەگەر پێی خۆشە لەبەر ئێران بڵێ ئاگام لێ نەبووە، یا ئاگای لێ نەبووبێ. ئەگەر پێشی خۆشە شانازیی پێوە بکا، با شانازیی پێوە بکا. بەڵام ئەو شارەزایانەی باعیس بوون ٨٠٠ پێشمەرگەی ئێمە لە ڕێگایەکی دوورو درێژدا، لەبارانەدا، لەنێوان دوو ئەرتەشی بەرچەک‌دا، دالانێک وەبینەو پێی‌دا ڕزگار بێ، ئەفرادی ئەو حیزبە بوون کە نەجاتیان داو لە ناوچەی خەتەر دەربازیان کردن. دیارە با ئەو حەقە بڵێین کە وەختێک هێزەکانی ئێمە گەیشتنە شوێنێکی دیاریکراو، دەوڵەتی عێراقیش ڕێگای بۆ کردنەوە تەنانەت کۆمەکی کردن بە ماشێنیش بەشێکی زۆریان دەرباز بن. چونکی خەڵکەکەی ئێمە ئیدی هیچی پێ نەمابوو. گاڵتە نیە چەند شەو ڕۆژان بنیادەم هیچی دەست نەکەوێ بیخواو تەنانەت گژو گیاش گازی شیمیایی وەسەر کەوتووە لەویش دەترسێن بی‌خۆن. ئاخر خەڵکێکی زۆری ئێمەش بەو چەکە شیمیایی‌یە تووشی خەسار هاتن کە بە خۆشی‌یەوە کەمیان لێ نەمرد، ئێ وامان هەیە ئێستاش موشکیلاتی تەنەففوسیی هەیە لە نەتیجەی ئەو بۆمبارانە شیمیایی‌یەدا.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ئەمن لەوەی تێ نەگەیشتم. یەکیەتی ڕزگاری کردن یان سۆسیالیست؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** یەکیەتی بۆ ئەوە کۆمەکی کردبوون کە لەلای هێزەکانی ئێران ئاشکرا نەبێو هێرشیان نەکرێتە سەر. بەڵام شارەزاکان کە وەپێشیان کەوتبوونو دەگەڵیان کەوتبوون کە ژمارەیان بەینی ٤ هەتا ٦ کەس بوو، زۆربەیان هی سۆسیالیستان بوون. ئەوانە کونبەکونی ئەو مەنتەقەیە شارەزا بوونو توانیویانە بە لاڕێ‌دا، بەنێو ئەو دوو ئەرتەشەدا دەربازیان بکەن. خۆ دوو کەسیش نین بڵێی بشاردرێنەوە. ٨٠٠ کەس گاڵتەی پێ ناکرێ. یانی کارێکی زۆر گران بوو. ئەگەر ئەوە نەبوایە هی ئێمە هەموویان تێدا دەچوون.

ئەو وەختی ئاساری شەڕی نەعلەتیی بەینی ئێمەو کۆمەڵەش هەر مابوو. گوردانێک لە پێشمەرگەکانی ئەوانیش لەوێ بوون کە فەرمانەکانی ئێمە پێ‌یان گوتبوون وەرن با پێکەوە بڕۆین. بەهەر دەلیلێک کە ڕەنگە باوەڕیان پێ‌یان نەبووبێ، دەگەڵیان نەکەوتبوون. بەداخەوە ئەوان یەک نەفەریشیان لێ دەرنەچوو.

**هەیاس کاردۆ:** مەبەستت گوردانی شوانە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ گوردانی شوان. زۆر بەداخەوە گوردانی شوان هەمووی لەبەین چوو. بۆیە ئەگەر تەماشا دەکەی، کارەکە کارێکی گەورە بوو. یەکیەتیی نیشتمانی نەیهێشت ئێران هەست بە وجوودیان بکاو هێرشیان بکاتە سەری. سۆسیالیستیش ڕێنوێنیی کردن و دەربازی کردن کە پێمخۆشە تاریخ حەقی خۆیان بداتێ.

* دوای ئەنفال و هەڵەبجە کە لە کارەساتە هەرە تاڵەکانی مێژووی کوردن، بزووتنەوەی خەڵکی باشوور تووشی پاشەکشەیەکی دیکە هات. لەو قۆناغەدا کە هێزەکانی یەکیەتی مەیدانداری ئەسڵیی خەباتەکە بوون کاریان بە کوێ کێشراو چییان لێ هاتەوە؟ پێوەندیی حیزب و یەکیەتی لەو کات و ساتانەدا چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وابێ دەزانی کە ئەمن لەو کاتانەدا ئەندامێکی ڕێبەریی حیزب نەبووم. لەو ڕۆژانەدا کۆنگرەی ٨ گیرابوو کە ئەمن خۆم بۆ کۆمیتەی ناوەندی کاندیدا نەکردەوە. هێزەکانی یەکیەتیی نیشتمانی دیارە ڕۆژگارێکی تاڵیان بەسەر هات. یانی هەموو هێزەکان مەجبوور بوون دوای ئەوەی ئەو هەموو ناوچە ئازادەیان دەیەر دەستدا بوو، لەواقیعدا وڵات بەجێ بێڵن و بچنە دەرەوەی سنوورەکان. تەنانەت ڕووحێکی نائومێدی بەسەر هەمووناندا زاڵ بوو. ئەوەی ئەمن بیزانم کاک نەوشیروان پیاوێکی زۆر ئازایە. زۆریش بەرووحیەیە. کوڕی مەیدانی شەڕو سازماندەهیی شەڕو حیزبییە. لەو بارەیەوە پیاوێکی بە توانایە. بەڵام کاک نەوشیروان دەوەیدا نائومێد ببوو. ئەمن دە مەجلیسەکەدا نەبووم، بەڵام دوایە بۆیان گێڕامەوە کە گوتبووی حیسابی کوردی عێراق تازە بۆ ٢٠ ساڵی دیکە ڕۆیشت. یانی ئەو ڕووحییەتە زاڵ ببوو. دیارە دوایە بە خۆشییەوە هەمووی ٢ ساڵی پێوە خرا کە بە خیلافی ئەو پێشبینییە، یان ئەو ڕەشبینییە، دەرفەتێکی دیکە خولقاو شتەکان گۆڕان.

بەڵام لێرەدا ئەمن پێمخۆشە ئیشارە بە شتێکی جێگای شانازی بکەم بۆ کوردەکان لەعێراقدا: ئەگەر هاوکاریی زۆری بەینی کوردەکان نەبایە، جا کوردەکان بەواتەشەوە کە دەگەڵ دەوڵەت بوون، باوەڕ کە بە هەزاران پێشمەرگە لەبەین دەچوون. ئێمە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ئاگامان لێبوو کە بە هەزاران پێشمەرگە بە ماشێن بە بەردەمی هێزەکانی عێراقدا هاتن و تێپەڕین، بڵێین بە لیباسی عادییەوە. هەموو بەناوی دیکەوە وەرەقەی عەدەم تەعەڕڕوزیان بۆ ساز کرا بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێ. مەسەلەن ناوەکەیم نە لەبیرەو نە ئەگەر لەبیریشم با دەمگوت، بەڵام یەک ماڵ، تەنیا یەک ماڵ بە ماوەی نیزیک بە مانگێک دەوری ٤٠ پێشمەرگەی ڕاگرتبوو هەتا دەرفەتیان بۆ هەڵکەوێ بڕۆن. ئەوە لە یەکێک لە شارە چووکەکانیش نەک شاری گەورە. یەک ماڵ ٤٠ پێشمەرگە بحاوێنێتەوە لەحاڵێکدا ئاشکرابوونی یەک پێشمەرگە بۆ وی

بەمانای تێداچوونی خۆی و بنەماڵەکەیەتی. ئەو ئازایەتی یەی کوردی عێراق نواندی، بە مەشرووعیەتی ئیدارەکانیشەوە، بەوانەوە کە بەحیساب پیاوی دەوڵەتن، بەکرێگیراوی دەوڵەتن بەھەمووپانەوە، ئەو ئازایەتی یە شتێکی مێژوویی بوو.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا وەک بزانی حیزب لەو نەقڵ و ئینتیقالەدا هیچ یارمەتی یەکی کرد؟
**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێموایە ئێمەش نەقشی خراپمان نەبوو. هەم حیزبی دیمۆکراتو هەم لایەنەکانی دیکە لەو بارەیەوە عامیلێکی موسبەت بوون. هەر ئەوەندەی لێ دەڵێم.

* هەروەک دەزانین دوای ڕاگرتنی شەڕی ئێران و عێراق حیزبی دیمۆکرات دەورەیەکی دیکەی لە وتووێژ دەگەڵ کۆماری ئیسلامی دەست پێ کرد کە ئاکامێکی زۆر خەفەتباری بەدواوە بوو. لەم پرسیارەدا ناچینە نێو ئەو باسە بەڵام پێمخۆشە بزانم مام جەلال چ ڕۆڵێکی لەو پێوەندی یەدا گێڕا؟
**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** زۆر جار کە دیدارەکانمان دەبوون، مامجەلال بە دوکتۆر قاسملوی دەگوت ئەمن پێت قەرزدارم. ئەتۆ منت بردە بەغدا، ئەمنیش دەمێ تۆ بەرمەوە تاران. لەپێشەوە بۆ تەوزیحی شتەکە با ئەوەی بڵێم، ئەمن هەتا شەھیدبوونی دوکتۆری، بەجورئیاتەوە ئاگام لەوە نەبوو کە شتێکی ئاوا هەیە. جارێکیان دوکتۆر قاسملوو بەشێوەیەکی سەربەستە، بە قەولی دەڵێن دە لەفافەدا دەگەڵی باس کردم کە ئەگەر دەوڵەتی جمهووری ئیسلامی داوای موزاکەرە بکا بۆ حەللی مەسەلەی کورد، نەزەرت چیە؟ جوابەکەی من ئەوە بوو کە بەبێ ئەو پرەنسیپانەی دەختی خۆی پەسندمان کردوون پێم وایە شتێکی تەبیعی یە. لەو ڕادەیەدا ئاگام لێ بوو. هەتا ئەو ڕۆژەی خەبەری شەھیدبوونی هات، جا ئەو ڕۆژە بۆم دەرکەوت کە حادیسەکە ئاوا بووە. یانی لەسەر مێزی بەناو وتووێژ شەھیدیان کردوە. کەوابێ بە بێ شک پێکهاتنی ئەو دیدارە وەساتەتی مامجەلالی تێدا بووە. تەنانەت نەک وەساتەت، بەڵکوو مامجەلال هەر بۆخۆی تێدا بووە. چونکی وەکی دەزانین ئەوە هەر ئەو دیدارە نەبووە کە دوکتۆر قاسملوو و کاک عەبدوڵڵای تێدا شەھید بوون، دەگەڵ دوکتۆر فازیلی. ئەوە لە مانگی ژووئیەدا بوو. لە مانگی ژانویەدا، یانی ٦ مانگ پێشتر، واتە کۆتایی یەکانی دیسامبری ٨٨ و سەرەتاکانی ژانویەی ١٩٨٩، دوو، سێ جەلسەی دیکە ببوون لە ڤییەن کە لەوانەدا هەم مامجەلال هەبووە، هەم وا بزانم ئەگەر دەمەوشی دا نەبێ کاک نەوشیروانی هەبووە. هەم دیارە ئەحمەد بن بیللا سەرۆک کۆماری پێشووی ئەلجەزایر هەبووە.

ئەوێدا قسەکانیان کردووەو بڕیاریان داوە نەزەرەکان بەرنەوە تاران و دوایە جواب بدەنەوە. دواتر دەنگۆیەک بڵاو بۆوە کە موزاکەرات بووە. ڕاستە، درۆیە؟ زۆر ساغ نەبۆوە. تەنانەت جارێکی بەدوای ئەوەدا شتێک ڕووی دا.

یەکێک لەمنی پرسی ئەرێ ئەو سەفەرەت چۆن بوو؟ گوتم سەفەری کوێ؟ گوتی سەفەری تاران. گوتم تارانی چیو شتی چی؟ گوتی کوڕە وەک شتێکی موسەللەم باسیان کرد کە ئەتۆیان لەسەر پردی "پریسوێ" دەماشێنیدا دیوە بەرەو تاران چووی. هێندێک ئەو شایعاتە ساز ببوو، بەڵام بۆ خەڵکی سابیت نەبوو. جمهوریی ئیسلامی بۆخۆی شایعەیەکی وای بڵاو کردبۆوە. دواتر ئەوە دەرکەوت کە گۆیا ئەو وتووێژانە ئاشکرا بوون. ئەوەش بۆچی، بۆ ئەوەی بی کەنە بیانوو بۆ حەزفی یەکیەتیی نیشتمانی لەو وەساتەتە. کە گۆیا یەکیەتی زاریەھاوارو قسەکان دەدرکێنێ، بۆیە نامانەوێ تێیدا بێ.

دەڵێن ئەگەر بەڵاو موسیبەت هات ئینسان نە چاوی دەبینێ، نە گوێی دەبیسێ، نە زمانی گۆ دەکا، نە عەقڵیشی کار دەکا. کاربەدەستانی ڕێژیم دەڵێن دەبێ دیدارێکمان هەبێ جوابی ئەو قسانە بدەینەوە کە داواتان کردوە. لەو وەختەدا دوکتۆر سەعید لە دەرەوەیە. دوکتۆر قاسملوو دەڵێ باشە ئەوە جێگری سکرتێرمان لەوێیە، دیدارەکە دەگەڵ وی ڕێک بخەن، ئەمن لە کوردستانم. دەڵێن نا، دەمانەوێ هەر دەگەڵ خۆت دانیشین. یانی حەتتا ئەوەش دوکتۆر قاسملووی وەخەبەر نایەنێ کە ئەوانە بەرنامەیەکیان بە دەستەوەیە. ئەوە بوو کە قبووڵیان نەکرد، هەتا وایان کرد کە دوکتۆر قاسملوو بۆخۆی بچێتەوە دەرێ. لەدوایەش هەر بەو دەلیلە کە یەکیەتیی نیشتمانی زاریەھاوارو شتەکە دەدرکێنێ، ئەویان حەزف کرد. ئەوەش یەکێکە لە نیشانەکانی ناڕاستیی ڕێژیم. دەنا بۆ ترست لە درکانی هەیە؟ بۆ دەبێ ئاوا نهێنی بێ؟ ئەزقەزا یەکێک لە پرەنسیپەکانمان پێشتریشو دواتریش ئەوە بوو کە ئێمە موزاکەرەی نهێنی ناکەین. خۆ ئێمە ناچین دەگەڵ دەوڵەتێکی خاریجی قسان بکەین، دەچین دەگەڵ دەوڵەتی حاکم بەسەر وڵاتی خۆماندا قسان بکەین. دەی باشە ئەوە شاردنەوەی بۆچییە. جوزئیاتەکەی ڕەنگە هەتا پێک نەگەین بەکەس نەڵێین. بەڵام با هەموو دنیا بزانێ ئەوە موزاکەرەیە. بۆخۆم بۆم باس کردی ئەو وەختی دەچووین بۆ دیداری پیتروشی، هەم لە موحیتی دەفتەری سیاسیی خەڵک دەیان-زانی، هەم لە ڕێگایەش هەرکەس پرسیبای دەمانگوت بۆ شتێکی ئاوا دەچین. کەچی مەسەلەن دوکتۆر قاسملوو قبووڵی کردبوو کە دەبێ بەنهێنی بێو یەکیەتییش حەزف بکرێ چونکی گۆیا زار بە هاوارە.

**هەیاس کاردۆ:** یانی نەقشی مامجەلالی هەر ئەو حەددەیدا بووە کە چەند جەلەسەیەک بەشدار بێو تەواو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نازانم ئەتۆ مەبەستت ئەوەیە چ بپرسی؟ ژمارەیەک هەن بەناوی نهێنی یان پەنامەکی ئیدیعا دەکەن کە مامجەلال یان یەکیەتیی نیشتمانی دەستیان لەو تیرۆرەدا هەبووە، ئاگایان لێبووە، یان کارەکە بە موافەقەتی وان کراوە. یەکیەتیی نیشتمانی دۆستێکی لەمێژینەی حیزبی دێموکراتی کوردستانە. ئەمن شەخسەن ئەک دۆستایەتی، ئیحترامێکی زۆرم بۆ مامجەلال هەیە. بەڵام ئەوانە ئەگەر ڕاست دەکەن با بەڵگەیەک نیشان بدەن هەتا حیزبی دێموکراتیشو یەکێکی وەکوو منیش هەڵوێست بگرن. ئەمن ئامادەم

هەرچی توانای قەڵەمیم هەیە - ڕەنگە هیچی دیکەم لەدەست نەیە - دەکاری بێنم بۆ مەحکووم‌کردن یان بۆ ڕیسوا کردنی ئەوتیشەیەکی ئاوا. بەڵام جاری یەکەم کە دیدارەکە لە بەینی ئەوان و حیزبەو یەکیەتی‌دا بووە، ۱۹ کەسیان نیگابان داناوە کە ۷ کەسیان دەمانچەیان پێ بووە. جمهووری ئیسلامی تێ گەیشتووە بە بوونی یەکیەتی نیشتمانی ناتوانێ نەخشەی ئەو تیرۆرە جێبەجێ بکا. مەسەلەن ۳ جار دیدار هەبووە، هەر جاری لە ماڵێک بووە. هەموو جارێ چوون ئەفەراتەکانیان بردوە، جا دوایە چوون ئەوانی دیکەشیان بردوە بێ ئەوەی پێشتر نە حیزبی دێمۆکراتو نە ئەوان بزانن دیداری ئەمڕۆ لەکوێیە. ئەوە مورەتەبیش نەبەر دەرگاو لە داڵانی ماڵەکەو لە کووچەو لە خیابانێ نیگابان ڕاوەستاون کە حەوت لە نۆزدەیان دەمانچەشیان پێ بووە. لە وڵاتانی ئورووپایی، - ڕەنگە لەو وڵاتەی تۆشی لێ‌دەژی وا بێ- خەڵک بەپێی شەراییتێک دەتوانن سیلاحیان هەبێ، موجەووزیان دەدەنێ. جا تێ گەیشتوون کە بەو وەزعییەتەوە دوکتۆریان بۆ ناکوژرێ. دەبێ وا بکەن کە یەکیەتی حەزف بکەن. ئەدی ئەحمەد بن‌بیللایان بۆ حەزف کرد. پێم وایە بن‌بیللا ئەو پیاوە نەبوو، ئەو ئیمکانییەتەی نەبوو کە بتوانێ شتێکی ئاوا بکا. بەڵام نەیانەویست بە کوشتنی وی خۆیان دەگەڵ وڵاتانی عەرەبی تووشی کێشە بکەن کە کابرا سەرۆک‌کۆماری پێشووی وڵاتێکی عەرەبی بووە. بۆیە ئەویشیان بە بیانووی ئەوە کە ئەوە مەسەلەیەکی نێوخۆییەو نابێ ئەوی تێدا بێ، حەزف کرد.

یان مەسەلەن تۆمەت لە دوکتۆر فازیلی دەدەن. تۆمەتیان لێ داوە کە کۆمەگی بەو تیرۆرە کردوە. دوکتۆر فازیل پیاوێک بوو زۆر عاشقی ناوو شۆرەت. بۆیە دەستی دە هەموو کونان ڕا دەکرد. جارێ لەپێشدا ئەوەی بڵێم پیاوێکی یەکجار خوێندەوار بوو. کوردی‌یەکی زۆر باشی دەزانی. عەرەبی‌یەکی زۆر باشی دەزانی. ئەڵمانی‌یەکی مونتازی دەزانی. وەکی دەڵێن ئینگلیسی‌یەکی باشی دەزانی. مامۆستای زانستگا بوو لە ڤییەن. بەڵام وەختێک کۆمۆنیست بوو. لەپاشان کە کۆمۆنیسمی ئینقیلابیی سەر بەچین پەیدا بوو، ڕووی دەوی کردو بوو بە مائۆییستێکی دوو ئاتەشە. دوایە کە ماوەیەک ئیسلامیزم ڕەواجێکی زۆری پەیدا کرد، ڕەگەڵ وان کەوت. مەجەللەیەکیشی دەر دەکرد بە ناوی "الحوار" کە مەجەللەیەکی فکری- ئیسلامی بوو. لەو ڕێگایەوە دەگەڵ بەنی سەدرو دەگەڵ کۆماری ئیسلامییش دۆستایەتیی پەیدا کرد. باشە ئەوان دەبێ کەسێکیان هەبێ دەگەڵ دوکتۆر قاسملوو قسە بکا. فازیل هەم دۆستی دوکتۆر قاسملوو بوو، هەم پێش ئەویش دەگەڵ شەخسی من دۆست بوو. فازیل ئەو کەسە نەبوو خۆ بفرۆشێ، یان خەیانەت بە دوکتۆر قاسملوو بکا. بەڵام دەبێ یەکێک واسیتە بێ. لەپاشانیش بۆ جمهووری ئیسلامی کوشتنی یەکێکی وەک فازیل چییە؟ دەی باشە کوردێک کەمترا یانی زۆر بە ئاسانی دەتوانن ئەویش فیدا بکەن. دەنا ئەمن ئەگەر خیلافی ئەوەم بۆ دەرکەوێ، هیچ بۆی داناپۆشم. بەڵام لە ویژدانی خۆمدا، دوکتۆر فازیلی بە بێ‌تاوان دەزانم. یانی کرا بە قوربانی. دەبوو ئەویش بکوژن هەتا هەموو شتێک ون بێ. دەنا ئەو مابایە هەموو شتێکی ئاشکرا دەکرد.

* بەشێک لەبیروڕای گشتی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان پێی وایە مامجەلال نفووزی دوکتۆر قاسملووی پێ تەحەممول نەدەکراو هەربۆیە کارئاسانیی بۆ لەداوخستنی کردوە. دیارە ئەوە تەنیا بیری بەشێک لەخەڵکە کە من ناچارم بۆ ڕوونبوونەوەی مێژوو وەدوای کەوم. ئەتۆ لەو بارەیەوە چۆن فکر دەکەیەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە لە وەڵامی پرسیارەکەی ئەووەڵی‌دا بەجۆرێک باسی ئەوەم کرد. ئەمن پێم وایە جەلال تاڵەبانی دۆستایەتیی دەگەڵ خەڵکێکی زۆر زۆر هەبووە. کەم کەس لەدنیادا ئەوەندە دۆستایەتیی بەریتی هەیە. بەڵام ئەوەندەی ئەمن مامجەلالم دەگەڵ خەڵکی دیکە دیوە، پێم وایە ئیحتیرامێک کە بۆ دوکتۆر قاسملووی قایل بوو، بۆ هیچ کەس قایل نەبووە. لەپاڵ خۆی‌دا پێم وایە تەنیا دوکتۆر قاسملووی بە کەسێک دەزانی کە دەبێ لێی فێر بێ. دەبێ مەشوەرەتی دەگەڵ بکاو قسەی لێ ببیسێ. بە هیچ جۆر ئەو هەستە کە بە خەتەری بزانێ، یان لە نفووزەکەی بترسێ، ئەمن هەستم پێ‌نەکردوە. عەکسی ئەوە. ئەو قووەتی حیزبی دێمۆکراتی بە قووەتی خۆی دەزانی. ئەوەندەی لەدەستی هاتوە لەو بارەیەوە کردوویەتی، چونکی کافی‌یە ١٧٠٠ کەسی لە پێشمەرگەی حیزبەکەی خۆی ناردۆتە کۆمەگی حیزبی دێمۆکرات. یانی ئەوە ناسوپاسی‌یەکی عەجایب زۆرە ئینسان ئەوەی وا تەفسیر بکا.

**هەیاس کاردۆ:** ئەدی چۆنە لەسەرەتای ئینقیلابدا کۆمەگی بە دروستبوونی کۆمەڵە کردوە. گۆیا گوتوویەتی بارزانی‌یەکی دیکە بۆخۆتان دروست مەکەنەوە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کێ‌یە ئەو قسەیە دەکا؟ ئەمن بۆخۆم ئاگام لەوەی هەیە کە لەو ماوە دیاریکراوەدا یەکیەتیی نیشتمانی هەوڵی داوە لە کوردستانی ئێران پێگە بۆ خۆی دروست بکا. پێی وا بووە حیزبی دێمۆکرات تەواو بووە، شتێک بەناوی حیزبی دێمۆکرات نەماوە. بەڵام دوایە کە پێوەندی‌یەکان دروست بوون، ئەمن لە غەیری هاوکاری، غەیری سەداقەت و موحیببەت بەڕاستی نە لە مامجەلالی بەرامبەر بە دوکتۆر قاسملووی و نە لە یەکیەتیی نیشتمانی بەرامبەر بە حیزبی دێمۆکرات نەمدیوە. ئەوە بەو مانایە نیە کە هەڵە نەبووە. بەو مانایە نیە کە ئێمە هەمیشە لە هەڵوێستەکانی وان ڕازی بووین. بەو مانایە نیە ئیرادمان بەوان نەبووە، یان ئەوان ئیرادیان بە ئێمە نەبووە. ئەمن بۆخۆم دەگەڵ مامجەلال شەڕم کردوە.

* بەدوای ڕاپەڕینی خەڵکی باشووری کوردستان و بەدەسەڵات گەیشتنی یەکیەتی‌دا، چ ئاڵ‌وگۆڕێک لە پێوەندی‌یەکانی دوو لایەندا پێک‌هات، بەتایبەت بە نەبوونی دوکتۆر قاسملووی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەدەسەڵات‌گەیشتنی کوردەکان لە باشووری کوردستان ڕەنگە جاروبار هێندێک مەحدوودیەتی بۆ ئێمە دروست کردبێ. هێندێک شتی خراپی تێدا بووە. بەڵام وەکی دیکە حیزبیش و خەڵکی

ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش ئەوەی کە ڕووی داوە بە دەسکەوتی کوردیان زانیوە. پێوەندییشمان دەگەڵ یەکیەتیی نیشتمانی هەر پێوەندییەکی دۆستانە بووە. شاراوە نیە هەر وەکی باسمان کرد شەڕی چەکدارانە دە بەینی ئەو پارتیدا هەبوو. بۆیە بۆ ماوەیەک ساردیو کوردووریمان لەبەینیدا هەبووە. بەڵام تەنانەت پێش دامەزرانی حکوومەتی هەرێمیش کە جارێ بەرەی کوردستانی حاکم بوو، پێوەندیی ئێمە دەگەڵ پارتی گەڕاوەتەوە سەر دۆخێکی دۆستانەو سالم. یانی بۆتە نموونەی پێوەندییەکی باش لەنێو هێزە کوردستانییەکاندا. ئەمن بە موسبەتی دەزانم. ئەوە بەو مانایە نیە ئێمە بووینە پارتی یان یەکیەتی یان ئەوان بوونە دێموکرات.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا لێرە ئەمن باسی گێڕانەوەی مێژووت لێ دەپرسم نەک شتی ڕەسمی. پێم‌خۆشە ڕووداوەکان بە دەقیقی باس بکەین. سەرەتا کە ئەوانە دێنەوە وردە وردە دەسەڵات بەدەستەوە دەگرن، قۆناغ بە قۆناغ ئێوە تووشی موشکیل دەبن. ئەوانە وەک ڕووداو باس بکەین.

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** وەک چ موشکیلێک؟

**عەباس کاردۆ:** وەک ئەوە کە ئێوەی لە قەندیلی بەرە بەرە فشارتان بۆ دێنن‌و دەرتان دەکەن.

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** خۆ ئەو فشارە فشاری پارتیو یەکیەتی نیە. باشە ئەوە هەر ئێستا هەموو ڕۆژێ خاکەکەیان تۆپ‌باران دەکرێو هیچیشیان پێ ناکرێ. ئێمە قەت وا ناواقیعیین نەبووین کە پێمان وا بێ ئەوان دەبێ بێن لەسەر ئێمە لەشکرکێشی بکەن. تەنانەت ئەمن ئەوەم دە ئیو سەدە تێکۆشان‌یشدا هێناوە کە ئەو قسەیەم لە کاک مەسعوود بارزانی بیست، قسەیەکی تاریخییە وستم سەبتی بکەم. ئەمن چووبوومە لای هەر دووک حیزبان. لە هەولێر چوومە لای کاک کۆسرەت کە وەک کارگێڕی دەفتەری سیاسی کاری دەکردو مام‌جەلال لەدەرێ بوو. کاک کۆسرەت پێی گوتم کە دەچیە لای کاک مەسعوود لەزمان منەوە پێی بڵێ مام‌جەلال لێرە نیە با ئەو فەرمان بە هێزەکانی یەکیەتییش بدا بۆ ئەو مەسەلەیە. ئەوە لە پێوەندیی دەگەڵ ئەو موشکیلاتەدا بوو کە بۆ ئێمە ساز ببوو. کە چووم بە کاک مەسعوودم گوت، گوتم کاک کۆسرەت وا دەڵێ. کاک مەسعوود قسەیەکی تاریخیی کرد. یانی قسەکە خۆشە مەسەلە ئەوە نیە دەبێ عەمەلێ وا بێ. گوتی ئەمنیش دەڵێم هێزەکانی پارتیش‌و یەکیەتیش لەژێر ئەمری حیزبی دێمۆکراتدان. ئەگەر پێویست بێ بۆ دیفاع لە حیزبی دێمۆکرات، بۆ خۆم دەچمە سەنگەرەوە. باشە ئەوە قسەیەکی دۆستانەی قیمەتییە. بەڵام خۆ ئەمن نابێ ئەو قسەیە وا تەفسیر بکەم کە کاک مەسعوود دەبێ بێتە پێشمەرگەیەک‌و لەسەنگەردا بێ. یان پێشمەرگەکانی یەکیەتی هەموو شتێک وەلا بنێن‌و بێن دەگەڵ جمهووریی ئیسلامی بەشەڕ بێن کە داخوا مەقەڕی حیزبی دێمۆکرات دەبێ لە قەندیلی بێ یان لە جێگایەکی دیکە.

* زۆر لەسەرکەوتنی کوردەکانی باشوور تێنەپەڕیبوو کە بنکە سابیتەکانی حیزب لەبناری قەندیل تووشی نائەمنی بوون. ئێوە ئەوکات هیچ چاوەڕوانی‌یەکتان لەو پێوەندی‌یەدا لە یەکیەتی وەک هێزێکی سەرەکی هەبوو کە بۆتان جێ بەجێ بکا، بەڵام نەی کرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەخۆشی‌یەوە زۆر کەس ماون کە دەزانن ئەمن بەتەنیا لە دەفتەری سیاسی‌دا کێشەیەکم هەبوو دەگەڵ هەمووان. هەر ئەوکاتە کە لە "گەورەدێ"و ئەوانە کەوتینە بەر هێرش، ئەمن داوام کرد بچینە جێگایەک کە لە مەودای تۆپخانەی ئێران بەدوور بین. دەمگوت مووشەک دەگاتە هەموو جێگایەک، ناتوانین خۆمان لە تەیارەش بشارینەوە. بەڵام دوورکەوتنەوە لە تۆپباران کەمخەرجتەیە، با لێی دوور کەوینەوە. قبووڵیان نەکرد چونکە پێیان وابوو دەبێ پشتمان بە ئێرانەوە بێ. دەمگوت کورە پشتی چمان بە ئێرانەوە بێ، خۆ ئەگەر عێراق نەیەڵێ بچینەوە ئێران لەلێوی سنووریش بین هەر نایەڵێ. باشە نایە پێشمان پێ بگرێ، بەڵام پێت دەڵێ نابێ لێرە بمێنی، ئەو وەختی ئەتۆ چ دەکەی. ئەگەر بە چوونەوەشمان ڕازی بێ، لە"حیللە"ش بین ڕاستەو خۆو ناڕاستەوخۆ ڕێگامان دەدا بچینەوە وڵاتی خۆمان. ڕەنگە ١٠ ڕۆژی فەرق هەبێ، ئەوە ئەساسی نیە. ئەمن هەر لەئەووەڵەوە موخالیفی ئەوە بووم. یان مەسەلەن هاتبووینە قەندیلی، لە"قسڵان" کەوتبووینە خەتەر. ئیسراریان کرد لە"ئاوتاق" خانوویان بۆ دروست بکرێ. هاواری دنیام کرد کە ئاوتاق لە تیرڕەسی دوژمن‌دایە. بەسەدان هەزار دینارمان لێ خەرج کرد کە تەئسیساتمان لێ دروست کرد. هەر خانوو ساز کران، وەبەر حەملە کەوت. ئەو هەموو زەرەرەمان لێ کەوت یەک ڕۆژی تێدا دانەنیشتین، مەجبوور بووین هێنامانە "باینجان".

کەوابێ مەسەلەکە ئەوە بوو کە ئێرانەو دەیەوێ تەزعیفمان بکا، دەیەوێ حاکمییەتی کوردی پێشێل بکاو هەمووی ئەوانە. لەو وەختەدا ئێمە ئینتیزاری چیمان هەبوو لە یەکیەتیی نیشتمانی، هەر پێشم خۆش نیە بە تەنێ باسی یەکیەتی بکەم، چونکە ئەوە پارتییشی دەگرتەوە. ئێمە چاوەڕوانی هێندێک کۆمەگی واقیعیمان هەبوو کە لەدەستیان دەهات. ئەوە کە کۆمەگ بکەن بە پەیدابوونی جێ‌وڕێ. ئەوە کە کۆمەگ بکەن بە ڕاگوازتنی ئەو خەڵکەی، چونکە وا بە ئاسانی ڕانەدەگوێزرا. ئەتۆ بۆخۆت ئەو دەمی لەوێ بووی. ئێمە لە قەندیلی حیسابمان کرد کە بزانین چەندەمان جێگا هەیە. لێکیان دایەوە کە تەواری ئەو خانوانەی ئێمە هەمانە بە ساڵۆنی گەورەو بچووکەوە، دەی کردە ٣٠٠٠ ژووری ٣ بە ٤. جا ئەوە هەموو ماڵی تێدایە، پێشمەرگەی تێدایە، وەسایلی تێدایە. ڕاگوێزتنی ئەوەی کارێکی قورس بوو. ئێمە ئەو چاوەڕوانی‌یەمان هەبوو کە هەر دووک، بەتایبەتی یەکیەتیی نیشتمانی بە دەمصانەوە هاتن و زۆریان کۆمەگ کردین. ئەگەر ئێمە ویستبامان بۆخۆمان ڕای گوێزین، خۆ بە ئیمکاناتی خۆمان بە ٣ ساڵان بۆمان ڕانەدەگوێزرا. بەڵام لە ماوەیەکی کەمتر لەیەک مانگ‌دا، بە کۆمەگی ئەو هەرەوەزەی بۆیان کردین هەموو خەڵکەکەمان موتتەقیل بوو بۆ شوێنێکی

کە ئەک بڵێم ئەمنییەتی موتڵەقی بۆ دابین کرا، چونکە ئەمنییەتی موتڵەق هەر نیە، بەڵام لە خەتەری تۆپخانەی دوژمن دەرچوو. حەتتا بەشێکمان کە هاتنە "پێخەمە"ی زستانێک، لەوێش هەر کەوتنە بەر هێرشی تۆپخانە کە بە خۆشی‌یەوە زیانی گەورەیان وێ نەکەوت.

* مامۆستا ئەو کارەساتانەی دوای ساڵی ۱۹۹۱ بەسەر حیزب و ئەندامانی لە باشووری کوردستان هاتن هەم دەردهێنەر بوون و هەم جێگای لێوردبوونەوە. هەرچەند ناکرێ هەموو ڕووداوەکان وەک یەک حیساب بکرێن و لایەنێکی تایبەتی‌یان پێ تاوانبار بکرێ، بەڵام پێم‌خۆشە بزانم سەرەتای دەستپێکردنەکان و بەتایبەت ئەو گوشارانەی لە بواری قەتڵ کەوتنە سەر حیزب زیاتر بە هۆی چ لایەن یان کەسانێکەوە بەڕێوە دەچوون؟ ئێوە دەتوانن لەو بەینەدا یەکیەتی خەتابار بکەن؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** ئەمن پێم وایە ئەو تەنگ‌پێ‌هەڵچنینانەی لە بواری قەتڵی بۆ ئێمە هاتنە پێش، عامیلی ئەسڵی، یان لەواقیعدا تەنیا عامیل جمهووریی ئیسلامی بووە. بەڵام دیارە هێندێک شتی دیکەمان تووش بوون. وەکوو هێندێ عەمەلیاتی تەخریبی کە پێم وایە ئەوانە ناچنە خانەی ئەو شتانەوە کە بڵێین هێزە سیاسی‌یەکانی کورد لە عێراق دەستیان تێی‌دا هەبووە یان تەئسیریان هەبووە. ئەوە وەک بڵێی خاتر و خواهیش گرتن نیە. وەکی دەزانین ئەو مینی‌بووسەی تەقیەوە و ئەتۆش بەشت لە بەرەکەتەکەی‌دا هەبوو، ئەو مینی‌بووسە ئێستاش عامیلەکانی نەدۆزراونەوە. ڕەنگە بێ‌دەسەڵاتی بووبێ، ڕەنگە بێ‌توانایی بووبێ، ڕەنگە بتوانین موتتەهەم بکەین ئەگەر بمانەوێ بیکەین. یانی بڵێین ئەوەندەیان خۆ لێ‌ماندوو نەکرد کە بیان‌دۆزنەوە. لەحاڵێکدا ئاسان نیە، چونکی مینی‌بووس تەقیوەتەوە و کەس لەوێ نەماوەتەوە. بەڵام دواتر هەوڵێکی دیکەیان دا بۆ تەقاندنەوەی مینی‌بووسێکی دیکە. ئەوە بوو کە برادەرانی خۆمان هەستیان پێ کرد و وەدوای سیمەکەی کەوتن کە دیار بوو ئەو سیمەیان ڕاکێشابوو لە ڕێگای دوورەوە بیتەقێننەوە، ئەفەرەکانیان دینەوە. لەوانە دوو کەسیان لێ گیران بەڵام یەکیان دەرچوو. ئەو دووانە هەر دووکیان دوایە لە تەرەف یەکیەتی نیشتمانی‌یەوە موحاکەمە کران و ئیعدام کران. بەڵام تەقسیمی ئەو سێ کەسەی سەیر بوو کە دەرکەوت. یەکیان سەر بە یەکیەتی بوو، یەکیان سەر بە پارتی بوو. یەکیان سەر بە حیزبی سۆسیالیست بوو. یانی جەبهەیان پێک‌هێنابوو کە ئەمن هەر ئەو وەختی بە گاڵتە گوتم وا دیارە ئەوە کارێکی جەبهەیی‌یە. ئەوە لەحاڵێکدا بوو کە هیچ کام لەو حیزبانە ئاگایان لێ‌نەبوو. ئەدی یەکیەتی بۆ ئیعدامی کردن؟ لە هەمووی موهیمتر دوای ئەوەی ئیعدامی کردن ئیعلانیشی کرد. ئەمن دوو، سێ حاڵەتی دیکەم ئاگا لێیە کە خەڵکیان کوشتوە لەسەر ئەوەی ئەو جۆرە کارانەیان کردوە، بەڵام بەداخەوە ئیعلانیان نەکردوە کە ئەوە خراپە. یانی ئێمە چەند حاڵەتێکی ناوامان زانیوە کە لەسەر ئەو کردەوە تیرۆریستی‌یانە کەسانێکیان موجازات کردوە بەڵام ڕایان نەگەیاندوە. بە باوەڕی ئێمە هەدەف هەر کوشتن نیە. ئەگەر کەسێک لەسەر کارێکی خراپ دەکوژرێ،

بۆیەیە کە خەڵک بزانن. یانی هەڵوێستە سیاسی‌یەکە موهیممە. لەپاشانیش تەمبێ‌کردنی کەسانی دیکە موهیممە، نەک ئەوە تەنیا خوێنێک ڕژابێ. بەڵام ئەو دوو کەسە کە دیارە ئێمە گرتمانن و تەحویلی وانمان دان، موحاکەمە کران و ئیعدام کران و ئیعلانیشیان کرد.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا لە بناری قەندیلی چەند ڕووداوی دیکەی ئاوا ڕوویاندا ئەگەر لەبیرت بێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە هەوڵی دیکە دران کە جێبەجێ نەبوون. بەڵام ئیدی عەمەلیاتی ڕێژیم وەک خۆی زۆر بوون. وەک هێرشی هەوایی کە "بۆڵێ" چەند جار بۆمباران کرا. لەپاشان مەسەلەن بۆمبێکیان هێنابوو کە دای‌بنێنەوە. هەددەفەکەیان ئەمن بووم کە نەیانتوانی دای‌بنێن و خونسا کرایەوە. جارێکی دیکە شتێک کەشف بوو کە دیارە لە سەردەشتێ‌ڕا کەشف بوو. ئەویش ئەوە بوو کە ئێرانە حەیاتەکە کەسێکی مەئموور کردبوو بۆ کوشتنی دوو کەسان. یەکیان ئەمن بووم، ئەوی دیکەیان مام‌جەلال بوو. دیارە کەسەکە ویژدانی بە خەرج داو بۆخۆی وای کرد بگیرێ، و دوایە هەموو ئیعتیرافاتێکی کرد. بەڵام ئەوەندی لەبیرم بێ‌و ئەتۆش لەوێ بووی ئەگەر وەبیرت دێ کۆمەگ بکە، پێم وایە غەیری ئەو دوو حاڵەتە لە مەنتەقەی قەندیلی کەسی دیکەمان بە تیرۆر لێ نەکوژرا.

لە بۆمبارانی هەوڵێ‌دا کاک حەسەنی پوورخزری شەهید بوو. لە بۆمبارانێکی دیکەدا پێشمەرگەیەکی دیکەمان لێ‌شەهید بوو بەناوی موحەممەد ئاشەوان کە لە هێزی کێلەشینەوە بۆ دەورەدیتن هاتبووە فێرگە. لە بۆمبارانێکی دیکەدا خەڵکی زۆرمان لێ‌شەهید بوون. کە لە نەخۆشخانەشیاندا لەبنکەی پشتی ڕادیۆی ٣ پێشمەرگەمان شەهید بوون. هەروەها لە تەقەمەتی کەسێکمان شەهید بوو. بەڵام وەکوو تیرۆر وەبیرم نایە کەسی دیکەمان لێ تیرۆر کرابێ.

* دەستپێکردنەوەی شەڕی پارتی‌و یەکیەتی ئەگەر بۆ کورد نەگبەتیی بەدواوە بوو، بۆ حیزبی دێمۆکراتیش موسیبەتبار بوو. دەتوانی ڕادەی ئەو زیانانەی لەو پێوەندی‌یەدا وەحیزب کەوتن بەراورد بکەی؟ لەو بەینە دا بەشی یەکیەتی چۆن دیاری دەکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە ئەو زیانەی لە کاناڵی ئەو شەڕەوە بەحیزبی دێمۆکرات گەیشتوە - دەگەڵ ئەوەی ڕەنگە پرسیارەکەی جەنابت ڕووی دەوە نەبێ – دەپێش هەموو شتێک‌دا هەر خودی ئەو شەڕەیە. پێم وایە لە هەر جێیەک دوو بەش لە بزووتنەوەی کورد، یان دوو گرووپ لە هێزەکانی بەشدار لە بزووتنەوەی کورددا بکەونە حاڵەتێکی واوە کە شەڕی براکوژی بکەن، زیانەکەی بە هەموو بەشەکانی کوردستان و بە هەموو حیزبەکان دەگا. کەوابوو لەپێش هەموو شتێک‌دا ئەوە زیانێکیەتی. بەڵام شاراوە نیە لەبەر ئەوەی ئێمە

لە مەنتەقەکەدا بووین، یانی لە هەردووک بەشی ژێر دەسەڵاتی دوو حیزبی بەقەول موتەخاسیسیدا بووین، بەجۆرێکی دیکەش زیانی بە حیزبی دێمۆکرات گەیاند. ڕەنگە ئێمە هەر باسی حیزبی دێمۆکرات بکەین دەنا زیانی بۆ هەموو لایەنەکانو بە تایبەت بۆ لایەنەکانی ڕۆژهەڵات هەبووە. لەوانە بڵێین بەرتەسک‌بوونەوەی مەیدانی حەرەکەتو کارو کردەوەی زیاتیکە کە بە حیزبی دێمۆکرات گەیوە. لەپاشان دەخالەتەکانی ئێران لەو مەنتەقەیەدا کە ڕەنگە ئەوە باسێکی دیکە بێ، چونکە زۆری ئیحتیاج بە لێ-وردبوونەوە هەیە ئەگەر نەشڵێین لێکۆڵینەوە. دیارە ئێران بە هەموو شێوەیەک دەستی دەو شەڕە وەردەدا. ئاوری ئەو شەڕەی خۆش دەکرد. ئەگەر تەماشای تاریخی ئەو شەڕە براکوژی‌یە بکەین ئێران جارێک بە تۆپخانە کۆمەگی پارتیی کردوە بە زیەدی یەکیەتی، جارێک کۆمەگی یەکیەتیی کردوە بە زیەدی پارتی. ئەوەی کردوە بۆ ئەوەی ئەو شەڕە هەر بەردەوام بێ. کەوابێ فشاری لەسەر هەردووکیان هەبووە، هەردووکیانی خستوونە حاڵەتی واوە کە تا ڕادەیەکی زۆر چاو لە جموجۆڵەکانی لە خاکی باشووری کوردستاندا بپۆشن. دیارە لەو کاناڵەوە زیانێکی زۆری بە هێزە سیاسی‌یەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کە موقیمی باشوورن گەیاندوە، بەڵام پێش هەموواندو زیاتر لە هەمووانو تاڵتر لە هەمووان بە حیزبی دێمۆکراتی گەیاندوە. چونکی شاراوە نیە، ئێستا ڕەنگە هێزێکی سیاسی ئەم قسەیەی پێ خۆش نەبێ، بەڵام حیزبی دێمۆکرات زۆر گەورەتر بووە لە هەمووان. ئەفڕاتی زیاتر بووەو هاتوچۆشی زیاتر بووە. لەناکاودا بەشێکی لەو کردەوە تیرۆریستی‌یانەی جمهووریی ئیسلامی پتر بووە. یانی ئەوەی دەڵێن بەشی شێر، حیزب لەو نێوەدا بەشی شێری پێ بڕاوە. ئێمە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا ئەگەر هەمووی حیساب بکەی، کە دیارە پێش شەڕەکەش کردەوەی تیرۆریستی دەستی پێ کردبوو، بەڵام نیزیک بە ٣٠٠ کەسمان کەوتوونە بەر حەملەی تیرۆریستی. لەوانە دەوری ١١٠ هەتا ١١٥ کەسیان شەهید بوون. ئەوی دیکەش بریندار بوون کە لە برینداری سووکەوە تێیاندا بووە هەتا برینداری وا کە کەمئەندام بووە. کەوابێ زیانێک کە لەو پێوەندی‌یەدا بە حیزبی دێمۆکرات گەیشتوە دوو لایەنیە. یەکێک ئەوە کە دوو هێزی نێو بزووتنەوەی کورد پێکەوە شەڕ دەکەنو لێک دەکوژن کە ئەوە بۆ هەموو بزووتنەوە زەرەرە کە ئێمەش بەشێکین لەوە. یەکی دیکەش ئەوە کە بەشێوەیەکی تایبەتی مەحدوودییەتمان بۆ پێک‌هاتوە. هێندێک موشکیلاتی لاوەکیمان بۆ دروست بوون. سەرەنجامیش خەڵکێکی زۆرمان لێ کەوتۆتە بەر پەلاماری تیرۆریستی. ئەگەر ئەو دوو لایەنە دەشەڕدا نەبایەن ڕەنگ‌بوو ئاسانتر بکرایە کۆنترۆڵی وەزعەکە بکەنو ئیجازەی ئەو هەموو ڕەبازێنە بە هێزەکانو بەکرێگیراوانی جمهووریی ئیسلامی نەدەن.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا لەو پێوەندی‌یەدا لە بەشی یەکیەتی زیاترتان زیان پێ گەیوە یان لەبەشی پارتی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن نازانم بە چ موناسەبەتێک بوو چاوێکم بەلیستی شەهیدو بریندارەکاندا خشاند، ئەوەی لەژێر دەسەڵاتی یەکیەتی بووە پتر بووە لەوەی لەژێر دەسەڵاتی پارتی‌دا بووە. هۆیەکەشی بە بێ ئەوەی بە مانای پاکانە بۆ لایەک بێ‌و حەملە بۆ لایەکی دیکە، بەڵام دەلیلەکەی شتێکی واقیعی‌یە. ئێمە وەختێکی هەر بنکەیەکمان هەبوو کە دوایە بوونە دوو بنکە لە مەنتەقەی ژێر دەسەڵاتی پارتی کە یەکیان لە"جێژنیکان" بوو، یەکیان لە"دێگەڵە". بەڵام کوللی دەفتەری سیاسیمان لە مەنتەقەی یەکیەتی‌دا بووە. کە دەفتەری سیاسی ژمارەی پێشمەرگەو ماڵ‌و کادرەکانی بەتاقی تەنیا دوو، سێ بەرابەری هەموو شوێنەکانی دیکە دەبوون. بێجگە لەوە ئێمە لە مەنتەقەکانی دیکەی ژێر دەسەڵاتی یەکیەتی وەکوو سلێمانی‌و ئەو لای سلێمانی‌و ئەملای سلێمانی، لە هەمووی مەقەڕاتمان هەبوو‌و هاتوچۆمان تێدا کردوە. بۆیە چونکە جموجۆڵەکە پترە، زەرەرو زیانەکەش پتر دەبێ.

* سەقامگیر بوونتان لە قەڵای کۆیە دوای ئەوەی لەقەندیل‌داگەڕان، بەبێ هاوکاریی یەکیەتی نامومکین بوو. ئایا لەو بارەیەوە خۆتان بە قەرزدار دەزانن؟ هەرلەجێدا ئەو جێگۆڕکێ‌یە بەڕەزایەتی خۆتان بوو یان ناچار بەو کارە کران؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** شتێکی مەعلوومە ئەگەر لە بەشی دووهەمڕا دەست پێ بکەین، هێمن دەڵێ: "کوا بەخۆشیی خۆم بەجێ دێڵم وڵاتی خۆشەویستم". دیارە ئێرەش هەر وڵاتی مەیەو ئەوێش هەر وا بووە. بەڵام بەجێ‌هێشتنی ئەو ناوچە سنووری‌یانە کە لەوێ بنکەمان هەبوو، بە مانای لەدەستچوونی بەرهەمی ماندووبوونی چەند ساڵەمان بووە. بەمانای هەزینەکردنی بەمیلیۆن دۆلار بووە. جگە لەوانە هەر وەک جێگای دانیشتنیش، ئەوێ بۆ ژیان زۆر خۆشتر بوو هەتا ئێرە. کەوابوو کێ بە دڵخوازی خۆی ئەو جێگایە دەگۆڕێ. ئەوە لەناکامی ئەو هەموو پەلامارەدا بوو کە جمهووریی ئیسلامی هێنابووی‌و هیچ شتێکیشمان پێ نەدەکرا. نە بۆخۆمان توانای بەرەنگاریمان هەبوو، نە حکوومەتی مووەققەتی باشووری کوردستانیش دەی‌توانی شتێک بکا کە دیارە ئەوکات هەر جەبهەی کوردستانی بوو هێشتا حکوومەت دروست نەببوو. ئەو زەروورەتەش نەبوو بۆ ئەوەی بنکەی حیزبی دێمۆکڕات لەبناری قەندیل بمێنێ، هێزەکانی پارتی‌و یەکیەتی کە هێزی سەرەکی بوون، دەگەڵ ئێران واریدی شەڕ بن.

بەڵام لەبارەی ئەوەی کە داخوا هەست بە قەرزداری دەکەین یان نا، دوو تەعبیر هەیە. یەکێکیان ئەوە کە مادام هەموومان هێزی سیاسیی کوردین‌و بە حوکمی ئەو تێکەڵاوی‌یە کە هەمانە جارێک کوردی ئێرە موحتاجی کوردی ڕۆژهەڵات دەبێ‌و جارێکیش کوردی ڕۆژهەڵات ئیحتیاجی بەخەڵکی ئێرە دەبێ، ئیدی

دوودا ڕەنگە هیچیان پێویست نەبێ منەت لە یەکتری هەڵگرن یان منەت بەسەر یەکتردا بکەن، چونکە شتەکە دەچێتە خانەی ئەرکێک و خزمەتێکی نەتەوایەتی. بەڵام بە ماناکەی دیکە، هەر چاکەیەک دەگەڵ ئینسان بکرێ زۆر ناسپاسی دەبێ ئەگەر دەچاوی‌دا نەبێ. لەو بارەیەوە ئێمە قەرزداری هێزەکانی باشووری کوردستانین، بەتایبەتی دوو هێزی سەرەکی. لەباری ئێرەشەوە، هەرچەندی ئەو شوێنەی مە دەوروبەری کۆیە بوو بەڵام هەمووی دەبەر دەستی هێزەکانی یەکیەتی‌دا نەبوو. ئەو شوێنەی وەختی خۆی سکرتاریای لێ‌دانرا، پێش ئەوکاتە پێشمەرگەی پارتیی تێدا بوون. ئەوانیش بۆ ئێمەیان چۆڵ کرد، چونکی ئێمە بۆ چارەسەری ئەو موشکیلاتە دەگەڵ هەر دووکیان تەماسمان هەبوو، هەرچەند جەبهە هەبوو بەڵام ئێمە دەگەڵ جەبهە تەرەف نەبووین. بەشی هەرە زۆری دەگەڵ پارتی و یەکیەتی و جاروبارێش دەگەڵ حیزبی سۆسیالیست قسەمان دەکرد کە ئەویش لایەنێکی بەرەی کوردستانی بوو. بەڵام بەڕاستی لێرە یەکیەتی وەکوو فارس دەڵێن سەنگی تەمامی دانا. ماوەیەکی کە لێرە بووین یەکیەتی هەموو قورسایی‌یەکەی خستە سەر شانی خۆی. قورسایی گواستنەوە و موستەقەربوونە تەنانەت بۆ ماوەی نێزیک بەمانگێک کە خەڵکەکە هاتبوون بەڵام ماڵەکانیان بۆ نەهاتبوو، لە قوتابخانەکانی کۆیە دایان مەزراندبوون و یەکیەتی تەداروکی دەکردن. نانەواخانەی تایبەتی‌یان داتابوو کە نانمان بۆ بکەن، لەپاشان لەباری میوەو خواردنەوە پێ‌یان ڕادەگەیشتن. بەهەر حاڵ ئەمن بەش بەحاڵی خۆم هەرچەند ئینسان ئیختیاری زیاتریشی لە برای خۆی هەیە، بەڵام هەست بە سوپاس و قەدرزانیی دەکەم بەرامبەر یەکیەتی و پارتی بەتایبەتی بەرامبەر بە حکوومەتی هەرێمیش بەگشتی. ئێستا هەر بوونمان لێرە کۆمەگێکە ئەوان پێمان دەکەن. یانی ئێستاش زۆر شتمان هەر لەسەر وانە. ئەوە ئاوە، بەرقە، پێداویستی پێهداشتی و شتی دیکەش هەمووی لەسەر وانە. لە ئیسلامدا شتێک هەیە کە دەڵێن ئەوەی سوپاسی عەبدی نەکا، شوکری خوداش ناکا. بۆچی دەبێ ئێمە ناسوپاس بین. ئەگەر ناڕەزایەتیمان هەیە حەقمان هەیە پێ‌یان بڵێین کە پێشیان دەڵێین. بەڵام لەسەر یەک ئێمە پێمان وا نەبووە کە دەبێ هەموو شتێکمان بۆ بکەن. ئەوەی ئەوان کردوویانە ئەگەر پتریشیان لەدەست بێ، کە بە حەقیقەت لە دەستیشیان دێ. بەڵام دیسانەکە ئەوەی کردوویانە جێی سوپاسە.

• داخستنی ڕادیۆی دەنگی کوردستان کردەوەیەکی ئاشکرای یەکیەتی سەبارەت بەحیزب بوو. تکایە ئەو کارە بۆ کرا، چۆن و کەی کرا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** تاریخەکەی بە ڕۆژو مانگ ئاوا حوزووری زەینم نیە کەی بوو، دەتوانین موراجەعە بکەین و پێی بینینەوە. بەڵام ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٩٦ کە دەبێتە ١٣٧٥ی ئێرانی. دیارە لە نەتیجەی فشارێکی زۆری ئێراندا بوو کە داوایان لە یەکیەتی کردبوو ڕادیۆکەمان داخەن. هەڵبەت جارێکی

داوایان لێ کردین کە بۆخۆمان دای‌خەین. مامجەلال لە کۆیە بوو، لەدوای منی ناردبوو. گوتی تەنیا بۆماوەی پێنج ڕۆژان بۆمان داخەن گوشارمان زۆر لەسەرە. گوتم بۆماوەی پێنج دەقیقەش دای‌ناخەین. چونکی فایدەی نیە، خۆ ئەگەر دامان‌خست بەوەی تەواو نابێ. سبەینێ فشاری دیکەتان بۆ دێنن. چونکی پێش ئەوەی بچم دەمانزانی بۆ ئەوەمان لەدوا دەنێرن، بڕیارمان دا جوابەکە ئەوە بێ دەنا هەر لەخۆمەوە ئەو جوابەم نەدایەوە. پاش چەند ڕۆژان ئەوجار لە دوای کاک مستەفای ناردبوو. دووبارە حەدسمان لێ‌دا بۆ ئەوە بێ‌و دیسان بڕیارمان دا جوابی کاک مستەفاش هەر ئەوە بێ. کاک مستەفا ڕۆیشتو ماوەیەکی پێوە خرا هاتەوە. گوتمان چی بوو؟ گوتی وەڵڵا کەرەمان کرد بە زەنگ، قەولمان پێ‌دان. جا وەختێک گوتبوویان گۆیا ئەوە ئەمن بووم ئەو کارەم کردوە. جارێک دەگەڵ کاک حەسەنی شەرەفی دانیشتبووین. ئەمن گوتم داستانەکە ئاوا بووە. کاک حەسەن گوتی ئەشهەدوبیللا وا بوو، ئەمن بۆ هەردووکانیش دەگەڵ بووم. بەڕاستی ئەمن لەبیرم نەبوو کە ئەو دەگەڵ بووە. بەڵام ئەو گوتی بۆ هەردووکان دەگەڵ بووم، ئەتۆ موافقەتت نەکرد بەڵام کاک مستەفا قەولەکەی دا. جا بۆ ماوەی پێنج ڕۆژەکە دامان خستو دیسان دەستمان پێ کردەوە.

پاشان کە داخوازەکە هەر هاتو هەر هات، جارێک هەیئەتێک هات بۆ لای ئێمە ئەو داوایەیان کردەوە. ئێمە گوتمان بۆخۆمان دای‌ناخەین چونکە پێمانوایە کارێکی نادروستە. بەڵام ئەگەر ئێوە بێن دای‌خەن، خۆ پێشتان پێ‌ناگرین. ئێوە وەرن وەک دەسەڵات دای‌بخەن، ئێمە شەڕتان دەگەڵ ناکەین. کە هاتن دایان‌خست کە دیارە پۆلیس هاتو ئەویش هەر دەئیختیاری یەکیەتی‌دا بوو، ئیدی کە هاتن ئێمە بە پێشمەرگەکانمان گوت لێیان گەڕێن با دای‌خەن. بۆ تاریخ بڵێم، پێشمەرگەو فەرماندەکانمان زۆر ناڕەحەت بوون. ئەو وەختی پێم وایە فەرماندەی هێزی پارێزگاری کاک ئەحمەد نستانی بوو، هات بەڕاستی بەگریان گریا. گوتی با ئەمن کەلاکم لەوێ بکەوێ بەڵام نایەڵم دای‌خەن. گوتمان نا پێویست ناکا، کەلاکی تۆ بۆ بکەوێ. ئەوە بڕیارێکی سیاسی‌یەو موهیم ئەوەیە ئێمە لێرەین‌و ئێرەش دەسەڵاتێکی هەیە کە ڕێگا نادا ڕادیۆمان هەبێ. بە هەرحاڵ قبووڵمان کرد کە دای‌خەن. تەنانەت ئێمە دوو بنکەی ڕادیۆمان هەبوون کە تەنیا یەکێکیان پێ دەزانی‌و هاتن ئەویان داخست. دەمانتوانی لەوی دیکەوە بەرنامەکانمان بڵاو کەینەوە، بەڵام بۆ ئەوەی دیسان بیانوو نەدرێ بە ئێران کە فشاریان بۆ بێنێ‌و بیانێرنەوە سەرمان، ئیدی ئەویشمان بێ‌دەنگ کرد. هەروا بزانە هەر دووکیان لە یەک جێگا بوون. لەحاڵێک‌دا لە جێگایەک نەبوون.

* ڕاست لەبەربەری کۆنگرەی یازدەدا ژمارەیەک کادرو بەرپرسی حیزب لە دەروازەی شاری کۆیە بە دەستووری ڕاستەوخۆی بەرپرسانی یەکیەتی‌و بەچەکی پێشمەرگەی یەکیەتی شەهید کران. هەڵوێستی ئێوە

سەبارەت بەو کردەوەیە چۆن بوو؟ یەکێتی چیی گوتو چیی کرد؟ ئاکام بەکوێ گەیشت؟ تکایە ناوی شەهیدەکانیش ئەگەر لە بیرت ماون.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێمخۆشە لە بەشێک لە پرسیارەکەدا دیققەتی زیاتر بەخەرج بدەی. لەوەدا کە چەند کەسی ئێمە شەهید بوون. کاک سەید مەنسووری ئاسری کە ئەندامی موشاویری کۆمیتەی مەرکەزی بوو. کاک ئەبوبەکری ئیسماعیلزادە(ساماڵ) بەرپرسی کۆمیتەی بانە بوو کە ئەو وەختی لە ئانجمەنی پەرۆژ ‌بوو. یەکێک لە پێشمەرگەکان بەناوی بەدوڵڵای شیرین‌سوخەن کە شەهید بوو. ئەوی دیکە کاک ڕەفعەتی حوسێنیی ناو بوو. ئەوانە هەر وەک لە جێگایەکی دیکەش باسمان کرد، ڕاست لەبەر دەرکی پرسگەکەی کۆیەو بەدەستی پێشمەرگەکانی یەکێتیی نیشتمانی لێیان دراو شەهید بوون. ئەوە ڕاستە بەڵام ئەو ئیلدیعایە کە بەدەستووری ڕاستەوخۆی بەرپرسانی یەکێتی بووە ئەوە وەک ئیحتیمال جایزە پیاو ئیحتیمال لێ بدا. بەڵام وەک ئیدیعایەکی حقووقی، کەمێک موشکیل‌خوڵقێنە. بۆیە ئەمن خودی ئەو ئیدیعایە ناکەم هەرچەند یەکیەتی بەئەولەوی بە مەسئوول دەزانم. چونکی ئەگەر ئەوە نەبوو، دەبوایە قبووڵ نەکاو لێپرسینەوەیەکی وردتر لەوەی کردی بکا.

ئەمن لەجێگایەکی دیکەش باسم کرد. ئەوە کە ڕووی دا، دیارە ئێمە لێرە بووینو لەلایەکەوە لەخاکی وڵ-دایەو ناتوانین بڵێین مەسەلەی مرقابەلەبەمیسلو ئەوە دەکەین. لەلایەکی دیکەش ئەو موقابەلەبەمیسلە چ خێرێکی تێدایە؟ زۆرجار کە سەفەری دەرەوەمان دەکرد، برادەرانی خۆشمان سەرزەنشیان دەکردین، کە ئەگەر بێکەینە زمانی کوردەواریی خۆمان، دەیان‌گوت ئێوە حیزن، هەموو شتێک قبووڵ دەکەن. بەو کەلیمەیە نەیان دەگوت، بەڵام مەبەستیان ئەوە بوو. دەیان گوت پێ.کا.کا قارەمانە. ئەمن ئەو وەختیش جوابم ئەوە بوو کە پێ.کا.کا قارەمانە کە دەستی کردەوە. بەڵام چ خێرێکی لێ دیوە؟ غەیری ئەوەی برینی نێوان چەند بەشی بزووتنەوەی کوردی قووڵتر کردوە، چیی دیکەی دەست کەوتوە. پێ.کا.کا زۆر کەسی بەشەڕی ڕاستەوخۆ لێ کوژران بۆ ئەوەی حاشای لێ بکرێ. چونکی بەهەر حاڵ شەڕە بەینی هێزەکانی باشووری پێ.کا.کا. خەڵکێکی زۆری لێ کوژرا. لە ساڵی ١٩٩٢دا کە شەڕەکە بەینی پارتی‌و یەکیەتی لەلایەک‌و پێ.کا.کا لەلایەکی دیکەوە دەستی پێ‌کرد، باوەڕم پێ بکە بەشی هەرە زۆری خەڵکی بێلایەنی باشووری کوردستان پارتی‌و یەکیتی‌یان بە خەتابار دەزانی‌و مەحکوومیان دەکردن کە ئەوە لەلای خۆی حکوومەتی کوردی پێک‌هاتوە کەچی شەڕ دەگەڵ هێزێکی کوردستانی دەکا. بەڵام لەو شەڕەی دوایەدا کە لە داخلی باشووری کوردستان بوو، کەس لەسەر پێ.کا.کای وەجواب نەهات. ئەوە لەحاڵێک‌دایە کە لەسەر ئەو حاڵەتەی لە دژی ئێمە ڕووی‌دا، دەکرێ بڵێین هەموو کوردستان لەو حەرەکەتە ناڕازی بوو هەرچەند خۆ نەهاتن شەڕ

دەگەڵ یەکیەتی بکەن. دیارە مەبەست تەنیا لەپێوەندی دەگەڵ ئەو ٤ کەسەدا نیە بەڵکوو سەرجەمی ئەو حەرەکەتەی لەدژی ئێمە کرا. ئەوە بۆ؟ چونکە ئێمە مەسئوولانە ڕەفتارمان کرد.

کەوابێ خۆ نەدەکرا شەڕیان دەگەڵ بکەین، بەڵام ئیعتیرازی سەختمان بەو حەرەکەتە کرد. هەڵوێستی یەکیەتی ئەوە بوو کە ئەوە شتێکە ڕووی داوە، مەحکوومەو فلانەو ئەوانە دەبێ بەسزا بگەن. تەنانەت نامەو شتی واشیان لەو بارەیەوە هەیە. بەڵام دوایە هاتن پێشنیاریان کرد هەر وەک جارێکی دیکەشمان باس کرد کە با بێین کۆمیسیۆنی تەحقیقی هاوبەش دابنێین. با ئەو کۆمیسیۆنە لێی بکۆڵێتەوە. ئێمە وەکوو دەفتەری سیاسی ساغ ببووینەوە جا جوابەکەمان داتەوە. جوابەکەشمان ئەوە بوو کە ئەگەر ئێوە بتانەوێ تاقیق بکەن زۆر چاک دەزانن بیکەنو زۆر چاکیش دەتوانن تاوانبارەکان بدۆزنەوەو بەسزای خۆیانیان بگەیەنن. بەڵام کۆمیسیۆنی هاوبەش بۆچی پێک بێنین؟ ئێمە بێین چی بکەین؟ ئەوانەی ئێمە هەموو لەجێدا کوژراونو کەس نەماوە لێی بپرسین. فەقەت قاتڵەکان ماونو دەبێ هەر لەوان بپرسرێ. کەوابوو خەڵکەکە ئی ئێوەیە، شارەکەو وڵاتەکە ئی ئێوەیەو دەسەڵاتەکەش ئی ئێوەیە. شتەکەش زۆر ڕوونە. ئەوانە بە ماشێنێکی بەرازیلیو ٣ تفەنگەوە کە ئەوانیش دەسەندووقی پشتی ماشێنەکەدا بوون، هاتوون. خۆ نەهاتوون کۆیە بگرن. مەعلوومە ئەوانە بێ‌خەتا کوژراون. کەوابوو بۆخۆتان بیکەنو ڕای بگەیەنن. هەربۆیە ئامادە نەبووین بچینە ئێو کۆمیسیۆنەکە، چونکی پێمان وابوو ئەگەر بیانەوێ تەحقیق بکەنو موجازات بکەن، ڕێگایان بۆ ئاوەڵایە، ئەگەر نا، وەختێک بیانەوێ دیزەبەدەرخۆنەی بکەن بۆ ئێمە مەشرووعییەت بەو شانۆسازی‌یە بدەین. هەربۆیە نەچووینە نێوی.

زاهیرەن، کە نازانم چەندە وا بوو، ماوەیەک گیرانو دوایە دادگایەکیان بۆ کراو هەموو تەبرئە بوون. بەوتاوە کە گۆیا: "لەژێر ئاڵای سەوزی یەکیەتیی نیشتمانی‌دا دیفاعیان لە حاکمییەتی کورد کردوە. ئەوانە هاتبوون کۆیە بگرنو حکوومەتی کوردستان تێک بدەن"!! . لەو جۆرە ئیدیعایانەیان کردو شانۆسازی‌یەکەیان وەڕێ خستو حەقەکەش جوان پێی ڕێ‌خرا.

* پەلاماری بەربڵاوی هێزەکانی کۆماری ئیسلامی بۆ سەر بنکەکانی سەر بە دەفتەری سیاسی لە نێزیک کۆیە - وەکی باس دەکرێ - لووتکەی هاوکاریی یەکیەتی دەگەڵ ئەو ڕێژیمە بوو. ئەو ڕووداوە چۆن بوو؟ زانیاریی ئەوکاتتان لەسەر ئەو مەسەلەیە دەگەڵ هی ئێستاتان هیچ جیاوازی‌یەکی هەیە؟ دەتەوێ لەم بارەیەوە چی بڵێی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** شتێکی تازەم نیە بیڵێم، وەختی خۆی زۆرمان باس کردوە. ئێمە ماوەیەکی زۆر بوو لە ڕێگای ئیتیلاعاتی خۆمانەوە دەمانزانی کە ئێران بەتەمایە هێرشێک بۆ ئێرە بکا. ئەو خەبەرەمان هەبوو.

دەشمان زانی کە بەئیحتیمالی زۆر لە ڕێگای سلێمانییەوە دێ کە لەژێر دەسەڵاتی یەکێتی‌دا بوو. چونکی حەملەکە بۆ دەفتەری سیاسی بوو، دەفتەری سیاسییش لە مەنتەقەی یەکێتی‌دا بوو، ئەو مەڵبەندەی کە مونتەهی دەبوو بەوێ ئەویش هەر لە مەنتەقەی یەکێتی‌دا بوو. چەند جار کاغەز ڕەدووبەدڵ کرا کە ئێمە پێمان وایە شتێکی ئاوا هەیە. یانی پێمان گوتن ئیحتیمالی شتێکی ئاوا هەیە، هیواداریین پێشگیریی لێ بکەن. گوتمان ئەگەر بە مووشەک یان تەیارە لێمان بدەن کەس ئێوە خەتابار ناکا، چونکە پێشتان پێ ناگیرێ. بەڵام ئیدی چەندین کیلۆمیتر بەنێو خاکی کوردستانی عێراقدا بەماشێن و بە ڕێگای زەمینی‌دا بێن، ئەوە مانایەکی دیکە دەدا. دیارە لەو بەیاننامەشدا هێندێک جار داوای ئەوەیان دەکرد کە زاهیرەن جمهووریی ئیسلامی دەیەوێ بەنهێنی موزاکەرە بکەین. جوابی ئێمە ئەوە بوو کە موزاکەرەی نهێنیمان نییە. ئەگەر ڕاست دەکەن فەرموون بەو شەرتانەی ئێمە پێشتر باسمان کردووە ئامادەین. موزاکەرە لەسەر حەقی خەڵک و بەئاگاداریی خەڵک بێ. پاشان لە شوێنێک بێ کە هەردووکمان باوەڕی پێ بکەین. خەڵکی سەڵاحییەتداری هەردووک لا تێی‌دا بەشدار بن و خۆڵاسە ئوسووڵێکمان هەبوو.

لەنامەیەکدا کە وەختی خۆی بەڕێز مام جەلال لە جوابی نامەیەکی مندا ناردبووی نووسیبووی ئێوە لە داخلی وڵاتدا عەمەلیات دەکەن و پاشان حازر نەبوون موزاکەرەی نهێنی بکەن. ئێمە شەڕی ئێرانمان پێ-ناکرێ و پێشی وانمان پێ ناگیرێ. بۆیە ئێمە کارێکمان لەدەست نایە. ئەمن دەجوابی ئەو نامەیەدا، - جوابێکی مام جەلالم دایەوە- نووسیبووم ئێمە شەڕێکی وامان لە زیندی جمهووریی ئیسلامی نەکردووە. موزاکەرەی نهێنیشمان بۆیە ڕەت کردۆتەوە چونکی تەجرەبە سابیتی کردووە موزاکەرەی نهێنی دەگەڵ جمهووریی ئیسلامی لەشەڕی ئاشکرا خەتەرناکترە. مەگەر دوکتور قاسملووی ڕەفیق و دۆستی خۆت لە موزاکەرەی نهێنی‌دا تێرۆر نەکرا؟ کەوابێ ئەوەی ناکەین. لەئاخری‌دا جوملەیەکی توندیشم نووسیبوو کە دیارە نەک بە مانای بێ ئەدەبی، جوملەیەکی وام نووسیبوو کە ئەمن ئەو نامەیەتان بە موجەووێزی ئەو حەملەیە دەزانم. بەڵام قەیدێ ناکا خودا لە سوڵتان مەحموودی گەورەترە.

بەهەر حاڵ ئێمە خەبەرمان پێ گەیی — لەمەڕیواتەوە خەبەریان پێ‌داین — کە هێزێکی بۆ شەو پەرداغ بەرەو سنوورەکان وەڕێ کەوتووە کە ئێمە پێمان وایە بۆ سەر ئێوە دێن. دوایە خەبەرمان زانی گەیشتە نێو شاری سلێمانی و ئەو جار لەویش تێ‌پەڕی، جا خۆش ئەوە بوو کە لە نێو شاری چرایان کوژاندبووەوە بۆ ئەوەی خەڵک نەیانبینێ. هێزەکە هات لە "مەعسکر" سەلام موستەقەر بوو، بۆ بەیانی خەبەرمان زانی کە ئەوەیە و ئێمە ئامادەی تەواومان هەبوو. هەموو شتەکانمان دەزانی. پێم وایە ئەوە ئیکراوە بەڵام لەبەر شتێک پێم خۆشە بیڵێم، چونکی ئەوە پرسیارە کە داخوا یەکێتی بەمەی گوت یان پێی نەگوتین، ئەو پرسیارە کراوە. هەر بۆیە باسی دەکەم. ئێمە بۆخۆمان دەمانزانی. هەنگاو بەهەنگاو بە دوایەوە بووین. ئەگەر ئەوەش نەبایە کە بەداخەوە

پێشمەرگەی یەکیەتی دەگەڵیان سواری ماشێنەکان ببوون، دەمانتوانی لێیان بدەین. یانی نەیانزۆڕابوو ڕێگا بدەن ماشێنی یەکیەتی بەجودا بێو ماشێنی هێزەکانی ئێرانێش بەجودا. لەترسی ئەوەی لێیان دەین، یان کەمێتیان بۆ دابنێین چونکە کوردە باوەڕی پێ ناکەن. ماشێنێک پاسداریشی تێدا بوو پێشمەرگەی یەکیەتییشی تێدا بوو. ئەوە شتێک نیە بۆ ئەوانیش دڵخواز بووبێ، نە بۆ فەرماندەکانو نە بۆ پێشمەرگەکان، بەڵام لە وەزعێکی وادا بوون کە بەداخەوە پێکیان هێنابوو.

ئێمە هەمووی ئەوانەمان دەزانی. لە دەفتەری سیاسی کۆ بیووینەوەو فەرماندەکانی پێشمەرگەشمان بانگ کردبوون بەرنامە دابڕێژین کە لە بەرابەر ئەو پەلامارەدا کە بۆمان دێ چ بکەین. خەریکی مەشوەرەتو بیروڕاگۆڕینەوە بووین کە خەبەریاندا کاک "ئەژادی ئەحمەدی عەزیز ئاغا" هاتوە دەڵێ دەچمە سەردانی فلانە کەسی. کاک ئەژاد دۆستێکی زۆر قەدیمیی دوکتۆر قاسملوو بوو. بە تەبەعییەتی دوکتۆر قاسملووی دۆستایەتیی دەگەڵ منیش هەبوو. دەگەڵ حیزبیش دیارە پێوەندیی باشی هەبوو. لەعەینی کاتدا وەختی خۆی ئەندامی حیزبی کۆمۆنیستی عێراق بوو کە ئەو دواییانە وەک ئەندام نەمابوو. جێگری سەرۆکی پارلمانی کوردستانیش بوو. دیارە ئێمە کۆ بیووینەوە، بەڵام ئەمن گوتم هاوڕێیان ئەژادی ئەحمەدی عەزیز ئاغا کەسێک نیە ئەمن بڵێم مەیە. بۆیە گوتمان با بێ. برادەران چوونە ژوورێکی دیکەو کاک ئەژاد هات دەگەڵی دانیشتم. گوتی ئەمن هاتووم قسەیەکت پێ بڵێم. بیستوومە کە ئێران حەملەیەکی بەدەستەوەیە بۆسەر ئێرە. بە تەیارەیە، بە مووشەکە، بە چییە نازانم. بەڵام حەملەیەکی ئاوای بەدەستەوەیەو بۆخۆشم هاتووم، کەس نەی ناردووم. کاک ئەژادیش ئەو وەختی لەلایەن یەکیەتییەوە ببوو بە ئەندامی پارلمان. یانی دەگەڵ ئەوەی ئەندامی یەکیەتی نەبوو بەڵام پاڵێوراوی وان بوو. کرابوو بە جێگری سەرۆکی پارلمانیش.

ئەمن بەدڵگەرمییەوە گوتم ئەو پێچوپەنایەی ناوێ. لێتان مەبارەک بێ. ئەوە هێزەکان لەو دیوی "هەیبە سوڵتان"ی موستەقەر بوون. تانکەکانو هێزەکانو تۆپخانە ئەوە لەوێن. مەبارەکتان بێو ئێمەش کەیفی خۆمانە. گوتی نا ئەوە ئەمن بۆخۆم هاتووم ئەوانە. گوتم باشە هاتووی ماڵت ئاوەدان بێ، بەڵام حەقیقەتەکە ئەوەیەو دەشزانی. گوتی ئاخر لێرە بڕۆن. گوتم بۆچی بڕۆین. ئەوە لێرە دانیشتووین. هەرچی کوژرا کوژرا، هەرچیش ما ئەوە باشتر. لەپاشان هەر وەک عەرزم کردی تەمەنیشی لەمن زیاتر بوو برا گەورە بوو بەڕاستی، زۆرم ڕێز بۆی هەبوو. وەکوو براگەورەیەک گوتی قارەمانبازی دەرمەیەنە. ئەتۆ بمێنی باشترە. زۆریش خسووسی گوتی لاچۆ لێرە لەجیاتی بڵێ بڕۆن. ئەو پەیامەکەی خۆی گەیاندو هەستا ڕوا. ئەمنیش ئەمگوت وەمێنە چونکی مانەوەی چی، پاش چەند سەعاتی دیکە تۆپبارانو مووشەکباران دەکراین.

دوایە کۆبوونەوەکەمان درێژەداو هەتا ئێوارێ بەردەوام بووین. ئێوارێ یەک دوو برادەر لە کۆیەڕا هاتن باسی مەسئوولێکی کۆیەیان کرد. -مەبادا ئەو مەسئوولە پێی خۆش نەبێ ناوی نابەم-. گوتیان فلانە کەس ئێمەی

ناردوە دەڵێ ئەوشۆ ئێرە ئاورباران دەکرێ. بەفلان کەسی بڵێن با لێرە نەبێ، دیسان هەر خسووسی، نەک بڵێ با دەفتەری سیاسی لێرە نەبێ. ئەمنیش گوتم بچن پێی بڵێن مەسەلەکە هەر ئێمە نیین. ئێمە وەک دەفتەری سیاسی شتێکمان هەر لەدەست دێ، کارێک بۆخۆمان دەکەین. بەڵام موهیم ئەو ژن و منداڵەیە. با ئەو ژن و منداڵەمان بەسورعەت بۆ ڕاگوێزن بۆ نێو شاری کۆیە. چونکی ئێمە بۆخۆمان ٦،٧ ماشینمان هەبوون بەوەندێ ئەو هەموو ژن و منداڵە ڕانەدەگوێزرا. یانی دەوری ٢٠٠٠ کەس. گوتیان دەچینەوە پێی دەڵێین. چوونەوە هاتنەوە گوتیان گوتوویەتی هیچم لەدەست نایە. تکای لێدەکەم ناویشم نەهێنێ، ئەمن بۆخۆم ئەو کارەم کردوە. ئەوە بوو ئەوان ناهومێدیان کردین. ئێمەش گوتمان با بە ژن و منداڵ بڵێین بەڕێیان وەڕێ کەون و بچنە کۆیە. لە کۆیەش هەر ماڵێکی تووشی بوون لە دەرگا بدەن و بچنە ژوورێ. دەگەڵ خەڵکی کۆیە تێکەڵاو بن. کاریان بەوە نەبێ دەیناسن یان نا. هاتووە پەنام هێناوە دەبێ ڕام گری.

ئیدی دەرگای ماڵەکانیان پێوە داوە بێ ئەوەی هیچ کەس دەستەچیلکیشی بۆ دەرچێ، ڕۆیشتن بۆ نێو شاری. پاش سەعاتێک خەبەریان هێنا گوتیان ئەوە لە دەوری هێندێک سازمانی خەیریە کە لەوێ بوون کۆ بوونەتەوە و تەزاهورات دەکەن. گوتمان پێیان بڵێن وەختی تەزاهورات نیە و خۆیان بخەنە نێو ماڵان. ئێستا بێن بە بووکیان دەبەن. ئیدی بەقسەیان کردین و چوونە نێو ماڵان و دەگەڵ خەڵکی تێکەڵ بوون. بۆخۆشمان کە بەنیاز بووین هەر لێرە وەمێنین. فەرماندە ئیزامییەکان گوتیان دەبێ بڕۆن. گوتمان ناڕۆین. هەرچی ئەوان گوتیان ئێمە نەمانبیستو ئەوەی ئێمە گوتمان ئەوان نەیانبیست، دوایە بە شتێک مەحکوومیان کردین. گوتیان ئێوە دەستو پێی ئێمە دەگرن، ئەگەر ئێوە لێرە بن دەبێ بەشێکی زۆری هێزەکان سەرفی پاراستنی ئێوە بێ. کەوابێ لێمان گەڕێن با کارەکەی خۆمان بکەین. مەجبوور قبووڵمان کرد کە ئێمە بچینە ئەو دیوی ئەو گردەی ئێرە. لەوێ بنکەیەکمان هەبوو چووینە وێ. یانی زۆر نزیک.

بەهەر حاڵ پێم وایە لە درێژایی شەوێدا لێیان نەداین، بەرەی بەیانی دەستیان پێ کرد. سبەینەکەی ئێمە کە بنکەمان لە هەولێر بوو چووینە وێ. دیارە ئەوان ڕۆژەکیان وا هەڵبژاردبوو کە شەممەو یەکشەممە بێ و ئێمە دەنگمان بە هیچ جێگایەک ڕانەگا. بەڵام ئێمە کە پێشتر زانیاریمان هەبوو، دنیای دەرەوەمان ئاگادار کردبوو. زۆر جێگامان ئاگادار کردبوون کە ئێران بەرنامەیەکی وای بەدەستەوەیە. کە چووینە هەولێریش ئەو وەختی مۆبایل و شتی وا نەبوو بەڵام تەلەفۆنی ماهوارەییمان هەبوو. لەو بارەیەوە دەسەزیقەدا نەبووین چونکە تەلەفۆنەکەم دەگەڵ خۆم بردبوو. لەوێ وەڕێمان خستو دنیامان لێ ئاگادار کرد. دوایە وامان زانییەوە کە ڕاستیش بوو، ئەمریکا لە ڕێگای سەفارەتی سویسەوە کە پارێزەری قازانجەکانی لە ئێرانە، بە دەوڵەتی ئێرانی ڕاگەیاندبوو کە ئەو مەنتەقەیە لە دەست سەددام حوسێنی دەرنەهاتوە بۆ ئەوەی ئەوان ڕەبازێنی تێدا بکەن. گوتبوویان ئەگەر ئەوەی بکەن ئێمە دژکردەوە نیشان دەدەین. بەکردەوەش تەیارەکانی ئەمریکا بەسەر هێزەکانی

ئێراندا فریبوون کە دە مەنتەقەدا بوون. ئەوە بوو کە هێزەکانی ئێران ناچار بوون بە پەلەپرووزە بکشێنەوە. دوایە هەیئەتێکی یەکیەتی هات لە هەولێر دەگەڵ ئێمە دانیشتن. یادی بەخێر کاک دوکتۆر فوئاد مەعسووم بوو وەکوو سەرپەرستو چەند کەسێکی دیکەشیان هاتن بەڵام سەرپەرستی هەیئەتەکە کاک دوکتۆر فوئاد بوو. لەلایەن ئێمەشەوە کاک مستەفای هیجری دیاری کرا. باسەکەش ئەوە بوو کە چۆن شتەکەحەل کەینو ئەوانە. دەوێدا کاک دوکتۆر فوئاد مەعسووم گوتبووی هەم کاک نەژادو هەم ئەو کەسەی دیکەی کۆیە کە نەفەری ناردبوو، ئێمە پێمان گوتبوون بۆ ئەوەی ئێوە زیانتان پێ نەگا. لەپاشان فشاری بیروڕای گشتی بە ڕادەیەک لەسەر یەکیەتی هەبوو کە ئەوەیان بەخەڵکیش گوت. گوتیان بۆخۆمان پێمان گوتوون. جا ئەمن لە جێگایەکدا پێمگوتن کە بابە دنیاتان لێ تێکداوە لەبەر خاتری جمهوریی ئیسلامی. ئێستا دڵی جمهوریی ئیسلامی بۆ لەخۆتان عاجز دەکەن کە ئاشکرای دەکەن.

کەوابێ مەسەلەکە ئەوە بوو، یانی شتەکە وا نەبوو کە یەکیەتی پێمان بڵێو بۆخۆمان نەمانزانیبێ. بۆخۆمان دەمانزانی بەڵام بەو شێوە ناڕاستەوخۆیە ئەوانیش پێیان گوتین. بە هەرحاڵ ئەوە نەبوو کە ئەوان لەسەرەتاوە ئاگادارمان بکەن چونکە هەموو شتەکانمان دەزانی.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا وەک بزانی بەرنامەکە چی بوو؟ یانی گرتنی بنکەکانتان بوو لێرە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەرنامەکە ئەوە بوو کە ئێرە بگرن. پێم وابێ ٢ یان ٣ ترێلیی قەفەسداریشیان هێنا بوون کە خەڵکەکەی ئێمە دەقەفەسان کەنو بیانبەنەوە بۆ ئێران. بەرنامەکەیان زۆر وەسیع بوو. دیارە بەخۆشییەوە بۆیان نەچووە سەر، بەڵام ئەگەر هاتبانە ئێرە پێم وایە بە وەزعێکی زۆر شڕ دەگەڕانەوە. چونکی پێشمەرگە ئامادەییەکی تەواوی هەبوو. وەکی مەعلووم بوو، ویستبوویان لە بەشێکڕا حەملە بکەن کە لێرەدا پێشمەرگەکان کەمێک تاکتیکی غەڵەتیان بەکار بردبوو. یانی پێش ئەوەی تێزیک بنەوە تەقەیان لێ کردبوون. ئیدی کە زانیبوویان پێشمەرگە ئامادیە بێ ئەوەی ئازاریان پێ بگا. کشابوونەوە. بەڵام پێشمەرگە لە هەموو جێیەکی هەبوو. شتێکی زۆر سەیرو سەمەرەش بوو کە دەواقیعدا ئێمە کەسمان لێ نەکوژرا. تەنیا تەلەفاتی ئەو حەملەیە ژنێک بوو کە لە ئێرانڕا هاتبوو. ئەو مرد نەک بە وێکەوتنی پریشکەی تۆپو شتی ئاوا. بۆخۆی فشاری خوێنی هەبوو، گەرمایەکی زۆر بوو و عومریشی لەسەرێ بوو. ترسو دڵەخورپەو ئەوانەش کۆمەگی بەوە کرد لەو وەختەدا بمرێ. دەنا تەلەفاتمان نەبوو. بۆیە پاش بۆمبارانەکە هەموو خەڵک پێیان سەیر ببوو، گوتبوویان یانی ئێوە لێرەنو ماویشن؟ ئەمن دواتر کە گەڕاینەوە، سەنگەرێکم دی کە هەر قوولکەیەک بوو هەڵیان قەندبوو. قایمیش نەبوو کە بڵێی دەورەکەی بە تەلیسو ئەوەی گیرا بێ. بەڵام

موبالەغە نیە ئەگەر بڵێم لەفاسیلەی ٢ میتری بەو لاوە هەتا ١٥، ٢٠ میتری، زیاتر لە ١٠ تۆپەو کاتیۆشای وێ‌کەوتبوون. کەچی یەک نەفەریان برینداریش نەببوو. شتێکی زۆر سەیر بوو.

دیارە دەزانین کە وەک زیانی ماڵی، زەرەری زۆر گەورەمان وێ‌کەوت. ئێمە لەڕاستی‌دا لە بەشی "ئازادی" و "تامیرەت"ی ماڵی ساغمان نەمابوو. یانی یەک ماڵیش تەما بە ساغی دەرچووین. هەمووی زیانی پێ‌گەیشتبوو. بەڵام ئەو ماڵانەی کە زیانی زۆریان پێ‌گەیشت جا لە سووتانو ڕووخانەوە بیگرە هەتا ئەوەی کە دیواری تەئیوو ئیحتیاجی بە تەعمیر هەیە، هەر ئەوانە ١٢٨ ماڵ بوون.

* دوای پەلاماری هێزەکانی ئێران بۆسەر بنکەکانتان لە نیزیک کۆیە، حیزبی دێموکرات ناچار کرا ڕێک‌کەوتنێک دەگەڵ یەکیەتی مۆر بکا کە چیی دیکە شەڕی چەکداری نەکا. ئەوە لەڕاستی‌دا سەرەتای دەستێکی ژیانێکی دیکە بۆ ئەندامانو پێشمەرگەکانی حیزب بوو کە هەتا ئێستاش درێژەی هەیە، پێم وایە ڕوون‌کردنەوەی ئەو مەسەلەیە گرنگیی زۆری هەیە، جەنابت چی دەڵێی؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** ئەوە تەقریبەن زۆرشتی دەبێ تەسحیح بکرێ. ئەوەڵەن کەم‌بوونەوەی عەمەلیاتی پێشمەرگەی ئێمە لەو وەختی‌ڕا دەستی پێ‌نەکرد. بەڵکوو لەمێژ بوو عەمەلیاتی پێشمەرگە کەمی کردبوو. پاشان یەک، دوو شتی دیکە کە دەپرسیارەکەدا هەاتوون جێی خۆیەتی لێرە باسیان بکەم. یەکیان ئەوە کە دەڵێن گۆیا ئێمە دەگەڵ جمهووریی ئیسلامی ڕێک‌کەوتنمان ئیمزا کردوە. جاری دیکەشم گوتوەو ئێستاش دەی‌ڵێمەوە کە لە دوورو نیزیک، نە ڕاستەوخۆو نە ناڕاستەوخۆ، نە بەسەراحەتو نە بەکینایە هیچ ڕێک‌کەوتنێک دەبەینی حیزبی دێموکراتو جمهووریی ئیسلامی‌دا نەبووە. بەڵکوو شتەکە لە بەینی حیزبی دێموکراتو یەکیەتی‌دا بووە. شتی دیکە کە ئیبهامە، ئەوانەی نان لەوە دەخۆن کە تۆمەت بڵاو بکەنەوەو گومان دروست بکەن، لە زۆر جێگا گوتوویانە هەم بەنووسین بەناوی نهێنی‌و هەم بەقسەش گوتوویانە کە ئەوە ئەمن بووم وەک عەبدوڵڵای حەسەن‌زادە کە دەگەڵ یەکیەتی ڕێک کەوتووم. تەنانەت وەقاحەتیان گەیاندە جێگایەک کە گۆیا ئەو هێزانە بە تەمەری من هاتوون. بەڵام ئەو تەوافوقە شتی ئیمزا کراوە. لەلایەن ئێمەوە کاک مستەفای هیجری ئیمزای کردوە، لەلایەن یەکیەتیی نیشتمانی‌یەوە دوکتۆر فوئاد مەعسووم ئیمزای کردوە.

مەتڵەبێکی دیکەی کە دیسان پێویستە ئیشارەی پێ‌بکەین ئەوەیە کە ئەو ڕێک‌کەوتنامەیە هیچ تەعەهودێکی بۆ مە دروست نەکردوە بۆ ئەوەی شەڕ لە داخڵی ئێراندا نەکەین. بۆ؟ بەڵێ تێ‌دا بووە کە ئێمە دا مەوقیعێکی موعەییەن شەڕ ڕادەگرین. بەڵام لەموقابیل‌دا نووسراوە ئەگەر ئەوەندە تەعەهوداتی مەیە، ئەوەندەش تەعەهوداتی یەکیەتیی نیشتمانی‌یە. لەعەینی حاڵ‌دا لە بەندێکی ئەو ڕێک‌کەوتنامەیەدا هاتوە

کە دەڵێ ئەو ڕێک کەوتننامەیە یەک واحیدە. جێبەجێ نەکردنی هەر جۆزئێکی ئەو ڕێک کەوتننامەیە. بەمانای هەڵوەشانەوەی هەمووییەتی. زۆر بەندی ئەو ڕێککەوتننامەیە، ئەگەر نەڵێم هەموویان، کە مەربووت بووە بە تەعەهوداتی یەکیەتیی نیشتمانی بەرابەر بە حیزبی دێمۆکرات، بۆ یەک لەحزەش جێبەجێ نەکران. کەوابێ لەو بارەیەوە حیزبی دێمۆکرات ئازاد بوو لەو تەعەهودەی هەیبوو کە عەمەلیات لەداخڵی وڵاتدا نەکا. بەمجۆرە ڕاوەستانی عەمەلیاتی چەکدارانە بە دەلیلی ئەو ڕێککەوتننامەیە نەبووە. دەلایلی دیکەی هەبووە کە لە زۆر جێگا باس کراوە. یەکیان ئەوە بووە کە بە تەنیا مابووینەوە کە خەباتی چەکدارانە بکەین. تەنانەت لە کوردستان لەمێژ بوو هێزەکانی دیکە وازیان لە عەمەلیاتی چەکدارانە هێنابوو. هەر ئێمە بووین درێژەمان دەدا. یانی ئێمە هێشتا هەر لە قەندیل بووین کە هێزە سیاسی‌یەکانی دیکە عەمەلیاتی چەکدارانەیان ڕاگرت، بۆ ئەوەی ئینسافم بەخەرج دابێ، یەکیەتیی شۆڕشگێڕان هەتا ئەو دەوروبەرەی چەند جارێک عەمەلیاتی پێشمەرگانەیان هەبوو. دەنا هێزەکانی دیکە نەیانبوو.

لای دیکە، ئێمە پشتی جەبهەمان لەدەست دابوو. یەکیەتی و پارتی لە وەزعییەتێک‌دا نەبوون کە ئیجازە بدەن ئێمە لێرە موقیم بین و پاشانیش بچین عەمەلیاتی تیزامی بکەین و بێینەوە ئێرە. ئەو فشارەی ئێران لەسەریانی هەبوو، ئەو وەزعەی دەگەڵ عێراق هەیانبوو، ئەو مەوقیعییەتە نابەسامانەی تێی‌دا بوون وەک وڵاتێکی وێران و ئەوانە، ئیجازەی ئەوەی پێ نەدەدان. جگە لەوە، توانا و ئیمکانی تەعەڕڕوزیی ئێمەش مەعلوومە لەکەمیی دابوو. ئەگەر وەختێک دەمانگوت دوازدە هەزار پێشمەرگەمان هەیە و بەوەشەوە سی، تا چل هەزار کەس هێزی بەرگریمان هەبوو، ئێستێ ببووینە چەند هەزارێک ئەویش لە دەرەوەی سنوورەکان. بۆیە بەردەوامیی عەمەلیاتی چەکدارانە بەکردەوە شتێکی موفید نەبوو. زیاتر زەرەری لێ‌دەداین هەتا خێرمان پێ بگەیەنێ. لەبەر ئەوە بوو، دەنا ئەو بەڵێنەی دابوومان هەر لە ڕۆژی ئەووەڵێوە ئێمەی لێ ئازاد بووین، لەبەر ئەوەی لایەنەکانی دیکەی ئەو تەوافوقنامەیە جێبەجێ نەکرابوون. بەتایبەتیش دەڵێ ئەو تەوافوقنامەیە یەک واحیدە و هەر جوزئێکی بەڕێوە نەچێ هەموو جوزئەکانی دەگرێتەوە.

**هەیاس کاردۆ:** پرسیارێکی دیکە ئەوەیە کە گۆیا تۆ بوویە باعیسی ئەوەی هێزەکانتان لەقەندیلڕا داگەڕێنە خوارێ. لەکاتێک‌دا کاک مستەفای هیجری کە ئەوکات سکرتێر بوو لەماڵ نەبوو و نەقشی تێی‌دا نەبووە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەش وەک ئەو شتانەی دیکەیە کە دەگوترێن. ئێمە دەفتەری سیاسی‌یەکمان هەبوو، ئەوە بۆتە تاریخ، لە ئیختیلافی نەزەردا کە دەهاتە پێشێ ئەمن بەتاقی تەنێ لایەک بووم. ئێمە ٥ کەس بووین، چواریان لایەک بوون ئەمن بەتەنیا بووم. ئەو وەختی ئیختیلافمان هەبووە. بەڵام لەسەر ئەو شتەی کە پێش هات، خۆ شتێک نەبوو بەئیختیار هەڵی‌بژێرین، یەک دەنگی موخالیف نە لە دەفتەری سیاسی و نە لە

کۆمیتەی مەرکەزی‌دا نەبووە. هەموو پێکەوە کارمان کردوە. کاک مستەفای هیجریش ڕاستە لێرە نەبووە، بەڵام لە جەریانی هەموو شتێک‌دا بووەو کە هاتۆتەوە ئێرەش هیچ ئیعتیرازێکی نەکردوە لەوەی کە بۆ گوازتوومانەتەوە. چونکی تەواوی میحنەتەکە ئێمە چەشتوومانە، ئەو لەسەفەر بووە لەو وەختی‌دا. وەکوو ئاگاداربوونیش ئاگای لە هەموو قەزیەکە هەبووە. شتێکە دەگوترێ‌و ئەوانەی پێیان خۆشە وا بڵێن، ئەگەر نانێک لەوەی دەخۆن با بی‌خۆن.

* بەهەموو هەوراز‌و لێژیی پێوەندی‌یەکانی نێوانتان دەگەڵ یەکێتی، دۆستایەتیتان هەروا پارێزراوە. ڕەمزی ئەوە لەچی‌دا دەبینی؟ پێت وایە بەڕاگرتنی ئەو دۆستایەتی‌یە قازانجتان کردوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە لە پێوەندیی نێوان هێزە سیاسی‌یەکانی کورددا، یان هێزە نیشتمانپەروەرەکانی کورددا، شتی ناتەبیعی‌و نائاسایی شەڕو پێکدادان‌و نێوان‌ناخۆشی‌یە. ئەوی دیکە هەر دەبێ وا بێ. ئیدامەی ئەو دۆستایەتی‌یانە هێندێک دەلیلی خۆی هەن. یەکیان هەر ئەو ئەسڵەیە کە هێزە سیاسی‌یەکان دەبێ پێکەوە دۆست بن. ئەسڵی دیکە ئەوەیە کە ئێمە دەرکی مەوقیعییەتمان کردوەو هەستی مەسئوولییەتمان تێدا بەهێز بووە کە نەمانهێشتوە ئەو ڕووداوانەی دێنە پێشێ ببنە باعیسی تەشەنەکردنی ناکۆکی‌یەکان لەبەینی دوو هێزی نیشتمانپەروەری کورددا بۆ ئەوەی شتی خراپتری لێ بەرهەم نەیە. یەکی دیکەو گرینگتریش لەوان ئەوەیە کە دەگەڵ ئەوەی شتی ناخۆش لە بەینی ئەو دوو هێزەدا گوزەراوە خاڵی هاوبەش‌و هەنگاوی موسبەت‌و هەستی برایەتی زۆر بەهێزتر بووە لەو حاڵەتانەی کە هاتوونەتە پێش. یانی لەو ئامولایانە کە بڵێین شەڕ بەردەوام بێ یان لێک‌دابڕان‌و ناکۆکی هەبێ. ئەمن بەشبەحاڵی خۆم زۆری پێ سەربەرزم. بەتایبەتی کە دەبینم دوو هێز لەنێو خۆی باشووری کوردستاندا پاش شەڕی براکوژی‌و پاش گەیاندنی تەلەفاتی قورس بە یەکتری کە دەتوانێ سەر لە هەزاران شەهید بدا، پاشان هیچ ڕێگا نەمان غەیری ئەوەی ئاشت ببنەوەو هەوڵ بدەن هاوکاری بکەن. جا چ باشتر هی ئێمە نەکەوتە ئەوەی لێک بکوژین. نەکەوتە ئەوەی سەنگەر لەموقابیل یەکتردا بگرین. بریا پارتی‌و یەکیەتیش هەر وایان کردبایە. بریا پارتی‌و یەکیەتی شەش مانگ زووتر، ساڵێک زووتر، ئەگەر کرابا پێنج ساڵ زووتر ڕێک کەوتبانایە.

بەباوەڕی من هیچ شتێکی غەیری ئەوە، هیچ بانگەوازێکی غەیری ئەوە کە هێزە نیشتمانپەروەرەکانی کورد دەبێ پێکەوە دۆست بن‌و هەر لەهەنگاوی یەکەمەوە پێشی ناکۆکی‌یەکانیان بگرن، غەیری ئەوە دڵسۆزی بۆ کوردو کوردستان‌و ئینسانییەت نییە.

* وەک ئاخرین پرسیار لەپێوەندی دەگەڵ یەکیەتیی نیشتمانیدا، شەخسی مام جەلال تاڵەبانی چۆن هەڵ-دەسەنگێنی؟ بوونی ناوبراو وەک کەسی یەکەمی یەکیەتی چ قازانج و زەرەرێکی بۆ حیزبی دێموکرات هەبووە؟ پێوەندیی خۆت دەگەڵ ناوبراو چۆنە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** مامجەلال تاڵەبانی ئێستا لەوەی گوزەراوە کە پێویست بێ ئەمن قەزاوەتی لەسەر بکەم. مامجەلال لە شەخسییەتێکی کوردەوە بۆتە کەسایەتییەکی عێراقی، ناوچەیی و نێونەتەوەیی. ئێستا جەلال تاڵەبانی لە ڕادەی نێونەتەوەییدا یەکێک لە شەخسییەتە ناسراوەکانە. وەکوو هەموو شەخسییەتێکی سیاسیی دیکەش نوقتەی بەقەوەت و موسبەتی هەیە، خاڵی لاواز و مەنفییشی هەیە. ئەمن پێم وایە بوونیشی لە ڕەئسی یەکیەتیی نیشتمانیدا، ئەگەر لەسەر یەک بی گرین بە قازانجی حیزبی دێموکڕات بووە تەک بە زەرەر. دەتوانم بڵێم زۆر جار بە قازانجی هەمەران بووە، یانی بە نەفعی پارتییش بووە، کە دیارە شەڕی زۆر ناخۆشیان لەبەینەدا بووە. بەڵام وا بزانم هۆیەکی کاریگەر بووە بۆ ئەوەی ئاڵۆزی کەم بێتەوە و پێش بە پەرەگرتنی ناخۆشییەکان بگیرێ. لەسەر یەک عامیلێکی خێر بووە. عەرزم کردی خەتاشی بووە، گلەییشی هاتۆتە سەرێ.

لەپاشان پێوەندیی شەخسی خۆم دەگەڵ وی، بەشێکە لەپێوەندییە گەورەکان. ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان یەکیەتی و حیزبی دیموکڕات خوا نەخواستە نێوانیان ناخۆش بێ. شتێک بەناوی دۆستایەتیی من و مامجەلال مانای نامێنێ. چونکی دەگەڵ ئەوەی ئەو کەسی یەکەمی یەکیەتییە، بەڵام فەردێکە دەنێو یەکیەتیدا. ئەمنیش کە ئەو مەوقیعییەتەم نیە، ئەندامێکم لە نێو حیزبی دێموکڕاتی کوردستاندا. حەتمەن پێمان ناخۆش دەبێ وەک دوو کەس کە دۆستین حیزبەکانمان نێوانیان ناخۆش بێ. بەڵام هیچ مومکین نیە ئەو کات دۆستایەتیی یەکتر بکەین. ڕەنگە هەوڵ بدەین ئاڵۆزییەکە نەمێنێ. بەڵام ئیدی هیچمان بەپێچەوانەی سیاسەتی گشتیی حیزبەکانمان ناجووڵێینەوە. ئەمن لە تاریخێکی زۆر کۆنەوە ناڕاستەوخۆ مامجەلالی دەناسم. ئەو ڕەنگە کەمتر ناوی منی بۆ ئاشنا بووبێ، چونکی لەوەتی وەبیرم دێ ئەمن ناوی مامجەلالی وەک یەکێک لە سەرانی کورد دەبیسم. بەڵام ئەو درەنگتر ناوی منی زانیوە. لەپاشانیش هەر لە تاریخێکی کۆنەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ چل ساڵ پێش ئێستا، یانی لە ساڵی ١٩٧٠وە ئەمن لە نیزیکەوە دەیناسم. کە یەکەمجاریش یەکترمان دیوە وەکوو دوو کەسی دۆست و ئاشنا یەکترمان وەرگرتوە و بەخۆشییەوە ئەو دۆستایەتییە هەتا ئێستاش بەرقەرارە. هیوادارم هەمیشەش بەرقەرار بێ و وەک هۆیەکی لێکنیزیکبوونەوەی بزووتنەوەی ئەو دوو بەشەی کوردستانیش بەحیساب بێ و کەڵکی لێ وەربگیرێ.

# حیزبی دیموکراتو حیزبی شیووعیی عێراق

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا پێمخۆشە لە پێوەندیی دەگەڵ حیزبی شیووعیی عێراقیشدا باسێک بێتە گۆڕێ ئەگەر پێت باش بێ. دەزانم حیزبی دێمۆکرات دۆستایەتیی درێژماوەی دەگەڵ ئەو حیزبە هەبووە کە دیارە ئێستا هەم کوردستانی‌یەکەی هەیەو هەم عێراقی‌یەکەی. دەکرێ پرسم هۆ، یان هۆیەکانی ئەو دۆستایەتی‌یە بۆچی دەگەڕێتەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دۆستایەتی بەینی حیزبی شیووعیی و حیزبی دێمۆکرات ئەوەندە کۆنە کە دەگەڕێتەوە پێش ئەوکاتەی ئەمن لەپێوەندی‌یەکانی دەرەوەی حیزبی دێمۆکرات ئاگادار بم. مەسەلەن ئەمن لە ساڵەکانی ۱۹۷۰وە لە نێزیکەوە لە پێوەندی‌یەکانی دەرەوەی حیزبی دێمۆکرات ئاگادارم. لەحاڵێکدا ئەو پێوەندی‌یانە دەگەڕێنەوە بۆ زۆر زووتر. بناغەکەی لەسەر چی پێکهاتووە چۆن پێکهاتووە لە نێزیکەوە لێی ئاگادار نیم. ڕەنگە هۆیەکی ئەوە بووبێ کە ماوەیەکی زۆر ئەو دوو حیزبە پێکەوە دەگەڵ وڵاتانی بەرەی سۆسیالیستی دۆستایەتی‌یان بوو. ئێمە دەگەڵ حیزبی توودەی ئێران ماوەیەک هەر یەک حیزب بووین کە ئەوانیش برادەری حیزبی توودەی ئێران بوون. ڕەنگە ڕەوابیتی شەخسی، بەتایبەت بوونی دوکتور قاسملوو لەعێراقو لەخودی بەغداو پێوەندیی دەگەڵ کەسایەتی‌یە گەورەکانی حیزبی شیووعیی عێراق یەکی دیکە لە هۆیەکانی بووبێ. بەهەر حاڵ ناچمە سەر ئەو باسە. ئەوی دیکە، یانی ئەوەی ئەمن لێی ئاگادارم دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستی بەڕاستی بەپرەنسیپو بەئەخلاقی ڕێبەرانی حیزبی شیووعیی عێراق بەرامبەر بە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان.

حیزبی شیووعیی عێراق ئێستا حیزبێکی سەربەخۆ یان نیوەسەربەخۆی دیکەی لێ دروست بووە بەناوی حیزبی شیووعیی کوردستان. پێوەندی‌یەکانی ئێمە ئێستا دەگەڵ حیزبی شیووعیی عێراق زیاتر لە کانالی حیزبی شیووعیی کوردستانەوەن. بەڵام ئەوە تازەیە. لە ساڵانی پێشوودا هەتا ۱۹۹۰و ئەوانە، لەواقیعدا پێوەندی‌یەکان دەگەڵ حیزبی شیووعیی عێراق بوون. ڕەنگە ئەوەش تەئسیری بووبێ، بەتایبەت لە ئیدامەدا کە بۆ ماوەیەکی زۆر بەرپرسایەتیی یەکەمی حیزبی شیووعیی عێراق هەر بە کوردەکان بووە. مەسەلەن دەورانێک کاک "بەهائەددین نووری" سکرتێری حیزبی شیووعی بوو کە نازانم چەندی کێشاوە. بەڵام دەورانێکی زۆر دوورودرێژ کاک "عەزیز موحەممەد" سکرتێر بوو. کاک عەزیز هەرچەند شیووعی‌یەکی موخلیس بوو بۆ

باوەڕەکەی، لە عەینی حاڵدا لەباری هەستی نەتەوایەتی‌یەوە دەکرا پێی بڵێی ناسیۆنالیستێکی تۆخ. یانی ئەوەندە هەستی کوردایەتیی هەبوو. دیارە حیزبی شیوعییش وەک هەموو حیزبێک و ڕێبەرانی ئەو حیزبەش وەک هەموو ڕێبەرانی دیکە ئیرادیان هەبوو و هەڵەشیان هەبووە. بەڵام حیزبی شیوعیی عێراق پێشەنگی ئەو [illegible] وڵاتانی [illegible] کورد [illegible] زۆر باشی بەرامبەر بە حیزبی [illegible] هەبووە.

ساڵی ١٩٥٦، یانی ٥٤ ساڵ بەر لەئێستا حیزبی شیوعیی عێراق لە کۆنفرانسی خۆی‌دا بڕیارنامەیەکی پەسند کرد کە حەقی جودا بوونەوە لەعێراق بەکورد دەدا. ئەوە هەڵوێستێکی ئوسووڵی‌یە کە هێزەکانی دیکە نەیانبووە. پاشان ئەمن ئەوەم لەبیرە کە حیزبی دێمۆکراتی کوردستان دەگەڵ ئەوەی کۆمۆنیستیش نەبوو، باوەڕی بەوە هەبوو کە دۆستی وڵاتانی سۆسیالیستی و بەتایبەتی یەکیەتیی شووڕەوی بێ. تەنانەت پێی خۆش بوو خۆ بە یەکیەتیی شووڕەوییشەوە هەڵاوسێ کە ئەمن دەگەڵ بەشێکی موخالیف بووم، پێم وا بوو توندڕەویی تێدایە. لەوەدا حیزبی توودەی ئێران کە حیزبی کۆمۆنیستی وڵاتەکەی خۆمان بوو، کاری بەدگۆیی لەلای یەکیەتیی شووڕەوی بەدژی حیزبی دێمۆکرات بوو. کەچی حیزبی شیوعیی عێراق بەپێچەوانە لەلای وڵاتانی سۆسیالیستی دیفاعی لی‌دەکردین. تەنانەت لەبیرمە جارێکی دیدارێک هەبوو بەینی ئێمە و یەکیەتی و حیزبی شیوعی. هەروا کە قسە دەکران، دوکتۆر قاسملوو بە مامجەلالی گوت تاکێ حیزبە کۆمۆنیستەکانمان بگۆڕینەوە؟

دەتوانم بڵێم پێوەندیی نێوان ئەو دوو حیزبە نموونەیەکی یەکجار جێی لێ‌فێربوون و لەبەر نووسینەوەیە لە پێوەندیی نێوان ئەحزابی سیاسی‌دا. ئەگەر بکرێ حیزبێک لەو جێگایانەدا کە پێویست بووە زیاتر لەتوانای خۆی کۆمەگی بە حیزبێکی سیاسی کردبێ، دەتوانین بڵێین حیزبی شیوعیی عێراق بەرامبەر بەحیزبی دێمۆکرات کردوویە. هیوادارم نموونەی ئەو جۆرە پێوەندی‌یانە لەنێوان حیزبە دێموکرات و پێشکەوتنخوازەکاندا زۆر بێ.

**هەیاس کارەۆ:** لەنێو ڕێبەرانی حیزبی شیوعی‌دا چ کەسانێک ڕۆڵی سەرەکی‌یان بۆ سازکردن و بەردەوام ڕاگرتنی ئەو دۆستایەتی‌یە هەبووە؟ ئەی لەنێو حیزبی دێموکراتدا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێشتر گوتم سەرەتاکەی نازانم چۆن بووە. بەڵام لەو کاتەوە کە ئەمن لێی ئاگادارم دەتوانم بڵێم نەخشی ئەساسی بەکێ بووە. مەسەلەن بەکاک "عەزیز موحەممەد" بووە کە سکرتێر بوو. دوایە بەکاک "کەریم ئەحمەد" بووە کە ئەویش سکرتێر بووە. ئێستێ بەکاک "کەماڵ شاکر"ە کە سکرتێری حیزبی شیوعیی کوردستانە. بەڵام لەنێو ڕێبەرایەتیی حیزبی شیوعی‌دا بەڕاستی قەتم ناوێک نەبیستوە کە بڵێن پێی خۆش نیە ئەو ڕابیتە دۆستانەیەمان دەنێودا هەبێ. بۆیە ئەگەر نەخشی گەورەتر دەدەم بە یەکیان، زیاتر لەبەر

ئەوەیە کە بڵێین مەزهەری حیزبەکەیە، نوێنەری حیزبەکەیە کە عادەتەن سکرتێری گشتی‌یە یان ڕەئیس یان بەرپرس یان هەر ناوێکی دیکەی لەسەرە. لەنێو حیزبی دێموکراتی کوردستانیشدا دیسان ڕەنگە ئەوە تەئسیری هەبێ کە سکرتێر نەخشی زیاتری هەیە. بەڵام بەڕاستی دەنێو حیزبی دێموکراتیشدا قەتم لەبیر نیە کەسێک موخالەفەتی دەگەڵ دۆستایەتیی ئەو دوو حیزبە کردبێ. بەڵام مەعلوومە لێرەش نەخشی مەسەلەن دوکتور قاسملوو کە سکرتێر بووە دیارترە، یان ئی دکتور شەرەفکەندی کە سکرتێر بووە بەرچاوتر بووە. دیارە ئەمنیش وەختێکی سکرتێر بووم ئەو نەخشەم هەبووە.

**عەباس کاردۆ:** قەت وا هەبووە مەسەلەیەکی واتان بۆ بێتە پێش کە بۆ ماوەیەک دەگەڵ حیزبی شیووعی لێک دوور کەونەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە جالبە. ڕەنگە بەدەلیلی جوغرافیایی یان ئەمنییەتی پێوەندی‌یەکانمان ماوەیەک لێک دابڕابن یان تونتوتۆڵ و چالاک نەبووبێ بەڵام قەتم وەبیر نایە ئێمە ناخۆشی و ناکۆکیمان دەبەین‌دا بووبێ. ئەوە لەحاڵێک‌دا بوو کە ئەوان حیزبێکی کۆمۆنیستی بوون بەڵام ئێمە نەبووین. کەچی قەت ئێواتمان ناخۆش نەبووە. مەسەلەن لە بەینی یەکیەتی و حیزبی شیووعی‌دا شتی وا ڕووی داوە. بەینی پارتی و حیزبی شیووعی شتی وا ڕووی داوە. شەڕی تەبلیغاتی و تەنانەت یەکتر کوشتنیشیان دەنێوانیدا هەبووە. بەڵام ئێمە حەتتا بەتەبلیغاتیش دژی یەکتر نەدواوین. بۆ ئیستیسنا جارێکی کاک کەریم ئەحمەد وتارێکی نووسیبوو کە بەجۆرێک لەجۆران هێرشی بۆسەر "کورتەباسێک لەسەر سۆسیالیزم" تێدا بوو. ئەوەش قەت نەبوو بە باعیسی شێواندنی پێوەندی‌یەکانمان. وەکوو لێکدانەوەیەک سەیری کراو هیچی دیکە.

## گوازتنەوەی بنکەی ڕێبەری بۆ باشووری کوردستان

**هەیاس کاردۆ:** زۆر دوای گرتنەوەی جادەی سەردەشت-پیرانشار نەبوو کە حیزبی دێمۆکراتو دیارە لایەنەکانی دیکەش ناچار بوون بنکەی سەرکردایەتیی خۆیان بۆ بەشی باشووری کوردستان ڕاگوێزن کە لەژێر دەستی حکوومەتی بەعسدا بوو. پێت وایە ئەوە سەرەتای دوورکەوتنەوەیەکی بەردرێژ بوو کە پێوەندیی حیزبی دەگەڵ خەڵک بڕی؟ ئایا هیچ ڕێگا چارەیەکی دیکە نەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوانەی لە قەراغێ دانیشتوون وەکوو دەڵێن زەینیان ڕوونە. ئەوی لەشەڕێ نەبێ شێرە. لەپاش شەڕێ هەموو کەس قارەمانە. ئەوانە ئیستیلاحاتێکن کە گوتراون. ئەگەر تەماشای ئێران بکەین جوابی ئەو پرسیارەمان وەدەست دەکەوێ. دوای ئینقیلاب لە زۆربەی ئەو ناوچانەدا کە نەتەوە ژێردەستەکانیان لێ دەژین بزووتنەوەو ڕاپەڕین بۆ داخوازی نەتەوایەتی دەستی پێ کرد. تەنانەت لە ئازەربایجان کە گەورەترین نەتەوەی زۆرلێکراوی لێیە. بەڵام ماوەیەکی کەمی پێوە خرا کە هەموویان سەرکوت کران. مەسەلەن ئاغای شەریعەتمەداری مەجبوور بوو ئیعلانی ئینحیلالی حیزبەکەی بکا کە ئیددیعایان دەکرد ٣ میلیۆن ئەندامی هەیە. حیزبی دێمۆکرات قەت ئیددیعای وای نەکردوە کە بڵێ یەک میلیۆن ئەندامیشی هەیە. ڕەنگە ئیددیعای بەمیلیۆن لایەنگری کردبێ بەڵام بۆ ئەندام نەی کردوە. ئەوجار بۆماوەی چەند ساڵان تەواوی هێزی جمهووریی ئیسلامی لەسەر کوردستانو هێزە سیاسییەکانی کورد کۆ بۆتەوە کە دیسان باری هەرەقورس هەر لەسەر شانی حیزبی دێمۆکراتە. کەسێک پێی خۆشە یان یەکێک پێی ناخۆشە ئەوە حەقیقەتێکە. کەوایێ ئاکامی ئەوە کە ئەو ڕێگایەمان نەگرتبایە پێشێ چ دەبوو؟ دەبوو خۆکوژییەکی قارەمانانە بکەین کە ئەمن هەمیشە بەغەڵەتم زانیوە. هەر بۆوەی بڵێن قارەمانە خۆت بکوژی. حیزبەکەت لەبەین بچێ. یان گرتنەبەری ڕێگایەک کە دڵخواز نیە، بەڵام وەسیلەیەکە بۆ بەقاو دەوامو درێژەی تێکۆشانو خەباتەکە.

ڕەنگە لەو ڕێگایەوە پێوەندیی توندوتۆڵو گەرموگوڕی نێوان حیزبو خەڵک خەلەلی تێ کەوتبێ، ئەوە ڕاستە. بەڵام پێم وا نیە پێوەندیی حیزبی دێمۆکراتو هێزەکانی دیکەش دەگەڵ کۆمەڵانی خەڵک بەوە پچڕابێ. ئەو بەیانە کە ئەو ٤ تێکۆشەرە کوردەو تێکۆشەرێکی غەیرە کورد ئیعدام کران( مەبەست شەهید فەرزادی کەمانگەر، مەهدیی ئیسلامیان، فەرهادی وەکیلی، شیرینی عەلەم هولیو عەلیی حەیدەریانە کە ڕۆژی ١٩ی بانەمەڕی ١٣٨٩ی هەتاوی لەلایەن کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە ئیعدام کران. هەیاس)،

ڕۆژێکی لێرە سیمینارێکیان پێک‌هێنا بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو وەزعییەتە. یانی شەهیدکرانی ئەو ٥ تێکۆشەرەو لەپاشان ئەو حەرەکەتە ئیعتیرازییەی لە کوردستان وەڕێ خرا. ئەمن لەوێدا گوتم کە ئەوە هێندێک شتی نیشاندا. یەکێک لەوانە ئەوە بوو کە بەخیلافی هێندێک تەبلیغاتی ئەملاو ئەولا، ئێستاش ئەو هێزە سیاسی-یانەی کورد لەنێو خەڵکی کوردستاندا خاوەنی جێگەو پێگەی تایبەتیی خۆیانن. چونکی ئەگەر بە ناقیسیش بوو بە یەک دەنگ داوایان لە خەڵک کرد بێنە مەیدان و خەڵکیش بەدەنگیانەوە هاتن، ئەوە نیشانەی پێوەندی-یە. ئەگەر پێوەندی نەبێ، سەعات تەنەکە ناو بخۆنەوە کەس نالێ عاقیبەتتان بێ. کەوابێ ئەو پێوەندییە ڕەنگە لاواز بووبێ، گەرم گوڕییەکەی نەمابێ. بەڵام نەپچڕاوەو هەر بەردەوامە.

ئەگەر کورتی کەمەوە پێم وایە هاتنی ئەمدیوەمان نادڵخواز بوو، بەڵام ڕێگای دیکە نەمابوو. ئەگەر هێزە سیاسییەکانی کورد لەوێ هەر مابانەوەو تەعاتیانە پشتی جەبهە، بەتایبەت کە ئیدارەت هەبوو، مەقەڕاتت هەبوو، ئینتیشاراتت هەبوو، ڕادیۆت هەبوو، ئەوانەت هیچی تەدەما. دەبوو ببینە چەند سەعات پێشمەرگەیەکی چەک لەشان کە ڕەنگ بوو قارەمانەتی بنوێنن بەڵام پاش ماوەیەک بەرە بەرە لەبەین دەچوون. بێجگە لەوەی کە ماڵوێرانیی زیاتر بۆ خەڵکەکە دروست دەبوو. بەڵام ئەو حەرەکەتە ئەگەڵ ئەوەی کە دڵخواز نەبووە، کارێکی عاقڵانە بووە. ئەوە یەکەمجاریش نەبووەو هەر بۆ ئێمەش نەبووەو هەر لەنێو کوردیشدا نەبووە. زۆرجار بزووتنەوەیەک مەجبوور دەبێ بۆ ماوەیەک پاشەکشە بکا. پێم وایە قسەی کۆنفۆسیۆسە کە دەڵێ قارەمان ئەوە نیە قەت نەکەوێ، قارەمان ئەوەیە دوای هەموو کەوتنێک هەستێتەوە. بۆ حیزبی دێمۆکراتو بزووتنەوەی کوردیش وایە. ئێشکانو پاشەکشەی هەبووە، بەڵام مردنی نەبووە. چۆتە پێشێ، کشاوەتەوە، کەوتوە هەستاوەتەوە. لە خەباتێکی بەردرێژدا ئەوە شتێکی سروشتییە.

## کورتەباسێک لەسەر سۆسیالیزم

**هەیاس کاردۆ:** وا بزانم هەر لەجەنگەی ئەو پاشەکشانەدا بوو کە لە بەرنامەی کۆنگرەی شەش دا، لە چەرچێوەی کۆنگرەو دوای ئەویش، کێشەی "کورتە باسێک لەسەر سۆسیالیزم" هاتە گۆڕێ‌و بەو هۆیەش ژمارەیەک لە ئەندامانی حیزب یان ڕۆیشتن یان دەرکران. ئایا هێنانەگۆڕی ئەو باسە لەو سەردەمەدا پێویست بوو؟ قازانج‌و زەرەرەکانی بۆ حیزب‌و بزووتنەوە چی بوون؟ کەسانی ناسراوی موخالیف کێ بوون‌و بۆخۆت لەو بارەیەوە چۆنت بیر دەکردەوە؟

**عەبدوڵلا حەسەن‌زادە:** ئەوە باسێکە کە لەواقیعدا بۆتە بەشێک لە تاریخ. بەڵام ئەو باسە ئی کۆنگرەی شەش‌و دوای ئەو وەختێ کە هاتینە پشت سنوورەکان نەبوو. ئەو باسە لە کۆنفرانسی سێهەمی حیزبی دێمۆکراتدا دەستی پێ‌کرد. لە کۆنگرەی سێهەم بەردەوام بوو. لە کۆنگرەی چوارەم‌و لە کۆنگرەی پێنجەمیش هەڵ‌گیرسایەوە هەتا لە کۆنگرەی شەشەمدا بەو سیغەیە نووسرا کە دەنگی دایەوە. دەنا لە کۆنفرانسی سێهەم کە لەو کۆیەی کە ئێستا لێی دانیشتووین گیرا، ئەو باسە هەبوو. کەریمی حیسامی قسەیەکی کردو ئەمنیش قسەیەکم دەموقابیلدا کرد. گوتی سۆسیالیزم، دێمۆکراتیک‌و نادێمۆکراتیکی نیە. ئەگەر گوتت سۆسیالیزم، یانی هەموو شتێک، هەموو شتێکی تێدایە. ئەمنیش گوتم لە نێو مەلایان‌و موسوڵمانەکاندا دەیان‌گوت "ئەڵلا" یانی زاتی موستەجمیع بۆ جەمیعی سیفاتی کەماڵ. بەعیبارەت‌و کەلیماتی عەرەبی دەیان‌گوت. واتە ناوی "ئەڵلا" یانی زاتێک کە هەرچی سروشتی کەماڵ هەیە تێی‌دایە. گوتم ئەتۆ بۆچی سۆسیالیزم‌مان بۆ ئاوا لێ‌دەکەی؟ نەخێر سۆسیالیزم شتی باشیشی هەیەو شتی خراپیشی هەیە.

بەهەر حاڵ ئەووەڵەن مونتەکیری ئەو تێزەو ئەو فکرە خودی دوکتۆر قاسملوو بوو. دوکتۆر قاسملوو لە وڵاتانی ئورووپایی ژیابوو. لەنێو کوردی غەیری کۆمۆنیستدا هیچ کەس ئەوەندە شارەزای بیروباوەڕی سۆسیالیستی نەبوو، یان موتالەعاتی ئەوەندەی نەبوو. لە عەینی‌حاڵدا پیاوێکی ئازادەو ڕووناکبیر بوو، دەروێش‌سیفەت نەبوو. بە بێ‌شک ژیان لە ئورووپای غەربییش کە شتێکی بەناوی ئورۆکۆمۆنیزم تێدا هەبوو، شوێنەواری لەسەری دانابوو. حیزبی کۆمۆنیستی ئیتالیا بە دەرەجەی یەکەم دوایە حیزبی کۆمۆنیستی فەڕانسەو هێندێک لە ئەحزابی کۆمۆنیستی دیکەی ئورووپایی، ئەو فکرەیان هێنابووە گۆڕێ کە دەبێ حیزبە کۆمۆنیستەکان لەژێر هێژمۆنیی حیزبی کۆمۆنیستی ئیتتیحادی شووڕەوی بێنە دەرێ. لە عەینی‌حاڵدا لەو

شتەش کە پێیان دەگوت دیکتاتۆریی پرۆلیتاریا ناڕازی بوون. دوکتۆر قاسملوو لەو موەیتەدا ژیابوو. بۆیە لەمێژ بوو، یانی لە کۆنفرانسی سێیەمەوە کە ساڵی ١٩٧١ بەسترا هەتا دەگاتە کۆنگرەی شەشەم کە ساڵی ١٩٨٤گیرا، لە هەموو ئەو ماوەیەدا ئیدامەی هەبووە. بەڵام لەوێ‌دا بەو سیغەیە کە سۆسیالیزمی دێمۆکراتیکی لێ‌پەیدا بوو لە بەرنامەی حیزبدا جێگای کرایەوە ئەو ئامیلکەی کورتە باسەشی لێ هاتە دەرێ.

باسی ئەوە کرا کە سەرانی موخالیفی سۆسیالیزمی دێموکراتیک کێ بوون. ئەمن بۆخۆم لە ڕیزی موافیقانی‌دا بووم بۆ ئەوەی ئیدیعا بکەم تیئۆریسیەنی ئەو شتە بووم. لە موخالیفەکانیش ئەگەر لەسەرەتاوە پێدا بێین، ناوی کاک کەریمی حیسامی‌ و کاک حەمەدەمینی سیراجی بەرچاو دەکەون. دواتریش بەشێک لەوانەی هەتا ئێستاش لەڕیزی تێکۆشەراندان یان لەڕیزی ڕێبەراندا هەن. کاک حەسەنی ڕەستگارو کاک جەلیلی گادانی موخالیفی ئەوە بوون. لە کۆنگرەی شەش‌دا شتێکی خۆش گوزەرا. ئەگەر لەبیرم بێ بەعیتی مزۆ سەرهەنگ قادری بوو. ئەویش موخالیفی کورتەباس بوو. سەرهەنگ قادری گوتی ئەوانەی پشتیوانی لە سۆسیالیزمی دێمۆکراتیک دەکەن زۆریان لەبەر ناگاهی نیە. هەر لەبەر ئەوەیە دوکتۆر قاسملوو وا دەڵێ. ئەمن گوتم کاک سەرهەنگ ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە لەنێو لایەنگرانی هەر دووک بۆچوونەدا ئەو دوو دەستەیە هەن. هەم موافیقانو هەم موخالیفان. هێندێکیان بۆخۆیان ئەهلی نەزەر دەدەنو ئەزموونی خۆیانیان هەیە، هێندێکیشیان پەیڕەوی لە ئەزموونی کەسی دیکە دەکەن. بەڵام پێم ناڵێی بۆچی پەیڕەوی لە ئەزموونی فلان برادەر ئیفتیخارەو گوناح نیە، بەڵام پەیڕەوی لە ئەزموونی دوکتۆر قاسملووی گوناحە؟ باشە ئەتۆ پێت‌خۆشە پەیڕەوی لە ئەزموونی یەکێک بکەی، ئەمن پێم‌خۆشە پەیڕەوی لە بۆچوونی یەکێ دیکە بکەم، هیچیان تاوان نین. یانی لەبیرمە شتێکی ئاوا ئەو وەختی گوزەرا.

بەهەر حاڵ شتەکە ئەو وەختی نەهاتبووە پێش. ئێستا پاش چەندین ساڵ کە بەسەری‌دا تێ‌پەڕیوە، ڕەنگە بتوانین بڵێین ئەدەبیا ئەو مەسەلەیە ئاوا عومدە کرابایەوە. بەڵام بە باوەڕی من حیزبێکی سیاسی مەسائیلی خۆی نابێ وەک فارس دەڵێ "ماستمالی" بکا، یان وەک کورد دەڵێ دیزە بەدەرخۆنەی بکا. حیزبی سیاسی دەبێ لەسەر ئەو مەسەلانە ڕوون بێ. ئەگەر ئەمن بڵێم خراپ بوو، بە بارێکی دیکەدا دەڵێم خراپ بوو. حیزبی دێمۆکرات حیزبی ئیدئۆلۆژی نیە. حیزبێکی میللی - دێمۆکراتیکە. ئەدەبوو نوسوولەن بکەوێتە نێو ئەو کێشە فکری‌یانەی نێوان حیزبە کۆمۆنیستی‌یەکان. ڕەنگە لەو بارەیەوە ئیرادی پێ وارید بێ. دەنا ئەوە نابێتە دەلیل کە دە شۆڕش‌داین. خەڵکی دیکەش دە شۆڕش‌دانو مەسائیلی ئەزموونیش دێتە پێش.

خۆ دیارە لەسەر یەکیش دوایە دەرکەوت ئەو ئەزموونیە دروست بوو کە دوکتۆر قاسملوو هێنابووی. بەڵام خەڵکەکەی دیکەمان زۆری لێ‌نەدەزانی. داستانێکم لەبیرە. لەسەر جەنازەی دوکتۆر قاسملووی. برادەرێکمانم

دیتەوە -لەبەر دەلایلێک ناوی ناهێنم- کە هەرچەند موخالەفەتی دەگەڵ سۆسیالیزمی دێمۆکراتیک باعیس نەبوو خودا نەخواستە لەحیزب دەربکرێ، بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆر لە حیزب دوور کەوتەوە و یەکێک لە هۆیەکانی دوورکەوتنەوەشی ئەوە بوو. پاش جەنازەکە داوای کرد کە پێکەوە دانیشین. دیارە ئەودەمی و پێش ئەودەم دۆست بووین و ئێستاش هەر دۆستین و وا بزانم هەتا ماوین هەر دۆست دەبین. لەوێ گوتی پێمخۆشە لەوەی بەولاوە دەگەڵ حیزب هاوکاری بکەم. ئەمن ئینسانم دارو بەرد نیم. تاریخ سابیتی کرد کە لە ئیختیلافی من و حیزبی دێمۆکراتدا، حیزبی دێمۆکرات لەسەر حەق بووە. ئێستا تەنیا کۆسپی سەر ڕێگای هاوکاری‌یەکی چالاکانەی من ئەو دوو دەستەیی‌یەیە، کە ئەو وەختی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕمان هەبوو. ئەمن زۆرم سوپاس لێ کرد، دوایە گوتم هەرچەند ئەوە زۆر خۆشە، بەڵام دیسان گلەیی‌یەکم هەر لێت هەیە. گوتی چیە؟ گوتم ئەوە کە دەڵێی تاریخ ئیسپاتی کرد مەنزوورت ئەوەیە ئەو سیستەمە سۆسیالیستی‌یە غەڵەتە؟ گوتی بەڵێ وایە. دەی گوتم بۆ هەتا کوردێک ئەوەی دەگوت غەڵەت نەبوو، بەڵام ئێستا کە ڕووسێک دەڵێ قسەکەی قبووڵ دەکرێ؟

**هەیاس کاردۆ:** دەگوترێ دوای کۆنگرەی شەش ڕێبەرایەتیی حیزب ناڕازی‌یانی کورتەباسی ناچار دەکرد یان ئیمزا بکەن کە قبووڵیانە یان ڕیزەکانی حیزب بەجێ بێڵن. ئەوە ڕاستە؟ ئەگەر بەڵێ، بۆ ئەو کارە دەکرا؟ ئوسوولەن لە حیزبێکی دێمۆکراتدا چۆن دەبێ خەڵک ناچار بە شتی وا بکرێن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە ئەوە کەمێک موبالەغەی تێدایە، یان زۆری موبالەغە تێدایە. شتەکە ئەوە نەبوو. داواکە ئەوە بوو کە بابە ئەوە هەتا ئەو کاتەی ئەبیوو بە سیاسەتی حیزب جیدالێکی فکری بوو دەبەینماندا لەبەینی تێکۆشەرانی حیزبی دێمۆکراتدا. ئێستا کە بۆتە خەتی سیاسیی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان. ئێوە بیرو باوەڕەکەتان بۆخۆتان هەیە، بەڵام حەقتان نیە تەبلیغی لەسەر بکەن.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا موبالەغەکە دە کوێ‌دایە، ئەو پرسیارەش هەر وا دەڵێ. دەڵێ یان دەبێ قبووڵی بکەن یان بڕۆن.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا نەگوتراوە دەبێ بڕۆن. نەش‌گوتراوە دەبێ قبووڵی بکەن. بەڵام گوتراوە حەقتان نیە لەدژی بدوێن. بیر و باوەڕی خۆتە بەڵام حەقت نیە تەبلیغی بۆ بکەی. ئەو دووانە فەرقیان هەیە. ئەمن بۆخۆم لە دوای کۆنگرەی ١٠ شتێکی دیکەم هێنا کە ڕەنگە بیگەیێنێ باسی بکەین. دوێندا ئەوەم هێنا کە ئیجازە بە موخالیفان بدەین کە دەنێو حیزبدا موخالەفەتیشی دەگەڵ بکەن. تەبلیغیشی لەدژ بکەن لەو شتەی باوەڕیان پێی نیە. بەڵام ئەو وەختی ئەو ئەسڵە دە ئەساسنامەی حیزبدا نەبوو کە موخالیفی فکری حەقی هەبێ دەنێو

حیزبدا لەزیندی ئەوە قسە بکا. گوترا هەتا ئێستا لەنێو ئەندامانی حیزبدا ژمارەیەک ناوایان بیر دەکردەوە ژمارەیەک بەپێچەوانە کە ئەبوو بەختی حیزب. ئێستێ کە خەتی حیزبە، ئەتۆ کەیفی خۆتە قبووڵتە یان قبووڵت نیە، بەڵام حەقت نیە لەدژی بوەتی. ئەوان ئەوەیان قبووڵ نەبوو. ئەوان دەیانگوت لە دەرێ و لە ژووری لەزیندی تەبلیغ دەکەین. ئەو حەقەیان پێ نەدرا، بۆیە ژمارەیەک دەرکران. ئەوە ڕاستە.

**عەباس کاردۆ:** ئەتۆ ئەسڵەکەت قبووڵە یان ئەو بڕیارەت قبووڵە کە ئەو وەختی حیزب دای؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بڕیاری حیزب هەمیشە بۆ من ناوا بووە. ئەو وەختەی بڕیاری حیزب لەسەر شتێکی ئەدرێ، ئەندامی حیزب دەبێ پابەندی بێ. ئەو ڕۆژانە کە کێشەی لۆگۆی کورد کانالی هاتە پێشێ، ئەمن دەگەڵ یەکێک لە ڕەفیقانی زۆر عەزیزم قسەم کرد. گوتم باشە ئەو خەڵکە ئیعتیرازی هەیە بۆ نایهێننەوە سەر جێی خۆی؟ خەڵک ئیعتیرازی بەوەی هەیە ئێمەش تەلەڤیزیۆنمان بۆ ئەو خەڵکەی دەوێ. کە کەمێک کێشەمان بوو گوتی ئەتۆ وەختێکی دەتگوت نابێ ئاڵای کوردستانی دانێن کەچی ئێستا دەڵێی بۆ ئاڵای کوردستان لەسەر لۆگۆی کورد کانالی هەڵگیراوە. گوتم سیاسەتی من ئەیەدەمن نەگۆڕاوە. ئەو وەختی حیزبی دێمۆکرات بڕیاری نەبوو ئاڵای کوردستان دابنێ. حەقم بوو بڵێم مادام حیزب ئاڵا دانانێ، فەرد حەقی نیە دایبنێ. بەڵام ئێستا حیزب بڕیاری داوە ئاڵا دابنێ، کەوابوو ئەندامانی حیزب لەو جێگایانە کە پێویستە دەبێ ئاڵا دابنێن. گوتم سیاسەتی من هیچ نەگۆڕاوە. ئەوەی کە هەیە دەبێ دیفاعی لێ بکەین.

ئەمن بۆخۆم لە ناستانەی کۆنگرەی دەیەمدا لەسەر هێندێ مەسەلە ئیختیلافم دەگەڵ هاوڕێیانی دەفتەری سیاسی هەبوو. بەڵام حەقم نەبوو بێم لەنێو ئەندامانی حیزبدا تەبلیغ بۆ بیروڕای خۆم بکەم. دەیانگوت هەر لە دەفتەری سیاسیدا حەقت هەیە. قەناعەتم دەکرد. دەمگوت بابە کۆبوونەوەی دەکەین لە ساڵۆنێ قسەی خۆم بۆ خەڵکی دەکەم، دەیانگوت نا. مەجبوور بووم قبووڵی بکەم. خەتی حیزبی دێمۆکرات ئەو وەختە ئەوە بوو. کە وەختێک شتێک بۆتە بڕیاری حیزب، ئەندامان حەقیان نەبووە تەبلیغی لە دژ بکەن.

**عەباس کاردۆ:** بەڵام خودی ئەسڵی قانوونەکەت قبوڵ بووە یان نا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن دواتر هەوڵم داوە ئەوەی بگۆڕم.

**عەباس کاردۆ:** یانی ئەوە هەڵە بووە ئیدی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن نالێم هەڵە بووە. مادام بڕیاری حیزبە دەبێ پەیڕەوی لێبکرێ هەتا دەگۆڕێ. یانی ئەو وەختی ئەو ئەندامانە هیچ حەقیان نەبووە بچن تەبلیغ لە دژی سۆسیالیزمی دێمۆکراتیک

بکەن کە بۆتە بڕیاری حیزب. حیزبەکە ئەوەی بڕیار داوە، حیزبایەتی بۆخۆی ئوسوولی هەیە. ئازادی دەی-کەی یان نای کەی. بەڵام کە کردت دەبێ بەو جۆرەی بکەی کە حیزبایەتی‌یە. دەو وەختیدا وا بووە. لەپاشان کارم کردوە، هەوڵم داوە بۆ ئەوەی ئەوە بگۆڕێ. بەخۆشی‌یەوە هەوڵەکانم سەرکەوتنیشیان بەدەست هێناوە.

**هەیاس کارەۆ:** کەسایەتی‌یەکی ناسراوی ڕێبەرایەتیی حیزب کە ماوەیەکی زۆریش بوو دەنێو حیزبدا بوو، دوای کۆنگرەی شەش حیزبی جێ هێشتو دوایەش حیزبی دیکەی پێک هێنا. ئەو کەسە بەڕێز کاک ئەمیری قازی بوو. خۆت کاک ئەمیر چۆن دەناسی‌و داخوا دوورکەوتنەوەی ناوبراو چ زیانێکی بۆ حیزب بەدواوە بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن کاک ئەمیری قازی بە پیاوێکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەر دەزانم. ئەوە کە بۆ لە حیزب دوور کەوتەوە دەلایلی زۆری هەبوو. دە زۆر شتدا دەگەڵ خەتی سیاسیی حیزبی دێمۆکرات نەدەهاتەوە. لەواقیعدا کاک ئەمیر کە ئەمن ناوبشیم هێنا، یەکێک لە موخالیفانی کورتە باس بوو. بەڵام ئەو هەر لەبناغەڕا موخالیفی سەرسەختی هەموو جۆرە فکرێکی چەپو کۆمۆنیستی‌و سۆسیالیستی‌و مارکسیستی بوو. دەگەڵ خەتی ئەو کاتی حیزب نەدەهاتەوە، جا ئێستا ئەو خەتە دروست بووبێ یان غەڵەت. لەبەر ئەوە بێ-ئەوەی حیزبی دێمۆکرات دەری بکا بۆخۆی کشایەوەو ڕۆیشتە دەرێو دوایەش حیزبی خۆی پێک‌هێنا. ئەمن ئێستاش دۆستایەتیم دەگەڵی هەر گەرمەو ڕەنگە هەتا مارین هەر دۆست بین. بەڵام وەختی خۆی لەنێو حیزب-دا بیروباوەڕمان لێک جودا بوو.

## لە هەر باخچەی گوڵێک

**هیلاس کاردۆ:** هەر لە بنەماڵەی بەڕێزی قازی‌یەکان ئێمە کاک عەلی قازی(کوڕی ڕەش)مان هەیە. کاک عەلی کوڕی قازی موحەممەدە و حەق وابوو لەو حیزبەدا کاری کردبا کە بارکی دای‌مەزراند. نەک هەر ئەوە نەبوو، بگرە وا بزانم ماوەیەک حیزب دەگەڵی دە کێشەشدا بوو. دەکری باسێکی گشتی لەو بارەیەوە بکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەباوەڕی من کاک عەلی یان بڵێین کوڕی ڕەشاغا- مەعمولەن وایان پێ‌دەگوت- پێم وایە لە بەشە میراتی بابی خەتە سیاسی‌یەکەی بۆ نەماوەتەوە. ئەحوالی پێشەوا قازی هەرچی بووبێ بۆ منداڵەکانی بەجێ ماوە. بەڵام لەباری خەتی سیاسی‌و فکری‌یەوە ئەو هیچ وەختێک تێکۆشەری ڕێگای قازی موحەممەد نەبووە. ئەمن نالێم خائین بە ڕێگای قازی موحەممەد بووە، یان خائین بە ڕێگای کوردایەتی بووە. تۆمەتی خراپی لێ نادەم. بەڵام قەت لە تێکۆشەرانی حیزبی دێمۆکرات نەبووە. ئەوەش واجب نیە حەتمەن وابێ. ئەمن بۆخۆم منداڵەکانم هەموویان یان ئەندامی حیزبن یان لایەنگرن. بەڵام ئەمن پێم‌گوتوون ئەگەر لەبەر من دەبنە حیزبی، مەبن. ئەگەر باوەڕتان پێی هەیە ببنە دێمۆکرات دەنا چ حیزبێکتان پێ‌خۆشە ئەوی هەڵ-بژێرن. یانی کوڕی ئەندام یان ڕێبەری حیزبێک مەجبوور نیە حەتمەن ئەندامی ئەو حیزبە بێ. کاک عەلی قازیش قەت ئەوەی نەبووە.

ئەوەی کە ڕووی دا ڕەنگە بۆ خۆش نەبێ بێ. ئەگەر نەبایە باشتر بوو. بەڵام ئەوەش شتێک بوو کە بەداخەوە نەدەکرا نەبێ. چونکی کوڕی ڕەش پێی وابوو بەکوڕی قازی موحەممەد هەموو شتێکە. هەر وەک جارێک گوتبووی ئەمن دەچم لە سابلاغێ قسە بۆ خەڵکی دەکەم جا بزانم خەڵک منیان دەوێ یان قاسملوو. پێی وابوو خەڵک کە قاسملووی دەوێ تەنیا لەبەر ناوەکەیەتی. ئەویشیان لەبەر ناوەکەی دەوێ. بەڵام قاسملوو لەبەر خەتو ڕێبازو سیاسەتو کارو کردەوەی قبووڵ دەکرا نەک لەبەر ئەوەی کوڕی موحەممەد ئاغای وسووقە. کاک عەلیشیان بۆیە ناوێ کە کوڕی قازی موحەممەدە، لەبەر هۆی دیکەیە. دیارە لەبەر ئەوەی کوڕی قازی موحەممەدە لەلای هەمووومان حورمەتێکی هەیە، هەر وەک لەلای منیش هەر وایە.

بەڵام ئەو وەختی کاک عەلی چووبوو دەگەڵ دەوڵەتی عێراق ڕێک کەوتبوو. سیلاحی وەرگرتبوو کە بێ لە کوردستان شتێک وەڕێ بخا. شتەکەشی دیارە زیاتر لە موقابەلە دەگەڵ حیزبی دێمۆکراتدا بوو. ئەوە بوو کە حیزبی دێمۆکرات دەورەی لیدا و ئەفرادەکەی چەک کردن. لەپاشانیش بۆ ماوەیەک لەزینداندا ڕای گرت. ئەوە ئەگەر نەبایە خۆشتر بوو، بەڵام زەروورەت وای کرد کە ئەوە ڕوو بدا.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا پرسیار ئەوەیە حیزبی دێمۆکرات لەحاڵێکدا بۆخۆی پێوەندیی دەگەڵ عێراق هەبوو و کۆمەگیشی لێ وەردەگرت، چۆن بوو بۆ وی ئەو ڕێگایەی نەدەدا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** حیزبی دێمۆکرات قەت بە پێوەندیی هیچ هێزێکی سیاسیی دیکە دەگەڵ دەوڵەتی عێراق ئیعتیرازی نەکردوە. بەڵام دەوڵەتی عێراق پێی خۆش بوو دەگەڵ هەموو سەرۆک عەشیرەتێک بۆخۆی پێوەندی دامەزرێنێ. لەبەر ئەوە موخالیفی بووین. ئەوە ڕاستە. مەسەلەن حاڵەتی دیکەش هەبوون. با بریمان تازە نەکەینەوە کە خەڵکی دیکە چوون چەک و تەقەمەنی و شتیان لە دەوڵەتی عێراق وەرگرتوو حیزبی دێمۆکرات پێشی پێ گرتوون. ڕەنگە لەجێیەک حیزب دەستی نەڕۆیشتبێ، بەڵام موخالیفی ئەوە بووە خەڵک وەکوو تاک، وەکوو ڕەئیس عەشیرەو ئەوە پێوەندی بگرن. دەنا مەسەلەن سازمانە سیاسییەکانی دیکە پێوەندییان دەگەڵ دەوڵەتی عێراق هەبووە، لە کوردستانییەوە بگرە تا ئێرانی، حیزبی دێمۆکرات موخالەفەتی دەگەڵ هیچ کامێکیان نەکردوە. ئەویش کە چووبوو لەواقیعدا خەتەکەی ئەوە بوو کە وەک بەدیلی حیزبی دێمۆکرات بیکا. لەحاڵێکدا خۆی حیزبی نەبوو. یانی کاک عەلی خاوەنی حیزبێک نەبوو کە وەک حیزبێک بیکا. وەکوو خۆی چووبوو.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا مەلا شێخ عیززەددینیش حیزبی نەبوو، وەک شەخس دەی کرد و کەسیش پێشی نەدەگرت.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** مامۆستا شێخ عیززەددین لەواقیعدا پووشتی هێندێک سازمانی دیکە بوو. نەخێر ئەویش وا نەبوو. بۆخۆی مرتڵەق بۆخۆی نەبوو. بۆخۆی هیچ کەسی نەبوو. بەڵام وەکوو شەخسییەتێک ناسرابوو. ئەمن بۆخۆم لە عێراقییەکانم بیستوە کە گوتوویانە شێخ عیززەددین بۆمە گرنگە، لەحاڵێکدا دەزانین ئەو ئەفراتی نیەو براکەیەتی کە ئەفراتی هەیە. ئەمن هەر بۆخۆم لێم بیستوون.

**هیاس کاردۆ:** بنەماڵەی گەورەی قازی‌یەکان لەبواری جۆراوجۆردا خزمەتیان بە کورد کردوە، لەنێو ئەوان دا ئەدیبی بەتوانا، نووسەر، وەرگێڕو سیاسەتوانی نازاش هەڵکەوتوون. جەنابت هەتا چ ڕادەیەک دەگەڵ کەسایەتی‌یەکانی سەر بەو بنەماڵەیە ئاشنایەتیت هەبوە پێت خۆشە چی‌یان لەسەر بڵێی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بنەماڵەی قازی‌یان حەتتا پێش ئەوەی قازی موحەممەدیان تێدا هەڵکەوێ، بنەماڵەیەکی گەورە بوون. هەم موقتەدیر بوون، هەم خاوەن‌بەهرە بوون. بەهرەی جۆراوجۆریان هەبووە. مەسەلەن سەیفی قازی (سیف‌القضات). هەرچەند بەرهەمی شێعری کەمە بەڵام بە یەکێک لە پێشەنگانی شێعری موکریان دەناسرێ. پاشان خەت‌خۆشی باش، نەقاشی باش‌و ئەدیبی باشیان تێدا هەیە.

بەداخەوە فورسەت ڕێ نەکەوتوە ئەمن دەگەڵ زۆرانیان پێوەندیم هەبێ. بەڵام لەسەر یەک دەگەڵ ئەوانەی کە دەیان ناسم دەگەڵ هەموویان ئیحتیرامی موتەقابیلمان دەبەین‌دا هەبووە. ئێستێش ئەگەر لەوڵات بین پێم وایە دۆستایەتی‌و پێوەندیی بەربڵاومان دەبەین‌دا دەبێ. بەڵام ئەمن قاچاغم لە شاخی‌و ئەوان لە وڵات دەژین ڕەنگە گرتنی ئەو پێوەندی‌یە هێندە ئاسان نەبێ. غەیری چەند کەسێکیان کە لە دەرەوەی وڵاتن‌و عومدەتەنیش لە تێکۆشەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانن. پێم وایە غەیری کاک ئەمیرو کاک حەسەن، هەرچی قازی لەدەرێیە، بەجۆرێک دەگەڵ حیزبی دێموکراتە. دیارە کاک حەسەن دەگەڵ هیچ حیزبێک نیە.

**هیاس کاردۆ:** سەقامگیربوونی بنکە سیاسیەکانی حیزب لە خاکی باشووری کوردستان وەکی باوە دەڵێن بەرجەرە فەرهەنگی خۆخۆری‌و لەپشت‌سەردانی هێنایە ئاراوە. ئەو ڕەوتە دواتر وا پەرەگرتوو بوو کە "جەناحبازی" بوو بە سیاسەت. پرسیار ئەوەیە داخوا ڕێبەرایەتیی حیزب ئەوەی دەزانی؟ بۆ هەتا هات زیاتر پەرەتان بەو وەزعە دا؟!

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەش یەکێک لەو شتانەیە کە ئەمن دەگەڵ ئەو موتڵەق‌کردنەی نیم. لەبنی‌ڕا ئاوارەیی‌و دەربەدەری شتێکی خراپە، ئەمن ڕاستەوخۆ ئەم‌خوێندۆتەوە، بەڵام لە کەسی دیکەم بیستوە کە باوەڕم بەڕاستگۆیی‌یان هەیە، دەڵێن لێنین کە ڕێبەرێکی گەورەی دنیای سیاسەت بووە، موهاجەرەتی بە موهاجەرەتی لەعنەتی ناو بردوە. موهاجەرەت شتی زۆر خراپی هەیە. بەڵام بێ ئەوەی ئەو قسەیەی بیبەسم پێش ئەوە زۆر موخالیفی ئەوە بووم. پێم وایە بۆم باس کردی کە لە کۆنگرەی ٤ دا گوتم ١١ ساڵ لە عێراق بووم ئەگەر بە ١١ ساڵ عومر بۆم بشۆرێتەوە دەی‌شۆمەوە. کە لێرەش بووم پێش ئەو دەورەیەی، دەم‌گوت بۆ کوردی ئێران ئەوانەی جێگای هیوان بە دەرەجەی یەکەم ئەو کوردانەن کە تەنت عێراقیان نەدیوە. بەدەرەجەی دووهەم ئەو کوردانەن کە هاتوونە عێراق بەڵام نەکەوتوونە بنکەو مەقەڕاتەو شتی وا. بۆخۆیان ژیانی خۆیان ئیدامە داوە. بە دەرجەی هەزارەم ئێمەین. بۆخۆم تەزەوم لەسەر ئەوەی وا بووە.

بەڵام لەعەینی حاڵدا پێمخۆش نیە ئەو شتانە وا لێبکەین کە گۆیا دووبەرەکی تەنیا پاش ئەوە لە حیزبی دێمۆکراتدا ڕووی داوە. شتی وا نیە. ئەگەر تەماشا بکەین پێش ئەوەی دەربەدەر بین ، تەنیا بۆ ئەو مەرحەلەیە کە باسی دەکەین، ئیختیلافاتی بەینی چەپەکان و ڕاستەکانی ئەندامی حیزب تەنانەت لەنێو سلوولی زینداتیشدا دەبینین.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا خەتی فکری باس ناکەین.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** کوڕە خەتی فکری چی، شتی زۆر خراپی تێدا بوو. هەموو شتێک بۆ ئەوە نابێ زۆری لێک کەینەوە. لەپاشان ئەوە کۆمیتەی ئینقیلابی‌یە، ئەوە کۆمیتەی ساغ کەرەوەیە. ئەوە ڕێبەرایەتیی کاتیی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانە. ئەوە پەیڕەوانی کۆنگرەی چوارن. یانی ئەوانە لە دەربەدەری‌دا بوون؟ یانی با ئەوانە نەکەینە باعیس. دەربەدەربوون بۆخۆی خراپە. پێوەندیی‌بڕان دەگەڵ خەلکی بۆخۆی خراپە. هاتنە جێیەکی دیکە کە لەزۆر بارەوە پێت لەسەر عەرزی خۆت نیەو وەزنی خۆت لەدەست دەدەی. هەمووی خراپە. بەڵام با ئەوەی نەکەینە "مسبب‌الأسباب"ی هەموو شتێک. ئەدی مەسەلەن هەر لە باشووری کوردستان ئەو شەڕە عەزیمەی نێوان دوو هێزە گەورەکەی کوردستان لە دەربەدەری‌دا بوو؟ لە ئۆردووگانشینی‌دا بوو؟ ئەوە نیە لێرە لەسەر خاکی خۆیان حاکمن شەڕ دەکەن. شۆڕشگێڕانی فەلەستینی لەسەر خاکی خۆیانن کە بوونەتە چەند دەستە. لەنێو تێکۆشەرانی فەڕانسەیی‌و ئەڵمانی‌و نازانم چی‌دا قەت ناکۆکی نەهاتۆتە گۆڕێ؟ ئەو هەموو کێشەیەی نێوان یەکیەتیی نیشتمانی کە لەسەر خاکی خۆشیانن. حیزبی شیوعیی عێراق چەند جاری لەتبوون تێدا هەڵ کەوتوە. یانی لەخۆڕا کە دەمانەوێ شتێک ساز بکەین، شاخ‌و باڵی لێ دەنێین. جا تەبلیغاتیش وایە، ئەگەر خەلکەکە ئاگادار نەبێ دەتوانی کێچێک بکەیە گایەک‌و گایەک بکەی بە کێچێک. یانی ئەوە موبالەغەیە.

بەڵام دیارە کە پیاو دادەنیشێ‌و بێکار دەبێ، مەسەلێکی کوردی هەیە دەڵێ دەستی بەتاڵ کارگەی شەیتانە. کە هیچ نیە وەختی خۆی پێ پڕ بکاتەوە مەعموولەن ئەوانەشی لێ پەیدا دەبن. ئەوە کۆمەگ بە ڕەوتەکە دەکا. دەنا فکر ناکەمەوە ئەوانە هەموو لە دەربەدەری بن. پاشان ئەمن دەمەوێ بڵێم کە دەربەدەری‌یەکە ئاکامی شتێکی دیکەیە. مەسەلەن دەڵێن بۆیە پاسیفین چونکە دەربەدەرین. ئەخێر بۆیە دەربەدەرین چونکە ئیمکانی ئەوە نەبوو ئەو خەباتە چەکدارانە بەردرێژە ئیدامە بدەین. یانی گۆیا بەدڵخوازی خۆمان هاتووین سنوورەکانمان بەجێ هێشتووە لێرە موستەقەڕ بووین؟ دەگەڵ شانازیم بە بستەبستی خاکی کوردستانەوە، هەر ڕۆژێکی ئیمکان هەبێ حیزبی دێمۆکرات بگەڕێتەوە بۆ نێو ئەو وڵاتەی بەشوێنی

تێکۆشانی دەناسرێ، ئەگەر حەقتییەک تەئخیر بکا پێم وایە هەڵەیەکی زۆر گەورە دەکا. کەوابێ بە مەجبووری هاتووین خۆ دڵخواز نەبووە.

**عەباس کاریز:** کۆنگرەی حەوت تەنیا کۆنگرەیەک بوو کە دوکتۆر قاسملوو زۆرینەی دەنگەکانی تێدا هێنایەوە. بۆ وا بوو؟ جێی پرسیارە ناوبراو کە میشکی هەڵسووڕی حیزب بوو بۆ لە کۆنگرەکان دا کەمتری دەنگ دەهێنایەوە؟ ئەوە نیشانەی دێمۆکراتبوونی حیزب بوو یان هۆی دیکەی هەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نیشانەی دێمۆکراتبوونی حیزبیش هەیە چونکە خەڵک بەئازادی دەنگی خۆی دەدا. بەڵام نیشانەی شتێکی دیکەش هەیە کە بەداخەوە جارو بار هەموو کەس بە مەسئوولییەتەوە بڕیار نادا. نموونەیەک کە زۆرجارم گێڕاوەتەوە با لێرەدا بۆ تاریخ سەبتی بکەم. بۆ کۆنفڕانسی سێهەم هێندێک وردە کۆنفڕانسمان گرتن بۆ ئەوەی نوێنەر هەڵبژێرین. ئەوانەی شارەکانی باشووری کوردستان ئەمن و کاک مەلا ڕەسووڵی پێشنەمازیان لێ کرابووین بە مەسئوول کە ئەو کۆنفڕانسانە بگرین. هاتینە کۆیە بۆ ئەوەی کۆنفڕانسی لێرە بگرین. کۆنفڕانسەکەش چ بوو نازانم ١٢ کەس بوون یان ئەو بەرەکەی ١٥ نەفەر دەبوون کە هەر لەماڵی کاک مەلا ڕەسووڵی کۆبووینەوە کە ئەو وەختی ماڵی لێرە بوو. وا بزانم ٢ یان ٣ نوێنەریان هەڵ-دەبژارد، کە ڕەفیقەکانمان خوێندنەوە، - هێندێش لێک نێزیک بووین خەتی هەمواتمان دەناسی- یەکێک لە ڕەفیقەکان کوڕێکی زۆر باش بوو هەڵبژێرابوو. تەماشام کرد دەنگی هەموویانی هێنا بوو تەنیا ڕەئیی یەکێک لە ڕەفیقەکانی نەهێنابوو. کە کۆنفڕانس تەواو بوو و بڵاوەمان کرد، ئەوان چوونەوە ماڵەکانی خۆیان و ئەمنیش هەر لەماڵە کاک مەلا ڕەسووڵی دەنووستم. گوتم ئەرێ مەلا ڕەسووڵ ئەمن وام هەست کرد فڵانە کەس دەنگی بەو ڕەفیقەمان نەداوە. گوتی وەڵڵا ئەمنیش تێ گەیشتم. گوتم بۆ؟ گوتی نازانم. وەختی نوستنێ هات ئەمن لە دیوی میوانان نووستم ئەویش چۆوە دیوی خۆی. بەیانی هاتەوە گوتی حەلم کرد. گوتم چیت حەل کرد؟ گوتی مەسەلەی ئەو دوو برادەرە. گوتم چی بووە؟ گوتی دەڵێ ژنەکانیان بەشەڕ هاتوون. پاشی بەشەڕهاتنی ژنەکانیان دەبێتە باعیسی ئەوەی دەنگ بە یەکتری نەدەن. جا هەڵبژاردن جار و بار ئەوانەی تێدا هەیە.

دیارە کابرا حەقی هەیە دوکتۆر قاسملووی ناخۆش بوێ. خۆشویستنی سکرتێری حیزب لەسەر ئەندامانی حیزب واجب نیە. بەڵام ئەگەر بە مەسئوولییەتەوە دەنگ بدا، دەنگ بەو کەسە دەدا کە بۆ حیزبەکەی بە کەڵکترە جا با لەلای وی خوێنتاڵ و ناخۆشەویستیش بێ. ئینسانی ئاگا وا دەکا. مەسەلەن هەر لە کۆنفڕانسی ٣ کە هەر لێرە لەو کۆیەی گیرا، کاک دوکتۆر قاسملوو چەند ڕەئی لە دوای کاک کەریم حەدادەوە بوو. کاک کەریم یەکەم دەنگی هێنابوو، کاک دوکتۆر وا بزانم ٤، ٥ دەنگی کەمتر هێنابوو کە

دیارە ژمارەی دەنگدەرانیش هەر کەم بوو. دەلیلەکەی چی بوو. کاک کەریم دەستی دەڕۆیشت و چاکەی دەگەڵ خەڵکی دەکرد. دوکتور قاسملوو کە جەیی بوو ڕەنگە بەشێک بەو تاوانە ڕەئیان نەدابێتێ. یانی بەشێکی ئەوە نیشانەی ئەوە بوو کە لە کۆنگرەیەکی حیزبی‌دا هەموو ئەندامان سیرفەن بە هەڵسەنگاندنێکی سیاسی و تەشکیلاتی ڕەئی نادەن. خۆشەویستی، ناخۆشەویستی، دڵئێشان و شتی وا شوێنەوار دادەنێ.

**هەیاس کاردۆ:** دوای بەناکامنەگەیشتنی وتووێژەکانی کوردو دەوڵەت لەساڵی ٥٩-٥٨دا و پاش بڕیاری خەبات بۆ "ڕووخانی ڕێژیم" لە کۆنگرەی پێنجەم دا، حیزب هەروا بەدوای وتووێژ دەگەڵ ڕێژیم دا دەگەڕا. لەو ماوەیەدا چەند دانیشتنی دیکەش لێرولەوێ کران کە شتێکی وایان لێ پەیدا نەبوو. دەکرێ باسێک لەو بارەیەوە بکەی. دانیشتنەکان چۆن بوون، لەکوێ بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە تەرحی باسەکە بەو جۆرە هەرنەبێ باشە. حیزب قەت بەدوای وتووێژدا نەگەڕاوە. بەڵام حیزب لەبنی‌ڕا باوەڕی وا بووە ئێستێش هەر باوەڕی وایە کە مەسەلەی کوردستان بەڕێگای نیزامی‌دا چارەسەر ناکرێ. ئەوە بەو مانایەیە کە نە کورد دەتوانێ بەخۆی و چەند کلاشینکۆفێکەوە ڕێژیم بڕووخێنێ و مافەکانی خۆی دابین بکا، نە دەوڵەتەکانیش دەتوانن بەچەک و شەڕ میللەتی کورد وا لێ بکەن واز لە داخوازەکانی بێنێ. کەوابێ وتووێژ و ڕێگاچارەی ئاشتیخوازانە دروستترە. بۆیە حیزبی دێمۆکرات ئەو ئامادەیی‌یەی تێدا هەبووە کە هەر وەخت دەوڵەت ئامادە بێ بۆ وتووێژ و چارەسەری ئاشتیخوازانە، حیزب پێشوازیی لێ بکا. دەنا ئەوە نەبووە بەدوای‌دا بگەڕێ کە بۆ نایەی قسەم دەگەڵ بکەی. تەنانەت دەتوانم بڵێم لە شەهیدبوونی دوکتور قاسملوویەوە تا بڵێین چەند ساڵ ئەوە پێش - چونکە ماوەیەکە ئەو دەنگانە نابیستم - بەدەیان جار ئەو پەیامانە هاتوون کە با وتووێژ بکەین و ئەو شتانە. ئێمە تەنیا ئەوەندەمان گوتووە کە لەباری ئوسوولی‌یەوە ئامادەین، بەڵام هەموو پێشنیارێکی وانمان بۆ وتووێژی نهێنی ڕەت کردۆتەوە.

جا پێموایە لەو وەختەوە کە پێوەندی‌یەکان پچڕان هەتا داستانی ڤییەن یانی سەرەتای دەستپێکردنی وتووێژەکان نەک شەهیدبوونی دوکتور قاسملووی کە دەبێتە سەرەتای ساڵی ١٩٨٩ یانی ٣١ی دیسامبری ٨٨ و ١ی ژانویەی ٨٩ی، شتێک نەبووە ناوی لێ بنرێ وتووێژ. پێموایە پێشتر باسمان کرد کە دیدارێکی ئاوا هەبوو لە ئالانی سەردەشتێ کە ئەمن بۆخۆم تێی‌دا بەشدار بووم. بەڵام دەرکەوت بۆ وتووێژ نەهاتوون. هاتوون بۆ ئەوەی زیندانی‌یان بگۆڕینەوە. بەدوای دوو زیندانی‌دا دەگەڕان کە لەلای ئێمە نەبوون. لەئەنتیجەدا ئەوانیش ئەو وەختێ زیندانی‌یەکەی ئێمەیان ئازاد نەکرد و لەڕاستی‌دا کاک "عومەری قازی"یان بێ‌لەزەت کرد. قەلەچیان کرد و بەجارێک هیچیان پێ نەهێشت جا دوایە ئازادیان کرد. ئەوە هەموو قەزیەکە بوو و هیچ شتێکی دیکەمان بەناوی وتووێژ نەبووە.

**عەباس کاروان:** ئەدی لە دۆڵی دێمۆکراتو ئەوانە، یان لە ناوچەی مەهاباد دەیانگوت چاو پێکەوتن بووە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** تا ئەوەی مەنتەقەی مەهاباد هەر ئەوە بوو کە چەند جار تەماسیان گرتو لەبۆکانیش-ڕا هەر تەماسیان گرت. کەسانێکیان دەدیت، ئەوانیش دەهاتنە لای دەفتەری سیاسی. دەفتەری سیاسی ئوسوولەکەی باس دەکردو ئامادەییشی بۆ موزاکەرەیەکی ئوسوولی ڕادەگەیاند. ئەوە سەرەنجامەکەی بوو بەو دیدارەی لە پێتروشێن ڕوویدا. لەوێش دەرکەوت کە نەخێر ئەوانە نەهاتوون بۆ موزاکەرەیەکی جیددی. لەڕاستیدا ئەومیان کردۆتە بەهانە بۆ ئەوەی ئەو زیندانییانە بگۆڕنەوە. لەوێش ئێمە گوتمان ئەوانە لەلای مە نین، ڕەنگە ئەوەی کە ئەوانە بە زیندانییان دەزانن لە مەیدانی شەڕدا کوژرابن.

**عەباس کاروان:** پێتان وانەبوو ئەوە تاکتیکێک بوو بۆ لەبەریەک بڵاوکردنی ئێوە دەگەڵ موجاهیدین؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەومیان ئەمن بە ئیحتیمالێکی دوورتر دەزانم. چونکی ئێمە لەنێو شووڕای میللی موقاوەمەتدا شتێکمان نەبوو کە حەققی وتوویژ لەسەر مەسائیلی کوردستان لە ئێمە مەنع بکا. لە ئەساسنامەو ڕێککەوتننامەکانیدا شتێکی ئاوا نەبوو هەتا جمهووریی ئیسلامی ئەو ئیستیفادەیەی لێبکا. پێموایە هەدەفەکە هەر بەردانی ئەو دوو کەسە بوو کە وا دیار بوو دەبێ بۆ ئەوان موهیم بووبن.

**عەباس کاروان:** وابزانم دوای کۆنگرەی شەشەم جەنابت بووی بەجێگری سکرتێری گشتی. ئەزموونەکانی خۆت لەو بەرپرسایەتییەدا چۆن هەڵدەسەنگێنی؟ پێتوایە تێیدا سەرکەوتوو بووی؟ پێشتر کێ ئەو بەرپرسایەتییەی هەبوو؟ هەر لەم بەشەدا پێمخۆشە بپرسم کارکردنی ئاوا نێزیک دەگەڵ دوکتۆر قاسملوو ئاسان بوو یان چەتوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە جارێکی دیکەمان باس کرد. پێش کۆنگرەی شەشەم پۆستێک بەناوی جێگری سکرتێر نەبوو. بۆ ماوەیەکی کەم کە دوکتۆر قاسملوو لە عێراقڕا سەفەری کرد بۆ ئورووپایە، پێشنیاری کرد کاک کەریمی حیسامی لەجیاتی وی بەرپرسی کاروباری سیاسیو لەڕاستیدا بەرپرسی یەکەمی حیزب بێ. کە ئەوە بەسەریش چوو کاک کەریم بۆخۆی ناوی لێنابوو جێگری سکرتێر. جا بێ ئەوەی هیچ مەنسەبێکیشی هەبێ هەر بەو ناوە لە بەیرووتو ئەملاو ئەولا قسەی کردبوو. جارێکیش پێش کۆنگرەی پێنجەم دوکتۆر قاسملوو بەسەفەر دەچوو. ئەمنیش لە سەفەرێکی دیکە بووم. قەرار وابوو بگەڕێمەوە بۆ دەفتەری سیاسی بەڵام نەگەڕامەوە. کە هاتمەوە دوکتۆر قاسملوو ڕۆیشتبوو. لەوێدا کاغەزێکی بۆ نووسیووم بۆی بەجێ هێشتبووم. نووسیبووی پێمخۆش بوو بێیەوە کە نەهاتیەوەو ئەمنیش دەبوایە بەسەفەر بچمو یەکترمان نەدیت. شتی دیکەش ئەوەیە کە برادەران بەتێکڕای دەنگ دایان تا لەماوەی سەفەری مندا

ئەتۆ کارەکان بکەی. بەشۆخییش نووسیبووی ئەگەر ناویشی لێ دەنێی جێگری سکرتێر کەیفی خۆتە. یانی لەواقیعدا ئیشارەی بە کارەکەی کاک کەریمی حیسامی کردبوو. ئەمن ئەو ماوەیە ئەو پۆستەم بەکار هێنا. ماوەیەکی پێموایێ ٣ مانگی پێوە خرا هەتا دوکتۆر هاتەوە. بەڵام ئەوە پۆستێکی ڕەسمی نەبوو. ئەمن جێگری سکرتێر نەبووم، هەرچەند بەو ناوەیان ناو دەبردم. هەتا جارێکی لەبیرمە دوکتۆر سەعیدی ڕەحمەتی بەو ناوە بەنوێنەری هێزێکی سیاسیی ناساندم کە فڵانە کەس جێنشینی دەبیری کوللە. بەڵام ئەوە هەتا کۆنگرەی شەشەم عینوانێکی ڕەسمی نەبوو.

لەکۆنگرەی شەشەم ئەو پۆستە دانرا. ئەوجار کە کەوتینە ئینتیخاب بۆ جێگری سکرتێر دوو نەفەر کاندید بوون. دوکتۆر سەعیدو ئەمن. لە ئاکامی ڕەئی گیریدا دەنگی من پتر بوو ئەمن هەڵبژێرام بۆ جێگری سکرتێر. لە کۆنگرەی حەوتەمیشدا هەر ئەمن بووم. لە کۆنگرەی حەوت کە ئەمن بۆم باس کردی پێم خۆش نەبوو بیکەم و دوکتۆر قاسملوو دەلیلی هێنایەوە قبووڵم کرد. بەڵام نازانم ساڵێکی بەسەردا تێپەڕی یان زیاتر یان کەمتر، ئەمن لەو پۆستە ئیستیعفام کرد. بۆخۆشم چوومە لای دوکتۆر سەعیدو گوتم ئەمن ئیستیعفا دەکەم. تکام لێ کرد کە ئەگەر ئەتۆ کاندید کرای خۆت مەپارێزە. چونکی پێم وابوو ئەو لەهەمووان باشترە. ئیدی کە ئەو کاندید بوو کە دیارە کاندیدی واحیدیش بوو، بوو بەجێگری سکرتێر.

ئەوی دیکە مەسەلەکە هەم دوو بەش بوو هەم بەتایبەت پێمخۆشە بیکەمە دوو بەش. ئەوە کە هاوکاریی نیزیک دەگەڵ دوکتۆر قاسملووی چۆنە. ئەمن هاوکاریی نیزیکم دەگەڵ دوکتۆر قاسملووی هەر ئەو وەختە نەبووە کە جێگری سکرتێر بووم. پێش ئەوەش کە پۆستێک بەناوی جێگری سکرتێر هەبێ و ئەمن جێگر بم، تەنانەت لە وەختانێکدا کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییش نەبووم وەکوو چەند ساڵێکی پێش کۆنگرەی ٤ کە دوای کۆنگرەی ٣ ئیستیعفام کردبوو، هەر لە نیزیک دوکتۆر قاسملووی بووم و هاوکارییەکی نیزیکم دەگەڵی هەبوو. تەنانەت پێموایە بۆم باس کردی کە دەچووینە کۆنگرەی ٤، هیچکام لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی لە نووسینی ڕاپۆرتی کۆمیتەی مەرکەزیدا چووکترین کۆمەگێکیان نەکرد. لەحاڵێکدا ئەمن چەند بەشێکی ڕاپۆرتی پێسپاردم کە نووسیمن. یان پۆستی جێگری سکرتێرمان نەبوو کە ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی پێنجەم هەر سەرتاسەر ئەمن نووسیم. یانی ئەوەندە نیزیکیمان بووە. بۆیە کار کردن دەگەڵ دوکتۆر قاسملووی لەو بارەیەوە بۆ من تازە نەبوو.

لەسەر یەک کارکردن دەگەڵ دوکتۆر قاسملووی ئەگەر جارێک خۆش بووبێ و جارێک ناخۆش بووبێ، هەموو وەختێک ڕێگایەک بووە بۆ فێربوون. چونکی وەختێک وێک کەوتینەوە، نائێم ئەو هەموو شتێکی دەزانی و ئەمن هیچم نەدەزانی، چونکی ئەو دووانە هەر دووکیان ناسومکینن. بەڵام ئەو زۆر زۆری لە عالەمی

سیاسەت دەزانی‌و ئەمن کەم کەم. دوایەش ئەو هەر زۆر زۆری دەزانی‌و ئەمنیش ئەو کەم کەمە ئەمابوو‌و بۆخۆم شتێک فێر ببووم.

**هەیاس کاردۆ:** بەڵام ماموستا مەسەلە هەر مەسائیلی سیاسی نیە، مەنزوور بەرخوردی ڕۆژانەو گیروگرفتەکانی کە بەردەوام دێنە پێش.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** بەڵێ بەرخوردیشمان پێکەوە هەبووە تەنانەت پێشتریش هەر هەمان بووە. ڕەنگە بێ ئەدەبی بێ کە دەیڵێم بەڵام دەلیلم هەیە. ئەمن کە کتێبی "کوردستان‌و کورد"ی دوکتور قاسملووم تەرجەمە کردوە، لەسەر پێشنیاری من چەند شتی لێ گۆڕاون کە ئەمن پێم‌گوتوە بابە ئەمن لە کۆمەڵی کوردەواری‌دا ژیاوم ئەوەی ئەتۆ نووسیوتە وا نیە. ئەو وەختی زۆریش متمانەی بەمن نەبوو چونکی منی باش نەدەناسی. بەڵام باوەڕی بە ڕەحمەتیی هێمن هەبوو. داوەری‌یەکەمان دەبردە لای ماموستا هێمن‌و ئەو تەئییدی دەکرد کە ئەمن ڕاست دەکەم. چونکە ئەمن دەمێژ ئەو کۆمەڵەی‌دا پتر ژیابووم. ئەو لێی دوور بوو. یانی وەک عەرزم کردی ئەمن کەمم دەزانی‌و ئەو زۆر، بەڵام هەر دووکمان ئیستیفادەمان لێک کردوە. هەروەک هەموو ڕەفیقان کەلکیان لە زانیاریی دوکتور قاسملووی وەرگرتوە ئەویش ئیستیفادەی لەوان کردوە. با لەپەڕانتێزدا ئەوەی بگێڕمەوە. ڕەفیقێکی فارسی‌زمانمان هەبوو کە ناومان نابوو ڕەزا شیرازی‌و ئەتۆش دەیناسی. دەگەڵ ئەوەی نێوانمان زۆر خۆش بوو زۆر دۆست بووین، بەڵام جارێکی بە تەعنەوە گوتی هیچ لە حیزبی دیمۆکرات فێر نەبووم. مەبەستی ئەوە بوو حیزبی دیمۆکرات هیچی پێ نیە. گوتم ئەوە بەفکری خۆت باسی زیرەکیی خۆت دەکەی، بەڵام لەڕاستی‌دا باسی کەودەنیی خۆت دەکەی. هەر نموونەم هێنایەوە گوتم ڕەنگە دوکتور قاسملوو سەت ئەوەندەی من بزانێ، بەڵام ئەگەر هیچ لەمن فێر نەبووبێ زۆر کەودەنە، جا ئەتۆش ئەگەر بەقەت هەموو حیزبی دیمۆکرات بزانی کە نازانی، چەند ساڵە لەنێو حیزبی دیمۆکراتدا دەژی، ئەگەر هیچی لێ فێر نەبووبێ بەڕاستی کەودەنی. کەوابێ هەمووومان لێک فێر بووین.

لەباری جێگریی سکرتێرەوە وەک عەرزم کردی سەمیمییەتمان یەکجار زۆر بوو، بەڵام ئەمن لە هەموو ڕەفتاری وی وەک سکرتێرێک کە جێگرێکی لەژێر دەستدایەو حەق وایە پەروەردەی بکا، ڕازی نەبووم. شەرت نەبوو بۆ هەر جێیەکی دەچین پێکەوە بین. بەڵام جێگری سکرتێر بۆ ئەوەیە کە ئەگەر سکرتێر سەفەری کرد ئەو کارەکانی بۆ بکا. بۆیە جێگر دەبێ بەهەموو سەلاحییەتو لێزانینێکەوە دەجەرەیانی هەموو کارەکاندا بێ. ئەگەر خوای نەخواستە سکرتێر مرد، هەتا سکرتێر هەڵدەبژێردرێتەوە دەبێ جێگر هەموو کارەکانی سکرتێر ڕاپەڕێنێ. کەوابێ دەبێ لە پێگەیاندنی‌دا زۆر کۆمەگ بکا. لەو بارەیەوە ئەمن لە دوکتور قاسملووی ڕازی نەبووم‌و گلەییشم لێی هەبوو. مەسەلەن جاری وا بووە دەگەڵ خەبەرنێگارێک دانیشتووین، یان

کابرایەکی کە ئەمن زمانەکەی نازانم. لەسەدا نەوەدونۆی قسەکانیان بەو زمانە بووە کە ئەمن نەمدەزانی، جا یان ئینگلیسی بووە یان فەڕانسەیی. لەو ماوەیەدا ئەمن هەر وەک گونگرێک کە حاڵییش نابێ دانیشتووم. ڕاستە خۆ سکرتێر نابێ ببێتە موتەرجیمی جێگرەکەی، بەڵام بۆ جێگریش نابێ حەق وایە کارێکی وا بکا ئەو خەڵکەی لەوێ دانیشتوون لە کوللیاتی شتەکەی حاڵی بن. یان زۆر جاری وا هەبوو دەگەڵ ڕەفیقانی حیزبی مەسائیلێکی باس دەکرد، وا نەبوو لە منی بشارێتەوە، بەڵام داوای لە من نەدەکرد ئەتۆش وەرە دانیشە. ئەوە ئەگەر بۆ هێندێک کەس سوخەتڕانی دەکا قەیدێ ناکا. بەڵام ئەگەر کۆبوونەوەی حیزبی‌یە. حەق وایە هەتا ئەو جێیەی مومکینە سکرتێرو جێگر هەردووکیان بەشدار بن بۆ ئەوەی جێگریش لە جەرەیانی کارەکاندا هەبێ. واتە داخوا چ باس دەکرێ، چ بڕیارێک دەدرێ ئاگای لێی هەبێ.

ئەوە هەر دەگەڵ من وا نەبوو. نەک بفەرمووی خوا نەخواستە شتێکی دەگەڵ من هەیە. بە موبالەغە وا ناڵێم، بەڵام پێم وایە لەنێو حیزبی دێمۆکڕاتدا بەتێکڕا بی گری دوکتۆر قاسملوو لە دەفتەری سیاسی‌دا کەسی لەمن نیزیکتر بەخۆی نەدیوە. بەڵام شێوەی کارەکەی وا بوو. دەگەڵ دوکتۆر سەعیدیش هەر وا بوو. بۆیە وەختێک دوکتۆر قاسملوو شەهید بوو، دوکتۆر سەعید بەڕاستی کەوتە دنیایەکی تاریکەوە. زۆری ئاگا لە کارەکان نەبوو. ئەزموونەکانی لێ وەرنەگرتبوون. ئەوە زۆر خراپ بوو. ئەوە بڕێک باسی خۆمی تێدایە بەڵام لەبەر شانازیم بە زیرەکیی دوکتۆر سەعیدی دەی‌گێڕمەوە. ئەوەڵەن دوای شەهید بوونی دوکتۆر قاسملووی ئەمن بەیانێکم نووسی کە تێی‌دا گوتبووم هەتا هەڵبژاردنی سکرتێری تازە، جێگری سکرتێر هەموو کارەکانی سکرتێر بەڕێوە دەبا. گوتی دەبێ ئەوەی لابەری. گوتم چ لابەم ئەوە عورفی دنیایەیە. لە هەموو دنیایە وایە کە ڕەئیسێک دەمرێ پێش ناشتنی دەبێ مەعلووم بێ کێ لە جێگایەتی. بۆ دنیای دەرەوە دەبێ ئەوە مەعلووم بێ چۆن لای‌بەم. یانی دەواقیعدا ئەسڵێکی ئاوا ئەو لێی بێ‌خەبەر بوو بەڵام قبووڵی کرد. لەپاشان کە بەڕەسمی بوو بەسکرتێر، کۆنفرانسێکی چاپەمەنیمان پێک‌هێنا. بەزۆر ناردم دەنا نەدەچوو، گوتی ئەتۆش وەرە دانیشە ئەمن تەجرووبەی ئەو شەرەشەقەم نیە. عەینی ئەو کەلیمەیەشی بەکار هێنا. بۆیە لەپەنای دانیشتم و ئەگەر شتێک هەبایە مەشوەرەتێکمان دەکرد، ئەوجار جوابی دەدایەوە. تەنانەت لە بەشێکی‌دا ئەمن بوومە موتەرجیمیش چونکە عەرەبی بوو. مەبەستم ئەوەیە دوکتۆر قاسملوو لەو بارەیەوە زۆری کار نەدەکرد بۆ ئەوەی جێگری خۆی باش پەروەردە بکا. فێری فنوونی کارەکەی بکا. ڕەنگە ئەمن نەمتوانیبایە زمانی ئینگلیسی و فەڕانسەیی وا بەئاسانی فێر بم، چاوەڕوانیش نەبووم دەرسم پێ بڵێ. بەڵام شێوەی کارەکە، ئەوە کە چۆن کاران دەکا و سەوابیقی کارەکەی چۆنە لێی فێر دەبووم. لێشی هەر فێر بووم چونکی خۆ ئەوە نەبوو بڵێی لێم دەشارێتەوە. بەڵام لەپەروەریشی جێگری خۆی‌دا ئەو تەلاشەی نەدەکرد یە بێ ئەوەی بڵێم مەبەستی ئەوە بوو فێر نەبێ.

ئەمن پێم وایە جارێ دیکە گێڕاوومەتەوە لەبارەی نووسینەوە. ئەووەڵ جار کە دانیشتین پێکەوە لە دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی کوردستان مەقالەیەک بۆمن دانرا کە بینووسم. چوومە کن گوتم ڕێنوێنیم بکە. گوتی بۆخۆت بینووسە. گوتم ئاخر تەجرەبەم نیە، نازانم. کەمێک بە تووڕەییەوە گوتی بۆمن نەبوویە ئەندامی دەفتەری سیاسی. بۆخۆت بینووسە ئەدی بۆ بوویە ئەندامی دەفتەری سیاسی. لەدڵی خۆمدا هەزار کفرم کرد. گوتم نایەوێ فێر بم. بەناچار نووسیم و بۆم بردەوە، هێندێ دەسکاریی تێدا کرد و ڕێی دامەوە. بۆ وتاری دووهەمیش هەر چوومە لای و هەر بەوجۆرە ڕەفتاری لەگەڵ کردم. ئاخرەکەی تێ گەیشتم هەرچەند مێتۆدەکەی کەمێک بێبەزەییانە و ڕەق و زبر بوو، بەڵام مەبەستی ئەوە بوو فێر بم هەر چاوم لەوێ نەبێ.

**هێمن کاردۆ:** مامۆستا شتێکی دیکە لەسەر دوکتور قاسملووی کە دەڵێن پێی خۆش نەبوو کەسانی زۆر شارەزا لە دەوروبەری بن. بۆ ئەوەی شتێک کە ئەو دەیڵێ لێی بزانن. ئەوە ڕاستە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن ئەوەی زۆر بەتوندی ڕەت دەکەمەوە. دوکتور قاسملوو پێی خۆش بوو خەڵکێکی زۆر زیرەکی بەدەورەوە بن. زۆر حەزی لەوە دەکرد. یانی بەهیچ جۆر ئەزانپەرست نەبوو. ڕەنگە وەک هەموو ئینسانێک پێی خۆش بووبێ ئەزمراتی وی قبووڵ بکرێ. ئەمن پێموایە ئەو خەسڵەتە خراپ نیە کە یەکێک پێی خۆشە ئەزمراتی قبووڵ بکرێ. بۆ؟ ئەتۆ کە لەسەر مەسەلەیەک ئەزمرێکت هەیە ئەو ئەزمرەت پێ دروستە بۆیە پێتخۆشە ئەو شتە ڕاستە قبووڵ بکرێ. دوکتور قاسملوو ڕەنگە ئەوەی تێدا بووبێ. هەوڵیشی داوە بۆ بەرەوپێشبردنی ڕەئیی خۆی. بەڵام نە بە دیکتاتۆری سەپاندوویەتی و نە ئەوە بووە کە پێی خۆشبێ دەوروبەرەکەی نەزان بن. بۆیە قەدری ئەوانەی زۆر دەگرت کە شتێکی پێوە شک دەبردن. یانی جاری وا بوو نازی دەکێشان. ئەمن ئیدیعا ناکەم شتێکی زۆری پێوە شک بردووم بەڵام ئەو حەقەی بۆ قایل دەبم کە زۆر وەخت نازی کێشاوم. یانی هاتوە بەمرادەی لێپاڕانەوە لەبەرم پاڕاوەتەوە. ڕەنگە مابێتم دوای کۆنگرەی ٨ نامەیەکی بۆ نووسیبووم. ئەمن چووبووم لەکۆمیسیۆنی ماڵی کارێکم وەر گرتبوو. لەماڵ نەبووم کە چووبوو بۆ سەفەر. نامەیەکی بۆ بەجێ هێشتبووم کە دەڵێ غەدرێکی زۆر گەورەیە ئەتۆ لەو هەلومەرجەدا خۆت بەکارێکی لاوەکییەوە خەریک کەی. ئەتۆ دەبێ مەسئوولییەتی گەورەتر وەئەستۆ گری. جا پێم وایە نووسیبووشی ئەوە هەر بۆخۆم بۆت دەنووسم کەس ئاگای لێ نیە. کەیفی خۆتە چی دەکەی، بەڵام بۆ تاریخ پێت دەڵێم.

کە هاتمەوە نەغەدە دەگەڵ هاتنەوەی هێندێک میوانمان هەبوون کە منیشیان لەبەر میوانەکان دەعوەت کردبوو. لەوێ پرسیان ئەوە چی دەکا و هۆوە بەچییەوە سەرقاڵە. کە نۆرەی من هات گوتی وەڵڵا نازانم فلانە

کەس چ دەکا. ئەوە دەشی‌زانی ئەمن لە کۆمیسیۆنی ماڵی کار دەکەم. مەبەستی ئەوە بوو کە ئەو کارە نی من نیە. ئەویش گوتیان بەرپرسی چاپەمەنی‌یە. گەشایەوە، گوتی ئەگەر وایە خەبەرێکی خۆشە.

**هەیاس کاردۆ:** دوای کۆنگرەی حەوت کاک مستەفا شەڵماشی کە پێشتر ئەندامی دەفتەری سیاسی بوو دانیشت و ڕووی لە دەرەوە کرد. کاک جەلیل بە تەمەنێک خەبات و تێکۆشانەوە لە دەفتەری سیاسی کەوت و کەسانی تازەکار جێگایان گرتەوە. دیارە هەر بەدوای ئەو کۆنگرەیەدا بوو کە کەسانی دیکەش حیزبیان بە جێ هێشت. ئەوانە کاک خالیدی عەزیزی سکرتێری ئێستای حیزب، کاک تاهیری عەلیار و ... لەسەر ئەو ڕووداوانە، ئەوکات چۆنت بیر دەکردەوە و ئێستا دەڵێی چی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێموایە ئەوانە لە هیچ حیزبێک‌دا ڕووداوی سەیروسەمەرە نین. لەجێدا ئاڵ- وگۆڕی پۆست و ئەفەرەکان کە ئەمن هەوڵم داوە گۆڕینی سکرتێریش بکەمە ئیجباری، بەشتێکی موسبەت دەزانم.

**هەیاس کاردۆ:** ئەو کاتیش وات بیر دەکردەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هیچ‌وەختێک ئەمن هیچم بە کفر نەزانیوە. جارێ بۆخۆم تەقریبەن لە هەموو کۆنگرەکاندا هەوڵم داوە نەبم بە ئەندامی ڕێبەری. وەکی لە کۆنگرەی هەشتەمدا گوتم ئەمن قەت لە دوکتۆر قاسملووی نەپاڕاومەوە بم‌کاتە کۆمیتەی مەرکەزی. ئەوە دوکتۆر قاسملوو بووە تکای لە‌من کردوە خۆم کاندیدا بکەم. پێموایە جارێکی دیکەشم ئەوە باس کرد. لەپاشان بۆ خەڵکی دیکەش پێم وا بووە خۆ کفر نیە کەسێک لەو پۆستەی دەکەوێ و جێگایەکی دیکە پڕ دەکاتەوە.

بەڵام دیارە ئەوانەش دەلایلی خۆیان هەبوو. کاک مستەفای شەڵماشی هێندێک گیروگرفتی بنەماڵەیی هەبوون کە کۆمەگیان بەوە کرد بچێتە دەرێ. لەعەینی حاڵیش‌دا لە هێندێک بیروباوەڕی حیزبی‌دا لە باری سۆسیالیزمی دێمۆکراتیکەوە نەزەری جیاوازی هەبوو. دەنا خۆ کاک مستەفای شەڵماشی وەختی خۆشی لە حیزب دەر نەکراو ئەگەر بۆخۆی دووریی نەکردبایە کەس دووریی لێ‌نەدەکرد. کاک تاهیری عەلیار بە دەلیلێکی دیکە بوو کە پێم وا بوو پێویست نیە وا بکا. کاک تاهیری عەلیار لەبارەی شەڕی کۆمەڵەوە کەمتر لەمن تەفاوتی نەزەری هەبوو، چونکی ئەو ئاگای لێ نەبوو. ڕەنگە کاتێک ئەم قسانە بخوێنێتەوە بڵێ وا نیە. بەڵام ئەو ئاگای لێ نەبووە کە ئەمن لە دەفتەری سیاسی‌دا زۆر جار لە بارەی شەڕی کۆمەڵەوە نەزەراتم دەردەبڕی. ئەوەش نەک بڵێی کۆمەڵەی بەحەق بزانم و حیزبی دێمۆکرات بەناحەق. بەڵام لە هێندێک میتۆدی کاری خۆمان ناڕازی بووم و بەتوندییش قسەم دەکرد. بەڵام کاک تاهیر لە نەتیجەی ئەوەدا حیزبی

بەجێ هێشتو پاشان چوو موساحەبەیەکی زۆر توندی لەدژی حیزب دەگەڵ بڵاوکراوەیەکی غەیری حیزبی کرد. ئەمن کە دەنێو حیزبدا مەسائیلم هەبوو هەر لەوێدا باسم دەکرد، نەدەچووم لەملاو لەولا قسان بکەم. یانی پێموایە لەهەر حیزبێکدا کە دێموکراسی تێدا هەبێ حەتمەن ئەو ئاڵوگۆڕانە دەبن. جاری وایە هەر بەتەسادوفیشە. ئەتۆ تەماشا بکە لە وڵاتانی دێموکراتدا ئەو حیزبانە دێنو دەڕۆن یانی لە حکوومەت لادەچن. هەر ئەو حیزبانەن جارێکی دیکە خەڵک دەنگیان پێ دەداتەوە. ئەوە پیلانیش نیە. بەڵکوو ڕەنیی دێموکراتیکی خەڵکە.

ئەتۆ حەتمەن چاکت لەبیرە "جۆن هاوەرد"ی تێوە خەڵکە کە دەنگیان پێ نەدا گوتیان با چیهرەیەکی دیکە بێ ئەوە زۆر کۆن بووە. (جۆن هاوێرد سەرۆک وەزیری پێشووی ئوسترالیا لە حیزبی لیبراڵ بۆ ماوەی ١١ ساڵێو تێر ئەو پۆستەی پێ بوو کە لە هەڵبژاردنەکانی کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ی زایینیدا تەنانەت دەنگی پێویستی بۆ ئەندامەتی پارلمانیش نەهێنایەوە. هەیاس) هەر لەبەر ئەوەی دەڵێن بابە کۆن بووە با یەکی تازە بێ. یانی لە نیزامێکی دێموکراتیدا ئەوە شتێکی سەیروسەمەرە نیە. ڕەنگە هێندێک سەبەب کۆمەگ بکەن بۆ ئەوەی. حەتمەن هێندێک سەبەب دێنە پێشێ. هەر ئێ حیزبەکان کە لە حکوومەت دەگۆڕێن. هێندێک نارەزایەتی دێنە پێشێ و ئۆپۆزیسیۆن هێندێک کار دەکا بۆ ئەوەی ئەو حیزبە سەر نەکەوێ. چونکی ئیرادگرتن لە کارکردن زۆر ئاسانترە. بەڵام لەسەر یەک ئەوە نە نیشانەی دوژمنایەتییەو نە پیلانەو نە هیچ.

**هەیاس کاردۆ:** بە مەسەلەی کاک تاهیری وەبیرم هاتەوە کە کاک ئیلیی عەلیزادە لە کتێبەکەیدا دەڵێ ئێمە دەگەڵ حیزبی دێموکرات گەیشتبووینە تەوافوقێک کە شەڕ ڕابگیرێ بە هاوکاریی ٦ جەرمیانەکە. بەڵام دوکتور قاسملوو کە لە دەرەوە بوو ڕای گرتەو کە هاتەوە نەیهێشت سەر بگرێ، یانی وای دەر دەخا کە دوکتور قاسملوو موخالیفی سەرسەختی بەیەک گەیشتن بووە. ئەوە هەتا چەند ڕاستە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دوکتور قاسملوو قەت موخالیفی سەرسەختی بەیەک گەیشتن نەبووە. موخالیفی سەرسەختی ڕاگرتنی شەڕیش نەبووە. بەڵام بەداخەوە دوکتور قاسملوو پێداگر بوو لەسەر ئەو شتەی کە ئەمن ئەو وەختیش موخالەفەتم دەگەڵ کردو ئێستێش هەر موخالیفی هەم. دەی کردە شەرت کە کۆمەڵە دەبێ ئیعتیراف بکا حیزبی دێموکراتی کوردستان شۆڕشگێڕە. ئەوەی تێدا بوو. تەنانەت بە باوەڕی من بۆ حیزبی دێموکرات کەمایەسییە کە خۆی بە موحتاجی ئەوە بزانێ هێزێکی سیاسی دیکە بە شۆڕشگێڕی لەقەڵەم بدا. ئەگەر باوەڕت بە شۆڕشگێڕبوونی خۆت نیە بۆ داوا لەخەڵک دەکەی؟ ئەگەر باوەڕت بەخۆت هەیە کە پێم وایە باوەڕمان پێی هەبووە، خۆ شۆڕشگێڕبوون شتێکی سەیروسەمەرە نیە کە قابیلی دەرک نەبێ، کەوابێ بۆ داوا لە لایەنێکی دیکە بکەین. لەپاشان داوایەکی نادێموکراتیکە. یانی ئەگەر دەمانەوێ پێکەوە تەعامول

بکەین، گرنگ ئەوەیە ڕەفتاری سیاسیمان دەرحەقی یەک چۆنە. هەروەک لە جێگایەکی دیکە گوتم هیچ ئەندامێکی حیزبی مەجبوور نیە سکرتێری خۆش بوێ. مەجبوور نیە کۆمیتەی ناوەندیی خۆش بوێ، بەڵام حیزبەکە چ سیاسەتێکی هەبێ دەبێ پەیڕەوی بەرێ. ئەوە بۆ دۆستیش هەروایە، بۆ هاوپەیمانەکەش هەروایە. خۆ ئەو مەجبوور نیە عاشقت بێ.

ئەمن دەڵێم دوکتۆر قاسملوو موخالیفی شەڕ بوو. حەتتا موخالیفی شەڕ دەگەڵ جمهووریی ئیسلامییش بوو. بەڕادەیەک موخالیفی شەڕ دەگەڵ جمهووریی ئیسلامی بوو کە سەری لەسەر سوڵح دانا. جا چۆن دوکتۆر قاسملوو موخالیفی ڕاگرتنی شەڕ دەگەڵ کۆمەڵە دەبێ؟ ئێستا کە باسی ئەوەی دەکەین، با حادیسەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە دوکتۆر قاسملوو لەبارەی شەڕی کۆمەڵەوە ئەزەری چۆن بوو. بەداخەوە ئەمن تاریخەکان لەبیر دەکەم، بەڵام پێموایە ساڵی ١٣٦٠ بوو کە ناکۆکی لە نێوان کۆمەڵەو حیزبی دێمۆکراتدا هەبوو. لە مەنتەقەی ڕەبەتێ دێی سیسێرێ بەپایەگای کۆمەڵە دەناسرا. هەم بەشێکی زۆر لە لاوەکانیان ببوون بە ئەندام لایەنگری کۆمەڵەو هەم مەقەڕێکی گەورەیان لەوێ دانابوو. خەبەر هات کە پێشمەرگەی حیزب دەوری سیسێرێیان داوە -لە دێیەکانی دیکەشڕا وایان کردبوو کە هەموویان لەوێ خڕ ببنەوە- دەوریان داوە دەیانەوێ کۆمەڵە تەسلیم ببێ. دوکتۆر قاسملوو نایێ بڵێم توووڕە بوو، دەبێ بڵێم ئاوری گرت. لەدین دەرچوو یان هەر تەعبیرێکی لەو بابەتە کە بەکاری بێنی. گوتی هەرچی لەتواناما‌دا هەیە دەیکەم ئەگەر هەر ئێستا ئەو گەمارۆیە نەشکێ. گوتی یانی هێزێکی ئێشتیمانپەروەر لە ناوچەیەکی ئاوادا دێیەکی پێ ڕەوا نابینێ؟ بۆیە دەستبەجێ دەفتەری سیاسی دەستووری دا کە موحاسەرەی سیسێرێ بشکێ. کەسێک کە لایەنگری شەڕ بێ‌و ئاوا بێڕەحم بێ شتی وا ناکا. باوەڕ بکە هەڕەشەی نەکرد بەڵام ئەگەر لێی قبووڵ نەکرابایە لەوانە بوو لەپۆستی سکرتێری ئیستیعفا بکاو زیاتریش. چونکە ئەوەندە پێی توووڕە بوو.

**هەیاس کاردۆ:** هەر سەروبەندی دوای کۆنگرەی ٧ بوو کە ئەمر کاک سەید ڕەسووڵی دێهقان(سەید ڕەسووی بابی گەورە) حیزبی جێ هێشتو لە ڕێگای ئەویشەوە خەڵکێک بەرێ کرانە دەروە. ئاوبراو بۆ ڕۆیشتو هۆی چی بوو دەستی بەو کارە کرد؟ ئەگەر دەکرێ بفەرمووی کەی‌و چۆن شەهید کرا.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێموابێ ساڵی ١٣٦٥ بوو کە کاک سەید ڕەسووڵ حیزبی بەجێ‌هێشت چونکی کۆنگرە ٦٤ی گیرا. ئەمن قەزاوەت لەسەر ئەو شتانە دەکەم کە دەیانبینمو دەیانبیسم. وەکی گوتم ئەمن جێگری سکرتێر بوومو دوکتۆریش بەسەفەر چووبوو. کە ئەو باسە کرا، لەدووم نارد هاتە سکرتاریا. هەرچی ئەمن هێنامو بردم کە بۆچی دادەنیشی، تەنیا دەلیلی هێنایەوە هەر ئەوە بوو کە گیروگرفتی ماڵیم هەیەو پێم-خۆشە مندالەکانم ژیانێکی باشتریان بەنسیب بێ‌و ئەو یارمەتی‌یەی لە حیزبی وەردەگرم بەشم ناکا. ڕاستیشی

دەکرد. چونکی پیاوێکی زۆر بەدەستوودڵ بوو. میوانداریی زۆر دەکردو پێشی خۆش بوو منداڵەکانی بەنازو نیعمەتێکی زیاتر بژین و ئەوانە. ساڵەکانی پێشتریش کە یارمەتییەکی کەمی لەحیزب وەردەگرت - یانی پێش ڕووخانی ڕژێمی شای - ئەو دەستی تەبابەتی هەبوو، یارمەتییە سەرەتاییەکانی دەرمانی زۆر باش دەزانی و زیانی خۆی لێ تەئمین دەکرد.

ئەمن گوتم باشە ئەگەر هەر ئەوەی دەکەی، تکات لێدەکەم ئەتۆ مەڕۆ لە حیزب ئیستیعفا مەکە. ئەو وەختی سیستمێکمان هەبوو کە هەموو تێکۆشەرانی حیزب یارمەتییان هەبوو وەک یەک. بەڵام ئەو کەسانە کە کارو تێکۆشانێکی زۆریان هەبایە، شتێکیان وەک "فوق‌العادە" دەدرایە. ئەو لەوانە بوو کە هەردووکی وەردەگرتن. گوتم ئەتۆ لەحیزب مەکشێوە، بڕۆ کاروکاسبیی خۆت بکە. هەتا ئەو وەختەی بۆخۆت دەڵێی دەوڵەمەند بووی و ئیحتیاجم نەماوە، ئەمن قەول دەدەم کە هەم یارمەتییەکەت بدرێتێ و هەم فوق‌العادەکەت بدرێتێ. دیسانەکە ئیسراری کرد کە ئەوەی ناکەم و لەحیزب دەڕۆم. هیچ دەلیلێکی دیکەی نەهێنایەوە. لەدڵی خۆیدا چ گوزەراوە، یان لەمەلاولەولا چیی گوتوە ئەمن حیساب لەسەر ئەوانە ناکەم.

**عەباس کاردۆ:** یانی مامۆستا ئێوە پێشتر لەوە ئاگادار نەبوون کە سەید ڕەسووڵ لەحیزب ناڕازییە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** تا ئەو وەختەی شتی ئاوا نەبووە. مەسەلەن هەر ئەوەی نیسبەتی دەدەن بە دوکتور قاسملووی، هەم دوکتور زۆری ڕێز لێدەگرت و هەم ئەویش زۆری ڕێز لە دوکتور قاسملووی دەگرت. ئەوانە هیچیان نەبوون. بەختێکی ڕۆیی دوکتور قاسملوو هەر لەماڵ نەبوو، لەسەفەر بوو.

لەدوایێش کە ڕۆیی بەداخەوە ئەوە حەقیقەتێکە، کاک سەید ڕەسووڵ نەچوو لە"سەقز"ی دانیشێ کاسبی بکا.(سەقز گوندێکی چۆڵکراوی باشووری کوردستان بوو کە ئەوکات بازاڕێکی گەورەی لێ بوو. عەباس) ئەو هەوڵی وای نیشاندا کە دەچێ کاسبی دەکا. بۆخۆی ڕۆیی بۆ نێو دەوڵەتی عێراق و ئەوە کە ئیرتیباتی دەگەڵ چ دەزگایەکی دەوڵەتیی هەبوو وەزیفەی من نیە باسی بکەم. ئیدی ئەوەی دەست پێ کردو دەوریدا بوو. وا بزانم چەند کەسێکیش لەڕێگای ئەوەوە ڕۆیشتنە دەرێ کە پێم وایە یەکیان کاک تاهیری عەلیار بوو. بۆ یەک، دوو کەسێک کۆمەگێکی جوزئیی لەدەست هاتوە بەڵام خۆ وا نەبوو بڵێی ئاژانسی موسافیرەتی داناوە ڕۆژێ هەر خەڵکی بەڕێ دەکا. چونکی شتی وا هەر مومکین نەبوو. نە بۆ وی و نە بۆ هیچ کەسی دیکە. بەڵام ڕەنگە کۆمەگی بەچەند کەسێک کردبێ. بەهەرحاڵ ئەمە تاوان نیە.

دەمێنێتەوە مەسەلەی شەهیدبوونەکەی. ئەوەندەی مەعلوومە ئەو وەختی هەموو کەس پێیزانی، ئەو کاتی ماڵی لە سلێمانی بوو، یانی مەنزڵەکەی لەوێ بوو. لە نیزیک مەنزڵەکەی مەقەڕێکی چەکدارەکانی دەوڵەت هەبوو ئەوەی بیلامانێ پێیان دەگوتن جاش یان فورسان. ئەو ئاشنایەتی دەگەڵ کەسانی ئەو مەقەڕە هەبوو. ئەو

وەختی بۆ هەموان ڕوون بوو کە هەر ئەو کەسانە چوون بانگیان کردۆتە دەرێ، ئەویش کە ناسیونی بەدەنگیانەوە چۆتە بەر دەرگاو لەوێ کوشتوویانە. زۆر کەس و حەتتا کوڕەکەی خۆی نیسبەتی ئەو قەتڵەی دەدەن بە دوکتۆر قاسملووی. نە دوکتۆر قاسملوو و نە هیچ کەس لە حیزبی دێمۆکرات - لانی کەم لە ڕێبەرایەتیی حیزب - ئێستێ و ئێستێش ناوی ئەو کەسانە نازانن کە تەقەیان لە کاک سەید ڕەسووی بابی گەورە کرد. بەهیچ جۆر. هەر ئەوەندە دەزانین کە شتێکی ئاوا بووە. پێموایە هیچ یەک لە ڕێبەرانی حیزبی دێمۆکرات نە ماڵەکەی سەید ڕەسووڵی پێ‌زانیوە نە ئەو مەقەڕەی پێ‌زانیوە.

پاشان ئەمن شاهیدی حاڵەتێکی جالب بووم. دەگەڵ کاک دوکتۆر قاسملووی بەسەفەر دەچووین. نازانم هەر دووکمان قەرار بوو پێکەوە بچینە دەرێ یان نا، بەڵام لانی کەم هەتا بەغدایە پێکەوە بووین. ئەو ڕۆژەی دەڕۆیشتین لە کەرکووکێ دەعوەتیان بۆ دوکتۆر قاسملووی ساز کردبوو، یانی میوانی موخابەرات بووین. مەسئوولی بەشی پێوەندی دەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی باسەکەی کێشایە سەر مەرحوومی سەید ڕەسووی بابی گەورە. پیاوەکە ناوی ئەبوومێژەر بوو. گوتی خەڵک دەڵێن سەید ڕەسووڵ یان ئەبوومێژەر کوشتوویەتی یان دوکتۆر قاسملوو. دوکتۆر قاسملوو دەقاودەق ئەو جوملەیەی گوت. گوتی: هیچ کەس ناڵێ قاسملوو کوشتوویەتی. هەموو کەس دەزانێ قاسملوو پیاوکوژ نیە. کابرا بە نیشانەی ڕەزایەت پێ کەنی. یانی ئەوان کوشتوویانە. دیارە ئەوانەی کوشتیان چەکداری کوردەی عێراقی بوون. ئەویش مەسئوولی موخابەرات بوو. وا دیار بوو ئەو دەستووری داوە کوشتوویانە.

هەیاس: باشە قازانجی دەوڵەتی عێراقێ دەکوشتنی ویدا چ بووە مامۆستا؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن ڕەنگە دە مەحکەمەدا ئەوەم بۆ سابیت نەبێ، چونکی نە دەوڵەتی عێراق ماوە نە بەڵگەکان ماون. بەڵام ئەو پیاوە دە موخابەراتدا بوو، بۆ من وا دەرکەوت. یانی تێگەیشتنی من ئەوەیە. وەختێکی کاک سەید ڕەسووڵ لە حیزب چۆتە دەرێ تەماسی دەگەڵ گرتوون کە بەجۆرێک هاوکاری‌یان دەگەڵ بکا. ئەوان قبووڵیان نەکردوە. کە قبووڵیان نەکردبوو دەلیلی هەبوو. جارێکی لەسەر کەسێکی ئێمە کاریان کردبوو. بۆ ئێمە دەرکەوت کە ئەو کەسەیان لەسەر مە کردۆتە جاسووس هەر لەنێو خۆماندا. ئەو کەسە سزا دراو دەرکرا. هەر بۆخۆم حوزووری دەگەڵ بووم کە دوکتۆر قاسملوو پێی گوتن خەڵکی بۆ لەسەر ئێمە دەکەنە جاسووس؟ چیتان لەسەر حیزبی دێمۆکرات دەوێ ئەمن لە هەموو کەس باشتر دەزانم. وەرن داوا لەمن بکەن با پێتان بڵێم. دەنا بۆ خەڵکمان لەسەر دەکەنە جاسووس؟ زمانیان تێکەڵ‌پێکەڵ کرد، گوتیان ئەوە هەڵەیەکی شەخسی بووە دەنا ئێمە چۆن کار لەسەر ئێوە دەکەین. ئێمە شانازیی بە دۆستایەتیی ئێوەوە دەکەین و ئەو قسانە. جا چونکی دەیان زانی کاک سەید ڕەسووڵ هەمیشە دەگەڵ ئێمە بووە و لە ڕێبەرایەتییشدا بووە،

کە چووە پێیان وابووە حیزب ناردوویەتی. بۆیە ئەوان قبوولیان نەکردووە هاوکاریی دەگەڵ بکەن. لەبەر ئەوە چووبوو دەگەڵ ئیستیخباراتی ئەرتەشی عێراق هاوکاریی دەکرد. ئەو خەڵکەشی کە بەرێ کردوە دەبێ تەلەقەیەکی پێوەندیی بووبێ دەنا لەخۆڕا بۆی ناکرێ. یانی پێوەندییەکەی دەگەڵ دەوڵەتی عێراق لە ڕێگای ئیستیخباراتەوە بووە. ئەو دەزگا جاسووسییانەش لە هەموو دنیادا بەسەر یەکترەوە ڕەقیبن. ئەسڵەن دروستیان دەکەن بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر یەکتر کۆ بکەنەوە چونکی دەوڵەتەکان متمانەیان پێ ناکەن. ئەسڵەن دەزگای تەجەسسوس بۆخۆی لەسەر بەدگومانی دانراوە. مەسەلەن دەڵێن ئیتتیلاعات و زیندی ئیتتیلاعات. هەردووکیان نی دەوڵەتن.

عێراق ٤ دەزگای ئەمنییەتیی هەبوو. یەکیان پێیان دەگوت ئەمن، هەمان سازمانی ئەمنییەتی ئێران. یەکێکیان موخابەرات بوو کە دەزگایەکی تەجەسسوسیی سەر بە ڕەئیسجمهوور بوو. گۆیا بۆ کاروباری دەرەوە بوو بەڵام دەرەوەی چی. لە ژوورەوەش بەدەیان جارو هەزاران جار خەڵکیان دەگرتو موحاسەبەیان دەکردو سزایان دەدا. یەکێکیان ئیستیخباراتی جەیش بوو کە هی ئەرتەش بوو. دەتوانم بڵێم لە هەمووشیان کاریگەرتر دەزگای ئەمنی حیزبی بوو. یانی حیزبی بەعسیش سەرباقیی هەمووی ئەوانە دەزگایەکی ئەمنی هەبوو کە هەموویانی کۆنترۆڵ دەکرد. ئەمن بۆخۆم ٢ جار لە بەغدا بەهۆی ئەمنی بەعس کەوتوومەتە ژێر تاقیبە بەڵام هیچ جاران نەگیرام.

ئێمە لە بەغدا مەقەڕێکمان هەبوو. ئەمن بۆخۆشم ماڵم هەبوو. هەردووک جارەکان وابوو ئەمن شەوێ درەنگ دەچوومەوە ماڵێ. جارێکیان هاتن گوتیان بەو نیوە شەوە لێرە چ دەکەی؟ دەلیلەکەشی ئەوە بوو کە ئەمن بە پێیان دەچوومەوە چونکە ئەوەندەم نەگەر شەو درەنگ دەبوو تاکسی وەدەست نەدەکەوت. دەکەوتمە سەعات یەکو دووی شەوێ لەبەر ئەوەی برادەرمان لە دەرەوڕا دەهاتنەوە بۆ پێشوازییان دەچووین. بۆیە وەدرەنگێ دەکەوتم ئەو وەختی کە دەبوو بچمەوە بە کووچەو کۆڵانانێدا دەڕۆیشتم لەجیاتی ئەوەی ڕاست بەخەیابانێدا بڕۆم. جارێکی گوتم حاڵم قەزییەیەکی وا بووەو تاکسیم دەست نەکەوتوو ناوا دەڕۆمەوە. ماشێنیان پێبوو، گوتیان پێت خۆشە بتگەیێنینەوە؟ گوتم مەمنوونیشتان دەبم. ئەوان بۆیەیان دەویست بمبەنەوە هەتا بزانن ڕاست دەکەم یان ڕاست ناکەم. بردیانەوە بۆ موقابیلی ماڵەکەی خۆم کە دیارە ڕێشوێنیم کردن. لەوێ منیان دابەزاند کە بەڕێمەوە بۆ بەری ماڵەکەم، ڕاوەستان هەتا ئەمن سویچەکەم دەرهێناو دەروازەکەم کردەوەو مەعلووم بوو کە ڕاست دەکەم جا ڕۆیشتن.

جارەکەی دیکە لە کووچەیەکی تاریکدا بووم کە دوو گەنجی ١٨، ١٩ ساڵە ڕاوەستا بوون. هاتن گوتیان ئەتۆ بۆ بەو نیوە شەوەی لەو کووچەو کۆڵانەی دەخولێیەوە؟ ئەمن دووبارە داستانەکەم بۆ باس کردن. بەڵام لێم پرسین ئەرێ باشە دەکرێ بپرسم بۆ لێم دەپرسن؟ یەکێکیان کارتەکەی دەرهێنا زۆر موحتەرەمانە نیشانی دام.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا ئەودەم دەگوترا کە ناڵقەیەک هەبوو بەم شێوەیە: کاک ئەمیری قازی لە دەرەوە بەهۆی کوڕی ڕەشۆ سەرداری جاف لە عێراقۆ سەید ڕەسوولیش چۆتە نێو ئەو ئاڵقەیەی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو داستانانە ئەگەر ڕاستیش بن ئەمن بەڕاستی کەمیان سەر لێدەردەکەم. نە ئەو وەختیم سەر لێدەرکردووە نە ئێستا. کاک ئەمیر دۆستێکی کۆنی کاک سەید ڕەسوولی بووە ئەویش دۆستی وی بووە. جارێک ئیختیلافیان بووە جارێک ڕەفیق بوون، شتی ئاوا هەبووە. بەڵام نە ئەو وەختی ئاگام لەوەی بووە نە ئێستا. ئەوەندەم زانیوە کە ئەو وەختی کاک سەید ڕەسووڵ لەوێ بوو، دەگەڵ سەردار بەگی جاف کە ئێستا نەماوە پێوەندی‌یان هەبوو، هاتوچۆی دەکرد. بەڵام ئەو هاتوچۆیە چۆن بووە بۆچی بووە نازانم. چونکی ئەمنیش چوومەتە ماڵی سەردار بەگی. خۆ ئەوە دەلیلی ئەو جۆرە هاوکاری‌یانە نیە. سەردار بەگ زاوای قازی موحەممەد بوو و ئێمەش دەگەڵ بنەماڵەی قازی موحەممەد تێکەڵاویمان هەبووە. لەو حەددەی‌دا هاتوچۆمان بووە. جا بۆ نەڵێین سەید ڕەسوولیش هەر ئاوا بووە. لەحاڵێک‌دا سەید ڕەسووڵ دەگەڵ ماڵی قازی تێکەڵاویی زیاتری هەبووە زۆریان لێ نیزیک بووە.

**هەیاس کاردۆ:** بەدوای ڕووخانی ڕێژیمی پاشایەتی‌دا ژمارەیەکی بەرچاو ئەفسەر و دەرەجەداری ئەرتەش هاتنە ڕیزەکانی حیزب و لە بەشی نیزامی دا سازمان دران. لەنێو ئەوانەدا ژمارەیەک زۆر ئازایانە خۆیان نواند و دواتر شەهید بوون. ژمارەیەک کە چاوەڕوانیی زۆریان لێ دەکرا حیزبیان بەجێ هێشت. لەوانە پێم‌خۆشە ئاماژە بە سەرهەنگ سمکۆ عەلییار و سەرهەنگ چیا بکەم. هۆی ئەوە چی بوو؟ هەر لەجێدا تۆ کارنامەی ئەو پسپۆڕە نیزامی‌یانە چۆن هەڵدەسەنگێنی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەگەر باسی ئەوەی بکەین چۆنیان هەڵدەسەنگێنم، ئەمن پسپۆڕی هەڵسەنگاندنی کاری ئەفسەران و نیزامی کاران هەر نەبووم و نیم. بەڵام لەسەر یەک ئەک هەر ئەوانە کە شەهید بوون، یانی گەیشتنە ئاخر دەرەجەی دڵسۆزی چونکە پێم وایە هەموو کەس دەگونجێ شک لە ئیخلاسی‌دا بکرێ ئیللا شەهید. کابرا کە حازر بوو لەسەر ئامانجەکەی ڕووح دابنێ، ئیدی ئینتیزاری چیی دیکەت لێی هەیە. نەک هەر ئەوانە، بەڵکوو ئەوانی دیکەش کارەکانی کە کردوویانە جێگای پێزانین و ڕێزلێنانن. ئەو دوو ناوەی کە ناوت بردن کەمێک فەرقیان هەیە. ئەوەی کە مەربووت دەبێ بە کاک سمکۆی عەلییار. کاک سمکۆ

دەکرێ بڵێین لە ئەفسەرانێک کە هاتنە نێو حیزبی دێمۆکراتەوە لە هەموانیان بەتواناترو شایستەتر بوو. هەرچەند سەرهەنگ بوو بەڵام لە ئەفسەرە ڕەشیدەکان بوو. ڕەشید هەر بەمانای ئازایەتی لەشەڕدا نا، یانی بەتواناو بە نوتۆریتە. لە زەمانی شای‌دا ئەفسەرێک بووە کە هەمیشە لەپێش بووە. خۆشەویست بووە لەلای ئەرتەش‌و خودی شا.

کاک سمکۆ لەواقیعدا بۆیە لەحیزب دوور کەوتەوە کە حیزبی دێمۆکرات بەجۆرێک لەجۆران نەی‌توانی لە وجوودی وی ئیستیفادە بکا. چونکی شتەکە زۆر سەیروسەمەرە بوو. حەملەیەکی عەجایب هەبوو لەسەر سمکۆ عەلییار. دروشم دەنووسرا لەسەر دیواری کە: بمرێ ئیمپریالیزمی ئەمریکا، بمرێ سمکۆ عەلییار. یانی بەقەت ئیمپریالیزمی ئەمریکا سمکۆ گەورە کرابوو. دەگەڵ ئەوەی خودی دوکتور قاسملوو ویستی زۆری قەدر بگرێ‌و زۆری لێ نیزیک بوو. تەنانەت جارێکی کاغەزێکی دوکتور قاسملوویان بڵاو کردەوە کە بۆ سمکۆی ناردبوو. - کە نازانم چۆنیان دەست کەوتبوو — لەئاخری نامەکەی‌دا دەنووسێ برای بچووکت ڕەحمانی قاسملوو. بەڵام نیی وای لێ‌هات حیزبی دێمۆکرات لەژێر ئەو فشارەی گرووپەکاندا بەجۆرێک لەجۆران وازی لە کاک سمکۆ هێنا. بۆیە سمکۆ ڕۆیشت.

بەڵام ئەوەی دەگەڕێتەوە سەر سەرهەنگ چیا، ئەو وا نەبوو. سەرهەنگ چیا ماوەیەک مەسئوولیەتی وەرگرتبوو بەفەرماندەی هێز بەتایبەت لە مەنتەقەی بۆکان‌و هێندێک کاری زۆر گەورەی کردن. بەتایبەتی کە تەفروتوناکردنی گوردانی ٨٠١ی شیراز دەنگی دایەوە. ئەوە بە فەرماندەریی وی کراو چەند عەمەلیاتی سەرکەوتووی دیکە کران. پاشان کە هاتینە گەورە دێ‌و لەوێ جێگیر بووین، نازانم بەجۆرێک تەئسیری ئەوانەش کە موخالیفی کورتە باس بووند وەکوو شتێک بە پەیرەوانی فکری توودەیی دەناسران تەئسیری ئەوانەشی لەسەر هەبوو. بۆیە کەوتە مەنتی‌بافی دەگەڵ حیزب‌و بەهانەتاشین‌و سەرەنجام ئیدی بۆخۆی وازی هێناو ڕۆیشت. ئەو بەیانانە جارێکی هاتبۆوە بۆ ئێرە، میوانی کاک مستەفاو ئەوان بوو. ئەمانە لای ئێمە. لەپاشان کە ڕۆیشتەوە باسیان کرد گۆیا دەگەڵ وانیش تێکی داوە. نەک وەک ئەندامی حیزب تێکۆشانی نیە، دەواقیعدا پێوەندی‌یە عاتفی‌یەکەشی هەر نەماوە. بەڵام بەهەرحاڵ ئەوەی دەحیزبدا کردوویەتی جێگای ڕێزە. کاری باشی کردوو حەقی خۆشی بووە نارازی بێ. ڕەنگە ئەمن دەگەڵ ناوڕەزایەتی، یان ڕەزایەتی کەسێک نەبم بەڵام ئەوەی بەحەقی هەموو کەس دەزانم.

**عەباس کاردۆ:** دامەزرانی "کۆمیسیۆنی سیاسی - نیزامی" بە بەرپرسایەتی کاک مستەفا هیجری، سیستێکی ویشکەو یەک‌بوعدیی دەنێو حیزب دا پیادە کرد. لەئاکامی سەپاندنی ئەو سیستمەدا زۆر کەس دەرکران، حیزبیان جێ هێشت یان زەبری ڕووحی‌یان وێ کەوت. دیارە حاشا لەوە ناکرێ کە زۆر کەسیش بە

هۆی ماندووبوون یان بیانووی دیکە حیزبیان جێ هێشت، بەڵام زەحتی ئەو کۆمیسیۆنە لەو دەورەیەدا حاشای لێ ناکرێ. شکڵ گرتن و درێژەی کاری کۆمیسیۆنی سیاسی ــ نیزامی، ئەوکات چۆن لێک دەدرایەوەو ناکامەکانی بۆ حیزب چی بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە دەبێ پێکهاتنی کۆمیسیۆنی سیاسی ــ نیزامی دەگەڵ مودیرییەتی کەسێک لە بەرپرسانی سیاسی ـ نیزامی لێک جودا بکەینەوە. دروستبوونی ئەو کۆمیسیۆنە لەڕاستیدا وەکوو زەروورەتێکی لێ‌هاتبوو. ناکامی لێکدانەوەیەک و ئیحتیاجێک بوو کە بە پێک‌هێنانی ئۆرگانێکی ئاوا دەستی پێ کرد. پێشتر ئێمە دوو تەشکیلاتمان هەبوون. کادری سیاسی و پێشمەرگە یان فەرماندەی پێشمەرگەی. لەسەرووەش کۆمیسیۆنی تەشکیلاتمان هەبوو، کۆمیسیۆنی پێشمەرگەمان هەبوو. بەتایبەتی لەخوارێ ناتەبایی‌یەکی یەکجار زۆر هەبوو. ناوی سەیروسەمەرە لە کادرە سیاسی‌یەکان دەنران: "باڵتۆ سپی-یەکان"، "بنکەی دۆڵمەپێچانەوەی"، "مریشک خۆرەکان"، "سەر چەورەکان"، ئیدی شتی ئاوا سەیریان وەدوای کادرەکان دەخست هەر وەکوو بێگانەیەک بن. لەپاشان ئەوانە هەمووی ئاپاراتی حیزبن. ئاخر ئەگەر لەبیرت بێ وەختێکی ئێمە پێشمەرگەو ئەندامی حیزبمان دوو شتی لێک‌جیاواز بوون. نەیبوو بەشەرت هەموو پێشمەرگەیەک ئەندامی حیزب بێ. کەسێک دەی‌توانی پێشمەرگە بێ و ئەندامی حیزب نەبێ. دواتر وای لێ‌هات کە ئەوانەی دەبنە پێشمەرگە مەگەر تەمەنیان لەژێر ١٨ ساڵ بێ دەنا دەبوو ببنە ئەندامی حیزب. عادەتەن ئێستێ هەموو پێشمەرگەکان ئەندامی حیزبیشن. بەڵام ئەو وەختی وا نەبوو. بەو حاڵەش زۆربەی پێشمەرگەکان ئەندامی حیزب بوون. ئەگەر ئەندامیش نەبووبن بەڕەسمی، جوزوی فیداکارترینەکان بوون. ئەوە نیە خۆیان بەکوشت دەدا.

کەچی لەبەینی ئەو دووانەدا تەزاددێکی زۆر هەبوو. حەتتا ئەو وەختیش دیارە ئەو کەسەی کاری نیزامی-گەری‌یە، پتر دەچێتە جەبهەی شەڕو پتر فیداکاری دەکا، لەوەی کە کاری ڕێکخستن و تەبلیغاتی و ماڵی و ئەو شتانە دەکا، پتر تێ‌دەکەوێ. بەڵام هەر ئەو وەختی ئێمە بەرپرسانی تەشکیلاتیی واشمان هەبوون کە دەکەوتنە شەڕ لە پێشمەرگەکان و تەنانەت لە فەرماندەکانیش تەدەمانەوە. ئەوە وا بوو بەڵام ئەو حەسساسییەتە هەر هەبوو. هەروا بزانە دوو ڕەقیبی سەرسەختی یەکترن. ئەو زەرورەتە بوو بە باعیسی ئەوەی بیر لەوە بکرێتەوە ئەو دووانە تێکەڵاو بکرێن. تەنانەت بیر لەوە کرایەوە ئەوە بچێتە خوارتریش. تەنانەت لە کۆمیتە شارستانەکانیشدا وا دانرا کە فەرماندە هێز نەک هەر ئەندامی کۆمیتە شارستان، بەڵکوو ئەندامی هەیئەتی ئیجراییش بوو. ئەوە بۆیە بوو کە ئاپاراتی حیزبی بە یەک دەزگا ئیدارە بکرێ و کارەکان بن کە تەقسیم دەکرێن نەک دەزگاکان. ئەوە بە باوەڕی من کارێکی باش بوو. ڕەنگە لە هەلومەرجێکی دیکەدا تەشخیس بدرێ ئەوە لێک جودا بکرێتەوە. بەڵام ئەوە تەنیا لە وڵاتێکی پێشکەوتووی دێمۆکراتدا ڕەنگە زۆر عەمەلی بێ. لە وڵاتێکی وا کە وەزیری

خاریجە دەتوانێ کۆنە ژەنەڕاڵ بێ. بەڵام وەزیری دیفاع حەتمەن دەبێ مەدەنی بێ، بەو حاڵە ئەرتەش لەژێر فەرمانی دایە. یان مەسەلەن سەرۆک کۆمار فەرماندەی کوللی هێزە چەکدارەکانە با قەتیشی سەربازی نەکردبێ، بەڵام کە دەستووری دا چەسپیبێ دەکرێ چونکی دێمۆکراسییەو قانوون جێی گرتوە. بەڵام هەتا وەزعییەتەکە بەو جۆرەیە بۆ ئێمەمانان تێکەڵ کردنی ئەو دوو هێزە شەریک کردنیان لە مەسئوولییەتو بڕیاردان-دا کارێکی باشە. یانی نیزامییەکە جودا نەبێ لە سیاسییەکە. جارێک فەرماندە هێز دەبێتە بەرپرسی کۆمیتەی شارستانو جارێک بەرپرسی کۆمیتەی شارستان دەبێتە فەرماندە هێز کە زۆریشمان هەبووە.

ئەوە کە دەگەڕێتەوە سەر مەسئوولییەتو موشکیلاتی پێوەندیدار بەوە، ڕەنگە بتوانین بڵێین لە بەشێکی زۆری ئەو حاڵەتانەدا کە ڕوویان داوە یەکێک دڵی شکاوە، یەکێک دەرکراوە، خەتاکە ئی وییە. خەتاکە ئی بەرپرسەکە، یانی ئی کاک مستەفای هیجری نیە. شەرت نیە ئەگەر کاک مستەفا پیاوێکی وشکە هەرچی بیکا خەتای وی بێ. ئەمن دوو برادەر کە بەخۆشییەوە یەکیان زیندوویەو ئێستاش هەیەو یەکیشیان بەداخەوە شەهید بووە. خەڵک لەبەرخوردیان ناڕازی بوون. لەبەر ئیحتیرامی شەهیدەکەشو ئەوەش کە ماوە ناویان نابەم بەڵام دەتوانم بڵێم لە زیاتر لە سەدی هەشتای ئەو جێگایانە کە ئیختیلافیان دەگەڵ کەسێک هەبووە یان دڵی خەڵکیان لێ ئێشاوە، حەق بەو دوو برادەرە بووە. بەڵام بەرخوردەکەیان توند بووەو خەشین بوون. ئەوە باش نیە ئەگەر نیشان بتوانێ. بەڵام دەبینی کابرا دڵسۆزەو بەرخوردەکەشی بەو جۆرەیە. زۆرجار ڕێ-کەوتوە هەر بۆخۆم بە یەکێکی بڵێم ئای ئەو کابرایە فیرعەونە، کەچی وەختێک لە نێزیکەوە دەگەڵی تەڕەف بووم واش نەبووە.

دەگەڵ هەمووی ئەوانە ئەمن قەبووڵمە کاک مستەفای هیجری وشکە. ئەمن ئەو کەلیمەیەم لە کاک مستەفای هیجری بیستوە کە بۆخۆی گوتوویەتی ئەمن مەغرووڕم. لەپاشان لەسەر ئەو بەرخوردە توندەی ئەمن جارێکی پێم گوت ئەو وەختی ئیختیلافەکەمان هەبوو، گوتم بابە وەک لە ئێرانێ دەیانگوت قاتیعییەت باشە بەڵام قاتیلییەت نا. بەڕەحمەت بێ مەلا ئەحمەدە لەتکەمان هەبوو، قسەخۆش بوو، دەیگوت پێم وایە کاک مستەفا دایکی قەت لەسەر لانکێ "وشتوشتی" پێ نەکردوە هەتا وەپێکەنین بکەوێ، چونکی نازانێ پێ-بکەنێ. یان دەیگوت ئەگەر پێکەنینیشی پێ بۆ ئەوەی خەڵک نەیبینێ ڕوو دەولای دەکا جا پێدەکەنێ. پێم وایە حەقیقەتێک دەوێدا هەیە کە کاک مستەفا توندو وشکە. بەڵام ئەوە بەو مانایە نیە کە بڵێین هەرچی دڵی لە کاک مستەفا ئێشاوە لەسەر حەق بووە.

**هەیاس کاردۆ:** دیارە ئەوە لێکۆڵینەوەی زۆری دەوێ. مەسەلە دڵێشان لە کاک مستەفای نیە. مەسەلە ئەوەیە ئەو سیستەمەی گرتبوویانە پێش بۆ سازماندانی خەڵک ئەملاوئەولای تێدا ئەبوو. جا لێرەدا خەڵکێکی زۆر بە ناڕەوا ئاڵوگۆڕ کران، یانی لەڕاستی‌دا وایان لێ کرا بڕۆن.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ڕاستە سیستمی کاری کاک مستەفا ئەوە بووەو هەیە. نازانم هەتا کەنگێش هەروا دەبێ. سیستمی وی ئەوەیە دەبێ هەمو یەکدەست بن. هەمووش موتیعی موتڵەق بن. کابرا هەرچی بێ ئەگەر موتیع نەبێ ئینسانێکی خەراپە، ئینسانێکی مەڕمووزە، ئینسانێکی بێ کەڵکە. بەڵام ژێرفەرمانو هاوفکر بێ، هەرچی بێ ئەوە پیاوێکی ماقووڵەو بەکار دێ. ئەو وەختێ کە ناکۆکیمان لێ‌پەیدا ببوو بەڵام جارێ لەت بوون نەببوو، شتێکیان بۆ گێڕامەوە. گوتیان بە کاک مستەفایان گوتوە ئێوە کە فلانەکەستان کردۆتە ئەندامی هەیئەتی ئیجرایی کۆمیتەی شارستان خۆ پێنج کلاسی سەواد هەیە. گوتیان جوابەکەی ئەوە بووە کە خۆ ئەمن ئەمەدزانی پێنج کلاسی سەواد هەیە، پێم وابوو کەمتری هەیە. بەڵام ئەگەر بێسەوادیش بێ پێم لە دیپلۆمەکەی تۆ چاکترە. حەقیقەتەکەی ئەوەیە کە ئەو ئیتاعەتی موتڵەقی لە خەڵکی دەوێ. پاشان دەبێ دەگەڵ وی بێ. دەنا سەری بچێتە ئاسمانێش قبووڵی ناکا.

**هەیاس کاردۆ:** لە "گەلاڵە"ی شینکایەتی ڕا هەتا "بۆڵێ" ی بناری قەندیل، سەرکردایەتیی حیزب ٣ جێگای گۆڕین. ئەو هەمو جێ‌گۆڕینە بۆ؟ کاریگەری‌یەکانی ئەو جێ‌گۆڕینانە لەسەر ورەو تواناتان چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو جێگۆڕکێ‌یانە پێموایە لە جێگایەکی دیکەش باسم کرد. هەمووی لە نەتیجەی فشارو تۆپبارانو مووشەکبارانو ئەوەدا بوون. ئەمن بەتاقی تەنیا ڕەئیی موخالیفم هەبوو بەڵام یەک ڕەئیی موخالیف چی پێ‌دەکرێ. ئەمن دەمگوت بابە ئێستا کە ئێمە مەجبوورین ئێرە بەجێ بێڵین لەبەر مووشەکبارانو تۆپبارانە. دەبا بچینە جێگایەک کە کاتیۆشاو تۆپی نەگاتێ. بەڵام ئیسرارەکە ئەوە بوو کە دەبێ پشتمان بە قەندیلەوە بێ. دەنا بەڕاستی کار و ئێنرژی‌و دارایی‌یەکی زۆری لێ سەرف کرا لە هیچ‌وخۆڕایی.

**هەیاس کاردۆ:** یانی ئەتۆ پێت وابوو هەر لەو کاتەوە دەبوایە هاتبانە شوێنێ وەک ئێستا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ئیسرارم ئەوە بوو کە بچینە جێ‌یەکی کە لە بوردی تۆپ‌و خۆمپارەدا نەبێ. ئەزموونەکە ئەوە بوو کە دەبێ نیزیک بینو بتوانین بەئاسانی بگەینەوە وڵاتی خۆمان. پێم وایە واش نەبوو. هەر ئەو وەختێش گوتم کە ئەگەر دەوڵەتی عێراق نەیەڵێ بڕۆینەوە ئەگەر لە لێوی مەرزیش بین هەر نایەڵێ. ئەو پەڕەکەی دەڵێ بڕۆ بەڵام ئیدی نابێ بگەڕێیەوە. ئەو کات چ دەکەی؟ ئەگەر ڕێگاشت بدا بڕۆی لە

کەرکووکیش بێ هەر ڕێگات دەداو کارناسایشت بۆ دەکا. بەڵام لەسەر یەک ئەو دوور کەوتنەوە لەسنوورە هەر چەند لەڕووی ناچاری بووە بەڵام بۆ هاتوچۆو چوونەوە بۆ وڵاتی مانیع نەبووە. دیارە زەرەری دیکەی زۆر بوون بەڵام پێم وا نیە لەباری ڕووحی‌یەوە تەئسیری خراپی بووبێ. مەسەلەن ئێمە لە قەندیلی کەسمان بەخێڵی لازم نەبوو. لێرە دەمێ هەموو هەیانێ. یانی ژیانی ئەوێ ئاسانتر بوو. هاتووینە شاری بە ئیمکاناتی شاخەوە کە ناخۆشە. خەڵکەکە لە ژیانی پێشمەرگانە دابڕاوەو تووشی ژیانێکی دیکە بووە. یانی هێندێک شت هەن کە ژیانی شاری پێی تەحمیل کردووین کە بۆ ژیانی پێشمەرگانە نابێ. ڕەنگە لەو بارانەوە زەرەمان کردبێ. دەنا پێم وا نیە ئەوە مەعنەویاتو ڕووحیاتی خەڵکی شکاندبێ.

## بەڵگەنامەکان

### بەڵگەی (١)

[illegible] بەڕێز مامۆستا !

پاش سڵاو،

[illegible]

[illegible]

[illegible]

[illegible]

[illegible] !

[illegible]

[illegible]

[illegible]

١٩٩٠/٩/٢٤

بەڵگەی (٢)

١٩٦٧/٩/٦

١٥ [illegible] ٤٦/٩/٧

برای بەڕێز ماموستا!

پاش سڵاوێکی گەرمی برایانە.

پێم خۆش بێکەوە دانیشین و هێندێ قسەم هەبوو کە عەرزت بکەم. بەداخەوە کاتم یەکجار زۆر کەمە و منیش لە سەفەردام. بۆیە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم.

بە نەزەری من لە ئێستا دا وەشتەوە کە خۆت بە کاری لاوەکی لە کۆمیتەی ناوەوە مەشغوول بکەی. لە هەل و مەرجی ئێستا کە ئەمڕۆ دا من لەوە بەتەواوی زانیم و پێم وایە کە پێویستیە بە جێی مەسئوولیەتێکی گەورە بە خۆوە بگری هەڵبەتە بۆ خۆت بڕیار دەدەی بەڵام بە نەزەری خۆم رای نەزەری خۆتم بۆ بنووسە چونکە پێم خۆش نییە خەڵک قسەت لە سەر بکەن.

[illegible] برات

تێبینی: لە نووسینی ئەم نامەیە کەس ئاگادار نییە.

# کێشەی لیستی ڤیکس

**هەیاس کاردۆ:** دوای کۆنگرەی حەوت بەرجەرە یەکگرتوویی ئەندامانی ڕێبەری کەلێنی تێ کەوت کە سەرئەنجام لە کۆنگرەی هەشتدا تەقیەوەو جیابوونەوەی لێ کەوتەوە. کێ بوون ئەوانەی لەبەرامبەر یەکدا ڕاوەستابوون هۆیەکانی چی بوون بۆچی ڕێگاچارەیەکی ژیرانەی بۆ نەدۆزرایەوە؟ نەخشی خۆت لەو نێوەدا چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە ئیختیلاف لە بەینی ئەفرادی ڕێبەری‌دا شتێکی تەبیعی‌یەو کۆنێشە. بەدوای کۆنگرەی حەوت خۆلاسە نابێتەوە. لە کۆنگرەی چواریش‌دا هەبوو. دوای کۆنگرەی چواریش هەر هەبوو. دوای کۆنگرەی پێنجیش هەبوو و دوای شەشیش هەبوو. دوای سێزدەو چاردەش هەبوو و دوای پازدەو شازدەش هەر دەبێ. ئەوە شتێکی سەیروسەمەرە نیە.

بەڵام بۆ جوابی بەشەکەی دیکە کە کێ بوون پێم وابێ زۆری تەخسیس ناوێ هەتا بناسرێن. چونکی سەرئەنجام ئەوەی لە کۆنگرەی هەشتدا تەقیەوە سەفەکانی بەئاشکرا لێک جودا کردەوە.

**هەیاس کاردۆ:** مەبەستم ئەوەیە لە جەرەیانی ساز بوونو پەرەگرتنیشی‌دا ئەو ڕیزبەندی‌یە هەر ئاوا بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** مەعلومە ئیختیلافە شەخسی‌و سەلیقەیی‌یەکە هەبوو کە جاروبار بەرگی سیاسیشی بەبەردا دەکرا. هەرچەند کۆنگرەی شەش سۆسیالیزمی دێمۆکراتیکی پەسند کردو بەشێکی ئەوانەش کە لە کۆنگرەی هەشت کەوتنە موقابیلو جودا بوونەوە موخالیفی بوون بەڵام ئەوانە مانەوەو کاری خۆیان درێژە دا. یا لەسەر مەسەلەی کورتە باس یان سۆسیالیزمی دێمۆکراتیک ئیختیلافیشیان بووبێ. بەڵام دوایە مەعلووم بوو. ئەوانەی ڕۆیشتن بەیاننیان دەرکردو بەیاننیان ئیمزا کرد. شتێکی شاراوە نەبووە، یانی ناوەکان هەموو هەن.

بەڵام ئەوەی لە کۆنگرە ڕووی‌دا، ئەمن هێندێک شتیم گوتوەو ئێستێش دەی‌ڵێم. بە باوەڕی من هێندێک هەڵەی تێکنیکی وای لە کۆنگرە کرد وەها دەی‌توانی وا نەبێ. خودی دوکتۆر قاسملوو کە بانیی لیستی ڤیکس بوو، ئەوە نەبوو کە دەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی دوایە جودا بوونەوەو ناوی خۆیان نا "ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ" موخالیف بێ‌و حازر نەبێ کاریان دەگەڵ بکا. ئەوەی بۆ دوکتۆر قاسملوو گرنگ بوو و پێی وابوو ناتوانێ کاری دەگەڵ بکا، تەنیا کاک حەسەنی ڕەستگار بوو. تەنیا یەک نەفەر بوو. دیارە وەختێکی لە

ساڵی ١٩٧٠دا ئێمە یەکمان گرتەوە دوکتۆر قاسملوو زۆری ئومێد بە کاک حەسەن هەبوو. یەکجار زۆری ئومێد پێی هەبوو، چونکی ئینساتێکی وردو خۆش فکر بوو. ئێستاش هەر وایە.

قەرار نیە شتەکانمان هەر وشک بن، با شتێکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە. جارێکیان لە مەجلیسێک‌دا بووین. کاک یووسفی ڕیزوانی کە ساڵی حەیوو سەروێی بۆ لێ‌نابووین. ڕووحی شاد بێ کاک حەمەدەمینی سیراجی ئەندامی دەفتەری سیاسی بوو، بەڵام کاک حەسەن ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو. لە کۆبوونەوەکاندا کاک حەمەدەمین زۆری قسە دەکرد. بەڵام وا دیار بوو قسەکانی زۆر دڵچەسپ نەبوون. نەک لەبەر ئەوەی موخالیف بووە، لەبەر ئەوەی خۆش نەبوون. کاک حەسەن کە خۆش‌فکر بوو زۆر کەمی قسە دەکرد. لەو مەجلیسەدا کە سفرە ڕاخراو نان دانرا، سەروێی‌یەکە هەمووی دەرهاتبوو لەسەر بلوورێک دانرا بوو. دوکتۆر قاسملوو گوتی باشی بەش کەن. مێشکەکەی بدەن بە کاک حەمەدەمین. زمانەکەش بدەن بە کاک حەسەن. یانی هەتا ئەو ڕادەیەی خۆش دەویست.

بەڵام دوایە کاک حەسەن لە کاروباردا بڕێک خۆبوێر بوو کە ڕەنگە پێتی خۆش نەبێ ئەوەی دەڵێم بەڵام دەبێ باسی بکەم. جارێکی ئەمن لە غیابی کاک حەسەنی‌دا دیفاعێکی جانانەم لێ کرد. گوتم حەقیەتی کار نەکا، حەقیەتی ناڕازی بێ، چونکی ئەوە جێی وی‌یە ئەمن گرتوومە. جا هەر بەڕاستییش بەئیمانەوە وام گوت. چونکی کاک حەسەن لە شاری گەورە بیبوو، زیندانی دیبوو، دەگەڵ کەسانی گەورە گەورە هەستان‌و دانیشتنی کردبوو و لەباری سیاسی‌یەوە زۆر لەمن پتری پێ‌بوو. گوتم ئەوە جێی وی‌یە. دوکتۆر قاسملوو لە یەک کەلامدا گوتی ئەمن ئیحتیاجم بەکاری تۆ هەیە نە بەفکری کاک مەلا حەسەنی. یانی ئاوا وەرگەڕا.

جا بێمەوە سەر مەسەلەی کۆنگرەی هەشت. لەجێدا مەسەلەکە تەنیا دەگەڵ کاک حەسەنی ڕەستگار بوو، دەگەڵ ئەوانی دیکە نەبوو. دوکتۆر قاسملوو قسەیەکی کرد کە دوایە زۆریان لێ بەدەمەوە گرت. گوتی کە ئەوە فیتنەی منە. با ئەو حەقیقەتەی بۆ یەکەمجار بڵێم کە ئەو کەلیمەی فیتنەیە یەکەمجار لەزمانی من هاتە دەرێ. دەگەڵ دوکتۆر قاسملووی دانیشتم گوتم ئەو فیتنەیەی ساز مەکە. ئەتۆ کێشەکەت دەگەڵ کاک مەلا حەسەنی ڕەستگارە، وەرە قسەی لەسەر بکە. بڵێ بەو دەلایلە ئەو پیاوە بۆ کۆمیتەی ناوەندی نابێ. گوتی ئەوە کوردەواری‌یەو پتر تەئسیر دادەنێ‌و خەلکەکەی بەلای وی‌دا ڕادەکیشێ‌و دەبێتە مەزلوومو ئەوانە. گوتم باشە وەرە شتێکی دیکە بکە. بڵێ بابە ئەمن دەگەڵ ئەو برادەرە ناتوانم هاوکاری بکەم. کەوابێ ئەمن بەو شەرتە بۆ کۆمیتەی مەرکەزی کاندیدا دەبم کە کۆنگرە قبووڵ بکا هەر وەرەقەیەکی ناوی ئەو دووانەی تێدا بوو بەتاڵ بێ. ڕەئیەکانی دیکە دەبژێرین، ئی کاممان پتر بوو ئەو دەبێتە کۆمیتەی مەرکەزی‌و ئەوی دیکە لادەچێ. دەگەڵ هەموو ڕێزم بۆ دوکتۆر قاسملووی، بەڵام وا دیارە لە ئاکامەکەی نیگەران بوو. پێی وابوو ئەگەر وا بڵێ زۆربەی خەلکەکەی ڕەئیی دەدەن بە کاک حەسەنی ڕەستگار نای‌دەن بەو. دەحاڵێک‌دا

دوایە دەرکەوت هەرچەند خەڵکێکی زۆریش دەگەڵ کاک حەسەنی کەوتن بەڵام بەشداراتی کۆنگرە دوکتۆر قاسملوویان بۆ ئەوان وەلا نەنا.

لەپاشان جەرچانەکە چۆن بوو. هێندێک شتیان هەبوو کە بەباوەڕی من ئەوان غەدریان کرد. مەسەلەن وەختێکی لیستی فیکس هاتە گۆڕێ کە ئەوان دەڵێن بە یەک ڕەئی سەرکەوت، وا نەبوو. لیستی فیکس بە دوو لەسێی ڕەئییەکان سەرکەوت. تەنانەت زیاتر لەدوو لەسێش. یانی ئەندامان قەبووڵیان کرد کە هەڵبژاردن بە لیستی فیکس بێ. بەڵام کە لیستەکە هات شەش کەسێشی لەو برادەرانە کە دوایە بوونە "ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ" تێدا بوون. بەڵام ئەوان لێی کشانەوە. دەنا کاک جەلیلی تێدا بوو. کاک فەتاحی تێدا بوو. کاک حوسێنی مەدەنیی تێدا بوو. کاک سەدیقی بابایی تێدا بوو. خۆلاسە شەش کەس بوون ناوی هەموویانم لەبیر نیە. ئەوانە کشانەوە کە هیچ زەرووڕەتی نەبوو. بەڵام کە هاتە سەر دەنگدان لەوێدا لیستەکە بە جیاوازی یەک دەنگ سەرکەوت.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ئەتۆ گوتت دوکتۆر قاسملوو تەنیا موخالیفی کاک حەسەنی بوو. ئەدی مەسەلەن کاک هاشمی بۆ تێدا نەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** مەسەلەی وی فەرقی هەبوو. ئی وی لەبەر ئەوە نەبوو نەتوانێ هاوکاریی دەگەڵ بکا. بەڵام نەزەری ئەوە بوو کاک هاشم بەبڕشت نیە. دەنا ئەگەر کاک هاشم هەبووایە، دەگەڵ وی دەی-گوزەراند. بەڵام پێی وابوو پیاوی چاکەو لەباری فکرییەوە بەتوانایە کەچی لەباری کاری عەمەلیو ئیجراییەوە پیاوێکی بەئیقدام نیە. ئێستا ئەوە نەزەری وی بوو، چەندی ڕاستەو چەندی ڕاست نیە شتێکی دیکەیە.

بەڵام کە هاتینە سەر دەنگدان، ئەووەڵەن ئەوانەی دەگەڵ وان بوون، مەعلوومە هەموویان ڕەئییان نەدا. ئەمن پێموایە یەک کەسیشیان دەنگی نەدا. لەوانی دیکەش، کە چاریان لە لیستەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی دەکرد پێیان زەعیف بوو. یەکێکیان بۆخۆم. ئەمن لە کۆنگرەکانی پێش ئەو وەختیدا یانی کۆنگرەی چوارو پێنجو شەشو حەوتدا کە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بیستو پێنج کەس بوون، هەمیشە بیستو پێنج کەسم دەنووسی. یانی بیستو پێنج ناوم دەخستنە سەر وەرەقەی دەنگدان. بەڵام ئەوە زۆر وەختی کەمتری دەگرت لەوەی کە ئەمن بنووسم موخالیفم موافیقم یان مومتەنیعم. بەڕاستی نەمدەزانی چ بکەم. دیارە ئەمن کە بەدوکتۆر قاسملووم گوت فیتنەی ساز مەکە، ئەوەشم پێ گوت کە دوکتۆر ئەوە چوار کۆنگرە بەسەردا تێپەڕین. لەهەر چواریاندا شەخسی تۆ بیستو چوار ئەندام کاندیدا کراون کە لە هەموویاندا تەنیا یەک

نەفەر دەنگی نەهێناوەتەوە. جا سەیرە، لە هەموویاندا کە کۆمیتەی ناوەندی بیستو پێنج کەسی کاندید کردوون تەنیا یەک نەفەریان دەرنەچووە. گوتم باشە ئەو بەزمەی بۆ دەکەی لێ گەڕێ با ئاوا بێ.

بەهەر حاڵ کە هاتینە سەر دەنگدانێ، بەڕاستی نەمدەزانی چ بکەم. نەمدەویست موخالیف بم. بەڵام شکم هەبوو موافیق یان مومتەنیع ڕەئی بدەم. کۆنگرە زۆر درێژ ببۆوە. پاش ماوەیەکی زۆر بیرکردنەوە کە بەقەت دوو جار ڕەئیدان بە بیستو پێنج کەسی وەخت گرت، دەنگی موافیقمدا. ئەویش لەبەر ئەوە بوو ئەگەر ئەوجار سەرنەکەوتبایە، دەبوو دووبارە لیستەیەکی دیکە دروست بکرێو وەختی زۆر زیاتری لەسەر دابنێین. لەڕاستیدا ئەو لیستە بەو دەنگەی سەرکەوت. ئەگەر نووسیبام مومتەنیع، نیوە بەئیزافەی یەکەکەی نەدێنایەوەو سەرنەدەکەوت. مەبەستم ئەوەیە ئەگەر ئەمن یان کەسێکی دیکە کە دەنگی موافیقیان دا، ڕەئی مومتەنیعیان دابایە نەک موخالیفیش، دیسان سەر نەدەکەوت.

بەڵام بۆ حیزبی دێموکرات دەرکەوت ئەو لیستە فیکسە بۆ کۆمەڵی کوردەواری جارێ زووە. بۆیە دواترو بۆ گرتنی کۆنفڕانسەکان کە دەبووایە ئەو سیستمە دابەزێ، لە هیچ کۆنفڕانسێکدا لیستی فیکسمان دانەنا. چونکە دەرکەوت کە جارێ زووە بیر لەوە بکەینەوە. دەنا لیستی فیکس بۆخۆی هیچ عەیبی تێدا نیە. ئەمن بۆخۆم لە چەند کۆنگرەی ئەحزابی پێشکەوتووی ئورووپایی، وەک سۆسیالیستو سۆسیال دێموکراتو ئەوانەدا بەشدار بووم، لە هیچ کامیاندا نەمدیوە خەڵک هەروا ناوان بنووسێ. لیستێک دێنێو خەڵک یان دەڵێن موخالیف یان دەڵێن موافیق. ئەسڵەن شتی وا نیە کە ناوەکان بنووسن. زۆریش دێموکراتیکە. خۆ ئێمە بۆخۆمان موتەکیری دێموکراسی نیین. دەبێ دێموکراسی لەوان فێر بین. جاری وایە دوو، سێ لیستە موقابیلی یەکتر ڕادەوەستن. کەسێک ئەوەی هەڵدەبژێرێ یەکی دیکە هەڵی نابژێرێ. خۆ موخالیفەکان بۆ لیستی فیکس موافیق بوون. بەڵام لە وەزنی دوکتور قاسملووی دەترسان. گوتیان باشە با دوکتور قاسملوو تەنیا دەیەک لیستدا نەبێ. ئێمە لیستێکی دیکە ئامادە دەکەینو ناوی ویشی تێدارێین، هەرکامیان سەر کەوت کاری تێدا بکا کە دوکتور قاسملوو حازر نەبوو ئەوەی بکا. دووبارە ئەوەی دەڵێمەوە، دوکتور قاسملوو حازر نەبوو دەگەڵ لیستێک هاوکاری بکا کە کاک حەسەنی ڕەستگاری تێدابێ.

دیارە ئەمن دەپێشدا هەوڵی خۆم دا. موافیقی لیستی فیکس بووم. یانی هەر لەپێشەوە موافیقی بووم. کاک مستەفای هیجری لە موساحەبەیەکدا ئیددیعای کردبوو کە ئەمن موخالیفی لیستی فیکس بووم، لەحاڵێکدا قەت لەحزەیەک موخالیفی نەبووە. ئەمن موافیقی بووم بەڵام پێم وا بوو پێویستیمان بەوەی نیە. کە کۆنگرە تەواو بوو شەهید قاسملوو لێی پرسیم ئەزرەت لەسەر کۆنگرە چیە. گوتم ئەتۆ قسەیەک دەگێڕمەوە کە دوکتورێک نەخۆشێکی عەمەل کرد. گوتیان عەمەلیاتەکە چۆن بوو؟ گوتی زۆر سەرکەوتوو بوو. گوتیان ئەدی نەخۆشەکە چۆنە؟ گوتی مرد. گوتم ئەوەش وایە. لیستی فیکس سەر کەوت، بەڵام حیزب

زەرەری کرد. لەراستیشدا هەر وابوو. سەرفی‌نەزەر لەوەی خەتایەکە ئی کێیە، یان خەتابارەکە چەندی حەق بوو بۆ ئەوەی ئاوا بکا. حیزب زەرەرێکی زۆر گەورەی کرد. یانی حیزب دە وەختێکی خراپدا لەت کرا و دوایەش هەروەک دیتمان شتی زۆر ناخۆشی لێ کەوتەوە.

لەپاشان ئەمن لە نیوسەدە تێکۆشانیشدا باسم کردوە کە بە شێوەیەکی زۆر نامەنتیقی جوولانەوە بەتایبەتی برادەرانی ئەولای. یانی ئەو برادەرانەی ناوی خۆیان نا رێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ یەکجار زۆر خەراپیان هێرش کرد، ئی لای ئێمە دەپێشدا هێندێک کەلیمەی ناحەزیان بەکار هێنا، مەسەلەن کەلیمەی "جاش موجاهید"یان بەکار هێنا. جاش موجاهید بەمانای جاشی موجاهیدین نیە. بەمانای زڕە موجاهیدە. ئوسوولەن جاش لە عێراقیش کە پەیدا بوو پێیان دەگوتن "جاش پۆلیس". بۆ ئەو کەسانەی تفەنگی دەوڵەتیان پێ بوو بەڵام پۆلیس نەبوون پێیان دەگوتن جاش پۆلیس واتە زڕەپۆلیس، کورد بە بالتۆی کورت دەڵێ "جاش بالتۆ" یانی بالتۆی تەواو نیە. یانی ناوەکە لەوێڕا هات هەرچەند هەر جوان نەبوو کە دوایە حەزف کرا. بەڵام ڕادیۆی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ بۆخۆم چەند جار گوێم لێبوو دەی‌گوت جاشەکانی ڕەفسەنجانی. قسەی ئاوا نامەعقووڵ لەبەینماندا هاتە ڕابرد. ئەو هەموو جنێو بێ حورمەتی‌یەی بە یەکترمان کرد. مەعلوومە زەرەرێکی زۆر گەورە بوو، شتێکی قێزڕ بوو.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ئەتۆ بۆچی خۆت کاندیدا نەکرد بۆ کۆمیتەی ناوەندی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن دەلیلی دیکەم هەبوو. هیچ پێوەندی بەو شتەوە نەبوو. ئەمن زۆر پێشتر ئیعلانم کردبوو. هەروەک گوتم، لە ڕۆژی هەوەڵەوە هەتا ئەو سەعاتەی ئەو قسانەی تێدا دەکەین ئەمن قەت بۆ یەک لەحزەش پێم‌خۆش نەبووە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بم. دووبارە سەبتی دەکەمەوە، قەت بۆ یەک لەحزە پێم-خۆش نەبووە سکرتێر یان جێگری سکرتێر بم. تەنیا وەختێک بەخیلافی مەیلی خۆم بوومەتە کۆمیتەی ناوەندی، پێم‌خۆش بووە ببمە ئەندامی دەفتەری سیاسی. بەوەشەوە دیارە هێندێک دەلیلی دیکە هەبوون کە باس‌کردنیان سوودێکی نیە. ئەمن لەمێژ بوو هەر دەم‌گوت ئەندامەتی کۆمیتەی ناوەندی قەبووڵ ناکەمەوە. جارێکیان دوکتور قاسملوو لەدووی ناردم کە بچم قسەی دەگەڵ بکەم. ئەمن ناردمەوە گوتم پێی‌بڵێن ئەگەر بۆ ئەوەیتی کە لە کۆنگرەدا مەسئوولیەتی کۆمیتەی ناوەندی وەئەستۆ بگرم، تکایە با نەیەمە خزمەتی. چونکی پێم خۆش نیە ئینڵیی بکەم کە مەعلوومیشە دەبێ بێنڵیی بکەم. ئەویش کە پێیان گوتبوو، گوتبووی وەڵڵا ڕاست بۆ ئەوەمە.

بەڵام دوای تەواوبوونی کۆنگرە، لەبیرمە کاک حەسەنی ڕستگار هێندێک بەدەورمدا هات. هەتا حەددێک وەک شتێک ئینتیزاری ئەوە بوو هاوکاری بکەین. بەو تەعبیرەم جواب دایەوە، گوتم کاک حەسەن ئەوەت

لەبیر بێ ئەگەر خەڵکێک سواری ئۆتوومبیلێک دەبن و مەسەلەن لێرەڕا دەچنە هەولێرێ یان کەرکووکێ، هەموویان بۆ یەک مەبەست ناچن. کەوابێ ئەمن دەگەڵ ئەوەی تێوە نیم. تەنانەت ئەوەم گوت کە دڵساردکردنەوەی تاقە یەک پێشمەرگە لەو شەڕایەتەدا بەتاوان دەزانم. ئەوە هیچ کە ئەمن پێشتریش ئەو حاشایەم دەکرد، چەندجار کاک حەسەن دەی گوت باوەڕت پێ ناکەم، پێی وا بوو پیلانە. حەتتا لە کۆنگرەی چاردەشدا کە ئەمن نەمویست ئیدی بیکەم، هێندێک هەر پێیان وابوو ئەوە فێڵە دەی کەم بۆ ئەوەی ئەوانی دیکە نەبن. هەتا لە ئاخر کاتەکاندا بوو کە کاک جەلیلو کاک حوسێنی مەدەنی گوتیان بەڕاستیتە نای کەی؟ گوتم دیارە بەڕاستیمە. جا ئەوجار ئەوانیش خۆیان کێشایەوە. دەنا کاک جەلیلیش کاندیدا بوو بۆ کۆنگرەی چاردە.

**هەیاس کاردۆ:** باشە ئەتۆ دەتزانی ئەوان جیا دەبنەوە کە ئەوەت بەکاک حەسەنی ڕەستگار گوت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** خەتەرەکە یەکجار زۆر بوو، چونکی پێشتر گوتبوویان، یانی بیسترابوو لە هێندێک کەس کە ئەوە ئیدی وەک پێشوو نیە. ئەو سەفەرەی ئەگەر ئاواو ئارا بێ ئینشیعاب دەکرێ.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا نازانم تۆ چۆنی دەبینی بەڵام بیستنی ئەو جۆرە ناوانە وەک ئەوەی کۆنگرەی چوارو ئی کۆنگرەی هەشتیش خەڵک لە تۆیان دەزانی، وەک هەر ئەو کەلیمەی جاش‌موجاهیدە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئی کۆنگرەی چوار کە بۆخۆم ئیقرارم کرد بەڵێ بەپێشنیاری من ناوی جاشیان بۆ دیاری کرا. ئەمن ئەوەی باوەڕم پێی هەیە دەی‌ڵێم خۆ نای‌شارمەوە با یەکێکیش موخالیفی بێ. ئەمن لە نامەیەک‌دا کە نووسیم نەک بڵاو کرایەوە، نووسیم بۆ ئەوەی برادەران بێن بۆ کۆبوونەوە جا نازانم نامە بوو یان تێلگراف بوو، نووسیبووم هیوادارین - یانی دەفتەری سیاسی نووسی بەڵام ئەمن فۆرمۆلەم کرد - کە کۆمیتەی ناوەندی ئەوانە بەجاش بناسێ. کە هاتن کاک هاشمی کەریمی لە مەهابادێ تووشم بوو گوتی تۆ چۆن بە غەنی بلووریان پاش بیستو پێنج ساڵ زیندان دەڵێی جاش؟ گوتم هەر بۆیە پێی دەڵێم جاش چونکە پاش بیستو پێنج ساڵ مانەوە لە زینداندا ئێستا لەو وەزعە دژوارەدا پشت لە حیزبو میللەت دەکا. ئەوەیان باوەڕم پێی هەبوو، بەڵام کەلیمەی جاش‌موجاهید بەهیچ جۆر ئی من نیەو باوەڕی من نەبووە.

**هەیاس کاردۆ:** مەبەست ئەوەیە خەڵک لە وردبینیی تۆ ئاگادار بوون بۆیە پێیان وابوو وەدەوخستنی ئەو جۆرە ناوانە دەبێ کاری تۆ بێ.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** موسەللەمە ماوەیەکی زۆر پاش کۆنگرەی هەشت دۆستەکان دەیانگوت "سێ قوتبە"، موخالیفەکان دەیانگوت "سێ چوکڵەی حیلە بازان"، یان ڕەنگە "سە مرد خبیث"یشیان پێ گوتبێن. برادەرانی

ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕی ئەو وەختە بە لایەنەکەی ئێمەیان دەگوت "فراکسیۆنی شەرەفکەندی - قاسملوو". شەرەفکەندییشیان بۆیە وەپێش دەخست کە گۆیا سەری فیتنەکەیە. یانی قاسملوو وەدوای وی کەوتوە. بەڵام بیستمەوە کە ئەو فکرەیان دەبەینەدا بووە کە بیکەنە فراکسیۆنی حەسەنزادە ـ شەرەفکەندی ـ قاسملوو. ئەمنیشی دەگەڵ بخەنو تەنانەت وەپێشیشم بخەن. دوایە گرووپانە تازە ڕۆیشتوە با شەریکیان بۆ پەیدا نەکەین. بەڵام بەهیچ جۆر وا نەبوو. ئەمن زۆرم پەرۆش بووم. زۆرم پێ ناخۆش بوو. پێم ڕووداوێکی خراپ بوو بۆ حیزب. مەحکوومم کردوە. ئەوانیشم بە خەتابار زانی کە پێم وابوو ئەدەبوو ئەوەی بکەن. پێم وابوو قابیلی گۆڕان بوو. بەتایبەت دەگەڵ دوکتور قاسملووی شت دەکرا. ئەمن دوایە پێم گوتن. گوتم لەواقیعدا لەو چیهراتەی ناسراو بوون تەنیا ئەمن مابوومەوە. بەڵام ئەمن توانیم ئەو وەزعییەتە بگۆڕم. بۆ ئەگەر هەموومان مابایین ئەمان دەتوانی پێ گۆڕین.

بەڵام بەهیچ جۆر هاتەری ئەو لەتیوونە نەبووم. هاتەری ئەو شتە ناشیرنانە نەبووم کە پێیان گوترا. دەگەڵ ئەوەش ئەمن دەتێو خۆماندا دەمگوت ئەرێ ئێوە بەوان دەڵێن لادەر. لادەر لەچی؟ بوونە جاش، بوونە خائین؟ خۆیان تەسلیمی دوژمن کردۆتەوە؟ بەڵام لە هەموو جێگایەکی لە دەرەوەی حیزب کە باسم دەکردن بە لادەرم ناو دەبردن. بۆ؟ چونکی بۆ من وایە. بڕیاری حیزبی بۆ من ئیدی موڵزیمە.

**هەباس کاردۆ:** پلینۆمەکانی پێش کۆنگرەی هەشت بۆ نەیانتوانی کێشەی ڕێبەری چارەسەر بکەن؟ ئەسڵەن بۆ لەو بارەیەوە هیچتان دەگەڵ کادرەکان باس نەدەکرد؟ شەڕی ئەسڵی لەسەر چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** شتەکە مەعلووم بوو هەموو لایەنەکان بە نەتیجەی هاوبەش نەگەیشتین. دیارە وەکی گوتم ئەمن ڕەئیی خۆم نەشاردۆتەوە. ئەمن موافیقی لیستی فیکس بووم هەر ئەو وەختی کە لە کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی‌دا باس کرا. ئەوەم هیچ بەقاوان نەزانیوە. بەڵام وەکوو کورد دەڵێ ئەمن "گایەکم دەو گێرەیەدا نەبوو". حەتتا بەڕەحمەت بێ دوکتور قاسملوو گوتی ئەتۆ قسە لەسەر حەسەنی ڕستگار بکە. گوتم ئەمن بۆ دەی‌کەم. ئەمن حازرم دەگەڵ حەسەنی ڕستگار هاوکاری بکەم. ئەتۆ کە حازر نی، بۆخۆت وەرە قسەی لەسەر بکە. دەواقیعدا لەئەزەر دوکتور قاسملوویەوە وا بوو کە دەگەڵ کاک حەسەنی دە ئۆرگانی کۆمیتە مەرکەزی‌دا هاوکاری نەکا. بەڵام کێشە ئەسڵی‌یەکە دەبەینی ڕەحمەتی دوکتور سەعیدو کاک حەسەنی ڕستگاردا بوو. دوو قوتبی ئیختیلافەکە ئەو دووانە بوون. حەتتا لە کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی مەرکەزی‌دا کاک حەسەن تەعنەیەکی لە دوکتور سەعیدی دا. گوتی فایدەی چی ئەوە ئیعلانی بێ‌تەرەفی ناکا هەتا بزانین لەبەینی من و تۆدا خەلک کامەی دەوێ، مەبەستی دوکتور قاسملوو بوو کە لای کاک سەعیدی دەگرت. یانی کاک حەسەن موقابەلەجوویی دەگەڵ کاک سەعید دەکرد.

ئەمن بەشێک نەبووم لەو قەزیەیە. بەڵام لە تەحلیلی نەهایی دا پێم وابوو ڕۆیشتنی ئەوان کارێکی خراپە. بەڕاستی لەحیزب ڕۆیشتنە. ئەمن ئەوەی وانم بە ئینشیعاب نەزانی. چونکی ئینشیعاب ئەوەیە حیزب لەسەری ڕا هەتا خواری لەت بێ. ئێستێ کەم دەکەوێتە لایەک و زۆر دەکەوێتە لایەکی دیکە، ئەوە تەئسیر ناکا. بەڵام وەختێک ئەوان لە حیزب ڕۆیشتن تاقە یەک نەفەریان ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی دەگەڵ نەبوو. هەتا ئاخرین لەحزە لە کۆنگرەدا دانیشتوون. کۆنگرە ڕێبەرایەتی یەکی تازەی هەڵبژاردوە. یەکجار لەو موخالەفەتەدا فەعەعال بوون. ئەمن لەبیرمە کە قسە لەسەر لیستی فیکس دەکرا، خەڵکێکی زۆر ناویان نووسیبوو. ئەمن هەستام پێشنیارم کرد بۆ ئەوەی وەخت زۆر نەگیرێ هەر دوو موخالیفی لیستی فیکس قسە بکەن یەک موافیق قسە بکا. کەچی کردیان بەهەرا گوتیان ئەوە زمانمان دەبەستن؟ یانی بەوەش ڕازی نەبوون دوو بەرابەر قسە بکەن. چونکە لەبەرامبەر یەک موافیقدا، زیاتر لە دوو موخالیف قسەیان کرد. باشە ئەدی دەبوایە چیی-دیکە بکرێ. پاشان دانیشتوون هەتا ئاخری کە کۆمیتە مەرکەزی یەکی دیکە هەڵبژێراوە. بەڵام دوایە کە ئیعلانی مەوزیعیان کرد نووسیبوویان فڵان ئەندامی دەفتەری سیاسی و فیسار ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و لەو شتانە. بابە ئەوە مەربووتە بەتاریخ. کۆنگرەی تازە گیراوە. کەوابێ جەمعێک لە کەوادیری حیزب ڕۆیشتن. ئەوەی ئەم دواییانە جەماعەتی کاک مستەفای هیجری بەمەیان نیسبەت دا کە چەند کەس لە حیزب ڕۆیشتوون. نەخێر چەند کەس لەحیزب نەڕۆیشتوون. حیزب لێرەدا ئیدی لەت بووە بەڵام نەشاردراوەتەوە کە بەشی زۆری ئەندامانی کۆمیتەی مەرکەزی لای ئەوان بوون.

**هەیاس کاردۆ:** کەسانی زۆر ناسراو و کۆنی حیزبی وەک :کاک جەلیل گادانی، کاک حەسەن ڕستگار، کاک حوسێن مەدەنی، کاک هاشم کەریمی، کاک فەتاح کاویان و کەسانی دیکەش لەو قۆناغەدا خۆیان لە بەرامبەر ئێوە(حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران) دا دیتەوە. ئەوانە کەسانێک نەبوون بە هاسانی لەبەر چاوی خەڵک بخرێن و بێ ئیعتیبار بکرێن. دەکرێ پێناسەیەکی ئەو کەسایەتی یانە بکەی؟ تکایە بۆ چوونی ئەو کاتیشت لەسەر ناوبراوان دەرببڕە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بۆچوونی من لەسەر ئەوان ئێستاش نەگۆڕاوە. کارەکەیانم پێ خراپ بووە. هەربۆیەش ئەوەم بەخەسار زانیوە. ئەوانە لە ئەندامانی کۆنی حیزب بوون. لە چێهرە ناسراوەکانی حیزبی دێمۆکرات بوون. لەڕاستیدا لە کۆڵەکەکانی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانیش حیساب دەکرێن. بەڵام پیاوی گەورە هەڵەکەشی گەورەیە. ئەوان هەڵەیەکی گەورەیان کرد کە حیزبی دێمۆکراتی کوردستانیان بەجێ هێشت. بۆیە لەڕاستیدا شتەکەی ئەوان نەی گرت. ئێستا کاک مستەفای هیجری و هاوڕێیەکانی بێهوودە دەیانەوێ هەروەک ئەوکاتی حیساب بکەن. بەڵام شتەکە فەرقی زۆرە. ئەوان ئەو وەختی لە موقابیل وەزعیەکی دیکەدا بوون.

بۆیە لەڕاستیدا ئەبوون بەحیزبێک کە لەهەموو بوارێکدا لە بەرامبەر حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێراندا خۆ بنوێنن و قەبووڵ بکرێن. یانی تەحلیلەکەیان لە ئەوزاعەکە غەڵەت بوو. نەیانتوانی قەبووڵ بکەن کە دوکتور قاسملوو وەزنێکە موقابیلەی دەگەڵ ناکرێ. ئەوکات وابوو کە دوکتور قاسملوو لەکوێ با، حیزبی دێمۆکرات لەوێ بوو. ئەوان نەیانتوانی ئەوەی دەرک بکەن. هەروەک ئەو برادەرانەی دیکەش هەڵەی موحاسەبەیەکی دیکەیان هەبوو. ئەوان پێیان وابوو مادام هاوڕێیانی موقابیلیان ئیعلانی مەوزیع دەکەن، ئیدی حیزبی دێمۆکرات خۆیانن. یانی ئەوانیش دوکتور قاسملوون. ئەمن دوای لەتبوون لە یەکەم کۆنفرانسی مەتبووعاتیدا ئەوەم گوت. گوتم هیوادارم کەس دوچاری ئەو هەڵەیە نەبێ کە پێی وابێ دوکتور قاسملوویە.
باشە ئەو وەختی هەمووی ئەوانەی لەو دواییەدا ئۆپۆزیسیۆن بوون لەوێ بوون. کەچی بەو حاڵە ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕیش بۆ ماوەیەک کۆسپی سەر ڕێگای حیزبی دێمۆکرات بوو. ڕاستە نەیتوانی ببێتە ڕەقیب بەڵام کۆسپ بوو. جا ئێستا ئەوان پێیان وایە دوکتور قاسملوون، دوکتور سەعیدن، عەبدوڵای حەسەن-زادەن، غەفووری حەمزەیین، فەتاحی عەبدولین، عەبدوڵای شەریفین و خولاسە هەموویانن. ئەکری ئەوەی ناکەنەوە کە ئەو هەموو زیندوو و شەهیدە لە موقابیل ئەو چەند کەسانەدا بوون کە ناومان بردن. بەڵام ئێستا نەتۆ بەتەنێ و چێهرە ناسراوەکانیش نەماون. ئەوە غەڵەتی موحاسەبەیە. لەواقیعدا ئەو دوو دەستەیە هەر دووکیان تووشی هەڵەی موحاسەبە بوون.

**هەیاس کاردۆ:** مانەوەی خۆت لەبەرەی دوکتور قاسملوودا بەبێ قبووڵکردنی ئەندامەتیی ڕێبەری چ مانایەکی هەبوو؟ دەلیلت بۆ ئەوە چی بوو؟ لەو کارەی خۆت ڕازی بووی؟
**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ماناکەی زۆر سادەیە. ئەمن دەحیزبی دێمۆکراتی کوردستاندام. قەت نەمویستوە هەتا ئێرەش - ڕەنگە ڕۆژێک بێ بە دەلیلێک حیزب بەجێ بێڵم هەرچەند بەدووری دەزانم - بەڵام هەتا ئێستا نەم ویستوە ئەو حیزبە بەجێ بێڵم. ویستوومە دە ڕێبەرایەتییەکەیدا نەبم. هەروەکوو پێشتریش گوتم لە هێندێک عەمەلکردی دوکتور قاسملووی وەک پەروەرشی جێگری خۆی بەگلەیی بووم. پێم ناڕاست بوو. پێم وابوو دەبوایە چ من، چ دوکتور سەعیدی باشتر لەوەی کە بووین پەروەردە کردبا بۆ ئەوەی لە دوای خۆی باشتر ئەرکەکان بەجێ بگەیێنین. بەڵام ئەمن قەت لە خەتەکەی نارازی نەبووم و حیزبەکەم هەمیشە قبووڵ بووە.
لەپاشان غەیری مەرحەلەیەکی کەم نە کارم بۆ حیزب کەمتر کردوە ، نە حەتتا غەیری ڕەشیدانەکە، ئەخشم لە ئەندامی ڕێبەرایەتی کەمتر بووە. هەر لە بەینی کۆنگرەی هەشتەو نۆدا پێم وایە بۆخۆت دەبێ شاهید بووبی کە ئەمن نەبوومە کۆمیتەی مەرکەزی، بەڵام بە دەیانجار ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی دەهاتن ئەوردی

دڵیان لەلا دەکردم، دەمگوت ئەوە نیە بۆخۆت ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزیی، بۆخۆت باسی بکە. دەی گوت نا ئەتۆ فەرقت هەیە.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا ئەتۆ بۆخۆت شتێکت بەناوی ڕێبازی دوکتۆر قاسملوو قبووڵە؟ پێت وایە بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتووی، یان کۆمەگت کردوە شتێکی وا دروست بێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێموایە ڕێبازی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان لە بناغەدا ڕێبازێکە کە خەتە گشتی‌یەکانی لە زەمانی قازی موحەممەدەوە داڕێژراون. بەڵام هەرچەند کاک جەلیل گوتبووی شتێکمان نیە بەناوی ڕێبازی قاسملوو، ئەمن پێموایە وا نیە. لەنێو حیزبی دێمۆکراتی دوای قازی موحەممەددا، دەتوانین دوو ڕێبازی فکری لێک جودا بکەینەوە. دیارە ئەوە بەو مانایە نیە هەموو شتێکیان لێک جیا بێ. یەکیان وەختی خۆی عەبدوڵڵای ئیسحاقی نوێنەرایەتیی دەکردو ئەوی دیکەیان ڕەحمەتیی قاسملوو. ئەو ڕێبازە هەیە. قاسملوو بۆمن بوت نەبووە. خەسمیش نەبووە. قاسملوو بۆمن مامۆستا بووە، ئۆلگوو بووە. بەڵام چەند جاریشی دەگەڵ بەشەڕ هاتووم. چەند جاریش موخالەفەتم کردووە دەگەڵ ڕەئیەکەی نەبووم. ئەمما لەسەر یەک هەمیشە خۆم لەخەتی فکریی وی پێ نیزیک بووە. تەنانەت چەندین جار - ئاخر کە دەڵێم چەندین جار یانی دەبێ لەیازدە جار بەرترووز بێ - دوکتۆر قاسملوو لەکن خەڵکی گوتوویەتی فلانە کەس تیپیک ئەندامی حیزبی دێمۆکراتە. یانی ئەگەر بتەوێ یەکێک بکەیە سیمبول بۆ حیزبی دێمۆکرات، ئەوە. دەی گوت ئەو نە بەلای چەپدایە کە بۆخۆی‌و کەریمی حیسامی‌و حەمەدەمینی سیراجی تەمایولیان بەچەپ‌و توودەییزم هەبوو. نە بەلای ڕاستدایە کە هێندێکمان هەبوون کە ناسیۆنالیستێکی بەرچاوتەنگ بوون. پێی وابوو ئەمن سێمبولی ڕێبازی حیزبی دێمۆکراتم. جا لەو بارەیەوە زۆر لێی نیزیک بووم.

تەنانەت جارێکی بەنامە بۆم نووسی کە ئەمن شانازی بەوە دەکەم ئەفکارم لەتۆ نیزیکە. ئەگەر بە قازانجی خۆشم بێ پێمخۆشە ئەوەی بگێڕمەوە. ساڵی ١٣٦٤ ئەمن لەپاریس بووم کە ئەو کات بەنۆرە دەچووینە نوێنەرایەتیی دەرەوە. کاک ڕەسووڵی قادری، دایک‌برای کاک دوکتۆر سەعیدی زۆری کۆمەگ دەکردم، موحیببەتی زۆر دەکرد. ئەمنیش هەموو جارێ سوپاسم دەکرد. جارێکیان چووبووینە جێگایەک نازانم دوکتۆر بوو چ بوو کە لەبەر من چووبووین. کە هاتینەوە، لە ئاسانسۆرەکەدا دووبارە سوپاسم لێ کرد. گوتی ئەرێ ئەو سوپاس سوپاسەت لەچییە؟ خۆ ئەمن بۆتۆی ناکەم. ئەمن بۆ حیزبی دەکەم چونکی دوکتۆر سەعید گوتوویەتی ئەگەر خوای نەخواستە دوکتۆر قاسملوو بمرێ هیچ خەم نیە. چونکی فلانە کەس دەتوانێ تەواوی ئەفکاری دوکتۆر قاسملووی بنووسێتەوە. ئەوە شاهیدیی دوکتۆر سەعیدی بوو. جا دوایە کە دەگەڵ کاک ڕەسووڵی هێندێک بەینمان ناخۆش بوو، پێم گوت کاکە گیان ئەمن نە فریشتەم نە شەیتانم. نە ئەوەی

ئەوەمیت ڕاست بوو کە پێت دەگوتم، ئە ئەوەی ئێستا دەفکرتدا هەیە. گوتی تا ئەمن هەروات تەماشا دەکەم. گوتم تا خۆ ئەمن دەزانم هەڵوێستت گۆڕاوە. بەڵام نە ئەو بووم نە ئەمەم. ئەمن ئێستام.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا دوای جیابوونەوەی ئەو تێکۆشەرانەی دواتر حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران(ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ)یان دامەزراند، کۆمیسیۆنی سیاسی- نیزامی لە بەخشنامەیەکی ئێوخۆیی‌دا ڕەسمەن ئیعلانی شەڕی بە دژ دەرکردن. پرسیار ئەوەیە ئەو کارە بۆ کرا؟ ئاکامەکانی بۆ بزووتنەوەی کورد چی بوون؟ هەڵوێستی ئەوکاتو ئێستات لەو بارەیەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن نالێم شەڕیان لەدژی دەست پێ کردن. بەڵام ئەوەڵەن ئەوە سیاسی – نیزامی نەبوو کە ئیعلامیەکەی دەرکرد. چونکی بەیانێک کە ئەوەی تێدا کرا کە ئەگەر ناو نەگۆڕن و شت نەکەن بە هەموو جۆر دەگەڵیان بەرەوڕوو دەبین، یەک لەوان نیزامی، ئەوە لەتەرەف دەفتەری سیاسی‌یەوە دەرچوو. ئەمن پێم وایە ئەوە یەکێک لە هەڵە تاریخی‌یەکانی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانە. ئەو وەختی بەیانەکە پێش بڵاوبوونەوەی بەمن نیشان درا. چوومە کن دوکتۆر قاسملووی. پێم‌گوت کارێکی زۆر خراپە. گوتی ئەخێر دەبێ مەجبوور بکرێن بەوە. دوایە هاتمەوە دڵم ئاقەتی نەگرت جارێکی دیکەش چوومەوە. گوتم حەتتا ئەگەر بە عەمەلیش دەی‌کەن، بە نووسین مەی‌نووسن. ئەوە عەیبێکی زۆر گەورەیە ئێمە بڵێین لەسەر ئەوەی ناوی ئەوەیە دەی گۆڕن. قەبووڵی نەکرد. دایان بەڕادیۆی بۆ خوێندنەوە. دەتوانم بڵێم لە حیزبی دێمۆکراتدا هیچ کەس نەبوو بە ئەندازەی خوالێخۆشبوو ئەمای عەتیقی موخالیفی ئەو برادەرانە بێ. بەڵام کە خوێندبوویەوە هەڵی‌گرتبوو هاتە کن من. گوتی ئەوەت دیوە؟ گوتم نا. گوتی بۆ بە دوکتۆر قاسملووی نالێی بی‌گۆڕێ ئەوەی تێدا نەبێ. گوتم بۆ بۆخۆت پێی نالێی؟ گوتی بۆخۆم چووم بەقسەی نەکردووم. گوتم ئەمن دوو جار چووم، هەستە جارێکی دیکەش پێکەوە بچین. هەستاین دووبارە پێکەوە چووینە لای دوکتۆر قاسملووی. ئی من بوو بە سێ جار، ئی وی بوو بە دوو جار. بەداخەوە دیسان لێی قەبووڵ نەکردین.

وەک گوتم دوکتۆر قاسملوو بوت نەبوو. چەند جاری دیکەشم گوتوە، شانازی بە زەڕڕە زەڕڕەی خاکی سەر گۆڕەکەشی دەکەم. بەڵام ئینسان بوو قابیلی خەتاو هەڵە بوو. چونکی ئەگەر ئەو قەبووڵی کردبا دەفتەری سیاسی حەتمەن قەبووڵی دەکرد. بەڵام قەبووڵی نەکرد.

جا جارێکی لەکن کاک مەسعوود بارزانی بووین. بانگی کردبووین. لەوێ کاک مستەفای هیجری گوتی ئەو ناوە خوێنی لەسەر ڕژاوە. گوتم ئەو وەختیش موخالیف بووم، سێ جار چوومە لای دوکتۆر قاسملووی کە ئەوە نەبێ. دیارە ئەو بەشانازی دەی‌گوت کە وەختی خۆی ناوا بووم، گوتم کە دەگەڵ تۆش بووم ئەو وەختیش پێم غەڵەت بوو. سێ جار چوومە کن دوکتۆر قاسملووی کە ئەوە نەبێ.

**هەیاس کاردۆ:** بەساز بوونی شەڕ لەنێوان دوو لایەنی دێمۆکڕاتدا، "حیزبی دێمۆکڕاتی کوردستانی ئێران" ڕەسمەن لەسێ بەرەدا شەڕی دەکرد (کۆماری ئیسلامی، کۆمەڵە، ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ). پرسیار ئەوەیە تواناو ئیمکاناتی حیزب چەندە بوو کە بتوانێ ئەو بارە قورسە هەڵگرێ؟ هەڵوێستی کادرو پێشمەرگەکانتان چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نابێ بڵێی توانا چونکی مەعلومە ئەو توانایە نەبوو. ئەگەر شەڕ بەمانای بەچۆک-داهێنانو ئەوە بێ هەر ئێ جمهوری ئیسلامی بەس بوو بۆ ئەوەی. لەپاشانیش دیسان بۆ حەقیقەت بڵێم، بۆ پێ-خۆشبوونو پێناخۆشبوونی هیچ کەس نیە. دەزانم ئەو قسەیەی ئێستا دەی کەم یەکێک پێی خۆشە یەکێک پێی ناخۆشە. بەڵام وەکوو باوەڕ دەی‌ڵێم، حەق نیە بڵێین دوو لایەنی دێمۆکڕات بەشەڕ هاتن. چونکی پیاو حەق بڵێ ئەوانەی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ کە کارەکەیان غەڵەت بوو، بەڵام لەوەی‌دا زۆر لاشەڕ بوون. زۆرجار لەبەر پێشمەرگەکانی مە هەڵدەهاتن. یەک، دوو جار ڕێ‌کەوت کە چەکەکانیان تەسلیم دەکرد دەیان‌گوت ئێمە شەڕ ناکەین. یانی وا نەبوو کە ئەو دوو لایە پێکەوە بەشەڕ بێن. هەڵ‌کەوت کە پێکەوە شەڕ کراو تەقەیان لێکتر کرد، بەڵام بەگشتی ئەوان لاشەڕ بوون. بەهەر حاڵ نە ئەو وەختیم پێ کارێکی دروست بووە و نە ئێستا. ئەوە شتێکە ئەو وەختیشم گوتوە.

پاشان لەسەر هەڵوێستی کادرو پێشمەرگەکانمان. پێموابێ کادرو پێشمەرگەی حیزبی دێمۆکڕات دەگەڵ هەموو ناگاهی‌یان، کادرو پێشمەرگەیەکی مونزەبیت بوون. بەشی زۆری کادرو پێشمەرگەکان - نەک بڵێین هەر ئەوانەی کە بەجۆرێک لەجۆران ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕیان خۆش ویستوە - ئەوانە کە ڕقیشیان لێیان بووە - بەشی زۆرتریان موخالیف بوون. بەڵام مادام حیزبەکەیان بڕیاری داوە، وەکوو ئینزیباتی حیزبی قبووڵیان کردوە، دەنا باوەڕیان پێ نەبوو. تەنانەت لەشەڕ دەگەڵ کۆمەڵەش - کە یەقینەن لەنێو کۆمەڵەش‌دا وا بووە، جا ڕەنگە کەمتر بووبێ - بەشێک موخالیفی ئەو شەڕە بوون. بەڵام وەکوو ڕاگرتنی نەزم قبووڵیان دەکرد. هەر ئەوەش بوو کاتێک حیزبی دێمۆکڕاتی کوردستان دەگەڵ کۆمەڵە ئاشت بۆوەو شەڕی ڕاگرت، لەواقیع‌دا چووکترین ئیعتیراز نەکرا. تەنانەت لەبارەی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕەوە پێش ئەوەی ئەو یەکگرتنەوەیە هەبێ، جارێکی لێرە لەو قەڵایەی دەگەڵ میوانێک باسی ئەوە دەکرا. باسەکە ئەوە بوو کە ئەو بایکۆتە قۆرە لەسەریان هەڵ‌گرین. یادی بەخێر کاک بابەعەلی گوتی بایکۆت لەسەر لادران هەڵ‌گرین دووسەت کادرو پێشمەرگە دادەنیشن. گوتم یەک نەفەریش دانانیشێ. بەڵام ئەگەر کارەکە دروست بێ، لەجیاتی دووسەت، با سێ سەت کەس دانیشن. بڕیارێکی دروست دەبێ بدرێ. بەڵام دوایە کە بووینەوە بە یەک حیزب، تاقە یەک پێشمەرگەش دانەنیشت.

مەبەستم ئەوەیە ئەوە دوو شت دەگەیەنێ. یەکێکیان ئینتزیباتەکەیە. ئەمن دەگەڵ ئەوەی تەبەعییەتم پێ خراپە، بەڵام ئینتزیباتم پێ باشە. چونکی هەر حیزبێکی ئینزیباتی دەنێودا نەبێ بە تایبەت لە وڵاتێکی وەک وڵاتی ئێمە، کارەکانی بەرەوپێش ناچن. نیشانەکەی دیکە ئەوە بوو کە خەڵکەکە لەوەی ڕازی نەبوون. یانی بەو سیاسەتەی گیراوەتە پێش ڕازی نەبوون. ئەوە هەر لەبەر ئینتزیباتەکە بوو دەنا هەمو خۆیان لەشەڕی کۆمەڵەی دەبوارد. تەنانەت لەشەڕ دەگەڵ برادەرانی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕدا هێندێک لە فەرماندەرانمان هەر نەیان کرد. یانی نەیاندەویست بیکەن شتەکە ڕوون بوو.

## تیرۆری دوکتۆر قاسملوو

**هەیاس کاردۆ:** دوای ڕاگرتنی شەڕی ئێران- عێراق، بێ ئەوەی بەدەنەی حیزب هەست بکا، یان وەکی دەڵێن ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندییش بزانن، سکرتێری گشتیی حیزب بەشێنەیی خەریکی دانیشتن دەگەڵ نوێنەرانی ڕژیم بوو. تۆ کە ئەوکات لە ڕێبەریدا تەبووی هیچ زانیارییەکت لەو بارەیەوە هەبوو؟ پێم باشە ئەو مەسەلەیە زیاتر شی کەیەوە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕاستییەکەی زۆرم پێ شی ناکرێتەوە. چونکی ڕەنگە لەدوایە شتی دیکەت بۆ دەرکەوێ. بەڵام هەتا دوکتۆر قاسملوو لە ژیاندا مابوو هیچ مەسەلەیەکی ئەساسیی گشتیم وەبیر نایە کە لە منی شاردبێتەوەو دەگەڵی باس نەکردبم. کەچی لە دوورو نیزیک ئەو مەسەلەیەی دەگەڵ من باس نەکرد کە کارێکی ئاوا هەیە. تەنیا یەکجار بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەر وەکی باسم کرد لێی پرسیم گوتی ئەگەر دەوڵەتی جمهوریی ئیسلامی بیەوێ موزاکەرە بکا پێتوایە چ بکەین باشە. ئەمن گوتم پێموایە سیاسەتی حیزبی دێمۆکرات لەو بارەیەوە ڕوونە. ئەگەر ئەوان بیانەوێ موزاکەرەیەکی ئوسوولی بکەن بۆ دەبێ ڕەتی کەینەوە؟ ئەوەم کە ئاوا بە یەک دەقیقە گێڕایەوە ڕەنگە بیست دەقیقەی خایاندبێ. بەڵام ئەوە کە شتێکی ئاوامان هەیە ئەمن ئاگام لێ نەبووە هەتا ئەو ڕۆژەی دوکتۆر شەهید بوو. ئەو ڕۆژە هەم جومعە بوو هەم جێژنی قوربان بوو. ئێمە لە ماڵێ بووین لە "ئێندزێ". کاک مستەفا ئەندامی دەفتەری سیاسی بوو. ئەمن ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی نەبووم، بەڵام شەهید دوکتۆر سەعید لەدوای ناردین هەردووکمان چووین. دیارە ئەو شۆفیرەی بەدوامانەدا هاتبوو (ئیرەج) لە ڕێگایە گوتی گۆیا لە ئوتریش تەقە لە چەند کوردەی ئێرانی کراوە. بەڵام کە چووین دوکتۆر سەعید باسی کرد، ئەمن پێم وابوو عێراق کوشتوویەتی. چونکی دوای بۆمبارانی هەڵەبجەی کاک دوکتۆر قاسملوو هێندێک شتی گوتبوو، بۆیە پێم وابوو کاری عێراقە. دوکتۆر سەعید گوتی نا ئەتۆ ئاگات لە هێندێ شت نیە. گوتی موزاکەرە هەبووەو شتی ئاوا لە نێوماندا ڕابردوە. ئەوجار گوتم کەوابوو مەعلوومە موزاکەرە هەر بۆ کوشتنەکەی بووە. هەتا ئەو وەختی نەمزانیبوو.

**عەباس کاردۆ:** کۆمیتەی ناوەندییش ئاگای لێ نەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کۆمیتەی ناوەندی ئاگای لە کولییاتەکەی هەبوو، بەڵام ئاگای لە جوزئییاتەکەی نەبوو. دەفتەری سیاسیش ئاگای لە هەموو شتێکی هەبوو. هێندێک کەس وایان گوتوە کە گۆیا دەفتەری سیاسی ئاگای لێ نەبووە. بەڵام نا دەفتەری سیاسی لە کەم هەتا زۆر ئاگای لە هەموو شتێکی بووە.

**عەباس کاردۆ:** ئاکامی دانیشتنەکانی شەهید دوکتۆر قاسملوو دەگەڵ نێردراوانی ڕژیم بۆ هەموو لایەک ڕوونە. سەرجەمی ئەو کارەساتە لە نێوخۆی حیزبدا چۆن لێک درایەوەو چ کاریگەرییەکی لەسەر کارو تێکۆشانتان هەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لێکدانەوە لە خودی کارەساتەکە لەڕاستیدا لە وەختی حادیسەکەدا نەبوو. ئەو وەختی زیاتر ئەوە بوو کە دەبێ چ بکەین. بە یەشک لەدەستدانی دوکتۆر قاسملووی موسیبەتێکی گەورە بوو. خەسارێکی گەورە بوو لە حیزبی دێموکرات بەتایبەتیو بزووتنەوەی کورد بەگشتی کەوت. بەڵام بێجگە لەوەش بەتایبەتی خەسارە گەورەکە، یان خەسارە ڕووحییەکە لەوەدا بوو کە سەرمایەیەکی ئاوا گەورە، بە هەرزانیو بێ‌موبالاتی لەدەست چووە. لە جێگایەکی دیکەدا باسمان کرد لە پێوەندیی دوکتۆر قاسملوو و مام-جەلالیدا. کە هێندێک دەڵێن ئەخیر یەکیەتیو مامجەلال بوون. بەڵام پێم وایە خەتاباری یەکەم ئاخر هەر خودی دوکتۆر قاسملووی بوو کە چۆن ئاوا باوەڕی بە دوژمن کرد. پێموایە ئەو شوێنەی ڕووداوەکەی لێ ڕوودا، دەگەڵ ئەو شوێنەی ڕەفیقەکانی خۆمانی بەزۆر دەرکردوو نەی‌هێشتوە دەگەڵی بچن، سەت میتری بەین نیە. نیزیکترین ڕەفیقەکانی خۆمان لەوێ کە میوانیان بووە باوەڕی پێیان هەبووە، دەگەڵی بوونە بەزۆر گێڕاونیەوە. پێی گوتوون ئەوە تاقیم دەکەن. باوەڕم پێ‌ناکەن؟ جا ئەوە بۆخۆی زۆر تاڵ بوو.

بەڵام بەڕاستی حیزبی دێموکرات لەو حادیسەیەدا نیشانی دا کە ڕەگی داکوتاوە. ئەوەشی نیشان دا کە ڕێبەرانێکی وەکوو قازی موحەممەدو دوکتۆر قاسملووش ڕێبەری واقیعی بوونە حیزبیان پێ گەیاندوە. چونکی دیارە خەلکی دیکەش گوتوویانەو ئەمنیش بەو عیبارەتە دەڵێم کە ڕێبەرێکی واقیعی هەر ئەوە نیە هەتا بۆخۆی هەیە کارەکان بە باشی بڕۆن. ڕێبەرێکی واقیعی ئەوەیە لەحاڵی حەیاتیشیدا کارەکان هەر بۆخۆی نەکا بەڵام بەڕێوە بچن. لەپاشانیش ئەگەر مرد هەموو شتێک دەگەڵ خۆی نەبا. خەتێکەو ڕێبازێک بێڵێتەوە کە بەردەوام بێ. ئەمن جاری دیکەش گوتوومە دوکتۆر قاسملوو هەر وەک ئەوەی بەجۆرێک لەجۆران بیری لەوە کردبێتەوە کە ڕۆژێک بەجێمان دێڵێ، زۆر ساڵ بوو جۆرە تەمرینێکی بە ئێمە دەکرد. دەرۆیی سێ مانگ، چوار مانگ، پێنج مانگ بەجێی دەهێشتین. دەیەویست بزانێ داخوا کارەکان بەڕێوە دەچن یان نا. دیارە کەوتبوە سەر گەڕو دەرکەوت بەبێ ویش کارەکان بەڕێوە دەچن. لە شەهیدبوونیدا ئەوە بەتەواوی

دەرکەوت کە دوکتۆر قاسملوو ئەوەندەی کار کردوە کە ئەگەر بۆخۆشی نەبێ، ڕێبازەکەی نەفەوتێ‌و ڕێگاکەی کوێر نەبێتەوە.

شتێکی دیکە ئەوە بوو کە ئەو شوێنەوارەی هەر لەسەر ئەندامانو تێکۆشەرانی حیزبی دانەنا. شوێنەوارەکەی لەسەر کۆمەڵانی خەڵکیش دانا. لاوانی کورد وا دیار بوو ئیلهامیان پێ کرابوو کە دەبێ بەجۆرێکی دیکە بێنە مەیدان. دەبێ ئەو کەلێنە پڕ کەنەوە. دوکتۆر قاسملوو لە ٢٢ی پووشپەڕدا( ١٣ی ژوونیە) شەهید بوو. تا کەوتینە ئاخری ساڵ، زیاتر لە ٤٨٠ لاوی تازە هاتنە ڕیزی پێشمەرگایەتی. لەبیرمە هەر لەو وەختەدا کە خەبەرەکە گەیشت، دەفتەری سیاسی پەیامێکی بە هێزەکان دا. ئەو کات زۆربەی کادرو پێشمەرگەی هێزەکان لە نێوخۆی وڵاتو لە شوێنی کارو تێکۆشانیان بوون. پاش دانی خەبەرەکە گوترابوو دوکتۆر قاسملوو ڕۆیی، بەڵام ڕێبازەکەی ماوە.

تەنانەت یەکێک لەو کارانە کە دەفتەری سیاسیی ئەو وەخت کردنی، ئەوە بوو کە هەوڵ بدا پێشمەرگەکان لە نێرخۆدا تۆزێک کۆنترۆڵ بکا کە ئیحساسات نەیانگرێ‌و نەکەونە هەستی تۆڵەئەستاندنەوەیەک کە زەرەر بەخۆشیان بگەیەنێ. یانی خۆیان بەناو ئاوردا بدەن. دەنا بەڕاستی ئەگەر وا نەبا، خەتەری ئەوە هەبوو کە پێشمەرگە بەتۆڵەی ئەو زەبرە گەورەیەی دوژمن لە ئێمەی داوە بەبێ موتالەعە هێرش بکەنە سەر بنکەو پایەگاکانی دوژمن. پێموایە بۆخۆشت لەبیرتە کە خەبەرەکەشمان بە پێخۆر دەرخواردی خەڵکی دا. ئەووەڵێ ئاگاداری‌یەکی چووکەڵەمان بڵاو کردەوە کە بەپێی خەبەرێکی گەیشتوو لە ئورووپاوە، دوکتۆر قاسملوو لەلایەن چەند کەسێکەوە تەقەی لێ کراوە. ئێمە دەگەڵ کۆمیتەی حیزب لە ئۆتریش دەتەماس‌داینو دوایە لە جەڕەیانی شتەکەی ئاگادارتان دەکەینەوە. ئەو وەختی ڕادیۆ سێ جار بەرنامەی بڵاو دەکردەوە. بەرنامەیەکیان دوازدەو نیوی نیوەڕۆیە بوو. بەرنامەیەکیان پێم وابێ پێنج یان پێنجو نیوی ئێواریێ بوو. بەیانیش دووپات دەبۆوە. ڕۆژەکانی دیکە ئەو سێ بەرنامەیە هەموویان یەک بوون. بەڵام ئەو ڕۆژەی گۆڕیمان. لە بەرنامەی نیوەڕۆیەدا هەر ئەو شتە کورتە بوو. لە بەرنامەی پاش نیوەڕۆیەدا بەیاننامەکە ئامادە کرا. لەبیریشمە ئەمن چوومە خزمەت دوکتۆر سەعیدی گوتم ئەتۆ مەشغوولی، خەڵک دەورەت دەدەن. قەیدێ ناکا ئەمن دەچم بەیانەکەی دەنووسم. بەیانەکە ئەمن نووسیم.

نازانم بە چ حاڵێکم ئەو بەیانە نووسی، یانی زۆر تاڵ بوو. دەڵێن بۆ شۆڕشگێڕان خەمداگرتن نابێ. دوکتۆر قاسملوو دەڵێ بۆ شەهیدەکانمان ناگریین. بەڵام دڵ بەردیش بێ لەو وەختانەدا دەبێتە ئاو. زۆرجار سەرم لادەبرد هەتا ئەوەی نووسیومە بە فرمێسکەکانم ڕەش نەبێتەوە. جا لەبیرمە برادەرێکمان با ناویشی بەرم کاک جەعفەری شەریعەتی کە ئاگای لەحاڵی من نەبوو، گوتبووی ئەو کابرایە دڵی بەردە چۆنی ئەو بەیاننامەیە بۆ نووسراوە. ئەمن زۆرجار وەبیرم دێنایەوە کە ئەوە بەشێکە لە ئامۆژگاری‌یەکانی دوکتۆر قاسملوو.

تازە کۆنفرانسی سێ گیرابوو. شەهید مەلا قادری ویردی ببوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. ساڵێکی بەسەردا تێ‌وەرنەسووڕابوو کە لە شاری بانە شەهید بوو. ئەووەڵ شەهیدی کۆمیتەی ناوەندی لەو دەورانەدا بوو کە ئێمەی تێدا بووین. یانی لەپاش ساڵەکانی ٤٦-٤٧. زۆر عەجایب ناڕەحەت بووین. ئەگەر بڵێم ئەو وەختی تەئسیری لەسەر ڕووحییاتی ئێمە لە شەهیدبوونی دوکتور قاسملووی پتر بوو زیادم نەگوتوە. وەختێک دوکتور قاسملوو شەهید بوو هێنایەمان ئەو شتانە دیبوون بەجۆرێک لە تەقە هەڵاتبووین. بەجۆرێک ڕاهاتبووین. ئەو وەختی هەمووومان دەگریاین. دوکتور قاسملوو خەریک بوو لە ناڕەحەتی‌یان بتەقێ، بەڵام نەدەگریا. ئایا هەر گریانی ئەدەمەت یان چونکی مەسئوول بوو دەبوو لەبەر ئێمە خۆ ڕابگرێ، نازانم. لەپاشان پیلی منی گرتو گوتی هەستە با بچینە ئەو دیوەی سەرێ بەیاننامە بنووسین لێرە ناکرێ. زۆرێک بوو چووین لەوێ گوتی بنووسە. گوتم مێشکم هیچی تێدا نیە هیچم بۆ نانووسرێ. گوتی خۆ ئەمن دەتوانم بنووسم بەڵام دەبێ فێر بی. ئەوە سەرەتای کارە. چەند کەلیمەیەکی پێ‌گوتم گوتی ئاوا بنووسەو بەجێی هێشتم. مەجبووری کردم بۆخۆم بنووسم. بەیاننامە لەسەر شەهید مەلا قادری ویردی ئەمن نووسیم.

جا ئەمن گوتم ئەوە دەرسەکە بوو کە دوکتور قاسملوو فێری کردم کە دەبێ لە وەختی ئاوادا دەفکری کارەکاندا بی. خەفەتەکە بەجێی خۆی بەڵام دەبێ کارەکان بکەی. بەهەر حاڵ لەباری تەئسیرەکەیەوە دەگەڵ ئەوی موسیبەتێکی گەورە بوو، زەبرێکی گەورە بوو وە ڕووحی هەموولو ئازادیەک وەکۆشکی هیواو هومێدی خەڵکیش کەوت. بەڵام ئەو دژکردەوەی تێدا بوو کە دەبێ جێگاکەی پڕ بکرێتەوە. جا بەخۆمان زانی یان بەخۆمان نەزانی، یان خەڵکەکە بەخۆی زانی یان بەخۆی نەزانی.

بەڵام هەڵسەنگاندنو لێکدانەوەی ڕەسمی لە حادیسەکە نەکرا هەتا کۆنگرەی نۆ. لە ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی نۆدا، نازایانەو بەڕاشکاوی ڕەخنە گیرابوو لەوەی کە ئێمە بۆ وامان لێ‌هات. ئەدەبوو وامان لێ‌بێ. شەهید دوکتور شەرەفکەندی نووسیبوویەو فۆرمووڵەی کردبوو، لەوەدا ئینتیقادی گرتبوو کە بەداخەوە ئەویش بوو بە عالیمی بێ عەمەل. ئەو زۆر خراپتر کەمتەرخەمیی نیشاندا. چونکی ئی دوکتور قاسملووی شتێکی ئاوا بۆ من دەرنەکەوت. بەڵام ئی دوکتور سەعیدی دەرکەوت کە پۆلیسی ئەڵمان گوتوویەتی ئێمە نیگابانت بۆ دادەنێین. قبووڵی نەکردوە. یانی پێ‌یان گوتوە قبووڵی نەکردوە. بۆیە خەتایەکەی گەورەتر بوو. ئەمن لەبیرمە کە چووین بۆ تەشییع جەنازەی دوکتور قاسملووی، پۆلیسی فەڕانسەش هاتن گوتیان دەبێ نیگابانتان هەبێ. لەدوایە کردیانە شەرت هەر سکرتێرێکی حیزبی دێموکرات نیگابان قبووڵ نەکا ویزای نادەنێ. تەنانەت جارێکی لە "ڕۆم"ێ بووین لە کۆبوونەوەی ئەنتێرناسیۆنال سۆسیالیست کە ئەو وەختی ئەش بووین بە ئەندام. بەڵام باسی مەسەلەی کوردو ڕۆژهەڵاتی ئێوەڕاست بوو. ئێمە گوتمان ئەوە مەسەلەی کوردو ڕۆژهەڵاتی ئێوەڕاستەو ئێمەش لێرین دەمانەوێ قسان بکەین. وا بوو

موافەقەتیان کرد قسە بکەین. هەر لەوێ خێرایەکی ئەمن پەیامێکی کورتم نووسی و دامان بە بەشی تەرجەمە بە زمانەکانی دیکەش خوێندرایەوە. ئەمن چووینە پشتی تریبوون بۆ خوێندنەوەی وتارەکە. هەتا هاتمەوە پۆلیسی ئیتالیا لەسەر جێگاکەی ئێمە ئامادە بوون و گوتیان لەئێستاڕا دەبێ نیگابان قبووڵ بکەن. دەگەڵ ئەوەی موحافەزەتێکی توندیش لە هۆتێلەکە و سالۆنەکە هەبوو، بەڵام گوتیان دەبێ ئێوەش نیگابانتان هەبێ. ئیدی ئەوجار دوو ماشێنی پۆلیس و چوار پۆلیسی مەخفیمان ڕەگەڵ کەوتن. وا بوو ئێمە بە دەلایلێک دوو ڕۆژ زیاتریش لە کۆبوونەوەکە لەوێ ماینەوە، هەتا ئەو وەختەی سواری تەیارەیان کردین دەگەڵمان بوون.

**هەیاس کاردۆ:** دوای تیرۆری دوکتۆر قاسملوو و هاوڕێیانی، هەر چەند جەنابت ئەندامی ڕێبەریی حیزب نەبووی بەڵام بۆ بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنیان ڕەوانەی پاریس کرای. ئایا ئەوە لەبەر نزیکیی تۆ بە دوکتۆر بوو یان هۆی دیکەی هەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە پێم وایە دەزانی کە ئەمن بەتەنیا نەبووم. کاک حەسەنی شەرەفی وەک ئەندامی دەفتەری سیاسی و ئەمن پێکەوە چووین. هەرچەند کاک حەسەن ئەندامی دەفتەری سیاسی بوو بەڵام بە حوکمی ئەوەی ئەمن تەمەنم زیاتر بوو یان هەرچی بوو بە کردەوە نەفەری یەکەمی هەیئەتەکە ئەمن بووم.

**هەیاس کاردۆ:** بەڵام لەبەر تەمەن نەبووە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر لەبەر تەمەن نەبوو. ڕاست لەبەر ئەوەی بوو کە ئەمن دەگەڵ دوکتۆر قاسملووی زۆرتر لێک نیزیک بووین و زیاترم لەسەر وی دەزانی. ئەوانە بوون زیاتر. لە مەراسیمەکەشدا ئەزاری خەڵکی زیاتر ڕووی دەمن بوو. لە کۆنفرانسی مەتبووعاتییشدا ئەوەی وەپێش کەوت بۆ قسە کردن و پتریشی قسە کرد هەر ئەمن بووم. پەیامەکە ئەمن نووسیم. پەیامەکە ئەمن خوێندمەوە. لەدوایە کە بڵاو بۆوە، درابوو بە بەغدایە و لە بەغداشڕا بە بێسیم درابوو بە ڕادیۆی. دوایە بۆم دەرکەوت کە بەناوی وتاری کاک حەسەنی شەرەفی لە ڕادیۆ خوێندراوەتەوە. بەڕاستی ڕەنگە کەمجار وا هەبووبێ، بەڵام ئەو سەفەرەی پێم ناخۆش بوو. ئەگەر گوتبای وتاری هەیئەتی حیزب لەسەر گڵکۆی شەهیدان، هەر بەو جۆرەش لە ڕۆژنامەدا چاپم دەکرد. بەڵام کە ڕاست دابوویان بە کاک حەسەنی شەرەفی، پێم وابوو غەدرێکە، ناحەقییەکە. پێم وایە ئەتۆش شاهیدی کە هەرچی ئەوانەی ئەهلی قەڵەم بوون، کە گوێیان لێ ببوو گوتبوویان ئەوە قەڵەمی کاک حەسەنی شەرەفی نیە. ئەوە نووسینی فلانکەسە. پێیان وابوو کە ئەو خوێندوویەتەوە، بەڵام زانیبوویان ئەو نەینووسیوە. لەڕاستیدا هەم نووسینەکە نی من بوو هەم بۆخۆشم خوێندمەوە. جا بۆیە کە گەڕاینەوە و لە ڕۆژنامەدا چاپمان کرد هەر بەناوی قسەکانی عەبدوڵڵا حەسەنزادە بڵاو کرایەوە. یانی دەلیلەکە هەر ئەوە بوو کە ئەمن لە دوکتۆر

قاسملووی تێزیکتر بووم و زۆر پێکەوە ژیابووین. ئەو وەختی ئەوا (کاک حەسەن) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییش نەبوو ئەمن جێگری دوکتۆر قاسملووی بووم. یانی ئەگەر ئەو جارەش حیساب کەم کە باسمان کرد، یانی جێگر نەبووم بەڵام دای نابوو ئەمن کارەکانی لەجیاتی بکەم. سێ دەورە جێگری سکرتێر بووم. هەمووی ئەوانە باعیس بوون کە دوکتۆر سەعید پێشنیاری کردبوو و دەفتەری سیاسییش پەسەندی کردبوو کە ئەمن بچم.

**هیوا کاردۆ:** بەڵام بۆ دوکتۆر سەعیدی وا نەبوو کەچی بۆ ئەویش ئەتۆ هەر چووی. خۆ دەلیلی ئەوە نەبوو دەگەڵ وی زۆر لێک نیزیک بوون.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە بۆ دوکتۆر سەعیدی شتێکی دیکە لەئارادا بوو. دەکری بڵێم جگە لە هەمووی ئەوانە، ئەمن پێشتر بەنیازی سەفەرێکی دەرێ بووم. ویزام بۆ هاتبوو. یانی ویزام وەرگرتبوو کە بڕۆم. بۆیە ئامادەتر بووم. چونکی ویزا وەختێکی دەویست. هەرچەند جارەکەی پێشتر زۆر سەریع ویزایان دابێنی. بەڵام بۆ شەهادەتی دوکتۆر سەعیدی ویزام بۆ هاتبوو بۆ نۆروێژێ. ئەو سەفەرەی بە نۆروێژێدا ڕۆیشتم. بەڵام جاری پێشوو کە دوکتۆر قاسملوو شەهید بوو ئێمە هەر لە بەغدایە سواری تەیارە بووین. ڕەنگە ئەوەشی تێدابێ کە ئاوا هاسانتر بوو. لەوانەیە کاک مستەفای هیجرییش کە جێگری سکرتێر بوو بە باشی زانیبێ ئەمن بچم.

**هیوا کاردۆ:** باشە ئەو جارەیان هەر خۆت بە تەنیا بووی؟
**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ئەو جار هەر ئەمن بە تەنیا بووم.

**هیوا کاردۆ:** دەزانم هەتا ئێستا چ بەنووسین چ بە قسەو چ بە درێژدانی ڕێگا، ئەژگریی خۆت بە کەسایەتیی دوکتۆر قاسملوو نیشان داوە. بەو حاڵەش کەسانێک پێیان وایە تۆ موخالیفی کارو کردەوەکانی ئەو شەهیدە بووی و بەتایبەت ویستووتە دوای شەهید بوونی کەمڕەنگی بکەی. وەک مێژوو پێمخۆشە بزانم کۆی بۆچوونەکانت لەسەر دوکتۆر قاسملوو چی بووەو ئێستا چین؟
**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێموایە لە هەموو ژیانی خۆمداو لەو جێگایانەش کە باسم کردوە، بیروبۆچوونی من لەسەر دوکتۆر قاسملووی دەرکەوتوە. ئەمن زۆر بە سەراحەت گوتم دوکتۆر قاسملوو بۆ من هەم ئۆلگوو بوو هەم مامۆستا بوو. بەڵام نە بوت بوو نە فریشتە بوو. وا بووە شەڕم دەگەڵ کردوە. زۆر جار ئینتیقادم لێ کردوە. زۆر جار بە هەڵوێستەکانی ناڕازی بووم. هەتتا ساڵی ڕابردوو لە بیرەوەریی بیست ساڵەیدا داوایان کرد ئەمن قسەی لەسەر بکەم. لەوێدا گوتم کە دوکتۆر قاسملوو بۆخۆی دەڵێ ڕۆژی ٢٥ی سەرماوەزی ١٣٢٥ قازی موحەممەد هەڵەیەکی گەورەی کرد کە بەپێی ئەرتەشی شاهەنشاهییەوە چوو. ئەمنیش دەڵێم دوکتۆر

قاسملوو هەڵەیەکی مێژوویی کرد، زەربەیەکی گەورەی لە خەڵک‌دا کە بۆخۆی بە لاقی خۆی چووە تەڵەی دوژمنەوە. دیارە لە کاری ڕۆژانەشدا ڕەخنەم هەر لێ گرتوە.

ئەو کەسانەی ئەو قسانەیان کردوە بۆخۆیان زۆر چاک دەزانن ڕاست ناکەن. بۆخۆیان باوەڕیان پێی نیە. بەڵام ئەوان نانیان لەوەی خوارد. ئەگەر بە قسەیەکی باتڵ یەکێک یان چەند کەسێک دەتوانن نانێک بخۆن با بی‌خۆن.

**هەیاس کاردۆ:** مەسەلەی کۆنترۆڵی ماڵی لەلایەن سکرتێرەوە، چ لە کاتی ژیانی دوکتۆر قاسملوو داو چ دواتر وەک گرێ‌پووچکەی قەت نەکراوە مایەوە. لەو بارەیەوە دیارە دەنگۆی جۆراوجۆریش بڵاو دەبوونەوە کە ڕاستی‌و ناڕاستی‌یان هەتا ئێستاش دەر نەکەوتوە. پێت‌خۆشە دەرگای ئەو باسە بکرێتەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم‌خۆش نیە ئەو باسە زۆر بکرێتەوە. بەڵام لەو بارەیەوە پێم‌خۆشە لێی بدوێم کە دیسان موخالیفان بۆ ئەوەی لە شەئنی دوکتۆر قاسملووی کەم کەنەوە، تۆمەتی زۆریان لێ دا. ئەو دارایی‌یەی حیزب کە لەدەرێ هەمانبوو، هەتا دوکتۆر قاسملوو مابوو هەمووی بەدەستی ویەوە بوو کە ئەوە کارێکی خراپ بوو. ئەوە بۆخۆی دوایە دەرکەوت کە کارێکی خراپە. یانی لە باری قانوونی‌یەوە گیروگرفتێکی زۆری پێک‌هێنا. دوکتۆر قاسملوو نامەیەکی نووسیبوو و ئیمزای کردبوو کە هەرچی بەناوی من هەیە لەدنیادا، لە پووڵو ئەموالی مەنقوولو نامەنقوول هەمووی هی حیزبی دێمۆکڕاتی کوردستانی ئێرانە. ئەگەر ئەمن شتێکم بەسەر هات هێلینی قاسملوو لەسەریەتی هەموو ئەو شتانە کۆ بکاتەوەو تەسلیمی حیزبی دێمۆکڕاتیان بکا. بەڵام وەختێکی دوکتۆر قاسملوو شەهید بوو حادیسەکە ئەوەندە چووک نەبوو کە بێدەنگ بڕوا. نەسرین خانم هەوڵی دابوو ئەو مەوجوودییەی هەمانە مونتەقیلی بکا بە حیسابێکی دیکە. یانی حیسابێکی دیکە کە ئی خۆیەتی بۆ ئەوەی بپارێزێ.

**هەیاس کاردۆ:** باشە دوکتۆر قاسملوو وەکیلی نەبوو هەتا سەنەدەکانی لەلا دابنێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەکیلەکەی ئەو بوو. کاغەزەکە لەسەر دەستی دادگاو ئەوانە نەبوو. جا ویستبووی شتێکی ئاوا بکا. چونکی وەکیلی بوو حەقی هەبوو هەموو تەسەڕڕوفێک لەو حیسابەدا بکا. کە داواکەی کردبوو پێ‌یان گوتبوو خانم موەککیلی تۆ مردوە. ئەتۆ ئێستا ئیدی ناتوانی دەوەی‌دا تەسەڕڕوف بکەی. بۆیە نەی‌توانی دۆلارێک مونتەقیل بکا. لەپاشان بۆ ئەوەی ئەو ئەموالەی کە هەبوو لەدەست حیزبی دێمۆکڕات دەر نەچێ، نەیێتە میراتی شەخسی دوکتۆر قاسملووی، کارو زەحمەتێکی زۆری ویست. هەزینەیەکی نیزیک

بە دوو سەت هەزار دۆلارێکیشی تێ‌چوو. بەڵام دوایە شەهید دوکتۆر سەعید بە دەرسوەرگرتن لەوە کارەکەی کردە کارێکی جەمعی. یانی بەناوی هەیئەتێک نەک بە ناوی حیزبی دێمۆکرات سەبتی کرد. هەر ئەوەش بوو وەختێک دوکتۆر سەعید شەهید بوو هیچ گیروگرفتێک نەماتە پێشێ. نەخێر هیچ موشکیلەیەک نەماتە پێشێ. یەکێک لە ئەندامانی ئەو ئاسۆسیاسیۆنە مردوە. ئاسۆسیاسیۆن دەتوانێ یەکی دیکەی لەجێگا دابنێ کە داشی نا.

بەڵام ئەوە کە تۆمەتیان لێ دەدا، بۆ دوکتۆر قاسملووی ئەوەندە کافی‌یە کە تەنانەت کتێبەکانیشی نەکردە میرات بۆ منداڵەکانی‌و خێزانی. قەڵەمێکیشی بۆ ئەوان نەکردە میرات. هەرچی بووی بە پێی وەسیەتنامەیەک کە هەیبوو ئەموالی حیزبی دێمۆکرات بوو. هەرچەند وەسیەتنامەکە لەسەر دەستی دادگاو مەراجیعی ڕەسمی‌و قانوونی نەبوو. هەروا خۆبەخۆیانەتی بوو ئەی‌توانی ئەو تەئسیرەی هەبێ. دەواقیعدا کۆمەگێکمان کرا، دەنا ئەو ئەمواڵە دەبوو بە میراتو تەنانەت وەکی ئەو وەخت باسیان کردو لەبیرمە کە نازانم چەند بوو، بەڵام وا بزانم سەتا ٥٥ی دەگەڕایەوە بۆ دەوڵەتی ئێران.

**عەباس کاردۆ:** یانی چۆن دەچوو بۆ ئێران؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەکوو مالیات لەسەر میرات دەچوو بۆ دەوڵەتی ئێران. ڕەقەمەکە سەتا ۳٥ بوو یان چەند زۆر موهیم نیە چونکی چاکم لەبیر نەماوە، بەڵام مەبلەغێکی بە پێی قانوون دەدرا بە دەوڵەتی ئێران. ئەوە قانوونە کەسێک کە بابی دەمرێ‌و میراتێکی زۆری بۆ دەمێنێتەوە، بەشێک لەو میراتەی دەدرێ بە دەوڵەت. ئەویش ئێرانی بوو و بە پێی قانوون دەبوو بدرێ بەو دەوڵەتە. جا زەحمەتو تێکۆشانو تەنانەت هەزینەیەکی زۆری ویست هەتا سابیت بکرێ‌و قەبووڵ بێ کە ئەوە پووڵی قاسملووی نەبووە. ئەو ماڵە ماڵی دەزگایەکی ناوا بووە. دەنا دوکتۆر قاسملوو یەکجار بدری بوو لەوانە.

زۆر جار تۆمەتی عەجایبی بۆ هەڵ‌دەبەسترا. نازانم ئەتۆ لە کۆنگرەی ٧ بووی یان نا. تەواو بوونی کۆنگرە هاوکات بوو دەگەڵ ساڵڕۆژی لەدایکبوونی دوکتۆر قاسملوو. ویستمان جێژنێکی بۆ بگرین بێ ئەوەی بۆخۆی بزانێ. ئەمن بۆخۆم قەڵەمێکم هەبوو ئەو قەڵەمەم دانا. ئاردم دەستێک لیباسیشی بۆ هاتە. دەمانچەیەکم شک دەبرد کە نی خۆی بوو. ڕەنگە هەستی کردبێ بەڵام گوتم کارم بەو دەمانچەیەتە. دەمانچەکەشم لێ‌وەرگرتە. لەوێ چوومە پشتی میکرۆفۆنو گوتم ئەو جێژنە هاوکاتە دەگەڵ جێژنێکی دیکەش کە ساڵڕۆژی لەدایکبوونی دوکتۆر قاسملوویە. ئەمن وەک سەمبولێک ئەو دیاری‌یانەی دەدەمێ. ئەوە قەڵەمو دەمانچە کە یەکیان بۆ سیاسەتو ئەوی دیکەش بۆ خەباتی چەکدارانەیە. ئەو دەستە لیباسەشە کە هیوادارم بە لەشی ساغی بدرێ، هەروا بۆ قسەی خۆش. جا شتێکی ناوامان کرد.

پاش ماوەیەک چوومە بەغدا. دۆستەکانی منیش و دۆستەکانی دوکتۆر قاسملووش گوتیان شتێکت لێ دەپرسین بەڵام تۆخودا ڕاست بڵێ. گوتم فەرموون. گوتیان بیستوومانە دوکتۆر قاسملوو جێژنێکی لەدایک‌بوونی گرتووە ١٥٠ هەزار دیناری تێ‌چووە، یانی نیزیک ٥٠٠ هەزار دۆلار. دۆستە کوردەکانمان پێیان ناخۆش بوو قاسملوو کارێکی وا خراپی کردبێ. شتی ئاوا ساز دەبوو. لەپاشان هەر بۆ ئەوەی قسە خۆشەکانمان باس کردبێ، بەینێکی فێر ببوو هەتا باسی قسان دەکرا دەی‌گوت ئەمنیش ٥ دینارم هەیە. ئەویش نازانم چ بوو، ڕۆژێک داوای ٥ دیناریان لێ کردم. گوتم ئەرێ دوکتۆر ئەتۆ ٥ دینارت پێ نیە بمدەیەی؟ دەشم زانی هەر ئەو ٥ دینارەی هەیە. گوتی با هەمە. ٥ دینارەکەم لێ‌وەرگرتو ناردم. یانی ئەساسەن ئەو پیاوە ئەوەندە ئازادە بوو کە پووڵی وەرنەدەگرت. هەمووی ئێمە یارمەتی‌یەکمان لە حیزب وەردەگرت کە دیارە ئی هەموومان هەر کەم بوو. ئەو ئەوەشی وەر نەدەگرت بەڵام دەبوو نانی بخوا. یانی سکرتێری ئانەزگ بوو. ئەوە نەبوو کە ماڵی دنیایە کۆ کاتەوەو میرات بۆ منداڵەکانی بەجێ بێڵێ. شتی وای تێدا نەبوو.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا هەر لەو پێوەندی‌یەدا پێم‌خۆشە بزانم چۆن بوو ئەسرین خانمی خێزانی دوکتۆر قاسملووی دواتریش لەبەشی کۆنترۆڵی ماڵیی حیزبدا مایەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەسرین خانم لە شتێک‌دا هەبوو. دیارە پیاو حەق بڵێ ئەگەر ئەو کۆمەگی نەکردبایە ئەو ئەموالە نە کۆ دەبۆوەو نە دەبوو بە ئی حیزبی دێمۆکرات. ئەو کۆمەگی کرد بۆ ئەوە. هەتا ماوەیەکیش لە شتێک‌دا کە دروست ببوو وەک کۆمیسیۆنێک، ئەندام بوو. لەپاشان بە دەلایلێک کە شتەکە کەوتە سەر ڕەواڵێک کە چەند کەسێک لەوانەی دە حەڵقەی حیزبی‌دا بوون بەسەر ئەو دەخل و خەرجە ڕادەگەیشتن، ئەو هاتە دەرێ. ئەو ئێستا لەو حەڵقەیەدا نەماوە.

**هەیاس کاردۆ:** دوکتۆر شەرەفکەندی هەر چەند زۆر دواتر لە ئێوە دەستی بە کاری سیاسی کردو هاتە جەرگەی خەباتەوە بەڵام زوو هەڵی دا. هەڵسەنگاندنی تۆ لەسەر ئەو ئینسانە چی بوو؟ پێت وابوو شیاوی ئەوە بوو کە ئاوا زوو بگاتە لووتکە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لە حیزبایەتی‌دا، تەنانەت لە ئەساسنامەشدا هاتوە کە سابیقەی ئەندامەتی بۆ هێندێک شت پێویستە. مەسەلەن بۆ بوون بە ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی وەختێک دوو ساڵ بوو، دوایە کردمانە سێ ساڵ. یانی کەسێک پێویستە سێ ساڵ ئەندامی حیزب بێ هەتا بتوانێ خۆی بۆ ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندی کاندیدا بکا. بەڵام ئەوە بەو مانایە نیە کە پلەی حیزبی بە سابیقە دیاری بکرێ. یانی بە سێ ساڵ ببێتە فڵان و بە دە ساڵ ببێتە ئەوەو بە پازدە ساڵ ببێتە ئەوە. شتی ئاوا نیە.

دوکتۆر شەرەفکەندی ناوی خۆی بە خۆیەوە. بەرزترین پلەی عیلمیی وەرگرتبوو. لە ڕشتەیەکیشدا وەوی گرتبوو کە دەیانگوت ئەو وەختی لە هەموو ئێراندا دوو کەسی دیکە مەدرەکی دوکتۆرای شیمیی تەجزییان هەیە. کەوابێ لەباری عیلمییەوە ئاوا بوو. لەباری تەجرەبەی کاری سیاسیی و حیزبایەتییەوە، تەجرەبەی کەم بوو. چونکی پێم وایە دەوروبەری ساڵی١٩٧٧ و ئەوانە بوو کە لەپاریس دەگەڵ دوکتۆر قاسملووی ئاشنا بوو، دەگەڵ وی لە تەوزیعی ڕۆژنامەی کوردستاندا هاوکاریی کردبوو لە پاریس. لەپاشان کە گەڕایەوە بۆ ئێران وەک ئەندامی حیزب و تەنانەت وەک نوێنەری ڕاستی دوکتۆر قاسملووی گەڕایەوە تاران. کەوابێ ڕابردووی کاری حیزبیی و تەشکیلاتیی زۆر نەبوو. بەڵام قابلییەتەکەی یەکجار زۆر بوو. هیچ بێئەدەبی نیە لەبەرابەر ڕووحی دوکتۆر قاسملوودا کە بڵێم لەباری ئەوەی پێی دەڵێن زەکاوەت و بیرتیژی، زۆر لەپێش دوکتۆر قاسملووی بوو. لەو بارەیەوە ئەو زیرەکتر بوو. لە هێندێ کاری مودیرییەتیشدا لە دوکتۆر قاسملووی بە بەرنامەتر و ڕێک‌وپێکتر بوو. قابلییەت و خەسڵەتی ئەوەی کە ببێتە ڕێبەر تێدا هەبوو. بەڵام ئەوەی خەسارێکی گەورە بوو بێجگە لە شەهیدبوونەکەی، ئەوە بوو کە پێش ئەوەی ماوەیەکی زۆر کاری حیزبی بکا و کارامەتر بێ، ئەو موسیبەتە بەسەردا هات و ئەو مەسئوولییەتی بەکەمی وەرگرت. ئەگەر ماوەی چەند ساڵێکی دیکە لەپەنا دوکتۆر قاسملووی بێ گەیشتبایە لەباری تەجرەبەی کاری حیزبییەوە پوختەتر بایە، دەیتوانی زۆر سەرکەوتووتر بێ. داوایەش کە بەداخەوە زۆر زوو لەدەست چوو.

یادی بەخێر دوکتۆر مەحموود عوسمان کە ئێرانییەکان لەبارەی دوکتۆر سەعیدەوە لێیان پرسیبوو چۆنەو چۆن نیە، گوتبووی خۆ بابە هێشتا جێ‌قوونی گەرم نەکردوە بە نیازن ئەویش بکوژن؟ گوتبوویان بۆ دوکتۆر قاسملوو ئێمە کوشتوومانە؟ ئەویش گوتبووی ئەمن نازانم، بەڵام بۆخۆتان دەزانن کێ کوشتوویەتی.

**هیاس کاردۆ:** هیچ خاڵی جێی ناکۆکیتان دەگەڵ نەمر دوکتۆر شەرەفکەندی هەبوو؟ پەیوەندیی کاریی و دۆستایەتیتان چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نازانم خاڵی ناکۆکی چیە. ئەمن خاڵی ناکۆکیم دەگەڵ کوڕم و کچم و برام هەموو ئەوانە هەیە. دەگەڵ بابم نەمبووە چونکی ئەو وەختی منداڵ بووم، بەڵام خاڵی ناکۆکیم دەگەڵ دوکتۆر قاسملووی هەبووە، دەگەڵ هەموو ڕەفیقەکانم هەبووە. خاڵی ناکۆکی ناکرێ لە بەینی دوو ئینساندا نەبێ. بەڵام شتێک بەناوی تەزاد بەینی من و دوکتۆر سەعیدی نەبووە. مەسەلەن هەر نموونەیەک بێنمەوە لە حادیسەی شەهیدبوونی دوکتۆر قاسملوویدا. دوکتۆر سەعید بەرپرسی تەبلیغات بوو واتە ئینتیشارات و ڕادیۆ. کە دوکتۆر شەهید بوو دەفتەری سیاسی بڕیاری دابوو ئەمن و کاک حەسەنی شەرەفی بچین بۆ سەر جەنازەکەی. بڕیار بوو کاک حەسەن لەوێ بێ هەتا بەخاک دەسپێردرێ و پاشان بێتەوە. بەڵام ئەمن چوار پێنج

مانگان لەوێ بم هەتا نوێنەرێکی دیکە دیاری دەکرێ ئەمن وەک نوێنەر کارەکان بکەم. چوومە کنی، گوتم بۆ ئەو کارەتان ئاوا لێ کردوە؟ گوتی بۆ؟ گوتم ئەتۆ ئێستێ تەواوی مەسئوولییەتی ئەو حیزبەت بەملەوەیە. مەسئوولییەتی ڕادیۆو ئینتیشاراتیشت پێیە کە زۆر پڕ کارە. باشە ئەگەر کاک حەسەن بێتەوە ئێرە دەتوانێ چ درووەیەک لەقالبی تۆ دەرێنێ؟ کەوابێ با کاک حەسەن وەمێنێ‌و ئەمن زوو بێمەوە هەتا بارێکت دەگەڵ ڕاست کەمەوە، کارێکت دەگەڵ بکەم. گوتی ئاخر دەفتەری سیاسی وای بڕیار داوە. گوتم خۆ بڕیاری دەفتەری سیاسی ئایەی قورئانێ نیە نەسخ نەبێتەوە. باسی بکەنو ئاوای لێ بکەن. دوایە چووبوو پێشنیارەکەی لە دەفتەری سیاسی باس کردبوو کە قبووڵیان کردبوو چونکی پێیان حیسابی ببوو. ئەوە لەحاڵێکدا بوو ئەگەر کاک حەسەنی شەرەفی ــ کە ئەوەی دەخوێنێتەوە ئینشەڵڵا ــ ئەگەر گوتبایان خودات دەگەڵە با خودا وەمێنێ لەوێ ئەتۆ وەرەوە، قەت شتی وای نەدەکرد. یانی مانەوە لەپاریسێی قەت نەدەدا بە جێگایەکی دیکە. بەڵام ئەمن بۆ ئەوەی کاری دوکتۆر سەعیدی لەنگ نەبێ‌و بتوانم هاوکاریی بکەم هاتمەوە. مەعلوومە ڕەنگە حەمل بکرێتە سەر خۆهەڵکێشان بەڵام بۆیە ئەو قسەیە دەکەم کە بڵێم ئەگەر لە هەموو شتێکدا کاک حەسەنی شەرەفی زۆر لەمن لەپێشتر بێ، لە کاری نووسینو ئەوەدا ئیدی لەمن لەپێشتر نەبووە. نە بووەو نە هەیەو نە دەبێ. بۆیە ئەمن پاریسم بەجێ هێشت بۆ ئەوەی بێمەوە هاوکاریی دوکتۆر سەعیدی بکەم. یانی شتێک بەناوی ئەزاد لە بەینی منو دوکتۆر سەعیددا قەت نەبووە. بەڵام دەگەڵ ویش زۆرجار پەشەڕ هاتووم هەر وەک دەگەڵ دوکتۆر قاسملوویش پەشەڕ هاتووم.

**هەیاس کاردۆ:** دوای شەهید بوونی دوکتۆر قاسملوو، زۆر کەس پێیان وابوو حیزبی دێمۆکرات تازە ناتوانێ خۆی بگرێتەوە. پێتوایە ئەو بۆچوونە هەڵە بوو؟ بۆ؟ ئایا ئەو ماوە کەمەی دوکتۆر سەعید لەسەر کار بوو جێی گرت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێموایە ئەگەر ڕاستگۆیانە قسان بکەین، دوکتۆر سەعید دوکتۆر قاسملوو نەبوو. بەڵام ئەو لێکدانەوەیە هەر لەبنێڕا هەڵە بووە کە ئەگەر دوکتۆر قاسملوو مرد تازە حیزبی دێمۆکرات پشت ڕاست ناکاتەوە. کاک سەعید زۆر بە کیفایەتو لیاقەتەوە مەسئوولییەتەکەی وەئەستۆ گرت. ڕێبەرایەتییەکی باشی بە کاروباری حیزبی دا. لەدوای ویش ئەو حیزبە کاری خۆی هەر کردوە. ئێمە دوکتۆر قاسملوومان هەر هەبوو کە حیزبێکی بێناو بووین. دوکتۆر قاسملوومان هەر مابوو کە لە حاڵێکدا تەقریبەن زیاتر لە نیوەی خاکی کوردستانی ئێرانمان لەبن پێدا بوو، مەجبوور بووین وڵاتەکەمان بەجێ بێڵین، کەوتینە پشتی سنوورەکان. هەلومەرجی خەبات جاری وایە شکست بەسەر حیزبێکی سیاسیدا دێنێ، جاری وایە سەرکەوتنی بە نسیب دەکا. ئەگەر دوکتۆر سەعید یان کەسانی دیکەی پاش وی دوکتۆر قاسملوو نەبوون، حیزبی

دێمۆکرات وەک حیزبی دێمۆکرات ئەو زەرفییەتەی تێدا بوو کە لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ‌و درێژە بدا. لە دواڕۆژیشدا دیسان ئەگەر هەلومەرج بۆ حیزب ڕەخسێ دەبێتەوە هەمان ئەو حیزبە کە لەزەمانی ئەوجی کاروتێکۆشان بە ڕێبەرایەتیی دوکتور قاسملوی‌دا هەی‌بوو. ئەوە بە باوەڕی من کەمێک عاتیفی و ئیحساسی‌یە کە وا بگوترێ.

ئەمن لەجێیەکی دیکەی ئەم وتووێژەدا گوتم پێم ناخۆشە وایە بەڵام لە مەجموعی توانای سیاسی‌دا، نەک لە حیزبی دێمۆکراتە لە حیزبە کوردی‌یەکانی دیکەش‌دا هەتا ئێستا دوکتور قاسملوویەکی دیکەمان نیە. بریا سەتمان هەبایە. ئەوەی بە موسیبەت نازانم. ئەگەر شکیشم بردبا بە پێی توانای خۆم کە شناختی خۆمە، ئەم‌دەشاردەوە ئەگەر لە حیزبێکی موخالیفی حیزبی دێمۆکراتیش بایە. ئەمما ئەوە بەو مانایە نیە کە حیزبەکە دەمرێ. ئەگەر حیزبێک بە نەبوونی قاسملووی دەمرێ با هەر بمرێ. حیزب نابێ بە مردنی هیچ‌کەس بمرێ. قاسملووش بەدوای ئەو حیزبەدا دەگەڕا کە دوای وی نەمرێ.

**عەباس کاریزۆ:** لەنێوان کۆنگرەکانی هەشتەو نۆدا کە ئەندامی ڕێبەرایەتی نەبووی زیاتر بە چیەوە خەریک بووی؟ لەو دەورانەدا خۆت چۆن دەدیتەو هەڵوێستی ڕێبەرایەتی بەرامبەر بە تۆ چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن لەو ماوەیەدا کە جارێکی دیکەش وا بزانم ئیشارەم پێ کردوە بۆ ماوەیەک چووم لە کۆمیسیۆنی ماڵی کارێکم وەرگرت. ئەو ماوەیە زۆر بەردرێژ نەبوو.

**عەباس کاریزۆ:** کاری وەک چی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وابێ مەسئوولییەتی لێکۆڵینەوەی ماڵیم هەبوو. هێندێک هاوکارم هەبوون لەو بەشەدا کە بەتایبەت یادی بەخێر کاک لەتیف حەداد کە کاروباری حیسابداریی دەزانی. کارە فەننی‌یەکان ئەو دەی‌کردن. ئەوەی لەدەست من دەهات زیاتر ئەوە بوو کە تەشخیس بدەم داخوا ئەو کارانە چۆنن. مەسەلەن ئەو ڕەقەمەکانی بەرابەر دەکردن داخوا دەخڵ چەندەو خەرج چەندە. بەڵام ئەمن دیققەتم بەو شتانە دەکرد کە ئەو خەرجەی کراوە بەڕاستی بەجێ‌یە؟ یان مەسەلەن ئەو وەختی ئیمکانی ئەوەمان هەبوو کە بەشێک لە خەرجی خۆمان لەڕێگای کاری حیزبی‌یەوە تەئمین بکەین. دەمانویست بزانین داخوا ئەو ئۆرگانە توانیویەتی ئەو کارانە بکا یان نا.

**هەیاس کاردۆ:** ئەوە یەکەم ئەزموونی کاری ماڵیت بوو دەحیزبدا؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** بەڵێ یەکەم تەجرەبەم بوو. ئوسوولەن ئەگەر بڵێم قەتم کاری ماڵی نەکردبێ وا نەبوو. مەسەلەن جاری وا بووە ئەمن لە جێگایەک بووم کە مەبلەغێک پووڵ دەبێ خەرج بکرێ، ئەو پووڵەی خەرج دەکرا دەبوو ئەمن بی‌نووسم، ئەوەی کە چەند بە چی دراوەو چەند بۆ کوێ خەرج کراوە. یانی لەو حەدەدا بووە کە ئەوە پێی ناڵێن کاری ماڵی یان حیسابداری. لە واقیعدا کاری حیسابداریم قەت نەکردوە. تەنانەت دوای کۆنگرەی شەشەم بۆماوەیەک بەرپرسی کۆمیسیۆنی ماڵییش بووم، بەڵام کارە تەکنیکی‌یەکان کەسانی دیکە دەیان‌کردن. جا ئەو ماوەیە ماوەیەکی درێژ نەبوو. دەکرێ بڵێین لە کۆنگرەی هەشتڕا کە دوای ٢ی ڕێبەندان تەواو بوو، کێشای هەتا ئاخری هاوینێ یان شتێکی ئاوا بوو. دوایە گەڕامەوە بۆ چاپەمەنی. یانی بەرپرسایەتیی چاپەمەنیم وەئەستۆ گرت. لەوێڕا هەتا کۆنگرەی نۆ ئەمن هەر ئەو کارەم بە ئەستۆوە بوو.

جالیبیشە ئەوەی بزانین دەگەڵ ئەوەی ئەندامی ڕێبەری نەبووم، لە تەواوی ئەو ماوەیەدا تەنیا یەک سەرمەقالە هەبووە کە دوکتۆر سەعید نووسیویەتی. دەنا هەموو وەختێک ئەگەر ڕۆژنامەی کوردستان سەروتاری بووبێ هەر ئەمن نووسیومە. ئەوەش کە ئەمن لە ڕۆژنامەدا کارم چەندە بووە، پێم وابێ ئەتۆ یەکێکی لەو کەسانە کە لە نێزیکەوە بووێو ئاگات لێ‌بووە. حەتتا لەبیرمە کە جارێکی ڕۆژنامەی کوردستان کە پێم کارێکی خەراپ بووە، قەتم ئەوە بە موسیبەت نەزانیوە، شازدە مەقالەی تێدا بوون، سێزدەیان ئی من بوون. دیارە ژمارەی واش هەیە کە وەختێکی پێشتر دەرچووە، هەموو مەتڵەبەکانی ئەمن نووسیومن. پاشان خوێن‌تاڵ بووم یان خوێن‌شیرین بووم ئەوە بابەتێکی دیکەیە. ئەوەندەی فکرم پێی شکابێ هەوڵم داوە ڕۆژنامە لەباری زمانو نێوەرۆکی مەتڵەبەکانیشیەوە، چەندی بکرێ کەموکوڕیی نەبێ یان کەمی هەبێ.

ئەوەی دیکە کە ڕێبەریی چۆنی سەیر کردووم، ئێمە لە جێگایەکی دیکەش باسی ئەوەمان کرد کە حیسابی ئەوە ناکرێ داخوا ئەتۆ منت خۆش دەوێ یان نا. لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی سیاسی‌دا موهیم ئەوەیە دەگەڵ یەکتر چۆن بەرخورد دەکەن. لەکاری حیزبی‌دا ئەمنو تۆ مەجبوور نیین ئاشقی یەکتری بین. بەڵام بەپێی ئەو ئوسوولەی حیزب دای‌ناوە مەجبوورین پێکەوە هاوکاری بکەین. لەو ماوەیەدا ئەمن شتێکم لە تەڕەف ڕێبەرایەتی‌یەوە نەدیوە کە بێ ئیحتیرامیی تێدا بێ. لەپاشان لای بەدەنەی حیزب ئەمن ئەو ماوەی چوار ساڵە بە دەورانێک دەزانم کە بەدەنەی حیزب زیاتر لە هەموو وەختەکانی دیکە موحیببەتیان پێ کردووم. بەعزێک پێ‌یان وابوو ئەوە کە نەبوومە کۆمیتەی مەرکەزی تازە بەهیچم نازانن. هێندێک وایان دەگوت. ئەمن دەمگوت قەت ئیحساسم نەکردوە لەکن خەڵکی ئەمن چووکەڵەترم لە جاران. بۆ کۆنفڕانسی پێش کۆنگرەی نۆیەمیش زۆر کەس پێ‌یان دەگوتم ئەتۆ خۆت کاندید مەکە ئەوەک نەیەڵن هەڵبژێری. دەیانگوت ئێمە وا دەکەین کە کۆمیتەی ناوەندی دەعوەتت بکا. گوتم جا ئەگەر خەڵک نەی‌هەوێم بۆ دەچمە کۆنگرەی. بەڵام

کە چووینە کۆنفرانس خەڵکێکی زۆری تێدا بوو. پێم وایە ژمارەیان لە ٢٠٠ کەس هەورازتر بوو. ئەمن لە مەجموعی دەنگەکان وا بزانم سی دەنگێکم نەهێنابوو. ئەوی دیکە هەموو ڕەئیەکانم هێنابوو. کە وەک نەفەری یەکەم دەرچووم. کەوابێ ئیحساسی ئەوەم نەکردوە نە لە ڕێبەرایەتیدا بێ حورمەتیم پێ دەکرێ و نە بەتایبەتی لەبەدەنەدا.

**عەباس کاردۆ:** تاکۆکیی ئەندامانی ڕێبەریی حیزب دوای لێکدابڕانەکەی کۆنگرەی هەشتیش هەر تەواو نەبوو. هەروەک دیتمان کێشەکان ئەوجار ڕەنگی دیکەیان بەخۆوە گرت و دواتر لە کۆنگرەی ١٠ بەولاوە ڕەسمەن ٢ باڵ لەبەرامبەر یەکدا ڕاوەستان. پێش کۆنگرەی نۆ و لە جەریانی ئەو کۆنگرەیەدا هیچ کێشەیەکی وا هاتە پێش کە بۆ باس بێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن دووبارە ئەو قسەیەی تەسحیح دەکەم. چۆن دوای کۆنگرەی ١٠ دوو باڵ لە بەرامبەر یەکدا ڕاوەستان؟ ئەو حیزبە ئەوەتا هەیە، حیزبی دیکەش تەقریبەن، لە دروستبوونیانەوە جەناحی جۆراوجۆریان هەر تێدا بووە. تەحزابی وڵاتانی پێشکەوتووش هەروا. بەڵام بەرخوردی جەناحەکان لە هێندێک شوێن شێوەیەکی سالمتر و مەعقوولتری هەیە. لە وڵاتانی قوڕبەسەری وەک وڵاتی ئێمەش کە ڕەفتارەکە دەگەڵ یەکتر موتەمەدینانە نیە. سەر دەکێشێتە کێشە و هەڵا و لێکجودابوونەوە. بەڵام لە حیزبی دێموکراتدا ئەگەر بڵێین دووباڵی تێدا نەبووە ئەدی کۆمیتەی ئینقیلابی بۆ هەبوو؟ کۆمیتەی ساغکەرەوە بۆ هەبوو؟ جودابوونەوەی ساڵی ١٣٥٩ بۆ بوو ئەوەی پێیان گوترا تاقمی ٧ کەسی؟ ئی کۆنگرەی هەشت بۆ بوو؟

هەر لە ئاستانەی کۆنگرەی ٩ دا ئێمە دوو جەناحی فکریی تەواو لێک جودا بووین. یانی ئەو دوو قوڵە پێشتر شکڵیان گرتبوو. دەتوانم بڵێم دوای کۆنگرەی سێزدە ئیختیلافی سیاسیی بەو سووڕەتەمان نەبوو وەک ئەوەی لە کۆنگرەی ٩دا هەمانبوو. چونکی بەرنامە و ئەساسنامە و ڕاپۆرتی کۆنگرەی پەسند کرابوو. هەر لێرەشدا بیڵێم هەموو ئەسنادی کۆنگرەی سێزدە هەر ئەو لایەنە ئامادەی تەنزیمی کردن کە کەوتنە لای ئێمە. کەوابێ لەو بارەوە ئیختیلافی سیاسیمان نەبوو. ئیختیلافی مودیریەتیمان هەبوو. بەڵام لەپێش کۆنگرەی ٩ دوو قوڵ بووین کە لەسەر مەسەلەیەکی سیاسی ئیختیلافمان هەبوو. ئەویش ئەوە بوو داخوا ئەو حیزبەمان هەروا بە پەرشوبڵاوی بمێنێتەوە، یان دەگەڵ جەمعێک کە بە هەر دەلیلێک کە پێشتر باسمان کرد جیا بوونەتەوە و بە ناوێکی دیکە تێکۆشانیان هەیە یەک بگرینەوە؟

**هەیاس کاردۆ:** باسەکەشمان ئەوەیە مامۆستا. چەرمیانی پێش کۆنگرەی نۆ. ئەمن دەڵێم دوای ڕۆیشتنی ئەوانەی لە کۆنگرەی هەشت جیا بوونەوە و حیزبێکی دیکەیان پێک هێنا، دووبارە ئیختیلاف لەسەر چی سەری هەڵدایەوە؟ یانی هەتا کۆنگرەی نۆ شتێکی وا هەیە جەنابت باسی بکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لە کۆنگرەی نۆدا ئێمە شتێکی وامان نەبوو. کەسانێکمان هەبوون کە بەجۆرێک بۆخۆیان شتیان هەبوو یان کەوتبوونە بەر غەزەب. مەسەلەن ئەمن لە کۆنگرەی نۆدا هەر ئەو نەزەراتەم هەبوو لەبارەی ئەو جەمعەوە کە بەناوی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ فەعالییەتیان دەکرد. ئەمن پڕۆژەی بڕیارنامەیەکم ئامادە کردبوو کە بیدەم بە کۆنگرە بۆ هەڵگرتنی ئەو شتە کە پێیان دەگوت بایکۆت. کە ئەوەم زۆر پێ خەراپ بوو و دژی بووم. لەپاشان لەپڕ شتێکیان هێنا لە بۆڵتەنی خەبەری‌دا کە ئەو برادەرانەی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ وتارێکیان بڵاو کردۆتەوە کە گۆیا فشاری خەڵک وای لێ کردووین باسیان بکەین. ئەوە لەحاڵێک‌دا بوو هیچ فشارێکمان لەو بارەیەوە لەسەر نەبوو. کە ئەوەم دیت زۆرم پێ ناخۆش بوو، بۆیە وەپشت گوێم دا. باسیشم کرد کە ئەمن شتێکی ئاوام ئامادە کردبوو بەڵام چونکی ئەوەیان نووسیوە لێی دەگوزەرێم. گوتم با نەیێتە ئەو نەقڵەی کاک فەتاحی کاریان. ئاخر ئەو وەختی ئیختیلافمان دەگەڵ کۆمەڵە هەبوو، کۆمەڵە لە تەبلیغاتی خۆی‌دا دەی‌گوت کۆمەڵانی خەڵک حیزبی دێمۆکرات بەچۆک‌دا دێنن و لەو قسانە. جا کاک فەتاح کە زۆر قسە خۆشە دەی‌گوت هەتا قوونێ خۆم بە شەقی کۆمەڵانی خەڵکەوە نەبینم دەگەڵ کۆمەڵەی ڕێک ناکەوم کە دیارە هەر بۆ شۆخی ئەو قسانەی دەکردن. ئەمنیش گوتم با پێیان وا نەبێ کە گۆیا ئێمە فشارێکی عەجایبمان لەسەرە. چونکی هیچ فشارێک نەبوو. تەنانەت یەک نامەی چووکەڵەش لەو بارەیەوە لەلایەن خەڵکەوە نەنووسرابوو. جا بۆیە ئەمن پاشگەز بوومەوە.

**هەیاس کاردۆ:** کاک جەعفەری حامیدی زۆر بەتوندی کەوتە بەر ڕقی سکرتێر. ئەوە لەبەر چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە ئەوە مەسەلەیەکی زۆر چووکتر لەوەیە کە باسی بکەین. جەعفەری حامیدی نەکەوتۆتە بەر ڕقی هیچ کەسێک. جەعفەری حامیدی لەوەتا هەبووە هەمیشە ڕقی لە هەموان بووە. یانی بۆخۆی نیشانی داوە دەگەڵ کەس ناحاوێتەوە. لەو دنیایەدا دوو کەسی وەگیر ناکەون کە بەهاوفکری خۆییان بزانی و حیزبێکیان دەگەڵ دامەزرێنێ. یانی لەو دنیایەدا بەتاقی تەنیایە.

**هەیاس کاردۆ:** یانی کەوابوو لە کۆنگرەی نۆدا ئیختیلاف نەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا شتێکی وا گەورە نەبوو. دیارە هێندێک ئیختیلافی نەزەر هەبوو. مەسەلەن ئەمن شێوەی هەڵبژاردنی کۆنگرەی نۆم زۆر پێ لە هی کۆنگرەی هەشت خەراپتر بوو. زۆرم پێ لە لیستی فیکس

خراپتر بوو. بەڵام دەمزانی ئەگەر ئیعتیرازیش بکەم قبووڵ ناکرێ. چونکی نازانم لەبیرتە یان نا. کۆمیتەی ناوەندی لیستەیەکی هەبوو. خەڵکیش حەقی هەبوو خۆیان کاندید بکەن. لیستەکە فیکسیش نەبوو بەڵام لە مەرحەلەی یەکەمدا کەس حەقی نەبوو دەنگ بەوانە بدا کە بۆخۆیان خۆیان کاندید کردبوو. دەبوو هەر دەنگ بەوانە بدەن کە لە لیستی کۆمیتەی ناوەندی‌دا بوون. جا دوایە بۆ مەرحەلەی دووهەم ئەوانەی لەو لیستەیە هەڵنەبژێردرابوون و ئەوانەش کە خۆیان کاندیدا کردبوو دەکەوتنە بەر دەنگدان. یانی ئەندامانی حیزبی کرابوونە دەرەجە یەک و دەرەجە دوو.

لەپاشان شتی لەوەش خراپتر. بانگی کاک "برایم لاجانی"یان کردبوو. بەداخەوە دوکتور سەعیدیش دەگەڵ بوو. یانی دوکتور سەعید و کاک مستەفای هیجری. پێیان گوتبوو ئێمە کاندیدت دەکەین بۆ کۆمیتەی ناوەندی بەڵام بۆخۆت هەستە بڵێ نای کەم. جا دوایە ئێمە داوات لێ‌دەکەین بۆ جێگر خۆت کاندید بکەی. یانی بۆ ئەوە رەفیقت پێ دەدەین تەک بۆ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، ئەویش کە پیاوێکی دڵساف بوو قبووڵی کردبوو. ئەو کە ئەوەندەی یەکەمی لیستەکە بوو، چونکە بە تەرتیبی حرووفی ئەلفبا نووسرا بوو، لاچوو، دوایە سەید رەزای دروودگەریان لە جێگای وی دانا. یانی ئەو حەزبە بوو کە ئەوشتانە زۆر خراپ بوون. بەڵام ئەوە نەبوو کە دوو جەناح لە موقابیل یەک‌دا راوەستن.

**عەباس کاردۆ:** دوای کۆنگرەی نۆ دیسان بوویەوە بە ئەندامی رێبەری و تەنانەت خۆت بۆ جێگری سکرتێر کاندیدا کرد بەڵام دەنگت نەهێنایەوە. بۆ ئەو کارەت کرد و هۆی دەنگ نەهێنانەوەت بۆ ئەو بەرپرسایەتی‌یە چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** دەبێ ئەوەی تەسحیح بکەم چونکە بە هیچ جۆر ئەمن خۆم بۆ جێگری سکرتێر کاندید نەکرد. چونکی مەسەلەکە زۆر لەوەی سادەتر بوو. وەختی خۆی پاش مەرگی دوکتور قاسملوی، دوکتور سەعید داوای لێ‌کردم ببمە موشاویر. گوتم نابمە موشاویر. گوتی بۆ؟ گوتم پێم خۆش نیە. ئەمن ئەگەر ویستبام لەوانە بوو جێگری سکرتێر بایەم. ئەوە نەبوویام حەتمەن دەفتەری سیاسی دەبووم کۆمیتەی ناوەندی دەبووم یان جێگر هەر دەبووم. ئەوانەم هیچی نەکردوە بۆ دەبمە موشاویر. گوتی ئاخر مەسئوولی ئینتیشاراتی با لە کۆبوونەوەکاندا بەشدار بی. گوتم جا با بە بێ ئەوە لە کۆبوونەوەکاندا بەشداربم چ دەبێ. گوتی چۆن ئەوە دەکرێ ئەتۆ ئەگەر گەیشتە خۆت ئەساسنامە لەژێر پێ دەنێی. گوتم جا ئەوە چ ئیفتیخارێکی بۆمن تێدایە؟ پاشان ئەساسنامە بۆ پێشێل دەکرێ؟ گوتی ئاخر شتی وا نەهاتوە. گوتم باشە دە ئەساسنامەدا هاتوە کە بەرپرسانی کۆمیتەکانی شارستان دە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی‌دا بەشدار بن؟ ئێستا هەموویان بەشدار دەکەن کە کارێکی زۆریش باشە. دەی باشە مەسئوولی ئینتیشاراتیش دەبێ ئاگای لە

سیاسەتی حیزب هەبێ، دێم لەوێ دادەنیشم. قبووڵی نەکرد. لەدوایە گوتی زەرەر دەکەی. گوتم ئەمن هەر ئەو وەختی پێم گوتووی زەرەر ناکەم، چونکی چاوم بۆ هیچ شتێک نەسووتاوە.

جا لە واقیعدا با ئەوە بگوترێ کە وەکوو گلەییش بێ یان هەرچی بێ، کە بۆ کۆمیتەی مەرکەزی هەڵ-بژێرام حەتتا لە جەرەیانی کۆنگرەدا هێندێک شت هەبوو کە ئەوە ناخۆش بوو. کاک سەعید کە لیستی کۆمیتەی ناوەندیی خوێندەوە ئەمنیشی دانابوو. ناوی هەرکەسی خوێندەوە دیفاعی لێ کرد. بەڵام کە ناوی منی خوێندەوە گوتی: کاک هاشمی کەریمی دەیگوت ئەگەر بە ساڵی ئەندامەتیی کۆمیتەی مەرکەزی بێ ئەمن پتر لە فڵانە کەسی (مەبەست مامۆستایە. هەیاس)ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی بووم، چونکی ئەو چەند ساڵ ئیستیعفای کردوە بەڵام ئەمن هەر ماومەتەوە. نازانم ئەوە ئێستا خودا دەڵێ ناوە خۆی کاندیدا دەکاتەوە بەش بەحاڵی خۆم سوپاسی دەکەم. یانی هەر ئەوەندەی دیفاع لێ کردم کە لەواقیعدا هێرشی بۆ کردم. دوایە کە هەڵیش بژێراین، ناوەکان بە تەرتیب نووسرابوون. لە هەڵبژێرانیشدا لەبیرمە ئەمنو کاک غەفووری هەمزەیی بە قەت یەکمان دەنگ هێنابوو. بەڵام کاک سەعید کە ناوەکانی خوێندەوە ناوی وی وەپێش خست لەحاڵێکدا "عەین" لەپێش "غەین"ە. "حێ"ش زۆر لەپێش "هێ"یە. ئەمن عبداللە حسنزادە بووم، ئەو غفور هەمزەیی بوو. بەڵام ناوی وی وەپێش من خرابوو.

جا لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی مەرکەزیدا کە ئەمن خۆم بۆ ئەندامی دەفتەری سیاسی کاندید کرد، سکرتێر هەڵبژێرابوو. عەرزیشم کردی ئەمن قەت پێمخۆش نەبووە ببمە کۆمیتەی ناوەندی، بەڵام کە بوومە کۆمیتەی ناوەندی، پێمخۆش بووە ببمە دەفتەری سیاسی. تەنیا بۆ ئەوەیان پێمخۆش بووە. بۆ دەفتەری سیاسی ٣ کەسی دیکەش هەڵبژێران بەڵام ئەمن هەڵنەبژێرام. ٣ کاندید مابووین. ئەمن بووم، کاک غەفوور بوو، کاک دوکتۆر خەلیقی بوو. یانی کە هەڵنەبژێراین ئەمن ٨ دەنگم هێنابوو، ئەوان هەر یەکەی ٧ دەنگیان هێنابوو. بۆ دەوری دووهەم ئەمن گوتم دەچمە دەرێو خۆم کاندید ناکەمەوە. زۆریشم پێخۆش بوو بچمە دەرێ، یەکجار زۆر. چونکی قەت نەمویستوە بەخێر ببمە ئەندامی دەفتەری سیاسی. بۆیە گوتم ئەمن دەچمە دەرێ با ڕەقابەتەکە ببێتە بەینی ئەو دووانە. ئەوجار دوکتۆر سەعید گوتی نا، نابێ ئەو کارەی بکەی. بۆ دەوری دووهەم کە هەڵبژاردن کرا، پێم وابێ ئەوان یەکی یەک، دوو دەنگیان هێنابۆوە. دەنگەکانی دیکە هەموو درابوون بە من. یانی بەرنامە بوو کە تۆڵەی ئەو وەختیم لێ بکرێتەوە. زەرەرەکە ئەوە بوو ئەو تۆڵەیەم لێ-کرایەوە. دەنا بۆ جێگری سکرتێر خۆم کاندید نەکرد. تەنانەت دوای شەهیدبوونی دوکتۆر سەعیدیش کە بوومە جێگری سکرتێر بەزۆری بوو. ئەمن لەپێش چاوی خۆی دەنگی خۆم دا بە کاک حەسەنی شەرەفی کەچی ئەو ماڵ بەماڵ دەگەڕا کە ڕەئی بدەنێ. ئەمن بۆ ئەوەی هەڵنەبژێرێم ڕەئیەکەی خۆم دا بەوی کەچی منیان هەر هەڵبژارد، دەنا ئەو دەمیش پێم خۆش نەبوو ببمە جێگر. مەبەستم ئەوەیە لە کۆنگرەی نۆدا ئەمن خۆم بۆ

پۆستی جێگری سکرتێر کاندید نەکردوە. ئەوە دوای شەهید بوونی دوکتور سەعیدی بوو کە بەزۆر کاندیدیان کردم. ئەمنیش دەنگی خۆمدا بە بەئیستیلاح ڕەقیبەکەم بۆ ئەوەی نەبم کەچی هەر بووم.

**عەباس کاردۆ:** وا دەگوترا هەتا دوکتور قاسملوو مابوو قسەی ئەو قسەی کۆتایی بڕیارەکان بوو. دوای شەهیدبوونی ناوبراو ئایا ڕەوالی کۆبوونەوە بڕیارەکان هیچ گۆڕانێکی تێدا پێک هات؟ ئوتۆریتەی دوکتور شەرەفکەندی چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە ئەوی دیکەش دەبێ تەسحیح بکرێ. دوکتور قاسملوو ئەگەر بڵێین ئوتۆریتەی هەبوو ڕاستە، دەنا وا نەبوو بڵێی ئەوەی ئەو دەیهەوێ هەر ئەوە بچێتە پێشێ. زۆر جارم لەبیرە کە ڕەئیی دوکتور قاسملووی کەوتۆتە ئەقەللییەتەوە ڕەت کراوەتەوە. یانی وا نیە هەرچی پێی خۆش بووبێ هەر ئەوە کرابێ. ئەگەر بێینە سەر دوکتور سەعیدی گوتمان ئەو لەباری پێگەیشتوویی سیاسییەوە زۆری مابوو بێتە دوکتور قاسملوو. ڕەنگە دە سالی دیکەی کار کردبایە وەپێش دوکتور قاسملووش کەوتبا. چونکی وەک عەزم کردی زەکاوەتی فکریی زۆر بوو. لە دوکتور قاسملووی زیاتر هەبوو. هەرچەند دوکتور سەعید پتر هەولی دەدا ڕەئیی خۆی بسەپێنێ بەلام زەمانی ویش زۆرجار وا بووە ڕەئیەکەی قەبوول نەکراوە. عادەتەن ئەمن هەمیشە گوتوومە سکرتێر فەردێکی عادی نیە. بەلام لە حیزبی دێمۆکراتدا هەتا ئێستاشی دەگەل بێ سکرتێر هیچ سەلاحییەتو ئیختیاراتێکی زیاتر لە ئەندامێکی دەفتەری سیاسیی نیە. یانی لە بڕیاردانەدا ئەویش هەر یەک دەنگی هەیە. لەحالێکدا فەت نابێ وای تەماشا بکەی کە مەوقیعییەتی ئەویش وەک ئەندامانی دیکەی دەفتەری سیاسییە. دیارە مەوقعییەتی ڕێ جیاوازە.

## ڕووخانی ڕێژیمی سەددام حوسێنو ئاکامەکانی

**هەیاس کاردۆ:** پەلاماری عێراق بۆ کوەیتو دواتر هێرشی وڵاتانی هاوپەیمان بۆ سەر عێراقو کزکردنی ڕژێمی سەددامو ڕاپەڕینی خەڵکی باشووری کوردستانو گۆڕەوەکەو زۆر شتی دیکەش لەو ڕووداوانەن ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کاریگەری‌یان لەسەر خەباتی ئێوە وەک حیزبی دێمۆکرات هەبووە. دەکرێ بە وردی لەو بارەیەوە زانیاری‌یەکانی خۆت باس بکەی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** دیارە پەلاماری عێراق بۆ کوەیت تەئسیری لەسەر تێکڕای باروەزعەکە لە عێراق دانا. ئێمەش وەک حیزبی دێمۆکرات بنکە سەرەکی‌یەکانمانو بنکەی ڕێبەرایەتیمان لە کوردستانی عێراق بوون. پاشان نوێنەرایەتیمان لە بەغدا هەبوو. بەتەوێ و نەتەوێ بەشێکی ئەو وەزعییەتە ئێمەش دەگرتەوە، هەرچەند ڕاستەوخۆ سەروکارمان دەگەڵی نیە بەتایبەتی دە بڕیاردانەدا. بەڵام هەموو شوێنەوارەکەی ئێمەشی گرتۆتەوە. ئێمەش کەوتووینە ژێر گەمارۆ. ئێمەش کە ویستوومانە سەفەر بکەین ئەگەر جاران لە بەغداڕا دەڕۆیشتین ئێستا دەبوو بەڕێگای زەمینی‌دا بۆ ئەملاو ئەولا بڕۆین هەتا دەگەینە جێگایەک کە حەقی پەروازی هەبوو. بەڵام لەسەر یەک ئەو مەحدوودیەتانە کە بۆ ئێمە بوون کە دیارە لە زۆر بارەوە بوون، بەخۆشی‌یەوە وا نەبوون کە پشتی حیزبی دێمۆکرات بشکێنن یان کارەکانی پەک بخەن. ئێمە توانیمان خۆمان دەگەڵ وەزعەکە بگونجێنین هەرچەند دڵخواز نەبوو.

**هەیاس کاردۆ:** دوای ئازادبوونی بەشێک لە خاکی باشووری کوردستانو بەدەسەڵاتگەیشتنی کوردەکانی ئەو بەشە، چاوەڕوان دەکرا خەباتی کوردەکانی پارچەکانی دیکەش زیاتر وەگەڕ بکەوێ و هەنگاوی زیاتر باوێژێ. نەک ئەوە نەکرا، بگرە ئەوە سەرەتای گەلێک تەنگوچەڵەمەو بەربەستدروستکردن لەسەر ڕێی خەباتکارانی بەتایبەت ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو کە دیارە بەشی حیزبی دێمۆکرات زۆر بەرچاوە. لێکدانەوەی ئێوە ئەوکات لەو وەزعە چی بوو؟ هەڵوێستەکانتان چۆن بوون؟ بەگشتی چیتان لێ بەسەرهات؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن نازانم کێ چاوەڕوانیی دەکرد کە خەباتەکە زیاتر پەرە بگرێ. ناتوانین بڵێین هەموو گەلی کورد. بەڵام پێم وایە ئەوانەی چاوەڕوانی‌یان کردوە کە بەو ئاڵوگۆڕەی لە باشووری کوردستان پێکهاتوە خەباتی بەشەکانی دیکە پەرە بستێنێ، ئینتیزارێکی بەجێ‌یان نەبووە. ئێمە قەت چاوەڕوانیی ئەوەمان

نەبووە. دەلیلەکەشی زۆر ڕوونە. جارێ ئەو وەزعەی بۆ باشووری کوردستان پێک‌هاتبوو هیچ ئیستیقرارێکی پەیدا نەکردبوو. هیچ ڕەسمییەتێکی پەیدا نەکردبوو بەتایبەتی لە قۆناغەکانی هەوەڵی‌دا. هەتا ئێستاشی دەگەڵ بێ کە لە عێراق سیستمێکی فیدراڵی پەسند کراوە و مافەکانی کورد لە دەستووردا چەسپاون، وەزعییەتی کوردستانی عێراق ئەو ئیستیقرارە موتڵەقەی بەدەست نەهێناوە کە لێی دڵنیا بین. یانی بڵێین ئەوە تەواو لەخەم ڕەخسی. ئێستاش بەدەردی کوردەکانی باشوور کە بەکاری دێنن، لەبەر تەحەددییاتێکی زۆر دایە. بەرەبەرەکانێی زۆری دەگەڵ دەکرێ لەتەرەف عێراقەوە، لەتەرەف ئێرانەوە، لە تەرەف تورکیەو سوریەوە تەنانەت ڕەنگە لەتەرەف هاوپەیمانانی ئەو دەوڵەتانەشەوە. بەگشتی خەتەراتێکی زۆری لەسەرە. باشە ئەو هێزە سیاسی‌یە کوردانەی لە دەرەوەی کوردستانی عێراقێرا هاتوونە ئەو بەشە، چۆن دەتوانن ئیمتیازیان هەبێ کە حکوومەتی هەرێمی کوردستان- لە هەوەڵەوە جەبهەی کوردستانی بوو- ڕێگا بدا ئەوان بەکەیفی خۆیان کار بکەن و ئەو خاکەی ئەوان وەک فارس دەڵێ بکەنە سەکۆی پەرتاب بۆ کاری نیزامی و تەشکیلاتی لە وڵاتەکانی خۆیان-دا. ئەمن پێم‌وایە ئەو تەسەووڕە لەسەر لێکدانەوەیەکی قووڵ نەبووە. حیزبە سیاسی‌یەکان کە دەگەڵ واقیعییەتەکەی ژیاون باشتریان دەرک کردوە. بۆیە ئێمە بەشبەحاڵی خۆمان ئەو لێکدانەوەیەمان نەکردوە.

تەنانەت ئەمن باوەڕم وایە ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو بەشەی کوردستان فیدرالیزمەکەشی بچەسپێ و تەنانەت سەربەخۆییش بەدەست بێنێ کە بەدووری دەزانم ئێستا هەلومەرجەکە ڕێگای شتی وا بدا، ئەو وەختەش ئیمتیازی ئەوە کە هێزە سیاسی‌یەکانی بەشەکانی دیکەی کوردستان لێرەوە بتوانن تێکۆشانێکی ئاوا بەرچاو بە پشتیوانیی ئەو حکوومەتە بکەن ئیمتیازێکی بێ‌جێ دەبێ. چونکی ئەو وەختیش حکوومەتێکی تازە دامەزراوە، حکوومەتێکی چووکەڵەیە، حکوومەتێکە کە هیچ‌یەک لە بونیادەکانی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، دیپلۆماسی و نیزامیی خۆی بەقووەت نەکردوە. چوار دەوریشی موخالیفن ئەگەر نەشڵێین دوژمنن. ئەوە چۆن دەتوانێ ببێتە سەکۆی پەرتاب بۆ ئەوەی کوردەکانی ئێران خاکەکەی خۆیان لەوێوە ڕزگار بکەن و کوردەکانی تورکیە کوردستانی خۆیان لەوێرا ڕزگار بکەن. ئەوە چاوەڕوانی‌یەکی زۆر ناواقیعبینانەیە. بەش بەحاڵی خۆم پێم‌وانیە لە حیزبی دێموکراتدا شتی وا بووبێ. بە ئیحتیمالی زۆر لە حیزبەکانی دیکەشدا شتی وا نەبووە.

**عەباس کاردۆ:** ئەوکات چاوەڕوانیتان چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بە باوەڕی من زیاتر لە چاوەڕوانی، ئەرکی حیزبەکانی دیکە ئەوە بوو کە بە هەموومان ئەوەی لە دەستمان دێ - ڕەنگە کەممان لە دەست هاتبێ - کۆمەگی فکری و عەمەلی بکەین بۆ ئەوەی ئەو ئەزموونەی پێک‌هاتوە زووتر و زۆرتر سەرکەوێ. یانی لەپێشدا کۆمەگی بکەین و لە موقابیلیشدا

بێ گومان چاوەڕوانیمان هەیە حورمەتمان بگیرێ. چاوەڕوانیی ئەوەمان هەیە کە زۆریش بەجێیە کە ئەگەر موشکیلاتێکمان هەیە - چ وەکوو حیزبو چ وەکوو خەڵکی دیکە کە پەنابەرنو ئاوارەی دەستی زوڵموزۆرن- حکوومەت کۆمەگمان بکا بۆ چارەسەرکردنیان. لە هەمووی گرینگتر چاوەڕوانی‌یەکی بەحەقمان هەبوو کە دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان، چ ئەو وەختەی بۆتە حکوومەتی هەرێمو چ ئەو وەختەش کە هێشتا جەبهە بووە، کۆمەگێکی زیاتر بکا بۆ پاراستنی ئەمنییەتی ئەو خەڵکە. ئەوە گلەیی‌یەکە، تەقسیکە یان کەمکاری‌یەکی یەکجار زۆرە کە بە مل دەسەڵاتدارانی باشووری کوردستاندا هاتوو تاریخیش سەبتی دەکا کە ئەوان لە بەشێکی کوردستاندا حاکم بوون، کەچی کوردەکانی بەشێکی دیکەی کوردستان هەموو ڕۆژێ کەوتوونەتە بەر پەلامارو لێیان کوژراوو بریندار کراوە. دەتوانم بڵێم وەکوو چاوەڕوانی، هەر ئەوانەمان هەبوون. ئەوە بە جێ بووە دەنا ئەوی دیکەمان نەبووە.

تەنانەت لەبیرمە جارێکی هەیئەتێکی ئێرانی لێرە بوون. هاتبوون بۆ چاوپێکەوتن دەگەڵ سەرۆکانی کورد واتە مامجەلالو کاک مەسعوود. ئەو وەختی هێشتا ئەو شتە ناخۆشانە ڕوویان نەدابوو. ئەمنیش وەک جێگری سکرتێر چووبووم بۆ باسی هێندێک مەسایلی خۆمانو ئیشارەیەکیش بەو مەوزووعاتە چونکە دەمانزانی ئەوانە لێرەن.

**هەیاس کاردۆ:** یانی ئێوە چووبوون دەگەڵ ئەو هەیئەتە ئێرانی‌یەش دانیشن یان تەنیا کوردەکان؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا تەنیا دەگەڵ مامجەلالو کاک مەسعوود. دیدارەکەمان لە سەلاحەددین بوو. لەوێ دەگەڵیان دانیشتم هەردووکیان بوون. گوتم ئەمن لە تەرەف حیزبی دێمۆکراتەوە هاتووم بۆ شتێک. دەزانین هەیئەتی ئێرانی هاتوە بۆ تەنزیمی ڕەوابیت دەگەڵ ئێوە. زۆریش وێ دەچێ کە مەسەلەی ئێمە یەکێک لە گرینگترین مەسەلەکان بێ. ئەمن هاتووم ئەو پێشنیارەتان پێ بکەم: ئێوە دەگەڵ هەیئەتی جمهووریی ئیسلامی هەوڵ بدەن تەوافوقنامەیەک بنووسن کە بگوترێ نوێنەرانی حکوومەتی کۆماری ئیسلامیو نوێنەرانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان ڕێک کەوتن لەسەر ئەو خاڵانە:

خاڵی یەکەم، حکوومەتی هەرێمی کوردستان بەرعۆدەیە پێشی هەموو جموجۆڵێکی سەربازیی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان بگرێ. دووهەمو سێیەمو چوارەمو ئەوی دیکە چ دەنووسن بنووسن. ئێمە موتەعەهیدین کە ئێوە مەجبوور نەبن پێشمان پێ بگرن، بۆخۆمان هەموو چالاکی‌یەکمان ڕادەگرین. مامجەلال گوتی ئەتۆ دەزانی چیت گوت؟ گوتم بەڵێ بەڵێ زۆر چاک دەزانم، لەخۆشمەوە نایڵێم. دەفتەری سیاسی دانیشتوو ئەو بڕیارەی فۆرمۆلە کردوە کە بێم پێتان ڕابگەیەنم. لەپێناوی ئەوەدا کە جمهووریی ئیسلامی ئیعتیراف بە

حکوومەتی هەرێمی کوردستان بکا ئێمە ئەو فیداکارییە دەکەین. دیارە هەر دووکیان هەم کاک مەسعودو هەم مام‌جەلال زۆریان پێ خۆش بوو.

**هەیاس کاردۆ:** باشە مامۆستا ئێوە هەڵوێستو پێشنیارەکەتان جوان بووە. بەڵام لەپێناو گەیشتنی واندا بە هیچ لەڕاستیدا بەشێک لە کارو تێکۆشانی ئێوە فیدا کرا.

**عەبدوڵلا حەسەن‌زادە:** نا خۆ ئێمە تێکۆشانمان نەوەستاند. لەپاشان شتێکی دیکەم لەبیرە، کە بۆخۆم لەوێ نەبووم بەڵام بیستمەوە لە مەجلیسێکدا کە کاک مەسعوود بارزانی لەوێ بووە باسی حیزبی دێمۆکراتو پ.ک.ک دەکرێ. دەڵێن بابە حیزبی دێمۆکرات هەڵوێستی زۆر باشترە لە پ.ک.کا. کاک مەسعوود دەڵێ ڕازی نیم ئەو موقایەسەیە بکەن. گەرە ئەو دووانە لەبەتای یەک دابنێن. یانی ئەوەمیان هەڵوێستی ئێمە بە ئوسوولی دەزانی. هەڵوێستی ئێمە لەو باوەڕەوە بوو کە زیاتر لەوەی ئینتیزارمان لەوان هەبێ، دەبێ کۆمەگ بکەین. دەبێ بەشی خۆمان لە مەسئوولییەت وەئەستۆ بگرین. ئێمە وای بۆ دەچووین. ئێستا ڕەنگە کەمسان لەدەست بێ. مەعلوومە ئێمە ناتوانین حکوومەتی هەرێمی کوردستان بڕێنین. ئەگەر جەبهەی دەگەڵ دەوڵەتی تورکیەی لێ پەیدا بێ خۆ ئێمە پشتی لەشکری تورکمان پێ ناگیرێ بە چەند سەت کلاشینکۆفێکەوە. بەڵام پێمان وا بووە ئەوەی لە دەستمان بێ دەبێ ئەنجامی بدەین.

**هەیاس کاردۆ:** بیروڕای خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئەوکات دەربڕی جۆرێک نارازی‌بوون لە هەڵوێستی پارتە سەرەکییەکانی باشووری کوردستان سەبارەت بە خەباتکارانی ئەو بەشەی کوردستانی پێوە دیار بوو. ئێوە لەو نارەزایەتییانە ئاگادار بوون؟ ئەگەر نا، چۆن هاودەنگیتان دەگەڵ دەکردن؟

**عەبدوڵلا حەسەن‌زادە:** مەسەلە هەر ئەوکات نیە. ئێستاشی دەگەڵ بێ بیروڕای خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەکوللی هەڵوێستەکانی دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان بەرامبەر تێکۆشەرانی حیزبەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کە لێرەن نارازین. ئەو وەختیش ناگامان لێی هەبوو. هەوڵمان دەدا ئەوەندەی دەکرێ لەو بارەشەوە تەوزیح بدەین. ئەمن لەبیرمە وەختێک ئەو حەوادیسەی ئێرە ڕووی‌دا، نی کۆیە، لە کوردستانی ئێران لە زۆر جێگا فشارێکی زۆر بۆ سەر ئەندامانی یەکیەتی نیشتمانی دروست بوو. برادەرانی یەکیەتی باوەڕیان وا بوو کە ئێمە گوتوومانە. بەڵام ئێمە نەمان‌گوتبوو. وەختێکی باسیان کرد کە دیارە وتارێکیشی لەسەر نووسرا. نووسرابوو ئێمە شتی وامان نەگوتوە، بەڵام ئەو خەڵکە وەختێک کچو کوڕو خوشک‌وبراو دایکو بابیان لەژێر دەسەڵاتی ئێوەدا دەکەونە بەر حەملەی دوژمن ، شتێکی زۆر سروشتییە کە پێیان ناخۆش بێ‌و ئیعتیراز بکەن. ئەوەندەی لەبیرمە هەوڵمان دەدا نەیەڵێن ئەو ئیحساساتە بگاتە جێگایەکی وا کە کەلێنی خراپ

بخاتە بەینی ئێمەو هێزەکانی باشووری کوردستانەوە، هەوڵمان لە تەعدیل‌کردنی‌دا بوو دەنا دەمانزانی خەڵک چۆن بیر دەکەنەوە.

# تیرۆری دوکتۆر شەرەفکەندی

**عەباس کاروخ:** زۆر دوای ئازادبوونی باشووری کوردستان نەبوو کە یەکێکی دیکە لە ڕێبەرانی حیزبی دێمۆکرات لەوڵاتی ئەڵمان تیرۆر کرا. شەهیدبوونی دوکتۆر شەرەفکەندی دووهەمین زیانی قورس بوو کە وەبەیکەری ئەو حیزبە کەوتو بەتایبەت لە هەلومەرجی ئەوکاتەدا زۆر لەسەر حیزب بە گران وەستا. ئەوە بۆ ڕووی دا؟ پرسیار ئەوەیە ڕێبەرایەتیی حیزب بۆ ئەوەندە بێ مووبالاتو بێ ئاگا لە باری ئەمنییەتی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بێ ئەوەی ناواقیعبینانە قسان بکەم کە بڵێم لەدەستدانی دوکتۆر سەعیدی قورستر بوو لە هی دوکتۆر قاسملووی، ئەو موبالەغەیە ناکەم بەڵام لە ویژدانی زۆر کەساندا بەتایبەتی کەسانی مەسئوولو خاوەنلێکدانەوەو ئەوانەی لەواقیعدا بەرپرسن، مەرگی دوکتۆر سەعیدی زەبرێکی زۆر بەهێزتر بوو. هەر دوور نەڕۆین با ئەمن تەعبیر لەخۆم بکەم. لە یەک قسەدا دەگەڵ هەموو تاڵییەکەی، بە مەرگی دوکتۆر قاسملووی ئیحساسی سەرشۆڕیم نەدەکرد. چونکی ئەوەڵەن تەجرەبە نەبوو، پاشان دوکتۆر قاسملوو لەپێناو سوڵحو ئاشتیدا ئەوەی بەسەر هاتبوو. بەڵام لە حادیسەی دوکتۆر سەعیدیدا ئیحساسی شەرمم دەکرد. پێمخۆش بوو کەس لێم نەپرسێ ئەوەی بۆ وای لێهات. چونکە هیچ جوابێکم پێ نەبوو. هەموو کەس حەقی بوو بڵێ - کە دەشیان گوت - ئاخر بۆ ئاقڵ نەبوون. بەو کەلیمەیان نەدەگوت بەڵام هەر ئەوە بوو. دەیانگوت بۆ عیبرەتتان وەرنەگرت. خەسارێکی یەکجار زۆر گەورە بوو. وەکی عەرزم کردی دوکتۆر سەعید لە ڕاپۆرتی کۆنگرەی نۆدا زۆر بەجێ ڕەخنەی لە چۆنیەتیی شەهیدبوونی دوکتۆر قاسملووی گرتبوو. کەچی بۆخۆی لەحاڵێکدا پێیان گوتبوو کە دەبێ پۆلیستان بۆ دابنێین قبووڵی نەکردبوو. ئەوە خەسارێکی گەورە بوو بەڵام لەدوایە پێم وایە چونکە زەبرەکە زۆر بەهێز بوو ڕێبەرانی حیزبی دێمۆکراتی وشیار کردەوە.

جارێکیان لە بەشی فارسیی ڕادیۆی فەرانسە مورساحەبەیان دەگەڵ کردم. کە ئەمن چووم دوو ماشێنی پۆلیسم دەگەڵ بوون. بەڵام دەچوویە هەر شوێنێکی ئەوانە دەگەڵ پۆلیسی ئەو مەنتەقەیەش هەماهەنگییان دەکرد. لەدەوروبەری ڕادیۆ کە دەزگایەکی زۆر بەربڵاوە، پۆلیس هەمووی بەسیج کرابوو. لە زیمنی پرسیارەکاندا لێیان پرسیم: دەبینین گاردێکی یەکجار زۆر حیمایەت لە تۆ دەکا. ئەوە بۆ وایە؟ گوتم پەروەکی دەڵێ:

**"هر که ناموخت از گذشت روزگار    هیچ ناموزد ز هیچ آموزگار"**

ئێمە ئەو زیانە گەورەیەمان لێ کەوتوە، بۆیە هەوڵمان ئەوەیە جارێکی دیکە ئاوا نەکەوینە داوی دوژمنەوە. ڕەنگە لەجێیەکی دیکە بکوژرێین هیچ مەسەلە نیە. بەڵام ئەوە کە دوژمن جارێکی دیکە لەبێ‌موبالاتیی ئێمە کەڵک وەرگرێ و زەربەمان لێ‌بدا خەسارێکی زۆر گەورەیە. خەسارەکە چەند قات دەبێتەوە. بۆیە دەڵێم بەڵێ زۆر ناخۆش بوو، زۆر تاڵ بوو. جوابمان بۆ خەڵکی پێ نەبوو. دەواقیعدا هێندێک واقیعی‌بوون یان مەسئوولبوونی حیزبی دێمۆکراتی دەخستە ژێر پرسیار. بەڵام بەڕاستی مەسئوولییەتەکە بەتەنیا لەسەر شانی خودی دوکتۆر سەعیدی بوو، چونکی خۆ کەس ئاگای لێ نەبوو وەزعییەتی وێ چۆنە. ڕاستە ئەندامی دیکەی کۆمیتەی مەرکەزی دەگەڵ بووە وەک کاک فەتاحی عەبدولی یان کاک هومایوونی ئەردەڵان. بەڵام مەسئوولییەتەکە لەسەر شانی وان نەبوو. خۆ دەفتەری سیاسی لێرە هیچ ئاگای لێ نەبوو. ئەمن دوایە کە زیاتر لە قەزیەکەی ئاگادار بووم، سەرفی‌نەزەر لە هەمووی ئەوانە، باری ئەمنییەتی‌یەکەی نا، ئەگەر ئەو ڕووداوە ڕووشی نەدابایە و ئەمن ئاگادار بامایە ئەو کۆبوونەوەیەم هەر مەحکووم دەکرد. بۆ؟

چونکی دەگەڵ کەسانێک کۆ بۆتەوە کە هیچیان هاوتەرازی وی نین. ئاخر لە دیپلۆماسی‌دا ئەوە ڕیعایەت دەکرێ. ئەگەر میوانت بێ قەیدێ ناکا. مەسەلەن وەزیری دەرەوەی وڵاتێک دەچێتە وڵاتێکی دیکە سەرکۆمار دەبینێ. ئەوە قەیدێ ناکا. بەڵام کە بۆ موزاکەرە دادەنیشی دەبێ تەرازوێک هەبێ. هیچ کەس لەوانە سکرتێری حەرەکەتی خۆیان نەبوون کە دەگەڵی دانیشتوون. باسەکە چی بووە؟ تەفسیلاتەکەی نازانم چونکە ڕەسمی نەبووە. لە هەمووی سەیرتر لە شەئنی سکرتێری حیزبی دێمۆکراتی کوردستان‌دا نەبوو بچێ لە قاوەخانەیەک دانیشێ. ئەمن بۆخۆم مەشهوورم کە لەسەر ماڵی حیزب سەقیلم. پێم وایە کەس لەسەر ماڵی خۆم تۆمەتی سەقیلیی لێ‌نەداوم، بەڵام لەسەر ماڵی حیزب سەقیلم. بەڵام ئەو وەختەی لە وڵاتانی دەرەوە چووم دەگەڵ خەڵکی دانیشتووم، حەتمەن جێگایەکی موحتەرەمم هەڵبژاردوە. یانی جێیەک بێ کە عەیب نەبێ سکرتێری حیزب لێی دانیشێ و پەزیرایی میوانی لێ بکا. مەسەلەن قاوەم بە سێ دۆلاران کڕیوە لەحاڵێکی‌دا دەمتوانی لە شوێنێکی دیکە بە نیو دۆلار بی کڕم. لەو ڕۆژەدا کە پێویستە ئەمن سەت دۆلاری خەرج کەم دەبێ خەرجی کەم. جا ئەو ڕێستوورانەی ئەوان لێی دانیشتبوون کە بە میکۆنۆس مەشهوورە، وەک قاوەخانە موحەقەقەرەکانی شارەکانی کوردستانە. یانی لەچاو یێرلین شتێکی وایە.

**هەیاس کاردۆ:** گۆیا لە زەمان دادگای ئەڵمان یان دادستانەوە ئاشکرا کراوە کە دەبێ یەکێک لە شەهیدەکان مەئموور‌ی دەوڵەتی ئێران بووبێ، ئەوە چۆنە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە لەهیچ‌وەخۆڕایی بڵاو بۆوە دەنا ئەو شتە وا نەبوو. عەکسی ئەوە پێموایە لە یەکەم ساڵی دوای حادیسەکەدا بوو کە دادستانی شتێکی بڵاو کردەوە گوتی هیچ بەڵگەیەک بەدەستەوە نیە کە

نیشان بدا هیچکام لەوانەی کوژراون دەستیان لەو حادیسەیەدا هەبووە. لەواقیعدا هەم ئەوانی تەبرئە کرد، هەم ناڕاستەوخۆ تۆمەتی لەوانە دا کە مابوون. چونکی مەعلووم بوو ئەو کابرای خاوەن ڕێستورانەکە - وا بزانم هادی غەففاری بوو - کە بە ڕێکەوت برینداریش بوو، دەستی هەبووە. چونکی پێش ئەو وەختیش و دوای ئەو وەختیش هەر هاتوچۆی ئێرانی دەکرد. حەتتا ئەو وەختیش ئەمن لە وتووێژێکی چاپەمەنیدا تەعنەیەکم لەوانە دا کە مابوون. هەرچەند هێندێکیان هەم سالم بوون هەم دوایەش کۆمەگی باشیان کرد. پرسیاریان لێ کردم کە ڕەئیت چیە لەسەر ڕێکهێنانی هەیئەتێکی تەحقیقی هاوبەش. یانی لە ئێمە لەوانە کە بەشداری کۆبوونەوەکە بوون. ئەمن گوتم هەیئەتی تەحقیق دەگەڵ هێزە ئینتیزامی‌یەکان بەباش دەزانم بەڵام دەگەڵ ئەوانە شکم هەیە. گوتیان بۆ؟ گوتم چونکی ئەو کاتەی تێرۆر دەکرێ ئەوان گیانیان لە ئەمانداییە. ئێمە دەکوژرێین بەڵام ئەوان ناکوژرێن. هەرچەند بەڕاستی دوایە بەبرێ پەرەویزی دەستەڵاتچی زۆری کۆمەگ بە ڕوون بوونەوەی مەسەلەکان کرد وەک شاهیدی‌دانی ئەوانە. بەڵام لانی کەمی ئەوە بوو کە ئەوەش هەر دەیتە ئیعتیقاد لە دوکتور سەعیدی کە دەگەڵ کەسانێک دانیشتوە جمهووریی ئیسلامی گوللەیەکی لێ خەسار نەکردن. ڕەقەکەی لە جیزبی دێموکراتە کە جمهووریی ئیسلامی هەموو سەرمایەکەی دادەنێ بۆ ئەوەی زەربەی لێبدا. یانی لەو بارەشەوە ئیعتیقادی پێ وارید بوو.

**عەباس کاردۆ:** دوای شەهید بوونی دوکتور شەرەفکەندی خەڵکی باشووری کوردستان هاودەردی‌یەکی کەم وێنەیان نیشاندەلو خەمی خۆیان بە شکڵی جۆراوجۆر دەربڕی. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە سەرکردایەتیی حیزب لە ژێر فشارێکی زۆردا بوو هەتا بنکەکانی چۆڵ بکاو تەنانەت دەکەوتە بەر هێرشیش. ئەو دوو هەڵوێستە دژ بەیەکە چ مانایەکی هەبوو؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** پێموایە دژی یەکتر نین، موکەممیلی یەکترن. دەکرێ بڵێم ڕەنگە هەلومەرجێک ئیجازە بداو هەلومەرجێک ئیجازە نەدا. ئەگینا خەڵکی کوردستان وەکوو خەڵک، لە هەموو بەشەکاندا ئەو هەستی هاودەردی‌یەیان دەگەڵ یەکتر هەیە. خەڵکەکە ئەو هەستەیان هەیە. لە زەمانی شەهید بوونی دوکتور قاسملوویدا ئەو شارانە هەموویان دەدەست دەوڵەتی عێراقدا بوون. خەڵک ئیمکانی دەربڕینی ئەو هاودەردی‌یەی نەبوو. دیارە کە مەجلیسی سەرەخۆشیمان لە شارەکان دانا خەڵک هاتن و سەرەخۆشی‌یان کرد. بەڵام نە سەرەخۆشی‌یەکە بەو ئەندازەیە پانوبەرین بوو، نە هاوپێوەندی‌یەکە.

پاشان ئەو فشارەی بۆ چۆڵکردنی لەسەرمان بوو خۆ فشاری خەڵکی نەبوو. یانی خەڵک نەبوو کە بیەوێ ئێمە دەربکا یان تۆپبارانمان بکا. تەنانەت کاربەدەستانی حکوومەتی هەرێمیش نەبوون. دیارە هێندێک عەناسیری خەراپ هەبوون وەک ئەمرد کە لە قەندیلی فشاریان بۆ دێنان. ئەوە دوایە دەرکەوت کە دەوڵەتی ئێران تەماحی وەبەر نابووند شتی دابڕوونی هەتا بەگژ ئێمەیاندا بکا. بەڵام خۆ ئەوە کاری حکوومەت نەبوو.

لەو نێوەدا شتێکی دیکەش هەبوو ئەگەر ئەمن لەبیرم بێ. ئەو وەختی بەتایبەتی یەکێک لە دوو حیزبی حاکم لە باشووری کوردستان لە مەوقعییەتێکی تایبەتی‌دا بوو بەنیسبەت جمهوریی ئیسلامی. یانی نێوانیان ناخۆش بوو. یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان بەڕادەیەک نێوانی دەگەڵ ئێران ناڵەبار بوو کە مامجەلال بە سەراحەت گوتی هەم ئەوە کاری جمهوریی ئیسلامی‌یەو هەم دوکتۆر قاسملووش ئەوان کوشتوویانە. دەحاڵێک‌دا وەختی شەهید بوونەکەی بەو شکڵەی دەرتەبڕی. ئەوەش دیارە کۆمەگ بوو بەوەی کە نیشاندانی هاوپێوەندیی و داخ‌دەربڕینەکە زیاتر بێ. سەرەڕای ئەوانە ئەو وەختی کوردستان ئازاد بوو و خەڵک مەجالی هاوپێوەندیی زیاتر دەگەڵ یەکتریان هەبوو.

**هەیاس کاردۆ:** هەر لە"بۆڵێ" بوون کە عەمبارێکی گەورەی حیزب لەهەولێر ئاگری گرت و وەکی دەگوترا زیانی زۆرتان وێ کەوت. حەقیقەتی ئەو مەسەلەیە ئێستاش ڕوون نەبۆوە و کەس لەو بارەوە بەخەتابار نەزانرا. دەکرێ لەو بارەیەوە بدوێی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وا بزانم مەسەلەکە زۆر چووکترە. زیانێکیش کە وێمان کەوت بۆ حیزبێکی سیاسی ئەوەندە زیانێکی گەورە نیە. چاکم لەبیر نیە، بەڵام وا فکر دەکەمەوە ڕەنگە زیانەکەی بگاتە دە هەزار دۆلار. ئەوە بۆ حیزبێکی وەک حیزبی دێمۆکرات زۆر نیە. بۆ مرۆڤ هەزار دۆلاریش و پێنج سەت دۆلاریش زۆرە. ئەگەر دەوڵەتێک پێنج سەت میلیۆنی زەرەر وێ کەوتبێ ئاکرێ بڵێین زەرەری قورسی وێ کەوتوە. ئێستێ شکم هەیە کە داخوا گەیشتە ئەو مەبلەغەش یان نا. بەڵام لەسەر تەحقیقەکەی، ئەوەی ئەمن لەبیرم بێ حادیسەکە شتێکی عەمدی نەبوو. یانی بڵێی بە ئەنقەست ئاوری تێ بەردراوە. دیارە بێ مەسئوولییەتیی تێدا بوو. لەپاشانیش بە بەر ئەو خەسارەوە کە کەوتبوو، هێندێک سوونی ئیستیفادە کرا. چونکی ڕۆیشتوە ئەمن ناوی هیچ کەس نابەم، بەڵام یەک حەقیقەت دەڵێم: کە هەیئەتی تەحقیق خەریکی کاری خۆیان بوون ئەمن لەلاوە پرسیارم کرد کە ئەوە نی چیەو بۆ چیە؟ دیار بوو نەیاندەزانی. گوتم بابە ئەمن شاهیدی فلان شتەم. گوتم شاهیدی ئەوەم پاش ئەوەی ئاور کوژاوەتەوە هیچ نەماوە. پەنجەرەیەکی دووڕو درێژی چوار میتری هەبوو کە بە پانایی و درێژایی پەنجەرەکەو بە بەرزایی نیزیکەی نیو میتر، سیگاری وینستۆن لەسەر یەک دانراوە کە لە سووتانێ ڕزگار بووە. ئەوە زۆریش دواتر کە ئەمن چووم. کەچی یەک پاکەت سیگار چیە نەهاتبووە حیساب. گوتم وەرن لەمن بپرسن. تەنانەت سێ جاریشم گوت بەڵام ئەوانەی تەحقیقیان دەکرد هەر نەهاتن لێم بپرسن. چونکە بەجۆرێک ویستیان ئەوەی لەوێدا پیاو خەراپ دەبوو، تەبرئە بکەن. چونکی هەر ئەو وەختی ئەوانە "خودی" بوون.

**عەباس کاردۆ:** یانی ناکامی لێکۆڵینەوە بە هیچ کوێ نەگەیشت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر لە ناکامی ئەوەدا کەس سزا نەدراو کەس تاوانبار نەکرا. دەنا هەر ئەوە بۆخۆی نیشانەی هێندێک شت بوو. باشە عەمبار سووتاوە، سووتاوە، بەڵام ئەدی ئەوە چیە. مەسەلەن بەدەیان و سەدان دەست لیباسی حیزبیمان هەبوو. هەمووی لە بازاڕی فرۆشرا. لەوانە نەپرسرایەوە چونکی خودی و ناخودی هەبوو.

**عەباس کاردۆ:** بە نەمانی دوکتور شەرەفکەندی و بوونی کاک مستەفا هیجری وەک سکرتێری حیزب، هەست دەکرا بۆشایی‌یەکی گەورە لە رێبەرایەتی‌دا پەیدا بووە. وەکی باس دەکرێ ئەوە سەرەتای لاوازیی حیزب و پەرەگرتنی خۆبەخۆیی لە رێبەری‌دا بوو. بەڕای جەنابت ئەو بۆچوونە ڕاستە؟ دەورانی دوای شەهیدبوونی دوکتور شەرەفکەندی هەتا کۆنگرەی ١٠ چۆن پێناسە دەکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێم وایە ئەگەر بمانەوێ مەسافەت دابنێین دەتوانین ئاوا بڵێین. ئەگەر نێوانی دوکتور قاسملوو و دوکتور شەرەفکەندی بڵێین لە یەک هەتا پێنج بووە، بە ئاسانی دەتوانین بڵێین فاسیلەی بەینی دوکتور سەعید و کاک مستەفا یەک هەتا چلە. ئەوەندە فاسیلەیان هەیە. ئەمن گوتم دوکتور سەعید لەباری زەکاوەتی فکری‌یەوە لە دوکتور قاسملووش زیرەکتر بوو. بەڵام کاک مستەفا دەگەڵ ئەوەی لەو بارەیەوە زۆر لە خوارەوەی دوکتور سەعید بوو و بە تەریقی ئەولا لە خوارەوەی دوکتور قاسملووش بوو، شتێکی هەبوو و هەیەتی کە بەقەت یەک لەوەی هیچ کامیان ئەهلی مەشوەرەت و فکری جەمعی نیە. زۆر مەغرووره. زۆر ئیعمالی دەسەڵات دەکا. با ئەوەش بڵێم دەفتەری سیاسی‌یەک کە دوای دوکتور سەعیدی پێکهات پێنج کەس بووین. چواریان لایەک بووین یەکیش بە تاقی تەنیا لایەک بوو. دواقیەدا ئەوەی ئیعتیرازی بەو شتانەی کاک مستەفا دەکرد تەنیا ئەمن بووم. کە دەکەوتینە دروەدوویی زۆر جار ئەوان تەواو هاوفکرم بوون. بەڵام ئەو هەمبستەگی‌یە وای کردبوو ئەگەر باوەڕیشیان پێی نەبایە هەمبستەگی‌یان دەگەڵ وی دەکرد. ئەوە زەربەیەکی زۆری گەیاندبوو هەم بە ئینسیجامی ئەو ڕێبەری‌یە کە لە دەفتەری سیاسی‌دا خۆی دەنواند، چونکی هیچ نەبێ مشیان بۆ دەرنەدەکرا کە یەکدەست بین. هەمیش دیارە لە کارایی شتەکەی کەم کردبۆوە.

گوتم ئەمن کە دە ڕێبەریش‌دا نەبووم زۆر مەورید هەبووە کە دوکتور قاسملوو بانگی کردووم و مەشوەرەتی دەگەڵ کردووم. پێم وایە بۆخۆشت شاهید بووی کە دوکتور سەعید هەم بۆ مەشوەرەت و هەم بۆ موناسەبات زۆری بانگ دەکردم. دوکتور سەعید دە زەمانی ژیانی‌دا وەک سکرتێر دوو موناسەبەت ڕێک کەوتن کە بەشدار بێ. یەکیان بەشداربوونی لە کۆنگرەی یەکیەتی نیشتمانی و یەکیشیان سەردانی کاک مەسعود

بارزانی بووە. ئەمنیش ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی نەبووم. بۆ هەر دووکیان داوای کردوە ئەمن دەخزمەتی‌دا بچم، چونکی بەهەر سوورەت پێی وا بوو ئەمن دەتوانم کۆمەگ بکەم، شارەزایی‌یەکم هەیەو خەڵکی دەناسم. یان مەسەلەن میوان دەهاتن، کاک مەسعوود هاتوە، مامجەلال هاتوە، کاک عەزیز محەممەد هاتوە، دوکتۆر مەحموود هاتوە. وەبیرم نایە لەماڵ بووبێم دوکتۆر سەعید لەدوای نەناردبێم. نەک لەبەر ئەوەی ئیحتیاجی بەمن هەیە. بەڵام دەیەوێ شتێک کە ئەو ئاگای لێ نیەو ئەمن ئاگام لێ‌یە لە دانیشتنەکاندا باسیان بکەم چونکە ئەمن پتر لە نێوی‌دا ژیاوم. لەو بارەیەوە زۆر کۆمەگی فکریی داوا دەکرد. بەڵام کاک مستەفا ئەوەی تێدا نەبوو. باوەڕیش ناکەم ئێستا کە سێ‌چوار ساڵە لێک دوورین تێی‌دا پێک هاتبێ.

**هەیاس کاردۆ:** یانی قبووڵ دەکەی کە لەو ماوەیەدا حیزب لەباری مودیرییەتو ڕێبەری‌یەوە داشکانی بەخۆیەوە دیت.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن واقیع‌بینم. دەڵێم حیزبێک لەبەین ناچێ. ئەگەر حیزبەکە هەبێ‌و هەلومەرجەکە باش بێ دەتوانێ کۆمەگ بکا بە ڕاستبوونەوەی. دەنا مەعلوومە. ئێستێ ئیختیلافی سەلیقەی منو یەکی دیکە یان ئەو دوو حیزبەی ئەوەیە. ئەمن بۆخۆم پێموایە، ئێستا دوو حیزبی دێمۆکراتمان هەن بە دوو ناوی جیاواز. هەر دووکیان بەنیسبەت چالاکترن لە پێنج ساڵ بەر لەئێستا. بەڵام بە هەردووکیان نە لەنێو ئەندامانی ئەو دوو حیزبەدا، نە لەنێو کوردی ئێراندا، نە لەنێو کوردی بەشەکانی دیکەدا، نە لەنێو ئێرانی‌یەکانو نە لەنێو دنیای خاریجدا بەقەت ئەو وەختی نفووزیان نیە. ئەوە تەسەووری منە. بەڵام تەسەووری لایەنەکەی دیکە ئەوەیە کە ئەوەتا حیزب هەیەو تاریخی بووە ڕۆژی وا دژوارەی بەخۆیەوە نەدیوە. پێی وایە لە ئەوجی عەزەمەتدایە. ئەمن ئەوەی بە کارەسات دەزانم.

# ڕۆیشتنی تێکۆشەران بۆ وڵاتانی بێگانە

**عەباس کاردۆ:** داگەڕان بۆ دەشتی کۆیەو برینداربوونی غرووری شۆڕشگێڕانی دیموکرات لەلایەک و پەرە گرتنی ناامنی و فەزای ترس لە باشووری کوردستان لەلایەکی دیکە، دوورکەوتنەوەی دەستە دەستەی ئەندامانی حیزبی بەدواوە بوو. ئایا ئەوە قەیران بوو لەحیزب دا؟ تۆ چۆنی لێک دەدەیەوە؟ ئەوکات بۆ پێشگیری لە پەرەگرتنی ئەو ڕەوتە چیتان دەکرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لە هێندێک شت نازانم بۆچوونەکانمان زۆر لێک جودان. ئەمن پێموایە ئینسانی تێکۆشەرو شۆڕشگێڕ بەو ئاڵوگۆڕانە ورەی دانابەزێ. مەسەلەن ئەمن داگەڕان لە قەندیلیڕا بۆ دەشتی کۆیەی باشووری کوردستانم زۆر پێ لەوەی کەمترە کە لە شارەکانڕا بچینە شاخی و لەشاخیڕا بەرەبەرە بکشێینەوە تەنانەت بێینە پشتی سنوورەکان. ئەمن پێموایە ئەوەیان زۆر ناخۆشتر بوو. ئەوی دیکە یانی ڕۆیشتن یان دانیشتنی تێکۆشەرانیش لەڕاستیدا هەر لێرە نەبوو. ئەگەر لە ئێرانێ بووین و بە هەزاران و بگرە بەدەیان هەزار کیلۆمیتر خاکی ئازادکراومان لەبەر دەستدا بوو خەڵک هەر دەڕۆیشتن یان دادەنیشتن. مەسەلەن لەشەڕی سێ مانگەدا خەڵکێکی زۆر وەدەر کەوت. بەڵام کە چووینەوە دوایە جارێکی دیکە مەجبوور بووین شارەکان بەجێ بێڵین خەڵکێکی زۆر ئیدی خۆیان تووشی ئەو گێرەو کێشەیە نەکردەوە نەهاتنەوە دەرێ. یانی ئەوەش هەر مەخسووسی ئەو جێیە نیە.

ئەمن پێم وایە لە ڕەوتی شۆڕشێکی خوێناویدا ئەو شتانە هەر دەبن. مەسەلێک هەیە کە ڕەنگە لە بارەی ئێمەوە لەوێش تێپەڕیبێ. دەڵێن بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی کە دەست پێدەکا هەتا سەردەکەوێ لە سەدا دەی ئەوانەی لە دەستپێکردنیدا دەگەڵی بوون دەگەڵی دەمێنن. ئەمن پێموایە بزووتنەوەی ئێمە هێندە درێژ بۆتەوە ڕەنگە هەر لەسەدا پێنجی ئەوانەی هەوەڵێ دەگەڵ مابن. بەڵام ئەوە بەو مانایە نیە کە ورە دابەزیوە یان مەئیووس بوون. جارێکی ئەمن قسەیەکم کرد نازانم جاری وایە تەفسیری سەیر لێ دەدرێتەوە. گوتم جەریانی خەبات و شۆڕش وەک حەوزێکی ئاو وایە کە لەلایەک ئاوی تازەی دێتە پاڵ و لەلایەکی دیکەوە لەبەری دەڕوا. ئەوەیان بە کفر دانابوو. لەحاڵێکدا شتێکی زۆر سروشتییە. ئێمە موڕەتەب خەڵکمان ماندوو دەبێ، خەڵکمان پیر دەبێ، خەڵکمان دووچاری گیروگرفت دەبێ یان خەڵک دڵسارد و ناڕازی دەبێ. ئەوە هەمووی هەیە. بەڵام لە عەینی حاڵدا خەڵکێکی تازەنەفەس ڕەگەڵ دەکەون. ئەو ڕەوتە لە زەمانی پێشەوە هەتا ئێستا

ئیدامەی هەبووە. هێندێک کەس حیزبایەتی و خەباتی ئازادیخوازانە هەر لەوەدا دەبینن لە شاخی بی و تفەنگت دەشانی‌دا بێ. ئەخێر ئەو ڕەوتە زۆر لەمێژە دەستی پێ کردووە هەتا ئێستا درێژەی هەیە. جارێک لە لووتکەدا بووە، جارێک دابەزیوە. جارێک لە شار بووە، جارێک لە شاخ بووە. جارێک خەباتی چەکدارانەی دەگەڵ بووە، جارێک بە شکڵی دیکە بووە. یانی خەبات هەموو ئەو شتانەی تێدا دەبێ.

دیسان وەکوو دیفاع لە خۆشم پێم‌خۆشە شتێک بڵێم. لەو چەند ساڵەدا کە ژمارەیەک پێیان وابوو بە بەدگۆیی من دەتوانن خۆیان شیرین کەن یان ئەمن ناحەز بکەن، هێندێک بوختان و شتی زۆر سەیریان بۆ من هەڵبەست لەپێوەندیی دەگەڵ ئەو کەسانەدا کە دەچن بۆ دەرەوە. وەک ئەوە کە ئەوە ئەمنم نایەڵم "یوو ئێن" قبووڵیان بکا. تەنانەت لەوەش زیاتر وەختی خۆی بڵاویان کردەوە کە ئەوە فلانکەس نایەڵێ ئەمریکا هێرش بکا دەنا ئەمریکا لە ڕۆژهەلاتی کوردستان مەنتەقەی پەروازممنووع بۆ ئێمە دادەنێ و هێرش دەکاتە سەر ئێران. پێم وایە لە کۆنگرەی سێزدەدا بوو کە گوتم ئەوە ڕاستە، چونکی هەموو بەیانان سەعات هەشت جۆرج بووش تەلەفوون بۆ من دەکا و دەپرسێ بەرنامەی کاری ئەمڕۆم چییە؟ یانی قسەی زۆر بێ مانایان دەکرد.

جا لێرەدا پێم‌خۆشە شتێک بڵێم. کە هاتینە ئێرە دیارە ماوەیەک بوو ئەمن گەڕابوومەوە نێو ڕێبەرایەتیی حیزب، بەڵام بەڕاستی لێرە بوو ئەمن بۆم دەرکەوت کە دەفتەری سیاسیی ئێمە بڕیارێکی هەیە. بڕیارەکە دەڵێ ئەوانەی پێشمەرگایەتی‌یان کردوە ئەگەر بڕۆن بۆ وڵاتانی دەرەوە، حیزب تەئیدییەیان ناداتێ بۆ ئەوەی ئەگەر بگەڕێنەوە نێوخۆ گیانیان وەخەتەر دەکەوێ. کە ئاگادار بووم لە دەفتەری سیاسی‌دا کردمە هەڵلا. گوتم کوڕە ئەوە ئابڕووچوونە. یانی چی، کەسێک هەر تەنیا جاسووس نەبێ و پیاوی ڕێژیم نەبێ، ئەگەر بڕواتە دەرێ ئێمە تەئییدی دەکەین کە ئەگەر بڕواتەوە گیانی دەکەوێتە خەتەر کە کارێکی باشیش دەکەین. بەڵام ئەوەی دەپازدە ساڵی پێشمەرگایەتی کردوە ئەگەر تەئییدی نەکەین مانای ئەوەیە بە تاوانی ئەو گوناحەی کردوویەتی دەبێ سزا بدرێ. بە هەڵلایەکی زۆر ئەمن ئەوەم چەسپاند کە دەبێ ئەوانە تەئیید بکەین.

بە هەر حاڵ ئێمە هەوڵمان داوە بەڵام ئەو هەوڵە قەت سەرکەوتوو نەبووە و قەتیش سەرکەوتوو نابێ. هەر وەکی گوتم بە هەر دەلیلێک بێ خەڵک واز دێنن. دیسان بۆ منیان هەڵبەستبوو کە گۆیا گوتوومە ئەوانە بەزیون. ئەمن لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا کە نازانم لە سوئێد بوو یان نۆڕوێژ، گوتم ئەمن نەم‌گوتوە بەزیون. بەو مانایە کە ئەوە لەترسان هەڵاتوون. بەڵام با ئێستێ بڵێم بەڵێ بەزینە. ئێوە بەزین هەر بەوەی دەزانن کە بڵێن فلان کەس گوتوویەتی ترسەنۆکن لە تەقەی ترساون. ئەمن دەڵێم بەزین، بەزینە. ئەتۆ لەبەر ناموڵایماتی حیزبی هەڵاتووی هەر بەزینە. لەبەر گەرمای دەشتی کۆیە هەڵاتووی هەر بەزینە. لەبەر سەرمای قەندیلی هەڵاتووی هەر بەزینە. لەبەر کەم‌وکووڕیی ماڵی و ئابووری هەڵاتووی - ئەگەر ئەوەی بە بەزین ناو بەرین کە من هیچیان بە

بەزین نازانم - دەی ئەوەش هەر بەزینە. هەرچەند ئەمن ناوی بەزینیان لێ نانێم. ئەمن ئەو کەلیماتەی بەکار ناهێنم. لەعەینی حاڵدا دوورکەوتنەوە بە شتێکی سروشتی دەزانم.

لەو کۆبوونەوەیەدا نەبوو وابزانم لە یەکێ پێشتردا بوو، برادەرێک لەسوێد - ناوەکەیم لەبیرە بەڵام ناوی نابەم - وەکوو تەعنە لەوەی کە ئێستا وەزعی حیزب خراپە گوتی ئەو خەڵکە بۆ دێتە دەرێ؟ دەیویست ئەو تەعنەیە لێبدا کە وەزعی حیزبەو ڕێبەری خراپە. گوتم باشە ئەتۆ بۆ لێرەی، ئەتۆ بۆ هاتوویە دەرێ؟ ئەوەی ئەمڕۆ دێتە دەرێ هەشت ساڵ دوای تۆ دێتە دەرێ. ئەو وەختێ چی بوو؟ یانی بە باوەڕی من ئەوەی نە بە قەیران ناو بەرین و نە بەوەی ناو بەرین کە خەڵکەکە مەئیووس بووە، ڕەنگە لە دەورانێکدا چوونە دەرەکە زیاتر بووبێ. بەڵام بەباوەڕی من هۆی چوونەدەرەوەی زیاتر ئەوە نەبووە کە وەختەکانی دیکە کەمتریان حەز لە دەرێ هەبووە و ئەو وەختەی زیاتریان حەز لێ بووە. یان ئەو وەختەی بەزیوە و تەزیوە و وەختەکانی دیکە قارەمان و فیداکار بوون. ئەوەی نازاو قارەمان بووە هەر هەیە. بەڵام دەلیلی ئەوەی کە لە وەختێکدا زیاترە یان کەمترە، ئیمکاناتی چوونەدەرەوەیە. مەسەلەن ئێستا کەمترە لەو وەختەی جەنابت باسی دەکەی. چونکێ لە هەولێر دووکانێکیان دانابوو بیبوو بە ئاژانسی موسافیرەتی. کابرا لێرە هەڵدەستا دەچووە هەولێرێ. لەوێ دادەنیشت و بە دەرەنگ و زوو بەڕێ دەکرا. دوایە لە تورکیە هەبوو دەچوونە ڕێ. ئێستا وای لێهاتوە بۆ تورکیەش بەزەحمەتە بچێ. هەولێر بەو سوورەتە هەر نەماوە، لە تورکیەش زۆر دەیگێڕنەوە. ئێستا تەنیا ئەو کەسانە دەچنە دەرێ کە بتوانن بە دەیان هەزار دۆلار خەرج کەن بۆ ئەوەی بگەنە وڵاتێکی ئورووپایی. ئەوەش هەموو کەس لەدەستی نایە. ڕەنگە دەلیلەکەی هەر ئەوە بێ. دەنا ئەمن پێموایە ئەگەر ئێستا ئاسان بێ خەڵک بتوانێ بە مانگێک بڕواتە دەرێ - هیچ کەس موتتەهەم ناکەم بە بەزیوە و تەزیوە و ئەوانە - بەڵام شکم نیە لەڕیزی هەموو حیزبەکاندا نیوەی هەموو ئەندامانیان دەڕۆن ئەگەر بزانن بە مانگێک دەگەنە جێ. کابرا جەوانە پێی خۆشە دنیای دەرەوە ببینێ. لێرە دەگەڵ هەموو مەحروومییەتی دنیایە ڕووبەڕوویە. یان دەیەوێ بخوێنێ لێرە ئیمکانی نیە. دەیەوێ دەوڵەمەند بێ دیسان لێرە ئیمکانی نیە. زۆر دەلیلی دیکە هەن بۆ ڕۆیشتن ئیدی بۆ ئینکاریان بکەین.

**عەباس کاردۆ:** گلەیی و لەڕاستیدا خوێنخواردنەوەی ئەندام و پێشمەرگەی حیزب بە درێژایی ساڵان و بەتایبەت لەو سەروبەندە ئەوە بوو کە ڕێبەرایەتیی حیزب سەبارەت بە چارەنووسی ئەو کەسانەی دادەنیشن بێتەفاوەتە. ئەوە لەسەر زۆر کەس بەگران تەواو بووە و ڕەنگە زۆر کەسیشی هان دابێ دوای وازهێنان لە کاری تەواوکاتی حیزبی، ئیدی ڕووی تێنەکەنەوە. دیارە لەو بارەیەوە ڕووی گلەییەکان تۆش دەگرێتەوە کە یان کەسی دووهەم بووی یان یەکەم. لەو بارەیەوە دەڵێی چی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەش دیارە ئەو پەڕی ناشارەزایی تێدا بوو. گۆیا "یوو ئێن" لەبەر قسەی منە نایەڵێ بڕۆن. لە حاڵێک‌دا لە تەواوی ژیانمدا کە زۆریش هەڵکەوتوە پێوەندیم دەگەڵ مەسئوولینی یوو ئێن هەبووە، مەسەلەن دەگەڵ یوو ئێنی ژنێڤ دانیشتووم، بەڵام قەت جارێک نەبووە ئەمن دەگەڵ بەرپرسێک دانیشمو ئەوەی لەدەستم دێ وەک شەفاعەت بۆ ئەو کەسانەی کە لێیان قەوماوە باس نەکەم. مەسەلەن ئەوانەی لە تورکیە بوون. لەحاڵێک‌دا دەیانگوت فڵانە کەس نایەڵێ. ئێستاش دەیڵێمەوە کە نەقشی منی تێدا نەبووە. باشە خۆ ئەمن ئەوە حەوت ساڵە دەرێبەرایەتیی حیزبدا نیم. خۆ ئەو ئاغایەی جاران نەماوە. ئاغایەکی دیکە بۆ یوو ئێنی پەیدا بووە، ئەدی بۆ خەڵکی بەڕێ ناکا؟ ئەدی ئێستا ئەمریکای بۆ نایەتن ناوچەیان بۆ ئازاد بکا؟

بەڵام ئەمن نەمشاردۆتەوەو ناشی شارمەوە بۆ ئەبەد کە هەر وەختێکی ئەندامێکی حیزبیمان لە داخڵی وڵاتەوە دێ بۆ ئێرە بۆ پێشمەرگایەتی بە خەسارێکی گەورەی دادەنێم. هەر وەختیش یەکێک لێرەڕا دەڕواتە دەرێ دیسان بە خەسارێکی گەورەی دادەنێم. ئەوەم پێ خراپە. بە دەنگی بەرزیش هاوار دەکەم. هەتا ئێستا ئەمن باوەڕی خۆمم نەشاردۆتەوە. بەڵام ئەوەم پێ نامەردییەکی گەورەیە کە کەسێک بچێ بە مەقاماتی یوو ئێن بڵێ ئەو پەناخوازەی وەرمەگرن. ئەمن لەو بارەیەوە نموونەیەک دێنمەوە. ژمارەیەکمان هەبوون پەناخواز لە شارەکانی هەولێرو سولێمانیو ئەوەی. ئەوانە لە وڵاتانی دەرەوە قبووڵییان هەبوو بەڵام دەوڵەتی عێراق ڕێگای نەدەدا بڕۆن. جارێکی ئەمن سەفەری بەغدایەم کرد. بەرپرسانی عێراقی هاتن هەر لە ماڵەکەی خۆمان بەخێرهاتنیان کردین. باسی داواو مەسەلەکانی خۆشمان کرا. یەکێک لە گرینگترین باسەکان کە هەڵم ئایساند ئەوە بوو کە گوتم ئەو خەڵکە قبووڵیی وڵاتانیان هەیە بەڵام ئێوە نایەڵن بڕۆن. باشە بۆ نایەڵن؟ گوتیان خەڵکی عێراقییان بە ئێرانی نووسیوە. ڕاستیش بوو شتی وایان کردبوو. گوتم باشە ئێوە خەڵکە عێراقییەکەی دەناسن دەتوانن بیانگێڕنەوە. دەنێو نێ ئێمەشدا کەسی وا نەبوو، بۆیە خاترجەم بووم. ئەوجار گوتیان باشە ئێوە لیستمان بدەنێ هەرچی نێ حیزبی دێمۆکراتی کوردستانە ئیجازەیان دەدەین بڕۆن. گوتم هەموویان نێ ئێمەن. گوتی چۆن شتی وا دەبێ، کابرا بۆخۆی هاتوە دەڵێ نێ کۆمەڵەم، دەڵێ نێ فڵانەم. گوتم مادامێکی ئەوانە لیقەوماوو سیاسینو لە ڕێگای میللەتی خۆیاندا زەحمەتیان کێشاوە هەموویان نێ ئێمەن. کابرا لەوێ هیچ دەنگی نەکرد، لەپاشان لەکن برادەری خۆمان گوتبووی بە بێ‌موبالەغە دڵی حیزبی دێمۆکرات زۆر گەورەیە. سازمانەکانی دیکە دێن زۆر جار هێرش دەکەنە سەر حیزبو بەدگۆیی دەکەن. کەچی فڵانکەس دەڵێ تەواوی ئەوانە نێ ئێمەن. جا بۆیە حازر نەبووم تەنانەت لێکیشیان جودا کەمەوە. با بۆ تاریخیش بڵێم کە قبووڵیان کردو ئەوانەی قبووڵییان هەبوو ئیجازەیان دان هەموو ڕۆیشتن.

**عەباس کاریزۆ:** لەوکەسانەی لەو دەورەیەدا حیزبیان بەجێ هێشت کەسانی ناسراوی وەک دوکتۆر خەلیقی ئەندامی ڕێبەرایەتی‌و کادرە ناسراوەکانی وەک کۆچکردوو کاک ئەمەای عەتیقی‌و کاک ئەحمەدی شێربەگی دەبینران. ئەوانە بۆ ڕۆیشتن‌و هەڵوێستی ئێوە لەو بارەیەوە چی بوو؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** لەو بارەیەوە نموونەیەکی باشت نەهێنایەوە. چونکی دوکتۆر خەلیقی ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی بوو. بڕیارێکمان هەبوو کە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حەقیان نیە بچنە دەرێ. ئەگەر بە سەفەر بچنە دەرێ‌و لەوێ بمێننەوە، ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندی لەدەست دەدەن. کاک دوکتۆر خەلیقی بە ناوی نەخۆشی‌و موعالەجە ڕۆیشتە دەرێ لەپاشان نەهاتەوە. پێش ئەوەی بڕوا دوای ئەوەش کە ڕۆیشت خەڵکەکە لێکرا دەیانگوت تازە نایەتەوە. ئەمنیش دەمگوت لێی گەڕێن با بچێ. ئەگەر نەهاتەوە ئەمنیش دەڵێم نەهاتەوە. دوو مانگی مابوو بۆ هاتنەوەی، دەمگوت ئەو ماوەیەش سەبر بکەن. ئەمن نە دەڵێم دێتەوەو نە دەڵێم نایەتەوە، هەر واش بوو کە نەهاتەوە وبەر ئەو بڕیارە کەوت کە پێشتر باسم کرد.

بەڵام بۆ کاک ئەمەای عەتیقی‌و کاک ئەحمەدی شێربەگی عەکسی ئەوە بوو. ئەوە چاکەیەک بوو کە حیزب دەگەڵ ئەو دووانەی کرد. ئەوان نە بۆخۆیان ڕۆیشتن‌و نە حیزب دەری کردن. هەر لە زەمانی دوکتۆر سەعیدی‌دا داوایان بۆ کرا کە چەند کەسێک وەر بگیرێن. لەپاشان ئەوە سەری نەگرت‌و جارێکی دیکە ئێزنیان درا کە ناو بنووسن‌و بڕۆن وەک پاداشێک بۆ ئەو زەحمەتانەی کێشاویانە. ڕەنگە ئەوانیش وەک هەر کەسێکی دیکە گلەیی‌یان لە حیزب بووبێ، بەڵام ئەوەیان وەک پاداش درا بوو. دیارە چەند کەسێکی دیکەش دەگەڵ بوون کە وەختی خۆی قبووڵیش کران. لە دوایە نازانم چۆن بوو هەر دوکتۆر سەعید بۆخۆی ڕای-گرتن. دە کەس بوون، هەر بۆخۆی بە برایمی جوورابچی گوتبوو دەبێ وا بکەی ئەوانە وەر بگیرێن. برایمی جوورابچی وای کردبوو هەر دەکەسیان لە سوئێد قبووڵ بکرێن. بەڵام دوایە دوکتۆر سەعید گوتبووی ئەو پەروەندەی دەبێ ڕابگرن. دەلیلەکەی چی بوو نازانم.

**عەباس کاریزۆ:** دوکتۆر خەلیقی لەو کەم‌کەسانە بوو کە بە خوێندەواریی زۆر بەرزو نازایەتیی لەڕادەبەدەری هاتە نێو حیزب، بەڵام قەت ئەو جێگایەی نەگرت کە چاوەڕوانی بوو. هۆی ئەوە چی بوو؟ ئەزموونی خۆت لەسەر ناوبراو چی بوو؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** لەسەر دوکتۆر خەلیقی پێم‌خۆشە هێندێک شت بڵێم. دوکتۆر خەلیقی حەتتا بۆخۆی پێی گوتووم خودا غەزەبت لێ گرێ ئەتۆ ئەمنت تووشی ئەو بەزمەی کرد. زۆر دۆست بووین بەڵام نەدەبوو بە ئەندامی حیزب. جارێکیان لە مەهابادێ دانیشتبووین گوتی ئەمن کوردم. گوتم هەمووومان کوردین بەڵام ئەو کوردایەتی‌یەی ئەتۆ دەڵێی بۆ کەسێک دەبێ شوانی نەخوێندەواری دێهاتی بێ. کابرا بە مەدرەکی

دوکتۆراوە دەبێ هەڵبژێرێ. دەبێ خەتی سیاسیی هەبێ. گوتم ئەمن ناڵێم وەرە نێو حیزب بەڵام چ سازمانێک لە خەتی فکریت نێزیکە بچۆ ئەوێ. ئەوە مانای نیە هەر بڵێی کوردم. ئەتۆ دەبێ بیروباوەڕی سیاسیت هەبێ و بە خەتێکدا تێ‌بەڕی کە پێت وایە بۆ کورد بەسوودترە. لەپاشان هەر نەبوو بە حیزبی هەتا پاییزی ١٣٥٩ کە ئەمن دەگەڵ چەند برادەری دیکە بە مەئموورییەت چووبووینە جنووبی کوردستان. ئەوکات ئەو مەنزڵی لە "تەوریوەر"ی ناوچەی "ژاوەرۆ" بوو کە مەقەڕی کۆمیتەی شارستانی لێ‌بوو. لەوێ کاروباری کۆمەڵایەتیی ڕادەپەڕاند و جاروبار دەچوو بۆ دێهات قسەی بۆ خەڵک دەکرد. دووبارە لەوێ تێم هەڵپێچایەوە کە بۆچی نابی بە ئەندامی حیزب. گوتی ئەمن پێم‌خۆشە ئازاد بم. گوتم مانای نیە ئازاد بی. ئەتۆ بچی بە ناوی حیزبی دێمۆکرات قسە بکەی بەڵام دێمۆکرات نەبی. لەبەر ئەوەی ڕەفاقەتمان خۆش بوو شۆخیم دەگەڵی هەبوو. گوتم خۆ ئێمە خەڵکی "حمص"ێ نیین جوولەکەی بەکرێ بگرین بانگمان بۆ بدا. دوایە گوتم ئەگەر ئەندامەتیی حیزب وەر نەگری "ممنوع المیکروفون"ت دەکەم و دەڵێم قەت حەقی نیە بە ناوی حیزب بچێ لە مزگەوتان قسە بۆ خەڵک بکا. ئەویش قسەکردنی پێ‌خۆشە. بە هەرحاڵ قبووڵی کرد.

جارێکی هەر لەو تەوریوەرەی لە مەجلیسێکی گەورەدا کە ڕەنگە سی کەسێک دەبووین قسەیەکی کرد. گوتی ئەمن نامەوێ قسە بکەم دەنا ئەمن چم دوکتۆر قاسملوو چیە. ئەو دوکتۆرە ئەمنیش دوکتۆرم. ئەو مامۆستای دانیشگایە ئەمنیش مامۆستای دانیشگام. ئەمن لەوێ هیچم نەگوت. پاش کۆبوونەوەکەی بانگم کرد چووین قەدەمێکمان لێدا. گوتم ئەو سەفەرەی ئەو قسەیەت کردوە لەپێش چاوی خەڵکی هیچم نەگوت بەڵام جارێکی دیکە شتی وا مەڵێ. دوکتۆر قاسملوو بە وەرگرتنی مەدرەکی دانیشگا و مامۆستایەتی نەبووەتە ئەو دوکتۆر قاسملووە. ئەوە ئاکامی دەیان ساڵ هەوڵ و تێکۆشان و مرتالا و خەباتی سیاسی‌یە کە بووەتە ئەو دوکتۆرە. ئەتۆش دەتوانی ببی، خەڵکی دیکەش دەتوانێ ببێ. بەڵام ئەو حوکمە حوکمێکی نادروستە. بە خۆشی‌یەوە ئەمن هەتا ئێستاش جارێکی دیکەم لێ نەبیستەوە ئەوەی بڵێ.

دوکتۆر خەلیقی دوکتۆرای دەفەلسەفەدا هەبوو کە لەو بارەیەوە لەو ڕشتەیەدا کەسی دیکەمان نەبوو وەک وی بێ. پیاوێکی خوێندەوار و بە توانایە. بە قەت دنیایەک نووسیوە و شتی وای هەیە. تەنانەت بۆ زاخاوی مێشکیش بێ قسەی برادەرێکی قسە خۆشمان دەگێڕمەوە کە ئێستا دەگەڵ جەماعەتی کاک مستەفایە. کاک ئەبوو کەریمی دەی‌گوت دوکتۆر خەلیقی ئیسهالی قەڵەمی هەیە. بەڵام ئەمن پێم‌وایە ئەو ئینتیزارەی ئەو هەی‌بوو زیاتر لەوە بوو کە لەباری سیاسی‌یەوە توانای تێدایە. یان ڕێگای گەیشتن بەوەی باش هەڵ-نەبژاردبوو. هەر ئەویش وا نەبوو. کەسی دیکەش دەنێو حیزبدا هەبوون کە هەم چاوەڕوانی‌یەکانیان زۆر بوون و هەم ڕێگای خەراپیان هەڵبژاردوە. مەسەلەن ئەمن قەتم پێ‌شک نایە بە ویم گوتبێ بەڵام بە کەسی دیکەم گوتوە. گوتوومە بابە ئەتۆ حەقی خۆتە پێت خۆش بێ ببی بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی یان دەفتەری

سیاسی، یان تەنانەت بە جێگری سکرتێرو سکرتێریش. بەڵام خۆ بەزۆر ناکرێ. ئەتۆ دەبێ کارێک بکەی مەولێک بدەی کە خەڵک مەجبوور بێ بۆخۆی بە تۆ بڵێ وەرە بیکە. ئیدی ئەتۆ لە هەموو جێیەک بۆڵەت هەیەو لە هەموو شتێک ناڕازیی کە نات‌کەنە ئەوە، خۆ ناوا نابێ. ئەمن بە دوکتۆر خەلیقیم نەگوتوە، هەرچەند ئەویش زۆری بۆڵە هەبوو کە ناکرێتە دەفتەری سیاسی‌و ناکرێتە جێگری سکرتێرو ئەوانە. بەڵام بە هەر دەلیلێک بوو ئەمن بەش بە حاڵی خۆم پێموایە لەباری سیاسی‌یەوەو لە مەجمووعی کاری حیزبی‌دا لەو کەسانە نەبوو کە بۆ دەفتەری سیاسی لەپێش بوون.

دوکتۆر خەلیقی زۆر شتی لەمن زیاتر بوو، مەسەلەن ئەو فەلسەفە دەزانێ کە ئەمن هەر نای‌زانم. ئەوە شتێکی دیکەیە. بەڵام لە مەجمووعی کاری حیزبی‌دا لەوانی دیکە بەتواناتر نەبوو. شتێکی تەبیعیشە جاری وایە یەکێک بەتواناشە بەڵام بە هەر دەلیلێک هەیە ناگاتێ. ئەمن بەخۆشیم گوتوو بەخەڵکی دیکەش دەڵێم. دەڵێم بۆ هەر شتێک دەبێ لەخۆتەڕا دەست پێ بکەی. بۆ وەڵامی عیللەتەکان دەخۆتەدا نادۆزیەوە؟ مەسەلەن خەڵک ڕقیان لێیە. باشە بۆ ڕقیان لێتە؟ بڵێی ئەو خەڵکە هەموو دژی ئینسان بن؟ ئەگەر هەموویان قەرارە ڕقیان لێت بێ دەبێ شتێک دەتۆدا هەبێ کە ئەو خەڵکە لێکڕا ڕقیان لێتە. کەوابوو وا نیە. دەبێ دەلایلی دیکە هەبێ.

بەهەر حاڵ پێم وایە دوکتۆر خەلیقی وەک پیاوێکی خوێندەوار جێگای خۆی هەیە. بەڵام لێرە وەک ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی جاروبار واش بووە بەرخوردی خراپی پێ کراوە کە ئەمن ئەوەشم لەبیرە. ئەمن زۆر موخالیفی ئەو بەرخوردە خراپە بووم کە پێی کراوە. بەڵام بەداخەوە نەی‌توانیوە لەو بارەیەوە جێگای خۆی بگرێ. سەیرەکەشی ئەوەیە ئەو بەرخوردانەی پێی کراون لەلایەن جەمعێکەوە بووە کە ئێستا زیاتر لەوان نیزیکە.

## وەسەریەکەوتنەوەی بنەماڵەی دیموکرات

**هەیاس کاردۆ:** بەرنامەی ئەسڵیی تۆو ئەو کەسانەی وەک تۆ بیریان دەکردەوە بۆ کۆنگرەی ١٠، ئاشت بوونەوە دەگەڵ هاوڕێیانی "ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ"و پلانی تێکەڵبوونەوە بوو. گرینگیی ئەو کارە بەتایبەت لەوەدا بوو کە دوو لایەن مێژوویەکی چەند ساڵەی پڕ لەگرژیو تەنانەت لێک کوشتنیان تێپەڕاندبوو. پرسیار ئەوەیە سەرکەوتنی ئەو فکرە نیشانەی گرینگیی باسەکە بوو یان وەک ئەوەی کەسانێک باسیان دەکرد جیناحبازی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێموایە پێشتر باسم کرد کە هەر ڕۆژی هەوڵێ موخالیفی ئەوەی بووم کە لە کۆنگرەی هەشتدا ڕووی‌دا. دەگەڵ شەخسی دوکتور قاسملووی هەوڵم دا کە وانەکا مونجەڕ بێ بە شتێکی ناوا. دوایەش پێم گوتەوە کە حیزب زەرەری وێ کەوت. هەمیشە گوتوومەو ئێستاش دەیڵێم ڕۆیشتنی وانیشم بێ کارێکی ناڕەوا بوو. هەوڵەکانی دوایەش ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ منو کەسانێکی کە وەک منیان بیر دەکردەوە پێم وابێ لەبیەیک بە داخوازی کۆمەڵانی خەلک بوو. سەرسەختترین موخالیفانی یەکیەتیو یەکڕیزی ئەگەر شتەکەی باس دەکەن قەت جورئەت بەخۆیان نادەن بڵێن پەرشوبڵاوی چاکە. چونکە هێندە ناحەزە. تەنانەت ئەوانیش دەڵێن یەکڕیزیو پێکەوەکارکردن باشە، بەڵام نای کەن. کەوابێ ئەوە لەبیەیک گرتن بە داخوازی خەلک بوو. خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەشێکی ڕەنگە سیاسەت نەکاو دەگەڵ هیچ حیزبێک نەبێ. بەشێکی سیاسەت دەکاو دەگەڵ حیزبی دێمۆکرات نیەو دەگەڵ لایەنەکانی دیکەیە. بەڵام ئەوانەی دەگەڵ حیزبی دێمۆکرات بوون - با دەرسەدێکی موشەخخەس دیاری نەکەم - بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان تەئییدی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێرانیان دەکرد نەک ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ، کەمایەتی-یەکی کەم پشتیوانیی‌یان لەوان دەکرد. بەڵام پێموایە لە هەموو ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەنگێکم نەبیستوە کە پێی خۆش بێ ئەو وەزعە هەبێ. هەموویان، چ ئەوانەی پشتیوانیی حیزبی دێمۆکراتیان دەکردو چ ئەوانەی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕیان پەسند دەکرد، لێکڕا خوازیاری ئەوە بوون کە یەک بگرنەوە.

کەوابێ لە واقیعدا ئەوە جەناحبازی نەبوو. جەناحەکە لەسەر ئەوەی دروست بوو، ئێمە پێش کۆنگرەی دە لە کۆنگرەی دەدا نوختەی ئیختیلافمان لەڕاستی‌دا هیچی دیکە نەبوو. عادەتەن لەو جۆرە حاڵەتانەدا نەک هەر ڕەقیبەکان یەکتری موتتەهەم دەکەن، خەڵکی دیکەش ئێمە موتتەهەم دەکەن کە لەسەر کورسیو دەسەڵاتە.

هەر ئەو وەختی کە ئەو کێشەیەمان هەبوو دەیانگوت گۆیا کێشەی بەینی من و کاک مستەفای هیجری لەسەر پۆستی سکرتێرییە. دەمگوت تەواو تەواو پێچەوانەیە. کاک مستەفا پێی خۆشە سەمانانیش برۆین بۆ ئەوەی ئەو هەر سکرتێر بێ. بەڵام ئەمن پێمخۆشە هەموو ئەوانەی ڕۆیشتوون بێنەوە بۆ ئەوەی مەجبوور نەبم ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیش بم. هەر بەکردەوەش ئەو ڕۆژەی لە کۆنگرەی دە دا بڕیاری یەکگرتنەوەی ڕیزەکانی حیزب پەسند کرا، ئەمن هەموو ئەو دۆستانەی لەڕیزی پێشەوەی تەرەفدارانی فکرەکەدا بوون لە ژوورێکدا کۆم کردنەوەو گوتم ئەوەی دەمەویست پێکهات. بۆیە ئەمن خۆم بۆ کۆمیتەی ناوەندی کاندید ناکەم. چونکی ئەمن هیچ هەدەفی دیکەم نەبوو ئەوە نەبێ. ئەوە زۆریان ساوێ لێیان پرسە. ئەوان گوتیان شتێکی زۆر بێ‌مانایە، ئەوە بڕیارێکەو پەسند کراوە. ئەتۆ ئەو بڕیارە بدەیە دەستی کەسێکی کە ئیمانی پێی نیە جێبەجێ نابێ. سەت کۆسپی دەخەنە سەر ڕێگا. کەوابێ ئەک دەبێ خۆت بۆ کۆمیتەی ناوەندی کاندید بکەی، دەبێ خۆ بۆ سکرتێریش کاندید بکەی. ئەمن قسەکەیانم قبووڵ کرد چونکی پیاو دەبێ قسەی حیسابی قبووڵ بکا. دەنا ئەساسەن ئەوە نەبوو کە لەسەر دەسەڵات بووبێ.

وەختی خۆی داوایان کرد ئەمن جوابی کاک مستەفای هیجری بدەمەوە لەسەر شتێک. ئەمن لە دەرەوە بووم کاک مستەفا قسەی کردبوو. گوتبووی وەختێک فلانکەس هەولی دەدا ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ بێتەوە، لەبەر ئەوە نەبوو وەحدەتخوازە بۆ تەقویەتی مەوزیعی خۆی بوو. یانی بۆ ئەوەی بوو کە پێگەی خۆی قایمتر بکا. کە هاتمەوە گوتیان جوابی بدەوە. جوابم نەدایەوە. بەڵام ئێستا ڕەنگە جێگای بێ جوابێکی ویش بدەمەوە. دیارە ئەو قسەیەی کاک مستەفای ڕاست نەبوو چونکە مەوقیعییەتی من بە قەوەت بوو بۆیە ئەو بڕیارە پەسند کرا. ئەگەر لەنێو حیزبدا مەوقیعییەتم بەهێز نەبایە، یان ئەو خەتە کە باوەڕم پێی هەبوو بە قەوەت نەبایە بۆ ئەو بڕیارە سەر دەکەوت؟ ئاخر کە چووینە کۆنگرە سەرەتا شکم هەبوو کە بتوانێ زۆرینەی دەنگەکان وەربگرێ. بەڵام دوو ڕۆژو نیو لەسەر ئەو مەسەلەیە کە قسە کرا مەبنای ئیستیدلالی ئێمە ئەوەندە بە هێز بوو کە وەختێکی دەنگی بۆ درا لە ١١٤ کەس ئەندامانی کۆنگرە، ١١١ کەس دەنگی موسبەتیان پێ دا. یانی تەنیا ٣ دەنگی موخالیفی هەبوون. کەوابێ مەوقیعییەتی من بە قەوەت بوو. بەڵام ئەگەر دای‌بنێین قسەکەی کاک مستەفای وایە کە ئەمن بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆم لایەنگری یەکگرتنەوە بووم. کاک مستەفا پیاوەتی‌یەکی زۆر گەورە دەگەڵ من دەکا. چونکی بۆ خۆی بە زمانی خۆی دەڵێ فلانکەس قووەتی خۆی لە یەکگرتنەوەدا دەبینێ. جا چ لەوەی باشترە. بەڵام کاک مستەفا بەداخەوە قووەتی خۆی دەپەرش و بڵاوی‌دا دەبینێ. خۆ بەو حیسابە ئەو خراپەی منی نەگوتوە. نازانم بۆخۆی موتەوەججیهی مانای قسەکانی بووە یان نا. بەڵام لەڕاستی‌دا شاهیدیم بۆ دەدا کە ئەمن هێزی خۆم لە یەکگرتنی حیزبدا دەبینم.

**هەیاس کاردۆ:** لە کۆنگرەی ١٠دا لایەنگرانی تۆ سەرکەوتنیان وەدەست هێنا و تۆ بووی بە سکرتێری گشتیی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران. ئەوە یەکەم ئەزموونی جەنابت وەک کەسی یەکەمی گەورەترین حیزبی سیاسیی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو. ترس و نیگەرانی‌یەکانت چ بوون و چ بڕیارێکت دا بۆ ئەوەی بتوانی وەڵامدەری چاوەڕوانیی خەڵک و حیزب بی؟

[illegible] هەمووش ئیمکانی یەکێتی حیزبی دیموکراتی کوردستان‌و ئەندامەتی ڕیزەکانی حیزب بوون.

بەڵام ئەگەر بێمە سەر ئەوەی نیگەرانی‌یەکانم چی بوون. ئارەزوو دەکەم هیچ کەس ئەوەی نە بە خۆبەکەم‌گرتن و تەوازوع حیساب بکا و نە بە ڕیابازیی بزانێ. لە هەموو ژیانمدا ئەگەر بێزار بووم لەوەی مەسئوولییەت وەر بگرم جا هەر مەسئوولییەتێک - غەیری دەفتەری سیاسی کە گوتم ئەگەر بوومەتە کۆمیتەی ناوەندی پێم‌خۆش بووە بیمە دەفتەری سیاسی چونکە دەمەوێ دەگەڵ خەڵکی خۆم ڕاستگۆ بم - بەڵام هەموو وەختێک کە پێم خۆش نەبووە هیچ بەرپرسایەتی‌یەک وەرگرم، ڕەنگە هەر جارەی هێندێک دەلیلی لێک‌جیاوازی بووبن. بەڵام یەک دەلیل کە هەموو جارێ‌و بۆ هەموویان هەبووە، ئەوە بووە کە توانا و لێهاتوویی مەسئوولییەتێکی وا گەورەم دەخۆمدا شک نەبردوە. بۆ ئەوەی ئەو کارە بکەم لە هەوەڵەوە هەتا ئاخر. ئەمن ناڵێم بۆ ئەوەی چاوەڕوانی‌یەکانی کۆمەڵانی خەڵک بێنە دی، چونکە ئینتیزاراتی خەڵکی نەهاتۆتە دی. نەک هەر ئەمن نەمهێناوەتە دی. دوکتۆر قاسملووش نەی‌هێناوەتە دی. بەڵام بۆ ئەوەی چەندی مومکینە پیاو لە کارەکەی‌دا ڕووسوور بێتە دەرێ، تەنیا ڕێگاو میکانیزمێک کە ئەمن گرتوومەتە پێش‌و توانیومە کەلکی لێ‌وەرگرم، ئەوە بووە کە ئیستیفادە لە عەقڵی هەمووان بکەم. ئەو قسانە لە داهاتوودا بڵاو دەبنەوەو هیوادارم هەموو کەس بیان‌بینێ، ئەمن کاک مستەفای هیجری بەشاهید دەگرم کە بۆخۆی بەدەیان جار ڕەخنەی لێ‌گرتووم کە ئەتۆ بۆ هەموو شتێکی دێنیە دەفتەری سیاسی‌و بۆخۆت بڕیاریان لەسەر نادەی. لەحاڵێک‌دا دوایە تۆمەتی لێ‌دابووم کە شێوەی دیکتاتۆریم هەبووە. یانی هەر لەو کاتەی‌دا کە حوزووری وای پێ‌گوتووم، پاشملە تاوانباری کردووم کە هەر بۆخۆم لێ‌دەخورم.

لە ئەقڵی جەمعی زۆرم ئیستیفادە کردوە. پێموایە پاش کۆنگرەی سێزدە بوو کە جارێکی دیکەش ئەوەم گوتوە. گوتم لە دەورانێکی زۆر بوحرانی‌دا ئەمن سکرتێری حیزب بووم کە نێزیکەی دە ساڵ بوو. تواناکانم مەحدوود بوون، وەزعەکەش وەزعێکی زۆر خراپ بوو. لە بەشی هەرە زۆری ئەو ماوەیەدا ئێمە لەبەینی دوو تەرەفی موتەخاسیمدا بووین. لایەک دەوڵەتی عێراق‌و لایەک دەوڵەتی هەرێمی کوردستان. ئەو دوورانە ئەگەر دەشەڕی عەمەلییش‌دا نەبووین، بەڵام لە موقابەلەدا بوون. لەماوەیەکیشی‌دا بەداخەوە دوو تەرەفی دژبەری کورد

بوون وەک پارتی و یەکیەتی. ئێمەش لە هەردووک حاڵەتەکەدا دەگەڵ هەر دوو تەرەفی تەجرەبەکە پێوەندیی دۆستانەمان هەبووە. توانیومانە سەربەرز پێشە دەری و ئەو دۆستایەتییە پیارێزین. هەم مەوقعییەتی خۆمان پارێزین و هەم بێ لایەنیی خۆمان نیشان بدەین. لەحاڵێک‌دا ئێمە تا ئێستا بەیانێک یان نووسینێکمان نەبووە کە شەرمی لێ‌بکەین یان لێی پەشیمان بین. دۆستان دڵتەنگ و دوژمنان دڵخۆش بکەین. ئەوە هەر بە تەنیا ئی من نەبووە، ئی عەقڵی گشتی بووە. جا هەر وەخت ئیرادم لێ گیراوە کە بۆچی بڕیارەکان بەشتێ نادەم، گوتوومە لە مەسئولیەتدا شەریکین. کە لە مەسئولیەتدا شەریکین، دەبێ لە بڕیاریشدا شەریک بین. یانی چاکەو خراپە هەمووی ئی هەموومانە. ئێستاش دەڵێم ئەمن لە هەموو سەرکەوتن و تێشکانەکان لە سەرەتای وەرگرتنی مەسئولییەتەوە هەتا ئێستا خۆم بە شەریک دەزانم و ڕەفیقەکانیشم هەروا.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا وەڵامی پرسیارەکەی منت نەدایەوە. نیگەرانی‌یەکانت چی بوون، چاوەڕوانی-یەکانت چی بوون.

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** عەرزم کردی نیگەرانی‌یەکانم ئەوە بوون کە نەتوانم لە عۆزدەی ئەوەی بێمە دەرێ. میکانیزمیشم هەر ئەوە بوو. مەعلوومە هەموو ئیمتیازاتی خەڵکیم بەدی نەهێناوە، بەڵام بەو میکانیزمانەی ڕەچاوم کردوون دەتوانم بڵێم نە ئەمن و نە ڕەفیقەکانم شەرمەزاری خەڵک نین. یانی کارێکمان نەکردوە ڕووزەردی خەڵک بین.

**هەیاس کاردۆ:** یەکێک لە بڕیاراتی کۆنگرەی دەهەم "بەڕەسمی‌ناسینی مافی کەمایەتیی ئەندامان لە دەربڕینی بیرو بۆچوونەکانیان"دا بوو. مانای ئەوە چی بوو؟ ئەو بڕیارە چ قازانج و زەرەرێکی بەدواوە بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** ئەو فکرە بە چاکە و بە خراپییەوە - کە ئەمن بە چاکی دەزانم — ئی من بووە. باوەڕم بەوەی بووە ڕەنگە بەشێکیشی ئەوە بووبێ کە تەجرەبەشم هەبوو کە خەفەکردنی دەنگی موخالیف لە نێو حیزبدا زۆر شتی خراپی لێ شین دەبێتەوە. نیشانەکان عوقلمی ڕادێنی. کابرا ئەگەر مەجالی نەبوو دەنێو حیزبەکەی خۆی‌دا قسەی خۆی بکا، ڕێگایەکی بۆ نامێنێتەوە غەیری ئەوەی بەناپەدڵی درێژە بدا یان حیزبەکە بەجێ بێڵێ.

پێموایە لە هەموو کۆمەڵێک‌دا ئیجازەدان بەوەی لە چوارچێوەی ئوسووڵدا خەڵک قسەی خۆی بکا، بە قازانجی کۆمەڵەکەیە. هەر وەکوو لە ڕادەی جیهانی‌دا ئێمە دیتمان وڵاتانی سۆسیالیستی دەستیان دەگەرووی خەڵک دەنا و دەیان‌خنکاندن. بەڵام وڵاتانی سەرمایەداری تا ڕادەیەکی دیاری کراو ئەو ئازادیی بیروڕایەیان بە خەڵکی دەدا. وڵاتانی سۆسیالیستی هەر وەک دیتمان هەموویان تێک تەپین لەحاڵێک‌دا تەزەرییەکە ئەوە بوو

کە سەرمایەداری سەری خۆی دەخوا. بۆیە ئەمن ئەو فکرەیەم هێنا. ئەمن بۆ ئەوەی ئەو قسەیەم لە زمان خۆمەوە نەکردبێ لە زمان کەسێکیەوە دەکەم کە لە زۆربەی ژیانی خۆی‌دا موخالیفم بووە، لەو کۆنگرەیەش‌دا هەموو کاری تەنیا موخالەفەت دەگەڵ من بوو. برادەرێکمان هەیە بەناوی کەماڵی داوودی ئەو وەختی لە پاریس دەژیا، ئێستا لەمێژە لە ئەمریکا دەژی. تەنانەت لە کۆنگرەدا یەک، دوو جار موقابەلەمان بوو، یانی ئەمن موقابەلە بە میسلم دەگەڵ کرد. دوایە هات گوتم مەسەلێکی مەشهوور هەیە کە دەڵێ" زدی ضربتی، ضربتی نوش کن". گوتم ئەو هەموو هێرشە دەکەی دەبێ جوابێکیش وەربگریەوە. هەڵبەت وا دیار بوو جوابەکەی من خەڵکەکە پەسندی کردبوو، جا مەبەستم ئەوەیە کە ئەو بڕیارە پەسند بوو، دەستی هەڵێناو قسەی کرد. گوتی تاریخ ئەوەی بە ناوی عەبدوڵڵای حەسەنزادە سەبت دەکا کە بۆ یەکەمجار ئازادیی ڕادەربڕینی لەنێو حیزبی دێمۆکراتدا دایر کرد. لە کۆنگرەدا ئەوەی گوت کە دەنگەکەی مارە.

پاشان ئەگەر باسی ئەوە بکەین داخوا ئاسەواری موسبەتو مەنفی یان قازانجو زەرەری چ‌بوو. پێموایە لەسەریەک ئەو بڕیارە بەرهەمی باشی زیاتر بووە. وەک دەشزانین لە کۆنگرەی دە دا بە شێوەیەکی ناقیسو ناتەواو پەسند کرا. بڕیارەکە ئاوا بوو کە لە شەش‌مانگ پێش کۆنگرەوە ئەو ئەندامانەی حیزب کە نەزەری جیاوازیان لەسەر سیاسەتەکانی حیزب هەیە، حەقیان هەیە لە کۆبوونەوەکانی حیزبی‌داو لە بۆڵتەنی نێوخۆی حیزبی‌دا نەزەراتی خۆیان چ‌هەیە بیڵێن. یانی تەنیا شەش مانگ پێش کۆنگرەو لە دەرەوەی حیزبیش نا. بەڵام لە کۆنگرەی یازدەدا شتەکە وای لێ‌هات کە هەر لە ڕۆژی دوای کۆنگرەوە ئەندامانی حیزب حەقیان هەیە لەسەر هەر مەسەلەیەک نەزەری جیاوازیان هەبێ، حەتتا لەسەر شوعاری ستراتیژیک، لەسەر هەر ئۆرگانێک‌و هەر کەسێک، دەتوانن لە کۆبوونەوەکانی حیزبی‌و لە ئەدەبیاتی نێو خۆیی حیزبدا بەسەراحەت باسی بکەن. تەنیا دوو شەرت هەبوو:

یەکیان ئەوە بوو کە عیففەتی کەلامی هەبێ‌و شتی خراپ نەڵێ. دووهەمیش ئەوە کە دەرفەتان بە تەرەفی موقابیل بدا کە ئەویش نەزەری خۆی بڵێ. ئەوە لە کۆنگرەی یازدەدا پەسند کرا. جا لەسەریەک دەتوانم بڵێم بەرهەمی باشی پتر بووە لە بەرهەمی خراپ. بەڵام ئەگەر جاروبارێش شتی خراپی لێ شین بووبێتەوە. دووبارە دەچمەوە سەر قسەکەی دوکتۆر قاسملووی کە لەسەر گڵکۆکەشی هەر گوتم. دەی‌گوت: ئەوە باجی دێمۆکراسی‌یە. کەسێک دیمۆکراسیی دەوێ دەبێ باجەکەشی بدا. جارجار ڕەنگە شتی نامەنتقیشی لێ‌شین بێتەوە. مەسەلەن جاری وایە لە کۆبوونەوەکاندا خەڵک قسە دەکا. لەڕاستی‌دا بەشێکی هەر بۆ ئەوەیە کە قسەیەک کرابێ. جاری وایە سنوورەکەش دەترازێ‌و تەنانەت وا هەیە لە دەرەوەش باسی دەکەن کە ئەمن پێم‌وایە ئەوە خراپە. حیزبی سیاسی بۆیە حیزبەو ئەو خەڵکە بۆیە پێکەوەن چونکی جەمعێکی هاوفکرن لە موقابیل دنیای دەرەوەدا. جا ئەندامی حیزب دەبێ ئیجازەی هەبێ لەنێو حیزبەکەی خۆی‌دا نەزەری خۆی بڵێ‌و هەوڵ

بدا پیکاتە ئەزمری گشتیی حیزبیش. بەڵام لە دەرەوەی حیزب ئەگەر دیفاع لە سیاسەتە گشتی‌یەکانی حیزب نەکا ئەوەی پەسند کراوە لە خراپترین حاڵەتدا دەبێ بێدەنگ بێ، نەک هاودەنگ دەگەڵ موخالیفان لە دەرەوەی حیزب بچێ تەبلیغ بکا.

## بەڵگەنامە

# ڕێککەوتننامە

بە ئیمان بە ڕەوا بوونی خەباتی شێلگیرانەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و بە لەبەرچاو گرتنی قازانج و مەسڵەحەتی بزووتنەوەی کورد و بۆ بەهێزتر کردنی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە تایبەت لەم قۆناغە لە مێژووی خەباتی گەلی کورددا، هەیئەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و « حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ » لە سەر ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕێک کەوتن :

١- لە ڕۆژی ئیمزاکراتی ئەم ڕێککەوتننامەیەوە «حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ » تێکەڵ بە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەبێتەوە و دیاردەیەکی سیاسی بەو ناوە نامێنێ.

٢- هەتا کۆنگرەی یازدەهەم ئەو هاوڕێیانەی کۆمیتەی ناوەندیی « ڕێبەرایەتی » کە لە کۆمیسیۆنەکانی ڕێبەری کاریان کردووە، لە کۆمیسیۆن و کۆمیتەکانی دەرووەی دەفتەری سیاسیی حیزب کاریان پێ دەسپێردرێ، مەگەر بە موافەقەتی خۆیان و بە سەلاح زانینی حیزب بنێردرێنە کومیتەکانی مەڵبەند و شارستان.

٣- ئەو کادر و پێشمەرگانەی « ڕێبەرایەتی » کە لە کومیتەکان کاریان کردووە، دەنێردرێنە کومیتەی هاوناوی خۆیان لە حیزبدا و کاریان بۆ دیاری دەکرێ. لەو شوێنانە کە بە پێویست دەزانرێ، یەک یان دووکەس لەو هاوڕێیانە بە ئاگاداری و موافەقەتی کۆمیسیۆنی سیاسی ـ نیزامی دەکرێنە موشاویری کۆمیتەی مەڵبەند یان شارستان.

٤-لە بارەی پلەی تەشکیلاتییەوە، ئاییننامەی پلەی کادر و پێشمەرگە کە تا ئێستا لە بارەی کادر و پێشمەرگەکانی حیزبەوە بەڕێوە چووە، لە سەر هەموو کادر و پێشمەرگەکانی « ڕێبەرایەتی » پیادە دەکرێ.

٥- تەشکیلاتی نهێنیی « ڕێبەرایەتی » لە ڕێگای ئوسوولییەوە بە بەرپرسی کۆمیسیۆنی سیاسی ـ نیزامیی حیزب دەناسێندرێ و کار لە گەڵ ئەو تەشکیلاتە بە هاوکاریی بەرپرسانی ئاتێستای درێژە دەدرێ.

٦- لە دەرەوەی وڵات، لەو شوێنانە کە حیزب کۆمیتەی دامەزراوی هەیە، ئەندامان و بەڕێوەبەرانی کۆمیتەکانی « ڕێبەرایەتی » لەگەڵی « ادغام » دەکرێن. بەرپرسی کۆمیتەی « ڕێبەرایەتی » لە هەر وڵاتێک دەبێتە ئەندامی کۆمیتەی حیزب لەو وڵاتە و یەک یان دوو کەس لە ئەندامانی دیکەی کومیتە، دەکرێنە موشاویری کومیتەی حیزب. لەو وڵاتانەش کە حیزب کومیتەی دامەزراوی نیە، ئەندامان و لایەنگرانی هەردوولا پێکەوە هاوکاری دەکەن، هەتا دەگەنە کۆنفرانس و کومیتە هەڵدەبژێرن.

٧- « ڕێبەرایەتی »، پێوەندییەکانی دەرەوەی تەحویلی بەشی پێوەندییەکانی حیزب دەدا و هەموو پێوەندییەکان لەو کاناڵەوە دەگیرێن. بەشی پێوەندییەکانی دەرەوەی حیزب لە سەر هێشتنەوە یان داخستنی پێگەکانی پێوەندیی دەرەوەی « ڕێبەرایەتی » بڕیار دەدا.

٨- ڕێبەرایەتیی حیزب لە سەر درێژەدان یان کۆتایی پێهێنانی پێوەندی لەگەڵ ئەو لایەنانە کە حیزب پێوەندیی لەگەڵیان نەبووە، بەڵام « ڕێبەرایەتی » هەیبووە، بە قازانجی حیزب بڕیار دەدا.

٩- هەموو ئیمکاناتی تەدارەکاتی، چەک و تەقەمەنی، ڕادیۆ و چاپەمەنی، ئەسناد و مەدارێک و بە کورتی هەرچی دارایی « ڕێبەرایەتی » یە، لە ژێر چاوەدێریی هەیئەتێکی هاوبەشدا، تەحویلی حیزب دەدرێ، بەو تێبینییەوە کە ئارشیوی ڕادیۆ و چاپەمەنی وەک بەشێک لە ئارشیوی حیزبدا ڕادەگیرێ.

١٠- شەهیدان و کەمئەندامانی هەردوولا بێ جیاوازی، وەک شەهیدان و کەمئەندامانی حیزب چاویان لێ دەکرێ.

١١- ئەوانەی لە بارەی ئەمنییەتییەوە گومانیان لە سەر بووە، لە هەرلایەک بووبن، لە ڕیزەکانی حیزب

## ئەمنیەتی تێکۆشەرانی دێموکرات لە باشووری کوردستان

**هەیاس کاردۆ:** لەساڵی ١٣٧٣ی هەتاوی بەملاوە وەزعی ئەمنییەتیی کوردە ڕۆژهەڵاتی‌یەکانی دانیشتووی باشوور بەرەو خراپی ڕۆیشتو هێرشی چەکداری بۆ سەریان زۆری پەرە گرت. بەتایبەت زۆر پێشمەرگەو ئەندامی حیزب کەوتنە بەر پەلامارو شەهید کران. مامۆستا دەکرێ بە شێوەیەکی شەفاف لەو ڕووداوانە بدوێی و ئەگەر بۆت بکرێ تاوانباران بناسێنی؟ هیچ ئامارێک لە ڕادەی تیرۆر کراوان لەبەر دەستدا هەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن نازانم بە شێوەی شەفاف یانی چی؟ بە شێوەی شەفاف زۆر جارمان باس کردوە کە ئەوە شتێکی خراپە. یانی کەمبوودێکی گەورەیە بۆ دەسەڵاتی کوردی کە ڕێگا بدا بەکرێگیراوانی دەوڵەتێکی دیکە لەنێو وڵاتەکەی وی‌دا ئاوا تەراتێن بکەن‌و موخالیفانی خۆیان تیرۆر بکەن. لەسەر ئەوەی کە عامیلەکەی کێیە ئەمن پێشتر باسم کردوە. بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە بکەری کارەکە کێ‌یە، کوردە یان غەیری کوردە، کوردی ئەم دیوە یان کوردی ئەو دیوە، ئەوەی قازانجی لە ئەنجامی ئەو کارەدایە تەنیا جمهووریی ئیسلامی‌یە. ئەوەندەی مەربووت دەبێ بە دەسەڵاتی کوردی، گلەیی‌یەکەی زیاتر لەو بارەیەوە لەسەرە کە نەی‌توانیوە سنوورەکانی خۆی کۆنترۆڵ بکاو ئەمنییەتی تێکۆشەرانی کوردی بەشەکانی دیکە بپارێزێ.

لەبارەی ئامارەوە، ئەمن ئێستێ لەبیرم نیە بەڵام ئاماری دەقیق لەبەر دەستدا هەیە. ڕەنگە لەلای خۆشم هەبێ. بەڵام بە تەخمین دەتوانم عەرزت بکەم کە مەجموعی ئەو تیرۆڕانەی ڕێژیم لە نیمەی کوردوون کە ٩٥%ی وەبەر کوردستانی عێراق دەکەوێ، لە ٣٠٠ کەس تێ‌دەپەڕێ لەبەینی کوژراوو برینداردا. لەوانە دەوری ١١٠ هەتا ١١٥ کەسیان هەر شەهید بوون. ئەوانی دیکە بریندار بوون.

**هەیاس کاردۆ:** هاوینی ساڵی ١٣٧٣ کاک غەفوور حەمزەیی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێمۆکرات تیرۆر کرا. ئەو تیرۆرە لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی کوردەکاندا نەبوو. هۆکاری ئەوە چی بوو؟ کێ بەتاوانبار ناسراو ئاکام چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە وەکی گوتت کاک غەفووری حەمزەیی لێرە نەبوو. ئەو لە بەغدایە تیرۆر کرا. وەکوو هەموو وەختێکی ئێمە سەرەتاو بەرپرسی تاوانەکەمان بە جمهووریی ئیسلامی نیسبەت دا. لێرە شتێکی سەیریشم وەبیر دێتەوە با باسی بکەم. ئەو وەختی کاک مستەفا سکرتێری حیزب بوو. لەسەر قەیران بووین کە

پارتی‌و یەکیەتی‌و هەموو لایەنەکان کۆ ببوونەوەو هاودەردی‌یەکی زۆر باشیان دەگەڵ کردین. لەسەر قەبران بۆ تیرۆرێک کە لە بەغدایە کراوە کاک مستەفا قسەی کردو بە قەولی کوردەکانی باشوور دابەزیە سەر دەسەڵاتی کوردی هەر سەیر. هەر بەڕاستی بەجارێک هەموومانی تووشی ناڕەحەتی کرد. ئاخر باشە ئەو خەلکەی غەیری خۆمان حەقی هەبوو بڵێ پیاوی حیسابی ئەو تیرۆرەی ئێستا قسەی لەسەر دەکەی لە بەغدا کراوە کەچی هەر باسی ئەوێ ناکەی، باسی کورد دەکەی. بە هەر حاڵ وەسەر خۆیان نەهێنا بەڵام زۆریان پێ ناخۆش بوو. دیارە هەر یەکەی کورتە پەیامێکیشیان هەر دا.

بە هەر حاڵ لەوەی بگوزەرێین. ئێمە دوایە گەیشتینە ئەو ئاکامە کە تیرۆری کاک غەفووری هەمزەیی بە دەستی کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق بووە. بۆ دەلیلەکەشی دەتوانین ئەوە بڵێین کە کاک غەفوور هەمزەیی دڵسۆزی‌و هاوپێوەندیی زۆری بۆ کوردەکانی باشووری کوردستان هەبوو کە ئەوە شتێکی زۆر پیرۆز بوو. ئەوە لەڕاستیدا ئەرکی هەموومانە. یانی هەموو کوردێک بۆ هەموو کوردێک. بەڵام پیاوێکی زۆر بێ ئیحتیات بوو. لەسەر تەلەفۆنێک کە هیچ ئینسانێک ناتوانێ گومانی هەبێ کە ئەوە کۆنتڕۆڵ دەکرێ. هەمیشە هەموو قسەیەکی دەکرد. ئەمن چەند جار ڕێ کەوت کە بە تەلەفون قسەم دەگەڵ دەکرد، کە دەستی بە قسان دەکرد ناچار دەبووم دای بخەم چونکە بۆم کۆنتڕۆڵ نەدەکرا. یانی قسەی بەوان دەگوتە یان شتی دیکە کە نەدەبوو لەسەر تەلەفون بگوترێ دەی گوت. بۆیە لە مەجموعدا گەیشتینە ئەو قەناعەتە کە بەدەستی پیاوانی دەوڵەتی عێراق کوژراوە. بەڵام خۆ ئێمە نەماندەتوانی ئیسپاتی بکەین یان بە وانی نیسبەت بدەین. دەنا لەبەر دەرگای ماڵی خۆی کوژراو ئەوانیش لەباری ئەمنیەتی‌یەوە هەتا ڕادەیەکی زۆر موسەللەت بوون. بە تایبەتی ئەگەر بە مەفهومەکەی دیکەش بی گرین هەر ئەوان مەسئوول بوون لە کوشتنی. چونکی وەختێکی ماڵی کەسێکی ئاوا لەوێ‌یە دەبێ لەژێر کۆنتڕۆڵدا بێ. خۆ لە خەیاباتێش نەبووە بڵێی یەکێک لێی داوە. بە ئیحتیمالی زۆر چاوەڕوان بانگیان کردبووە دەرێ‌و کە هاتبوو دەرگای کردبۆوە لێیان دابوو.

**هەیاس کاردۆ:** یانی دەوڵەت هیچ هاوکاری‌یەکی نەکردن بۆ دۆزینەوەی بکوژەکان؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** نەخێر هیچ هاوکاری‌یان نەکرد، جا هاوکاری چی بکەن. وەکی عەرزم کردی ئەوە تەقریبەن دواتر بوو کە ئەو ڕەئی‌یەمان لەلا پەیدا بوو کە بۆخۆیان کوشتوویانە.

**هەیاس کاردۆ:** لە نێوان کۆنگرەی ١٠ هەتا ١١دا کە جەنابت سکرتێری گشتیی حیزب بووی وەزعی گشتیی خەبات‌و هەڵسووڕانتان چۆن بوو؟ تکایە لەبیرەوەرییەکان‌و هەوڵەکانتان بدوێ.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەزعی گشتیی حیزب دڵخواز نەبوو کە هاتبووینە ئەو مەنتەقەیە. نە لەباری جێگاوڕێگاوە لە وەزعێکی باشدا بووین. نە لەباری ئاوو هەواوە بۆ ئێمە سازگار بوو. نە لەباری جموجۆڵو ڕاپەڕەوە ئەو ڕاپەڕەمان هەبوو. بەڵام لەعەینی حاڵدا ئەمن پێموایە وەزعییەتێکی ئەوەندە نائومێدیمان نەبوو. پێوەندی‌یەکانمان دەگەڵ هێزە سیاسی‌یەکانی باشووری کوردستان پتەوتر بوون، لەجاران سستتر نەبوون. کارو بارەکانمان کەموزۆر هەر ڕادەپەڕین. تەنانەت حەرەکەتی پێشمەرگە بۆ نێو خۆی وڵاتیش جاری هەر ئیدامەی هەبوو. ئەوە دواتر بوو کە دەواقیعدا ئەو حەوادیسە ڕووی‌دا(ساڵی ١٣٧٥ بوو کە وای لی‌هات حەرەکەتی پێشمەرگانە بەجێ بێڵین).

بەڵام ئیدی ئەگەر تەماشا بکەی لە ساڵەکانی دوای ١٣٦٥ و ئەوانەوە ساڵ بە ساڵ ئەو بەشە لە تێکۆشانی حیزب لەکەمیی داوە. لە ساڵی حەفتا بەملاوە پتر لە کەمیی داوە. ئیمکاناتەکە کەمتر دەبوو، حەرەکەتەکە بەرەو وڵات کەمتر کۆسپی زیاتری لەپێش بوو. ئەوانە هەموو هەبوون.

**هەیاس کاردۆ:** هەتا بەرەو کۆنگرەی ١١ دەچوون ڕادەی فشارەکان زیاتر دەبوو و هەر بەو پێ‌یەش کادرو پێشمەرگەی حیزب زیاتر ڕوویان لە دەرەوە دەکرد، بە جۆرێک کە ناوی کۆنگرەی یازدەمان نا "کۆنگرەی خەباتکارانی خۆڕاگر". ئایا ئەو ناوە بۆ ئەو هەلو مەرجە پڕبەپێست بوو؟ دروست بوو کە خەلکی زیاتر بووبانە قوربانی؟ مانەوەی زیاتر چ یارمەتی‌یەکی بە وەزعەکە دەکرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** با لەپێشدا بیڵێم ئەگەر هەموو کەس نازانێ، با هەموو بزانن ئەو ناوە پێشنیاری من بووە. بەڵام سەیرەکە ئەوە بوو هێندێک کەس ئەوەیان بە تەوهین بەخۆیان دەزانی. باشە ناوێک کە دادەنرێ دوو هەدەفی تێدا هەیە، مەبەستم ئەو جۆرە ناوانەیە: یەکێکیان تەجلیلە لەو کەسانەی لە هەلومەرجی سەختیشدا هەڵدەکەن. یەکیش تەشویقە بۆ ئەوەی خەڵکی ئاوا زۆر بن. دەنا هیچ بێ‌حورمەتی‌یەکی بۆ ئەو کەسانە تێدا نیە کە ئیحتیمالەن خۆڕاگری‌یان نەکردوە. ئەوە بە باوەڕی من زۆر بەجێ بوو. زۆر جار شتی ئاوا هەیە کە لە مەیدانی شەڕێکدا یان بەرەنگاری‌یەکدا، ژمارەیەک کە موقاویمتر دەبن و هەتا ئاخر دەمێننەوە تەجلیلی زۆر گەورەتر لەوەیان لی‌دەکرێ. ئەوە فەقەت ناوێک بوو بۆی دانرا بوو. حورمەتێک بوو بۆ ئەو تێکۆشەرانە. مەسەلەن ئێمە کۆنگرەیەکمان ناو لێنا کۆنگرەی شەهید قاسملوو ( کۆنگرەی ٩. هەیاس). ئایا ئەوە بێ-حورمەتی بە پێشەوا قازی یان شەهیدەکانی دیکە بوو؟ یان جنێو بوو بە ئەندامانی دیکەی کۆمیتە مەرکەزی؟ بەڵام بە ئیحتیرامی گیانی دوکتۆر قاسملووی کە دە ڕێگای ئامانجەکەیدا گیانی فیدا کردوە ئەو ناوەمان بۆ داناوە. یەکێکمان ناو نا کۆنگرەی شەهیدان. یانی زیندووەکان، ئەوانەی ڕێگای شەهیدانیان

گرتوە بێحورمەتی‌یان پێ کراوە؟ ئەخێر ئەوان هەر جێگای شانازین کە ڕێگای شەهیدان ئیدامە دەدەن. ڕێگای خەبات خۆ بە شەهیدان ئیدامە نادرێ، بە زیندووان درێژە دەدرێ.

بەڵام بەداخەوە هێندێک کەس وایان لێک‌داوەتەوە کە بە باوەڕی من هەڵەیە. لەو وەختەی‌دا دەبوو تەجلیل لەو کەسانە بکرێ کە بە بوونی ئەو هەلومەرجە دژوارە هەروا ڕاوەستاون. خۆ ئەو هەلومەرجە دژوارە هەر لەبارێکەوە نەبوو. ئێستاشی دەگەڵ بێ هەلومەرجی ژیان لێرە زۆر دژوارە، ئەگەرچی چەند ساڵێکە ئەو تێرۆرە نیە یان زۆر کەمترە. بەڵام زۆر کەس خۆی تێدا ڕاناگرن. بۆیە ئەوانەی خۆی تێدا ڕادەگرن جێگای تەقدیرن. بە باوەڕی من هەر ئەوانە کە ڕۆیشتوونە دەرەوە - دەگەڵ شانازیم بە کارو خزمەتی پێشوویانو ئێستایان — هەر ئەوانە خۆیان قەدرو ڕێزێکی تایبەتی بۆ ئەوانەمان دادەنێن کە لێرە ماونەتەوە.

جارێکی باسی پلەبەندیی ئیمتیازاتمان دەکرد. لە فەسڵێکی دیکەدا بووین. باسی ئەوە کرا کە ساڵی پێشمەرگایەتی ئەوەندەی ئیمتیاز هەبێ. ساڵی تێکۆشانی ئەندامی حیزب لەداخڵی وڵاتدا ئەوەندە ئیمتیازی هەبێ. جا ئەوەی بۆ ساڵی پێشمەرگایەتی دانرابوو پێم وایە دە هێندەی ئەوە بوو کە بۆ ساڵی ئەندامەتیی حیزب لە داخڵی وڵات دانرابوو. ژمارەیەک لە هاوڕێیان گوتیان تێکۆشان لە داخڵی وڵات موهیمەو دەبێ ئیمتیازی زیاتری بۆ دابنرێ. ئەمن گوتم موافیقی ئەو تەرحەم – تەرحەکە ئەمن نەمهێنابوو – چونکی بە حەقیقەت تێکۆشان لێرە زۆر زەحمەتترە لە نێوخۆی وڵات. چونکە لەلایەک تێکۆشان لەنێوخۆی وڵات وا نیە ئەندامی حیزب شەوو ڕۆژ کار بکا. تەماسی هەیە کە جاری وایە لەساڵدا دوو جاری تەماس هەیە. بەڵام ئەوەی ئێرە دایمە کار دەکا. لەلای دیکە ئەوە تەجرەبەمانە. دەگەڵ هەموو ئەو خەفەقانە کە هەیە، ئەوانەی لە نەتیجەی کاری حیزبی‌دا کەشف دەبن و دێن بۆ ئێرە ژمارەیەکی زۆر کەمیان - حدوودی ٥% یان - دەمێننەوە. ئەوانی دیکە هەلومەرجی ئێرەیان پێ تەحەممول ناکرێ و دەڕۆنە دەرێ. کەوابێ هەلومەرجی خەبات لێرە زۆر دژوارە.

ئەو هەلومەرجە دژوارە ئێستاش هەر هەیە، دەگەڵ ئەوەی تێرۆر نەماوە. بۆیە ئەوانە کە دەمێننەوە مەئیووس نابن پێوایە هەر دەبێ تەشویق بکرێن. باوەڕ بکە خەڵکیش وایان دەبینێ. ئەمن دەزانم کەمێکیشم باس کرد کە ڕەنگە دە داخڵی وڵاتدا دە بەرابەرو بیست بەرابەری ئەندامانی کۆمیتەی مەرکەزی خەڵکی وامان هەبێ کە لەباری سیاسی‌و خوێندەواری‌یەوە لەوانە لەسەرتر بن. ئەمن ئێستا لێی زیاد دەکەم دەڵێم لە دەرەوەی وڵاتیش نیسبەتێکی بەو ڕادەیە نا بەڵام زۆرمان هەیە. بەڵام ئەگەر لەوانیش بپرسی کە باسی حیزبی دێمۆکرات دەکرێ، حیزبی دێمۆکرات لەو مەوجوودییەتەدا دەبینن کە لە باشووری کوردستانە. کە باسی کۆمەڵەش بکەی هەر وایە. یانی ئەوانەن کە مەوجوودییەتو قەوارەی حیزبەکیان ڕاگرتوە. کەوابێ لەو پێشنیارەی کە کردوومە پەشیمان نیم واتە ناوی کۆنگرەمان ناوە کۆنگرەی خەباتگێرانی خۆڕاگر.

قەڵادزە لەسەروبەندی کۆنگرەی یازدە دا ناوی وەک جاسووسی ڕێژیم ئاشکرا بوو و توانی دەرباز بێ، کەسانێک تۆیان تاوانبار کرد کە پێوەندیی خزمایەتیت دەگەڵ ناوبراو هەبووە و بەرپرسایەتیی گرینگت پێ ئەسپاردوە، دەکرێ ئەو مەسەلەیە شی کەیەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە شیکردنەوەی ناوێ بەڵام داوودی عەلی باڵەی - ناوی خۆی داوود بوو بەڵام لێرە بە ئازاد ناوی دەرکردبوو - کەس بە جاسووس‌بوونی نەزانی هەتا لەو ڕووداوەدا شتەکەی لێ کەشف بوو. دواقیعەدا وەختێکیش لێی ئاشکرا بوو، ئازادی عەلی باڵەی بۆی دەرچووبوو. ئێستا کە باست کرد ئەو داستانە خراپ نیە ڕوون بکرێتەوە. ئەوە لە جەریانی ئەو حادیسەیەدا ڕووی‌دا کە گوتم چوار تێکۆشەرمان لە دەروازەی شاری کۆیە شەهید بوون.

لەنیزیک "دوکان"ێ دوو ماشێنی ئێمە کە هەر دووکیان ماشێنی چووکی بەرازیلی بوون بەچەند نەفەرێکەوە دەهاتن بۆ ئێرە بۆ دەفتەری سیاسی. لەوێ کەوتنە کەمینی پیاوانی جمهوریی ئیسلامی‌یەوە. برادەرانمان لێ‌یان وەدەست هاتبوون. هەرچەند ڕووحی شاد بێ کاک مەنسووری فەتاحی (مەنسووری ڕەشە هەورامی) شەهید بوو و دوو، سێ کەس لە پێشمەرگەکان بریندار بوون، بەڵام بەو حاڵە توانیبوویان ڕاویان بنێن و ماشێنێکیان پێ بەجێ بێڵن. یەکێک لە کوڕەکان سواری ماشێنەکە ببوو و هێنای بۆ ئێرە. ماشێنەکە وەسایلی تێدا بوو کە دەبوو پشکنرێ. بۆ ئەوەش هەر دەبوو بپشکنرێ کە نەکا خەتەریشی هەبێ بۆ تەقینەوە و شتی وا. ئەمن داوام کرد - ئەم نووسراوە دەخوێنرێتەوە - داوام کرد لە کاک چەکۆ کە بەرپرسی کۆمیتەی ئەمنییەت بوو و هەروەها کاک شاهۆی حوسێنی کە لەباری ئەمنیەتی‌یەوە زۆر وردو شارەزا بوو، گوتم بچن لەو مەیدانەی تەنیا بۆخۆتان هەموو شتێکی بپشکنن. لەپڕ نازانم بۆچی هاتمە دەرێ لەپشت دەرگای سکرتاریای، ئەگەر تەماشام کرد وەک گای بگرووی خەڵکێکی زۆری لێ‌هاڵابوو. عەینی ئەوەم هاتە بەرچاوو گوتم ئەوە گای دەگروون ئەوە چیە؟ زۆر ناڕەحەت و تووڕە بووم، بەڵام تازە چووبوو. تۆمەز ئازادی عەلی باڵەی دەستخەتی خۆی دەبینێ. یانی لەنێو ئەو بەڵگانەدا کە گوزاریشی داوە خەتی خۆی دەبینێتەوە. ئیدی ئەو فیزماڵکی دەداتێ و بە ئەدەب دەڕواتە دەرێ. لەپاشان کە ئەواریان هێنا و لێ‌یان دانەوە دەنگی ئازادی عەلی باڵەی بۆ هەموو کەس ئاسرابوو کە لێرە لەو کۆیەی دەگەڵیان دانیشتوە. زیاتر لە جارێکیش چووبوو قسەی دەگەڵ کردبوون و شتی گوتبوو.

بەڵام لەبارەی ئینتیهامەکەی دیکەوە. عەلی باڵە خزمی من بوو و پیاوێکی زۆریش باش بوو. ئەوە شاراوە نیە کاک هەژاری ڕەحمەتی (سەروان ئەحمەدی جاوید فەڕ. هەیاس) برای بوو بە پیاوی خەراپ و پیاوی دوژمن کە بەڕادیەکیش خەراپ بوو وای کرد بۆخۆی کوشتی. دەتوانێ برات خەراپ بێ، دەتوانێ کەسی

دیکەت خراپ بێ. بەس ئەوەی دەبێ بڵێم ئەووەڵەن کەس نەیزانی ئەو کورە خراپە هەتا ئەو وەختەی ئاوا لێی ئاشکرا بوو. ئەوپاشان با یەکێک غیرەتی هەبێو بڵێ لە وەرگرتنیدا، لە کاری‌نەسپاردنی‌دا. لە هیچ شتێکی‌دا یەک جار نەک ئەمن پێم‌سپاردبێ. هەر داخوا شەریک بووم؟ هەر داخوا پرسم پێ‌کراوە کە ئازاد کاری چ بێ یان لەکوێ بێ‌و مەسئوولییەتی چ بێ؟ لە دوورو نیزیک نەک ئەتۆ. باپیری تۆ چەندی تەئسیر هەبووە کە کار بە ئازادی عەلی بالەی بسپێردرێ ئەمنیش ئەوەندە. ئەگەر ئەو بێ موبالاتی‌یەش نەبایەو بە قسەکەی مەیان کردبایە کە نابێ کەسی دیکە غەیری ئەو دوو کەسە ئاگای لەهیچ بێ، ئەو دەمی ئازادیش دەرنەدەچوو و دەگیراو دەزیندانی دەکرا. بەڵام ئەوان ئاوایان کەمتەرخەمی کرد کە هەموو کەس چوو و ئازادیش چوو. بۆیە هەرکە زانی شتەکانی وی دەگەڵێ خۆی دەرباز کردو ڕۆیشت. بەداخەوە ئێستێ ئەگەر ویژدانو ئینساف ئەما کابرا دەتوانێ هەموو شتێک بڵێ.

**هەیاس کاردۆ:** فەزای گرتنی کۆنگرەی یازدەو باسو موناقەشەکانی ئەو کۆنگرەیە چۆن بوو؟ هیچ جیاوازی‌یەک لە بەینی ئەو کۆنگرەیەو ئەوانی پێشتردا هەبوو؟ چ بڕیارێکی گرینگیان پەسند کرد؟ مەسەلەی جناحبازی چۆن برایەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو جەناحانە لە کۆنگرەی یازدەش‌دا لە موقابیل یەک‌دا هەر هەبوون. پێم‌خۆشە ئیلێمو سەبتی بکەم کە ئەمن دوو جار بەشێک لە جەناح بووم لە تەواوی ئەو تاریخەدا. یەکێک لە چەند مانگێک بەر لە کۆنگرەی دوو هەتا کۆنگرەی ٥. یەکێکیش لە چەند مانگی دوای کۆنگرەی سێزدەوە هەتا ئێستە بووین. دەنا لە تەواوی ئەو ماوەیەدا بە هەموو ویژدانەوە بە تەواوی بێ‌لایەن بووم. ئێستا کاک مستەفا دوای کۆنگرەی سێزدە زۆر جار ئیددیعای دەکرد کە بێ‌لایەنە. بەڵام بەڕاستی بێ‌لایەنی کراسێکی زۆر فرەوان بوو، دە(١٠) کاک مستەفای دەچوونە نێوێ. یانی بە هیچ جۆر بە باڵای کاک مستەفای نەدەکەوت. بەڵام ئەمن ئەوەندە بێ‌لایەن بووم کە هەردوو لایەن تاوانباریان دەکردم کە دەگەڵ لایەنەکەی دیکەم. ئاخر باشترین دەلیلی بێ‌لایەنی ئەوەیە کە دوو لایەنی ناکۆک ئاوات تەزاوەت لەسەر بکەن. ئەتۆ دەگەڵ کەسێکی دیکە ئیختیلافت هەیە. یەکێکی سێهەمیش لەو نێوەدا هەیە کە ئەتۆ پێتوایە دەگەڵ کەسەکەی دیکەیەو ئەویش پێی وایە دەگەڵ تۆیە. ئەوە مانای وایە بەڕاستی بێ‌لایەنە. تەنانەت جارێکی ئەمن لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی مەرکەزی‌دا لە سکرتێری حیزب ئیستعفام کرد. گوتم بابە خۆ جەناحبازی عەیب نیە، تاوان نیە، ئابڕووچوون نیە. ئەوە نیە نێوە جەناحن، بەڵام ساغ بنەوە کامتان قبووڵتانم دەگەڵتان دەبم. یەکێکیان قبووڵیان نەبووم، ئەوە پێش کۆنگرەی دوازدە بوو. یانی هیچیان قبووڵیان نەبووم کە ئەمن یەکێکم لە جەناحەکەی.

بەڵام بە هەر حاڵ لە کۆنگرەی یازدەدا جەناحبازی هەبوو. هەوڵێکی زۆر هەبوو کە لایەنێک بە سەر ئەوی دیکەدا سەر کەوێ. لە نەتیجەدا هەر ئەو جەناحە سەر کەوت کە موخالیفی جەناحی بەرندەی کۆنگرەی سێزدە بوو. ئەوان زۆرایەتی‌یان بەدەست هێناو ئەمنیش دوو نێوەی‌دا هەبووم کە ئەملا دەی‌گوت دەگەڵ ئەولایەو ئەولا دەی‌گوت دەگەڵ لایەکەی دیکەیە.

لە بارەی بڕیارەکانی کۆنگرەی یازدەوە دەتوانم بڵێم لە ئاڵوگۆڕدا، شتی ئەساسی ئەوە بوو کە لە بڕیارنامەی کۆنگرەدا ئەوەمان گونجاند کە ئازادیی دەربڕینی بیروڕای سیاسی لەنێو حیزبدا هەر لەدوای کۆنگرەوە دەست پێ دەکا.

**هەیاس کاردۆ:** لەوێدا مەسەلەی یەکگرتنەوە ئیدی تەسبیت بوو کە کۆنگرەی دە بڕیاری بۆ دابوو؟ ئەو مەسەلەیە بەکوێ گەیشت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** یەکگرتنەوە کە لە کۆنگرەی دە بڕیاری لەسەر درا یانی ساڵی ٧٤ی، ئیدی بەرەبەرە دەستمان کرد بە هاتوچۆو دانیشتن. ئەوە ساڵێک‌و چەند مانگێکی خایاند هەتا ساڵی ٧٥ کە یەکگرتنەوە سەری گرت. وەکی گوتیشم لە رێک‌کەوتننامەیەک‌دا کە ئەو وەختی ئیمزامان کردبوو، بەندێک هاتبوو کە دەڵێ: لە رۆژی تەواو بوونی کۆنگرەی هەشتەوە هەتا ئەورۆ هەر بەیانییەیەک، هەر بڕیارێک لەلایەن هەرکام لەو دوو لایەنەوە دەرچووە ئەگەر دەگەڵ رووحی ئەو تەوافوقنامەیە ناتەبا بێ، بەتاڵ‌و بێ ئیعتیبارە. بەڵام جالیب بوو ئەو برادەرانە کە خۆیان بە فریشتە دەزانی، بۆ یەک سەعاتیش ئەو ناوانەو ئەو جنێوانە کە لە وەختی خۆی‌دا بە رێبەرایەتیی شۆڕشگێڕیان دەدان، لەخەفادا قەت لەدەمیان نەکەوتن. قەتیش لە دەستەبەندی رانەوەستان چونکە پێ‌یان وا بوو لە کۆنگرەی دەدا گوناحێکی گەورە کراوە دەبێ بشۆرێتەوە.

ئەمن پێش کۆنگرە دوو جار دەگەڵ کاک مستەفای باسم کردو گوتم چارەسەری ئەو گیروگرفتە داخوازی خەڵکی کوردە. شانازی‌یە ئەگەر حەل بکرێ. با ئەو شانازی‌یە بە تۆ ببڕێ، وەرە کۆمەگ بکە بە حەللەکەی. گوتی بە خەیانەتی دەزانم. هەر دووک جارەکە وای گوت. لەدوای کۆنگرەی دەیەم چەند جار باس کراوە، هەمیشە دەی‌گوت ئەوە بڕیاری کۆنگرەیەو قبووڵمە بەڵام بە هەڵەیەکی گەورەی دەزانم. جا بۆ راستکردنەوەی ئەو "غەڵەت"ە قەت ئەوان بێدەنگ نەبوون‌و بێکار دانەنیشتن.

**هەیاس کاردۆ:** جەنابت پێشتر گوتت لە کۆنگرەی دە تەنیا سێ نەفەر دەنگیان بەو دادایە نەدا بۆ تێکەڵ بوونەوە. باشە ئەوانە چ مەجبوور بوون بە پێچەوانەی مەیلی خۆیان دەنگی موسبەت بدەن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمنیش نازانم. ئەوەی دەبێ لەخۆیان بپرسی کە داخوا دروستە ئینسان بە خیلافی باوەڕی خۆی کارێک بکا یان دەنگ بدا؟ یان ئەگەر بە باوەڕەوە بڕیاری دا درایە ئاوا پشتی تێ‌بکا؟ جا بۆ

لە کۆنگرەی دوازدە دا بە تێکڕای دەنگ، بە بێ یەک دەنگی موخالیف تەسویب کرا کە هەرجۆرە دەستە بەندی‌یەکی نهێنی بە قازانجی شەخسی‌و گرووهی تاوانە هەتا سنووری خەیانەت. یانی ئەو بڕیارە یەک دەنگی موخالیفی نەبوو. بەڵام ئەوان ڕاست لەڕێگای دەستەبەندیی نهێنی‌یەوە وایان کرد لە کۆنگرەی سێزدەدا زۆرایەتی وەدەست بێنن. ئەوەش بەڵگەی لێ گیرا لە خودی کاک مستەفای هیجری، شتێک نەبوو حاشای لێ بکرێ.

**عەباس کاردۆ:** وەک ئەزموونی حیزبە ڕەنگە هەموو حیزبێکی سیاسیش هەر وا بێ کە بەرەبەری کۆنگرە باسو جەدەلی زۆر پەیدا دەبێ‌و یەکترتاوانبارکردن دەگاتە ئەوپەڕی خۆی. ئەو ڕەوتە لەحیزبی دێمۆکرات دا چۆن بووەو چ ئوسوولو بەربەستێک بۆ کۆنترۆڵی ئەو جۆرە یەکترتاوانبارکردنانە هەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەحیزبی دێمۆکراتی کوردستانیش‌دا شتی وا هەبووە. دەگەڵ ئەوەی وەکی گوتم ئەو وەختی بەشێک لەجەناح نەبووم بەڵام پێم‌خۆشە - نەک بە تەرەفداری لەو کەسانەی ئەمن ئێستا دەگەڵیانم - وەکوو بەیانی حەقیقەت باسی شتێک بکەم. مەسەلەن لە بەرەبەری کۆنگرەی دوازدەدا ئەو برادەرانە کە لە وەختی خۆی‌دا بە ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ دەناسران، مونادیی ئەوە بوون کە دروشمی حیزب لە خودموختاری‌یەوە بکەینە فیدرالیزم. موخالیفەکانیان دەستیان پێ کرد کە ئەوە خەیانەتە بە ڕێبازی قاسملووی. ئەوە دوژمنایەتیی قاسملووە چونکی لە زەمانی قاسملووی‌دا شوعارەکەمان خودموختاری بوو. چەندی بۆیان کرا کاریان لەسەر ئەوە کرد کە ئەوە خەیانەتە بە ڕێبازی دوکتۆر قاسملووی. یانی لە شێوەی ئاوا نامەشرووع کەڵکیان وەرەگرت.

لەپاشان کۆنفرانسی پێش کۆنگرەمان لەپێش بوو نێ ئۆرگانەکانی سەر بەدەفتەری سیاسی‌و هێزی پارێزگاری. ئێمە ئێواران لەبەر دەرکی سکرتاریای جادەیەکی لێ‌بوو پیاسەمان تێ دەکرد. لێدانی تەوارەکانی دوکتۆر قاسملووی گەیشتبوو جێگایەک کە پیاو لێی وەڕەز دەبوو. بەدایم ئەوە تەواری دوکتۆر قاسملووی لەسەر بڵیندگۆی بوو. کۆنفرانس گێراو دوکتۆر قاسملوو یەعنەک بوو ئێستاش دەنگی ئێمەر نەهاتە دەرێ. بە وەسیلەی ئاوا نامەعقوولو نامەشرووع موتەوەسسیل دەبوون. یانی دوکتۆر قاسملووی بکەیە ئامراز بۆ ئەوەی خەڵکی پێ فریو بدەی. یان مەسەلەن داستانی موخالەفەت‌کردنی من دەگەڵ داتانی وێنەی دوکتۆر قاسملووی کە حەتمەن بیستووتە. تەنانەت وایان لێ کردبوو کە گۆیا ئەمن عەکسی دوکتۆر قاسملووم دڕاندووە تەدەتقەم کردووە کە لە هیچ بارەگاو مەقەڕێکی حیزب هەڵنەواسرێ. شتی عەجایب نامەنتیقی‌و نامەشرووعیان بە کار دەبرد.

**هەیاس کاردۆ:** تێکەڵبوونەوەی دوولایەنی دێمۆکرات پاش چەند ساڵ لێکدابڕان و تەنانەت لێک کوشتن، ئەزموونێکی باشی تۆ وەک سکرتێری حیزب بوو. لەڕوتی ئەو یەکگرتنەوەیەدا پێت خۆشە چ بڵێی و ئەو ئەزموونە چۆن پێناسە بکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێمwایە یەکێک لەکارە باشەکان بوو کە کرا بەڵام هەر کاری من نەبوو. ئەمن ئەو کات نەفەری یەکەم نەبووم کە ئەو بڕیارە پەسند کرا. ئەمن دەزیمنی یەکگرتنەکەی‌دا سکرتێری حیزب بووم، بەڵام هەر وەک پێشتر گوتم نەقشی سکرتێر هەرچەند وەک قانوونیش شتێکی تایبەتیی نەبێ موهیمترە لەوانی دیکە. ئەوە کارێک بوو کە بە هەموان کردمان. جوابدانەوەو سەردانەواندن بۆ داخوازی خەڵکی کوردستانیش بوو. بەڵام جێگای داخ ئەوە بوو کە ئەوانەی موخالیف بوون دەگەڵ ئەوەی دەنگی موسبەتیان دابوو، دوایە هەموو توانایان بەکار هێنا بۆ کارشکێنیی ئەو یەکگرتنەوەیە. ئەو یەکگرتنەوەیە کارێکی زۆر پیرۆز بوو، هەنگاوێکی بەجێ بوو.

ئەمن هەر لەهەوەڵەوە زۆرم هەوڵ‌دا پەسند بێ. لەپاشان هەوڵی ئەوەم دا کە ئیمتیازیش نەدرێ بەوان چونکە هەروەک گوتم ئەوەی وان ڕۆیشتن لەحیزب بوو. یانی ڕۆیشتنی بەو شکڵەم پێ باش نەبوو. ئاخر لەئاخری‌دا وای لێ‌هاتبوو کە موتتەهەمیان دەکردم بەوە کە گۆیا نایەڵم یەکگرتنەوەکە سەر بگرێ. لە کۆبوونەوەیەک‌دا کە لە هەولێر گرتمان گوتم هەشت ساڵان پێتان گوتم لادەر. چونکە هەر چاوم لێ‌یان نەبایە پێیان دەگوتم لادەر. جا ئەوێ گوتم هەشت ساڵانتان پێ گوتم لادەر، هەشت ساڵانیش پێمهەڵێن تێکدەر، ئەمن لەسەر ئەو شتانەی باوەڕم پێ‌یان هەیە بەردەوام دەبم. لەو بارەیەشەوە هەوڵمدا. بەڵام باوەڕ بکە بە حەفتەو دوو حەفتە فکری من بەوەوە مەشغووڵ بوو کە چ ناوێک لەو حەرەکەتە بنێم. یانی نە بیێتە تێکەڵبوونەوەی دوو حیزب و ئەو وەزنە بۆ ئەوانە داترێ کە لە حیزب ڕۆیشتوون. واتە حیزبێک بن وەک حیزبی دێمۆکرات. نە کەلیمەیەک بەکار بێنین کە مانای هاتنەوەی وان بداو غرووریان بشکێنێ. تەنانەت جارێک کاک جەلیلی گادانی کە باسی شتێکمان دەکرد گوتی ئێوە یان ئەتۆ - دەقیق نازانم کامیانی گوت - دەتانەوێ ئێمە سووک بکەن. گوتم ڕاست عەکسی ئەوەیە. ئەگەر ئێوە حورمەتتان نەبێ چ خێرێکتان بۆ حیزبی دێمۆکرات دەبێ؟ نەخێر ئەمن دەمەوێ بەو پەڕی عیززەت و ئیحتیرامەوە لەنێو حیزبی خۆتاندا جێ بگرن. جا مەبەستم ئەوەیە زۆرم هەوڵ‌دا کەلیمەیەکی ئاوا بیبینمەوە. سەرەنجام ئەو ناوە مەشهوورە جێی گرت کە ئەمن دامهێناوە. هەتا زیندووم ئەگەر کەسێک هەیە بڵێ وا نەبوو با بڵێ وا نیە. ناوەکەش ئەوە بوو: **"وەسەر یەک کەوتنەوەی بنەماڵەی گەورەی حیزبی دێمۆکرات"**. نە ئەوەی تێدایە کە تێکەڵ بووینەوە. نە ئەوەی تێدایە بووینە یەک حیزب. نە ئەوەی تێدایە هێندێک گەڕانەوە. تەعبیرێکی ناسکە کە هەموان ڕازی دەکا. بەخۆشی‌یەوە ئێستاش زۆرجار بە موناسەبەتی جۆراوجۆر بەکاری دێنن. قسەی خۆم نەبێ زۆر تەعبیر هەن لە حیزبی دێمۆکراتی کوردستاندا

وەختی خۆی ئەمن دامهێناون. مەسەلەن باسمان کرد ئەو ناوی "هێزی پشتیوان"، پێشنیاری من بوو. ئەو هێزانەی دوژمن کە دەچوون جادەیان دەگرت پێیان دەگوتن "تەئمینی جادەی". گوتم کەی ئەوانە جادەی تەئمین دەکەن. با پێیان بڵێین "ڕێگرەکان". بۆیە ناومان لێنان ڕێگرەکان. یان مەسەلەن ئێستا دروشمی ژنان هەیە وەک "ئازادی بۆ ژن، بەختیاری بۆ کۆمەڵ". ئەوە ئەمن فۆرموولەم کردوە. ڕەنگە زۆری دیکەش بن کە عیبارەتێ پێشنیارم کردوون و پەسند کراون. یان جاری وا بووە هەر لە زیمنی نووسینەکەمدا هاتوون و جێیان گرتوە.

بۆ نموونە جارێکی برادەرێک کە ئێستا لە جەماعەتی ئەو بەرێیە، شتێکی نووسیبوو لە زمان دوکتور قاسملوویەوە. نووسیبووی دوکتور قاسملوو وای گوت. ئەمنیش نەمدەزانی لە کوێیە. گوتم کاکە ئەو قسەیە ئی دوکتور قاسملووی نیە قسەی منە. گوتی نەخێر قسەی تۆ نیە. گوتم قسەی منە. قسەکە ئەوەیە کە دەڵێ: پێشمەرگە ئەو ئینسانەیە کە هەموو سەرمایەی ژیانی، تەنانەت گیانیشی لە ڕێگای ئازادیدا دادەنێ بێ ئەوەی چاوەڕوانیی پاداشێک و تەنانەت سپاسێکیشی هەبێ. شتێکی ئاوایە جوملەکە ڕەنگە دەقاودەق نەبێ. گوتم کاکە بەڕاستی ئەوە بە قەڵەمی من نووسراوە. دیسان گوتی وەڵلا وا نیە. ئاخری گوتی ئەوە ئی ڕاپۆرتی کۆنگرەی پێنجەمە. دەی گوتم ڕاپۆرتی کۆنگرەی پێنج ئەمن نووسیومە. شتی ئاوا هەبووە. جا ئەوەش وەکی عەرزم کردی عیبارەتەکە ئەمن داهێنا.

**عەباس کاروان:** لەنێو ڕێبەرانی نەسڵی "ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ"دا کەسانی وەک بەڕێزان: کاک جەلیل گادانی، کاک حەسەنی ڕەستگار، کاک فەتاح کاویان، کاک حوسێن مەدەنی و ... دەبینران کە هەم ڕابردوویەکی زۆری خەباتیان هەبوو هەم دۆستی تۆش بوون، دەتەوێ باسێک لەسەر ئەو کەسایەتییانە بکەی؟ کێی دیکەت دەبەرچاوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هەر لەوانە ئەگەر ئەمن چاکم گوێ لێ بوبێ ناوی کاک هاشمی کەریمیت نەبرد. کاک هاشمی کەریمییش هەر لەو ڕیزەیە بەڵام جگە لەوانە کەسانی دیکەشیان تێدا بوو کە بە ڕاستی وەختی خۆی نەخشیان هەبوو. مەسەلەن قەت ناتوانم عوسمانی ڕەحیمی لەبیر بکەم. یەکێک لە بەدشانسییەکانی حیزبی دێمۆکرات ئەوە بوو کە عوسمانی ڕەحیمی زوو لەدەست چوو. کابرایەک بوو چەندی بڵێی دڵسۆز، چەندی بڵێی فیداکار، ئازا لە هەموو بوارەکاندا، لەخۆبوردوو. مەسەلەن وەختێکی خەڵک سەروملی دەشکاند بچێتە دەرێ، ئەو بۆرسی خوێندنی بۆ داترا کە بچێ بخوێنێ، گوتی نا ئەمن لیسانسەکەم لە دانیشگای کوردستان وەردەگرم، مەبەستی پێشمەرگایەتی بوو، بۆیە مایەوە نەچوو. حەتتا لەدوایەدا کە دەگەڵ ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ کەوت، ناردیان بۆ ئەڵمان. لەوێ مایەوە ئیقامەی وەرگرت. هێندێکیش زەمانی

ئەڵمانی فێر بوو. بەڵام بێ کوردستان ئەژیاو هاتەوە دەگەڵ ڕەفیقەکانی بوو هەتا دەنێو ئەواندا گیانی بەخت کرد. دیسان ئەو برادەرانی دیکەی کە ئێستا هەمانن وەک کاک کەماڵی کەریمی و سەید براییم زۆری دیکە هەن کە ئێستا ناتوانم ناویان بەرم. ئەوانە هەموو لە تێکۆشەرانی ئەو حیزبە بوون و هەن.

لە قازی موحەممەدەوە بیگرە هەتا پێشمەرگەیەکی تازەهاتوو کەسمان بێ خەتاو بێ عەیب نیە. بەڵام هەمووی ئەوانە ئیفتیخاراتی خۆیانیان هەیە. حیزبیش و میللەتیش و تاریخیش دەبێ قەدریان بگرێ. لە عەینی حاڵدا دەبێ لە هەرکامێکماندا ئەگەر نوقتەیەکی لاواز هەیە ببینرێ و باس بکرێ. ئەوە نەک بۆ سووک-کردن و تاوانبارکردن، بەڵکوو بۆ فێربوون و عیبرەتوەرگرتن. ئەگەر لەنێو هەزار حوسنیدا عەیبێک هەبێ دەبێ ببینرێ. بە پێچەوانەش ئەگەر لەنێو هەزار عەیبیدا حوسنێک هەبێ دیسان دەبێ ببینرێ و باس بکرێ.

**هەیاس کاردۆ:** لەنێو ئەواندا دۆستایەتیی تایبەتیت دەگەڵ کەسانێکی تایبەت هەیە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** قەرار نیە ئەوەی دابنێین، دیارە ڕەفیقایەتیی حیزبی دەگەڵ هەموورانە. بەڵام لە دۆستایەتیدا پیاو دەگەڵ یەکێکی گەرم و گوڕتر دەبێ هەتا یەکێکی دیکە. یادی بەخێر دوکتور قاسملوو شتێکی لە خەڵکی چیکۆسلۆڤاکی دەگێڕایەوە. یان لە یەکی چێک یان سلۆواکیان پرسیوە ئێوەو میللەتەکەی دیکە بران یان دۆستن. گوتوویەتی ناوەڵلا براین. پیاو دۆستی خۆی هەڵدەبژێرێ بەڵام برا بەدەست خۆت نیە. جا وایە. ئەندامەتیی حیزب و ڕەفاقەتیی حیزبی برایەتییەکەیە. پیاو مەجبوورە لە چوارچێوەی ئوسوولی حیزبیدا هاوکاریی یەکتر بکا. بەڵام دۆستایەتیی شەخسی بەدەست خۆتە. نەک بە مانای موقابەلە دەگەڵ یەکێکی دیکە، بەڵام تێکەڵاویی دەگەڵ یەکێکی ڕەنگە خۆشتر بێ هەتا یەکێکی دیکە. ئەمن شانازی بە دۆستایەتیی هەموویان دەکەم. نەک هەر ئەوانەی دەرێبەرایەتی شۆڕشگێڕدا بوون، بەڵکوو هەموو هاوڕێیانی حیزبی. بەڵام بە دروستی نازانم بڵێم دۆستایەتیم دەگەڵ ئەوەی هەیەو دەگەڵ ئەوەیان نیمە. شتێکی ئاشکرایە هەموومان لە ژیاندا دەگەڵ هێندێکان نیزیکترین هەتا هێندێکی دیکە.

# ڕاگرتنی خەباتی چەکدارانە

**عەباس کاردۆخ:** بە دوای مۆرکردنی ڕێککەوتننامە دەگەڵ یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستاندا هەرچەند بڕیاری وەلانانی خەباتی چەکدارتان ئەدا بەڵام بەکردەوە لێی دوور کەوتنەوە. هەر وەک دەیبینین ئەو ڕەوتە ئێستاش هەر بەردەوامە و ڕێش ناچێ ئاڵوگۆڕی تێدا بکرێ. بەو بیانوویە دەرگای چەند پرسیارت بەڕوودا دەکەمەوە کە هیوادارم وەڵامی پێویست وەرگرمەوە:

**عەباس کاردۆخ:** حیزبی دێموکرات کەی ڕەسمەن دەستی بە خەباتی چەکداری کرد و بۆ ئەو کارەی کرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** باسکردنی تاریخی ئاوا بە دەقیقی زەحمەتە بەڵام خەباتی چەکدارانە لە حیزبی دێموکراتدا تاریخێکی دووروودرێژی هەیە و بە شێوەی جۆراوجۆریش هەیە. بۆ یەکەم جار لە دەورانی کۆماری کوردستاندایە کە حیزبی دێموکرات دەگەڵ دیفاعی چەکدارانە بەرەوڕوو دەبێ، یانی ئەو وەختەی دەوڵەتی شاهەنشاهی هێرش دەکاتە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کۆمار و هێزی پێشمەرگەش دیفاع لە کۆماری کوردستان دەکا. لەپاشان وەکی دەزانین لەساڵەکانی ٤٦-٤٧دا و تەنانەت لەساڵەکانی پێش ٤٦-٤٧یش دا حاڵەتێک ڕووی داوە کە ئەندامانی حیزبی تووشی بەرەنگاری‌یەکی چەکدارانە بوون. چونکی هاتوچۆیان بۆ نێو وڵات کردوە مەجبوور بوون چەکیان پێ بێ دەنا وەک کەمپارە ڕاویان دەکردن. ساڵانی ٤٦-٤٧یش دەزانین کە بۆ ماوەی هەژدە مانگێک خەباتی چەکداری یان دیفاعی چەکدارانە هەبووە. لەپاشان لەو دەورەیەدا کە بە دوای کۆماری ئیسلامی‌دا دێ، هەر لە یەکەم ڕۆژەکاندا کە جمهووریی ئیسلامی هاتبووە سەرکار، پێنوابێ یەکەم حەرەکەتی چەکدارانە ئەوە بوو کە لە سنەی کرا. لەپاشان لە نەغەدە ڕووی دایەوە. تاریخی دەست‌پێکردنی خەباتی چەکدارانەی بەردەوام ڕەنگە نەتوانین بە وردی دیاری بکەین بەڵام بە شێوەی عومدە بەدوای ئەو حوکمەی خومەینی‌دا دەست پێ کرا کە ناوی جیهادی لەسەر دانرا. تەمەن دووبارە ئەوەی دەڵێمەوە ئەوە فەرمانی جیهاد بە مانای خۆی نەبوو. شتی وا نەبوو بەڵام فەرمانی هێرش بۆ سەر کوردستان بوو. بە تایبەتی سەرانی حیزبی دێموکراتیشی بە کافر و موڕتەد و ئەوانە ناو برد. تەقیرە واش حاڵی کرابوو کە ئێمە ڕێبەرانمان هەمووی دە، پازدە کەسێک ئەوە لە ترسی خەڵکی لە کونو کەلێناندا خۆیان شاردۆتەوە. ئەوەی گوت کە بیانگرن خوێنیان کەنەو و ئەوانە. لەو کاتەوە کە ئەو هێرشە گەورەیە بۆ سەر کوردستان دەستی پێ-

کرد، بڕیاری دیفاعی چەکدارانە لەلایەن حیزبی دێموکراتو هێزە نیشتمانیی‌یەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە درا.

**هەیاس کاردۆ:** هەر وەک بۆخۆت باش دەزانی بەڕێوەبردنی خەباتی چەکدارانە تواناو ئیمکاناتی پێش جەبهەو پشتی جەبهەی زۆری دەوێ. ئەزموونی حیزب لەو بارەیەوە چۆن بوو؟ گیروگرفتەکانتان لە ماوەی ساڵانی ئەو خەباتەدا چی بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بۆیە حیزبی دێموکرات هەمیشە خەباتی چەکدارانەی بە شێوەیەکی داسەپاو لە خەبات زانیوە چونکی هەر لەبنی‌ڕا کوشتوکوشتار لە فەلسەفەی حیزبی دێموکراتدا پەسند نیە. نە بکوژێی، نەبکوژێ. حیزبی دێموکرات تەرەفداری هیچ‌یەک لەوانە نیە. بەڵام سەرباری ئەوانە لەوەتا خەباتی چەکدارانەی میللەتی کورد هەبووە هەر لە هەموو مێژووی کوردستاندا، هەمیشە خەباتێکی نابەرابەر بووە. چونکە لەلایەک دەوڵەتێک هەیە کە هەموو ئیمکاناتێکی ماڵی، سیاسی، دیپلۆماسی، نیزامی‌و بێهداشتی‌و هی دیکەی هەیە. لەلایەکەی دیکە هێزێکی بەرتەسکی ناموتەزەممی بێ‌ئیمکاناتمان هەیە کە لە کەمترین ئیمکاناتی دیفاعی تەنانەت نەک هێرشییش بەهرەمەندە. ئەو موقاوەمەتە چەکدارانەیە کە بەسەر حیزبی دێموکراتیش‌و لایەنەکانی دیکەی بزووتنەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش‌دا سەپا، لە هەموو ئەو ئیمکاناتانە کە ئەتۆ باسی دەکەی‌و پێویستە، بێبەش بوو، چونکی دروستە ئێمە پشتی جەبهەیەکمان هەبووە‌و توانیومانە لە ناتەبایی دوو سیستمی حاکم بەسەر ئێران‌و عێراقدا کەڵک وەربگرین، بەڵام هەر ئەوانەی لە نێزیکەوە سەروکاریان دەگەڵی هەبووە دەزانن کە - ئەمن بۆخۆم لەوان نیم، هەرچەند ئەمنیش کەم‌وزۆر ئاگام لێ‌یە - ئەوە چەندی کەندوکۆسپ لەپێش بوو.

ئەمن دەمەوێ بڵێم لە هەموو بارێکەوە ئێمە دەگەڵ کەم‌وکوڕی بەرەوڕوو بووین. بەڵام سەرمایەیەکی زۆر گەورەمان هەبوو کە ئەویش پشتیوانیی خەڵک بوو. پشتیوانیی خەڵکەکەش بێجگە لەوەی دەرکەوتوە لەکۆنەوە تا ئێستا حیزبی دێموکرات ئامانجەکانی خەڵکی باش لە بەرنامەی خۆی‌دا گونجاندوە، بەڵام بێجگە لەوە ئەو پشتیوانی‌یە لەوەی‌ڕا سەرچاوەی گرتبوو کە حیزبی دێموکرات بە پێچەوانەی ئەو هەموو هێرشەی کرایە سەری زۆری هەوڵ دا ئەو شەڕە لەکۆڵ خەڵکی کوردستان بکاتەوە. هەموو هەوڵێکی دا بۆ ئەوەی کوردستان دوچاری ئاوری ئەو شەڕە نەبێ. هەموو توانای خۆی بە کار هێنا، هەموو حوسنی نییەتێکی نیشان داو تەنانەت هەموو جنێوو تۆمەتو بوختانێکی لەلایەن ئەملاوئەولاوە قبووڵ کرد کە بە سازشکارو تەسلیم‌تەڵەبو هەموو شتێکی ناشیرینی ناو بەرن، هەر بۆ ئەوەی تووشی شەڕ نەبێ. بۆیە وەختێک تووش بوو خەڵکی کوردستان قەت جارێک لەجاران سەرکۆنەی حیزبیان نەکرد کە بۆ ئەو شەڕەی دەکا. لەباری ماددی‌و

مەعنەوی‌یەوە پشتیـــوانی‌یان لێ کرد. پرسیار ئەوەیە داخوا هەر حیزبی دێمۆکرات بۆخۆی‌و ئەندامەکانی ئەو کێن؟ ئەوانیش هەر ئەو میللەتی کوردن، ئەوە یەکێک لە گەورەترین سەرمایەکان بوو.

لەپاشان ڕەنگە هەر ئیلهام لەوەی وەربگرێ کە نازایەتی‌و لەخۆبوردوویی ڕۆڵەکانی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان ئیدی جێی شک نیە. چونکی ئەگەر بە ئیستاشەوە تەماشا بکەین سەرچاوەی سەرەکیی هەموو پێداویستی‌یەکی ماددی‌و نیزامیی حیزبی دێمۆکرات هێزی دوژمن بووە. مەسەلەن ئەتۆ تۆپت لەکوێ بووە، چ دەوڵەتێک پێی داوی؟ لە دوژمنمان ئەستاندوە. خۆمپارەمان لەکوێ بووە، لانی کەم لە قۆناخەکانی هەوەڵی‌دا ئەو چەکە نیوە قورسانەمان لەکوێ بوون؟ هەرچەند لە واقیعدا ئەوانەمان قەت بەکار نەهێنان، بەڵام تانکمان لەکوێ بووە؟ ئەسلەحەی وردو موهیماتمان لەکوێ بووە؟ لە قۆناخەکانی سەرەتایی‌دا هەمووی لەدوژمن گیراوە. لە دوایەش کە توانیومانە وارید بکەین، دیسانەکە ئەوەی کڕیومانە یان ئەوەی لەملاو ئەولا ئیحتمالەن وەرمان‌گرتوە، بەشی زۆر کەمتر بووە لەوەی لە دوژمنمان گرتوە. لەو بارەیەوە دەتوانم بڵێم نوقتەی موسبەتو پاڵوێندانمان هەبووە. بە دەرەجەی یەکەم پشتیوانیی خەڵک، بە دەرەجەی دووهەم نازایەتیی ڕۆڵەکانی گەل کە لەسەنگەری پێشمەرگەدا خۆیان دیتۆتەوە.

**عەباس کاریزی:** لە ڕەوتی خەباتی سەختی چەکداری‌دا هەزاران ڕۆڵەی کورد بە کچ‌و کوڕ، پیرو لاو، شاری‌و لادێیی لەریزی پێشمەرگەدا خەباتیان کردو بەشێکی زۆریان لەو ڕێگایەدا یان شەهید بوون یان کەم ئەندام. زۆر منداڵ بێ باوک کران‌و گەلێک ئۆبەروک حەسرەتی دەباوەش‌گرتنی خۆشەویستیان بۆ مایەوە. پرسیار ئەوەیە حیزبی دێمۆکرات کە ئەو خەڵکەی دێنایە مەیدان‌و بەگژ ئەو دوژمنە دڕندەی‌دا دەکردن، چۆن وەڵامی چاوەڕوانیی بنەماڵەی شەهیدانی دەدایەوەو چیی بۆ دەکردن؟ ئایا لەو بارەیەوە لە خۆتان ڕازین؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پرسیارەکە لەواقیعدا بەشی ئاخرەکەیتی‌و ئەوی دیکە تەسویری دیمەنەکە بوو. ئەمن جارێکی لە موناسەبەتێک‌دا گوتوومەو بە ئیمانەوە گوتوومە. ئەوەی سەرڕووت دەبێ بە بنەماڵەی شەهیدان، ئەمن خۆم تەنانەت حیزبەکەشم نەک بە قەرزدار بەڵکە بە شەرمەزاری بنەماڵەی شەهیدان دەزانم. حیزبی دێمۆکرات قەت لە هەلومەرجێک‌دا نەبووە کە بتوانێ وەڵامی ئەو هەموو فیداکاری‌و سەرمایەدانانەی بنەماڵەی شەهیدان بداتەوە. بنەماڵەی شەهیدەکانمان زۆر گەورەن چونکە تەنانەت جاروبارێش حیزبی دێمۆکرات نەی‌توانیوە بە شتی چووکیش وەفا بکا کە بنەماڵەی شەهیدان لێی ڕازی دەبن. بۆ نموونە لە موناسەباتێک‌دا کە دێتە پێش، بنەماڵەی شەهیدێک بەوە ڕازی دەبێ کە حیزبی دێمۆکرات پیرۆزبایی‌یەکی لێ بکا. هەلومەرجی خەباتی حیزبی دێمۆکرات ئەوەندە سەخت بووە کە ئەو وەزیفەیەشمان بۆ بەجێ نەگەیەندراوە. بەڵام هەم کۆمەڵانی خەڵک‌و هەم بنەماڵەی شەهیدان بە گەورەیی لەو قسووری حیزبی دێمۆکرات خۆش بوون.

لەبەر ئەوەی هەموویان دەزانن کە هەلومەرجی خەباتەکە ئەوندە دژوارە کە حیزبی دێمۆکرات هەرچی هەوڵ بدا ناتوانێ چاوەڕوانییەکان ئەنجام بدا.

مەسەلەن ئەمن بۆخۆم کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە ئەندامانی ڕێبەریی ئەم حیزبە بووم، ڕەنگە ئەگەر زۆر فشار بۆخۆم بێنم هەر بگەمە سەت شەهید کە بزانم خەڵکی کوێ‌یەوماڵەکەی لەکوێ‌یە. کەوایێ مادام لەنێوی‌دا نی، نە ئادرەسەکەی دەزانێ نە ژمارە تەلەفۆنەکەی دەزانێ‌و نە لەوانە گرنگتر ئیمکاناتی ماددیت هەیە کە پێ‌یان ڕابگەی، ناتوانی پێیان ڕابگەی. خەڵکەکەو بنەماڵەی شەهیداتیش ئەوەی دەزانن. بۆیە بە گەورەیی خۆیان لە حیزبی دێمۆکراتو هێزەکانی دیکە خۆش بوون. ئەمن باسی شەرمەندەیی‌یەکەم کرد. بەڵام هیچمان نە حیزبی خۆمانو نە حیزبەکانی دیکە بە تاوانبار نازانم هەتا ڕۆژێکی کە ئۆمێدەوارم بی‌بینین کە حیزبی دێمۆکرات هەر وەکوو هێزەکانی باشووری کوردستان کە لەنێو خەڵکی خۆیاندا هەنو دەسەڵاتیشیان هەیە دەتوانێ پێ‌ڕابگا. بەڵام ئەو وەختی ئەگەر نەکرا، حیزبەکان نەک هەر شەرمەندە دەبن، تاوانباریشن. ئیدی ئەوکات هەرچی پێ‌یان بڵێی حەقە، بەڵام ئێستا نا.

**هەیاس کاردۆ:** باسی شانازی‌یەکانی پێشمەرگەو تۆمارکردنی داستانە فەرامۆشنەکراوەکانی ئەو رۆڵە ئازایانە دەوراتێک وێردی زمانی گەورەو چووک بوو. ئایا ڕەوایە ئەو مێژوویە هەروا بە هاسانی لەبیر بچێتەوەو ئاوڕی لێ نەدرێتەوە؟ لەو بارەیەوە چیتان کردوەو ئەسڵەن هیچ پلانێک بۆ وەسەریەک خستنەوەی ئەو مێژوویە هەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو پرسیارە بەشێکی دیکەش لە پرسیارەکانت وا دەردەخەن هەر وابزانە ئەمن لە سەدری حیزبی دێمۆکراتدام، یان لانی کەم بەشێکم لە ڕێبەرایەتیی حیزب. ئەم وتووێژەی دەگەڵ من دەکرێ وەکوو یەک نەفەر دەکرێ نەک وەکوو حیزب. بۆیە ئەمن لەجیاتی حیزب جواب نادەمەوە. دەزانم بەشێک لەو داستانانە وەکوو ماددەی خام تۆمار کراون. بەڵام ئەوە تەنیا کەرەسەی خاوە. زۆربەی هەرەزۆری ئەو حەماسانە لە ئارشیوی حیزب، بە تایبەتی ئارشیوی ڕادیۆی دەنگی کوردستاندا پارێزراون. ئەوە دەبێ وەختی خۆی پێی ڕابگەنو فۆرمووله بکرێو پاشان جەمعیەندی بکرێ. ڕەنگە ئەگەر هەمووی ئەوانە بێنی نە لە توانای کەس-دا بێ ئامادەیان بکاو نە ئەگەر ئامادەش بکرێن کەس هەیێ بیانخوێنێتەوە. ئەوە عەمەلی نیە. بەڵام دەبێ ناوی ئەو قارەمانانە تۆمار بکرێو ئەبەدی بکرێ. ئەزموونەکانیان وەکوو ئەزموون بدرێنە دەستی بەرەکانی دواڕۆژ. ئەوە دەکرێ ببێ.

بەس ئەمن شتێکم گوتووە نەک بە دیفاع لە حیزب، هەر وەک واقیعییەت. لەڕاستی‌دا مێژوونووسین نە کاری سیاسی‌یەکانەو نەکاری ئەوانەیە کە لەحیزبەکاندان. چونکی بە دەرەجەی یەکەم نای‌زانن. بە هەموو ڕێبەرانی حیزبە کوردستانی‌یەکان بەقەت کەماڵ مەزهەرێک نازانن تاریخنووسین چیە. خۆ ئەوە گوناح نیە.

لەلایەکی دیکەش تاریخ دەبێ ئەو کەسانە بی‌نووسن کە کاریان مێژوونووسینە. ئێستا ئەمن قەولم دا ئەوەندەی عەقڵم بڕی دەشکێ‌و بیرەوەری‌یەکەم ڕێگام پێ‌دەدا، خیلافی واقیع نەڵێم‌و ناشی‌ڵێم. ئەگەر شتێکم لێ کەوتبێ لەبەر ئەوەیە خەرابم لەبیرە. بەڵام بە هەرحاڵ ئەمن بە تەرەفداری لەحیزبی دێموکرات گەورە بووم. فکرەکەم دەگەڵ وی‌یە. جاری وایە عەیبەکانی لەلای من ون دەبن. حوسنەکانی لای من زیاترن. بۆیە دەبێ خەڵکی بێ تەرەف ئەو تاریخەی بنووسن.

باشترین کار بەباوەڕی من ئەوەیە ئەو کەسانەی دەحیزبیدا دەمێننەوە، بیرەوەری‌یەکانیان بنووسن‌و بیان‌خەنە بەردەستی مێژوو نووسان. لەپاشانیش ئەگەر مێژوونووسێک موراجەعەی کرد بۆ وەرگرتنی بەڵگەو سەنەد لەبارەی ئەو ڕابردووەوە، بەسەخاوەت‌و دڵفروانی‌یەوە بخرێتە بەر دەستی.

**هەیاس کاردۆ:** هاوکاریی بێدریغی خەڵکی کوردستان دەگەڵ هێزی پێشمەرگە لە هەموو بارێکەوە شتێکی لەبیرنەکراوە. ناکرێ باسی مێژووی خەباتی چەکداری بکەی‌و نەخشی خەڵک وەلا بنێی. پرسیار ئەوەیە ئێوە چۆن دەتانتوانی بەدایم ئەو خەڵکە ئامادە ڕابگرن لەکاتێک دا ئەوان لەوپەڕی بێ ئیمکاناتی‌و دەست‌کورتی دا دەژیان؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێموایە حیزبی دێموکرات ئەو هونەرەی هەبووە کە داخوازەکانی خەڵکی باش لەبەرنامەی خۆی‌دا گەڵاڵە کردوە، بەڵام تەعارووفم دەگەڵ کۆمەڵانی خەڵک نیە ئەگەر بە ئینسافەوە پیاو بڵێ، ئەوە ئەوانن کە وەرمان داوە بە تێکۆشەرانی حیزب پێش ئەوەی تێکۆشەرانی حیزب وە بەدەن بەوان. هەڵبەت حیزبی دێموکراتیش نەخشی خۆی هەیە. با بڵێین ڕەنگدانەوەی ئەو خەبات‌و قارەمانەتی‌یە لە ئەدەبیاتی حیزبی دێموکرات‌و هێزە سیاسی‌یەکانی دیکەدا بەگشتی، تەبلیغاتی سیاسی، هەوڵی ڕوون‌کردنەوەی خەڵک لەسەر جینایاتی ڕێژیم لەسەر مافەکانیان‌و لەسەر داخوازەکانیان. ئەوانە بە بێ‌شک تەئسیریان هەیە لە ئامادەکردنی خەڵک‌دا بۆ فیداکاریی زیاتر. بەڵام ئەو تەئسیرە لەسەریەک دوو لایەنیە. لەتەحلیلی نیهاییش‌دا ئەوە خەڵکن کە هەم وەرە هەم ئیمکانات دەدەن بە تێکۆشەرانی ڕێگای ڕزگاری. خەباتکارانی ڕێگای ئازادی یەک شانازی‌یان هەیە کە دەبنە پێشەنگ بۆ فیداکاری. بەڵام سەرمایەکە هەمووی هی خەڵکە.

**هەیاس کاردۆ:** لەماوەی ساڵانی شەڕ دژی کۆماری ئیسلامی‌دا حیزبی دێموکرات پێویستیی بە چەک‌وچۆڵی زۆر، لیباس‌و کەوشی پێشمەرگە، دابین کردنی جێگاو خواردەمەنی‌و هەروەها ڕاگوێزتن‌و زۆر شتی دیکەش هەبوو کە هەمووی پێویستیی بە توانای زۆرو بەرنامەڕێژیی دەقیق‌و مودیرییەتی دروست هەبوو. دەکرێ ئەزموونەکانی خۆتان لەو بارەیەوە باس بکەی؟ تۆ خۆت قەت لەو بەشانەدا کارت کردوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هەمووی ئەوانە دەبن. بەڵام نە حیزبی دێمۆکڕاتو نە هیچ هێزێکی دیکە ناتوانێ ئیددیعا بکا کە هەموو ئەوانەی بە تەواوی‌و بەشێوەیەکی ڕێکوپێک ئەنجام داوە. لەبڕیاردانەدا ئەمن بەشدار بووم کە مەسەلەن بۆ تەئمینی لیباسی پێشمەرگە دەبێ چ بکەین، یان موهیمماتی پێشمەرگە چۆن دابین بکەین. بەڵام وەکوو ڕاستەوخۆ بۆخۆم دەکاری تەداڕوکاتی‌و شتی وادا بوویم، تەنیا دەتوانم بڵێم دوو، سێ مانگێک ئەوەی کە ناومان لێنا "مانگی دیفاع لە ئازادی"و "مانگی هێرش بۆسەر دوژمن"و پاشان مانگی دیکەشی بەدووودا هاتن. ئەمن لەو ماوەیەدا ڕاستەوخۆ دەستم لە تەداڕوکاتی بەشێک لە هێزی پێشمەرگەدا هەبوو. یانی لەڕاستی‌دا ئەو بەشەی کە پێوەندیی بە دیفاع لە خەتی جادەی نێوان پیرانشارو سەردەشتەوە هەبوو، تەداڕوکی بە دەرجەی یەکەم کەوتبووە سەرشانی من. دیارە ئەمن لەجێ‌یەکەی خۆم دادەنیشتمو تەنیا چەند جارێک سەری هێندێک لە شوێنەکانی دوورترم دەدا. بەڵام لە خواردەمەنی‌یەوە بگرە هەتا چەک‌و تەقەمەنی‌و ئەوانە هەمووی دەگەیشتە ئەو شوێنە کە ئەمنی لێ‌بوومو لەوێڕا بەسەریاندا تەوزیع دەکرا.

**هەیاس کاردۆ:** لەسەر یەک ئەزموونەکانی خەباتی چەکداری، یان باشترە بڵێم دیفاعی چەکدارانەی حیزب لە دەورەی کۆماری ئیسلامی‌دا چۆن هەڵدەسەنگێنی‌و قازانجو زەرەرەکانی لەچی‌دا دەبینی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** زۆر کەس لەوانەی بۆخۆیان دەگەڵی نەبوونو شانازیی بەشداری‌یان تێی‌دا نەبووە، تەنانەت ئینسانی ڕووناکبیریش ئەو خەباتو فیداکاری‌یە بە بێهوودە دەزانن. تەنانەت ئەمن لە پیاوی "ڕووناکبیر"م بیستوە کە ئێمەو هەموو هێزە سیاسی‌یەکانی بە تاوانبار زانیوە. یانی ئەو کەسەی کە دەمەزەرمدا هەیەو ناوی نابەم، گەیاندیە جێگایەک کە ڕێبەرانی کوردی بە تاوانبار لە قەتڵوعامی خەڵکی هەڵەبجەو ئەنفالو حەوادیسی دیکەی وەکوو کوشتاری بارزانی‌یەکانو ئەوەدا ناو برد. بەڵام ئەمن جۆرێکی دیکەی لێ‌دەڕوانم.

ئەزموونەکە بۆخۆی دەبێ زیاتر موتالەعە بکرێ، شتی لەسەر بنووسرێ‌و جەمعبەندی بکرێ بۆ ئەوەی نوختە لاوازو بەهێزەکانی ئەو دیفاعە چەکدارانەیەی کورد لە هەموو دەورەکانی مێژوودا - نەک هەر ئەوندەی حیزبی دێمۆکڕات یان ئەو چەند دەساڵەی دوای هاتنەسەرکاری جمهووریی ئیسلامی - دەرکەوێ. بەڵام ئەمن پێموایە ئەو خەباتە چەکدارانەیە دەسکەوتی زۆر گەورەی هەبووە. خوێنبایی شەهیدەکان تەنیا ئەو وەختە وەدەست کەوتوە کە ئازادی وەدەست بێ کە ئامانجی شەهیدەکانە. کە ئازادی وەدی نەهاتوە، ئێمە ئەومان وەرنەگرتۆتەوە. بەڵام بە مانایەک ئەو خوێنانە هیچیان بەفیڕۆ نەچوون. ئەگەر کورد هەیە، ئەگەر ئەو ئاگاهی‌یە سیاسی‌یە هەیە، ئەگەر ئێستاش لە هەموو مورعادەلاتێک‌دا بۆ نموونە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئەگەر کورد حیسابی لەسەر دەکرێ هەمووی لەو خەباتەوەیە. هەر ئەوڕۆژانە لە هێندێک تەلەڤیزیۆنی خاریجی

کە بەناوی ئێرانی‌یەکانەوە قسان دەکەن و ماموارەیین. چەندجارم گوێ لەوەی بوو کە بەشانازی‌یەوە باسی ئەزموونی کوردستانیان دەکرد. باسی ئەوەیان دەکرد کە دەبێ لە کوردستان فێر ببن و ئۆلگوو بەرداری بکەین، بە تایبەتی لە حەرەکەتی ۲۳ی بانەمەڕ. ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئەو خوێنانە بەفیڕۆ نەچوون. ئەوە بەرهەمی ئەو خەبات و قوربانی‌دانەیە.

ئەمن ئەو کەسەی کە گوتم ناوای باس کردوە بە ئەدەبەوە دەگەڵ خۆی بەرخوردم کرد. بەڵام لەکن یەک، دوو دۆستان گوتم ئەگەر ئەو خوێنانە نەبان، ئەو فیداکاری‌یە نەبایە، ئێستا ئەو برادەرە بە جاشیش کەس قبوولی نەبوو. نەک هەر تێکۆشەری ڕێگای ئازادی نەدەبوو و قسەی زەلامی نەدەکردن. تەنانەت بە جاشیش کەس قبوولی نەدەکرد. چونکی جاش لەواقیعدا لە سێبەری پێشمەرگەی‌دا نان دەخوا. وەختی خۆی دەیان‌گێڕایەوە کە هێندێک لە جاشەکانی کوردستانی عێراق هەر وەخت مەعاشەکەیان وەردەگرت دەیان‌گوت خوا لە سەلامەتەفای بەزیاد بکا. چونکی ئەگەر مەلا مستەفا لەشاخی نەبێ دەوڵەتی عێراق ئەوان بۆ بەجاش وەردەگرێ. ئەگەر ئەو فیداکاری‌یە نەبایە ئەو وشیاری‌یەی خەڵک نەدەبوو. نە ئەو حەرەکەتە زیندووەی ئێستا هەیە دەما، نە تەنانەت هێندێک ئازادی و سەربەستی کە ئێستا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەیە دەبوو، جمهوریی ئیسلامی ئێستاش نەی‌توانیوە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەسەڵاتی خۆی بەسەر خەڵکی کوردستاندا بسەپێنێ. نەی‌توانیوە زۆر لە قانوونە کۆنەپەرستانەکانی بەسەر کورددا بسەپێنێ. ئەوە لەبەر ئەوەیە کە کورد دیفاعی لە خۆی کردوە. ئەمن لێی پەشیمان نیم. بە بەفیڕۆچووی نازانم. سڵاو نەک لەگیانی شەهیدان لە قەترە قەترەی خوێنەکەیان دەکەم.

## هێندێ شت لەسەر کۆنگرەکانی حیزبی دێموکڕات

**عەباس کاردۆ:** با بگەڕێینەوە سەر ڕەوتی باسەکەمان. بوونی دوو قۆڵ، یان وەکی باوە "جەناح" لە نێو حیزبدا بە درێژایی سالآنی سکرتێریی جەنابتان چی بەدواوە بوو؟ بۆ نەتانتوانی ئەو دیاردەیە کۆتایی پێ بێنن؟ دەڵێن ماموّستا قازانجی خۆی دەودا دەدیت. ئەوە هەتا چەند ڕاستە؟ ئەدی لایەنی بەرامبەر چ قازانجێکی دەودا دیوە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەوانە کە دەڵێن فلانکەس قازانجی خۆی دەودا دیوە کە جەناح هەبێ، تەوزیح نادەن قازانجەکە دەچی‌دایە. هەمویان، موافیق و موخالیف، دەزانن کە ئەمن لە تەواری ماوەکەدا ئارەزووم ئەوە بووە کە لێم گەڕێن لە کۆمیتەی ناوەندییش‌دا نەبم. باشە قازانجی من لەچی‌دایە؟ ئاخر دەبێ شتێک هەبێ، دەبێ کەسبی ماددیی لێ بکەم؟ دەبێ قازانجی مەقامی لێ‌بکەم؟ مەقامێک کە ئەمن هەر شەرم دەکەم بە مەقامی بزانم. شانازیی پێوە دەکەم، دەبێ هەموو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی، تەنانەت جێگرو موشاویرو کادری خوارتریش بە مەسئوولییەتی بزانن لەبەر ئەوەی مەسئوولییەتێکی ئەتەوەیی‌یە لەسەر شانیان ئەگەر وەری بگرن. بەڵام مەقامی چی؟ ئەمن زۆرجار ئەو عیبارەتە بەکار دێنم کە بە هەموو حیزبەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کە بنکەمان لە باشووری کوردستانە، بە هەمووومان دوو گەز عەرزمان نیە کە یەکێکمانی تێدا بنێژرێ. کام ئیمتیاز، کام مەقام، کام خۆڕاتان؟ خۆهەڵسانەن لەسەر خەڵکی، ئەمن بۆخۆمی بە شەرم دەزانم. کەوایێ چ قازانجێکم لەوەدا هەبووە؟

لەسەر ئەوە کە بۆ کۆتایی نەهاتوە، ئێمە هەموو هەوڵی خۆمان داوە. هەرچەند هەوڵدان ئەرکێکی ئینسانی-یە، لە هەمان‌کاتدا ناتوانێ حەتمەن هەدەفەکە دەستەبەر بکا. دەنا ئەمن گەیشتمە ئەو جێگایەی کە لە کۆنگرەی دوازدەدا پێشنیاری بڕیارێکم کرد کە جارێکی دیکەش ئیشارەم پێ کرد، کە هەموو جۆرە دەستە بەندی‌یەک بە تاوان تا سنووری خەیانەت دابنرێ. یانی هەتا ئەو ڕادەیە چوومە پێش. پاشان ئەمن دەستە بەندی بێ یان نەبێ، وەختێکی لەمپەڕێکی ئاوام دروست کردوە. وای دادەنێم یەک لە میلیاردیش ئەمن پێم‌خۆشە ببمە سکرتێر بەڵام ئەمن تەقریبەن بە نیوەزۆری، نیوەزۆری‌یەکە ئەوە بووە کە گوتوومە ئەگەر ئەو ماددەیە لە پێڕەوی نێوخۆی حیزب هەڵ‌گیرێ ئەمن لەنێو حیزبی دێمۆکراتدا نابینن. ئەویش ئەوە بوو کە هیچکەس ناتوانێ زیاتر لە دوو دەورەی بەدوای یەک‌دا ببێتە سکرتێری حیزب. باشە ئەگەر وایە ئیدی دەستە

بەندی بۆ بکەم؟ وەختێکی بۆخۆم کۆسپێکی ئاوام دروست کردوە، کۆسپێکی قانوونی کە بە هیچ جۆر ناتوانم بیسەوە سکرتێر، ئەگەریش بە فەرزی مەحاڵ بمەوێ کە قەتم نەویستوە.

بەڵام ئەوانەی قسە دەکەن بە هەموو جۆر قسان دەکەن. پێمخۆشە ئەوەش لە مێژوودا سەبت بکەم کە ئەفەرێکی موخالیفی من، لەکن دوو کەس بەدژی من قسەی کردوە. یەکێکیان پیاوێکی بەدین و مەلاو ڕووحانی بووە. لە لای ئەو کەسە لەبارەی منەوە گوتوویەتی بابە مەلای چی و ڕووحانیی چی. نارەقی دەخواتەوە، چ دەکا، چ دەکاو چ دەکا. هەر ئەو پیاوە لەکن پیاوێکی لائیک باسی منی کردوە، گوتوویەتی کوڕە وازی لێ بێنە. ئەوە مەلایە، ئێستاش نوێژێ دەکا، ڕۆژوان دەگرێ و لەو شتانە. چونکە لە کن ئەویان پێی وایە بەوەی چووک دەبمەوەو لەکن ئەوی دیکەیان پێی وایە بەوەی چووک دەبمەوە. یانی بە هەموو زمانێک ئەو جۆرە کەسانە قسان دەکەن کە بە خۆشییەوە ژمارەیان زۆر کەمە. یەکجار یەکجار ژمارەیان کەمە. ئەمن نالێم ئەوەندە خۆشەویستم یان جێگەو پێگەی ئەوەندە قایمم لەنێو کۆمەڵی کوردەواری‌دا هەیە. بەڵام بە خۆشییەوە ئەوەی‌دا سەر نەکەوتوون.

ئەمن بە هەموو ئیمانەوە دەڵێم ئەوانەی لە نێو حیزبی دیموکراتی کوردستاندا پێش لەتبوونی و ئەوانەی ئێستا لەنێو دوو حیزبی دیموکراتدا منیان بە جۆرێک لەجۆران خۆش دەوێ، بە دەیان بەرابەری ئەو کەسانەن کە ناخۆشیان دەوێم. چونکی ئەمن لە کەسم شتێک غەیری دۆستایەتی و ئیحتیرامی موتەقابیل نەویستوە. زۆر جارم گوتوە، یەک کەس خۆشی بوێم پێم بە سەت کەس دەبێ کە ڕیاییم لەبەر بکا. پێم بە میلیۆن کەس دەبێ کە لێم بترسن. بۆیە قەتم وا نەکردوە کەسێک لێم بترسێ. ئاخر بۆچی لێم بترسێ؟ لەبەر لەشکری زۆرم لەبەر عەشیرەتی زۆرم لەبەر ماڵی زۆرم یان لەبەر دەسەڵاتی زۆرم؟ بەڵام وەکی عەرزم کردی ئەو کەسەی موخالیفە هەوڵی دنیایە دەدا کە زۆریش مەزبووحانەیە. پێمخۆشە خەڵکی دیکە قەزاوەت بکەن داخوا ئەو هەوڵانە چەندیان تەئسیر داناوە. لە ماوەی ئەو لەتبوونەدا بە هەزاران لاپەڕە ڕەش کراونەوە لە زیندی ئێمە. هەرکەس وەدوای کەوتبێ زۆر بە هاسانی دەزانێ کە لە خەراپترین حاڵەتدا سەتا نەوەدی بۆ من بووە. داخوا هەر ئەوە کە هەموو هەوڵەکە لەدژی منە بە هەموو جۆریش، بێ ئەوەی کابرا قەدری قسەی خۆی بزانێ، ئەوە نیشانەی ئیفلاس و نائومێدیی وان نیە؟

جا وەکی عەرزم کردی با ئەوەی دووپات کەمەوە کە ئەو کەسە یان ئەو کەسانەی وا دەڵێن، بۆخۆیان ئیقرار دەکەن کە بۆیە یەکگرتنەوەی ویستوە هەتا خۆی بە قووەت بکا. یانی بە ئاشکرا دەڵێ ئەمن قازانجی خۆم لە یەکڕیزی‌دا دەبینم. ئەوە بۆخۆی ئیعتیراف دەکا ئەمن ئەمگوتوە. هەرچەند واش نیە چونکی ئەمن بۆیەم وا نەکردوە. بەڵکوو یەکڕیزیم پێ باش بووە نەک لەبەر قازانجی خۆم. یەکڕیزی جیابانەوەی ویستی خەڵک بووە لەبەر ئەوە ویستوومە. بەڵام ئەو دەڵێ مەسڵەحەتی خۆی ئەوەدا دەبینی.

**هەیاس کاردۆ:** لەماوەی ساڵانی نێوان کۆنگرەکانی یازدەو دوازدەدا دیارترین چالاکی‌و کاری بەرچاوتان چ وەک سکرتێرو چ وەک حیزب بە گشتی چی بوو؟ ئەدی بەربەستەکانتان؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەربەستەکان دیارە بەداخەوە لە هەمووی ئەو ماوەیەدا هەر هەبوون. خۆ بەربەست هەر ئەوە نیە یەکێک بێ ڕێگات پێ بگرێ. بەڵام بەربەستەکان بەردەوام بوونو زیاتریش بوون. یانی ئیمکانی جموجۆڵو ڕاپەڕی زۆر نەبووە. ئێستا ئاوی دەتێ هاودەردی‌و هاوپێوەندی دەگەڵ بزووتنەوەی کورد لە باشووری کوردستان، یان بەرتەسکیی ئیمکانات، یان دژواریی هەلومەرجە لەنێو خۆی وڵاتدا بۆ هەموو جۆرە کارێک،زۆر لە مەسەلەکە ناگۆڕێ. خۆلاسە بەربەستەکە هەبووە. ئەگەر موتەوازیعانەو واقیع‌بینانە قسە بکەین، دەشکرێ بڵێین زیاتر لەو ماوەیەداو تەنانەت هەتا چەند ساڵ لەوە پێشیشو بە مانایەک هەتا ئێستاش، کاری ئێمە ئیدامەکاری‌یە، مانەوەیە، خۆئامادەکردنە بۆ ڕۆژانێکی لەپێشمان. چونکی ئەمن هەلومەرج بۆ گۆڕان لە داخلی وڵاتدا ساڵ بە ساڵ ئامادەتر دەبینم. یانی ئەگەر لە دەساڵ لەوە پێشەوە بی گرین، ئەوە نەک لەبەر ئەوەی هێندێک ئارەزوو دەکەن یان بە حیساب لێک دەدەنەوەو تەفسیر دەکەن کە گۆیا مووشەکەکانو تەیارەکان لەلایەن وڵاتانی خاریجی‌یەوە بەرێوەن. ئەو ئیحتمالەم نە قەت پێ خۆش بووە، نە پێم چاک بووەو نە تەنانەت بە نیزیکیشم زانیوە هەتا ئەو سەعاتەشی دەگەڵ بێ. دیارە بە موتەقیبیشی نازانم چونکی ناکرێ پێشبینیی ئاوا بکرێ.

بەڵام وشیاربوونەوەو ڕوونبوونەوەی بەرچاوی خەڵک، دەرکی زیاتری ماهییەتی کۆماری ئیسلامی لەلایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە، ئەوانە هەموو پێتدەڵێن کە ڕۆژانی باشتر لە ئێراندا لەپێشن. مەسەلەکە ئەوەیە هەتا چەند ساڵ لەوە پێش خەڵکی ئێران - کە باسی خەڵکی ئێران دەکەین، ئەوانە دەڵێین کە لە دەوڵەتدا بەشدار نین - بەسەر دوو جەناحی نێو حاکمییەتدا بەش ببوون. ئێستێ ئەوانەی دەکرێ پێیان بڵێین خەڵکی ئێران هەموویان لەلایەکن. ئەوانەش کە دەحاکمییەتدان، هەموو لەلایەک نین بەڵام بەهەر حاڵ کەوتوونە لایەنی بەرامبەر. هەرچەند لەنێو ئەوانیشدا دیارە پەرشو بڵاوی‌و ناکۆکی دەبینرێ کە ئەوەش کۆمەگێک دەبێ بە کۆمەڵانی خەڵک کە لە هەوڵی گۆڕینی ئەو ئیزامەدان. یانی دەتوانم بڵێم کاری ئێمە زیاتر ئەوە بووە ئەم حیزبە وەکوو ڕێکخراوێکی موعتەبەر بهێڵینەوە. پاشان هەوڵ بدەین ئامادە بین. خەڵکەکەمان ئەوەی دەنێوخۆی وڵاتدایە ئامادە بێ. پێوەندیمان دەگەڵ خەڵکی بەهێزتر بێ، پێوەندی‌یەکانمان دەگەڵ دنیای دەرەوە بپارێزینو پەرەیان پێ بدەین، دیارە بە پێی توانا، چونکە تواناکان بەرتەسکن.

**عەبباس کاردۆ:** ئێوە ئەتان توانی کۆنگرەی دوازدە لە هەرێمی کوردستانو لە ناوچەی ژێر ئیدارەی برایانی کورددا بگرنو ناچار کەرکووکتان هەڵبژارد کە لە ژێر دەستی حکوومەتی ئەوکاتی عێراقدا بوو. ئەوە بۆ کرا؟ بەرپرسانی هەرێمی کوردستان چۆن سەیری ئەو مەسەلەیان کردو خۆتان چۆنتان لێک دایەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە هەتا کۆنگرەی سێزدە، بۆ هیچ کۆنگرەیەکمان مەوقعییەتێک ڕێک نەکەوتوە کە حیزبی دێمۆکرات کۆنگرەکانی لەو شوێنانە بگرێ کە لەژێر دەسەڵاتی حکوومەتی هەرێمدان. کۆنگرەی نۆ(٩)مان لە جێگایەک گرت کە لەڕاستی‌دا حکوومەتی هەر لێ‌نەبوو. بۆخۆشت لەوێ بووی، لە "گەڵی بەدران"مان گرت کە کەس هەر فکریشی نەدەکرد لەو شوێنە کۆنگرە بگیرێ. شوێنێکە پێم-وایە لەبیرتە کە دوو ڕۆژ دوای تەواو بوونی کۆنگرە ڕنووی بەفری بە سەردا هات. زیندانیشی لێ‌بوو، مەقەڕاتیشی لێ‌بوو، هەمووی وەبن خۆدان کە بەداخەوە زیندانی‌یەکیش هەر مرد. یانی وەبن بەفرێ کەوتو هەتا دوو، سێ ڕۆژان جنازەکەشی دەرنەهاتەوە.

کۆنگرەی دە(١٠) ئێمە پێمان‌خۆش بوو، ئارەزوومان دەکرد لە سێبەری حکوومەتی کوردی‌دا بگرین. هەلومەرج وابێ کە دەعوەت بکەین لە نوێنەراتی دەوڵەتییشو حیزبەکانیش کە لەوێ‌دا بەشدار بنو لە کۆبوونەوەی کردنەوەی کۆنگرەدا پیرۆزبایی‌مان لێ‌بکەن. بەڵام هەلومەرجەکە ئەو ڕێگایەی نەدا. بۆیە - هیوادارم پێ‌یان ناخۆش نەبێ ئاشکرای بکەم - دەگەڵ حیزبی شیوعی کوردستان قسەمان کرد. ئەوان لە هەولێر جێگایان دابین. زاهیرەن بەحزبی حکوومەتی هەرێم بوو، بەڵام لە باتین‌دا نە ئێمە لە حکوومەتی هەرێم-مان دەشاردەوە نە دەسەڵاتدارانی حکوومەتیش هێندە بێ‌ئاگا بوون کە نەزانن. ڕەسمەن بە ئاگاداریی وان نەبوو. وەک شتێک بێ‌هێنەوە ناوی مەعییەنە، ئەوانیش گوێی خۆیان لێ‌ناخنیو ئێمەش کۆنگرەکەمان بە خۆشی گرت. کۆنگرەیەکی زۆریش دوورودرێژ بوو، دە ڕۆژی خایاند. ئەوە بەڕاستی بۆ من یەکێک بوو لە شتە خۆشەکان لە بیرەوەری‌یە خۆشەکانی مێژووی حیزبی دێمۆکرات. بۆ ماوەی دە ڕۆژان ئێمە دەوری دوو سەت(٢٠٠) کەسمان لە کۆبوونەوەدا بووین. بەڵام دراوسێی ئەو ماڵەی ئێمە کۆنگرەمان تێدا گرت، نەیان-دەزانی لەو شوێنە چ خەبەرە.

تەنانەت ئەو وەختی هێندێک ناکۆکی لە بەینی حیزبی شیوعی‌و هێزەکانی دیکەی کوردستان‌دا ڕووی دابوو (دیارە ڕاست ئەو دەمی نەبوو، کەمێک پێشتر بوو)، بۆیە هێندێک کەس وایان لێک دابۆوە کە وا دیارە حیزبی شیوعی بەرنامەیەکی بەدەستەوەیە، چونکی خەلکی لێرە کۆ کردۆتەوە. ماڵەکە گەورە بوو و داشمان-نابوو نابێ لەو ماڵەی بچینە دەرێ لە ماوەی ئەو دە ڕۆژەدا. ئەو جێ‌یەی کۆنگرەی لێ‌دەگیرا ئەوە لێی دەگیرا، ژوورەکانی دیکەش بۆ نوستن بوون ئەوە هیچ. بەڵام حەوشەو حەسارێکی زۆری هەبوو کە پارێزگاریی ئەو حەوشەو حەسارو ماڵەی هەمووی بەدەستی پێشمەرگەی خۆمانەوە بوو. جگە لەو کەسانەی وەک پەزیرایی

کاریان دەکرد کە خەڵکی زۆری دەوێ، بە هەموویەوە دووسەت(٢٠٠) کەسی لێ‌بوو. پێشتر گوتم ئەندامانی کۆنگرە سەتو چاردە(١١٤) کەس بوون. بەڵام لەپشتی حەوشەوە کە دەچوویە دەرێ، ئەوجار حیزبی شیوعی زەحمەتی زۆری کێشا بوو کە بە ئەندامو پێشمەرگەی زۆرەوە ئەمنیەتەکەی دەپاراست.

بۆ کۆنگرەی یازدە(١١) ئێمە دیسان هەوڵماندا بتوانین لە شارێکی هەرێمی کوردستان کۆنگرە بگرین. بەڵام مومکین نەبوو. بەدزی هەر نەدەکرا. بە دەلایلی سیاسیو دیپلۆماسییش نەمانتوانی موافەقەت وەربگرین. ناچار ئەویشمان هەر بردە دەرەوەی ئێرە. خۆ خەراپ نیە بگوترێ کە کۆنگرە لە هەرجێیەکی بگیرێ گرینگ ئەوەیە چیی تێدا باس دەکرێو چ بڕیارێکی تێدا دەدرێ. خۆ عەیب نیە چونکە ئەوێش هەر خاکی کوردستان بوو. بەڵام ئێمە هەر دوو کۆنگرەی یازدەو دوازدەمان لە کەرکووک گرتو لەژێر پارێزگاریی دەوڵەتی عێراقێشدا بوون. بۆ مێژووش بی‌ڵێم، ئەوانیش زەحمەتێکی یەکجار زۆریان کێشا بۆ پارێزگاریی ئەو دوو کۆنگرەیە. دەگەڵ ئەوەی نهێنی کاریی‌یەکەمان لە هەموو حاڵەتێک‌دا هەر زۆر بوو، وامان کردبوو دوژمنمان پێی نەزانێ. بەڵام دەگەڵ هەمووی ئەوانەدا دەمەوێ بڵێم بێجگە لەو ئەمنیەتەی لەسەر عەرزێ هەبوو، لەحزە نەبوو تەیارەش بەسەر کەرکووکەوە نەبێ بۆ ئیحتیمالی هێرشێکی هەوایی کە بتوانن دیفاع بکەن. ئەوە وەکوو حەقیقەتێکی تاریخ دەبێ بگوترێ.

ئەمن ئەو شتانەم پێ باشن. ماوەیەک لەمەو بەر دوکتۆر کەماڵ مەزهەر یادی بەخێر بێ، وتووێژێکیان دەگەڵ کرد پێم وابێ لە کوردستان تی ڤی بوو، یان تەلەڤیزیۆنێکی دیکە بوو کە لە هەولێر کار دەکەن. باسی سەددام حوسێنی کرد کە وەختی خۆشی دەنگی دایەوە. سەددام حوسێن بانگی کردبوو و قسەی دەگەڵ کردبوو. لەوێ دوکتۆر کەماڵ زۆر ئازایانە قسەی کردبوو. گوتبووی ئەوەی ئەواتە پێت دەڵێن- چونکە خەڵکی دیکەشی بانگ کردبوو لەپێوەندیی دەگەڵ مەسەلەی کوردستاندا لێی‌پرسیبوون- هیچی وا نیە. ئەوانە (واتە حیزبە کوردستانی‌یەکان) هیچیان بەکرێگیراو نین. نۆکەری بێگانە نین. بەڵکوو لە خەڵک نین. نوێنەری خەڵکنو خەڵکی کوردستان پشتوانی‌یان لێ‌دەکەن. بۆیە مەسڵەحەتی کوردو عێراق دەوەدایە کە دەگەڵیان رێک بکەون. ئەمن کەلیماتەکەی ناڵێم بەڵام مەتڵەبەکەی کە باسی کردبوو ئەوە بوو کە دەوڵەت ئیعتیراف بە حەقی کورد بکا کە مەسڵەحەتی کوردو عەرەبو هەموو عێراقی‌یەکانی تێدایە. ئەو قسانەی بە سەددام حوسێن گوتبوو. دیارە ئەو هەڵوێستە هەر ئەو وەختی دەنگی دایەوە. بەڵام کە ئەو قسەیەی دەگێڕایەوە گوتی پیاو حەق بڵێ گوێگرێکی زۆر باش بوو. زۆر باش دەرکی دەکرد. زۆر بە ئیحتیرام بوو. ئەمن دوایە چاوم پێی کەوت گوتم دوو جار ئازا بووی. یەکیان لەو وەختەدا ئازا بووی کە بەرامبەر بە سەددام حوسێنی ئاوا دوای، یەکیشیان ئەو وەختە ئازا بووی کە پاش ئەوەی سەددام ڕووخاوە ڕۆژ هەتا ئێوارێ جنێوی پێ‌دەدەن، ئەتۆ خەسڵەتێکی باش کە دەوتدا دیوە باسی دەکەی.

بەڵام با ئەمەتیش ئەوەی بڵێم، دەوڵەتی عێراق خەرجی نەکێشاین. یانی لە هیچ جارەکاندا خەرجمان لەسەر دەوڵەتی عێراق نەبوو. عەکسی ئەوە بەشێک لەو ئەڵقەیەی لێمان نیزیک بوو وەکوو پارێزگاری، ئێمە خەرجی خواردن و تەداروکاتی ئەوانمان دەکرد. وەکوو ماددە هیچ کۆمەگی پێ نەکردین. بەڵام وەکوو پارێزگاری، دەکرێ بڵێم باشی کردو بە میلیۆن میلیۆنیش خەرجی بووە، ئەوانەی شارەزان دەزانن خەرجی تەیارەیەک کە هەر جارێ دەچێتە ئاسمان و سەعاتێک بە حەوا دەبێ چەندە.

**عەباس کاردۆ:** کۆنگرەی دوازدە دیسان مەیدانی دابەشکردنی دەسەڵات و شەڕی جەناحی بوو. لەو کۆنگرەیەدا دیسان لیستی ڕێبەرایەتی هاتە ئاراوە کۆمیتەی ناوەندی لەنێوان دوو قۆڵدا دابەش کرا. تکایە باسێکی گشتی لە هێنانی لیست بۆ کۆنگرەکان بکەو بەتایبەت چۆنیەتی دابەشکردنی قودرەت لە کۆنگرەی دوازدەدا.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** داستانی کۆنگرەی دوازدە، داستانێکی تایبەتییە. هیچ کەس لە موخالیفان و مواڤیقان ناتوانێ نکۆڵی لەو حەقایقە بکا کە باسی دەکەم. لەپێش کۆنگرەی دوازدەدا بە ماوەیەکی زۆر ئەمن لە کۆمیتەی ناوەندی ڕامگەیاند کە لەو کۆنگرەیەدا هەر بۆ کۆمیتەی ناوەندیش خۆم کاندیدا ناکەمەوە. بۆیەش لەنەکاو وا نالێم ئێستێ دەیڵێم کە بەهەمەموومان بیر بکەینەوە ڕێک کەوین کێ سکرتێر بێ. ئەوە لە کۆمیتەی ناوەندیدا وەکوو ئەسڵێک قەبووڵ کراو بڕایەوە. یانی قەبووڵ کرا کە ئەمن نابم. لەپاشان کە ئیدی ئەمن نابم، شەڕە جەناحەکە بەڕاستی بە قووەت بوو. ئەمن دوایە ئیستیلاحی سەرگرووهم بەکار دێنا. دەمگوت دوو سەرگرووهمان هەن: کاک مستەفای هیجری لە لایەک و کاک حەسەنی ڕەستگار لە لایەکی دیکە. دیارە هەرکەسەش ڕەفیقانی خۆیان هەبوون. لەوێدا بوو بە ململانەو کێشەیەکی زۆر هەبوو. هەوڵوتەقەلایەک هیچ، حەتتا ململانەی حوزووری. ئەمن ئەو شتانە بۆ مێژوو باس دەکەم. جارێکی لە کۆمیتەی ناوەندیدا دانیشتبووین. کۆنفرانسەکان گیرابوون. ئەو وەختی چەند کۆنفرانسی مەحدوودمان دەگرت، سێ(٣) مەڵبەند یان ناوەندمان هەبوون کە کۆنفرانسی خۆیان گرتبوو. دوو کۆنفرانس لایەنی کاک مستەفای بردبوویەوە. کۆنفرانسێک قۆڵی کاک حەسەنی بردبوویەوە. یانی ئەمن وام ناو دەبردن. کاک مستەفا ئیدی بەجارێک ئومێدی هەبوو ئێرەش بەرێتەوە(کۆنفرانسی دەرەوەی دەفتەری سیاسی). ئەو وەختی زۆرایەتیی بەدەست دەبوو. جارێکی هەر بە سەراحەت گوتی ئەمن سەتی حەفتاوپێنجی(٧٥%) کۆنگرەم پێ بێ، پێشی خەڵکم پێ ناگیرێ. یانی لێ دەدەم حەزف دەکەم.

کاک حەسەنی ڕەستگار لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی مەرکەزیدا - هیوادارم هەموو ویژدانەکان بە بێداری ئەگەر ڕۆژێک ئەوەیان خوێندەوە قەزاوەت بکەن - گوتی کاکە ئەرێ ئەتۆ چیت دەوێ؟ دەتەوێ بیی بە

سکرتێر مەبارەکت بێ. بەڵام ئەدی جێگری سکرتێر چی؟ گوتی مەعلوومە، جێگری سکرتێر نیزیکترین کەس لە خۆم دیاری دەکەم. بەهەرحاڵ لەپاشان کە کۆنفرانسی دەوروبەری دەفتەری سیاسی گیرا بەلایەکەی دیکەدا شکا. هەردووک لایان لیستیان هەبوو. وای لێهات ئیدی لیستەکە هەڵبژێرا. حەتتا لەسیستمی هەڵبژاردنەکەدا ئەوەشمان دانابوو کە خەڵک ئازادن. هەرکەس دەتوانێ دەنگ بە یەکێک لەو لیستانە بدا، یان دەتوانێ دەنگ بە ئەفراد بدا. هەرچەندە هەبوو لە هەر دووک لا کە دەنگی بە ئەفرادێک دەدا کە دە لیستی لایەکەی دیکەدا بوون، بەڵام ئەوە زۆر کەم بوو. لەئاکامدا ئەو لیستە لە موحیتی دەفتەری سیاسی سەرکەوت کە سەر بە کاک حەسەنی ڕستگار بوو. دیارە جەمعێکی زۆریش بوون، چونکی لە کۆمیتەی ناوەندییشدا زۆرایەتی هەر بەو لایەنە بوو، تەوازونەکە بەجارێک تێک چوو. ئیدی بوو بە ململانە.

لەپاشان هەردووک جەناحەکە هاتن بۆلای من گوتیان ئەتۆ ناتوانی بکشێیەوە، چونکی هیچ لایەک لە ئێمە لایەکەی دیکەی قبووڵ نیە بەڵام هەردووک لامان تۆمان قبووڵە. گوتیان ئەتۆ دەبێ مەسئوولییەت وەربگریەوە. تەنانەت کاک بابە عەلی، کە ئێستا دوای لەتبوونێ هەڵوێستێکی گرتوە کە دەگەڵ هیچ لایەک تەماوەو حیزبایەتی دەواقیعدا ناکا، سێ(٣)جار هاتە کن منو زۆر سادقانە گوتی ئەو حیزبەی نەجات بدە. بۆخۆت وەکیل بە چ بۆ من دادەنێی، حەتتا لە بنکەیەکی چووکەڵە بۆم دانێی چاپەزی بکەم ڕازیم. زۆریش بەسەداقەتەوە دەی گوت. چ ئەو، چ کەسانی دیکە کە دەهاتن، دەمگوت کاکە زەریی دەم بکەن نابمە دوکتۆر قاسملوو. بەڵام دوکتۆر قاسملوومان هەبوو دوو ئینشیعابی گەورەمان تێدا پێکهات. کەوایێ ئەمن بەتەنێ بۆم ناکرێ. وەرن دەست دە دەستی یەک بدەین با بەیەکەوە ئەو حیزبەی نەجات دەین.

بەکورتی- هەرچەند کورتیش هەر نابڕێتەوە- وای لێهات ئەمن قبووڵم کرد. بەڵام گوتم ئەگەر ئەوە بێ دەبێ ئیجازەم بدەن. گوتیان کەیفی خۆتە کێ دادەنێی دانێ. چۆنی بەش دەکەی بەشی کە. ئەمن گوتم بیستو سێ(٢٣) کەسان دەکەینە کۆمیتەی ناوەندی. یانی کۆمیتە ناوەندییەکی بیستوسێ کەسی هەڵ- دەبژێرین. ئەمن بێلایەنم. دوازدە(١٢) کەس بۆ ئەو بەشەی ئەکسەرییەتی پێیە. دە(١٠) کەسیش بۆ ئەو لایەنەی ئەقەلییەتی پێیە. ئەوانەی زۆرایەتی بوون ئیعتیرازیان کرد. هاتن گوتیان ئێمە ئەوەی قبووڵ ناکەین. گوتم هیچ مەجبوور نین قبووڵی بکەن. ئەگەر قەرارە ئەمن حەکەم بم، پێم وا نیە ئەقەلییەت دەبێ سەر ببڕدرێ، دەبێ حیسابی بۆ بکرێو بخوێندرێتەوە. ئەمن ئاوای تەقسیم دەکەم. ئەگەر نا دەچمە دەرێ چۆنی دەکەن بیکەن. حەزێ دەکەن یەک نەفەریشیان مەدەنێ. کە وامگوت ئەوان قبووڵیان کرد.

ئەوجار هاتن گوتیان باشە ئەو دە نەفەرو دوازدە نەفەرە ئەتۆ بۆخۆت دیارییان بکە. کێ دیاری دەکەی دیاری بکە.

**عەباس کاردۆ:** ئەقەلییەت بەو دابەشکردنە ناڕازی نەبوو؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەقەلییەت زۆر کەم ئیعتیڕازی کرد، چونکی عەدلی عومەری دە ئیسلامدا مەشهوورە، ئەگەر عومەریش هاتبایە ئاوای بەش نەدەکرد. ئاخر دەرکەوت وەختێکی ئەوان لە کۆنگرەی سێزدەدا ئەکسەرییەتیان کەوتە دەست، لە بیست و سێ (٢٣) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەشت کەسیان بۆ کەمایەتی دانابوون. یانی یەک لە سێیان دانابوو. لەحاڵێکدا ئەمن بە دوو ئەفەر تەفاوتەوە دامنابوو. جا هەردووک لایان هاتن گوتیان ئەو لیستانەی ئێمە چۆنی دادەنێی دانێ. بە هەردووکانم گوت دەزانم بۆ وا دەڵێن. هەرکام لە ئێوە وەعدەی بە ژمارەیەکی زۆر داوە. یارگیریتان کە کردوە پێتان گوتوون دەتان‌کەینە کۆمیتەی مەرکەزی. ئێستا ناتانەوێ بە کەس بڵێن ئێمە ئەتۆ حەزف دەکەین. دەتانەوێ ئەمن پیاوخراپ بم. باشە، لە پێناوی پاراستنی ڕیزەکانی حیزبی دێمۆکراتی کوردستاندا ئەمن ئەوەش قەبووڵ دەکەم. لەپاشان لە پەراتێزدا ئەوەش دەڵێم کە ئەوانەی ئەقەلییەت کردیانە مەثەلا کە فلانەکەس فلانەکەسی حەزف کردوە.

**عەباس کاردۆ:** یانی ئەتۆ لیستەی هەردووک لات نووسی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن لیستەکەم نووسی بەڵام یەک بە یەک بانگم کردن. هەم کاک حەسەن و هەم کاک مستەفام بانگ کرد. گوتم ڕاستە ئێوە ئاواتان کردوە بەڵام وەرن بە مەشوەرەت بیکەین. هەم دوازدە کەسەکەو هەم دە کەسەکەم بە مەشوەرەت دەگەڵ ئەوەی پێیەگوتن "سەرگرووە" دانان. بەڵام ئەوان لەسەر یەکێکی قسەیان هەبوو کە گۆیا ئەمن حەزفم کردوە. دنیایان تێ گەیاندو ئەوەشیان تێ گەیاند کە ئەمن حەزفم کردوە. ئەفەرەکەش کاک حەمە عەلی عینایەتی بوو. لە کۆبوونەوەیەکی دوای کۆنگرەدا ئەوەیان هەڵایساند. ئەمنیش بە قەولی فارسان ڕوودەستی‌یەکی باشم لێ‌دان. گوتم باشە خەتایەکە نی مەنە ئەمن حەزفم کردوە. بەڵام ئێستێ پێمەڵێن کێم لەجیاتی وی لابردبایە؟ یانی کێم حەزف کردبایە. ئەوجار زمانیان بوو بە تەڵەی تەقیو. چونکی دەبوو بڵێن دەبوو فلان کەست حەزف کردبایە ئەوجار بۆخۆیان پیاوخراپ دەردەچوون. گوتم وا نەبوە بەڵام با وای دابنێین وابووە، بەڵام بڵێن کێم لەجیاتی ئەو حەزف کردبا؟ ئیدی قرەی لێ‌نەهات.

لەپاشان کە ئەمن موتتەهەم کراو ئێستاش هەر تۆمەتبارم دەکەن کە جەناح بووم، بە تایبەتی ئەوانەی ئێستا موخالیفی منن، منیان بە جەناحەکەی دیکە داناوە. ئێستا ئەگەر ئەوانی دیکە گلەیی بکەن پتریان حەق هەیە چونکە بە پێچەوانە ئەمن پێشنیارێکم کرد. گوتم پێشنیار دەکەم کۆمیتەی ناوەندی ئەو لیستەی پەسند بکا. پێم وایە کۆمیتەی ناوەندی بە هەمووییەوە چل(٤٠) یان چل و دوو(٤٢) ئەفەر بوو. گوتم پێشنیار دەکەم ئەوانە لەپشت ئەو لیستە بن و لە کۆنگرەدا جارێکی دیکە دەنگ نەدەن. ئەوەم بۆچی کرد. لەبەر ئەوەی مەبادا برادەرانی ئەکسەرییەت بەخیلافی عەهدەکەی خۆیان بچن دەنگ بەوان نەدەن و ئەو دە ئەفەرە سەر نەکەون. یان

کەمتریان سەرکەوتنو دیسان برینەکان سەر هەڵدەدەنەوە. لە موقابیلدا خەلکەکەی دیکە ئازادە. ئەوان چلودوو کەس بوون. بەشدارانی کۆنگرەی سەدوچلو هەشت(١٤٨)کەس بوون. یانی خەلکی ئازاد دوو بەرابەری چل-ودوو نەفەری کومیتەی ناوەندی زیاتر بوون. ئەوانە ئازادن دەنگ بەو لیستە بدەن یان دەنگی بەربڵاو دەدەن کەیفی خۆیانە. یانی با ئەوەش مەعلووم بێ کە ئازادیی دەنگدان لە خەلکەکەی ئەستێندرابوو.

بەلام لە کۆنگرەدا کە کاندیدی دیکەش هەبوون ئەو کاندیدایانەی کۆمیتەی ناوەندی سەرکەوتن. چونکی بۆخۆی چلودوو رەئیی لەپشت بوو. تەوزیحیش درابوو کە ئەوە لەپێناوی چ دایە، بۆیە بەشی زۆری خەلکەکە دەنگیان بە لیستەکە داو سەرکەوت. یا ئەوەش بڵێین، دەنگەکەی لەکن ئێمە ماوە و فیلمەکەی لەلای ئەوانە. سووسەم کردو گوێیشم نامەوێ. بەلام کاک حەسەنی شەرەفی سێ رۆژانی کار کرد لەسەر دەستەگوڵێک هەتا ئامادەی کرد. کاک مستەفای هیجری بە پاداشی نەجاتدانی حیزبی دێموکرات، بە پاداشی پاراستنی یەکیەتیی ریزەکانی حیزبی دێموکرات ئەو دەستەگوڵەی لە رۆژی کۆتایی کۆنگرەدا دا بەمن. ئەمن کە مرخالیفانم لەقەبێکی شەریفیان داومێ، پێمدەلێن مەلا گرینۆک، لەخۆشیی ئەوەی بە گریانەوە گوتم ئەمن نابێ خەلات بکرێم. ئەمن گوڵم بۆ چیە، ئێوە دڵتان داوە بە من. باشترین خەلاتم پاداش بۆ من ئەوەیە کە یەک گرتووی حیزبی دێموکراتم نەجات داوە. ئێوە کە لەوەدا هاوکاریتان دەگەڵ من کردوە ئەمن پاداشی دیکەم ناوێ.

لێرەدا دوو حادیسە بڵێم چونکی ئەتۆش باست کرد کە ئەوە دەسەلات تەقسیم کراوە. ئەمن دەڵێم دەسەڵات دابەش نەکرا، حیزبی دێموکرات نەجات درا. لە نۆرویژی رەفیقێکی زۆر عەزیزم لە کۆبوونەوەیدا پێی گوتم کە گۆیا کورسی‌یەکان بەش کراونو تەوافوق کراوە. ئەگەر ئەوە راست بێ ئەمن زۆر بەداخم. ئەوە لە کۆبوونەوەی گشتیدا بوو. دەجوابەکەیدا گوتم ئەگەر جمهووریی ئیسلامی یان موخالیفانی دیکەی حیزب بەوەی قەلس بن یان بەداخ بن کە حیزبی دێموکرات یەکی گرتوە، هیچ سەیر نیە. بەلام زۆر شتێکی سەیرە کە تێکۆشەرێکی بە سابیقەی حیزبی بەداخ بێ لەوەی کە رێبەرانی حیزبەکەی رێک کەوتوونو حیزب لێک بڵاو نەبووە.

نموونەیەکی دیکە کە دەمەوێ لەو بارەیەوە بیهێنمەوە ئەوەیە: ئێمە کە چووین بۆ کۆنگرە، ئەو خەلکەی نەهاتبوون بۆ کۆنگرەی هەموویان دڵیان دەمستیدا بوو. هەموو پێیان وابوو ئەو حیزبە لەوێ لێک بڵاو دەبێ، ئێمە لەبەر ئەوەی ئەو کارانەمان کردبوون کۆنگرەکەمان بە سێ(٣) رۆژان تەواو بوو. کە رۆیشتین کەمینمان داناو زۆر بە ئیحتیاتەوە چووین لەترسی تیرۆرو شتی ئاوا. کە هاتینەوە گوتیان دەنێرین پێشمەرگەمان بۆ بێ‌و حیسابەتمان لێ بکەن. ئەمن گوتم کاکە ئەوەی ناوێ، هیچ کەس تەسەوور ناکا بەو وەزعەی ئێمە پێی هاتووینە کۆنگرەی بە سێ رۆژان تەواوی کەین. بڕۆن ماشێنی گەورە گەورە بگرن. یەکسەر سوار دەبینو

لەتەکاو دەچینەوە ماڵێ. چونکە جمهوریی ئیسلامی پێشبینی ناکا ئێمە ئاوا زوو دەچینەوە هەتا کەمینمان بۆ دابنێ. ڕاست وامان کرد. لێکڕا تەواوی ئەو خەڵکەی بە سێ ماشێنان هاتینەوە. ژمارەیەکی کەم مانەوە وەک تەداروکات کە دەبوو وەسایلەکان بێننەوە دەنا ئەوی دیکە هەمووی بە یەکەوە هاتنەوە. کە هاتینەوە، خەڵکە کە دیبوویان ئەوە سێ ماشێنی گەورە هاتن، ئەوەڵێ نیگەران ببوون کە باشە ئەوە دەبێ چ بێ هاتۆتە سەرمان. دوایە کە دیتبوویان ئەوە ئێمەین دادەبەزین، لێکڕا تێکشکابوون کە ئەوە حیزب لێک بڵاو بووە. یانی خەڵکە ئەوەندە تەسەووری ناخۆشیان هەبوو. دواتر کە دەرکەوت سەرکەوتووین زۆریان پێ خۆش بوو،

ئەمن زۆر جارم گوتوە بەڵام دەیەوێ بی‌لێمەوە. پاش چەند ڕۆژێک هاتین کۆبوونەوەیەکمان بۆ خەڵکی گرت. تەک هەر ساڵۆن جێگای هیچی نەمابوو، لە دەرەوەی ساڵۆنیش خەڵک ڕاوستابوون، هەموو هەر هاتبوون. ئەمن قسەم کردو جەرەیانەکەم بۆ باس کردن کە چۆن بووە. هەم باسی ئەوەم کردو هەم ئەو بڕیارەم خوێندەوە کە هەموو دەستە بەندی‌یەکی نهێنی تاوانە هەتا سەر حەددی خیانەت. کە ئەوەم خوێندەوە تەواوی ئەو خەڵکەی هەستانە سەر پێ، ناڵێم چەند دەقیقە بەڵام درێژترین چەپڵەی عومری خۆم کە دیومە لێ‌درا. بە هەموو مەسئوولییەتەوە دەڵێم حەتمەن زیاتر لە یەک‌لەسێی خەڵکەکە لەخۆشی‌یان دەگریان. ئیدی دوای ئەوە فەزایەک پەیدا بوو بەڕاستی فەزایەکی مەلەکوتی. ئەو خەڵکە ماتوچۆڕی یەکتریان دەکردو ناکۆکی‌یەکان لەبیر کران. ئەو هەوڵو تەقەلایە زاهیرەن بۆ ماوەیەک هەر بە تەواوی لەبەین چوو. دەتوانم بڵێم هەتا ئاخر ڕۆژی کۆنگرەی سێزدەش ئەو دەستە بەندی‌یە لەلایەن بەشەکەی دیکەوە نەبوو، دەنا خۆ ئەوانیش بێ‌دەسەڵات نەبوون ئەگەر کردبایان. بەڵام بە هەر حاڵ ناکرێ بڵێم بە کوللی لەبەین چووبوو. لەلایەکەوە بە تەواوی لەبەین چوو و لەلایەکەی دیکەوە هەر ئەو داستانەی وەختی خۆی دەیانگێڕایەوە لە حیزبی ئێمەشدا پەیدا بوو. دەیان‌گوت لە یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو جارێکی لە مەسئوولێکی حیزبی‌یان پرسیوە کە ئەوە چیە دەڵێن لە کۆمۆنیزمدا پارە(پووڵ) نامێنێ. کابرا وەڵام دەداتەوە کە: بەڵێ ئیفراتی‌یەکان دەڵێن نامێنێ، ڕێویزیۆنیستەکان دەڵێن دەمێنێ، بەڵام ئێمە وەک مارکسیست- لێنینستە واقیعی‌یەکان دەڵێین لەلای هێندێکان دەمێنێ و لەلای هێندێکان نامێنێ. ئەویش وابوو، لەلای هێندێکان نەمابوو بەڵام لەلای هێندێکان هەر مابوو. هەتا دوایە ئیدی وای لێ‌هات بەڵگە لەسەر ئەو مەسەلەیە دەر کەوت،

مەبەستم ئەوەیە هەرچەند زۆریشم درێژ کردەوە ئەوە ناکەوێتە خانەی دەسەڵاتبەش‌کردن. دەکەوێتە خانەی ئەجاتی حیزب، تەوافوقو تەفاهومێک کرا بۆ کارێکی موسبەت. هەوڵ‌کە ئەوە بوو جیناحبازی نەمێنێ. لەلایەک جارێ جیناحەکان ڕازی بکرێن هەر کەسە بە سەهمی خۆی، لەپاشان میکانیزمێک دروست بکەین کە جیناحبازی نەمێنێ. هەر ئەوەش بوو کە بۆ کۆنگرەی سێزدەش کاک بابە عەلی تەرحێکی هێنا کە هەڵبژاردنی کۆمیتەی مەرکەزی بە جۆرێک بێ کە ئەو جیناحبازی‌و یارگیری‌یە تەئسیری لەسەری نەبێ.

ئەوان جەناحبازی‌یەکەیان کرد بۆ ئەوەی لە کۆنگرەدا ئەو تەرحەی خرنسا کەنەوە. دیارە ئەوانیش هەوڵی لەبەین‌بردنی جەناحبازی‌یان دابوو، بەڵام میکانیزمی وان شتێکی دیکە بوو. برادەرێک لە دواکۆبوونەوەی پێش کۆنگرەی سێزدەدا گوتی ئێمە جەناح نایەڵین. جا ئەو برادەرە وەختی خۆی دەگەڵ جەناحەکەی دیکە بوو بەڵام ئەو سەفەرەی دەگەڵ ئەوان لێکی گرێ دابوو. گوتم ڕاست دەکەی. زەمانێک "عبدالكريم قاسم" گوتی ئەمن فەقیر لە عێراقدا نایەڵم. دوایە کە هاتە سەرکارو ئیختیلافات لەبەینی ئەوو هێزە سیاسی‌یەکان بەتایبەتی حیزبی شیووعی‌دا پەیدا بوو، شیووعی‌یەکان دەیان‌گوت ڕاستی کرد کە دەیگوت فەقیری نایەڵێ،ئەوە نیە هەمووی کوشتن. گوتم ئێوە ئاوا جەناح نایەڵن چونکە جەناحی بەرامبەر لەبەین دەبەن. بەڕاستییش هەموو هەوڵیان ئەوە بوو. جەناحی موقابیل دوو ڕێگای لەپێش بوو: کۆیلەتی یان ڕۆیشتن.

**هەیاس کاردۆ:** هەروەکی بۆخۆشت باست کرد لە بوونی دیاردەی جەناحبازی‌و لەبنەوەکارکردن بۆ بنکۆڵ کردنی لایەنی بەرامبەر ناڕازی بووی. بۆیە لە کۆنگرەی دوازدەدا بە ئیسراری تۆ بڕیارێکی تازە هاتە ئاراوە کە بۆ پێشیگری لە دەستەبەندیی نهێنی بوو. دەکرێ ئەو باسەو هۆیەکانی زیاتر شی کەیەوە؟ ئاکامەکەی چی بوو؟ واتە ئەو بڕیارە توانی چی بکا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بڕیارەکە ئەوە بوو کە گوترابوو هەموو ئەزو دەربڕینێک یان ڕەخنە گرتن لە هەرسیاسەتو دروشمێک یان هەر ئۆرگانو شەخسییەتێکی حیزب لە کۆبوونەوەکانی حیزبی‌و چاپەمەنیی نێوخۆی حیزبی‌دا ئازادە بەڵام لە موقابیلدا دەستە بەندیی نهێنی بە تاوان هەتا سنووری خەیانەت دەژمێردرێ. ئەوەش بە کۆی دەنگ بێ ئەوەی یەک دەنگی موخالیفی هەبێ پەسند کرا.

**هەیاس کاردۆ:** باشە هیچ سزایەک بۆ تاوانباران لەبەر چاو گیرا ؟ ئاخر خەیانەت تاوانێکی قورسەو هەربۆیە سزاکەشی دەبێ قورس بێ.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە ئیشارە کرابوو کە دەبێ توندترین سزای بەدواوە بێ. جا دوایە حاڵەتێک کەشف بوو کە لە کەرکووک لە دەوروبەری بنکەی ڕادیۆ ژمارەیەک خەریکی دەستەبەندین. (ئەوکات بنکەی ڕادیۆی دەنگی کوردستان لە دەوروبەری کەرکووک بوو کە دوایە هاتەوە لای خۆمان). شتەکە دەپێشدا هاتە کن من، کە ئەوەم زانی لە کۆمیتەی ناوەندی باسم کرد کە شتێکی ئاوا ڕووی داوە بێ‌ئەوەی ئادرەس بدەم. هەمووان قسەیان نەکرد، بەڵام هەرچی قسەی کرد مواقیق بوون کە ئەوە دەبێ بە توندی لی‌بدرێ. یانی سزای توندی بۆ دابنرێ. کە دوایە باس کرا کێ بوون، دەرکەوت سەر بەو جەناحەن. ئەوجار کۆمیتەی ناوەندی تەقسیم بوو. جەناحێک گوتی ئەوە دەبێ تەزەککوریان پێ بدرێ. جەناحەکەی دیکە گوتی دەبێ

دەریکرێن، ئەمن هاتمە پێوێ گوتم هاوڕێیان ئەو گوناحەی کراوە نە هێندە کەمە کە بڵێی بێ لوتفیتان فەرمووە، نە هێندەش گەورەیە کە بونیانی حیزبی دێمۆکراتی لەرزاندبێ. کەوابێ با سزایان بدەین بەڵام سزای دەرکردن نەبێ. پێموابێ پێنج(٥) کەس بوون. هەموویان سزایان بۆ دیاری کرا. وا بزانم یەک‌دوویەکیان بۆ ماوەی شەش(٦) مانگ لە ئەندامەتی هەڵپەسێردران، یەک‌دوویەکیان پلەیەکی کادرەیی‌یان لێ ئەستێندرایەوە یانی هاتنە خوارتر. شتێکی لەو بابەتە بوو. کەچی دوایە لە وەختی ئینشیقاقدا هەموویان موتتەفیق بوون، لە کۆبوونەوەدا بەگژ مندا هاتن کە ئەتۆ بۆچۆت لەسەر ئەوەی ئەوانە دوو قسەی نهێنی‌یان پێکەوە کردوە، پێنج کەست لە حیزب دەرکردن. گوتم بڕیارەکان ماون لە دەفتەردا نووسراون. هەمووشتان لەبیرتانە کە لە کۆمیتەی ناوەندی‌دا داستانەکە ئاوا بوو. بەڵام دوایە دەفتەری سیاسی بڕیارەکەی داوە تەک ئەمن. ئەو ئەعضایەش لەسەر پێشنیاری من بووە یەک نەفەریشیان دەرنەکراوە. جا کەسیان دەرنەکرا. دیارە هەبوون هەر لەوانە کە سزا درابوون ڕۆیشتن. ئەوە نایێتە دەرکردن چونکە زۆری ئەوانەی لە حیزب ڕۆیشتوون قەت سزا نەدراون.

**عەباس کاریزی:** خودی بڕیارەکە هیچ شتێکی دروست کرد کە خەڵکی لێی بڕەنگێنەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دەزانی چۆنە لەو جۆرە شتانەدا ئەوەی ڕەقیبە بە سەر ئینسانەوە، ڕەقیبی واقیعی تەنیا ویژدان و قەناعەتە. دەنا ئەوی دیکە هیچ شتێک مانیع نیە. هیچ شتێک ناتوانێ بەرگیرەوە بێ بۆ ئەوەی کەسێک کاری خیلاف نەکا. ئێستا مەسەلەن لە وڵاتانی دواکەوتوو، ئەگەر بێ‌ئەدەبی نەبێ لەخزمەتیان‌دا، موقەڕەراتی هاتوچۆ هەمووی لە خزمەتی ئینسانەکاندایە. لە چرای سوور مەدە، قایش‌کەمەرەکەت ببەستە، لە سورعەتی ئەوەندە زیاتر لێ‌مەخوڕە، ئەوانە هەموو بۆ خزمەت بە ئینسانەکانە. بەڵام چونکی قەناعەتە واقیعی‌یەکەی دەگەڵ نیە، زۆربەی شۆفێرەکان مادام پۆلیس دیار نەبێ خیلافەکەی دەکەن. دەبێ ویژدانی زیندوو و بەخەبەر ئەو خەڵکەی لەخیلاف بگێڕێتەوە.

ئەوان شەقیان لە بڕیاری خۆیان هەڵدا. چونکی وەک گوتم ئەو بڕیارە یەک دەنگی موخالیفی نەبوو. هەموان دەنگی موسبەتیان پێدا، بەڵام پێشی نەگیرا. چونکە ئەووەڵەن هەوڵ دەدرا نەمزانێ. کە زانراش سزایەکە دەستەبەندی بۆ کراوە بۆ ئەوەی کەم بێ. مەسەلەن هەر ئەوەی کاک مستەفای هیجری کە وەختی خۆی شتەکەی لێ‌دەرکەوت. لە کۆمیتەی ناوەندی‌دا کە ئەمن شتەکەم باس کرد، دیارە نازانم بڵێم چیی بەسەر هات بۆ ناڕەحەت بوون. ئەمن گوتم داوای سزای بۆ ناکەم بەڵام موستەحەقی هەموو سزایەکە چونکی موخالیفی بڕیارێکی ئاوایە، بۆیەش پێشنیاری سزام بۆ نەکرد چونکی ئەوەندەی کار کردبوو کە ئەگەر پێشنیاریشم بکردایە قەبووڵ نەدەکرا.

**هەیاس کاردۆ:** ئەو نامەیە چی بوو، چی باس کردبوو کاک مستەفا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو نامەیە هەمان نامەیە کە بۆ ئەفرادەکەی نووسیوە کە: دەبێ خۆتان ساز کەن، دەبێ بە ئامادەیی‌یەوە بێن، ئەو حیزبە وێرانە، هەتا ئەو ڕێبەری‌یە نەگۆڕێ هیچ نابێ. ڕەنگە لێم بپرسن بەرنامەت چیە، بەڵام هەتا ڕێبەری نەگۆڕێ بەرنامە نابێ. تەنیا دەبێ ڕێبەری بگۆڕێ. ڕێبەرییش لەباتیی خۆی‌دا دواقیعەدا تەنیا ڕێبەر بوو. چونکی ئەمن زۆرجارم ئەوە گوتوە لە کۆنگرەی سێزدەدا، بیست و یەک(٢١) نەفەر لە ژووری کۆنگرە هەڵبژێران. تاقە یەک نەفەریان لەوانە بوو کە دە کۆنگرەکانی پێشتردا نەبوو. ئەویش هەر لە کۆنگرەی دوازدەدا نەبوو دەنا پێشتر هەبوو. کەوابوو ڕێبەری نەگۆڕاوە، تەنیا ڕێبەر دەبێ بگۆڕێ کە ئەمن قەت خۆم پێ ڕێبەر نەبووە بەڵام ئەو خۆی پێ ڕێبەرە. جا ڕەفیقێکمان نامەیەکی بۆ نووسیبوو، با ئەو ناوە سەبت بێ چونکی ئیفتیخارە (کاک ڕەحیمی قادری) بوو. ئاخر ئەو لەو کەسانە بوو کە ئەو نامەیەی بۆ ناردرابوو. نووسیبووی پێم سەیرە کە ئەتۆ دەڵێی بەرنامە هیچ نیە. ناوی ڕێبەری حیزبێکی ئیسپانیایی هێنابوو کە دەڵێ بۆ سەرکەوتن ئێمە سێ شتمان پێویستن: یەکەم بەرنامە، دووهەم بەرنامە، سێهەم بەرنامە. کەچی ئەتۆ دەڵێی بەرنامە هیچ نیە هەر دەبێ ئەفەرەکان بگۆڕین. ئەفەرەکانیش نەگۆڕان. شتەکە هەر ئەوە بوو کە دەبێ ئەو بێ. ئەوە لەحاڵێک‌دا بوو کە بۆی مسۆگەر بوو، قانوونە، یەندی ئەساسنامەیە کە ئەمن ئەگەر بشمهەوێ ناتوانم بیمەوە. لە کۆنگرەی دوازدەدا گوتیان دەی‌گۆڕین. گوتم دەی‌گۆڕن کەیفی خۆتانە بەڵام ئەمەنی من لە حیزبی دێمۆکرات‌دا بەقەد عومری ئەو ماددەیەیە. ئەو ماددەیە لاچوو ئەمنیش لادەچم.

**هەیاس کاردۆ:** لە کۆنگرەی دوازدەدا ئەسڵێکی دیکەش پەسند کرا کە پێشی بوونی کەسێک بە سکرتێری حیزب دوای دوو دەورەی دەگرت. واتە هەرکەس دەی‌توانی تەنیا دوو کۆنگرەی بەدوای یەک‌دا لەو بەرپرسایەتی‌یەدا بێ. قازانجی ئەو کارە چی بوو؟ وا بزانم تۆ لەو بارەیەوە زۆر کەوتوویە بەر گلەیی چونکە ئەوەش بە ئیسراری تۆ بوو. قسەی ئێستات لەو بارەیەوە چیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێموایە جەنابت بە هەڵە ئەوەت گوێجاندوە. ئەو بڕیارە لە کۆنگرەی یازدەدا پەسند کرا نەک دوازدە. لە کۆنگرەی یازدەدا دامان نا، بۆیەش ئەمن توانیم لە کۆنگرەکانی یازدە و دوازدەدا بیم. چونکە ئەمن لە کۆنگرەی دەش‌دا هەر سکرتێر بووم بەڵام وەکی دەڵێن قانوون عەتف بە ماسەبەق ناکا، ئەوە وەبەر نەدەکەوت. ئەو فکرە دەمێک‌دا زۆر کۆن بوو. بەڵێ ئەوەش ئی منە. لە زەمانی دوکتۆر قاسملووی‌دا، دوو جار یان ئیحتیمالەن سێ جاریش بە شەخسی دوکتۆر قاسملووم گوتوە کە خۆزگە یەکێکم شک بردبایە کە وەک تۆ نەبا بەڵام زۆریش لەتۆ خوارتر نەبایە. ئەودەم هەموو کارێکم دەکرد بۆ ئەوەی نەبیەوە بە سکرتێر. کە دەی-

پرسی بۆ، دوو جوابم دەدانەوە: یەکێکیان شۆخی بوو، دەمگوت بزانم ئەتۆ هەر سکرتێری دەکەی یان حیزبایەتییش دەکەی. بەڵام دوایە تەوزیحم دەدا. دەمگوت هەموو خەتەرەکان لەسەر تۆن. هەموو ئومێدەکان بە تۆن. خەڵکی دیکە پەروەردە نابێ. بەڵام ئەگەر دەستاودەست بکا هەم خەڵک بە لەبەینچوونی سکرتێر بێ هیوا نابن هەم دوژمن هەموو هەوڵەکانی بۆ شتێک نابن، هەم خەڵکی دیکە پێ دەگەن.

بەڵام ئەوەم قەت عەمەلی نەکرد هەتا دوکتور قاسملوو شەهید بوو. کە ئەو شەهید بوو لە چزکی خۆم دڵو گوتم بریا هەر وامان کردبایە. چونکی بەڕاستی هەروەک جارێکی دیکەش باسم کرد دوکتور شەرەفکەندیی شەهید دنیای بەسەردا ڕووخا. چونکە هەم ماوەکەی دەرێبەری‌دا کەم بوو و هەم ئەو ماوە کەمە کە جێگری سکرتێریش بوو بە حوکمی ئەوەی کە دوکتور شت دەزانی‌و دەتوانی کارەکان ڕابەرێنی، زۆر هەوڵی نەدەدا لەوێ بێ‌و ئاگای لە کارەکان هەبێ. بۆیە لەنەکاو مەسئوولییەتێکی ئاوا قورسی بەسەردا باری بێ ئەوەی ئاگای لە جوزئیات‌و سەوابیقی کارەکان هەبێ. ئەوەش دیارە زۆر سەختە بۆ کەسێک کە ڕێبەری حیزبێکی گەورەو گرانی بە ئەستۆوە بێ، ئەویش لە هەلومەرجێک‌دا کە ئەو حیزبە دەگەڵ خەباتێکی سەخت‌و خوێناوی بەرەوڕوویە.

دوایە لە ڕۆژانی پێش کۆنگرەی نۆدا ئەمن چوومە لای دوکتور سەعیدی. گوتم دەڵێی لەئێستاڕا ئیمزا بکەم هەتا ئەمن هەم نیمە هیچ کۆنگرەیەک. بەڵام با تەرحێکی ئاوا لە ئەساسنامەدا بگونجێنین کە هیچ کەس لە دوو دەورە زیاتر نەتوانێ وەک سکرتێر کار بکا. دوایە دەورەیەک ئەو لادەچێ‌و یەکی دیکە دێ. بۆ دەورەی دواتر ئەگەر حیزب بە مەسڵەحەتی زانی دووبارە دەی‌هێنێتەوە. بەڵام هەتا ئەو وەختەی یەکێک هەر دانراو هەر سکرتێر بێ، لانی کەم لە کۆمەڵی ئێمەدا، نە خەڵکێکی دیکە دێ خۆی کاندیدا بکا، نە ئەو کەسانەی دەنگ دەدەن بە بوونی یەکێکی دیکە دڵیان ئاو دەخواتەوە، پێیان وایە هەر دەبێ ئەو بێ. بەڵام ئەگەر بوو بە ئیجباری‌و لاچوو، سبەینێ ئەگەر دەنگیان بە سکرتێری دەورەی پێشوو دا، زۆر بە ئیقناع‌و باوەڕەوە ڕەئیی پێ دەدەن. چونکە ئەوە کراوە هیچ ئیشکالیشی نەبووە.

کە ئەوەم بە دوکتور سەعیدی گوت، گوتی موافیقم بی‌گونجێنە. ئەمن ئەندامی کۆمیسیۆنێک بووم کە پێڕەو پڕۆگرامی دەنووسیەوە. پێموایە ڕۆژێکی پێوە خرا یان دوو ڕۆژ، بانگی کردم گوتی مەی‌گونجێنە. گوتم بۆ؟ گوتی لە دەفتەری سیاسی‌دا باسم کردوە موخالیفن. گوتی با هەڵلای لێ ساز نەبێ. ئەمنیش فکرەکەم هەر دەگەڵ وی باس کردبوو. کە ئەو پێی مەسڵەحەت نەبوو نەم‌گونجاند. دوایە لە کۆنگرەی یازدەدا بۆخۆم سکرتێر بووم، بە مانایەک ئەو شتە لەزیانی خۆم بوو بەڵام کردم. بۆ پەسندکردنی ئیسرارێشم لەسەر کردو بۆیە بڕیاری لەسەر درا. دیارە زۆر کەس موخالیف بوون بەڵام بۆیە لە کۆنگرەی یازدەدا پەسند کرا کە پێیان وابوو هەتا کۆنگرەیەکی دیکە دەچێتە ملکی یەکی دیکە. لە کۆنگرەی دوازدەدا زۆریان ئیسرار کرد

کە هەڵبگیری، گوتم ئەگەر لەبەر منتانە، ئەمن لەئێستاڕا ئیعلام دەکەم لەپشتی میکرۆفۆن کە عومری من لە حیزبی دێمۆکراتدا بەو ماددەیەوە بەستراوەتەوە. ئێستێ لای بەرن، ئێستێ بەیەکجاری لە حیزبی دێمۆکرات دەڕۆمە دەرێ. ئیدی کە هەڕەشەیەکی ئاوام کرد شتەکە بوو بەجیددی و قبووڵیان کرد.

لەسەر ئەوەی ئێستێ ڕەئیم چییە، هەرچەند ئینسان دەگۆڕێ بەڵام ئێستا وا فکر دەکەمەوە کە هەتا دنیا دنیایە لێی پەشیمان نابمەوە. پێموایە کارێکی باشم کردوە.

**هەیاس کاردۆ:** لە کۆنگرەی دوازدەشدا بوویەوە بە سکرتێری حیزب و وەکی دیار بوو کەست بۆ ئەو بەرپرسایەتی‌یە لە بەرامبەردا نەبوو. هۆی ئەوە بۆ چی دەگەڕێنیەوە و خۆت چۆن ساز کرد هەتا دیسان لەنێو قۆڵەکان دا هاوسەنگی بکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن خۆم بۆ هیچ ساز نەکرد. هەموو گوتیان دەبێ بیکەی بۆیە کردم. وەکی عەرزم کردی ئەو میکانیزمەم دانابوو. لەباری هاوسەنگییشەوە داستانەکە زۆر درێژ دەبێتەوە دەنا ئەگەر ڕۆژێک بێیتە سەر ئەو باوەڕە ئەمن لەزۆر جێیانم هەوڵ داوە و چەند جاریش حەتتا بە ئیعلانی ڕەسمی ئیعلانم کردوە کە با بێن بە حوزووری چەند حەکەم. تەنانەت دەمگوت دوو حەکەم لە هەرحیزبێک، لە هەرمیللەتێک، لە هەرمەزهەبێک، لە هەرزمان و وڵاتێک، ئەگەر ئەوان قبووڵیانە ئەمن قسەی لێ ناکەم. تەنیا شەرت ئەوەیە ئەو دوو کەسە هەم لە حیزبایەتی بزانن و هەم بتوانن حاڵی بن. قسەکانمان بۆ ئەوان باس دەکەین با بزانین کێ خەتابارە.

بەینی سێ دەورە کە لە نۆ ساڵ زیاتر و دە ساڵیش تەواو نەبوو کە ئەمن سکرتێری حیزب بووم. دوو، سێ جار بە کاک مستەفای هیجریم گوتوە پێش لەتبوونێ. ئەوە دوای کۆنگرەی سێزدە بوو. ئەمن ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی نەبووم بەڵام دەگەڵی دادەنیشتم. دەمگوت ئێوە پاش کۆنگرەی دوازدە کارێکتان کرد کە هەر بە دەنگی خۆتان بە تاوانبار هەتا سەرحەددی خەیانەت دەناسران. چونکی خۆتان بە مەغدوور دەزانی و پێتان وا بوو وەکوو کەمایەتی غەدرتان لێ کراوە. ئێوە ئێستا بۆخۆتان ساغ بنەوە لەکام کۆنگرەدا بەشێکی زۆر کەمتان درابوویە وەکوو ئەقەلییەت. ئەوەی لەو کۆنگرە خەراپەدا بۆتان دانرابوو، ئێستا ئەوەی بدەن بە ئەقەلییەتی ئێستا، هەرکەس پێی خوار دانا ئەمن مۆری خەیانەتی لە نێوچاوانێ دەدەم. گوتی ئەمن نای کەم، ئەمن ئەکسەرییەتم. دەی گوتم کاکە ئەتۆ وەختێک ئەقەلییەت بووی ئەوان ئاوایان دەگەڵ تۆ ڕەفتار کردوە ئێستا ئەتۆ بۆ وا ناکەی؟

ئەمن لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە سکرتێر بووم قەت هەوڵم نەدا ئەقەلییەت هەست بە مەغدووری بکا، یان پێی وابێ لە حیزبدا بێگانەیە. با نموونەیەکت بۆ بگێڕمەوە لە پێوەندی‌یەکانی دەرەوە. دوای کۆنگرەی دە

جارێکی بیستمەوە کە ژن و کچەکانی کە لەماڵ لەولا بوون پێکەوە دانیشتوون. یەکێک لەوانەی کە لەولا بوو گوتبووی ئەری خوشکێ بەچی دەزانن هەروا بەشۆخی. گوتبووی هەتانەو ئێتانە سکرتێرێکی ڕەق وڕووت. جێگری سکرتێر لەمەیە. بەرپرسی پێوەندی‌یەکانی سلێمانی ئی مەیە. بەرپرسی پێوەندی‌یەکانی هەولێرێ ئی مەیە. بەرپرسی پێوەندی‌یەکانی بەغدایە ئی مەیە. بەرپرسی تەشکیلات ئی مەیە. بەرپرسی پێوەندی‌یەکانی پاریسێ ئی مەیە. هەمووشی ڕاست دەکرد.

لەپاشان هەر لەو پێوەندی‌یەدا نموونەیەکی دیکە هاتە پێش. شۆفێرێک کە هاتوچۆی بەغدایەی دەکرد کە ئەویش بەشێک لە پێوەندی‌یەکان بوو، بەدڵنیاییەوە دەبوو لابچێ. یادی بەخێر کاک بابە عەلی دوو جار هاتە لای من و برادەرێکی پێشنیار کرد گوتی با ئەوی لە جێگا دابنێین. ئەو کەسە سەر بەو جەناحەی بوو و کاک بابە عەلی بۆخۆشی هەر لەوان بوو. ئەمن کەسێکی دیکەم لە نەزەردا بوو، بۆیە بە یەندگی تێپەرم دەکرد. بۆ جاری سێهەم هاتەوە گوتی ئەری جوابەکەت نەدامەوە. گوتم کاک بابە عەلی ئینساف باشە. تەواوی مەسئوولیەتی پێوەندی‌یەکانی دەرەوە لە ئێوەن. شۆفێرێک بە جەناحەکەی دیکە ڕەوا نابینن؟ دە با ئەو شۆفێریش لەوان بێ، تاقە یەک شۆفێر. ئەمن ئاوام قسە دەگەڵ دەکردن.

ئەمن زۆر جارم گوتوە جا پێی بڵێن دڵ‌گەورەیی، پێی بڵێن پیاوچاکی، پێی بڵێن ئەزاتی، پێی بڵێن دەم-چەوتی، هەرچی پێی دەڵێی بڵێ. بەڵام ئەوی ئەمن لەو بارەیەوە کردوومە لەتاریخدا نموونەی نەبووە. مەسەلەن بۆم باس کردی لە کۆنگرەی نۆ بۆ دە دەفتەری سیاسیمان پێنج کەس بوو. چواریان لایەک بوون ئەمنیش بە تاقی‌تەنێ لایەک بووم. کە چووینە کۆنگرەی دە دەمتوانی وا بکەم- هەر ئەمن دەنگم دابا وای لێ‌دەهات وەکی لە کۆنگرەی سێزدەدا ئەوان کردیان- کە کێمان پێ‌خۆش بوویا حەزفمان کردبا. ئەوەمان نەکرد هیچ، هەموو ئیسرارم بوو کە دەفتەری سیاسی وەک خۆی هەڵبژێرایەوە دەقاودەق. ئەمن لایەک چوار ئەندامی دەفتەری سیاسی لایەکی دیکە. ئەوەی پێشیان دەگوت ڕەقیب ڕەقیبەکەش زۆرم ئیسرار کرد کە بکرێتە جێگری سکرتێر.

**عەباسی کاروان:** جا شتێک هەیە پێم‌باشە باسی بکەم دۆستانی تۆ لەنێو حیزبدا، ئەوانەی بەهەر حاڵ ڕەنگە زیاتر لەو جەناحەدا بوون کە لە قۆناغی جۆراوجۆردا پشتی تۆیان گرتوە پێیان وایە ئەتۆ غەدرت لێ کردوون و پشتت بەردان. لە بەرامبەردا پێیان وایە ئیمتیازی زیاترت داوە بە جەناحی بەرامبەری ئەوان. ئەوەت قبووڵە؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** پێموایە ڕاست دەکەن. وەختی خۆشی هاتوون و دەگەڵ خۆم باسیان کردوە. لە دوای کۆنگرەی دە زۆر کەسیان دەهاتن دەیان‌گوت خەڵک دەڵێن هیچ شتێک نەگۆڕاوە هەر سکرتێر گۆڕاوە. دەم-

گوت بۆ دەڵێی خەڵک دەڵێن بڵێ بۆخۆم دەڵێم خۆ تاوان نیە حەقتە بیڵێی. بەڵام نەخێر گۆڕان یەکجار زۆرە. ئەگەر سکرتێری پێشوو بایە هەرچی ڕۆژێکی موخالەفەت کردبوو لێی دەدا. بەڵام ئەمن دەڵێم ئەوانە دەبێ بگێڕنەوە نابێ لێی‌بدرێن. گۆڕانی جەوهەری ئەوەیە. دەنا کاک مستەفای هیجری بە دووسێ مانگ بەر لە کۆنگرەی ١٥، جارێکی لە کۆمیتەی ناوەندی‌دا هەڕەشەی لەمن کرد کە وەدەرم دەنێ. ئەوکات ئەمن بە حیساب جێگری وی بووم. مەسەلەکە چۆن بوو؟

جارێکی مەسەلەی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ هاتە پێشێ کە ئەمن لە ڕۆژی ئەووەڵەوە موخالیفی ئەو بایکۆتە بووم هەتا ئاخر. جا ئەوجارەش هێنامەوە گۆڕێ‌و گوتم عەیبە. هەر واشم گوت کە بۆ ئێوە عەیب نیە بانەو بان لەبەر لادەران هەڵدێن؟ ئەوی دیکە تەعبیری قسەکەیە. چونکی گوتم وەکوو پەپرەوی هەرچەند پێم‌خراپ بوو بەڵام بەکارم دێنا. مەسەلەن کابرا دەچووە ڕانیەو دەگەڵ ڕەفیقێکی ڕادەوەستا کە دەگەڵ ئەوان بوو. جا کە دەهاتەوە قوربان جەڕەبابەیان دەداو هەڵیاندەپێچا کە بۆ دەگەڵ ئەوەی ڕاوەستاوی؟ هەر وەک ئێستاش ئەوەی دەکەن. دەمگوت ئەوە بۆ ئێمە عەیبە. بە هەرسووڕەت لە کۆمیتەی مەرکەزی‌دا پێشنیارەکە ڕەت بۆوە. برادەرێکی دەفتەری سیاسی گوتی ئەمن پێشنیار دەکەم کۆمیتەی ناوەندی بڕیار بدا کە لە کۆمیتەی ناوەندی‌دا جارێکی دیکە باسی لادەران نەیەتەوە گۆڕێ. گوتم وا دیارە دەتانەوێ زمانمان ببڕن.

**هەیاس کاردۆ:** باشە مامۆستا ناوی ئەوانە بۆ ناهێنی؟ مەگەر ئەوە بەشێک لە مێژووی ئەو حیزبە نیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەبەر شتێک ناوم نەهێنا بەڵام بیشی‌هێنم تاوان نیە. کاک سەید سەلامی ڕەحمەتی بوو. گوتم زمانم دەبەستن؟ هەتا هەناسەم بێ زمانیشم دەگەڕێ لەوەی خاترجەم بن. کاک مستەفا گوتی بابە ئەوەی ناوێ دوو مانگی ماوە. یانی وەک کورد دەڵێ (بە پەڕۆیەکی پیس کلکی دەگرین وەدەری دەنێین) ئیدی. جگە لەوە هیچ مانای دیکەی نەبوو. کۆنگرە گیراو دەفتەری سیاسی هەڵبژێرایەوە. جارێکیان لە دەفتەری سیاسی‌دا باسمان کرد. گوتم ئەتۆ ناوا بووی. ئەگەر ئەتۆ لە کۆنگرەی دەدا سەرکەوتبای، ئەو نیەتانەت جێبەجێ دەکرد. لەبیرتە ئەو قسەیەت کرد؟ گوتی قەت شتی وام نەگوتوە. ئەمنیش ڕووم کردە برادەران پرسیم خۆتان‌و ویژدانتان کاک مستەفا ئەو قسەیەی کرد یان نەی‌کرد؟ بۆ حەقیقەتو تاریخ هەر سێکیان، مەرحوومی کاک سەید سەلام، کاک بابە عەلی‌و کاک حەسەنی شەرەفی گوتیان وەڵڵا کاک مستەفا گوتت. گوتی مەبەستم ئەوە نەبووە. گوتم باشە ئێستا پێم بڵێ مەبەستت چ بوو؟ ئیدی زمانی بوو بە تەڵەی تەقیو، چونکە هیچ مانای دیکەی نەبوون. کاکە ڕاوەستن دوو مانگی ماوە یانی بەڵێ دوو مانگی دیکە دەچینە کۆنگرەو ئەوەی ئەو خەتەی هەیە نایەڵین هەڵبژێرێتەوە. لای‌دەبەین‌و تەسفیەی دەکەین.

# لەتبوونی حیزبی دیموکرات لە ساڵی ١٣٨٥(٢٠٠٦)دا

**عەبباس کاردۆ:** دوای کۆنگرەی دوازدە وا دیار بوو دیسان جەناحبەندی‌و دەستەبازی پەرەی گرتەوەو ئەمجارەیان شکڵی دیکەی بەخۆوە گرت. درێژەی ئەو ڕەوتە لە کۆنگرەی سێزدە دا تەقیەوەو دواتر حیزبی لەت کرد. تۆ وەک سکرتێر هەتا چ ڕادەیەک خۆت لەو دەستەبەندی‌یەدا بەشدار بووی‌و لە تێکۆشانی لایەنی بەرامبەر چیت دەزانی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن لە ئەوەڵەوە گوتم هەتا دوای کۆنگرەی سێزدە(١٣) ئەمن لە جەناحدا نەبووم. هەستیشم بەو هەوڵانە دەکرد کە وەک جەناح دەدرێن. مەسەلەن جارێکی لە تۆروێژی بووم باسیان کرد گوتیان دەڵێن لەنێو ڕێبەری‌و بەدەنەدا ئیختیلاف هەیە. گوتم شتی وا نیە. یەکێک هەستا گوتی هەر لەخۆڕا وا دەڵێن. ئەمنیش گوتم بەقوربان ئێمە بڕیارێکی ئاوامان هەیە. دەی ئەگەر ئێوە پێتان ناخۆشە ئیختیلافمان هەبێ هەرکەس هات باسی ئەو ئیختیلافەی بۆ کردن بڵێن چیە. ئەگەر نەی گوت بڵێن درۆیە دەکەی. ئەمن کە دەڵێم ڕاست دەکەم چونکە ئەمن ئیختیلافم دەگەڵ هیچ کەس نیە. جەناحبەندی‌و ململانێم دەگەڵ کەس نیە. دەباشە ئەوەی دێ وا دەڵێ دەپێشدا لێی بپرسن دەڵێ چی یا دەلایەکەی بڵێ. خۆ ئەوان قەت بەئاشکرا قسەیان نەکرد. دەستەبەندی‌یەکیان موتڵەقەن نهێنی بوو.

ئەمن هیچم نەزانیبوو هەتا چەند مانگ بەر لە کۆنگرەی ١٣. لەدەرێ بووم کە ئەوەم دەست کەوت. ئەمن جارێکی دیکە گوتم، دووبارە دەی‌ڵێمەوە، ئەو برادەرانەی ئێستێ دەگەڵیانم پێکەوەین ئەگەر گلەییم لێ‌بکەن حەقیانە چونکی شتی ئاوا زۆر بووە. لەوێڕا بەکەسم نەگوت. هاتمەوە ئێرەش‌و هەتا پلێنۆم پێکهات لانی کەم مانگ‌و نیوێکی پێ‌چوو دەگەڵ یەک نەفەر نە بە ئیماو ئیشارەو نە بە سەراحەت باسم نەکردو ئەو نامەیەم نیشان نەدا بۆ ئەوەی لەسەر من نەیێتە دەستەبەندیی نهێنی. چونکی پێم خەیانەت بوو و نەشم دەویست خەیانەت بکەم. ڕاست لە کۆمیتەی ناوەندی‌دا بە حوزووری هەموویان ئاشکرام کرد. ئەگینا یەک کەسیش لێی نەبیستبووم. ئەوانە کە بڵێن پێشی پێ نەگرتن یان لێی نەدان بەڵێ ڕاست دەکەن. بەڵام ئەمن هەمیشە دەلیلم ئەوە بوو، بەتایبەتی دوای کۆنگرە، کە دەم‌گوت ئەوەی کاک مستەفا هیجری دەیکا وەک "ئەوەی دەرکەو ئەوی لابەرو ئەوی دیکە چ لێ‌بکە"، ئەوە باشە؟ ئەگەر باشە گلەییتان لێی چیە. ئەمن بە یابەوش بەرم

ناتوانم ئاوا چاکی بکەم. یانی ئاوا لە موخالیفانو جودابیران بدەم. ئەگەر پێتان وایە ئەوکارە خراپە بۆ چاوەڕوانن ئەمنیش بیکەم. ئەمن کە پێم خراپ بووە نایکەم. دەنا ڕاست دەکەن.

ئەمن لە فورسەتێکی دیکەدا پێت نیشان دەدەم کە چۆن دەستیان بە لابردنی خەلکی کرد. مەسەلەن هەر لە تۆرگانێکی زۆر چووکەلەی وەک شەهیدان، دوو تەفەری ئەولایەیان لابردن بە بیانووی ئەوەی کە شەهیدان کادری زۆرە. کەچی دوو ڕۆژی پێوە خرا دوو کەسی خۆیان هێنا دایان نان.

**هەیاس کاردۆ:** ئەو نیقشاگەری‌یە لە ئاخرین پلینۆمی پێش کۆنگرەی سێزدەدا بوو یان وەختێکی دیکە بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەی کە ئەمن زانیم عەرزم کردی لەدەرێ بووم دوایەش کە هاتمەوە مانگ‌و نیوێکی پێوە خرا هەتا باسم کرد. بەڵام وا بزانم ئاخرین پلینۆمی پێش کۆنگرەی سێزدە نەبوو. وام لەبیرە یەک پلینۆم لەپێشتر بوو. چونکی دەگەڵ ئەوەی تەزەرمان ئەوە بوو کۆنگرە زووتر بگیرێ، وای لێ‌هات کۆنگرە درەنگتر لە وەختی خۆی گیرا. بۆیە پێموایە پلینۆمی دیکەشمان پێک‌هێنا.

**هەیاس کاردۆ:** ئەو شتەی بلاو بۆوە کە گۆیا جەنابت لە پلینۆمێک‌دا یان کۆبوونەوەی دەفتەری سیاسی-دا بووە چی بووە نازانم پێشنیارت کردوە کە وێنەی شەهیدان جگە لەوێنەی قازی موحەممەدی هەڵناوەسرێن، ئەوە پێش ئەو نامەی بوو یان دواتر بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە زۆرزۆر پێشتر بوو. یانی یە ساڵ‌و دوو ساڵ پێشتر بوو. ئەمن پێشنیارێکم کرد. پێموایە ڕۆژێک لەڕۆژان ئەوە هەر دەچەسپێ ئەگەر زەمینەیەکی سالم هەبێ حەتمەن دەچەسپێ. پێشنیارەکە ئەوە بوو کە گوتم ئەگەر ڕۆژێک لە وڵاتی خۆمان بارەگای حیزبیمان هەبێ زۆر بەجێ‌یە عەکسی هەموو ئەندامانی کۆمیتەی مەرکەزی، تەنانەت ئەوانە کە شەهیدیش نەبوون، لەحەجمێکی یەک لە یەک‌و نیو میتردا گەورە کەینەوەو دەگەڵ شەرحی حاڵێکی چووکە لە ژیانیان، لە کۆریدۆرەکانی ئەو بارەگایە هەڵیان واسین بۆئەوەی خەلک وەک تاریخی حیزب بیانناسێ. بەڵام ئەگەر وەکوو سێمبول لە هەموو ژوورێکی کاری حیزبی دابنرێ، تەنیا یەک وێنە باشە. گوتم لەنێو ئەو سێ ڕێبەرەدا هەرکامێکتان پێ باشە با ئەوی دابنێین. ئەمن بەش بەحاڵی خۆم پێموایە پێشەوا باشە چونکی پێشەوای دوکتۆر قاسملووش بووە، ڕێبەری ویش بووە بەڵام ئەوانی دیکە هەر ڕێبەری ئێمەن. ئیستیدلال کراو پەسند کرا کە نەخێر ئەو شتە با هەر ئاوا بمێنێ. هەتا ئەو ڕۆژە ژوورەکەی من تەنیا عەکسی پێشەوای لێ‌بوو. هەر لە جەلەسەی کومیتەی ناوەندی هەستاین چووم بە کوڕەکانی سکرتاریام گوت کە عەکسی دوکتۆر قاسملوو و دوکتۆر سەعیدیش هەر سبەینێ بێنن لێرە هەڵیانواسن. ئیدی هەر ڕۆژی دوای ئەوەی کە بوو بە بڕیاری کۆمیتەی ناوەندی لە ژوورەکەی من

عەکسی دوو شەهیدەکەی دیکەش هەڵاوەسران، خۆ ئەوە نەبوو دوژمنایەتی دەگۆڕیدا بێ. ئێستا لەم ژوورەی لێی دانیشتووین ئەمن عەکسی پێشەوام هەیە کە چوار پێنج ساڵە بە دیواری داویانمێ دەتا بە حەیاتم لە ماڵێ وێنەی پێشەوام هەڵنەواسیوە، دەگەڵ هەموو ڕێز و حورمەتەکەم بۆی، چونکی پێشەوام نەدیوە. بەڵام بیست ساڵ لە نێزیکەوە دەخزمەت دوکتور قاسملوویدا بووم جگە لەوەی ڕێبەرم بووە ڕەفیقیشم بووە. ئەوە لە ماڵێ، چونکە لە ماڵێ کەیفی خۆتە عەکسی کێ هەڵدەواسی. بەڵام لە شوێنی کار ڕەسمیاتە پێموابوو دەبێ عەکسی پێشەوای هەڵواسم. لە ئیدارەی هەتا ئەو وەختی عەکسی دوکتور قاسملووم هەڵنەواسیبوو. جا ئەوە دوایە بوو کە ئەو داستانەیان لەسەر دروست کرد.

**عەبباس کاروخ:** ماموستا بەو حیسابە کە داستانی ئەو عەکسانە زۆر پێش ئینتشای ئەو نامەیە بووبێ کەوابوو جەناحبەندییەکە هەر هەبووە. ئینتی شاردنەوەی لەلایەن ئێوەوە چ مانای هەبوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوان ئەو کات نەدەهاتن بە ئاشکرا ئەوە بڵێن، ئەوەیان زۆر بە نهێنی گوتوە. بەڵام دوایە ئاشکرایان کرد. تەنانەت لە کۆنفرانسی پێش کۆنگرەی سێزدە لە ئۆرووپا ئەوە باس کرابوو. ساڵێک پێش ئەو کۆنفرانسەی ئەمن لە ئۆرووپا لە ماڵی کاک ساڵحی وەلیزادە بووم. خێزانی وا بزانم سەیلزادە فاتمی ناوە ئەگەر هەڵە نەکەم ژنێکی یەکجار موحتەرەمە بە موحیببەتە. ئەزقەزا لەوێ نەخۆشیش کەوتم یانی پێنج شەش ڕۆژان هەر دەجێیدا کەوتم. ئەو خانمە ئەوەندەی موحیببەت کرد هیچ پاداشم نەبوو جگە لەوەی ئەگەر هاتمەوە دەستم ماچ کرد. ئەو خانمە وای لێهاتبوو کە لە کۆنفرانسی ئۆرووپادا قڕی خۆی ڕنیبوو کە چۆن عەکسی دوکتور قاسملووی قەدەغە دەکرێ؟ ئاسەواقەتی هیچ حەددێکی نەناسیبوو. وایان بڵاو کردبۆوە کە ئەمن بە مەقەڕاندا دەگەڕێم بزانم کوێ عەکسی دوکتور قاسملووی لێیە لای بەرم.

**عەبباس کاروخ:** گرینگترین کار و چالاکیتان لە نێوان کۆنگرەکانی دوازدەو سێزدەدا چ بوون و تۆ خۆت چ هەوڵێکت دا بۆ ئەوەی حیزب لە تەنگەشەی دوو قۆڵی نەجات بدەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێموایە ئەو پرسیارەی لە هەر کەس بپرسی ئاوا لەنەکاو ناتوانێ جواب بداتەوە.

**عەبباس کاروخ:** ئەتۆ سکرتێر بووی چۆن ناتوانی جواب بدەیەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن بە کورتی و پوختی گوتم لەماوەی ئەو چەند کۆنگرەیەدا کاری گرینگی ئێمە ئەوە بووە ئیدامەکاری هەبێ. سەعی بکەین ئەو حیزبە لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ. تەشکیلاتو ئیعتیباری خۆی لەدەست نەدا. پێوەندییەکانی دەگەڵ خەڵک بە دەرەجەی یەکەم دەگەڵ هێزە سیاسییەکانیش

بەدەرجەی دووهەمو هەروەها دەگەڵ دنیای دەرەوە بە دەرەجەی سێهەم بەقەوەت بکا. ئێستا ئەمن ناتوانم بڵێم فلان کارەمان کرد. هیچ کارێکی سەیروسەمەرەمان نەکردوە. بۆ کێشەی دووجەناحییش هەر ئەو شتانەم کردوە کە بۆم باس کردی.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا حەسەنزادە کە لەسێ کۆنگرەی پێشوودا بە هاسانی دەنگی بۆ سکرتێری هێنابۆوە، لە کۆنگرەی سێزدەدا کەوتە بەر بێ لوتفیو بە تەواوی پشت گوێ خرا. ئەوە نەریتی هاوڕێیەتی بوو؟ ئوسوولەن بۆ لە حیزبی دێمۆکراتدا فەرهەنگی تۆڵەکردنەوە لە هاوسەنگەر بەهێزە؟ تۆ ئەوەت قبووڵە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن ئەوەی ناکەمە ئی حیزبی دێمۆکرات. کەسانێک کە وا دەکەن کەیفی خۆیانە. لە کۆنگرەی سێزدەشدا ئەگەر هەموو دنیا وەسەر یەک کەوتبایە، ئەمن خۆم بۆ کۆمیتەی ناوەندی کاندیدا نەدەکرد ئیللا بە یەک شەرت. ئەگەر زانیبام هەڵنابژێرێم حەتمەن خۆم کاندید دەکرد. یانی ئەگەر زانیبامایە لەو کۆنگرەیەدا دەنگم پێنادەن بۆ کۆمیتەی ناوەندی، حەتمەن خۆم کاندید دەکرد هەتا ئەوەش ببێتە دەلیلێکی دیکە لەسەر هەستی تۆڵەئەستاندنەوەی نابەجێو لەسەر ڕقوکینەیەک کە دەڵی ئەوانەدا بوو. بەڵام یەقینم هەبوو هەرچییان دەتوانادا بایە کردبایان دیسان ئەمن هەر دەبوومە ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی. ئەمنیش ئەگەر هەموو دنیام دەگەڵ بایە نەدەبوومە ئەندامی دەفتەری سیاسی. چونکی ئەوان بۆخۆیان ئەبزی کۆنگرەیان دەدەستدا بوو. دایاننابوو لەو کۆنگرەیەدا بیست و یەک(٢١) کەس هەڵبژێرێن. سێزدەی(١٣) ئی وانەو هەشتی(٨)ای ئی لایەنەکەی دیکە. لەنێو خۆشیاندا وایان بەش کردبوو کە لەو هەشت کەسە تەنیا چوار کەسیان لە مەرحەلەی یەکەمدا هەڵبژێردرێن. واتە لەمەرحەلەی یەکەمدا دەنگ بەوانی دیکە نەدەن هەتا دوایە بۆ مەرحەلەی دووهەم ئەوانی دیکە هەڵبژێرن. کەوابوو ئەوان سێزدە کەسیان هەبوون کە دەنگ بەمن نەدەن بۆ دەفتەری سیاسی. هیچ مومکین نەبوو کە کردبایانمە ئەندامی دەفتەری سیاسی. بەڵام ئەگەر هەموو دنیا وەسەر یەک کەوتبایە، هەر ئەو ڕەفیقانەی دەگەڵ وان بوون لانی کەم بەشی ئەوەی بۆ کۆمیتەی ناوەندی سەرکەوم دەنگیان بەمن دەدا. ئەمنیش نەمدەویست بیکەم.

**هەیاس کاردۆ:** یانی لەوەی دڵنیای کە دەتتوانی ببیە کۆمیتەی ناوەندی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** هیچ گومانم نیە. نە گومانم هەبوو و نە هەمە. ئەگەر زانیبام دەنگم پێنادەن حەتمەن خۆم کاندید دەکرد هەر بۆ وەی ئەوەش ببێتە دەلیلێکی دیکە لەسەر حیقدو بوغزێکی کوێر کە ئەوانە هەیانە. مەسەلەن ئەگەر هەموو دنیا داوای لێ کردبامایە چونکی ئەوەم دەزانی نەمدەکرد. بەڵام یەک نەفەریان نەیگوت بۆ خۆت کاندید ناکەی. هەر نەیانگوت بۆ خۆت کاندید ناکەی. ئەوانی دیکە بەڵێ زۆریان هەوڵدا.

لێرەدا ناو نابەم. بەڵام لە شەش مانگی پێش کۆنگرەی سێزدەدا کە ئەو وەزعە پێک‌هاتبوو، لە تەرەف ئێمەوە پشتیوانی لە کاک بابە عەلی دەکرا. کاک بابە عەلی ئێمە هانمان نەدابوو، ئەو وەکوو ئینسانێکی موستەقیل خۆی کاندید کرد بۆ پۆستی سکرتێری کە شتێکیشی بڵاو کردەوە، ئەوەی بە ئاشکرا کرد نەک بە دزی‌و فزی. ئەو وەختی کە ناوبراو ئەوەی بە ئاشکرا بڵاو دەکردەوە کاک مستەفا دەیگوت ئەمن کاندید نیم بۆ سکرتێری. هاوڕێیان داوایان لەمن دەکرد خۆم بۆ سکرتێریش کاندید بکەمەوە بەڵام ئەمن گوتم مومکین نیە. گوتم جگە لەوە کە نامەوێ بۆ هیچ پۆستێک کاندید بمەوە، نامەوێ عاری لابردنی ئەو نەسڵەش بە من بیڕێ کە تەنیا دوو دەورە ڕێگا دەدا یەکێک ببێ بە سکرتێر، بە کێ دەبڕێ با ببڕێ. بەڵام ئەمن بە عاری دەزانم ئەسڵی ئەساسنامەیی بگۆڕێ بۆ ئەوەی یەکێک ببێتە سکرتێر. ئەو عارەی ئەمن تەحەممول ناکەم.

**هێلس کاردۆ:** یانی پێت وا نیە کەوتوویە بەر کەملوتفی لە کۆنگرەی سێزدەدا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کەم لوتفی چت عەرز کەم؟ کوڕە دوژمنایەتی بوو. ئەمن پێت نیشان دەدەم کە دەلایلەکە زۆرە. ئاخرین پاڕاگرافی ڕاپۆرتی کۆمیتەی مەرکەزی ئەوە بوو کە دەڵێ: "هاوڕێیان ئەم ئەرکانەو زۆر ئەرکی دیکەی حیزبیش وەختێک جێبەجێ دەکرێن کە پێکەوە بین، کە هاوکاری بکەین. ئەوەندەی هەین، دوو ئەوەندەی دیکەش بین بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانمان هەر کەمین. حیزبی دێموکرات جێی هەمووانی تێدا دەبێتەوە، وەرن با دەست وەدەستی یەک دەین بە حورمەتی ڕابردووی خۆمان‌و خوێنی شەهیدان با ڕێگا بەو دەستەبەندی‌و دوو بەرەکی‌یە نەدەین. هەرکەس هەوڵی‌دا وەحدەتی ڕیزەکانی ئەو حیزبە تێک بدا، با بە هەموومان بەگژی‌دا بچینەوە..." ئەوەیان لە ڕاپۆرتی کۆمیتەی مەرکەزی لابرد. یانی ڕەئی گیری‌یان بۆ کرد گوتیان نابێ ئەوەی تێدا بێ. پێش ئەوەی ڕەئی گیریی بۆ بکەن ئەمن گوتم هاوڕێیان پیاوی چاک بن ئەوەی لامەبەن، ئەوە بەرهەمی زۆر خراپی دەبێ. کەچی دەنگیان بۆ وەرگرت‌و بڕیاریان بە حەزف‌کردنی دا. ئەمنیش هەستام ساڵۆنی کۆنگرەم بەجێ هێشت. گوتیان بۆ کوێ؟ گوتم لە کۆنگرەیەک‌دا دانانیشم کە باسی تەبایی‌و برایەتی ڕەت کاتەوە.

چووم لە ژوورەکەی خۆم دانیشتم. دوایە هاتن‌و داوایان کرد وەرەوە. گوتم دەگەڵ ئەو پاڕاگرافەی دێمەوە. گوتیان ئاخر ئەوە خراپەو خەڵک دەڵێن ئیختیلافیان هەیەو لەو شتانە. گوتم بابە هەموو کەس دەزانێ ئیختیلافمان هەیە، بەڵام ئێستا دەڵێن ئێمە بڕیارمان داوە وا نەبێ. دەنا هەموو دنیا دەزانێ. ئاخر هەر ئەو کاتی کاک مەلا بەختیاری یەکیەتیی نیشتمانی لە تۆزروێژی موساحەبەی کردبوو کە دەڵێ حیزبی دێموکرات لەت دەبێ. لەئاخری‌دا کە زۆریان ئیسرار کرد گوتم بۆ ئەوەی نەڵێن بەهانە دەگرێ باشە شتێکی دیکە

دەکەین. ئەمن دێمەوەو کۆنگرەکە تەواو دەکەین. لەپاشان کە راپۆرتەکەمان چاپ کرد، پەنجا نوسخەی لێ چاپ دەکەین کە ئەو پاراگرافەی تێدایە. ئەوە بۆ ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی‌و کەسانێکی وەکوو منیش. دەمزانی کەسانی دیکەش حەزف دەکەن بۆیە گوتم با هەر کۆمیتەی ناوەندی ئەبن. ئەوە پەسند کراو قبووڵ کرا کە وای لێ‌بکەن. لەپاشان کە کۆنگرە تەواو بوو راپۆرتی کومیتەی ناوەندی چاپ کرا، ئەو پاراگرافە بوو بە بەردی بن گۆمێ‌و ئێستاش خەتێکی نەبیترایەوە. پێت نیشان دەدەم دەت دەمێ ئەو پاراگرافە. یانی باسی ئەبایی‌یان رەت کردەوە.

**هەیاس کاردۆ:** باشە ئەو فەرهەنگە لەچی‌را هاتوە، بۆ وایە کە ئەندامانی یەک حیزب ناوا تۆڵە لە یەک بستێننەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن نازانم، ئەو پرسیارەی دەبێ لەوان بکەی. بۆ من شت لەوە سەیرتر نیە. هیچ شتێک لەوە غەریبتر نیە کە ئەوانەی ئێستا لێیان پرسی دەڵێن تەنیا رێگای سەرکەوتن یەکگرتن‌و پێکەوە بوونە. کەچی ئەو کەسەی وا دەڵێ، ئەفرەقە بە نیعمەتی خودا دەزانێ.

مەسەلەن کە دوکتۆر قاسملوو شەهید بوو، دەستیان پێ‌کرد گوتیان ئەو کابرایە ئیلهامی غەیبی بۆ هاتبوو. دەنا ئەگەر 'لادەران'مان دەگەڵ بان دوای شەهیدبوونی ئەو، حیزبەکەمان ئاداری بە سەر پاداریەوە نەدەما. گوتم بە تەواوی درۆیە. گوتم ئەگەر پێکەوە باین‌و ئەوان هەروا لە کەمایەتی‌دا بان‌و ئەندامی کۆمیتە مەرکەزییش نەبانایە، هەموو توانایان بە خەرج دەدا هەتا حیزبەکە لەجێی خۆی بمێنێ. بەراستییش هەروا دەبوو. چونکی ئەمن زۆر جار دەمگوت حیزبی دێمۆکرات حیزبی تەنگانانە. لە تەنگاناندا هەموو شتێکمان لەبیر چۆتەوە. بەڵام ئەویان بە نیعمەتی خودا دەزانی‌و ئێستاش هەروای دەزانن. ئێستاش پێ‌یان وایە حیزبەکەیان لە باشترین حاڵەتی تاریخی شێستو پێنج ساڵەی عومری خۆی‌دایە.

**هەیاس کاردۆ:** ئەگەر دەکرێ برێک باسی کۆنگرەی سێزدە بکە. بە ئامار چەند کەس بەشدار بوون، شێوەی هەڵبژاردن چۆن بوو، وەکی بۆ کۆنگرەی دوازدە باست کرد تکایە ئی کۆنگرەی سێزدەش شی کەوە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لە کۆنگرەی سێزدەدا ئێمە هەوڵماندا، چەند جاریش هەوڵماندا کە تەوافوقێک بکرێ وەک ئەوەی لە کۆنگرەی دوازدەدا کردمان. کاک مستەفا گرتی ئەمن جوابی خەڵکم پێ‌نادرێتەوە.

**هەیاس کاردۆ:** چەند کەس بەشداری کۆنگرە بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** زۆر بە دەقیقی نازانم بەڵام پێموایە لەسەت و پەنجا(١٥٠) کەس تێ‌دەپەڕی.

**عەباس کاردۆ:** شێوەی هەڵبژاردن چۆن بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** شێوەی هەڵبژاردن ئازاد بوو. خەڵک خۆی کاندید دەکرد و دەنگی وەردەگرت. لیستی دیاریکراو نەبوو. هەموو خەڵک خۆیان کاندید دەکرد بەڵام "کەڵەبابەکە بە لەپان لێ‌نرابوو". یانی هەموو شتێک دیاری کرابوو. ئەو لایەنەی منی تێدابووم هەشت کەسی بۆ دانرا بوون.

**عەباس کاردۆ:** ئاخر چۆن ئەو سەهمییە دانراوە؟ مادام هەڵبژاردن ئازاد بووە تۆ چۆن دەزانی سەهمییان دانابوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوان بۆ خۆیان دایان ناوە. هەروا بوو. ئێمە بە دوو حەفتە پێش کۆنگرەش دەمانزانی ئەوەی لەوان هەڵدەبژێردرێن کێ‌ن و کێن. سێزدە کەسیان لە ساڵۆنی کۆنگرەدا هەڵبژێران زۆر پێشتر ناوی هەموویانمان وەکوو ئێستا دەزانی.

**عەباس کاردۆ:** ئەی خۆشتانتان دەزانی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا ئەی خۆماتمان نەدەزانی. دەمانزانی کە هەشت کەسیان بۆ داناوین. ئەکسەرییەتەکە بەوان بوو.

**عەباس کاردۆ:** باشە ئەتۆ دەفەرمووی ئەو کات دەجەناحدا نەبووی. بەڵام چۆن ئەو لایەش بە ئەی خۆت دەزانی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن عەرزم کردی لەو ئیختیلافاتەدا کەوتوومەتە حاڵەتی لایەن. ئەمن ئەمگوتوە لە ئیختیلافاتەکەدا نەبووم بەڵام هەتا دوای کۆنگرەی جەناحم نەبووە. لەڕاستی‌دا کاری جەناحی دوای کۆنگرەی دەستی پێ کرد. دەنا ئەمن دەو ئیختیلافاتەدا بووم چۆن نەبووم؟ وەختێکی کابرا خیلافێکی ئاوا گەورەی کردوە خۆ ناکرێ بێ تەفاوەت بم.

جا ئەوان ئەو تەوافوقەیان کردبوو. دایاننابوو هەشت(٨) ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزیمان بلەفێ دەگەڵ سێ(٣) جێگر. هەشتەکە بە دوو مەرحەلە هەڵبژێران. سێزدەکەی خۆیان لە دەوری یەکەمدا هەڵبژێران. چونکی گوتراوە. ئەو هەشتەی مەش پێم وابێ چواریان لە مەرحەلەی یەکەمدا هەڵبژێران و چواریان کەوتنە دەوری دووهەم. ئەوانەش کە حەزفیان کردبوون - دەگەڵ شانازیم بە هەمووانەوە - هەوڵیان دابوو ئەوانە حەزف کەن کە موتەمەسیرترن. مەسەلەن "قادر وریا" دەبێ هەڵنەبژێرێ. "عوسمانی ڕەحیمی" دەبێ هەڵنەبژێرێ. ئەمن بە کاک مستەفای هیجریم گوت. گوتم دوو کەسمان هەبوون هەر دووکیان ئەندامی کۆمیتەی

مەرکەزی بوون، هەر دووکیان لە ڕادیۆ کاریان دەکردو هەر دووکیان ڕەحیمی بوون. عوسمانی ڕەحیمی و مەلا ئەحمەدی ڕەحیمی. ئەوە چ ویژدانێکە کە تەوسیە دەکا مەلا ئەحمەدی ڕەحیمی هەڵبژێری بەڵام عوسمانی ڕەحیمی حەزف بکرێ. چەندیان فەرق هەیە. جا بەڕاستی فەرقیان زۆر بوو. بە هەر حاڵ ئاوا بوو.

بەڵام ئی جێگرەکان خۆش بوو. جێگرەکان سێیەکە هەڵبژێراو چواری وانیش هەڵبژێران. هێندیان وەعد بەمەو بەو دابوو سێ دەورە هەڵبژاردن کرا بۆ ئەوەی چواری دیکە هەڵبژێرێن هەر نەکرا. چونکە بڕیار درابوو یازدە جێگر هەڵبژێرین. لە دەوری یەکەمدا چواری وان و سێی ئێمە هەڵبژێران. سێ دەورمیان هەڵبژاردن کرد بۆ چوارەکەی دیکە هیچکەس هەڵنەبژێرا. چونکە قەولیان بە زۆران دابوو. بۆ دەوری چوارەم ئەمن پێشنیارم کرد کە بابە خۆ هەتا سێ ڕۆژی دیکە لێرە دانانیشین. ئەو سەقەرەی هەڵبژاردن بکەن، هەر کەس دەرچوو، دەرچوو، هەر کەس دەرنەچوو با هەر ئەوەندە کەسە بن. یانی ئەوەندیان قەولی بە ناحەق بە خەڵکی دابوو لەنێو خۆیاندا بۆیان هەڵنەدەبژێردران. خۆ مەعلووم بوو ئی مە هەڵنابژێرین، بەڵام ئی خۆیان پێ هەڵنەبژێران، ئیدی مەجبوور بوون وازیان لەو چوار کەسە هێنا.

**هەیاس کاردۆ:** لە سازکردنی ئەو تەشکیلاتە نهێنی‌یەدا لە دەرەوەی وڵات پێتوایە کاک شاهۆی حوسێنی نەقشی بەرچاوی هەبووە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کاک شاهۆ حوسێنی نەقشی زۆر بەرچاوی هەبوو. تەنانەت ئەو نامە شەریفەی کاک مستەفاش لەسەر پێشنیارێکی کەتبیی کاک شاهۆو خوسرەوی عەبدوڵڵاهی نووسرابوو. بۆیان نووسیبوو ئێمە بۆمان دەرکەوتوە برادەر، یانی ئەمن، خۆی کاندید دەکاتەوە. بۆیە ئەتۆ دەبێ بێیە ناوەوەو قورسایی خۆت دانێی. ئەو نامەیە لەسەر تەوسیەی کاک شاهۆی نووسرابوو. دیارە بۆیە دەڵێم ئی کاک شاهۆی، چونکی خوسرەو ئەوە نیە حیسابی وای لەسەر بکەی. دیارە کاک شاهۆ لەو دوایی‌یانەدا زاهیرەن هێندێک مەوازیعی باشی هەبووە. ئیدی نازانم چەندە دروستەو چەندە دروست نیە. وەکی دەڵێن ئێستا جۆرێکی دیکە بیر دەکاتەوە. بەڵام ئەو وەختی وا بوو.

**هەیاس کاردۆ:** وەک ڕوونبوونەوەی مێژوویی پێم‌خۆشە بزانم ئەوانەی لە کۆنگرەی سێزدە دا وەک دوو لایەنی بەرامبەر ناسرابوون کێ بوونو بەرنامەو پلانیان بۆ داهاتووی حیزب چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێموایە ئەگەر ئێستا تەماشای ڕێبەرایەتیی ئەو دوو حیزبە بکەی کەم و زۆر ناوی هەموویانت دێتە دەست. بەڵام لەو وەختەشدا ئەگەر بڵێین ئەو کەسانەی هەریەکەی لەسەر لایەکی حیساب دەبوون دەتوانین ئاوا بڵێین: لەوانەی ئێستا دەگەڵ حیزبی دێموکراتی کوردستانن دەتوانین ناوی ئەوانە

بەرین. هاوڕێیان: جەلیلی گادانی، حەسەنی ڕەستگار، فەتاحی کاویان حوسێنی مەدەنی، مستەفای مەولوودی، حەسەنی قادرزادە، کەمالی کەریمی، عومەر باڵەکی، قادر وریا، سمایل بازیارو کەسانی دیکەش کە هەمووم لەبیر نین، دیارە لەوانە بەشێکیان ئەبوونە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بەڵام بەشێکیان بوونی. لەلای ئەوانیش دەتوانین ناوی ئەوانە بەرین. بەڕێزان: مستەفای هیجری، حەسەنی شەرەفی، حەمەنەزیفی قادری، سەید ڕەزای دروودگەر، کاوەی بەهرامی، تەیمووری مستەفایی، شاهۆی حوسێنی کە لە مۆرە نەسڵیەکان بوون. کەسانی دیکەش هەبوون.

**عەباس کاردۆ:** کاک بابەعەلی مێهرپەروەر بە بەرنامەی دیاری کراوەوە لە کۆنگرەی سێزدە دا هاتە مەیدان و چاوەڕوان دەکرا پۆستی سکرتێری وەرگرێ. نەک ئەوە نەکرا دواتر کەوتە بەر کەمولتفییش و سەرەنجام دوای لێکدابڕانی حیزب کوردستانی بەجێ هێشت. ئەوە چۆن بوو؟ لەسەر ئەو بەڕێزە هیچت بۆ گوتن هەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** کاک بابە عەلی مێهرپەروەر وەختێکی زۆر هەروەک بۆخۆی دەی گوت ئەو وەختی کە ئیختیلافمان هەبوو هەتا پێش لەئەبوونی، ئەو بەشێک بوو لە ئۆپۆزیسیۆن. جاروبار دەی گوت موخالەفەت دەگەڵ ئەو برادەرانە بۆ من زەحمەتترە هەتا ئێوە. چونکی ئەمن هەشت ساڵان دەگەڵیان هاوجەناح بووم. کاک بابە عەلی هەتا ئاخر ڕۆژەکانو لانی کەم مانگەکانی پێش کۆنگرەی سێزدە زیاتر ئەگەر قەرار بایە لەسەر جەناح حیساب بکرێ، لەسەر ئەو جەناحی حیساب دەبوو. لە کۆنگرەی دوازدەشدا هەروابوو و پێشتریش هەروا بوو. بەڵام دوایە ئەو شتانەی کە بوون هێندێک وەزعیەتەکەیان گۆڕی. بەتایبەتی ئەوە کە کاک بابەعەلی تێشووی شوانی خواردو باسی ئەوەی کرد کە مومکینە کەسێکی دیکە بێتە سکرتێر، ئیدی بەوە بەجارێک خۆێتی خۆی دەکاسەی کرد. لەو ماوەیەدا کە وەکوو ئۆپۆزیسیۆن کارمان دەکرد دەگەڵ ئەوەی ڕەنگ بوو کەسەکانی دیکە بە خەتابارتر بزانێ کە ئەو تازە کەوتۆتە ئەو بەشەوە. زۆر وەخت لە کۆبوونەوەکاندا کە چەندجار کۆبوونەوە هەبوو، وەکوو دوو تەرەف دادەنیشتین، هوجوومی زیاتر لەسەر وی بوو هەتا مەسەلەن لەسەر کاک حەسەنی ڕەستگار یان من. ئەمن کە کۆمیتەی ناوەندی نەبووم بەڵام دەزیمنی حەرەکەتی ئۆپۆزیسیۆندا هەبووم. لە ئاخریشدا کاک بابەعەلی بە جۆرێک لە جۆران کۆمەگێکی زۆر گەورەی بە وان کرد. ئەویش ئەوە بوو کە لە ئەساسنامەدا ئەسڵێک هەبوو کە دەڵێ مەشرووعیەتی کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی مەرکەزی وەختێکە کە زیاتر لە دوو سێهەمی ئەندامانی ئەسڵی تێی‌دا بەشدار بن. ئەو وەختی ئەقسیمەکە وا کرابوو کە سێزدە کەس لەوان هەڵبژێرابوون هەشت کەسیش لەوانەی دیکە کە ئاخودی بوون. هەمووی دەبوو بە بیستو یەک(۲۱) کەس. ئەوان کە سێزدە کەس بوون نەدەبوونە دوو سێهەم چونکە شازدە کەس دەموقابیل

هەشت کەسیدا دەبێتە دوو سێیەم، یان دەبێ ئەمان حەوت بن و ئەوان سێزدە کە دەبنە بیست کە دیارە ئەو وەختیش هەر تەئمین نابێ.

بە هەرحاڵ کاک بابەعەلی دیارە بە نییەتی باش، تەعاروفی دەگەڵ ناکەم بەڵام بۆخۆم پێموایە بە نییەتی باش ئەوەی کرد. ئەو پێی وا بوو ئەگەر سەفی ئێمە بەجێ بێڵێ و بچێتە گەڵ وان لە کۆبونەوەدا بەشدار بێ، مەسەلەکە حەل دەبێ. بەو جۆرە ئەو شەرعییەتیدا بە کۆبوونەوەکەی وان. چونکی ئەگەر ئەو نەچوویایە کۆبوونەوەی ئەوان شەرعی نەدەبوو. هەر دەیانگرت، بەڵام بە پێی ئەساسنامە ناشەرعی بوو. هەر بڕیارێکی دابایان ناشەرعی و ناقانوونی دەبوو. بەڵام چوو دەگەڵیان کەوتو کۆمەگێکی زۆر گەورەی پێ کردن، ئەوە دیارە کەوتە دوای کۆنگرە.

بەڵام کاک بابەعەلی هەر بەوەی خۆی کاندید کرد ئیدی کەوتە بەر غەزەبیان. لە عەینی حاڵدا ئەوانی دیکەش کە دەبەر غەزەبدا بوون، دایان نابوو کە بەشێکیان لێ هەڵبژێرن، هەشت کەسیان لێ هەڵبژاردن. هەروەکی گوتم چواریان لە مەرحەلەی یەکەمدا و چواریان لە مەرحەلەی دووهەمدا. هەر ئوسوولەن واشیان دانابوو کە هەموویان ڕێکڕا هەڵنەبژێرن مەبادا ئەو کەسانەی ئەوان نایانەوێن لە دەستیان دەرچێ و خەڵکەکە دەنگیان بدەنێ. جا کاک بابەعەلییش کەوتە بەر ئەو هوجوومە بێ ڕەحمانەیە.

**هەیاس کاردۆ:** وەکی دوای تەواوبوونی هەموو کۆنگرەکان دەگوترا، کۆنگرەی سێزدەش بە سەرکەوتوویی کارەکانی تەواو کردو ڕێبەریی نوێی هەڵبژارد. ئەگەر وا بوو بۆچی دوای کۆنگرە دیسان کێشەو ئاژاوە سەری هەڵدایەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** سەرکەوتنی کۆنگرەی بە هێندێک شتە. زۆرجار خەڵک تەعنە لێ دەدەن و دەڵێن مەسەلەن حیزبی دێمۆکرات نووسی کۆنگرەکە سەرکەوت، ئەمن هەمیشە دیفاعم کردوە. سەرکەوتنی کۆنگرە چیە. کۆنگرە هێندێک بەرنامەی کاری داناوە. دای ناوە ڕاپۆرتێکی کۆمیتەی ناوەندی هەیە مونافەشەی بکاو بڕیاری لەسەر بدا. مەسەلەن بەرنامەو ئەساسنامەی داناوە پێی دا بچێتەوە. دەبێ مونافەشەی بکاو بڕیاری لەسەر بدا. دەبێ بڕیارنامەیەک دەربکا. نازانم ئەگەر لێکۆڵینەوەی ماڵیی هەیە بیکا. پەیامان بنێرێ و هەڵبژاردن بکا. ئەگەر ئەوانەی کردن، کۆنگرە لە کارەکانیدا سەرکەوتووە. یانی لەخودی کارەکانیدا سەرکەوتووە.

بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە لە کۆنگرەی سێزدەدا، لەحزە بە لەحزە ئەو دروولەتییەی کە هەبوو بە قەوەت دەکرا. یانی ئەوانە وەک لەشکری فاتیح هاتبوون لێ دەن و ئیحترام بشکێنن و حەزف بکەن. ئەمن دوایە قسەیەکم بیستەوە کە چاکم تەئیید کرد. برادەرێکی وان کاک "چەکۆی ڕەحیمی" چەند مانگ دوای

کۆنگرە چووبووە دەرێ. لەدەرێ - پێمواپە لەدانمارکێ - کۆبوونەوەیەکی پێکهێنابوو بۆ لایەنگرانی خۆیان، پێمواپە وای زانیبوو کەسی نامەحرەمی لێنیە بۆیە قسەیەکی کردبوو. گوتبووی ئیگەرانی کۆنگرەی چاردە مەبن. لە ئێستاڕا دەزانین لە کۆنگرەی چاردەدا هەر کورسییەک کێی لەسەر دادەنیشێ. ئەو قسەیە یەکجار زۆر ڕاست بوو. چونکی هەر لە جەلەساتی کۆنگرەی سێزدەدا خەریک بوون کورسییەکانی کۆنگرەی چاردەیان ڕیز دەکرد. بە حیساب، دەبێ وا بکەین لە کۆمیتەی مەرکەزیدا، لە بیستو سێ کەسان هەشتیان بدەینێ. لە جێگرەکان، لە یازدە کەس کە دانرا بوو، دەبێ سێ کەس لە موخالیفان بن. پاشان لەو ماوەیەدا بۆخۆیان دەزانن چۆنی تەسفیە بکەن. هەر لەو کاتەدا کۆمیتەی مەرکەزی کە موشاویری هەیە، ئەوانیش وا دابنێن کە وەزنەکە تێک نەچێ. هەر وەکی جارێک موشاویریان هەڵبژاردن کە شەش(٦) کەس بوون. چوار لە خۆیان بوونو دووی نامەحرەمیش. یانی لە هەموو شتێکیدا حیسابیان کردبوو کە کۆنگرەی چاردە کارەکانی لە ئەوروپاوە مسۆگەر بێ.

بۆیە لەڕاستیدا کارەکانی کۆنگرە وەکوو کاری کۆنگرە ناتوانین بڵێین سەر نەکەوتن. کۆنگرە کارەکانی خۆی هەموو کردن، بەتایبەتی کە ئەو هەڵەشی بۆ وەدی هێنان کە زۆرایەتیی کۆمیتەی ناوەندی وەدەست بێنن. لەواقیعدا ئەمن ناڵێم کۆنگرە سەر نەکەوت. کۆنگرە سەر کەوت، بەڵام حیزب سەر نەکەوت. لە کۆنگرەی دوازدەدا ئەوەی کە باسمان کرد حیزب سەرکەوت. چونکی هەموو ئەو کەسانەی ئەو حیزبەیان پێک دەهێنا، هەموویان بەشیان درا، حیسابیان بۆ کراو خوێندرانەوە. بەڵام لە کۆنگرەی سێزدەدا وا نەبوو. لایەنێک سەرکەوت بۆ ئەو شتانەی بۆخۆی مەبەستی بوون. ئێستا زۆر جاریان باس کردووە، نابڕێتەوە کە ئەمن نەچوومە جێژنی کۆتایی کۆنگرە. جێژنی کۆتایی کۆنگرەی دوازدە چووین چونکی هەموو سەرکەوتبوون، هەموو ڕازی بوون. ئەوەی لە ئەقەلییەتدا بوو بە لایەوە چووبوو، نەک کەمی نەهێنا بوو زیادیشی بەلاوە چووبوو. چونکی ئەو ئەکسەرییەتەش وەک ئی کۆنگرەی سێزدە دەیتوانی بێڕەحمانە لێدار بە کەیفی خۆی بکا. بەڵام ئیمتیازی بۆ دانانو بە ڕەزایەتەوە بوو.

لە کۆنگرەی سێزدەدا وا نەبوو، لایەنێک لێدرا بوو، لایەنێک سەر کەوتبوو. ئەمن بە دوو کەسانم گوت کە بەداخەوە پێم وابێ پێیان نەگوت. گوتم بە کاک مستەفای بڵێن هەموو حیزب لەو کۆنگرەیەدا سەر نەکەوتوە. تەنیا لایەنی وان سەرکەوتوە. سەر کەوتوە پیرۆزبیان بێ، بەڵام با لەسەر هەستی خەڵکی هەڵنەپەڕن. با ئەو جێژنەی نەگرن بۆخۆشم نایەم چونکی پێمواپە ئەوە خراپە. بۆیە نەچووم، ئێستاش دەڵێم کاری چاکم کرد نەچووم. چونکی ئەمن پێمواببوو میحنەتی حیزبە. نەک میحنەتی جەناحێک، بەڵکوو میحنەتی حیزبە. خەڵک بۆ میحنەت شایی ناکا، بۆ خۆشی شایی دەکا. ئەمن بۆ خۆم نەچوومە ئەو مەڕاسیمەی. بەڵام پێم‌وایە ئەوان هیچیان حازر نەبوون پێی بڵێن یان قسەی خۆیان خەسار بکەن. ئەوان گرتیانو دەگەڵ ئەوەش کە

بەشی زۆری ئەوانی ئەقەلییەتیش چووبوون، بەڵام هەر لە کۆبوونەوەکەدا لەسەر ئیحساساتی خەڵکەکەی هەڵدەپەڕین و شوعاریان دەدا: "بڕۆ بۆ دوو کۆنگرەی دیکە، بۆ هەشت ساڵی دیکە". ئەوە مەسەلەن یەکێک لە دروشمەکان بوو کە درابوون، یانی سکرتێریی کاک مستەفای بۆ هەشت ساڵی دیکە مسۆگەر بوو.

**هەیاس کارەزۆ:** لە کۆنگرەی سێزدەدا جەنابت خۆت بۆ ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندی دیاری نەکرد. ئایا ئەوە بە نیشانەی ناڕەزایەتی بوو یان شتێکی دڵخوازی خۆت بوو؟ دوای کۆنگرە چۆنت بەرخورد دەگەڵ کراو بە چییەوە خەریک بووی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن جاری دیکەش گوتوومەو ئێستاش دەیڵێمەوە. ئەگەر کۆنگرەی سێزدە - کە کاری وا هەر ناکری و عەڵەتیشەو هەر نابێ بکرێ - هەموو شتێکی درابایە دەستی من و گوترابا ئەتۆ چۆن دەکەی با وابێ، هیچ مومکین نەبوو خۆم کاندید بکەم. چونکی هەروەک گوتم لەمێژ بوو هەر حەزم لە ئەندامەتیی ڕێبەری نەبوو. لێرەوش باوەڕێکم هەیە کە پێموایە ئینسان کە گەیشتە تەمەنێک، لە تواناکانی کەم دەبێتەوە. لەلایەکی دیکەش بەڕاستی هەموو ئینسانێکی تێکۆشەری ڕێگای ڕزگاری حەقی هەیە ئەگەر ماوەیەکی زۆری تەمەنی خۆی لەپێناو ئامانجەکانی‌دا تەرخان دەکا. نەک بڵێم خودای نەخواستە دوایە پشتیان تێبکا بەڵام حەقی هەیە چوار پێنج ساڵی ئاخری تەمەنیشی بۆخۆی بژی. ئەوەش بۆخۆم پێم وا بوود. لەوانەش گرینگتر پێم وا بووە دەبێ جڵەوی کارەکان بدرێتە دەست کەسانێکی دیکە کە تازە نەفەسن. ڕەنگە ئەزموونیان کەمتر بێ بەڵام تواناو ئێنرژی‌یان زیاترە. ئەوان زیاتر پێوەندی‌یان بەو زەمانەوە هەیە کە تێی‌دا دەژین. باوەڕم بەوە هەبووە. تەنانەت زۆریشم گلەیی هاتۆتەوە سەری و بڕێکیشم نەفرەت لێ کراوە چونکی ئەمن گەڵاڵەیەکی دیکەشم پێشنیار کردوە کە لێی پەشیمان نیم. ئەگەر لەسەر ئەوە هەزار جاریشم گلەیی لێ بکری و نەفرەتم لێبکرێ دیسان لێی پەشیمان نیم.

گەڵاڵەکەش ئەوە بوو کە پێشنیارم کردبوو ئەساسەن کەسانێک کە تەمەنیان لەحەفتا (٧٠) ساڵ تێ‌دەپەڕێ حەقیان نەبێ خۆیان بۆ کۆمیتەی مەرکەزی کاندید بکەن. دیارە باسی ئیستیسنای تێدا هاتبوو کە ئەگەر نەک بە تەشخیسی خۆی و داوای خۆی، بەڵام کۆمیتەی مەرکەزی لە غیابی ویدا پێی وابوو هەم لەباری فکری‌یەوەو هەم لەباری جیسمی‌یەوە توانای بەڕێوەبردنی کارەکانی وەک جاران هەیەو وجوودی زۆر پێویستە، دەتوانێ کاندید بێتەوە. یانی ئەو تێبینی‌یەی تێدا هەبوو. بەڵام پێشنیارەکەی من ئەوە بوو لە بیست و یەک (٢١) ساڵی‌ڕا هەتا حەفتا ساڵی ئینسان حەقی هەبێ خۆی بۆ کۆمیتەی مەرکەزی کاندید بکا. لە حەفتا ساڵی بەولاوە حەقی نەبێ خۆی کاندید بکا. پێم وا بوو بۆ دەفتەری سیاسی لەسی (٣٠) ساڵی‌ڕا هەتا شێست و پێنج (٦٥) ساڵی بێ. چونکی ئەو هەم کاری زیاتری دەوێ هەم تەجرەبەی زیاتر. لەسی ساڵی تەجرەبەی ژیانی هەیەو هەتا شێست و پێنج ساڵیش ئێنێرژیی هەیە. بۆ سکرتێر پێم وا بوو لەچل (٤٠) ساڵی‌ڕا

حەقی هەبێ ببێتە سکرتێر هەتا شێست(٦٠) ساڵی. لە شێست ساڵی بەو لاوە کەس حەقی نەبێ خۆی بۆ سکرتێری کاندید بکا.

کە پێشنیارەکەم بردە کۆمیتەی مەرکەزی، دوورەکەی ئەخیر پەسند نەکران بەڵام یەکەمییان پەسند کرا. یانی حەفتا ساڵەکە پەسند کرا. ئەمن لە کۆنگرەی سێزدەدا نەببووم بە حەفتا ساڵ. بەڵام هەر بێ ئەوە بڕیارم دابوو خۆم کاندید نەکەم. ئەوە لە تەسەووری منیدا بێجگە لەو فایدانەی کە هەنی، قازانجێکی دیکەشی هەیە. ئەمن پێموایە ئەو کەسانەی عومریان دەچێتە سەرێ، هەموو کەس- ڕەنگە لە دەیان هەزار کەس حاڵەتێکی ئیستیسنایی بێ- دەنا هەموو کەس لە هەموو تواناکانی کەم دەبێتەوە. باوەڕم وابوو و ئێستاش هەر باوەڕم وایە کە هەر لەبەر ئیحتیرامی وان ڕا چاکە قانوونێک هەبێ کە حەقیان نەبێ خۆ کاندید کەنەوە، مەبادا کار بگاتە جێگایەک خۆیان کاندید بکەن بەڵام خەڵک بڵێن بابە وازی لێ بێنن با لەکۆڵ حیزب بێتەوە. یانی دەڵێم ئینسان لە ڕێبەری‌دا یان لە دەسەڵاتدا وا باشە کاتێک بڕوا کە بڵێن ئەرێ بۆ دەڕۆی، نەک بڵێن ئەرێ بۆ لەکۆڵ نابێتەوە. ڕەنگە ڕووبەڕوو پێی نەڵێن. لەبەر حورمەتی وانیش پێموایە هەروا باشە.

جا بە هەرحاڵ ئەمن هەر وەک گوتم بە هیچ جۆر خۆم کاندید نەدەکردەوە ئەگەر هەموو شتێکی کۆنگرەش بە دڵی من و بە بڕیاری من بایە. بەڵام دیارە پێموایە جارێکی دیکە گوتم ئەوان هەرچی لەتوانایان‌دا بوو لەچەند ساڵ پێش کۆنگرەوە دەستیان پێ کردبوو. یەکێک هەر لەخۆیان شاهیدیی دابوو کە ساڵی ١٣٧٧و ئەوانە لە داخڵ بووە. وەختێک هاتۆتە ئێرە داوای کتێبی نیوسەدە تێکۆشانی کردوە. نەی‌زانیوە ناوی چیە، بۆیە گوتوویەتی ئەو کتێبەی مێژووی حیزب. گوتوویانە چل ساڵ خەبات؟ گوتوویەتی نا ئەوەی فڵانە کەس نووسیویەتی. گوتوویانە ئەوە بۆ مێژووی حیزبە، ئەوە هێندێک تێروڕوانی خۆیەتی. بۆخۆی شاهیدیی دا ئێرە نەک لەبەر دۆستایەتیی من. هیچ ئەوە نەبوو. ئەو وەختی گوتوومە حەقی خۆیانە وا بڵێن. لەحاڵێک‌دا بە چاک و خەراپ ئەمن بۆخۆم لە پێشەکی‌یەکەی‌دا گوتوومە ئەوە مێژوو نیە. بەڵام چاک و خەراپی هەر پێنج ئەندامی دەفتەری سیاسی خوێندوویانەتەوە و بڕیاریان لەسەر داوە، دوایە دراوە بە چاپ. یانی نەزەری دەفتەری سیاسی بووە. ڕاستە ئەمن نووسیومە بەڵام هەر پێنج کەس خوێندوویانەتەوە و نەزەریان لەسەر داوە. ئەوان لەمێژ بوو ئەوەیان دەست پێ کردبوو.

ئەوەشم گوت کە حەتتا یەک ئەفەریان بە سەری لێوانیش نەی‌پرسی بۆ نایکەی. خۆ ئەگەر کینە و بوغز یان قیامەنەفس لی‌یان گەڕابا هەموویان دەیانزانی ئەمن خۆم کاندید ناکەمەوە. بەڵام بەسەری لێوانیش هیچیان نەیان‌گوت ئەرێ بۆ خۆت کاندید ناکەیەوە؟ ئێستێ ناتوانی ببیە سکرتێر وەرە ببە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی یان دەفتەری سیاسی. خودا هەڵ‌ناگرێ کەس شتێکی وای نەگوت، دەگەڵ خۆیان ڕاستگۆ بوون .

پیاو دەبێ ڕێزدانی هەبێ، بەرخوردی زاهیرییان ناموحتەرەمانە نەبوو. بەڵام وەکی دیکە لە هیچ حاڵەتێکدا بەداخەوە لە بەدگۆیی و لە شکاندن ڕانەوەستان. جارێک هاتن گوتیان قەدرزانیت لێ دەکەین. ئەمنیش گوتم قەدرزانیی چم لێ دەکەن؟ گوتیان قەدرزانیی ئەوە کە چەند ساڵ سکرتێر بووی. گوتم ئەوە قەدرزانی نیە، ئەوە تەعاروفە. دەنا سکرتێری لەپێش چاوی خەڵکی مەنسەبێکە داویانمەتێ، بۆ قەدرزانی نابێ. بەڵام ئەگەر قەدرزانیم لێ دەکەن با ئەوەی تێدا بێ کە لە ماوەی سکرتێریی خۆیدا یەکیەتیی ڕیزەکانی حیزبی پاراستوە، سەربەخۆیی سیاسیی حیزبی پاراستوە درێژەی بە ڕێبازی ڕێبەرانی شەهیدمان داوە، چونکی ئێوە دنیاتان پڕ کرد کە ئەمن خەیانەتم بە ڕێبازی قاسملوو کردوە. ئەوەندەی بشۆنەوە هیچی دیکەم ناوێ. گوتیان نا ئەوەی ناکەین. گوتم ئەدی ئەمن بەوەی فریو دەدەن کە سوپاس بۆ ئەوەی چەند ساڵ سکرتێر بووم؟ چەند ساڵ ئاغا بووم، چەند ساڵ کوێخا بووم، خۆ ئەوە بۆ تەقدیر نابێ. ئەتۆ وەرە بیر لە خەدەماتم بکەوە، ئەگەر خزمەتێکی وام نیە تاریفی بکەی تەقدیری چم لێ دەکەی؟ یانی حازر نەبوون ئەوەی بڵێن.

ئەمن لەو کۆبوونەوەیەدا کە پێموایە جارێکی دیکەشم ئیشارە پێ کردوە کە دوای کۆنگرە گیرا، باسی زۆر لەو مەسەلانەم کرد. گوتم کە ئەوەتان ساز کرد لە دژی من کە گۆیا دوژمنی قاسملووم، هەمووتان لێرە دانیشتوون. کێ بە قەت منی لەسەر نووسیوە، کێ بە قەت منی لەسەر باس کردوە، کێ بە قەت منی دەگەڵ ژیاوە تەنانەت کێ بە قەت منی لێ فێر بووە؟ چونکە ئەمن خۆم بە شاگردی دەزانیی و ئەوی دیکەش ڕەنگە خۆی بە دوو قاسملوویان نەگۆڕبێتەوە. لەپاشان چەند نموونەیەکم هێنانەوە. پاش هەمووی ئەوانە ئەمن گوتم دەگەڵ هەمووی ئەوانە هەرچی لە توانا پێمە، ئامادەم لە خزمەتی ئەم حیزبەو ئەم ڕێبەرایەتییەی دابێم تەنیا بە دوو شەرت. یەکیان ئەوەیە حیزبەکە نی هەمووان بێ. ئەندامی دەرەجە یەک و دەرەجە دوومان نەبێ. ئەوەی دیکەش حیزب بەرنامەی هەبێ بۆ کارو تێکۆشان. جا لەوێندا شتێکی دیکەشم گوت کە لەسەر سایتەکان هەڵڵای لەسەر ساز بوو.

گوتم ڕەنگە بڵێن ئەدی بۆ هەتا بۆخۆت سکرتێر بووی بەرنامەت دانەدەنا؟ بەڵام لە جوابی ئەو پرسیارەدا کە ئیحتیمالەن هەتانە، پێتان دەڵێم کە سێ(٣) مانگی دیکە دەبێتە سێ(٣) ساڵ بەرنامەیەک کە ئەمن پێشنیارم کردوە بۆ ئەوەی کارەکانمان چۆن بکەین، ئەو بەرنامەیە لە کۆمیتەی ناوەندیدا پەسند کراوە (نەک هەر ئامادە کراوە)، بەڵام بە قودرەتی قادری ئەو بەرنامەیە جێبەجێ نەکراوە، هەرچێکی دەبوو بکرێ، نەدەکرا چونکی وەکی گوتم دەزگاکانی بەڕێوەبەری لەدەستی واندا بوون. مەسەلەن سیاسی- نیزامی لە هەموو ئەو ساڵانەدا لەدەست واندا بووە. نەدەبوو بکرێ ئەوەکوو لە دەورانی سکرتێریی مندا سەرکەوتنێکی بۆ حیزب بەدواوە بێ. هێندێک نموونەی سەیرو سەمەرە هەبوون.

مەسەلەن مەجەللەیەک بە ناوی "چشم‌انداز" لە ئێران بڵاو دەکرێتەوە کە دوو جار ژمارەی تایبەتیی لەسەر کوردستان دەرکرد. لە ژمارەیەکی تایبەتی‌دا چەند کەس نووسیبوویان بەتایبەتی "احسان هوشمند" کە هوجوومیان کردبووە سەر حیزبی دێموکرات. گوتیان دەبێ وەڵامیان بدرێتەوە. دوایە ڕوویان دەمن کرد کە جوابی بدەمەوە، گوتم حەوسەڵەم نیە. سەرئەنجام لەسەر ئەوە ڕێک کەوتین کە بە شێوەی وتووێژێک پرسیار لە من بکرێ‌و جواب بدەمەوە. ئەوەمان ڕێک‌خستو وتووێژەکە کە تەسویری بوو بە "سی دی" بڵاو بۆوە. لەپاشان پیادە کراو بە نووسینیش بڵاو بۆوە. ئەمن بۆخۆم زۆری لێ ناڕازی بووم، چونکە پێموابوو پێویستیی بە حەوسەڵەو خۆماندووکردنی زیاتر هەیە کە ئەمن ئەوەم نەکرد. بەڵام ئەوەی ئەمن دیم، ئێرەو لە نێوخۆی وڵات خەڵک لێی ڕازی بوون، ناردمان بۆ دەرێ هەتا لەوێش بڵاو بێتەوە. ئێستاشی دەگەڵ بێ نەیانهێشت ئەو کاسێتە بڵاو بێتەوە. یانی نایێ خەڵکی دەرێ بزانن کە ئەمن جوابێکم داوەتەوەو جوابەکەش بە قازانجی حیزب بووە. جا لەو جۆرە کارانە لە هیچی ئەوێستان بەدگۆیی‌و کارشکێنی‌و شتی سەیروسەمەرە هەر هەبوو.

**هیاس کاردۆ:** کاک مستەفا هیجری وەک سکرتێری گشتیی دوای کۆنگرەی سێزدە چ هەنگاوێکی هەڵگرت بۆ ئەوەی فەزای گرژی پێشوو ماوەی کۆنگرە هێور بکاتەوە؟ بەگشتی ڕەوتی ڕووداوەکان دوای کۆنگرە چۆن تێ‌دەپەڕی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەداخەوە نەک هەنگاوێکی هەڵنەهێنایەوە، بەڵکوو بە پێچەوانە هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە بوو کە ئەو حیزبە تەسفیە بکا. دەست کرا بە موجازاتو نەقڵ‌و ئینتیقالو ساغکردنەوە. مەسەلەن ئێمە سێ ناوەندمان هەبوون. ناوەندی دوو لە کۆنفرانسەکانی پێش کۆنگرەدا زۆربەکەی بەلای ناخودی‌یەکاندا کەوتبوو. ناڕاستەوخۆ ئەوان بڕیارێکیان دابوو کە ئەوە ئی ئێمە نیە. جا وەرە لە هەموو جێیەکان هەڵگرەو بی‌گوازەوە بۆ وێ. وای لێ‌هاتبوو کە لە ناوەندی دوو ژمارەی کادرەکان زۆر زیاتر بوو لە ژمارەی پێشمەرگەکان. بیرەکە ئەوە بوو کە ئەوەی ئی من نیە با بڕوا. ئەوانی دیکە دەبێ یەکدەست بکرێنەوە.

بۆ وێنە ئێمە هێزی پارێزگاریمان هەبوو. ژمارەی پێشمەرگەکانی وەک هەموو شوێنەکانی دیکە لەگۆڕاندا بوو. مەسەلەن لە هەشتا کەس هەتا سەدو چەند کەس نەوسانی دەکرد. ئەو هێزە کادری هەردوو لای تێدا بوو. تەسفیەیان کرد هەتا لەسی‌و یەک(۳۱) کادران تەنیا یەکی لایەنەکەی دیکەیان هێشتەوە. بەڵام بۆ هیچ کۆبوونەوەیەکی ئەویان دەعوەت نەدەکرد. ئەوە لای خۆی یەک حیزب بوو. نموونەی زۆر سەیر هەبوو کە پیار ناتوانێ تەسەووری بکا.

مەسەلەن هەر پێم‌خۆشە سەبت بێ. تەلەفیزیۆن دانرا کە کارێکی باش بوو. جارێ لەت نەبووین، حیزبەکە یەک حیزبە. یادی شەهادەتی دوکتور قاسملوو و دوکتور شەرەفکەندی بەسەردا هات. یادی هەردووکانیان

کردەوە. بەڵام چونکی لەسەر جەنازەی وان ئەمن قسەم کردوە ئەو دووکەسە ئێستاش و ئێستاش نەنێژراون. لەپاش ئەو وەختیش هەتا ئێستێ مەڕاسیمی بەخاکسپاردنی دوکتۆر قاسملوو و دوکتۆر شەرەفکەندی نیشان نەدراوە چونکی ئەمنی تێدا بووم.

لەهەمووی سەیرتر بە موناسەبەتی ساڵڕۆژی دامەزرانی حیزب ناسۆی کوڕم جوزوەیەکی نووسی- چاکە یان خراپە کەیفی خۆیەتی کارم بەوە نیە - لەسەر فیدراڵیزم. دیارە زۆر لە قانووننزانان پێیان شتێکی باش بووە داوایان کردوە بۆیان بچێ. بەڵام ئەتۆ بڵێی خەراپ بووە. ئەوەی نووسی و پێشکەشیشی کرد بە یادی دامەزرانی حیزب، درا بە ئینتیشارات کە چاپ بکرێ. ئینتیشارات حازر نەبوو چاپی بکا. ئەمن لە کاک بابە عەلیم پرسی، ئەو قسەیەی لەخۆڕا ناکەم، گوتم ئەرێ ئەوە هەر چونکی ئەو کەسەی نووسیویەتی حەسەن زادەی بە دوای ناوەکەیەوەیە بۆیە بۆی چاپ نەکرا؟ گوتی وەڵڵا بێ تەئسیر نەبووە. فیدراڵیزم لە کۆنگرەی سێزدەدا پەسند کراوە. ئەو کتێبەش لەسەر فیدراڵیزم نووسراوە. " فیدراڵیزم بۆ کورد، فیدراڵیزم بە کوردی " ناوەکەی ئەوە بوو. پێشکەش بەیادی دامەزرانی حیزب کراوە بەڵام چونکە کەسێک نووسیویەتی کە حەسەن زادەی بە دوای ناوەکەیەوەیە، نابێ چاپ بکرێ. سەیر ئەوەیە هەزینەیەکی واشی نەبوو. دوایە کوڕەکان هەر بە پووڵی خۆیان چاپیان کرد. دەگەڵ ئەوەی بەشێکی زۆریشی هەر بە دیاری لێدرا بە دۆستان، بەڵام زۆر زیاتر لە خەرجەکەی دەرهێنایەوە. کەچی ئەوان وایان کرد کە هەر نابێ چاپ بکرێ.

تەنانەت لە وتارێکدا هوجووم کرابووە سەر حیزب کە ئەمن جوابەکەم نووسیەوە. بەڵام هوجوومی بۆ سەر منیش تێدا بوو. ئیجازە نەدرا وەڵامەکە لە ئەدەبیاتی حیزبدا چاپ بکرێ. یانی دیفاع لەحیزب نابێ لە ئەدەبیاتی حیزبدا چاپ بکرێ. ئەمن ناویشم نەدەویست ها، ئەیەدەن ناوم نەدەویست. چونکی یەک، دوو جار کە لە بڵاوکراوەکانی حیزبیدا ناوی من هاتوە ئیعتیڕازم کردوە. گوتوومە ئەمن مەقالە بۆ حیزب دەنووسم نامەوێ ناوی منی لەسەر بێ. بەڵام چونکی ئەمن نووسیبووم نەیانهێشت. نموونەی ئاوا باوەڕ بکە بێ حەددو حەسرن.

مەسەلەن ئەمن لەدەرێ بووم، لە ئوستڕالیاوە تەلەفۆنیان بۆ کردم کە ئێمە کۆنفرانسێکمان بەدەستەوەیە لەسەر کورد. حەتمەن جەنابیشت لە جەرەیانەکەی ئاگادار بەروی. گوتیان خەڵکی کوردیش و ئوستڕالیاییش و شەخسیاتی دیکەشی تێدا بەشدار دەبن، داوات لێ دەکەین بێی بەشدار بی. گوتم زۆر سوپاس، بەڵام بۆم ناکرێ بێمو ناتوانم هەرچەند تەعارۆفیش کرا کە هەزینەی ڕێگاش ئەوان تەئمینی دەکەن. گوتیان ئەگەر وایە پەیامێکمان بۆ بنێرە. ئەمنیش پەیامێکم بۆ ناردن. باوەڕ بکە هەر لەبیریشم چوویەوە. پاش ماوەیەک ڕاپۆرتێک هات - لە ڕادیۆم گوێ لێبوو - کە کۆنفرانسێکی وا گیراوە و سکرتێری حیزب، کاک مستەفای هیجری پەیامی ناردوە کە خوێندراوەتەوە. عەبدوڵڵا حەسەنزادەش پەیامی ناردوە خوێندراوەتەوە. ئەوڕۆ پەیامی

سکرتێری حیزبیان بڵاو کردەوە. بەرپرسی ڕادیۆش کاک عومەر باڵەکی بوو کە لەسەر لای ئێمە حیساب بوو. بەڵام ڕادیۆ هەردووک لای لێ‌بوون. گوزاریشیان بە کاک مستەفا دابوو کە ئەوە وتارێکی ناوا هەیە سبەینێ قەول وایە بخوێندرێتەوە. هەڵی گرتبوو تەلەفۆنی کردبوو ئەو وتارە نابێ بخوێندرێتەوە. بۆ؟ نەخێر نابێ بخوێندرێتەوە. قەدەغە کرا. کە بیستمەوە گەڕام بە زەحمەتێکی زۆر نەسڵی نووسینەکەی خۆم دیتەوە بزانم ئەمن چیم نووسیوە کە دەڵێ نابێ بخوێندرێتەوە. کە خوێندمەوە، نووسیبووم: دەستخۆشیتان لێ دەکەم پیرۆزباییتان پێ دەڵێم وەکوو کوردێک کە ماوەیەکی زۆر لەپێناو ئامانجەکانی کورددا خەباتم کردوە. دوای ئەوەش قسەکانی خۆم کردبوو. تەنانەت نەمنووسیبوو ئەندامی حیزبی دێمۆکراتیشم. بەڵام نابێ ئەو ناوە هەبێ. ئەوە ڕەفتارەکە بوو دەگەڵ من.

ناوەندی کۆمیتەی ئەمنییەت ڕووبەڕووی زۆری کاری من بوو. تەقریبەن هەمیشە یەکێک لەوێ ڕاوەستابوو ژوورەکەمی خستبوو ژێر چاوەدێری بۆ ئەوەی بزانن کێ دێتە کن من. جارێک چوومە کن کاک مستەفای گلەییم کردو گوتم ئەرێ بابە ئەوە چییە. یەکێک دانیشتوە دایمە بزانێ کێ دێتە کن من، بۆ وایە؟ گوتی وایە خەڵک بۆ دێتە لاتە ئەمنیش گوتم باشە ئەدی بۆ دێتە کن تۆ؟ گوتی ئەمن سکرتێرم. گوتم کاک مستەفا لەبیرت نەچێ ئەمن سکرتێر بم یان نەبم، کۆمیتەی ناوەندی بم یان نەبم، تەنانەت ئەندامی حیزبی دێمۆکرات بم یان نەبم، ئینسانێکم لەو کۆمەڵەی‌دا ژیاوم، عومرێکم هەیەو خەڵک دەمناسن. یانی خەڵک هەر دەچێتە کن سکرتێر؟ مەبەستم ئەوەیە ئەو نموونانە لە گێڕانەوە نایەن. بەڵام وەکی دیکە دووپاتی دەکەمەوە هەتا ئەمن چووبم بۆ سکرتاریای لەبەرم هەستاون و بە خێرهاتنیان کردووم. یانی لەو بارەیەوە بێ‌حورمەتیی حوزووریم لێ‌نەدیون بەڵام ئەو شتانە زۆر بوون.

**هەیاس کارەۆ:** یانی بەو حیسابە هەنگاوەکانی کاک مستەفای وەک سکرتێر لە دوای کۆنگرەی سێزدەوە زیاتر لەجیهەتی دوو دەستەیی‌دا بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نا لەجیهەتی دوو دەستەیی‌دا نەبوون لەجیهەتی یەکدەست‌کردندا بوون. ڕەنگە ئەو تەعبیرەیان لێ‌نەدایتەوە کە پێیوایە لێیشیان نەداوەتەوە بەڵام ئەو خەڵکە بەڕاستی دەیانتوانی وەک بەردە لە حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێرانی ژێر ڕێبەرایەتیی ئەواندا بمێنن. بەڵام لەوە بەولاوە حەقێکیان نەبوو. مەسەلەن لێرە لەو ساڵۆنەی کۆبوونەیەک بوو. هێندێک مەسائیل باس کران. برادەرێکیان کە دوایە بوو بە کۆمیتەی مەرکەزی و ئێستا لە دەرێ‌یەو وا دیارە ئاشت‌گەڕێتەوە، بەناوی عیرفانی ڕەهنموون نوێنەری حیزب بوو لە سلێمانی. کۆبوونەوەکە دوو ڕۆژی خایاند. ڕۆژی یەکەم هەر قسە کراو خەڵک ناویان نووسی لەسەر قسەکانی من قسان بکەن. ناوەکان وەکی باسیان کرد نەوەدو حەوت(٩٧) کەس بوون. بۆ سبەینێ‌ڕا کە قسە

کرا ئەو برادەرە هاتبۆوە. ڕۆژی یەکەم ئەو برادەرە لەوێ نەبوو ناو بنووسێ. کەچی ئەگەر لەبیرم بێ کرابووە ئەفەری هەشتەم، وەختێ قسەیان پێدابوو. قسەی کرد کە دیارە کوڕێکی بە دەموپلیشە، ئیدی وەکی کورد دڵی چاوی نووقاندنو زاری کردەوە. دەستی کرد بە هوجوومو جنێو. تەنانەت کاری گەیاندە ئەو جێیە کە گوتی دەریا بەدەمی سەگ پیس نابێ. هیچ کەس لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا چووکترین هوجوومی لەفزیی بۆ سەر کاک مستەفا یان کەسێکی دیکە لە ڕێبەری بەدەمدا نەهاتبوو. بەڵام کاک مستەفا دەریایەو ئەوانی دیکە سەگن کە ناتوانن دەریا پیس کەن. لە ئاکامدا جەووەکە ئاڵۆز بوو و ئەمن گوتم کاکە کۆبوونەوە ناکەم تەواو بوو. ئیدی تەواومان کرد.

دوایە هاتن ئیمزایان کۆ کردەوە. پێموابێ سێسەدو چەند کەس ئیمزایان کۆ کردبۆوە کە ئەو برایە بەرخوردێکی ناشیرینی کردوەو دەبێ موجازات بکرێ. خودی کاک مستەفا حەتتا لەکن منیش گوتی شتێکی موستەحەقی سزای نەکردوە هەتا سزا بدرێ. سزایان نەدا. جارێکی دانیشتبووین، چونکە زۆرجاران دادەنیشتین بۆ ئەوەی ئەو وەزعە تەواو بێ. ئەو جارە پێمگوت ئاخر ئەوە چۆن دەبێ سێسەد کەس داوای کردوە لێپرسینەوەی لێناکرێ. گوتی نە لیستم قبووڵە، نە تۆمارم قبووڵە، نە جەمعم قبووڵە. هەرکەس نارازی‌یە لە تۆرگانی خۆیو تەنیا لە تۆرگانی خۆی شکایەت بکا. ئەگەر لێیان پرسیەوە، لێیان پرسیەوە. ئەگەر لێیان نەپرسیەوە دەتوانێ ڕێیەکی دیکە بگرێ. ئەوە کەلیماتی خۆی بوو زۆر بە دەقیقی دەی‌ڵێم. هەموو ئەقڵێکیش دەزانێ ڕێگاکەی دیکە چیە، دەبێ بڕوا ئیدی. یانی ناڵێم هەموویان دەرکردن بەڵام زۆریان هەوڵدا بۆ ئەوەی خەڵکەکە وەجان بێنو بڕۆن.

مەسەلەن حاڵەتی وا هەبووە کە یەک نەفەر لە ماوەیەکی کورتی یەک، دوو مانگەدا هەشت جار ئەمبەر ئەوبەرو سزادانی بۆ کراوە هەر بۆ ئەوەی مەجبووری کەن یان تەسلیم بێ، یان بڕوا. ئەو ئیستیلاحەشم بۆ یەکەمجار لەوان بیست کە: دەپەڕیەوە هەموو شتێکت بۆ دەکەین. ناپەڕیەوە ئەوە حاڵتە.

**هەیاس کاردۆ:** یانی بەسەراحەت ئەوەیان گوترا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ بە سەراحەت گوتراوە. یانی کابرا ئەمبەر ئەوبەری کردوە. بۆیە پێیان گوتوە ئەگەر بۆ ئەولای وەپەڕێ هەموو شتێکی بۆ دەکەن. ناپەڕێتەوە بەشی زیللەتە.

**هەیاس کاردۆ:** تۆ خۆت ماوەیەکی باش دوای کۆنگرە بێدەنگ بووی‌و هیچت دەرنەبڕی. کەی‌و چۆنە بۆ دیسان هاتیەوە مەیدانو هەڵوێستت گرت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** مەسەلە ئەوە بوو کە ئەمن هیچم نەنووسیوە. بۆخۆشم هیچ نەنووسیوە. ئەگەر هەر بۆخۆم بام بە ڕەنگ بوو هەرچیم داوا کردبا بۆم بکەن بەو شەرتە زەمانم دەزاری‌دا نەبی‌و ئیعتیراز بە هیچ نەکەم. بەڵام هەوڵەکەی من ئەوە بوو کە ئەم حیزبە ئی هەمووان بێ.

**عەباس کاردۆ:** ئەو هەوڵەت چۆن دەست پێ کردەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەشی هەرەزۆری بە دانیشتنی خسووسی دەگەڵ خودی کاک مستەفا بوو. هەر دەسگوت با ئەو حیزبە وا نەبێ. قبوولی هەر نەکرد کە دوایە وای لێ‌هات دیارە خەڵکەکەش زۆریان ڕوو دەمن بوو، هاواریان لێ هەستابوو. دیارە جارێکیش پێم‌گوت، گوتم ئەو هەموو ڕقەی ئەتۆ لەمنت هەیە دەزانم لەبەر شتێکە. دەزانی ئەگەر ئەمن نەباما‌یە ئەو حیزبە هەفتەیەک دوای کۆنگرە لەت دەبوو. موقابەلەی تۆ دەگەڵ من زیاتر لەسەر ئەوەیە کە نەمهێشتوە حیزب لەت بێ. چونکی لەتبوونی ئەم حیزبە دەسکەوت نیە. هەتا جارێکی پێم‌گوت کە ئەمن بۆخۆم گوتوومە، زیاتر لە جارێکیشم ئەوە گوتوە، کە لەباری مودیرییەتەوە کاک مستەفا لەمن باشترە. یانی مودیرییەتی وی لە ئی‌من چاکترە. بەڵام ئێستا پەشیمانم لەوەی کە گوتوومە.

**عەباس کاردۆ:** کەنگێ وات گوتوە مامۆستا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** گوتوومە. تەنانەت وەختێک سکرتێر بووم، گوتوومە ئەگەر توندوتیژیی لێ‌دەرچێ مودیرییەتی وی لە ئی‌من باشتر بوو. ئێستاش جارێکی دیکە دەیڵێمەوە. بەخۆیم گوتوە، گوتوومە ئەوەی ئێرانی‌یەکان دەڵێن "قاطعیت، نەک قاتلیت". ئەتۆ جاروبار دەیگەیەنیە قاتلیت. بەڵام گوتوومە مودیرییەتت باشترە لەمن. ئێستێ پەشیمانم لەو قسەیەم، چونکی مودیرییەتی تۆ ئەم حیزبەی بەو ڕۆژە کێشاوە کە لەسەر لێواری پەرش‌وبڵاوبوونە. ئەوە مودیرییەتێکی خراپە. دەنا گوتوومە، بەڵام خۆ بە مەتبووعاتم نەگوتوە. هەر لە نێو خۆماندا کە باس کراوە زیاتر لە جارێکم گوتوە کە بۆ ئەوە باشە لەمن بەمشوورترە. بەڵام ئیدی دوایە لەو قسەیەی خۆم پەشیمان بوومەوە چونکی خۆ مودیرییەت ئەوە نیە ڕەفیقانو یارانت ئیدارە بکەی. مودیرییەتی باش ئەوەیە کە خەڵکی وڵاتەکەت ئیدارە بکەی کە هەموو جۆرە فکرو سەلیقەیەکی تێدایە.

ئەمن ئەوکات دە کۆمیتەی ناوەندی‌دا نەبووم کە جارێکی باس کرابوو کە بابە ئێمە هیچمان ناوێ بەڵام سکرتێر دەبێ سکرتێری حیزب بێ نەک سکرتێری جەناح. کاک تەیمووری مستەفایی کە ئەندامی دەفتەری سیاسی بوو گوتبووی ئەوە قسەی قۆڕە. یانی چی سکرتێر دەبێ ئی هەمووان بێ. سکرتێر دەبێ سکرتێری ڕەفیقەکانی خۆی بێ. جا خوا هەڵناگرێ کاک مستەفا بەو مانایە زۆریش سکرتێری چاک بوو.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا دوای ئەوەی ئەتۆ لەو هەوڵانەت دەگەڵ کاک مستەفا نائومێد بووی، یانی لەڕاستیدا جواب نەبوو یان توند بوو، ئەتۆ ئیدی چیت کرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** مەسەلە هەر ئەمن نەبووم، برادەرانی دیکەش بوون کە زیاتر لە منیش هەڵسووڕ بوون. ئەوجار وای لێهات کە لە بەینی خۆماندا هەیئەتێکمان پێکهێنا کە ئەمنیش دەگەڵ کەوتم.

**هەیاس کاردۆ:** ئەو هەیئەتە ئەوە بوو کە بەناوی "ئۆپۆزیسیۆن" بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ئەوە بوو کە زۆریان موناقەشە کرد کە دیارە بە نووسراوە هەمانە، نووسیومانە دەتوانین ناوێکی دیکەی لێ بنێین، نووسراوەکەت دەدەمێ. ئەوە مەسەلە نیە داخوا ناوی ئۆپۆزیسیۆن بۆ ئەوەی دروست بووە یان نا. جەمعێکمان هەبوو بۆ ئەوەی کارەکان بەڕێوە ببرێن و فکرەکان بکرێنەوە کە چ بکەین و چ نەکەین. ئەو جەمعە پێک هاتبوو لەهەشت ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی کە سێیان ئەندامی دەفتەری سیاسی بوون. کاک بابە عەلی و کاک حەسەنی ڕستگارو کاک مستەفای مەولوودی ئەندامی دەفتەری سیاسی بوون. ئەوانەو جێگرانی کۆمیتە ناوەندیی کۆنگرەی سێزدە بوون دەگەڵ ئەوانە کە لە کۆنگرەی دوازدەدا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی ببوون بەڵام هەڵنەبژێرابوونەوە. بە هەرحاڵ ئەوە ئاوا پێکهات کە بە هەمووماندوە دەبووینە دەوری بیستوپێنج کەسێک. بەڵام لەنێو ئەوانەدا کە هەموو ڕۆژێ کارو کۆبوونەوەو شتی وا هەبوو هەیئەتێکی پێنج کەسی هەڵبژێرا بوو کە ئەگەر باشم لەبیربێ ئەوانە بوون: کاک حەسەنی ڕستگار، کاک مستەفای مەولوودی، کاک قادر وریا، کاک عوسمانی ڕەحیمی بوو و ئەمن بووم. ئەو پێنجە وەک هەیئەتێکی ئیجرایی کارەکانیان بەڕێوە دەبردن، چونکی جاری وا بوو ڕۆژێ جارێک دەبا کۆ بینەوە.

ئەوجار لەسەر ئەوە دانیشتین داخوازەکانمان فۆرمووڵە کردو دەگەڵیان باسمان کرد کە باشە چۆن ئەو حیزبە بتوانێ وەک یەک حیزبی واحید کاری خۆی بکاو ئەو خەلکە چۆن خۆی دەنێو حیزبدا ببینێتەوە. ئەوە بوو کە هێندێک یادداشتمان ڕەدوبەدەڵ کردن. ئێمە داخوازێکی بیست(٢٠) ماددەییمان دابوو کە پێمان وا بوو دەبێ جێبەجێ بکرێن.

بەڵام ئەمن پێمخۆشە ئیشارە بە شتێکی نێوخۆیی بکەم کە ئەو هەیئەتە بۆخۆی ئیمزای کردوە. هەتا ئێستاش ئەو شتە بڵاو نەبۆتەوەو ئیشارەی پێ نەکراوە. یانی ئەو هەیئەتە بیستوپێنج کەسیە. بەڵگەکە دەڵێ ئەو حەرەکەتە بۆ تەقویەتی حیزبەو هەتا ئەو جێیەی مومکینە بۆ لەتبوون نیە. ئەوانەی دەگەڵ ئەو حەرەکەتەن دەبێ بە توندترین شێوە دیسیپلینی حیزبی ڕیعایەت بکەن. هیچ کەس حەقی نیە چووکترین کەلیمەی بێحورمەتی بەرامبەر بە تەرەفی موقابیل بەدەمدا بێ . ئێستا هەموویم لەبیر نیە باسی بکەم بەڵام

هێندێک شتی دیکە هەبوو پێم باشە باس بکرێن. تێیدا نووسراوە ئەو حەرەکەتە هیچ‌شتێک بە هیچ کەس قەرزدار نیە. بۆ پلەو پایە نیە، بۆ نەجاتی حیزبە. چ وەک یەک حیزب بمێنینەوەو چ ئەگەر مەجبوور بین لێک بینەوە بۆ ئەوە نیە پلەو پایە بۆ کەسێک دابین بکرێ. تەنانەت خاڵێکی تێدا بوو کە ئەو حەرەکەتە هیچ کەسیش مەجبوور ناکا بە خیلافی مەیلی خۆی پۆست وەربگرێ. تەنانەت یەک، دوو کەس ئەوەیان ئیمزا نەکرد بە ئیعتیراز لەوەی. چونکە تێ‌گەیشتبوون کە مەبەست لەخۆمە. یانی ئیمزامان کردبوو کە ئەگەر خودای نەخواستە ئەو حیزبە لەت بوو کە بەداخەوە لەت بوو، کەس ئینتیزاری نەبێ کە ئەمن حەتمەن دەبێ بەرپرسایەتی وەربگرم بە تایبەتی مەسئوولیەتی یەکەم. لەو شتانەی تێدا بوو کە هەمووی سیرفەن بۆ تەقویەتی حیزبەو یەکپارچەیی حیزب بوو.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا ئەو خاڵەی باست کرد هیچ ئیشارە بەوە نیە کە دەتانەوێ لەت بن؟ یانی ئیحتیمالی ئەوەتان لێ‌دەدا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەڵێ ئیحتیمالی ئەوەمان لێ‌دەدا. زۆرجار کە باس دەکرا، ئەمن عەینی ئەو قسەیەم ڕەنگە بەدەیان جار گوتبێ. گوتوومە هەڵبژاردنی یەکەم دووهەم دەیەم سەدەم هەزارەم یەکڕیزی حیزبی دێمۆکراتە، بەڵام ئەگەر کار گەیشتە جێگایەک کە ئەو جەمعە تەنیا سێ ڕێگای لەپێشدا بێ: یەکیان ئەوە کە کابرا بێتە کۆیلە. مۆرەیەکی بێ ئیرادە بێ‌و وەکوو نۆکەر سەیری بکرێ. دووهەم ئەوە کە پەرش‌وبڵاو ببنە مەجبوور بن یەک ڕوو بکاتە ئیجارەشو یەک ڕوو بکاتە فەعلەیی‌و یەک ڕوو بکاتە موعەللیمی‌و هەر کەس کارێک بکا. یانی وەکوو سیاسی‌و حیزبی نەمێنێ. سێهەمیشیان ئەوە بێ بە جودا فەعالییەت بکا، لەت بێ. ئەمن ئەو وەختی تەنیا لەو حاڵەتەدا سێهەمەکەی هەڵدەبژێرم. چونکە بە گوناحی دەزانم ئیوەی ناپارانی ئەو حیزبە، ئەویش ئیوەیەک کە هەمموو عومری خۆی لەو حیزبەدا سەرف کردوە وای لێ‌بێ ببێتە نۆکەر؟ یان واز لە سیاسەت بێنێ‌و پەرش‌وبڵاو بێ‌و هەرکەس بۆ لایەک بڕوا، ئەوەی بە خزمەتی میللەتی کورد نازانم. جا لەو حاڵەتەدا ئەمن بەناچار لەتبوون هەڵدەبژێرم. بۆیە ئەو ئیحتیماڵە هەر هەبوو.

زۆر کەس هەبوون کە لە مەراحیلی ئەوەڵێ‌دا هاتوون بۆلای من کە چەت بۆ دەکرێ یەکە با ئەو حیزبە لەت نەبێ. ئەوە هەتا ساڵێک ئاوا بوو. پاش ساڵێکی هەر ئەو کەسانە هاتوون گوتوویانە ئەرێ ئەتۆ داری، بەردی، چیی؟ هەتا کەنگێ ئەوەی تەحەممول دەکەی؟ ئەمن هەموو جارێ دەمگوت هەتا چل ساڵ. جا جارێکی کۆبوونەوەیەکی گەورە کراو بوو بە هەڵڵا کە هەتا کەنگێ ئەو زیللەتەی قبووڵ دەکەنو بۆ ڕێگایەکی دیکە ناگرن. ئەمن گوتم زۆری ماوە ئەوە. چونکی خەراپترین حاڵەت ئەوەیە. بەڵام لەبیرتانە زۆر لە ئێوە کە لێرە دانیشتوون بۆخۆتان هاتوون داواتان لە من کردوە کە تەبعەن ئەو حیزبە لەت بێ، کە ئەو وەختی

کاری چاکتان کردوە. ئێستاش ئەو قسەیە هەر ڕاستە. بەڵام ئەو مارەیە ئێوەی تێ گەیاندوە ئەوانە نایانەوێ ئەو حیزبە یەک بێ.

ئەمن جاری دیکەم گوتوە ئێستاش دەیڵێمەوە. ماوەیەکی چەند جەلەسەیەکمان دەگەڵ ئەوان هەبوو دادەنیشتین بۆ حەللی موشکیلەکان. هەموو جارەکان ئەگەر دەچووینە ژووری کۆبوونەوەکان، ئەگەر پێوانەیەکت گرتبا بزانی فاسیلەی ئێمەو ئەوان چەندە، کە هەڵدەستاین فاسیلەکە دەبووە سێ(٣) بەرابەر. بە هەموو وەسیلەیەک هەوڵیان دەدا کە ئەو فاسیلەیە زیاتر بێ. ئەوان بڕیاری خۆیان دابوو. لە دیدگای ئەوانەوە خێری حیزبو خێری میللەتی کورد دەودا بوو.

ئەمن با شتێکی دیکەش ئاشکرا بکەم کە ئاشکرا نەبووە. ئەو ڕۆژەی کە بەیانیەکەمان نووسی کە ئێمە ئەمانتوانی یەکڕیزی بەسەر واندا بسەپێنین بەڵام ئەوان توانیان دوولەتبوون بەسەر ئێمەدا بسەپێنن، ئیعتیراقمان بە شکستی خۆمان کرد. ئەو ڕۆژە بەیانیەکەمان نووسی بۆ بڵاوکردنەوە. گوتمان دەی‌نێرین بۆ ئەوان بەڵکەم بڵێن کاکە ئەگەر بڵاوتان نەکردۆتەوە بڵاوی مەکەنەوە. شایەد بڵێن با ئێستێ دانیشین. ئەگەر وایان گوت دیسان دادەنیشین چونکە دانیشتنەکەشیان قەتع کردبوو. وا بزانم کاک حەسەنی ڕەستگارو کاک مستەفای مەولوودی بۆیان بردن. هەروەک خەبەرێکی خۆشیان پێ بگا، هیچ داوایان نەکردبوو کە بڵاوی مەکەنەوە.

**هەیاس کاردۆ:** دەقیق چیان گوتبوو مامۆستا:

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هیچ، نەدەبوو وای لێ بێ. ئێستا کە واتان لێ کردوە بۆخۆتان دەزانن. ئیدی خەڵاس. کوڕە ئەمە شتمان دەنووسی بۆ ئەوان بە هیچ کەسمان نیشان نەدەدا. بەڵام کە ئەوان شتیان بۆ ئێمە دەنووسی بڵاو دەبۆوە. جارێکی شتێکیان بۆ من نووسیبوو. ویستم فۆتۆکۆپی بکەمو بۆ ئەو برادەرانەی دیشی بنێرم. گوتیان هەمۆ بەدەست هەموانەوە هەیە. هەر ئەو وەختێ کە بۆ ئێمەیان ناردبوو تەکسیریان کردبوو بە هەموو ئەفرادی خۆیان دابوو. هەموو شتەکانیان ئاوا بوون. یانی هیچ سرێک لە بەینماندا نەبوو. چونکی ئەوان دەیانەویست خەتەکە وا لێ بکەن ڕۆژبەڕۆژ بەرەوپێش بچێ‌و گەڕانەوەی بۆ نەبێ.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا ماوەی کاری ئۆپۆزیسیۆن چەندی گرت؟ لەو ڕۆژەوە دامەزرا هەتا ئەو ڕۆژەی لەت بوون.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە بە دیققەت نەزانم بەڵام دەوریساڵو نیوێکی خایاند.

**عەباس کاردۆ:** یانی ساڵ و نیوێک ئێوە وەک ئۆپۆزیسیۆن کارتان کرد؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** جا خۆ هەر لە هەوڵەوە دەرکراو غەیرەمەوردی بووین. بەڵام بەڵێ هەر لەو ڕۆژەوە ئەو ناوەی لێ‌نرا دەوری ساڵ و نیوێکی خایاند.

**عەباس کاردۆ:** ئەوان ئیعتیرافیان بەوە کرد کە ئۆپۆزیسیۆنێک هەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هەر وەک عەرزم کردی یەک، دوو جار دانیشتین بەڵام دوایە بۆخۆیان کۆبوونەوەیەکیان کرد بە بێ ئەوانەی ئێمە. لە کۆمیتەی مەرکەزیدا بڕیاریاندا کە دەگەڵمان دانەنیشن. نووسیشیان کە ناوی ئۆپۆزیسیۆن ناوێکی غەڵەتە. ئەوان دە دەسەڵاتدا بەشدارن و لەو قسانە. ئێمەش جوابێکمان دایەوە کە نووسیبوومان ئۆپۆزیسیۆن یانی ناڕازی، بەڵام ئەگەر پێتان وایە ئەوە خەراپە ئێمە کێشەمان نیە. هەر ناوێکی لێی دەنێن لێی بنێن. گرینگ ئەوەیە ئەو جەمعە لەو ڕەفتارە ناڕازین.

**عەباس کاردۆ:** باشە دوای ڕۆیشتنی کاک بابە‌عەلی ... یانی جیێشتنی ئەو جەمعەی ئێوە دەچوونە کۆبوونەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەختێک کاک بابە عەلی ڕۆیشت کاک لوقمان مێهفەر یش هەر ڕۆیشت. لەلای ئێمە مانەوە شەش کەس. ئەو شەش کەسە دەگەڵ ... جێگران مانەوە ئەوانە ئیدی نەدەچوونە کۆبوونەوەی.

**عەباس کاردۆ:** کاک لوقمان بۆ هەڵوێستی گۆڕی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** جا دەبێ لە خۆی پرسی. هەر لە هەوڵەوە ... چەندێک تەزەلزولی تێدا هەبوو، دوایە ئیدی کشایەوە.

**عەباس کاردۆ:** هەرچەند ڕەنگە لە هەردووک لایەن ئەفرادی توندڕۆ هەبووبن بەڵام لەلای ئەوان کەس یان کەسانێک هەبوون کە نەرم بن و بیانەوێ موسالەحەیەک بکەن؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن وای لێ‌دەگەم ئەو وەختیش وا بوو و تا ئێستاش وایە. لەلای ئێمەش هەبوون کە پێیان خۆش بوو حیزب لەت بێ. لەلای وانیش هەبوون کە پێیان خۆش بوو حیزب لەت نەبێ. بەڵام فەرقە کە ئەوە بوو کە هەتا ئێستاش هەروایە. لەلای ئێمە ئەوانەی باوەڕیان بە وەحدەتی حیزب هەبوو، پێیان خۆش نەبوو لەت بێ و هەتا ئێستێش هەر باوەڕیان پێی نیە، هەموو وەختێک هەم ئەکسەریەتی موتڵەق بوون هەم بڕیار بەدەست بوون. بەڵام لەلای ئەوان بە پێچەوانە، ئەوانەی باوەڕیان بە وەحدەتی حیزب نەبوو و پێیان خۆش بوو لەت بێ، هەم زۆرایەتی بوون و هەم بڕیاربەدەست بوون. ئەمن پێموایە ئێستێ بەوجۆرەی کە دەیسەم وەزعییەتە کە

گۆڕاوە. لەنێو ئەواندا ئەوانەی باوەڕیان بە برایەتی و تەبایی هەتا سەرحەددی بوونەوە بە یەک حیزب هەیە، دە زۆرایەتی دان. زیادیان کردوە زۆریشیان زیاد کردوە بەتایبەت لەبەدەمەدا یەکجار زیاترن. بەڵام ئەوەی بڕیاری بە دەستە ئەوانەن کە حاشا لە هەموو شتێک دەکەن.

نازانم هەر ئەو ڕۆژانە شتێک ڕووی دابوو لە حاشیەی کۆبوونەوەی کردنەوەی کۆنگرەی یەکیەتیی نیشتمانی‌دا. دۆستێکی هەردوولا یان دۆستێکی حیزبی دێمۆکرات بانگی هەردووک سکرتێری کردوە پێکەوە دانیشتوون. شک دەوەدا نیە کە کاک خالیدی عەزیزی سکرتێری حیزبی دێمۆکراتی کوردستان گوتوویەتی ئێمە هیچ شەرتێکمان نیە بۆ دانیشتن. ئێمە هەر لە سەرەتاشەوە پێمان وا بووە دەتوانین پێکەوە دانیشین و قسان بکەین هەتا ئەو وەختەی بە یەک دەگەین. تەنانەت ئەگەر زەمینەمان خوڵقاند دەبینەوە بە یەک حیزبیش. پێم- وابێ کاک خالید شتێکی زیاتر لەوەشی گوتبوو کە گوتبووی ئێمە موشکیلێکمان نیە. نە لە نێو خۆمان، نە لە نێو کورد، نە لە نێو ئێرانی‌یان و نە لە نێو دنیای دەرەوە. لە هیچ جێگایەکی موشکیلێکمان نیە موشکیلی ناو بێ. ئەو دوو ناوەش دوو ناون ناڕێک نین. بەڵام ئەگەر ئێوە بە موشکیلی دەزانن ئێوە ناوی خۆتان بگۆڕن. هەتتا گۆیا کاک مستەفا بە کوردی لێی پرسیوە کە ئیحتیمالی ئەوەی ناو بگۆڕن چەندە. ئەویش گوتوویەتی ئیحتیمالی ئەوەی سیفری موتڵەقە. ئەمن بەش بەحاڵی خۆم بە هەموو تواناوە موخالیفی گۆڕینی ناوم. ئێستا نازانم چۆنە ئەو خەبەرە کەوتۆتە سەر سایتان بەڵام تەماشا دەکەم بە ناوی سکرتاریا تەکزیبیان کردۆتەوە. دەڵێن ئەوە وا نەبووە و کابرایەک چووە، دۆستێک لە دوای ناردوە و لە دالآنێکی بۆ ماوەی پێنج، شەش دەقیقە قسەیان کردوە کە نی ئەولاش لەوێ بووە بێ ئەوەی ناوی بێنێ. لەپاشانیش ئەو شتانەی گوزاریش کراوە ئەوە ڕاست نیە و چەواشە کراوە. جا سایتەکە بۆخۆی تەوزیحێکی داوە کە پێموایێ "ڕۆژهەڵاتتایمز" بوو، دەڵێ نازانم چەواشەکە دەکوێ‌دایە. خەبەرکەی ئێمەش هەر ئەوەی دەڵێ کە ئەوان دەیڵێن کە دەڵێ هەرکامیان لەسەر هەڵوێستی خۆیان بوون. چی‌دیکە هەیە پێمان خۆشە بزانین چیمان چەواشە کردوە. یانی دەسبەجێ دژکردەوەیان بەوەش نیشان داوە کە قسەیەکی خێر کراوە.

**هەیاس کاردۆ:** لە بەینی کۆنگرەی سیزدە هەتا دوولەتبوونی حیزب، ئەوەی دیارە کێشەی نێوخۆیی زۆرترین ئێنێرژیی ڕێبەرایەتی و بەدەنەی حیزبی بەخۆوە خەریک کردبوو. لەو ماوەیەدا هیچ تێکۆشانێکی بەرچاوی وا کرا کە بۆ باس بێ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بەشێکی گرتوە بەڵام پێم وا نیە ئەو تەعبیرە ڕاست بێ، چونکی هەموو کارەکانی حیزبی بەرێوە چوون. ڕەنگە ژمارەیەکیش هەبووبن کە بێکار بوون کە یەکیان ئەمن بووم. هیچ کارێک بەمن پێشنیار نەکراوە جگە لە یەک کار. ئەویش ئەوە بوو کە ببمە مەسئولی کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤ کە

شتێکی سادە بوو. گوتم کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤ حەقی هەیە لە پێشێلکردنی مافی ئەندامانی حیزبی دێمۆکرات بپرسێتەوە یان نا؟ کامە حقووقی بەشەر؟ عادەتەن کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤ دەبێ لە حیزبایەتی و ئەوانە بەدوور بێ. ئەمن کە ئەندامێکی لەمێژینەی حیزبم چۆن دەبمە کۆمیسیۆنی حقووقی بەشەر؟ ئەمانەت پێم گوتن کە ئەگەر موافیق بن پێی بڵێین کۆمیسیۆنی دیفاع لە زیندانیانی سیاسی جا گشتی بێ یان هەر هی حیزب بێ، دەکرێ شتێکی ئاوا بێ. هەر ئەوەی دوایە دواقیەدا شتێک دروست بوو لەنێو حیزبی دێمۆکراتی کوردستاندا کە ئێمە ئێستا هەمانە، کۆمیسیۆنێک یان ئەنجومەنێکمان هەیە بۆ دیفاع لە زیندانیانی سیاسی. گوتم ئەگەر شتێکی ئاوا بێ باشە بەڵام مافی مرۆڤی چی؟ ئەمن دەتوانم بچم ئیعتیراز بکەم بە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە جمهووریی ئیسلامیدا؟ بڵێم بۆ وا دەکەن؟ بچم ئیعتیراز بە حکوومەتی هەرێمی کوردستان بکەم؟ لەپاشان لەنێو حیزبەکەمدا حەقم هەیە دیفاع لە مافی ئەندامانی حیزب بکەم؟ گوتم ئەو شتە بێناوەڕۆکە چییە؟ ڕەنگە چەند کەسێکی دیکەش کە کاریان پێ ئەسپاردبێ، یان ئەگەر پێیان ئەسپاردبێ قبووڵیان نەکردبێ. پێم وایە هەر کاک عوسمانی ڕەحیمی بوو کە کارێکیان پێ ئەسپارد بەڵام نەیکرد، کاک قادر وریاش پێموایە کارێکی نەکرد بەڵام بێکار نەبوو. ڕەنگە شتی ئاوا بووبێ دەنا کارەکانی حیزبی هەر دەچوونە پێش.

مەسەلەن لە دوای لێکبڕانی- زۆر دوای لێکبڕانی نەبوو- کە کاک مەسعوود بارزانی دەستپێشخەرییەکی کرد لە دوای ئاردبێن، لەوێ کاک مستەفا گوتی ئەوەتا ناویان حیزبی دێمۆکراتی کوردستانە و ڕۆژنامە دەردەکەن بە ناوی کوردستان و چ دەردەکەن و چ دەکەن. گوتم زۆر تەبیعییە کاکە. هەر ئەو کەسانە بوون ئیدارەیان کردووە کە ئێستاش لەسەر جێگای خۆیانن. جا زۆربەی هەرە زۆری کادرەکانی ڕۆژنامەی کوردستان، ڕادیۆی دەنگی کوردستان و بڵاوکراوەکانی دیکە، زۆربەی هەرە زۆریان ئەندامانی دەستەی نووسەرانیان سەر بەملایە بوون.

**عەباس کاردۆ:** باسی کۆبوونەوە دەگەڵ کاک مەسعوود بارزانیت کرد. گۆیا لە کۆبوونەوەیەکدا کە تۆ و کاک مستەفا دەگەڵ ویتان هەبووە، کاک مستەفا موافیقی پێشنیاری کاک مەسعوود بووە بۆ یەکگرتنەوە بەڵام تۆ بە بیانووی مەشرووتە دەگەڵ هاوڕێیانت خۆت لەژێر باری دەرهاویشتووە. دەتوانی ئەوەی شی کەیەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە یەکێکە لەو شتانە کە ئەمن لە ژیانمدا شانازییان پێوە دەکەم. هەر ئەو دیدارە بوو کە ئێمە دانیشتبووین. هەر دەستبەجێ بڵاومان کردووە بە نووسراو هەیە. ئێمە دانیشتبووین، کاک مستەفا جۆرێکی سەیری قسە کرد. گوتی چەند کەس لە حیزب ڕۆیشتوون بەڵام حیزبی دێمۆکرات هەر لەجێی

خۆیەتی. هەرکەس وەک خۆی دێتەوە وەردەگیرێتەوە. یانی لەواقیعدا گوتی ئەو خەڵکە لە بەینی دوو هەتا دە کەسن، چونکی لە هەمور زمانەکانی دنیادا "چەند" بە مانای دوو هەتا دەیە. یانی کەمتر لە دە کەس ڕۆیشتوون هەر کەس وەک خۆی نەک وەک جەمع دێتەوە با بێتەوە. یانی ئەگەر بیکەیە زمانێکی سادە گوتی ئەگەر کەسێک داوای ئەماننامە دەکا دەتوانێ با بێتەوە. ئەمن کە قسەم کرد گوتم کەس لە حیزبی دێمۆکرات نەڕۆیشتوە. حیزبی دێمۆکرات لەت بووە. حیزبێکیش لە دنیادا وجوودی نیە ئێمە بچینەوە نێوی. بەڵام ئەو لەتبوونە شتێکی داسەپاو بووە ئێمە ئامادەین کار بکەین بۆ یەکگرتنەوە.

بەینێک قسەمان کرد نەگەیشتینە هیچ نەتیجەیەک. لەپاشان کاک مەسعود بارزانی ڕووی دەمن کرد گوتی تەگبیر چیە؟ گوتم ئەمن ناڵێم قەزاوەت بکە، بەڵام جەنابت جەمعبەندی بکە بزانە چۆن دەبێ، ئەتۆ بڕیار بدە. ئەویش فەرمووی ئەگەر ئیزن بدەن ئێمە بۆخۆمان کۆ دەبینەوە مەشورەتێک دەکەین. گوتم فەرموون.

**هەیاس کاردۆ:** بۆخۆیان وەک کێ، وەک پارتی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** نەخێر وەک پارتی نەبوو، جەمعێکی زۆر بوون. کاک مەسعورد وەک سەرۆکی هەرێمی کوردستان. کاک کۆسرەت وەکوو جێگری سەرۆکی هەرێم لەوێ بوو. کاک دوکتۆر فوئاد حوسێن کە سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتیی هەرێمە لەوێ بوو. وا بزانم هەیئەتێکی پێنج نەفەری بوون کە دەقاودەق لەبیرم نیە کێ بوون. خۆلاسە ئەوان چوون مەشورەتێک بکەن. پاشان کە ماوەیەک پێکەوە دانیشتن ئەوجار ناردیان لە دووی کاک مستەفای، هەر خۆی بەتەنیا نەک هەیئەتەکەی دەگەڵی بوو. کاک مستەفا چوو زۆر لەوێ بوو. نیو سەعاتێک زیاتری خایاند. پاشان ئەو هاتەوە. ئەگەر هاتەوە بە تەشخیسی هەموومان زۆر تێکچوو بوو. ئەوجار هاتن داوای منیان کرد، ئەمنیش هەر بە تەنیا. ئەمن چووم دانیشتم. کاک مەسعورد بارزانی فەرمووی ئەمن پێشنیارێکم بە کاک مستەفای کردوە پێی باش بووە، بزانم داخوا ئەتۆ دەڵێی چی. گوتم فەرموو. گوتی پێشنیارەکە ئەوەیە کە بەیانێک دەربکەن مزگێنی بە خەڵکی بدەن کە حیزبی دێمۆکرات یەک دەخەنەوە. لەپاشان کار بکەن بۆ حەللی مەسەلەکان. ئەمن گوتم بە شتێکی باشی دەزانم بەڵام دوو تێبینیم هەن:

تێبینیی یەکەم ئەوەیە کە دەگەڵ ئەوەی دڵنیام قبووڵ دەکرێ، بەڵام ئێمە ئێستێ کۆمیتەی مەرکەزیمان هەیە. - چونکی دوای لەتبوونێ ئێمە کۆمیتە مەرکەزیمان دروست کرد- ئەوە دەبێ کۆمیتە مەرکەزی بڕیاری لەسەر بدا. دەفتەری سیاسیمان نەبوو بەڵام کۆمیتە مەرکەزی هەبوو. گوتم دڵنیام پەسندی دەکا بەڵام ئەو دەبێ بڕیاری لەسەر بدا چونکی بەتەنیا ئەو سەڵاحییەتەم نیە بڕیاری لەسەر بدەم.

دووهەمیش ئەوە بوو کە دیارە دەپێشدا پرسیم ئەو بەیانە لەلایەن کێوە دەردەچێ؟ فەرمووی بۆ ئەوەی ئیشکالی لێ پەیدا نەبێ ئەو بڵێ ئەوە حیزبی دێمۆکرات ئێمە ئەوە چ نیە، با هەر بە ناوی تۆو ناوی کاک مستەفای ئیمزا بکرێ. گوتم باشە بەڵام تێ‌بینی‌یەکم ئەوەیە کە ئەگەر مزگێنیمان داو سبەینێ یەکمان نەگرتەوە خەتای کێ بێ؟ پرسی مەبەستت چیە؟ گوتم دەبێ لەسەر هێندێک شتی ئوسوولی‌و گشتی ڕێک بکەوین. ئەوەی لەسەر دەستی جەنابت ئیمزا بکەین، جا ئەو وەختی بەیانەکە دەرکەین. دوایە دیسان پێمان‌خۆشە نوێنەری جەنابت لەوێ حازر بێ دانیشین لەسەر جوزئیات قسان بکەین. ئەگەر ڕێک نەکەوتین مەعلووم دەبێ کێ لەو ئەسڵانە لای داوە. کاک مەسعوود فەرمووی وەک چی؟ سێ، چوار خاڵم بۆ ڕیز کردن گوتم وەک ئەوانە. گوتم دەبێ لەپێشدا ئەو شتانە قبووڵ بکەین جا دانیشین بۆ قسەکردن. گوتی زۆر حیسابی‌یە. جا بەڕاستیش حیسابی بوو. چونکە هەر لەخۆڕا مزگێنیی یەکگرتنەوە بەخەڵکی دەدەی، ئەگەر یەکت نەگرتەوە خەتای کێ‌یە وەختێکی هیچ میعیارێکت نیە.

وا بوو بانگیان کردین بۆ نانخواردنێ. چووینە سەر مێزی نان خواردنێ نانمان خواردو بۆ چاخواردنەوەی چووینەوە ژوورێکی دیکە. لەوێ کاک مەسعوود ڕووی لە کاک مستەفای هیجری کردو گوتی ئەوە دەگەڵ فلان کەسی باسم کردوە. ئەویش موافیقە بۆ شتەکەی. ئەمنیش بۆ ئەوەی کاک مستەفا تێ‌بگا چۆنم موافەقەت کردوە، عەینی شتەکەی خۆم گوتەوە. گوتم ئێمە چاوەڕێ دەبین جەنابت نوێنەرێک بنێرێ لەسەر ئەو ئەسڵانەی عەرزم کردی قسە بکەین، ئەوانە ئیمزا بکەین جا ئەوجار بەیانەکە دەرکەین. یانی بۆ ئەوەی کاک مستەفا تێ‌بگا کە ئەمن هەروا نەم‌گوتوە. ئەو بەناشکوری ئەمێ هیچ بە پێویستی نەدەزانی مەشوورەت دەگەڵ کۆمیتە مەرکەزی‌یەکەی بکا کە ڕەنگە ئەوە باش نەبێ.

بە هەرحاڵ ئەوەمان گوتو هاتینەوە. پاش ماوەیەکی وا بزانم یەک حەفتەیێ، هەیئەتێک لەلایەن پارتی‌و یەکیەتی‌یەوە هات کە لە کۆبوونەوەکەی‌دا بە هیچ شتێک نەگەیشتین. دوایە هەیئەتەکە پێشنیاری بە ئێمە کرد کە بۆچوونی خۆمان لەسەر یەکگرتنەوە بنووسین. گوتم بۆ ئێمە بنووسین؟ ئێمە دوو لایەنین، دەبێ هەردوو لا بنووسین. کاک فازیل میرانی قسەیەکی کرد کە دیارە قبووڵی کرد. گوتی باشە هەردوو لا بنووسن. حەفتەیەک دانرا کە هەرلایەکمان بۆچوونی خۆمان بنووسین. قەرار بوو هەر کاممان بۆچوونەکانی خۆمان بۆ هەیئەتەکە بنێرین کە تێکەڵاوێک بوو لە یەکیەتی‌و پارتی. دوایە ئەوان دەبوایە ئەو شتانە بۆ ئێمە بنێرن. ئێمە لە ماوەی چوار ڕۆژدا شتەکەمان ئامادە کردو بۆمان ناردن. لەلاوەڕا تێ گەیشتین کە ئەوانیش شتێکیان ناردوە. بەڵام ئەو هەیئەتە نە پێشنیارەکانی وانی بۆ ئێمە ناردو نە ئیحتیمالەن ئی ئەمەشی بۆ ئەوان ناردبێ. بۆیە دەڵێم پیاو نابێ لەخۆڕا قسە بکا. ئی خۆمان دەزانم بۆمان نەهاتە بەڵام ئەمن چووزانم بۆ ئەوان چووە یان نا. هەرچەند بە دووریشی دەزانم بۆ ئەوانیشیان ناردبێ.

**هەیاس کاردۆ:** بۆ نەیان ناردەوە، دەلیلی چ بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دەلیلی نازانم. وەختێکی ئەوان نەیان ناردەوە ئێمەش ئەمان پرسیەوە. بەدوای ئەوەدا ئیدی ئەو هەوڵانەش درێژەیان پێنەدرا.

**هەیاس کاردۆ:** هیچت لەبیرە لەبارەی ڕوانگەکانی خۆتان بۆ ئەو پێکهاتنە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەی لەبیرمە ئەوە بوو کە تاقیق بکرێ لەو سزایانەی دراون. لەپاشان شتێک بکەین کە موشارەکەت هەبێ. مەسەلەن لەباری تەبلیغاتییەوە وەک یەک دەسترەسیمان بە کەرەسەی تەبلیغاتی هەبێ. لەباری ڕێبەرایەتییەوە مودیرییەتی وەک یەک هەبێ. لەباری ماڵییەوە بەرپرسایەتیی وەک یەکمان هەبێ. خۆلاسە سێ، چوار ئەسڵی کوللی کە موشارەکەتی تێدا بێ. ئێمە گوتیشمان بابە دەوران دەورانی موشارەکەتە. لە کوردستان هەڵبژاردن کرا، سێ مانگی خایاند هەتا لایەنەکان ڕێک نەکەوتن حکوومەت تەشکیل نەبوو. لە عێراقیش هەروا ئینتیخابات کرا ئەو هەمووەی پێچوو هەتا لایەنەکان ڕێک نەکەوتن حکوومەت تەشکیل نەبوو.

هەر لەو کۆبوونەوەیەدا کاک تەیموری مستەفایی گوتی موشارەکەت دەگەڵ خەڵکی دەبێ، لەنێو خۆتدا چۆن موشارەکەت دەبێ. تەوافوق چۆن دەبێ ئاوا؟ گوتم کاک تەیموور ئەتۆ لە زۆر جێیان ئەو قسەیەت کردوە با لێرە جوابت دەمەوە. ئەو قسەیەی تۆ مانای ئەوەیە کە ئەگەر سبەینێ ئێمە دەگەڵ هێزە سیاسی-یەکانی کورد دانیشتنمان بوو، دەتوانین تەوافوق بکەین و بە نەتیجەیەک بگەین و موشارەکەتێک قەبووڵ کەین. ئەگەر دوو سبەی دەگەڵ هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی قسەمان کرد، دیسان دەتوانین ڕێک کەوین و بە موشارەکەت بیکەین. ئەگەر سێ سبەی دەگەڵ جمهوریی ئیسلامی قسەمان کرد، دیسانەکە دەکرێ بە تەفاهوم و تەوافوق بگەین. بەڵام لە نێو خۆمان و دەگەڵ خۆمان حاشاوکەللا ئەوە بکەین. گوتم ئەوە بۆ هیچ کەس شانازی نیە. بە قازانجیشت نیە جارێکی دیکە بیڵێیەوە. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا ئەو ئەوەی گوت ئەمنیش ئاوام جواب دایەوە. یانی دەڵێن لەنێوخۆدا موشارەکەت نیە، تەفاهوم نیە، تەوافوق نیە. جا جارێکی پێم گوتن ئێوە لە کۆنگرەی دوازدەدا کە دە ئەقەللییەتدا بوون- بەڕاستی ئیرادیشیان لێ گرتم بەڵام چونکی گوتوومە هەر لێی پەشیمان نیم بۆ ئەوەی دەگەڵ خۆم سادق بم- گوتم بە میلی گرم و میلیمیتر موعامەلەتان دەکرد. ئێستێ بۆ کە زۆرایەتیتان وەدەست هێناوە- سەرفینەزەر لەوەی لە چ ڕێگایەکەوە بەدەستتان هێناوە- حازر بە هیچ تەفاهومێک نین؟

**عەباس کاردۆ:** زۆر کەس لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە لایەنە سەرەکییەکانی باشووری کوردستان لە سازکردنی دووبەرەکیو سەرئەنجام دوولەتکردنی حیزبدا ڕۆڵی گرینگیان گێڕاوە. جەنابت کە وەک ڕێبەری لایەنێکی کێشەکە لە مەیداندا بووی ئەوەت قبووڵە؟ ڕاستیی مەسەلەکە چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** زۆرجار مەجبوورم ئەو تەعبیرانە ڕاست کەمەوە. ئەمن قەت ڕێبەر نەبوومو بەتایبەتی ڕێبەری لایەنەکەش نەبووم. ئەمن یەکێک بووم لە عەناسیری بەڕێوەبردنی کارەکانیان. لەو بارەیەوە تۆمەتی زۆر لێدراوە بەتایبەتی کە نووسیشیان، یانی جەناحی ئەوبەر نووسیشیان کە یەکیەتی نیشتمانی دەستی تێدا هەبوو ئەوانە. ئەمن بەش بەحاڵی خۆم بە هەموو مەسئوولییەتەوە دەڵێم لەو ڕۆژەوە کە ئەو ناکۆکییانە دەتوو حیزبی دێمۆکراتدا پەیدا بوون، هەتا ئەو سەعاتەی کە ئەمنو تۆ پێکەوە قسان دەکەین، نە پێش لەتبوونی لە هیچ کەسێکی یەکیەتی نیشتمانی لەسەری هەتا خوارێیانم بیستوە یان بیستۆتەوە- چونکە ڕەنگە ڕاستەوخۆ نەتبیستبێ بەڵام لەڕێگای دیکەوە بیبیستی- کە پێی خۆش بێو تەشویق بکا بە لەتبوون، نە لە دوایە لە هیچ کەسم بیستوە یان بیستۆتەوە کە بڵێ کارێکی چاکتان کردوە. تەنانەت دەتوانم بڵێم یەکیەتیی نیشتمانی زۆریشی غەدر لێکردین هەر بۆ ئەوەی ئەوەڵەن تەشویقمان نەکا بۆ ئەوە کە ڕازی بین بە لەتبوونێ، هەم بۆ ئەوەی ئەو تۆمەتە لەسەر خۆی لابەرێ. مەسەلەن لە دابەشکردنی جێوڕێی مەنتەقەی کۆیەدا، سەرژمێریی ماڵەکانمان کرد. ماڵەکان ئەگەر دەقیق لەبیرم بێ ئێمە دووسەتو هەشت(٢٠٨) ماڵ یان دووسەتو شەش(٢٠٦) ماڵمان هەبوو. لایەنەکەی دیکە سەت و دوو(١٠٢) ماڵی هەبوو. یانی ئێمە لە دووبەرابەر پتر ماڵمان هەبوو. کەچی کە ماڵەکانیان تەقسیم کردن هێندێک خانوومان هەبوون ئامادە هێندێکیشمان بۆ ساز کرابوون بەڵام تەواو نەببوون. دوو سەتوحەفتاودوو(٢٧٢) خانوویان دا بەو سەتودوو(١٠٢) ماڵەی، سەتودوازدە(١١٢) خانووشیان دا بەو دووسەتوشەش یان هەشت ماڵەی. هەتا ئێستاشی دەگەڵ بێ کەمێک کە پێی دەڵێن "ئازادی" کە زاهیرەن بۆ ئەوان دانراوە بەینی حەفتا تا هەشتا ماڵی ئێمەی لێیە، لەحاڵێکدا خانووەکانی وان هێندە زۆر بوون کە دوو ماڵیان کردوونە یەک بۆ ئەوەی ماڵەکە گەورە بێو ئاوەدانیان کەنەوە.

عادەتەن لەنێو ئێمەدا سێ ئەندازەی خانوو هەبوو. ماڵی دوو نەفەریو سێ نەفەری ئەندازەیەک بوو. چوار نەفەریو پێنج نەفەری ئەندازەیەکو لەپێنج نەفەر هەورازتر ئەندازەیەکی گەورەتر. ئەوان ماڵی هەرە گەورەیان داوە بە ژنو مێردێک چونکە هێندەیان جێوڕێ هەیە بۆیان پڕ ناکرێتەوە. ئەوە غەدرێکی گەورە بوو لێیان کردین هەر بۆ وەی.

لایەنەکەی دیکە ئەمن بۆ یەکەم جار ئەوەی بە ڕەسمی دەڵێم. بۆخۆم هیچم ڕاستەوخۆ لێنەدیوە، بەڵام جارێکی بە کاک مستەفای هیجریم گوت. گوتم لە ئاخر سەرداناندا کە دەچووینە لای کاک مەسعوود بارزانی پێش کۆنگرەی سێزدە چووینە سەلاحەددین لە دەفتەری سیاسی لاماندا چایەکمان خواردەوە. کە

هەستاین کاک فازیل میرانیمان دەگەڵ بوو. کاک فازیل میرانی بانگی تۆی کرد گوتی کاک مستەفا وەرە دەگەڵ من سوار بە. ئەو سکرتێر بوو ئەمنیش سکرتێر بووم. جوانتر ئەوە بوو بڵێ فڵانە کەس ئەتۆ وەرە دەگەڵ من سوار بە. چونکی زاهیرەن دەو لەحزەیەدا ئەمن ئەفەری یەکەمی حیزب بووم. بەڵام ئەوە قەیدی ناکا ڕەفیقایەتیی دەگەڵ تۆ خۆشترە با وا بڵێ. بەڵام کە لە دیداری کاک مەسعوودی هاتینەوەو خوداحافیزیمان لێ کرد، کاک فازیل گوتی کاک مستەفا ئاگامان لێک دەبێ. پێم نالێی بۆچێتان ئاگا لێک دەبوو؟

وەختێک بۆ نەجاتدانی ئەو حیزبەی ئێمە هەستاین چووین هەم سەردانی مام جەلالمان کرد، هەم سەردانی کاک مەسعوودمان کرد. داوای یارمەتیمان لە هەردووکیان کرد کە وا بکەن ئەو حیزبە لەت نەبێ. نە لەت بێ‌و نە بەشێک لە ئەندامانی حیزب بینە کۆیلە. هەر لایەنی ئێمە بۆخۆمان چووین. ئەوان دنیایان پڕ کرد کە ئەوە سەربەخۆیی حیزب دەخەنە خەتەرەوەو مەسائیلی حیزبی دەبەنە کن خەڵکی دیکەو لەو شتانە. ئەمن لێرە لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا کە هەر ئێ لایەنەکەی خۆمان بوو جوابم دانەوە. گوتم ئێمەش چووینو ئەوانیش چوون. بەڵام چوونەکان چوار فەرقیان هەبوو:

یەکیان، ئەوان هەر چوونە لای لایەنێک، ئێمە چووینە لای هەر دووک لایەنی دەسەڵاتدار لە هەرێمی کوردستان.

دووهەم، ئێمە بە ئاشکرا چووین، ئەوان بە دزی چوون.

سێهەم، ئێمە بۆ پاراستنی یەکپارچەیی حیزب چووین، ئەوان بۆ تەقویەتی مەوزیعی خۆیان چوون.

چوارەم، ئێمە چووینە ئەو بنکەو بارەگایانە کە ئاسراون، بەڵام ئەوان چوونە ماڵو مەزرەعەی شەخسی.

بەڵێ زۆر لەمێژ بوو ئەوان ئەو تەرزو بەستەیان هەبوو. تەنانەت شتێکیان ساز کردبوو کە گۆیا ئەمن سەر بە یەکیەتیی نیشتمانیمو موخالیفی پارتیمو ئەوانە. جارێکم بە کاک سامی(سامی عبدالرحمان)ی ڕەحمەتی گوتو جارێکیشم بە خودی کاک مەسعوودی گوت. گوتم ئەوەیان گوتوە، ئەمن حازرم دەگەڵ هەموو کەس دانیشم با بزانین دەلیلیان بۆ ئەوە چیە. کاک سامی هیچی نەگوت بەڵام کاک مەسعوود گوتی کوا شتی وا گوتراوە؟ گوتم بفەرموو ئەمبیستوە، لەحاڵێکدا یەقینەن بیستبووی چونکی ئەوەندەیان کار لەسەر کردبوو. ئەوە یەکەمجارە لەشتێکدا کە پێموایە چاپ دەبێ ئەوەی دەڵێم.

**هەیاس کاردۆ:** تکایە ئەگەر بکرێ با باسی ڕێکەوتو ئامار بکەین. لە سازبوونی فراکسیۆنەوە هەتا لەتبوون چی گوزەراو چ کەسانێک دەوریان گێڕا؟ ڕووداوەکان چۆن تێپەڕ دەبوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** باسی کەسەکانمان کرد کە لەلای ئێمە چ کەسانێک ڕێبەری حیزبەکە بوون. باسی کەسەکانی ئەولاش هەر کرا هەرچەند ناوی هەموویان وەبیر نایەنەوە. بەڵام لەسەر ڕووداوەکان دیارە مەسەلەی زۆر هەن مەگەر کورتیان کەمەوە.

جارێ هەر لە سەرەتاوە کە دەستی پێ کرا، ئەوانە کە ئەندامی دەفتەری سیاسی بوون هەر کەسە لەبەر خۆیەوە لە دەرفەتەکانی دەفتەری سیاسی‌دا باسیان کردبوو کە بابە ئاوا نابێ. ئێستێ هەرچی بووە ئەکسەرییەتی کۆمیتەی ناوەندی بە ئێوەیە مەبارەکتان بێ. بەڵام با وا بکەین ئەو حیزبە نی هەمووان بێ، ئەو خەڵکە خۆی تێدا ببینێتەوە. ئەو لێدانەو پێدادانە نەمێنێ. ئەمن بۆخۆم چەندجار دەگەڵ کاک مستەفای بە تەنێ دانیشتم دەگەڵم باس کرد. ئەوە هیچ فایدەی نەبوو، چونکی دەستیان پێ کرد بە ئەقڵی ئینتیقالێک هەر مەپرسە، شتێکی سەیر بوو. ئەمن زۆرجارم ئەو تەعبیرە بەکار هێناوە کە ڕەنگە زۆر کەم موبالەغەی تێدا بێ، زۆر کەم. گوتم ئۆباما مەسەلەن پۆستی سەرکۆماریی لە جۆرج بووش وەرگرت. ئەندامانی پارلمانیش ئەوە جودایە، بەڵام لە ئەمریکای سێسەد میلیۆنی، بە قەت وانی ئاڵوگۆڕی مۆرەکان نەکرد. کە وای دابنێ ئاپاراتی حیزبی ئێمە هەزار کەسە. لە هەزار کەسی بە قەت سێسەد میلیۆنیان خەڵک ئاڵوگۆڕ کرد. ئەوی لابە، ئەوی بێنە، ئەوی موجازات کە، ئەوی پاڵ پێوە نێ. شتێکی زۆر سەیر بوو. هەرکەس لە ئێرێدا نەژیابا باوەڕی نەدەکرد.

جا کە ئەوە فایدەی نەبوو، ئێمە مەجبوور بووین خۆمان ڕێک خەین. ئەوە بوو کە ئەو ئەندامانەی کومیتەی ناوەندیی کۆنگرەی سێزدە کە هەشت کەس بووند سێ جێگریش، دەگەڵ ئەندامانی کومیتەی ناوەندیی کۆنگرەی دوازدە کە هەڵنەبژێردرابوونەوە دەستمان بەکار کرد. بۆیەش هەر تا کۆنگرەی دوازدەمان حیساب کرد چونکی نەمان‌دەویست زۆر گەورە بێتەوە بڕوا بۆ کۆنگرەکانی پێشتریش. بۆیە هەر ئەو دوو کۆنگرەیەمان حیساب کرد. لەو نێوەدا شتێکیشمان وەک هەیئەتی ئیجرایی پێک هێنا لە پێنج کەسان بۆ ئەوەی ئاسانتر کۆ بنەوە. پێموایە ئەوەڵ شتی ڕەسمی کە ئێمە پێمان نیشان دان، ئەو شتە بوو کە لە بیست خاڵ‌دا ئامادەمان کرد. ئەمن پێموایە بۆ ئەوەی ئەو باسە زۆر درێژ نەبێتەوە وا باشە ئەو سەنەدانە بەدوای یادداشتەکان‌دا چاپ بکەین چونکە ئێستا ناتوانم هەموو خاڵەکانی ئەو سەنەدانە وەبیر بێنمەوە. لەو بیست خاڵە دەتوانم بڵێم هەژدە خاڵیان سەرفەن مەسائیلی تەشکیلاتی‌ و ڕەفعی نابەرابەری‌ و زوڵم ئەوانە بوون. وەکوو میکانیزمێک ئەوانە پێشنیار کرابوون بۆ چارەسەری ئەو مەشکیلاتە. خاڵێکیان ئەوە بوو کە ئەگەر حیزبی دێمۆکرات تاقە دوو نەفەر ئیختیلافیان نەبایە، ئەو مەسەلەیە هەروا موهیم دەبوو بۆ منیو بۆ ڕەفیقانو بۆ خەڵکی دیکەش. ئەویش ئەو نامەیە بوو کە کاک مستەفا بۆ عەلیڕەزا ئەزمی‌ئەفشاری ناردبوو.

داستانەکە ئەوە بوو کە لێرە ڕەفیقێکی ئێمە موساحەبەیەکی کردبوو(ڕامیرد لوتفپووری)، باسی ورمێو ماکۆو ئەوانەی کردبوو. گوتبووی ئەوانە وەکوو کەرکووکی باشووری کوردستانن. دانیشتووانیان تێکەڵن لە کوردو ئازەربایجانی، بەڵام خاکەکە خاکی کوردستانە هەروەک کەرکووکیش وایە. ئەو کابرایەش کە نازانم وەختی خۆی مودیری کاک مستەفای بووە یان بازڕەسی مەداریس بووە نازانم، خۆلاسە لە ئیدارەی پەروەردەو فێرکردندا یەکتریان ناسیوە دوایەش لە دنیای دەرەوە دووبارە یەکتریان دیوەتەوەو پێوەندییان بەرقەرار بۆتەوە. نامەیەکی نووسیوە بە ئیعتیراز لەوەی، کە نامەکەی دەنووسێ کاک مستەفا ئەوەی لە دەفتەری سیاسی باس دەکا. بەڵام دەڵێ نامەیەکی خسووسییەو ئەمنیش جوابی دەدەمەوە. ئیدی نامەکەی خۆی بە برادەرانی دەفتەری سیاسی نیشان نادا. ئەزمی‌ئەفشاریش وەک پیاوان هەستا نامەکەی کاک مستەفای بڵاو کردەوە دەگەڵ وتووێژێکی گەورە. خۆلاسەی نامەکەی کاک مستەفای ئەوەیە کە ئەوەی ئەو برادەرەی ئێمە گوتوویەتی فڕی بەسەر سیاسەتی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانەوە نیەو دەقیقەن لە جیهەتی عەکسی سیاسەتی حیزبدایە. ئەوەش هەڵەیەک بووە کە ئێمە دەستوورمان داوە ئەو هەڵەیە تەسحیح بکرێو شتیوا تیکرار نەبێتەوە. کابرا دە موساحەبەکەیدا دەڵێ ئەمن وەک برا گەورەیەک نەسیحەتم کردوە، هەموو شتەکانم پێ گوتوو هەموویانم پێ قبووڵاندوە. ئەوە شتێک نەبوو لەبەر خاتری ئیختیلاف بێ. ئەگەر ئەمنو کاک مستەفا یەک جەستە باینایە، ئەو ئیشتیبایە ئەمن کردبامایەو تاقە یەک نەفەر وەبیری هێنابامەوە، دەستبەجێ داوای لێبووردنم لە میللەتی کورد دەکرد.

جا ماددەیەکی ئاوا بوو گوتبوومان ئەوە مەسەلەیەکی تەتەوەیییە. داوامان ئەوەیە یان کاک مستەفا لە ئیقدامێکی شوجاعانەدا بڵێ ئەو نامەیە هەڵە بووە. یان دەفتەری سیاسی ئەشڵێ سکرتێر خەرایی گوتوە، هەر ئەوەندە بڵێ لە نوقتەنەزەری حیزبی دێمۆکراتی کوردستانەوە ئەو شارانەی ئازەربایجانی غەربی خاکی کوردستانن. ئەوە ئیختیلافێکە بەینی ئێمەو ئازەرییەکان. ئەمن بۆخۆم پێموایە ورمێ ئەگەر یەک کوردیشی لێ‌نەبێ خاکەکەی خاکی کوردستانە. جا سەیر ئەوە بوو کابرایەکی فارس هەر لە وڵاتەکەی ئێوە ئوستڕالیا، شتێکی نووسیبوو جوابی ئەزمی ئەفشاری دابۆوە، ئەک بەدیفاع لە کورد. دەڵێ ئەو ئوستانەی ئەتۆ پێتوایە خاکی ئازەربایجانە، هەزار ساڵ پێش ئێستا یەک نەفەری لێ نەبووە تورکی بزانێ، کەچی ئەتۆ پێتوایە خاکی ئازەربایجانە. تەنانەت ئەو وەجواب هات.

تاقە یەک ماددە ئەوە بوو کە داوا کرابوو بۆ تەعادول ئەگەر سکرتێر لەوانە، جێگری سکرتێر لە ئوپۆزیسیۆن بێ. تاقە یەک ماددە. ئەویش لە نامەیەکی دیکەدا گوتمان لەوە عودوول دەکەین. ئەوەمان ناوێ. چونکی زۆریان تۆمەتی ئەوە لێ‌داین کە ئەوە بۆ مەنسەبەو ئەو شتانە. کوڕە مەنسەبی چی؟ هەزار جاری دیکەش دەیڵێمەوە ئەمن بە عاری دەزانم پیاو لەو وەزعییەتەدا وەرگرتنی پۆستی ڕێبەری یان سکرتێری لە حیزبێکدا بە

مەنسەب بزانن. لەسەر خاکی خۆت نەبی، دەسەڵاتی پووشێکت نەبی‌و بستێکت خاک لەژێر پێدا نەبێ، مەنسەب چ مانایەکی هەیە. بەڵام بە هەرحاڵ ئەو ئیتتیهامانەیان لێ‌دەداین.

هەر لە جوابی ئەو بیست خاڵەی ئێمەدا ئەوان یادداشتێکیان دا لە حەقدە(١٧)ماددە دا. ئێمە نووسیمان لەوانە چوار ماددەیان هیچ پێوەندی‌یەکیان بەو بیست ماددەیەی ئێمەوە نیە، بەڵام شتی ئوسووڵیی حیزبین. ئێمە ئەگەر بە تەوافوق گەیشتین ئەوانە ڕیعایەت دەکەین. لە سێزدەکەی دیکە تاقە یەکێکیان بە نیوەچڵی قەبووڵ کردبوو. ئەوانی دیکەیان موناقەشە کردبوو، دە واقیعدا بۆ ڕەت کردنەوە. ئێمە ئەوەمان یەک بە یەک جواب دانەوە. لە کۆتاییشدا نووسیبوومان ئێوە حەقدە ماددەتان بە دووی یەکدا ڕیز کردوە تا وا بەخەڵکی بڵێن کە گۆیا لەو بیست ماددەیە حەڤدەیتان قەبووڵ کردوە تەنیا لەسەر سێ ماددە مشتومڕمانە. بەڵام لەڕاستی‌دا قەزیەکە ئەوە بوو. جا جالیب ئەوە بوو چەند مانگ بەر لە ئێستا ئەندامی دەفتەری سیاسیی ئەوان کاک تەیموری مستەفایی لە موساحەبەیەکی تەلەفیزیۆنی‌دا بە سەراحەت ئەو کەلیمەیەی گوت. گوتی بیست ماددەیان داوا کردبوو. ئێمە حەقدەمان لێ قەبووڵ کردن بەڵام لەسەر سێ ماددە جودا بووینەوە. لە حاڵێکدا هەر وەک عەرزم کردی چوار ماددەیان پێوەندی‌یان بەو خاڵانەی ئێمەوە نەبوو. شتی دیکە بوون، ئوسووڵی بوون‌و ئێمەش گوتمان ئەوە ئوسووڵی حیزبین‌و باوەڕمان پێ‌یان هەیە. دەمێنێتەوە سێزدە. لە سێزدەکەش دوازدەیان ڕەت کردبووەوەو یەکیان بە نیوەچڵی قەبووڵ کردبوو. ئەوە سەنەدەکان هەموویان هەن‌و هیوادارم ئەتۆش بیانبینی.

بەو حاڵەش دیسان هەوڵ‌و تەقەلای زۆر دراو چەند جار دانیشتین. وەکوو دوو هەیئەت پێویستە دوو، سێ جار دانیشتین. بە ئاشکرا دیار بوو هەوڵەکە بۆ لێک‌نیزیک‌بوونەوە نیە. هەوڵی وان بۆ لێک‌دوورخستنەوە بوو. چونکی هەر پێداگری‌یان لەسەر ئەو مەوازیعەی هەیانبوو، دەکردو ئێمە تەنیا ئیتاعەمان لەسەر بوو. دێمۆکراسی بۆ ئەوان تەنیا یەک مانای هەبوو، تەبەعییەتی کەمایەتی لە زۆرایەتی. لەحاڵێکدا ئەتۆ بۆخۆت لە وڵاتی دێمۆکراتدا دەژی. ئەووەڵین خەسیەی دێمۆکراسی ڕیعایەتی حقووقی ئەقەلییەتە لەلایەن ئەکسەرییەتەوە، جا ئاخرینیان نەوەیە. ئێمە دەمانگوت‌و دەمانووسی‌و ئێستاش دەڵێین وەختێکی بڕیاری حیزبی دەدەین، ئەگەر بە تەوافوق نەگەیشتین هیچ ڕێگایەک نیە جگە لە تەبەعییەتی کەمایەتی لە زۆرایەتی. بەڵام ئەوە بەو مانایە نیە زۆرایەتی کەمایەتی بخوا. مەسەلەن ئەگەر لە وڵاتێکدا حیزبێک دەنگی زۆرینە دەباتەوەو حیزبی حاکمە، خۆ حەقی نیە هەموو پۆستەکان بۆخۆی داگیر بکاو ئەوانەکەی دیکە دەرکا. حەقی نیە تەنگیان پێ‌هەڵچنی‌و لە مافی کۆمەڵایەتی‌یان بێ‌بەش بکا. وەکی گوتم قسەی وان ئەوە بوو ئەوەی شکایەتی هەیە لە ئۆرگانی خۆی‌و تەنیا لە ئۆرگانی خۆی دەتوانی باسی بکا. لێ‌یان پرسیەوە جاکە لێ‌یان نەپرسیەوە دەتوانێ ڕێگایەکی دیکە بگرێ.

ئەوە بوو کە حەتتا دەخالەتی دۆستانو برادەرانیش بە نەتیجە نەگەیشت. مەسەلەن هەیئەت هاتبوو بۆ ئێرە. لەڕاستی‌دا بە زمانێکی زۆر سادە پێیان‌گوتن قسەی لێ مەکەن. گوتیان هیچ نیە مەسەلەیەک نیە، ئێمە دەتێو خۆماندا حەللی دەکەین. ئەمن کە قسەم کرد گوتم نا، مەسائیلی زۆر جیددیمان هەیە. ئەوەی ئێوەش بۆی هاتوون ئەمن بە دەستێوەردانی نازانم. لە پێوەندیی نێوان ئەحزابی کوردستانی‌دا زۆر تەبیعی‌یە ئەگەر گیروگرفتێک لە دەروونی حیزبێک‌دا هەبێ یان لە بەینی دوو حیزباندا هەبێ کە مەترسیی گەورەی لێ بکرێ، دەبێ قسەی خێری لەبەینیدا بکەن. بەڵام جوابی ئەوانەشیان نەدایەوە. ئەوجار لەلای کاک مەسعوودو ئەوانیش دیسانەکە ئەو ئەزموە خێریان نیشان نەدا. ئەوە بوو کە سەرەنجام ئێمە ئیعتیرافمان بە شکستی خۆمان کرد.

**عەباس کاردۆ:** ماموستا پێشتر باسی ئەوەت کرد ئیحتیمالیکان هێشتبووە کە ڕەنگە کۆتایی ئەو کێشانە بگاتە لێک‌دابڕان. پرسیار ئەوەیە بۆ ئەو دەرسەدە کەمەش پێشبینیی ئەوەتان کردبوو چۆن خۆتان بحاوێنتەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** هەموو خەڵکی کوردستان شاهیدە، ئێمە هیچ ئیمکاناتی ماڵیمان لەبەر دەستدا نەبوو، بەشی هێندێک کاروباری ڕۆژانە لە کۆمیسیۆنی ماڵی دەبەر دەستی مەدا بوو. سیستمی حیزبی دێموکرات وا بووە، دارایی‌یەکەی لەلای سکرتێرو جێگری سکرتێرە. ئەویش مانگ‌مانگ هەزینەکەی دەدا بە کۆمیسیۆنی ماڵی. کۆمیسیۆنی ماڵی چونکی دەگەڵ ئێمە بوو ڕادەیەکی زۆر کەم ڕەنگە بەشی ئیحتیاجاتی سەرجایی کەمتر لەچەند حەفتەی پارە هەبوویێ کە لەوەی کەڵکمان وەرگرت. لەپاشان ئیدی ئەمن نالێم سواڵ- چونکە بە موبالەغە ناوی سواڵی لێ دەنێ- بەڵام کەوتینە یارمەتی کۆکردنەوە لە میللەتی خۆمان. بەتایبەتی ئەمن لەو بارەیەوە زۆر ڕوودار بووم زۆر گەڕام زۆرم داوا کرد. هەتا ماوم لەبیرم ناچێ کە بە دەنگەوەهاتنی خەڵکی، بە تایبەت لە باشووری کوردستان یەکجار بەرچاو بوو.

**عەباس کاردۆ:** یانی ڕاستەوخۆ داراتان لە خەڵک کرد یان لە حیزبەکان؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** عومدەتەن لە خەڵک. چونکی حیزبەکان چەند دانەیەکن. خەڵک یارمەتیی گەورەگەورەیان پێ کردین. ڕەنگە جاروبار شتی‌وا هەبێ حیزبێک لە نێو میللەتی خۆی‌دا یارمەتی کۆ بکاتەوە، ئەمن بۆخۆم پێشتر لە نێو خەڵکی کوردستانی ئێراندا دیومە خەڵک یارمەتی بە حیزبی دێموکراتی کوردستان بکەن بەڵام حیزبێکی بەشێکی کوردستان لە بەشێکی دیکەی کوردستاندا یارمەتیی وای پێ بکرێ بێ سابیقەیە. یارمەتی‌یەکان لەپەنجا (٥٠) دۆلارەوە، یان بڵێین پەنجا هەزار (٥٠٠٠٠) دیناری عێراقی‌ڕا هەبووە هەتا پەنجا هەزار (٥٠٠٠٠) دۆلار کە یەک نەفەر داویەتی. ئێمە بناغەی کارەکەمان لەسەر ئەو جۆرە

یارمەتییانە دامەزراند. تەنانەت بەشێکی بە ناوی خوازراوەوە بڵاویشمان دەکردەوە بەڵام دوایە هێندێک مولاحەزەمان بۆ هاتن کە بڵاوکردنەوەکەمان ڕاگرت. دەنا وا بزانم هەتا چوار، پێنج ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستان بڵاومان دەکردەوە. دیارە خەڵک کە پێی خۆش نەبوو ناوی بڵاو بێتەوە بەتایبەتی کە بەشێکیان لە داخلی وڵاتدا بوون. ئێمە زیاتر بە حەرووف ناوەکانمان دادەنان کە زۆر جار حەرفەکان دەربڕی ئەسڵی ناوەکانیش نەبوون. یان کابرا بۆخۆی ناوی دەدا کە ناوای بناسێنین. مەسەلەن برایەک بۆخۆی داوای کرد کە بە ناوی دۆستێکی دوکتور قاسملوو بڵاوی کەینەوە. یەکێک داوای کردبوو بە ناوی دۆستێکی عەبدوڵڵای حەسەنزادە ناوی بڵاو بکرێتەوە.

بەڵام لەباری دیکەوە بەڵێ لە واقیعدا جۆرێک سازمانیشمان کردبوو. چونکی ئیدی مەعلووم بوو سەفەکان بەرەمبەری یەکتر ڕاوەستابوون. دیارە ئەو بەرابەریەکترڕاوەستانە لەلایەن ئێمەوە زیاتر بۆ ئەوە بوو کە واداریان بکەین بڵێن بابە ئەوە سێ کەس نین دەڕۆن. ئەوە حیزبە لەت دەبێ. بەڵام کە دەڵێن قسەی پیاواز یەکە. ئێستاشی دەگەڵ بێ قسەی وان ئەوەیە هەر چەند کەس لە حیزبی دێموکرات ڕۆیشتوون.

**عەباس کارەزا:** یانی ئێوە تەشکیلاتێکتان ساز کردبوو؟ دەتانزانی چەند کەستان دەگەڵە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە :** بەڵێ تەقریبەن مەعلووم بوو. مەسەلەن وەختێکی ئێمە کۆبوونەوەمان دەکرد، هەر ئەترادی خۆمان دەهاتن. ئەوانیش کە دەیان کرد هەروا بوو. جاری واش هەبوو کە بەسەر یەکەوە خڕ دەبووینەوە بۆ موناقەشە کە دوایە ئیدی ئەوان ڕێگایان نەدا. ئەوە هەر جارێک بوو. ئەوان قسەی خۆیان کرد. لەپاشان کە نۆرەی ئێمە هات شێوانیدیان نەیانهێشت قسەکانی خۆمان بکەین. دیارە هیچ وەختێش قسەی مە لە ڕاگەیاندنەکاندا بڵاو نەکرایەوە. بابە قسەی من هەموو غەڵەت نیە. نوسخەیەکی بیدەوە بە خۆم. ئەو قسانەی دەمانکردن تەنانەت نوسخەیان نەدەداوە بە خۆشمان. تەنیا دەدەستی خۆیاندا ڕایاندەگرتن کە ئەوەش داستانێکی درێژە. یانی تەواوی ئەسنادی موسەوەرەی ئێرمان پاش ئەتەبووتی دەنێو باخەڵاندا بردە دەرێ. جالیب بوو. ماوەیەکی زۆر هەموو شتەکە بەدەست وان بوو. مەسەلەن سکرتاریا یەک شتی دەبەر دەستی مەدا نەبوو. بەڵام موڕەتەب بە تەنێتی ئەوە شتی سکرتاریایان دزیوە بردوویانە لەجێی "ئەمن" دایان ناوە. چونکی بە هەموو تەسەووری خۆیان پێیان وابوو ئەمن داوام کردوە یەکیەتی نیشتمانی بێ هوجوومیان بکاتە سەری و بیانگرێ. ئەمن ئەقرەت لەوە دەکەم کەسێک لە حیزبێکدا یەکێکی دیکە بێنێتە سەر حیزبی خۆی. بە لەعنەتی دەکەم. ئاخر شتەکە دە سایتێکی پارتیدا بڵاو بۆوە کە ئێمە تەکزیبمان کرد. خۆدا هەڵناگرێ ئەو سایتە تەکزیبەکەی ئێمەی بڵاو کردەوە. سایتی "کوردستان تی ڤی" بوو. پاشانیش یەکیەتی نیشتمانی تەکزیبێکی توندی کرد. جا بۆیە وایان کرد.

مەسەلەی کۆنگرەمان دەگرت. ئەوە هەر ئەو تەسەووراتەی بۆخۆیان دروستیان کردوە. کۆنگرەمان لێرە گرت، یەکیەتیی نیشتمانی زۆری کۆمەگ کردو زۆری مایە لەخۆی دانا. مەعلوومە ئێران کە دۆستیانە بەوە ڕازی نیە. بەڵام هەوڵی دنیایاندا کە ئەمن قانیع بکەن ئێرە نانەمێنە. بە تایبەت لە کومیتەی ئەمنییەتەوە دەهاتن دەیانگوت خەبەرمان وەرگرتوە کە ئێران مەسائیلی زۆری بەدەستەوەیە کە بەتایبەتی لە کۆیە ئیجرای بکا. دەمگوت بێنە پێمڵێن شتەکە چیە، ئێمە لە هەموو جێگایەک خەتەرمان لەسەرە. هەر ئەوە چونکی بەو تەقلیبەتە کە بۆخۆیان هەیانبوو، پێیان وابوو ئەگەر لێرە بگیرێ ئیدی یەکیەتیی نیشتمانی دێ هەرچی پێی خوار داتێ ملی دەپەڕێنێ. لەحاڵێکدا یەکیەتیی نیشتمانی یەک نەفەری نەهاتە جێیەکی ئەوەندە نیزیک کە گوێی لە دەنگی بڵێندگۆکەی ساڵۆنی کۆنگرە بێ.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا لە ئاخرین دانیشتنتاندا کە ئیدی بڕیاری لەتبوونتاندا بۆخۆت چ هەستێکت هەبوو ئەو وەختی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن گوتم موقاوەمەتێکی یەکجار زۆرم کرد لە بەرامبەر ڕەفیقەکانی خۆماندا. بەتایبەت کە دوایە ئاوای لێهاتبوو، ئیدی بە حوستی ئیمەتترینەکانیشیان دەهاتن دەیانگوت ئەتۆ داری، بەردی؟ هەتا کەنگێ؟ ئەوی کە دەڵێن ئەگەر ئەو نەبایە ئەو لەتبوونە نەدەبوو ئەمن ئەوی قەبووڵ دەکەم. ئەوە ڕاستە. ئەمن خوازیاری لەتبوون نەبووم بەڵام لەو وەختەدا بمەوێ و نەمەوێ بوومە ڕەمزی ئەو بزووتنەوەیە. تا ئێستاشی دەگەڵ بێ ئەوان بۆ جنێو، دیارە بە فکری خۆیان بە جنێوی دادەنێن، بە ئێمە دەڵێن تاقمی حەسەنی ڕەستگار. یانی مەبەستیان ئەوەیە جارێک حەسەنی ڕەستگار جودا بۆتەوە ئێستاش هەر ئەوە هێندێک کەسی دەگەڵ خۆی بردوە لەو قسانە. بەڵام بۆخۆت دەزانی نووکی تیژی هێرشەکەیان هەمووی لەسەر منە چونکی ئەوی دەزانن. ئەوە وا بوو. ئەمنیش هەموو هەوڵم دا بۆ ئەوەی ئەوە نەبێ. بەڵام کە هیچ چارە نەما، بە مەرارەتێکی زۆرەوە، قەبووڵم کرد.

نازانم جارێکی دیکەش ئەوەم لێرە باس کردوە یان خوسووسی بۆم باس کردی. کە ئەو بەیانیەشمان نووسی، بەیانیەی تەسلیم، دەواقیعدا ئێمە تەسلیمی وان بووین. چونکی ئەوان دوازدە ساڵ بوو کاریان دەکرد بۆ لەت-کردنەوەی حیزبی دیمۆکراتو تەسحیحی ئەو خەتایە کە ئەمن یان ئێمە لە کۆنگرەی دەدا کردمان. هەمووی ئەو ماوەیە ئەوان کاریان بۆ ئەوە کردو ئێمەش موقاوەمەتمان کرد بەڵام ئاخری ئێمە تەسلیم بووین. جا کە بەیانییەکەمان نووسی، گوتمان بەڵکوو وەک ئاخر هەوڵ، بەڵکوو هەتا ئێستا بە جیددییان نەگرتبێ با دەپێش-دا پێشانی وانی بدەین بەڵکوو گوێیان وەرن مەیکەن با دانیشین حەللی کەین. بۆمان ناردن، وەکوو وەحیی ئاسمانییان بۆ بچێ ئاوایان تەماشا کردبوو. یەک قسەشیان نەکردبوو داخوا بڵاو کراوەتەوە یان نا. ئەگەر

بڵاوتان نەکردۆتەوە بڵاوی مەکەنەوە. ئەوی بۆ مەگەر ڕێگا چارە نەماوە؟ هیچ هیچ، هیچیان نەگوتبوو. زۆر بەخۆشی‌یەوە پێشوازی‌یان لێ کردبوو.

**عەباس کاروان:** لایەنی خۆتان چۆنیان وەرگرت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئێمە شتەکەمان لە خەڵکی نەشاردبۆوە. خەڵکەکە بەزۆری بەسەریاندا سەپاندین. مەسەلەن با بۆ تاریخ شتێک بە ناوی کەسێکی دیکەوە سەبت بکەم، وەکی گوتم ئێمە هەیئەتێکی پێنج کەسیمان هەبوو کە سەلاحییەتی درابۆیە کارەکان بەڕێوە بەرێ. کاک جەلیل لەخاریجی ئەو حەڵقەیەدا بوو. زۆریان موتتەهەم کردوە بەوەی کاری ویشە. بۆ تاریخ دەڵێم ڕۆژی پێش لەتبوونی هاتە ژوورەکەی من گوتی ئەکات لێ‌دەکەم ئەگەر بە مەرویەکیشەوە بمێنە مەیەڵێ پەمێ. یانی دەتوانم بڵێم ئەسەدتا نەوەد و پێنج(٩٥%) و زیاتریش خەڵکی ئێمە دەگەڵ ئەوەی لە ڕەفتاری واز بێزارو ماندوو بوون نە لەتبوونیش بێزار بوون. هەمرواتیش هەوڵی خۆیان دا بەڵام ئیدی وای لێ‌هات هەر وەک عەرزم کردی لە دوایەدا وەزاڵە هاتبوون دەیان گوت هەتا کەنگێ ئێوە ئەو زیللەتەی قەبووڵ دەکەن.

**عەباس کاروان:** دوای ڕاگەیاندنی لێک‌دابڕانو بڵاوبوونەوەی "هێڵە گشتی‌یەکان" دەرکەوت کە ئێوە دەتانەوێ ڕەوتێکی نوێ لە حیزبایەتی دەست پێ‌بکەن. ئایا باوەڕتان بەو ئاڵوگۆڕانە هەبوو کە لە هێڵە گشتی‌یەکاندا ڕیزتان کردبوون یان هەر بۆ پاساوی لێک‌دابڕان بوون؟ بەگشتی چیتان کرد کە نیشان بدەن لەو خەتەی پێشوو دوور کەوتوونەتەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن ناڵێم ئەوەی دەهێڵە گشتی‌یەکاندا هاتوە لە هەمووی‌دا سەر کەوتووین، مەعلومە هەر بەرنامەیەکی دای‌دەنێی نیسبەتی سەرکەوتن لە جێبەجێ کردنەکەی‌دا هەمیشە مەحدوودە. پێم‌وایە هیچ بەرنامەیەک لە دنیادا ئەویش بەرنامەی درێژخایەن لە ماوەیەکی کورتدا هەمووی جێبەجێ ناکرێ. بەڵام بە باوەڕی من ئەو هێڵە گشتی‌یانە نە لە بێ‌ئیمانی‌و بۆ بازاڕگەرمی بوون‌و نە ئەساسەن لە ویژدانی مەدا، یانی ئەوانە کە ئاگایان لێ‌بوو دەڵێن چی، شتێکی تازە بوون.

مەسەلەن یەکێک لەو باسانەی دەوێدا هاتوە باسێکی گەورەیە. یانی ئەوەی باس دەکا کورد میللەتێکەو کوردستان وڵاتێکەو ئەوە. ساڵی ١٣٦٨ یان ٦٩ بۆخۆم لە ڕۆژنامەی کوردستاندا نووسیومە. ساڵی ١٣٨٢ لە جێژنی بیستوپێنجی گەلاوێژدا بە وتار باسم کردوە. عەینی ئەو مەتڵەبەش لە ڕۆژنامەی ئۆرگانی حیزبدا بڵاو بۆتەوە. ئەوەی کە مەربووتە بە ئازادیی ئیرخۆ، لە نێو کۆنگرەکاندا هەنگاو بە هەنگاو کارم بۆ کردوەو چۆتە پێشێ. ئەوەی مەربووتە بە بەرابەریی ئەندامانی حیزب کە دەبێ وەک یەک تەماشا بکرێن ئەو

وەختەی ئەمن لەڕیزی پێشەوەی مەسئوولیەتدا بووم وام کردوە کە برادەرانی هاوفکر یان بەقەوڵ هاوجەناحی من بەحەق گلەیی‌یان هەبووە. چونکی ئەمن بەشی شێرم داوە بە موخالیفان. کەوابێ بۆ بازاڕگەرمی نەبووە. دیارە هێندێک کەس تەنانەت لە ژێر ئەندامانی حیزبیشدا خراپ حاڵی بوون، وا حاڵی ببوون کە گۆیا ئێمە لە ئێرانی‌بوون شۆڕاوینەوە. ئەتۆ هێڵە گشتی‌یەکان تەماشا بکە. هەر لەو کاتەدا کە پێ لەسەر تەقویەتی بیری نەتەوایەتی دادەگرێو پێوەندیی کوردەکان دەگەڵ یەکتر باس دەکا، لە عەینی حاڵدا باسی ئەوش دەکا کە چەندی یەکڕی پێوەندی دەگەڵ هێزە ئێرانی‌یەکان دەبێ پتەوتر بێ. پاشان بەرنامەو ئەساسنامەمان هەیە کە دەکۆنگرەدا پەسند کراوە. هەموو داخوازەکانی لەچوار چێوەی ئێراندایە.

با ئەوەش بڵێم هێڵە گشتی‌یەکان هەم داڕشتنیانو هەم جەوهەرە ئەساسی‌یەکەیان ئی من بووە. بەڵام بە کۆمەگی برادەرانی دیکە بەقەولی دڵێن موتوربە کراوە. بۆیە ئەمن هێڵە گشتی‌یەکان زیاتر لە شتەکانی دیکە بە ئی خۆم دەزانم. بەڵام مەسەلەن بەرنامەو ئەساسنامە ئەمن هەر حەزم دەکرد تێی‌دا نەبم. یانی ئەوەی بۆ کۆنگرەی چارە پەسند کرا بۆ یەکەم جار حەزم دەکرد تێی‌دا نەبم. لە دولیە کە بڕیاریان کرد بیم بووم دوو هەیئەتمان دانابوون کە دوو تەرح ئامادە بکەن. یەک لە دەرێ یەک لە ژووری. ئەمن لەوێ ئێرەدا بووم. بەڵام لەوێ‌دا هەیئەتێکی سێ[٣] ئەفەرمان دانا بۆ تەدوین. هەرچی بڕیاریان کرد ئەویشم قەبووڵ نەکرد. سەرئەنجام کە دوو تەرحەکە هاتنەوە لای یەک، ئەمنیشو زۆر لە برادەرانی دیکەش پێمان وا بوو لە باری تەدوینەوە ئەوەی لە دەرێ ئامادە کرابوو گونجاوترە بۆ ئەوەی بە وی دیکە تەکمیل بکرێ. یانی ئەزموان وا بوو کە ئەویان کەمتری دەستکاری دەوێ. لەوێ‌دا ئەزەریان وا بوو کە ئەمن بیانکەم بە یەک. زۆرم هەوڵدا کە ئەوەش نەکەم. بەڵام زۆریان بڕیار کرد. چونکی ئەوە شاراوە نیە لە حیزبی دێمۆکراتدا بەرنامەو ئەساسنامە یەکەم جار دوکتۆر قاسملوو نووسیویەتی‌و برادەرانی دیکە تەکمیلیان کردوە. بەڵام بەدوای ویدا هەموو جارێ یان ئەمن ئامادەم کردوە یان عونسوری ئەسڵی بووم لە ئامادەکردن یان دەستکاری کردنی‌دا. ئیدی گوتیان دەبێ ئەتۆ بیکەی، بۆیە ئەوەی لە بەرنامەو ئەساسنامەدا گۆڕدرا، بەتایبەتی لە ئەساسنامەدا، ئەمن وەکوو ئەندامێکی حیزبو وەکوو دێمۆکراتێک لە هێندێ شتدا کە پێمخۆش نیە ئیشارەیان پێ بکەم تەسلیمی بیروڕای خەڵک بووم. دەنا پێم وا بووە هێندێک شتی وای تێدایە کە عەمەلی نیە یان واقیعبینانە نیە. پێم وا بووە شتی وای تێدایە، یان مەسەلەن شتێک حوکمی شوعاری زیاتر هەیە هەتا واقیعبینی. هەر لە جەڕەیانی کۆنگرەشدا ئەمن بە عەمەد لە چەند مەوریدا پاشەکشەم لە هەڵوێستی خۆم کرد بۆ ئەوەی ڕێزم بۆ دەنگی خەڵکەکەی دیکە دانابێ بۆ ئەوەی بەحوکمی ڕیش‌سپی‌یەتی یان ئوتۆریتە یان هەر ناوێکی لێ‌دەنێی بە جۆرێکی دیکە بڕیار نەدرێ.

**عەباس کاروان:** ئەوە لەبەر ئەوە نەبوو کە فەزای حیزبایەتی‌یەکە ئەوەی پێویست بوو؟

**عەبدوڵلا حەسەن‌زادە:** نا، ئەمن ئەگەر لە کۆنگرەدا مەسئولییەتم وەر نەگرت لەبەر هێندێک هۆ بوو. وەک گوتم دەلیلی ئەسڵی لە هەموویدا ئەوە بوو کە ئەمن حەز لە مەسئولییەت ناکەم. بەڵام لەپاش ئەوەی یەکێک لە دەلیلە بە هێزەکان ئەوە بوو کە گوتم بە تەسادوفە، وا خولقابوو، ئەمن هەستم کرد کە ئەگەر لە کۆمیتەی مەرکەزیدا بم ئیحتیمالی ئەوەی ئوتۆریتەی من بەسەر کۆمیتەی مەرکەزیدا زاڵ بێ زۆرە. سەرفی ئەزەر لەوەی فشارێکی زۆریشم بۆ دەهات کە حەتمەن دەبێ سکرتێری وەر بگرم، حەتمەن ئەو فشارەم بۆ دەهات، چونکی مانیعە ئەساسی‌یەکیش نەمابوو، بەڵام ئەگەر ئەوەش نەباو هەر ئەندامی دەفتەری سیاسی یان کۆمیتەی ناوەندی بام ئەوەندێک ئوتۆریتە زاڵ دەبوو. ئەمنیش دەمەویست ئەگەر خزمەتێکم بۆ حیزبی دیمۆکراتی کوردستان لەدەست دێ لە دەرەوەی ڕێبەری بیکەم بەڵام لە ژێر ئوتۆریتەی من دەر بچێ.

جا لە کۆنگرەشدا ئەو ئوتۆریتەیە هەر حاکم بوو کە بۆ سابیت‌کردنی ئەوەی دەتوانێ ڕۆژێک لە ڕۆژان فیلمەکان چاو لێ کرێنەوە، یان دەتوانێ لە بەشدارانیش بپرسێ، بۆیە لە چەند مەورێدا بە عەمەد قسەم ئەکرد کە دەمزانی ئەگەر قسەم کردبایە- نەک بە سەپاندن بەڵام بە ئیستیدلال- لەوانە بوو نەتیجەکە شتێکی دیکە بێتە دەرێ. بۆیە بە عەمەد پاشەکشەم دەکرد بۆ ئەوەی هەموو شتێک مۆرکی منی پێوە نەبێ.

**عەباس کاروان:** ئێستا پاش چەند ساڵ، ئەگەر ئاوڕ لە ڕۆژی دوای لێک‌دابڕان بدەینەوە کارنامەی ئەم چەند ساڵەی تێکۆشانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بخەینە ژێر زەرەبین دەتوانین چی بڵێین؟ ئایا کارێک کراوە کە دەربڕی جیاوازی‌یەکانتان بێ؟

**عەبدوڵلا حەسەن‌زادە:** ئەمن پێموایە تەنیا ناشارەزاو لەوەش خراپتر موغریزان ناتوانن جیاوازی‌یەکان ببینن. دیارە وەختێکی لەت بووین جیاوازیی بەرنامەو ئەساسنامەییمان نەبوو. ئێمە تازە لەت ببووین کە هێندێک ڕۆژنامە نووس هاتن. ئەوەڵێ دەگەڵ وان قسەیان کردبوو دوایە هاتنە لای منیش. گوتیان ئێمە دەگەڵ فلانە کەسی قسەمان کردوە گوتوویەتی خۆ هیچی تازەیان پێ نیە، هەر ئەوەیە کە لە کۆنگرەی سێزدەدا پەسند کراوە. گوتم ڕاست دەکا بەڵام دەزانی بۆ؟ گوتی بۆ؟ گوتم لەبەر ئەوەی ئەسنادی کۆنگرەی سێزدە هەمووی ئێمە ئامادەمان کردوە. ئەو فکری مە بووە، ئاخر درو سەنەد لە کۆنگرەی سێزدەدا پەسند کران، ڕاپۆرتەکە ئەمن نووسیبووم، بەرنامەو ئەساسنامەش لەجێدا کاک حەسەنی ڕەستگارو کاک حوسێنی مەدەنی پێی‌دا چوونەوە. پاشان لە وەختی کۆنگرەدا کاک حوسێن لەبەر ئەوەی نەخۆش کەوت چووە سوێدو هەر لەبەر موعالەجەکەی بۆی نەکرا لە کۆنگرەدا بەشدار بێ. دیسان ئەوێشدا وەک حەقیقەت دەڵێم نەک

خۆهەڵکێشان. دوای موناقەشەو باسێکی زۆر کاک حەسەن کە دەبوو جواب بداتەوە یەک، دوو شتی جوابدانەوە گوتی یا فلانەکەس جواب بداتەوە. ئیدی ئەویش ئەمن دیفاعم لێ کرد.

ئەوە بۆ ئەودەمی بوو. بەڵام دواتر ئەتۆ تەماشای کۆنگرەی ئێمە بکەو تەماشای بەرنامەو ئەساسنامەکەمان بکە. تەماشای ئەساسنامەی وانیش بکەو بزانە هەرچی ئێمە گۆڕیومانە بەرەو دێمۆکراتیزە کردنی حیزبە. هەرچی ئەوان گۆڕیویانە بەرەو سانترالیزەکردنی زیاتری حیزب بووە. نێ ئێمە بۆ دیسانترالیزە کردنە، نێ ئەوان بۆ سانترالیزەکردنە. ئەوە فەرقێکی ئەساسی‌یە. لەپاشان لە ڕەفتاری نێوخۆدا لە هەموران ڕوونە فەرقەکە چۆنە. لێرە لەسەر سایتەکان چاو لێ بکە. ئەندامانی ئێمە لە کۆبوونەوەکاندا جاری وایە بە شێوەی بڕێک نامەنتیقیش قسەیان کردوە، بەڵام هەر ئازیزەکەی جارانن. لە ئورگانی داخلی‌دا هەر عەینی شتە. جاری وا بووە لە دەرەوەی حیزبیش ئەوە کراوە بەڵام عەینی شت. یانی هیچ هەڵوێستێکی توندیان بەنیسبەت نەگیراوە. لە حاڵێکدا ئەوان ئەندام لەسەر ئەوەی موجازات دەکەن کە مەسەلەی یەکێتی ئێمەی دیوە. لەسەر ئەوەی موجازات دەکەن کە گوتوویەتی تەبایی باشە. هەر چەند مانگی ڕابردوو چەند کەسیان لە نێو خۆیاندا سزا دا لەبەر ئەوەی بەڵگەی ئەو کەمپینەیان ئیمزا کردبوو کە داوای یەکگرتنەوەی دەکرد. هەر ئەوە کە گوتوویەتی تەبایی باشە لەسەر ئەوە سزای دەدەن. بە گشتی دوو جۆر بیرکردنەوەیە، دوو سیاسەتە، دوو مەنتیقە. پێموایە بۆ هەر کەسێک هەر کەمێک شارەزا بێ تەفاوەتەکە ئاشکرایە.

**عەباس کاردۆ:** ئەتۆ هەرچەند لە کۆنگرەی سێزدەدا خۆت بۆ ئەندامی ڕێبەری کاندید نەکردوە، بەڵام ڕێبەریی جەرەیانێکی لەتبوونت وەئەستۆ گرت. ئەوە بۆ کرا؟ چەندە ڕاستە کە بگوترێ ماموستا حەسەن زادە حیزبی لەت کرد؟ وەڵامت بۆ ئەوە چییە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** سەعدی شیرازی شێعرێکی هەیە کە دەڵێ "**گرچه تیر از کمان همی گذرد از کماندار بیند اهل خرد**". مەسەلە حەسەنزادە نییە. لە هەرکەس بپرسی دەزانێ ئەمن ئەگەر ئاخر کەس نەبووبم جوزئی دوو، سێ کەسی ئاخر بووم کە ڕەزایەتم داوە بە لەتبوونێ. بەڵام لەجێدا حیزبی دێمۆکراتی کوردستان خەتاباری لەتبوونێ نییە. لەتبوون بۆ حیزبی دێمۆکراتی کوردستان شتێکی ناخۆش بوو، بەڵایەک بوو بەسەری هات و شتێک لە خاریجی ئیرادەی ئەو بوو. بەڵام لەتکردن بۆ ئەو برادەرانەی موقابیلی ئێمە ستراتێژی بوو، کاریان بۆ کردبوو. چونکی ئەوان یەکگرتنەوەی دوای کۆنگرەی ده، ساڵی ١٣٧٥یان بە خەیانەت زانیوە. لەکن مە گوتوویانە غەڵەتە، بەڵام لە نێو خۆیاندا هەمیشە بە خەیانەتیان ناو بردوە. هەمیشەش بە نهێنی کاریان بۆ کردوە. لەو ماوەیەشدا کە پێکەوە بووین، ئەوان ڕەفتارێکیان دەکرد کە ئەمن دەڵێم هەردووک لامان موخالەفەتی جەناحبازیمان دەکرد. ئێمە دەمانەویست بە ڕێگای تەفاهوم دابین کردنی

حقووقی هەمووانو تەعەهودی ئەخلاقیدا هەوڵ بدەین دووجەناحی لەبەین بەرین. بەڵام ئەوان هەوڵیان ئەوە بوو جەناح لەبەین بەرن نەک هەوڵی جەناح‌دروست کردن نەدەن. جەناحی موخالیف دەبوو نەبێ، یان تەسلیمی موتڵەق بێ، یان ئینسانی دەرەجە دوو و دەرەجە سێ بێ، یان دەبێ بڕوا.

کەوابوو نەک هەر دروست نیە بڵێن عەبدوڵلای حەسەنزادە حیزبی لەت کرد، بە بێ تەعەسوب، ئەگەر کردیتم هیچ ئیبام نیەو دیفاعی لێ دەکەم. ئەمن ئەو نەقشەی بوومە هەموویم ئیعتیراف پێ کردووە ئیفتیرافیشی پێ دەکەم. بەڕاستی زۆر ناڕەوایە ئەگەر بڵێن ئەوانەی ئێستا حیزبی دیمۆکراتی کوردستانن ئەوانە لەتیان کرد. بەڵام هەر وەک گوتم : **گرچه تیر از کمان همی گذرد از کماندار بیند اهل خرد**، ئەو ستارتە ئێمە لێمان داوە. ئێمە گوتوومانە ئیعتیراف بە شکستی خۆمان دەکەین کە نەمانتوانی بەکرێزی بەسەر موقابیلەکانماندا بسەپێنین. بەڵام ئەوان توانیان لەتبوونمان بەسەردا بسەپێنن. بەڵام ئێمە ئیعلام دەکەین لەمە بەدواوە تێکۆشانی حیزبی خۆمان بە جودا لە ئەندامانی زۆرایەتیی کۆمیتەی مەرکەزی دەکەین.

لەپاشان نازانم پرسیارەکە ئەوەی تێدا بوو کە داخوا کارنامەکە چۆنەو چۆن نیە. ئەگەر ئەوە بێ هەر بۆخۆم دەزانم چەندم گلەیی لە حیزبی دیمۆکرات هەبووە لە ئەوێڵەوە هەتا ئێستا. یەکگرتوو، دوولەتو سێ لەتو خۆلاسە لە هەمووی. کەموکوڕیمان یەکجار زۆر بووە. ئەگەر نەیبینم کوێرم. بەڵام زۆرجار مەسائیل لە موقایەسەدا ڕوون دەبێتەوە. ئەگەر بەراورد دەکەم ڕۆژەکانی پێش لەتبوونیو پاش لەتبوونی وەبیر دێنمەوە. دوجیزبەدا هەرچی ئیمکاناتی حیزبیبە: هەمووی لە دەستی موقابیلەکانی ئەودا بوو. ڕادیۆیە، تەلەفیزیۆنە، تەنانەت ئەو سایتەی حیزبە کە ئێمە سایتی دیکەمان دانا. ئەوە لەباری تەبلیغاتی. ئیمکاناتی ماڵی، لە پووڵی ئەغدەوە بگرە هەتا ئیمکاناتی دیکە، غەیری مەسەلەن چەند دەزگا ماشێن یان ئەو پەتۆیەی پێشمەرگەکانمان پێی دەخەون، یان ئەو تفەنگەی دەشانی پێشمەرگەکانماندایە. دەنا هەمووی بەدەستی وانەوەیە.

هەموو پێوەندییەکانی دەرەوەی حیزب چ کوردستانی، چ ئێرانیو چ دەرەوەی وڵات هەموو بەدەستی وانەوەیە. چونکی بۆخۆی بڕیاری داوەو زۆریش بە بێ ئینسافی دابەشی کردوە. یانی هەڵبژاردنەکە سەیر بوو. مەسەلەن لەسلێمانی کە بنکەمان نەبوو، دامانناو بەڕپرسێکو دە، دوازدە پێشمەرگەی لێ دانران. یەک نەفەری ناسەحرەمی تێدا نەبوو، چەند کەسیان هێنا سکرتاریای، یەک دانە نامەحرەمی تێدا نەبوو. تەلەفیزیۆن دانرا یەک دانەشی تێدا نەبوو. تەشکیلات، بەرپرسی تەشکیلات هەر لەوان بووەو کاروباری داخلی بەدەست وانەوە بووە. لەچەند ساڵ بەر لە لەتبوونیشەوە ئەوە موڕەتەب کاریان کردوە لەسەر ئێمە. ناپاراتی حیزبی لێرە بەدەست وانەوە بوو چونکی سیاسی - نیزامی بەسەریان ڕادەگەیشتو ئەویش دەبەر دەستی واندا بوو.

ئێمە کە ئەو لەتبوونە بوو نوسوولەن کەوتینە تاریکاییەکەوە. یانی بۆ ئەوەی لانی کەمی دەنگ ڕۆیشتنمان هەبێ، سایتێکمان دانابوو شتێک بوو بەڵام خۆ ئێستاشی دەگەڵ بێ سایت شتێکی نەوتەم

عمومی نیە بڵێی هەموو کەس دەستی وێڕا دەگا. خەڵکێکی کەم کۆمپیوتێریان هەیەو خەڵکێکی کەمتر دەگەڵ ئینتەرنێت سەروکاریان هەیە. بەتایبەتی سایتێکیش کە نەناسراوە. بۆ ئەوەی لاتی کەمی دەنگمان بێ، تەقریبەن حەفتەیەک دوای لەت بوونەکەی کۆنفرانسێکی چاپەمەنیمان لە هەولێرێ دانا کە خەڵکێکی باش هاتبوون. بیست و یەک(٢١) ڕسانە هاتبوون. ئەوە دەنگەکەی بڵاو کردەوە. با ئەوەش بڵێم کاک مستەفاش دوای ئێمە ئەوەی کرد. بەشدارانی کۆنفرانسە مەتبوعاتی‌یەکەی هەمووی ئی خۆیان بوون. هێندێک کەسی تێدا بوون کە بۆ یەکەم جار بوو ئەو جۆرە کارانەیان دەکرد. هەموو پرسیارەکانیان بۆ نووسرابوون و زۆر جار وەڵامەکانیش دەپێشڕا ئامادە کرابوون. لەحاڵێکدا ئێمە ڕۆژنامە، ڕادیۆ، مەجەللە، و تەلەڤیزیۆنمان دەعوەت کردبوون هەر نەماندەزانی کێ هاتوە.

دەگەڵ هەمووی ئەوانەدا ئێستێ کە بەرەو چوار ساڵەی ئەو ڕووداوە دەچین - تەقریبەن سێ ساڵو نیوی لێ گوزەراوە - ئەگەر تەماشا دەکەم پێشکەوتنێکی یەکجار زۆر هاتۆتە پێشێ. کەموکوڕی‌یەکان دەڵێم زۆرن. دەگەڵ هەموو ئەو بێ ئیمکاناتی‌یەی کە هەتا ئێستاش هەمانە، ئەگەر تۆزێک واقیعبینانە تەماشای قەزیەکە بکەم پێمگە لە نیدە سیاسی‌یەکە کە هی ئیمە لە هەوەڵەوە باشتر بوو، کە هەر ئەوەش بوو بە باعیسی گەشەکردنی ئێمە، ئەو ڕۆژەی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران لەت بوو، بوو بە دوو حیزب. دەتوانم بڵێم ئەگەر تێکڕای قەزیەکە حیساب بکەین، نەک مەسەلەن کادرو پێشمەرگەی ئێرە. لەو بارەیەوە لە ژمارەی پێشمەرگەی قەدیمو کادری قەدیمو کارکوشتەو ئەوانەدا ئێمە لەسەرەوە بووین. یانی لە ئاپاراتی ئاشکرای حیزبی لێرە ئێمە لەسەرتر بووین. بەڵام لە مەجموعی شتەکاندا بگرین بە هاسانی دەتوانم بڵێم ئێمە لە باشترین حاڵەتدا دەگەیشتینە پازدە لە سەدا(١٥%). ئەوان هەشتاو پێنج(٨٥%) لەسەد بوون. بەڵام ئێستێ کە تەماشا دەکەم بۆ مِن زەحمەتە وا قەزاوەت بکەم کە پەنجا بە پەنجاین(٥٠-٥٠). چونکی لەزۆر باری گرینگەوە وا هەست دەکەم ئێمە زۆرزۆر لەپێش وانین. ئەوە نە خۆ فریودانە و نە خەڵک فریودان. یانی مەقبوولییەتمان لەلای ڕووناکبیران ئەوانەی پێیان دەڵێن بژاردەکانی کۆمەڵ یان نوخبەگانی کۆمەڵ، زۆر پترە. لە کۆڕو کۆبوونەوە نێونەتەوەیی‌یەکاندا، بەرداشتو قسەو لێکدانەوەکانی ڕێبەرایەتیی ئێمە باشتر وەر دەگیرێ.

ئەگەر ئیمکاناتی مالی‌یەکە ئاوا مەحدوود نەبایە بۆ کاروباری تەبلیغاتیی ئەوانە، لەوان وەپێش دەکەوتین. لەو شتانەشدا کە ئیمکاناتەکە وەک یەکە. مەسەلەن سایت. گرینگ نیە ئێمە چەند سایتمان هەن ئەوان چەندیان هەن. بەڵام ئی وان هیچ لە هی ئێمە باشتر نین. یان ڕۆژنامەمان هەیە. لە تێکڕای بەرنامەکان مەسەلەن ئەمن جاری وا هەبووە بەرنامەیەکی وانم دیوە زۆرم پێ جوان بووە. نەک هەر یەک، زیاتریش. بەڵام ئەگەر لەسەر یەک حیسابی بکەین ئەو ڕسانانە کە هەمانن خەڵک هی ئێمە پتر پەسند دەکەن هی ئێمە پتر

دەگەڵ ڕووحی ئەم سەردەمە دێتەوە. بۆیە پێموایە کارنامەی ئێمە لەو ماوەیەدا لەسەریەک بە موسبەت حیسابە. هەرچەند هەروەک گوتم نارێکوپێکی هەیە، هەڵەو ئیشتیبای سیاسی دەبێ. ئەو قسەیە زۆر جوانە کە دەڵێ: ئیملای نەنووسراو غەلەتی نیە. کەسێک کار دەکا هەڵەی سیاسییش دەکا. بەڵام ئەگەر کەسێک هیچ نەکا هیچ غەلەتان ناکا. ئەوانەمان هەموو هەن. کەموکوڕیمان هەیە. زۆریشمو زۆریشی پێوە ماندووین. بەڵام بە تێکڕا کە حیسابی دەکەم ئەو کارنامەیە بە کارنامەیەکی موسبەتو سەرکەوتوو دەزانم.

**عەباس کاردۆ:** دوای لەتبوون هێندێک ڕووداوی ناخۆش هاتنە پێشێ. هێندێک کەس پێیان وایە کێشەکە دوو لایەن سازی کردووە هێندێکیش پێیان وایە تەنیا لایەک دروستی کردووە. دواییەش یا دیارە هێزەکانی هەرێمی کوردستان مەجبوور بوون دەخالەت بکەن. هەروەک ئێستاش دیارە لە هێندێک بارەوە لەژێر کۆنترۆڵدا هەن. ئەوە بۆ وای لێهاتو چۆنی لێک دەدەیەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەویش یەکێکە لە عیبرەتەکانی تاریخ. ئەمن ڕەنگە لەبەر کەمدەمیم بێ، بەڵام ئێستێش تێی ناگەم ئێمە بۆ دوژمنین؟ قوربان دەستیان کرد بە هوجووم. برادەرێکمان هەبوو بە ناوی تارخی زەمانی کە ئێستاش هەر هەیە. نیزیکترین ڕەفیقەکانی لەتێو واندا بوون. وەکوو دۆست چوونەتە بەر دەرگاکەی، بانگیان کردوە. یەکێک دەستی بە دەمیدا گرتووە بە دوواییش بە چەقۆ لێیان داوە. بیستو پێنج(٢٥) چەقۆی لێ درابوون بەڵام حەڤدەیان(١٧) کاریگەر بوون. ئیدی مەسەلێک هەیە دەڵێن ئینسان بە بێئەجەل نامرێ. بە ڕاستی بۆ ئەو پێشمەرگەیە وا بوو. دەوشا دەزیستی لێدانیدا دوو قسەی زۆر تاریخییان پێ گوتبوو. یەکیان ئەوە بوو کە گوتبوویان جارێ ئەمری چەکی گەرممان پێ نیە. یەکیشیان ئەوە بوو ڕەفیقێکی هەبوو، دوو برادەر بوون هەر دووک خەڵکی سنە بوون. پێیان گوتبوو ئەویش دەتێرینە کن تۆ، تۆزێ ویش دێ.

ئێمە لە "جێژنیکان" زۆر کەمتر بووین لەوان. وا بزانم ئێمە چاردە(١٤) ماڵمان هەبوون. ئەوان پەنجاو سێ(٥٣) ماڵیان هەبوون. لەوێش دەستیان پێ کرد، جا وەرە لێنە، جا وەرە پێنا دە، جا وەرە جنێوان بدە. مەسەلەن ڕۆژێک ئێمە هەموو لێرە لە قەڵایە بووین. تەماشامان کرد بوو بە هەڵڵاو دروشمدانو جنێودانو ئەوە، ئەگەر تەماشا دەکەین جەمعێک لە سکرتارییاڕا هاتوون بۆ هەڵایساندنی فیتنەی. لێرەش فیتنەیەکی زۆریان هەڵایساند. ئیدی وای لێهات ئێمە داوامان لە هەر دووک حکوومەت کرد کە بابە ئەمنییەتمان بپارێزن. ئەو وەختە دوو ئیدارە هەبوو. ئەوان ئەوەشیان بە نۆکەری دەزانی. ئاخر باشە ئەتۆ لە وڵاتێکی دیکەدا بژی بۆ پاراستنی ئەمنییەتی خۆت داوا لە کێ دەکەی؟ ئێستا ئەتۆ لە ئوسترالیا مەسەلەیەکت بۆ بێتە پێش حیزبەکەی خۆت دەتپارێزێ یان دەبێ بە حکوومەت بڵێی؟ ئێمەش بە حکوومەتمان گوتوە.

ئاشپەزخانەمان هاوبەش بوو. ڕۆژێک لەبەر دەرکی ئاشپەزخانەی ئەو برادەرانەی ئاسایش کە هاتبوون دەستیان کردبوو بە پشکنینی. چواردە(١٤) چەقۆو پەنجە بۆکسێکو دەمانچەیەکیان گرتبوو. هەر شازدەی نی وان بوو. هیچ کەسی ئێمە هیچی پێ نەبوو. یەکێکیان کە خوێندکاری فەوقی لیسانسیش بوو، گوتبووی ئەمن لە جەماعەتی فلان کەسیم. ناوی منی بردبوو. ئاسایش گوتبوویان ئەتۆ کەیفی خۆتە جەماعەتی کێی، ئێمە کارمان ئەوەیە نالێن چەکتان پێ بێ. بە هەموو ئەقڵی خۆی پێی وا بیوو ئەگەر بڵێ لەوانم لێی وەرناگرن. جا باوەڕیشیان پێ کردبوو کە لای ئێمەیە. بەڵام گوتبوویان ئێمە کارمان بەوە نیە دەگەڵ کێی. یانی شتی سەیرو سەمەرە هەبوو لەو بارەیەوە. دیارە ئەوانە کەم‌کەمە لەسەر سایتەکان بڵاو بوونەوەو خەڵکیان لێ ئاگادار کرا. مەعمولەن ئەفرادی مە لە ئەخۆشخانەی بوونو هی ئەوانیش لە زیندانێ. جا جاری وابوو نی مەش وەبەر دەکەوتن بۆ گیرانێ بەڵام زۆرتر نی وان لە زیندانێ بوونو نی مەش لە ئەخۆشخانەی بوون. ئەوە شتێک بوو کە هەر بۆ عیبرەت دەبێ باسی بکەی.

جا گرینگ ئەوە بوو کە لە سەرەوە دەستوور دەدرا کە ئاوا بکەن. بۆ مێژوو نامەیەک هەیە. ئەو وەختەش کە ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ جوێ بیوو، بە خەتی کاک مستەفای بۆ برادەرانی "ڕۆمادی" نووسراوە کە تەشویق دەکا حەملەیان بۆ بکەن. بەڵام دەنووسێ کارێکی وا مەکەن بڕینی سەختیان لێ بێ یان... ئەوە بەخەتی خۆی نووسراوە کە ئەمن دیومە. ئەوە هەر ئەوەیە کە لە کوردەواری‌دا دەڵێ لەجێی نەرمی دە. یانی بە ئاشکرا مان دەدا بچن لە لایەنگرانی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێر بدەن. ئەوەی ئەمجاریش دەستووری مەرکەزی بوو. غەڵەتێک نەبوو بڵێی دوو پێشمەرگە دەیکەن.

## بەڵگەی (٥)

من بر این باورم که کرد ها بالذاته دشمن ما نیستند و با روشهای معقول میتوانند دوست ما نیز باشند. اگر این شرایط در هر ملت دیگری حتی برادران و خواهران عرب ایران (که امروز مطمئن ترین دوستان ما هستند) بود من زیاد حساسیت نمیداشتم، ولی ما با کردها محکوم به همزیستی هستیم و لازم نیست که عاشق هم باشیم فقط کافی است که به حقوق هم احترام بگذاریم و ما این تجربه را داشته ایم. فقط مصالح مشترک و رهبران شایسته خوش نیت و مستقل میتواند این سناریو را تجدید کند. امروز مصالح مشترک موجود است، هردو، ملتی مظلوم و مستضعف هستیم که در یکقرن اخیر آماج بیشرمانه ترین خشن ترین های حکومتهای خود بوده ایم و از مرکز نشینان، جز غارت و تطاول و اعدام و اشغال نظامی و بمباران چیزی ندیده ایم. البته بسیار ساده لوحی است اگر باور کنیم که اکراد، در سرزمین ما نظر ندارند، ولی در هیچ ملک بی صاحبی همسایگان بی نظر نخواهند بود، در مثل مناقشه نیست و این مثاله "تشبیه مع الفارق" است. در دهات ترک نشین میگویند" با گرگ هماغوشی کن ولی چوب را از دست مگذار". ما اگر اراده و قدرت نگهداری سرزمین خود را داشته باشیم، نه تنها، ما را هنگی به نفس میکند، ضمناً، دشمنان احتمالی و تطاولگران سرزمین ما را نیز به تأمل مجدد وامیدارد. زور آزمائی لازم نیست و از آن غیر ضروری تر تحریکات و تشنجات ابتدا به ساکن است.

بەشێک لە وتووێژی علیرضا نظمی افشار دەگەڵ سایتی شمس تبریز، ۱۳۸۵/۲/۲

8. ئەو کەسانەی تا ئێستا چەند جار ناویان تێکراوە ئەرکێ بەرپرسایەتی وەربگرن بەڵام ئامادە نەبوون کاری پێشنیارکراو قبووڵ بکەن ئەگەر ئامادە بن ئەرک وەئەستۆ بگرن، بە پێی لێوەشاوەیی هەرکامیان کاری شیاویان بۆ دیاری بکرێ. تەشخیسی ئەم لێوەشاوەییە بە ئۆرگانەکانە.

9. ئاییننامەکان چاویان پێدا بخشێندرێتەوەو ئەگەر مەوردی وا هەبێ کە بەر بە جووڵەی کارو ئەرکەکان بگرێ دەستکاری بکرێن. بۆ ئەو مەبەستە هەر کەس و هەر ئۆرگانێک دەکرێ پێشنیارەکانی خۆی بدا بە دەفتەری سیاسی.

10. لە کۆنفرانسەکانی دەرەوەی وڵات هەوڵ بدرێ لە هەڵبژاردنی ئەندامانی کومیتەدا موشارکەتی گشتی و "انسجام"ی تەشکیلاتیی پێوەر بێ.

11. هەروەک پێشتر هەوڵ درا کە بەرپرسی ناوەندی 2 ئەندامێکی کومیتەی ناوەندی سەر بە کەمیتە بێ بەڵام قبووڵ نەکرا ئێستا کە ئەوە یەکێک لە داواکانی هاوڕێیانە موافقین ئەم بەرپرسایەتییە بە ئەندامێکی کومیتەی ناوەندی سەر بە کەمیتە بدرێ.

12. بڕیارێک کە سەبارەت بە خوێندنی ئەندامانی رێبەرایەتی و کادرو "پ-م"ی حیزب پێش کۆنگرەی 13 دراوە نەوەندەی بکرێ جۆرێک تەنزیم بکرێتەوە کە هەم دەرفەتی زیاتر بۆ ئەو مەبەستە بڕەخسێ و هەم رێگە بە بەڕێوەچوونی کارەکانی حیزب نەگرێ.

13. لە ئەساسنامەی حیزبدا ئۆپۆزیسیۆن نەهاتووە بۆیە ناکرێ بە رەسمی بناسرێ.

14. هەموو کادرو پ-م و ئەندامانی حیزب دەبێ پەیڕەوی لە ئەساسنامەو ئاییننامەکانی حیزب بکەن.

15. لە هەموو هەلومەرجێکدا دەبێ پرنسیپە دیموکراتیکەکانی حیزب بپارێزین.

16. هەموومان بەرعوهدە بین کە بەرانبەر بە بێکاری و کەمکاری و کارشکێنی هەڵوێست بگرین.

17. پاش ساغبوونەوە لە سەر ئەم خاڵانە هەموومان بە رووحی برایەتی و یەکگرتووی بۆ بەرەوپێش بردنی بەرنامەو بەرژەوەندییەکانی حیزب هەنگاو بنێین.

1385/9/6

2006-11-27

# کۆنگرەی چاردەی حیزبی دیموکراتی کوردستان

**هیواس کاردۆ:** پێمخۆشە هەلومەرجی گرتنی کۆنگرەی چاردەتان کە یەکەم کۆنگرەی دوای لێکدابڕان بوو باس بکەی، بەرنامەڕێژیتان بۆ کۆنگرەو بەربەستەکانتان. ڕادەی بەدەنگەوەهاتنی ئەندامانی حیزبو خەلکی کورد لە ڕۆژهەلاتی کوردستان. کۆنگرە چۆن گیراو چۆن تەواو بوو؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** لەباری بەربەستەوە بە دوو مانگ، سێ مانگ بەر لە کۆنگرەی، لە نێو وڵات نیگەرانییەکی سەیر پەیدا ببوو. بەبێ شک بە دەیان تەلەفۆن، ئەگەر نەڵێم بە سەدان تەلەفۆن و ئی مەیلو ئەوە کرا کە زانیومانە حکوومەتی هەرێم، هەر دوو حکوومەتەکە - ئەو وەختی دوو ئیدارە هەبوو کە بە داخەوە ئێستاشی دەگەڵ بێ سروشتی دوو ئیدارەیی هەر ماوە، زۆر کەم بۆتەوە بەڵام هەر ماوە - هەردوو ئیدارەکە پێیان ڕاگەیاندوون کە نابێ کۆنگرە بگرن. ئەگەر کۆنگرەش بگرن دەبێ ناوی کۆنگرەی یەک(١) بێ، حەقتان نیە ناوی کۆنگرەی چاردە(١٤)ی لەسەر دانێن. ئەمن ئەو وەختی لە دوو، سێ مەوریددا مەجبوور بووم بڵێم با تەلەفۆن بۆ من بکەن. ئەگەر ژمارەی منیشیان نیە، بیاندەنێ. گوتم دڵنیا بن هەتا ئێستا هیچ کەس بە ئێمەی نەگوتوە کۆنگرە مەگرن. بە دڵنیاییەوە دەڵێم لەمەودواش هیچ کەس پێمان نالێ کۆنگرە مەگرن. بەڵام ئەگەر هەموو دنیا پێمان بڵێ، کۆنگرە مەگرن هەر دەی گرین. ئەگەر هەموو دنیاش پێمان بڵێ هەر کۆنگرەی چاردە دەگرین.

ئەو شایعاتە هەبوو. بەڵام وەکوو بەربەست لەواقیعدا بەربەستێکمان لەپێش نەبووە. هەلومەرجەکە باشتر بوو. دەگەڵ ئەوە ڕەئیی جۆراوجۆر هەبوو کۆنگرە بەرینە کوێ، گوتم کۆنگرەی تا لێرە دەگرین، لە هەموو جێگایەک باشترە. بەخۆشییەوە لایەنگرم زۆر بوون. کۆنگرەمان لە مەقەڕەکەی خۆمان گرت.

کۆنگرە ئامادەیی تەواوی بۆ کرابوو، کۆمیتەی ئامادەکردنی کۆنگرە پێشتر دامەزرابوو. ئێمە هەر لە مانگەکانی دوای لەتبوونەوە بڕیارێکمان دابوو کە دەبێ لە ماوەی شەش(٦) مانگ هەتا ساڵێک دوای لەتبووندا کۆنگرە بگرین. بەداخەوە کەمێک وەدرەنگ کەوت. دەتوانین بڵێین دوو، سێ مانگ وەدرەنگی کەوت. دەقیق سێ مانگ وەدرەنگی کەوت چونکی لە ١٦ی مانگی ڕەشەمەدا گیرا. کۆمیتەی ئامادەکردن کارەکانی خۆی کردبوون، هەڵبژاردن لە هەموو جێیەک بە شێوەی دێمۆکراتیک کرابوو. لەو کۆنگرەیەشدا وەک کۆنگرەکانی دیکەمان دوای کۆنگرەی پێنج(٥) بەداخەوە ئەندامانی حیزب لە نێوخۆی وڵات نەیانتوانی

بەشدار بن. دەنا لەباری دیکەوە هەموو کەرەسەکانی باش ئامادە کرابوون. دەنگۆی ئەوەیان بڵاو دەکردەوە کە ئیختیلافمان هەیەو بەزمان ناگیرێ. ئەمن لە کۆنگرەی سێوە هەتا کۆنگرەی چاردە، یانی لە دوازدە کۆنگرەدا بەشدار بووم. لە دوو کۆنفرانسیشدا کە بەپێی ئەساسنامە حوکمی کۆنگرەیان هەبووە بەشدار بووم. ئەوە چاردە. بە ئاسانی دەڵێم کۆنگرەم لەوە زیندووترو فەعالتر نەدیوە. لەحاڵێکدا بەرخوردی بیروباوەڕەکان یەکجار زۆر بوو، هیچ دوو جەناحێک لە مرقابیل یەکدا ڕانەوەستابوون. کەسێک کە دەگەڵ ئەزموی تۆ موخالیف بوو ڕاست لەبەر ئەوە بوو بیروباوەڕی وابە، نەک لەبەر ئەوەی ئەتۆ وا دەڵێی. بۆیە ئەمن بە جۆرێکی دیکە بیر دەکەمەوە. شتی ئاوا ئەسڵەن لەئارادا نەبوو. بەڵام بیروباوەڕی جۆراوجۆر هەبوو لەسەر مەسەلەکان بەرخوردیان دەکرد تەنیا لەبەر ئەوەی بیرو دەنگیان جودایە. لە هەموو کۆنگرەو کۆبوونەوەیەکیشدا هەڵدەکەوێ کە قسەیەک دەکرێ کە ڕەنگە گوتنەکەی بەو جۆرە باش نەبێ. ئەوەشی تێدا هەبووە. بەڵام ئەوەندەی فکری منی پێڕاگەیشتوە نیازی هەمووان هەر ئەوە بووە کۆنگرەیەکی سەرکەوتوتر بێ، پەسندکراوەکانی دروستترو جێی پەسندتر بن.

**هەبیاس کاروان:** بۆ یەکەمجار وا دیار بوو بۆ ئەزموونوەرگرتن لەسەر گەڵاڵەڕێژیی بەرنامەو ئەساسنامە خەڵکی ناحیزبییشتان بەشدار کرد. ئەوەتان بۆ کردو داخوا خێری دایەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوانەی کە کۆمەگیان کردین لەوبارەیەوە، کەمتر بوون لەوانە کە داوای یارمەتیمان لێ کردن. داوای کۆمەگمان لەزۆرکەسی دەرەوەی حیزب کرد کە دۆستی حیزب بوون. خاوەنڕابوون، هەر لەوکاتەدا دۆستی حیزبیش بوون. ئەتۆ ئەگەر شتێکی نهێنیت هەیە نابێ بێبەیە کن خەڵکی دیکە. بەڵام ئێمە نەک هەر بەرنامەمان بگرە پێڕەوی نێوخۆشمان خۆ جوزوەیەکی نهێنی نیە. چونکی چاپ دەکرێ‌و بڵاو دەکرێتەوەو دەدرێ بە هەموو لایەک. یانی وەکوو بڵاو کراوەیەکی دەرەوەحیزبی نیە. بۆیە ئەمن پێموابێ زۆر کارێکی چاکە ئەگەر بۆ کۆنگرەکانی ئایندەش داوای کۆمەگ لە خەڵکی خاوەنڕا بکەین. ئەوە کارێکی باش بوو کردمان، حەتمەن کەڵکیشی بۆ باشتر گەڵاڵەکردنی بەرنامەو پێڕەوی نێوخۆی حیزب هەبووە. هیوادارم بۆ کارەکانی ئایندەش لەو هەوڵانە هەر بدرێن.

**هەبیاس کاروان:** مامۆستا ئێوە دوای لەتبوون سەرەتا خۆتان بە ناوی "حیزبی دێموکراتی کوردستان- ئێران" ناساندو دوای کۆنگرەی چاردە ئێرانەکەش لاچوو. ئەو مانای چی بوو؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئێمە ناوی حیزبمان نەگۆڕی بەڵام ئەو وەختەی لەت بوونەکە ڕووی دا تەنیا بۆ جیاوازی دەگەڵ لایەنەکەی دیکە وامان لێ کرد. یانی بەو خەتە تیرەیە خۆمان لەوان جیا کردەوە. ویستمان

بڕیارەکە هەڵگرین بۆ کۆنگرە. هەرچەند هەر ئەو وەختیش ئەوانەی دەستەئەندرکاری کارەکان بووین باوەڕمان وا بوو ناوەکە هەر دەبێ حیزبی دێموکراتی کوردستان بێ. بە دەلایلێکی مەنتقییش وامان بیر دەکردەوە. یەکیان ئەو حیزبە هەر لەبنیڕا ئەوە بووە. هەتا ئەو وەختێ و تەنانەت هەتا ئێستاش زیاتر لە نیوەی عومری هەر حیزبی دێموکراتی کوردستان بووە. چونکی لە کۆنگرەی چوارەمدا ناوی بۆتە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران. ڕاستە لە کۆنگرەی سێشدا ئێرانی تێدا بوو بەڵام لەنێو پەڕانتێزدا بوو. یانی ناوەکە هەر حیزبی دێموکراتی کوردستان بوو. دووهەم ئەوە بوو کە ئێمە لە هەلومەرجێکدا دەژین کە خەڵک زیاتر ئیحساسات و شعووری نەتەوایەتیی تێدا بە قووەتە. بۆیە تەئکید لەسەر هوویەتی کوردستانی بۆ خەڵکەکە خۆشتر و جەزابترە. ئەوە بۆ هەمووان وایە بۆ منیش وایە و بۆ ئێوەش وایە. سێهەمیش کە ڕەنگە جانبیی بێ: ئەوە بوو کە دەگەڵ ئەو ڕەفیقانەی پێشوومان کە ناوی حیزبەکەیان حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە فەرقمان هەبێ.

جا ئیدی کە گەڵاڵەکان بۆ کۆنگرە ئامادە کران هەر دووکیان ئاوا ئامادە کرا. نەک بڵێی لە کۆنگرەدا گۆڕابێ، بەڵام کۆنگرە دەنگی پێدا. دەواقیعدا هەر بۆیە بوو کە کۆنگرە ئەو ناوەی تەعیین کردبێ. بۆیە لە ئەوڕۆڵەوە دامان ئەناو تێرمەکمان خستە بەینێ.

**عەباس کاردۆ:** بەڕێوەبەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بۆ لێکنێزیکبوونەوە یان بۆ ئەوەی بتوانن دەگەڵ ئێوە دابنیشن، پێیانوایە ئەو ناوە لێ واندو دەبێ بی گۆڕن. ئەوە لە حاڵێکدایە لایەنی دیکەش کە تووشی لێکدابڕان بوون ناوی خۆیان گۆڕیوە. مەسەلەن دەبینین ئێستا شتێک پەیدا بووە بە ناوی "گۆڕان" کە لە یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان جیا بوونەوە. یان پێشتریش کە یەکیەتیی نیشتمانی دروست بوو لەڕاستیدا لە پارتی دێموکرات جیا بۆوە. ئێوە بیانووتان چیە کە ناوی خۆتان ناگۆڕن.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێموایە مەسەلەکە ئەوە نیە. ئەوڕۆڵەن لە تاریخدا یەکجار زۆرن ئەو نموونانەی کە حیزبێک لەت بووە و هەردووک بەشەکە بەهەمان ناو تێکۆشانیان بووە. مەسەلەن ماوەیەکی زۆر حیزبی شیوعیی عێراق، دوو حیزبی شیوعیی عێراق بوون. فەرقەکەیان ئەوە بوو یەکێکیان لیژنەی مەرکەزیی هەبوو، بەشێکیان قیادەی مەرکەزی هەبوو. یەکیان ڕۆژنامەکەی ئەوە بوو یەکیان ڕۆژنامەکەی ئەمە بوو. لەسەر ئەوەی یەکتریشیان نەدەکوشت. چریکەکان یەک، دوو جار حاڵەتی ناخۆشیان کەوتە بەینێ، بەڵام کە لەت بوون بوون بە چەند دانە کە هەموویان هەر ناوی چریکیان لەسەر بوو. تەنانەت پارتی دێموکراتی کوردستانیش کە لەت بوو، بۆ ماوەیەکی زۆر هەردوو لا ناویان پارتی دێموکراتی کوردستان بوو کە بەداخەوە شەڕ و ناخۆشییان کەوتە بەینێ.

مەسەلەکە لێرەدا ئەوەیە ئەو ئیدیعایەی ئەوان دەی کەن شتێکە کە فارس پێی دەڵێ "من دراووردی". ئەوە بۆ ئی وانە؟ ناوی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بۆ ئی وانە؟ ئاخر ناوێک وەختێک دەبێتە ئی یەکێک کە بەناوی وی سەبت کرابێ. قانوون دەبێ بیداتێ. هیچ قانوونێک لەو بارەیەوە نییە. حیزبی دیمۆکراتی کوردستان ئێستاشی دەگەڵ بێ لە هیچ جێیەک لەسەر هیچ کەس سەبت نەکراوە. دوایەش ئەو دوو ناوە لە هەموو دنیایەدا دوو ناوی جیاوازن. ئێستا لە قەوانینی دنیایەدا ئەگەر دوو ناو تەنیا بە یەک وێرگوول(،) فەرقیان هەبێ سەبت دەکرێن و موجەووز وەردەگرن. تەنانەت ئەگەر کەلیمەکە بە دوو ئیملا بنووسرێ دیسان سەبت دەکرێ. مەسەلەن وای دابنێین لەوڵاتێکی لاتینی زماندا کۆمپانیایەک دروست دەبێ ناوی "حەریر"ە. حەریرەکەی دەنووسێ(HAREER)، یەکی دیکەش ناوی "حەریر"ەکە دەنووسێ(HARIR)، ئەویش موجەووز وەردەگرێ و سەبت دەکرێ.

ئەوە لەلایەک کە دیارە ئی ئێمە لەسەر هیچ کەس سەبت نەبووە. پاشان نایکەمە موناقەشە چونکە باسەکەمان زۆر درێژ دەبێتەوە. بەڵام ئەو ئەکسەرییەتەی ئەوان لە کۆنگرەی سێزدەدا بەدەستیان هێنا، بە ڕێنگایەکدا وەدەست هات کە کۆنگرەی دوازدە بە تێکڕای دەنگ بە خیانەتی زانیوە. کۆنگرەیەکی مەشرووع بڕیارێکی داوە کە ئەوان شکاندیانە و بەوە زۆرایەتییان وەدەست هێنا. جگە لەوە دەگەڵ هەموو ئەو تەفاوەتەی هەمانە، ئەوەی پێی دەڵێن ئیسکلێت یان پەیکەری ئەساسیی هەر دووک حیزبەکە، ئەگەر لێکی بدەیەوە بەشی هەرە زۆری ئەوانەی کە کۆنترن و پتریان زەحمەت بۆ کێشاوە و پێناسەی حیزبن، هەر دەگەڵ حیزبی دیمۆکراتی کوردستانن. بەڵام دەگەڵ هەمووی ئەوانە زۆر شتێکی نامەنتیقییە کە ئێمە بڵێین شانازییەکانی حیزب، شەهیدەکانی و ڕابردووەکەی هەر ئی ئێمەیە. بە تەریقی ئەولا ئەگەر ئەوان ئەوەی بڵێن زۆر هەڵەترە. چونکی لە ڕێبەرایەتییەکەیاندا تەنیا یەک ئەفەریان هەیە کە بۆخۆی ئیدیعا دەکا- ئەمن بۆم سابیت نەبووە- کە پێش ساڵی ١٣٥٨ ئەندامی حیزب بووە. دەنا هەموویان دوای ئەو وەختی بوونە ئەندامی حیزب. لە ٢٤ەوە هەتا ٥٨ دەبێتە ٣٤ ساڵ. ٣٤ ساڵ هەیە کە ئەوانە هەر ئەندامی حیزب نەبوون. ئێستێ ئەو حیزبە بۆ ئی وانەو بۆ ئی ئەوانە نییە کە زۆر پێشتر تێیدا بوون. ئەوەی کە فارس دەڵێ "تێسکیان تێیدا هاوردراوە".

بۆیە ئێمە بە پێی هیچ شتێکی قانوونی ئەو حەقە بە ئی وان نازانین، هەروەک بە حەقی ئینحیساریی خۆشمانی نازانین. ئەو دوایییانە دیدارێکی ئیجباری بوو بەینی سکرتێری ئەو سکرتێری وان. بیستم کە کاک خالیدی عەزیزی پێی گوتوە ئێمە موشکیلێک نابینین، ئەگەر ئێوە موشکیلێک دەبینن ئێوە بی گۆڕن. یانی سەیرە هەر بۆخۆی دەڵێ و بۆخۆشی باوەڕی پێ دەکا. باشە ئەوە تە دەگەڵ هەموو حیزبە کوردستانی-یەکان ئێمەش پێوەندیمان هەیەو ئەوانیش هەیانە. دەگەڵ کۆمەڵگای نێونەتەوەیی، لە هیچ جێگایەک ئەوە

نەبووەتە کۆسپ کە ئێمە ئاومان نەبوبێ. مەسەلەن کۆنگرەی ئەنتەرناسیۆناڵ سۆسیالیست گیراوە کە جامیعەیەکی ئێوە تەوجی یە. هەردووکمانی تێدا بین، هەر دوو حەوتەی دیکە ئیجلاسی ئەنتەرناسیۆنالی سۆسیالیست دەگیرێ کە هەر دووک لامان دەعوەت کراوین. گوتم ئەوە یەکیەتیی نیشتمانی کۆنگرەی گرتوە، هەر دووکمانی لێ بووین. یانی ئەو بۆخۆی دای ناوە دەبێ ئاوا بێ. حەتمەن دەزانن ئەوە بەمانایەکی مەنتیقی نیە، بەڵام دەبێ شتێک بۆ ناتەبایی بیبیننەوە. وەکی عەرزم کردی ئەو بۆخۆی ئیعتیراف دەکا ئەمن قورەتی خۆم لە یەکڕیزیی حیزبدا دەبینم. بەڵام ئەو قورەتی خۆی لەوەدا دەبینێ.

**عەباس کاروان:** بۆ لە کۆنگرەی چاردەدا خۆت بۆ ئەندامەتیی ڕێبەری کاندیدا نەکردەوە؟ ئایا ئەوە بە مانای کۆتایی کاری سیاسیت لە بواری ئیجرایی دایە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** وەڵامی ئەو پرسیارەم داوەتەوە پێم خۆش نیە تیکراری کەمەوە. ئەمن گوتم هەر لەمەوبەرەوە قەت خوازیاری ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندی نەبووم. بۆ کاری ئیجراییش بەڵێ بە مانای کۆتایی کاری ئیجرایی یە. ئەمن ئێستا لە دوورو نیزیک هیچ ئیرتیباتێکم بە کاری ئیجرایی حیزبەوە نیە. حەتتا دوێنێ بۆخۆشت لەوێ بووی برادەرێک گوتی دەمەوێ وتووێژێکت دەگەڵ بکەم. گوتم ئەگەر موساحەبەی سیاسی دەکەی ئەوە سیاسی یەکان هەن دەگەڵ ئەوانی بکە. ئەگەر باسی گوڵ و بولبول و شێعرو شاعیرییش دەکەی دەخزمەت دام.(مەبەستی مامۆستا میوانداری یەکە کە ڕۆژی پێش ئەو پرسیارانە لە سکرتاریای حیزبی دێموکراتی کوردستان بۆ ژمارەیەک ڕۆژنامە نووس و ڕووناکبیری باشووری کوردستان ساز کرابوو کە بۆ سەردانی خۆی هاتبوون. منیش بەشدار بووم. عەباس). دیارە ئەمە بەو مانایە نیە کە ئەمن هیچ وەخت لەسەر مەسایلی سیاسی وتووێژ ناکەم. بەڵام ئەگەر باس باسی هەڵوێستەکانی حیزب بێ بە باش دەزانم بەرپرسانی ئەمڕۆی حیزب قسەیان لەسەر بکەن. مەگەر لەو حاڵەتانەدا کە سیاسەت و هەڵوێستی حیزب بۆ منیش ڕوونە.

وەتەبێ بڵێم قسە لە سیاسەت ناکەم. ئەگەر پرسیاری سیاسیم لێ بکەن وەڵام دەدەمەوە چونکی ئەمن ئەگەر ئەندامی هیچ حیزبێکیش نەبم حەقم هەیە ئەو کارە بکەم. ئێستێ کە تەمەنێک دە حیزبێکی سیاسی دا بووم ئێستاش هەر هەم، مەعلوومە حەقم هەیە. خۆ ئەوە مافەکەی لە من کەم نەکردۆتەوە ئەگەر زیادی نەکردبێ. بەڵام هەر بۆچوونێکی سیاسی دەربڕم ئەمن وەک خۆمی تەلەققی دەکەم هیچی لەسەر حیزبی دێموکرات ماڵ نیە. زۆرجار لە هێندێک قسە خۆم دەپارێزم چونکی دەزانم ئەمن کەسێکی زۆر ئاسایی نیم. زۆر کەس قسەی من وەک قسەی حیزبی دێموکرات وەردەگرن بۆیە هەوڵی من ئەوەیە زۆرجار قسەی وا نەکەم کە شتی تازەی تێدابێ، یانی وەکوو هەڵوێست گرتنێکی تازە بێتە بەرچاو. بەڵام هەڵوێستی حیزبێک هەیە ئەگەر

کەسێکی شارەزا لە دەرەوەی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانیش لێی بپرسن ئەری حیزبی دێمۆکرات لەفلان مەسەلەدا چۆن بیر دەکاتەوە، زۆر تەبیعی‌یە حەقی خۆیەتی بڵێ ئاوا بیر دەکاتەوە.

**عەباس کاروان:** گرینگترین کارو سەرقاڵی‌یەکانت دوای کۆنگرەی چارە، هەتا ئێستا چی بوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** رەنگە ئەوە ئیعتیرافێکی زۆر خەراپ بێ بەڵام گرینگترین سەرقاڵی‌یەکانم دیدارو چاوپێکەوتنی دۆستانە. دیارە زۆرتریش هەوڵ دەدەم ئەگەر کرا رۆژنامە بخوێنمەوە. لە رۆژنامەش زیاتر، تەماشاکردنی سایتەکانو خۆ خافڵاندنە بە ئینتێرنێتەوە. جاری وایە کاری دیکەش دەکەم وەک تەرجەمەو ئەوانە. خولاسە کەم‌وزۆر لە کارە حیزبی‌یەکەی دەرچی، زیانەکە هەر وەک جاران دەگوزەرێ. بەڵام شانازیی پێوە دەکەم کە خەڵکێکی زۆر بەسەرم دەکەنەوە. ئەگەر بڵێم ئەو وەختی سکرتێری حیزب بووم ئەوەندە خەڵک بەسەری نەدەکردمەوە هیچ زیادم نەگوتوە. دەگەڵ ئەوەی زۆرجاریش خۆ لەو دیدارانە دەبوێرم کە داوا دەکرێن، بەڵام هەر هەیە. چ لێرە لە بنکەی حیزبی، چ لەماڵی ئەو دیدارانە هەر هەن. یانی رەختێکی زۆرم دەگەڵ ئەو دۆستانە دەگوزەرێ.

# ئاوڕدانەوە لە ڕووداوێکی کۆن

**عەباس کاردۆ:** پێش ئەوەی کۆتایی بەو بەشە لە پرسیارەکان بێنم کە باسی حیزبایەتی و سیاسەتە، پێم‌خۆشە یەک پرسیاری دیکەش بکەم کە نازانم ئەم بەشە دەگرێتەوە یان نا. گۆیا زەمانێک جەنابت سەفەری یەکیەتیی شووڕەویت کردوە کە نازانم بۆ کاری حیزبی بووە یان بۆ مەبەستی دیکە. دەکرێ باسێک لەو سەفەرە بکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن سەفەری شووڕەوی بەتایبەتی بۆ دەکەم؟ شووڕەوی هیچکەسی ناسیاوی منی لێ‌نەبوو تا بڵێم بۆ سەردانی دۆستان سەفەر دەکەم. شووڕەویی ئەو وەختی کە ئەمن چووم هێندێک فەرقی هەبوو دەگەڵ شووڕەویی پێشوو کە وەکی بڵێیە دۆزەخێکەوە وا بوو ئەوەندە مەحدوودیەتی تێدا هەبوو. بەڵام بە هەرحاڵ هەر وڵاتی سۆسیالیستی بوو. لەبیرمە لەوێ ساختومانی دەزگای جاسووسیی شووڕەوی‌یان پێ‌نیشان بەڵام قەت باوەڕم وا نەبووە کە دەبێ ئێمە وەکوو جەمسەر بێ‌بینین و تەنیا جەمسەر بێ کە دەبێ هەر پێوەندیمان دەگەڵی هەبێ، یانی بە زۆری خۆی بەسەردا بسەپێنین. بەڵام ئەو وەختی هەرچەندە کەمڕەنگ ببۆوە، ئەو فکرە هەر هەبوو لەنێوماندا کە:

"ڕێی نەجاتمانە پەنا بۆ ئیتیحادی شووڕەوی   سورمەیە بۆ چاوی ئێمە خاکەخۆڵی مەسکۆی"

ئەوەی وەختی خۆی لە زەمانی جومهووری‌دا ڕەحمەتی هەژار گوتوویەتی.

ئەو سەفەرە بۆیە بوو کە ئێمە دەگەڵ نوێنەرانی حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتیی شووڕەوی دانیشین. بەڵام ئەوەندە سازشکار بوون ئەوەندە پێوەندی‌یان دەگەڵ تاخۆش بوو کە حەتتا حازر نەبوون ئەوەش بە تەواوی بکەن.

ئێمەوەلەمن دەگەڵ دەوڵەت دانەدەنیشتین، دەگەڵ ئەفەراتی حیزبی دادەنیشتین. کە عادەتەن لە سیاسەتەکانیاندا ئەوانەیان لێک جودا دەکردەوە. لەو جێگایانە کە پێیان خۆش بوو دەیانگوت ئەوە حیزبە کردوویەتی. مەسەلەن ئێران ئەتۆ بۆ گلەیی لە ئێمە دەکەی؟ ئەتۆ دەگەڵ دەوڵەتی ئیتیحادی جەماهیری شووڕەوی ئەمڕەفی، خۆ دەوڵەت شتی وای نەکردوە. ئەوە حیزبی کۆمۆنیستە بۆخۆی پێوەندی‌یەک دەگرێ بە دەوڵەت مەربووت نیە. دەحاڵێک‌دا هەموو کەس دەیزانی وا نیە. بە هەر حاڵ وایان لێ‌کرد کە ئەوە ئێمە سەفەری ئەفغانستان دەکەین، بەڵام بە شووڕەوی‌دا دەڕۆین. سەفەرەکەمان لەپاریسڕا کرد. ئەمن و کاک فەتاحی کاویان بووین. ئەوە ساڵی ١٩٨٥ واتە ١٣٦٤ی هەتاوی بوو. یانی پێش کۆنگرەی حەوتەم.

لەڕاستیدا لە چوونێش‌دا و لە هاتنەوەش‌دا میوانی حیزبی کۆمۆنیستی شووڕەوی بووین. میوانی وان بووین بەو مانایە کە هوتێلێکیان دەئیختیار نابووین. تەنیا ئەوەندەیان میوانداری لێ‌کردین. ئەویش هەر ئەوەندە بوو کە هۆتێلێکیان بە قیمەتی ڕەسمی دابووینێ. چونکی وڵاتانی سۆسیالیستی شتی عەنتیکەیان هەبوو. ئەو هوتێلەی کە ئێمەی لێ بووین ژوورێکی دوو نەفەریان دابووینێ کە گەورە و ڕێک‌وپێک بوو. ژوورەکە بە قیمەتی ڕەسمی بە پازدە ڕوبڵ بوو. پازدە ڕوبڵ ئەگەر چووبای ئەبانکێ گرپباتایە نێزیک بیست دۆلاری دەویست. بەڵام لەبازاڕی ئازاد پازدە ڕوبڵت بە پێنج دۆلار دەکڕی. ئەگەر وا نەبایە، ئەو هوتێلە بە نەوەد(٩٠) ڕوبڵی بوو کە دەیکردە سەت و بیست(١٢٠) دۆلار. جا ئەوەیان دابووینێ دەنا خوردو خوراکمان لەسەر خۆمان بوو، پووڵمان دەدا.

دوو جەلسەی درێژ دەگەڵ ئەفەراتیان دانیشتین لە ڕێگای تەرجەمەوە. نازانم بۆ وایان دانابوو، کوردی کە هیچ، کەسیان نەبوو بە فارسیش قسان بکا. ناچار بە ئینگلیسی قسەمان دەکرد کە کاک فەتاح تەرجەمەی دەکرد. قسەکانیشمان دەتوانم بڵێم زیاتر باسی وەزعیەتی خۆمان و کوردستان و حیزب و بەربەرەکانی دەگەڵ جمهووری ئیسلامی بوون.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ئێوە داواتان کردبوو بیانبینن؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** بەڵێ بەڵێ. بەڵام وایان ڕێک‌خست کە گۆیا ئێمە بە ترانزیت بەوێدا دەڕۆین بۆ وەی وایان نیشان نەدابێ کە حیزبێکی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی‌یان دیوە. باسی ئیمکانی کۆمەگ و هاوکاریمان دەگەڵ کردن بە تایبەتی کۆمەگی مەعنەوی. بە تایبەتی ئینعیکاسی ئەو ناحەقی‌یانەی لەئێرانێ لە کورد دەکرێن و چاوەڕوانی‌یەکانی خەڵکی ئێران و بە تایبەتی خەڵکی کوردستان لەو وڵاتە. باسی ئەو شتانەمان دەکرد. دیارە کاک فەتاح زۆر بە حەوسەلە زیمنی ئەوەی تەرجەمەی دەکرد، پرسیار و وەڵامەکانیشی دەنووسین. چاکم لەبیر نیە بەڵام پێموایێ سەت، سەت و بیست لاپەڕە شتێکی وای نووسیبوو. یانی ئەوەندەمان قسە کرد کە زۆر دوور و درێژ بوو.

لەوێڕا هەر بە کردەوە چووینە ئەفغانستان. پێموایە سێ شەو یان چوار شەوانیش لە ئەفغانستان بووین. لەوێ ئەو وەختی ڕەئیسی حیزب "بەبرەک کارمەل" بوو. ئەو نەی‌دیتین هەرچەند سەلامی ئەویان بۆ هێناین و دڵنیایان هێنایەوە کە گرفتارە چی. ئێمەش زۆرمان بە لاوە گرینگ نەبوو داخوا ئەوی دەی‌بینین کێ‌یە. گرینگ ئەوە بوو ئێمە چووبووین دەگەڵ حیزبەکەی وی دانیشین کە حیزبی مەردومی ئەفغانستان بوو. پیاوێکیان دەگەڵمان دادەنیشت بە ناوی "مەحموود بریالی" کە پێموایە دایک‌برای کارمەلی بوو. پیاوێکی زۆر تێگەیشتوو، زۆر مەنتیقی و زۆر ناسک بوو. نازانم دوایە چیی بەسەر هات! داخوا لەو ڕووداوانەدا کوژرا یان ماوە.

لەوێش خۆ داوای چی‌یان لێ دەکەی؟ ئەوان بۆخۆیان لەمە فەقیرتر بوون. دیارە خودا هەڵناگرێ گوتیان ئێمە ئیمکاناتی کۆمەگی ماددیمان نیە. بەڵام ئەگەر پێتان خۆش بێ خەڵک بێن لێرە لەسەر هەرچی پێویستیتان هەیە ئاموزیشتان بۆ دانێین. یا بێن و لەسەر زۆر شتان لێرە تەمرین بکەن. حەتتا بۆ چوونی بلیتی منیان کڕی. ئەویش ئەوە بوو کە گوتم ئێمە پووڵی بلیتەکەمان هەیە ئەک بلیتی نیمانە. بەڵام وەختێکی دەعوەتمان دەکەن ئەگەر ئەوەندە قەدر دانەنێن بلیتەکەمان بدەن، ئەمن نایەم. جا پووڵی بلیتی منیان دا بەڵام نی کاک فەتاحیان نەکڕی. یانی ئەوەندە فەقیر بوون دەنا لەبەر سەقیلی نەبوو.

لەوێ دیارە هەستمان دەکرد لە ماڵی خۆمانین. جا ئەو تەعارۆفەیان کرد کە ئەفرادی نیزامی بۆ تەمرین لەسەر چەکی جۆراوجۆر بنێرن ئێمە دەمزەمەتتان‌دایین. گوتمان بابە ئێمە لەو بارەیەوە ئیحتیاجمان نیە. ئەو سیلاحانەی لەبەر دەستماندان، کوڕە هەر دەگەڵیان گەورە بووە، وەکوو ئاو ڕەوانیەتی. تەنانەت گوتیان ئەگەر ڕێگاتان هەبێ دەتوانین کۆمەگی سیلاحیشتان بکەین. گوتمان بێجگە لەوەی ڕێگامان نیە، ئیحتیاجیشمان بە سیلاح نیە. گوتمان هەر پێوەندی‌یە دۆستانەکە بۆ ئێمە گرینگە. بەڵام جالیب ئەوە بوو لەوێ سەفارەتی شووڕەوی وەریان گرتین. ئەوەم زۆر پێ جالیب بوو، سەفیری شووڕەوی لەوێ ناوی "یووری وێرۆنسۆف" بوو کە دواتر بوو بە سەفیری شووڕەوی لە ئەمریکا یان سازمانی میلەل. باوەڕ بکە دەتگوت لە کۆڵانەکانی تارانی گەورە بووە. فارسی‌یەکی ئەوەندە جوانی دەزانی کە هیچ غەیرە فارسێک نەی‌دەتوانی بڵێ لەهجەی هەیە. ڕەنگە فارسێک زانیبای. تەنیا ئەوە نەبێ جاری وا بوو لەسەر کەلیمەیەک تێ‌دەما. ئەویش لە دیدارێکی دوو، سێ سەعاتیدا ئەگەر یەک، دوو جار گیری کردبا و کەلیمە فارسی‌یەکەی بۆ نەهاتبا. ئەویش کاک فەتاح کە ئینگلیسی دەزانی و ئەویش دەی‌زانی، لەوی دەپرسی. لەباری سیاسی‌یەوە پیاوێکی زۆر وشیار بوو، لە عەینی‌حاڵدا زمانیشی ئاوا دەزانی. دەگەڵ ویش دیارە هەر ئەو باسانەمان کرد.

دیتنی وڵاتی سۆسیالیستی و بە تایبەتی شووڕەوی بۆ من جالیب بوو. چونکی ئەحزابی کۆمۆنیستیی سەر بە مۆسکۆیە بەهەشتێکیان لەو وڵاتە دروست کردبوو، یانی لەپێش چاوی خەڵکیان ئەو بەهەشتە جۆرێک موجەسسەم کردبوو مەپرسە. بەڵام کە دیم لە زۆر بارەوە بۆ من جێی عیبرەت بوو. بە کۆمەگی ئەو دۆستەمان

کە ئەفغانی بوو، لە سەفارەتی ئەفغانستان لە مۆسکۆیە کاری دەکردو زمانی ڕووسیی باش دەزانی، لە زۆر شت ئاگادار بووین. ئەندامانی کۆمیتەی مەرکەزی سینەمای تایبەتی‌یان هەبوو. تیاتری تایبەتی‌یان هەبوو. فرۆشگای تایبەتی‌یان هەبوو. حەقیان هەبوو لە هێندێک فرۆشگا کە شتی وڵاتانی غەربی‌یان تێدابوو بە هەرزان شت بکڕن. هۆتێلی تایبەتی‌یان هەبوو. تەنانەت دوو جۆر ماشێنی فۆلگای نیشان داین، یەکێکیان تەنیا بۆ ئەندامانی دەفتەری سیاسی دروست دەکرا. کەسی دیکە لە یەکیەتیی شووڕەوی حەقی نەبوو بیبێ. دەشی گوت ماشێنێکی زۆر باشە، ڕەقابەت دەگەڵ ماشێنە باشەکانی وەک بێنزو شۆڤرلێتو ئەوانە دەکا. ئەوعێکی دیکەشی نیشان داین، گوتی ئەوش فەقەت بۆ ئەندامانی کۆمیتەی مەرکەزی‌یە. یانی ئەو نابەرابەری‌و جیاوازی‌یە.

جارێکی چووین بۆ فرۆشگایەکی. فرۆشگاکە زۆر گەورە بوو، دوو سەعات تێی‌دا خولاینەوە. یەک شتی لێ‌نەبوو بڵێم ئەوە جالیبە دەی‌کرم دەی‌بەمەوە، ئەوەندە مەحرومییەتی لێ‌بوو. ئەوە تازە شووڕەوی زەمانی گۆرباچۆفی بوو کە بەحیساب ئازادیی تێدا بوو. لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو ئەو فرۆشگا گەورەیە کە ئەگەر هەڵە نەکەم سێ(٣) قات بوو بەڵام یەکجار زۆر گەورە بوو. یانی هەر تەبەقەیەکی موبالەغە نیە بە قەت هەمووو ئەم قەڵایەی دەبوو. ئەوە هەمووی کرابووە دایرە دایرەو ئەوعێک دیواری ناسکی لێ‌ساز کرابوو کە ئێکیان جوێ بکاتەوە. وەک سەربازخانەی، یەکێک دەچوو شتێکی دەکڕی. ئەوە خەڵک بە سەف ڕاوەستاون. ئەو دەچوو تەماشای دەکردو هەتا ئەو نەهاتباوە دەرێ کەسی دیکە حەقی نەبوو بچێتە ژوور. یانی حەقیان نەبوو بەسەر یەکەوە بچن. چونکی ئیحتیمالێ دزیشیان دەکرد لەبەر ئەوەی خەڵکەکە ناوا فاسید بار هاتبوو. یان مەسئەلەن ئەوەم پێ جالیب بوو. هەر ئەو وەختی ئێمە لەوێ بووین شاڵواری "کاوبۆی"(جین) هاتبوو. بە قیمەتی معادلە دەگەڵ جێگای دیکە زۆر گران بوو. بەڵام سەفی بۆ گیرا چەند سەت کەسی. کە گوتیان تەواو بوو پێم‌وایە سەفەکە زیاتر لە سەت کەسی لێ‌مابوو. یانی بۆ شتێکی ئاوا دەبوو سەف بگرن ئەوەندە مەحرومییەتی تێدا بوو. جا بۆ من کەشفی حەقیقەتەکە خۆش بوو. بەڵام دیتنی ئەو هەمووو مەحرومییەتەی خەڵک بەڕاستی زۆر تاڵ بوو.

شتی سەیرو سەمەرە لەو شتانە زۆر بوون. ئەووەڵین جار بوو چووینە ڕەستورانێک نان بخۆین. هەر چووینو گوتیان جێگا نیە. مێزیش دیار بوو بەتاڵ بوون. گوتمان ئەوە نیە مێز؟ گوتی نا ئەوە گیراوە. کاک فەتاح گوتی پێم‌وایە حەل دەبێ شتێکان پێ نیشان دەین. ئەمن دوو دۆلارم پێ بوو. هەر پێم نیشان دان مێزیش هەبوو و قەدریشیان گرتین. یانی خەڵکەکەی لەبەر مەحرومییەت ئاوا تووشی فەساد ببوون. ئەو وەختی هەردووکمان سیغارمان دەکێشا. سیغارمان دەرێنا کە سیغاری خاریجی بوو، دەورمان گیراو هەرکەس داوای سیغارێکی

کرد. چونکە سیغاری خۆیان زۆر سەیر بوو. ئاخر داستانی سیغاری گاگارین خۆش بوو. سیغارێکیان بە ناوی گاگارین دروست کردبوو کە عەکسی سەگەکەشی لەسەر بوو. ئەوە ڕووداوێکی عیلمیە ئیدی.

ساڵێکیان لە عێراقڕا هەیئەتێک لەلایەن کۆڕی زانیاریەوە چوو بۆ شووڕەوی. لەوێ گێڕابوویانو لە ئاخری سەفەرەکەیاندا یەکی بۆکسێکیان لەو سیغارە دابوونێ. مام هەژار کە پیاوێکی عەجوول بوو، دەستبەجێ هەڵی دەپچڕێ بزانێ چۆنە. پاکەتێک دەکاتەوە سیگارێکی لێدەر دێنێو دای دەگیرسێنێو دەی کێشێ. ئەوانیش پێیان وایە سیغارێکی زۆر خۆشە چونکە تاریفی زۆر بووە، لە هەژاری دەپرسن پێت چۆنە؟ ئەویش کە زمان نازانێ دەست بۆ قوونی سەگەکەی دەباو دەڵێ نارایە. وەک گووی ئەو سەگەیە ئەوەندە ناخۆشە.

# بە دوور لە سیاسەتو حیزبایەتی

**هەباس کاردۆ:** مامۆستا هەتا ئێستا زیاتر باسی ژیانی سیاسیی ئێوەمان کردووە لە بوارەکانی دیکە کەم دواوین. ڕێگام بدە بگەڕێینەوە سەر باسە شەدەمیو زمانەوانییەکانو لەو بوارانەشدا هێندێک پرسیار بێنمە گۆڕێ. بەڵام بەر لەوە ئەگەر لە بواری تێکۆشانی سیاسیو حیزبیتدا دەتەوێ شتی دیکە بڵێی تکایە بفەرمووە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** با ئێمە ئەوەی سەبت کەین کە کارەکەی ئێمە دوو بە دوو وەک کاری خەبەرنیگارێک نیە کە چووە وتووێژ دەگەڵ کەسێک بکا. کارێکە دۆستانەو برایانەو هاوچارەنووسانە. بۆیە لەدوای ئەو قسانەش لەپێدا چوونەوەی ئەو قسانەدا کە کراون بە پەسەندی جەنابت یان پەسەندی من، دەتوانین شتێکی لێ کەم کەینەوە یان لێی زیاد بکەین. ئەگەر شتێکمان وەبیر هاتەوە پێمان وابوو زەروورە دەتوانین زیادی بکەین. بۆ ئێستا هیچی وام دەنەزەردا نیە.

**هەباس کاردۆ:** جەنابت وابزانم خۆت شێعرت گوتووەو دەگەڵ شێعری شاعیرانیش ئاشنای. دەزانم لە سەنعەتی شێعر دەزانیو زۆریشت لەبەرن. دەکرێ ئەزموونەکانی خۆت لەو بوارەدا باس بکەی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیسان دەگەڕێینەوە ئەو شتەی لەسەرەتاوە باسم کرد. پیاو نازانێ چۆن دەست پێدەکا. بەڵام لە ژیانی ئینسانیدا هێندێک ئۆگری هەن هەر بۆیە ڕشتەی جۆراوجۆر پەیدا بوون. مەناڵ دەچنە مەدرەسەی بۆ خوێندن. یەک بەرەو وەرزش دەکشێ، یەک عەلاقە بە مووزیک پەیدا دەکا، یەکێکی دیکە عەلاقە بە ئەدەبیات پەیدا دەکا. ئەوە توانا و قابیلییەتی ئینسانەکان دەری دەخا چییان دەوێ. دیارە ئۆگری بە شێعر دەکوڵدا دەلیلێکی دیکەشی هەیە. ئەوا بەرەبەرە لاواز دەبێ بەڵام لە کۆنەوە هەبووە. لەنێو میللەتانی دیکەشدا وایە، ئەو میللەتانەی خوێندەوارییان دەتێدا نیە ڕوو دەکەنە شێعر. لەبەر ئەوەی شێعر- دوور لەڕووی شێعری ئێستا- وەزنێکی هەیەو قافیەو ئاهەنگێکی هەیە. فێر بوونو لەبەرکردنی ئاسانە. لە پاشان دەتوانی بە گۆرانی بیڵێی. عیبارەتو مەتنێکی ئەدەبی لەبەرکردنی زەحمەتە. ناکرێتە گۆرانیو ئەگەر جوملەیەکو وشەیەکی لێ حەزف بوو مەعلووم نیە. بەڵام کەلامی مەوزووون وا نیە. بۆیە ئەمن لەبیرم نایە لەبەرچیو لەکەیەوە ئۆگریم بە شێعر پەیدا کردووە. پێموایە لەجێیەکی دیکەش گوتم، وا بزانم یەکەمین شێعرەکانی کە

ئەمن فێریان بووم. تەنانەت پێش ئەوەی بچمە مەدرەسەش، ئەو سروودانە بوون کە دە زەمانی دێمۆکراتی‌دا هەبوون. ئەوانە لە ڕێگای خوێندەوارەکانەوە هاتبوونە دێهاتی. بە تایبەت دێی مە هەروەک عەرزم کردی دەگەڵ ئەوەی ئەمن پیاو بووم کە مەدرەسەی دەوڵەتیی بۆ چوو، بەڵام مەدرەسەی ئاینیی لێ‌بوو، بۆیە خوێندەواریی تێدا هەبوو.

دواتر سەروکارم دەگەڵ شێعری فارسییش پەیدا کرد، چونکی بەشێک لەو شتانەی دەمانخوێند فارسی بوون. مەسەلەن لەحاڵێک‌دا زۆری لێ فێر نەبووم چونکی مامۆستاکان نەیاندەزانی هەتا ئەمن لێیان فێر بم لەو کتێبانەی ئەمن خوێندوومن، خۆ ئەو کتێبانەی لە مەدرەسە هەبوون هیچیانم نەخوێندبوون. هێندێک شتی دیکە هەبوون وەک: ئەی شەردو ئەحمەدی‌و نازانم چی، ئەوانەمان دەخوێند لەپاشان گولستان‌و بووستانم خوێندەوە. کتێبێکی دیکە هەبوو بە ناوی "پندنامه عطار" کە پێنج باب بوو هەمووی شێعر. ئەوانەم خوێندەوە. بە تایبەت ئەو پەندنامەی عەتارە نە مامۆستاکەم تێی دەگەیی‌و نە ئەمنیش تێی دەگەیشتم، بەڵام دەبوو بخوێندرێ. زۆر درەنگتر دەگەڵ شێعری کوردی سەروکارمان پەیدا کرد. زۆر چاکم لەبیرە یەکەم دیوانی شێعری کوردی کە چاوم پێی کەوت، دیوانی تاهیر بەگی جاف بوو. تاهیر بەگ زیاتر شاعیرێکی میللی‌یە هەتا ئەوەی بڵێی سەنعەتی شێعریی زۆر لەسەرێ‌یە. بەڵام ئینسانێکی نیشتمانپەروەر بووە‌و شێعرەکانیشی سادەو ڕەوان‌و خۆشن. دەکرێ بڵێم زۆر درەنگتر، یانی هەتا ڕێگام کەوتە کوردستانی عێراق بە کەمی دیوانەکانی دیکەم دەست کەوتوون. پێموایە درەنگتر دیوانی نالییشم دیتە، یان هەر ئەشعاری نالی بوون، بەڵام نە خۆم نەبوون نە هی خەڵکی دیکە بوون.

بە هەرحاڵ ئۆگریم بە شێعر زۆر بوو، لەهەمینی کاتدا تواناشم زۆر بوو. زۆر ئاسان شێعرم دەهاتە بەر. لەنێو خوێندنی مەلایەتی‌دا عادەتە ئەو دەرسانەی دەیانخوێنن بە تایبەت هەتا قۆناخەکانی سەروو لە خوێندنەکەیان هەمووی لەبەر دەکەن. بەڵام ئەمن نەک هەر شێعر بەڵکوو دەرسەکانیشم وەک وان لەبەر نەدەکرد. لەو بارەیەوە قابیلییەتێکم تێدا بوو کە هەر دەگەڵ خوێندنەوەی دەهاتە بەرم. یانی بە جارێک پێدا چوونەوەی تەماشام دەکرد هاتۆتە بەرم. ئەوە ئێستێ دەگەڵم لەدایک ببوو. شێعریش زۆر ئاسانتر دەهاتە بەرم هەتا پەخشان. پێموایی بۆم باس کردی. هەژار شێعرێکی هەیە "بەرەو موکریان" کە پێنج سەدو شێستو هەشت(٥٦٨) بەیتە. جارێک نووسیمەوەو سێ جار بۆ خەڵکیم خوێندەوە هەمووم هاتە بەرێ. قاچاغیش بوو ئەو وەختی بۆیە کاغەزەکانم سووتاندن گوتم مەبادا لێم بگیرێ، بەڵام ئێستێ هەمووییم لەبەر کردبوو خەمم نەبوو. تەنانەت لەبیرمە چوومە مەهاباد. هەر وەختێش دەچوومە مەهاباد تەغلەب بۆ دانیشتن‌و حەسانەوە دەچوومە مزگەوتەکەی مامۆستا مەلا شێخ عێززەدین کە فەقێشی هەبوون‌و مەحفەلێکی خۆمانە بوو. لەوێ ئەو شێعرم خوێندەوە. دواتر ڕۆژێکی دیکە چوومەوە کە چووم خودا عافووی بکا کاک سەعدی حاجی بایزئاغای لەوێ بوو. کاک

سەعد مامی کاک سەلاح‌و کاک عەبدوڵڵای موهتەدی‌و ئەوانە بوو. پیاوێکی زۆر ئەدیب‌و ئەهلی فەزڵ‌و ئەدەبی بوو. پیاوێکی زۆر موحتەرەم بوو. هەروا کە دانیشتبووین باسی شێعرو شاعیری‌و شێعری ئیشتمانی کراو هێندێک خوێندرانەوە. کاک سەعد باسی کرد گوتی بیستوسێ هەزار شێعرێکی زۆر جالیبی داناوە، هەر بیستبووی هێشتا نەی‌دیبوو. ئەویش تەماشای منیان کردو پێ‌کەنین. گوتی ئەوە چیە هەموو تەماشای مامۆستای دەکەن‌و پێ‌دەکەنن؟ هەر ڕاست ئەو کەلیمەیەی بەکار هێنا، بۆیە وەک خۆی دەی‌گێڕمەوە دەنا دەی‌ناسیم. گوتیان لەلای وی دەست دەکەوێ. گوتی یانی هەیەتی؟ گوتیان ناوەڵڵا نیەتی بەڵام لەبەریەتی. گوتی هەر نیە، ئەوێ ئەمن دەڵێم شێعرێکی زۆر دووروودرێژە. ئەوانیش گوتیان هەروەشەو لەبەریشیەتی. گوتی چۆن؟ ئەوجار ڕووی دەمن کردو گوتی پێم‌ڵێ بزانم چۆنە ئەوە. گوتم ئەوەندە شێعرییە بەڵام لەبەرمە. ئیدی خوێندمەوە.

لەپاشان بە ڕەحمەت بێ خالەمینی شاعیر کە ماڵی لە تەغەدە بوو زانیبووی. نازانم چۆن ناوا زوو دەنگی دابۆوە. کاغەزی بۆ مامۆستا مەلا شێخ عیززەددینی نووسیبوو. گوتبووی دەمێ لایەکی ڕیشی لەوێ بتاشێ‌و لایەکی لێرە. حەتمەن دەبێ بۆم بنێری. کە چووم گوتی کەیفێ خۆتە بە چەند ڕۆژانی دەنووسیەوە. پاییز بوو ئەو وەختە بەڵام حەتتا بەهاری نەی‌نووسیەوە هەر لێرێ. زۆر ئینسانێکی موحتەرەم بوو، ئەمنیش هەر مەمنوون بووم ئەو لوتفەم دەگەڵ بکا. ئەوە گەورەیی بوو تواندبووی. دوو ڕۆژان لەوێ بووم بۆم نووسیەوە، چونکی زۆر بوو نووسینەوەی ئاسان نەبوو.

**عەباس کاروان:** شێعرەکانی مامۆستا هێمنیشت لەبەر کردبوون؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** عەرزم کردی شێعری هەر شاعیرێکم خوێندبایەوە زۆر عەجایەم لەبەر دەکرد. تەنانەت جارێک ئەو کاک خالیدی حیسامی‌یە لە سەنگەسەر پێی گوتم وەڵڵاهی حەیفە پیاو شێعر بۆ هیچ کەس بڵێ بۆتۆ نەبێ. چونکی شێعری دەخوێندنەوە پازدە بیست شێعر. لە دوایە وەک ئەواری بۆم دەگوتەوە. جا زۆری پێ‌سەیر بوو. دیارە ئەوە هەمووی بەشێکە لە مێژوو. دەبێ بڵێم بەڕەحمەت بێ وا بوو. ئێستا زۆر زۆر کەمی کردوە. وەختێکی بە سەدان هەزار شێعرم لەبەر بوون فارسی‌و کوردی. ئێستێ جاروبار وەبیرم دێتەوە دیارە شێعرم کەمتاکورتێک هەر لەبەرن. بەڵام وەختێکی ئەگەر پێنج شێعریان خوێندبانەوە کە قەتم نەبیستبوون دەسبەجێ هەڵدەستام قەڵەمم تاو دەدایەو هەر پێنجم دەنووسینەوە. ئیدی بە یەکجار خوێندنەوە هەر پێنج شێعرم دەهاتنە بەرێ.

**عەباس کاروان:** مامۆستا چ شێعرێک زۆری کار تێ کردووی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم وایە ئەگەر باسی ئەوەی بکەم نەک هەر بۆمن، بۆ زۆر کەسی دیکەش- نەک بڵێم لە باری سەنعەتی شێعرییەوە لە هەموو شێعرێک بەرزتر بووە- بەڵام شێعری "بەرەو موکریان"ی هەژاری لای ئەوانەی شارەزای مەسیری حەرەکەتی ئەو شێعرە بوون وا بزانم لە هەموو شێعرێک تەئسیری پتر بووە. ئاخر داستانی شێعرەکەی ئەوەیە کە بە شەوێک سەفەرێکی خەیاڵیی کردوە بۆ موکریان. جا بە کوێدا ڕۆیشتووە لە کوێ ژیاوە کێی دیوە ئەوانە باس دەکا. تەنانەت هەڵەیەکیشی تێدا کردوە. هەڵەکەم بۆ هێمنی باس کرد، گوتم مامۆستا هەژار بە غەڵەت چووە ئەو شێعرەیدا. بۆم ئەوزیحدا قبووڵی نەکرد. لەپاشان کە دەگەڵ مامۆستا هەژاری پێکەوە دانیشتین، گوتم لەسەر شتێکی ئاوا دەگەڵ مامۆستا هێمنی کێشەمانە. گوتی دا بیڵێوە، بۆم باس کرد. گوتی وەڵڵا ڕاست دەکا، ئەمن بە غەڵەت چووم. شێعرەکەی ئاوا دەست پێ- دەکا:

**شەوە تاریکە، کڵۆرماوە زەوی     چڕنە خەو کێوی، کەوی، دار و دەوی**
**تووتەک و گایەر کوند و شیارن     ڕۆژ وچانیانە، بە شەو پڕ کارن**

لەپاشان دیمەنەکە دەڕوا دەڕوا زۆرم لەبەرە. دەڵێ:

**مانگ ئەوا تازە لە ئاسۆ دەردێ     کۆمەڵێ هەورە سپیلکەی بەر دێ**

جا پێیەوە دەڕوا ئەوانە. کە ئەتۆ ئەو دیمەنە دەبینی چەندی مانگییە؟ تاریکەو تازە مانگ هەڵدێ. دەبێ لانی کەم حەفتە یان هەژدەی مانگێ بێ کە شەو تاریکەو دوایە مانگ هەڵدێ. چونکی مانگی شەوی چاردەی دەگەڵ غورووب دێتە دەرێ. شەوەکانی پێشتری مانگێ یانی لە یەکەوە هەتا چاردەی لە ڕۆژدا مانگ هەڵدێ. جا مانگی شەوی پازدەی دواتر لە غورووب دێتە دەرێ. ئیدی مانگی حەڤدەو هەژدەی وای لێدێ کە پێش دەرکەوتنی مانگ شەو تاریکە. کەوابێ ئەو مانگە مانگی حەڤدەو هەژدەیە. سەفەرەکەش بە یەک شەوی کراوە. لە ئاخرەکەیدا دەڵێ:

**مانگە هەر چەند بە لەزی ئەیزانم     لێم گەڕێ تۆزێ تریش بڕوانم**
**سەر بکێشم بە بڕێک ماڵاندا     چاو بگێڕم بە خەت و خاڵاندا**
**کیژە بۆکانی خەواڵووی نازن     بلوور پەل و ڕووت و پێسیر وازن**

یانی بە مانگ دەڵێ بەپەلەی بۆ ئاوابوونی، بەڵام تۆزێکم لەسەر ڕاوەستە هەتا لەبەر ڕووناکایی تۆ تەماشایەک بکەم و چاو بە کون و کەلێناندا بگێڕم. ئاخر مانگی حەڤدەو هەژدەی ڕۆژ ڕووناک دەبێ، تاو گەرمیش دەبێ، دەگاتە لای نیوەڕۆیە جا ئاوا دەبێ. ئیدی ئەوە پاڕانەوەی بۆ چییە؟ غەڵەتەکە دەوێدایە. گوتی بابە وەڵڵا ڕاست دەکا ئەمن غەڵەتم نیدی.

بەڵام بۆ شێعری خۆم پێمخۆشە جارێکی دیکە لە خسووسی‌دا باسم کرد، ئەمن زۆرم شێعر گوتوون. ڕەنگە ئەو شێعرانەی گوتوومن بە سێ، چوار هەزار بەیت تەخمین بکرێن. ئێستاش هەر وەختە پێم‌خۆش بێ بە ئاسانی دەتوانم شێعر ڕێک بخەم. بەڵام دەزانی نابمە شاعیری چاک‌و پێشم خۆش نەبوو شاعیرێکی خەراپ بم. شێعرەکانیشم هەموویان تەقریبەن لەبەین چوون یەک، دوو شێعرم هەن کە لەملاو ئەولا چاپ بوون بەڵام قەت خۆم لێی نەکردوونە ساحێب.

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا تۆ گوتت "بەرەو موکریان" زۆری کار تێ کردووی. ئەمن لەو ئاخرانەدا شتێکم دیت کە تۆ وەختی خۆی نامەیەکت بۆ مامۆستا هێمنی نووسیوە لەسەر شێعری "ئێوارەی پاییز". دوایدا هەم شێعرێکی خۆت نووسیوە هەم سۆزێکی زۆرت نیشان داوە. ئایا ئەو شێعرەش ئاوا کاری تێ کردبووی؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** بەڵێ ئەوە ڕاستە بەڵام ئەو سۆزە لەبەر شێعرەکەی نەبوو، لەبەر حادیسەکەی بوو. ئەو شێعرە پاییزێ نووسرابوو. بەڵام وەختێک بەدەستی من گەیشت کە ڕێک‌کەوتننامەی ئەلجەزایر ئیمزا کرابوو. ئەمن لە سلێمانی بووم، هەموو نووسەرەکان کە دەچوو شاری‌دا هاتوچۆیان دەکرد، دروشمیان لە دژی مەلا مستەفاو لە دژی بزووتنەوەی کورد پێوە هەڵواسرابوو. مەسەلەن زۆر بێ‌ئەدەبی‌یە نووسرابوو مەلا مستەفا ئەسپێکی دۆڕاوە ئەگەر خۆی بەدەستەوە نەدا میللەت دەی‌هاڕێ. یان ئاقمی خائین دوو ڕێیان لەپێشە: یان خۆیان تەسلیمی عێراق دەکەنەوە یان هەتا هەتایە لە ئێران دەمێننەوە. لەو وەختەی‌دا ئەمن ئەو شێعرەم دەست کەوت. دواتیش‌دا دیمەنەکەی بۆمن ئەو ڕۆژە بوو. ئەمن ئەوەم دەدیت دەنا ئەو وەختی کە شێعرەکەی گوتبوو، ئەگەر ئەوکات خوێندبامەوە ڕەنگە ئەو تەئسیرەی تێ‌نەکردبام. بەڵام ئیدی باسی ئەوە دەکا کە وەزع چەند خەراپە و ئەوە، لە کۆتایی‌دا دەڵێ:

**گوتم کە وابوو ئاشنا، بەشی ئێمە لەنێو چوونە  گوتی ئالا دوور بنواڕە، دوور بنواڕە ئاسۆ ڕوونە**

ئەمن نامەکەشم کە بۆ نووسی هەر بۆیە بوو بڵێم شێعرەکەت جوان بوو. بەڵام هەر قەڵەم گەیشتە سەر کاغەزو هەمووی ئاوا بە شێعر هات. جا لەوێ لەجێیەک‌دا دەڵێم، هەر ئاوا دەست پێ‌دەکا کە دەڵێ:

**مامۆستای دووره وەتەنم — بولبولی عاشقە چیمەنم**
**کە شێعری تۆ دەخوێنمەوە — دەڵ گریم پێش‌دەکەنم**
**دەگریم چونکە نەتەوەکەم — گرفتاری ئەم ڕۆژەیە**

پێ‌دەکەنم کە دەبینم — شاعیرێکی وەک تۆی هەیە
هەرچەند دەبینی گەلەکەت — دیلو ژێردەستو زەبوونە
دیسان هەلاوی لێ دەکەی — دوور بخوازە ئاسۆ ڕوونە

ئەوجار باسی شێعرەکانیم کردوە. ئەمن دەزانم لەکوێت دیوە. ڕەنگە لە کتێبی "یادی هێمن"دا دیتبێتت کە کاک کەریمی حیسامی چاپی کردوە. بەڵام بە داخەوە دەستێکی ناپاکی تێوەرداوە. هێندێک شێعری تێدان کە پێی خۆش نەبووە ئەمن شێعری وام گوتبێ. مەسەلەن ئەمن گوتوومە:

ڕاستە کە دوژمن دەیەوێ — هەرچوار دەوری لێ بتەنێ (بە ئیلهام لە شێعرەکانی هێمن)
بەڵام کورد بەڵێنی داوە — تا سەرکەوتن چەک دانەنێ (هەر بەڕاستی پێتشم وا بوو)
با ئەو دڵی پڕ هیوامان — بە گوللە داپێژ داپێژ کا
ڕۆژێک دێ سروەی ئازادی — کۆنە برینان ساڕێژ کا

ئەو شێعرانە کە ئومێدیان تێدایەو شتی جوانیان تێدایە حەزفی کردوون. یانی دەستێکی ناپاکی تێ وەرداوە.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا "ناڵەی جودایی" بە قەد "بەرەو موکریان" تەئسیری تێ‌نەکردووی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر، عەرزم کردی ئەتۆ پرسیارەکەت ئەوە بوو کە چۆن بووە. دەنا ناڵەی جودایی زۆر شێعرترە لە بەرەو موکریان. حەتتا هەژار بۆخۆشی شێعری دیکەی هەن وەک "من و بولبول" کە لە باری شێعرییەوە زۆر لە بەرەو موکریان دەوڵەمەندترن. بەڵام بەرەو موکریان بە حوکمی ئەو شتانەی باسیان دەکاو خەڵکەکە دەگەڵیان ئاشنان شوێنی تایبەتیی داناوە. مەسەلەن بزانە چ بە هێمنی دەکا کە دەڵێ:

هێمن ئەو بولبولە سەر بێ‌تووکە — چونە لێی نایە چ جووکەو نووکە
کوانێ ئەو سینگە کە مازێنۆ بوو — سەر لە مەیدانی ئەدەبدا گۆ بوو
وەکوو بیستوومە لە مێروولە بەزی — دڵی را گەرموگوڕی سەیرە تەزی

ئەوە هەمووی ئیشارەیە بە شێعری هێمنی. بۆیە دەڵێ هێمن ئەو بولبولە سەر بێ‌تووکە، چونکە هێمن لە شێعرێکیدا دەڵێ:

ئەو بولبولەم ئەمن کە دەمم کرد بە ناڵەناڵ — یەکسەر بزووە میللەتی کوردی بەخوێندنم

یان مەسەلەن دەڵێ:

وەختێ گیانو سەروماڵم فیدای تۆ — وەگیانی من کەوێ دەردو بەلای تۆ

لەپاشان دەڵێ:

**لەباتی مازینۆ سینگم قەڵای تۆ**

ئەو شێعرەش کە دەڵێ: وەکوو بیستوومە لە مێرووله بەزی، ئیشارە بەو شێعرەی هێمن کە دەڵێ:

**تازە تا ماوم دەگەڵ مێروولەیەک ناکەم خەبات**

ئەوەی لە وەختی ناهومێدی‌دا گوتوە.

**هەباس کاریزۆ:** ئەوە ئی ئەو کاتەیە کە جیا بوونە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** نەخێر ئەوە ئی زۆر پێشترە. ئەو وەختی هەڵنەهاتبوو. زۆر زووتر مەسەلەی هێمن شێعرێکی بۆ وەلیمەحەدی نووسیبوو:

**بیحەمدیللا بە کوێریی چاوی دوژمن    وەلیمەحەدی لە باوەش گرت شاژن**

جا هەژار ناوای لەسەر دەنووسێ:

**لێم گەڕێ دڵ بە زوخاو خۆشم    با لەحەوز دوورە برام بخرۆشم**
**کاکە هەرچی من و تۆ کەی وابوون    کەی تیانا بوو لەیەکتر جیابوون**
**هەرچی دەردە کوڵە بەر من بکەوێ    تۆش وەکوو خۆشی بەبێ مێنی لەوێ**

لەئاخرەکەی‌دا دێتە سەر ئەو بەشەی کە دەڵێ:

**بولبولی کوردە وەکوو قەل دەترێنێ    بێژێ پێ بۆ کوڕی شا بخوێنێ**
**باڵی بشکێ‌و پەڕوپۆی هەڵوەرێ    مەل بکا زەمزەمە بۆ چاشە کەرێ**

ئەو شتانەم کە دەڵێت، ئەوانە تەئسیرێکی عەجایبیان هەبوو. کەسێک موکریانی نەدیبێ ڕەنگە "بەرەو موکریان"ی بخوێنێتەوە نەزانێ دەڵێ چی. بەڵام بۆ ئێمە هەمووی هەر شت بوو وەبیری دێنایەوە. بۆیە تەئسیرەکەی یەکجار زۆر بوو.

**هەباس کاریزۆ:** لە شاعیرانی کۆن و نوێی هەموو پارچەکانی کوردستان دەگەڵ کامیان ئاشنایەتیت هەبوو، یان هەیە؟ لە کاری کێ زۆر ڕازی‌و کامیان زۆریان کار تێ کردووی؟ شێعری کێت زۆر پێ خراپ بوو، بەتایبەت ئەوانەی ناسراون؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوەی بەشی دوایە هیچ عاقڵێک جوابی ناداتەوە. بەڵام لە شاعیرانی کۆن و نوێ بە تایبەتی شاعیرە ناسراوەکان ئەمن شانازیی ئەوەم هەبووە کە لە نێزیکەوە دەگەڵ "هەژار" و "هێمن" و "خاڵەمین"ی نێزیک بم و بەدرێژی دەخزمەتیاندا بم. لە شاعیرانی باشووری کوردستانیش دەگەڵ شاعیرە ناسراوەکانی وەک ماموستا "شێرکۆ بێکەس"، ماموستا "عەبدوڵڵا پەشێو" و زۆری دیکەش ئاشنایەتیم هەیە کە ئێستا ناوی هەموویانم وەبیر نایەتەوە. بەڵام دەگەڵ زۆران لە نێزیکەوە ئاشنا بووم و چێژم لە بەرهەمەکانیان وەرگرتووە. بەڵام ئەگەر بڵێم یەکیان بە سەر ئەوی دیکەدا تەرجیح دەدەم کارێکی ئاقڵانە نیە.

**عەبباس کاروخ:** پرسیاری من ئەوە نەبوو کامیان بە سەر ئەوی دیکەدا تەرجیح دەدەی. بەڵام گوتم لە کاری کامیان زۆر رازی یان ڕەخنەت لە کاری کامیان هەبووە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** عەرزم کردی شتی وا ڕووی داوە بۆ شێعری هەمووان. نە گۆرانیی هەموو کەس هەموویان خۆشن، نە شێعری هەموو کەس هەموویان سەرکەوتوو و تەئسیری گەورە دادەنێن. شێعرێکی زۆر جوانی فارسی هەیە کە بەداخەوە نازانم خاوەنەکەی کێیە. دەڵێ:

**"در بیان و در فصاحت چون بود یکسان سخن      گرچه گوینده بود چون جاحظ و چون اصمعی".** (جاحظ و اصمعي دوو ئەدیبی زۆر گەورەی عەرەبن). لەپاشان دەڵێ:

**"در کلام ایزد بی‌چون که وحی منزل است      کی بود "تبت یدا" مانند "یا ارض ابلعي"؟**

"تبت یدا" و "یا أرض ابلعي" دوو ئایەتی قورئانین. ئەوانەی کە زەرافەتی زمانی عەرەبی دەزانن باش دەزانن کە "یا أرض ابلعي" تەعبیراتی ئەدەبیی زۆر قووڵی تێدایە. بەڵام "تبت یدا" کە یەکێکە لە سوورەتە چکۆلەکانیش ئەو فەساحەت و زەرافەتەی تێدا نیە. جا دەڵێ دە کەلامی خودای‌دا هەموو وەک یەک نین هەتا دەگا بە کەلامی شاعیران. ئەوانە دیارە هەموو شتی جوان جوانیان هەیە بۆیە ناسراون. بە خۆشی‌یەوە دەگەڵ شاعیرانی موعاسیر دەگەڵ زۆریان لە نێزیکەوە ئاشنام.

**عەبباس کاروخ:** ماموستا لەنێو کاری سیاسی و حیزبی‌دا. مەبەست حیزبی دێموکراتی کوردستانە، کەسانێک هەڵکەوتوون ببنە شاعیر؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** حیزبی دێموکرات شاعیری تێدان بەڵام دیومە حیزبی دێموکرات شاعیری لەشێعر خستوون. مەسەلەن یەکێک لەوانە کاک "قادر وریا"یە. هێندێک شێعری هەبوون زۆر جوان بوون. یەک، دوو جاریشم بە چاوی‌دا داوەتەوە کە بۆ لە شێعرەکانت بوویەوە. بەڵام دیسانەکە شاعیرمان دەنێودا بوون و ئێستاش هەن. بۆ وێنە کاک "ڕەسووڵ سوڵتانی" شاعیرێکی خۆش زەوق و سەلیقەیە. خەیاڵی زۆر جوانی هەن. یان

مەسەلەن لەبیرمە مامۆستا "پەیمان" شێعری جوانی هەبوون. مامۆستا "عاشق" هەروا. کاک "ئەنوەر سوڵتانپەنا"ش یەک لەوانەیە کە هەستی جوانیان هەیە. کاک "ئەحمەد قادری" و مامۆستا "بێبەش" کە هەموویان شتی جوانیان هەیە. دیارە هەم حیزبی دێمۆکراتو هەم حیزبەکانی دیکەش کەسە وشیارەکانی کە هەڵیاندەسووڕێنن. ئەوە بەو مانایە نیە هەرکەس دەحیزبدا نەبوو وشیار نیە، بەڵام ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کەسە وشیارەکانی کە حیزبەکان بەڕێوە دەبەن. ئەوانیش زۆرەیان ئەدیبن، شاعیرن، نووسەرن و هونەرمەندن. یانی دەمەوێ بڵێم ئەو جۆرە هەستانە زیاتر دەتێو ئەو ئینسانانەدا وەدیار دەکەون کە بە ئیستیعدادن. زۆرتر ئەوانیشن کە دەبنە سیاسی‌و حیزبی.

**عەباس کاردۆ:** زۆر زیاتر لەشێعر، تۆ لە بواری وەرگێڕانی ڕۆمانو چیرۆک و قەتعەی ئەدەبی‌دا وا بزانم ئەزموونت هەیە. تکایە یەکەم کارەکانت لەو بوارانەدا چی بوون‌و کەی بوون؟ پێشتر باسی وەرگێڕانی حەمەدۆک‌و دان چەرمووومان کرد، چیی دیکەت وەک وەرگێڕان هەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێموایە ئەو باسە بە تایبەتی ئەم وتووێژەوە کۆن نیە، بەڵام لەسەر یەک زۆرجارم ئەو پرسیارە لێ کراوەو دووپات بۆتەوە. ئەمن نووسینم پترە لە وەرگێڕان. زۆر کەس پێیان وایە ئەمن زیاتر وەرگێڕم هەتا نووسەر. بەڵام نووسینەکانم زیاتر نووسینی سیاسی لەقاڵبی وتاردا بوون. ئەگەر باسی وەرگێڕان بکەین، یەکەم کارم لەو بوارەدا کتێبێکی چووکەڵانە بوو بە ناوی "واقیعییەتی گەلانی ئێرانو ئەفسانەی میم. ماکان". ئەوە جزوەیەک بوو کە دوکتۆر قاسملوو بەناوی ڕووناکیرانی کوردی ئێران لەدەرەوەی وڵات نووسیبووی. لە جوابی کەسێک‌دا نووسرابوو کە وابەستە بە جبهەی میللی بوو. ئەو کابرایە جزوەیەکی نووسیبوو بەناوی "افسانەی خلقهای ایران". یانی گاڵتەی بەوە کردبوو کە لەئێراندا شتێک بە ناوی گەلان هەبێ. جا بەناوی میم. ماکان نووسیبووی. ئەو جزوەیەی دوکتۆر قاسملووش هەر بە فارسی نووسرابوو کە ئەمن کردمە کوردی. ئەوە ساڵی ١٩٧٠، یان ٧١ بوو.

دووهەم کار کە کردم کارێکی قورسو عیلمی بوو. واتە کتێبەکەی دوکتۆر قاسملووی بە ناوی "کوردستانو کورد" بوو. تەرجەمەی ئەو کتێبەی بە زۆر دەلیل گران بوو. یەکیان لەبەر ئەوەی عیلمی بوو. چونکی باسێکی سیاسی- ئابووری‌یە. دیارە وەکوو پێشەکی شتێکی بۆ نووسیوە کە مێژوویی، جوغرافیایی‌یە چونکە بۆ دنیای دەرەوەی نووسیوە دەنا کتێبەکە عیلمی‌یە. دووهەم بە زمانی عەرەبی بوو. عەرەبیم دەزانی بەڵام وەکوو فارسی بۆم هاسان نەبوو. سێهەمیش ئەوە بوو چاپێکی کە دەستمان کەوتبوو، پڕ بوو لە غەڵەت. بێجگە لەوە کە مەسەلەن کەلیمە زیادە یان کەوتوە یان پێچەوانە نووسراوە، زۆر جار مەتنو حاشیەش جێگایان گۆڕابوو. ڕەنگ‌بوو ئەگەر لەو وەختەی‌دا دوکتۆر قاسملوو لەوێ نەبایە کە جاروبار بۆ ئەو شتانە موراجەعەی

پێ بکەم زۆر گرانترم بۆ تەواو بوایە. دوای ئەوە زۆر شتی چووکەڵە چووکەڵەم وەک وتار و چیرۆک وەرگێڕاون و داومن بە گۆڤار و بڵاوکراوە کوردی‌یەکان. بەڵام پێموایە لەپاش "کوردستان و کورد"، کتێبێک کە کردمە کوردی "گێلە پیاو" بوو کە بە فارسی "پخمە" بوو. دواتریش کتێبێکی چووکەڵەی دیکەی عەزیزی نەسینم وەرگێڕا بە ناوی "بیرەوەری‌یەکانی دوور خراوەیەک". دوایە لە چاپی دووهەمدا ناوەکەیم گۆڕی و کردمە "بیرەوەریی دوور خراوەیەک" بۆ ئەوەی ناوا درێژ نەبێ. ناوە فارسی‌یەکەی "خاطرات یک تبعیدی" بوو.

دواتر نۆرەی "حەمەدۆک" هاتو دەستم پێ کرد. دوای حەمەدۆکیش کە "دان چەرموو"م کردە کوردی. لەو دوایی‌یانەدا "دوعا برای آرمین"ی دوکتور براهیمی یونسیم وەرگێڕا. پاشان "سەرکەوتنی بێ سنووری ئانتۆنی ڕابینز"م کردە کوردی، پێشتر کۆمەڵە چیرۆکێکی "علی اشرف درویشیان"م کردبووە کوردی بە ناوی "هەتاو". لە فارسی‌یەکەیدا ناوی "از این ولایت" بوو کە نەدەکرا بە کوردی. ئەگەر کردبامە کوردی شتێکی جوانی لێ پەیدا نەدەبوو. بۆیە بە ناوی یەکێک لە چیرۆکەکانیم کرد. ڕەنگە شتی دیکەش هەبێ بەڵام ئێستا وەبیرم نایەنەوە.

**عەباس کاردۆ:** کتێبێکت بە ناوی "نیو سەدە تێکۆشان" لە دوو جڵددا چاپ کراوە کە باسی مێژووی حیزبی دێمۆکرات دەکا. تۆ کە مێژوونووس نی یێ ئەو باسەت بۆ نووسین هەڵبژارد؟ پێتوایە تێیدا سەرکەوتووی؟ هیچ هەیە لەو بارەیەوە باسی بکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن پێموایە قسەی خۆم لەو بارەیەوە هەر دەکتێبەکەدا کردوە. گوتوومە ئەمن مێژوونووس نیم. بەڵام دەبوو شتێک لەو پێوەندی‌یەدا بنووسرێ. وەختی خۆشی کە قەرار دانرا شتێکی ئاوا بنووسرێ، دوکتور قاسملوو پێشنیاری کرد ئەمن بی‌نووسم. تەنووڵەمن بڕیار بوو ئەمن وەک نوێنەری حیزب بچمە فەڕانسە. پاشانیش بە حوزووری دوکتور قاسملووی گوتم نادروستە ئەمن شتێکی ئاوا بنووسم. گوتم ئەخێر دەبێ بۆخۆت بی‌نووسی. ئەوە بوو کە نووسی. دیارە بە تیازی پرۆژەیەکی گەورە بوو. سەرەتا قەول وابوو بۆ جێژنی چل ساڵەی دامەزرانی حیزب فریا کەوێ. بەڵام ئەو کە بۆخۆی وای دانابوو ببێتە سێ(٣) جڵد، تەنیا یەک جڵدی فریا کەوت بە ناوی "چل ساڵ خەبات لەپێناوی ئازادی". ئەو جڵدە بۆ جێژنی چل ساڵەی دامەزرانی حیزب بڵاو کرایەوە. دوایە ویستی درێژەی بدا کە دیسان پڕ کاری مەجالی ئەدا غەیری ئەوەی دوو فەسڵی دیکەی نووسی کە قەرار بوو چوار فەسڵی دیکەشی دەگەڵ بێ هەتا ببێتە جڵدی دووهەم. ئیدی دوکتۆر قاسملوو بە سەردا شەهید بوو و پرۆژەکە پەکی کەوت.

ئەوجار نیزیک بووینەوە لە بەرەبەری پەنجا ساڵەی حیزب. برادەران ڕوویان دەمن کرد، چونکی ئەو وەختی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێر جودا بوو کە کەسانی وەک کاک جەلیل و کاک حەسەنی ڕستگار و کاک

حوسێنی مەدەنی‌و کاک فەتاحی کاویان وەک ئەندامە کۆنەکانی حیزب لەوێ بوون. لەنێو ئەوانەی خۆماندا لەمن بە سابیقەتریان تێدا نەبوو. بۆیە ڕوویان دەمن کرد کە دەبێ بی‌نووسم. ئەمنیش شتێکم نووسی کە ناوم لی‌نەناوە مێژوو. پێموایە مێژوونووسین کاری مێژوونووسانەو ئەمنیش مێژوونووس نیم. بەڵام بە هەرحاڵ هەرچەند نی دوکتور قاسملووی زۆری فەرق هەیە دەگەڵ نی من کەچی دەکرێ بڵێم ئەویش هەر مێژوو نیە. بەو حاڵەش ناومان ناوە کورتە مێژووی حیزبی دێموکراتی کوردستان. دەنا وەک عیلمی مێژوو ئەویش بە عیلمی مێژوو نەنووسراوە. ئەویش خەسڵەتی وەبیرهێنانەوەی شتەکانی هەر تێدایە.

**هەیاس کاردۆ:** لەبواری ئەدەبو لێکۆڵینەوەدا چیت کردوە. جگە لە وتارو بابەتی نێو ڕۆژنامان هیچی چاپ کراوت لەو بوارانەدا هەیە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لەبواری ڕەخنەوە دەتوانم بڵێم نە چاپ کراوی ناسیلکەو کتێبم هەیەو نە تەنانەت وتاریشم هەیە. یانی شتێکم نیە ناوی ئەدەبی لی‌بنێم. چەند جارێک لەبارەی زمانی کوردی‌یەوە چ موساحەبەیان دەگەڵ کردبم یان وەکوو نووسین نووسیومە. ئەوانە زیاتر لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا چاپ بوون. بەڵام بڵێی لێکۆڵینەوەی ئەووە درێژم کردبێ، شتی وام نیە. یان مەسەلەن لە وتارێکی زۆر کورتدا لە وەزعییەتی زمانی کوردی لەحاڵی ئێستادا گلەییم هەبووە. هەرچەند عادەتەن کە قسان دەکەم پێم‌خۆشە هەمیشە بوارە باشەو خراپەکان باس بکەم. هەر بە باوەڕیشەوە پێموایە دەورانی ئێستا دەورانێکی زێڕینە بۆ نووسین‌و تەرجەمەو گەشەی زمانی کوردی. لەهەمان کاتدا ناتەواوی‌و کەموکوڕی‌و گیروگرفتی زۆریشی پێوە دیارە کە جاروبار لەو بارەشەوە دواوم. بەڵام نە نووسراوەی دوورودرێژو نە وەک کتێبیش چاپ کراون. هێندێک شتم هەبووە لەسەر زمانی کوردی کە یەک، دوو جار دە سیمینارو شتی وادا گوتوومن‌و زاهیرەن دەنگیشیان داوەتەوە. نەک بڵێم هەر تەئیید کراوە بەڵکوو موخالەفەتیشی دەگەڵ کراوە. بە تایبەتی ئەوەی لەسەر زمانی یەکگرتووی کوردی نووسیم ئێستاش باوەڕم پێی هەیە.

**هەیاس کاردۆ:** ئەزقەزا یەکێک لە پرسیارەکانم ئەوەیە کە جەنابت هەوڵت داوە بۆ یەکگرتووکردنی زمانی کوردی. لەو تێوەشدا پێتوایە زاراوەی کرمانجیی خواروو(سۆرانی) دەبێ بکرێتە بنەما بۆ ئەو زمانە یەکگرتووە. پرسیار ئەوەیە دەلیلت بۆ ئەو شتە چیەو هەتا چەند تێی‌دا چوویتە پێش؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** بە باوەڕی من چوونەپێش وەک ئەوەی بڵێی لەباری قانوونی‌یەوە سەر بگرێ، نا نەچۆتە پێش. بەڵام لەباری مەعنەوی‌یەوە نەک بڵێی ئەوە هەر کاری من بێ، کاری من نیە کاری واقیعییەتێکە کە ڕووی داوە. ئەگەر کەسانێک هەن- کە هەشن- ئەو ڕاستی‌یە لەبەر چاو ناگرن بە داخەوە

دەبێ بێبەینە خانەی هێندێک دەمارگرژیی ناوچەیی و لەهجەیی و ئەوانە. ئەمن دەزیەنی ئەم قسانەدا دەلایەکەشم باس دەکەم.

ھەوڵی من وەک خۆم جارێ بۆ ئەوەیە کە کورد وەکوو هەموو میللەتانی دنیایە یەک زمانی هەبێ کە بۆ نووسینو خوێندنی ڕەسمی بە کار بێ. مەسەلەن ئێستا چاو لێ بکە بیستودوو(٢٢) دەوڵەتی عەرەبیمان هەن، ئەو زمانەی دە ڕۆژنامە یان دە وتاری ڕەسمی دا، دە تەلەڤیزیۆن یان ڕادیۆ دا، یان چاپی کتێبو شتی ئاوادا پێی دەنووسن، هەمووی یەک زمانە. یانی لە ڕاستیدا تەنیا لە داستانو گۆرانیدا لەهجە ناوچەیییەکان کە یەکجار زۆریشن بەکار دەبرێن. پێم وا نیە لەهجە مەحەللییەکانی عەرەب لە سەت(١٠٠) کەمتر بن. دەبێ زۆر زیاتر لەسەت لەهجە بن چونکی ٢٢ دەوڵەتو عادەتەن لە هەموو وڵاتانیش شتی وا هەیە کە ناوچە بە ناوچە جۆری قسەکردنەکە فەرق دەکا. ئێمە لەعێراق ژیاوینو ئەمن کەمێکم شارەزایی لە عەرەبیی عێراق هەیە. مەسەلەن ئەگەر ناوەندو باشوورو باکووری عێراق- تەنیا ناوچە عەرەبییەکان دەڵێم نەک کوردستانەکەی- چاو لێ بکەی جیاوازییەکی یەکجار زۆر لە لەهجەی مەحەللییاندا هەیە. بەڵام دە زمانە یەکگرتووەکەدا هەموو یەکن. هەوڵەکەی من ئەوەیە کە کوردیش زمانێکی یەکگرتووی هەبێ لە ڕووی نووسین. جارێ لەپێشدا بۆ من کێشەکە لەسەر ئەوەیە کە کورد یەک زمانی هەبێ. دەبێ ساغ بینەوە کە زەروورەتی هەیە کورد یەک زمانی هەبێ. چونکی ئەگەر یەک زمانی نەبێ، بە باوەڕی من دەبێتە دوو یان چەند میللەت.

بەڵام ئەگەر لەمن بپرسن ئەو زمانە کامەیە، یانی ئەو زمانە لە کام زاراوە دروست دەبێ. چونکە کەس پێی ناڵێ زاراوەی یەکگرتوو، دەڵێن زمانی یەکگرتوو، یان زمانی ستاندارد. لە هەموو دنیایەش هەر وایە. مەسەلەن دەڵێن زمانی عەرەبی، لەهجەی بەغدادی یان لەهجەی خەلیجیو چیو چی. یانی ئەوەی دەبێتە زمانی خوێندنەوەو نووسین بەوەی دەڵێن زمانی عەرەبی، بەوانی دیکە دەڵێن لەهجەی فڵان جێگا. تێ فارسییش هەر وایە. ئێستێ دەڵێن مەسەلەن "ترانەهای ایرانی"، یانی گۆرانیی فارسی کە بە شێعری فەسیح گوتراوە، لەپاشان دەڵێ "ترانەهای محلی شیرازی"، ترانەهای محلی یزدی". بەوانە دەڵێن مەحەللی. هەرچەند بە ناحەق گۆرانیی کوردیو ئازەریو ئەوانەش بە ترانەهای محلی ناو دەبەن. چونکی ئەوە فەرقی هەیە. ڕاستە مەحەللین بەڵام ئەوانە زمانی سەربەخۆن.

جا ئەگەر ئەوکارە بکەین، ئەوەی بە ناحەق پێی دەڵێن سۆرانی دەبێ بکرێتە مەبنا. بۆیە دەڵێم بە ناحەق چونکی ئەوانەی زمانناسن زمانی کوردی دابەش دەکەن بە سەر چەند زاراوەی ئەسڵیدا، وەکوو کرمانجیی ژووروو، کرمانجیی خواروو و شتی دیکە. جا سۆرانی بن زاراوەی کرمانجیی خوارووە. پێبوایە کرمانجیی خواروو بریتییە لە: موکریانی، سۆرانی، شارەزووریو ئەردەڵانی. ئەوانە چوار بنزاراوەی ئەو زاراوە ئەسڵییەن.

ئەوەش دەزانین کە هەر لە سۆرانی‌یەکەشدا دیسان لەهجەی جۆراوجۆر هەیە. لە موکریانی‌یەکەشدا دیسان هەروا بەڵام ئەوانە زۆر حیساب ناکرێن. جا ئەوەی پێی دەڵێین سۆرانی مێژوو بۆی هێناوە کە بۆتە زمانی خوێندنەوەو نووسین.

مەسەلەکە بەو جۆرەیە، ئەوتریین لەتێو هیچ نەتەوەیەک‌دا، لانی کەم ئەوەی ئەمن بزانم، زمانی ستاندارد بە بڕیاری سیاسی دروست نەبووە. زمانی ستاندارد لە ڕەوتی مێژوودا دروست بووە بەڵام هێندێک عامیل تێی‌دا شوێندانەر بوون. وەکوو دین و مەزهەب وەک سیاسەت وەکوو ئابووری. ئەوانە تەئسیریان تێی‌دا هەبووە. بۆ نموونە چونکە ئەمن دایرەی زمانزانیم بەداخەوە زۆر بەرتەسکە، ئەوانەی شتێکیان لێ دەزانم هەر ئەو دوو زمانەی دەوروبەرمانە کە فارسی و عەرەبین. بۆیە باسی عەرەبی دەکەم.

عەرەبی زمانێکی ستانداردی هەیە. ئەو زمانە ستانداردە بە دەرەجەی یەکەم زمانی حیجازی‌یە، نەک سەعوودی. چون سەعوودی هەمووی سەتو بیست ساڵێکە هەیە. بەڵام زمانی حیجازی و لەوەش بەرتەسکتر زمانی قورەیشە. بۆ ئەو زمانە بۆتە زمانی هەموو عەرەبان؟ دوو عامیلی ئەساسی هەبوون: یەکێکیان عامیلی ئابووری کە بازاڕی "عوکاظ" هەبووە لە حیجاز، ساڵێ دوو جار هەموو قەبایلی عەرەب بۆ ئاڵوگۆڕی کالای بازرگانی لەوێ کۆبوونەوە. کە لەوێ کۆبوونەتەوە، عادەت بووە بە تایبەت دەنێو عەشایردا کە خۆیان بناسێنن و شانازی‌یەکانی خۆیان باس بکەن. بۆیە کۆڕی وتارخوێندنەوەو شێعرخوێندنەوەیان داناوە. باشە خۆ ئەو هەموو قەبیلە عەرەبانە لێک حاڵی نابن، دەبێ لەهجەیەک هەبێ کە هەموویان بی‌زانن. کام لەهجە؟ باشتر ئەوەیە هەموویان بێن لەهجەی خانەخوێ فێر بن. دەنا هەر کامێکیان دەبێ چەندین لەهجە فێر بێ. بەڵام لەو حاڵەتەدا هەموویان تەنیا یەک لەهجە فێر دەبن. بۆیە دەستیان کردوە بە فێربوونی لەهجەی حیجاز.

عامیلی دیکە دین بووە. بوتخانەی کابەی هەبووە کە هەموو قەبایلی عەرەب ڕوویان تێ کردوە بۆ پەرستن. دەی باشە کابرا دێ میوانی بوتخانەی دەبێ زمانی کاروانسەرادارەکەی و زمانی خەڵکی کووچەو کۆڵان و بازاڕو زمانی خەدەمەی بوتخانەی بزانێ. هەموو دێن ئەوەی فێر دەبن چونکە خەڵکی ئەو شوێنەی خۆ ناتوانن سەت لەهجە فێر بن. بەڵام ئەوان دەتوانن فێری لەهجەیەک بن و هەولیشی بۆ دەدەن. بۆیە ئەو زمانە بووەتە زمانی عەرەبان. ئەمن زۆر جار ئەوەم گوتوە دووبارە دەی‌لێمەوە. زۆر کەس پێیان وایە ئەوە بۆیە بووەتە زمانی عەرەبی چونکی قورئان بەو زمانە نووسراوە. لەحاڵێک‌دا ڕاست بە پێچەوانەیە. ئەو زمانە ئەگەر نەڵێم بە هەزاران ساڵ، هەرنەبێ بە سەدان ساڵ پێشتر بووەتە زمانی هەموو عەرەبان. قورئان کە هاتوە بۆیە بووە خەڵک لێی حاڵی بێ، بۆیە هەر بەو لەهجەیە هاتوە. یانی قورئان مەجبوور بووە تابیعی وان بێ، نەک ئەوان تابیعی قورئان بن.

لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە عەرەب بە سەدانو بگرە هەزاران ساڵ پێش ئەوەی بزانێ عەرەبە، وەکوو میللەتێ زمانی ستانداردی هەبووە. فارسیش هەروا پێش ئەوەی وەک نەتەوە خۆی بناسێو دەوڵەتی نەتەوەیی هەبێ ئەو زمانەی بۆ دروست بووە لە ئاکامی هێندێک شتدا. لەنێوانێ زیاتر دوو عامیل هەن. یەکیان عامیلی ئەدەبی‌یە چونکی وەک شارەزایان دەڵێن ئەو زمانەی ئێستا وەک فارسی دەناسرێ، تێکەڵاوێکە لە لەهجەی تارانێ دەگەڵ لەهجەی شیرازێ. شیراز چونکی مەڵبەندو مەکزی شاعیرانو ئەدیبانی گەورەی ئەو نەتەوەیە بوو. تارانیش بە حوکمی ئەوەی بووەتە مەرکەز بەڵام دیارە زیاتری هەر ئی شیرازێ تەئسیری داناوە.

بەهەر حاڵ لە زمانی کوردیشدا وایە. زمانی کوردی دوو، سێ هەوڵی داون. مەسەلەن وەختێک ئەمارەتی بۆتانمان هەبووە. تەماشا دەکەی شاعیری کرمانجی خواروو بە کرمانجی سەروو شێعر دەڵێ لەبەر ئەوەی خەڵکی بۆتان بەو لەهجەیە دەدوێن. وەختێک عامیلی تەریقەت باعیس بووە تەنانەت مەزهەبیش تا. خانەقای بیارەی بووەتە ناوەندێک بۆ کۆبوونەوەی هەموو لایەنگرانی ئەو تەریقەتی نەقشبەندی‌یە. بۆیە دەبینی گەورەترین شاعیری کورد بە باوەڕی من، دەگەڵ ئەوەی بۆ خۆی هەورامی نیە بەڵام شێعرەکەی بە هەورامی گوتوە کە ئەویش مەولەویی تاوەگۆزی‌یە. ئەو بۆخۆی خەڵکی شارەزووری‌یە. شارەزوور خۆی بەشێکە لەبن لەهجەکانی زاراوەی کرمانجیی خواروو. بەڵام دەبینی بەو لەهجەیەی شێعر گوتوە.

وەختێک دەسەڵاتی کوردی گۆڕاوە بۆ جێی دیکە. مەسەلەن لە حدوودی سەت ساڵ لەوە پێشەوە چاو لێ بکە، بزووتنەوەی کورد کە دەسەڵاتی کوردی پەیدا دەکا، لە دوو بەشی کوردستاندا زەقە. بە نۆرە هەر جارەی لە یەکیاندا گەشە دەکا. یانی لە ڕۆژهەڵاتو باشووری کوردستان. لە هەردووکیشیاندا وا ڕێ کەوتوە کە ناوەندی بزووتنەکەی کەوتۆتە ئەو ناوچەیەی کە خەڵکەکەی بە کرمانجیی خواروو قسە دەکەن. بۆیە دەبینی خەڵکی هەموو ناوچەکان ئەو زاراوەیە فێر بوون. هەر ئێستا لە باشووری کوردستان بە دەیانو سەدان نووسەری باش هەیە کە بە کرمانجیی خواروو دەنووسن بەڵام بۆخۆیان یان کرمانجی سەروون، یان هەورامین یان سەر بە بنزاراوەیەکی دیکەن. بەڵام ئەوە بووەتە زمانێک کە هەموویان پێی دەنووسن. ئەمن ڕەفیقێکم هەبوو لەمێژە لە دەرەوەیە. لە ڕۆژنامەدا پێکەوە هاوکار بووین. سەریەست ناسەرتی‌یان پێ‌دەگوت یادی بە خێر بێ. بۆخۆی بادینی بوو کە دەبێتە کرمانجیی ژووروو بەڵام سۆرانیی وا دەنووسی‌و وای قسە پێ‌دەکرد کە هیچ کەس نەی‌دەزانی خەڵکی ناوەندی کوردستان نیە. کاتێکیش میوانی کرمانجیی ژووروی دەبوون دەستی دەکرد بە بادینی‌قسە کردن. ئەمن هەموو جارێ دەمگوت ئای کوڕە خۆ کاک سەریەست بادینیش دەزانێ. خۆش ئەوە بوو ئەویش هەموو جارێ لەبیری دەچوو کە ئەمن بە شۆخی وا دەڵێم. بۆیە دەیگوت کوڕە ئەمن بۆخۆم بادینیم.

دەلیلی زۆر جالیبی دیکە ئەوەیە کە ئەوە بۆ ماوەی زیاتر لە شێست ساڵ دەچێ لە ڕەئسی بزووتنەوەی کورددا کەسێک هەیە کە لەهجەی خۆی کرمانجیی ژووروویە. مەرحوومی مەلا مستەفای بارزانی‌و لەدوای

ویش کاک مەسعوود بارزانی. کەچی دەبینین هەموو وتارو قسە ڕەسمی یەکانیان بە لەهجەی سۆرانی یە مەگەر ئەو وەختەی بۆ خەڵکێک قسە دەکەن کە بادینین، مەسەلەن بۆ خەڵکی دهۆکی. هەموو نامە ڕەسمی یەکانیان هەر بەو لەهجەیە دەنووسرێن. یانی لە باتینی خۆی دا پێ ئەوەی بە خۆی بزانێ ئەوە بووەتە زمانی کوردی. جا لەویش گەڕێ کە لە میرنشینی بابانەوە تا ئێستا هەر بەو زمانە دەنووسرێ. لە هەمووی گرینگتر ئەوە بۆ سەد ساڵ دەچێ- پێموایە لە ساڵی ۱۹۲۷ەوە بۆ یەکەم جار- زمانی کوردی لە عێراق بە ڕەسمی ناسراوە کە پێشی دەنووسرێ، هەر بەو لەهجەیە دەنووسرێ. یانی کتێبی دەرسی و هەموو ئەو شتانە بەو لەهجەیە بوون.

ئەوانە هەموو دەڵێن بۆ ئەوەی ئەو زمانە ببێتە زمانی هەمووان. ئەمن لە سیمینارێک دا کە لە هەولێر گیرا گوتم بە باوەڕی من پرسیارەکە ئەوە نیە داخوا چ بکەین بۆ ئەوەی زمانی ستاندارد دروست بێ. پرسیارەکە دەبێ جۆرێکی دیکە تەرح بکرێ کە دەبێ ئاوا بێ: ئەرێ چ بکەین کە زمانی ستانداردی خۆمان پەرە پێ بدەین؟ چ بکەین لێی گەڕێین بۆخۆی گەشە بکا؟ چ بکەین کۆسپی نەخەینە پێشی؟ بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە لەحاڵی ئێستادا- هەر چەند پێشتر گوتم قەت زمانی ستاندارد بە بڕیاری سیاسی دروست نەبووە- بەڵام ئێستا کە بە تەنیشت لەهجەی سۆرانی یەوە لەهجەکانی دیکەش لە ئەنتیجەی هێندێک شتدا- بەداخەوە لە ئەنتیجەی حیزبایەتی و شەڕە گەرەک دا- کاریان لەسەر کراوە بە تایبەت لەهجەی کرمانجیی ژوورو، هێندێک دەڵێن یا دوو لەهجە بێ و تەنانەت بەشێک گەورەیی نیشان دەدەن و دەڵێن یا چوار لەهجە بێ واتە چوار زمانی ستانداردمان هەبێ. ئیدی بیر لەوە ناکەنەوە ئەدی بۆچی وڵاتێکی پڕحەشیمەتی وەک چین یەک زمانی هەیە، بۆ ئەوانەی چینین. بۆچی میللەتی هیندوستان بۆ هەموو هیندووەکان یەک زمانی هەیە. میللەتی عەرەب هەموو یەک زمانی هەیە. بۆیە ئەمن پێموایە کارەکە بەستراوەتەوە بە هەڵوێستی ڕێبەرایەتیی سیاسیی کورد. ئەو ڕێبەرایەتی یە دەبێ پشتی ئەوە بگرێ کە زمانی یەکگرتووی کوردی هەبێ. دیارە هیچ بێ ئەدەبی نیە لە خزمەت ڕێبەرایەتیی سیاسیی کورددا کە بڵێم بۆخۆی ساحێبنەزەر نیە. بەڵام لەو بارەیەوە ساحێبنەزەرە کە زەرووڕەتی هەیە کورد یەک زمانی ستانداردی هەبێ. ئەو کە زەرووڕەتەکە دەرک دەکا دەبێ دەستوور بدا پسپۆڕانو لێزانانو زمانناسان پێی بڵێن کە بە دەلایلی جێی پەسند کامە لەهجە دەبێ بکرێتە بنەمای زمانی یەکگرتوو. ئەو وەختی ئەمر دەکا کە ئەوە زمانی خوێندنەوەو نووسینە. کتێب دەبێ بەو زمانە بێ. وتار لە ڕادیۆو ڕۆژنامەو ئەوەدا بەو زمانە بێ. تابڵۆی ئیداراتو ئەوە هەمووی بەو زمانە بێ. ئەتۆ هەموو وڵاتانی عەرەبی بگەڕێ تابڵۆیەک نابینی بە لەهجەی مەحەللی نووسرابێ. لە ئێرانێ تابڵۆیەک نابینی بە لەهجەی مەحەللی بێ. هەمووی بەو زمانەیە کە خوێندنو نووسینی پێ دەکرێ. ئەو وەختەیە کە ئەوە

دەچەسپێ. دەنا هەتا هەر کەسە بە لەهجەی شاری خۆیو ناوچەی خۆیو گەڕەکو دێی خۆی بنووسێ ئومێدی گەیشتن بە زمانێکی یەکگرتووی کوردی یەکجار لاوازە.

**هەیلاس کاردۆ:** مامۆستا ئەتۆ لێرە مەبەستت دەسەڵاتی باشووری کوردستانە کە ئەو بڕیارە بدا یان دەسەڵاتی چوار پارچەی کوردستان. چون هیچ زمانەتێک نیە کوردی بەشێکی دیکەی کوردستان بڕیاری دەسەڵاتی باشوور بەڕێوە بەرێ.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** دەسەڵاتی چوار پارچەمان نیە. ئەمن لە عالەمی فەلسەفەدا قسە ناکەم. لە عالەمێکدا قسان دەکەم کە واقیعی‌یەو تەزموون پێدەڵێ ئەگەر ڕووناکبیرو حیزبی‌یەکان لێ گەڕابانایە هەموو کورد زمانی هەولێری، وەک پایتەختی هەرێمی کوردستان نەک وەک لەهجە، وەک بولبول فێر دەبوون هەر وەک وەختی خۆی زمانی مەهابادی وەک بولبول فێر ببوون. ئەمن لەبیرم ناچێ ساڵی ١٩٨٠(١٣٥٩) کە بۆ ماوەی دوو، سێ مانگێک چووبوومە ناوچەی جنووبی کوردستان. مەبەست ناوچەکانی مەریوان، کامیاران، هەورامانو سنەیە. دیارە هەموو جێیەکی نەگەڕاوین بەڵام لەو نێوەدا دەچووینە ئەو شوێنانە کە هێزو کۆمیتە شارستانەکانی لێ بوون. دەچووینە دێهاتیش دەگەڕاین. چوومە هەر ماڵە هەورامی‌یەک هیچ پیاوێکم نەدیت لە ئێمە حاڵی نەبیو قسەمان دەگەڵ نەکا. دیارە هەورامی لەهجەیەکی دووریشە. هەڵبەت پیاوی هەورامی کە سەنعەتکارن زۆر دەگەڕێنو سروشتی‌یە کە لەهجەکانی دیکەش فێر بن. بەڵام سەیر ئەوە بوو ژنو منداڵیش هەموو قسەیان دەگەڵ ئێمە دەکردو لێمان حاڵی دەبوونو ئێمەش لێیان حاڵی دەبووین. یانی بە زمانێکیان قسە دەکرد کە لێیان حاڵی بین دەنا ئێمە هەورامیمان نەدەزانی. ڕادیۆی دەنگی کوردستانیان دەگرت هەموو بێ گرێوگۆڵ لێی حاڵی دەبوون. ئەوە زۆر تەبیعی‌یە ئەگەر لێ گەڕێین بۆخۆی دەبێتە زمانی ستاندارد.

جا ئێستێ ئێمە مەوجوودیەتی کورد تەنیا لە باشووری کوردستان دەبینین. بەڵام ئەگەر ئەو باشووری کوردستانە زمانێکی یەکگرتووی هەبێ، هیچ گومانم نیە بە ماوەی دوو، سێ ساڵان لە هەموو جێگایەک دەبێتە زمانی خوێندنی کوردی. دەنا ئەو هەڵە بەئاسانی بۆ کورد پێک نایە هەموو ڕێکرا بڕیاری لەسەر بدەن. ئەگەر هەر پارچەش زمانێک بۆخۆی دابنێو کاری بە لایەکەی دیکە نەبێ ئیدی ئەوە کورد دەبێتە چوار میللەت.

**هەیلاس کاردۆ:** دەڵێن مامۆستا کەم دەخوێنێتەوە. هەر بەڕاستی نێوانت دەگەڵ خوێندنەوە چۆنە؟ لەمێژە نووسینێشت بەرچاو ناکەوێ، ئەوە بۆ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن جارێکی دیکە ئەوەم گوتوە ئەقرەبەن دازینە گوناحوانانە. ئەمن خوێندنەوەم زۆر نەبووە هەر چەند ڕەنگە بۆ ئێستا ڕاست نەبێ چونکی ئێستا پتر دەخوێنمەوە. دەلیلەکە دوو شتن کە هیچیان هونەری من نین یان خەتای من نین. بەڵام یەکیان باشەو یەکیان خەراپ. باشەکەیان ئەوە بوو کە بێ ئەدەبییشە وا دەڵێم، بەڵام بیرتیژ بووم. بە ئاسانی شت فێر دەبووم دەماقە بەرم. زیاتر لە ڕێگای بیستنەوە فێری دەبووم. زۆر پێویستیم بەوە نەبوو خۆم بە کتێبەوە ماندوو بکەم. ئەوە شتێکی موسبەت بوو. بەهرەیەکە کە هونەری خۆمی تێدا نیەو خوداداییە. ئەوی خەراپیشیان ئەوە بوو کە ئەمن هەتا ماوەیەکی زۆر لە عومری خۆم گوزەراوە- دەکرێ بڵێم هەتا ئەو وەختەی لە نەتیجەی کاری سیاسیدا قاچاغ بووم- زۆر بە دەگمەن دەستم وە کتێبی غەیری دەرسیو ڕۆژنامەو مەجەللەو ئەوە ڕاگەیشتوە. بۆ خۆم لە دێهاتی لە نێو مەلاو فەقێیاندا خوێندوومەو تەنیا ئەو شتانەم دیوە کە وەک دەرس دەگوتران. ئەو وەختەی زۆر شانسم هەبوو ئەو کتێبەی دەرسم تێدا دەخوێند ئی خۆم بوو. دەنا دەکرێ بڵێم لە نیوەی حاڵەتەکاندا حەتتا ئەو کتێبەشم نەبوو. ئەو کتێبانەشم زیاتر بە ئەمانەت وەردەگرت یان ئەگەر ڕەفیقێکم هەیبوو لە کتێبەکەی وی کەڵکم وەردەگرت. دیارە بۆ هەموو شتێکیش کەسایەتیی ئینسان لەو دەورانی سەرەتاوە شکڵ دەگرێ. یانی لە سەرەتای لاوەتیمەوە کە دەبوو فێری خوێندنەوەی زۆر بم کتێبێک نەبووە بیخوێنمەوە. کتێبە دەرسییەکەشم بۆ خۆشبەختی یان بۆ نەگبەتی وا بوو کە دەرسەکەم دەخوێندو ئاوا تەماشایەکم دەکرد، دەماقە بەرم. ئەوە بە خۆشییەوە خەڵکێکی زۆر لە ژیاندا ماون کە لە ژیانی من شارەزابوونو دەزانن وایە یان نا. بۆیە دوایە کە کەوتوومە نێو تەمەن ئیدی مێشکم تەمبەڵ فێر بووە. بەڵێ ئەوە ئیعتیڕافی پێدەکەم چونکی خەسڵەتێکی خەراپەو دەبێ خەڵکی دیکە خۆی لێ ببوێرن. بەو حاڵەش وەکی گوتم ڕەنگە بۆ ئێستام درووست نەبێ. ئێستا ئەوەندەی بۆم بکرێ کە وەختیشم زۆر نیە. نەک لەبەر کاری زۆر بەڵکوو لەبەر پێوەندییەکانو وەزعێکی کە هەمە ڕەنگە وەختم زۆر نەبێ. بەڵام وەختی بەتاڵی خۆم بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەو کتێب، بە تایبەتی تەماشاکردنی سایتەکانی ئینتێرنێت پڕ دەکەمەوە. خوێندنەوەم ئێستێ پترە.

**عەباس کاروان:** ئەدی نووسین؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دە واقیعدا نووسینی من وەکوو کتێب غەیری ئێو سەدە تێکۆشان هەرچی نووسینم هەیە هیچی بەناوی خۆم نیە. ئەمن دوو جۆر نووسینم هەبووە. ئەوانەی کە بە شێوەی نامیلکە دەنێو حیزبدا بڵاو بوونەوە. وەکوو مەسەلەن چوار، پێنج ڕاپۆرتی کۆمیتە مەرکەزی، یان هێندێک جزوەی دیکە کە ڕەنگە بگەنە دە، دوازدەیەک. ئەوانە هیچیان ناوی منیان لەسەر نیە. بۆ ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بە خیلافی ئەحزابی دیکە کە دەڵێن تەحلیلی سکرتێر، لە نێو حیزبی ئێمەدا دەڵێ سکرتێر خوێندوویەتەوە. جاری واش هەبووە

کە مەسەلەن ڕاپۆرتی کۆمیتە مەرکەزی بۆ کۆنگرەی پێنجەم ئەمن نووسیومە بەڵام دوکتور قاسملوو خوێندوویەتەوە کە بە شانازیی دەزانم.

وتاریشم هەروایە. هەموو وتارەکانم ئەگەر حیساب بکەی ڕەنگە دە وتارم نەبێ وەکوو وتار کە ناوی خۆمیان لەسەر بێ. ئەگەر وتووێژی ڕۆژنامەوانی بووە کە دیارە بە ناوی خۆم بووە، یان لە موناسەبەتێکدا قسەم کردووە دوایە بڵاو بۆتەوە ناوی منی لەسەر بووە. ئێستاش ئەگەر کەم‌وزۆر دەنووسم کە دیارە قبووڵی دەکەم کەم دەنووسم، بەڵام کە دەنووسم دیسانەکە بە ناوی خۆم نایانووسم و بڵاوی ناکەمەوە. جا ئەگەر خەراپە ئەوە شتێکی دیکەیە بەڵام عادەتم وا بووە. ئەمن بە ئاسانی دەتوانم بڵێم ئەو شتانەی نووسیومن لەزۆرترین حاڵەتدا ڕەنگە سەتی سێی ناوی منیان لەسەر بێ دەنا هەمووی بە ناوی دیکەن یان بێ‌ناون.

**هەیاس کاردۆ:** بۆ ماوەیەکی بەردرێژ نووسەری وتارە سیاسی و کۆمەڵایەتی‌یەکان لە ڕۆژنامەی ئۆرگانی حیزبەکەتدا بووی و زیاتریش وەک سەرنووسەر کارت کردوە. ئەزموونی خۆت لەو بوارەدا چۆن پێناسە دەکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەزموونی من لەو بارەیەوە بە داخەوە ئەزموونێکی قابیلی لێ‌فێربوون نیە، لەبەر ئەوەی ئەمن فێری نەبووم. ئەووەڵەن لێی ناڕازیم چونکی ئەوەی کردوومە ڕۆژنامەنووسی‌یەکی حیرفەیی نەبووە. لە ڕووی مێتۆدی عیلمی‌یەوە فێری نەبووم، بە قاعیدەو قانوون نەبووە. لەپاشان جارێکی بە وتارم نووسیوە و ناوی خۆشمی لەسەرە کە نووسیومە ڕۆژنامەی حیزبی ڕۆژنامە نیە. هەموو شانازی‌یەکم بە ڕۆژنامەی حیزبی‌یەوە هەیە، بە پیرۆزی دەزانم. ئەسڵەن ڕۆژنامەی حیزبی پێشەنگی ڕۆژنامە نووسیی کوردی بووە، ئەوە هەمووی بە جێی خۆی، بەڵام ڕۆژنامە نیە، چونکی مەجبوورە پەیڕەوی لە خەتێکی فکری بکا. مەجبوورە زۆر بەرتەسک بڵاو بێتەوە. ئەسڵەن لە هەموو کوردستاندا عومدەتەن ڕۆژنامەی حیزبی قاچاغ بووە جگە لە ئێستای باشووری کوردستان. ژمارەیەکی کەم دەتوانن بی‌خوێننەوە. پاشان فکری ژمارەیەکی مەحدوودە. هەر بۆیە ڕۆژنامە نیە.

بۆیەش گوتم قابیلی لێ‌فێربوون نیە چونکی بۆخۆم لە ڕووی فەننی‌یەوە فێری نەبووم هەتا خەڵکی دیکە فێر کەم. تەنیا ئۆگری و عەلاقەو لەعەینی حاڵیشدا ئیحتیاجی حیزبەکە بە کاری من، منی کردۆتە ڕۆژنامەنووس یان سەرنووسەری سیاسی. لەو بارەیەوە ئەزموونەکەم ئەگەر بۆخۆم قەزاوەت بکەم، کە حەق نیە ئەمن قەزاوەت بکەم، لە دوو شتانی ڕازیم. ئەوەم قبووڵە کە وەک ڕۆژنامەنووسێکی فەننی عەمەل نەکراوە کە جێی داخە، بەڵام لە دوو شتانی ڕازیم. یەکیان ئەوەیە هەتا ئەو جێ‌یەی ئەمن وەک سەرنووسەر کارم کردوو سەڵاحییەتم هەبووە دەستکاریی زمان بکەم، زمانەکە زمانێکی باش بووە. مەسەلەن وەختێکی ئێمە

ڕۆژنامەیەکی مانگانەمان دەردەکرد کە ئەووەڵی چوار لاپەڕە بوو و دوایە بوو بە هەشت لاپەڕە. ئەوکات لە باشووری کوردەستان دەرمانەدەکرد، گەورە نووسەرەکانی کوردی عێراق دەیانگوت ئەو ڕۆژنامەیە بۆیە دەخوێنینەوە کوردیی لێ فێر بین. دیارە نووسەری قەڵەمبەدەستی کوردی تێدا بوون. خۆشبەختی ئەو وەختی کە هەموومان بەسەر یەکەوە بووین ماموستا هێمنی شاعیر، ڕووحی شاد بێ، لەباری زمانی کوردی‌یەوە مەسئوول بوو. بەڵام بێ لەخۆبایی بوون ئەمنیش دیار بووم. با ئەوەش بگێڕمەوە:

ساڵی ١٩٧٤ بڕیار درا کە تیمە بەش بین. ئەمن دەچوومە کوردستان. دوکتور قاسملوو دەچووە دەرێ کە مەسئوولی سیاسی بوو. کە دانیشتین باسی ڕۆژنامەی کوردستانمان کرد. دوکتور قاسملوو فەرمووی لێرە بەولاوە لەباری سیاسی‌یەوە با کاک کەریم مەسئوولی ڕۆژنامە بێ کە هەر لە بەغدایە دەردەچوو. لەباری ئەدەبیشەوە با ماموستا هێمن مەسئوولی بێ. ماموستا هێمن گوتی بۆ هەتا ئێستاش هەر ئەمن نەبووم؟ دوکتور قاسملوو گوتی بەڵێ ئەتۆ بووی بەڵام واقیعیەت ئەوەیە هەتا ئێستا ماموستا لێرە بوو. جا بەمنی هەر دەگوت ماموستا. ڕاستیشی دەکرد ماموستا هێمن هەمووی بۆ من بەجێ دەهێشت. دیارە هێمن زۆر لەمن

**عەباس کاردۆ:** لەنێو حیزبی دیمۆکراتدا ڕەنگە دەیان کەس لەتەنیشت تۆو دەگەڵ تۆ کاری ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندنیان کردبێ. دەتوانی ئاماژەیەک بەو کەسانە بکەی؟ ئەگەر ئەوش ناکرێ دەتوانی لە هەر قۆناغەی کەسانێک بناسێنی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە :** ناوەکان یەکجار زۆرن بەڵام ئەوەندەی لەبیرم بێ دیارە لە سەرەتادا کە لە ڕۆژنامەی کوردستاندا کارمان دەکردو ئەمن واریدی ڕۆژنامە بووم ئەو کەسانە بوون. ڕەنگە بە تەرتیبی کارە زۆرەکەیان یان گرینگیی کارەکەیان بڵێم. ئەوانە بریتی بوون لە: شەهید دوکتور قاسملو، مەرحوومی کەریمی حیسامی بوو، بەداخەوە هەموویان هەر مەرحوومن، مامۆستا هێمنی شاعیر بوو، کاک حەمەدەمینی سیراجی بوو. ئەوەی کارەکەی بڕێک کەمتر بوو برادەرێکمان هەبوو بە ناوی عوسمانی یەزدانپەنا ناسراو بە(جەلال میراوەیی)، پاشان لە باری فەننییەوە کاک مەلا ڕەحمانی کازمی بوو، کاک مەلا حەسەنی شیوەسەڵی بوو.

ئینجا کە هاتووینەتەوە وڵات خەڵکێکی زۆر کاریان تێدا کردوە. بەڵام لەوانەی دەرپێمری‌دا بوون کاک بابە عەلیی میهر پەروەر بووە کاک حەسەنی شەرەفی بووە، هەرچەند بەزمان زۆرو بە مەسئوولییەتیش زۆر بەڵام لەباری بەرهەمەوە کەمتر، کاک مستەفای هیجری بووە، کاک مستەفای شەڵماشی ماوەیەک هەر بەرپرسیشی بوو. پاشان دوکتور شەرەفکەندی کە ماوەیەک وەخت هەر بەرپرسی بووە. ئەمجار ئەوانەی تێی‌دا بوون مەسەلەن بۆخۆت بووی، کاک قادر وریا بووەو زۆری دیکەش کە بەڕاستی وەبیرم نایەنەوە. لەوبارەیەوە داوای لێبووردن دەکەم ئەگەر ناتوانم ناوی هەموان بڵێم.

**عەباس کاردۆ:** دەقیق لەبیرتە هەتا کەی کاری ڕۆژنامەی کوردستانت کردوە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** یەکێک لە خەسڵەتە خەراپەکانم کە دەبێ ئیعتیرافی پێبکەم ئەوەیە: ئێستێ داوام لێبکەی بڵێی کەنگێ چوویە ڕۆژنامەی. کەنگێ چوویە دەرێ، کەنگێ دیسان ڕۆیشتی و کەی دیسان چوویەوە ئەک ڕۆژو حەفتەو مانگەکانیان تەنانەت ساڵەکانیشیان نازانم ئەگەر بشمەوێ وەبیریان بێنمەوە دەبێ زۆریان بەدوادا بگەڕێم

**عەباس کاردۆ:** ئەی تەکلیف چیە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمنیش نازانم. هێندێک کەس کە زۆر ئەهلی تاقیقن بە خوێندنەوەی وتارو شتەکان دەزانن. مەسەلەن ئێستێ ڕۆژنامەی کوردستان لەو مەرحەلانەدا کە ئەمن کارم تێدا کردوە زۆری وتاری من تێدان. وەکی جارێکی دیکەش باسم کرد ژمارەی وا هەیە هەمووی نی منە غەیری خەبەرەکانی. ژمارەی وا

هەمبووە زۆری ئی من بووە. بەڵام بە هیچجارێدا ناچمەوە کەچی ئەگەر وتارەکەم خوێندەوە ناگەمە نیوەی دەزانم ئی منە یان ئی من نیە. تەنانەت ئی هێندێک قەڵەمی دیکەش دەناسمەوە. مەسەلەن ئەو وەختەی ڕەحمەتیی هێمن بووە هەموو وتارەکانی دەناسمەوە بە سەبکەکەی‌را. ئی دوکتۆر قاسملووی دەناسمەوە. ئی دوکتۆر شەرەفکەندی دەناسمەوە. ڕەنگە ئیحتیماڵێکی کەمی هەڵەکردن هەبێ بەڵام ئی زۆریان دەناسمەوە.

**عەباس کاردۆ:** بەڵام خەڵک چۆن ئی تۆ بناسێتەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** جا خەڵکیش عەرزم کردی ئەوانەی کە نووسینی خەڵکی دەخوێننەوە ڕەنگە بی‌ناسنەوە. دیارە خۆ هەموو کەس نای‌ناسێتەوە. بۆم باس کردی کە لەسەر قەبری دوکتۆر قاسملووی قسەم کرد بە ناوی کاک حەسەنی شەرەفی بڵاو بیۆوە. بەڵام بەشێک لە خەڵکەو ڕەنگە یەکیشیان بۆخۆت بووبی ناسیبوویانەوە کە ئی منە.

**عەباس کاردۆ:** لە نووسین‌دا زیاتر گرینگیت بەچی داوە؟ بابەتی جێگای باس، ناو، نێوەرۆک، بواری زمانەوانی، یان تەبلیغات؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** چونکی بەشی زۆری نووسینی من سیاسی بووە، سروشتی‌یە کە نێوەرۆک‌و گرینگیی مەسەلەکە بۆمن بە نیسبەتی ئەو ڕۆژەو ئەو هەلومەرجە لەبەر چاو بووە. لەباری تەبلیغاتیشە دیارە پیاو دەبێ سەعی بکا تەبلیغ لەدژی دوژمنی خۆی‌و بە قازانجی سیاسەتەکەی خۆی بکا. یانی هەموو نووسینێکی سیاسی تەبلیغە بۆخۆتەو بیروباوەڕت، جا فکرەکە شەخسی‌یە یان سیاسی‌یە، یان تەبلیغە لە دژی دوژمنێک کە پێتوایە مافەکانی تۆی پێشێل کردوە. یان ئیحتماڵەن تەبلیغە زیدی ئەفکارێک کە دەگەڵ ئەفکاری تۆ یەک ناگرێتەوە بەڵام شەرت نیە کردەوەیەکی دوژمنانە بێ. لە عەینی کاتدا هەمیشە هەوڵم داوە نووسینی من نووسینێکی ڕەوان بێ‌و ئەگەر کرا ئەدەبیش بێ. یانی قەتعەیەکی جوانی ئەدەبی لێ‌دەرچێ کە ئەوە هەمیشە ئاسان نیە. ئەوە نە کاری هەموو کەسەو نە بۆ ئەو کەسانەش کە لە توانایاندا هەیە کاری هەموو وەختانە، چونکی کارەکە برێک زەحمەتترە. بەڵام ئەوە لانی کەم بۆ من زۆرجار زەحمەت نەبووە کە قەڵەمەکەم وا بێ ئەوەی دەیڵێم خەڵک بە ئاسانی لێم حاڵی بێ. لەو بارەیەوە شاهیدیی هێندێک کەسی شارەزام هەیە. یانی کەسانێک کە دەتوانی ئیستینادیان پێ بکەی.

مەسەلەن کتێبی حەمەدۆکم بە دیاری بۆ دۆستێک ناردبوو کە کوردیی خەراپ دەخوێندەوە. ئەویش کە دەستی بەخوێندنەوەی کردبوو، پێی خۆش ببوو. هەمووی خوێندبۆوەو پاشان لەپاریسێ بۆ ڕەحمەتیی هەژاری باس کردبوو. هەژار چووبووە پاریسەو ئەویش موقیمی پاریس بوو. گوتبووی بە حەمەدۆکی عەبدوڵڵای حەسەن

زادە حەمەدۆک نی من نیە بەڵام وای گوتبوو- فێری خوێندنەوەی کوردی بووم. ئەویش گوتبووی ڕاست دەکەی. زۆر کەس دەبێ لە خوێندنەوەی کوردیی فلان کەسی فێری خوێندنەوە بێ چونکە خوێنەری ماندوو ناکا. نووسینەکەی ئەوەندە ڕەوانە کە خەڵکی ئەمپەڵو کوردی نەخوێنێ وەکوو تۆش فێر دەکا. دیارە شۆخیی دەگەڵی هەبوو. جا ئەو دۆستە دەنامەیەکدا بۆی نووسیبووم کە کتێبەکەم ئاوا خوێندۆتەوەو پاشان دەگەڵ هەژاریم باس کردوەو ئەویش ئاوای گوتوە. یانی هەوڵی ئەوەم داوە ئەگەر مەتلەبەکە ئەدەبی نیە، لانیکەم ڕەوانو ئاسانفەهم بێ. پێموایە خەڵک نابێ مەجبوور بێ چوارجار بگەڕێتەوە سەر نووسراوەیەک هەتا بزانێ نووسەر دەڵێ چی.

**عەباس کاروان:** لەبیرتە باشترینو خراپترین نووسینیت چ بوون؟ قەت وا هەڵکەوتوە لە نووسینێکی خۆت پەشیمان بوویتەوە؟ ئەگەر بووە بۆ؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ڕەنگە شتی وام لەبیر نەبێ کە لە نووسینێک بە موتڵەقی پەشیمان بووبمەوە. بەڵام دەتوانم بڵێم زۆرتری نووسینەکانم وەختێکی بێیانەدا چووەمەتەوە هەڵکەوتوە کە لە نووسینی ڕستەیەک یان بەکار هێنانی وشەیەک پەشیمان بووبمەوەو گوتوومە ئەگەر ئێستا نووسیبام جۆرێکی دیکەم دەنووسی. پاشان بۆ باشو خراپی ڕەنگە ئینسان بۆ خۆشی تێبگا کە وتارێکی باشترە یان شاعیر بزانێ شێعرێکی باشترە. بەو حاڵە پێموایە نووسەرو شاعیر بۆخۆیان حەکەمێکی باش نین. حەکەمە باشەکە خەڵکە. مەسەلەن ئەمن دیومە یەکێک وتارێکی نووسیوە. یان بۆخۆشم ڕێ کەوتوە وتارێکم نووسیوە پێم وتارێکی زۆر سادەو عادەی بووە. کەچی تەماشا دەکەم خەڵک پێی جوانە. دەنگ دەداتەوەو دەپرسن ئەوە کێ نووسیویەتی. ڕەنگە پێچەوانەی ئەوەش ڕووی دابێ. بۆیە پێموایە ئەو حەکەمییەتە نەدەینە دەست نووسەرو شاعیرو ساحێب مەتڵەب. قەزاوەتەکە بەخەڵکی بسپێرین.

ئەوەندەی بۆ من دەرکەوتوە، خەڵک لە نووسینی من وەکوو نووسینی زمانی کوردی ڕازین. وەکوو ئیمرۆکی سیاسیی مەتلەبەکە دیارە یەکێک پەدڵیەتیو یەکێک بەدڵی نیە. بەڵام ڕەنگە لە باری نووسینی کوردییەکەیەوە نەمبیستبێ کە خەڵک سەرکۆنەی بکا. جاری وا هەبووە ڕەخنەم لێ گیراوە کە وشەی عەرەبیم بەکار هێناوە. حەتتا بەنامە بۆم هاتبوو کە دەڵێ لەو وتووێژەدا ئەمن شێستو چوار(٦٤) جار وشەی عەرەبیم بەکار هێناوە. گوتراوە ئەوە لەتۆ چاوەڕوان ناکرێ. ئەمنیش جوابم بۆ نووسیەوە کە ئەوە وتووێژێک بووە بۆ لێکحاڵیبوون بەتایبەتی لە باری سیاسییەوە. ئەمنیش دەو وەختەیدا نامەوێ کوردیی فێر کەم. دەمەوێ مەبەستەکەمی باشتر تێبگەیەنم. لە وتووێژ بە زمانی کوردییشدا زۆر وشەو زاراوە هەن کە کوردیی ڕەسەن نین، بەڵام ئەوەندە بەکار هاتوون کە لە کوردییەکەیان کوردیترن. زۆر جارم گوتوەو هەر ئێستاش

دووپاتی دەکەمەوە کە "سەعات"م هەزارجار لە"کاتژمێر" یان "دەمژمێر" پێ کوردیترە. برۆ بە نێو دێهاتیەکانی ئەخرێندەواردا بگەڕێ، سەدجار بڵێ دەمژمێر کەس نازانێ باسی چ دەکەی. بەڵام بڵێ ئەوێ سەعات چەندە دەسبەجێ جوابت دەدەنەوە. یان مەسەلەن کتێبیان کردۆتە "نێنووس" و قەڵەم بۆتە "پێنووس" و ئەو شتانە. جا بۆیە نووسیبووم بەشێکیان هەر ئەوانەن بوونەتە مڵکی کوردو کورد چاکتریان تێ‌دەگا. بەشێکیشیان ئەوەیە ئەو دۆستەی وتووێژی دەگەڵ کردووم ئاوا تێنەگاو ئەمنیش دەمەوێ بزانێ دەڵێم چی، نامەوێ کوردیی فێر بکەم.

**عەباس کالرۆ:** لە یەکەم ساڵەکانی دوای هاتنەسەرکاری کۆماری ئیسلامی‌دا حیزبی دێموکراتی کوردستان دەستی بەکاری فێرکردنو بارهێنانی منداڵانی کورد بەزمانی خۆیان کرد. لەو بوارەدا کتێبی کوردی چاپ کران زۆر مامۆستا ئاموزیش دران. بۆ خۆت لەو بوارەدا چ نەخشێکت هەبووو چەندە توانیت خزمەت بە زیندووکردنەوەی زمانەکەمان بکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەو کارە زیاتر کاری پسپۆڕانی بواری پەروەردەیە نەک ئەوە کە یەکێک داخوا

نوختەیەکی لەسەرەوە بۆ دابنێ دەبێتە(نا). نوختەکەی لە خوارێ دابنێ دەبێتە(با). لەجیاتی یەک نوختە دوو دانەی لە خوارێ دابنێ دەبێتە (یا). دوو نوختەی لەسەرێ بۆ دابنێ دەبێتە (تا). سێ نوختەی لە خوارێ بۆ دانێ دەبێتە (پا). بەڵام بەو هەمزەیەوە دەبێتە (ئا). یاشە بۆ لە هەموو حاڵەتەکاندا دوو پیتە بەڵام ئەو یەکیان-دا یەک پیتە؟ جا ئێمە لەسەر ئەو سیستەمەمان دانابوو کەچی کە بۆیان ناردینەوە بە خەتی درشتو جوان نووسیبوویانو کاریان لەسەر کردبوو. ئەو وەختی پیتی کۆمپیوتێری نەبوو، عەکسیان دەگەڵ دانابوو. بەڵام سیستەمەکیان گۆڕیبوو و دەستکاری‌یان کردبوو. ئێمەش دەستکاریمان نەکردو هەر بەو جۆرە لە بەیرووت دامان چاپی بکەن. هەر بۆخۆشم دام بە چاپ کە ئەویش خۆی داستانێکی هەیە.

چەند مانگی پێوە خرا چاپیان نەکردبوو. دوایە ئەمن چووم وەرمگرتەوە چاپم کرد. لە هەوەڵەوە قەوڵ وابوو فەلەستینی‌یەکان بۆمان چاپ بکەن. لە نێو فەلەستینی‌یەکانیشدا پیاوێکی ناسراو هەیە کە وەختێکی سەفیری فەلەستین لە تاران بوو بە ناوی "هانی‌الحسن". دەیشدا چاوم پێی کەوت گوتم بۆ چاپ نەکرا؟ دیارە ببوو بە دۆستی ئێران نەک بڵێی ببوو بە پیاوی ئێران. جا قەول وابوو بە خەرجی خۆشیان بۆمان چاپ بکەن. گوتی وەڵڵا ئەوە داوەمانە بە ڕەقابە. گوتم ڕەقابەی چی‌و گەزی چی‌و جاوی چی؟ ئەوە کتێبێکە لە لوبنان هەر کەس نای‌بینێ. لە عێراقیش کەس نای‌بینێ. لە ئێرانیش کەس نای‌بینێ. ئەوە کتێبێکە بۆ بزووتنەوەی کوردو لە ناوچە ئازادەکانی کوردستاندا دەخوێندرێ. ناچێتە فەلەستینێش‌و کەسیش نای‌ناسێ. گوتم کتێبەکە ماوە؟ گوتی بەڵێ چۆن نەماوە. گوتم بێنە بەدوە. پێموایە هەر تەنیا بۆیە ڕای گرتبوو نەک بڵێی لەسەر خەرجێک کە تێی دەچوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کارێکی ناوای بۆ ئێمە نەکردبێ، ئەوەکوو ئێران پێی ناخۆش بێ. بۆیە کتێبەکەم وەرگرتەوە و بردم لە چاپخانەیەک دامنا گوتم بۆم چاپ بکەن. ڕۆژی شەممە بوو دام بەوان. پەنجا هەزار(٥٠٠٠٠) نوسخەشم لێ چاپ کرد. ڕۆژی شەممەی ئایندە کە چووم بەرێ‌یان کردبوو بۆ بەغدایە، چونکە قسەم دەگەڵ کردبوون هەتا وێمان بۆ بەرێ کەن. تەنیا یەک، دوو جڵدیان ڕاگرتبوو کە بی‌بینم. ئەوەی دیکەیان هەموو بەرێ کردبوو.

لەپاشان کە کتێبی کوردی بۆ ساڵی دووهەم نووسرا ئەو وەختە بوو کە ئێمە بەرەبەرە هاتبووینە ئەوەی ناوچەی ئازاد لەدەست بدەین. دەفتەری سیاسی ببوو بە دوو بنکە، ژمارە یەک‌و ژمارە دوو. ئەمن ئەو کات لە دەفتەری سیاسیی ژمارە یەک بووم لە مەنتەقەی "پاراستان" و "ئەڵۆسە" لە ناوچەی ڕەبەت. دەفتەری سیاسیی ژمارە دووش کە دوکتۆر قاسملوو و دوکتۆر سەعیدو ئەوانی دیکەی لێ‌بوون لە ناوچەی "ئالان"ی بوو. ئەمنو کاک جەلیل لە دەفتەری ژمارە یەک بووین. دۆستێکی قازیلمان - کە پێستی لە ئێرانی‌یە بۆیە ناوی نابەم-، کتێبەکەی نووسیبوو. کە پێشانی دوکتۆر قاسملووی دابوو دوکتۆر گوتبووی ئەوە کاری من نیەو دەبێ پێشانی فلان‌کەسی بدەی، یانی ئەمن. بۆیە هاتو لەوێ لە ئەڵۆسەی دانیشتین. پێموایێ سێ ڕۆژ،

چوار ڕۆژی خایاند هەتا پێی‌دا چووینەوە چونکی زۆر بوو. دەستکاری‌یەکی زۆری کرا لەباری زمانی کوردی‌یەوە. لەبارێکی دیکەشەوە کە کاری منیش نەبوو بەڵام زۆر ئاشکرا بوو کە دەبێ بیکەی، بۆیە بە مەجبووری کردم. زۆر درێژ بوو. تەقریبەن دەکرێ بڵێین مەتڵەبەکان ئەگەر تێکڕا بی گرین تێزیک بە نیوەی لێ فڕێ درا. بێجگە لە ئاڵوگۆڕی کەلیماتو ڕستەو شتی وا ئەویش هەر کرا. هەر وەکی عەرزم کردی ئەو پیاوێکی فازیل بوو و ئەو کارە هەر بەوی دەکرا بەمن نەدەکرا. بەڵام هەموو مولاحەزەکانی قبووڵ کردن.

لە ئاخری‌دا قسەیەکیشمان لەبەین‌دا ڕەدووبەدڵ بوو کە پێم‌خۆشە ئەویش باس بکەم. کە لێ‌بووینەوە گوتم ئەو تێبینی‌یانەت پێ‌چۆن بوون؟ گوتی زۆر سوپاسەد زۆرم پێ باش بوون. هەر ئەوەشە کە هەمووم قبووڵ کردوون. ئەگەر پێم باش نەبان قبووڵم نەدەکردن. گوتم جا ئێستا ئەمن قسەیەکم لەسەری هەیە. گوتی چییە؟ گوتم پێموایە ئێستا ئەو کتێبە پاش ئەو دەستکاری‌یانە کتێبێکی خراپی سالی یەکی دانیشگایە نەک کتێبێکی چاکی دەوری سەرەتایی. گوتی بۆ؟ گوتم ئەتۆ بۆخۆتت نووسیوە. ئەتۆ ئەهلی فەزڵو زانینو ئەوەی. کتێبی دووهەمی منداڵان نابێ پایەی عیلمیی ئەوەندە لەسەرێ بێ. دەبێ سادە بێ‌و لە توانای زیهنی وانیشدا بێ. جا بەڕاستی کتێبەکەی لەباری نووسینو شتی ئاوارە کتێبێکی باش بوو بەڵام قورس بوو. بۆیە وای لێ‌هات کە هاتینە ئێرە زۆر زوو وازمان لێ‌هێنا. یانی لە هەرێمی کوردستان وازمان لێ‌هێنا هەر لەبەر قورسی‌یەکەی دەنا مەتڵەبەکەی باش بوو. ئەوجار بۆ پۆلی یەکەم ئی خۆمانمان دەدا بە منداڵان بی‌خوێنن بۆ پۆلی دووهەم ئی باشووری کوردستانمان دەدانێ، چونکی ئەوەی ئێمە نە کتێبی پۆلی سێهەمیشو چوارەمیش قورستر بوو.

# پێوەندی دەگەڵ کەسایەتییەکان

**هێلیاس کاردۆ:** مامۆستا دەکرێ باسی پێوەندییەکانت دەگەڵ کەسایەتییە سیاسی‌و کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان بکەی‌و ئەگەر بکرێ ناویشیان بێنی؟ یان ئەو سەفەرانەی کردووتن‌و ئەو دانیشتنانەی هەتبوون کە دیارە دەزانم دوورودرێژ دەبێ بەڵام ئەگەر بکرێ ئاماژە بە هێندێکی گرینگیان بکەی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەوە ئەک هەر کاری من، کاری کەس نیە بە ڕۆژێک‌و دوو ڕۆژ تەنانەت بە مانگیش تەواو نابێ. چونکی بەتایبەت پێوەندیی کۆمەڵایەتی ڕەنگە هەر لە منداڵییەوە دەست پێ‌بکا. خۆ پێوەندیی کۆمەڵایەتی هەر شەرت نیە دەگەڵ کەسایەتییە پایەبەرزەکان بێ، پێوەندیی کۆمەڵایەتی ئەگەر لەماڵێ ترازا دەگەڵ دراوسێکەتەوە دوایە بەربڵاوتر دەبێ. ئەوە کارێکی گرانە بەڵام دنیای سیاسەت دەرفەتێکی دیکە بۆ ئینسانی دەڕەخسێنێ. بەتایبەت ئەگەر لەو دنیایەدا یەکێک ڕێی کەوتە ئۆرگانەکانی ڕێبەرایەتی. بۆیە ئەمن لەو بارەیەوە دەگەڵ زۆر کەسایەتیی کوردو ئێرانی‌و عەرەبو خاریجی ئاشنایەتیم پەیدا کردووە. ئەو ئاشنایەتییە جاری وا بووە تەنیا بەدیدارێک یان دوو دیدار تەواو بووە، جاری واش بووە بووەتە پێوەندییەکی زیاترو تەنانەت هەتا ڕادەی ئەوە کە بتوانی پێی بڵێی دۆستایەتی چۆتە پێشێ. لەنێو ئەوانەدا ئەگەر بمەوێ باس بکەم پێموایە بەجۆرێک لەجۆران لەجێیەکی دیکەدا باسی هێندێک کەسایەتیی ئەدەبی‌و بەتایبەت شاعیرمان کرد. بەڵام ئەگەر بێمە سەر کەسایەتییە سیاسییەکان پێم‌خۆشە لە حیزبەکەی خۆمەوە دەست پێ-بکەم. چونکی ئەوانیش کەسایەتیی سیاسیی گەورەن. ئەوە بەداخەوە زۆرجار وەبیر نایەتەوە.

مەسەلەن هەر لەدنیای سیاسەتدا بووە ئەمن ئەگەر بە تەرتیبی ناسینیان باس بکەم دەگەڵ کەسایەتیی وەکوو مەلا ئاوارە، ئەحمەد تۆفیق یان سەید عەبدوڵڵای ئیسحاقی، سولەیمانی موعینی، سمایلی شەریفزادەو بەگشتی زۆربەی تێکۆشەرانی ساڵەکانی ٤٦-٤٧ ئاشنا بووم. ئەوجار دەگەڵ کەسایەتیی گەورەی وەکوو دوکتۆر قاسملوو، کەریمی حیسامی‌و لەڕاستیدا هەموو ڕێبەرانی حیزب ئەوانەی بوون‌و هەن ئاشنا بووم. ئەوانە هەر وەک نموونە باس دەکەم ئێستا ئەگەر ناوێک باس ناکرێ بەو مانایە نیە لەبەر چاو نەبێ. دیسان وەک جەلیل گادانی، حەسەن ڕەستگار، حوسێنی مەدەنی، فەتاحی کاویان هاشمی کەریمی، مستەفای هیجری، سەید سەلامی عەزیزی، بابە عەلی میهرپەروەر، عەبدوڵڵای شەریفی‌و زۆری دیکەش.

لە نێو ڕێبەرانی کوردی غەیری حیزبی، جارێ هەر لە وڵاتدا تەقریبەن دەگەڵ بەشی هەرە زۆری ئەوانە کە دە سازمانەکانی دیکەدا هەبوون ئاشنا بووم. دەگەڵ هێندێکیان هەر وەک پێوەندیی سیاسی و دەگەڵ هێندێکیان پێموایە دەتوانم بڵێم دۆستایەتیمان پەیدا کردوە. بەتایبەتی ئەوانەی ئێستا هەن وەک سەید برایمی عەلیزادە، کاک عەبدوڵڵای موهتەدی، کاک عومەری ئیلخانیزادە، کاک حوسێنی یەزدانپەنا. یەکی وەک مامۆستا مەلا شێخ جەلالی حوسێنی، مامۆستا مەلا خدری عەبباسی، مامۆستا مەلا شێخ عیززەددین هەرچەند وەک ڕێبەری حیزبێکی سیاسی نەبوو، بانی دەگەڵ هەموویان. پاشان ڕێبەرانی کوردی دەرەوەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەگەڵ شەخسییەتە گەورەکانیان ئاشنا بووم. ئەگەر بمەوێ ناویان بەرم ڕەحمەتی مەلا مستەفای بارزانی، دوو ڕێبەری ئێستای کورد، مام جەلال تاڵەبانی و کاک مەسعوود بارزانی. لەپاشان کەسانی دیکە لەو حیزبانەدا. تەقریبەن هەموو ڕێبەرانی پارتی لە قۆناغێکدا نەمن لێیان نیزیک بووم و ناسیومن. بەتایبەتی ئەوەی زۆرم دیون خوالێخۆشبوو سەیدا ساڵح یوسفی، کاک سامی عەبدوڕڕەحمان، ئەوانەی ئێستێ بەخۆشییەوە لەژیاندان کاک حەبیب موحەممەد کەریم کە سکرتێری پێشووی پارتی بوو، کاک عەلی عەبدوڵڵا کە ئێستاش هەر لەژیاندا ماوە هەرچەند بێتاقەتە، کاک ئازاد بەرواری، کاک

دیکە پێوەندیی تەلەفۆنی، ئەو پیاوە زۆریش شوجاع بوو. چەندجار هەر پەیامی پیرۆزبایی بۆ کۆنگرە دەنارد کە چاپیشمان دەکرد. جارێک لێمپرسی چاپی بکەین گوتی جا ئەمن پەیامم بۆ کۆنگرەی ناردوە هەتا چاپی بکەن یانی چی ئەتۆ دەپرسی. ئەمنیش هەروا قسەم دەکرد کە گۆیا ئەوەی گوێی لێیە ئەزانێ دەگەڵ کێ قسە دەکا. گوتی ئاغای حەسەنزادە ئێستێ لەوێ گوزەراوە قسەی خۆت بکە. دەزانم ئەو تەلەفۆنە گوێی لێدەگیرێ، بەڵام ئەتۆ قسەی خۆت بکە. هاشمی سەباغیان بوو، سەحابی کە ئەوانە جوزوی هەیئەتی دەوڵەت بوون بۆ وتووێژ. هەروەها ئەوانەی لەدەرەوەن وەکوو ئاغای مەتین دەفتەری، عەبدولکەریمی لاهیجی، عەلیڕەزا نووریزادە، مەهدیی تیهرانی، کامبیزی ڕووستا، حەسەنی شەریعەتمەداری، باقری مونیمیتی، حەسەنی حیسام پەروێزی ئەوێلی، هەژیری تەیموورییان مرحەممەدڕەزا شالگوونی، نازانم یەکجار زۆرن کە ناوەکانیانم بۆ یاس ناکرێن ئەو شەخسییەتە سیاسیو ئەدەبییانەی ئێرانی کە دیومنو ئاشنا بووین.

لە عەرەبانیش دەگەڵ زۆر شەخسیاتی سیاسییان دانیشتووم ناسیومن کە ڕەنگە ناوی هەموویان نەتوانم یاس بکەم یان مەسڵەحەت نەبێ ناویان بەرم. هەر لە عێڕاقێ دەگەڵ زۆر کەسیان دیدارم هەبووە ڕەنگە نەبوویتە حەددی دۆستایەتی. بەتایبەت ئەوانەی حیزبی شیووعیم لە نێزیکەوە دیتوون. لە عێراق مەسەلەن سەددام حوسێنم دیوە بەحوزووری. ئەحمەد حەسەن بەکرم بە حوزووری دیوە کە دیارە ئەو وەی بەکەمی بوو. هەر دە مەجلیسەکەیدا دانیشتین. کۆنفرانسێک بوو لەسەر نەوت گیرابوو. ئەو هەیئەتانەی بەشدار بوون داوەت کرابوون بۆ دیدار دەگەڵ سەرۆک کۆمار. هات دەکۆنفرانسەکەشدا قسەی کرد بە عموومی، بەڵام هەیئەتەکانی دەعوەت کرد بۆ کۆشکی سەرکۆماری. لەوێ ئەمنو مەرحوومی دوکتۆر قاسملوو بەشدار بووین. بەڵام دەگەڵ سەددام حوسێنی دەخزمەت دوکتۆر قاسملوویدا بە تەفسیل دەگەڵی دانیشتین و قسەمان دەبەیندا ڕەدووبەدڵ بوو. یانی نەک هەر دوکتۆر قاسملوو ئەمنیش قسەم کرد. دەگەڵ شەخسیاتی فەلەستینی زۆر دانیشتنم هەبووە وەک مەرحوومی یاسر عەرەفات. بەداخەوە هەموو ڕۆیشتوون، ئەبوو ئەیاد، ئەبوو جەهاد، هانی‌الحسنم چەند جار دیوە. لە تاراتیم هەر دیوبو لە بەیرووتیم هەر دیوە. زۆر کەسی دیکەیانم دیوەو ناسیومن.

لە دنیای دەرەوەی وڵاتانی عەرەبیش شەخسیاتی گەورەی وەکوو پییەر مۆرۆوا کە ماوەیەکی زۆر ڕەئیسی ئەنتێرناسیۆناڵی سۆسیالیست بوو. لە پاشانیش وەختێکی سەرۆک وەزیری فەڕانسەی بوو، لیۆنێل ژۆسپەن هەروا سەرۆک وەزیری دیکەی فەڕانسەی بوو کە دیدارم دەگەڵی بووە. مادام میتڕان وەک دۆستی نێزیکی کورد چەندین جارم دیوە. بێرنارد کۆشنێر کە هەر زۆرمان لێ نێزیک بوو، ماسیمۆ دالیما سەرۆک وەزیری ئیتالیا، فیلیپی گۆنزالێس سەرۆکی پێشووی حیزبی سۆسیالیستی کرێکاریو سەرۆک‌وەزیری پێشووی ئیسپانیا، دوکتۆر گرانژۆن سەرۆکی پێشووی ڕێکخراوی پزشکانی جیهان لەوە ئێقبووری بەرپرسی

کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤی مەجلیسی لۆردانی ئینگلستان لێرەش دیسان هەر وەک گوتم هەمووم وەبیر نایەنەوە شەخسیاتی زۆری ئورووپایین کە مولاقاتم کردوون یان دەگەڵیان ئاشنام. هەر سەرۆک کۆماری ئێستای ئوتریش، دوکتور هانس فیشێر کە چەندجار لە نیزیکەوە دەگەڵی دانیشتووم. ئەوانەش سەر لەدنیاو بگرە سەدان کەس دەدەن. ئەوە دنیای سیاسەتە دەگەڵ هەموو کەند کۆسپەکانی، ئەو دەرفەتەش بۆ ئینسانی دەخوڵقێنێ کە ئەو هەموو خەڵکەی ببینێ‌و بناسێ.

**عەباس کاروان**: مامۆستا بۆ چەند وڵات سەفەرت کردووە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە**: ئەویش ڕەنگە بە ئاسانی وەبیرم نەیەتەوە. لە وڵاتانی عەرەبی، جگە لە عێراق کە زۆری لێ‌بووم، ئوردۆن، سووریە، کوەیت، لوبنانم زۆر دیوە. بەعبووری میسریشم دیوە. بەڵام وڵاتانی دیکەی دەروە، زۆربەی وڵاتانی ئورووپای غەربیم دیون. دەکرێ بڵێم هەموویانم دیوە. باسی شووڕەوی‌و ئەفغانستانیشم کە پێشتر کرد. لە وڵاتانی ئورووپای ڕۆژهەڵاتی پێشوو بولغارستان‌و چێکوسلۆڤاکیم دیون. جارێک بۆ کۆنگرەی ئەنتەرناسیۆناڵ سۆسیالیست چوومە ئەمریکا. کۆنگرەکە لە نیویۆرک بوو کە هەر لەوێش بووینە ئەندامی ئەنتێرناسیۆناڵی سۆسیالیست. دوایەش چوومە واشینگتۆن‌و لەوێش هێندێک دیدارم بوون. ئەوێش دیوید وێلچ کە لە چەند دەورەدا جێگری وەزیری خارجە بوو چاوم پێی کەوت. کەسانی دیکەشیانم بینی. جارێک چوومە ئارژانتین دیسان هەر بۆ کۆبوونەوەی ئەنتێرناسیۆناڵی سۆسیالیست. هاتوومە ئوستڕالیای تۆش. ڕەنگە جێگای دیکەش هەبن بەڵام لەبیرم چووبن باسیان بکەم.

**عەباس کاروان**: مامۆستا لەو کەسایەتی‌یانەی ناسیوتن‌و دەگەڵیان بوویە دۆست کامیانت زۆر وەبەر دڵی کەوتوە؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە**: دەبوو لە نێو شەخسیاتی ئەنتێرناسیۆناڵی سۆسیالیستدا حەتمەن ناوی لۆنیس ئەیالام بردبایە کە لەبیرم چوو. ئەو ماوەیەکی زۆر سکرتێری ئەنتێرناسیۆناڵ سۆسیالیست بووەو ئێستاش هەیە کە زۆرم دیوەو زۆریش دۆستانە بەر خوردی کردوە. وەکوو خۆشەو وەکوو حیزبیش مەسەلەن جالیبە پێش ئەوەی ئێمە ببینە ئەندام لە ئەنتێرناسیۆناڵ سۆسیالیستدا ئیجازەیان دا کە ئەمن قسەم هەبێ. ئەوە زۆر کەم هەڵدەکەوێ. ئاخر کاک مەسعوود بارزانی چەند جاری قسە کردوە بەڵام مەوقیعیەتی وی دەگەڵ منو حیزبی دێموکرات فەرق دەکا. ئەو حاکمی وڵاتێکە. بەڵام ئەوەندە نێزیکایەتی‌یان هەبوو کە ئیجازەیان دا ئەمن قسە بکەم. بۆیە ئەمن چەندجار لە کۆبوونەوەکانی ئەنتێرناسیۆناڵی سۆسیالیستدا قسەم کردوە.

ئەوجار لەباری شەخسییەتەکاندا هەر یەکەی دەبێ لەبارێکەوە سەیری بکەی. بەڵام زۆرم حەز لە سۆسیالیستە لاچووەکان لەبەر ئەوەی بوو ئەمەنی چووبووە سەری. بەڵام لە هەمان کۆنگرەدا کە لاچوو، هەڵیان‌بژارد وەک سەرۆکی ئیفتیخاری. وەکی بزانم ئەو عینوانەی هەتا ئێستێش هەر هەیە. دەنا وەکی عەرزم کردی هەرکام لە شەخسیات بیگری بۆخۆی جەزابییەتی خۆی هەیە.

**عەباس کاردۆ:** لەژیانتدا کێ یان چ شتێک زۆری ناڕەحەت کردووی؟ هەڵوێستت چ بووە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ناکرێ لەژیاندا شت نەبێ پیاو پێی ناڕەحەت بێ. بەڵام بۆ ئەفراد بە دروستی نازانم ناوی هیچ کەس بەرم. ئەوەی دەمەوێ باسی بکەم دوو شتە. یەکیان ئەوەیە، زۆرجار موخالەفەتێکی کە دەگەڵ من کراوە لە ناڕوونیی مەوزیعو تێنەگەیشتنی بیروبۆچوونی من بووە. تەنانەت زۆرجار لە ژیانمدا ڕێ‌کەوتوە کە یەکێک بەناحەق لەمن تۆراوە. چووم داوای لێبووردنم لێ کردووە بۆم تەوزیح داوە. ئەوی دیکە کە کارم بەوەی نیە کێ باوەڕ دەکار کێ باوەڕ ناکا. بۆ ویژدانی خۆم دەڵێم دەگەڵ ویژدانی خۆشم سادقم، ڕەنگە زۆریش ناسروشتی بێتە بەرچاو. لە ژیانمدا هەڵکەوتوە یەکێکم خۆش نەوێ. بەڵام لە ژیانمدا ڕقم لە هیچ کەس نەبووە. هەر لە هیچ کەس. ئێستێ ڕقم لە ئەحمەدی‌نژادی نیە. چم بۆ بکرێ دەیکەم بۆ ئەوەی شەڕی ئەحمەدی‌نژادی لەسەر خەڵکی ئێرانێ کەم بێتەوە. بەڵام وەکوو ناخۆشەویستی، ڕقی خۆم نەکردۆتە عەمباری ڕقی هیچ کەس. زۆرم پێ‌خۆشە دڵم خەزێنەی خۆشەویستیی هەموان بێ. هەموو منداڵی دنیایەم خۆش‌دەوێن. هەموویان جا نی هەرکەس بێ، یان سەر بە هەر نەتەوەیەک بێ. دۆستایەتیم دەگەڵ زۆر کەس هەیەو هەر وەک گوتم پێم‌خۆشە دڵم گەنجینەی خۆشەویستیی هەموان بێ. بەڵام ئیدی دڵم عەمباری ڕقی هیچ کەس نیە. یەکێک دەتوانێ دەرکی بکا یان دەرکی نەکا، ئەوە مەسەلەی خۆیەتی. بەڵام دەگەڵ خۆم‌ودەگەڵ ویژدانم‌و دەگەڵ میللەتم‌و دەگەڵ خودای خۆم سادقم.

**عەباس کاردۆ:** بۆ چ شتێک زۆر بەداخ بووی؟ هەبووە کارێک بکەی‌و دوایە لەناخی دڵەوە لێی پەشیمان بی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لە جێیەکی دیکەدا باسم کرد. گوتم قسەیەکم کردوە هەتا دەمرم لەسەر دڵم سەراقەو زۆری لێ‌پەشیمانم. بە بێ مەورید ناتوانم باسیان بکەم. بەڵام هەرکات مەوریدێک بێتە پێشێ کە بزانم وەختی خۆی خەراپ بووە ئیعتیراف پێ‌دەکەم پێشم وایە ئەوە شوجاعەتە. لەزیمنی ئەو باسانەدا پێموایە تێ‌گەیشتی

کە ئەمن ئەگەر شتێکم کردبێ و ئێستاش باوەڕم پێی هەبێ باسی دەکەم، جا کێ پێی خۆشە یان پێی ناخۆشە کەیفی خۆیەتی. مەسەلەن گوتم بەیانێک کە لەبارەی گرووهی حەوت کەسییەوە بڵاومان کردەوە بەناوی حیزب بوو بەڵام ئەمن نووسیومە. ئەوکاتیش پێم وابوو کارەکەیان خەراپ بوو و ئێستاش هەر پێموایە خەراپ بوو. بەڵام زۆرجاریش بووە کەسێک هێندێک شتی بووە کە خەیاڵی خۆیەتی. مەسەلەن نی وا هەیە ژیانی تەرخان کردووە بۆ موخالەفەتی من. هەرچەند دەکەم دەکرێتم نازانم بۆ؟ بۆ وێنە هەر ئەو کابرایەی ئەتۆ وتارێکت دەموقابیلدا نووسی، حەسەنی ئەییووبزادە. ئێستێش تێناگەم بۆچی موخالیفی منە. بەحیسابم هیچ خەراپەیەکم بۆی نەبووە. ئەمن یەک‌جارم جواب دایەوە گوتم لێرە بەولاوە چ دەڵێ با بیڵێ. هەتا دنیاش دنیایە جارێکی دیکە جوابی نادەمەوە. چونکی پێموایە هەموو بەویژدانێک دەزانێ ئەو هیچ بەرهەمێکی لەو قسانەی وەرنەگرتووە. نە ئەوو نە ئەو کەسانەش کە لەپشت سەری ڕاوەستاون هیچ بەرهەمێکیان پێ نابڕێ. ئاخر خەڵکێک هەیە کە هانی دەدەن. ئەگەر زانیبام چیەر خەتایەکم شک بردبایە، پاش ئەو هەموو جنێوو بوختانەی بۆی هەڵبەستم بەتایبەتی دەچووم داوای لێبووردنم لێ دەکرد. بۆیەش وا نالێم واز بێنێ. گەردنی خۆشو ئازا بێ هەتا هەیە با هەر درێژەی بدا.

[illegible] بەڵام هەتا سیستمێک بە ناوی جمهووری ئیسلامی لەسەر کار بێ هیچ ئومێدێکم بەوە نیە مەسەلەی میللەتی ئێمە حەل ببێ. لەحاڵێک‌دا لە سیاسەتدا ئەوە موتڵەق نیە. ئەگەر لە باری سیاسییەوە لە من بپرسن دەڵێم بۆ نا؟ جمهووری ئیسلامی ئەگەر ڕۆژێک مەجبوور بێ دەتوانێ بیکا. ئەو خومەینییەی پەیامی بیستوشەشی خەزەڵوەری بڵاو کردەوە کە زاهیرەن دەستی ئاشتی و دۆستایەتی بۆلای کورد درێژ دەکرد، هەر ئەو خومەینییە بوو کە فەرمانی حەملە بۆ کوردستانی دەرکرد. ئەو خومەینییەی جامی ژاری نۆشی، هەر ئەو خومەینییە بوو کە لە واقیعدا بەشێوەی جۆراوجۆر وای کرد کە بیانوو بداتە دەست عێراق بۆ هێرش بۆ سەر ئێران. یانی نامومکین نیە ئەو جۆرە شتانە، بەڵام ئەگەر وەکوو خۆم بیر دەکەمەوە هیچ ئومێدێکم بەوەی نیە. شتی ئاوا هەیە بەڵام حەتتا ئەویش بە موتڵەقی نیە.

**عەباس کاردۆ:** خۆشترین و سەرکەوتووترین دەورانی ژیانت کەی بووە؟ هۆیەکانی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** باسی سەرکەوتووترین هاسان نیە بەڵام ڕەنگە خۆشترینی ئەو دەورانە بێ کە دەمدی دەنێو خەڵکی خۆمدام. هەر بەڕاستییش ئەو کاتە خۆم زۆر خۆشحاڵ دەدیت. ئێستاش پاش ئاواتە گەورەکە کە ڕزگاریی نەتەوەکەمانە، ئاواتی دووهەمم ئەوەیە جارێکی دیکە لەنێو خاک و خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا خۆم ببینمەوە. یانی ئاواتی دووهەمم ئەوەیە. ڕەنگە بەداخەوە ئاواتە گەورەکە بڕێک دوور بێ. با بە خەیاڵ دڵی خۆم خۆش نەکەم. ڕەنگە ئەویان نەبینم. بەڵام زۆرم ئارەزووییە ئەمرو ئەوی دیکەیان ببینم. یانی جارێکی دیکە دەنێو خەڵکی خۆماندا بژیم و لەخۆشی و ناخۆشییەکانیاندا بەشدار بم. ڕەنگە ئەوە نیشتمانپەروەریی مەحدوود بێ، بەڵام ئارەزووم ئەوەیە خۆم لەو گوندە دێیەدا ببینمەوە کە لێی لەدایک بووم و لێی گەورە بووم.

مەسەلەن ئەوساڵ دوو شت هەبوون کە یەکجار زۆریان پێ خۆشحاڵ بووم. یەکێکیان ئەوە بوو کە جێژنی نەورۆزی بە شێوەیەکی زۆر ڕێکوپێک لە دێیەکەی ئێمە گیرابوو. چەند دڵخۆش بووم ئەمن کە ڕۆژێکی ڕەنگبوو شانازی بەخۆشەوە بە دێیەکەشمەوە بکەم کە ئەدێیەکی دووردەست کەسێک هەڵکەوتوە وەک سکرتێری حیزبێکی گەورەی کوردی خزمەت دەکا. بەڵام کە ئەوەم دیت یانی دێیەکەی مە وای لێهاتوە کە جێژنی نەورۆز بەشکۆیەکی ئاوا گەورەوە دەگرێ و سروودی نەورۆزی بۆ دەخوێنێ تێگەیشتم چ-ئاڵوگۆڕێک ڕووی داوە. سێ دێیەکەشم دەست کەوتوە کە بۆخۆی نیشانەی پێشکەوتنێکی گەورەیە و زۆرم دڵ پێی خۆش بوو.

ئەوی دیکە، ئەو بەینانە بۆیان باس کردم کە تیمی فووتباڵی "گۆڵێ"- چونکە ئەمن هەتا تەمەنی سێزدە ساڵیم ماڵمان لە"سیسێرێ" بوو و دوای ئەوە ماڵمان چووە "گۆڵێ"- دەگەڵ تیمی بەسیجی ڕێمەتێ یارییان کردوە، تیمی فووتباڵی گۆڵێ لێی بردۆتەوە. یانی پیاو پێی خۆشحاڵ دەبێ. جا مەبەستم ئەوەیە نیشتمان-پەروەری لە شوێنی لەدایکبوونتەوە دەست پێدەکا هەتا دەبێتە وڵاتی گەورەت. یانی یەکێک خەڵکی گوندێکە لە ناوچەی پیرانشار. ئەوێشدا ئەوێی خۆشدەوێ، دوایە پیرانشار و لە دوایە ڕەنگە بچێتە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئەوجار دەگاتە وڵاتی کوردستان. تەنانەت ڕەنگە لە بەینی ئوستانی خۆی و ئوستانێکی دیکەدا هەر لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان دڵی بۆ ئوستانەکەی خۆی زیاتر لێبدا. مەبەستم ئەوەیە بڵێم ئەو ئارەزووە چووکانەشم دەدڵدا هەر هەن.

**عەبباس کاردۆ:** مامۆستا با پرسیارێک هەر لەو پێوەندییەدا بکەم. دەبینی کابرا خەڵکی مەهابادە ساڵی دەڕوا بۆ سنەی. ڕەنگە بۆ ماوەیەکی کورت ئەمێ خۆی بە غەریب بزانێ. بەڵام بۆچی ئێوە لە خاکی باشووری کوردستان خۆتان بە غەریب دەزانن لە کاتێکدا هەمووی هەر کوردستانە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن دەگەڵ ئەوی دیکەش هەر نیم. ئەو وەختەی لە فۆلکلۆری کوردیدا دەڵێ: **کە وڵاتی خۆمان کێژێک دیارە بە قەت ئەو کێژەی خەم لەعلم بارە**، وێژەری ئەو بەیتە فۆلکلۆرییە قەت بیری لە کوردستانی ئێرانو عێراق نەکردۆتەوە. ڕەنگە خەڵکی پیرانشاری بووبێ وا ڕێ کەوتبێ ماڵی چووبێتە بانێ. ئەگەر لەلای بانێ چووبێتە مەسەلەن سەر گەلیخانو لەوێرا چیایەکی پیرانشاری دیبێ ڕەنگە ئەو بەیتەی بۆ هاتبێ. یانی لەداخڵی وڵاتیشدا لە دێیەکەوە دەچیە دێیەکی دیکە بۆ ماوەیەک غەریبی. بەڵام ئەوە کە لە بەشێکی کوردستانەوە دەچیە بەشێکی دیکە، قەیدو بەندێکی سیاسیی زۆر دروست بووە کە ئەتۆ دەگەڵی بێگانەی. ئێستا بمانەوێو نەمانەوێ ئێمە لە باشووری کوردستان هاونیشتمان نیین. ئێمە خەڵکی وڵاتێکی دیکەین. لە باسی شوعارو ئارەزووەدا جۆرێکی دیکەیە. بەڵام لەدنیای واقیعدا وا نیە. ئێستا زۆر کەس لە ئێمە بەتایبەت ئەوانەی لە دەرەوەن باسی ئەوە دەکەن کاکە ئەمن ئێرانی نیم یان عێراقی نیم، ئەمن کوردستانیم. لە دنیای واقیعدا دیارە تاڵە بەڵام دەبێ ئەو تاڵییەی ببینین. ئێستا ئێران هەیە، عێراق هەیە، تورکیە هەیەو سووریەش هەیە بەڵام کوردستان نیە. لە پاسپۆرتی هیچ کوردێک نانووسرێ کوردستانی چونکی بەداخەوە وڵاتێکمان بەناوی کوردستان نیە. خۆش یان ناخۆش ئەوە واقیعە. بۆیە پێموایە فەرقی هەیە. ئەگەر کوردێکی خەڵکی قەڵادزێ بچێتە هەولێر یان دهۆک دەگەڵ ئەوەی بچێتە سەردەشت فەرقی هەیە. خۆ سەردەشتو قەڵادزە نێزیکنو زۆریشیان بنەماڵەیان لەت بووە کە بەشێکیان لە سەردەشتێو بەشێکیان لە قەڵادزێ. کەچی وەختێک قەڵادزەیی یەکە دەچێتە سەردەشت لە زۆر حەقی کۆمەڵایەتیو قانوونی بێبەش دەبێ. بۆیە بتەوێو نەتەوێ وڵاتی خۆت نیەو هەر بۆیە غەریبی.

**عەباس کارەنۆ:** مامۆستا لەژیانی خۆت ڕازیی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێموایە کەس ناتوانێ شاوا مرتڵەق جواب داتەوە. چونکی ژیان خۆشیی هەیەو ناخۆشیی هەیە. دڵخوازی هەیەو نادڵخوازی هەیە. بەڵام لە ژیانی خۆمدا ئەمن وا دەبینم. بەخۆم بەژیانی خۆم نارازی نەبووم. لە ناموڵایماتی ژیانم کە زۆریشم دیوە، زۆرم ڕەنج کێشاوە، بەڵام هەمیشە پێمخۆش بووە بۆخۆم بم. مەسەلەن لەحزبەکی بیرم لەوەی نەکردۆتەوە سەرم ڕەش کەمەوە. سپێلیشم پێشیشم بتاشم کە دیار نەبێ سپی بووە. پێمخۆش بووە ئەوە بم کە هەم. ئێستێ زۆر کەس هەیە نووسەرە. وتارێک یان کتێبێک کە چاپ دەکەن ئەگەر وێنەی خۆیانی دەگەڵ دابنێن، وێنەی چەندین ساڵ زووتر دادەنێن. ئەمن پێمخۆشە ئەگەر وتارێکم نووسی یان مرساحەبەیەکم دەگەڵ کرا، عەکسی ئەو ڕۆژەمی دەگەڵ دابنێن. ئەوە بم کە هەم. یانی خەڵک ئەمن ببینێ وەک چۆن هەم. لەو بارەیەوە لەخۆم نارازی نیم.

دیارە پێم‌خۆش بوو جێگەو پێگەی کۆمەڵایەتیم بەرزتر بایە. پێم‌خۆش بوو جوان‌چاک بایەم. پێم‌خۆش بوو زیرەک‌و زانا بووما‌یە. چووزانم پێم‌خۆش بوو لەباری ئیمکاناتی دارایی‌یەوە ئیمکاناتی باشترم هەبایە. یان پیاوەتیم پتر پێ کرابایە. هەمووی ئەوانەم پێ‌خۆش بوو، بەڵام بەوەی کە هەمە ڕازیم. پێم‌خۆشە لێرەدا ئەوەی بڵێم ئەمن کوڕە جۆلام. هەتا ساڵی ١٣٦٥ ئەمن هەموو نامەکانم کە نووسراون بە ناوی "عبدالله حیاکی" بوون. حەیاکی یانی جۆلازادە. لەوەی کە کوڕە جۆلام هیچ پێم کەم‌و عەیب نەبووە، بەڵکوو شانازیم بە بابو براکانی خۆمەوە کردوە. دوایە دوکتۆر قاسملوو کە زۆرم حورمەت بۆی هەبوو گوتی ئەری ئەتۆ دە سجیلیش-دا هەر حەیاکیی؟ گوتم نا حەسەنزادەم. گوتی باشە لە هەموو دنیایە قانوونە کابرا بە پێی شناسنامە خۆی دەناسێنی. ئەتۆ بۆ حەسەنزادەکەی نانووسی؟ لەو وەختی‌ڕا ئەمن حەسەن زادەم بەکار هێناوە.

**هەیاس کاردۆ:** مامۆستا شتێکی دیکە. جەنابت مەلا بووی. ئێستا هێندێک کەس هەر بە مەلا عەوڵا ناوت دەبەن. ئایا ئەوەت پێ‌ناخۆشە؟ داخوا لە مەلابوونی خۆت پەشیمانی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەمن ڕەنگە لەبارێکەوە پێم ناخۆش بێ. چونکی هێندێک لەوانەی کە ئەمن بە مەلا ناو دەبەن لەڕاستی‌دا پێیان وایە تەوهینم پێ‌دەکەن بۆیە وا دەڵێن. چونکی وا هاتوە خەڵک یان پێم‌دەڵێن عەبدوڵلای حەسەنزادە یان لەمێژە بەسەرەوە براوە پێم دەڵێن مامۆستا. مەسەلەن هەمیشە دوکتۆر قاسملوو هەتا ناوی من هاتبێ هەر نووسیویەتی مامۆستا. جا ئەوانەی پێم دەڵێن مەلا تەنیا ڕەنگە لەو بارەیەوە پێم ناخۆش بێ چونکی لە واقیعدا دیانەوێ تەوهینم پێ بکەن. بەڵام لەسەر یەک ئەمن شانازی بە مەلایەتی‌یەوە دەکەم، بە دەلایلێکی زۆر:

یەکیان ئەوەیە ئەگەر مەلا نەبامایە نەخوێندەوار دەبووم کە ئینسان دەبێ خوێندەوار بێ هەتا بزانێ نەخوێندەواری چەندە ناخۆشە. مەسەلەن ئێستا کە ئەمن مەتنێکی ئەڵمانی دەبینم یان مەتنێکی ڕووسی دەبینم دەزانم دەردی نەخوێندەواری چەند ناخۆشە. ئەگەر ئەمن دەرسی مەلایەتیم نەخوێندبایە دەرفەتی خوێندنم نەدەبوو، کەوایێ بێ‌سەواد دەبووم. هەموو ئەو شتانەی پێشتر باسمان کردن فەرعی ئەوەن کە ئەمن بوومە مەلا. ئەمن کە لە کۆمەڵی کوردەواری‌دا لەقەدەر خۆم ڕێزو حورمەتێکی زۆرم لێ گیراوە، بەشی هەرە زۆری بۆ ئەوە بووە کە مەلا بووم. جگە لەوە مەلابوون بۆ من بەمانای چوون بۆ نێو هێندێک کۆڕو کۆمەڵیشە. لەنێو مەلایاندا ئەوە هیچ کە پێیەکەوە بووین، بەڵام ئەگەر تەماشا بکەی مەلایەتی بۆ من بەمانای هاومەسلەکی دەگەڵ مەسەلەن شاعیرانی وەکوو نالی، وەکوو ناری، بێخود، مەحوی‌و ئەدیبانی گەورەیە. ئەوانەو زۆری دیکەش هەموو مەلا بوون. زانایانی زۆر گەورە، بەتایبەتی ئەوانەی لە بواری نیشتمانپەروەری‌و سیاسی‌دا خزمەتیان کردوە. ئەمن دەچمە هاومەسلەکی شێخ سەعیدی پیران شێخ عوبەیدوڵلای شەمزینی، مەلا

مستەفای بارزانی، قازی موحەممەد، مەلا ئاوارە، مەلا مەحموودی زەنگەنەو بەدەیان و سەدان گەورەپیاوی سیاسی کورد. یان ئەدیبانی شۆڕشگێڕی وەک مەلای گەورەی کۆیە، حاجی قادری کۆیی و زۆری دیکەش.

داوای لێبووردن دەکەم بەڵام پیاو دەبێ زۆر بێعاقڵ بێ کە پێی ناخۆش بێ دەگەڵ ئەوانە ناوی ببرێ. ئەوانەش کە بەقەستی ئەوەیین ناوی من ناوا دەبەن یانی مەلا عەوڵا- دەنا خەڵکێکی زۆر هەیە پێمدەڵێن مەلا عەوڵا ئەوە تەبیعی‌یە- ئەوانە ئیدی بێ ئەوە بەخۆیان بزانن ئەوەیین بەو شەخسییەتە گەورانە دەکەن. ئەتۆ تەماشای ڕابردووی کورد بکە، گەورەپیاوانی کورد لەباری کۆمەڵایەتی، دینی، ئەدەبی، سیاسی و نیشتمانپەروەری‌یەوە زۆربەیان مەلان، خوێندنیان مەلایەتی بووە. کەوابوو ئەگەر پێیان وایە بەو ناوە ئەوەیین بەمن دەکەن ئەوەیینیان بەو گەورە پیاوانەش کردوە. نازانم ئەوەیین بەو گەورە پیاوانە شانازی‌یە یان عەیبە. ئەمن پێم- وایە عەیبە.

# دوو پرسیار لەبارەی ئێستای ئێرانو مەسەلەی کوردەوە

**هێلس کارەن:** مامۆستا هەرچەند زۆر پەیوەندیی بە ژیانی ڕابردووی خۆتەوە نییە، بەڵام پێمخۆشە ئەزمونی جەنابت لەسەر یەک دوو مەسەلەی گرنگی ڕۆژ بزانم؛ دوای هەڵبژاردنی ساڵی ڕابردووی سەرکۆماری لە ئێرانو دزینی دەنگی خەڵک لەلایەن دەسەڵاتبەدەستانەوە، خەڵک تەکانێکی دا بەخۆیو هەر وەک دەبینین لە ساڵرۆژی ئەو ڕووداوەشدا جموجۆڵی زۆر نیشان درا. کۆی ئەو ئاڵوگۆڕانە چۆن دەبینی؟ ئەسڵەن بۆ هەڵوێستەکانی حیزبەکەت لە پەیوەندیی دەگەڵ هەڵبژاردنەکانی ئێراندا باس ناکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن لەجێیەکی دیکەی ئەو وتووێژەدا باسی ئەوەم کرد کە یەکێک لەو شتانەی لێیان ناڕەحەتم وەکوو خۆم، ئەوەیە کە پێموایە لە چوارچێوەی جمهووریی ئیسلامیدا کورد بە مافو ئازادی-یەکانی خۆی ناگا. بەڵام ئەوکاتانەش کە دە دەسەڵاتی حیزبیدا بەشدار بووم ئەو باوەڕەی خۆم تەبلیغ کردووە بەڕواڵەتیش سەرکەوتووە چونکی ئەوە هەر باوەڕی من نیەو پێش من باوەڕی دوکتور قاسملووی بووە کە مامۆستای هەموومان بوو. ئەوەی کە زۆرجار دوکتور قاسملوو دەیگوت سیاسەت هونەری مومکیناتە. ئەمن وا تێدەگەم کە ئینسانی سیاسی دەبێ لەسەر هەلومەرجی سیاسی بڕیاری سیاسی بدا. نەک ئەوە کە یەک دەندە بێ یان وەک ئەوەی لە کوردەواریدا دەڵێن قسەی پیاوان یەکە، ئاوا بێ. ئەمن زۆرجار بەگاڵتە دەڵێم لە سیاسەتدا قسەی پیاوی عاقڵ سەتە. وا نیە ئەتۆ قسەکەت هەر یەک بێ، هەر ئەوەشە دەبینی ڕۆژێک دوو هێز دۆستن، ڕۆژێک موخالیفنو ڕۆژێک تەنانەت دوژمنی یەکیشن.

جا هەلومەرجێک کە لە ئێراندا هاتۆتە گۆڕێ، هەرچەند تەقریبەن لەسیو یەک(٣١) ساڵی ڕابردوودا ئەو هەلومەرجە هەمووی لە چوارچێوەیەکی بەرتەسکدا بووە. لە نێوخۆی ئێراندا قانوونێک هەیە، سیستمێکو ڕێژیمێک هەیە کە ئەوعەناسیرەی تێیدان دەبێ لەو چوارچێوەیەدا بجووڵێنەوە. ناتوانن زیاتر لەو چوارچێوەیە کە بۆیان دانراوە پێی ڕاکێشن. ئێمە هەر لە کۆنەوە هەتا ئێستا وەکوو حیزبی دێموکرات زۆرجار بە پێی ئەو هەلومەرجە هەڵسوکەوتمان کردوە. بۆ نموونە بۆچوونێک هەیە، هەم پێشتر بووەو هەم ئێستا هەیە کە دەڵێ سەرانی جمهووریی ئیسلامی هەموویان وەک یەکن. بەقەولی مەشهوور بەرووپشتی سکەیەکن یان وەک فارس دەڵێ "سرو تە یک کرباسند". کورد شتی خراپتریش دەڵێ. ئەمن پێموایە دە سیاسەتدا نابێ وا بێ. یانی بە شتێکی مەنتیقیی نازانم. ئێستا لە بەینی ئەوانەدا کە لە ئێران وەک سەرۆک کۆمار هاتوونە سەرکار، قەت

ناتوانی بەنی‌سەدرو ڕەجایی‌و خامنەیی‌و ڕەفسەنجانی‌و خاتەمی‌و ئەحمەدی‌نژادی وەک یەک دانێی. ئەسڵەن بە عاقڵانەی نازانم ئینسان بڵێ خاتەمی‌و ئەحمەدی‌نژاد لە یەک‌قوماشن. ڕاستە لە چوارچێوەی ڕێژیمێک‌دا مەحدوودن بەڵام ڕێژیمی چاک یان خەراپ ئەو عونسورەی کاری تێدا دەکا دەتوانێ لەسەر باشتر یان خەراپترکردنی ڕەفتارەکان تەئسیر دابنێ.

ئەگەر ڕێژیمەکە ڕێژیمێکە دڕندە کە دەیەوێ خەڵکی بخوا، مەئموورەکەش بۆخۆی خوێن‌خۆرە، مەعلوومە پتر خوێن دەخوا. ئەگەر نا مەئموورەکە بۆخۆی ئینسانێکی سالمە، هەوڵ دەدا خۆی دەگەڵ ڕێژیمەکە بگونجێنێ بەڵام چەندی بۆی بکرێ کەمتر خوێن دەخوا. ئەگەر ڕێژیمەکە ڕێژیمێکی گەلی‌یەو مەئموورەکە بۆخۆشی گەلی‌یە، هەوڵ دەدا پتر خزمەت بکا. ئەگەر مەئموورەکە دژی گەلی بوو، بەشی خۆتەتبیق‌کردنێ خزمەت دەکا بەڵام چەندی بۆی بکرێ کەمتر چاکە دەگەڵ خەڵکی دەکا.

جا هەر لەو چوارچێوەیەدا ئەمڕۆ حیزبەکەشم ئەگەر تەماشا بکەین لە ڕابردوودا هەڵوێستی جۆراوجۆرمان گرتوە. مەسەلەن هەر لە ئاخرهەڵبژاردندا کە پارەکە ڕووی‌دا، حیزبی دێمۆکرات نەک ئەوە کە بڵێ خەڵکینە بەشدار بن - کە پێموایە دەبوو وا بڵێ‌و دەبوو بشڵێ دەنگ بە کام کاندیدا بدەن - ئەوە ڕوانگەی خۆمە. دەنا دەستی حیزب خۆش بێ‌و ئەمنیش تەبەعییەتم لێ‌کردوە. چونکی هەشت مانگ پێش هەڵبژاردنێ لەڕۆژا ڕادیۆ ئەمریکا تەلەفۆنی بۆکردم‌و لەسەر هەڵبژاردنی ئێرانێ پرسیاری لێ‌کردم. گوتم دەنگی ئینسانێک دەگەڵ دەنگی حیزبێکی سیاسی ئەرقی هەیە. ئینسانێک کە لەداخڵی وڵاتدا دەچێتە سەر سندووقی دەنگدان ڕەنگە هەر بۆیە بچێ چونکە ئەگەر شناسنامەکەی مۆری هەڵبژاردنی وێ‌نەکەوتبێ سبەینێ کەملوکوڕیی بۆ دروست دەکەن. بۆ وی ئەوەندە کافی‌یە بۆ ئەوەی بچێ دەنگ بدا. بەڵام حیزبی سیاسی دەبێ چاوی لە بەرنامە بێ. دەبێ بزانێ کاندیداکە بەرنامەی چیە. ئەگەر بەرنامەکەی باش بوو دەنگی دەداتێ‌و ئەگەر باش نەبوو دەنگی پێ نادا.

لە یەکەم هەڵبژاردنی سەرکۆماری‌دا ئێمە وەک حیزبی دێمۆکرات بڕیارماندا بەشدار بین‌و داوامان لە خەڵک کرد بەشدار بن‌و دەنگیش بدەن بە مەسعوودی ڕەجەوی چونکی دای‌نابوو ئەگەر بێتە سەرکۆمار گەڵاڵەی ٢٦ ماددەیی دەستەی نوێنەرایەتیی گەلی کورد بکاتە مەبنایەک بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد. دوایە کە ئەویان حەزف کرد حیزبی دێمۆکرات گوتی بەشدار نابین چونکی کاندیداکانی دیکە شتێکی وایان نەگوتبوو کە دڵی پێ‌خۆش کەین. لە هەڵبژاردنی پارەکەدا دیارە لە ناکامی هەوڵی بەشێک لە دڵسۆزان‌و بژاردەکانی کورد لە نێوخۆی وڵاتدا بوو کە چوونە لای کاندیدەکان‌و قسەیان دەگەڵ کردن‌و گوتیان باشە ئێوە دەبنە سەرکۆمار چیتان بۆ خەڵکی ئێران‌و بۆ ئەتەوە زۆرلێکراوەکانی ئێران پێ‌یە. دوو کەس لە کاندیداکان لەو پێوەندی‌یەدا بەرنامەیەکیان دا. بەرنامەی هەر دووکیان زۆر ناقیس بوو. هەم ئی کەڕووبی‌و

هەم ئی مرۆڤەوە. بەڵام لە چوارچێوەی جمهوریی ئیسلامی‌دا و لەچاو ئەوەی هەتا ئێستا عەمەلی کراوە هەنگاوێک بوون بەرەو پێش، بەتایبەتی ئی کەڕوبی شتی باشی تێدا بوو بەو مانایە لەو چوارچێوەیەدا نەک هەموو داخوازەکانی ئێمەی باس کردبێ. لە سیاسەتیشدا خۆ ئەوە نیە ئەتۆ بتەوێ هەموو شتێکت دەست کەوێ. باشە ئەوانەی سەختگیرن ئەوانە چ دەکەن؟ ئەمن دەڵێم خەڵکی نێوخۆی وڵات وەک ئازادیخوازان کە زۆرجار موخالەفەتیان دەگەڵ دەکرێ و جنێویان پێ‌دەدرێ، بەڵام ئەوە دەچێتە خەیابانێ، دەچێتە زیندانێ، ئەشکەنجە دەکرێ و چ دەکرێ. ئەوانەی لە دەرەوە قسەی گەورەگەورە دەکەن چییان کردوە؟ زۆرجار تەنانەت ئەوانە ئامادە نین بچن لە خەیابانێ دوو سەعاتان ڕاوەستن بۆ ئەوەی داخوازەکانی میللەت بێننە گۆڕێ. حەتتا بۆ ئەوە حازر نین. کەچی هەزار قسە بەوانە دەڵێن کە لە نێوخۆی وڵاتدا ئامادەن لە چوارچێوەی ئەو نیزامەدا هێندێک دەسکەوتی کەم وەدەست بێنن.

جا ئەگەر تەماشای تاریخی حیزبی دێموکراتی کوردستان بکەین، ئاوای کردوە. وەکی گوتم لە یەکەم ڕیفراندۆمدا کە کرا بەشدار نەبووین لەبەر ئەوەی ئینتیخابی تێدا نەبوو. گوترابوو جمهوریی ئیسلامی، ئا، یان نا؟ لەواقیعدا وا گوترا بوو، چونکی گوتبوویان جمهوریی ئیسلامی یان ڕێژیمی پاشایەتی؟ ڕێژیمی پاشایەتی بە خوێنو فرمێسکی خەڵک ڕووخا بوو، مەعلووم بوو کەس نایەوێ. بەڵام جمهوریی ئیسلامی‌یەک کە تاریف نەکراوە نەناسراوە، یان نیزامێکی دیکەیان لە موقابیلدا دانەناوە کە خەڵک بتوانن دەنگی پێ‌بدەن بۆیە گوتمان نا. هەڵبژاردنی سەرکۆماری بەو دەلیلە بەشدار نەبووین کە مەسعوودی ڕەجەوی‌یان حەزف کرد دەنا بەشدار دەبووین. بەڵام ئەووەڵین هەڵبژاردنی مەجلیس ئێمە بەشدار بووینو نوێنەرەکانیشمان لە بەشێکی زۆری حەوزەکانی هەڵبژاردندا هەڵبژێران. وەکوو مەهاباد، بۆکان، سەقزو بانە کە یەک حەوزە بوون، پیرانشارو سەردەشت کە یەک حەوزە بوونو شنۆو نەغەدە کە یەک حەوزە بوون. لەزۆر جێی دیکەش کەوتنە مەرحەلەی دووهەم بە دەنگی لەپێشەوە.

دواتر لە هێندێک هەلومەرجدا ئێمە تەحریممان کردوە. جاری وا بووە تەحریمەکەمان زۆر درووست دەرنەچووە. مەسەلەن ئەووەڵین دەورەی هەڵبژاردنی موحەممەدی خاتەمی ئێمە تەحریممان کرد. وا تێ‌دەگەم هەتا ئێستا هیچ هەڵبژاردنێک ئەوەندە خەڵک تێی‌دا بەشدار نەبوون. یانی دەرکەوت ئێمە هەڵسەنگاندنەکەمان تەواو نەبووە چونکی هەلومەرجی وڵاتمان نەناسیوە. ئەمن ئەوکات لە پاریس بووم کە دەگەڵ ڕەفیقێکی حیزبیمان لە کرماشان قسەمان دەکرد. ڕەفیقەکەمان گوتی هەڵوێستی حیزب دەزانم بەیانییەکەم دەبەر دەستدایە، بەڵام ئێستا ئەو گوێشی‌یە تەلەفۆنەی دادەنێمو دەچم ڕەئی دەدەم. چونکی ئێستا ڕەستاخێزە. باشە خۆ دەورانی خاتەمی دەورانی سەعادەتی ئەتەوە بندەستەکانو خەڵکی ئێران نەبوو. بەڵام دەورانێک بوو کە فەرقی دەگەڵ ئەوانی دیکە هەبوو.

دوایە نۆرەی مەجلیسی شەشەم هات. دەورەی شەشەمی مەجلیس ئەگەر لەبیرمان بێ دوای هەڵبژاردنی خاتەمی بوو. خاتەمی فەزایەکی کردەوە. فەزایەکی ڕیفۆرمخوازانە بوو، ئینقیلابی نەبوو. جا ئیختیلافەکە ئەوەیە. ئەمن پێم وا نیە ئێستا هەر دەبێ ئینقیلابی بێ. ئیسلاح یان ڕیفۆرم هەنگاوی چووکە چووکەڵەیە، پلیکانە بۆ ئینقیلابە گۆڕانی گەورەیە. بۆیە ئێمە وامان تەشخیس‌دا کە ڕەنگە ئێستا خەڵک بتوانێ نوێنەری خۆی بنێرێتە مەجلیس. یانی وا نیە ڕێژیم بتوانێ هەموواتیان بەکەیفی خۆی دیاری بکا. داوامان لە خەڵکی کورد بەشدار بن و داواشمان لەو کەسانە کرد کە پێیان وایە جێگای باوەڕی خەڵکن خۆیان کاندیدا بکەن. بۆ هەردووکی لەبیەیکمان پێ گوترا. هەم خەڵکێکی موحتەرەم لە کوردستان خۆیان کاندید کرد . هەمیش هەڵ-بژێران. ئەوە هەنگاوێک بوو. خۆ باش نیە حیزبی سیاسی حەتمەن خۆی لە دامودەزگاکان دوور خاتەوە. حیزبی سیاسی مەنتیقی دەبێ هەوڵ بدا لە هەموو دامودەزگایەکی ڕێژیمدا حوزووری هەبێ. ئەگەر توانی تەئسیر دابنێ، ئەگەر نەیتوانی با لە نێزیکەوە جۆنیاتی سیاسەت و ڕەفتاری ڕێژیم بزانێ.

لە واقیعدا هەموو حیزبە سیاسییەکانی کوردستان ئەو هەڵبژاردنەیان تەحریم کرد جگە لە حیزبی دێمۆکرات کە تەحریمی نەکرد و داوای لە خەڵک کرد بەشداری بکەن. بەشداریی خەڵکیش بۆ هەڵبژاردنی مەجلیسی شەشەم دەتوانم بڵێم بێ‌وێنە بوو. دواتریش ئەگەر لەبیرمان بێ "فراکسیونی نوێنەرانی کورد" پێکهات. فراکسیۆنی نوێنەرانی کورد ڕاستییەکەی ئەوەیە بە ئیبتیکاری حیزبی دێمۆکراتی کوردستان دروست بوو. ئێمە نامەمان نووسی بۆ ئەو نوێنەرانە. دیارە پێشنیاری من بوو بە شانازییەوە دەیڵێم هیچ شەرمیشم پێی نیە و وەکوو هەنگاوێکی دروست باسی دەکەم. نامەکەش ئەمن نووسیومە بەڵام دیارە بە ناوی حیزبەوە بوو. بۆمان نووسین و هەلومەرجەکەمان بۆ شەرح دان. لەوێدا نووسیبوومان بۆخۆتان دەزانن ئەگەر حیزبی دێمۆکراتی کوردستان دەعوەتی بۆ هەڵبژاردن نەکردبایە نە ئەو هەموو خەڵکە بەشدار دەبوو، نە ئێوەش خۆتان کاندید دەکرد. بۆیە داواتان لێ‌دەکەین فراکسیۆنی نوێنەرانی خەڵکی کوردستان دروست بکەن. بۆیەش ئێستا باسی دەکەم چونکی ڕێژیم لەمێژە زانیویەتی ئێمە داوامان کردوە دروست بکرێ. گوتمان با فراکسیۆنی نوێنەرانی خەڵکی کوردستان بێ بۆ ئەوەی غەیرە کوردەکانیش کە لە کوردستان هەڵبژێراون ڕەگەڵیان کەون. بۆیە کردیانە فراکسیۆنی نوێنەرانی کورد چونکی پێیوایە بەداخەوە ئەوانی دیکە ڕەگەڵیان نەکەوتن.

نە ئەمن دەتوانم بڵێم و نە ڕەنگە هیچ ئینسانێکی بە ئینسافیش بتوانێ بڵێ ئەو دەورەیەی مەجلیس دەگەڵ دەورەکانی دیکە فەرقی نەبوو. بەڵێ ڕاستە نوێنەرانی مەجلیس کوردستانیان ڕزگار نەکرد. بەڵام لەماوەی چوار ساڵ دەورەی مەجلیسی شەشەمدا هەمیشە مەسەلەی کورد تەنیا مەسەلەی زیندوو لەپارلمانی تاراندا بوو. هەمیشە لەسەر ئاننتێن بوو. ئەوە کارێکی کەم نیە.

جا ئەوە وەکوو پێشەکی بۆ ئەو باسە هێنامە گۆڕێ هەرچەند زۆریش درێژ بۆوە. با بێینەوە سەر باسی ئەوەی ئێستا. ئەمن پێم وابوو کارێکی باشە کە ئەوەمان کرد. ئەو سەفەرەش بەشی زۆری حیزبە سیاسی‌یەکانی کورد داوای بایکۆتیان کرد. ئەوانەی داوای تەحریمیان نەکرد حیزبی دێمۆکراتی کوردستان بوو دەگەڵ پارتی ئازادیی کوردستان. دیارە پارتی ئازادیی کوردستان باوەڕی بەوە هەبوو هەر داواش بکەین خەڵک بەشدار بێ و کاندید بدا و ئەوانە. یانی لەو بارەیەوە ئەو ڕادیکاڵتر بوو بەڵام بەیانە هاوبەشەکەی دەگەڵ ئێمە ئیمزا کرد. ئەمن زۆرجارم گوتوە، ناکامی هەڵبژاردن نیشانەی یەکێک لە دوو شتان بوو: یان نیشانەی ئەوە بوو خەڵک بەقسەی ئەو دوو حیزبەی کردوە بە قسەی ئەوانی دیکەی نەکرد کە ئەمن وای بۆ ناچم یان نامەوێ ئەو ئیدیعایە بکەم، یان نیشانەی ئەوە بوو ئەو دوو حیزبە خوێندنەوەیەکی باشتریان لە هەلومەرجەکە هەبوو. بەڕاستییش ئەو ئیدیعایە دەکەم دروستیشە. چونکی ئێمە پێوەندی‌یەکی بەرینمان دەگەڵ ڕووناکبیران و بژاردەکانی کورد لە داخڵی وڵاتدا هەبوو. ئەگەر لەبیریشمان بێ لەنێو خۆی وڵاتدا هیچ ڕێکخراوێک ئەوەی کە مومکینە لەوێ هەبێ، هیچ ڕێکخراوێک داوای تەحریمی نەکرد. هەموویان داوای موشارەکەتیان کرد. بەڵام هی وابوو داواکانی زیاتر بوون هی وا بوو داواکانی کەمتر بوون.

پاشان ئێمە پێمان وا بوو کە هەروایش دەرچوو، خەڵکی ئێران لەو موقابەلەیەدا دەتوانن لە دوو شتان یەکێک لە خامەنەیی و ئەحمەدی‌نژاد بستێنن. یان پۆستی سەرکۆماری‌یان لەدەست دەرێنن. یانی ئەحمەدی نژاد نەیێتەوە سەرکۆمار و خامەنەییش نەفەری خۆی دانەنێ. یان ئەگەر ئەوە نەکرا دەتوانن مەشروعییەتی لێ‌بستێنن. بەڵێ خەڵکی ئێران نەیانتوانی ئەو پۆستە لە ئەحمەدی‌نژادی بستێننەوە. چونکی بە کودیتایەکی ئینتیخاباتی ئەحمەدی‌نژاد بۆوە بە سەرکۆمار. وەختی خۆی شتێک بڵاو بۆوە ئەگەر لەبیرتان بێ، ڕاپۆرتێکی مەخفیی وەزارەتی نێوخۆ کە بۆ خامنەیی چووە. دەڵێ لەسەر تەوسیەی حەزرەتی عالی تەرتیبی کارەکانمان وا دا کە ئاغای ئەحمەدی‌نژاد بۆ دووهەمین جار بێتەوە بە سەرکۆمار. بەڵام ناکامی واقیعیی هەڵبژاردن ئاوایە. مووسەوی دەوری هەژدە میلیۆن دەنگ، کەڕووبی دەوری سێزدە میلیۆن و ئەحمەدی‌نژاد دەوری پێنج میلیۆن و چەند سەت هەزار دەنگ. یانی ڕاستە پۆستەکیان پێ لێ‌نەستێندرایەوە. بەڵام مەشروعییەتەکیان لێ‌ئەستاندەوە.

لەپاشان ئەوەی ڕووی داوە لەماوەی ئەو یەکساڵەی‌دا هەتا ئێستا، بە باوەڕی من بەرەوپێش‌چوونە. ڕاستە ڕێژیم بە سەرکوتی بێ‌ڕەحمانە توانیویەتی شەقامەکان بێدەنگ بکا، بەڵام لەوەتا ڕێژیم هەبووە نە بەقەد ئێستا لە تەنگانەدا بووە، نە بەقەد ئێستا ئیزۆلە بووە، نە بەقەد ئێستا بەدناو بووە نە بەقەد ئێستا بەخەراپی لە دنیادا ناسراوە. هەر ئەوەی ئێستا ڕووی داوە سەرکەوتن بۆ هێزی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی‌یە نەک بۆ ڕێژیم. مەسەلەن ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی کەنگێ گوتوویەتی ڕێژیم ناتوانێ سەرکوت بکا. کەنگێ گوتوویەتی بەدەستی بەتاڵ

بەتانک و تۆپ و هێلی کۆپتێرەکەی دەوێرێ. ئوپۆزیسیۆن گوتوویەتی ئەو ڕژێمە ئازادی کوژە. ئەو ڕژێمە مافی مرۆڤ پێشێل دەکا. ئەو ڕژێمە خەڵکی دەکوژێ. هەتا ڕژێم زیاتر جووڵاوەتەوە چاکتر ئەو ڕاستی-یەی دەرخستوە. چاکتریش دروستیی ئیزی ئوپۆزیسیۆنی ئێران بۆ خەڵکی دنیایە دەرکەوتوە. بۆیە ئێستاش پێم-وایە ئەو کارەی کرا باش بوو. خەڵک بەهانەی مەشرووعیان هەبوو بۆ ئەوەی بێنە مەیدانو بەرەنگاری دەگەڵ ڕژێم بکەن. دەرکەوت ئەوە کە "کوانێ دەنگەکانمان"- خەڵک بەو دروشمەوە هاتە مەیدان -، ئەوە تەنیا بیانوویە بۆ تەرحی مەتڵەبەکانیان. دوا گەیشتە جێگایەک کە دروشمی مردن بۆ دیکتاتۆرو مردن بۆ خامنەیی‌یان هێنایە گۆڕێ. تەنانەت کوللی نیزامیان هێنایە ژێر پرسیار. هیوادارم هەموو هێزە سیاسی‌یەکان چ کوردی و چ ئێرانی، هەم هەوڵ بدەن یەکدەنگی دەنێو خۆیاندا پێک بێنن. هەم سەعی بکەن پێکەوە بە هێزی یەکگرتووەوە لە فورسەتەکان کەڵک وەرگرن بۆ ئەوەی پێ بەپێ ئەو ڕژێمەی ناچار بە پاشەکشە بکەن. ئەوەش درێژەی هەیە هەتا ئەو ڕۆژەی بە جارێکی تێکیەوە دەپێچن. با پێشمان بڵێن "براندار" چونکە قەت حاشامان لەوەی نەکردوە کە بەرنەندازین. بەرئەندازیی کۆماری ئیسلامی یان هەر ڕژێمێکی دیکتاتۆری شانازی‌یە. بەڵام نابێ چاوەڕوان بین مووسەوی یان کەڕووبی شوعاری بەرئەندازی بەرز کەنەوە. چونکە ئەوان دەیانەوێ لە چوارچێوەی قانووندا عەمەل بکەن. خۆ لەو چوارچێوەیەدا ناتوانن بۆ لەبەینبردنیشی هەوڵ بدەن. ئەمن نالێم ئەوان شۆڕشگێڕن بەڵام ئەوەی بڵێ ئەحمەدی‌نژاد دەگەڵ مووسەوی و کەڕووبی یەکێکە. دەبێ هەر بڵێین خوا ڕەحمی پێ‌بکا. یان ئەوەی کورد دەڵێ خوا عەقڵ بدا بە منداڵی.

**عەباس کاردۆ:** پرسیارێکی دیکە. وەک خۆت، خوێندنەوەت لەسەر دەسەڵاتی ئەمڕۆی کورد لە باشووری کوردستان چی‌یەو داهاتووەکەی چۆن دەبینی؟ چاوەڕوانی‌یەکانت لێی و بەربەستەکانی سەر ڕێگای. بەگشتی وەزعی ئێستای ئەو حکوومەتە چۆن هەڵدەسەنگێنی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** زۆرجار گوتوومە ڕەنگە دووپات‌کردنەوە بێ کە دەسەڵاتی کورد لە باشووری کوردستان ڕەخنەی لەسەرە. بەڵام ئەو دەسەڵاتە لە زۆر بارەوە پیاو دەبێ نمرەی باشی بداتێ. هەرکەس داوەری دەکا پێم‌وایە ناکرێ ئەو کارە باشانەی نەبینێ. ئەگەر بێ تەعەسسوبو واقیعبینانە تەماشا بکەین ئەو سیستمە حکوومەتی‌یەی لە باشووری کوردستان هەیە. دەگەڵ ئەوەی کورد ئەزموونی دەوڵەتداریی زۆر کەم هەیە، هێندێک ئەزموونی کورت ماوەی لە تاریخدا هەن کە هیچیان ئەزموونەکەیان بۆ پاش خۆیان نەماوەتەوە. لەحاڵێکدا دەوڵەتانی دەوروبەرمان لە دووهەزارو پێنج سەت ساڵەوە هەیانە هەتا ئەوەی هەرە تازەیان کە سەد ساڵ زیاترە تەجروبەی دەوڵەتداریی بەردەوامی هەیە. بەو حاڵەش سیستمی ئیداریی دەوڵەتی لە کوردستان بە باوەڕی من لە مەجموعدا دواکەوتووتر لە هیچیان نیە. ئێستێ زۆر باسی گەندەڵی دەکرێ. گەندەڵی بەڕاستی هەیە،

کەس حاشای لێ ناکا. بەڵام حەقتا لەو بارەیەشەوە کوردستان ئەگەیوەتە جێگاکانی دیکەی عێراق. ئێستێ شەش مانگ تێ‌نەپەڕیبوو کە باسی حەیف و مەیلی یەک میلیارد دۆلاری لە وەزارەتی دیفاعی عێراقدا هەبوو، ئەوە هەر لەچەند مانگی ئەووەڵدا. ئەوەش هەیەو عەیبی دیکەش هەن. دەبێ هەوڵ بدرێ و دەبێش هەموو کەسێکدا سەرکردەکان دەبێ هەوڵ بدەن ئەو دیاردە ناحەزانە بنبڕ بکەن.

ئەوە کە ئایندەکەی چۆن دەبینین، پێشبینی کردنی کارێکی زۆر ئاسان نیە. بەڵام ئەمن ئەو ئۆمێدەم هەیە کە کورد نە لە عێراق و نە لە جێگاکانی دیکە قەت ئەگەڕێتەوە ئەو وەزعەی کە پێشتر تێی‌دا بووە. دەزانین مەسەلەی کورد لە هەموو جێگایەک هاتۆتە پێش. ئەگەر وەزعییەتەکە هەڵسەنگێنین و واقیعبینانە تەماشا بکەین، ئەمن پێموایە کورد لە تورکیە پێشکەوتنی پتر وەدەست هێناوە تا لە عێراق. ڕاستە لە عێراق فیدڕالیزم بەڕەسمی ناسراوە، حکوومەتی هەرێمی کوردستان بەڕەسمی ناسراوە. بەڵام ئاخر لە عێراق لە نیزیک سەت ساڵ پێش ئێستاوە کورد لە دەسەڵاتدا بەشدار بووە، خوێندنی بەزمانی خۆی بووە، ئیعتیرافی پێ کراوە و بە شەریکی ئەو وڵاتە ناسراوە. دیارە ئەوانە قۆناغ بە قۆناغ بوون نەک بڵێی هەمووی لە سەدساڵ پێشەوە هەبوون. بەپێی ئامارێک کە ئەمن خوێندوومەتەوە ساڵی ١٩٢٧، لەسەدا هەشتاو پێنجی(٨٥%) هەموو کارمەندانی ناوچەی کوردستان کورد بوون، لە هەموو عێراقیشدا سەدا پازدەی (١٥%) هەموو کارمەندەکان هەر کورد بوون. زۆر دەسکەوتی پتری بووە.

بەڵام لە تورکیەی هەتا پازدە بیست ساڵ پێش هەر وجوودی کورد ئینکار دەکرا. ئێستا ئیعتیرافی پێ‌دەکرێ. ئێستێ کۆنفرانسی کوردی لە دیاربەکر دەگیرێ و کوردی لە هەموو جێگایەکەوە بۆ داوەت دەکرێ، ئەوە پێشکەوتنێکی زۆرە. دیارە زۆری ماوە کورد بە مافەکانی خۆی بگا بەڵام لەو ماوەیەدا پێشکەوتنی زۆری بووە. لە ئێراندا دیسان کورد زیندوو بۆتەوە. کورد حوزووری هەیە. ئێستا ئازەربایجانی ڕەنگە لەباری ژمارەوە دوو بەرابەری کورد زیاتر بن بەڵام لە بواری سیاسەتدا بە قەد نیوەی کوردیش حوزووریان بەرچاو نیە. دیارە وەک باسی میللی دەڵێم دەنا ئازەری وەک ئێرانی نفووزیان زۆرە. بۆیە پێموایە کورد ناگەڕێتەوە جێگای خۆی، بەڵام ڕێیەکی سەختو پڕ هەوراز و نشێوی لەپێشە، وا نیە بڵێی لێی بۆتەوە.

جگە لەوەش ئەگەر دەوڵەتی قانوون تەواو دابمەزرێ و ئیستیقراری تەواو بەرقەرار بێ، تەنانەت ئەگەر دەستووری عێراق کە ئێستا بەشێک لە عێراقییەکان لێی پەشیمانن هەمووی جێبەجێ بکرێ، ئەمن پێموایە کورد لەو وەزعییەتەی ئێستا تێی‌دایە کەمتری دەدرێتێ. چونکە فیدرالیزمەکە ئەوپەڕی وەک دێموکراتیکترین وڵاتی دنیا دەبێ، تۆ بڵێی عێراق دەبێتە ئەمریکا، دەبێتە سویس، دەبێتە بێلژیک یان دەبێتە هیندوستان، لەو حاڵەتەشدا مەنتەقەی کوردستان کە هەرێمێکە لە چوارچێوەی عێراقی فیدراڵدا، ئەو ئیمتیاز و وەزعییەتەی ئێستا هەیەتی لێی کەم دەبێتەوە. یانی ئێستا کورد **"با هەرکەی لێ ناکاتەوە"**. مەسەلەن ئێستا لە

ئەمریکا کە دەوڵەتێکی فیدراڵە، مەگەر (FBI) لە هەموو جێیەک نیە؟ ئەرتەشی ئەمریکا لە هەموو جێ-یەک نیە؟ ئیدارەی دارایی لە هەموو جێیەک نیە؟ لەحاڵێکدا ئیستا دەوڵەتی کوردی هەروەک بە حەقیقەت ناوی دەبەن بەڕەسمی سەربەخۆ نیە دەنا لە هەموو شتەکانیدا سەربەخۆیە. ڕەنگە لەو بارەیەوە کورد لێی کەم بێتەوە. بەڵام ئەمن ئەو کەچوونەوەیەم دەگەڵ سەقامگیری و زەمانەتوەرگرتن پێ چاکترە لەوەی ئیستا ئیمتیازاتێکی زۆری هەیە بەڵام نەبووەتە شتێکی موئەسسەساتی. نەبووەتە شتێکی قانوونی کە بڵێی چەسپاوە و تازە گەڕانەوەی بۆ نیە.

# هێندێ مەسەلەی تایبەتی

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا پرسیارێکی خسووسی ئەگەر پێت خۆش بێ وەڵام بدەیەوە. تکایە نەخشی هاوسەری خۆشەویستت لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی ژیانتدا باس بکە. چەندە هاوکارت بووە هەتا چ رادەیەک بەربەستی بەرەوپێشەوەچوونت؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** خێزانەکەم ژنێکی نەخوێندەواری دێهاتی‌یە. لەو بارەیەوە ڕەنگە چاوەڕوانیی سەیرو سەمەرە لەوی بەجێ نەبێ. بەڵام لەو بارەیەوە جێگای ڕەزامەندیو تەنانەت سوپاسە کە لە ژیانی مندا قەت لەمپەری ئەو کارانە نەبووە کە کردوومن یان پێویست بووە بیانکەم. وەکوو هەموو ژنە پێشمەرگەو ژنە تێکۆشەرێک، زەحمەتێکی یەکجار زۆری لە پێناوی سەرکەوتنی کارەکانی مندا کێشاوە. زۆرجار هەڵکەوتووە کە بە چەند مانگ چاوی پێم نەکەوتوە. بەتایبەتی دوو جاریان پێم‌خۆشە باس بکەم.

جارێکیان لە وڵاتی خۆمان لە ئێران بەخۆیو دوو منداڵەوە، دوو کچ بوونو هەر دووکیشیان منداڵ بوون کە یەکیان شیرەخۆرە بوو و یەکیان پێی هەڵگرتبوو، بەجێم هێشتوە بۆ ماوەی شەش، حەوت مانگ. جارێکی دیکە بەخۆیو شەش منداڵەوە لەوڵاتی غەریبایەتی بەجێم هێشتوە. لە بەغدایەم بەجێ هێشتوەو بۆخۆم گەڕاومەوە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بۆکارو تێکۆشانی حیزبی. مەبەستم ئەوە نیە ئەمنیش پیاوێکی گەورەم بەڵام گوتراوە: لەپشت هەموو پیاوێکی گەورەوە ژنێکی گەورە هەیە. ئەوە حەقیقەتێکە لە بارەی ویشەوە سیدق دەکا. ئەگەر کۆمەگی وی نەبایە ڕەنگە زۆر لەو کارانەی کردوومن نەمتوانیبا ئاوایان ڕاپەڕێنم. لەو بارەیەوە جێگای تەقدیرە.

**عەباس کاردۆ:** دیسان پرسیارێک. خێزانت لە هەموو تەمەنی حیزبایەتیی تۆدا دەگەڵت بووە. ئەو زەحمەتانەشی کێشاوە ڕەنگە هەر وەک بۆخۆت باست کرد هێندێک جار زەجری زیاتریشی کێشابێ. بەڵام بۆ ئەو لەو حەقە سیاسی‌یە ناتوانێ بەهرەمەند بێ؟ وەک ئەوە حقووقێکی حیزبی هەبێ یان وەک کەسێکی سیاسی چاوی لێ‌بکرێ. یانی هەر دەبێ ئەندامی ڕەسمی بێ هەتا بتوانێ بە شتێک بگا؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** دیارە ئەو ئەندامی حیزب هەیە، بەڵام هێندێک شت هەن کە دێنە پێش. ئەوە بەدڵخواز نیە بڵێی ئوتوماتیک بێن. لە حیزبدا ئەوە نیە هەرکەس چەند ساڵ ئەندام بوو پلەیە مافێکی بۆ لەبەر چاو

بگیرێ یان پاداشتێکی مادەی وەربگرێ. بەڵکوو ئەسڵ ئەوەیە کە ئەندامی حیزب تەنیا ئەوکاتە یارمەتی وەردەگرێ کە تەواو وەخت کار بۆ حیزب بکا. بەداخەوە ئەویش چونکە نەخوێندەوارە کارێکی وای لەدەست نایە.

باشە ئێستا خێزانی مام جەلال تاڵەبانی دەگەڵ زۆر شەخسییاتو مەقاماتی کوردو غەیرە کورد پێوەندیی هەیە. ئەوە بۆیە نیە ژنی جەلال تاڵەبانییە، نی وەیە بۆخۆی ژنێکی خوێندەوارە، زمانزانەو زیرەکە. بەداخەوە خێزانم نەخوێندەوارە. لەبەر ئەوە لە هێندێک شت مەحرومە. بەو حاڵەش ئەمن پێموایە لەنێو کۆڕو کۆمەڵی خۆماندا خێزانم حورمەتی دەگیرێ. بەحوکمی ئەوەی عومرێکی ڕابواردوە مەسەلەن یەک، دوو جار جایزەیان داوەتێ وەکوو ڕێز لە خەباتەکەی. ئەوە ڕەنگە بەشێکی ئەوە بێ کە موشەخەسەن خێزانی منە، بەڵام بەشی زیاتری نی ئەوەیە ئەویش ڕەنجی لەو پێناوەدا کێشاوە.

**هێباس کاردۆ:** ئەگەر پێت خۆشە باسی منداڵەکانت بکەی کە دیارە جارێکی دیکە ئاماژەکت پێ کردن. ناوەکانیان، خوێندەوارییان، کاریان، پێوەندییان دەگەڵ یەکو هەرچی پێت باشە باسی بکەی.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** وەکوو باس‌کردن ڕەنگە شتێکی وا تایبەتی بۆ گوتن نەبێ. وەکی گوتم دوو کچم هەن کە هەر دووکیان لە کوردستانو ساحێب ماڵو مێردو منداڵی خۆیانن. یەکیان هەر ئێستا لە مەدرەسەی مامۆستای بنەڕەتییە(پێشتر ناوەندی بوو) کە لیسانسی هەیە. یەکیشیان لە مامۆستای قوتابخانەوە دەستی پێ کردو ماوەیەکی زۆر مامۆستای سەرەتایی بوو کە زۆریشی لێ ڕازی بوون. بەڵام ئێستا لە یەکیەتی ژناندا چالاکەو لە فێرگەی سیاسی- نیزامیی حیزبیش مامۆستای زمانی کوردییە. کوڕەکانم ئەوی گەورەم موحەممەد لە فەڕانسەیە لە نەخۆشخانە کار دەکا. بەڵام کاری دەرمانیو پزیشکی ناکا. وا بزانم لەسەر ئامبولانسە. ئامبولانسیش بەو شێوەیە نیەو جۆرێکی تایبەتە لەکاری نەخۆشخانەی کە بەینی دوو نەخۆشخانان هاتوچۆ دەکاو نەخۆشان دێنێو دەبا. ئەوی دیکە ئاکۆیە کە کوڕی سێهەمە. ئەو بەتازەیی چۆتە وڵاتی سوێدو لەڕاستیدا هەتا ئێستا کاری وەرنەگرتوە چونکی لە قۆناغی زمانفێربووندایە. ئەویش لیسانسی هەیە. کوڕی دووهەم بەداخەوە وەکی باسم کرد لە باری مێشکییەوە تەواو نیە. ئێستێ بۆ ٣٢ ساڵ دەچێ بەڵام لە باری عەقڵییەوە دوکتۆرەکان دەڵێن عەقڵی چوار ساڵە. مێشکی ڕوشد ناکاو زمانیشی هەر ناتەواوە. ئەومان بەسەر کۆمەڵی سوێدیدا سەپاندوە. ئاخر کوڕم دوکتۆرای لە حقووقی نێونەتەوەیی‌دا وەرگرتوە. لە ماوەی هەشت نۆ، دە ساڵی ئاخری دەرسەکەیدا کە ماوەی دوکتۆراکەی پێنج شەش ساڵی خایاند هەر لەپاش ئەوەی فەوقی لیسانسی وەرگرت وەک ئوستادیار دەستی بە دەرس‌گوتنەوە کرد. ئەو بەینانە دەستی هەڵگرتو قەرارە بێتەوە بۆ کوردستان لە ئیدارەی حکوومەتی هەرێم کار بکا. دێتەوە بە دایمی کار

بکا جا چەندی دەوام کردو چەندە لە کارەکەی ڕازی دەبێ ئەوە بۆخۆی دەزانێ. ڕەنگە بێتەوە هەم کار لە نیبارەدا بکاو هەم ئیحتیمالی هەیە لە دانیشگاش دەرس بڵێتەوە.

**هێلیس کارڤۆ:** جگە لە سیاسەتو ئەدەب ئۆگریت بە چیی‌دیکە هەبووە یان هەیە؟ دەگەڵ وەرزشو جووڵەی فیزیکی چۆن بووی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** دیسان ئەوەی باسم کرد ڕاتە شوێنی لەدایک‌بوونو پەروەردەبوون تەئسیر لەسەر هەموو چارەنووسی بنیادەمی دادەنێ. هەموو گیانم ئۆگری بە وەرزش بوو بەڵام وەرزشی چ دەکرا؟ تەنیا شتێک کە وەک وەرزش پیاو دەتوانێ حیسابی لەسەر بکا، ئەگەر لە قۆناغی منداڵی تێ‌پەڕێ، تۆپێن هەبوو. دوو جۆر تۆپێن هەبوو، یەکیان پێ‌یان دەگوت تۆپێنی جەغزێ. یاریکەرەکان دەبوونە دوو دەستە. دەستەیەکیان دەنێو جەغزەکەی‌دا ڕادەوەستانو دەستەی دیکەش لە دەرێ بوون. ئەوانەی دەرێ تۆپەکەیان بۆ یەکتر داوێشتو بەوانەی نێو جەغزەکەیاندا دەدا. ئەگەر ئەوانەی ژوورێ تۆپەکەیان گرتبایەوە نۆرەی وان دەهات بچنە دەرێ. ئەگەر پێی‌دا دابایەو نەی ئەنگاوتبا، دیسان ئەوانەی ژوورێ دەچوونە دەرێو ئەوانی دەرێ دەهاتنە ژوورێ. ئەوە قانوونەکەی بوو. جۆرەکەی دیکەش تۆپێنی داری بوو. بەدار لە تۆپەکەیان دەدا پێیان دەگاتە کرێ. پاشان دەڕۆیشتن بۆ مەیدانێکی کە پێ‌یان دەگوت شار. ئەویش دەبوونە دوو دەستە. دەستەیەک لە مەیدانەکەی‌دا بوونو دەستەیەکیش ئانیان دەخوارد کە وایان پێ‌دەگوت. ئەگەر لەو مەیدانەی‌دا توانیبایان یەکیان بە تۆپەکە بنگێون یان بیگرنەوە ئەوە دیسان جێگاکان دەگۆڕاو ئەوجار ئەوانی دیکە ئانیان دەخوارد.

جگە لەوەی هیچ جۆرە وەرزشێکی دیکەمان نەبوو. شتێکی دیکەش هەبوو کە پێ‌یان دەگوت قەڵاشکەری. منداڵیش دەیان‌کردو گەورەش دەیان‌کرد. سێ‌بازیش هەبوو. ئیدی هیچ کام لەو وەرزشانە کە ئێستێ باون لە دێ‌یەکەماندا نەبوون. یاریی منداڵانەی وەک هەڵوورکێنو مزراقو ئەو شتانە هەبوون کە وەک وەرزش زۆر حیسابیان لەسەر ناکرێ. بەڵام دواتریش فورسەت نەبووە وەرزش بکەم. بەو حاڵەش تەماشاکردنی زۆر وەرزشان بەتایبەتی فووتباڵم زۆر پێ‌خۆشە. ئەگەر فورسەتم هەبێ بەتایبەت ئەو فووتبالانەی لەرادەی جیهانی‌دا هەن وەک ئەوەی ئێستێ لە ئەفریقای جنووبی دەستی پێ‌کردوە، یانی جامی جیهانیی فووتباڵ تەماشاکردنیم پێ‌خۆشە.

**هێلیس کارڤۆ:** ئەدی دەگەڵ مۆسیقا چۆنی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** مۆسیقا یەکێک لەو شتانەیە کە زۆر ئۆگریم پێ‌یان هەیە. ئێستاش کۆمپیوتێرەکەم ئەگەر تەماشا بکەی بەشێکی زۆری بە مووزیک داگیر کراوە. زۆرجار کە کارێک دەکەم دەپێشدا

مۆسیقایەک دادەنێم دوایە دەست پێدەکەم. زۆرجار کە دەشخەوم ئەوارێک یان سێ دیبەک دادەنێم بۆ ئەوەی بە دەنگی ئەو خەوم لێبکەوێ. لێرەدا با ئەوەش زیاد بکەم هەتا گەنج بووم دەنگێشم هەبوو. ئەمن نالێم دەنگم خۆش بوو، بەڵام خەڵک پێیان خۆش بوو چونکە بە تێگەیشتنەوە گۆرانیم دەگوت. هەرگۆرانییەک وە کوردەواری‌دا هەبایە هەموویم دەزانی جا مەگەر وەبیر گوێم نەکەوتبا. ئێستاش باوەڕ بکە بەسەدان ئەگەر نەڵێم بەهەزاران گۆرانی دەزانم، بەڵام دەنگەکە هەر ئەوەندەیە کە بەحاڵەحاڵ گوێت لێیە. بۆیە ئێستا ئیدی نایڵێم چونکی ئەو دەنگە ئیدی بە کەلکی هیچ نایە. ئاخر گۆرانی نەفەسی دەوێ بۆ ئەوەی دەیبڕێ. مەسەلەن دیوتە ئەو گۆرانیبێژانە کە تەمەنیان دەچێتە سەرێ وەکوو مامۆستا عەلی مەردان لەکاتی خۆی‌دا، یان مامۆستا کەریم کابان کە ئێستا هەیە، کە گۆرانی دەڵێ بە دەنگێکی کەمی دەڵێ بەڵام دیسان هەناسەی ڕێی پێنادا بەیتەکەی تەواو بکا. جا ئی منیش ناوایە. ئەگینا ئەوەندەم ئۆگری بە هونەری گۆرانی هەبوو و هێندەم پێخۆشبوو ئەگەر ئێستا دەنگم هەبایە پێمخۆش بوو بچم بۆ ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن گۆرانی بڵێم.

**هەباس کاردۆ:** مامۆستا دەنگێکی زۆری کار تێ‌کردووی یان زۆرت پێخۆش بووە یان ئێستا پێت خۆشە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێموایە جارێکی دیکەمان ئەو قسەیە کرد کە نە گۆرانیی هەموو کەس هەموویان خۆشن نە شێعری هەموو کەس هەموویان وەک‌یەک جوانن. یانی هیچ هونەرمەندێک نیە هەموو کارەکانی وەک یەک بن. هەروەک هیچ نووسەرێکیش نیە هەموو نووسینەکانی وەک یەک بن. بەڵام لە گۆرانی-بێژەکان با باسی مردووەکان بکەین باسی زیندووەکان نەکەین. وەکوو حەقیش بڵێم ئەوەی لە تایەر تۆفیقی ڕەحمەتی فێر بووم لە وتووێژێک‌دا کە دوای مردنی بڵاو بۆوە پێی خۆش نەبوو باسی زیندووەکان بکا هەتا بەکێکیان هەڵنەبژێرێ.

لەمردووەکان سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ماملێ، حەسەن زیرەک، موحەممەد عارف جەزراوی، عیسا بەرواری، ئەسرین شیروان، مەلاکەریم ئەوانە بەشێک لەو گۆرانیبێژانە بوون کە گۆرانییەکانیانم زۆر پێخۆش بوون.

**هەباس کاردۆ:** مامۆستا تێوانت دەگەڵ مەزهەب و بەڕێوەبردنی داب و نەریتە مەزهەبییەکان چۆنە؟ دەگەڵ کەسانی نامەزهەبی چۆن مودارا دەکەی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن لە مەوڵوودەوە هەتا ئێستاش موسوڵمان بووم و هەم موسوڵمانیش دەمێنمەوە. بەڵام دوو شتم نەبوون. یەکێکیان ئەوە وەک لە کوردەواری‌دا پێی دەڵێن "بەرماڵم لەسەر ئاوێ نەگەڕاوە". یانی کە بڵێم قەت نوێژێکم نەچووە یان ڕۆژووم نەخواردووە ڕاست نیە. دیارە پێم خۆش نیە وا هەڵکەوتوە بەڵام ئیدی هەڵکەوتوە کە نەمتوانیوە هەموو واجباتی دینی بەجێ بگەیەنم. ئەوی دیکەش ئەوەیە قەت مەزهەبییەکی

وشکو کۆنەپەرست نەبووم. تەنانەت وەختێک لەبیرمە ئەمن تەکفیر دەکرام لەسەر ئەوەی مەزهەبی‌یەکی ڕووناکبینو ڕووناکبیر بووم. دیارە ئەوە لەو وەختەدا هەر ئەمن نەبووم، نێ لە مـن گەورەتریش تەکفیر دەکران. مەسەلەن پیاوی وەک مەلا هادیی سەرایە کە مەلایەکی زۆر گەورە بوو. یان مامۆستا مەلا شێخ عیززەددینی حوسێنی. لەپێش ئەوانیشدا کەسانی وەک شێخ موحەممەد عەبدەی تەکفیر دەکران. هەر چونکە ئەوانە ڕووناکبیری دینی بوون. باوەڕیان بە خورافات نەبوو. بەقەولی مامۆستا مەلا هادیی سەرایە جارێکی ئەو قسەیەی کرد کە: قسەیان بەدارو بەرد دەگوت. یانی خورافات. جا ئەمن مەزهەبی‌یەکی ئاوا بووم‌و ئێستاش هەروام.

**هیاس کاردۆ:** ئایا خۆت بە ئینسانێکی دڵئاوەلا دەزانی؟

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** ئەوە هیچ‌کەس ناتوانێ بۆخۆی قەزاوەت بکا. پێموایە جارێکی دیکەم ئەو قسەیە کرد کە ئەوە دەلیلی دڵئاوایی‌یە کە ڕقی کەسم دەدڵدا نیە. ئەگەر تەشخیص بدەم گوناحێکم دەرحەق بە کەسێک کردوە حازرم ئەنانەت بە دەستماچ‌کردن دڵی بێنمەوە جێگای خۆی. لێبووردنم هەزارجار لە تۆڵەسەندن پێ-خۆشترو پێ گەورەترە. ئەگەر کەسێک خراپەم دەگەڵ بکا لەو بارەیەوە خۆم بە دڵئاوەلا دەزانم کە لێی ببوورم.

**هیاس کاردۆ:** لە ژیانی خسووسیتدا نەهێستوە دڵت بەماڵەوە بێ. هەمیشە ماڵت پڕ لەمیوان بووە. بەڵام لە کاری حیزبی‌دا گلەییت لەسەرە کە زۆر دەستت بە ئەموالەوە گرتوەو دڵی خەڵکت ڕەنجاندوە. ئەو باڵانسە چۆن ڕاگیراوە، یانی لەماڵە خۆت وا نەبی بەڵام لە کاری حیزبی‌دا ئاوا دڵت بە ماڵەوە بێ.

**عەبدوڵلا حەسەنزادە:** لەماڵی خۆشمدا ئەگەر ویستباشم نەمدەتوانی حاتەمی تەی بم چونکی ئەوەندەم نەبووە بە دڵی خۆم خەرج بکەم. بەڵام لەوەتا ژیانم وەبیر دێ، لە بارەی خۆمەوە هەمیشە بە قەولی دەڵێن "تۆم دەگەری دێ‌دا بووە". ئەوەی دەستم کەوتوە پێم‌خۆش بووە زیاتر خەرج کەم. ئێستاش پێم‌خۆشە ئەگەر هێندێک گیروگرفتی ئەوەم نەبێ کە بۆخۆم بەتەنێ‌و خێزانم پیرو ئەوە، حەزم دەکرد زۆر زیاتر لەوە کە دەخزمەت میوانو دۆستاندا هەم لە خزمەتیاندا بایەم. بەڵام زۆرجار تەماشا دەکەم دەری ناباو پێ‌ڕاناگا. ئەخۆشە، ئەخۆشێکی وا تا لەجێ‌دا کەوتبێ، بەڵام بەهەر حاڵ عومری چۆتە سەری‌و توانای لە کەمیی داوە.

بەڵام بۆ ئەموالی حیزبی، ئەمن پێموایە ئینسانێک کە ماڵی عومورومی بەدەستەوەیە جا حیزبی یان دەوڵەتی، هەرچەند دڵی وا پێوە نیە، بەڵام حەق وایە پتر لەماڵی خۆی هەوڵ بدا بە ڕێ‌دەجێ سەرف بکرێ. لە ژیانی شەخسیشداو لە ماڵی شەخسی‌و حیزبیشدا باوەڕێکم هەیە: لەو جێیەی پێویستە هیچ دڵم بە میلیۆنێکەوە

نیە، جا لە هەرواحیدێکی پووڵ بیگری، بەڵام ئەو جێیەی پێویست نیە دڵم بە یەک دانەو تەنانەت یەک لەدەی واحیدی پووڵیشەوە هەیە. ئێستا ئەگەر بڵێن تمەنە، لەجێی خۆی‌دا یەک میلیۆن تمەنم پێ هیچ نیە. بەڵام تمەنو تەنانەت قرانێکیشم بەخۆڕایی پێ‌ناخۆشە کە دەیتە یەک لەدەی تمەنێک. زۆرجار ئەوەی دەڵێم لەسەر بەحری ئاو بەخۆڕایی خەرج بکری پێم ناخۆشە. لەماڵی خۆم کە زۆرجار هەبووە پووڵی بەرقم داوەو زۆرجاریش نەمداوە، بەڵام زۆرجار وا بووە لامپێکی یازدە واتیم کوژاندۆتەوە چونکی ڕۆژ بووەو پێویست نەبووە. بەڵام جاری وا بووە ئێرکۆندیشێنێکم هەڵکردوە کە سێ کیلۆواتی دەوێ. ئەو وەختەی زەروورەت هەیە دەبێ خەرج بکرێ‌و کە زەروورەت نیە دەبێ پێشی بگیرێ. لەپاشان بەتەریقی ئەولا ئەگەر بگاتە سووئی ئیستیفادە ئەوی شتێکی زۆر نامەشرووعە. وەبیرم نایە ئەو حەقەی لەسەر حیزبە بۆ کەسێک، ئەو وەختەی بەرپرسایەتیم هەبووە حەقی هیچ کەسێکم فەوتاندبێ. بەڵام وا بووە یەکێک چاوەڕوانی‌یەکی هەبووە کە پێم بەجێ نەبووە یان ئیمکانی نەبووە جوابم نەداوەتەوە.

**هێیاس کاردۆ:** ئەت کەست لەسەر ئەموالی حیزبی سزا داوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** وەکوو فەرد تا کەسم سزا نەداوە. بەڵام لە جەمعی دەفتەری سیاسی‌دا لەسەر ئەموالی حیزبی بەڵێ بڕیاری سزا دراوەو ئەمنیش دەنگم داوە. ئەوە ئەو کاتە بووە کە تەخەللوفەکە ئاشکرا بووەو دەفتەری سیاسی ئەسەری کۆ بۆتەوە. دەنا بۆخۆم شتی وام نەکردوە. وەکوو یاری دیکەش بۆ سزادان دوو جارم وەبیر دێ کە کردوومە. یەکیان نامەیەک بوو کە بەناوی خۆم نووسیم. نامەکە بۆ ڕەفیقێکی حیزبی بوو، ناوی نابەم چونکی بەداخەوە ئەماوە. هێندێک کاری کردبوو کە زیانی لە ئیعتیباری حیزب دەدا. بۆیە نامەیەکی سەرزەنیشتم هەر بەناوی خۆم بۆ نووسی. بۆم نووسی ئەو کارانەی تۆ ئاوا خەراپن، ئەگەر تەواویان نەکەی وا دەکەم سزای حیزبیت بۆ دیاری بکرێ. جارێکی دیکە خەڵک شکایەتیان لە یەکێکی دیکە کرد. یانی زۆری شکایەت لەسەر هەبوو. بۆم نووسی ئەگەر واز نەهێنی هیچ پێویست ناکا خەڵک نازی تۆ بکێشێ. خەڵک جوابت دەداتەوەو حیزبیش جوابت دەداتەوە. لەو پێوەندی‌یەدا لێی پەشیمان نیم. جارێکیش هەڵ‑کەوتوە یەکێکم بە دەسەڵاتی خۆم سزا داوە بێ ئەوەی بێ‌بەمە ئۆرگانی دیکە. سزاکەش لەسەر کارلابردنی بوو. جگە لەوانە قەتم لە دەسەڵاتی خۆم بۆ سزا کەڵک وەرنەگرتوە.

**هێیاس کاردۆ:** قەت کەسێکتان سزا داوە ‑ بەجەمع یان بەتەنیا‑ بەڵام دوایە دەرکەوتبێ بێ‌گوناحە؟

**عەبدوڵڵا حەسەن‌زادە:** بەڵێ هەڵ‌کەوتوە. بەداخەوە لە حیزبیش‌داو لە کۆمەڵیش‌داو لە دادگاکان‌دا شتی وا هەڵ‌دەکەوێ. ئەوجۆرە شتانە دەبێ. هەر ئەو ڕۆژانە لە ڕادیۆکان بڵاو بۆوە کابرایەک بۆ ماوەی دە ساڵ بە

تاوانی کوشتنی کەسێک دە زیندانێدا بووە، بەڵام پاش دە ساڵان کوژراو پەیدا دەبێتەوە. ئەوە هەر حەفتەیەک، دوو حەفتە دەبێ کە خەبەرێکی ئاوام گوێ لێ‌بووە.(وایە ئەمساڵیش لە ئەمریکا کابرایەک ٢٧ ساڵ بوو بە تۆمەتی تەجاوزی جینسی و کوشتنی کچێکی منداڵ دەزیندانێدا بوو بەڵام تازە تێستی DNA دەری خستوە بێ گوناحە، بۆیە ئازاد کرا. عەباس)

**عەباس کاردۆ:** لە ژیانتدا لە کێ شت زۆر فێر بووی و چۆنی لێ فێر بووی؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** لە خوێندن و شتی ئاوادا لە مامۆستای جۆراوجۆر فێر بووم. تەنانەت هەڵکەوتوە لە مامۆستای وا فێر بووم کە بەقەت منی دەرسەکە نەزانیوە. لە کاری سیاسیشدا هەوڵم داوە لە هەموو کەس فێر بم. کارم بەوە نەبووە ئەو شەخسە لە من گەورەترە، ڕەفیقی منە یان کەمتەمەنترە. پیاو دەتوانێ لە هەموو کەس فێر بێ. بەڵام لەباری کاری سیاسی‌یەوە بەڕاستی هیچ پێ‌هەڵگوتن نیە دوکتۆر قاسملوو بۆ من زۆر مامۆستایەکی گەورە بووە. ئەوەی فێری بووم بەشی زۆری لەو فێر بووم. ئەو زاناترو سیاسیترین کەس بووە کە لێی نیزیک بووم. ئەگینا هەر بۆخۆم باوەڕم وا بووە ئەو شێعرە فارسی‌یەشم هەر بۆ بیرو بەدەرس کە دەڵێ:

"مرد باید کە گیرد اندر گوش    ور نبشتەاست پند بر دیوار" (پێم‌وایێ هی سەعدی‌یە).

پیاو دەتوانێ لە هەموو کەس فێر بێ. یانی ئەگەر کەسێکی زۆر زانا لە یەکێکی عادی هیچ فێر نەبێ دەگەڵ ئەوەی ماوەیەکی زۆری دەگەڵ بژی، پێم‌وایە دەبێ سەرزەنیشی خۆی بکا. دەبێ عەیبێکی تێدا هەبێ دەنا چۆن فێر نابێ. هەرکەس لە دەوروبەری خۆی شت وەردەگرێ و شتیشیان دەداتێ.

**عەباس کاردۆ:** تۆ سووڵەن دۆستایەتی لە ژیانی تۆدا چەندی جێگا بۆ کراوەتەوە؟ دۆستانی خۆت بەپێی چ میلاکێک هەڵدەبژێری؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێم‌وایە ناتوانی حەددی دۆستایەتی دیاری بکەی. ڕەنگە لەباری ئەسمی و قانوونی‌یەوە بەجۆرێکی دیکە بێ بەڵام دەتوانم ئەوە بڵێم زۆرجار دۆستایەتی لە برایەتی خۆشترە. زۆر دۆستم بوون لە ژیانمدا کە نزیکایەتی و سوحبەتیان لە نزیکیم بە براکانم و ئامۆزاکانم زیاتر بووە. بەتایبەتیش کە ئەو سەمیمییەت و باوەڕپێ‌کردنەی لە بەینی دۆستاندا هەیە، لە بەینی برایان و تەنانەت خزمی دوورتریشدا ڕەنگە نەبێ. ئەو نیزیکی‌یە ئەسمی‌یە وەکوو شتێک پەردەیەکە لە بەینی خزماندا. بەڵام کە دەگەڵ بێگانەیەک دەبیە دۆست لەڕاستیدا ئەو نیزیکی‌یە ئەخلاقی و ڕووحی‌یەیە کە دەت‌کاتە دۆست. بۆیە دەتوانی هەموو شتێکیان دەگەڵ باس بکەی.

**عەبباس کاردۆ:** هەرکەس دڵی بەشتێک دەکرێتەوە. بۆ نموونە یەک بە گوڵی جوان دەگەشێتەوە، یەک بە شاری خاوێن و خۆش، یەک بە شاخ و داخ یان یەکی دیکە بە دەریا. چ شتێک تۆ دەگەشێنێتەوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** مێمن دەڵێ:

"جیلوەی جوانی دەمەرچی‌دا هەبێ خۆشم دەوێ
ڕۆژی کوشتەی مینی‌زۆبەو ڕۆژی گیرۆدەی شەدەم"

ڕەنگە هەموو کەس هەر وابێ نەک هەر ئەمن. جوانی لە هەرچی‌دا هەبێ لەمزەتی لێ دەبەم. لە پارچەیەکی جوان لە دیمەنێکی جوان لە گوڵێکی جوان لە خەتێکی جوان لە گۆرانی‌یەکی جوان و خۆش، لە شێعرێکی جوان و لە هەمووان. بەڵام ئینسانی جوان - ژن یان پیاو - لە هەموو شتێک زیاترم خۆشی دەداتێ. جوانیی مرۆڤ شتێکە بەرزوورتر لە هەموو جوانی‌یەک. مەودا زۆرن بۆ دەرکەوتنی جوانیی مرۆڤ. با هەر لە منداڵی‌یەوە سەیری بکەین. ئاخر بەڕاستی شت هەیە لە منداڵ جوانتر؟ لەچی‌دا منداڵی ناحەز هەیە؟ دوایە تەماشای لاوێک بکە. چ بوونەوەرێک دەتوانێ قەرە لە قەدی بدا؟ لەوانە بگوزەرێ مەودا بۆ دەرکەوتنی جوانیی مرۆڤ یەکجار زۆرە. بە ئازایەتی جوانە، بە زیرەکی جوانە، بە ئاکاری جوان و پەسند جوانە و بەکورتی جوانی‌یەکانی لە بڕانەوە نایەن. با لەو پێوەندی‌یەدا شتێکت بۆ باس بکەم: جارێکیان لە کۆڕێکی خۆماندا باسی ئەوە دەکرێ کە لە هەموو زیندەوەرێک‌دا نێرەکە جوانترە لە مرۆڤ‌دا نەبێ کە ژن جوانترە. خانمێکی ژیر و قسەلەڕوو هەڵدەداتێ دەڵێ سەلا لە عەقڵتان. ئێوە بەچاوی پیاو تەماشای پیاو دەکەن، بۆیە وا دەزانن. ئەگینا پێش هەمووان لە مرۆڤ‌دا نێرینە لە مێـــینە جوانترە.

**عەبباس کاردۆ:** دڵداری خۆ هەر ئەوە نیە هەوەس و کەڵکی خەراپ‌وەرگرتنی جینسیی تێدا بێ. دوای ئەوەی ژیانی هاوسەریت پێک‌هێناوە قەت دڵداری کردوە؟

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** پێش ئەوە بەڵێ بەڵام دوای ئەوە ئەخێر تەم‌کردوە. ناڵێم کەسم خۆش نەویستوە. پیاو یەکێکی خۆش دەوێ بەڵام خۆشویستن بە مانای ڕابیتەی جینسی قەتم نەبووە. حەتتا ڕابیتەی جینسیی خەراپ ئەمن پێشتریش هەر نەمبووە. جاری دیکەشم باس کردوە. بەخۆشی‌یەوە هەرگیز هەوەسباز نەبووم. بەڵام بە هەرحاڵ ئینی کە دڵ هەیە دڵداریش هەیە و دڵداریش هەیە.

**هێلیس گاردۆ:** مامۆستا بە جۆرێکی دیکە ئەو پرسیارەم لێ کردووی. شانازی بە چ شتێکی خۆتەوە دەکەی؟ یانی ئەوەی کردووتە.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** ئەمن شتی هێندە گەورەم نەکردووە وەکوو شاکار، بەڵام بە هێندێک شتی خۆم خۆشحاڵم. مەسەلەن سەربەرزم وەختێک تووشی هەر کەسێکی بۆخۆم نەناسراو دەبم دەڵێ کاکە ئەمن لەمێژە ئەتۆ دەناسم لە ڕێگای نووسینەکانتەوە لە ڕێگای زمانەکەتەوە. باڵابەباڵا پێی گەورە دەبم ئەگەر یەکێک لەبەر نیشتمانپەروەری بەکەم خۆشی دەوێم یان لوتفم دەگەڵ دەکا. ڕەنگە جاری دیکەم گێڕابێتەوە، بەڵام ئێستا بۆ سەبت لە مێژوودا شتێک دەگێڕمەوە. ئەو وەختیم گوتوو ئیمانیشم پێی هەیە.

ئەندامێکی حیزبیمان شەهید بوو. ئەمن لە دەرێ بووم کە جێژن بەسەردا هات. لە فەڕانسەڕا تەلەفۆنم بۆ بابی کرد. ویستم جێژنەپیرۆزی لێ بکەم چونکی بەتایبەتی نۆجێژنی بوو. ئەو پیاوە دوو کوڕی هەبوون، کوڕی گەورەی شەهید ببوو ئەوی چووکەی مابوو. هەرکە زەنگی تەلەفۆن لێدار کوڕەکەی تەلەفۆن هەڵ-گیرا، دەنگی بابی نەبوو چونکی دەنگی بابیم باش دەناسی. کوڕەکە جوابی دایەوە. بەداخەوە ناتوانم ناویان بێنم چونکی لەنێو خۆی وڵاتن. گوتم ماڵی فلان کەسی‌یە؟ گوتی بەڵێ. گوتم بابت تەشریفی لە ماڵێ‌یە؟ کوڕەکە گوتی نەخێر. گوتم ئەگەر بۆخۆی لەماڵێ بایە دەی‌ناسیم بەڵام پێم‌خۆش بوو بە بۆنەی ئەم جێژنەوە بەتایبەتی پیرۆزبایی عەرز بکەم. پیرۆزبایی عەرزی تۆش و خانەوادەش بکەم و جارێکی دیکەش هاودەردیتان دەگەڵ بکەم. گوتی ئەمن دەنگی تۆ دەناسم، بە قوربانی دەنگت بم. ناوی شەهیدەکەی بردو گوتی ئەویش و خۆشم و دایکیشم و خوشکیشم هەموو بەقوربانی تۆ بین. ئەو وەختی گوتم هەرچی لە ژیانمدا کردوومە بایی ئەو قسەیەی تۆ نایێ. ئێستاش هەر باوەڕم وایە.

ئاخر کەسانێک زۆر خۆیان بە تەڵەبکار دەزانن بۆ ئەو خەباتەی کردوویانە. پێموایە هەرچی تێکۆشەرێک کردوویەتی بە قەد ئەو پاداشە نایێ کە دڵسۆزانی میللەت دەی‌دەنەوە. نەیانەدیوی، ناتناسن، دەنگت خۆش نیە، جوانچاک نی، قسەت خۆش نیە، بەڵام چونکی خزمەتێکت کردوە خەڵک حورمەتت دەگرێ. ئەوە یەکجار زۆر جێی شانازی‌یە. ئەمن بەخۆشی‌یەوە لەو گەورەیی‌یانەم زۆر دەگەڵ کراوە ئێستاشی دەگەڵ بێ. ئێستێ کە ئەمن بە جۆرێک لەجۆران لە کاری حیزبی وەکوو کاری ڕۆژانەو بڕیاردانی حیزبی کشاومەوە، لە شتی دیکەش هەر دەمەوێ زیاتر خۆم دوور خەمەوە. بەڵام بەو حاڵە ڕووی خەڵکێکی زۆرم تێ‌یە. لەخۆمی بەزیاد دەزانم بۆیە پێی سەربەرزم. پێموایە زیاد لەحەددی ئەوەیە کە کردوومە.

**هێلیس گاردۆ:** مامۆستا ئەمن پرسیاری دیکەم نەماون. پێم‌خۆشە سفرەی دڵی خۆت بکەیەوە و چیت پێ-خۆشە پێوەی زیاد کەی. تکایە فەرموو.

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** شتێک کە پێمخۆشە لێرە بیڵێم ڕەنگە وەختی بڵاو بوونەوەی ئەمن نەمێنم. شتێک کە لە ژیانمدا زۆرم عەزاب پێوە چاشتوە ئەوە بووە کە ئەمن، ئێستاشی دەگەڵ بێ زۆرجار هەستم کردووە هەست دەکەم کە نیزیکترین کەسانیش وەک هەم نەیانناسیوم. بەتایبەتی مەبەستم فەزڵو گەورەیی و سیاسەتمەداری و زانایی و ئەوە نیە کە بۆخۆم ئەوانە نیم. بەڵام سەفای قەلبیی من نەناسراوە. مەسەلەی زۆرم دوژمنایەتی و موقابەلە کراوە با بڵێین لەسەر پۆستێک. دەحاڵێکدا ئەمن قەتم نەویستوە. ئەوەی کە دەڵێ:

**"هرکسی از ظن خود شد یار من وز درون من نجست اسرار من"**

بۆخۆی چۆنە ئاوای ئەمن حیساب کردوە. ئەوەی پێی دەڵێن قیاسی نەفس یان **"کافر همەرا بە کیش خود پندارد"**. زۆرجار موقابیلەکانی من خۆیان چۆن بوون پێیان وابووە ئەمنیش وام. لەحاڵێکدا ئەمن بەتەواوی جۆرێکی دیکە بووم. پێشتریش باسی ئەوەم کرد کە کەس هەبووە موقابەلەی دەگەڵ کردووم ئێستاشی و ئێستاش نەمزانیوە لەسەر چیە. هەتا جورئەتی ئەوەشی نەبووە بڵێ بابە لەسەر ئەوەیە. لەوە زۆرم عەزاب چاشتوە. هیوادارم ئەو زوڵمە لە هیچ کەسی دیکە نەکرێ. ئارەزوو دەکەم.

******

**عەباس کاردۆ:** مامۆستا ڕۆژی بیست و پێنجی(٢٥) مانگی(٥) مای ٢٠١٠ ئێمە دەستمان بە وتووێژ کرد بە هاوکاریی دۆستی بەڕێزمان کاک پێشەوا عەلیپوور کە کوڕێکی لێهاتووی ئێو حیزبە. ئەمن بۆخۆم سوپاسی دەکەم. ئەگەر هاوکاریی وی نەبا ڕەنگە نەمانتوانیبا ئاوا درێژەی بدەین و بچینە پێش. تەقریبەن هەموو ڕۆژێ ئێمە درێژەمان بە وتووێژەکانمان داوە دەزانم زیاتر لەسی سەعات(٣٠) وتووێژمان کردوە.( دەقیقەن ٣٦ سەعات بووا، ئەوڕۆش کە دوازدەی(١٢) مانگی(٦) جوونە وا وێدەچێ ئاخرین دانیشتنمان بۆ درێژەی وتووێژەکان بێ. ئەمن پڕ بەدڵ سوپاست دەکەم. وەک خۆشم زانیارییەکی زۆرم وەگیر کەوت. هیوادارم تەمەنت درێژ بێ و بتوانی زیاتر خزمەتی کوردو کوردستان بکەی

**عەبدوڵڵا حەسەنزادە:** سوپاسی جەنابت دەکەم کە ڕێگای هەزاران فرسەت بڕی بۆ ئەوەی ئەو دیدارە پێک بێنی. هەر وەها سوپاس لە کاکە پێشەواش لاوی جێگای ئومێدمان. هیوادارم بەردی بناغەی کارێکی باشمان دانابێ. ئەوەی هەتا ئێستا کردوومانە دەبێ وەکوو هەنگاوی یەکەمی کارەکەمان چاوی لێبکەین. ئەو وتووێژە دەتوانێ لە ئایندەدا تەکمیل بکرێ. شتی لێزیاد بکرێ یان شتی لێ کەم بکرێتەوە. ئەگەر هەڵەیەک

ڕووی داوە و لەپاشان بۆمان دەردەکەوێ، بۆ من یان بۆ جەنابت، ئەوانە ڕاست دەکەینەوە. لەباری ڕێک‌ڕێنکی و دیزاینەوە دەبێ ویراستاریی باشی بۆ بکرێ.

لەسەریەک وەکی پێشتریش گوتم ئەوە مێژوو نیە. بیرەوەریی هیچ کەس مێژوو نیە. بەڵام ئەو بیرەوەری‌یانە دەبنە سەرچاوەی باش بۆ ئەوانەی دەیانەوێ مێژووی وڵاتەکەمان بنووسن. ئاواتم ئەوەیە جەنابت لەو ڕێگایەدا بەردەوام و سەرکەوتوو بی. شوکور تەمەنت زۆری بە بەرەوە ماوە، ئینشەڵڵا فریا دەکەوی ئەم جۆرە وتووێژە دەگەڵ کەسانی دیکەش لەوانە کە ڕابردوویەکی سیاسی‌یان هەیە و ئەزموونیان هەیە ئەنجام بدەی. جارێکی دیکە سوپاس و بە ئاواتی سەرکەوتن. بە هیوای ئەوەی ڕۆژانی خۆشتر لەو ڕۆژانەی کە دیومانن ببینین.

**تێبینی:**

سەعات یەکی شەوی شەممە ٤ لەسەر ٥ی مانگی دووی ساڵی ٢٠١١ بەخۆشی‌یەکی زۆرەوە لە تایپ-کردنی بوومەوە.

## دوا قسە

هەروەک برای بەڕێزم کاک عەباس نووسیویە ئەم باسە بەرهەمی وتووێژێکی ٣٦ سەعاتی‌یە کە بە دەست-پێشخەری و زەحمەتی کاک عەباس کاردۆ و هاوکاریی لاوی بەبەهرە کاک پێشەوا عەلی‌پوور ئەنجام دراوە. دوای ئەوەی کاک عەباس تەواوی وتووێژەکەی بە حەوسەڵەوە ئەمانەتەوە هێناوەتە سەر کاغەز ئەمن زیاتر لە جارێک پێیدا چوومەوە و دەستکاریم کردوە. دەستکاری‌یەکە لایەنی جۆراوجۆری گرتۆتەوە: ڕاستکردنەوەی هەڵەی نووسین (کە زۆر کەم بوون)، گۆڕینی ڕێنووس، ڕاستکردنەوەی ڕستەبەندی، کەمکردنەوە و لێ-زیادکردن و وردترکردنی مێژووی ڕووداوەکان و زۆر شتی دیکە. دەکرێ بڵێم جێی وا هەیە کە نووسراوەکە تەواو دەگەڵ فایلە دەنگی‌یەکە لێک جیاوازە.

هەربۆیە بە پێویست دەزانم ڕایگەیەنم هەروەخت لە نێوان فایلە دەنگی‌یەکە و نووسراوەکەدا جیاوازی هەبوو، ئەوەی لە نووسراوەکەدا هاتوە بیروباوەڕی منە و خۆمی لێ بە بەرپرس دەزانم. لە کەموکوڕی‌یەکان داوای لێبووردن دەکەم و دووپاتی دەکەمەوە هەر هەڵەیەک بەرچاو بکەوێ بەرهەمی لەبیرنەمانی ڕووداوەکانە، نەک گۆڕینی ڕاستی‌یەکان بە قازانجی لایەنێک و بە زیانی لایەنێکی دیکە.

عەبدوڵڵا حەسەنزادە

٢٠١١/١٠/٠٣



ئەمن دەزانم نە مەوقیعییەتی مامۆستا ئەوە هەڵ دەگرێ هەموو شتێک باس بکاو نە هەلومەرجی خەباتی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش وای لێ هاتوە هەموو شاراوەکانی ئاشکرا بکرێن. هەر بۆیە چاوەڕوانی ئەوە نەبووم بێ پەردە پرسیار بخولقێنم و بێ سنووریش وەڵام وەرگرمەوە. بەو حاڵەش هەموو هەوڵی خۆم داوە هەم داوای ڕوون کردنەوەی زۆر قۆناغی جێگای پرسیار بکەم و هەم سەرنجی مامۆستا بۆ گرینگیی ڕوون کردنەوەی هێندێک شتی "حەسساس" ڕاکێشم. هەڵبەت پێی لێ دەنێم نەم توانیوە وەڵامی هەموو پرسیارێک بەو جۆرەی مەبەستی خۆم بووە وەربگرمەوە. بەڵام دەبێ بزانین ئەوە مامۆستا حەسەن زادەیە وەڵام دەداتەوە نەک کەسێکی ئاسایی. ناوبراو کە لە هەموو ژیانی سیاسیی خۆی دا بۆ تاقەجارێک لەسەر ئاشکراکردنی نهێنی یەکی تەنانەت چووکی حیزبییش نەهاتۆتە ژێر پرسیار. زۆر ئاسایی یە کە نەکرێ وەڵامی هەموو پرسیارێکی لێ وەرگریەوە. ئەوەی لە وەڵامی پرسیارەکان دا بۆم ڕوون بۆوە مامۆستا زۆر مەسئوولانە وەڵامی داونەتەوە، قازانجی گشتی و دوارۆژی زۆر لەبەر چاو بووەو بێ هۆکەس یان لایەنێکی تاوانبار نەکردوە.

هەیاس کاردۆ